سەرجەمی پەیامەکانی نوور

٦

# داوەرییەکان

بەدیعوززەمان

سەعیدی نوورسی

دانراوە

فاروق ڕەسوول یەحیا

کردوویە بە کوردی

سەرجەمی پەیامەکانی نوور

٦

# داوەرییەکان

بەدیعوززەمان

سەعیدی نوورسی

دایناوە

فارووق ڕەسووڵ یەحیا

کردوویە بە کوردی

بسم الله الرحمن الرحیم


نورسی، بدیع‌الزمان سعید، ۱۸۷۳ - ۱۹۶۰ م.
داوەری‌یەکان/ تألیف بدیع‌الزمان سعید نورسی؛ مترجم به زبان
کردی فاروق رسول یحیی.
تهران: نشر احسان، ۱۳۹۱.
۸۸۰ ص.
فیپا ISBN: 978-964-356-907-5
موضوع: قرآن - بررسی و شناخت، اسلام - مسائل متفرقه.
شناسه افزوده: یحیی، فاروق رسول.
رده بندی کنگره؛ ۱۳۹۱ ۳۰۲۷م۸۳ن/BP۱۱
رده بندی دیویی: ۲۹۷/۰۲م.
شماره کتابشناسی ملی: ۲۸۳۳۰۶۱


## داوەری‌یەکان


+مؤلف: بدیع الزمان سعید نورسی
+مترجم: فاروق رسول یحیی
+ناشر: نشر احسان
+نوبت چاپ: اول - ۱۳۹۱
+چاپ: مهارت
+تیراژ: ۳۰۰۰ جلد
+قیمت: ۲۰۰۰۰ تومان
+شابک: ۵-۹۰۷-۳۵۶-۹۶۴-۹۷۸



فروشگاه:
تهران. خ انقلاب. روبروی دانشگاه.
مجتمع فروزنده. شماره ۴۰۶
تلفن: ۶۶۹۵۴۴۰۴

# پێشەکیی وەرگێڕ

بسم الله الرحمن الرحيم

يا رب! لكَ الحمدُ كما ينبغي لجلالِ وجهِكَ وعظيمِ سُلطانِكَ.

يا رب! لا أحصي ثناءً عليكَ أنتَ كما أثنيتَ على نفسِكَ.

صلِّ يا رب وسلِّمْ على إمامِ المرسلين، حبيبِ رب العالمين، نبينا وأسوتِنا وقرةِ عيوننا محمدٍ، وعلى آله وصحبه أجمعين، ومن اتَّبعَ هداه إلى يوم الدين.

خوێنەرانی بەڕێز!

ئەم بەرگەی بەردەستتان هەندێ جیاوازە لەو بەرگانەی پێشوو کە بە چاودێری و بەخششی خوای گەورە لەم سالانەی دواییدا بلاومان کردەوە و ئێوەی ئازیز لێی بەهرەمەند بوون..

بەرگەکانی پێشوو بەرهەمی قۆناغی "سەعیدی نوێ"ن، کە لە سالەکانی (١٩٢٧ز) بە دواوە تا دەگاتە سالەکانی پەنجای سەدەی پێشوو نووسراون، کاتێ کە دەولەتی بە ناو خەلافەت کۆتایی پێ هات و، ولاتی نوێی تورکیا ڕووی لە قۆناغێکی ترسناك و دژوار کرد لە دوژمنایەتیی ئایینی ئیسلام و گەلی کورد، هەموو دام و دەزگاکانی دەولەتیش خرانەگەڕ بۆ دانانی بەربەستە جۆراوجۆرەکان لە ڕووی "ئیمان" و "ئیسلام" و "قورئان"دا، تاکو بەشێکی نەوەی نوێ لەسەر دژایەتی کردنی هەرچی پەیوەندی بە ئایینەوە هەبێت پێ بگات و، پاشان بکرێتە داردەستێکی خۆمالی بۆ درێژەدان بەو دژایەتی‌یە..

مامۆستا سەعیدی نوورسی لەو قۆناغەی تەمەنیدا و بۆ بەرەنگار بوونەوەی ئەو هەوڵە چڕوپڕانەی بەرەی دژ بە "ئیمان"، "پەیامەکانی نوور"ی نووسیوە و بڵاوی کردوونەتەوە. خوای گەورەش بە چاکەی خۆی و، بەهۆی نیازپاکیی دانەریان هێزێکی ئەوتۆی بەو پەیامانە بەخشی کە بوونە تەوەری بووژانەوەی "ئیمان" لەناو دڵاندا و، گەڕانەوەی تین و تەوژمی "ئایین" بۆ ناو کۆمەڵگا و، لەباربردنی سەرجەم تەقەلاکانی نەیاران بە ئایین و ڕەوشت و بەها بەرزەکان.

ئومێدێکی زۆرم بە چاودێری و پشتیوانیی خوای گەورە هەیە کە وەرگێڕانی "پەیامەکانی نوور" بۆ زمانی کوردیش جێی خۆی بگرێت و، ببێتە پاڵپشتێکی ئیمانیی توندوتۆڵ بۆ "ئیمانداران" و "عەوداڵانی ڕاستی" لە بەرامبەر وەسوەسە و گومان و دوودڵییەکانەوە کە لای خۆیشمان و شوێنانی تری جیهاندا دەورووژێنرێن. چونکە وەك لای شارەزایان سەلماوە هەر هەمان جۆری گومان و تەقالاکانی پێشووە کە بەرەی دژ بە ئیمان لە هەموو لایەك و، بە هاندان و چاولێکەریی کات و شوێنەکانی تر، دووبارە و چەند جارەی دەکەنەوە.

"پەیامەکانی نوور" ڕاست و دروستیی "ئیمان" و، فشەڵیی سەرجەم چەمکەکانی "بێ باوەڕی" بۆ مرۆڤی حەقویست و بە ویژدان دەسەلمێنن و، ڕۆڵێکی کاریگەر دەبینن لە دامەزراندنی کەسایەتیی ئیمانداری توندوتۆڵ و دڵسۆز و خاوەن پەیامدا. هەروەك دەستی یارمەتی بۆ هەموو ئەو بەڕێزانەش درێژ دەکەن کە ئامانجیان گەیشتنە بە "ڕاستی" و دوورن لە "دەمارگیری" بۆ ئەو چەمکانەی کە ڕاستی پشتیان ناگرێت.

ئەمە بە پوختی سەبارەت بە بەرگەکانی پێشوو.

* * *

بەڵام ئەم بەرگەی بەردەستی ئێوەی ئازیز زۆرینەی بەرهەمەکانی مامۆستا سەعیدی نوورسی لەخۆ دەگرێت کە پێش ئەو مێژووە ناوبراوە لە بۆنە و دەرفەتە جۆراوجۆرەکانی سەرەتای سەدەی بیستەمەوە هەتا ساڵی ١٩٢١ز دایناون و بڵاوی کردوونەتەوە، لەو دەمەی ژیانیدا کە خۆی ناوی قۆناغی "**سەعیدی کۆن**"ی لێ ناوە.

باسی دانە دانەی کتێب و نامیلکەکانی ئەم بەرگە و، بارودۆخی دانانیان، هەروەها لێدوان لەسەر کاری وەرگێڕانیان، هەڵدەگرین بۆ پێشەکییەکانی تایبەت بە خۆیان، کە چ مامۆستا ئیحسان قاسم صالحی و چ ئێمە لە سەرەتای پەیامەکانەوە نووسیومانن.
بەڵام لەم پێشەکییەی ئێرەدا هەندێ ڕوونکردنەوەی گشتی بە پێویست دەزانم بۆ خوێنەری بەڕێز، تاکو ببێتە بەرچاوڕۆشنییەك لە دەمی خوێندنەوەی ئەم بەرگەدا:
کتێب و نامیلکەکانی ئەم بەرگە، یەکەم جار بە جیا جیا و سەربەخۆ بڵاو کراونەتەوە. هەندێکیشیان لە ژیانی دانەردا چەند جارێك لە چاپ دراونەتەوە.
بەشێك لەم کتێبانە مامۆستا نوورسی بە هەردوو زمانی (تورکی و عەرەبی) دایناون. یان لە سەرەتادا بە یەکێك لەو دوو زمانە نووسیونی، پاشان هەر بۆ خۆی وەری گێڕاونەتە سەر زمانەکەی تر، کە بریتین لە:
(موحاکەمات، مونازەرات، وتاری شام، شەش هەنگاوەکان).
بەشێکی تری تەنها بە زمانی (تورکی) داناوە، کە بریتین لە: (سنووحات، بڕوانامەی هەردوو قوتابخانەی موسیبەت، هێماکان، ئاماژەکان، گزنگەکان، نوتق، وتارەکان).
تەنها یەك وتاریشی بە زمانی (کوردی) لە ڕۆژنامەی "تەعاون و تەرەقیی کورد"دا بڵاوکردووەتەوە بە ناوی: (ئەی گەلی کوردان).
جا ئەم بەرگەی بەردەستی خوێنەری بەڕێز هەموو ئەو بەرهەمانەی مامۆستا نوورسیی تێدا کۆ کراوەتەوە.
هەر لە نووسینەکانی "**سەعیدی کۆن**" ئەم پێنج بەرهەمەی تریش هەن، کە لەم بەرگەدا بڵاومان نەکردوونەتەوە، لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوە:
١- پەیامی "نوقتە" واتە (خاڵێك لە نووری ناسینی خوای گەورە). لەبەر ئەوەی یەکێکە لە پەیامەکانی بەرگی هەشتەم (مەسنەویی نووری) ئەوا بە پشتیوانیی خوای گەورە لەو کۆمەڵە پەیامەدا بڵاوی دەکەینەوە. هەروەك لە نێوان نامیلکەکانی کتێبی (ڕاستیی تەوحید)یشدا بڵاومان کردووەتەوە.
٢- پەیامی "لەمەعات" واتە (چەند بریسکانەوەیەك لە نێوان هەردوو مانگی یەك شەوەی ڕەمەزان و جەژندا). لەبەر ئەوەی لە بەرگی سێهەم، واتە لە کۆمەڵە پەیامی

(بریسکەکان)دا بڵاومان کردەوە. بە پێویستمان نەزانی لەم بەرگەشدا جارێکی تر بڵاوی بکەینەوە. خوێنەری ئازیز دەتوانێت لەوێ بیخوێنێتەوە.

٣- (شعاعات معرفة النبي ﷺ) واتە (تیشکەکانی ناسینی پێغەمبەر ﷺ). ناوەرۆکی ئەم نامیلکەیە، تەنانەت دەقی هەندێ لە بڕگە و باسەکانی، پێشتر دانەر لە کتێبی (موحاکەمات)دا بە شێوەیەکی ڕوونتر هێناونی و باسی کردوون. ماوەیەك لە وەرگێڕانیدا کارم کرد و، ویستم لەم کتێبەدا بڵاوی بکەمەوە. بەڵام دواتر گەیشتمە ئەو بڕیارەی کە دەست لەو نیازەم هەڵبگرم، چونکە مادەم (موحاکەمات) لەم بەرگەدا بڵاوکراوەتەوە، ئەوا پێویست بەو پەیامە نەماوە و، بڵاوکردنەوەی لێرەدا دەبێتە مایەی بێزاریی خوێنەر.

٤ – قزل إیجاز.

٥ – تەعلیقات.

مامۆستا نوورسی ئەم دوو بەرهەمەی بە زمانی عەرەبی لە زانستی "مەنتیق"دا داناوە.

ئێمە لەم بەرگەدا ئەم دووانەشمان نەکرد بە کوردی و بە عەرەبیش بڵاومان نەکردەوە، چونکە هەروەك دەگمەنیی زاراوەکانی ئەم زانستە لە زمانی کوردیدا وەرگێڕانی ئەو دوو کتێبە بۆ کوردی دەکاتە کارێکی ئەستەم، ئەو ڕێژە کەمەی خوێنەرانی بەڕێزیش کە بایەخ بەم زانستە دەدەن بێگومان لەگەڵ زاراوە عەرەبییەکانیدا ڕاهاتوون و، هەر هەوڵێك بۆ وەرگێڕانیان – لە بریی ئاسانکاری – پتر نامۆی دەکات. خوازیارانی ئەو دوو بەرهەمەی مامۆستا نوورسی دەتوانن لە کتێبی عەرەبیی (صیقل الإسلام)دا بیانخوێننەوە و سوودی لێ وەربگرن.

دەبێ ئەو ڕاستییەش بخەینە ڕوو کە مەگەر کەسێکی مەنتیق زانی زۆر شارەزا، دەنا خوێنەری ئاسایی پێویستی بە مامۆستایەکی ئەو زانستە دەبێت کە باسەکانی ئەم دوو کتێبەی لە لا بخوێنێت تاکو لێیان تێبگات، چونکە مامۆستا نوورسی بە تایبەتی بۆ قوتابییە هەرە زیرەکەکانی خۆی نووسیونی لە قۆناغی **"سەعیدی کۆن"**دا.

* * *

سەبارەت بەو پرسیارەش کە ئایا جگە لە وتاری ناوبراو (ئەی گەلی کوردان) بەرهەمی تری "سەعیدی کۆن" ماوە کە بە زمانی کوردی دایناییت؟ بە تایبەت کە یەکێك لە قوتابی‌یە دێرینەکانی بە ناوی "حەمزە موکسی" لەو نامیلکەیەیدا کە ژیانی مامۆستا نوورسیی تێدا نووسیوە، باس لەوە دەکات کە لە پێش جەنگی جیهانیی یەکەمدا مامۆستای ناوبراو وانەی تەفسیری قورئانی بە زمانی کوردی پێ وتوونەتەوە و، "مەلاحەبیب"ی قوتابیشی ئەو ڕاڤە "کوردی"یەی مامۆستا نوورسیی ڕاستەوخۆ نووسیوەتەوە؟

لە وەڵامدا دەڵێم: دوای سۆراخێکی زۆر، جگە لەو وتارە ناوبراوە هیچ بەرهەمێکی تری کوردیی مامۆستا نوورسیم دەست نەکەوت.

ئنجا بە مەبەستی دڵنیابوون لەم وەڵامە، هەمان پرسیارم لە بەڕێز مامۆستا "عەبدولقادر بادللی" کرد، کە نووسەرێکی خەڵکی باکووری کوردستان و، کەسێکی کوردپەروەرە و، قوتابیی خودی مامۆستا نوورسی‌یە و، جێی متمانەی مامۆستاکەی بووە و، بەشی زۆری شمەکە تایبەتەکانی نوورسی لای ئەو پارێزراون و، تەمەنی خۆی بۆ بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانی مامۆستاکەی و پاراستنی کەلەپووری ئەو تایبەت کردووە و، هەتا نووسینی ئەم چەند دێرەش لە ژیاندایە..

وەڵامی دامەوە کە:

"نووسینی مامۆستا بەدیعوززەمان بە زمانی کوردی هەر تەنها ئەو وتارەمان لە بەردەستدا هەیە کە چاپ کرابێت و لە فەوتان ڕزگاری بووبێت، لەگەڵ ئەوەشدا بیستوومە کە پێش جەنگی جیهانیی یەکەم کتێبی دەستنووسی هەبووە بە زمانی کوردی، نوسخەکەشی لە ماڵی تاهیر پاشای والیی (وان)دا پارێزراو بووە، بەڵام لە ڕووداوەکانی ئەو جەنگەدا لەناو کتێبخانەکەی والیی ناوبراودا سووتاوە. نووسینەوە کوردی‌یەکەی مەلا حەبیبیش بۆ وانەکانی مامۆستا نوورسی لە تەفسیری قورئاندا، لە ڕووداوەکانی جەنگی ناوبراودا تیاچووە و، ڕووسەکان فەوتاندوویانە".

پێم وایە خستنە ڕووی ئەم زانیاری‌یەش لێرەدا سوودی بۆ خوێنەران و توێژەران هەبێت:

لەم ساڵانەی دواییدا بەڵگەنامەیەك دۆزرایەوە كە بەرواری (١٩٠٩ز)ی لەسەرە.

ئەم بەڵگەنامەیە دەیسەلمێنێت كە مامۆستا نوورسی لەو مێژووەدا سەردانی ئیدارەی چاپ و بڵاوكردنەوەی سەر بە وەزارەتی ناوخۆی حكوومەتی "ئیتتیحاد و تەرەقی"ی كردووە، بە نیازی وەرگرتنی مۆڵەت بۆ دەركردنی ڕۆژنامەیەك بە ناوی: (مەعریفەت و ئیتتیحادی ئەكراد)ەوە، كە لە پێشدا حەفتەی جارێك و دواتریش ڕۆژانە دەربچێت و، باس لە (سیاسەتی شەرعی و، زانست و، كاروباری جۆراوجۆر) بكات، بە هەردوو زمانی "كوردی و توركی"!

بەڵام تا ئێستا ئەوە نەزانراوە كە ئایا مۆڵەتی ڕۆژنامەی ناوبراوی بەدەست هێنابێت؟ یان هیچ ژمارەیەكی لێ دەركردبێت؟

* * *

ڕێبازی ئێمە لە وەرگێڕانی كتێب و نامیلكەكانی ئەم بەرگەدا و، ئامادەكردنیان بۆ بڵاوبوونەوە بە زمانی كوردی، بە پێی چەند "هەنگاو"ێك بوو كە لەم دێڕانەی خوارەوەدا پێش چاویان دەخەین:

**هەنگاوی یەكەم:**

مامۆستای بەڕێز "ئیحسان قاسم صالحی" لە كتێبی (صيقل الإسلام)دا ئەو بەرهەم و ئاسەوارانەی مامۆستا نوورسیی كرد بە عەرەبی كە لە قۆناغی "**سەعیدی كۆن**"دا نووسیونی و بڵاوی كردوونەتەوە، بەڵام تەنها ئەو بەرهەمانەی كە خودی دانەر لە قۆناغی "**سەعیدی نوێ**" و دوا ساڵەكانی تەمەنیدا بە دەستكاری و پاكژكردنەوە بڵاوی كردبوونەوە.

ئێمە لە هەنگاوی یەكەمدا هەموو كتێب و نامیلكەكانی كۆمەڵە پەیامی (صيقل الاسلام)مان كرد بە كوردی، جگە لەو دوو كتێبەی كە لە زانستی "مەنتیق"دان.

ئنجا دوای وەرگێڕان و كاری پاكنووس و پیت ڕێز كردنی ئەم هەنگاوە، برای خۆشەویست و یارمەتیدەرم لەم خزمەتەدا مامۆستا (حسەین حەسەن كەریم) لە زانكۆی سلێمانی، بەراورد و پێداچوونەوەیەكی وردی لە كارەكانی ئەم قۆناغەدا بە ئەنجام گەیاند. ئێمەش تێبینییە بەنرخەكانی ئەو بەڕێزەمان بە هەند وەرگرت. خوا پاداشتی چاكەكارانی بداتەوە.

ئەمە هەنگاوی یەکەمی وەرگێڕانی ئەم بەرگەیە بۆ زمانی کوردی.

**هەنگاوی دووهەم:**

سوودمان لە چاپەکانی پێشووی ئەم ئاسەوارە دێرینانەی بەدیعوززەمان وەرگرت، کە فۆتۆکۆپیی زۆربەیانم لە لایە. چونکە هەندێ جار لە کاتی پێویستدا و بە نیازی دڵنیابوون لە هەر دەقێك کە جیاوازی لە چاپ یان لە وەرگێڕانەکانیدا هەبوبێت، گەڕاومەتەوە بۆ لای ئەو چاپە کۆنانە.

**هەنگاوی سێهەم:**

پاش ئەوانەی کە باسمان کردن، سوودێکی زۆرم لە کتێبی (آثار بديعيه) وەرگرت و، لە تەواوکردنی وەرگێڕانی ئەم بەرگەدا پشتم پێ بەست.

کتێبی ناوبراو کۆکراوەیەکە ئاسەوارە تورکی و عەرەبی‌یەکانی "**سەعیدی کۆن**"ی لەخۆ گرتووە، تەنانەت ئەوانەشیان کە دانەر لە قۆناغی "**سەعیدی نوێ**"دا بڵاوی نەکردوونەتەوە.

کاری کۆکردنەوەی ئەو بەرهەمە دێرینانەی مامۆستا نوورسی لە کتێبی ناوبراودا هەوڵێکی تایبەتیی خواستووە کە مامۆستای دیندار و کوردپەروەر (عەبدولقادر بادللی) لە باکووری کوردستان، وەك قوتابی‌یەکی بە ئەمەکی مامۆستا نوورسی ئەنجامی داوە و ڕەنجی لەگەڵدا کێشاوە. خوای گەورە بیخاتە ڕیزی کردەوە چاکەکانی.

لە پێشدا خۆم نوسخەیەکی چاپی دووهەمی کتێبی ناوبراوم لە لا بوو، پاشان "سەیدا عەبدولقادر"یش بۆ خۆی – ماڵی ئاوەدان بێت – نوسخەیەکی فۆتۆکۆپیی هەمان چاپی بۆ ناردم کە لە هەندێ شوێنیدا هەڵەگیری و ڕاستکردنەوەی تێدا ئەنجام داوە.

سوود وەرگرتنمان لە کتێبی ناوبراو، بۆ ئامادەکردنی ئەم بەرگە، لە دوو لایەنەوە بوو.

١- جگە لەوەی کە دەقی پێش پاکژکردن و دەستکاریی دانەر دەنوێنن، لە هەندێ شوێنی پەراوێزیشدا مامۆستا عەبدولقادر ئاماژەی بۆ جیاوازیی نوسخەکان کردووە، چاپکراو بن یان دەستنووس. جا لەبەر ئەوەی ئێمە دوا پاکژکاری‌یەکانی دانەرمان کردووە بە بناغەی کاری وەرگێڕانی ئەم بەرگە بۆ کوردی، جگە لە "مونازەرات" و

"بروانامەی هەردوو قوتابخانەی موسیبەت" کە دەقە کۆنەکەمان کرد بە بناغەی وەرگێڕانیان، ئەوا بۆ دەستنیشان کردنی جیاوازیی نوسخەی پاکژکراو لەگەڵ چاپەکانی پێشووتردا، سوودمان لەو کتێبە وەرگرتووە.

٢ – ئەو بەرهەمانەی کە لە وەرگێڕانە عەرەبییەکەی مامۆستا "ئیحسان"دا نەبوو، چونکە خودی دانەر لە دوا قۆناغی ژیانیدا سەرلەنوێ بڵاوی نەکردبوونەوە، ئێمە رامان هاتە سەر ئەوەی کە بە کوردی بڵاویان بکەینەوە، جگە لە (شعاعات معرفــة النبي ﷺ) کە هۆی بڵاونەکردنەوەیمان باس کرد. جا بۆ ئەو مەبەستە، سوودمان لە چاپە دێرینەکانی بەرهەمەکان و کتێبی (آثار بديعيه)ش وەرگرت، بە هاوکاریی ئەو سەرچاوانەی کە لە هەنگاوی داهاتوودا باسیان دەکەین.

**هەنگاوی چوارەم:**

دۆستی ئازیزم "سەیدا مەلا ئیبراهیم خەلیلی ئامەدی" لە باکووری کوردستان کتێبی (آثار بديعيــــه)ی وەرگێڕاوە بۆ زمانی کوردی (زاری کرمانجیی ژووروو). بەڕێزیان هەرچەند هێشتا وەرگێڕانەکەیان لە چاپ نەداوە، بەڵام فۆتۆکۆپیی دەستنووسەکەی بۆ ناردم، تاکو سوودی لێ وەربگرم.

لێرەدا هەروەك سوپاسی هەڵوێستی مەردانەی دەکەم، داواکارم لە خوای گەورە کە پاداشتی چاکەی بداتەوە و چاپکردنی ئەو بەرهەمەشی بۆ بڕەخسێنێت.

هەروەها هاوڕێی بەڕێزم جەنابی "کاك سەيید مەنسووری گەیلانی" لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان هەمان کتێبی وەرگێڕابوو بۆ زمانی فارسی و، جوامێرانە نوسخەیەکی دەستنووسی بۆ ناردم کە هێشتا بە تەواوی پاکژکاری تێدا نەکرابوو، بەڵام بۆ من جێی بایەخ بوو لە وەرگێڕانی ئەو سێ نامیلکەیەدا کە باسیان دێت. خوای گەورە پاداشتی چاکەکارانی بداتەوە.

ئیتر لە هەر سێ دەقی (تورکی، کرمانجیی ژووروو، فارسی)یەوە ئەم سێ نامیلکەیەی بەرهەمە کۆنەکانی نوورسیمان کرد بە کوردی (کرمانجیی خواروو) کە لە وەرگێڕانەکەی مامۆستا ئیحساندا نەبوون:

(گزنگەکان، ئاماژەکان، هێماکان).

بە هەمان جۆر ئەو نامیلکەیەش کە قوتابیی دێرینی مامۆستا نوورسی (حەمزە موکسی) لەسەر ژیانی مامۆستاکەی دایناوە، لەو سێ دەقەوە کردمان بەم کوردی‌یەی کە لەم بەرگەدا خوێنەری بەڕێز دەیبینێت.

**هەنگاوی پێنجەم:**

لە هەندێ شوێندا کە بە لامەوە پێویستی بە پەراوێز هەبوو، تێبینیم کرد نە دەقی تورکی‌یەکە و نە وەرگێڕانە عەرەبی‌یەکەش پەراوێزیان بۆ دانەنابوو. هاتم بە گوێرەی پێویست پەراوێزم بۆ دانا.

* * *

ئەوەی کە مابێت لەم پێشەکی‌یەدا باسی بکەم، پۆزش هێنانەوەم و داوای لێبوردنە لە خوێنەرانی ئازیزی بەرهەمەکانی مامۆستا نوورسی، لەسەر دواکەوتنی دەرچوونی ئەم بەرگەی بەردەستیان.

خۆ هەرچەندە دوای دەرچوونی بەرگی پێنجەم کارە سەرەکی‌یەکانی ئەم بەرگەمان تەواو کردبوو، بەڵام چاپ و بڵاوکردنەوەی ئەم بەرگە لە کاتی چاوەڕوانکراوی خۆی دواکەوت. بێگومان چەند هۆکارێکی جۆراوجۆر، لە دەرەوەی ویستی خۆمان، لە پشتی ئەم دواکەوتنەوە هەبوو..

هۆکاری سەرەکیی ئەم دواکەوتنە تایبەتمەندیی خودی ئەم بەرگەیە لەچاو بەرگەکانی تردا. چونکە وەك لە باسی هەنگاوەکانی ئامادەکردنیدا خستمانە ڕوو، تەقالا و ماندبوونێکی تایبەتیی خواست، زیاد لە کاری وەرگێڕان.

هۆکارێکی تر کەم وەختیی خۆم بوو. چونکە دوای ئەنجامدانی کاری ڕۆژانەم بۆ دابین کردنی گوزەران و بژێوی دنیا و، لەبەر هەڵکشانی تەمەن بەرەو لاوازیی پیری، پێویستم بە وچانێك دەبوو ماندووییم دەربکات. ئیتر کاتێکی ئەوتۆم بۆ نەدەمایەوە کە بتوانم بە خێرایی کارە وردەکانی ئەم بەرگە بگەیەنمە دوا قۆناغ.

هۆکارێکی دیکە هەیە کە لێرەدا بە پێویستی دەزانم بیخەمە ڕوو، چ وەك هۆیەکی دواکەوتنی چاپی ئەم بەرگە و، چ بۆ بەرچاوی مێژوو، بە مەبەستی ڕوونکردنەوەی ڕاستی‌یەك. هیوادارم خوێنەری بەڕێز بێزار نەکات و، وەکو خۆی وەری بگرێت:

پێش دەستکردن بە بڵاوکردنەوەی ئەم بەرگە گەورانە، لە سەرەتای ساڵەکانی هەشتای سەدەی پێشوو بە پشتیوانیی خوای گەورە دەستم دایە وەرگێڕانی ئەم پەیامانەی نوور بۆ زمانی کوردی و، پاشتر بڵاوکردنەوەیان لەسەر شێوەی نامیلکە و کتێبی مامناوەندی و بچووك، هەتا ژمارەیان گەیشتە "سی" دانە.

وەرگێڕان و بڵاوکردنەوەی ئەو کتێبە بچووکانە و ئەم بەرگە گەورانەش، شەرەفێکی گەورە و نیعمەتێکی مەزن بوو کە خوای گەورە - بە چاکە و میهرەبانیی خۆی - بە ئێمەی بەخشی. ئەم کارە لە ڕوویەکەوە بریتی بوو لە ناساندنی بەرهەمەکانی ئەم زانا گەورە و ناودارەی کورد بە گەلەکەی خۆی لە باشوور و خۆرهەڵاتی کوردستاندا. کەسێکی تر شك نابەم کە لە پێش ئێمەدا ئەم ئەرکە گەورە و قورسەی لە ئەستۆ گرتبێت.

شوکرانەی ئەم نیعمەتە مەزنەی خوای گەورە، ئەوەی دەخواست کە لەسەر ئەم خزمەتە بەردەوام بین و، سەرمایەی تەمەنی خۆمانی پێشکەش بکەین و، بەری ڕەنجیشمان - ئەگەر خوای گەورە بە میهرەبانیی خۆی وەری بگرێت - هەڵبگرین بۆ ئەودنیای هەمیشەیی..

بۆیە هەر لە چاپکردنی یەکەم بەرهەمەوە هەتا ئێستا - لەمەولایش بە پشتیوانیی خوای گەورە - تەنانەت یەك دیناریشم لە داهاتی ئەم بەرهەمانە بۆ خۆم هەڵنەگرتووە، بەڵکو ئەگەر قازانجێك لە کتێبێکدا بەدەست هاتبێت خستوومەتە سەر ئەو دەستمایەیەی کە بۆ چاپکردنیان دامناوە.

ئومێد دەکەم ئەم ڕەووشە یەکێك بووبێت لە هۆکارەکانی ئەو پیت و بەرەکەتەی کە بە ئاشکرا لە چاپکردنی یەك لە دوای یەکی ئەم بەرهەمانەدا هەستی پێ دەکرێت.

سەرقاڵ بوونم لەم ساڵانەی دواییدا بە بڵاوکردنەوەی بەرگە گەورەکان، هەلی چاپکردنەوەی نوێی ئەو کتێبانەی تری بۆ نەهێشتمەوە. لەولایشەوە داواکاریی خوێنەران لەسەر ئەو کتێبانە، بە تایبەت ئەوانەیان کە لە بازاڕدا نەمابوون، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیادی دەکرد. بۆیە لەم ماوەیەدا بەشێکی کاتە کەمەکانی خۆم تەرخان کرد بۆ

ئاوڕدانەوە لەو بەرهەمانە. ئیتر بە پشتیوانیی خوای گەورە زۆربەیانم بە چاپێکی نوێ و جوان خستەوە بەردەستی خوێنەران.

ئەمەش هۆکارێکی دیکەی دواکەوتنی چاپی ئەم بەرگە بوو!

ئەوەی لێرەدا پەیوەندیی بەم هۆکارەوە هەبێت و بمەوێت بیخەمە بەرچاوی مێژوو، لەو ڕووەوە کە بە پێویستم زانی لەم ماوەیەدا ئەو بەرهەمانەی تر لە چاپ بدەمەوە و، دەرچوونی ئەم بەرگەش دوا بکەوێت، بریتییە لەمەی خوارەوە:

نەمانی چاپی یەکەمی ئەو کتێبانەی تر لە کتێبخانەکاندا و، داواکاریی بەردەوامی خوێنەران لەسەر چاپکردنەوەیان، لە لایەن کەسێکی ناوبازارەوە بە شێوەیەکی ناشەرعی و نایاسی قۆزرایەوە. کەسێك جگە لە وەسفی "دزی ڕۆژی ڕۆشنا" و "حەرامخۆری – بەناو – فی سەبیلیللا" کاڵایەکی شیاوتر بە باڵای ڕەفتارەکانی شك نابەم. چونکە بە کرداری (Copy) و (Paste)ی بەشێکی ئەو بەرهەمانەم و، پاشان بڵاوکردنەوەیان بە ناوی خۆیەوە، بە بێ هیچ ئیزنێکی شەرعی و یاسایی من، ئەو پلە و پایە ناوبراوەی، لە بەرچاوی خوا و خەڵکیدا، بۆ خۆی هەڵبژارد.

خۆ هەرچەند دەبوو بەرەو دادگای بەرم و ڕووبەڕووی یاسای بکەمەوە، بەڵام هەوڵم دا شەرەفی "ئیمان بە خوا" و "تەقوای خوا" و "لێپرسینەوەی ڕۆژی دوایی" بهێنمەوە یادی، تاکو بە خۆیدا بڕواتەوە و، لەبەر دەسکەوتێکی حەرامی دنیا، لە دزییەکی ئاشکرادا کە تەنانەت منالێکی تازە خوێندەواریش هەستی پێ دەکات، قیامەتی خۆی وەکو دنیای لێ نەکات. بەڵام سەرجەم ئامۆژگارییەکانم بێ ئەنجام مانەوە و، هێزی کێشکەری چێژە درۆینە و حەرامەکان سەبارەت بەو لە بێدارکردنەوە ئیمانییەکان بەهێزتر بوو.

جا هەروەك ئەمە لێرەدا بۆ بەرچاوی مێژوو باس دەکەم، وەکو دوا بێدارکردنەوەش وریایی دەدەمێ کە ئەگەر بە خۆیدا نەڕواتەوە و دەستبەرداری ئەو دیاردە نەخوازراوە نەبێت، ئەوا چیتر وەکو ڕەفتاری پێشووم چاوی لێ ناپۆشم و، ناچاری ئامادەبوونی بەردەم یاسا و دادگای دەکەم، کە پێدەچێ تەنها زمانێك بێت لێی تێبگات.. چونکە لەبەر ئەوەی هەتا ماوەیەکی نزیکیش دەوروبەرەکەی جەوهەری ئەوی نەناسیبوو، ئەوا ناوی خزمەت بە ئایینی لەو دزییە ئاشکرایەی دەنا. ئێمەش لەو ماوەیەدا و لە لایەنی

خۆمانەوە تەنها ئەو ڕێگایەمان دەگرتەبەر، کـە هـەوڵی ورووژاندنـی شـەرەفی "ئیمـان" و "تەقوا" بوو لە ناخی ئەو کەسەدا، کە هەوڵێك بوو بێ ئاکام مایەوە.

هەر لەم ڕووەوە بە خوێنەری بەڕێز دەڵێم:

مرۆڤ، ئەگەر خوا پشتیوانی بێت، دەتوانێت لەبەر خوای گەورە لـەو کەسـە خـۆش ببێت کە (بە نەزانی) هەڵەی بەرامبەر دەکات..

بەڵام سوور بوون (بە زانینەوە) لەسەر هەڵەی دووپات بووی لـەم جـۆرە، بـە تایبـەت لە ژێر ناونیشانی "خزمەت بە ئایین"دا، هەموو چاوپۆشییەك لە کیسی خۆی دەدات.

مرۆڤ لەم چەشنە ڕووداوانەوە دەگاتە ئەو دڵنیاییەی کە تەنها "تەقوای ڕاستەقینە" و "حەیای ڕاستەقینە" لـە خـوای زانـای پەنهانـەکان (نـەك زمانلووسـی و لافـی ڕووکـەش) دەتوانێت مرۆڤ لە تاوان و کارە ناڕەواکان بگێڕێتەوە. خۆ ئەگەر کەسێك لەو ڕووەوە خوای گـەورە هیـچ ئـاوڕێکی میـهرەبانیی لـێ نەدابێتـەوە، ئەسـتەمە ئـایینیش وەکـو هـەر هۆکـارێکی دیکـەی گەیشـتن بـە ئامانجـەکان بەکارنـەهێنێت. ئەمـەش یەکێکـە لـەو دیاردانەی کە بیانووی بەجێی بۆ ئەوانە ڕەخساندووە دوژمنایەتیی نابەجێی ئـایینی پـاك و بێگەردی ئیسلام دەکەن!

هەروەها دەڵێم:

بە داخەوە ئـەم دیاردەیـە (واتـە دزینـی بەرهـەمی کەسـی تـر) چـەند جـارێك لـە چـەند کتێبێکی تری کوردیدا ڕوویداوە.

یەکێك لەوانە وەرگێڕانەکەی مامۆستا هەژارە بۆ چوارینەکانی خەیام..

مامۆستا هەژاری موکریانی – بەهەشت جێی بێت – لە پێشەکیی چاپەکەی دەزگای سرووشدا بۆ کتێبی ناوبراو، بـاس لـە دزینـی چـاپێکی ئـەو بەرهەمـەی دەکـات لـە لایـەن کاسبکارێکی لەو جۆرەوە. پاشان بەو بۆنەیـەوە ئەم بەسـەرهاتەمان بـۆ دەگێڕێتـەوە، کـە حیکمەتێکی "شێخی بورهان"[(١)]ی تێدایە، ڕەحمەتی خوای لـێ بێت.

---

(١) شێخی بورهان: نـاوی (شـێخ یووسـف سەمشـەدین)ە. سـاڵی (١٨٢٩ز) یـان (١٨٣٠ز) لـە "ماوەت" لـە دایك بووە. لە منداڵییەوە هەتا تەمەنی لاوی لە کـاری کشتوکاڵدا یارمـەتیی بـاوکی داوە. دوای ئەوە دەسـتی کردووە بە خوێندن لە حوجرەکاندا. دوای تەواوکردنی خوێندن لای شێخ عوسمان سیراجەدینی تەوێڵە – خوا پلەی بەرز بکات – تەریقەتی نەقشیی وەرگرتووە و، هەر لای ئەو ماوەتەوە هەتا ئیجـازەی ئیرشـادی بەدەسـت هێناوە. ئیتر بە فەرمانی مورشیدەکەی ڕۆشتووە بۆ ناوچەی موکریان و لە گوندی "بورهان"دا نیشتەجێ بووە.

مامۆستا هەژار دەگێڕێتەوە و دەڵێ:

"جارێك لەناو کۆمەڵێکدا سەید ڕەشیدی خانەقا گێڕایەوە: زەمانی شێخ (مەبەستی شێخی بورهان بوو) چەند کەس دزێکیان گرتبوو، دیواربڕێکیشی پێ بوو. هێنایانە خزمەت شێخی. گوتیان: قوربان ئەو دزە ئەو شەو خەریك بوو دزیت لێ بکا، لە ناخافڵ خۆمان پێدادا و گرتمان. شەو دەتەویلەمان کرد و ئێستاش ئەوە هێناومانەتە خزمەت تۆ. شێخ هێندێکی تەماشای دزەکە کرد و بزەی هاتێ و، پاشان فەرمووی: بەرەڵای بکەن با بڕوا. گوتم: قوربان جا چۆن دزێك بەرەڵابێ و دیواربڕیشی بە شاهید لەگەڵدا بێ؟!

شێخ ڕووی قسەی کردە جەماعەت و فەرمووی:

ئەگەر ئەنگۆ ... هونەرێکتان هەیە لەوە گەڕێن، بچن شێخ و خەلیفەکان، قازی و مەلاکانتان بگرن، کە زۆر لەو دزە دزترن! ڕدێن و بەرماڵ و عەبا و مێزەر و جبە و قەڵەمیان ماڵی موسڵمانان دەبڕێ، ئەنگۆ لە باتی بیانگرن دەچن دەستیان ماچ دەکەن و نوشتە و دوعاو بۆ دەنووسن. چوون ئەو فەقیرەو گرتووە ئاسنۆکێکی دوو بستی دە دەستیدایە لێتان کردۆتە شات و شووت و دەتانەوێ تەنبێی بکەم؟[1]"!

ئەم حیکمەتەی دانا و خواناسی کورد "شێخ یووسفی بورهان" ئەوە دەگەیەنێت کە کرداری دزیی بچووك، بە تایبەت ئەگەر برسێتی و موحتاجیی لە پشتەوە بێت، مرۆڤی جوامێر چاوپۆشیی لێ دەکات. تەنانەت ئەو شێخە دەست و دڵ پاکە بە کرداریش ئەم ئامۆژگاریی‌یەی پێش چاوی موریدانی خست..

بەڵام هەر کات ئایین و بەهاکان و مافە پارێزراوەکان وەکو پلیکانە بەکارهێنران بۆ گەیشتن بە ئامانجە ناڕەواکان، ئەوا تاوانبار هەلی لێبوردنی لەدەست دەچێت.

---

هەتا کۆتایی تەمەنی خزمەتی بە ئایینی ئیسلام و موسڵمانان کردووە. یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی بریتی بووە لەوەی کە بە کاری کشتوکاڵ و ڕەنجی شان، خەرجیی خۆی و خێزان و خانەقاکەی بەدەست هێناوە و، هیچ شتێکی لە کەس وەرنەگرتووە! ساڵی (١٩١٠ز) وەفاتی کردووە. بڕوانە: (تاریخ مشاهیر کرد، بابامردوخ روحانی. ٢/١١٤-١١٥، چ١ تاران، سروش، ١٣٦٦ك.هەتاوی).

(١) ئاشکرایە مەبەستی شێخی بورهان، ڕەحمەتی خوای لێ بێت، شێخ و مەلای ڕاستەقینە نییە، بەڵکو مەبەستی ئەوانەیە کە بە ڕەفتاری پێچەوانەی شەرع ناوی شێخ و مەلا ناشیرین دەکەن. دەنا شێخی بورهان بۆ خۆیشی هەم شێخە و هەم مەلایە!

هەزار ڕەحمەت لە ڕۆحی شێخی بورهان کە ئەم حیکمەتەی بە کردار بەرجەستە کرد و، لە مامۆستا هەژاریش کە لەسەر لاپەڕەی مێژوو بۆی هێشتینەوە.

* * *

ئێستاش لە کۆتایی ئەم پێشەکی‌یەدا، لە خوای گەورە و میهرەبان دەپاڕێمەوە و، لە خوێنەری بەڕێزیش تکاکارم کە هاونزام بێت و، ئامین بۆ دوعاکەم بکات.. دەڵێم:

خوایە گیان!

ئەگەر ئەم خزمەتەمان لە سنووری ڕەزامەندیی قودسیی تۆدایە، ئەوا بە فەزڵی خۆت یارمەتیمان بدە و پشتمان بگرە و، خوێنەرانیش سوودمەند بکە لێیان و، قبوولکردنی لای خۆتمان بۆ بنووسە لە دنیا و قیامەتدا.

خۆ ئەگەر لە بازنەی ڕەزامەندیی تۆدا نی‌یە و قبوولی خۆتیان ئاراستە نافەرمووی، ئەوا لەم کارانە دوورمان بخەرەوە و، لە خزمەتێکدا بمانخەرە کار کە سەرتاپا ڕەزامەندیی تۆی پەروەردگاری میهرەبان بێت. ئامین.

*فاروق ڕەسوول یەحیا*

سلێمانی - باشووری کوردستان

٢٠١٢/٣/١٢

# ئەم کۆمەڵە پەیامە

بە پێنووسی:
وەرگێڕ و لێکۆڵەری چاپە
عەرەبی‌یەکە
**مامۆستا ئیحسان قاسم صالحی**

الحمد لله رب العالمين، والصلاة والسلام على رسول الله ومن والاه.

پاشان..

دوای ئەوەی کە خوای گەورە بە چاکەی گشتی و پشتگیریی ڕەنگینی خۆی، تەواو کردنی وەرگێڕانی (سەرجەمی پەیامەکانی نوور) و بڵاوکردنەوەیانی لە حەوت بەرگدا پێ بەخشیین، پێم خۆش بوو سەردانی دانراوە کۆنەکانی مامۆستا نوورسی بکەم کە لە قۆناغی "سەعیدی کۆن"دا دایناون، واتە پێش دەست کردنی بە دانانی (پەیامەکانی نوور) لە ساڵی ١٩٢٧دا.

ئەمەش لەبەر ئەوەی کە ئەم پەیامە کۆنانە لە ڕوویەکەوە گرنگیی مێژوویی و لە ڕوویەکی ترەوە بەهای فیکریی خۆیان هەیە، وەك مامۆستای دانەر خۆی لە زۆر شوێنی نامەکانیدا، کە بۆ قوتابیانی نووری ناردوون، ئەو بێداری‌یەی داوە..

تەنانەت بەشێکی ئەم پەیامانەی تێهەڵکێشی باس و بابەتەکانی کتێبی "مێژووی ژیانی خۆی" کردووە. بگرە ئاماژەی داوە بە قوتابیانی کە هەندێ لەو بەرهەمە کۆنانە لە شێوەی گچکە کتێبی سەربەخۆدا بڵاو بکەنەوە، دوای ئەوەی کە سەرلەنوێ و لە ڕووناکیی پێوەرەکانی پەیامەکانی نوور و دەستوور و بناغەکانیدا چاوی پێدا گێڕانەوە و، ئەو پەیامانەی کە پەیوەندییان بە ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی‌یەوە هەیە هەڵەگیریی وردی تێدا ئەنجام دان و چەند بڕگەیەکی لێ لابردن و هەندێکی هێشتنەوە و، چەند ڕستەیەکی دیکەی بۆ زیاد کردن و هەندێکی تریشی لابرد.. ئەمە سەرەڕای دانانی چەند پەراوێزێك لە زۆر شوێندا بۆ ڕوونکردنەوەی واتا شارراوە و نادیارەکان..

واتە دانەر بە وردی و تەواوی ئەم پەیامانەی خۆی پوخت و ڕێك کردووەتەوە و، بۆ بڵاوبوونەوەی نوێ ئامادەی کردوون، بە جۆرێك کە زانایان و گشتینەی خەڵکیش سوودی لێ وەربگرن.

ئێمەش لە لایەنی خۆمانەوە و، لە دەمی وەرگێڕانی تورکییەکانیاندا بۆ عەرەبی، یان لێکۆڵینەوەی عەرەبییەکانیاندا، پشتمان بەم نوسخە ڕاستکراوە و پوختەکراوانەی دانەر بەست.

لە سەرەتا و کۆتاییشدا حەمد و سوپاس هەر بۆ خوای گەورەیە.

* * *

ئەم کۆمەڵە پەیامەی بەردەستت، ئەمانەی خوارەوە لەخۆ دەگرن:

١ - **"موحاکەمات"ی ژیری لە بوارەکانی تەفسیر و ڕەوانبێژی و باوەڕدا.**
کە دانەر ناوی "صيقل الإسلام" و "رجتة العلماء"یشی لێ ناوە.

٢- **قزل إيجاز:**

ئەم پەیامە پەراوێزی مامۆستا نوورسییە لەسەر: "السلم المنورق" کە لە لایەن "شيخ الإسلام عبد الرحمن الأخضـــــري"یەوە (ساڵی ٩٨٣ ك وەفاتی کردووە) لە زانستی مەنتیقدا هۆنراوەتەوە، هاودەم لەگەڵ شەرحی "مەلا عبد المجيد"ی (برای مامۆستا بەدیعوززەمان)دا (لەسەر پەراوێزەکان).

٣ - **(تعليقات على برهان الگلنبوي):**

ئەمیش پەیامێکی ترە لە زانستی مەنتیقدا و، بریتییە لە چەند پەراوێز و ڕاڤەکردنێکی مامۆستا نوورسی لە دەمی وانە وتنەوەی کتێبی "البرهان"دا، کە هی زانای لێکۆڵەر "ئیسماعیلی کوڕی مستەفای گولەنبەوی"یە، (ساڵی ١٢٠٥ك وەفاتی کردووە).

ئەم دوو پەیامەی کە لە زانستی مەنتیقدان، مامۆستا نوورسی خۆی بە زمانی عەرەبی دایناون و، جگە لە ڕێکخستنەوەیان من هیچ کارێکم تێدا ئەنجام نەداون، بەو هیوایەی کە خوای گەورە کەسێك بنێرێت ڕاڤە و ڕوونکردنەوەیان بۆ بکات، تاکو سوودیان گشتی بێت.

ئنجا ئەم سێ پەیامەی سەرەوە چەند دانراوێکی زانستین کە ڕووی گوفتاریان ئاراستەی زانایان، تەنانەت تایبەتمەندەکانیان کراوە..

بەڵام پاشماوەی پەیامەکانی تر نیشانە و شەقڵی زاڵ بەسەریانەوە ئەوەیە کە ڕووناکی ئاراستەی بارودۆخە کۆمەڵایەتی و سیاسی‌یەکان دەکەن لە ماوەی پێش یەکەم جەنگی جیهانیدا، واتە کاتێك دانراون کە دەوڵەتی عوسمانی لە دوارۆژەکانی دەسەڵاتیدا بە دەست گرفتەکانیەوە دەتلایەوە و، چەندین نەخۆشیی جۆراوجۆری تێدا بڵاو بووبووەوە..

لەبەر ئەوە، ئەم بەشەی کۆمەڵە پەیامەکە، دەرمانی ئەو دەردانە دەکات و، چارەسەری تێروتەسەل و شیفابەخشیان بۆ دادەنێت، لە هەمان کاتدا ئەو زامە قووڵانەش سارێژ دەکەن کە سەرانسەری نەتەوەی ئیسلام دووچاری بووبوون و، بە بێوەیترین هۆکار مەڵهەمی سارێژکار لەسەر ئەو زامانە دادەنێت.

واتە ئەم پەیامانە هێندە کۆنی ئەوتۆ نین کە کاتیان بەسەر چووبێت، بەڵکو چەندین وانەی کۆمەڵایەتی و تەرازووی سیاسیی ئەوتۆیان لەخۆ گرتووە کە بە تازەیی ترپە دەدەن و، تەڕ و پاراوییان لێ هەڵدەقوڵێت، چونکە چەند ڕاستی‌یەکی جێگیری دامەزراون.

ئەم پەیامانەش بریتین لەمانە:

**٤ – سنووحات.**

**٥ – مونازەرات.**

**٦ – دادگای عورفیی سەربازی:**

کە ئەمەیان بەرگریی مامۆستا نوورسی‌یە لە بەردەم دادگای عورفیی سەربازی لە سەردەمی ئیتیحادی‌یەکاندا و، ناوی "**بڕوانامەی هەردوو قوتابخانەی موسیبەت**"ی لێ ناوە. چونکە کاتێ مامۆستا نوورسی داوای چاکسازیی سیستمی خوێندن و کردنەوەی زانکۆیەکی لە خۆرهەڵاتی ئەنادۆڵ (کوردستان)دا بە ناوی "قوتابخانەی زەهراء" کرد، خستیانە نەخۆشخانەی شێتان و، دوای ئەوەش بەرەو دادگای سەربازی درایەبەر بە تۆمەتی داوای گەڕانەوەی شەریعەت. ئەوەبوو "خورشید پاشا"ی سەرۆکی دادگا ئاماژەی بۆ تەرمە هەڵواسراوەکانی سەر سێدارەکان کرد و، بە مامۆستا نوورسیی وت:

تۆیش داوای شەریعەت دەکەیت؟!

بەم جۆرە مامۆستا نوورسی "خەستەخانەی شێتان" بە یەکەم قوتابخانەی موسیبەت و، "بەندیخانە"ش بە دووهەمیان دادەنێت.

٧ - وتاری شام.
٨ - شەش هەنگاوەکان.

* * *

لە سەرەتای هەموو یەکێکی پەیامەکانی ئەم کۆمەڵەیەدا پێشەکییەکم سەبارەت بە "وەرگێڕان"ی یان "لێکۆڵینەوە"ی نووسیوە، لەگەڵ باسی گرنگیی پەیامەکە و هۆکاری دانانی.

ئەوەش هەیە کە ئەم کۆمەڵەیە هەموو دانراوەکانی "سەعیدی کۆن" لەخۆ ناگرێت، بەڵکو چەند پەیامێکی تریش هەن کە لە دەمی دانانیاندا بڵاوکراونەتەوە، بەڵام دانەر لە قۆناغی "سەعیدی نوێ"دا بڵاوی نەکردوونەتەوە، یاخود هیچ هۆکارێکی بۆ بڵاوکردنەوەیان بەدی نەکردووە. لەوانەیە لەبەر ئەوە بووبێت کە ناوەڕۆکەکانیان خراوەتە نێوان چەند پەیامێکی ترەوە.

ئەو پەیامانەش کە لەم قۆناغەی سەعیدی نوێدا بڵاوی نەکردوونەتەوە بریتین لە:
"طلوعات، إشارات، نُطق، رموز..."[١].

دەبێ ئەوەش بزانین کە بەشێکی تری دانراوەکانی "سەعیدی کۆن" سەربەخۆ - لە قۆناغی سەعیدی نوێدا - بڵاوی کردوونەتەوە، وەك "ئاماژەکانی ئیعجاز" و، "مەسنەویی نووری" هەروەها کتێبی: "چەند بریسکەیەك" کە لە پاشکۆی کۆمەڵە پەیامی "وتەکان"[٢]دا بڵاو کراوەتەوە.

دواجار ڕامان هاتە سەر ئەوەی کە ناوی یەکێ لە پەیامەکانی ئەم کۆمەڵەیە کە بریتییە لە "صيقل الإسلام" بخوازین بە ناونیشان بۆ هەموو کۆمەڵە پەیامەکە[٣].

لە خوای گەورە داواکارین کە نیازی جوان و، تێگەیشتنی ڕاست و، ڕاستیمان لە گوفتار و کرداردا پێ ببەخشێت.

---

(١) ئێمە لەم وەرگێڕانە کوردییەدا سەبارەت بە پەیامی "شعاعات معرفة النبي ﷺ"، هەمان ڕێبازمان گرتەبەر، لەبەر ئەو هۆیەی لە پێشەکیی ئەم وەرگێڕانە کوردییەدا ڕوونمان کردەوە. بەڵام پەیامەکانی ترمان (طلوعات، إشارات، نُطق، رموز) لەم بەرگەدا کرد بە کوردی. (وەرگێڕی کوردی)

(٢) لەبەر قەبارە گەورەیی چاپە کوردییەکەی (وتەکان) ئێمە ئەم پەیامەمان لە شوێنە ئەسڵییەکەی خۆی لە کۆمەڵە پەیامی (بریسکەکان)دا دانایەوە. (وەرگێڕی کوردی)

(٣) بەڵام ئێمە لەبەر ئەو هۆیەی کە لە تێبینیی سەرەتادا باسمان کرد وەرگێڕانە کوردییەکەی ئەم کتێبەمان ناونا: (داوەرییەکان). (وەرگێڕی کوردی)

بەرهەمی یەکەم:

# موحاکەمات

چەند داوەری‌یەکی ژیری‌یە لە: (تەفسیر و ڕەوانبێژی و باوەڕ)دا

یان:

« ڕەچەتەی زانایان »

ڕەچەتەیەکی پزیشکی‌یە بۆ:

چەرخێکی خەستە و، توخمێکی نەخۆش و، ئەندامێکی بیمار


بەدیعوززەمان

سەعیدی نوورسی

دایناوە

فارووق ڕەسووڵ یەحیا

کردوویە بە کوردی

# ناساندن

به پێنووسی:
زانای گەورە و مامۆستای بەڕێز:
دکتۆر عەبدولمەلیك سەعدی[1]

الحمد لله رب العالمين، والصلاة والسلام على سيد المرشدين، وعلى آله وأصحابه الهداة المهديين.

پاشان..

"ئیمامی نوورسی" لەوە بەناوبانگترە کە بناسێنرێت!

چونکە ئەو وشانەی کە لە ناوەکەیدا بەکار هاتوون، هەموویان لە زاتی ئەودا بەرجەستە بوون..

ئەوەتا بە ناوەکەی و ناوەرۆکی "سەعید"ە، واتە بەختەوەرە و.. "بەدیع"یشە، واتە ناوازەی ڕۆژگاری خۆیەتی لە جیهاد و خۆبەخت کردندا.. هەروەك "نوور"ە، واتە ڕووناکی‌یەکە لە باروودۆخێکی ئەوتۆی تورکیای ئیسلامیدا تیشکی درەخشایەوە کە زۆر پێویستی بە ڕووناکی‌یەکانی زیرەکی‌یە گەورە و ڕێنماییە ڕاستەکانی ئەو هەبوو..

---

(١) ناوی (عەبدولمەلیك کوڕی عەبدوڕڕەحمان کوڕی ئەسعەد سەعدی)یە. یەکێکە لە گەورە زانایانی عێراق و شارەزا لە هەر چوار مەزهەبەکەدا. سالی (١٩٣٧ز) لە شاری (هیت) لە دایك بووە. قۆناغەکانی خوێندنی لای زانا بەناوبانگەکانی ناوچەکەی تەواو کردووە، هەتا بڕوانامەی زانستیی بەدەست هێناوە. بڕوانامەی بەکالۆریۆسی سالی (١٩٧١) و ماجستێری لە سالی (١٩٧٤) لە بەغدا بەدەست هێناوە. پاشان بڕوانامەی دوکتۆرای لە زانکۆی (أم القرى)ی مەککەی پیرۆز لە سالی (١٩٨٤) وەرگرتووە.
جگە لە ئەرکی وتاربێژی و وانە وتنەوە لە ئاستە بلندەکاندا و، موناقەشە و سەرپەرشتیی چەندین نامەی ماجستێر و دوکتۆرا و، دەیان نووسین و توێژینەوی زانستی، لە چەندین کۆنگرەی جیهانیدا بەشداریی کردووە، هەروەك ئەندامە لە چەندەها ئەنجومەنی زانستیی جیهانیدا. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە پێگەی تایبەت بە خۆی لەم لینکەدا: http://www.alomah-alwasat.com/ (وەرگێڕ)

"نوورسی"م لـە نـاوەندی سـەروەتە زانسـتی‌یەکەیەوە بـە: زانایـەکی هەڵکەوتـە و، ڕابـەرێکی ڕێنیشـاندەر و، ئامۆژگـارێکی کاریگـەر و، موجـاهیدێکی کۆڵنـەدەر و، خۆڕاگرێکی توندوتۆڵ لەسەر سەختی‌یەکانی ژیان و، نووسەرێکی کارامە، ناسیوە..

ئـاخر چۆن وا نی‌یـە.. لـە کـاتێکدا هـەر ئـەو بـوو کـە ژیـانی لـە نێـوان بـەندی و دوورخستنەوە و، ڕۆژگارەکانیشی لە نێوان گوشار و چەوسانەوەدا بەسەر برد..

هەر ئەو بوو کە کتێبخانە زانستی‌یەکانی بە نووسین و پەیامەکانی خۆی ڕازاندەوە..

"نوورسـی" لـە بـارودۆخێکدا هـات وەك بلێسـی چـاوەڕوانیی ئـەوی دەکـرد، تـاکو چاکسـازی لـە بـوارە تێکچووەکـاندا بکـات و، هەرشـتێکیش نـەوی کرابـوو بـەرزی بکاتەوە..

"نوورسی" و جیهادەکەی یەکێکن لە ئاماژەکانی:

﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ﴾ (الحجر: ٩)..

هەروەك هەواڵێکن لە نێـوان هەواڵـەکانی هەتاهەتایـەتیی "پـەیامی محەممـەدی" لەسـەر زەویی خوای گەورەدا.

ئەم زانایـە لـە چـەرخێکدا دەرکـەوت کـە "کوفـر" سـەری تێدا بەرز کردبووەوە و، ئەستۆکانی "گومڕاکـردن"یـش ملیـان دەرکێشـابوو، تـاکو ڕوانینـە ژەهراوی‌یـەکانیان ئاراستەی دەوڵـەتێك بکـەن کـە بناغەیـەکی دێرینـی لـە شارسـتانێتیی ئیسـلامدا هەیـە و، خاوەنی ڕۆڵێکی کارایش بووە لە جێگیر کردنی ستوونەکانی باوەڕ لە وڵاتی ئەنادۆڵدا.

"نوورسی" بـە وێنـەی قارەمـانێکی ئـازا و خۆڕاگـر و، وەك شێرێکی بەهەڵمـەت لـە بـەردەم پێشـەوایان و بانگەشـەچییانی "سـێکیولاریزم"ی ئـەو وڵاتـە ڕاوەسـتا و، بـە بەڵگەکانی و، بە نووسین و مونازەرەکانی بـەردێکی دەرخـواردی دەموپلـە بۆگەنـەکانی ئەو بانگەشەچییانە دا کە بێ پەردە چەنەی تانەیان لـە ئیسلام و زمانی قورئان لـێ دەدا و، تۆمەتی کۆنەپەرستی و دواکەوتنیان دەدایە پاڵ.

ئەم پێشەوایە ڕچەی سوننەتێکی جوانی لە تورکیای موسڵماندا شـکاند کـە خـۆی و هەر کەسێکیش تا ڕۆژی قیامەت کاری پێ بکـات دەبنـە خـاوەنی پاداشـتی، چونکـە لـە بەرامبەر "خراپە"دا ئەو "چاکە"ی نواند و، کێشەی هزری بـە هـزر چارەسـەر کـرد. ئیـتر بانگەوازەکەی لەو کاتەوە و هەتا ئێستاش دوای وەفاتی خۆی "باوەڕ" لە دەروونی گەلی

تور کیادا دەڕوێنێت و، هیممەتیان دەبزوێنێت و، پشکۆی ئیمان لە دڵیاندا دەگەشێنێتەوە هەرکات خراپکاران بیانەوێت بیکوژێننەوە.

بزووتنەوەکەی ئەم پێشەوایەش تەنها لە گەلی موسلمانی تورکیادا نەمایەوە، بەلکو بە جیهاندا بلاوەی کرد و، ناوبانگی ڕۆشت هەتا گەیشتە هەموو شوێنێکی دنیا و، لەگەلْ خۆیدا هیوا و مژدەی بۆ ئیمانداران هەلگرت. ئەوانیش دلنیا بوون لەوەی کە گەلێك بزووتنەوەیەکی وەك ئەوەی نوورسیی تێدا پایەدار و نەمر بێت، شایانی ئەوەیە ئامانجەکانی بێنەدی لە درێژەدان بەو ڕێگایەی کە پێشەوا ئەوانی لەسەر دانا.

ئەم پێشەنگە مەزن و چاکسازە ئیلهام کراوە، بۆ درێژەدان بەو ڕێبازە، چەندین شوێنکەوتەی بۆ ڕەخسا کە ئەو مەشخەڵەی بە دەستی ئەوان دایگیرساند، لەناوخۆ و دەرەوەی تورکیادا هەلیبگرن، هەتا ئالای ئیسلام لە سەرانسەری ولاتی "فاتیح"دا هەلدەکەن.

خوای گەورە چەندین مەردی دلسۆز (بە پەروەردگار و ئایین و باوەڕ)ی بۆ بلاوکردنەوە و وەرگێڕانی نووسینەکانی ڕەخساند، یەکێك لەوانە برای ئازیز مامۆستا "ئیحسان قاسم صالحی"یە، کە گەلێ بەرهەمی ئەوی بۆ زمانی عەرەبی وەرگێڕا و بازاڕەکانی عێراق و کتێبخانەکانی زانایانی بەو بەرهەمانە پڕ کردەوە. دەسا خوای گەورە لە بریی دانەر و موسلمانان بە چاکە پاداشتی بداتەوە و، پیت بخاتە ڕەنج و تەقالاکانیەوە.

هەر مامۆستا "صالحی"ش بوو کە پێشنیازی بۆ کردم چاوەکانم بە خوێندنەوەی یەکێك لە کتێبەکانی ئەم بانگخوازە مەزنە شەرەفمەند بکەم و، پێلووەکانیشم بە کلی ئەو حیکمەتە زۆر و زانیارییە فراوان و زانستە لەڕادەبەدەرە بڕێژم، ئەویش کتێبی "محاكمات عقلية" بوو.

منیش دوای ئەوەی پەڕەکانیم هەلدایەوە و، چاوم بە ناو دێڕ و لاکانیدا گێڕا و، ئاگاداری گەوهەری ناو گەنجینەکانی بووم، بینیم کتێبێکە زانیاریگەلێکی ئەوتۆی لەخۆ گرتووە کە لای زانایان و زانست دۆستان کێشی تایبەتی و، لە لای کەسانی نرخشناس و خاوەن فەزلیش بەهای خۆیان هەیە..

بەڵام بینیم مامۆستا - خوا لێی خۆش بێت - لە شێوازی نووسینی "ئەم کتێبە"دا کاریگەریی ڕەوانبێژییانەی چەند ڕەوانبێژێکی وەك (سەککاکی و تەفتازانی و جورجانی) و جگە لەوانیشی لەسەرە، چونکە دیاردەی تەماوی بوون بەسەر شێوازەکەیەوەیە و نیشانەکانی ئاڵۆزییش بە دەستەواژەکانیەوە دەردەکەوێت. لەگەڵ ئەوەشدا ئاراستەیەکی ڕۆحیی وردی گرتووەتەبەر و، تەحەددای گەلێ دوژمنی "باوەڕ"ی کردووە. هاوکات لەگەڵ پێشکەش کردنی ڕێنمایی و ئامۆژگاری و بەرچاو ڕۆشنیدا، کە ئەمەش خوێنەر لە ناونیشانی بابەتەکە دوور دەخاتەوە.

لەبەر ئەوە..

بڕیاری من سەبارەت بەم کتێبە ئەوەیە کە:

کتێبێکی زانستیی توندوتۆڵە. نەك کتێبێکی ڕۆشنبیریی گشتی کە هەرکەسێك زەمینەیەکی ئیسلامیی هەبێت بە ئاسانی بەهرەی لێ وەربگرێت. بەڵکو پسپۆڕانی ئەم بابەتە سوودی لێ دەبینن و، بەشی گشتینەی خەڵکیی تێدا نییە.

لەگەڵ ئەوەشدا کتێبخانەی ئیسلامی بە زمانی عەرەبی پێویستی بە هێنانەدەرەوەی ئەم کتێبەیە لە نەبوونەوە بۆ بوون، تاکو لەگەڵ دانراوەکانی تری دانەر و، دانراوەکانی دیکەش کە لە بەهرە وسەلیقەی دانەران و پیاوانی هزر و بیری هەڵکەوتووی ئەم نەتەوەیەوە هەڵقوڵاون، جێی خۆی بگرێت.

ئەوپەڕی ڕێز و پێزانینم هەیە بۆ ئەو برایانەی کەلەپووری ئەم مەردە مەزنە بڵاو دەکەنەوە، لەگەڵ دوعای سەرکەوتندا بۆیان لە لایەن خواوەندی بەرز و بەتواناوە. هەروەك داوای بەزەیی و ڕازی بوونیش لە بەخشندەی میهرەبان دەکەم بۆ ئەم کەڵە زانایەی نەوەکانی ئوممەتی محەممەد ﷺ .

**دکتۆر عەبدولمەلیك سەعدی**

# وتەیەك بۆ خوێنەری بەڕێز

نووسینی مامۆستا:
**ئیحسان قاسم صالحی**

الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله ومن والاه.

پاشان..

مامۆستا "بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی" ئەم دانراوەی خۆی ناوناوە "رجتة العلماء" (واتە: ڕەچەتەی زانایان). چونکە هەستی دەکرد زانایان، بە تایبەت زانایانی سەردەمەکەی، پێویستیان بە وەرگرتنی ئەو چارەسەرییانە هەیە کە ئەم کتێبە لەخۆی گرتوون.

ئەم دانراوەشی بە زمانی تورکی نووسی، پاشان هەر بۆ خۆی وەری گێڕا بۆ زمانی عەرەبی، کە زمانی زانستە لە لای زانایان[1]. بەڵام ئەوەی کە لە تورکی‌یەکەدا بە درێژی لێی دوابوو، لەم وەرگێڕانەدا بە ڕادەیەك کورتی کردەوە کە دەقە عەرەبی‌یەکە مەگەر بۆ زانایان دەنا تەماوی و داخراو دەبینرا. ئەمەش ناچاری کرد کە لە سەرەتای چاپی یەکەمی وەرگێڕانە عەرەبی‌یەکەدا ئەمەی خوارەوە بنووسێت:

(دەبێ لە خوێندنەوەیدا پەلە نەکەیت و، هەر شتێکیشت نەزانی پرسیار لە زانایان بکەیت. هەروەها دەستبەرداری هاوڕێ تورکی‌یەکەی مەبە، چونکە شوێنە نادیارەکانی ئەمی ڕاڤە کردووە و، لە زاری تێگەیشتنی گشتینەی خەڵکەوە نزیکی خستوونەتەوە).

لە کۆتایی ئەو بێدارکردنەوەیەشدا، ئەمەی دووپات کردووەتەوە کە:

(هاوڕێ تورکی‌یەکەی بکە بە هاودەمت، کە درێژەی بە کورتەی ئێرە داوە).

---

(١) لە مامۆستای عەبدولقادر بادللیم بیست کە مامۆستا نوورسی وەك دانراوێکی سەربەخۆ عەرەبی‌یەکەی ئەم کتێبەی داناوە، نەك ئەوەی لە تورکی‌یەوە وەری گێڕابێت. واتە دوو دانراوی سەربەخۆی دانەرن بە دوو زمانی جیا، هەرچەندەش ناوەرۆکیان هەر یەکێکە. (وەرگێڕی کوردی)

هەروەها دەبینین کاتێ مامۆستا نوورسی کرا بە ئەندامی "دار الحكمة الاسـلامية"ی سەر بە مەشیەخەتی ئیسلامی لە دەوڵەتی عوسمانیدا، ناوی ئەم کتێبەی لە لیستی کتێبە تورکییەکانیدا، لە تۆمارگەی دەزگای ناوبراودا نووسیوە.

بەو واتایەی کە کتێبەکەی لە بناغەدا بە زمانی تورکی داناوە، پاشان هەر خۆی لە چەند دەستەواژەیەکی یەکجار پوختی زمانی عەرەبیدا بە کورتی داپڕشتووەتەوە.

لەمەوە دەگەمە دەرەنجامی ئەوەی کە:

ئەو هۆیەی بۆ وەرگێڕان و لێکۆڵینەوەی ئەم کتێبە هانی دام و، بە وەرگێڕانەکەی دانەر دەستبەردار نەبووم، تەماوی و ناڕوونیی لەڕادەبەدەری دەقە عەرەبییەکە بوو کە جگە لە زانایان، تێگەیشتنی لە لایەن خوێنەری ترەوە کارێکی ئەستەمە، کەچی دانراوە تورکییەکەی ئەم کتێبە، زانایان و زۆرێك لە بایەخدەران و ڕۆشنبیرانیش سوودی لێ وەردەگرن.

هۆکارێکی گرنگتری ئەوەی کە بۆ وەرگێڕان و لێکۆڵینەوەی ئەم کتێبە هانی دام، ئەوەبوو کاتێ خوای گەورەی بەتوانا بە لێکۆڵینەوەی ئاسەوارە عەرەبییەکانی مامۆستا نوورسی، واتە: "مەسنەویی عەرەبیی نووری" پاشان "ئاماژەکانی ئیعجاز" و "وتاری شام" دەستی بەخششی خۆی لەسەر دانام، بینیم ئەوەش ئەرکی سەرشانمە کە ئەم کتێبە بە شێوازێك پێشکەش بە خوێنەری بەڕێز بکەم لێی تێبگات، چونکە دانەر ئەم کتێبەی بە پێشەکییەك داناوە بۆ تەفسیرە بەنرخەکەی: "إشارات الإعجاز في مظان الإيجاز".

سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە کە یارمەتیی دام و پشتی گرتم.. فەزڵ و چاکەی سەرەتا و کۆتاییش هەر هی ئەوە.

ئەم کتێبە – لە خۆیدا – گرنگییەکی زۆر لەخۆ دەگرێت بۆ ئەوانەی کە بایەخ بە هزری ئیسلامی و زانستە ئیسلامییەکان دەدەن. چونکە هەموو ئەو شتانە دەخاتە ڕوو کە بە زەینی زانایانی ئەو دەمەدا دەهاتن و، لە کتێبە بەردەستەکانی تەفسیری ئەو سەردەمەدا (کۆتایی دەوڵەتی عوسمانی) مایەی قسە و لێدوان بوون. جگە لەوەی کە ئەو پێوەر و دەستوورانەی دانەر خستوونیەتە بەردەست بۆ ڕاستکردنەوەی ئەو چەمکانەی

کە نامۆن و خزاونەتە ناو کتێبەکانی بەردەستی زانایان، هێشتا تازەیی و پاراوی و ڕاستەقینەیی خۆیان پاراستووە. لەوانەیە هەر ئەمەش هۆکاری ئەوە بووبێت کە دانەر ئەم کتێبە ناو بنێت: "محاكمات عقلية أو صيقل الإسلام" بەو هیوایەی کە شمشێری ئیسلامی پێ دەمەزەرد بکاتەوە و چڵك و ژەنگەکانی لەسەر لاببات.

ڕێبازم لە وەرگێڕان و لێکۆڵینەوەیدا ئەمەی خوارەوە بوو:

**یەکەم:**

وەرگێڕانی ئەو دەقە تورکی‌یەی کە دەزگای پەخشی "سۆزلەر" لە ئەستەمبوڵ ساڵی ١٩٧٧ز چاپی کردووە، لەگەڵ پشت بەستندا بە نوسخەیەك لە چاپی یەکەم کە ساڵی ١٣٢٧ڕۆمی - ١٩١١ز لە چاپخانەی "أبو الضياء" لە ئەستەمبوڵ چاپ کراوە.

ئەم نوسخەیە هەڵەگیریی خودی دانەری لەسەرە و، برایانی کارمەندی دەزگای "سۆزلەر" خستیانە بەردەستم خوا پاداشتیان بداتەوە.

**دووهەم:**

بەرامبەر کردنی وەرگێڕانەکەم، دوای لێبوونەوە لێی، لەگەڵ وەرگێڕانە پوختەکەی دانەردا، چ هی چاپی یەکەمی کە لە ژێر ناوی "رحتة العلماء"دا بلاو کراوەتەوە. چ هی چاپی دووهەمیشی کە ساڵی ١٩٥٨ز لە چاپخانەی "نوور"ی ئەنقەرە لە ناوەندی کتێبی "الصيقل الاسلامي"دا پەخش بووە.

**سێهەم:**

وەرگرتنی هەندێ دەستەواژەی عەرەبیی دانەر لە وەرگێڕانە عەرەبی‌یەکەی خۆی.

**چوارەم:**

سەروبۆر دانان بۆ ئایەتە پیرۆزەکان و، دیاری کردنی شوێنیان لە سوورەتەکاندا.

**پێنجەم:**

تەخریجی فەرموودە پیرۆزەکان، بە هاوکاریی برای بەڕێز "فەلاح عەبدوڕڕەحمان".

**شەشەم:**

نووسینی چەند پەراوێزێك بۆ لێکدانەوەی هەندێ لەو زاراوە زانستی‌یانەی کە لە کتێبەکەدا بەکارهاتوون.

حەوتەم:

هەر لە پەراوێزەکاندا پوختە پێناسەیەکم بۆ ژیانی هەندێ لەو نووسەرانە داناوە کە لە کتێبەکەدا ناویان هاتووە، هەروەها بۆ دانراوەکانیشیان، لەوانەی کە لای خوێنەر زۆر ناسراو نین، لەگەڵ پشتگوێ خستنی ئەوانەی ناوبانگیان لای خوێنەر هەیە[1].

دوای ئەوەی کە بە فەزڵی خوای گەورە کارەکە هاتە ئەنجام، حەزم دەکرد یەکێك لە زانا بەڕێزەکان بەم وەرگێڕان و لێکۆڵینەوەیەمدا بڕواتەوە، بەشکو بەرەو باشتر ڕێنماییم بکات. ویستی خوای گەورە وابوو کە ئەو زانایە مامۆستای گەورە و زانای بەتوانا "دکتۆر عەبدولمەلیك سەعدی" بێت..

ئەوەبوو هەر هێندەی ئەم بیرۆکەیەم بۆ پێشنیاز کرد، یەکسەر پێخۆشحاڵیی دەربڕی و، بە خۆنەویستی‌یەکی زۆرەوە وەری گرت. ئیتر بە خوێندنەوەی کەسێکی زانای وردەکار کتێبەکەی خوێندەوە و، بۆ چەند خاڵێك وریایی پێ دام کە من لێیان بێ ئاگا بووم. هەروەك چەند پەراوێزێکی بۆ نووسی کە لە داوێنیاندا ناوی خۆیم داناوە. پاشان بە نووسینی پێشەکی‌یەکی بەنرخ و سوودبەخش - بە ئیزنی خوا - تاجە گوڵینەی لەسەر تەقالا و ڕەنجم دانا.

خوای گەورە لە بریی ئێمە جوانترین پاداشتی بەڕێزیان بداتەوە.

لە خوای گەورە داواکارین کە نیازی جوان و، تێگەیشتنی ڕاست و، ڕاستیمان لە گوفتار و کرداردا پێ ببەخشێت.

**ئیحسان قاسم صالحی**

(١) لەم وەرگێرانە کوردی‌یەدا بە شێوەیەکی تێروتەسەلتر ژیانی ئەو کەسایەتییانەمان لە پەراوێزدا نووسیوە، تەنانەت ئەوانەش کە لە عەرەبی‌یەکەدا نەبوون. (وەرگێڕی کوردی)

بسم الله الرحمن الرحيم

وبه نستعين وبالله التوفيق

سڵاو بۆ ئەو فەرمانڕەوا دانا و میهرەبانەی کە بوونی بەردەوامی هەیە و، نرخ و بەرزیی بەهۆی ئیسلامەوە پێ بەخشیوین و.. بە شەریعەتە خاوێنەکەشی ڕێنمایی ڕێی ڕاستی کردین. ئەو شەریعەتەی کە عەقڵ و نەقڵ پێکەوە ڕاستی‌یە نەگۆڕە دامەزراوەکانی پشت ڕاست دەکەنەوە.. کە شەریعەتێکە ڕەگی بەناو قووڵایی زەویی حەقیقەتدا ڕۆچووە و، بە ئاسمانی کەماڵاتدا پەلەکانی هاویشتووە و، بەروبوومەکانیشی بەختەوەریی هەردوو دنیایان هەڵگرتووە..

ئەو خوایەی کە بە قورئانی خاوەن "ئیعجازی بەیان"ی خۆی ڕێی حەقی ئاشکرا و ڕوونی پیشان داین، کە قورئانێکە بە دەستوورەکانی لەمەڕ کتێبی جیهان، ئەو یاسا قووڵانەی ڕوون کردووەتەوە کە بە دەستی قەدەر بەڕێ دەخرێن و، بە قەڵەمی حیکمەتیش لەسەر لاپەڕەی بوونەوەر دەنووسرێن و، بە بڕیارە دادگەرەکانیشی پێشکەوتنی ئادەمیزاد و بەرزیی سیستەمەکەی و وردیی ڕێکی(اتزان)ەکەی دەهێنێتەدی. ئیتر لە ڕاستیدا بوو بە ڕابەر و ڕێ پیشاندەرێکی خەڵکی بۆ ڕاستە شەقام.

سڵاواتی بەردەوام بۆ سەر پێغەمبەری گەورەی هەردوو جیهان ﷺ، ئەو گەورەیەی کە جیهان بە هەموو جۆر و ڕەگەزەکانی شایەتی لەسەر پێغەمبەرایەتیی دەدات و بەڵگەیە لەسەر موعجیزاتی، کە بانگهێشتی خەڵکی دەکات بۆ لای ئەو گەنجینە مەزن و گەوهەرە یەکجار گەورانەی کە لەگەڵ خۆیدا هێناویەتی. تەنانەت دەڵێی هەریەك لەو

جۆرانە – بە زمانی تایبەتیی خۆی – بەخێرهاتنی ئەو سەروەرە دەکات. هەروەك پادشای ئەزەل سەرجەم ژێیەکانی ئاسمان و زەوی دەخاتە گوفتار، هەریەك لەو ژێیانەش بە زمانی ئاوازی موعجیزەکانی، سروود دەڵێت. ئیتر زایەڵەی ئەو دەنگە جوانە هەتا ئەبەد و هەتا ئەم گومەزە شینە مابێت دەزرنگێتەوە..

ئەوەتا:

"ئاسمان" بە زمانی میعراج و مانگ و مەلائیکەتی، پیرۆزبایی لە پەیامەکەی دەکات..

"زەوی" بە زمانی دار و بەرد و گیانداری، شانازی بە موعجیزاتیەوە دەردەبڕێت..

"بەرزایی" ئاسمان بە جینییەکانی، مژدەی پێغەمبەریتیی ئەو ڕادەگەیەنێت و.. هەورەکانیشی دەیپارێزێ و سێبەری لەسەر دادەنێت..

"ڕابوردوو" لە ڕێی تەسدیقی پێغەمبەران – درووديان لەسەر بێت – و، ئامـاژەی کتێبەکان و، هێمای کاهینەکانی، مژدەی سپێدەی ڕاستی ئەو چـرا ڕووناکی بەخشەی گەیاند..

کـاتی "ئێسـتا"ش – مەبەسـتم باشـترین سـەردەم سـەدەی بەختـەوەریی پێغەمبەرێتییەکەیەتی – بە زمانی حاڵ شایەتی سەلماندنی پێغەمبەرێتیی ئەوە، بەهۆی ئەو ئاڵوگۆڕە مەزنەی کە لە سروشتی عەرەبەکاندا هێنایە کایەوە و، بە یەکجار لە دەشتەکێتییەکی تەواوەتییەوە ئەوانی بۆ شارستانێتییەکی سەرانسەری گۆڕی..

"داهاتوو"ش بە زمانی "دانایی" سوپاسی ڕێنماییەکانی دەکات و، بە ڕووداوەکانی و لێکۆڵینەوەکانیشی بەرەو پیریی کاروانی بە فەڕ و پیرۆزی ئەو دەڕوات..

سەرانسەری "گرۆی مرۆڤ"یش لە ڕێی زانایان و لێکۆڵەرانیەوە، بە تایبەت ئەوانەی گوێ بیستی فەرمایشتەکانی ئەو خۆشەویستەن بە زمانی شیرین و گوفتاری ڕەوانی، هەموویان شایەتی دەدەن کە ئەو پێغەمبەرە ﷺ لە لایەن خوای گەورەوە ڕەوانە کراوە، ئەو خۆشەویستەی کە وەکو خۆر وایە؛ بۆ خۆی ڕووناکە و ڕووناکیش بە غەیری خۆی دەبەخشێت..

"خوای گەورە"ش، بە زمانی قورئانی حەکیم، پێغەمبەرێتیی ئەو ڕادەگەیەنێت و دەیخاتە پێش چاوان تاکو بخوێنرێتەوە..

جملە شیران جهان بستەء این سلسلە اند

روبە از حیلە چسان بگسلد این سلسلەرا[١]

پاشان:

ئەم نوورسی‌یە هەژار و غەریبەی کە شایانی ئەوەیە ناوی "بیدعەتوززەمان"ی لێ بنرێت، کەچی - بە ناڕەزایی خۆی - ناوبانگی "بەدیعوززەمان"ی دەرکردووە، ئاگر لە هەناوی بەربووە بۆ دواکەوتنی ئەم نەتەوەیە و، هاوار دەکات و دەڵێت: ئاخ.. ئاخ.. بەداخەوە کە خەڵەتاین و، کاکڵە و گەوهەری ئیسلامان پشتگوێ خست و، ڕوانینی خۆمان ترنجاندە ڕواڵەت و توێکڵەکەی.

هەروەها بە جۆرێکی هەڵە و بە شێوەیەکی بێ کەڵك لەم ئیسلامە تێگەیشتین، لە ئەنجامدا ڕەفتاری بەد و لە ئەدەب بەدەرمان نواند بەرامبەری و، دەستەوسان بووین لەوەدا کە مافی تەواوی خۆی بدەینێ و، ئەو ڕێزەی شایانیەتی بۆی دەربڕین، هەتا مەیلی بەلاماندا نەما و، لێمان دوور کەوتەوە و، لە پشتی هەوری گومان و ئەندێشەکانی ئێمەوە خۆی لێ شاردینەوە.. حەقیشیەتی؛ چونکە "ئیسرائیلیات"مان لە جێی بناغە و بنچینەکانی دانا و، حیکایەت و چیرۆکمان خستە ناو "بیروباوەڕ"ەکەی و، مەجاز و حەقیقەتەکەیمان تێکەڵ بە یەکتری کرد.. بەم جۆرە مافی خۆیمان پێ نەدا، ئەویش بە زەلیلی و ڕسوایی دنیا سزای داین. هیچ چارەیەکیشمان نی‌یە، هانا بردن نەبێت بۆ سایەی سۆز و میهرەبانیی ئەو.

ئەی برایانی موسڵمان!

دەسا با بڕۆین پۆزشی بۆ بهێنینەوە، تاکو لێمان ڕازی بێت و، پێکەوە دەستی هاوڕێیەتیی بۆ درێژ بکەین، تاکو بەیعەتی پێ بدەین و دەستمان لە دەستاوێزی توندوتۆڵی ئەو گیر بکەین.

وا من، بێ پەروا و بێ هیچ دوو دڵی‌یەك، ڕایدەگەیەنم کە:

---

(١) ئەم بەیتە شیعرە هی (مەولانای جامی)یە و، چەند جارێك ئیمامی ڕەببانی لە مەکتووباتەکەیدا بۆ نموونە هێناویەتەوە و، مامۆستا "نوورسی"ش لەوی وەرگرتووە. واتە:

سەرانسەر شێرانی جیهان پابەندی ئەم زنجیرەیەن ڕێوی بە فێڵ چۆن دەتوانێ ئەم زنجیرە بقرتێنێ

بڕوانە: (نفحات الانس)ی مەولانای جامی، ل (٤١٣) چاپی (کتابفروشی سعدی). (وەرگێڕ)

ئەو شتەی هانی دام برۆمە زۆرانبازی لەگەڵ بیر و هزری چەرخەکانی پێشین و.. بەرەنگاری ئەو گومان و ئەندێشانە ببمەوە کە سەدان ساڵە کەڵەکە و بەهێز بوون، تەنها باوەڕ و یەقینی دامەزراومە بەوەی کە:

"حەق" بە وێنەی تۆوی ڕوێنراوی سەوز گەشە دەکات، هەرچەندەش لە ژێر گڵدا خۆی شاردبێتەوە.. "حەقخوازان"یش سەردەکەون، هەرچەندەش کەم بن و بەهۆی ستەمی بارودۆخەکانەوە لاواز بووبن!

باوەڕیشم وایە کە:

هەر تەنها "ڕاستیی ئیسلام" بەسەر کیشوەرەکانی جیهاندا زاڵ و فەرمانڕەوا دەبێت.

بەڵێ، تەنها هەر ئیسلامە کە لە داهاتوویەکی نزیکدا لەسەر تەختی ڕاستی‌یەکان و زانستەکان دادەنیشێت، چونکە جگە لە ئیسلام هیچ شتێك ئەو ڕاستی و زانستانە دەرناخات و داخراوەکانیش ناکاتەوە.. نیشانەکان ئاوا پیشان دەدەن..

چونکە لە سەردەمی ڕابوردوودا هەشت هۆکار هەبوون کە ڕێگر بوون لەوەی "شەریعەتی خاوێن" بە تەواوی زاڵ بێت لە بیابانی ترسناکی ئەوێ و سەردەمی ئەو نەزانی‌یەی کە دەمارگیریی نەفرەت لێکراو پادشای سەر تەختی بوو، چاولێکەرییش خۆی سەپاندبوو، لە وڵاتی نەزانی‌یەکدا کە شتانی بێ نرخ و ئیستیبدادی بێزراو خێوەتیان لەسەر هەڵدا بوو..

بەڵێ، ئەو دەمە هەشت هۆکاری ڕێگر هەبوون کە نەیاندەهێشت شەریعەت بە تەواوی بەسەر "ڕابوردوو"دا زاڵ بێت. هەر ئەو ڕێگرانە بوون، کە تا ئێستاش، سێ ڕاستی‌یان داپۆشیوە.. هەر ئەو ڕێگرانەشن کە بوون بەهۆی گیرانی خۆری ئیسلام.

ڕێگرەکانی لەمەڕ بیانی‌یەکان بریتین لە:

چاولێکەری.. نەزانی.. دەمارگیری.. زاڵبوونی قەشەکان بەسەریاندا.

ڕێگرەکانی لای خۆشمان بریتین لە:

ئیستبدادی جۆراوجۆر.. بەدڕەوشتی.. بارودۆخە پشێوەکان و، ئەو نائومێدی‌یەش کە بێ‌کاری و دەست بەتاڵی بەرهەم دەهێنێت.

هەشتەم ڕێگر، کە لە هەموویان گرنگترە و بەڵایەکی داباریوە بەسەرماندا: گومان بردنی ئەندێشەیی و ناحەقی ئێمە و بیانی‌یەکانیشە کە گوایا ناسازی‌یەك لە نێوان هەندێ ڕواڵەتی ئیسلام و هەندێ بابەتی زانستیدا هەبێت!

دەسا ئافەرین بۆ تەقالای بلاوبوونەوەی ڕیژنەی زانیاری‌یەکان و، دەستخۆشی لە ماندووبوونی زانستە بەغیرەتەکان کە پشتی لیکۆلینەوە و بەدواداگەڕانی ڕاستی‌یەکانیان گرت و، هیز و وزەیان بەبەر مرۆڤایەتیدا کرد و، حەزی بەکارهینانی ویژدانیان لە گرۆی ئادەمیزاددا چاند و، "ڕاستی‌یەکان"یان بە کەرەسە و تفاقی جەنگ و بە مەبەستی دوورخستنەوەی ڕیگرەکان پڕ چەك کرد، تا لەناویان بردن و لەمەولاش بە تەواوی نایانهیلن.

بەلی، گەورەترین هۆکاری ئەوەی کە حەوانەوەی دنیای لە ئیمە گرتەوە و، بیانی‌یەکانیشی لە بەختەوەریی ئەودنیا بی بەش کرد و، پەردەی بەسەر ڕووی خۆری ئیسلامدا هینا و، بوو بەهۆی گیرانی ئەو خۆرە، تەنها بەد تیگەیشتن و گومان بردنی ناسازی و نەگونجاویی ئیسلام بووە لەگەل ڕاستی‌یەکانی زانستدا.

گەلی سەیرە!! ئاخر چۆن بەندە دەبیتە دوژمنی گەورەکەی و، خزمەتگوزاریش دەبیتە نەیاری سەرۆکی خۆی و، منال چۆن لە باوکی خۆی هەلدەگەڕیتەوە؟! خۆ ئیسلام سەروەر و ڕابەری هەموو زانینەکان و، سەرۆك و باوکی سەرجەم زانستە ڕاستەقینەکانە!

بەلام – بە داخەوە – ئەم تیگەیشتنە نارەوا و هەلەیە تا ئیستاش فەرمانی خۆی ڕایی دەکات! ئەوەتا گومانەکانی خۆی دەهاویتە ناو دەروونەکان و، دەرگای شارستانیتی و زانیاریی لە ڕووی کوردەکان و هاوشیوەیان داخستووە. ئیتر سامیان لە گومانی بوونی نەگونجاویی نیوان چەند ڕوالەتیکی ئایین و چەند بابەتیکی زانستی لی نیشت.

بۆ نموونە: خڕیی زەوی، کە یەکەم پلەیە لە پلەکانی جوگرافیا، کە ئەویش یەکەم مەنزلی زانستەکانە و، بابەتیکی بەدیهی و بەلگەنەویستە، ئەوان لەو گومانەدا بوون کە دژ و پیچەوانەی ئەو شەش مەسەلەیە بیت کە لەمەولا باسیان دەکەین و، شەرم و شکۆیان لەوە نەکردووە کە سەرپیچی و سەرسەختیی تیدا بنوینن!

دەسا ئەی ئەو کەسەی بە وردی سەیری ئەم کتیبە دەکات!

بزانە ئەو خزمەتەی کە دەمەوی لە ڕیی ئەم کتیبەوە پیشکەشی بکەم، بریتی‌یە لە:

بەرپەرچدانەوەی گومان و دوودلی‌یەکانی دوژمنانی ئایین، کە مافی شایان و تەواو بە ئیسلام نادەن. ئەوەش لە ڕیی دەرخستنی ئەو شەقامە ڕاستەی کە ئایینی ئیسلامی لەسەرە..

هەروەها بەرەنگار بوونەوەی وەهم و گومانەکانی ئەو توندڕەوانەی کە شەیدای ڕواڵەتی ئیسلام بوون، نەك ڕاستی و ناوەرۆکەکەی، لەوانەی کە شایستەی نازناوی "هاوڕێی گەوج"ن. ئەوەش لە ڕێی ڕوونکردنەوەی ڕوویەکی تری ئەو ڕاستە شەقامە..

هەروەها بە نیازی پشتگیری و یارمەتیدانی زانایانی بەوەفا و ڕاست و هۆشمەندی ئیسلام کە ڕابەری ڕەسەن و ڕاستەقینەن، لەوانەی کە لە پێناوی پیشاندانی ئەم ڕاستە شەقامەدا تێدەکۆشن و، هیوای تەواوەتییان بە سەرکەوتن هەیە و، ڕێگا بۆ داهاتووی گەشی جیهانی ئیسلام خۆش دەکەن.

**پوختەی ئەم قسانە:**

ئامانجی من لە نووسینی ئەم کتێبە: لەزاخاودان و دەمەزەردکردنەوەی ئەو شمشێرە ئەلماسەیە..

ئەگەر دەپرسیت:

جا ئەم پەشۆکاوی و نیگەرانییەی بۆ چییە و، چ سوودێك لە هێنانەوەی بەڵگەکاندا هەیە لەسەر ئەو شتانەی کە وەك زانستە ئاشکرا و زانراوەکانیان لێ هاتووە؟ خۆ ئەو باس و بابەتانەی کە لە ئەنجامی "بە دوای یەکدا هاتنی بیر و هزرەکان" و دەرخستنی ئەزموونەکانەوە بەدەست هاتوون، هێندە ڕوون و ئاشکران کە بوون بە شتانێکی بەڵگەنەویست. کەواتە بەڵگە بۆ هێنانەوەیان وەکو ڕاگەیاندنی شتی "زانراو" وایە؟!

لەوەڵامدا دەڵێم:

هاوچەرخەکانم - بە داخەوە - هەرچەندە نەوەی سەدەی سیازدەهەمی کۆچین، بەڵام لە ڕووی هزر و بیر و پێشکەوتنەوە دەڵێی پێڕست و نموونە و ئاوێتەیەکی تێکەڵ و پێکەڵی چەرخەکانی پێشوون، هەر لە سەدەی سێ‌هەمەوە هەتا سەدەی سیازدەهەمی کۆچی، بە ڕادەیەك کە زۆر شتی بەڵگەنەویستی ئەم ڕۆژگارە لای ئەوان هێشتا تەماوی و نەزانراوە!

* * *

# پێشەکی

ئەم کتێبە لەسەر سێ وتار و سێ کتێب دامەزراوە:

**وتاری یەکەم:** لە توخمی (حەقیقەت) دەدوێ، یاخود لەبارەی ساف و خاوێن کردنەوەی ئیسلام، لە ڕێی هێنانی چەند پێشەکییەك و خستنە ڕووی چەند مەسەلەیەك.

**وتاری دووهەم:** توخمی (ڕەوانبێژی) دەردەخات.

**وتاری سێهەم:** توخمی (باوەڕ) ڕوون دەکاتەوە، هاودەم لەگەڵ وەڵامە ژاپۆنییەکاندا[1].

بەڵام کتێبەکان، لێکۆڵینەوەیەکی زانستی و جۆرە تەفسیرێك دەبن بۆ ئەوەی کە قورئان لە زانستی ئاسمان و زانستی زەوی و زانستی مرۆڤ ئاماژەی بۆ کردوون[2].

(١) سالی (١٩٠٧ز) واتە لە کۆتایی حوکمی سولتان عەبدولحەمیدی دووهەمدا سەرکردەی گشتیی سوپای ژاپۆن هاتبوو بۆ سەردانی ئەستەمبووڵ و، کۆمەڵێك پرسیاری ئایینیی ئاراستەی دەزگای "مەشیەختی ئیسلامی"ی دەولەتی عوسمانی کردبوو. ئەوانیش ئەو پرسیارانە و گەلێ پرسیاری تریان ڕووبەڕووی مامۆستا نوورسی کردەوە، کە ئەو دەمە لە ئەستەمبووڵ بوو. هەندێ لەو وەڵامانەی کە تایبەتن بە "باوەڕ"ەوە لە وتاری سێهەمی ئەم کتێبەدا هێناوە و، ئەو وەڵامانەش کە تایبەتن بە دەجاڵ و نیشانەکانی قیامەت لە تیشکی پێنجەمی کتێبی (تیشکەکان)دا داناوە. (وەرگێڕ)

(٢) دانەر بواری بۆ نەڕەخسا کە ئەو سێ کتێبە دابنێت، بەڵکو لە گەرمەی یەکەم جەنگی جیهانیدا دەستی دایە نووسینی تەفسیرەکەی: (ئاماژەکانی ئیعجاز) کە تەنانەت ئەویشی تەواو نەکرد. ئەوەبوو خوای گەورەی بەتوانا بۆ دانانی (پەیامەکانی نوور) ئاراستەی کرد، لە پێناوی ڕزگارکردنی ئیمانی ئیمانداراندا. (وەرگێڕ)

# وتاری یەکەم

# توخمی حەقیقەت

## چەند پێشەکی و مەسەلەیەك

هەندێ لە دەستوورەکانی زانایانی لێکۆڵەر پشت بەستنە بە چەند پێشەکی‌یەك، بە نیازی گەیشتن بە ئامانجەکان. وا ئێمەش بەو مەبەستە پەیژەیەکی دوازدە پلیکانەیی دادەنێین.

## پێشەکیی یەکەم

یەکێك لە دەستوورە چەسپاوەکان ئەوەیە کە:

ئەگەر لە هەر شتێکدا عەقڵ و نەقڵ پێکەوە نەسازان، عەقڵ دادەنرێت بە بناغە لەو بابەتەدا و، نەقڵەکەش بەو پێیە تەئویل دەکرێت، بەڵام دەبێ ئەو عەقڵە بە ڕاستی "عەقڵ" بێت[1]!

هەروەها ئەوەش چەسپاوە کە:

ئامانجە بنەڕەتی‌یەکانی قورئان و توخمە سەرەکی‌یەکانی کە بە هەموو لایەکیدا بڵاو بوونەتەوە، چوار دانەن: سەلماندنی بەدیهێنەری تاك و تەنیا.. پێغەمبەریتی.. زیندوو کردنەوەی جیسمانی.. دادگەری.

واتە: هەر تەنها قورئانە وەڵامی ئەو پرسیارانەی لە ئەستۆ گرتووە کە حیکمەت (واتە فەلسەفە) ئاراستەی بوونەوەراتی دەکات کە: ئایا لە کوێوە هاتوون؟ بە فەرمانی کێ هاتن؟ کێ پادشا و ڕابەر و گوتاربێژتانە؟ چی دەکەن؟ بۆ کوێ دەڕۆن؟

---

(١) دانەری کتێبی (الحصون الحميديـــة) کە مامۆستا نوورسی لە نووسینەکانیدا ئاماژەی پێ دەدات، لەم بارەیەوە دەڵێت:

(هەموو دەقێکی شەرعی دەبێ ئەو واتا ئاشکرایەی لێ بدەینەوە کە بە ڕواڵەت لێی وەردەگیرێت و، نابێ تەئویل بکرێت بۆ واتایەکی تری جگە لەوەی کە ڕاستەوخۆ دەیدات بە دەستەوە، مەگەر "بەڵگەی عەقلی" بێگومان هەبێت لەسەر واتایەکی تری جیاواز لە واتا ڕواڵەتی‌یەکەی. ئەو کاتەش بوونی بەڵگە عەقلی‌یەکە نیشانەیە لەسەر ئەوەی کە واتا ڕواڵەتی‌یەکە مەبەستی دانەری شەرع نی‌یە و مەبەستی شتێکی ترە. ئیتر لە کاتێکی وادا دەقەکە تەئویل دەکرێت و، واتایەکی تری لێ دەدرێتەوە کە بۆی دەست بدات و دژی ئەو بەڵگە عەقلی‌یە نەبێت. ئەمەش دەستوورێکی گشتی‌یە لە دەقە شەرعی‌یەکاندا پیادە دەکرێت و، هەموو ئەهلی سوننەت وجەماعەت لەسەری دەڕۆن). بڕوانە: (الحصون الحميديـــة) دانراوی: حسين الجسر، ص: ١٥٧-١٥٨ نشر: المكتبة التجارية الكبرى، مصر ١٣٥١هـ/١٩٣٢م.

کتێبی (أدب الدنيا والدين)ی "ماوەردی"ش ئەم دەقەی تێدایە:

(وجعلَ ما تعبَّدهم به من عقل متبوع وشرع مسموع. فالعقل متبوع فيما لا يمنع منه الشـــرع، والشـــرع مسموع فيما لا يمنع منه العقل، لأن الشرع لا يَرِدُ بما يمنع منه العقل، والعقل لا يُتَّبَعُ فيما يمنع منه الشـــرع. فلذلك توجَّهَ التكليفُ إلى مَن كملَ عقله). بڕوانە سەرچاوەی ناوبراو ص: ٦٩، چاپی (المطبعـــة الأميريـــة، القاهرة، ١٣٤٤هـ/١٩٢٥م) یان ص: ٧٠ چاپی (دار الكتب العلمية، بيروت، ١٤٠٧هـ/١٩٨٧م). (وەرگێڕ)

لەبەر ئەوە، باسی بوونەوەران لە قورئاندا - جگە لە ئامانجە بنەڕەتی‌یەکان - زیادە باسکردنێکی لاوەکی‌یە بۆ ڕوونکردنەوەی ڕێی بەڵگە هێنانەوە بە "ڕێکوپێکیی بەدیهاتووان" لەسەر بوونی "بەدیهێنەری شکۆمەند".

بەڵێ، ڕێکوپێکی لە بەدیهاتوواندا دەبینرێت، تەنانەت بە ڕوونی خۆی پێش چاو دەخات. کەواتە سنعەتی ڕێکوپێك شایەتێکی ڕاست و بێ گومانە لەسەر بوونی بەدیهێنەر و لەسەر ویست و مەبەستی لە داهێناندا. چونکە ئەو شایەتی‌یە لە هەموو لا و شوێنێکی گەردووندا دەبینرێت و دەدرەوشێتەوە و، جوانیی بەدیهێنان دەخاتە پێش چاوی دانست، تەنانەت دەڵێی هەر بەدیهاتوویەك زمانێکە تەسبیحاتی خۆی بە دەرخستنی حیکمەتی بەدیهێنەرەکەی دەردەبڕێ و، هەر "جۆر"ێکیش لە جۆرەکانی بەدیهاتووان شایەتی دەدات و بە پەنجەکانی ئاماژە بۆ دانایی بەدیهێنەری دەکات.

جا مادەم مەبەست لە بەدیهاتوواندا ئەمەیە و، مادەم ئێمە لە کتێبی بوونەوەراندا فێری ئەو هێما و ئاماژانە دەبین کە بەڵگەن لەسەر ڕێکوپێکی و، هەموو ئەنجامەکانیش هەر یەکێکن، ئەوا پێکهاتنی بوونەوەران لە زاتی خۆیاندا هەر چۆنێك بێت ئەرکی ئێمە نی‌یە، چونکە پەیوەندیی پێمانەوە نی‌یە.

بەڵام هەموو یەکێك لە تاکەکانی بوونەوەران، کە هاتوونەتە ناو ئەم ئەنجومەنە قورئانی‌یە بەرزەوە، چوار کارمەندی و ئەرکی خراوەتە ئەستۆ:

یەکەم: ڕاگەیاندنی گەورەیی بەدیهێنەری شکۆمەند، لە ڕێی ڕێکوپێکیی خۆی و یەکگرتنی لەگەڵ غەیری خۆیدا.

دووهەم: دەرخستنی ئەوەی کە ئیسلام پوختەی زانستە ڕاستەقینەکانە، چونکە هەریەك لە تاکەکانی بوونەوەران بابەت و کورتەی یەکێکە لە زانستە ڕاستەقینەکان.

سێهەم: چەسپاندنی هاوڕێکیی ئیسلام لەگەڵ ئەو یاسا خواییانەی کە لە جیهاندا کار دەکەن، تاکو ئیسلام بە پشتگیریی ئەو یاسا خواییانەی سروشت گەشە بکات، چونکە هەر یەك لە تاك و دانەکانی بوونەوەران نموونەی "جۆرێك"ە[1].

---

(١) بۆ ڕوونبوونەوەی واتای ئەم زاراوانە، پێویستە بزانین کە: هەموو زیندەوەران بە یەك ڕەگەز(جنس) دادەنرێن، بەڵام ئەم ڕەگەزەش بەسەر چەند جۆر(نوع)ێکدا دابەش دەبن، وەك: مرۆڤ و، باڵندە و،

بەڵێ، ئایینی ڕوونی ئیسلام بەم تایبەتمەندی‌یە لە ئایینەکانی تر جیا دەبێتەوە، کە لە نێوان هەوا و هەوەس و ئارەزووەکاندا دێن و دەچن! چونکە هیچ بنج و ڕەگێکی پشتگیر و یارمەتیدەریان نی‌یە؛ تاوێ دادەگیرسێن و تاوێکی تر دەکوژێنەوە و، بە خێرایی ئالوگۆڕیان بەسەردا دێت.

چوارەم: ئاراستە کردنی بیر و هزرەکانە بەرەو ڕاستیی شتەکان و هاندانیان و بێدار کردنەوەیانە بۆ ئەمە. چونکە هەریەك لەو بوونەوەرانە نموونەیە بۆ یەکێك لە ڕاستی‌یەکان.

بۆ نموونە:

سوێند خواردن لە قورئاندا بە قەبارە و بارستاییە بەرز و نزمەکان تەنها و هەمیشە بۆ بێدارکردنەوەی بێ ئاگایانە و هاندانیانە بۆ بیرکردنەوە. کەواتە سوێندەکانی قورئان گۆچان وەشاندنە لەوانەی کە لە خەوی بێ ئاگاییدا نوقم بوون!

جا ئەوەی کە ئێستا بە دڵنیاییەوە سەلماوە، ئەمەی خوارەوەیە:

قورئانی پیرۆز کە ئیعجاز بەخشە و، لە بەرزترین و بڵندترین پلەی ڕەوانبێژیدایە، بێ هیچ گومانێك ڕوونترین و ڕاست ترین و کورت ترین ڕێگای بەڵگەهێنانەوە و گونجاوترینیان لەگەڵ شێوازەکانی دەربڕین لە زمانی عەرەبیدا دەگرێتەبەر. واتە هەست و نەستی عەوامەکان ڕەچاو دەکات، بە مەبەستی تێگەیاندن و ڕێنماییان. بە واتایەکی تر: بەڵگە لەسەر مەبەستەکەی دەهێنێتەوە، کە بریتی‌یە لە ڕێکوپێکیی گەردوون، بە شێوەیەك ئەوان لێی تێبگەن و شارەزای بن و لەگەڵ ڕاهاتنی ژیریان تەبا بێت.. دەنا بە پێچەوانەی ئەمە، بەڵگە کە لەو بابەتە پەنهانتر دەبێت کە جێی باسە. دیارە ئەوەش دژی ڕێگاکانی ڕێنمایی و ڕێبازی ڕەوانبێژی و ڕێچکەی ئیعجازە.

بۆ نموونە، ئەگەر قورئان بیوتایە:

(خەڵکینە! بڕوانن کە چۆن گۆی زەوی بە جەزبە و مەستی لەناو بۆشایی ئاسماندا دەڕوات و دەفڕێت و.. بیر لە خۆر بکەنەوە کە هاودەم لەگەڵ جووڵانیشیدا جێگیرە و..

---

خشۆك و...هتد. ئنجا هەر یەك لەم جۆرانەش لە چەند تاك(فرد)ێك پێکهاتوون. کەواتە: ئازاد و، نەوزاد و، شێرزاد و...هتد، چەند "تاك"ێکی "جۆر"ی مرۆڤن، کە ئەویش لە "ڕەگەز"ی زیندەوەرانە. وەك لە زانستی مەنتیقدا ئەم واتا و زاراوانە ڕوون کراونەتەوە، کە دانەر لەو ڕەهەندەوە ئەم چەشنە پۆلێنانە دەکات. (وەرگێڕ)

سەرنج لە تەن و قەبارە بەرزەکان بدەن کە بەهۆی کێشی گشتییەوە پەیوەستی یەکترن و.. لە توخمە زۆر و زەبەندەکان ڕامێنن کە بە چەند پەیوەندییەکی کیمیایی پێکەوە گرێ دراون لە درەختی بوونەوەراندا، کە ئەویش لقەکانی بە حەوا و بۆشایی بێ سنووردا پەلیان هاویشتووە.. بیر لە هەموو ئەمانە بکەنەوە، تاکو لە گەورەیی بەدیهێنەریان تێبگەن)!!

یان بیوتایە:

(بە وردبینی ژێریتان سەیری دلۆپێك ئاو بکەن کە جیهانێك لە زیندەوەران لەخۆ دەگرێت، تاکو بزانن کە چۆن خوای گەورە توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە)!!

ئەگەر قورئان ئەمەی بوتایە، ئایا بەڵگەکەی پەنهانتر و تەماوی تر نەدەبوو لە مەبەستەکەی؟!

ئایا بەڵگەکەش پێویستی بە ڕوونکردنەوە نەدەبوو؟!

ئایا کارەکەی نەدەبوو بە ڕوونکردنەوەی حەقیقەت بە شتێکی تاریك لای ئەوان؟

یان ئەو کاتە شتێکی دوور لە ژیرییان نەدەخرایە ئەستۆ بەوەی کە بەهەڵەدا دەبران سەبارەت بە شتانی بەڵگەنەویستی هەست و نەستیان؟!

ئیعجازی قورئان بەرزتر و خاوێنترە لەوەی کە تۆز و گەردی "تێکدانی تێگەیشتنی خەڵکی" بەر چمکی پاك و درەخشانی بکەوێت.

قورئانی پیرۆز لەناو پێچاوپێچ و توێی ئایەتەکانیدا ئاماژەی بە ئامانجی ڕاستەقینەی خۆی داوە. هەروەك هەندێ ڕواڵەتی ئایەتەکانی کردووە بە ڕێنما و ڕێ پیشاندەر بۆ ئامانجەکەی.

هەروەها یەکێکی تر لە دەستوور و بناغە بڕیاردراوەکان ئەوەیە کە: ئەو شتانەی بە "کینایە" و هاوشێوەکانی وتراون، ڕاست و درۆ، یان پشت ڕاستکردنەوە و بەدرۆ خستنەوە، ڕوو ناکاتە شێوەی واتاکەیان. واتە - وەك لە زانستی ڕەوانکاری (بەیان)دا ڕوون کراوەتەوە - ڕوو ناکاتە واتا یەکەمەکانیان، بەڵکو ڕوویان لەو ئامانج و مەبەستەیە کە لە پێناویدا هێنراون، بە واتایەکی تر: ڕوو دەکاتە واتاکانی پلەی دووهەم. وەك ئەوەی کە ئەگەر بە کەسێك وترا: "طويل النجاد" (واتە کێلانی شمشێرەکەی

دریژه) ئەوا بڕیارە کە دروستە و قسەکەش ڕاستە گەر ئەو کەسە بالاّ بەرز بێت، تەنانەت گەر شمشێریشی نەبێت.

جا هەروەك لەناو گوفتارێکدا تەنها یەك وشە دەبێتە نیشانە(قرینـة)ی مەجاز لە خواستن(إستعارة)دا[1]، بە هەمان شێوە، چەند ئایەتێکی قورئانی پیرۆز - وەك بلێی لە گوفتاری خوادا یەك وشەن - دەبن بە نیشانە لەسەر ڕاستی و گەوهەری دەستە خوشکانی تریان و، تەرجومان و، ڕێ نیشاندەر و، بەلگە بۆ ئەو نهێنییانەی کە لە دڵ و دەروونی دراوسێکانیدایە!

**ئەنجامی ئەم قسانە:**

گەر کەسێك ئەم ڕاستییە لە پێش چاوی خۆی دانەنێت و، لە بەراوردکردنی ئایەتەکاندا دەستەوسان بێت و، نەتوانێت بڕیارێکی دادپەروەرانە لە نێوانیاندا دەربکات، وەکو ئەو "بەکتاشی"[2]یەی لێ دێت کە بۆ پاساودانەوەی وازهێنانی لە نوێژ، وتبووی: قورئان دەفەرموێ: ﴿لا تَقْرَبُوا الصـلاةَ﴾ (النساء:٤٣) بەلاّم دوای ئەمە ئایەتەکەم لەبەر نییە!

جا ئایا ئەمە لە بەرچاوی حەقیقەتدا نابێتە مایەی گاڵتەجاڕی؟!

* * *

---

(١) واتە: ئەو قەرینەیەی کە لە "مەجاز" و "ئیستیعارە"دا - کە ئەویش جۆرێکی مەجازە - دەبێت بە نیشانە و بەلگە لەسەر ئەوەی کە واتا ئەسلییەکە مەبەست نییە و، واتا مەجازییەکەی مەبەستە. (وەرگێڕ)

(٢) مەبەست لە "بەکتاشی" شوێنکەوتووانی تەریقەتی "بەکتاشی"یە، کە یەکەم جار لەسەر چەند بناغەیەکی ڕاست و دروست دامەزرابوو، بەلاّم دوایی لە ڕێ ترازا و، شوێنکەوتووانی بۆ "نوێژ نەکردن" و "ڕۆژوونەگرتن" و "ئارەق خواردنەوە" بە نموونە دەهێنرێنەوە! (وەرگێڕ)

## پێشەکیی دووهەم

وەك سەلماوە، هەندێ جار ئەو شتانەی کە لە ڕابوردوودا بە نەزەری (بیردۆزی) دانراون، دوایی دەبن بە شتانی بەڵگەنەویست. چونکە "جیهان" مەیلی کامڵ بوونی تێدایە و، هەر بەو مەیلەش شوێن یاسای تەواو کاری و پێگەیشتن دەکەوێت.

ئنجا لەبەر ئەوەی "مرۆڤ"یش بەشێکە لەم جیهانە و یەکێکە لە بەروبوومەکانی، ئەوا حەزێکی بەرەو پێش چوون و بەرزبوونەوەی تێدایە کە لە هەمان مەیلی کامڵ بوونەوە سەرچاوەی گرتووە.. ئەم مەیلی بەرەو پێش چوونەی مرۆڤیش هەردەم گەشە دەکات و پێدەگات.. ئنجا بەرەو پێشچوون و "بە دوای یەکدا هاتنی هزر و بیرەکان"یش پتر پشتی دەگرێت، کە ئەویش بە تەواو کاریی بنەماکان و کامڵ بوونی هۆکارەکان پتر فراوانی بەدەست دەهێنێت.. تەواو کاریی بنەماکانیش تۆوی زانستەکانی بوونەوەران لە "پشت"ی بەدیهێنانەوە دەردەهێنێت و "ڕەحم"ی ئەو ڕۆژگار و سەردەمەی پێ دەپیتێنێت کە ئەو تۆوانە سەوز دەکات و پێیان دەگەیەنێت.. ئنجا ئەزموونە یەك لە دوای یەك و پلەپلەکانیش ئاودێریی دەکەن و گەشەی پێ دەبەخشن.

جا لەسەر ئەم بناغەیە:

گەلێ باس و بابەت هەن کە لەم ڕۆژگارەدا ڕۆشتوونەتە ڕیزی زانستە ئاساییەکان و شتانی بەڵگەنەویستەوە، کەچی لە ڕابوردوودا بە نەزەری دادەنران و، پەنهان بوون و، پێویستیان بە هێنانەوەی بەڵگە هەبوو تاکو بسەلمێنرێن. ئەوەتا گەلێ بابەتی جوگرافیا و گەردوونزانی و کیمیا و ئەندازیاریی عەمەلی، ئێستا تەنانەت منداڵانی ئەم ڕۆژگارەش دەیانزانن و لە نێوان یاریـیەکانیاندا گەمەی پێ دەکەن. ئەوەش بەهۆی کامڵ بوونی بنەماکان و پێشکەوتنی هۆکارەکان و دەرخستن و ئاشکرا کردنی "بەدوای یەکدا هاتنی هزر و بیرەکان".

دەبێ بیشزانین کە هەموو ئەوانە پێشتر لای "ئیبن سینا" و فەیلەسووفەکانی هاووێنەی ئەو، "نەزەری" و پەنهان بوون. لە کاتێکدا کە ئەگەر باوکی فەلسەفە (ئیبن سینا)

بەرامبەر سەدان فەیلەسووفی ئەم زەمانە بخرێتە تایەکی تەرازووەوە و لەگەڵیاندا بەراورد بکرێت، ئەوا لە ڕووی زیرەکی و هێزی هزر و تەواویی دانایی و فراوانیی سەلیقە و وریاییەوە تای ئەو لە هی هەموویان قورستر دەبێت! کەواتە ناتەواوی لە "ئیبن سینا"دا نی‌یە کە کوڕی زەمانی خۆیەتی، بەڵکو لە باوکیدایە کە ئەو ڕۆژگارەیە تیایدا ژیاوە!

ئایا بەڵگەنەویست و ڕوون نی‌یە کە ئەگەر دنیای نوێ (ئەمریکا) - کە "کۆڵۆمبۆس"[(١)] ناوبانگی پێ دەرکرد - نەدۆزرابایەتەوە، ئێستا ئاساییترین کەشتیوان دەیتوانی بیدۆزێتەوە و بیخاتە سەردنیای کۆن؟ کەواتە ئێستا لە بریی ئەوەی بیری دۆزەرەوەی یەکەم بە گەشتی دەریاییدا بڕوات و خۆی دووچاری گرفتە مەترسیدارەکان بکات، تەنها کەشتی‌یەکی بچووك و قیبلەنمایەك سەروزیادە!

لەگەڵ ئەمەشدا، دەبێ ئەم ڕاستی‌یەی خوارەوە بە هەند وەربگیرێت:

مەسەلە وبابەتەکان دوو بەشن:

بەشێکیان: بەدوای یەکدا هاتنی هزر و بیرەکان کاریگەرییان لەسەری هەیە، تەنانەت بە بێ ئەو بیر و هزرانە ئەوانیش نایەنە دی. نموونەی ئەمە لە بابەتە ماددی‌یەکاندا وەك: هاوکاری لە بەرز کردنەوەی بەردێکی گەورەدا.

بەشی دووهەم: هەرگیز نە هاوکاری و نە پێشکەوتنی هزر و بیرەکان هیچ کاریگەری‌یەکیان تێدا نابێ؛ یەك کەس و هەزار کەس تیایدا یەکسانن. وەك بازدان - بە کردەوە - لە شوێنێکی بەرزەوە بۆ شوێنێکی تر.. یان تێپەڕ بوون بەناو شوێنێکی تەنگەبەردا.. چونکە هەموو خەڵکی بە گشتی و یەك دانە کەس لەم بابەتەدا وەکو یەکن و، هاوکاریی یەکتری هیچ سوودێکی بۆ کەس نابێت!

جا لەسەر بناغەی ئەم پێوەرە:

---

(١) کریستۆفەر کۆلۆمبۆس: (١٤٥١-١٥٠٦ز) دەریاوانێکی خەڵکی ئیتالیایە و، بە دۆزەرەوەی کیشوەری ئەمریکا ناودەبرێ، لەبەر ئەوەی یەکەم کەشتیوان و دەریاوانە لە ئەورووپاوە بەناو زەریای ئەتڵەسیدا ڕووەو ئەمریکا ڕۆشتبێت و پەڕیبێتەوە، ئەوەش بە چوار گەشتی دەریایی لە ساڵەکانی: (١٤٩٢-١٤٩٣ز)، (١٤٩٣-١٤٩٦ز)، (١٤٩٨-١٥٠٠ز)، (١٥٠٢-١٥٠٤ز)دا. هەرچەند ئەم چەمکە لە ناساندنی "کۆلۆمبۆس"دا ئێستا باوە، بەڵام ڕاستتر وایە بوترێ: "لە مێژووی نوێدا پێشەنگی ئەو کارە بووە، بە ڕێنمایی گەلێ هۆکار و، هاوکاریی چەندین دەریاوانی دیکە و، لە ڕێی بەکارهێنانی نەخشەکانی پێشتر". دەنا ئەورووپاییە دێرینەکان و، چینی‌یەکان و، موسڵمانەکان و، تەنانەت خودی هیندی‌یە سوورەکانیش، پێش ئەو کیشوەری ئەمریکایان دۆزیوەتەوە. ئەورووپاییەکانیش ڕاستتر وایە بە "داگیرکەری هەردوو کیشوەری ئەمریکا" ناوببرێن، نەك "دۆزەرەوە"یان! (وەرگێڕ)

بەشێ لە زانستەکان بە وێنەی بەرز کردنەوەی بەردەکە وایە؛ پێویستی بە هاوکاری و بەرەو پێش چوونی هزر و بیرەکانە. زۆرینەی زانستە ماددییەکان لەم بەشەن.

بەڵام بەشی دووهەم، کە وەکو نموونەی دووهەم وایە، کامڵ بوونی بـە کتوپڕی، یـان وەکو شتێکی کتوپڕی وایە. زۆرینەی زانینە مەعنەوییەکان، یاخود زانسـتە خواییـەکان لەم بەشەن.

بەڵام وێڕای ئەوەی کە پێشکەوتنی هزر و بیرەکان گەوهـەر و حەقیقـەتی ئـەم بەشـەی دووهەم ناگۆڕێت و پەرەی پێ نادات و زیـادی ناکـات، کـەچی ڕوونـی و ئاشـکرایی و هێز و پێزی پتر بە ڕێگای بەڵگەکانی دەبەخشێت!

ڕەچاو کردنی ئەمەی خوارەوەش پێویستە:

ئەو کەسەی بە زۆری لە شتێکدا ڕۆبچێت، دەیگەیەنێتە کەودەنی لە شتانی تردا.

لەسەر ئەم بناغەیە:

ئەو کەسـەی بـە زۆری لـە بابەتـە ماددییەکاندا ڕۆدەچێـت، لـە شـتانی مەعنـەویدا کەودەن دەبێت و بە ڕواڵەتبین دەمێنێتەوە!

جا بە پێی ئەم خاڵە:

بڕیاری کەسێکی شارەزا و کارامەی بواری مـاددی، بـە بەڵگـە دانـانرێت لـە شتانی مەعنەویدا. تەنانەت زۆر جاریش هەر شایانی بیستن نییە!

بەڵێ، ئەگەر نەخۆشێك لە بریی "پزیشـك" سـەردانی "ئـەندازیار"ێـك بکـات و، لای وابێ کاری "پزیشکی" وەکو "ئەندازیاری" وایە و، ئنجا بـەپێی ڕەچەتـەی ئەندازیارەکە چارەسـەر وەربگرێـت، ئـەوا بـەو ڕەفتـارەی خـۆی ڕاپۆرتێکـی بەدەسـت هێنـاوە کـە بگوێزرێتەوە بۆ گۆڕستانی نەمان و، سەرەخۆشی لە کەسوکاری دەکرێت!

بە هەمان شێوە، ئەو کەسەش کە لـەو بابەتـە مەعنەوییانـەی تێکـڕا حەقیقـەتی پـەتی و شتانی موجـەڕڕەدی سەرتاسـەرین، سـەر لـە بڕیـاری کەسـانی مـاددی بـدات و ڕاوێـژ بـە بیروبۆچوونیان بکات، ئەم کـارەی - لـە ڕاستیدا - ڕاگەیاندنی لەکارکـەوتنی "دڵ"ە، کە لایەنێکی ناسـك و بەخششـی پـەروەردگارە بـە مرۆڤ و.. سـەرەمەرگی "ژیـری"ش دەگەیەنێت، کە گەوهەرێکی گەش و ڕووناکە!

بەڵێ، ئەو کەسانەی لەناو ماددەدا بـە دوای هـەموو شـتێکدا دەگـەڕێن، ژیریـان لـە چاویاندایە. خۆ دیارە چاویش لە بینینی شتانی مەعنەویدا دەستەوسانە!

## پێشەکیی سێهەم

ڕۆشتنی هەندێ لە "ئیسرائیلیات"(١) و بەشێك لە "فەلسەفەی یۆنانی"(٢) بۆ ناو بازنەی ئیسلام و دەرکەوتنیان لە پۆشاکی جوانی ئاییندا، بیر و هزرەکانی شێواندووە. چونکە:

نەتەوەی نەجیبی عەرەب لە سەردەمی جاهیلیدا نەتەوەیەکی نەخوێندەوار بوون. بەڵام کاتێ نووری "حەق" بەسەریاندا هەڵهات و بە بینینی ئەو ئایینە ڕوونە هەموو تواناکانی هەست و نەستیان بێدار بووەوە، سەرجەم حەز و ئارەزووەکانی خۆیان تەنها و تەنها

---

(١) مەبەست لە (ئیسرائیلیات) زانیارییە پێشووەکانی ئەو نۆموسڵمانانەیە کە پێشتر زانای جولەکە یان گاور بوون. مامەڵە و هەڵوێستی هاوەڵان بەرامبەر بەو زانیارییانە بەپێی ئەو پێوەرانە بوو کە پێغەمبەر ﷺ دەستنیشانی کردبوون. واتە ئەگەر ئەو زانیارییانە دژی قورئان و سوننەت و ژیری ڕانەدەوەستان، یان درۆ و دەمهەڵبەست نەبوون، لێیان وەردەگرتن.. بەڵام ئەگەر دژی قورئان و سوننەت و ژیری بوونایە، وەریان نەدەگرت، تەنانەت هەڵەکانی ئەو نۆموسڵمانەیان لەو خاڵانەدا ڕاست دەکردەوە.. خۆ هەرکاتێ گریمانی ڕاست و هەڵەیان تێدا بوایە، کاریان بەسەریەوە نەدەبوو، واتە نە پشت ڕاستیان دەکردەوە و، نە بەدرۆشیان دەخستەوە. بەڵام - بە داخەوە - لە سەردەمەکانی تابیعین و دوای ئەوانیش هەتا سەردەمەکانی تری نووسینی تەفسیر، بەرە بەرە و بە بێ ڕەچاوکردنی تەرازووی ناوبراو کە هاوەڵان بەکاریان دەهێنا، ئەو زانیارییانە - کە پێیان دەوترێ "ئیسرائیلیات" - لەناو کتێبەکانی تەفسیریشدا پەرەیان سەند! بڕوانە: (التفسير والمفسرون) للدكتور محمد حسين الذهبي، رحمه الله. ١/١٦٥-١٨٠ و لاپەڕەکانی دواتریش. ط٢، ١٣٩٦هـ/١٩٧٦م، دار الكتب الحديثة. (وەرگێڕ)

(٢) لە سەردەمی عەبباسییەکاندا کتێبەکانی فەلسەفە لە زمانەکانی ترەوە، بە تایبەتی فەلسەفەی یۆنانی، تەرجەمە کران بۆ زمانی عەرەبی. ئەوەش لە سەردەمی مەنسووردا دەستی پێکرد و لە سەردەمی مەئمووندا گەیشتە لوتکە. دوای ئەوە، بایەخدان بە فەلسەفە هەموو بوارێکی زانستی و ڕۆشنبیریی گرتەوە، تەنانەت تەفسیری قورئانیش لەو دیاردەیە بەدەر نەبوو! هەڵوێستی زانایان بەرامبەر بە وەرگرتنی فەلسەفە لە تەفسیری قورئاندا لە دوو ڕای جیاوازدا دەرکەوت. یەکەمیان: لەڕادەبەدەر فەلسەفەیان پەسەند کرد و، پێیان وابوو دەتوانن فەلسەفە و ئایین پێکەوە گرێ بدەن و، تەبایی لە نێوانیاندا ساز بکەن. لەوانە: فارابی (٣٣٩ك) و، ئیبن سینا (٤٢٨ك). دووهەمیان: بەرامبەر بەو هەوڵانە ڕاوەستان و، بە توندی بەرپەرچیان دایەوە، چونکە پێیان وابوو لەگەڵ قورئاندا یەك ناگرنەوە. ئیمامی غەزالی (٥٠٥) و، ئیمام فەخرەدینی ڕازی (٦٠٦ك) لە زانا ناودارەکانی ئەم هەڵوێستەن. لە ڕاستیدا تێپەڕبوونی کات و، ئاڵوگۆڕەکانی ڕۆژگار و، دەرەنجامە سەلبییەکانی وەرگرتنی فەلسەفە لە تەفسیری قورئاندا، ڕاست و دروستیی هەڵوێستی دووهەمی سەلماند. بڕوانە: سەرچاوەی پەراوێزی پێشوو: ٢/٤١٧-٤٣١. (وەرگێڕ)

ئاراستەی زانین و فێربوونی ئەم ئایینە کرد و، تێڕوانینیان بۆ گەردوون لە جۆری درێژە ڕوانینی فەلسەفە نەبوو، بەڵکو تێڕوانینێکی لاوەکی بوو، بە نیازی ئەوەی کە وەك بەڵگە لەسەر بەدیهێنەر بەکاری بهێنن. ئنجا هەر تەنها ژینگە فراوان و بەرزەکەیان – کە لەگەڵ سروشتیاندا دەگونجا – ئیلهامی دەبەخشی بە هەستی ناسك و سروشتی ئەوان و، تەنها قورئانی پیرۆزیش سروشتە ساغ و خاوێنەکەی ئەوانی فێر دەکرد و پێی دەگەیاند.

بەلاّم ئەو نەتەوەیە پاش ماوەیەك نەتەوەکانی تری لە ئامێز گرت و، لەم ڕێیەوە زانست و زانیارییەکانی گەلانی تر هاتنە ناو بازنەی ئیسلامەوە. ئنجا "ئیسرائیلیات"ی دەستکاری کراو کەلێنێکی دەست کەوت کە لێیەوە بڕواتە ناو ئەندێشەی عەرەبەکان، ئەویش لە ڕێی موسڵمان بوونی چەند زانایەکی ئەهلی کیتاب، وەك کەعب و وەهب و، جۆگایەکی بەرەو ئەو گەنجینانە لێدا..

ئیتر لەوێوە ئیسرائیلیات تێکەڵ بە بیر و هزرە پاڵفتە و خاوێنەکان بوون، تەنانەت ڕێزیشیان لێ نرا!!

چونکە ئەو زانایانەی ئەهلی کیتاب کە ڕێی هیدایەت و موسڵمان بوونیان گرتەبەر بەهۆی کامڵ بوونیان بە شەرەفی ئیسلام پلە و پایەیەکی بەرزیان بەدەست هێنا. ئیتر زانیارییە دەست هەڵبەستەکانی پێشوویان بە وێنەی شتی سەلمێنراویان لێ هات و بەرپەرچ نەدرانەوە. بەڵکو بێ هیچ ڕەخنەیەك چەند گوێ بیستێکیان دەست کەوت کە گوێیان لێ ڕادەگرت، لەبەر ئەوەی بەرەنگاری بناغەکانی ئیسلام نەدەبووەوە و، یەکەم جاریش وەك چەند حیکایەتێك دەگێڕرانەوە کە نرخ و بەهایەکی ئەوتۆیان نەبوو.

بەلاّم – بە داخەوە – پاش ماوەیەك ئەو حیکایەت و چیرۆکانە بە وێنەی چەند ڕاستییەك وەرگیران و، بوون بە هۆی گەلێ دوودڵی و گومان.. چونکە دەکرێ هەندێ جار بۆ تێگەیشتن لە هەندێ "هێما"ی قورئان و سوننەت سەردانی ئەو "ئیسرائیلیات"ە بکرێت، یاخود لە کاتی بوونی پەیوەندییەك لە نێوان چەمکی هەردوولادا بکرێن بە سەرچاوەیەك بۆ هەندێ لەو چەمکانە، بەلاّم ناکرێن بە "واتا" و "لێکدانەوە"ی ئایەت و فەرموودە پیرۆزەکان، بەڵکو – ئەگەر ڕاست بن – لەوانەیە بە دانەیەك دابنرێن لەوانەی کە چەمکی واتای ئایەت یان فەرموودە کە دەیانگرێتەوە.

بەڵام "شەیدایانی ڕواڵـەت"[(١)] کە بـەهۆی ئیختیـاری بـەدی خۆیانـەوە، جگـە لەوانـە سەرچاوەی تریان دەست نەکەوت و بەشوێنیدا نەگەڕان، هـەندێ ئایـەت و فـەرموودەی پیرۆزیـان بـەوە لێکدایـەوە کـە "ئیسـرائیلیات"یـان بەسـەر ئـەو ئایـەت و فەرموودانـەدا شکاندەوە! لە کاتێکدا کە تەنها قورئان خۆی و فەرموودەی صەحیح دەتوانن تەفسیر و لێکدانـەوە بـۆ قورئـان بکـەن، نـەك تـەورات و ئینجیلێـك کـە ئەحکامـەکانیان هەڵوەشاوەتەوە و چیرۆکەکانیشیان تەحریف و دەستکاری کراوە.

"واتا" شتێکەو، ئەوەش کە واتا دەیگرێتەوە شتێکی تری جیاوازە. کـەچی لـەم کێشەیەدا ئەو شتەی کە دەگونجێ واتا بیگرێتـەوە خراوەتـە شوێنی "واتا"! ئیتر لەمـەوە گەلێ شتی گریمان کراو لە جێی شتانێك دانران کە ڕوویان دابێت!

پاشان کاتێ لە سەردەمی "مەئموون"دا[(٢)] "فەلسەفەی یۆنانی" بە نیازی ئەوەی بخرێتـە پاڵ هزری ئیسلامی، تەرجەمە کرا، کـە فەلسـەفەیەکە لـە سـەرچاوەی گەلـێ ئەفسـانە و خورافیاتەوە سەری هەڵداوە، هەندێ چڵك و چەپەڵیی لەگەڵ خۆیدا هێنـا و، تێکـەڵ بـە هزر و بیری ساف و خاوێنی ئەوان بوو. ئیتر تا ڕادەیەك بیری ئەوانی شێواند و، لـە بریـی "لێکۆڵینەوە" ڕێگایەکی لێدا بەرەو "چاولێکەری" هەروەك ئەوانیشی لادا لەوەی کە بە سەلیقەی سروشتیی خۆیان لـە سـەرچاوەی زوڵاڵـی ئـاوی ژیـانی ئیسـلام هـەڵبگۆزن و، هەژاری ئەوەی خسـتن بچـن قوتـابێتیی ئـەو فەلسـەفەیە بکـەن کـە ڕێگـرە لـە گەیشـتن بـە کەماڵ!

بەڵێ، هـەروەك زانـا لێکۆڵـەرەکان یاسـا و ڕێزمـانی زانستەکانی زمـانی عـەرەبی‌یان نووسی‌یەوە، تـاکو سـاغ و سـەلامەتیی "مەلەکە"ی گوفتـاری (مـوزەری) بپـارێزن، بـە هەمان جۆر لەو کاتەشدا کە (فەلسـەفە) و (ئیسـرائیلیات) هاتنـە نـاو بازنـەی ئیسـلامەوە

---

(١) لـەم کتێبـەدا چـەند جـارێك زاراوەی هاوشـێوەی ئەمـە دێتـە ڕێمـان، وەك: (ڕواڵەتی‌یەکان) یـان (ئـەهلی ڕواڵـەت) یاخود (شەیدایانی ڕواڵەت) هتد.. مەبەستی دانەر ئەو کەسانەیە کە بایەخ بە توێکڵ و ڕواڵەتی شـت دەدەن نەك گەوهەر و کاکڵەکەی و، نـاتوانن پـەی بـە نـاوەڕۆکی ببـەن، یـان بـە باشـی نـایزانن، یـاخود لـەسـەر ڕواڵـەتی دەقەکە ڕادەوەستن، بـە بێ ئـەوەی لێکدانـەوەی ڕاسـت و دروسـتیان بـۆی هـەبێت. (وەرگـێڕ لـە پەراوێزی چاپە عەرەبی‌یەکەوە هێناویەتی بە کەمێ دەستکاری‌یەوە)

(٢) ناوی: عەبدوڵڵا مەئموونە و کوڕی خەلیفە هاروونە ڕەشیدە. سالی (١٧٠ك) لەو ڕۆژەدا کە باوکی بـوو بـە خەلیفـە لـەدایك بـووە. ڕۆژی (١٩٨/١/٢٥ك) بەرامبـەر (٨١٣/٩/٥ز) بـووە بـە خەلیفـەی دەوڵـەتی عەبباسی. لە بەرواری: (٢١٨/٧/١٩ك) بەرامبەر (٨٣٢/٨/١٠ز) وەفاتی کردووە. (وەرگێڕ)

هەندێ لە زانا و ڕەخنەسازەکانی ئیسلام هەوڵیان دا ئەو شتانە لە ئیسلام جیا بکەنەوە و بە دوور ڕایان بگرن لێی، بەڵام - بە داخەوە - نەیانتوانی بە تەواوی لەم هەوڵەیاندا سەرکەوتن بەدەست بهێنن..

ئەوەبوو کارەکە لەم سنوورەدا ڕانەوەستا، بەڵکو کاتێ ڕووی هیممەت کرایە تەفسیر و لێکدانەوەی قورئانی پیرۆز هەندێ لە زانایانی ڕواڵەت بین کە بینییان قورئان هەردوو لایەنی نەقلی و عەقلیی لەخۆ گرتووە، هاتن بابەتە نەقلییەکانی قورئانیان بەسەر هەندێ لە ئیسرائیلیاتدا شکاندەوە و، یەکخستنیشیان سازدا لە نێوان باسە عەقلییەکانی قورئان و فەلسەفەی ناوبراودا.

جا لە بریی ئەوەی ئامانجەکان لە قورئان و سوننەت دەربهێنرانایە، هەندێ کەس هاوشێوەیی و پەیوەندییەکیان لە نێوان هەندێ بابەتی نەقلیی ڕاست و دروستی قورئان و هەندێ ئیسرائیلیاتی تەحریف کراودا هەڵێنجاند، هەروەها لە نێوان هەندێ بابەتە عەقلییە ڕاستەقینەکانی قورئانی پیرۆز و ئەم فەلسەفە وەهمی و بە ڕووکەش ڕازاوەیەشدا، بە گومانی ئەوەی کە ئەم لەیەکچوونە تەفسیرێك بێت بۆ واتاکانی قورئان و سوننەت و ڕوونکردنەوەیەك بێت بۆ ئامانجەکانیان!

نەخێر.. نەخێر.. هەرگیز کاری وا ڕاست و ڕەوا نییە. چونکە پشت ڕاستکەرەوەی ئەم قورئانە ڕوون و ڕەوانە تەنها ئیعجازەکەیەتی و.. قورئان بۆ خۆی تەفسیری خۆی دەکات و، واتاکانی لەناو خۆیدایە و، صەدەفەکەی گەوهەرێکی وەك خۆیەتی، نەك ئەوەی توێکڵێك بێت..

تەنانەت لە کاتی گریمانی ئەوەشدا کە مەبەست لە دەرخستنی ئەو لەیەکچوونە تەزکیە و پشتگیریی ئەو شایەتە ڕاستگۆیە بێت (واتە قورئان) لە لایەن ئیسرائیلیات و فەلسەفەوە، هێشتا هەر کارێکی نابەجێیە، چونکە قورئانی پیرۆز زۆر لەوە بڵند و بەرزترە پێویستی بە تەزکیە و پشتگیریی ئەو عەقڵ و نەقڵە بێت کە گەردنیان بۆ کەچ و سەریشیان بۆ نەوی کردووە! نابینی ئەگەر قورئان ئەوان تەزکیە نەکات شایەتییان وەرناگیرێت؟!

بەڵێ، گەڕان بە دوای کۆئەستێرەی سورەیادا دەبێ لە ئاسماندا بێت، نەك زەوی. کەواتە لەناو صەدەفەکانی قورئان خۆیدا بە دوای گەوهەرەکانیدا بگەڕێ، نەك لە گیرفانی خۆتدا کە تێکەڵەیەکی جۆراوجۆری تێدا جەم بووە. چونکە لە کاتی وادا

هیچت دەستگیر نابێت، تەنانەت گەر شتێکیشت دەست بکەوێت قورئان وەری ناگرێت و دەست بە ڕوویەوە دەنێت، چونکە مۆری "ڕەوانبێژی"ی لەسەر نییە و تەمغەی "بەلاغەت"ی لێ نەدراوە.

یەکێك لە شتە چەسپاوەکان ئەوەیە کە:

(واتا)ی ئایەت بریتییە لەوەی کە وشەکانی دەیرێژنە ناو دەماری بیستنەوە و، لەوێوە دەڕوات تا دەگاتە زەین و ژیری و، لەوێشەوە بەناو ویژداندا بڵاو دەبێتەوە و، ئنجا بە وێنەی پشکووتنی گوڵ، خونچەی بیرەکان دەکاتەوە..

دەنا هەرگیز ئەو گریمانانە نییە کە لەبەر زۆریی ڕۆچوونی شتانی تر خۆی کردووە بەناو ئەندێشەتدا.. ئەو دزییانەش نییە کە لە وتە پڕوپووچەکانی فەلسەفە و ئەفسانەی حیکایەتەکان گیرفانی خۆت لێ پڕ کردوون و، ئنجا لە توێی ئایەتەکاندا شاردووتنەوە و، پاشان دەیانگریت بە دەستەوە و هاوار دەکەیت: "ئەمە واتاکەیەتی.. وەرن بۆ وەرگرتنی"!!

چونکە ئەم وەڵامەت بە ڕوودا دەدرێتەوە:

کابرا! ئەو واتایەی تۆ لێکت داوەتەوە ساختەیە.. نیشانەی لاسایی و چاولێکەریی پێوە دیارە.. ڕەخنەسازانی حەقیقەت بەرپەرچی دەدەنەوە و دەیگێڕنە دواوە.. پادشای ئیعجاز ئەو کەسە دەردەکات کە سکەی ئەو لێبدات.. دانای ڕەوانبێژی - بە سکاڵای ئایەتەکە لێت، کە خۆت لە قەرەی ڕێسای ئایەت و فەرموودە داوە - ئەو وەهمەت لەناو ئەندێشەتدا بەند دەکات.. قوتابی و عەودالی حەقیقەتیش هەرگیز لێت وەرناگرێت، چونکە پێت دەڵێت:

(چەمکی ئایەتەکە مرواریییە، کەچی ئەمەی تۆ دەرت هێناوە قوڕ و لیتەیە.. واتای فەرموودەکە گیان و دڵ و هەناوە، کەچی ئەمەی تۆ دڕندەی کێوییە)!

نموونەیەك بۆ ڕوونکردنەوە:

لە پەندەکانی ئەدەبی کوردیدا دەگێڕنەوە کە: پیاوێك ناوی (عەلۆ) بووە، هەنگوینی دزیوە. کاتێ پێی ڕاگەیەنزا دزییەکەت ئاشکرا دەبێت و پێت دەزانرێت، ڕۆشت بۆ چاوبەستی خەڵکی، شارە زەردەواڵەی هێنا و لە کوورەیەکی هەنگدا کۆی کردنەوە، ئنجا هەرکات هەنگوینی بدزیایە لەناو کوورەکەدا هەڵی دەگرت. دوای ئەوە

هەرکەسێ لە بارەی هەنگوینەکەوە پرسیاری لێ بکردایە، دەیوت: ئەم هەنگوینە هەنگەکانی خۆم دروستی کردوون کە ئەندازیاری هەنگوینن!

ئنجا بە زمانێکی هاوبەش لە نێوان خۆی و زەردەواڵەکاندا دەیوت:

"ڤژ ڤژ ژ وە.. هەنگڤین ژ من"!

واتە: گیزەگیز ئەرکی سەرشانی ئێوەیە و.. ئەرکی منیش هێنانی هەنگوینە!

دەسا ئەی ئەو کەسەی بە گوێرەی حەز و ئارەزووی خۆی ئایەت و فەرموودەکان لێك دەداتەوە!

دڵی خۆت بە ڕەفتاری وەك ئەوەی ناو نموونەکە خۆش مەکە.. ئەمە تەنها پەندێکە. چونکە ئەو واتایەی کە تۆ هێناوتە ژەهرە، نەك هەنگوین. وشەکانی قورئان و فەرموودەش هەنگ نین، بەڵکو بە وێنەی مەلائیکەت وان کە نیگای حەقیقەتەکان دەگەیەنن بە دڵ و ویژدانی ئەو کەسەی کە خاوەنی دڵی زیندووە، یاخود بە باشی گوێی لێ ڕادەگرێ و بیریشی هەر لای ئەو ڕاستییانەیە..

فەرموودەی پێغەمبەریش ﷺ کانگای ژیان و ئیلهام بەخشی ڕاستییەکانە.

**لەمانەی پێشەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە:**

زیادەڕەوی و کورتبڕی (الإفراط والتفريط) هەردووکیان زیانبەخشن.. لەوانەیە کورتبڕییەکە زیانی زۆرتر بێت، بەڵام زیادەڕەوییەکە پتر گوناهبارە، چونکە دەبێتە هۆی کورتبڕی!

بەڵێ، لە ڕێی زیادەڕەوییەوە دەرگای چاوپۆشی کرایەوە و، شتانی ساختە و قەڵب هاتنە ژوورەوە و ئاوێتەی ئەو ڕاستییە بەرزانە بوون. ئنجا کاتێ کورتبڕان و ڕەخنەسازانی بێ ویژدانیش ئەو وتە ساختە و قەڵبانەیان لە نێوان ئەو ڕاستییانەدا بینی، کە هێندە بەرزن هیچ نرخێك لە بەهایاندا دەرناچێت، سڵەمینەوە و بێزارییان دەربڕی و، بە ناحەق و ستەم گومانی ئەوەیان برد کە هەموویان ئاڵوودە و قەڵب و ساختە بن.. کە حاشا هەرگیز وا نییە.

ئایا گەر لەناو گەنجینەیەکی دراودا هەندێ پارەی قەڵب دۆزرایەوە کە لە دەرەوەی گەنجینەکەوە خرابووە ناوی.. یان ئەگەر سێوێکی گەنیو لە باخێکی ترەوە کەوتبووە ناو باخە سێوێکی گەییو.. ئایا چ وێژدانێك ئەوە پەسەند دەکات کە هەموو گەنجینەکە بە

پارەی قەڵب و سەرجەم باخەکەش بە سێوی گەنیو دابنرێت و، پاشان وازیان لێ بهێنرێت بە بیانووی ئەوەی کە هەردوو کیان عەیبدار و تێکەڵ و پیس بوون بە شتی تر؟!

**کۆتایی:**

مەبەستم لەم پێشەکی‌یە ئەوەیە کە بیر و هزرە گشتی‌یەکان تەفسیرێکیان دەوێ بۆ قورئانی پیرۆز..

بەڵێ، هەموو "زەمان"ێك حوکم و بڕیاری تایبەت بە خۆی هەیە.. زەمانیش بۆ خۆی موفەسسیرێکە.. بارودۆخ و ڕووداوەکانیش دەرخەر و پیشاندەری شتانن.. ئەوەش کە دەتوانێت ببێت بە مامۆستای بیر و هزرە گشتی‌یەکان، بە هەمان جۆر، بیرە زانستی‌یە گشتی‌یەکانە..

جا لەسەر بناغەی ئەمە و بە پشت بەستن پێی:

داواکاری ئەوەم ئەنجومەنێکی شوورای زانستی پێك بێت، کە لە زانایانی لێکۆڵەر هەڵبژێررێن، هەریەکەیان لە زانستێکدا پسپۆڕ بێت، تاکو بە شوورای نێوانیان و بە سەرۆکایەتیی "زەمان" – کە موفەسسیرێکی گەورەیە – تەفسیرێك بۆ قورئانی پیرۆز دابنێن و، لایەنە جوانە پەرش و بڵاوەکانی ناو تەفسیرەکان کۆ بکەنەوە و بیانپاڵێون و زاخاوی بدەن.

ئەم کارەش پابەندە بەو مەرجەی کە "شوورا" لە هەموو شتێکیدا زاڵ بێت و، هزرە گشتی‌یەکان چاودێر بێت و، حوججیەتی "ئیجماع"یش[(١)] بەڵگە بێت لەسەری[(٢)].

---

(١) (ئیجماع): زاراوەیەکی زانستی "أصول الفقە"ە. مەبەست کۆدەنگیی سەرجەم موجتەهیدانی شەرعی ئیسلامە، لە سەردەمێکی دوای وەفاتی پێغەمبەردا ﷺ، لەسەر بڕیارێکی شەرعی کە ڕاستەوخۆ لە دەقدا نەهاتبێت، بەڵام لە ڕۆشنایی دەقدا ئەو بڕیارەیان دەرکردبێت. بڕوانە: (علم أصول الفقه، عبد الوهاب خلاف، ص: ٤٥. دار القلم، كويت ١٩٧٢)، (الوجيز في أصول الفقه، د. عبد الكريم زيدان، ص: ١٧٦، الدار العربية، بغداد ١٩٧٧). دانەر مەبەستی ئەوەیە کە ئەو تەفسیرەی بەو هەلومەرجانەی سەرەوە باسی کرد، مەرجێکی تری ئەوەیە کە دوای تەواوکردنی تەفسیرەکە زانایانی موجتەهیدی ئیسلام بە کۆدەنگیی نێوانیان پشتی بگرن، تاکو "حوججیەت" بە دەست بهێنێت. (وەرگێڕ)

(٢) دانەر ئەم داواکاری‌یەی بە شێوەیەکی ڕوونتر لە "إفادة المرام"ی کتێبی (إشارات الإعجاز)دا ص:٢ خستووەتە ڕوو. (وەرگێڕ)

## پێشەکیی چوارەم

"ناوبانگ" مرۆڤ دەکات بە خاوەنی شتێك کە هی ئەو نییە!

چونکە یەکێك لە ڕەفتار و خووەکانی ئادەمیزاد ئەوەیە کە شتی "نامۆ" یان "بەنرخ" دەداتە پاڵ ئەو کەسەی کە بە ڕەگەزەکەی ناوبانگی دەرکردووە، تاکو بە شتێکی ڕەسەن پێش چاوی بخات. واتە بۆ ئەوەی برەو بە قسەکانی بدات و بیانڕازێنێتەوە، یان لەبەر ئەوەی بەدرۆ نەخرێتەوە، یان لەبەر چەند ئامانجێکی تر، دەچێ - بە ناحەق - بەرهەمی هزر و بیری نەتەوەیەك یاخود لایەنە جوانەکانی قۆناغەکانی بیری ئەو نەتەوەیە دەگێڕێتەوە بۆ یەك دانە کەس و، لای وایە کە لەو کەسەوە سەرچاوەیان گرتبێ! لە کاتێکدا کە ئەو کەسە - خۆی - ئەو دیارییە وەرناگرێت کە بە ناحەق پێی بەخشراوە! چونکە ئەگەر شتێك پیشانی کەسێك بدرێت کە لە پیشەیەکی جواندا یان لە ڕەوشتێکی بەرزدا ناوبانگی هەبێت و، بۆ نموونە - بە ناحەق - پێی بوترێ: "ئەمە دەستکردی تۆیە" ئەوا بێ گومان شتی وا قبوول ناکات و، پەیوەندی نەبوونی خۆی پێیەوە ڕادەگەیەنێت و، بێزاری دەردەبڕێ و، دەڵێ: حاشا هی من نییە! چونکە ڕوانینی ئەو کەسە کە ڕوانینێکە بینەری ئەودیوی جوانییە ڕواڵەتییەکەیە، دەبینێ کە ئەگەر دروستکردنی ئەو سنعەتە بدرێتە پاڵ ئەو، جوانی و ڕێکوپێکیی ئەو سنعەتە تێکدەچێت.

جا لەسەر بناغەی ئەم خوو ڕەفتارە و، بە پشت بەستن بەو یاسا بەناوبانگەی کە دەڵێ: "إذا ثبت الشيء ثبت بلوازمــــــه"[1] خەڵکی ناچار دەبن کە هێزێکی مەزن و گەورەییەکی لەڕادەبەدەر و زیرەکییەکی نائاسایی و شتانی دەراسای تری هاوشێوەی ئەمانە بدەنە پاڵ ئەو کەسە بەناوبانگە، تاکو لەگەڵ ئەو حاڵەی ناو ئەندێشەیاندا بیگونجێنن. ئنجا بۆ ئەوەش ئەو کەسە بتوانێت سەرچاوەی هەموو ئەو شتە نائاساییانە بێت کە دەدرێنە پالی، ئەوا لە زەینی ئەواندا وەك بەدیهاتوویەکی سەرسووڕهێن بەرجەستە دەبێت!

---

(١) یەکێکە لە دەستوورەکانی زانستی "مەنتیق". واتە: هەر شتێك سەلما، ئەوا بێ گومان ئەو پێداویستییانەشی لەگەڵدا دەسەلمێن کە لێی دانابڕێن. وەك ئەوەی کە هەرکات سەلما لە شوێنێکدا خۆر هەڵهاتووە، دەشسەلمێت کە لەو شوێنەدا ڕۆژ بووەتەوە. (وەرگێڕ)

ئەگەر حەز دەکەیت ئەمەت بۆ ڕوون ببێتەوە، فەرموو بۆ وێنە مەعنەوی‌یەکەی "ڕۆستەمی زاڵ" بڕوانە کە لە ئەندێشەی عەجەمدا گەشەی کردووە، شتێکی یەکجار سەرسووڕهێنەر دەبینیت. چونکە لەبەر ئەوەی بە "ئازایەتی" ناوبانگی دەرکرد ئەوا بە هێزی "ناوبانگ" و بە حوکمی ئەو ئیستیبدادەی کە هیچ کاتێ ئێرانی‌یەکان دەرباز نەبوون لێی، هێرشی کردە سەر شانازیی ئێرانی‌یەکان و بۆ خۆی زەوتی کردن! بەم جۆرە، ئەو کەسایەتی‌یە لەڕادەبەدەر زل کرا و لەناو ئەندێشەکاندا بە گەورە پیشان درا.

جا مادەم "درۆ" درۆ ڕادەکێشێت، ئەوا ئەم ئازایەتی‌یە نائاسایییە، تەمەنێکی نائاسایی و، قەد و باڵایەکی نائاسایی و، پێداویستی‌یەکانی ئەم تەمەن و بەژن و باڵایەش دەخوازێت و بەدوای خۆیدا دەیانهێنێت! تەنانەت ئەو ئەندێشەیە لە زەینەکاندا بەرجەستە بووە و، هاوار دەکات: (من ڕەگەزێکی قەتیس بووی ناو کەسێکم) نەك لە نەوەی ئادەمیزاد، بەڵکو بە وێنەی بوونەوەرێکی ئەفسانەیی ناو حیکایەتەکانی خەڵکی کە پێش خورافیات و ئەفسانەکان دەکەوێت و، ڕێگا بۆ ئەفسانەی هاوشێوەی خۆی دەکاتەوە!

دەسا ئەی ئەو کەسەی کە دەیەوێ "حەقیقەت" بە پوخت و پاکی ببینێت!

بە وردی سەرنج لەم پێشەکی‌یە بدە.. چونکە دەرگای شتی خورافی و ئەفسانە لێرەوە دەخرێتە سەرپشت و، دەرگای لێکۆڵینەوەی زانستییش بەمە دادەخرێت. جگە لەمەش.. لەم زەوی‌یە شۆرەکات و وشك وبرنگەدا دەرفەتی وەرگرتنی پەند و ئامۆژگاری لە چیرۆکەکە لە کیسی مرۆڤ دەچێ و، ئەو سوودەی لە دەست دەڕوات کە بە پێی یاسای "پێشکەوتن" شتی نوێ لەسەر بناغەی پێشینان بنیات بنێت و، ناوێرێ هیچ دەستکاری و زیادکردنێك لەسەر خەرمانی کەلەپووری پێشینان مەڵۆ بکات.

گەر دەتەوێ ئەمەت بۆ ڕوون ببێتەوە، ئەوا فەرموو لە خواجە نەسرەدین (مەلای مەشهوور) کە ناسراوە بە (جوحای ڕۆمی) بپرسە:

"ئایا ئەم هەموو قسە نەستەق و نامۆیانە هی تۆن"؟

وەڵامی ئەوە دەبێ کە:

(ئەم قسانە پڕ بە چەند بەرگێك دەبن و، تەمەنێکی درێژیشیان پێویستە و، هەموو وتەکانی منیش لە جۆری قسەی نەستەق نین. من کابرایەکی زانام و، تەنها زەکاتی ئەو

قسانەم بەردەکەوێ کە دراونەتە پالم، نـەك زیـاتر. کەواتـە مـن بەوانـە ڕازی نیـم و دەیانـگێڕمە دواوە، چـونکە زیرەکی و قسـە خۆشـەکانم دەگۆڕێـت بـە قسـەی دەم هەڵبەست و خۆنواندن)!

دەسا کاکی برا!

لـەم دەمـارەوە شـتی خورافـی و "درۆ" هەڵبەسـتراوەکان سـەوز دەبێـت و، لـق و پەلەکانیان بلاو دەبنەوە.. هەر ئەویشە کە هێزی "ڕاستگۆیی" ناهێڵێت.

**کۆتایی:**

● "چاکەیەك" لە چاکەی خوای گەورە بە باشتر دابنرێت "چاکە" نییە!

● تەنها یەك دانە "ڕاستی" لە خەرمانێك "ئەندێشە" باشترە.

● دڵنیـایی و قەناعـەت کـردن بـە "چاکـە"ی خـوای گـەورە، لـە دەمی وەسفی هـەر شتێکدا، کارێکی پێویستە.

● ئەو کەسەی لەناو کۆمەڵگادایە، نابێ ڕێساکەی تێکبدات.

● بنەچـەی هـەموو شـتێك بەروبوومەکـەی دەری دەخـات و، شـەرەفمەندیی هـەموو شتێك لە خۆیدایە، نەك لە وەچەکەیدا.

● هەرکات شتومەکێك تێکەڵ بە شتومەکێکی تر بوو ئەوا لە نرخی یەکەم دەهێنێتە خوارەوە، هەرچەندەش دووهەم شمەکێکی بەنرخ بێت. تەنانەت دەبێت بە هۆی ڕاگرتنی ئەو کەرەستە ڕەسەنە.

ئێستاش لەسەر بناغەی ئەم خالانە، دەڵێم:

گێڕانەوەی هەندێ لە حەدیسە هەڵبەستراوەکان بۆ "ئیبن عەباس" و هاوەڵانی بەرێزی تـری وەك ئـەو - خـوا لێیـان ڕازی بێـت - بـە نیـازی "تـەرغیب و تـەرهیب" و هـاندان و هەڵنانی عەوامەکان، لە ڕاستیدا نەزانییەکی یەکجار گەورەیە.

بەڵێ، "حەق" پێویستی بە ڕەفتاری وا نییە و "حەقیقەت"یش پەکی لەسەر کاری لەو جۆرە نەکەوتووە. چونکە نووری خۆیان بەسە بۆ ڕووناك کردنەوەی دڵان و، فەرموودە صەحیحـەکانیش - کـە موفەسـیری ڕاستەقینەی قورئـانی پیرۆزن - سـەروزیادمانن و بڕوامان پێیانە و، دڵنیاین لەو مێژووە ڕاستانەش کە بە پێوەر و تـەرازووی مـەنتیق پەسـەند کراون.

# پێشەکیی پێنجەم

ئەگەر "مەجاز" لە دەستی زانستەوە بکەوێتە دەستی نەزانی ئەوا بە "حەقیقەت"ی[1] دادەنێت و، دەرگای ئەفسانەکانیشی پێ دەخاتە سەرپشت..

چونکە هەرکات دەستی تاریکی نەزانی "مەجاز" و "تەشبیهەکان"[2] لە دەستی ڕووناکی بەخشی زانست بکاتەوە، یان هەر بەو شێوەیە کاتیان بەسەردا بڕوات و تەمەنیان درێژ ببێت، ئەوا وەك "ڕاستی"یان لێ دێت و، هەموو تەڕی و پاراوی‌یەکیان لەدەست دەچێت و، دەبن بە سەرابێکی خەڵەتێنەر، هەرچەندەش پێشتر شەربەتێکی زوڵاڵ بوون و.. دەگۆڕێن بە پیرەژنێکی چرچ و لۆچاوی، دوای ئەوەی کیژۆڵەیەکی دڵڕفێنی ناسکۆڵە بوون!

بەڵێ، تروسکایی "حەقیقەت" لە ڕوونی و شەفافییەتی "مەجاز"ەوە دەبریسکێتەوە، بەڵام هەر هێندەی ئەو "مەجاز"ە کرا بە "حەقیقەت" دەگۆڕێت بە چڕی‌یەکی تاریکی ئەوتۆ کە حەقیقەتە ئەسڵی‌یەکە دادەپۆشێت!

ئەم ئاڵوگۆڕەش یاسایەکی سروشتیی خوای گەورەیە.

گەر شایەتت لەسەر ئەمە دەوێ، ئەوا سەردانی نهێنیی تازەبوونەوە و ئاڵوگۆڕی ناو "زمانەکان" بکە و، هاوبەشی و هاوتایی شتە هاوتا و هاوبەشەکان ببینە، ئەوکاتە بێ هیچ گومانێك لێیان دەبیستی کە دەڵێن:

---

(١) "حەقیقەت" و "مەجاز" دوو زاراوەی ڕەوانبێژین. مەبەست لە "حەقیقەت" بەکارهێنانی وشەیە لەو واتایەدا کە یەکەم جار بۆی دانراوە. وەك ئەوەی سەبارەت بە "خۆر"ی ئاسمان بڵێیت: "خۆر هەڵهات". بەڵام "مەجاز" بەکارهێنانی وشەیە لە واتایەکی تری جیاواز لە واتا ڕاستەقینەکەیدا، لەبەر ئامانجێکی ڕەوانبێژی. وەك ئەوەی کە ئەگەر خۆشەویستێکت لێ دەربکەوێ بڵێیت: "خۆر هەڵهات". مەبەستیشت لە "خۆر" خۆشەویستەکەت بێت! (وەرگێڕ)

(٢) "تەشبیهـ" بە کوردی: "وەك یەك". زاراوەیەکی ڕەوانبێژی‌یە. واتە لێچواندنی شتێك بە شتێکی تر. بۆ نموونە: "ئەم کاغەزە هێندە سپی‌یە دەڵێی بەفرە"! (وەرگێڕ)

گەلێ وتە و چیرۆك و ئەندێشە و واتای ئەوتۆ هەبوون کە پێشینان چێژیان لێ دەبردن، بەڵام لەگەڵ حەز و ئارەزووە لاوەکانی بەرەکانی دواییدا یەك نەکەوتن، چونکە لە سەردەمی ئەماندا بوون بە پیرەژنی چرچ و لۆچاوی کە جوانییان تێدا نەمابوو. هەر ئەمەش بوو بە هاندەریان کە مەیلیان بەلای تازەگەریدا بڕوات و، حەزیشیان لە داهێنان بێت و، پڕ کێشیی گۆڕانکاری بکەن.

ئەم دەستوورە، هەروەك لە (ئەندێشە و واتا و چیرۆکەکان)دا دەست بەکارە، بە هەمان شێوە لە "زمان"ەکانیشدا دەستوورێکی کارایە..

کەواتە نابێ بڕیار لەسەر "ڕواڵەت"ی هیچ شتێك دەربکرێت. چونکە ئەرکی سەرشانی مرۆڤی لێکۆڵەر:

(قووڵبوونەوەیە لە ناخی بابەتەکە و.. دەستبەرداربوونە لە کاریگەری‌یەکانی کات و.. ڕۆچوونە لە قووڵایی ڕابوردوودا و.. لەتەرازوودانی هەموو شتێکە بە پێوەرەکانی ژیری و.. دۆزینەوەی سەرچاوەی شتەکانە).

ئەو بەسەرهاتەی کە شارەزا و ئاگاداری ئەم ڕاستی‌یەی کردم، ڕوودانی "مانگ گیران" بوو لە دەمی منالیمدا..

ئەوەبوو هۆکارەکەیم لە دایکم پرسی. وەڵامی دامەوە کە:

ماری گەورە مانگی قووت داوە!

وتم: ئەی بۆچی دەبینرێت؟

وتی: ماری ئاسمان وەکو شووشە ڕوونە، ناوەوەی دەبینرێت!

جا بڕوانە چۆن "تەشبیهـ" کرا بە "حەقیقەت" و ڕاستیی حاڵ و ڕووداوەکەی گۆڕی!

چونکە گەردوونناسەکان خاڵی یەکتربڕینی خولگەی مانگ و خۆریان لە ناوچەی بورجەکان و لە سەر و کلکی ئەو دوو کەوانەیەدا شوبهاندووە بە دوو ماری گەورە یان دوو هەژدیها و، هەرکات یەکێ لە مانگ یان خۆر گەیشتە "سەر"ی یەکتربڕینی کەوانەکان و ئەوی تریش ڕۆشتە کلکی یەکتر بڕینی ئەو دوو کەوانەیە و "زەوی"یش کەوتە ناوەڕاستیان، ئەوا دیاردەی "مانگ گیران" ڕوو دەدات.

دەسا ئەی ئەو کەسەی کە لەم قسە تێکەڵ و پێکەڵانەی من بێزار نابێت!

بە وردی سەیری ئەم پێشەکی‌یەش بکە و لێی ورد بەرەوە. چونکە زۆر شتی خیلافی و خورافی لەم بنەچەیەوە سەر هەڵدەدەن. کەواتە پێویستە ڕێنمایی لە "مەنتیق" و "ڕەوانبێژی"(١) وەربگیرێت.

**کۆتایی:**

دەبێ "واتای ڕاستەقینە" مۆری تایبەت بە خۆی و نیشانەیەکی ڕوونی جیاکەرەوەی خۆی هەبێت. ئەو شتەش کە نیشانەکەی دەناسێتەوە و بەرجەستەی دەکات ئەو "جوانی"یە پەتی و سەرتاسەری‌یەیە کە ئەنجامی بەراورد کردنیەتی لەگەڵ ئامانجەکانی شەریعەتدا.

ڕێگادانیش بە "مەجاز" دەبێ بەپێی هەلومەرج و دەستوورەکانی "ڕەوانبێژی" بێت، دەنا بینینی "مەجاز" بە "حەقیقەت" و "حەقیقەت"یش بە "مەجاز".. یان پیشاندانیان لەو شێوەیەدا، جگە لە درێژەدان بە زاڵبوونی "نەزانی" هیچی تری لێ ناکەوێتەوە.

حەزی کورتبڕی کارێك دەکات کە هەموو شتێك بە ڕواڵەتەکەی لێك بدرێتەوە، هەتا - بە داخەوە - وردە وردە بە سەرهەڵدانی ڕێچکەی ڕواڵەت بینان (ظاهیری‌یەکان) کۆتایی پێ دێت..

حەزکردنیش لە زیادەڕەوی وا دەکات کە بە چاوی "مەجاز" سەیری هەموو شتێك بکرێت، کە ئەمەش لە ئەنجامدا دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی ڕێچکەی ناڕەوای "باطینی"یەکان..

جا هەروەك یەکەمیان زیانبەخشە.. دووهەمیان بە چەند پلەیەك زیانی لەو زیاترە.

ئەوەش کە ناوەندەڕێ دەردەخات و، لە سنوور بەزاندنی زیادەڕەوی و کورتبڕی دادەگرێت تەنها فەلسەفەی "شەریعەت"ە لەگەڵ "ڕەوانبێژی"دا و.. "حیکمەت"ە لەگەڵ "مەنتیق"دا.

---

(١) "مەنتیق" و "ڕەوانبێژی" ناوی دوو جۆر زانستن کە بۆ هەڵسەنگاندن و زانینی ڕاستی و ناڕاستیی گوفتارەکان و هزر و بیرەکان زانینیان پێویستە و، بە بێ بەکارهێنانی یاساکانی ئەم چەشنە زانستانە ئەستەمە مرۆڤ بتوانێ بڕیاری زانستی‌یانە و ڕاست و دروست سەبارەت بەو شتانە بدات. (وەرگێڕ)

بەڵێ، دەڵێم: حیکمەت (فەلسەفە)..

چونکە خێرێکی زۆری هەیە، هەرچەندە شەڕ و زیانیشی لەخۆ گرتووە، بەڵام شەڕ و زیانێکی جوزئییە. خۆ یەکێك لە بناغە سەلماوەکان ئەوەیە کە لەکاتی پێویستدا دەبێ یەکێك لەو دوو شەڕ و خراپەیە هەڵبژێررێت کە زیان و خراپەی کەمترە، چونکە وازهێنان لەو خێرە زۆرەی کە تیایدایە لەبەر زیان و خراپە جوزئییەکەی، ئەوە دەگەیەنێت کە خراپەی زۆر ئەنجام درابێت.

بەڵێ، حیکمەتی کۆن (فەلسەفەی دێرین) خێری کەمە و شتانی خورافی و ئەفسانەشی زۆرن. بۆیە پێشینان - تا ڕادەیەك - ڕێیان بەوە نەداوە کە مرۆڤ پێیەوە سەرقاڵ بێت، چونکە ئەو کاتە "زەینەکان" ئامادە نەبوون و، "بیر"ەکانیش پابەندی چاولێکەری بوون و، "نەزانی"یش بەسەر عەوامدا زاڵ بوو..

بەڵام فەلسەفەی ئێستا، لە ڕووی ماددییەوە و لەچاو فەلسەفەی کۆندا، خێری زیاترە و درۆ و ناحەقیشی کەمترە و، "بیر"ەکانیش لەم سەردەمەدا ئازادن و، "زانین"یش زاڵە بەسەر هەموواندا.

لە ڕاستیدا دەبێ هەموو "زەمان"ێك حوکم و بڕیاری تایبەت بە خۆی هەبێت.

## پێشەکیی شەشەم

بۆ نموونە:

هەرچی لە تەفسیردا دێت مەرج نییە "تەفسیر" بێت، چونکە زانستەکان بە دوای یەکدا دێن و پشتی یەکتر دەگرن..

ناشبێ "ڕا" بسەپێنرێت، چونکە یەکێ لە سەلماوەکان ئەوەیە کە مرۆڤێکی کارامە و لێهاتووی پیشەی "ئەندازیاری" لەوانەیە لە پیشەیەکی تری وەك "پزیشکی"دا عەوام و خۆهەلقورتێن بێت.

هەروەها یەکێك لە دەستوورەکانی ئوسوولی فیقهـ ئەوەیە کە:

هەرکەسێك "فەقیهـ" نەبێت لە ڕیزی فەقیهەکاندا دانانرێت، هەرچەندەش لە ئوسوولی فیقهدا موجتەهید بێت، چونکە سەبارەت بەوان بە عەوام دادەنرێت.

هەروەها یەکێك لە ڕاستییە مێژووییەکان ئەوەیە کە:

تاکە کەس هەرگیز ناتوانێت لە چەند زانستێکی زۆردا پسپۆڕی بەدەست بهێنێت، مەگەر بلیمەت و هەلکەوتوو بێت، ئەو کاتە دەتوانێت لە چوار پێنج زانستدا پسپۆڕی پەیدا بکات و، ببێت بە خاوەن بەهرە تیایاندا.

جا هەرکەس لافی پسپۆڕی لە هەموو زانستەکاندا لێ بدات، بە دلنیاییەوە هەموویانی لەدەست داوە!

چونکە هەموو زانستێك وێنەیەکی ڕاستەقینەی خۆی هەیە و، بە پسپۆڕیش تیایدا وێنە ڕاستەقینەکەی بەرجەستە دەبێت..

ئەوەتا کەسی پسپۆڕ لە هەر زانستێکدا گەر زانیارییەکانی تری نەکات بە تەواوکەر و پشتگیر و یارمەتیدەری ئەو زانستەی تیایدا پسپۆڕە، ئەوا شێوە و وێنەیەکی سەیر و سەمەرە لە زانیارییە لاوازەکانیەوە بەرجەستە دەبێت!

**گریمانکردنی نوکتەیەك بۆ ڕوونکردنەوە:**

گریمان وێنەکێشێك لە جیهانێکی ترەوە بێت بۆ ئەم زەوی‌یە و، پێشتر وێنەیەکی تەواوی نە مرۆڤ و نە هیچ زیندەوەرێکی تری نەدیبێت..

گریمان لە هەر زیندەوەرێك ئەندامێکی بینی.. ئنجا ویستی لەم ئەندامانەی دەست و، پێ و، چاو و، گوێ و، نیوەی ڕوخسار و، لووت و، تەنانەت مێزەری سەر و، شتانی وەك ئەمانەی کە لە زیندەوەراندا چاوی پێ کەوتن، وێنەی "مرۆڤ"ێك بکێشێت!!

یان ویستی لەو شتانەی کە بەرچاوی کەوتن، وەك کلکی ئەسپ و ملی حوشتر و سەری شێر، وێنەی ئاژەڵێك بکێشێت..

جا ئەو کەسانەی کە ئەم چەشنە وێنەیە دەبینن، وێنەکێشەکە لە کارەکەیدا تاوانبار دەکەن، لەبەر نەبوونی گونجاوی و ڕێکوپێکی لەو ئەندامانەدا و، تێکەڵ و پێکەڵ بوونیان بە شێوەیەك کە ڕێ دەگرێ لەوەی زیندەوەرێکی لەو شکڵ و شێوەیە هەبێت و، دەڵێن:

مەرجەکانی ژیان بوار بەم جۆرە شتە سەیر و سەمەرانە نادەن!

هەر ئەم "دەستوور"ە، لە زانستەکانیشدا هەیە.. چارەسەر تەنها ئەوەیە کە مرۆڤ یەکێك لە زانستەکان بکات بە بناغە و، زانیاری‌یەکانی تریشی بکات بە حەوزێك و تیایدا هەڵیان بگرێت.

هەروەها یەکێك لە نەریتە باوەکان ئەوەیە کە:

چەند زانستێکی زۆر لەناو یەك کتێبدا بە چڕی و شان بە شانی یەکتر دانراون. ئنجا بەهۆی تێهەڵکێش بوونیان و تەواوکردنی یەکتری، لەبەر ئەوەی کە پشتگیری یەکترن و هەندێکیان هەندێکی دی بەرهەم دەهێنێت، تا ڕادەیەك تێکەڵی و ئاڵۆزی دروست دەبێت، بەو ڕادەیەی کە ڕێژەی بابەتەکانی ئەو زانستەی کتێبەکەی تێدا دانراوە هەر هێندەی زەکاتی ئەو زانستانە دەبێ کە تێی ئاخنراوە!

جا نەزانینی ئەم نهێنی‌یە، کەسی ڕواڵەتبین یاخود گێرەشێوێنی بەهەڵەدابەر دەگەیەنێتە ئەوەی کە هەرکات لە تەفسیرێك یان کتێبێکی فیقهدا باسێکی لاوەکی ببینێت خۆی خزاندبێتە ناو بابەتەکە، ئەوە بکات بە بیانوو کە بڵێت:

"شەریعەت ئەمەیە.. تەفسیریش هەر ئەمەیە"!

جا ئەگەر دۆست بێت، دەڵێ:

"گەر ئەمەت پێ قبووڵ نەبێت، موسڵمان نییت"!!

خۆ ئەگەر دوژمنیش بێت، دەیکاتە بڕوبیانووی ئەوە کە بڵێت:

"شەریعەت و تەفسیر هەڵەن".. کە حاشا وا نییە!

دەسا ئەی کورتبڕان و زیادەڕەوان!

تەفسیر و شەریعەت شتێکە و.. ئەو کتێبانەش کە تیایاندا دانراوە شتێکی تری جیاوازە.. کتێب جێی زۆر شتی تێدا دەبێتەوە.. دوکانی کتێب گەلێ شتی بێ نرخی تێدایە کە جیایە لە گەوهەرە نایابەکان.

گەر توانیت لەمە تێبگەیت، لە دوودڵی ڕزگار دەبیت.. دەسا بێداربە!

هەروەك پێداویستییەکانی ماڵەوەت لە لای یەك پیشەساز ناکڕیت، بەڵکو سەردانی وەستای سنعەتی هەریەك لە پێداویستییەکانت بە جیا جیا دەکەیت، بە هەمان جۆر دەبێ کردار و جموجووڵەکانیش لەگەڵ ئەو یاسا گەردنکەشەی کەماڵات ڕێکبخرێت کە "یاسای فیترەت"ە. نابینیت کەسێك کە سەعاتەکەی شکابێت ئەگەر سەردانی بەرگدروو بکات بۆ دوورینەوەی، بێجگە لە گاڵتە و سووکایەتی پێکردن ڕووبەڕووی چیی دی نابێتەوە؟

**ئاماژەیەك:**

بناغەی ئەم پێشەکییە بریتییە لەوەی کە:

پەیڕەوی و گوێڕایەڵی بۆ یاسای "تەواوکاری و پێشکەوتن" - کە یاسایەکی بەدیهێنەری شکۆمەندە و لە گەردووندا بە پێی دابەشکردنی ئەرکەکان لەکاردایە - واجب و پێویستە، کەچی مافی تەواو نەدرا بە گوێڕایەڵیی ئەو ئاماژە و ڕەزامەندییەی خوای گەورە کە لەو یاسایەدا هەیە. لەکاتێکدا کە دەستی چاودێریی دانستی خوایی - کە دەستووری "کار دابەشکردن" دەخوازێت - چەندین توانا و لێهاتنی لە ماهییەتی مرۆڤدا داناوە بۆ ئەنجامدانی زانست و پیشەسازییەکان، کە لە حوکمی "فەرزی کیفایە"ی شەریعەتی گەردوونیدان.

وێڕای ئەم فەرمانە مەعنەوییەش بۆ بەجێهێنانیان، کەچی بە ڕەفتاری هەڵەی خۆمان ئەو حەز و شەوقەمان لەدەست دا کە پشتی ئەو مەیلە دەگرێت و لەو توانا و لێهاتنەوە سەرچاوەی گرتووە..

هەروەك بەم هەڵپە و سووربوونە درۆینەیەمان و، بەم حەزی بەسەرخەڵکدا سەرکەوتنەش - کە سەری ڕیاکارییە - بڵێسەکەیمان کوژاندەوە!

بێ گومان سزای سەرپێچیکار دۆزەخە.. ئێمەش بە "دۆزەخی نەزانی" سزا دراین، چونکە فەرمانەکانی شەریعەتی فیترەتمان لە خۆماندا جێبەجێ نەکرد کە یاسای بەدیهاتووانە..

خۆ تەنها کارکردن نەبێت بەپێی یاسای "دابەشکردنی کار" هیچ شتێکی تر لەم سزا و ئازارە ڕزگارمان ناکات. ئەوەبوو پێشینانمان بەهۆی جێبەجێ کردنی ئەم یاسایەوە ڕۆشتنە ناو "بەهەشتی زانستەکان".

کۆتایی:

هەروەك نامو سڵمانێك تەنها بە ڕۆشتنی بۆ ناو مزگەوت نابێت بە موسڵمان، بە هەمان جۆر هاتنەناوی مەسەلە و بابەتێکی فەلسەفە، یان جوگرافیا، یاخود مێژوو، یان هاوشێوەیان، بۆ ناو کتێبەکانی تەفسیر و فیقهـ هەرگیز ئەو مەسەلەیە ناکات بە تەفسیر و شەریعەت!

پاشان بڕیاری تەفسیرنووسێك یان فەقیهێك - بە مەرجی پسپۆڕی - تەنها لە "تەفسیر" یان "فیقهـ"دا دەکرێ بە بەڵگە. دەنا بەڵگە نابێت بۆ ئەو شتانەی بە پەنامەکی خۆیان خزاندووەتە ناو کتێبەکانی تەفسیر یان فیقهەوە، چونکە دەگونجێ ئەو تەفسیرنووسە یان ئەو فەقیهە لەو شتانەدا خۆهەڵقورتێن بێت. خۆ گلەییش لەو کەسە ناکرێت کە شتێك لە شوێنێکی ترەوە دەهێنێ و نەقڵی دەکات..

ئەگەر کەسێك لە زانستێکدا قسەی "بەڵگە" بێت و لە چەند زانستێکی تردا تەنها شت نەقڵ بکات، ئەوا بە بەڵگەدانانی قسەی ئەو کەسە لەو شتە نەقڵ کراوەدا، یان دەستگرتن بە قسەی ئەو تیایدا کە وەك دەعوایەك وایە، لە ڕاستیدا پشت هەڵکردنە لەو یاسا خواییەی کە پاڵی بە "دابەشکردنی چاکە و هەوڵ و کۆششەکان"ەوە داوە.

ئنجا لە ڕووی مەنتیقەوە سەلماوە کە:

"بڕیاردان" داخوازی تەسەوور کردنی هەریەك لە "مەوزووع" و "مەحموول"ە[١] تەنها بە شێوەیەك لە شێوەکان، بەڵام درێژەپێدان و لێکدانەوەکانی تر بە بەشێك لەو زانستە دانانرێن، بەڵکو باس و بابەتی زانستێکی ترە.

هەروەها ئەوەش بڕیاری لەسەر دراوە کە:

بە هیچ کام لە سێ دەلالەتە تایبەتەکان[٢] شتی گشتی (عام) نابێتە بەڵگە لەسەر شتێ کە تایبەت (خاص) بێت.

بۆ نموونە:

گەورەترین لادان لە مەنتیق لەوەدا دەردەکەوێ کە بۆ لێکدانەوەی ئایەتی: ﴿بين الصدفين﴾ (الكهف: ٩٦) لە تەفسیری بەیزاویدا بە دڵنیاییەوە وا دانراوە کە لە نێوان

---

(١) دوو زاراوەی زانستی "مەنتیق"ن و، بەرامبەر بە زاراوەکانی "موبتەدا و خەبەر" و "فاعیل و فیعل"ن لە ڕێزماندا. بۆ نموونە کە دەوترێ: (زێڕ کانزایە) وشەی "زێڕ" مەوزووعە، وشەی "کانزا"ش مەحمولە. یان کە دەڵێن: "مرۆڤ گۆیایە" وشەی مرۆڤ "مەوزووع"ە و وشەی گۆیا "مەحموول"ە، واتە سیفەتی گۆیا دراوەتە پاڵ مرۆڤ. (وەرگێڕ)

(٢) کە بریتین لە دەلالەتی: (موتابەقە و، تەزەممون و، ئیلتیزام). ئەمانەش لە زاراوەکانی زانستی "مەنتیق" و "ڕەوانبێژی"ن. بەپێی ئەم زانستانە هەر وشەیەك کە بۆ واتایەکی تایبەتی دانرابێت، کاتێ بەکاردەهێنرێت، یان مەبەست لەو بەکارهێنانە واتای پڕاوپڕی وشەکەیە، وەك ئەوەی کە ناوی کەسێك دەهێنرێت مەبەست خودی ئەو کەسە بێت کە ئەو ناوەی لێ نراوە. ئەمەش پێی دەوترێ "دەلالەتی موتابەقە".. یان مەبەست لە بەکارهێنانی وشەکە بەشێکە لە واتاکەی، نەك هەمووی. وەك ئەوەی پزیشك بە نەخۆشەکەی بڵێت: "تۆ پێویستت بە خواردنی ڤیتامینەکانە، کەواتە میوە و سەوزەی نەکوڵاو بخۆ". ئیتر بە شێوەیەکی ناوەکی(ضمني) ڕێنمایی نەخۆشەکەی دەکات کە ڤیتامینەکان لە میوە و سەوزەی نەکوڵاودا هەیە. ئەم بەشەیان پێی دەوترێ: "دەلالەتی تەزەممونی" واتە ناوەکی، چونکە ڕاستەوخۆ ئەو واتایە مەبەست نەبووە، بەڵام لە ناوەندی واتا سەرەکییەکەوە ئەم واتایە وەرگیراوە.. یان مەبەست لە بەکارهێنانی وشەکە واتایەکی دەرەوەی واتا پڕاوپڕەکەی وشەکەیە، بەڵام چ لە ڕێی ژیرییەوە – وەك لە زانستی مەنتیقدا – چ لە ڕێی عورفەوە – وەك لە زانستی ڕەوانبێژیدا – بە واتایەکی پێوست(لازم) دادەنرێت بۆ واتا سەرەکییەکەی ئەو وشەیە، لەبەر ئەوە پێی دەوترێ: "دەلالەتی ئیلتیزامی". نموونەی لازمی عەقڵی وەك ئەوەی یەکێك بڵێت: "ئەم ژمارەیە جووتە و تاك نییە". لە ڕێی دەلالەتی ئیلتیزامییەوە ئەم قسەیە ئەوە دەگەیەنێت کە ژمارەکە بەسەر ژمارە دوودا دابەش دەکرێت بە بێ مانەوەی هیچ کەرتێك. نموونەی لازمی عورفیش وەك ئەوەی بوترێ: "دیوەخانەکەی فڵانە کەس خەڵکی زۆری تێدایە". بەپێی دەلالەتی ئیلتیزام ئەو واتایە بە دەستەوە دەدات کە ئەو کەسە میوانی زۆرە، کە ئەوە دەگەیەنێت مرۆڤێکی نان بدەیە، دیارە ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ئەو ناوبراوە کەسێکی سەخییە! بڕوانە سەرچاوە "مەنتیقی" و "بەلاغی"یەکان. (وەرگێڕ)

چیاکانی "ئەرمینیا" و "ئازەربایجان"دایە! چونکە ئەو لە بناغەدا کەسێکە "نەقڵ" دەکات. جگە لەوەش دەستنیشان کردنەکە هەرگیز واتای قورئان نی‌یە، کەواتە بە "تەفسیر" دانانرێت، چونکە ئەو لێکدانەوەیە ڕاڤەیەکە پشتی بە زانستێکی تر بەستووە کە هی بەستێن(قەید)ێکە لە بەستێنەکانی ئایەتە پیرۆزەکە.

هەروەها کارێکی ئەوپەڕی ناڕەوا و ستەمە بەرامبەر بەو موفەسسیرە مەزنە و دامەزراویی لە زانستدا، بە تایبەت لەو تەفسیرە ناوبراوەیدا، گەر ئەم خاڵە لاوازانەی ناو تەفسیرەکەی بکرێت بە بیانووی بڵاوکردنەوەی گومان لەبارەیەوە. چونکە ڕاستی‌یە بنەڕەتی‌یەکانی تەفسیر و شەریعەت زۆر ڕوون و ئاشکران و، بە وێنەی ئەستێرەکان درەخشانن.

ئایا جگە لە ڕاستی و ڕوونیی ئەو ڕاستی‌یانە، چی جورئەت بە دەستەوسانێکی وەك من دەبەخشێ؟ کە ئیددیعا بکەم و، بڵێم:

گەر بە وردی سەیری هەموو یەکێك لە ڕاستی‌یە بنەڕەتی‌یەکانی تەفسیر و فیقهـ بکرێت، دەبینرێت کە:

لە "حەقیقەت"ەوە هەڵقوڵاون و..

بە پێوەری حیکمەت تەرازوو کراون و..

بەرەو حەق دەڕۆن و..

بۆ خۆیشیان "حەق"ن.

شوبهە و گومانە هاتووەکانیش - هەرچی‌یەك بن - لە زەینی چەنەبازێکەوە هەڵقوڵاون و، پاشتر تێکەڵ بەو ڕاستی‌یانە بوون.

هەرکەسێك گومانێکی سەبارەت بە ڕاستی‌یە بنەڕەتی‌یەکانی تەفسیر هەیە، ئەمە گۆڕەپانی کێبەرکێ‌یە، دەبا بێتە پێشەوە!

## پێشەکیی حەوتەم

زیادەڕەوی (المبالغة) ڕەفتارێکە شتەکان بەسەر یەکدا دەشێوێنێ..

چونکە یەکێك لە ڕەفتار و خووەکانی مرۆڤ ئەوەیە کە لەبەر حەز و مەیلی درێژەدانی بە قسەیەك چێژی لێ ببات، دەچێ "ئەندێشە" تێکەڵ بە "ڕاستی" دەکات و، لە دەمی وەسفی شتێکدا حەزی لە هەڵڕشتنی گوفتاری بێ بنەمایە و، بەرەو زیادەڕەوی دەکشێ لە گێڕانەوەکانیدا!

بەم ڕەفتارە نابەجێیە "چاکەکاری" وەکو "خراپەکاری"ی لێ دێت و.. لەوکاتەدا کە دەیەوێ شت زیاد بکات - بێ ئەوەی بە خۆی بزانێت - کەمی دەکاتەوە و.. ئەو وەختەی کە دەیەوێ چاکسازی ئەنجام بدات خراپەی لێ دەوەشێتەوە و.. هەر لەو ڕووەی کە "مەدح"ی پێ دەکات "زەم" سەرهەڵدەدات و.. کە دەیەوێ جوانکاری بکات، ناشیرینی پەیدا دەبێت!!

هۆی هەموو ئەمانەش ئەوەیە کە - بێ ئەوەی بە خۆی بزانێت - دەچێت ئەو جوانییە دەشێوێنێت کە هی گونجاوی و هاوسەنگیی "ئامانجەکان"ە.

جا هەروەك زیادبەکارهێنانی دەرمانێکی شیفابەخش دەیگۆڕێت بە دەرد و نەخۆشی، بە هەمان جۆر ئەو کەسانەش کە لە دەمی تەرغیب و تەرهیبدا ئەو زیادەڕەوییە دەنوێنن کە "حەق" پێویستی پێی نییە، بۆ نموونە: دەچن "غەیبەت" بە وێنەی "قەتڵ" و، "میزکردن بە پێوە" تا ڕادەی "زینا" و، "بەخشینی درهەمێك"یش هێندەی "حەج"ێك بە گەورە پیشان دەدەن، هەروەها وشەکانی تری هاوشێوەیان کە لە هیچ پێوەرێك نەدراون و، زیادەڕەوان بە هەڕەمەکی هەڵیان دەڕێژن.

لە ڕاستیدا ئەو کارەیان سووك سەیرکردنی تاوانی قەتڵ و زینایە و، داشکاندنە لە شان و شکۆی حەج.

لەسەر ئەم بناغەیە، دەبێ مرۆڤی ئامۆژگار (واعظ) کەسێکی دانا و شارەزای داوەرییەکانی ژیری بێت.

بەڵێ، ئەو ئامۆژگارانـەی کـە تـەرازوویان نىيـە و، بـە هەڕەمـەکی و مفتـە قسـە هەڵدەڕێژن، لە ڕاستیدا بوون بەهۆی شاردنەوەی گەلێ ڕاستیی درەخشانی ئایین.

بۆ نموونە:

ئەو زیادەیـەی کـە لـە ڕێـی زیـادەڕەویی قسـەوە خرایـە سـەر موعجیزەی درەخشـانی "لەتبوونی مانگ"، گوایا دوای "لەت بوون" مانگ لـە ئاسمـان هاتـە خـوارەوە و، ڕۆشتە بن هەنگڵی پێغەمبەرﷺ و، پاشان گەڕایەوە بۆ ئاسمان..

ئـەم زیادەیـە، کـارێکی کـرد کـە ئـەو موعجـیزە درەخشـانە خۆرئاسـایە بـە وێنـەی ئەستێرەی "سـوها"[1] پەنـهان بێـت و، ئـەو بەڵگـە مـانگ ئاسـایەی پێغەمبەرایـەتیش وەك مـانگی گـیراو پـەردەی بەسـەردا بدرێـت و، دەرگـای بڕوبیـانووی بێ نرخیشـی خسـتە سەرپشت بۆ ئەوانەی کە ئینکاری دەنوێنن.

**ئەنجامی ئەم قسانە:**

ئەوکەسـەی ئـایینی خـۆش دەوێـت و شـەیدای حەقیقەتـە، دەبێ دڵنیـابێت لـە نـرخ و بـەهای هـەموو شـتێك و، بـە مفتـە و هەڕەمـەکی قسـەکانی هەڵنـەڕێژێت و، سـنوور نەبەزێنێت..

چونکـە "زیـادەڕەوی" - لـە ڕاسـتیدا - قسـە هەڵبەسـتنە بـەدەم توانسـتی خـوای گەورەوە و، نـەبوونی متمانەیـە بـەو کـەماڵ و جوانییـەی لـە جیـهاندان و سووکایەتییە پێیان، کە هێندە ڕوونن "ئیمامی غەزالی"یان وا لـێ کـردووە بڵێـت: "لیس فی الإمکـان أبدع مما کان".

ئەی ئەو بەڕێزەی کە ئەم قسانەی ئاراستە دەکەم!

هەندێ جار "نموونە هێنانەوە" هەمان کرداری "بەڵگە" ڕادەپەڕێنێ.

جا هـەروەك یەك بە یەکی ئەڵماس و، زێڕ و، زیـو و، قوڕقوشـم و، ئاسـن تایبەتمـەندیی خۆی و نرخـی تایبـەت بـەخۆی هەیـە و، هەریـەك لـەم تایبەتمـەندی و نرخانــەش لەیـەکتر جیان..

---

(١) (سوها): ئەستێرەیەکە لە زەوییەوە هێندە بە بچووکی دەردەکەوێ کە بـە ئاسـانی نـابینرێ و، هـەندێ لـە شاعیران و ڕەوانبێژان بە نموونەی بچووکی و وردی دەیهێننەوە. (وەرگێڕ)

ئامانجەکانی ئایینیش – بە هەمان جۆر – لە ڕووی بەڵگە و نرخەوە جیاجیان.

خۆ ئەگەر جێی یەکێکیان "ئەندێشە" بێت، هی یەکێکی تر "ویژدان"ە و، هی ئەوی تر "شوێنی پاراستنی نهێنیی هەموو نهێنییەکان"ە.

ئەگەر کەسێك لە شوێنی بەهای "یەك فلس" یان "دە پارە"دا[1] گەوهەرێك یان لیرەیەکی زێڕ بدات، بە "هەرزە" دادەنرێت و ڕێی خەرجکردن و مامەڵە پێکردنی ماڵ و سامانی خۆیشی لێ دەگیرێت.

خۆ ئەگەر ئەم کێشەیە پێچەوانە ببێتەوە جگە لە وشەی گاڵتە و سووکایەتی چیی تر نابیستێ! چونکە لەبریی ئەوەی ببێ بە کەسێکی بازرگان، کەچی بوو بە فێڵبازێك کە مایەی گاڵتەجاڕیی خەڵکی بێت..

ئەو کەسەش بە هەمان جۆرە کە ڕاستییەکانی ئایین لە یەك جیا ناکاتەوە و، هەریەکەیان ئەو نرخ و بایەخەی شایانیەتی بۆی دانانێت و، نیشانە و مۆری شەریعەت بەسەر هەموو یەکێك لە فەرمان و بڕیارەکانیەوە ناناسێتەوە، کە هەریەك لەو بڕیارانەی شەرع وەکو بەشێك وایە لە چەرخێك کە لەناو کارگەیەکی مەزندا بە دەوری تەوەرەی خۆیدا بخولێتەوە..

جا ئەوانەی کە چەرخەکان لە یەك جیا ناکەنەوە، ئاستەنگ دەنێنەوە لە بەردەم ئەو جووڵەیەدا..

حاڵی ئەوانە وەك هی کەسێکی نەزانە کە چەرخێکی بچووك و وردیلە لە مەکینەیەکی گەورەدا دەبینێ و دەیەوێ چاکسازی و گۆڕانکاری لەو بارودۆخە ڕێکوپێکەدا ئەنجام بدات، بەڵام لەبەر ئەوەی تەبایی شیاوی ئەنجامی ئەو جووڵەیە نابینێت کە لە نێوان چەرخە بچووك و مەکینە گەورەکەدایە و، هیچ شتێکیش لە زانستی ماشینسازی نازانێت، وێڕای لەخۆبایی بوونی دەروونیش کە بە ڕوانینی ڕووکەش و ڕواڵەتی هەڵی دەنێ و دەیخەڵەتێنێ، دەبینی – بێ ئەوەی بە خۆی بزانێت – سیستەمی کارگەکە دەشێوێنێت و، دەبێت بە بەڵایەك بەسەر خۆیەوە.

---

(١) پارە: پارچە دراوێکی نەختینەیە یەکسانە بە چارەکە قورشێك. بەڵام لیرە: دراوێکی ئاڵتوونییە لە سەد قورش پێکهاتووە. بڕوانە: "المعجم الاقتصادي الاسلامي". (وەرگێڕ)

**پوختەی ئەم قسانە:**

خوای گەورەی خاوەن و دانەری شەریعەت، سكە و مۆری پشت پێ بەستراوی خۆی لە هەموو یەكێكی فەرمانەكانی شەرع داوە، دەبێ ئەو سكە و مۆرە بخوێنرێتەوە. ئەو بڕیارەی شەرع پێویستی بە هیچ نیيە جگە لە سكە و نرخ و بەهای خۆی و، پەكی لەسەر ڕازاندنەوە و دەست تێوەردانی ئەوانە نەكەوتووە كە كاریان زیادەڕەوی و لاف و گەزافێكی لەڕادەبەدەر و نەخشاندنی وشەكانە.

دەسا با ئەوانەی كە بە مفتە و هەڕەمەكی قسەكانیان هەڵدەڕێژن، بزانن چەندە لە بەرچاوی "حەقیقەت"دا بێزلێكراو دەبن كە - بەو جۆرە - ئامۆژگاریی كەسانی تر دەكەن.

بۆ نموونە:

یەكێك لەوانە، ئەو سەرزەنشتەی پێ سەروزیاد نەبوو كە لە شەرعدا هەیە بۆ دوورخستنەوەی خەڵكی لە ماددە مەستكەرەكان، بەڵكو لە بەردەم كۆمەڵێكی زۆری خەڵكیدا قسەيەكی وەهای لە زار دەرچوو كە شەرم دەكەم بینووسم و، دوای نووسینی كوژاندمەوە!

دەسا كاكی برا!

تۆ بەم قسانەت دوژمنایەتی لەگەڵ "شەریعەت"دا دەكەیت! تەنانەت گەر دۆستیش بیت هێشتا هەر جگە لە "دۆستێكی گەوج" زیاتر نابیت و، زیانت بۆ ئایین پتر لە هی دوژمنەكەيەتی.

**كۆتایی:**

ئەی ئەو ستەمكارانەی كە لە دوورەوە هەوڵی ڕەخنە گرتن و زامداركردنی ئیسلام دەدەن!

هەموو شتێك بە داوەریی ژیری بپێون و لێكی بدەنەوە و، بە ڕوانینی ڕواڵەتی قایل مەبن و، پێیشی مەخەڵەتێن. چونكە ئەوانەی كە بوون بەهۆی ڕەخنە لاوازەكانتان لە ئیسلام، لە زمانی شەریعەتدا پێیان دەوترێ: "علماء السوء" (زانایانی خراپكار)..

دەسا لە پشتی ئەو پەردەیەوە بۆ ئیسلام بڕوانن، كە "بێ پێوەری"ی ئەوان و دەستگرتنی توندیان بە ڕواڵەتەوە بەرهەمی هێناوە.. ئەو كاتە دەبینن كە هەموو یەكێك لە

ڕاستی‌یەکانی ئیسلام بەڵگەیەکی ڕووناکی وەك ئەستێرەی درەخشانە و، نەخشی ئەزەل و ئەبەدی لەسەر دەدرەوشێتەوە.

بەڵێ، ئەوەی لە گوفتاری ئەزەلی‌یەوە هاتووە، بەرەو ئەبەد و هەمیشەیی دەڕوات. بەڵام - بە داخەوە - کەسی وا هەیە ئۆباڵەکانی خۆی دەخاتە ئەستۆی کەسانی تر، تاکو خۆی بێ گوناهـ دەربکات! کە ئەوەش ئەنجامی خۆشویستنی خۆی و، لایەنگرتنی دەروونی و، دەستەوسانی و، خۆپەرستی و، لەخۆبایی بوونیەتی. ئیتر بەو جۆرە، گوفتارەکەی خۆی کە گریمانی هەڵەی هەیە و کردارەکانیشی کە هەڵدەگرێ هەڵە بن، دەداتە پاڵ کەسێکی ناسراو، یان کتێبێکی باوەڕپێکراو. تەنانەت هەندێ جار دەیگێڕێتەوە بۆ ئایین، زۆر جاریش بۆ فەرموودەی پیرۆز، لە کۆتاییدا بۆ قەدەری خوای گەورە.. مەبەستیشی تەنها بە بێ گوناهـ دەرکردنی خۆیەتی!!

حاشا هەرگیز ئەم کارە ڕەوا نی‌یە.. چونکە "تاریکی" لە "ڕووناکی"یەوە سەرهەڵنادات. تەنانەت گەر ئەو ئەستێرانەش داپۆشێت کە لەناو ئاوێنەکەی ئەودا دەبینرێن، ئەوا هەرگیز ناتوانێ ئەستێرەکانی ئاسمان بشارێتەوە و دایانپۆشێت، بەڵکو هەر تەنها خۆیەتی کە لە توانای بینیندا دەستەوسانە!

ئەی بیانووگری بەڕێز!

قۆزتنەوەی ئەو گومانانەی کە ئەنجامی تێگەیشتنی هەڵەن لە ئیسلام و، هی بارودۆخە شێواوەکانی ئاکامی ڕەفتار نەکردنن بە شەریعەت، وەك بیانوویەك بۆ ناشیرین کردنی ئیسلام، ستەمێکی ئابڕووبەرە..

ئەم کارە وەك هی ئەو دوژمنە وایە کە هەر هۆکارێکی دەست بکەوێ دەیکاتە بیانووی دەستی بۆ تۆڵەسەندنەوە..

یاخود وەك ڕەفتاری ئەو منداڵە وایە کە بە هەموو بڕوبیانوویەکی نابەجێ دەست دەکات بە گریان!

چونکە مەرج نی‌یە - لە واقیعدا - هەموو سیفەتێکی کەسی موسڵمان لە ئایینی ئیسلامەوە سەرچاوەی گرتبێ!

## پێشەکیی هەشتەم

**سەرەتا:**

لەم پێشەکی‌یە دوور و درێژەی کە دێت بێزار مەبە، چونکە کۆتاییەکەی لەڕادەبەدەر گرنگە. جگە لەمەش، ئەو "نائومێدی"یە ناهێڵێت کە لەناوبەری هەموو شتێکی کامڵ و بێ کەموکووڕی‌یە و، ژیان لەو هیوا و "ئومێد"ەشدا دەبووژێنێتەوە کە گەوهەر و هەوێنی هەموو بەختەوەری‌یەکە و، مژدەمان دەداتێ کە "داهاتوو" هی ئێمەیە و "ڕابوردوو"ش بۆ غەیری ئێمە دەبێت. کەواتە بەو دابەشکردنە ڕازی بووین..

ئەمەش بابەتی پێشەکی‌یەکەیە کە: سازدانی بەراوردێکە لە نێوان ڕۆڵەکانی "ڕابوردوو" و نەوەکانی "داهاتوو"دا. ئەوەتا خوێندنگا بەرزەکان ئەلفوبێی تێدا ناخوێنرێت. خۆ تا چەندەش گەوهەر و ناوەڕۆکی زانست مەزن بێت، ئەوا هەر شێوەی وتنەوەی جیایە لە ماهییەت و ناوەڕۆکی[1].

بەڵێ، "ڕابوردوو" قوتابخانەی هەست و نەستە ماددی‌یەکانە.. بەڵام "داهاتوو" قوتابخانەی هزر و بیرەکانە. کەواتە لەسەر یەك تەرز و شێوە نین.

مەبەستیشم لە ڕۆڵەکانی "ڕابوردوو":

سەدەکانی بەرایی و ناوەڕاستی پێش سەدەی دەهەمی ناموسڵمانەکانە.. بەڵام نەتەوەی ئیسلام: سێ سەدەی یەکەم باشترین سەدە(خير القرون)یە و، نەتەوەیەکی باشە هەتا سەدەی پێنجەم. بەڵام دوای ئەوە هەتا سەدەی دوازدەهەم بە "ڕابوردوو" ناوی دەبەم..

---

(١) لەوانەیە مەبەستی دانەر ئەوە بێت کە شێوەی گەیاندنی زانست بە پێی کات و ڕۆژگار دەگۆڕێت. بۆ نموونە: ئەو زانستەی کەسانێك دەیخوێنن کە لە سەرەتای خوێندندان جیایە لەوەی کە ئەوانە دەیخوێنن گەیشتوونەتە قۆناغە باڵاکانی خوێندن.. هەروەها ئەو شتانەی ڕۆڵەکانی ڕابوردوو زانیویانە جیاوازە لەوەی کە دەبێ ڕۆڵەکانی ئێستا و نەوەکانی داهاتوو بیزانن. (وەرگێڕی چاپی عەرەبی).

مەبەستم لە "داهاتوو" سەدەکانی دوای سەدەی دوازدەهەمە[1].

*دوای ئەمە..*

هەروەك زانراوە، ئەو شتەی کە زاڵ و دەمڕاستە بەسەر هەڵسووڕاندنی کاروبارەکانی مرۆڤدا:

ژیری، یان بینینە..

بە دەستەواژەیەکی تر: هزرەکان، یان هەستە ماددیيەکانە..

حەق، یان هێزە..

حیکمەت، یاخود حکوومەتە..

مەیلەکانی دڵە، یان بۆچوونە جۆراوجۆرەکانی ژیرییە..

"هەوا"یە، یاخود "هودا"یە.

*جا لەسەر ئەم بناغەیە:*

دەبینین خولق و خووی ڕۆڵەکانی ڕابوردوو، کە هەندێ پاکی و بێگەردییان لەخۆ گرتبوو، هەروەها هەست و نەستەکانیشیان - کە تا ڕادەیەك پاك و پوخت بوون - "بیروبۆچوون"ە دوور لە ڕووناکییەکانی ئەوانیان بەکاردەهێنا و بەسەریاندا زاڵ بوون. ئیتر لە ئەنجامی ئەمەدا "کەسایەتییەکان" سەریان هەڵدا و، "جیاوازییەکان" زاڵ و دەمڕاست بوون..

بەڵام "بیروبۆچوونەکان"ی نەوەکانی داهاتوو - کە تا ڕادەیەك چەند بیرێکی ڕووناکن - بەسەر ئەو "هەستانەیان"دا زاڵ بوو کە بە هەوا و ئارەزووەکان تاریك داهاتووە و، هەموو ئەوانەشی بۆ خۆی خستەکار..

لەمەوە بە دڵنیایی ڕوون دەبێتەوە کە زاڵ و دەمڕاستی "ئایندە" مافە گشتییەکان دەبێت و، بەمەش تا ڕادەیەك "مرۆڤایەتی" کەوتە ڕوو.

ئەم دیاردەیەش مژدەمان دەداتێ کە ئەو ئایینی "ئیسلام"ەی لە ڕاستیدا "مرۆڤایەتیی هەرە مەزن"ە، بە وێنەی خۆری درەخشانی دەمی نیوەڕۆ، بەسەر ئاسمانی "ئایندە" و باخچەکانی "ئاسیا"دا هەڵدێت.

---

(١) واتە: سەدەی دوازدەهەمی کۆچی. (وەرگێڕ)

لەبەر ئەوەی هەستە ماددىیەکان و، حەز و مەیلەکان و، ئەو هێز و زەبرەش کە بەرهەمهێنی ئامانجە دەروونییەکان و نەیاری و حەزی زالبوونە بەسەر کەسانی تردا، لە دۆڵ و شیوەکانی "ڕابوردوو"دا زاڵ و دەسەڵاتدار بوو، ئەوا "قەناعەت پێکردن" لە ڕێی قسە و گوفتارەوە سەروزیادی ڕێنمایی کردنی خەڵکی ئەو ڕۆژگارانە بوو..

چونکە وێنەکێشان و ڕازاندنەوە و بە گەورە پیشاندانی هەر "خواست"ێك و ڕاهێنانی لەگەڵ ئەندێشەدا، ختووکەی هەستە ناسکەکان دەدات و، کاریگەریی خۆی لە حەز و ئارەزووەکاندا بەجێ دەهێڵێت. ئیتر ئەمە - لە ڕابوردوودا - جێی بەڵگەهێنانەوەی دەگرت.

بەڵام قیاس کردنی خۆمان لەسەر ئەوان، وەرچەرخان دەگەیەنێت بەرەو دواوە و، خۆترنجاندن دەبێت لە زەمەنی ئەواندا.. چونکە هەر کات و سەردەمێك حوکم و بڕیاری تایبەت بە خۆی هەیە. ئەوەتا ئێمە داوای "بەڵگە" دەکەین و، بە وێنەکێشان و ڕازاندنەوەی "خواست"ەکان ناخەڵەتێین.

مادەم سەرچاوەی بە هەڵم بوونی دانایی لە بیابانی کاتی "ئێستا"مان و، ڕەوێنەری هەوری باراناوی بۆ چیاکانی "داهاتوو" بریتییە لە: (هزر و ژیری و حەق و حیکمەت) کە تازەکی حەزی گەڕان بە دوای ڕاستیدا و، ئەوینی حەق و، زاڵکردنی سوودی گشتی بەسەر هی تایبەتیدا و، سەرهەڵدانی حەز و ئارەزووە مرۆییەکان، بەرهەمی هێناون، ئەوا "خواستەکان" بە بێ هێنانەوەی "بەڵگەی گومان بڕ" لای کەس ناسەلمێن.

کەواتە ئێمەی نەوەی "ئێستا" و دەستنیشان کراو بۆ "داهاتوو" هەرگیز وێنەکێشان و ڕازاندنەوەی "خواست" زەینمان تێر ناکات، بەڵکو داوای بەڵگەی لەسەر دەکەین.

دەبا کەمێك لە خراپە و چاکەی "ڕابوردوو" و "ئاینده" باس بکەین کە وەکو دوو دەسەڵاتدار وان:

لە "ڕابوردوو"دا زۆربەی جار: هێز و، هەوا و ئارەزوو، سروشت و، حەز و مەیل و، هەستەکان زاڵ و دەمڕاست بوون..

لەبەر ئەوە، یەکێك لە لایەنە خراپەکانی ڕابوردوو لەوەدایە کە - هیچ نەبێ بە شێوەیەکی گشتی - ئیستیبداد و خۆسەپاندن و خۆشویستنی کەسێك لەسەر حسابی

دوژمنایەتیی کەسانی تر و، زاڵ بوونی دژایەتی کردنی ڕێبازەکانی تر بەسەر خۆشویستنی ڕێبازی خۆیدا و، خۆهەڵقورتاندنی پابەندبوون بە شتێکەوە لەناو شتانی تردا و دەمارگیری بۆی و، لایەنگیرییەك کە ڕێ لە دەرکەوتنی "ڕاستی" بگرێت، لە هەموو شتێکی ئەو سەردەمەدا هەبووە.

**ئەنجامی ئەم قسانە:**

لەبەر ئەوەی حەز و مەیلەکان جۆراوجۆرن، ئەوا خۆهەڵقورتاندنی هەست و شعوور بە "لایەنگیری" لە هەموو شتێکدا و، سەرهەڵدانی پشێوی لە ڕێی جیاوازییەکانەوە، کارێکیان کرد کە لەو سەردەمەدا "ڕاستی" قوتار بێت و خۆی بشارێتەوە.

پاشان یەکێك لە لایەنە بەدەکانی خۆسەپاندنی هەست و نەست، دامەزرانی ڕێباز و ڕێچکەکانە - زۆربەی جار - لەسەر بنەمای "دەمارگیری".. یان لەسەر چەواشە کردن و بە گومڕا دانانی کەسانی تر.. یان لەسەر "سەفسەتە"[(١)].

لەکاتێکدا کە ئەم سیانە لە ڕووی شەرعەوە زەم کراون و، دژی برایەتیی موسڵمانانەن و، پەیوەندیی هاوڕەگەزی (مرۆیی) لێك دەترازێنن و، پێچەوانەی هاوکاریی سروشتین، بە ڕادەیەك کە ئەوانە کەسی وایان هەیە لە دواییدا ناچار دەبێ ڕێچکە و ڕێبازەکەی خۆی بە یەکجاری بگۆڕێت و تەسدیقی یەکدەنگی و تەواتوری خەڵکی بکات و دەستبەرداری دەمارگیری و سەفسەتە ببێت!

کەچی ئەگەر لە سەرەتاوە لە بریی "دەمارگیری" پەیڕەوی "حەق"ی بکردایە و، لە جیاتی "سەفسەتە" شوێن "بەڵگە" بکەوتایە و، لە جێی ئەوەی خەڵکی بە هەڵە دابنێ هەوڵی یەکخستنی بۆچوونە جیاجیاکانی بدایە و، شوورای جێبەجێ بکردایە، ئەوا هەرگیز تەنانەت بەشێکی کەمی ڕێچکە و ڕێبازە "حەق"ەکەی خۆی نەدەگۆڕی، ئەگەر هەموو دنیاش لە دژی هەڵبسانایە!

---

(١) "سەفسەتە" لە زانستی مەنتیقدا: قیاسێکە لە "وەهمیات" پێکهاتووە. ئەم وشەیە لە ڕەفتاری "سۆفستائی"یەکانەوە داتاشراوە، کە بە زمانزانی و فێڵبازی دەچوون لە دەمی گفتوگۆدا حەقیان بە ناحەق و، ناحەقیشیان بە حەق، پیشان دەدا! (وەرگێڕ)

بەڵام لەبەر ئەوەی لە سەدە باشەکان و چەرخەکانی پێشینیاندا، کە خەڵکانی چاك و بۆ خوا سوڵحاو بوون: حەق و، بەڵگە و، ژیری و، شوورا، زاڵ و دەمڕاست بوون، ئەوا جێی شك و گومانەکان لەناویاندا نەدەبووەوە.

هەروەها دەبینین بەهۆی بڵاوبوونەوەی زانستەکان لە سەردەمی ئێستادا و، زاڵبوونی تەواوەتییان – بە پشتیوانیی خوا – لە داهاتوودا، ئەوا لە بریی هێز "حەق" و، لە جیاتیی دەمارگیری و سەفسەتە "بەڵگە" و، لە جێی هەستە ماددی‌یەکان "پەرۆشی" و، لە بریی سروشت "ژیری" و، لە جیاتی هەوا و ئارەزوو "هودا" زاڵ دەبێت، بە وێنەی سەدەکانی یەکەم و دووهەم و سێ‌هەم هەتا پێنجەمیش بە شێوەیەکی گشتی. بەڵام لە دوای سەدەی پێنجەمەوە هەتا ئێستا "هێز" بەسەر "حەق"دا زاڵ بووە!

یەکێکی تر لە لایەنە باشەکانی دەستەڵات پەیدا کردنی هزر و بیرەکان ئەوەیە کە:

خۆری ئیسلام ڕزگاری بوو لە هەوری ئەو وەهم و ئەندێشانەی دایانپۆشیبوو، تەنانەت هەموو یەکێك لە ڕاستی‌یەکانی ئەو خۆرە خەریکن ڕووناکیی خۆیان پەخش دەکەن، بگرە کەسانی گەنیوی ناو زۆنگاوی ئیلحادیش خەریکن سوود لەو ڕووناکی‌یە وەردەگرن.

یەکێك لە چاکەکاری‌یەکانی ڕاوێژی هزرەکان:

دامەزرانی بیروباوەڕ و ڕێبازەکانە لەسەر بەڵگە گومان بڕەکان و، پەیوەست کردنی ڕاستی‌یەکانە بەو حەقە جێگیر و دامەزراوەی کە پشتگیر و یاریدەدەری هەموو کەماڵێکە. دیارە ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە هزرەکان نەخەڵەتێنرێن و پۆشاکی حەق بە باڵای ناحەقدا نەبڕێت!

ئەی برا موسڵمانەکان!

باری "ئێستا" بە زمانی حاڵ مژدەمان دەداتێ کە ناوەرۆکی: ﴿جاء الحـــق وزهـــق البـــاطل﴾ (الاسراء:٨١) گەردنی بەرز کردووەتەوە و، بە دەست ئاماژە بۆ "داهاتوو" دەکات و، بە دەنگی بەرز ڕایدەگەیەنێت کە:

فەرمانڕەوای خاوەن دەسەڵات بەسەر ڕۆژگار و سروشتەکانی مرۆڤدا هەتا ڕۆژی قیامەت "ڕاستیی ئیسلام" دەبێت، کە بریتی‌یە لە دەرکەوتنی دادگەریی ئەزەلیی خواوەند

لـە جیـهانی "بـوون"دا و، مرۆڤایـەتیی هـەرە مەزنـە. تەنانـەت چاکەکاریـەکانی شارستانێتی – کە مرۆڤایەتیی بچووکە – پێشەکیی ئەوەن!

ئایا نـابینرێت کـە پێشـکەوتن و ڕوونبوونـەوەی هـزر و بیرەکـان، هـەموو چینـەکانی تەپوتۆزی وەهم و ئەندێشەی لە سەرشانی ڕاستییەکانی ئیسلام تەکاندووە!

ئەمەش دەریدەخات کە ڕاستییەکانی ئیسلام، کـە ئەستێرەی ئاسمـانی هیدایـەتن، لـە داهاتوودا بە تەواوی دەردەکـەون و پـتر درەخشـان دەبن و دەدرەوشـێنەوە، بـە کوێرایـی چاوی دوژمنان.

ئەگـەر پێـت خۆشـە، فـەرموو بڕۆرە نـاو "ئایندە"وە و ببینـە کـە ئـەو کەسـەی لـەناو "خواپەرستیی سێ کوچکـەدا" بـە دوای "یەکتاپەرستی"دا دەگـەڕێت چـۆن بـە چەنـەباز دادەنرێت و شکست دەهێنێت، گەر ڕووبەڕووی ئەوانە ببێتەوە کە دەستیان لـە بـاوەڕی حـەق و ڕاسـت گـیر کـردووە و شمشـێری بەڵگـەیان هـەڵبڕیوە، کـە باوەڕێکـە "یەکتاپەرستی"ی خاوێن پێی قایلە و، ژیریی ساغ و باوەڕی تەواو داخوازی دەبن!

سوێند بێ بە قورئانی خاوەن شێوازی حەکیم، کە جگـە لـە پـەراوێزکردنی ژیـری و، بـەدەرنانی بەڵگـە و، چاولێکـەریی ڕاهیبـەکان، هیـچ شتێکی تـر گـاوران و هاوشـێوەی ئەوانی هەڵنەداوەتە ناو دۆڵ و شیوی گومڕایی..

هـەروەها هیـچ شـتێك وای لـە "ئیسـلام" نـەکردووە کـە هەمیشـە ڕوون بێـت و، ڕاستییەکانی ئاشکرا بین و، بە ڕێژەی کرانـەوە و بـەرفراوانیی بیر و هزرەکـانی مـرۆڤ ئـەویش کرانـەوە و فراوانـی بەدەسـت بـهێنێت، جگـە لـەوەی کـە لەسـەر "حەقیقـەت" دامەزراوە و، شمشێری بەڵگەی بە دەستەوەیە و، ڕاوێژ بە ژیری دەکات و، لەسەر تـەختی حەقیقـەت نیشتەجێیە و، لەگـەڵ یاسـا و دەسـتوورەکانی ئـەو حیکمەتـەدا یەکاویـەك و پڕاوپڕە کە لە ئەزەلەوە بەرەو ئەبەد زنجیرەی بەستووە و، چاوی لـێ دەکات!

ئایا نابینرێ کە چۆن قورئانی پیرۆز لە سەرەتا و کۆتایی زۆربەی ئایەتەکانیدا مـرۆڤ ڕەوانەی ویژدان و ڕاوێژی ژیری دەکات و، دەفەرموێ:

﴿أفلا ينظرون﴾ (الغاشية: ١٧) و..

﴿**فانظروا**﴾ (العنكبوت: ٢٠) و..

﴿**أفلا يتدبرون**﴾ (محمد: ٢٤) و..

﴿**أفلا تتذكرون**﴾ (الأنعام: ٨٠) و..

﴿**تتفكروا**﴾ (سبأ: ٤٦) و..

﴿**ما يشعرون**﴾ (البقرة: ٩) و..

﴿**يعقلون**﴾ (البقرة: ١٦٤) و..

﴿**لا يعقلون**﴾ (البقرة: ١٧١) و..

﴿**يعلمون**﴾ (الأنعام: ٩٧) و..

﴿**فاعتبروا يا أولي الابصار**﴾ (الحشر: ٢).

منیش لە لایەنی خۆمەوە دەڵێم:

(فاعتبروا يا أولي الألباب)!

ئەی خاوەن دڵ و ژیرییەکان! پەند وەربگرن!

**کۆتایی:**

دەسا ئەی خاوەن دڵ و ژیرییەکان!

فەرموون لە "ڕواڵەت"ەوە بچنە ناو "حەقیقەت" ئەوەتا حەقیقەت چاوەڕوانتانە!

جا ئەگەر چاوتان پێی کەوت، ئازاری مەدەن.. چونکە دەبێ بەو جۆرە بێت و، هەروەهاش پێویست دەکات.

## پێشەکیی نۆهەم

لە لای ژیری‌یە ساغەکان سەلماوە کە:

"خێر" بناغەیە لە جیهاندا، بەڵام "شەڕ" پاشکۆیە. کەواتە "خێر" شتێکی هەمەکی(کوللی) و "شەڕ"یش شتێکی هەندەکی(جوزئی)یە.. چونکە:

بە چاو دەبینرێ کە هەریەك لە "جۆرەکان"ی بوونەوەرانی جیهان زانستێکی تایبەت بە خۆی بۆ پێکهاتووە و، ئێستاش هەر پێکدێت. خۆ دیارە "زانست"یش بریتی‌یە لە چەند دەستوورێکی هەمەکی. جا ئەگەر دەستوور "هەمەکی" بێت، ئەوا جوانی و ڕێکوپێکی ئەو "جۆر"ە دەردەخات. واتە: هەموو یەکێك لە زانستەکان شایەتێکی ڕاستن لەسەر ڕێکوپێکیی بەدیهاتووان.

بەڵێ، "هەمەکیتی" بەڵگەی ڕێکوپێکی‌یە.. چونکە هەر شتێك ڕێکوپێکیی تێدا نەبێت بڕیارەکەشی هەمەکێتیی تێدا نابێت، بەڵکو لەبەر زۆریی هەڵاوێرەکان(استثناء)ی بڕیارێکی لاواز دەبێ. ئەو شتەش کە ئەم شایەتانە تەزکیە دەکات بریتی‌یە لە پشکنین و لێکۆڵینەوەی تەواو(الإستقراء التام)[1] بە چاوی "دانایی". بەڵام هەندێ جار لەبەر فراوانیی بازنەکەی لەچاو بازنەی مەودای بینیندا ئەو ڕێکوپێکی‌یە نابینرێت، کەواتە لە هەلومەرجی وەهادا ناتوانرێ هەموو لایەنەکانی ببینرێ و تەسەوور بکرێت، دیارە ئەو کاتەش دژوارە کە "ڕێکوپێکی" خۆی دەربخات.

لەسەر بناغەی ئەمانەی پێشوو:

---

(١) پشکنین و لێکۆڵینەوەی تەواو(الإستقراء التام) لە زانستی "مەنتیق"دا بریتی‌یە لە بڕیاردان لەسەر "هەمەکی" بەو شتانەی کە لە هەموو بەشە "هەندەکی"یەکانیدا، یان لە هەندێکیاندا هەبێت. بۆ نموونە: بەو پێوەرە دەتوانیت بڕیار بدەیت کە وەچەی مرۆڤ توانای قسە و گوفتاری هەیە. ئەمە بڕیارێکی هەمەکی‌یە و، ئەنجامی لێکۆڵینەوەیە کە دەری خستووە کە هەموو مرۆڤەکان، یان زۆربەیان، توانای قسەکردنیان هەیە، بە پێچەوانەی زیندەوەرانی تر. وەك ئاشکرایە زۆربەی زانستەکانی مرۆڤ لەم ڕێیەوە بەدەست دێن. (وەرگێڕ)

بە شایەتیی سەرجەم زانستەکان و، پشت ڕاستکردنەوەی ئەو لێکۆڵینـەوە و پشـکنینە تەواوەی کە ئەنجامی بینینە بە ڕوانینی دانایی، سەلماوە کە:

تەنـها خـودی "جوانـی و، خـێر و، حـەق و، کـەماڵ" مەبەسـت و زاڵـی ڕەهـان لـە بەدیهێنانی جیهاندا..

بەڵام "شەڕ و، ناشیرینی و، ناحـەق" چـەند شتێکی پاشکۆ؛ بێ دەسـەڵات؛ بەزیوو؛ داپۆشـراون، تەنانـەت گـەر هـێز و دەسەڵاتێکیشیان ببێـت هـەر شـتێکی کـاتی و کـەم خایەنە.

هەروەها چەسپاوە کە:

بەڕێزترین بەدیهاتووان: ئادەمیزادە.. کارامەیی و توانا و لێهاتنەکانی شایەتیی ئەوەی بۆ دەدەن..

سـەربەرزترین ئادەمیزادەکـان: موسـڵمانە ڕاسـتەکانن، کـە شـوێنکەوتەی حـەق و ڕاستین.. ڕاستییەکانی ئیسلام شـایەتیی ئـەوەیان بـۆ دەدەن، هـەروەك ڕووداوەکـانی داهاتووش تەسدیقیان دەکەن.

هەروەها سەلماوە کە:

کاملـترینی ئـادەمیزادە مـوسـڵمانە ڕاسـتەکان: حـەزرەتی موحـەممەدە ﷺ.. موعجیزات و ئاکارە بەرزەکانی شایەتیی ئەوەی بۆ دەدەن، هەروەك زانا لێکۆڵـەرەکانی ئادەمیزاد تەسدیقی دەکەن، تەنانەت دوژمنانیش ئەوە دەسەلمێنن.. دەشبێ بیسەلمێنن!

جا مادەم ئەم سیانە بەم جۆرەن..

ئایـا جۆر و ڕەگـەزی مـرۆڤ دەتوانـێ، بـەهۆی بەدبەختی و لـەڕێ ترازانـی خـۆی، شـایەتیی ئـەو زانسـتانە زامـدار بکـات و.. ئـەنجامی ئـەو پشـکنینە گشـتی و تـەواوە هەڵبووەشێنێتەوە و.. لە ویستی پەروەردگاری خۆی هەڵبگەڕێتەوە؟!

نەخێر نەیتوانیوە و هەرگیز ناشتوانێت!

سوێند بێ بـە خـوای گـەورەی بەخشـندە و دڵۆڤـان و دادوەر و دانـا، گـرۆی مـرۆڤ ناتوانـێ بـە سـووك و ئاسـانی "شـەڕ و، ناشـیرینی و، ناحـەق" هـەرس بکـات و، دانسـتی خـوای گـەورەش ڕێـی پێ نـادات.. چونکـە هەرکەسێ دەستدرێژی بکاتـە سـەر مافـە گشتییەکانی بوونەوەران هەرگیز لێخۆشبوون نایگرێتەوە و بوار نادرێ بە سزا نەدانی.

بەڵێ، زاڵبوونی شەڕ بە درێژایی هەزاران ساڵ، ئەنجامەکەی تەنها ژێرکەوتنێکی ڕەهای لانی کەم هەزار ساڵ دەبێت لەم دنیادا. بەڵام لەودنیادا "خێر" بڕیاری ئیعدامی هەتاهەتایی بۆ "شەڕ" دەردەکات!

دەنا گەر وا نەبێت ئەوا سەرجەم ڕەگەز و جۆرەکانی تری بوونەوەران، کە سەرتاپا ڕێکوپێك و کامڵ و گوێڕایەڵی فەرمانە ڕێکەکانی خوای گەورەن، لە نێوان خۆیاندا ڕێ بەم مرۆڤە سپڵە و بەدبەختە نادەن و مافی بوونی لە ناویاندا هەڵدەوەشێننەوە و، بەرەو نشینگەی عەدەم و تاریکستانی نەبوون دەینێرن و، لە کارمەندیی سروشتیی بەدیهاتن بەدەری دەنێن..

چونکە زاڵبوونی "شەڕ" بەسەر "خێر"دا داخوازی هەڕەمەکێتی و بێ ئامانجیی ئەو لێهاتن و حەز و مەیلانەیە کە لە نێوان تواناکانی مرۆڤدا دانراون بۆ ئەوەی ببێتە سەروەری جیهان و، بەختەوەریی هەمیشەیی ئەودنیایان پێ بەدەست بهێنێت. لە کاتێکدا کە هەڕەمەکێتی و بێ مەبەستی دژی ئەنجامەکانی پشکنین و لێکۆڵینەوەکانە، هەروەك پێچەوانەی دانایی بەدیهێنەری دانایە و، نەیاری بڕیارەکانی پێغەمبەری ئەمین و ڕاستگۆیە، دروودی خوای لەسەر بێت.

"داهاتوو" هەندێ لەم دەعوایانە دەپاڵێوێت. بەڵام پاڵاوتنی کۆتایی لە دوارۆژدا دەبێت. لەبەر ئەوەی "داهاتوو" - بێ ڕەچاوکردنی کەسەکان - گۆڕەپانی سەرکەوتنی "حەق" و "جوانی"ی نەوعی و گشتییە. جا ئەگەر ئێمە - کەسەکان - تا ئەو کاتە مردین، ئەوا نەتەوەکەمان زیندووە. لەبەر ئەوە، بە سەرکەوتنی ماوەی چل ساڵ ڕازی نابین، بەڵکو لانی کەم هەزار ساڵمان دەوێت.

بەڵام گۆڕەپانی سەرکەوتن و زاڵبوونی: "جوانی و، خێر و، کەماڵی کەسی و گشتی و هەندەکی و هەمەکی" هەروەها دادگا مەزنەکەیان کە مرۆڤیش وەك برایانی لە بوونەوەرە گوێڕایەڵەکان پاداشت دەدرێتەوە تیایدا و، بەگوێرەی توانا و لێهاتنەکانی خەڵات دەکرێ، تەنها قیامەت و ئەودنیایە، کە حەق و دادگەریی ڕاستەقینە و بێگەردی تێدا بەرجەستە دەبێت.

بەڵێ، ئەم دنیا بچووك و بەرتەسکە، نە هێندە فراوانە و، نە دەستیش دەدات بۆ ئەوەی کە توانا بێ سنوورەکان و حەز و مەیلە بۆ ئەبەد خولقاوەکانی گەوهەری مرۆڤی تێدا گەشە بکەن و گوڵ بگرن. لەبەر ئەوە، ڕەوانەی جیهانێکی تر دەکرێن، تاکو پێی بگەیەنرێن و، ئەو حەز و مەیل و تواناییانەشی پوخت و کامڵ ببن.

گەوهەر و حەقیقەتی مرۆڤ گەلێ مەزنە و، تاوانەکەشی یەکجار گەورەیە و، گوێڕایەڵی کردنیشی تابڵێی گرنگە. کەواتە لە بەدیهاتووانی تر ناچێت. لەبەر ئەوە، ناکرێ لە ڕشتەی بوونەوەرانی تردا بە ڕێکوپێکی ڕیز نەبەستێ و، گوێڕایەڵی فەرمانەکان نەبێت!

بەڵێ، ئەو کەسەی بۆ هەتاهەتایی پاڵێوراوە، کەسێکی مەزنە.. لەبەر ئەوە، پشتگوێ ناخرێ و بەدیهێنانیشی هەڕەمەکی و بێ مەبەست نابێ و، بڕیاری نەمانی ڕەهای لەسەر دەرناکرێ و، بەرەو نەبوونی تەواوەتی ناڕوات.. بەڵکو لە لایەك دۆزەخ دەمی بۆ واڵا کردووە و، لەولاشەوە بەهەشت ئامێزی سۆز و نیانی خۆی بۆ گرتووەتەوە.

**کۆتایی:**

وەك لە دوورەوە دەبینرێ:

ئایندەی ئیسلام و ئاسیا لەوپەڕی ڕوونی و گەشیدایە، چونکە چوار پێنج هێز هەن کە ناتوانرێ بەرگری بکرێن و، هەموویان لەسەر دەسەڵات گرتنە دەست و سەروەریی ئیسلام بەسەر ئاسیادا، هەر لە سەرەتاوە تا کۆتایی، یەکیان گرتووە:

**هێزی یەکەم:**

هێزی ڕاستەقینەی ئیسلامە، کە بە زانست و شارستانێتی پشتی گیراوە.

**هێزی دووهەم:**

ئەو پێویستییەی کە بە زۆربوونی هۆکارەکان و کامڵ بوونی بنەماکان پڕچەك کراوە.

**هێزی سێهەم:**

کێبەرکێ و ئێرەیی و ڕقی شاڕراوە، چەند هاندەرێکن ئامادەباشی بۆ ئەو ڕابوونە دەکەن کە ئەنجامی بینینی ئاسیایە لەوپەڕی نزمی و غەیری ئەویش لەوپەڕی خۆشگوزەرانیدا.

**هێزی چوارەم:**

تواناکانی سروشتی مرۆڤە، کە پڕچەك کراوە بە:

یەکخستنی وتە و گوفتار، کە دەستووری یەکتاپەرستانە و..

ڕەوشت جوانی و میانەڕەوی، کە تایبەتمەندیی باری ئێستایە و..

ڕووناك کردنەوەی زەین و هۆشەکان، کە ڕۆشنایی سەردەمە و..

پێشکەوتن و تەواوکاریی هزر و بیرەکان، کە یاسای شارستانێتی‌یە و..

ساغ و سەلامەتیی سروشت، کە سیفەتی دانەبڕاوی دەشتەکێتی‌یە و..

چاپوکی و کۆڵنەدان، کە هەردووکیان بەروبوومی "پێویستی"ن.

**هێزی پێنجەم:**

حەز و مەیلی بەشارستانی بوون و.. خولیای تازەگەری و پێشکەوتنی ماددی، کە لەم سەردەمەدا بەرزکردنەوەی ئاڵای ئیسلام بەندە لەسەری و، ئایینی ئیسلام فەرمانی پێ دەدات و، ڕۆژگاریش موسڵمانانی بۆ هەڵ دەنێت و، هەژاریی لەڕادەبەدەریش ناچاریان دەکات بۆی..

هەروەها ئەو "هیوا"یەش کە بووژێنەرەوەی ژیانە، بە مردنی ئەو "نائومێدی" و بێ هیواییەی لەناوبەری هەموو ئارەزوویەکە.

ئنجا ئەوەش کە پشتگیریی ئەم هێزانە دەکات و یارمەتییان دەدات:

زاڵبوونی لایەنە بەد و بێ کەڵکەکانی شارستانێتی‌یە بەسەر لایەنە بەکەڵك و باشەکانیدا، ئەو لایەنە بەد و خراپانەی کە ئاژاوەی لە نێوان بیانی‌یەکاندا نایەوە و، شارستانێتیی ئەوانی پیر و ماندوو کرد..

هەروەها بەش نەکردنی ئەنجامی هەوڵ و کۆششەکانە بۆ داخوازی‌یەکانی هەرزەیی، کە ئەمەش دوو هۆکاری هەیە:

**یەکەم:**

بواردان بە بڵاوبوونەوەی هەرزەیی و.. گوێڕایەڵی بۆ حەز و ئارەزووەکانی دەروون، ئەوەش بەوەی کە ئایین و ڕەوشتبەرزی نەکران بە دەستووری شارستانێتی.

**دووهەم:**

جیاوازیی كۆمەڵایەتیی سامناك لە گوزەرانی ژیانی خەڵكیدا، كە ئەویش ئەنجامی نەمانی سۆز و بەزەییە و، ئەویش بەرهەمی خۆشویستنی ئارەزووەكان و دوورەپەرێزییە لە ئایین.

بەڵێ، "ئیلحاد" و "دوورەپەرێزی لە ئایین" بوونەتە هۆی نانەوە و تەشەنەكردنی ئاژاوەگێڕی لەناو شارستانێتیی ئەوروپادا و، سەرەوبن هەڵگێڕاوەتەوە، ئەوەتا گەلێ ڕێكخراوی ئاژاوەچی و دەستە و پێڕی بەدكاری و گومڕاكردنی بەرهەم هێناوە.

جا ئەگەر پەنا بۆ ڕاستیی شەریعەتی بێگەرد نەبرێت و، خۆ بەو دەستاوێزە توند و تۆڵە قایم نەكرێ و بەربەستێكی وەك ئەوەی زولقەرنەین لە بەردەم ئەو ڕێكخراوە ئاژاوەچییانە دانەنرێت، ئەوا هەر ئەو ڕێكخراوانە جیهانی شارستانێتی ئەوان دەڕمێنن و لەناوی دەبەن، هەروەك ئێستا ئەم هەڕەشەیەی ئاراستە دەكەن.

توخوا! ئەگەر "زەكات" كە یەك لە هەزاری بابەتەكانی ڕاستیی ئیسلامە، بكرایە بە دەستووری شارستانێتی و بناغەی هاوكاری تیایدا، ئایا نەدەبووە دەرمان و چارەسەرێكی شیفابەخشی ئەو لاسەنگی و جیاوازییە مەترسیدارەی ژیان و گوزەرانیان، كە وەك كونی مار و ژەهری كوشندە و گیروگرفتی ڕووخێنەری لێ هاتووە؟!

بەڵێ، دەبێتە دەرمانێكی شیفابەخش و كاریگەری هەمیشەیی.

**ئەگەر بوترێ:**

"چی ڕێ لەوە دەگرێ كە ئەو شتەی بووەتە هۆكاری زاڵبوونی ئەوروپا تا ئێستا، ببێت بەهۆی درێژەپێدان و بەردەوامیی زاڵبوونی"؟

**وەڵام:**

پێشەكیی ئەم كتێبە بخوێنەرەوە و، ئنجا بە وردی سەیری ئەمەی خوارەوە بكە:

هۆكاری پێشكەوتنی ئەو بریتی بوو لە:

"هێمنی" و "لەسەرخۆیی" چ لە وەرگرتن چ لە دەست لێ هەڵگرتنی هەموو شتێك و..

"توندی و سەرسەختی" بەرامبەر هەر شتێك، کە ئەویش ئەنجامی سارد و سڕیی وڵاتەکەیانە و..

"گەشە کردنی هزر و زانین" و "ڕووکردنە پیشەسازی" لەبەر زۆریی دانیشتووان و تەنگەبەریی شوێن و نشینگەیان و..

"هاوکاری" و "بەدواداچوون" کە بەرهەمی بوونی هۆکارە یارمەتیدەرەکانی وەك: دەریا و کانزاکان و شتانی هاوشێوەیانە.

بەڵام ئێستا هۆکارەکانی گواستنەوە بە ڕادەیەکی هێندە زۆر پێشکەوتووە کە سەرتاسەری جیهان وەکو یەك شاری لێ هاتووە و، دانیشتوانیشی لە ڕاوێژی کاروبارياندا، بەهۆی پێشکەوتنی هۆکارەکانی گواستنەوەی دەنگ و چاپەمەنی، دەڵێی لەناو یەك ئەنجومەنداں.

لەمەوە دەگەینە ئەو دەرەنجامەی کە:

ئەگەر یارمەتیی خوای گەورەمان لە پشت بێت پێیان دەگەینەوە، تەنانەت پێشیشیان دەکەوین. چونکە کۆڵی ئەوان قورسە و کۆڵی ئێمەش سووك و ئاسان.

**کۆتایی کۆتایی:**

ئەو شتەی شانسی ئاسیا و بەختی ئیسلام دەکاتەوە، بریتییە لەو "شوورا" و "ئازادی"یەی کە بە پەروەردەی "شەریعەتی پاکی ئیسلام" پێگەیشتبن[1].

**ئاگادارکردنەوەیەك:**

ئەو شتانەی کە پێیان دەوترێ: لایەنە جوانەکانی شارستانێتی، لە ڕاستیدا چەند بابەت و مەسەلەیەکی شەرعی ئیسلامن، شێوەیەکی تریان پێ دراوە!

---

(١) ئەی برایانی قوتابیی نوور! ئەو پیر و دەستەیەی قورئان کە لەو کاتەدا مامۆستای خۆشەویستمان گوفتاری ئاراستە کردوون، ئێستا بریتین لە قوتابیانی نوور. کەواتە بێدار بینەوە! ئەوەی لەم لاپەڕانەدا نووسراوە بە تایبەت لەگەڵ ئێمە دەدوێت، دەسا هۆکارەکانی زانست و شارستانێتی بخەنە خزمەتی ئیسلام و، شارستانێتیی ئیسلام بۆ هەموو جیهان ڕابگەیەنن. (مستەفا صونگور)

## پێشەکیی دەهەم

قسەبێژ لەو قسانەی دەیانکات ئۆباڵی هەموو ئەو شتانەی ناخرێتـە ئەستۆ کـە دەڕۆنـە زەینـی بیسـەری گوفتارەکـانی، چونکـە چـەمك و واتاکـان - جگـە لـەوەی کـە گوفتارەکەی لەپێناودا هێنراوە - کاتێ لـە ئەستۆی قسـەبێژدایە کـە ویسـت و مەبەستی بن، خۆ ئەگەر ئەو چەمك و واتایانەی مەبەست نەبووبن گلەیی لـێ نـاکرێ، بـەڵام گـەر ئامانج و مەبەستی بووبن، ئەوا بێ گومان دەبێ بە زامنیان.

لە زانستی "ڕەوانکاری"دا چەسپاوە کە:

"ڕاستی" و "درۆ" شوێنکەوتەی نیاز و مەبەستی قسەبێژن. کەواتە ئۆباڵ و گلـەیی لـە مەبەست و هێنـانی گوفتارەکـەدا لـە ئەسـتۆی قسـەبێژدایە، بـەڵام گوناهـ و نـاڕێکیی پەلوپۆکانی گوفتار (واتە هێما و ئاماژەکـانی) و، هۆکـار و شـێوازی پێش چاوخستنی (واتە شێوەی واتاکان و، تەرزی ڕوونکردنەوە و، واتا یەکەمەکان) لە ئەستۆی قسەبێژدا نییە، بەڵکو دەکەوێتە ئەستۆی داب و نەریت و قبووڵکردنـی گشتیی خـەڵکی. چونکـە عورف و قبووڵکردنی گشتی - لە پێناوی تێگەیاندندا - ڕێزی لـێ دەگیرێت..

پاشان ئەگەر گوفتارەکە گێڕانەوە بوو، ئەوا هەڵە و ناڕێکیی ئەو گوفتارە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە قسەکەی لەبارەوە گێڕراوەتەوە.

بەڵێ، لە شێوەی واتاکان و پەلوپۆکانی گوفتاردا گلەیی لە قسەبێژ نـاکرێ، چونکـە بەکارهێنانیان لەلایـەن قسـەبێژەوە بـە مەبەستی لێکردنـەوەی بـەروبوومی گوفتـار نییـە، بەڵکو بۆ پێدا هەڵزنین و سەرکەوتنە بەرەو لقی ئامانجی بەرزتر.

ئەگەر پێت خۆشە لەمە تێبگەیت فەرموو سەرنج لە "درکە"(کینایـە)کـان[1] بـدە، بـۆ نموونـە: کاتێ لـە باسـی کەسێکدا دەوترێ: (طویـل النجـاد، کثـــیر الرمـاد)[2] ئـەوا

---

(۱) (کینایە): لە "ڕەوانبێژی"دا چەند پێناسەیەکی بۆ کراوە. پوختەکەی بریتییە لەوەی کە: مـرۆڤ لـەبارەی شتێکەوە بدوێت و مەبەستی شتێکی دیکە بێت، بەڵام لە واتادا یەك بگرنـەوە. بۆ نموونـە بڵێیـت: (فلانـە کـەس زۆر میواندارە). مەبەستت ئەوە بێت کە مرۆڤێکی سەخییە. (وەرگێڕ)

(۲) واتە: کێلانی شمشـێرەکەی درێژە و، خۆڵەمێشـی زۆریشـی هەیـە. یەکـەمیان کینایەیـە لـە باڵابـەرزی، کـە مەبەست پێی ئازایەتییە. دووهەمیشیان کینایەیە لە میوانداری، کە مەبەست پێی سەخاوەتە! (وەرگێڕ)

گوفتارەکە ڕاستە، گەر ئەو کەسە باڵا بەرز و بەخشندە بێت، تەنانەت گەر خۆڵەمێش و شمشێریشی نەبێت!

ئەگەر دەتەوێ ئەمەت پتر بۆ ڕوون ببێتەوە، بە وردی بۆ "نموونە" و "پەندە گریمان کراوەکان" بڕوانە، دەبینی ئەو نموونانە بەهۆی ناوبانگیانەوە نرخ و هێزی خۆیان لە وتووێژ و گفتوگۆی نێوان هزر و ژیریەکاندا هەیە، تەنانەت ئامادەباشییان تێدایە بۆ ڕاپەڕاندنی ئەرکی ناوبژیوان و گەیەنەر لە نێوانیاندا. بگرە ڕاسترین نووسەر و زاناترین کەسی دانای وەك خاوەنی مەسنەوی (جەلالەددینی ڕۆمی)[١] و (سەعدیی شیرازی)[٢] ئەو پەند و نموونە گریمان کراوانەیان بەکار هێناوە و، هیچ نەنگی و چەند و چۆنێکیان تێدا نەبینیوە.

جا ئەگەر ئەم نموونەیەت بۆ ڕوون بووەوە، ئەوا لە ڕووناکییەکەی چرایەك هەڵبگرە و، بڕۆ بۆ ناو گۆشە و سووچی چیرۆك و حیکایەتەکان و، بەم پێوەرە لێکیان بدەرەوە. چونکە ئەوەی بەسەر (جوزء)دا دێت هەندێ جار بەسەر هەموو (کول)یشدا جێبەجێ دەبێت[٣].

(١) مەولانا جەلالەددینی ڕۆمی لە شاری (بەلەخ) لە دایك بووە و لە شاری (قۆنیە)ش کۆچی دوایی کردووە. لە نێوان ساڵەکانی: (٦٠٤-٦٧٢ك/ ١٢٠٧-١٢٧٣ز)دا ژیاوە. لە فیقهی حەنەفی و سەرجەمی زانستەکانی ڕۆژگاری خۆیدا زانایەکی بەناوبانگ و بەتوانا بووە و، دوای وەفاتی باوکی لە ساڵی (٦٢٨ك)دا لە چوار قوتابخانەی شاری "قۆنیە"دا دەرسی وتووەتەوە. پاشان ڕێبازی تەسەووفی گرتووەتەبەر و (شەمسی تەبریزی) لەم بوارەدا ڕابەریی کردووە. ئنجا تەریقەتی "مەولەوی"ی دامەزراندووە. گەلێ بەرهەمی دوای خۆی بەجێهێشتووە، وەك (فیە ما فیە، دیوان شمس تبریزی، کە پێیشی دەوترێ: دیوان کبیر) بەڵام بەناوبانگتریان (مەسنەویی مەعنەوی)یە کە بیست و شەش هەزار بەیتی شیعرە بە زمانی فارسی و، بۆ چەندین زمانی جیهانی وەرگێڕراوە و بووە بەهۆی بڵاوبوونەوەی ناوبانگی مەولانا لە سەرتاسەری جیهاندا. بۆ زانینی درێژەی ژیانی بڕوانە: (مولانا جلال الدين الرومي في حياته وشعره، تأليف: الدكتور محمد عبدالسلام الكفافي، دار النهضة العربية، بيروت، ١٩٧١) هەروەها بەرگی یەکەمی: (رجال الفكر والدعوة في الإسلام) نووسینی خوالێخۆشبوو (سەيد ئەبولحەسەنی نەدوی). (وەرگێڕ)

(٢) شێخ موصلیحەددین سەعدیی شیرازی: یەکێکە لە شاعیرە مەزنەکان و خاوەنی تەعبیرێکی نەرم و نیانە. لە شاری "شیراز" لە سەرەتای سەدەی حەوتەمی کۆچیدا لە دایك بووە و، ڕۆشتووەتە بەغدا بۆ تەواوکردنی زانستە ئیسلامییەکان لە قوتابخانەی "نیزامیە"دا. سی ساڵ تەمەنی لە گەشتوگوزار و هۆنینەوەی شیعردا بەسەر بردووە. هەر لە شیراز لە ساڵی (٦٩١ك) یان (٦٩٤ك)ماڵئاوایی لەم دنیایە کردووە. بەناوبانگترین بەرهەمەکانی "گولستان" و "بۆستان"ە. (وەرگێڕ)

(٣) دوو زاراوەی "مەنتیق"ن. کول(الكل): وەکو "جەستە" و، "خانوو". بەڵام جوزء (الجزء): وەکو "ئەندام"ەکانی جەستە و، "بنمیچ و دیوار" و پێکهێنەرەکانی تری خانوو. (وەرگێڕ)

**ئاگادارکردنەوەیەك:**

لەمەولا و لە (وتاری سێهەم)دا دەستوورێك سەبارەت بە گرفت و موتەشابیهەکانی قورئان[1] دێتە ڕێمان. بەڵام لەبەر خواستی ئەم شوێنە پوختەیەکی لێرەدا لێ باس دەکەین:

ئامانجی هەرە گرنگی قورئانی حەکیم ڕێنمایی "جەماوەر"ە کە زۆرینەی خەڵکی پێکدێنن، لەبەر ئەوەی کەسە "تایبەتمەندەکان" دەتوانن سوود لەو ڕێبازە وەربگرن کە بۆ زۆرینەی ڕەشۆکی خەڵکی بەکارهێنراوە، بەڵام جەماوەری ڕەشۆکی ناتوانن بە تەواوی لەو وتانە تێبگەن کە ئاراستەی تایبەتمەندان کراوە. لە کاتێکدا کە زۆرینەی جەماوەر خەڵکی ڕەشۆکین و، ئەوانیش ناتوانن خۆیان لە ئەندێشەکانیان و ئەو شتانەش داماڵن کە پێی ڕاهاتوون و، پەی بە ڕاستی‌یە ڕووت و پەتی‌یەکان ببەن و بیانبینن..

تەنها شتێك کە ئەو پەیبردن و بینینەیان بۆ دەستەبەر دەکات لەبەرکردنی پۆشاکی شتانی لەگەڵ ڕاهاتوویانە بە بەری ڕاستی‌یە ڕووت و پەتی‌یەکان، کە زەینی ئەوان هۆگری بوون و پێی ڕاهاتوون، تاکو ئەو ڕاستی‌یە پەتییانە بناسن و، لە پشت وێنە و شێوە ئەندێشەییەکانەوە بیانبینن.

جا مادەم ئەمە بەم جۆرەیە، ئەوا ڕاستیی پەتی و ڕووت پۆشاکی شتانی خوو پێوەگرتووی ئەوان دەپۆشێت، بەڵام دەبێ تێڕوانینیان نەترنجێتە وێنە و شێوەکە و تیایدا قەتیس نەمێنێت.

---

(١) (موتەشابیهـ): بەو دەقە شەرعی‌یانە دەوترێ کە بە ڕوونی نازانرێ مەبەستی دانەری شەرع تیایاندا چی‌یە. هۆی پەنهانیی مەبەست لە هەندێکیاندا "وشە"کانیانە، وەك سەرەتای ئەو سوورەتانەی کە بە پیتە پچڕ پچڕەکان دەست پێدەکەن.. یان هۆکەی لە "واتا"کەیدایە، وەك ئایەتەکانی (صیفات)ی خوای گەورە و سیفەتەکانی قیامەت.. یاخود لە "وشە" و لە "واتا"شدایە، وەکو ئەم ئایەتەی کە دەفەرموێ: ﴿وَلَيْسَ الْبِرُّ بِأَنْ تَأْتُوا الْبُيُوتَ مِنْ ظُهُورِهَا﴾ (البقرة:١٨٩). هەموو ئەمانەش دەبن بە سێ بەشەوە. یەکەمیان: کەس ناتوانێ بگاتە ڕاستیی واتاکانیان، وەکو کاتی بەرپابوونی قیامەت. دووهەمیان مرۆڤ دەتوانێت بگاتە ڕاستیی واتاکانیان، وەکو وشە نامۆکان و واتا داخراوەکان. سێهەمیان: لە نێوان ئەو دوانەدایە و زانینیان تایبەتە بە هەندێ لە زانایانی ڕۆچوو لە زانستدا و لای غەیری ئەوان پەنهانە. هەر ئەمەش مەبەستی پێغەمبەر ﷺ بووە لە دوعاکەیدا بۆ ئیبن عەبباس کە فەرموویەتی: (اللهم فَقِّهْهُ فِي الدِّين وعَلِّمْهُ التَّأويل). بۆ درێژەی ئەم بابەتە بڕوانە: (مفردات القرآن) للراغب الأصفهاني. ص:٢٥٧-٢٥٨. چاپی پێنجەمی (دار المعرفة، بیروت) سالی ١٤٢٨ك/٢٠٠٧ز بە تەحقیقی: (محمد خليل عيتاني). (وەرگێڕ)

لەسەر بناغەی ئەمە:

ئەو شێوازانەی کە لە زمانی عەرەبیدا هەن لە چەشنی: "چاودێریی تێگەیشتنەکان و لەگەڵدا ڕۆشتنی زەینەکان" لە قورئانی حەکیمی خاوەن ئیعجازی بەیانیشدا بەکارهاتووە، کە ئەوەیە پێی دەوترێ: "التنزلات الإلهية الى عقول البشر".

بۆ نموونە:

فەرمایشتە پیرۆزەکانی خوای گەورە:

﴿ثُمَّ استَوى على العرش﴾ (الأعراف:٧) و..

﴿يَدُ الله فوقَ أيديهم﴾ (الفتح:١٠) و..

﴿جاءَ ربُّكَ﴾ (الفجر:٢٢) و..

ئایەتەکانی تری هاوشێوەیان..

هەروەها:

﴿تَغْرُبُ في عَين حَمِئَةٍ﴾ (الكيف:٨٦) و، ﴿والشَّمسُ تجري لِمُستَقَرٍّ لها﴾ (يس:٣٨) و، ئایەتەکانی تری وەك ئەوان، هەموویان چەند جۆگە و ڕووبارێکن بۆ یارمەتی و بەخوڕکردن و پشتگیریی ئەم شێوازە..

﴿ذلك الكتابُ لا ريبَ فيه﴾ (البقرة:٢).

**کۆتایی:**

"داخراوی" و "ئاڵۆزی"ی قسە و گوفتار یان لە بێ هێزیی وشە و لاوازیی شێوازەوە سەرهەڵدەدات، کە هەرگیز ئەمە توخنی قورئان ناکەوێت..

یان هی وردی و، قووڵی و، باشی و، دەگمەنی و، پێ ڕانەهاتوویی واتاکانیەتی، بەڕادەیەك دەڵێی ئەو واتایە بە نازەوە خۆی لە تێگەیشتنی مرۆڤ نادیار و ئاڵۆز دەکات، تاکو تاسەی ببزوێنێت. بەمەش بایەخی سەرنجی بۆ لای گرنگی و پلەی بەرزی ئەو واتایە ڕادەکێشێت.

هەموو کێشە و گرفتەکانی (تێگەیشتن لە هەندێ شوێنی) قورئان لەم چەشنەن.

**بێدارکردنەوەیەك:**

هەموو ئایەتێك "پشت و ڕوو"ی هەیە و، هەریەکەیان سنوور و هەڵاتگەی تایبەت بە خۆی بۆ دانراوە و، هەریەکەشیان لق و پەلی جیای لێ بووەتەوە، بەو شێوەیەی کە لە

فەرموودەیەکی پیرۆزدا بەم واتایە وەسف کراوە[١]. شایەتی ڕاست لەسەر ئەمە: زانستە ئیسلامییەکانە.

هەریەك لەم پلانە نرخ و پایە و بەهای خۆی هەیە و، تەنگ بە یەکتر هەڵناچنن، بەڵکو لە یەکدی دەئاڵێن و، ئاڵۆزی لەمەوە پەیدا دەبێت. ئەوکاتەش پێویستی بە لێك جیاکردنەوە دێتە گۆڕێ، چونکە هەروەك بازنەی "هۆکارەکان" ئەگەر تێکەڵ بە بازنەی "باوەڕەکان" بکرێت، ئەوا بە ناوی "تەوەککول"ەوە بەتاڵی و تەمبەڵی سەرهەڵدەدات، یاخود بە ناوی "چاودێریی هۆکارەکان"ەوە ڕێچکەی ئیعتیزال بەرهەم دەهێنێت[٢].. بە هەمان جۆر گەر ئەم پلە و بازنانە لێك جیا نەکرێنەوە، ئەوا ئەم چەشنە ئەنجامانەیان لێ دەبێتەوە.

---

(١) (أنزل القرآن على سبعة أحرف) رواه أحمد والترمذي عن أُبي رضي الله عنه وأحمد عن حذيفة، وهو عند الطبراني من حديث ابن مسعود بزيادة.. وفي رواية أخرى عنده: لكلِّ حرف منها ظهر وبطن ولكل حرف حدّ ولكل حدّ مطّلع. (باختصار عن كشف الخفاء ١/٢٠٩). (لكلِّ حد ومطلع) واتە: هەموو "سنوور"ێکی پلیکانەیەکی هەیە لە ڕێی زانینەوە مرۆڤ دەتوانێت بۆی سەربکەوێت، وەك لە "لسان العرب"دا هاتووە.

وفي المثل: "الحديث ذو شجون" أي فنون واغراض، وقيل أي يدخل بعضه في بعض، أي: ذو شعَب وامتساك بعضه ببعض.. وأصل الشجنة بالكسر والضم: شعبة من غصن من غصون الشجرة (لسان العرب باختصار). (وەرگێڕ، لە چاپە عەرەبییەکەوە)

(٢) دانەر لە چەند بەرهەمێکی دیکەیدا (بازنەی هۆکارەکان و بازنەی باوەڕ) ڕوون دەکاتەوە، کە ئەمە پوختەکەیەتی:

(خوای گەورە بە ویستی خۆی ڕێسایەکی لە بوونەوراندا داناوە کە "هۆکارەکان - الأسباب" پەیوەست دەکات بە "بەهۆکراوەکان - المسبَّبات". ئنجا مرۆڤی ناچار کردووە کە چاودێریی ئەو ڕێسایە بکات، بە بێ ئەوەی پێی وابێت کە "هۆکارەکان" لە موڵکی خوادا کاریگەرییان هەبێت، چونکە دەبێ لەو باوەڕەدا بێت کە جگە لە خوای گەورە بەدیهێنەرێکی تر نییە. جا لەو کاتەدا کە پێویستە مرۆڤ بەدیهێنانی هەموو شتێك بۆ خوای گەورە بگێڕێتەوە، ئەگەر کاریگەری بە "هۆکارەکان" بدات، لە ئەنجامدا وەکو موعتەزیلەکانی لێ دێت کە پێیان وابووە مرۆڤ بەدیهێنەری کردەوەکانی خۆیەتی. ئەگەر لەو کاتەشدا کە پێویستە چاودێریی هۆکارەکان بکات، کەچی وازیان لێ بهێنێت و بڵێ مادەم خوای گەورە خۆی بەدیهێنەرە ئیتر من هۆکارەکان پشتگوێ دەخەم، ئەوا لە ئاکامدا دووچاری تەوەکولێکی تەمبەڵانە دەبێت و، بە وێنەی جەبرییەکانی لێ دێت کە پێیان وایە مرۆڤ هیچ ویستێکی پێ نەسپێرراوە و خوای گەورە هەموو شتێکی بەسەردا دەسەپێنێ)! بڕوانە:

(إشارات الاعجاز: ٢٩-٣٠)، (بریسکەکان: ٨٠٣)، (مەکتووبات: ٨٨٠). (وەرگێڕ)

## پێشەکیی یازدەهەم

هەندێ جار تەنها یەك گوفتار چەندین بڕیار لەخۆ دەگرێت، ئەوەتا دەگونجێ یەك صەدەف گەلێ مرواریی تێدا بێت.

ئنجا لە لای ژیران و هۆشمەندان ئەوەش سەلماوە کە:

تەنها یەك کێشە چەندەها کێشەی تر لەخۆ دەگرێت، هەر یەك لەو کێشانەش بەروبوومێکی جیاواز لە هی ئەوی تر بەرهەم دەهێنێت، هەروەك لە بنەڕەت و بناغەیەکی جیاوازەوە هەڵقوڵاوە و سەری هەڵداوە. جا ئەو کەسەی کە توانای لێك جیاکردنەوەی نی‌یە، لە حەق لادەدات و لێی نامۆ دەبێ..

نموونەی ئەمە:

لە فەرموودەی پیرۆزدا هاتووە کە:

(بُعثت أنا والساعة كهاتين)[1].

واتە: لە دوای من هەتا قیامەت پێغەمبەری تر نایەت. ئیتر مەبەست لە فەرموودەکە هەرچی بێت، هەر حەقە.

ئەم فەرموودە پیرۆزە سێ بڕیاری لەخۆ گرتووە:

**یەکەمیان:**

ئەم وتەیە گوفتاری پێغەمبەرە ﷺ.. ئەم بڕیارە دەرەنجامی تەواتورە، گەر بێت. (واتە ئەگەر فەرموودەکە موتەواتیر بێت).

**دووهەمیان:**

واتا و مەبەست لەم گوفتارەدا حەق و ڕاستە.. ئەم بڕیارەش دەرەنجامی ئەو بەڵگەیە کە پشتی بە موعجیزاتی پێغەمبەرﷺ بەستووە، "چونکە پێغەمبەرﷺ جگە لە ڕاستی هیچ گوفتارێکی تری لێ نابیسترێ".

(١) حديث صحيح أخرجه البخاري ٦٥٠٥ من حديث أبي هريرة رضي الله عنه. وهو حديث متواتر. انظر النظم المتناثر في الحديث المتواتر ص ١٤٣ برقم ١٨٧. (وەرگێڕ - لە چاپە عەرەبی‌یەکەوە)

جا دەبێ یەکگرتن لەسەر ئەم دوو بڕیارە هەبێت، چونکە ئەو کەسەی ئینکاریی یەکەم بکات، درۆزن و نەسەلمێنەری حەقە.. ئەو کەسەش ئینکاریی دووهەم بکات گومڕایەکە بەرەو تاریکی‌یەکان پێی خلیسکاوە و کەوتووەتە خوارەوە.

**بڕیاری سێهەم:**

واتا و مەبەست لەم گوفتارە ئەمەیە (واتە ئەمەیە کە من دەیلێم). ئەمەش مرواریی ناو صەدەفەکەیە.

ئەم بڕیارە دەرەنجامی ئیجتیهادە، نەك هی حەز و ئارەزوو. چونکە شتێکی زانراوە کە داوا لە موجتەهید ناکرێ تەقلیدی موجتەهیدانی تر بکات.

ئەم کێشەی سێهەمەیە کە سەرچاوەی ئیختیلاف و جیاوازی‌یەکانە..

باشترین شایەت لەسەر ئەمە، هەموو ئەو وتە جیاجیا و دژ بە یەکانەیە کە لە "تەنها یەك مەسەلە"دا دەیبینین.

جا ئەو کەسەی ئینکاریی ئەم کێشەیە بکات بە سەرسەخت و ملنەدەر و گومڕا دانانرێت و، پێی بەرەو کوفر ناترازێ، بە مەرجێ ئینکاری‌یەکەی لە ئیجتیهادەوە سەرچاوەی گرتبێت..

چونکە شتی گشتی(عام) بە نەبوونی شتی تایبەتی(خاص) بە نەبوو دانانرێت و نەفی ناکرێت. زۆر دەقی بێ گومان (قطعي المتن)یش هەیە کە گومان لە دەلالەتیدا دەکرێ و (ظني الدلالة)یە.

کەواتە دەبێ لە دەرگاکانەوە بڕۆینە ناو خانووەکان، ئەوەتا هەموو ماڵێك دەرگای تایبەت بە خۆی هەیە و، هەموو قفڵێکیش کلیلی تایبەتیی بۆ دانراوە.

**کۆتایی:**

ئەم سێ مەسەلەیە هەروەك لە "فەرموودە"دا هەیە، لە "ئایەت"یشدا هەیە، چونکە چەند مەسەلەیەکی گشتین. بەڵام یەکەمیان جیاوازی‌یەکی وردی تێدایە.

بەم جۆرە دەرکەوت کە:

هەندێ جار گوفتارێك چەند حوکم و بڕیارێکی زۆر لەخۆ دەگرێت، بەڵام چەند حوکمێکی تایبەتن و، لە بناغەدا هەریەکەیان لەوی تر جیایە و، بەروبوومێکی جیاواز لە هی ئەوی تر بەرهەم دەهێنێت.

بێدارکردنەوەیەك:

گەر کەسێك بیەوێت لەم چەشنە مەقامانەدا خەریکی "بەهەڵەبردن" بێت، لەوانەیە چەند بڕوبیانوویەکی بێ نرخ و بەهانەگەلی لاواز بدۆزێتەوە، کە لە خۆشویستنی خۆیەوە سەریان هەڵداوە، وەك:

پشتگیریی لایەنی بەرامبەر و نەیار و..

دەمارگیریی نەفرەت لێکراو و..

حەزی خۆدەرخستن و..

هەستی لایەنگیری بۆ لایەك و..

پاساو هێنانەوە بۆ وەهم و ئەندێشەکان، بەوەی کە بیانگێڕێتەوە بۆ بناغەیەك و..

بینینی شتانی لاواز بە شێوەیەکی بەهێز، لەبەر گونجانی لەگەڵ حەز و مەیلە کەسی‌یەکان و..

دەرخستنی تەواوی و کەماڵی خۆی، بە شکاندن و کەمکردنەوەی شان و شکۆی خەڵکانی تر و..

خۆدەرخستنی بە "ڕاستگۆ" لە ڕێی بەدرۆخستنەوەی ئەوانی تر و..

پیشاندانی ڕاستڕەویی خۆی، بە گومڕا دەرکردنی خەڵکی و..

شتانی تری نزم و سووکی وەك ئەمانە.

(وإلى اللهِ الْمُشتَكى).

واتە: سکاڵامان تەنها بۆ لای خوای گەورەیە.

## پیشەکیی دوازدەهەم

ئەو کەسەی "کاکڵە"ی دەست نەکەوێ، بە "توێکڵ"ەوە سەرقاڵ دەبێت..

ئەو کەسەش بە "حەقیقەت" ئاشنا نەبێت، بەرەو "ئەندێشەکان" دەخلیسکێت..

ئەوەی "ڕاستە ڕێ" نەبینێت، دووچاری "زیادەڕەوی" و "کورتبڕی" دەبێت..

هەرکەسێکیش "پێوەر" و "تەرازوو"ی نەبێت و "هاوسەنگی"ی لەدەست دابێت، خەڵکی دەخەڵەتێنێت و بۆ خۆیشی زۆرجار دەخەڵەتێ!

هۆکارێك کە ڕواڵەتبینەکان دەخەڵەتێنێ: ئاڵۆزی و تێکەڵ بوونی چیرۆکە لەگەڵ ئەو پەندەی کە لێی وەردەگیرێت و، ئاڵۆز بوونی پێکەوە هاتنی پێشەکی‌یە لەگەڵ ئەوەی لە زەینڈا مەبەستە بەو پێکەوە هاتنەی کە لە بوونی دەرەکیدایە..

سەرنج لەم خاڵە بدە، چونکە دوایی پێویستت پێی دەبێت.

پاشان یەکێك لە هۆکارەکان، بگرە گرنگترینی ئەو هۆیانەی کە بەربادی و بێ سەرەوبەرەیی دەنێنەوە و، جیاوازی و دووبەرەکی دەخەنەوە و، خورافات دروست دەکەن و، زیادەڕەوی بەرهەم دەهێنن: قەناعەت نەکردن و دڵنیا نەبوونە بەو جوانی و بەرزی و بڵندی‌یەی لە جیهاندا بەدی هێنراوە، کە ئەمەش - پەنا بە خوا - سووکایەتیی چێژێکی ناساز و بەد دەگەیەنێت بەو ڕێسایەی کە لە گەردووندا فەرمانڕەوایە.

هەریەك لە جوانیی ڕێکوپێکی و.. مەزنی و.. بڵندی کە لەناو ڕاستی‌یەکانی جیهاندا دانراون، لە بەرچاوی حیکمەت و ژێریدا موعجیزەیەکی توانستی خوای گەورەن، کە دەستی دانستی خوایی بەوپەڕی جوانی و ناوازەیی دایهێناون، بە ڕادەیەك کە ئەگەر بەرامبەر بەو جوانی و کەماڵە نائاساییە دابنرێت کە لە ئەندێشەی شەیدایانی خەیاڵ و زیادەڕەواندایە، ئەوا سەرجەمی ئەو خەیاڵ و ئەندێشە نائاساییانە لە ئاستیدا یەکجار ئاسایی دەنوێنن و، یاسا خواییەکانیش لەچاو ئەواندا بە ڕاستی و ناوازە و دەراسا دەردەکەون و، لەوپەڕی جوانی و تەواوی و مەزنیدا دەبینرێن..

بەڵام "لەگەڵ ڕاهاتن"(الألفة) - کە خوشکی نەزانیی ئاڵۆز و دایکی بینینی ڕواڵەتی‌یە - چاوی زیادەڕەوانی بەستووە. خۆ جگە لە فەرمانی قورئانی پیرۆز بە

تێڕامان و سەرنج لێدانی دەروون و ئاسۆ لەگەڵ ڕاهاتووەکان، هیچ شتێکی تر ئەو چاوە بەستراوانە ناکاتەوە.

بەڵێ، هەر تەنها ئەستێرە گەش و تاریکی برەکانی قورئانن کە چاوەکان واڵا دەکەن و، تاریکیی نەزانی و ڕوانینی سەرپێیی هەڵدەگرن. چونکە دەستی سپیی ئایەتە ڕوونەکانی قورئان پەردەی "ڕاهاتن" و ڕوانینی ڕووکەش و داوێن گرتنی ڕواڵەتی بینراو دەدڕێنن و، ژیریەکان ئاراستە و ڕێنمایی ڕاستییەکانی لەمەڕ ئاسۆ و دەروونەکان دەکەن.

پاشان یەکێك لە بەرهەمهێنەرانی حەزی "زیادەڕەوی": پێویستیی سروشتیی مرۆڤە بە دەرخستن و هێنانەڕووی مەیل و ئارەزووەکانی خۆی لە دۆخی نادیارەوە بۆ دۆخی دیار و لەبەرچاو. چونکە یەکێ لە مەیلەکانی مرۆڤ بریتییە لە بینین و پیشاندانی شتانی سەرسووڕهێنەر و سەرسامی بەخش و، حەزی تازەبوونەوە و بەدیهێنان.

جا لەسەر ئەم بناغەیە:

مرۆڤ کاتێ بە ڕوانینی ڕووکەشی خۆی دەستەوسان ما لە چەشتنی ئەو خۆراکە ڕۆحییەی کە لەناو دەفرەکانی بوونەوەراندا بە پەردەی "لەگەڵ ڕاهاتن" داپۆشراون، بێزار بوو لە لستنەوەی دەفر و دەرخۆنەکان و، جگە لە بێ قەناعەتی و تامەزرۆیی بۆ شتانی نائاسایی و حەزکردن لە ئەندێشەکان، هیچ شتێك دادی ئەوی نەدا. کە ئەمەش حەزی "زیادەڕەوی"ی - بە نیازی خۆ نوێکردنەوە و برەوپێدان - تێدا ورووژاند. ئەو "زیادەڕەوی"یەی کە وەکو تۆپەڵە بەفرێکی تلۆر بوو وایە لەسەر لوتکەی چیایەکەوە، هەتا خل بێتەوە پتر گەورە دەبێت..

ئەو گوفتارەش کە لەسەر لوتکەی ئەندێشەوە خلۆر بووەتەوە بۆ زمان و لەویشەوە بۆ زمانێکی تر و زمانێکی تر، ڕاستییە خۆییەکەی ئەو گوفتارە بەم لا و ئەولادا پەرتەوازە دەکات، بەڵام لە هەر زمانێك و بە حەز و مەیلی زیادەڕەوی، گەلێ ئەندێشە لە دەوری خۆی خەرمانە پێ دەدات و بەرە بەرە هێندە گەورە دەبێت کە لە ناو دڵ، بگرە لە دەماری بیستن، تەنانەت لە ناو خودی ئەندێشەکەشدا جێی نەبێتەوە! ئنجا کاتێ کە "ڕوانینی ڕاستەقینە" دێت پاشکۆ و خۆپیاهەڵزنەکانی لێ جیا دەکاتەوە و، بە شێوەیەکی

پەتی دەبیاتەوە سەر بناغەکەی خۆی و، نهێنیی ﴿جاءَ الحقُّ وزَهَقَ الباطِل﴾ دەردەکەوێت.

یەکێك لەوانە، بەسەرهاتێکە لەم ڕۆژانەدا ڕووی داوە و، دەبێ بە نموونە لەسەر ئەمە:

هەر لە منالیمەوە - بێ ئەوەی مەبەستم فەخر و شانازی بێت - ڕێبازم لابردنی ئەو دوودلی و گومانانەیە کە یان بە "زیادەڕەوی" یاخود بە "کورتبڕی" ڕاستی‌یەکانی ئیسلام چڵکن و لەکەدار دەکەن و، هەوڵ و تەقالام بۆ خاوێن کردنەوە و لەزاخاودانی ئەو ڕاستی‌یە ئەلماس ئاسایانەیە. شایەت لەسەر ئەمەش زۆربەی ڕووداوەکانی مێژووی ژیانمە.

ئەوەبوو لەم ڕۆژانەدا بابەتێکی بەڵگەنەویستی وەك "خڕیی زەوی"م تاوتوێ کرد و، ئەو بابەتە ئایینی‌یانەشم لە بەرامبەرەوە هێنا کە بگونجێ پێکەوە هەڵبشێلرێن، بە نیازی بەرپەرچدانەوەی ڕەخنەی دوژمنان و، لابردنی گومانەکانی ئەوانەش کە ئایینیان خۆش دەوێت، وەك لەمەولا بە دوورودرێژی لە "مەسەلەکان"دا باسی دێت.

پاشان ئەوانە پەیدا بوون کە شەیدای ڕواڵەتن و، لەسەر ئەندێشە زل کراوە لە وزە بەدەرەکان ڕاهاتوون! وەك بڵێی ژیریی ئەوان ئەم بابەتەی پێ قبووڵ نەبێت.. بەڵام هۆکاری بنەڕەتی - بێ هیچ گومانێ - شتی تری جگە لەمە بوو. ئیتر هەندێ ڕەفتاری شێتانەیان نواند! بە وێنەی کەسێك بیەوێت بە چاونووقاندن ڕۆژگار بگۆڕێت بە شەو، یان بە فووی دەم خۆر بکوژێنێتەوە، لەو گومانەدان کە هەرکەسێ بڕیاری خڕیی زەوی بدات کارێکی لە دژی زۆر باس و بابەتی ئایین ئەنجام داوە!

ئیتر ئەمەیان وەکو بیانوو بە دەستەوە گرت و، بوختانێکی گەورەیان هەڵبەست. کارەکەش تەنها لەم سنوورەدا نەمایەوە، بەڵکو گەیشتە ئەوەی بوختانەکەیان پتر گەورە بکەن، ئەوەبوو کەش و هەوایەکی لەباریان لەناو زەینە گوماناوی‌یەکاندا دۆزی‌یەوە. تەنانەت هێندە بە گەورەیی خستیانە ڕوو کە جەرگی ئایینداریانیان پێ داخ کرد و، کەسانی خەمخۆر و بە پەرۆشیان خستە باری نائومێدی و بێ هیواییەوە لە پێشکەوتنی ئیسلام!

بەڵام ئەمە بوو بە وانەیەکی گەورە بۆ خۆم. چونکە بەئاگای هێنامەوە لەوەی کە "دۆستی نەزان" دەتوانێ بە وێنەی "دوژمن" زیان بە ئایین بگەیەنێت!

لەبەر ئەمە، هەر لە سەرەتای ئەم کتێبەوە ڕووی گوفتارم ئاراستەی ئەو شوێنە دەکرد کە "دوژمن"ی لێ بێت و، بە شمشێرە ئەڵماسی‌یەکەی دەستم ئەو ناحەقی‌یەم دەبڕی کە بەرامبەر بە ئیسلام نواندوویانە.. بەڵام ئێستا لەبەر پەروەردەکردنی ئەو چەشنە "دۆستانە" ناچار دەبم شمشێرەکەم مەگەر تەنها لە کەمێکی ئەندێشە لەڕادەبەدەرەکەیان بدەم کە عەوامەکان تامەزرۆن بۆی.

وێڕای ئەوەی کە پێویست بەم چەشنە باسانە ناکات بۆ شتانی "کەسیی" وەك ئەمە، بەڵام کارەکە لە سنووری "کەس"دا نەما و، بوو بە "مەسەلەیەکی گشتی" کە پەیوەستە بە ژیانی قوتابخانە ئایینی‌یەکانەوە.

دەسا با ئەو ڕواڵەتبینانە بزانن کە هەوڵی بێهوودە دەدەن. ئەوان بەم چەنەبازی و قسە هەڵانەی کە دڵی عەوامەکانی بۆ دەشنێ ئێمەیان تا ئێستا لەناو نەزانیدا هێشتەوە و، دەشیانەوێ هەروا بە نەزانی بمێنینەوە، تاکو سوود لە نەزانیمان وەربگرن و بیقۆزنەوە..

بەڵام ئەو بۆچوونەیان زۆر دوورە و هەرگیز شتی وا نابێت، بەڵکو ژیان سەرلەنوێ لە قوتابخانە ئایینی‌یەکاندا دەبووژێتەوە! والسلام.

پاشان یەکێك لەو شتانەی کە بیر و هزری ڕواڵەتبینەکان تێکدەدات و ئەندێشەیان دەشێوێنێت، ئەوەیە کە لەو باوەڕەدان بەڵگەکانی ڕاستیی پێغەمبەران – دروودیان لەسەر بێت – تەنها لە ناوەندی کارە لە ئاسا بەدەرەکانیاندا قەتیس بوو بێت و، پێیان وایە کە هەموو – یان زۆربەی – بار و جموجووڵێکی پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ موعجیزە و نائاسایی بێت، کە ئەمەش هەرگیز واقیع بواری پێ نادات. بۆیە ئەو خەیاڵەیان هەرگیز جێ ناگرێت و، هیچ کاتێك ڕاست دەرناچێت، چونکە باوەڕی لەم جۆرە بێ ئاگاییەکی مەزنە لە نهێنیی دانستی خوای گەورە لە بوونەوەردا و، لەوەش کە هەموو پێغەمبەران – دروودیان لەسەر بێت – جڵەوی ملکەچ بوونیان داوەتە دەست یاسا دەست بەکار و جێبەجێ بووەکانی خوای گەورە لەم جیهانەدا.

بەڵێ، هەموو بارودۆخ و جموجووڵ و ڕەفتارێکی پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ بەڵگەیە لەسەر "ڕاستی"ی گوفتارەکانی و، شایەتە لەسەر پابەند بوونی بە "حەق"ەوە. لەگەڵ ئەوەشدا ملکەچ و شوێنکەوتووی یاساکانی خوایە. (لە وتاری سێهەمدا خوێنەر بۆلای ئەمە بەئاگا دەهێنین).

پاشان دەرخستن و پیشاندانی کارە دەراساکان تەنها بۆ پشت ڕاستکردنەوەی "پێغەمبەرێتی"ی پێغەمبەرانە، کە ئەمەش بە جوانترین و تەواوترین شێوە لە موعجیزە دیار و ئاشکراکانیدا دێتەدی. ئیتر هەر (کارێکی دەراسا) کە لە ڕادەی پێویست زیاتر بێت، ئەوا یان شتێکی بێهوودە و بێ جێیە، یاخود دژی نهێنیی ئەرك پێ سپاردن(التكليف)ە، کە لە ڕاستیدا بریتی‌یە لە تاقیکردنەوەی مرۆڤ لە شتە نەزەری‌یەکاندا، نەك بەڵگەنەویستەکان، یان ئەوانەی نزیکن لە بەڵگەنەویستەوە، چونکە لەو شتانەدا پلەی هەرە نزم و یەکجار بەرز یەکسانن.. یان ئەو کارە دەراسایەی کە لە ڕادەی پێویست زیاترە دژ و پێچەوانەی ملکەچ کردنە بۆ پیادەبوون و دەستبەکاریی دانستی خوای گەورە!

خۆ ئەمەش ناگونجێ، چونکە پێغەمبەران - دروودیان لەسەر بێت - لە هەموو کەسێ زیاتر بەندایەتی و ملکەچی‌یان بۆ فەرمانەکانی خوای گەورە خراوەتە ئەستۆ.

دەسا ئەی ئەو کەسە حەقخوازەی کە دەڕوانێتە وتە پەرت و بڵاوەکانم!

ئەو حەز و مەیلانەی لە ناوەڕۆك و ماهییەتی تۆدا دانراون بە "خۆر"ی ئەو "ڕاستی"یە دەپشکوێ و گەشە دەکات کە هەرچەند هەمیشە لە ڕۆشتندایە، کەچی لەو دوازدە پێشەکی‌یەی ڕابورد نیشتەجێ و وەستاوە.

**کۆتایی:**

هەرکەسێ لافی ئەوە لێ بدات کە سەییدە (واتە لە ئالی بەیتە) کە لە ڕاستیدا لەوان نەبێت، هەروەها ئەو کەسەش کە سەییدە بەڵام ئینکاری دەکات لەوان بێت، هەردووکیان گوناهبارن..

جا هەروەك ڕۆشتنە ناو "سەییدەکان" و لێ دەرچوونیان حەرامە، بە هەمان جۆر لێ کەمکردن و زیاد بەدەمەوەنانی قورئان و فەرموودەی پیرۆزیش کارێکی قەدەغەیە. تەنانەت لێ زیادکردنەکە زیانی زۆرترە، چونکە ڕێسا تێکدەدات و، دەرگاش بۆ هاتوچۆی وەهمەکان دەخاتە سەرپشت..

ئەوەتا "نەزانی" دەبێتە بەهانە بۆ کەمکردنەوە، بەڵام زیادکردن بە "زانین" دەبێت و "زانا"یش بەهانەی لێ وەرناگیرێت..

ئنجا هەروەك ئەمە وایە..

"ئـايين"يش پێـوەلـكانـدن و لـێ دابڕینی دروسـت نی‌یـە، تەنانـەت هێنـانی حیکایـەتی درۆ و، ئیسرائیلییاتی چەپەڵ و، تەشبیهە نارەواکان بۆ ناو ئەڵماسـی بـاوەڕ و گەوهـەری شەریعەت و مرواریی فەرمانەکانی ئایین، لە ڕاستیدا هۆی داشکاندنی نرخ و بەهایانە و، دوورخستنەوەی خوازیارەکانیانـە لـە عـەودالآنی ڕاسـتی و، ئاراسـتە کردنیانـە بـەرەو پەشیمانی.

(کۆتایی کۆتایی)

دەست هـەڵگرتنی کەسی لێهاتوو لـەو شتانەی کە شایانیەتی ئەنجامیان بـدات و، دەستگرتنی بە داوێنـی ئـەو شتەی شایانی نی‌یە، لـە ڕاستیدا سـەرپێچی‌یەکی گـەورە و پشتگوێ خستنێکی ئابڕووبەرە سەبارەت بە گوێڕایەڵیی شەریعەتی گەردوون..

چونکە یـەکێ لـە خواستەکانی ئـەم شـەریعەتە: بڵاوبوونـەوەی توانـا و لێهاتنـەکانی مرۆڤ و چوونە ناوەوەی بەهرەکانیەتی بـۆ نـاو سنعەتەکە و، ڕێز گرتـن و خۆشەویستیی سنعەتەکەیە و، لـەخۆدا پـیادە کردن و بەرجەستە کردنـی یاساکانیەتی. بە پوختـی: ئـەم شەریعەتە داخوازی توانەوەیە لە سنعەتدا.

مادەم ئەرکی سەرشانی "بەدیهاتن" ئەمەیە.. ئەوا ڕەفتار کردنی مرۆڤ بـە پێچەوانـەی ئەم شەریعەتە، لە ڕاستیدا شێوەی شیاوی سنعەتەکە دەگۆڕێت و، یاساکانی تێکدەدات. هەروەك شێوەی سنعەتە ناسروشتی‌یەکەش کە دەستی لە داوێنی گیر کردووە دەشێوێنێت بەوەی کە مەیلی ناخی خـۆی بـەلای سنعەتەکەی تردایـە، هۆکەشـی ئەوەیـە کـە مـەیل و سنعەتەکە ئاوێتەی یەکتر نابن و، لە ئەنجامدا شیرازەیان تێکدەچێت.

لەسەر بناغەی ئەمە:

کەسانێکی یەکجار زۆر بە مەیلی سەرکردایەتی و، فـەرماندەیی و، خۆ گـەورە دانـان بەسـەر خـەڵکانی تردا ڕەفتار دەکەن. دەبینـی "زانسـت" کـە شـتێکی شـەوق بـەخش و ڕابەر و ئامۆژگار و نەرم و نیانە، بە وێنەی هۆکـارێکی زەبر و زۆرەملێـی "خۆسـەپاندنی کەسی" بەسەر خەڵکانی تردا بەکار دەهێنێت، واتە لە بریی ئـەوەی خزمـەت بـە زانسـت بکات دەچێ لە خزمەتی خۆیدا دەیخاتە کار! بەم پێ‌یە کارمەندی‌یەکان – نەخوازەڵا هـی قوتابخانـە ئایینی‌یـەکان – کەوتـە دەسـت کەسـانێکی نەشـیاو. لـە ئـەنجامی ئەمەشـدا قوتابخانەکان بەرەو پووکانەوە و نەمان ڕۆشتن.

تەنها چارەسەری ئەمەش بەوە دەبێ: وانە بێژەکان، کە وەکو کارگوزارانی یەك فەرمانگە وان، لە چەند بازنەیەکی زۆردا بە وێنەی زانکۆ و، هەریەکەیان لە بواری پسپۆڕیی خۆیدا ڕێکبخرێن، تاکو هەرکەس بازاڕی مرۆڤایەتیی خۆی بەرێوە ببات و، ڕووی لە مافی خۆی بێت و، بە مەیلی سروشتی و گوێڕایەڵی کردنی فەرمانی مەعنەویی دانستی ئەزەلییش دەستووری "کار دابەشکردن" جێ‌بەجێ بکات.

**بێدارکردنەوەیەك:**

ئەو هۆکارە گرنگەی کە زانستی ناو قوتابخانە ئایینی‌یەکانی لە ئاستی خۆی دابەزاند و، لە ڕێڕەوی سروشتیی خۆی ترازاند ئەوەیە:

کاتێ کە "زانستە ئامرازە"کان(١) خرانە ناوەندی زانستە مەبەستەکانەوە، زانستە باشەکان پشتگوێ خران. چونکە شیکردنەوەی دەستەواژەی عەرەبی، کە پۆشاکەکەی (وشەکەی) لە حوکمی واتاکەیدایە، بەسەر زەینەکاندا زاڵ بوو. ئنجا ئەو زانستەش کە مەبەستی سەرەکی‌یە لە خوێندندا بوو بە پاشکۆی ئەو! جگە لەوەش، ئەو کتێبانەی کە لە زنجیرەی خوێندنی زانستدا بوون بە کتێبی ڕەسمی و دەستەواژەکانیان تا ڕادەیەك دەماودەمیان پێ دەکرا، هەموو کات و بیر و هزرەکانیان لە خۆیاندا بەند کرد و بواریان نەدا بە دەرچوون لێیان!

* * *

ئەی برای بەویژدان!

دەتبینم تاسەمەندی بۆ بینینی ناوەرۆك و گەوهەری ئەو سێ کتێبەی کە لەسەر ئەم پێشەکی‌یانە دادەمەزرێن..

ئارام بگرە! وا بابەتێکت بۆ باس دەکەم کە پوختەی ئەو سێ کتێبە، یان شێوە بچووککراوەکەیان، یاخود نەخشە کورت و پوختەکەیان دەنوێنێت. بەڵام بە خستنە ڕووی (نۆ مەسەلە)ی ناو ئەو کتێبانە دەست پێ دەکەم، بەو هیوایەی کە خوای گەورە

(١) زانستە ئامرازەکان (العلوم الآلية) وەکو: نەحوو، صەرف، مەنتیق و زانستەکانی تری هاوشێوەیان کە دەبنە ئامراز و هۆکار بۆ تێگەیشتن لە زانستە باڵاکان (العلوم العالية) وەکو: تەفسیر و، حەدیس و، فیقهـ و زانستەکانی تری هاوشێوەیان. (وەرگێڕ)

ویستی لەسەری بێت و پەروەردگاری بەخشندە یارمەتی بدات لە دوای (وتاری سێهەم) درێژە بەو بابەتە بدەم.

دە فەرموو ئەمەش بابەتەکەیە!

لەمەولا بە گەشتێکی ڕۆحانی و، بەو هۆکارانەی کە قورئانی پیرۆز پیشانیان دەدات و، بە هێز و توانای فەلسەفەی ڕاست، بەرەو زانستەکانی لەمەڕ ئاسمانەکان سەردەکەوم، تاکو لەوێوە بڕوانین و ببینین کە:

گۆی زەوی بریتی‌یە لە تۆپێکی گەورە کە دەستی توانستی بەدیهێنەری دانا دەیخولێنێتەوە و، بە چاوی دانست دەبینین کە هەمان دەست بە وێنەی بەردی قۆچەقانی (بەردەقانی) هەڵی دەدات هەتا وردوخاشی دەکات، تاکو بیگۆڕێت بە باشتر..

پاشان وردە وردە لە هەوا و بەرزایی ئاسمانەوە پلە بە پلە دێینە خوارەوە هەتا دادەبەزینە سەر ئەم "زەوی"یەی لانکی خۆمان، کە بەدیهێنەری میهرەبان بۆ حەوانەوەی ئێمە ڕایخستووە و ئامادەی کردووە..

پاشان بە وردی و سەرنجدانەوە دەڕوانینە "مرۆڤ" کە هەروەك چۆن بە تەواوبوونی قۆناغی "منداڵی"ی بێشکە و لانکەکەی فڕێ دەدات، بە وێران بوونی زەوییش ڕەوانەی کۆشکەکانی بەختەوەریی هەمیشەیی دەکرێت.

دوای درێژەدانمان بەم تێڕوانینە، بە "گەشتێکی ڕۆحانی" کە کات و شوێن ڕێی لێ ناگرێت، دەڕۆینە ناو گۆڕەپانی "ڕابوردوو"ەوە و، لەوێ بە شەپۆلی بروسکە مێژووییەکان لەگەڵ هاوڕە گەزەکانمان لە ڕۆڵەکانی ڕابوردوو دەڕۆین و، ئەو پەند و ڕووداوانە شارەزا دەبین کە لەو گۆشە نادیار و ئاوابووانەدا ڕوویان داوە و، شەمەندەفەرێکی هزر و بیریان لێ پێکدەهێنین و، ئنجا دەگەڕێینەوە و سەردانێکی هاوڕەگەزەکانمان دەکەین.

پاشان ڕووەو "داهاتوو" دەڕۆین تاکو سپێدەی ڕاستی بەیان لە داهاتوودا – کە لە دوورەوە دیارە – ببینین و، پیشانی غەیری خۆمانی بدەین. ئنجا سوار شەمەندەفەری "بەرزبوونەوە و پێشکەوتن" و کەشتیی "هەوڵ و تێکۆشان" دەبین کە پێی دەوترێت "سەرکەوتن لە کار و کۆششدا" و، چرای بەڵگە بە دەستەوە دەگرین و لەگەڵ خۆماندا

دەیبەین تاکو دەڕۆینە ناو ئەو "زەمان"ەی کە سەرەتاکەی تاریك دیارە، بەڵام دوای ئەوە ڕووناکی و درەخشانییەك دێت، تاکو لەگەڵ نەوەکانی "داهاتوو"دا تەوقە بکەین و پیرۆزبایی ئەو بەختەوەرییەیان پێشکەش بکەین کە پێی شاد بوون.

بەم جۆرە و لە دووتوێی ئەم وێنە فۆتۆگرافییە بچووککراوەیەدا، وێنەیەکی جوان هەیە بە "نووسراوی" بۆت دەردەکەوێت.

ئێستاش.. لەم زەوییەدا درەختەکانی ئەو کتێبە ناوبراوانە دەڕوێت و، بە جۆگەلەی هەر سێ (وتار)ەکەش ئاودێری دەکرێن.

برام!

پێش ئەوەی دەستت بگرم و بتگەیەنمە گەنجینەی ڕاستییەکان، دەست دەکەم بە هێنانی چەند مەسەلەیەك کە بەڵێنم پێ دایت، تاکو پەردەی ئەو ئەندێشانە لەسەر چاوی بینایی دڵت لا بدەم، کە وەکو دێوەزمە و درنج دەستی لەسەر چاوانت دادەنێت و دەیاننوقێنێت و، پاڵ بە سنگتەوە دەنێت و دەتترسێنێت.. خۆ ئەگەر شتێکی پیشان دایت ئەوا هەرچی ئەو بە "ڕووناکی" پیشانت بدات لە ڕاستیدا "ئاگر"ە و، هەر شتێکیش بە "گەوهەر و مرواری" بخاتە پێش چاوت گڵمۆتە. کەواتە خۆتی لێ بپارێزە!

بیشزانە! مەزنترین سەرچاوەی گومانەکانت چەند مەسەلەیەکن پەیوەندییان هەیە بە:

خڕیی زەوی.. پاشان "گا" و "نەهەنگ".. چیای قاف.. بەربەستی زولقەرنەین.. دانانی چیاکان بە وێنەی مێخ.. بوونی دۆزەخ لە ژێر زەویدا.. هەروەها ئایەتە پیرۆزەکانی:

﴿دَحاها﴾ (النازعات: ٣٠) و..

﴿سُطِحَتْ﴾ (الغاشية: ٢٠) و..

﴿والشَّمْسُ تَجري لِمُسْتَقَرٍّ لَها﴾ (يس: ٣٨) و..

﴿ويُنَزِّلُ مِنَ السَّماءِ مِنْ جِبالٍ فيها مِنْ بَرَدٍ﴾ (النور: ٤٣) و..

مەسەلەکانی تری هاوشێوەیان.

منیش حەقیقەتی هەموویانت بۆ ڕوون دەکەمەوە، تاکو ئەم ڕوونکردنەوەیە چاوی دوژمنان دابخات و، هی دۆستانیش بکاتەوە.

وا لە سەرەتاوە دەستی پێدەکەم بە:

# مەسەلەی یەکەم

لە لای زەینی بەویژدانتان ئاشکرا و ڕوونە کە:

زانایانی ئیسلام کۆکن لەسەر "خڕیی زەوی" ئەگەر چی یەکگرتنیشیان لەسەر ئەم مەسەلەیە بە "بێدەنگی" بوو بێت[1]..

گەر گومانت لەمەدا هەیە فەرموو بڕۆ بۆ "مەقاصید"[2] و "مەواقیف"[3] لەوێ دەچیتە سەر شوێنی مەبەست و لێی شارەزا دەبیت و، دەبینیت کە هەریەك لە "سەعد"[4] و

---

(١) واتە "ئیجماعی سکووتی" کە زاراوەیەکی زانستی "أصول الفقه"ە. تەنانەت هەندێ سەرچاوە باسی "ئیجماعی صەریح"ی زانایانی ئیسلام دەکەن لەسەر "خڕیی زەوی". لەوانە:
(الفصل في الملل والأهواء والنحل)ی "إبن حزم": ١/٣٥٢-٣٥٣. تحقيق أحمد شمس الديـــن، دار الكتـب العلمية - بيروت، الطبعة الثالثة: ٢٠٠٧م/١٤٢٨هـ.
(مجموع الفتاوى)ی "إبن تيمية": ٥/٩٥-٩٦، ٦/٣٥١-٣٦٠. بتحقيق: عامر الجزار وأنور البـــاز، نشـــر: مكتبة العبيكان - الرياض، السعودية، ودار الوفاء - المنصورة، مصر. (وەرگێڕ)

(٢) مەبەست کتێبی (شرح المقاصد)ە کە مەتن و شەرحەکەشی دانراوی "پێشەوا سەعدی تەفتازانی"یە و، کتێبێکی بەناوبانگ و سەرچاوەییە لە زانستی کەلامدا. "تەفتازانی" بەم کتێبەی هەموو ئەو کەلێنانەی زانستی "کەلام"ی پڕ کردووەتەوە کە پێشتر لە کتێبەکانی ئەم بوارەدا بەدی دەکران. بۆ بابەتی ئاماژە پێدراوی ئەم کتێبە بڕوانە: (شرح المقاصد، لسعد الدين التفتازاني، بتحقيق إبراهيم شمس الدين : ٢/٣٤٨-٣٥٨) الطبعـة الأولى، دار الكتب العلمية، بيروت، ١٤٢٢هـ/٢٠٠١م. (وەرگێڕ)

(٣) مەبەست کتێبی (شرح المواقف)ە لە زانستی کەلامدا، کە دانراوی سەیید شەریفی جورجانی‌یە و، ڕاڤەی کتێبی "المواقف"ی "قازی عەزودەدین عەبدوڕڕەحمانی ئیجی"یە کە ساڵی (٧٥٦ك) کۆچی دوایی کردووە. بۆ بابەتی ئاماژە پێدراوی ئەم کتێبە بڕوانە: (شرح المواقف، للإيجي: ٧/٨٣-١١٠)، الطبعة الأولى، دار الكتـب العلمية، بيروت، ١٤١٩هـ/١٩٩٨م. (وەرگێڕ)

(٤) مەبەستی دانەر (پێشەوا سەعدی تەفتازانی)یە، کە ناوی "مەسعوودی کوڕی عومەری کوڕی عەبدوڵڵا"یە. ساڵی ٧١٢ك (یان٧٢٧) لە تەفتازانی سەر بە خوراسان لە دایك بووە و، لە سەمەرقەندیش ساڵی (٧٩٣ك) کۆچی دوایی کردووە. لە زانستەکانی زمانی عەرەبی و مەنتیق و کەلام و بەلاغەدا پێشەوای زانایانی ڕۆژگاری خۆی بووە. دوای ئاوابوونی خۆری زانستە ئیسلامی‌یەکان لە ئەنجامی هێرش و پەلامارەکانی مەغۆلدا ئەم زانایە هەوڵی دا ئەو زانستانە زیندوو بکاتەوە و گەلێ کتێبی سەرچاوەیی گرنگیشی بۆ ئەم مەبەستە دانا. تەنانەت بە سنووری نێوان زانایانی پێشین و دوایین دادەنرێت. ئەمەش ناوی هەندێکە لە کتێبەکانی: (تـهذيب المنطق، شرح المقاصد، شرح العقائد النسـفية، المطـول، مختصر المعاني، التلويح في كشف حقائق التنقيح). تا ئێستاش هەندێ لەم کتێبانە لە قوتابخانە ئایینی‌یەکانی کوردستان و زانکۆکانی چەشنی زانکۆی ئەزهەریشدا بە دەرس دەخوێنرێن. (وەرگێڕ)

"سەييد"[١] بە وێنەی دەستاودەست پێکردنی تۆپێکی ئاسایی لە گـۆی زەوی دواون و بـە چێژ وەرگرتنەوە ڕوانیویانەتە هەموو لایەنەکانی.

خۆ ئەگەر کردنەوەی ئەو دەرگایەت بە ئاسانی بۆ نەهات بە دەستەوە، ئەوا بڕۆ بۆ ناو تەفسیرە فراوانەکەی ئیمامی ڕازی[٢] کە ناوی "مفاتیح الغیب"ە و، لـە ئەڵقـەی وانـە وتنەوەی ئەو پێشەوا بلیمەتە دابنیشە و گوێ لە دەرسەکانی ڕابگرە[٣].

ئەگەر بەمەش دڵنیا نەبویت و نەتتوانی لە "خڕیـی زەوی" تێبگەیت، شوێن "ئیبراهیم حەققی"[٤] بکەوە و، بڕۆ بۆلای حوججەتولئیسلام ئیمامی غەزالی[٥] و لێی بپرسە:

---

(١) مەبەستی دانەر (سەیید شەریفی جورجانی)یە کە زانایەکی بەرز و بەڕێزی چەرخی خۆی بووە و، لە ساڵی (٨٣٨ ك - ١٤٣٤ز) کۆچی دوایی کردووە. گەلێ بەرهەمی زانستیی دوای خۆی جێ هێشتووە، وەك: "الرشاد في شرح الإرشاد" و، شەرحی "إرشاد الساري"ی تەفتازانی کە لە زانستی "نەحوو"دایە و، وەرگێڕانی نامیلکەیەك لە مەنتیقدا کە باوکی بە زمانی فارسی دایناوە و، دانانی کتێبی "الغرة" لە مەنتیقدا و، لە هەموویان گرنگتر: شەرحی کتێبی "المواقف"ی "عەزودەدینی ئیجی"یە لە زانستی "کەلام"دا. (وەرگێڕ)

(٢) ئیمام فەخرەددینی ڕازی: (٥٤٤-٦٠٦ك/١١٥٠-١٢١٠ز) ناوی محەممەدی کوڕی عومەری کوڕی حەسەنی کوڕی حوسەینی تەیمیی بەکریيە و، پێشەوایەکی تەفسیرنووس و تاقانەی بێ وێنەی ڕۆژگاری خۆی بووە لە زانستە عەقلی و نەقلی و زانستەکانی پێشیندا. لە بنەچەدا خەڵکی تەبەرستانە و بە نەسەبیش قوڕەیشیيە و لە شاری "ڕەی" لە دایك بووە و پاشان لە ساڵی ٦٠٦ کۆچی لە شاری "هەرات" کۆچی دوایی کردووە. ئەمەش ناوی هەندێکە لە بەرهەمەکانی: "مفاتیح الغیب" کە تەفسیری قورئانی پیرۆزە لە هەشت بەرگدا و، "لوامع البینات فی شرح أسماء الله تعالى والصفات". بڕوانە ئەم سەرچاوانە: الأعلام ٦/٣١٣، وفیات الأعیان ١/٤٧٤، مفتاح السعادة ١/٤٤٥، لسان المیزان ٤/٤٢٦، البدایة والنهایة ١٣/٥٥، طبقات الشافعیة ٥/٣٣. (وەرگێڕ)

(٣) بڕوانە تەفسیری (مفاتیح الغیب)ی ئیمامی ڕازی: ٢/١١٣-١١٤، ٤/٢١١-٢١٣، ٨/١٦٣، ١٩/٣-٤، ٢١/١٦٧، چاپی دار الفکر، ١٤٠١هـ/١٩٨١م. (وەرگێڕ)

(٤) شاعیر و زانا و گەشتیار و ئەندازیارێکی زیرەك و زاهیدێکی مەزن و بەڕێزە. خەڵکی یەکێك لە گوندەکانی سەر بە شاری ئەرزرۆمە. لە نێوان ساڵەکانی (١٧٠٣-١٧٨٠ز)دا ژیاوە. لای زانایانی سەردەمی خۆی وانەکانی خوێندووە، بە تایبەت لە شارۆچکەی "تیللۆ"ی سەر بە پارێزگەی "سیرت". بەناوبانگترین بەرهەمەکانی ناوی: "مەعریفەتنامە"یە. ئارامگاکەی لە شاری "سیرت"ە لە باکووری کوردستان. (وەرگێڕ)

(٥) ئیمامی غەزالی (٤٥٠ - ٥٠٥ك) یەکێکە لە گەورە مەردانی ئیسلام و، ناوی ئەبوو حامید محەممەدی کوڕی محەممەدی کوڕی محەممەدی غەزالیيە. کەڵە زانای زانستەکانی فیقهی شافیعی و کەلام بووە و، بە فەیلەسووف و زاهید و چاکسازێکی ئایینی و کۆمەڵایەتی و خاوەن پەیامێکی ڕۆحی دادەنرێت کە جێ دەستی لە ژیانی ئیسلامیدا هەر لە سەردەمەکەی خۆیەوە هەتا ئێستا ئاشکرا و نمایانە. لە شاری "تووس"ی سەر بە خۆراسان لە دایك بووە و، پاش تەواو کردنی خوێندن لە زانستەکانی کەلام و فەلسەفە بە تایبەت هی ئیبن سینا و فارابی، هەروەها لە زانستەکانی دەستەی باتینی کۆڵیوەتەوە، بەڵام هیچ کام لەوانە نەیانتوانیوە

ئایا هیچ گرفتێك لەوەدا هەیە كە زەوی "خڕ" بێت؟

بێ گومان وەڵامت دەداتەوە كە:

(گرفت لەوەدایە خڕیی زەویت پێ قبووڵ نەبێت)!

چونكە هەر لە چەرخی خۆیەوە ئەو فەتوایەی ناردووە كە: "هەركەسێك بە نیازی پارێزگاری لە ئایین ئینكاری لە هەر شتێكی سەلماو بە بەڵگەی بێ گومان بكات، وەك خڕیی زەوی، ئەوا تاوانێكی گەورەی بەرامبەر ئیسلام ئەنجام داوە، چونكە ئەو هەڵوێستە هەرگیز وەفاداری نی‌یە بەرامبەر بە ئیسلام، بەڵكو خیانەتێكە بەرامبەری"(١).

خۆ ئەگەر نەخوێندەوار بوویت و بە باشی فەتواكەی ئەوت بۆ نەخوێنرایەوە، فەرموو گوێ لە زانای هاوچەرخمان و برای هاوبیرمان "حسین الجسر"(٢) ڕابگرە كە سەرزەنشتی توند ئاراستەی ئەو كەسە دەكات لە "خڕیی زەوی" ئینكاری بنوێنێت و، بە بێ دوودڵی و بە هێزی حەق و ڕاستی دەڵێت:

---

پێویستیی ژیریی ئەو بە یەقین و دڵنیایی تێر بكەن و، ڕەزامەندیی حەز و خواستی دڵیشی لە بەدەستهێنانی بەختەوەریدا دەستەبەر بكەن، هەتا خۆی بە ڕێبازێكی جیاواز لە هەموو ئەوانە توانیویەتی بەو ئامانجە بگات و، دوایی هەر خۆی لە كتێبی (المنقذ من الضلال)دا ئەو گەشتە فیكری و ڕۆحی‌یەی تۆمار كردووە. ماوەیەك لە قوتابخانەی نیزامی‌یەی بەغدا (كە گەورەترین زانكۆی ئەو سەردەمە بووە) سەرگەرمی وانە وتنەوە بووە، پاشان سەردانی زۆر شاری وەك دیمەشق و بەیتولمەقدیس و قاهیرە و ئەسكەندەریە و مەككە و مەدینەی كردووە. گەلێ بەرهەمی دوای خۆی بەجێ‌هێشتووە كە ئەمە ناوی هەندێكیانە: "إحیاء علوم الدین"، "تهافت الفلاسفة"، "المنقذ من الضلال"، "الأربعین في اصول الدین". پێم خۆشە خوێنەری بەڕێز بۆ زیادە شارەزابوون لە ژیان و ڕۆڵی گرنگی ئەم مەردە ناوازەیە بەرگی یەكەمی كتێبی (رجال الفكر والدعوة في الإسلام)ی خوالێخۆشبوو (سەیید ئەبولحەسەنی نەدوی) و، (هكذا ظهر جیل صلاح الدین)ی (د. ماجد الگیلاني) (بە تایبەتی: الفصل العاشر) بخوێنێتەوە. (وەرگێڕ)

(١) بۆ وتەكەی ئیمامی غەزالی بڕوانە: (تهافت الفلاسفة) للإمام الغزالي ص: ٨٠، تحقیق وتقدیم الدكتور سلیمان دنیا، الطبعة الثامنة، نشر دار المعارف، مصر، دون تأریخ. هەروەها (معیار العلم) للإمام الغزالي ص: ٦٢، تحقیق وتقدیم الدكتور سلیمان دنیا، مطابع دار المعارف، مصر،١٩٦٩م. هەر هەمان دەقی ئەو كتێبە ص: ٣٠ چاپی (دار الكتب العلمیة، بیروت) ساڵی ١٤١٠هـ/١٩٩٠م، ڕاڤەكردنی: أحمد شمس الدین. (وەرگێڕ)

(٢) حسین الجسر: لە (تەرابلوس)ی لوبنان لەدایك بووە و هەر لەوێش كۆچی دوایی كردووە. لە نێوان ساڵەكانی (١٢٦١-١٣٢٧ك/١٨٤٣-١٩٠٩ز)دا ژیاوە. ساڵی (١٢٨٤ك) خوێندنی لە ئەزهەر تەواو كردووە. كە گەڕاوەتەوە بۆ تەرابلوس یەكە پیاوی ئەوێ و شاعیر و زانا و فەقیهێكی بەناوبانگی سەردەمی خۆی بووە. چەند بەرهەمێكی هەیە، بەناوبانگترینیان: (الرسالة الحمیدیة) و (الحصون الحمیدیة)یە. بڕوانە: (الأعلام)ی زەركەلی ٢٥٨/٢. (وەرگێڕ)

"ئەو کەسەی گوایا پشت بە ئایین دەبەستێ و لـە پێنـاوی پاراستنیدا ئینکـاریی خرپـی زەوی دەکات، دۆستێکی نەفامە، زیانی ئەو بۆ ئایین لە هی دوژمنـی سەرسەخت گەلـێ زیاترە"[١].

گەر هزری "عەودالی ڕاستی"ت بەم دەنگە بەرز و بەهێزە لە خەوی خۆی هەر بێـدار نەبووەوە و، چاوەکانیشت نەیانتوانی بکرێنەوە، فـەرموو دەسـتی "ئیـبن هومـام"[٢] و "فەخرولئیسـلام"[٣] و هاوشـێوەیان بگـرە و، بـڕۆ بـۆلای ئیمـامی شـافیعی[٤] و، لـە مەسەلەیەکی فیقهدا داوای فەتوای لێ بکە:

(لە یەك کاتدا هەر پێنج فەرزەکە ئـەدا دەکرێـن.. قـەومێك هـەن هـەندێ جـار کـاتی نوێژی خەوتنانیان نی‌یە، ئایا چۆن نوێـژی خـەوتنان بخوێنـن؟.. قـەومێکیش هـەن چـەندین ڕۆژ خۆریـان لــێ ئـاوا نـابێـت یـاخود چـەندین شـەویان لــێ دەگـوزەرێ خۆریـان لــێ هەڵنایەت، ئایا چۆن بەڕۆژوو بن)؟

(١) لە ڕاستیدا ئەمە بەشێکە لە دەقی وتەکەی ئیمـامی غـەزالی کـە لـە پـەراوێزی پێشـووتردا ڕابـورد، پێدەچێ شێخ "حسين الجسر" لەوی وەرگرتبێت، یـاخود دەقێکی نزیـك لـەوەی ئیمـامی غـەزالیی هـەبێت ڕێمـان لێـی نەکەوتبێت، چونکە لە کتێبی (الحصون الحميدية)دا دەقێکی ڕاشکاوی وەهامـان نـەبینی، بـەڵام دەتوانـرێ ئـەو واتایە لە لاپەڕە (١٦٩) و لاپەڕەکانی دەوروبەری لە کتێبی ناوبراو وەربگیرێت. (وەرگێڕ)

(٢) ئیبن هومام (٧٩٠ - ٨٦١ك/١٣٨٨-١٤٥٧ز) ناوی "موحەممەد کوڕی عـەبدولواحید"ە و، پێشـەوایەکە لە زانایـانی فیقـهی حەنـەفی. شـارەزای بناغـەکانی ئـایین و تەفسیر و فـەرائیز و فیقـهـ و بیرکاری‌یـە. لـە قاهیرە کۆچی دوایی کردووە. یەکێك لە کتێبەکانی ناوی: (فتح القدير)ە کە لە هەشت بەرگدایە و ڕاڤـەی کتێبی: (الهداية)ی فیقهی حەنەفیی تێدا کردووە. هەروەها کتێبی (التحرير) لە زانستی (أصول الفقه)دا. (وەرگێڕ)

(٣) فەخرولئیسلامی بـەزدەوی (٤٠٠ - ٤٨٢ك/١٠١٠ - ١٠٨٩ز) نـاوی: "عـەلیی کـوڕی موحەممـەدی کوڕی حسـەین"ە و، ناسـراوە بـە "فخر الإسـلام البزدوي". زانایەکی فیقهـ و ئوسـوولی فیقـهی مەزهـەبی حەنەفی‌یە و، نیشتەجێی "سەمەرقەند" بووە و لە بنەچەدا خەڵکی قەڵای "بەزدە"یە لە نزیکـی (نەسـەف) گەلـێ بەرهەمی جێ هێشتووە، لەوانە: (كنز الوصول) لە زانستی ئوسـوولی فیقـهدا و ناسراوە بـە "أصـول البـزدوي" هەروەها تەفسیرێکی گەورە بە ناوی (تفسير القرآن) و (غذاء الفقـهاء) لـە زانسـتی فیقـهدا. (وەرگێڕ لـە چاپـە عەرەبی‌یەکەوە).

(٤) "ئیمامی شافیعی": ناوی (محەممـەدی کـوڕی ئیدریـس)ە و، سـاڵی (١٥٠ك/٧٦٧ز) لـە فەلەستین لـەدایك بووە، بە منالی براوە بۆ مەککە و لەوێش گەورە بووە. لە مەککە و مەدینە خوێندوویـەتی، پاشـان ڕۆشـتووە بـۆ یەمەن و، دووجاریش سـەردانی بـەغدای کـردووە. سـاڵی (١٩٩ك) ڕۆشتووە بـۆ میسـر و هـەر لـەوێش سـاڵی (٢٠٤ك/٨٢٠ز) کۆچی دوایـی کـردووە. یەکێکـە لـە پێشـەوای چـوار مەزهەبـە فیقهی‌یەکانی ئیسـلام و لــە زیرەکە هەڵکەوتووەکانی مێژوو. بەناوبانگترینی بەرهەمەکانی بریتین لـە کتێبی (الأم) و (أحكام القـرآن). بـۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: (الإمام الشافعي، فقيه السنة الأكبر، تأليف عبد الغني الدقـر) هـەروەها (تجزيـه و تحليـل زندگانی امام شافعی، تاليف عبدالله احمديان). (وەرگێڕ)

هەروەها لێی بپرسە:

(ئایا پێناسـەی "مـەرجی شـەرعی" کـە بریتیـیە لـەوەی "لەگـەڵ هـەموو ڕوکنـەکاندا بەرامبەر بوەستێ" چۆن لە مەرجی ڕووکردنە قیبلـەی نوێـژدا دەردەچێ[1]، لـە کـاتێکدا ئەو بەرامبەر وەستانە تەنها لەکاتی وەستانی نوێژ و دانیشتندا دێتە دی)؟

دڵنیابە کە ئەو - واتە ئیمامی شافیعی - سەبارەت بە مەسـەلەی یەکەم بـە خێرایـی ئـەو بازنەیە وەڵامت دەداتەوە کە بە خۆرهەڵات و خۆرئاوادا تێپەڕ دەبێت..

لە مەسەلەی دووهەم و سێهەمیشدا بە کەوانەیی ئـەو بازنەیـە وەڵام دەداتـەوە کـە لـە باشوورەوە هەتا باکوور درێژ بووەتەوە، واتە ئەو وەڵامەت دەداتەوە کـە بەڵگـەی عـەقڵی دەیدات بە دەستەوە..

سەبارەت بە مەسەلەی قیبلەش دەڵێت: "قیبلە بریتی‌یە لە سـتوونێکی نوورانیـی ئـەوتۆ کە ئاسمانەکانی هـەتا عـەرش لـە یـەك ڕشتەدا هۆنیوەتـەوە و چینـەکانی گـۆی زەوییشـی کوناودەر کردووە هەتا دەگاتە ناخی زەوی"[2].

خۆ ئەگەر پەردە لەبەر چاوانت لابدرایە ئەوا تیشکی چاوت لە هەموو جموجوولێکی نوێژەکەتدا تەوقەی لەگەڵ خودی قیبلەدا دەکرد!

برای بەڕێزم!

وەهم و گومانە سەیر و سەمەرەکانت هیچ نرخێکیان نی‌یە هەتا بڕۆنە دڵەوە، چونکـە جگە لـە "جیـهانی ئەندێشـە" هیـچ جێگایـەکی تـرت بـۆ نەدۆزینـەوە! وێـڕای ئـەوەی کـە

---

(١) مەبەست لە "قیبلە" شوێنی کەعبەیە، نەك بیناکەی. چونکە ئەگەر بیناکـەی بۆ شـوێنێکی تر بگوێزرێتـەوە دروست نی‌یە ڕووی تێبکرێت لە نوێژدا، بەڵکو دەبێ ڕوو بکرێتە شوێنەکەی. بڕوانە: (نـــهاية المحتـــاج: ٤٠٦/١، نشر: المكتبة الإسلامية، دون تأريخ) لە فیقهی شافیعیدا، هەروەها: (رد المحتار: ٢٩٠/١، نشر: دار إحياء التراث العربي، دون تأريخ) لە فیقهی حەنەفیدا. (وەرگێڕ)

(٢) ئەو پێناسـەیەی کە نووسـەر هێناویـەتی بۆ قیبلـە، تەنـها تایبـەت نی‌یـە بـە مەزهـەبی شـافیعی‌یەوە، بـەڵکو مـەزهـەبەکانی تریش کـۆکن لەسـەر نـاوەرۆکی ئەو پێناسـەیە و، دەڵێن: کەعبـە و سـەرووی کەعبـەش هـەتا ئاسمان و، ژێر کەعبەش هەتا بەرەو خوار بڕوات، هەر قیبلەیە. بۆ نموونە: ئەگـەر مرۆڤ لەسـەر چیـا بـەرزەکان یـان لـەناو بیرە قوولـەکاندا نوێـژ بکـات، مـادەم ڕووی لـەو ئاراسـتەیە بێـت، نوێژەکـەی دروستە. بڕوانـە ئـەم سەرچاوانە: (رد المحتار: ٢٩٠/١)؛ (نـــهاية المحتاج: ٤٠٧/١، ٤١٧-٤١٨)؛ (حاشية الجمل على المنـــهج: ٣١٣/١ نشر: دار الفكر للطباعة والنشر والتوزيع، دون تأريخ)؛ (الموسوعة الفقهية: ٦٢/٤) إصـــدار وزارة الأوقاف، الكويت، ١٤٠٦هـ/١٩٨٦م)؛ (الفقه الإسلامي وأدلته، للدكتور وهبة الزحيلي، ٧٥٨/١ طبعـة رابعة معدلة، دار الفكر، دمشق، ١٤١٨هـ/١٩٩٧م). (وەرگێڕ)

خۆیشت باوەڕت پێیان نی‌یە و، تەنانەت ناتوانی لە دەروونی خۆتدا قەناعەتیان پێ بکەیت.. بەڵام هێندە هەیە کە تۆ لە ڕێ لاتداوە..

جا ئەگەر ئەو دڵەت کە لە ئاستی "ئەندێشە"دا کراوە و لە بەرامبەر "ڕاستی"ش داخراوە، جێی "خڕیی زەوی"ی تێدا نەبێتەوە، کە زۆر لەوە بچووکترە بە ئەندێشەی تۆدا دێت، ئەوا ئاسۆی ڕوانینت فراوان بکە تاکو زەینیشت فراوان ببێت و، پاشان دانیشتوانی گۆی زەوی بە وێنەی یەك دانە ئەنجومەن ببینە و، پرسیاریان لێ بکە، چونکە خاوەن ماڵ لە هەموو کەسێ زیاتر شارەزای شتانی ناویەتی. ئەو کاتە هەموویان بە بینین و تەواتوور و، بە یەك دەم و زمان وەڵامت دەدەنەوە کە:

"ئەم گۆی زەوی‌یەمان، کە لانك و شەمەندەفەرمانە لە گەشتی ئەم بۆشاییەی جیهاندا، هەرگیز شێت نی‌یە تا لەو یاسا دەست بەکار و بەردەوامە خواییە لابدات کە لە هەموو تەن و قەبارە بەرزەکاندا جێ‌بەجێ و دەست بەکارە".

ئنجا لەگەڵ ئەم وەڵامەیاندا، نەخشەکانی زەویشت وەك چەند بەڵگەیەکی بەرجەستە لە بەردەمدا ڕادەخەن!

یاسای سروشتی خوایی کە پێی دەوترێ "ڕێسای بەدیهێنانی جیهان" ئەوەی بەسەر زەویدا سەپاندووە - ئەو زەوی‌یەی کە وەکو موریدی شەیدای ناو تەریقەتی مەولەوی دەخولێتەوە و هەڵدەسووڕێ[1]- کە لە ڕیزی ئەو ئەستێرانە (هەسارانە) لانەدات چاویان لە خۆر کردووە. ئەوەبوو زەوی لەگەڵ هاوتاکەیدا (ئاسمان) وتیان: ﴿أتينـا طـائعين﴾ (فصلت: ١١).. خۆ دیارە گوێڕایەڵیش لەناو کۆمەڵدا گەلێ باش و جوانترە.

**لەمانەی پێشەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە:**

خوای گەورە زەویی بەو شێوە بەدی هێناوە کە ویستی خۆی لەسەری بێ و دانستەکەشی داخوازی بێت، نەك بەو شێوەیەی کە ئەندێشەتان - ئەی شوێنکەوتووانی ئەندێشەکان - حەزی لێیەتی! هەروەها ژیریی ئێوەشی نەکردووە بە ئەندازیاری بوونەوەران!

---

(١) مەبەست بە "مەولەوی" لێرەدا: ڕێڕەوانی تەریقەتەکەی مەولانا جەلالەددینی ڕۆمی‌یە. چونکە موریدی ئەم تەریقەتە لە کاتی زیکردا بە دەوری کۆڕی زیکرەکەدا دەسووڕێتەوە و، لە هەمان کاتدا بە دەوری خۆیشیدا دەخولێتەوە. (وەرگێڕ)

**وریاکردنەوەیەك:**

یەکێك لەو شتانەی کە ئاماژەن بۆ "لاوازیی بیروباوەڕ" یان "مەیل بە لای ڕێچکەی سۆفستائی"دا[١]، یاخود ئاماژە بۆ شوێنکەوتن و خواستنی ئیسلام دەکەن لە لایەن کەسێکەوە کە هێشتا ئیسلامی بەدەست نەهێنابێت، ئەو وشە گەوجانەیە کە دەڵێت:

(ئەم ڕاستی‌یە پێچەوانەی ئایینە)!

چونکە ئەو کەسەی گریمانی دژایەتی دادەنێت لە نێوان هەر شتێکدا کە بە بەڵگەی یەقینی سەلمابێت و لە نێوان ئاییندا کە حەق و ڕاستیی بێ گومانە و، ترس و سامی ئەم دژایەتی‌یەی لێ نیشتووە ، هەرگیز لەمانە بەدەر نی‌یە:

یان سۆفستائی‌یەك لە مێشکیدا خۆی حەشار داوە کە شتانی لێ دەئاڵۆزێنێت..

یان گومان ورووژێنەرێك لەناو دڵیدا خۆی حەشار داوە کە گاڵە گاڵ و ئاژاوە دەنێتەوە..

یاخود ئایینخوازێکی نوێ‌یە؛ دەیەوێ بە ڕەخنە لێگرتن ببێت بە خاوەن ئایین!

---

(١) سۆفستائی‌یەکان: دەستەیەك بوون لە فەیلەسووفەکانی یۆنانی کۆن، کە دوای قوتابخانەی "فیساگۆرس" و لە ئەنجامی ئاڵۆزیی باری ڕامیاری و قەیرانی ئابووری پەیدا بوون. ئەم دەستەیە ئینکاریی حەقیقەتی شتانیان کردووە و لایان وا بووە کە هیچ شتێك دارای حەقیقەت نی‌یە. "گۆرگیاس" و "بڕۆتاگۆراس" بەناوبانگترینی فەیلەسووفە سۆفستائی‌یەکانن. ئەم تاقمەش لەناو خۆیاندا چەند بەشێکن. کاتی خۆی "سوقرات" زۆر بە توندی بەرپەرچی داونەتەوە. بەڵام ئەوەندە هەیە کە ئەم جۆرە کەس و بیر و ڕایانە لە هەموو سەردەمێکدا بە کاڵای نوێ و ناوی جۆراوجۆرەوە پەیدا دەبنەوە. بۆ زیادە شارەزابوون سەیری ئەم سەرچاوانە بکە: "شـــرح العقائد النسفية" لسعدالدين التفتازاني ص ٢٣-٢٥ طبعة تركيا سنة ١٣٢٦ هـــ، "كشـــاف إصطلاحـــات الفنون" للتهانوي ج١/ص٦٦٥ طبعة كلكته في الهنـــد عـــام ١٨٦٢م، "الموســـوعة الفلســـفية الميســـرة" ج١/ص١٠٣٤ طبعة دار نـــهضة لبنان — بيروت سنة ١٩٦٥م. هەروەها پێشەکیی (مهدی توحیدی پور) بۆ (نفحات الأنس)ی مەولانای جامی ص ٦٩-٧٠ ناشر: کتابفروشی سعدی. (وەرگێڕ)

## مەسەلەی دووهەم

شاراوە نییە کە باسی بەناوبانگی (گا و نەهەنگ)[1] نامۆیە بە ئیسلام و، لاکوت و مشەخۆرە، چونکە لەگەڵ موسڵمان بوونی ڕاوییەکانی (گێڕەرەوە) کەیدا هاتووەتە ناو موسڵمانانەوە. ئەگەر حەز دەکەیت لەمە تێبگەیت سەردانی "پێشەکیی سێهەم" بکە تاکو ببینیت کە لە چ دەرگایەکەوە هاتووەتە ناوەوە!

سەبارەت بەوەش کە دراوەتە پاڵ "ئیبن عەبباس" سەیری ئاوێنەی "پێشەکیی چوارەم" بکە، لەوێ لە نهێنیی ئەوە تێدەگەیت کە بۆچی دراوەتە پاڵی.

لەگەڵ ئەوەشدا، لەبارەی ئەوەی کە زەوی لەسەر (گا و نەهەنگ) بێت حەدیسێك ڕیوایەت کراوە[2].. بەڵام:

یەکەم: نایسەلمێنین کە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ بێت، چونکە نیشانەی "ئیسرائیلیات"ی پێوەیە!

دووهەم: ئەگەر بیشسەلمێت کە فەرموودەی پێغەمبەرە ﷺ ئەوا حەدیسێکی "ئاحاد"ە و لەبەر لاوازیی پەیوەندییەکانی نێوان سەنەدەکەی "ظَـن" دەگەیەنێت، نەك "یَـقین". کەواتە ناڕواتە بواری بابەتەکانی عەقیدەوە، چونکە ئەو بوارە مەرجەکەی "یەقین"ە.

سێهەم: تەنانەت ئەگەر "موتەواتیر" و "قطعي المتن"یش بێت، "قطعي الدلالة" نییە.

سەردانی "پێشەکیی یازدەهەم" بکە و لە "پێشەکیی پێنجەم"یش ڕامێنە، تاکو ببینیت کە چۆن "ئەندێشە" حەزی خەڵکانی ڕواڵەت بینی بەلای خۆیدا کێش کردووە و، ئەم حەدیسەیان لە لێکدانەوەی دروست و ڕووە ڕاستەکانی خۆی ترازاندووە.

---

(١) بریسکەی چواردەهەم لە کتێبی (بریسکەکان) ئەم مەسەلەی بە درێژی ڕوون کردووەتەوە. (وەرگێڕ)

(٢) بڕوانە: (الطبري، جامع البيان: ١/١٥٣،١٩٧، ٢١/٧٢)؛ (الحاكم، المستدرك: ٤/٦٣٦)؛ (ابن عبد البر، التمهيد: ٤/٩)؛ (الهيثمي، مجمع الزوائد: ٨/١٣١، نقلاً عن البزار). (پەراوێزی وەرگێڕانی عەرەبی، چاپە تازەکەی دار النيل ٢٠١٠).

هەروەها بڕوانە: (ابن حجر، المطالب العالية، الطبعة المحققة: ٤/٤٦-٤٧). (وەرگێڕ)

ئەم حەدیسە - گەر بسەلمێت فەرموودەی پێغەمبەرە ﷺ - سێ ڕووی ڕاستی هەیە:

ڕووی یەکەم:

هەروەك هەڵگرانی عەرش کە ناویان: "ثَوْر" و "نَسْر" و "إنسان" و ناوی تری جگە لەم ناوانەیە، "مەلائیکەت"ن[1]..

ئەم گا و نەهەنگەش دوو "مەلائیکەت"ی هەڵگری زەوین.

دەنا هەڵگرتنی عەرشی مەزن لەسەر شانی مەلائیکەت، بەڵام دانانی زەوی لەسەر گایەکی لاواز - وەك لاوازیی زەوی - پێچەوانەی ڕێسای جیهانە!

لەسەر زاری "شەریعەت" ئەوە هاتووە کە:

هەموو "جۆر"ێکی بوونەوەران مەلائیکەتێکی سەرپەرشتیاری تایبەت بەخۆی هەیە کە گونجاو بێت بۆی و، هەر لەسەر بناغەی ئەو پەیوەندییە مەلائیکەتەکە بە ناوی ئەو "جۆر"ەوە ناونراوە، لەوانەشە لە جیهانی مەلائیکەتاندا لەسەر شێوەی ئەو دەربکەوێت.

فەرموودەیەك بەم واتایە هەیە کە دەفەرموێ:

(هەموو ئێوارەیەك خۆر لە ژێر "عەرش"دا ئاوا دەبێت و سوژدە دەبات، پاشان ڕوخسەت دەخوازێت و دەگەڕێتەوە)[2].

بەڵێ، ئەو مەلائیکەتەی کە سەرپەرشتیاری "خۆر"ە، ناوی "خۆر"ە و، لە شێوەی خۆردایە و، هەر ئەویشە کە دەڕوات و دێت.

"فەیلەسووفە ئیلاهییەکان"یش[3] لایان وایە کە هەموو "جۆر"ێك ماهیەتێکی پەتی (مُجَرَّد) و گۆیا و زیندووی تایبەت بە خۆی هەیە کە یارمەتیدەر و پشتگیری یەك بە

---

(١) بڕوانە: (الطبري، جامع البيان: ٣٤٣/١ (السيوطي، الدر المنثور: ٤٨٦/٥)؛ (تفسير الخازن: ١٥٣/٦). (پەراوێزی وەرگێڕانی عەرەبی، چاپە تازەکەی دار النیل ٢٠١٠).

(٢) عن أبي ذر رضي الله عنه قال: دخلت المسجد ورسول الله ﷺ جالس. فلما غابت الشمس قال: "يا أبا ذر! هل تدري أين تذهب هذه؟". قال: قلت: الله ورسوله أعلم. قال: "فإنها تذهب فتستأذن في السجود، فيؤذن لها، وكأنها قد قيل لها: ارجعي من حيث جئتِ فتطلع من مغربها". بڕوانە: (صحيح مسلم الحديث رقم (١٥٩). (وەرگێڕ)

(٣) بەو فەیلەسووفانە دەوترێت کە باوەڕیان بە بوونی خوای بەدیهێنەر هەبووە، بەڵام لە باسی زاتی خوای گەورە و سیفەتەکانیدا و، لە خودی "بەدیهێنان" و، لەو بابەتانەشدا کە بە بێ "وەحی"ی خوای گەورە و بە تەنها لە ڕێی ژیرییەوە ڕاستییان نازانرێت، کەوتوونەتە هەڵەوە. (سوقرات و ئەفلاتۆن و ئەرستۆ)

یەك و دانە دانەکانی ئەو جۆرەیە. "شەرع" بە: "مَلَكُ الجبال و، مَلَكُ البحار و، مَلَـــكُ الأمطار" ناویان دەبات.

بەڵام هیچ کام لەوانە کاریگەریی ڕاستەقینەیان نییە، چونکە لە هەموو گەردووندا جگە لە خوای گەورە هیچ شتێکی تر کاریگەریی نییە (لا مؤثِّرَ في الكونِ إلاّ الله).

حیکمەتی دانانی هۆکارە ڕواڵەتییەکانیش: دەرخستنی گەورەیی و مەزنیی خوایە، تاکو ئەو ڕوانینەی کە ئاراستەی بازنەی "هۆکارەکان" دەکرێت، دەست وەردانی بێ پەردە و ڕاستەوخۆی دەستی توانست نەبینێت لەو شتانەدا کە بەڕواڵەت بێ نرخ دەبینرێن.

بەڵام لە ڕووی "مەلەکووت" و ڕاستەقینەدا - کە بازنەی باوەڕە - دەست وەردانی بێ پەردە و ڕاستەوخۆی دەستی توانست لە هەموو شتێکدا کارێکی شیاوە بۆ مەزنی و گەورەیی خواوەند، چونکە هەموو شتێك لەم ڕووەدا بەرز و بڵندە.. ئەوەش بڕیاری خوای خاوەن مەزنی و داناییە (ذلكَ تقديرُ العزيزِ العليم).

**ڕووی دووهەم:**

"گا" (ثور) وورووژێنەری کێڵاندن و گرنگترین هۆی کشتوکاڵ و ئاوەدانکردنەوەی زەوییە. بەڵام "نەهەنگ" (حوت) "ماسی" سەرچاوەی ژیان و گوزەرانی خەڵکانی نیشتەجێی کەنارە دەریاییەکانە، تەنانەت هی زۆرێك لە خەڵکانی تریش.

خۆ ئەگەر کەسێك بپرسێت: دەوڵەت لەسەر چی ڕاگیر دەبێت؟

وەڵامەکەی ئەوە دەبێت کە: لەسەر شمشێر و قەڵەم.

یان ئەگەر بپرسێت: شارستانێتی لەسەر چی ڕادەوەستێت؟

وەڵامی دەدرێتەوە: لەسەر زانین و پیشەسازی و بازرگانی.

یاخود گەر بپرسێت: مرۆڤایەتی بە چی بەردەوام دەبێت؟

وەڵامی دەدرێتەوە: بە زانست و کارکردن..

بە هەمان جۆر و لەسەر بناغەی ئەوانەی پێشوو - خوای گەورەش باشتر دەزانێ - سەرداری هەردوو گەردوون و مایەی شانازیی هەردوو جیهان ﷺ وەڵامی پرسیاری ئەو

---

پێشەنگیانن، پاشان فەیلەسووفەکانی ئەفلاتوونیی نوێ: (میلۆن و ئەفلۆتین) و، لەناو فەیلەسووفە موسڵمانەکانیشدا: (فارابی و ئیبن سینا) لە ڕیزی فەیلەسووفە ئیلاهییەکاندا پۆلێن دەکرێن. (وەرگێڕ)

کەسەی کە - بە بەڵگەی پێشەکیی دووهەم - هێشتا زەینی ئامادەی تێگەشتنی ڕاستییەکان نەبووەو، پرسیاری لە شتێکی بەدەر لە ئەرکی سەرشانی خۆی کرد و پرسیی: "زەوی لەسەر چییە؟" پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ وەڵامی ئەوی بە شتێك دایەوە کە پێویستە بیزانێت و، فەرمووی: "زەوی لەسەر گایە". واتە: ئاوەدانیی زەوی بۆ ڕەگەزی مرۆڤ و سەرچاوەی ژیان بۆ کەسانی گوندنشینی ئەوان لەسەر کشتوکاڵ بەندە، خۆ کشتوکاڵیش لە ئەستۆی "گا" نراوە..

هەروەك زۆرینەی گوزەرانی بەشەکەی تری مرۆڤ و زۆربەی سەرچاوەی بازرگانیی خەڵکانی شارنشین لەناو سکی ماسی و نەهەنگدایە، بە ڕادەیەك کە پەندی بەناوبانگی (کل الصيد في جوف الفرا)یان[1] تێدا دێتەدی.

جا ئەم وەڵامە - تەنانەت گەر بە گاڵتەشی بووبێت، چونکە پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ لە حەق بەولاوە هیچی تر نافەرموێ[2]- وەڵامێکی ڕاست و ناسك و نیانە.

خۆ ئەگەر ئەوەش بسەلمێ کە پرسیاری لە چۆنێتیی بەدیهاتنی زەوی کردبێت، ئەوا بەپێی ئەو دەستوورەی زانستی ڕەوانکاری کە پێی دەوترێ: (تلقّي السامع بغير المترَقّب) "وەڵامی بیسەر بە شتی چاوەڕوان نەکراو دراوەتەوە". چونکە بە شێوازی کەسی دانا (أسلوب الحكيم) وەڵامی شتی پێویستی درایەوە، نەك بەپێی ئیشتیهای نەخۆش و درۆینەی خاوەن پرسیار وەڵام بدرێتەوە..

ئایەتی پیرۆزی: ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ الأَهِلَّةِ قُلْ هِيَ مَوَاقِيتُ لِلنَّاسِ﴾ (البقرة:١٨٩) سەرەتایەکی قەشەنگ(براعة استهلال)ە بۆ ئەم ڕاستییە.

**ڕووی سێهەم:**

"گا" و "نەهەنگ" دوو بورجی مەزەندە کراون لە خولگەی ساڵانەی زەویدا. جا هەرچەند ئەو بورجانە وەهمی و گریمانکراون، بەڵام ئەو یاسا خواییەی کە لە جیهاندا

(١) پەندێکی عەرەبییە، لە کاتێکدا دەهێنرێتەوە کە یەك دانە شت - لەبەر مەزنییەکەی - جێی گەلێ شتی زۆر بگرێتەوە. (وەرگێڕ)

(٢) لە کتێبەکانی فەرموودەدا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إني لأمزحُ ولا أقولُ إلا حقاً). رواه الطبراني في الصغير والأوسط، وإسناده حسن. بڕوانە: (مجمع الزائد، للهيثمي: ٨٩/٨، ١٧/٩ چاپی ١٤٠٧ك، هەروەها: مسند الفردوس، للديلمي: ٦٥/١، چاپی: دار الكتب العلمية، بيروت، ١٩٨٦م. (وەرگێڕ)

دەست بەکارە و تەنە ئاسمانییەکان ڕێکدەخات و پەیوەستیان دەکات بە یەکەوە و، وەك زاراوەش ناوی "کێشی گشتی" (الجاذبية العامة)ی لێ نراوە، ئەو یاسایە لەو بورجانەدا جێگیر بووە. لەبەر ئەوە، دەستەواژەی گەردووناسیی: "زەوی لەسەر بورجەکانە" دروستە.

ئەم ڕووەش بەپێی بۆچوونی زانستی گەردووناسیی نوێیە، چونکە گەردووناسیی کۆن گریمانی بورجەکانی لە ئاسماندا دەکرد، کەچی ئەمەی نوێ لە خولگەی زەویدا گریمانی دەکات. بۆیە ئەم لێکدانەوەیە لە لای گەردووناسیی نوێ گرنگی بەدەست دەهێنێت!!

پاشان ئەوەش ڕیوایەت کراوە کە پرسیارەکە دووبارە بووەتەوە، ئەویش جارێ لە وەڵامدا فەرموویەتی: "علی الحوت" (واتە لەسەر نەهەنگە).. جارێ تر و دوای مانگێك لە وەڵامی هەمان پرسیاردا فەرموویەتی: "علی الثور" (واتە لەسەر گایە)!

واتە تاڵە دەزووەکانی ئەو یاسا ناوبراوە و، تیشکە پەرش و بڵاوەکانی بە هەموو لایەکی بۆشایی فراوانی بێ سنووردا، ئەو کاتە لە بورجی "نەهەنگ"دا جەم بووە، بۆیە گۆی زەوی لە بورجی سەتڵەوە دەرچووە و دەستی بەو یاسایەوە گرتووە کە لە بورجی "نەهەنگ"ەوە شۆڕ بووەتەوە و، بە وێنەی بەرێکی پێگەیشتوو بە لقێکی درەختی بەدیهاتوواندا هەڵواسراوە..

یان زەوی بە وێنەی باڵندە لەسەر بورجی "گا" نیشتووەتەوە و هێلانەی لەسەر کردووە!

دوای ئەوەی کە لەمە تێگەیشتیت، ئنجا ویژدان بەکاربهێنە و ورد بەرەوە:

ئایا بەپێی ناوەرۆکی "پێشەکیی پێنجەم" ئەم بابەتە سەیر و بەناوبانگەی نێوان شوێنکەوتووانی ئەندێشە، کە شەیدای هۆنینەوەی شتانی نامۆن، چۆن دەکرێ لێکبدرێتەوە بە بێ ئەوەی کاری بێهوودە و بەربادی بدرێتە پاڵ دانستی ئەزەلی و، بە بێ قایل بوونی ئیسراف لە سنعەتی پەروەردگاردا و، بە بێ تێکدانی ئەو ڕێسا ناوازەیەش کە بەڵگەی بەدیهێنەری شکۆمەندە؟!

ئای "نەفامی"! دەك خوا لەناوت بەرێت!

## مەسەلەی سێهەم

### چیای قاف

بزانە کە:

زانینی "بوون"ی هەر شتێك جیاوازە لە زانینی "جۆر" و "ماهییەت"ەکەی[1].

دەبێ ئەم دوو خاڵە لێك جیا بکرێنەوە. چونکە زۆر شت هەیە کە لە بناغەدا بێ گومان بووە، کەچی وەهم و گومان هێندە دەستکاریی تێدا کردووە کە لە شتێکی "گونجاو"ەوە گۆڕیویەتی بە "نەگونجاو". سەبارەت بەمە ڕاوێژ بە "پێشەکیی حەوتەم" بکە، بە زمانێکی پاراو وەڵامت دەداتەوە کە: بەڵێ، زۆر دەقی بێگومان (قطعي المتن)یش هەیە کە گومانەکان لەسەر دەلالەتەکەی کەڵەکە بوون! تەنانەت فام و تێگەیشتنەکان سەرسامن لە وەڵامی پرسیاری: (مەبەستی ئەم وتەیە چییە)؟ صەدەفی پێشەکیی یازدەهەم بشکێنە ئەم گەوهەرەی تێدا دەبینیت.

**ئاگادارکردنەوەیەك:**

مادەم ئەمە وایە.. ئەوا لە "دەقی یەقین و بێ گومان"دا جگە لە: ﴿ق والْقُرْآنِ الْمَجِيدِ﴾ (ق:١) هیچ شتێك نییە ئاماژە بۆ (قاف) بکات. لەکاتێکدا کە دەکرێ (قاف)یش وەکو (صاد) وابێت؛ لە خۆرهەڵاتی دنیادا نەبێت، بەڵکو لە خۆرئاوای دەمدا بێت! ئەو کاتەش بەم گریمانە بەڵگە لەسەر یەقینەکە لەدەست دەچێت.

---

(١) ماهییەت: زاراوەیەکی فەلسەفە و زانستی "کەلام"ە، لە پرسیاری: (ما هو؟) وەرگیراوە، وەڵامی ئەم پرسیارەش پێی دەوترێت "ماهییەت". کە دەبێ وەڵامێك بێت تەسەووری ئەو شتەی پرسیاری لەبارەوە کراوە، هەروەها زانینی زات و گەوهەر و سروشتی، بەدەستەوە بدات. زانایانی "کەلام" پێیان وایە زانینی "ماهییەت"ی هەر شتێك جیایە لە سیفەتی "بوون"ی ئەو شتە. بۆ نموونە: خوای گەورە ماهییەتی شتەکان دەزانێت پێش ئەوەی بەدییان بهێنێت، وەك ئەوەی کە دارتاش پێش دروستکردنی کورسی ماهییەتەکەی دەزانێت. بۆ زانیاریی زیاتر لەسەر "ماهییەت" بڕوانە کتێبی: (شرح المقاصد: ١/٢٢٣-٢٤٨). بەڵام ئێمە ناوەرۆکی ئەم پەراوێزەمان لە داوێنی ل:٢٢٣ وەرگرت، کە پوختەیەکە لێکۆڵەری کتێبی ناوبراو لە: (الموسوعة الفلسفية العربية ص: ٧٢٣-٧٢٤)ەوە هێناویەتی. (وەرگێڕ)

بەڵگەیەکی تر لەسەر ئەوەی کە "بێگومانیی بەڵگە" شتێکی تری جگە لەمەیە، وتەکەی "قەرافی"یە[١]، کە یەکێکە لە موجتەهیدانی شەرع، فەرموویەتی: "ئەسڵی نی‌یە"!

ئنجا سەبارەت بە گێڕانەوەی چۆنێتی‌یە بەناوبانگەکەشی بۆ "ئیبن عەبباس" سەیری ئاوێنەی "پێشەکیی چوارەم" بکە، تاکو هۆی دانە پاڵی بۆلای ئەو ببینیت. دەبێ بیشزانرێت کە هەرچی "ئیبن عەبباس" وتوویەتی هەروەك مەرج نی‌یە فەرموودە بێت، مەرجیش نی‌یە بۆ خۆی هەموو ئەو شتانەی پێ قبووڵ بوویێت کە هێناونی، چونکە "ئیبن عەبباس" لە ڕۆژگارانی لاویدا و لە ڕێی حیکایەتەکانەوە کەمێ ئاوڕی بەلای "ئیسرائیلیات"دا داوەتەوە، بە مەبەستی دەرخستنی هەندێ ڕاستی[٢].

ئەگەر دەڵێیت: زانا سۆفی‌یەکان وێنەکێشانێکی زۆریان سەبارەت بە (قاف) هەیە؟

لە وەڵامدا دەڵێم: جیهانی بەناوبانگی "میسال" گۆڕەپانی هاتوچۆی ئەوانە[٣]..

---

(١) ناوی (شەهابەدین ئەحمەدی کوڕی ئیدریسی قەرافی)یە و لە ساڵی (٦٨٥ك/١٢٨٥ز) کۆچی دوایی کردووە. لە میسر لەدایك بووە هەر لەوێش ژیاوە و وەفاتی کردووە. زانایەکی مەزهەبی مالیکی‌یە. گەلێ دانراوی لە ئوسووڵ و لە فیقهدا نووسیوە، لەوانە: (أنوار البروق في أنواء الفروق) لە چوار بەرگدا، (الذخيرة) شەش بەرگە لە فیقهی مەزهەبی مالیکیدا. بڕوانە: (الأعلام: ١/٩٤-٩٥). (وەرگێڕ - لە چاپە عەرەبی‌یەکەوە هێناویەتی.)

(٢) "إبن كثير" لە تەفسیرەکەیدا دەفەرموێ: (هەندێ لە پێشینان وتوویانە "قاف" چیایەکە دەورانده‌وری زەویی داوە. پێدەچێ ئەمە لە ئەفسانەکانی نەوەی ئیسرائیل بێت هەندێ کەس لەوانی وەرگرتبێت. لە ڕاستیدا شەرع تەنها لەو شتانەدا ڕێی داوە ڕیوایەت لەوان بکرێت کە ژیریی مرۆڤ پەسەندی بکات، دەنا گەر پەسەندی نەکات و بە ڕەوای نەزانێت هەرگیز لەو جۆرە نی‌یە، خوای گەورەش خۆی باشتر دەزانێت). بە پوختی لە "تفسیر إبن كثير"ەوە ٤/٢٢١، چاپی (دار إحياء التراث العربي، بيروت، ١٩٦٩م). (وەرگێڕ)

(٣) لەسەر "جیهانی میسال" شتی زۆر وتراوە. زانای لێکۆڵەر "پێشەوا سەعدی تەفتازانی" پوختیان دەکاتەوە و دەڵێ: (ئەوانەی بە بوونی "جیهانی میسال" قایلن بەڵگەیان ئەوەیە کە ئەو وێنە جوزئییانەی لەناو ئاوێنە و شتانی هاوشێوەیدا دەبینرێن نە عەدەمی تەواوەتی‌یە و نە لە جیهانی ماددیاتیشە). تەفتازانی تا ئێرەی بەڵگەکەیان پەسەند دەکات و دەڵێ: (ئەمە شتێکی ئاشکرایە). دوای ئەوە، پاشماوەی بەڵگەکانی ئەوانی پشتگوێ خستووە و، دەڵێ: (لەبەر ئەوەی دەعواکە بلندە و شوبهەکەشیان لاوازە، ئەوا لێکۆڵەران، چ لە دانایان و چ لە زانایانی کەلام، ئاوڕیان لێ نەداوەتەوە). بڕوانە: (شرح المقاصد: ٢/٥٠٤).
هەرچی لە پەیامەکانی نووردا لە بارەی "جیهانی میسال" باس کراوە یان ئاماژەی پێ دراوە، لەو بەشەی یەکەمە کە زانایان سەلماندوویانە و ئینکاریی لێ ناکرێت، وەك: خەون و، دەرکەوتنی وێنەکان لەناو ئاوێنەکاندا. بۆ نموونە لە پەیامەکاندا ئەوە هاتووە کە: "نوستن" پردێکە لە نێوان جیهانی بێداری و جیهانی

چونكە هەروەك ئێمە پۆشاكەكانمان لەبەر دادەماڵین، ئەوانیش لە جەستە دەردەچن و بە گەشت و گەڕانی ڕۆحانی دەچنە سەیری ئەو پیشانگایەی كە شتانی نامۆ و سەرسووڕهێنی تێدا جەم بووە.

جا (قاف) وەك پێناسەی دەكەن، لە جیهانی ئەواندا بە وێنەی شتانی ناو ئاوێنە دەبینرێت. چونكە هەروەك ئاسمانەكان و ئەستێرەكان لە ئاوێنەیەكی بچووكدا وێنەیان دەردەكەوێت، بچووكترین شتی وەك "گەردیلە"یەكی جیهانی بینراویش، بە كاریگەریی بەرجەستە بوونی واتاكان، لە جیهانی میسالدا بە وێنەی درەختێكی گەورە دەبینرێت.

بڕیارەكانی ئەم دوو جیهانە هەرگیز تێكەڵ بە یەكتر نابن. كەسێ كە شارەزای كاكڵە و ناوەرۆكی قسەی "محێدینی عەرەبی"[(1)] بێت ئەمە پشت ڕاست دەكاتەوە.

سەبارەت بەوەش كە لە نێوان عەوام و هاوشێوەی ئەواندا بەناوبانگە كە گوایا (قاف) چەند دانە چیایەكە دەورانـدەوری زەوییان داوە، ماوەی نێوان هەموو دوو دانەیەكیان پێنج سەد ساڵ ڕێیە و، لوتكەكەی بەر ئاسمان دەكەوێت.. هەتا دوا ئەندێشەكانی تریان، سوود لە "پێشەكیی سێهەم" وەربگرە بۆ هەڵسەنگاندن و ڕاستكردنەوەی ئەم ئەندێشانە، پاشان بڕۆرە ناو ئەم تاریكستانە، بەڵكو ئاوی سازگاری ڕەوانبێژییان بەدەست بهێنیت.

---

میسالدا. (مەسنەویی عەرەبیی نووری: ٣٧٤)، هەروەها: "خەون بینین" سێبەری جیهانی میسالە و جیهانی میسالیس سێبەری جیهانی بەرزەخە. (بریسكەكان: ٧٩٠).

جگە لەمانە، مامۆستا نوورسی خۆیشی یەكێكە لە زانایانی "ئەهلی تەحقیق" و، چاولێكەری هیچ كەسێك نییە، بەڵكو لێكۆڵینەوەی تایبەتیی خۆی هەیە لەسەر ئەو شتانەی لەبارەیانەوە دەدوێت، كە یەكێك لەوانە "جیهانی میسال"ە. بۆیە لە شوێنە جیاجیاكانی پەیامەكانیدا، بە پێی پێویست، ئەنجامی لێكۆڵینەوەی خۆی لەبارەیەوە دەربڕیوە. (وەرگێڕ)

(١) ناوی ئەبووبەكر محەممەدی كوڕی عەلیی كوڕی محەممەدی كوڕی عەرەبیی طائیی ئەندەلوسییە و بە "محێدینی كوڕی عەرەبی" بەناوبانگە و لە نێوان ساڵەكانی: (٥٦٠ – ٦٣٨ ك / ١١٦٥ – ١٢٤٠ ز)دا ژیاوە و نازناوی "الشیخ الأكبر"ی لێ نراوە. یەكێكە لە پێشەوایانی زانستەكانی سەردەمی خۆی. لە شاری "مەرسییە"ی ئەندەلوس لە دایك بووە و پاشان ڕۆشتووە بۆ "ئەشبیلییە" و، گەشتێكی بە وڵاتانی شام و ڕۆم و میسر و عێراق و حیجازدا كردووە و، خەڵكی میسر لە دژی ئەو "شطحات"ەی لە زاری دەرچووبوون لێی ڕاپەڕیبوون و تەنانەت هەندێكیشیان هەوڵی كوشتنیان دابوو، بەڵام خرایە بەندیخانەوە و پاشان "عەلیی كوڕی فەتحی بوجائی" بۆی تێكۆشا و لە بەندیخانە ڕزگاری كرد. دوای ئەوە لە "دیمەشق"دا گیرسایەوە و هەر لەوێشدا كۆچی دوایی كرد. بەناوبانگترینی بەرهەمەكانی بریتین لە: "الفتوحات المكیة" و "فصوص الحكم" لە تەصەووف و دەروونناسیدا. بڕوانە: الأعلام ٦/٢٨١ فوات الوفیات ٢/٢٤١ میزان الإعتـــدال ٣/١٠٨ جامع كرامات الأولیاء ١/١١٨ شذرات الذهب ٥/١٩٠. (وەرگێڕ)

ئەگەر دەتەوێ "باوەڕ"ی من بزانیت سەبارەت بەم مەسەلەیە، ئەوا بزانە من دڵنیـام لـە بوونی (قاف)[1]. بەڵام چۆنێتی‌یەکەی دەگێڕمەوە بۆ سەلماندنی فەرموودەیەکی صەحیح و موتەواتیر.

جا ئەگەر بسەلمێ کە فەرموودەیەکی وا هەیە چۆنێتی‌یەکەی ڕوون بکاتەوە، ئەوا باوەڕی پێ دەکەم بەو جۆرەی کە پێغەمبەرﷺ مەبەستی بووە، کە دیارە مەبەستی ئەویش حەق و ڕاست و دروستە. نەك بەو شێوەیەی کە لـە ئەندێشـەی خەڵکیدایە، چونکە ڕێ دەکەوێت "تێگەیشتن" لە شتێك جیاواز دەبێت لەوەی کە "مەبەست"ە تیایدا.

سەبارەت بە "تێگەیشتن"ی ئێمەش لەم مەسەلەیە، وا بەم جۆرە دەیخەینە بەردەستت:

**یەکەم:**

چیـای "قـاف" لـە زنجیرەی "هیمالایـا"یـە کـە مەزنترین چیاکـانی "چـامولار"ە، کـە ئەویش زنجیرەیەکە دەوراندەوری زۆربەی خۆرهەڵاتی داوە و، لەسەردەمەکانی پێشوودا بەربەستێك بوون لە نێوان دەشتەکی‌یەکان و خاوەن شارستانێتی‌یەکاندا. وتراویشـە کـە زۆربەی چیاکـانی جیـهان لـە دەمـاری ئـەم زنجیرەیـەوە لـق و پـەلیان هاویشـتووە و بـڵاو بوونەتەوە. هەر لەم بناغەیەشەوە بیرۆکەی "دەورەدانی قاف بە دنیا" سەری هەڵداوە.

**دووهەم:**

جیهانی میسال ناوەند(بەرزەخ)ێکە لە نێوان هەردوو جیهانی "بینراو" و "پەنهان"دا؛ بە "شێوە" لە یەکـەمیان و بـە "نـاوەرۆك"یـش لـە دووهـەمیان دەچێـت. ئـەم چەمکـە، ئـەو مەتەڵ و گرێ کوێرەیە دەکاتەوە.

هەرکەسێ دەیەوێ کەمێك بەسەر ئەم جیهانەدا - جیهانی میسال - بڕوانێت، دەبێ لە پەنجەرەی "کەشفی ڕاست" یاخود لـە دەلاقـەی "خـەونی ڕاسـت"ەوە بۆی بڕوانێـت، یان بە چاویلکەی ماددە ڕوون و بریسکەدارەکان، لانی کـەم لەسـەر شاشـەی پشتەوەی "ئەندێشـە" سـەیری بکـات. چونکـە بەڵگـەی زۆر هەیـە لەسـەر بوونـی ئـەم جیهانـە (میسال) و لەسەر بەرجەستەبوونی واتاکان تیایدا.

لەسەر ئـەم بناغەیـە، دەگونجێ ئەو "قـاف"ەی کـە لـەم گـۆی زەوی‌یـەی خۆماندایـە "تۆو"ی "قاف"ێکی پڕ لە شتانی سەرسووڕهێنەر بێت لە جیهانی میسالدا.

---

(١) لەبەر دەقی: ﴿ق والقُرآن المجید﴾ بەو شێوەیەی کە خوای گەورە خۆی مەبەستیەتی. (وەرگێڕ)

سێهەم:

موڵكی خوای گەورە فراوانە و، تەنها بە گۆی هەژاری زەوییەوە بەند نییە. هەروەك ئەم بۆشاییەی كە خوای گەورە دایناوە گەلێ فراوانترە و، دنیاكەشی لەوە مەزنترە كە جێی "قاف"ی خاوەن شتی سەیر و سەمەرەی تێدا نەبێتەوە. هەروەك ئەوەش بەدەر لە "ئیمكانی عەقلی" نییە كە سەری ئەو چیایە لە شانی ئاسمان بدات كە "شەپۆلێكی ئارام بوو"ە[1]، هەرچەندەش پێنج سەد ساڵ رێ - بە رۆژەكانی خوای گەورە - لە گۆی زەویمان دوور بێت، چونكە دەگونجێ "قاف" بە وێنەی ئاسمان روون و نەبینراو بێت.

چوارەم:

بۆچی نابێ "قاف" زنجیرەیەكی مەزن بێت كە لە بازنەی ئاسۆدا دەربكەوێت، وەك ئەوەی كە ناوی "ئاسۆ" دەبێتە سەرچاوەی "قاف"؟ چونكە مرۆڤ لە هەر لایەكەوە سەیر بكات بازنەیەكی لە چەند زنجیرە چیایەكی وەك بازنە هاوچەقەكان لێ دەردەكەوێ.. هەروەها پلە بە پلە و یەك لە دوای یەكی روانینەكە دەمێنێتەوە و جێگیر دەبێت، پاشان جڵەوی خۆی دەداتە دەست ئەندێشە، ئیتر "ئەندێشە" بازنەیەك لە زنجیرە چیایەكی دەورەدەر بە زەوی بەدیدەكات كە بەر كەنارەكانی ئاسمان دەكەوێت، ئەو چیایانەش لەو ئەندێشەیەدا دەبینرێن كە پەیوەستی یەكترین، بە بەڵگەی خڕیی گۆی زەوی، تەنانەت گەر دووریی نێوان ئاسۆ و ئاسمان پێنج سەد ساڵیش بێت.

---

(١) (السماء موج مكفوف) جزء من حديث أخرجه الإمام أحمد في مسنده (٢/٣٧٠) والترمذي برقم (٣٢٩٨) وفي تحفة الأحوذي برقم (٣٣٥٢) وقال: هذا حديث غريب من هذا الوجه. عزاه صاحب التحفة لأحمد وابن أبي حاتم والبزار، وفي مجمع الزوائد (٨/١٣٢) جزء من حديث رواه الطبراني في الأوسط، وفيه أبو جعفر الرازي، وثقه أبو حاتم وغيره وضعّفه النسائي وغيره، وبقية رجاله ثقات. وانظر فيه (٧/١٢١) وتفسير ابن كثير سورة الحديد. (وەرگێڕ، لە چاپە عەرەبییەكەوە هێناویەتی)

## مەسەلەی چوارەم

## بەربەستی زولقەرنەین

وەك زانیت:

زانینی "بوون"ی هەر شتێك جیاوازە لە زانینی "ماهییەت" و "چۆنێتی"یەکەی.

هەروەها:

تەنها یەك کێشەگەلێ بڕیار لەخۆ دەگرێت، هەندێکیان "زەرووری"ن و هەندێکی تریشیان "نەزەری"ن؛ ڕای جیاجیا و جۆراوجۆر هەڵدەگرن.

هەروەها:

ئەگەر کەسێکی چاولێکەری سەرسەخت و ملنەدەر سەبارەت بە شتێك کە لە کتێبێکدا بینیبووی پرسیاری ئاراستەی یەکێك کرد، تەنانەت ئەگەر ئەوەی لەناو کتێبەکەدا دیویەتی هەڵە و پرسیارەکەشی لە ڕووی تاقیکردنەوەوە بێت، ئەویش وەڵامی پرسیارەکانی ئەو کەسەی، تەنانەت هی زانراوە نائامادەکەشی دایەوە، ئەوا وەڵامەکە لە دوو ڕووەوە ڕاستە:

یان ڕاستەوخۆ وەڵامێکی ڕاستە و لەگەڵ واقیعدا یەکاویەك دەردەچێت.. یان لەبەر ئەوەی لەگەڵ خودی زانیارییەکانی کەسی ملنەدەردا یەك دەگرێتەوە.. یان بە تەئویل لەگەڵیدا یەکدەخرێت، ئەوا هەردوو ڕووەکە ڕاست دەردەچن.

کەواتە تەنها یەك وەڵام، واقیع لە خۆی ڕازی دەکات، چونکە وەڵامێکی ڕاست و ڕەوایە.. ئنجا قەناعەت بە کەسی خاوەن پرسیاریش دەبەخشێ، چونکە دەتوانێ بەسەر زانیارییەکەی خۆیدا جێبەجێی بکات، هەرچەندەش زانیارییەکەی ئەو جێی مەبەست نەبێت.. لە هەمان کاتدا پایە و مەقامەکەش زامدار ناکات، چونکە ئەو وەڵامە هەوێنی ئەو ژیانەی لەخۆ گرتووە کە "ئامانجەکانی گوفتار" سەرجەم هۆکار و هاندەرەکانی ژیانی خۆیانی لێ بەدەست دەهێنن.

وەڵامەکانی قورئانی پیرۆز بەم جۆرەن.

لەمەولا "زەرووری" و "نازەرووری" لە یەك جیا دەكەینەوە..

هەر لەو بڕیارە "زەرووری"یانەی كە لە وەڵامی قورئان وەردەگیرێت و، ملنەدان و ئینكاری هەڵناگرێت: "زولقەرنەین"ە[1]، كە ئەویش كەسێكی پشتگیراو بووە لە لایەن خوای گەورەوە و، هەر بە ڕێنمایی و كارسازیی خوای گەورەش بەربەستێكی لە نێوان دوو چیادا بنیات ناوە، بۆ دوورخستنەوەی خراپكاریی ستەمكاران و دەشتەكییەكان.. هەر لەو وەڵامانەی قورئان: "یەئجووج و مەئجووج"ە كە دوو هۆزی خراپكارن.. هەروەها بەربەستەكەش كاتێ خوای گەورە فەرمانی لەسەری بێت دەڕمێت... هتد.

بەپێی ئەم پێوەرە، هەموو ئەو بڕیارانەی كە بەڵگەی قورئانیان لەسەرە، لە بەشی "زەروورییات"ی قورئانن. واتە (قطعي الدلالة)ن و، ناكرێ ئینكاریی تەنانەت یەك دانە پیتیشیان بكرێت، بەڵام درێژەدان بە باسی ئەو بابەتانە و لێدوان لە چۆنێتی و ڕووەكانیان و سنووری ماهییەتیان "قطعي الدلالة" نین لە قورئاندا، بەڵكو سەلماوە كە قورئان بەڵگە نییە لەسەریان، بەپێی ئەو دەستوورەی كە دەڵێ: "بە هیچ كام لە سێ دەلالەتەكان شتی گشتی نابێتە بەڵگە لەسەر شتی تایبەت"[2]. هەروەها بەپێی ئەو دەستوورەی زانستی مەنتیقیش كە پێی وایە: "بۆ بڕیاردان لەسەر هەر شتێك تەسەووری ڕوویەك لە ڕووەكان لە نێوان مەوزووع و مەحموولدا سەرزویادە"[3].

بەڵام دەگونجێ قورئان ئەوە قبووڵ بكات. واتە: ئەو درێژەپێدانانە لە بڕیارە "نەزەرییەكان"ە، بەڵام گۆڕراون بۆ چەند بەڵگەیەكی تر. كەواتە جێی ئیجتیهادن و، بواری تەئویلیان تێدایە.

بەڵگەش لەسەر ئەوەی كە ئەو درێژەپێدانانە "نەزەری"ن، واتە "ظـــني الدلالـــة" ن، جیاوازیی ڕا و بۆچوونی زانایانە تیایاندا.

بەڵام بەداخەوە ئەندێشەی: "پێویستیی یەكاویەك دەرچوونی وەڵام لەگەڵ پڕاوپڕی پرسیاردا" - بێ بایەخدان بە ناتەواوی و كەموكووڕیی پرسیارەكە - هەردوو بڕیارە "زەرووری" و "نەزەری"یەكانی وەڵامەكەیان پێكەوە و لە هەمان سەرچاوە و شوێنی

---

(١) بڕیسكەی شازدەهەمی كتێبی (بڕیسكەكان) ئەم بابەتەی بە درێژی ڕوون كردووەتەوە. (وەرگێڕ)

(٢) لە لاپەڕە (٦٩)دا ڕوونكردنەوەی ئەو سێ دەلالەتە ڕابورد. (وەرگێڕ)

(٣) لە لاپەڕە (٦٩)دا ڕوونكردنەوەی هەردوو زاراوەی "مەوزووع و مەحموول" ڕابورد. (وەرگێڕ)

سەرهەڵدانی پرسیارەکە وەرگرت، ئیتر بوون بە "موفەسسیر" بگرە تەئویلدەری ئەو شتەی کە دەگونجێ وەڵامەکە بەڵگە بێت لەسەری.. بگرە دانە دانەی واتاکانیان بە "خود"ی واتا پیشان دا.. بەڵکو هاتن ئەو شتەی کە دەگونجێ بە هەندێ گریمان وەڵامی پرسیارەکە بیگرێتەوە، وەك واتا و تێگەیشتن لەو وەڵامە لێکیان دایەوە..

ئیتر ڕواڵەتبینەکان قبووڵیان کرد و، زانایانیش لەبەر گرنگی نەبوونی ئەو لێکدانەوەیە بەلایانەوە، بە چەشنی گرنگی نەبوونی حیکایەتەکان، بە بێ هیچ ڕەخنە ئاراستەکردنێك گوێیان لێ ڕاگرت، وەك ئەوەی کە لە "پێشەکیی سێهەم"دا ڕوون کراوەتەوە..

بەڵام گەر بەو درێژەپێدانە وەربگیرێت کە لە تەورات و ئینجیلی دەستکاری کراودا هاتووە، ئەوا دژی عیصمەتی پێغەمبەرانە - درووديان لەسەر بێت - بەپێی بیروباوەڕی ئەهلی سوننەت و جەماعەت. شایەت لەسەر ئەمە چیرۆکی حەزرەتی "لـــــووط" و "داوود"ە، درودی خوایان لەسەر بێت.

بەڵام مادەم لە "چۆنێتی"یەکەدا بواری ئیجتیهاد و تەئویل هەیە، ئەوا پشت بە یارمەتی و پشتیوانیی خوای گەورە دەبەستم و، دەڵێم:

باوەڕی یەقینی و دامەزراو بەوەی کە خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی ﷺ ویستوویانە، بە شێوەیەکی ڕەها واجبە، چونکە لە شتانی "زەرووری"ی ئایینە. بەڵام ئایا مەبەست پێی چییە؟ ئەوا بۆچوونەکان جیاوازن لە دەستنیشان کردنی ئەو مەبەستەدا.

بۆ نموونە: زولقەرنەین - ناڵێم ئەسکەندەر، چونکە ناوەکە ڕێ بەوە نادات - هەندێ کەس لە زانایانی تەفسیر لەبارەیەوە وتوویانە:

پادشایەکە.. هەروەها وتراوە: مەلائیکەتێکە.. هەروەها وتراوە: پێغەمبەرێکە.. هەروەها وتراوە: وەلییەکە هەتا دوا وتە و بۆچوونەکان[1].

بەڵام هەرکام لەوانە بێت، گومان لەوەدا نییە کەسێکی پشتگیراو بووە لە لایەن خوای گەورەوە و، ڕابەر و ڕێ پیشاندەری بنیاتنانی بەربەستی چین بووە.

سەبارەت بە بەربەستەکەش هەندێ وتوویانە:

---

(١) بۆ درێژەی زانینی ئەم باسە بڕوانە: بریسکەی شازدەهەمی کتێبی (بریسکەکان). (وەرگێڕ)

بەربەستی چینە.. هەروەها وتراوە: بەربەستێکی تری جگە لەوە گۆڕاوە بە چیایەك.. هەروەها وتراوە: بەربەستێکی پەنهانە نابینرێت، ڕووداوەکانی جیهان داپۆشیوە.. هەروەها وتراوە و.. وتراوە..

بەڵام هەرچۆن بێت، گومان لەوەدا نییە کە پڕکردنەوەیەکی گەورە و دیوارێکی مەزنە بۆ دوورخستنەوەی زیانی خراپکاران بنیات نراوە.

سەبارەت بە "یەئجووج و مەئجووج"یش وتراوە:

دوو هۆزن لە نەوەی "یافث".. هەروەها وتراوە: هەردوو هۆزی "مەغۆل و مانچۆڕ"ن.. هەروەها وتراوە: چەند نەتەوەیکی باکووری خۆرهەڵاتن.. هەروەها وتراوە: دەستەیەکن لە کۆمەڵێکی مەزنی ئادەمیزاد کە بەربادی و ئاشووب لە دنیا و لەناو شارستانێتیدا بڵاودەکەنەوە.. هەروەها وتراوە: چەند بەدیهاتوویەکی خوای گەورەن، ئادەمیزاد بن یان شتی تر، لەسەر زەوی بن یاخود لەناویدا، دەبنە هۆی تێکچوونی جیهان لە نزیکی بەرپابوونی قیامەتدا..

بەڵام لایەنی یەکگرتن لە هەموو ئەو بۆچوونانەدا و، ئەو شتەی گومانی تێدا نەبێت ئەوەیە کە:

دوو دەستە و کۆمەڵن لە بەدیهێنراوانی خوای گەورە، خەریکی هێرش و خراپکاری بوون و، هەڵیان کوتاوەتە سەر شارستانێتی، بە وێنەی ئەجەلێك بۆ لەناوبردنی.

کاولبوونی بەربەستەکەش لەبارەیەوە وتراوە:

لە کاتی قیامەتدا دەبێت.. هەروەها وتراوە: نزیك لە قیامەت.. هەروەها وتراوە: دەڕووخێت بە چەشنێ کە بە یەکێك لە نیشانەکانی قیامەت دادەنرێ، هەرچەند ڕووخانیشی دوور بێت لە بەرپابوونی قیامەت.. هەروەها وتراوە: بەربەستەکە ڕووخاوە، بەڵام وردوخاش نەبووە.. هەروەها وتراوە و.. وتراوە..

هەرچۆن بێت، ڕووخانی ئەو بەربەستە نیشانەیەکە لەسەر بەساڵاچوونی زەوی و پیربوونی مرۆڤ.

جا ئەگەر بەراورد لە نێوان هەموو ئەوانەدا بکەیت کە ئێستا باس کران، دەتوانیت ئەوەت بۆ ڕاست بێت کە ئەو بەربەستەی لە قورئاندا باس کراوە بەربەستی چین بێت کە چەند فەرسەخێك درێژە و، یەکێکە لە حەوت سەرسووڕهێنەرە بەناوبانگەکان و، بە ڕێنمایی کەسێکی پشتگیراو لە لایەن خوای گەورەوە بنیات نراوە، تاکو ڕێ لەو زیان و

خراپەیە بگیرێت کە دەشتەکی‌یەکان دەیان نایەوە بۆ خەڵکی خاوەن شارستانێتیی ئەو ڕۆژگارە.

بەڵێ، هۆزی "هۆن" کە ئەوروپایان دارماند و، "مەغۆل"یش کە ئاسیایان تێك و پێکدا، لەوانن.

پاشان داڕووخانی بەربەستەکە یەکێکە لە نیشانەکانی قیامەت، بە تایبەتی کە ڕووخانی جیایە لە وردوخاش بوونی. لە کاتێکدا کە پێغەمبەر ﷺ "خۆی" بە یەکێك لە نیشانەکانی قیامەت دابنێت و، بفەرموێ: (أنا والساعة كــــهاتين) ئیتر چۆن بە دوور دەزانرێت کە داڕووخانی بەربەستەکە یەکێك بێت لە نیشانەکانی قیامەت لە دوای سەدە باشەکان (خير القرون)؟

پاشان ڕووخانی ئەو بەربەستە سەبارەت بە تەمەنی زەوی وەکو گرژبوون و هاتنەوەیەکی ڕووی زەوی وایە لەبەر پیری، بگرە وەکو کاتی زەردەی خۆرئاوایە سەبارەت بە تەواوی ماوەی ڕۆژ، تەنانەت گەر بە هەزاران ساڵیش قیامەت دوور بێت.

هەروەها ئەو بەربادی و پشێوی‌یەی کە یەئجووج و مەئجووج دەینێنەوە، وەکو "تا"یەك وایە "گرۆی مرۆڤ" لەبەر پیری دووچاری بووبێت.

دوای ئەمە، لە سەرەتای "پێشەکیی دوازدەهەم"دا دەرگایەکت بۆ تەئویلێکی تر لێ دەکرێتەوە، کە بریتی‌یە لەوەی: قورئان چیرۆکەکانی بۆ ئەوە دەگێڕێتەوە کە پەندیان لێ وەربگیرێت و، ئەو خاڵانەیان تێدا هەڵدەبژێرێت کە وەکو هەوێنی ژیان وان و لەگەڵ یەکێك لە ئامانجەکانی قورئاندا دەگونجێن، ئیتر پەیوەستیان دەکات بەو ئامانجەوە..

جا هەردوو کیان - چیرۆکەکە و ئەو پەندەش کە لێی وەردەگیرێت - لە "زەین" و لە "شێواز"دا دەست لە ملی یەکتر دەئاڵێنن، هەرچەندەش لە "دەرەوە" پێکەوە نەیەنەدی و ئاگری هەردوو کیان یاخود ڕووناکیی هەردوو کیان پێکەوە دەرنەکەون.

جا مادەم "چیرۆك" بۆ "پەند لێ وەرگرتن"ە، ئەوا پێویستت بە درێژەپێدانی نی‌یە و، ئەوەشت نەخراوەتە ئەستۆ کە بزانیت چۆن بووە.. بەشی خۆتی لێ وەربگرە بڕۆ بە ڕێتەوە..

لە "پێشەکیی دەهەم"ەوە بڕوانە، دەبینیت کە "مەجاز" دەرگا دەخاتە سەرپشت لە "مەجاز". بۆ نموونە: ﴿تَغْرُبُ فِي عَيْنٍ حَمِئَةٍ﴾ (الكهف:٨٦) ڕواڵەتبینەکان دەلاوێنێتەوە و بەدەریان دەنێت.

**بزانە کە:**

کلیلی بەڵگەی خوای گەورە لەسەر بەندەکانی، کە لە شێوازەکانی عەرەبدا دەردەکەوێت، بریتی‌یە لەو "ڕەوانبێژی"یەی کە ئەسڵی "ئیعجاز"ە و لەسەر بناغەی "ئیستیعارە" و "مەجاز" دامەزراوە، نەك ئەو مووروووانەی کە - بە حەدسێکی درۆینە - لەناو شتە بەناوبانگەکاندا هەڵدەگیرێنەوە و خۆیان لەناو صەدەفی ئایەتەکاندا دەشارنەوە، بە بێ ڕەزامەندیی ئایەتەکان. بۆنی کۆتایی "پێشەکیی دەهەم" بکە چونکە میسکە و، تامیشی بچێژە چونکە هەنگوینە.

دروستیشە بەربەستەکە، کە خۆی لە خۆیدا چۆنێتی‌یەکەی نەزانراوە، لە شوێنێکی تری نەزانراودا بێت و لە ئێمە شاردرابێتەوە، بە وێنەی نیشانەکانی تری قیامەت و، بەهۆی هەندێ لە ئاڵوگۆڕەکانی، ئەو بەربەستە هەروا بە نەزانراوی بمێنێتەوە هەتا قیامەت و، لە قیامەتدا بڕووخێت.

**ئاماژەیەك:**

ئاشکرایە کە "خانوو" زیاتر لە "نیشتەجێ بووانی" دەمێنێتەوە و، تەمەنی "قەڵا"ش لە هی ئەوانە درێژترە کە "خۆیانی تێدا دەپارێزن". کەواتە "نیشتەجێ بوون" و "خۆپاراستن" هۆی بوونی بیناکەیە، نەك هۆی بەردەوامی و مانەوەی. تەنانەت ئەگەر هۆی ئەوەش بن، ئەوا داخوازی بەردەوام ئاوەدانی و خاڵی نەبوونیان نین. چونکە بەردەوامیی هەر شتێك، بەردەوامبوونی ئەو مەبەستەی کە لێیەوە پەیدا دەبێت و چاوەڕوان دەکرێت، ناکاتە "شتێکی پێویست". ئەوەتا زۆر تەلار و بینا بە مەبەستی "نیشتەجێ بوون" و "خۆ پاراستن" بنیات دەنرێن کەچی چۆڵ و بەتاڵن.

بەهۆی تێنەگەیشتن لەم نهێنی‌یە، دەرگا لەسەر وەهم و ئەندێشەکان کرایەوە.

**ورياكردنەوەيەك:**

مەبەست لەم درێژەپێدانە، کردنەوەی دەرگایە کە بۆ جیاکردنەوەی:

تەفسیر، لە تەئویل.. "قَطعي"، لە "ظَنّي".. بوون، لە چۆنیتی.. بڕیار، لە درێژەپێدانە لاوەکی‌یەکان.. واتا، لە دانە دانەکانی ئەوانەی کە واتا دەیانگرێتەوە.. ڕوودانی شتێك، لە گریمانی ڕوودانی.

## مەسەلەی پێنجەم

ئەوەی کە سەبارەت بە "بوونی دۆزەخ لە ژێر زەوی"دا ناوبانگی دەرکردووە، ئیمەی ئەهلی سوننەت و جەماعەت شوێنەکەی بە دڵنیایی و بێگومانی دیاری ناکەین، بەڵام بوونی لە "لای ژێرەوە" شتێکی ئاشکرایە[1]!

جا لەسەر ئەم بناغەیە، پشت بە خوای گەورە دەبەستم و، دەڵێم:

یەکەم:

گۆی زەویمان بەرێکی درەختی ئەم جیهانە مەزنەیە کە هێندەی درەختی "تووبا" مەزنە و، سەرجەم ئەستێرەکانی ئەم جیهانەش بەری هەمان درەختن. ئەوەی لە خوار "بەر"ەکەوەیە هەموو پەل و لقەکانیەتی..

جا لەسەر ئەم بناغەیە، "دۆزەخ" لە ژێر زەوی و لە نێوان ئەو لقانەدایە، چونکە موڵکی خوای گەورە تابڵێی فراوانە و، درەختی بەدیهاتووانی ئەویش لق و پەلی بە هەموو لایەکدا هاویشتووە، دۆزەخیش لە هەر شوێنێك بێت جێیەکی لە نێوانیاندا هەیە و، ماوە(مسافة)ی لە ژێرەوە بوونیشی داخوازی دوور و درێژی و پەیوەست بوونی نیی‌یە بە زەوی‌یەوە.

بەپێی ڕوانینی "دانستی نوێ": ئاگر بەسەر زۆرینەی گەردووندا زاڵە. ئەمەش دەری دەخات ئەو ئاگرە دۆزەخە، کە هاوڕێی مرۆڤە بەرەو هەتاهەتایی و هەمیشەیی و، ڕۆژێك دێتە پێش کە پەردەی سەر ڕوخساری خۆی دەدڕێنێت و دەچێتە مەیدان و، دەڵێ: خۆتان ئامادە بکەن!

هەروەها دەمەوێ سەرنجتان بۆ لای ئەم خاڵەی خوارەوەش ڕابکێشم:

دووهەم:

ژێرەوە و خوارەوەی هەر "تۆپ"ێك بریتی‌یە لە مەڵبەندەکەی و ناوەوەی. بەم پێ‌یە زەوی ئێستا بە "تۆو"ی درەختی زەقوومی دۆزەخ ئاوسە و ڕۆژێك دێت کە دەبێت.

---

(١) نووسەر لە وەڵامی پرسیاری سێ‌هەمی مەکتووبی یەکەم لە کتێبی (مەکتووبات)دا ئەم باسەی ڕوون کردووەتەوە. (وەرگێڕ)

بگرە "زەوی"ی باڵندەی ناو ئەم بۆشاییە، ڕۆژێك دێت كە هێلكەیەكی لەو جۆرە دادەنێت، تەنانەت گەر هەموو دۆزەخیش بە تەواوی لەو هێلكەیەدا نەبێت، لانی كەم "سەر" یاخود "ئەندام"ێكی دۆزەخی تێدایە، بە جۆرێ كە ڕۆژی قیامەت لەگەڵ پلە نزمەكانی دۆزەخ و ئەندامەكانی تریدا یەكدەگرێتەوە و، بۆ تاوانباران و سەرپێچیكاران دۆزەخێكی ترسناك و سەرسووڕهێنەر بەرجەستە دەكات.

دەسا ئەی مرۆڤ!

"بیركاری" و "ئەندازە" دەتوانن تۆ بگەیەننە لای شوێنی دۆزەخ، بێ ئەوەی كە خۆیشت بڕۆیت بۆ ئەوێ!

چونكە:

بە ڕۆچوونی ماوەی هەموو سی وسێ مەترێك بە ناخی زەویدا نزیكەی یەك پلەی گەرمی زیاد دەكات. بەو واتایەی كە پلەی گەرمیی چەقی زەوی لە دوو سەد هەزار پلەوە نزیكە. جا ڕێژەی ئەم ئاگرەی چەقی زەوی لەچاو پلەی ئاگری ئێمەدا – كە هەزار پلەیە – دووسەد هێندەیە..

ئەمەش هەمان فەرموودەی بەناوبانگ دەسەلمێنێت كە واتاكەی ئەوە دەگەیەنێت:

ئاگری دۆزەخ دووسەد هێندەی ئاگری ئێمە تیژتر(گەرمتر)ە[1].

پاشان بەشێكی دۆزەخ "زەمهەریر"ە، كە ئەویش بە ساردییەكەی شتان دەسووتێنێت، چونكە لە زانستی سروشتیدا سەلماوە كە پلەی گەرمی دەگاتە ڕادەیەك ئاو دەبەستێت و دەیكات بە سەهۆڵ و بە ساردییەكەی شت دەسووتێنێت، لەبەر ئەوەی گەرمی هەڵدەمژێت. واتە ئەو "ئاگر"ەی كە هەموو پلەكان دەگرێتەوە، بەشێكی "زەمهەریر"ە.

---

(١) عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: قال رسول الله ﷺ: اشتكت النار إلى ربها، فقالت: "يارب! أكل بعضي بعضاً، فجعل لها نفسين. نفسٌ في الشتاء ونفس في الصيف. فشدّة ما تجدون من البرد من زمهريرها، وشدة ما تجدون من الحر من سمومها". رواه البخاري – كتاب الإيمان. ابن ماجه: ٤٣١٩ والترمذي: ٢٥٩٢.

وعن أبي هريرة رضي الله عنه أن رسول الله ﷺ قال: "هذه النار جزء من مائة جزء من جهنم". رواه أحمد ١٦٤/٢٤ (الفتح الرباني) وأورده الهيثمي في المجمع ٣٨٧/١ وقال: رواه أحمد ورجاله رجال الصحيح. (وەرگێڕ – لە چاپە عەرەبییەكەوە هێناویەتی)

**وریاكردنەوەیەك:**

جیهانی هەتاهەتایی ئەودنیا بە پێوەرەكانی ئەم دنیا فانییە لێكنادرێتەوە و، فراوانیشیان وەكو یەك نییە. دەسا خۆت ئامادە بكە، چونكە لەمەولا و لە كۆتایی "وتاری سێهەم"دا شتێكت لە ئاخیرەت بۆ دەردەكەوێ.

**ئاماژەیەك:**

هەشت دەرگا و دوو پەنجەرە لە خانەی بەختەوەریی هەمیشەیی و بەهەشتی سایە فراوانەوە لە بەردەم ژیریدا دەكرێنەوە، ئەوەش بە:

شایەتیی رێكوپێكیی هەموو زانستەكان..

بە رێنمایی پشكنین و بەدواداگەڕانی تەواوی دانست..

بە هێمای گەوهەری مرۆڤایەتی..

بە ئاماژەی بێ كۆتایی حەز و مەیلەكانی مرۆڤ..

بە نیشانەی قیامەتی دووپات بووی "جۆرەكان" لە زۆربەیاندا، وەكو شەو و رۆژ..

بە بەڵگەی نەبوونی بێهوودەیی و هەرەمەكێتی..

بە ئاماژەی دانستی ئەزەلی..

بە رێنمایی حیكمەتی رەهای خوایی..

بە زمانی پاراوی پێغەمبەری راستگۆ ﷺ..

بە رێنمایی و هیدایەتی قورئانی خاوەن ئیعجازی بەیان.

## مەسەلەی شەشەم

تایبەتمەندیی جوداکەرەوەی قورئانی پیرۆز لــە هــەموو شــتێکی تــر: "ئیعجــاز"ە.. ئیعجازیش لـە لوتکەی "ڕەوانبێژی"یەوە پەیدا دەبێت.. ڕەوانبێژیش لەسەر چـەندین تایبەتمەندی دامەزراوە، نەخوازەڵا "ئیستیعارە" و "مــەجاز". جـا ئەگـەر کەسێك بـە چاویلکەی ئەم دوانە نەڕوانێت، تایبەتمەندیی "ڕەوانبێژی"ی دەست ناکەوێت.

قورئانی پیرۆز زۆر شتی لەوانە تێدایە کە پێیان دەوترێ: "التـنزلات الإلهیـه إلى عقـول البشر" واتە لەوانەی کە گوفتاری خوای گەورەیان تێـدا دێتـە ئاستی تێگەیشتنی ژیریـی مـرۆڤ و، کانیاوەکـانی زانسـت دەتەقێننـەوە بۆنـاو شێوازەکانی زمـانی عـەرەبی، تـاکو زەینەکان لەگەڵی ڕابێن، لەوانەی کە چاودێریی تێگەیشتنەکان دەکەن و، ڕێز لـە شتانی هەست پێکراو دەگرن و، شان بە شانی زەینەکان دەڕۆن.

مادەم وایە، ئەوا دەبێ تەفسیرنووسان مافی قورئان پشتگوێ نەخەن، بەوەی کـە بچـن "قورئان" بە شتێك لێکبدەنەوە "ڕەوانبێژی" شایەتیی لەسەر نەدات.

ئەو ڕاستی‌یە لە هەموو حەقیقەتێك ڕوونتر دەرکەوتووە کـە واتاکـانی قورئـانی پیرۆز "حەق"ن و، شێوازەکانی گەیاندنی واتاکانیشی بەرز و ڕەوانـن. جـا هـەر کەسێك شتە جوزئی‌یەکان نەباتەوە سـەر ئەو کانگایـە و نەیانگێڕێتـەوە بـۆ ئـەو کانیـاوە، لـەو کەسـانە دەبێت کە مافی قورئان پشتگوێ دەخەن.

وا نموونەیەکی سەرنج ڕاکێش لەسەر ئەمە دەهێنینەوە:

ئایەتی پیرۆزی: ﴿والْجبالَ أوتاداً﴾ (النبـأ: ٧) بـە "مەجــاز"ێکی نـاوازە – کـە خـوای گـەورە خـۆی دەزانێـت مەبەستی چی‌یـە – ئاماژەیـەك دەکـات، چونکـە دەگونجــێ ئـەو "مەجاز"ە هێمایەك بێت بۆ تەسەووریکی وەك ئەمە:

**یەکەم:**

"گۆی زەوی" کە وەکو کەشتی و ژێردەریاییەك وایە بەناو دەریـای بۆشایی فراوانـدا ڕۆچووبێت، هاوسەنگیی خۆی پاراستووە و، لــە دەمـی لێـك کـەوتنی لەگـەڵ هـەوادا و

لەودەوروبەرە هەواییەدا بە چەند پەتێکی هێندە گەورە و ئەستووری وەك ستوون و مێخ لەنگەری گرتووە. بەو واتایەی کە چیاکان لە حوکمی ستوونی ئەو کەشتی‌یەدان.

**دووهەم:**

لەرەلەرەکانی ئەنجامی گۆڕانکاریی ناخی زەوی بەهۆی چیاکانەوە هێور و ئارام دەبنەوە. چونکە کونیلە وردەکانی پێست چۆنن بۆ جەستە، چیاکانیش وەهان بۆ گۆی زەوی، خۆ هەرکات هەڵچوونێك لە ناوەوەی زەوی ڕووبدات ئەوا لە ڕێی کەلێن و دەربازگەی چیاکانیەوە هەناسە دەدات و، بەوەش هەڵچوونەکەی ئارام دەبێتەوە. واتە هۆکاری هێمنی و لەسەرخۆیی زەوی چیاکانیەتی.

**سێهەم:**

ستوونی ئاوەدانکردنەوەی زەوی بریتی‌یە لە "مرۆڤ".. ژیانی مرۆڤیش بەندە بە پارێزگاری کردنی سەرچاوەکانی ئەو ژیانە لە: "گڵ و ئاو و هەوا" هاودەم لەگەڵ دەستەبەرکردنی سوودوەرگرتن لێیان. خۆ هەر "چیاکان" ئەنجامدانی ئەو ئەرکە دەگرنە ئەستۆ، چونکە "عەمباراوی ئاو"ن و، "پاکژکاری هەوا"ن و، تین و تەوژمی هەریەك لە سەرما و گەرما کەم و تەنك دەکەنەوە و، دەبنە هۆی پاڵفتە کردنی هەوا و سەرچاوەی کەڵەکەبوونی گازە زیانبەخشەکانی ناوی، لە هەمان کاتدا بەزەیی بە خاك (وشکایی)شدا دێتەوە، چونکە لە قوڕ و لیتە و گەنین و زاڵبوونی دەریا دەیپارێزێت.

**چوارەم:**

ڕووی لێکچوون و پەیوەندی - لە لایەنی ڕەوانبێژی‌یەوە - ئەوەیە کە:

ئەگەر کەسێك بە سواری باڵۆنی "ئەندێشە" بەرەو ئاسمان بەرز ببێتەوە و لە زەوی دوور بکەوێتەوە، ئنجا لەو بەرزاییەوە سەیری زنجیرەی چیاکان بکات و، بە ئەندێشە "چینی خاك"ی بە دەواری دەشتەکی‌یەکان هاتە پێش چاو کە بەسەر ستوونەکاندا ڕاخرابوون، چیا دانە دانە و تەنیاکانیش بە وێنەی چادری جیا جیا و تەنیا هاتنە بەرچاوی ئەندێشەی کە هەر یەکەیان لەسەر یەك ستوون ڕاگیر بوویێت.. ئایا پێت وایە ئەندێشەی ئەو کەسە ڕەفتارێکی دژی سروشتی ئەندێشەکان نواندبێت؟

خۆ ئەگەر لە ئەندێشەی خۆتدا بەو جۆرە بینیت و، وێنەی ئەو زنجیرە چیایانەت - بە تێهەڵکێش بوونی چیا تەنیاکانیشەوە - وەك چەند خێوەتێکی دەشتەکی‌یەکان، کە

هەندێ جار ڕەشماڵی جیا جیا و تەنیاشیان لە نێوانیاندا بێت، خستە پێش چاوی کەسێکی دەشت نشین، ئەوا هەرگیز بەم کارەت لە شێوازە ئەندێشەییەکانی عەرەب لات نەداوە..

یان ئەگەر تەسەووری ئەوە بکەیت کە خۆت لەم جیهانە بنیات نراوە داماڵیوە، ئنجا بە چاویلکەی "دانست" بیرت لە گۆی زەوی کردەوە کە لانکی گرۆی ئادەمیزادە و لە ئاسمانیش کە بنمیچێکە لەو بەرزاییەوە ڕاگیر کراوە، پاشان بە ئەندێشە ئەو ئاسمانەت - کە بە بازنەی "ئاسۆکان" سنووردار بووە و لەو ئاسۆیانە دەخشێ - بە وێنەی دەوارێك بینی کە بەسەر زەویدا هەڵدرابێت و بە چەند مێخێك پەیوەست بووبێت، ئەوا لەم ئەندێشەیەدا هەرگیز تاوانبار نابیت.

دواتر لە کۆتایی "مەسەلەی هەشتەم"دا یەك دوو نموونە لەسەر ئەمە دێنە ڕێمان.

## مەسەلەی حەوتەم

ڕواڵەتبینان، بە نیازی شڵەژاندنی زەینەکان، دەچن دەست بە داوێنی هەریەك لە: ﴿دَحاها﴾ (النازعات: ٣٠) و ﴿سُطِحَتْ﴾ (الغاشية: ٢٠) و ﴿فَرَشْناها﴾ (الذاريات: ٤٨) و ﴿تَغْرُبُ فِي عَيْنٍ حَمِئَةٍ﴾ (الكهف:٨٦) و، ئایەتەکانی تری هاوشێوەیانەوە دەگرن کە لە قورئانی پیرۆزدا هاتوون.

ئێمەش پێویستمان بەوە نییە بەرگری بکەین، چونکە تەفسیرنووسە مەزنەکان بەپێی پێویست نهێنییەکانی ناخی ئەم ئایەتانەیان خستووەتە ڕوو، ئیتر پێویست بە ئێمە نەماوە و، وانەیەکی پەند وەرگرتنیان پێ وتووینەتەوە و، دێڕی بناغەیان نووسیوە و دارشتووە، تاکو ئێمە بە شوێن پێیاندا بڕۆین.

ولكن بكَوْا قبلي فهَيَّجُوا لِي البكا وهَيْهـاتَ ذو رَحِمٍ يَرِقُّ لبكائي[1]

ڕاگەیاندنی شتی زانراو، نەخوازەڵا کە "بینراو" بێت – وەك ئاشکرایە – کارێکی بێهوودەیە. واتە لە کاتی وادا دەبێ خاڵێکی نامۆ هەبێت کە لەو بێهوودەییە دەری بهێنێت..

بۆ نموونە، ئەگەر بوترێت:

سەیری "زەوی" بکەن کە چۆن بە تەختی بەدیمان هێناوە و کردوومانە بە لانکی ئێوە، هەرچەندەش بۆ خۆی شێوەی "گۆ"ی هەیە و.. لە زاڵبوونی دەریاکانیش ڕزگاری بووە..

---

(١) زۆر گەڕام بۆ سەرچاوەی ئەم بەیتە شیعرە بەم دەقەی سەرەوە، دەستم نەکەوت. بەڵام نزیك لە واتای نیوە دێڕی یەکەمی بەیتەکە، ئەم دوو دێڕەم بینی:

ولو قبل مبكـاها بكيتُ صبابة لكنتُ شفيت النفس قبل التنـدم

ولكن بكتْ قبلي فهيج لي البكـا بكـاها فكان الفضل للمتقدم

ئەمانەش بە چەند دەقێکی کەمێ جیاواز دراونەتە پاڵ یەزیدی کوڕی معاویە. (وەرگێڕ)

یان ئەگەر بوترایە:

بڕوانن کە "خۆر" هەرچەندەش ڕاوەستاوە، کەچی لە پێناوی ڕێکخستنی ژیان و گوزەرانی ئێوەدا لە هاتوچۆدایە..

یان وەك ئەوەی بوترایە:

بڕوانن کە چۆن "خۆر" لەناو کانیاوێکی قوڕ و لیتاودا ئاوا دەبێت، هەرچەندەش هەزاران ساڵ لێمانەوە دوورە..

ئەگەر بەو جۆرە بوترایە، ئەوا واتای ئایەتەکان لە "درکە"(کنایـــــة) دەردەچوون و دەبوونە "ڕاشکاوی"(صراحة).

بەڵێ، ئەم خاڵە نامۆیانە چەند سەرنجێکی ڕەوانبێژین.

## مەسەلەی هەشتەم

◆ یەکێك لەو شتانەی کە ڕواڵەتبینانی ئێوە گلاندووە، تەنانەت یەکەم هۆکاری ئەوەی کە تووشی نیگەرانی و دوودڵیی کردوون بریتی‌یە لە:

تێکەڵ بوونی گریمانەکان (ئیمکانات) لەگەڵ ڕووداوەکان (وقوعات)دا لە لایان[1].

بۆ نموونە دەڵێن:

مادەم ئەو شتە بەو جۆرەیە، کەواتە گریمانی بوونی هەیە بۆ توانستی خوای گەورە و، بەوەش زیاتر دەبێتە بەڵگە لەسەر مەزنیی ئەو بەلای ژیریمانەوە، کەواتە هەیە و ڕووی داوە!!

ئێمەش دەڵێین:

هەژارینە! ئەم بۆچوونەتان لە ڕاستی‌یەوە دوورە! ژیریی ئێوە لەکوێ دەتوانێ ببێت بە ئەندازیاری گەردوون؟ ئێوە بەم "ژیری‌یە جوزئی"یەتان دەستەوسانن لەوەی کە بتوانن دەوراندەوری "جوانیی کوللی" بدەن و لێی تێبگەن. خۆ ئەگەر "لووت"ێك ببێت لە ئالتوون کە هێندەی باڵێك درێژ بێت، لەوانەیە ئەو کەسە پێی جوان بێت کە تەنها سەیری خودی لووتەکە بکات!!

◆ پاشان ئەو شتەی کە ئەوانی دووچاری سەرسامی کردووە، ئەوەیە کە لەو گومانەدان "ئیمکانی زاتی"[2] دژی "یەقینی زانستی" بێت. ئیتر بە دوودڵی و گومانەکانیان لە ڕێچکەی "لا أدری"یەکان[3] نزیك دەبنەوە. تەنانەت هیچ شەرمێکیش

---

(١) "وقووعات" بریتی‌یە لە هاتنەدیی شتێك کە لەوەو پێش نەبووە. "گریمان"ی هەر شتێکیش بریتی‌یە لەوەی کە "بوون" و "نەبوون"ی یەکسان بێت، ئەگەر هۆکارێك نەبێت یەکێك لەو دوانەی بۆ هەڵبژێرێت. واتە گریمانی "بوونی شتێك" ئەوە ناگەیەنێت کە لە "ڕاستی"دا ببێت. بڕوانە: "التعریفات"ی جورجانی. (وەرگێڕ)

(٢) "ئیمکانی زاتی" ئەو شتەیە کە دژەکەی لە زاتی خۆیدا "واجب" نەبێت. بڕوانە: "التعریفات"ی جورجانی. (وەرگێڕ)

(٣) "لا أدری"یەکان دەستەیەکن لە "سۆفستائی"یەکان. دەڵێن: (نازانرێت ئایا شتەکان لە ڕاستیدا هەن یان نین، بەڵکو جێی گومانن. ئێمەش دوودڵین لەوەدا کە ئەزانین یان نازانین)! (وەرگێڕ)

ناکەن، چونکە ڕێبازەکەیان داخوازی ئەوە دەبێت کە مرۆڤ گومانی لە شتانی بەڵگەنەویستی وەك بوونی "دەریاچەی وان" و "چیای سوبحان"دا بێت، لەبەر ئەوەی ڕێبازەکەیان شتی وای بەلاوە گونجاوە! واتە: بەلایانەوە گونجاوە کە دەریاچەی وان ببێت بە "دۆشاو" چیای سوبحان(سیپان)یش بگۆڕێت بە هەنگوینێك کە بە شەکر داپۆشرابێت!! یان هەردووکیان بڕۆن بۆ دەریای "نەبوون" – وەك هەندێ لە هاوڕێیانمان کە بە "خڕیی زەوی" ڕازی نەبوون، پاشان ڕۆشتن بۆ سەفەر و پێیان ترازا – بەو واتایەی کە ڕێبازەکەیان داخوازی قبوولکردنی ئەو حاڵە ناوبراوەی چیا و دەریاچەکەیە!!

◆ دەسا ئەی کەسانی بێ بەش لە مەنتیق! ئێوە لە کوێن؟

ئەوەتا لە زانستی "مەنتیق"دا سەلماوە کە:

"وەهمیات" لە شتانی "هەست پێ کراو"دا لە بەڵگەنەویستەکانە[1]. جا ئەگەر ئینکاریی ئەو بەڵگەنەویستە بکەن و سەرسەختیی لە ڕوودا بنوێنن، ئەوا تەنها هێندەم بۆ دەمێنێتەوە کە لە بری ئامۆژگاری، "سەرەخۆشی"تان پێشکەش بکەم لەسەر مردنی زانستە ئاساییەکان و زیندووبوونەوەی "سەفسەتە" لە لاتان!

◆ بەڵای چوارەم:

ئەوەی کە سەر لە خەڵکانی ڕواڵەت بین دەشێوێنێت: تێکەڵ بوونی "گریمانی وەهمی" و "گریمانی عەقڵی"یە[2] لە لایان. لە کاتێکدا کە "گریمانی وەهمی" لە دەماری لاسایی و چاولێکەرییەوە سەرهەڵدەدات، نەك لەسەر بناغەیەکی زانستی. هەر ئەویشە کە "سەفسەتە" بەرهەم دەهێنێت، چونکە بەڵگەی لەسەر نییە و، ڕێگایەك لەناو بەڵگەنەویستەکاندا لێدەدات بۆ گومان و گریمان.

---

(١) مەبەستی ئەوەیە کە: شتێکی بەڵگەنەویستە نابێ وەهم و گومان لە شتانی هەست پێ کراو (محسوسات)دا بێت، چونکە هەر شتێك بەهۆیەوە پەی بە شتی تر ببرێت "زانست"ە، نەك "وەهم و گومان". ئەمەش بیروباوەڕی "ئەهلی سوننەت و جەماعەت"ە. بەڵام "سۆفستائییەکان" بەلایانەوە دروستە کە گومان لە شتی هەست پێ کراودا ڕوو بدات. بۆ نموونە دەڵێن: دەنکە ترێیەك گەر بخرێتە ناو شووشەیەکی پڕ لە ئاو، لە قەبارەکەی خۆی گەورەتر دەبینرێت. وەڵامیان دەدرێتەوە کە: دەنکە ترێکە گۆڕانی بەسەردا نەهاتووە، بەڵکو بوونی لەناو شووشە ئاوەکەدا بەو شێوەیە دەری خستووە، دەنا ئەو دەنکە ترێیە هەر وەکو خۆیەتی و نەگۆڕاوە. (پەراوێزی د. عەبدولمەلیك سەعدی)

(٢) جیاوازیی نێوانیان ئەوەیە کە: "گریمانی وەهمی" یان دەبێت یان نابێت. بەڵام "گریمانی عەقڵی" دواناکەوێت. (پەراوێزی د. عەبدولمەلیك سەعدی)

ئەم "گریمانی وەهمی"یە زۆربەی جار لە سازنەدانی داوەریی ژیری و، دەمار لاوازیی دڵ و، نەخۆشیی سنووری ژیری و، تەسەوور نەکردنی "مەوزووع و مەحموول"ەوە پەیدا دەبێت.

کەچی "گریمانی عەقلی" بەدەر لە "واجب" و "مەحاڵ"ە و، لەبەر ئەوەی بەڵگەیەکی بێ گومان لەسەر "بوون" یان "نەبوون"ی بەدەستەوە نی‌یە، دوودڵی لە بوون یان نەبوونیدا دروست دەبێت..

جا ئەگەر گریمانی هەرکام لەوانە لە بەڵگەیەکەوە بوو، ئەوا قبووڵ دەکرێت، دەنا بایەخی پێ نادرێت.

هەندێ لە بڕیارەکانی گریمانی وەهمی ئەوەیە کە:

بەشێك لەوانەی گریمانەکان دەورووژێنن، دەڵێن: لەوانەیە ئەو شتە بەو جۆرە نەبێت کە بەڵگە سەلماندوویەتی و دەری خستووە، چونکە "ژیری" ناتوانێت پەی بە هەموو شتێك ببات و، ژیریمان ئەم گریمانەمان دەداتێ!

بەڵێ..

هەرگیز وا نی‌یە. بەڵکو تەنها وەهم و گومانە کە ئەو گریمانەتان لەلا دەورووژێنێت، چونکە سروشتی "ژیری" وایە کە بە پێی "بەڵگە" دەڕوات و ڕەفتار دەکات..

ڕاستە کە "ژیری" ناتوانێت هەموو شتێك بزانێت و بەراوردیش لە نێوان هەموو شتێکدا بکات، بەڵام ئەم شتە ماددییانە، نەخوازەڵا ئەوانەی کە لە سنووری بینین بەدەر نین، هەرچەندەش بچووك بن هەر ژیری هەستیان پێ دەکات و هەڵیان دەسەنگێنێت. خۆ ئەگەر نەتوانین بە ژیری پەی بەو شتانە ببەین، ئەوا ئێمەش - بە وێنەی منداڵەکان - هیچ تەکلیفێکمان ناخرێتە ئەستۆ.

**وریاکردنەوەیەك:**

ئەو کەسەی کە گفتوگۆ فیکری‌یەکانی خۆمی ئاراستە دەکەم و، بە "ڕواڵەت پەرست" و "ڕووکەش بین" ناوی دەبەم و پەردە لەسەر هەڵەکانی لادەدەم و سەرزەنشتی دەکەم، زۆربەی جار کەسێکە دوژمنی ئایینە، ئەوەیە کە مافی ئایین پێشێل دەکات و جوانیی ئیسلام نابینێت و لە دوورەوە بە ڕوانینێکی ڕووکەشانە بۆی دەڕوانێت..

هەندێ جاری تریش مەبەستم لەو زیادەڕەوانەیە کە لەوکاتەدا دەیانەوێ چاکسازی ئەنجام بدەن دەچن ئایین تێکدەدەن و شێوەکەی ناشیرین پێش چاو دەخەن، کە دۆستە نەزانەکانی ئایینن.

◆ بەڵای پێنجەم:

بریتی‌یە لە گەڕان بە دوای "حەقیقەت" لە هەموو شوێنێکی گشت "مەجاز"ێکدا، کە ئەمەش دەستی زیادەڕەوان و کورتبڕانی گرتووە و بەرەو تاریکستان بردوونی!

ڕاستە دەبێ هێندەی دەنکە دانەوێڵەیەك "حەقیقەت" هەبێت تاکو "مەجاز"ی لێ سەوز ببێت و گەشە بکات و گوڵ بگرێ. یاخود "حەقیقەت" ئەو پڵیتەیەیە کە ڕووناکی دەدات، بەڵام "مەجاز" بریتی‌یە لەو شووشە بلوورەی کە پتر ڕووناکی‌یەکەی درەخشان دەکات.

بەڵێ، "خۆشەویستی" لە دڵدایە و "ژیری"ش لە مێشکدا. گەڕان بە دوای ئەم دووانە لە دەست و پێدا کارێکی بێهوودەیە!

◆ بەڵای شەشەم:

بریتی‌یە لە "کورتهێنانی بینین لەسەر ڕواڵەت". کە ئەمەش چاوانی لەکارخستووە و پەردەی بەسەر ڕەوانبێژیدا هێناوە. ئیتر - بەو پێ‌یە - مادەم "حەقیقەت" بە لای ژیری‌یەوە ڕێی تێبچێت، ئەوانە هەنگاو بەرەو "مەجاز" نانێن. تەنانەت گەر بەرەو مەجازیش بڕۆن واز لە واتاکەی دەهێنن.

هەر لەسەر ئەم بناغەیەشە کە تەفسیر و تەرجەمەی ئایەت و فەرموودەکان جوانیی ڕەوانبێژییان دەرناخات. وەك بڵێی ئەوانە لایان وایە نیشانە(قەرینە)ی مەجاز بریتی بێت لەوەی کە لە ڕووی "ژیری"یەوە "حەقیقەت" لەتوانادا نەبێت و دەست نەدات جێی مەبەست بێت..

کەچی لە ڕاستیدا نیشانەی مەجاز - کە ڕێ دەگرێ لەوەی "حەقیقەت" جێی مەبەست بێت - دەکرێ "ژیری" بێت، هەروەك دەگونجێ شتێکی هەست پێ کراو بێت، یاخود داب و عورف بێت، یان مەقام بێت، یان گەلێ شتی تریش.

ئەگەر دەتەوێت لەمە شارەزا ببیت، فەرموو بڕۆرە ناو "بابی دووسەد و بیست و یەکەم" لە بەهەشتی فێردەوسی "دلائل الإعجاز" دەبینیت کە چۆن "عەبدولقاهیری

جورجانی"ی بلیمەت[١] ئەو جۆرە کەسە هەڵەشە و قیرسیچمانەی بردووەتە لای خۆی، سەرکوت و سەرزەنشتیان دەکات!

◆ بەڵای حەوتەم:

بریتی‌یە لە ترنجاندنی "عەرەض"[٢] لە شتی "زاتی"[٣]و "ئەینییەت"دا[٤]. کە ئەوەش لای ئەوان شتانی "ناسراو"ی کردووە بە "نەناسراو". کە ئەمەش ئەنجامەکەی ئینکاری کردنی دانەپاڵی "سیفەت"ە بۆ شتێك کە لە بناغەدا هی ئەو نەبێت. هەر بەمەش خۆری "حەقیقەت" لە جووڵەی خۆی لایدا.

ئایا ئەوانە سەیری شێوازەکانی زمانی عەرەبیان نەکردووە کە چۆن دەڵێن: "صادَفَتْنا الجبالُ ثم فارَقَتْنا" واتە: (چیاکان هاتنە ڕێمان پاشان لێمان جیا بوونەوە).. یان: "تراءتْ لنا الجبالُ ثم بَعُـــدَتْ عنَّـــا" واتە: (چیاکانمان لێ دەرکەوت پاشان دوور کەوتنەوە لێمان).. یان: "البحرُ ابتلعَ الشمسَ" واتە: (دەریا خۆری هەڵلووشی).. هتد؟

یان ئایا سەرنجی ئەوەیان نەداوە کە شێوازی زمانی عەرەبی وایە چەندین جار "ئەندێشە" دیواودیو دەکات لە پێناوی چەند نهێنی‌یەکی ڕەوانکاری، وەك ئەوەی لە

---

(١) ناوی "ئەبووبەکر عەبدولقاهیری کوڕی عەبدوڕەحمانی کوڕی محەممەدی جورجانی"یە و، لە سەرەتای سەدەی پێنجەمی کۆچیدا لە شاری (جورجان)ی ئێران لە دایك بووە. هەر لە شارەکەی خۆیدا لە هەموو بوارێکی زانستەکانی ئەو سەردەمە، وەکو نەحوو، ئەدەب، زانستەکانی قورئان، فیقھ، بەلاغە.. هتد خوێندوویەتی و، زانایانی بە توانای وەکو ئەبوو عەلیی فارسیی و قازی عەلی کوڕی عەبدولعەزیزی جورجانی مامۆستای بوون، هەتا لە ئەنجامدا بووە بە مامۆستایەکی شارەزا و زانای ئەوتۆ کە لە گشت لایەکەوە زانستخوازان ڕوویان تێکردووە. کەسێکی خاوەن تەقوا و وەرع و بە قەناعەت و هەژار بووە. لە زانستی "نەحوو"دا ئەم کتێبانەی داناوە: (المغني) و (المقتصد) و(التكملـــة) و(الإيضـــاح) و(الجمـــل)، هەروەك لە ئەدەبیشدا جگە لە دیوانێکی شیعر چەند کتێبێکی تری داناوە، یەکێك لەوانە: (المختار من دواويـــن المتنـــبي والبحتري وأبي تمام). بەڵام زیاتر کتێبەکانی لە بواری ئیعجازی قورئان و ڕەوانبێژی(البلاغـــة)دا ناوبانگیان دەرکردووە، کە ئەمانەن: (إعجاز القرآن) ، (دلائل الإعجاز) ، (أسرار البلاغـــة) ، (الرســـالة الشـــافية في الإعجاز). ساڵی (٤٧١ك) یان (٤٧٤ك) ماڵئاوایی لە دنیا کردووە. (وەرگێڕ)

(٢) "عەرەض" ئەو شتەیە کە بۆ "بوون"ی پێویستی بە جێیەك هەبێت کە بەهۆیەوە دەربکەوێت، وەکو "ڕەنگ" کە پێویستی بە تەنێك هەیە تیایدا دەربکەوێت و لەو ڕێیەوە ببینرێت. بڕوانە: "التعريفات"ی جورجانی. (وەرگێڕ)

(٣) مەبەست لە "زاتی" لێرەدا ئەو "تەن"ەیە کە بۆ خۆی خاوەنی "بوون"ە و بۆشاییەك لە بووندا پڕ دەکاتەوە. (وەرگێڕ – لە چاپە عەرەبی‌یەکەوە)

(٤) واتە شوێن، جێگا. (وەرگێڕ)

کتێبی "مفتاح"ی سەککاکیدا[1] دەبینرێت؟ کە ئەوەش ناسك و نیانییەکی ڕەوانکارییە و، لەسەر بناغەی "خۆبەهەڵەبردنی وەهم" دامەزراوە، بەپێی نهێنیی "دەوەران"[2].

وا دوو نموونە لەسەر ئەمە ڕوون دەکەمەوە، تاکو ببن بە ڕچەشکێن و سەرمەشقێك کە لە ڕێیانەوە نموونەی تر لێك بدرێتەوە:

﴿وَيُنَزِّلُ مِنَ السَّماءِ مِنْ جِبالٍ فِيها مِنْ بَرَدٍ﴾ (النور:٤٣) و..

﴿وَالشَّمْسُ تَجْرِي لِمُسْتَقَرٍّ لَها﴾ (يس:٣٨).

ئەم دوو ئایەتە پیرۆزە تابلێی شایانی تێبینی و تێڕامانن، چونکە ڕاوەستانی وشك و برنگ لەسەر ڕواڵەتی واتاکەیان سەرسەختی و ناحەقییە بەرامبەر "ڕەوانبێژی".

ئەوەتا ئیستیعارەیەکی ناوازە لە ئایەتی یەکەمدا هێندە بە گەرموگوڕی خۆی دەردەخات کە ڕەقیی شەختە سەهۆڵ دەتوێنێتەوە و، بە وێنەی هەورە بروسکەش پەردەی هەوری "ڕواڵەت" دەدڕێنێ..

"ڕەوانبێژی" لە ئایەتی دووهەمیشدا هێندە بەهێز و جێگیر و درەخشانە کە "خۆر" بۆ بینینی ڕادەوەستێ!

ئایەتی یەکەم بە وێنەی هاوشێوەکەی: ﴿قَوارِيرَ مِنْ فِضَّةٍ﴾ (الانسان:١٦) ئیستیعارەیەکی ناوازەی تێدایە، چونکە دەفرەکانی بەهەشت هەروەك "شووشە" نین "زیو"یش نین، بەڵکو جیاوازیی شووشە لە زیو نیشانە(قەرینە)ی ئیستیعارە ناوازەکەیە.

---

(١) ناوی: (ئەبوو یەعقووب یووسفی کوڕی ئەبووبەکری کوڕی محەممەدی خوارێزمیی سەککاکی)یە سالی (٥٥٤ك/١١٥٩ز) لە خوارێزم (ئۆزبەکستانی ئێستا) لە دایك بووە، سالی (٦٢٦ك/١٢٢٨ز) کۆچی دوایی کردووە. لە ڕۆژگاری خۆیدا پێشەوای زانستەکانی: نەحوو، صەرف، مەعانی، بەیان، شیعر، عەرووز، کەلام.. هتد، بووە. بەرهەمی بەناوبانگی کتێبی: (مفتاح العلوم)ە کە دوازدە زانستی تێدا کۆکردووەتەوە و، هەر لە سەردەمی خۆیەوە هەتا ئێستا جێی بایەخی زانایان و توێژەران بووە لە هەموو ڕوویەکی: لێکۆڵینەوە و، وانە وتنەوە و، لێکدانەوە و، کورتکردنەوە و، پەراوێز لەسەر نووسین. (وەرگێڕ)

(٢) پێدەچێ مەبەستی دانەر لە "دەوەران" لێرەدا "دەوەران" بێت لە زانستی ئوسوولی فیقهـ و لە (باسی قیاس)دا. واتە: "بەهۆکراو"(معلول) پەیوەستە بە هۆکار(علة)ێکەوە، چ لە بوونی و چ لە نەبوونیدا؛ جا ئەگەر هۆکارەکەی بوو ئەویش دەبێ، گەر نەبوو ئەویش نابێ. بڕوانە: (کشاف اصطلاحات الفنون، للتهانوي، مادة (دوران) ١/٨١٢. (وەرگێڕ)

واتە شووشە بە ڕوونىيەكەى و زيويش بە سپێتى و بريسكانەوەكەى وەكـو ئـەوە وان نموونەيەك بن بۆ ناسـاندنى پەرداخـەكانى بەهەشـت، خـواى ميـهرەبان نـاردوونى بـۆ ئـەم جيهانە تاكو شەوقى تاسەمەندانى بەهەشت بورووژێنن، لەوانەى كە خۆيـان و سـامانيان بۆ بەدەستهێنانى دەبەخشن.

جا هەروەك ئيسـتيعارە لـەم ئايەتـەدا بـەم جۆرەيـە، ئيسـتيعارەيەكى نـاوازەى پڕاوپڕ و تەواوى وەكو ئەمە لە ئايەتى پيرۆزى: ﴿مِنْ جِبالٍ فِيها مِنْ بَرَدٍ﴾يش دەچۆڕێت..

زەمينەى ئەم ئيستيعارەيە لەسەر بناغەى پێشبڕكێ و چاولێكەرىيەك بنيات نراوە كـە "ئەندێشە" لە نێوان زەوى و ئاسماندا تەسەوورى دەكات، كە بەم جۆرەى خوارەوەيە:

هـەروەك "زەوى" خۆى بە چيـاكان دەڕازێنێتەوە، كە ئەوانيش خـۆيـان بـە پۆشـاكى بەفر و تەرزە داپۆشيوە، يان سەريان بە مێزەرى تەرزە و بەفر پێچاوەتەوە.. بـاخ و بێستانە ڕەنگاوڕەنگەكانيشى پۆشـاكيان لەبـەر خۆيـان لابـردووە و بـێ پـەردە خۆيـان پێـش چـاو خستووە.. "ئاسمـان"يـش بـە هـەمان جـۆر لــە بەرامبەريــەوە چـاوى لــێ دەكـات و بـە سەرپۆشى پەڵـە هـەورە پچڕ پچڕەكان خـۆى دەڕازێنێتەوە كە بـە وێنـەى چيـا و شـاخ و دۆڵەكانى زەوى و لە ڕەنگ و ڕووى ئەواندا بـە نـازەوە خـۆى دەنوێنێـت و، وێنەيـەك بـۆ باخ و بێستانەكانى زەوى دەكێشێت..

كەواتە ئەگەر بوترێت:

ئەو پەڵە هەورانە وەكو چياكان ياخود كەشـتىيەكان يـان كـاروانى حوشـتر يـاخود باخ و دۆڵ و شيوەكان وان، هيچ هەڵەيەك لە تەشبيهەكەدا نابێت. چونكە – لە ڕوانينـى ڕەوانبێژيـدا – ئەندێشـەى مرۆڤ پەڵـە هـەورەكان بـە مەلـەوان و گـەڕۆك دەبينێـت لـە بۆشاييدا، وەك بڵێى دەنگى گرمەى هەور شوان و شۆفێريان بێت و، هەر هێنـدەى لـەناو زەرياى هەوادا گۆچانى بروسـكەى خۆى لـە سـەرى ئـەوان وەشـاند يەكسـەر ئـەو پەڵـە هەورانە دەلەرێنەوە و بە وێنەى چەند چيايەك دەبينرێن كە وەكـو خـورى شـى كرابنـەوە. دەڵێى ئاسمان بە گرمەى هەورەكەى گەرديلەكانى هەڵمى ئـاو بـۆ چـەك هـەڵگرتن بـانگ دەكـات و بـەرەو سـەربازى دەيـانيرێت، پاشـان بـە دەركردنـى فـەرمانى "حەوانـەوە" هەريەكەيان دەڕواتەوە شوێنى خۆى و لە بەرچاودا ون دەبێت!

ئنجا زۆر جار "هەورەکان" پۆشاکی "چیاکان" دەپۆشن و لە شێوە پەیکەری ئەواندا دەنوێنن و، ڕەنگی سپیی بەفر و تەرزە لەخۆ دەگرن و لەگەڵ بارودۆخی "سەرما" و "شێ"دا خۆیان دەگونجێنن. هەر لەبەر ئەمەیە کە هاوسێیەتی و هاوڕێیەتی لە نێوان چیا و هەورەکاندا هەیە. ئیتر – لە ڕوانینی ڕەوانبێژیدا – شایانی ئەوەیە کە هەریەکەیان پێداویستییەکانی خۆی لەوی تر بخوازێت و لەگەڵ یەکتردا بیانگۆڕنەوە و، "چیا" بۆ "هەور" بەکار بهێنرێت و "تەشبیه" لەبیرببرێتەوە.

لە چەند شوێنێکی قورئاندا ئەم برایەتی و ئاڵوگۆڕە دەبینرێت، چونکە ئەم لە پۆشاکی ئەودا و ئەویش لە پۆشاك و بریسکە و ڕەنگی ئەمدا دەردەکەوێت.

یەکێك لە مەنزڵەکانی تەنزیل(قورئان) تەوقەکردنی نێوان چیا و هەورەکانە، هەروەك ئەوەی لەسەر لاپەڕەی کتێبی جیهاندا لەباوەش گرتنی یەکتری و تەوقەی نێوانیان بەچاو دەبینرێت. ئەوەتا هەورەکان دەبینین لەسەر چیاکان دانراون، وەك بڵێی چیاکان بەندەر بن بۆ لەنگەرگرتنی کەشتیی هەورەکان.

ئایەتی دووهەم:

﴿وَالشَّمْسُ تَجْرِي لِمُسْتَقَرٍّ لَهَا﴾.

بەڵێ، وشەی: ﴿تَجْرِي﴾ ئاماژە بۆ شێوازێکی "ڕەوانکاری" دەکات. هەروەك وشەی: ﴿لِمُسْتَقَرٍّ﴾ ئاماژەیە بۆ حەقیقەتێك. بەو واتایەی کە ئەو شێوازە "ڕەوانکاری"یەی کە بە ﴿تَجْرِي﴾ ئاماژەی بۆ کراوە ئەمەی خوارەوە بێت:

"خۆر" وەکو کەشتییەکی زرێپۆشی دروستکراو لە تەواوەی ئاڵتوون وایە و، لە دەریای ئاسمانی "ئەثیر"دا – کە بە شەپۆلی ئارامبوو ناو دەبرێت – گەشت و مەلە دەکات. خۆ هەرچەندە خۆی لە جێی خۆیدا لەنگەری پێ گیرابێت، کەچی ئەو ئاڵتوونە تەواوە لەناو ئەو دەریا مەزنەی ئاسماندا دێت و دەڕوات. بەڵام ئەم هاتوچۆیە بە پێی بینینی هەستەوەرەکانە کە لە پێناوی تێگەیاندندا ڕەچاو دەکرێن. واتە هاتوچۆیەکی عەرەزییە (نەك ڕاستەقینە).

بەڵام خۆر دوو هاتوچۆی ڕاستەقینەی هەیە، دەشبێ ببێت، چونکە مەبەست – لەم ئایەتەدا – دەرخستنی ڕێکوپێکییە لە کاری خوای گەورەدا. جا بە گوێرەی

شێوازەکانی زمانی عەرەبی و بەپێی ڕوانینی ڕێکوپێکی، ئەو هاتوچۆیە چ خۆیی و ڕاستەقینە بێت و چ عەرەزی بێت، یەکسانە و هیچ شتێ لە بابەتەکە ناگۆڕێت.

دووهەم: خۆر لە شوێنی جێگیر بوونی خۆی و لە تەوەرەکەی خۆیدا دەجوولێت. لەبەر ئەوە، بەشەکانیشی - کە تەواوەی ئالتوونەکەن - لەگەڵ ئەودا لە هاتوچۆدان و دەجوولێن. جا ئەم جوولە ڕاستەقینەیە هێندەی دەنکە دانەوێڵەیەکە لەو جوولە مەجازی‌یە ناوبراوە، بگرە بزوێنەریەتی.

سێ‌هەم: یەکێك لە خواستەکانی "دانست" ئەوەیە کە جوولەی خۆر و سەربازەکانی - هەسارە گەڕۆکەکانی - لە بۆشایی جیهاندا جوولەیەکی بینراو بێت. چونکە توانستی خوای گەورە کە هەموو شتێکی بە زیندوو ڕاگرتووە و دەیاجوولێنێ، بڕیاری ڕاوەستانی ڕەهای بۆ هیچ شتێك دەرنەکردووە و، میهرەبانی‌یەکەشی بواری بە هیچ شتێك نەداوە کە خۆی پەیوەستی ئەو بێکاری‌یە ڕەهایە بکات کە خوشکی "مردن" و ئامۆزای "نەبوون"ە..

لەبەر ئەوە، "خۆر"یش - بە مەرجی گوێڕایەڵی کردن بۆ فەرمانەکانی خوای گەورە - سەربەستە. ئەوەتا ئازادیی جوولەی دراوەتێ، بە مەرجێ دەست لە ئازادیی غەیری خۆی وەرنەدات. خۆر پادشای بۆشایی ئاسمانە و، فەرمانبەری فەرمانەکانی خوای گەورەیە و لە هەموو جوولەیەکیشدا ویستی خوای گەورە جێبەجێ دەکات.

بەڵێ، هەروەك دەکرێ جوولەی خۆر لە ڕووی "حەقیقەت"ەوە بێت، دەکرێ لە ڕووی "مەجاز"یشەوە بێت. هەروەك جوولەی خۆر ڕاستەقینە و "خۆیی"یە، دەکرێ عەرەزی و "حیسسی"ش بێت.

نیشانە لەسەر "مەجاز" وشەی: ﴿تَجْرِي﴾یە و، ئاماژەدەریش بە هەوێنی ژیان (العقدة الحياتية) وشەی: ﴿لِمُسْتَقَرٍّ لَها﴾یە.

**لەمانەی پێشەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە:**

ئامانجی خوایی لەم ئایەتە پیرۆزەدا پێش چاو خستنی ڕێسا و ڕێکوپێکی‌یە. ئەوەتا ڕێسا بە وێنەی خۆر درەخشانە.

جا بەپێی دەستووری "كل العسل ولا تسل": ئەو جوولەیەی کە ڕێسا بەرهەم دەهێنێت، چ هی خۆر بێت چ هی خولانەوەی زەوی - هەرکامیان بێت - ئێمە ناچار

نین بە دوای هۆکاری بنەڕەتیدا بگەڕێین، چونکە زیان لە ئامانجی بنەڕەتیی ناوهێنانی لە ئایەتەکەدا ناگەیەنێت..

ئەوەش - بۆ نموونە - وەکو "ئەلف"ی (قال) وایە، کە سووکەڵەیی دەربڕینی وشەکە لەسەر زار دەهێنێتەدی، ئیتر ئەسڵی "ئەلف"ەکە هەرچی بێت سووکەڵەیی وشەکە لەسەر زمان هاتووەتەدی و، "ئەلف"ەکەش ئەلفە، تەنانەت گەر لە بری "واو" ئەسڵەکەی "قاف"یش بووبێت!

**ئاماژەیەك:**

هاودەم لەگەڵ ئەم هەموو تەشبیهانەدا، وشکی(جمود)ی ساردوسڕ و دەمارگیری بۆ ڕوالەت، دژی گەرموگوڕی و نەرمونیانیی "ڕەوانبێژی"ن. هەروەك پەسەندکردنی ژیری زامدار دەکات و دژی ئەو پەسەندکردنەیە، کە بەڵگەیە لەسەر دانستی خوایی، کە ئەویش بناغەی ڕێسای جیهانە و، ئەویش شایەتە لەسەر بەدیهێنەر.. بەم جۆرە:

ئەگەر لە دووریی چەند قۆناغێکەوە ڕووت کردە چیای "سوبحان" و، پاشان ویستت بارودۆخی ئەو چیایە سەبارەت بە هەر چوار لاکەت بگۆڕێت، یان لە هەر چوار لاتەوە ببینرێت، ئنجا لە بری ئەوەی چەند هەنگاوێکی کەم بەرەو چیاکە بڕۆیت، داوا لەو چیا مەزنە بکەیت ئەو لە چوار لاکانتەوە بێت بۆ لات و بازنەیەکی هێندە گەورە ببڕێت کە هەر بۆخۆت سەرسامیت لە تەسەووریدا.. ئەم نموونە سەیر و سەمەرەیەی ئیسراف و بێهوودەیی و هەڵبژاردنی ڕێگا دوور و درێژەکە و وازهێنان لە ڕێگا کورتەکە، من بە تاوانی دادەنێم بەرامبەر ڕێسای جیهان.

ئێستا فەرموو بە ڕوانینی "حەقیقەت بین" و "ویژدان" سەیری ئەم دەمارگیرییە سارد و سڕە بکە و، بزانە کە چۆن دژایەتیی ڕاستییەکی ڕوون و درەخشان دەکات کە بە شایەتیی لێکۆڵینەوە و پشکنینی تەواو[1] سەلماوە. ئەو ڕاستییەش بریتییە لەوەی کە:

هیچ ئیسراف و بێهوودەییەك لە بەدیهاتنی بوونەوەراندا نییە و، "دانستی ئەزەلی"ش هەرگیز ڕاستە ڕێیەکی کورت واز لێ ناهێنێت و ڕێگایەك هەڵنابژێرێت کە درێژ و دژوار بێت.

---

(١) مەبەستی دانەر "الاستقراء التام"ە، کە لە زاراوەکانی "مەنتیق"ە. لە پەراوێزی لاپەڕە (٨٣)دا ڕوونکردنەوەمان لەسەر نووسیوە. (وەرگێڕ)

كەواتە ئیتر بۆچی نابێت لێكۆڵینەوە و پشكنینی تەواو نیشانەی "مەجاز" بێت؟ یان چ ڕێگرێك بۆ ئەوە تەسەوور دەكرێت؟

**وریاكردنەوەیەك:**

ئەگەر پێت خۆشە، فەرموو بڕۆرە ناو پێشەكی‌یەكان و، پێشەكیی یەكەم بكە بە (صوغرا) و سێ‌هەمیش بە (كوبرا)[1] تاكو ئەم (ئەنجام)ەت بۆ بەرهەم بهێنێت:

ئەو شتەی كە زەینی ڕواڵەت بینەكان دەشێوێنێت كێش بوونیانە بەلای فەلسەفەی یۆنانیدا، ئەمەش لە ڕادەیەكدایە كە بۆ تێگەیشتن لە ئایەتەكان وەك سەلمێنراوە بێ گومانەكان دەڕواننە ئەو فەلسەفەیە!

ئنجا یەكێك لەو شتانەی كە جەرگ سووتاو دەهێنێتە پێكەنین ئەوەیە كە:

هەندێ كەس لە گوفتاری ئەو مەردەی كە لەوە مەزنترە گەوهەری حەقیقەت لە زەرق و بەرقی فەلسەفە جیا نەكاتەوە، لەوەدا كە بە زمانی كوردی وتوویەتی: (عەناصیر چیهارن ژی وانن مەلەك)[2] كە مەبەستی ئەوەیە مەلائیكەتان چەند جەستەیەكی

---

(١) دوو زاراوەی پێوانەی پێكەوەیی(قیاس إقتراني)ن لە زانستی مەنتیقدا. كە بریتی‌یە لەوەی بە دوو پێشەكی ئەنجامێك بەرهەم دەهێنن. وەك ئەم نموونەیە: "شادمان مرۆڤێكی دانایە، هەموو مرۆڤێكی داناش لێبوردەیە، كەواتە شادمان لێبوردەیە". ڕستەی یەكەم پێشەكیی یەكەمە و پێی دەوترێ "صوغرا" ڕستەی دووهەم پێشەكیی دووهەمە و پێی دەوترێ "كوبرا". ڕستەی سێ‌هەمیش پێی دەوترێت: "ئەنجام". (وەرگێڕ)

(٢) ئەمە بەشێكە لە بەیتێكی مەلا خەلیلی سیرتی (سیعردی) لە كتێبی "نهج الانام" ل: ٤دا. تەواوەتی‌یەكەی بەم جۆرەیە:

عەناصیر چیهارن ژی وانین مەلەك    وەكی ئینس و جین نوورە قیسمی گەلەك

واتە: توخمەكان چوار دانەن. مەلائیكەت لە یەكێكی ئەم توخمانە دروست كراون. چونكە مەلائیكەتیش وەكو ئینس وجین لە یەكێكی ئەم توخمانە كە "ڕووناكی"یە بە دیهێنراون. بڕوانە (**Risale-i Nurun Kudsi Kaynaklari**) لاپەڕە (٦٧٤).

"مەلا خەلیلی سیرتی"ش (١١٦٤-١٢٥٩ ك) خەڵكی گوندێكی باكووری كوردستانە لە نزیكی گوندی نوورس بە ناوی (گوهێك). پاشان لە شاری سیرت نیشتەجێ بووە و هەر لەوێش كۆچی دوایی كردووە. گەلێ بەرهەمی دوای خۆی بەجێ هێشتووە كە زۆربەیان تا ئێستا هەر دەستنووسن و تەنها دوانیان لێ چاپ كراوە، یەكەمیان: (نهج الانام) بە زمانی كوردیی كرمانجیی ژووروو، دووهەمیشیان كتێبێكە لە زانستی مەنتیقدا بە زمانی عەرەبی.

تێبینی: ئەم زانیاری‌یانەم لەسەر ژیانی (مەلا خەلیلی سیرتی) لە مامۆستا "عەبدولقادر بادیللی"ی قوتابیی مامۆستا نوورسی وەرگرت، كە سەرچاوەی ناوبراو دانراوی ئەوە. (وەرگێڕ)

نوورانین و لـە توخمـە کان دروسـت بـوون، نـەك وەکـو ئـەوەی کـە فەیلەسـووفە کان لـەو گومانەدان: مەلائیکەت لە مادیەت بەدەرن..

ئەوانە لەم گوفتارە و لەم ڕاشکاوی‌یە وا تێگەیشتوون کە:

"توخمەکان چوارن" و ئەم بڕیارەش هی ئیسلامە!!

تێگەیشتنێکی گەلێ سەیرە!!

چونکە ژمارەی توخمەکان کە چوار بن و توخم بن و چەند شتێکی ساکار بن.. لە زاراوەی فەیلەسووفەکانە و، بەشێکن لـە بناغـەکانی زانستە سروشتی‌یە بـە ڕووکـەش ڕازاوەکان و، هەر هیچ پەیوەندی‌یەکیان بە ئیسـلامەوە نی‌یـە. بـەڵکو تەنـها مەسـەلەیەکە بەپێی ڕواڵەتی بینراو بڕیاری لەسەر دەدرێت.

بەڵێ، هەر شتێك پەیوەندی‌یـەکی بـە ئایینـەوە هـەبێت، مـەرج نی‌یـە بەشێك بێـت لـە ئایین. چونکە ئەگەر هەر ماددەیەك تێکەڵ بە ئیسلام کرابێت، بە توخمێك یان بەشێك لـە ئیسلام قبووڵ بکرێـت، نـەزانی دەردەخات بەرامبـەر تایبەتمەندی‌یـەکانی توخمـی ئیسـلام خـۆی. لەبـەر ئـەوەی چـوار توخمـە بناغەییـەکانی ئیسـلام - کـە بریتـین لـە قورئـان و سوننەت و ئیجماع و قیاس - هەرگیز ئەم چەشنە ماددانـە دروسـت ناکـەن و بەرهـەمیان ناهێنن!

**ئەنجامی ئەم قسانە:**

ئـەو توخمانـە، کـە: (توخمـن و.. سـاکارن و.. چـوار دانــەن).. هــەموو ئەمانــە، هـی زۆنگاوی "فەلسەفەی یۆنانیی کۆن"ن و، لە سەرچاوەی پـاك و بـێ خلتـەی شـەریعەتەوە هەڵنەقوڵاون..

بەڵام لەبەر ئەوەی ڕۆشتنە سەر زاری پێشینانمان، ئەوا لێکدانەوەیەکی دروستیان بـۆ دۆزی‌یەوە، چونکە کاتێ ئەو پێشینانە وتیان: چـوار دانـەن، ئـەوا لەبـەر ئـەوە بـوو کـە بـە "ڕواڵەت" یان بە "حەقیقەت" چوار دانەن، کە "تەنـە ئەندامی‌یـەکان" بەرهـەم دەهێنـن و، بریتین لـە:

بەرهـەمهێنی ئـاو (هـایدرۆجین و ئۆکسـجین).. بەرهەمـهێنی ترشـی (هـایدرۆجین و ئۆکسجین و کاربۆن).. ئازۆت (نایترۆجین).. کاربۆن.

جا ئەگەر تۆ کەسێکی ئازادیت لە بیرکردنەوەکانتدا، ئەوا سەیرێکی خراپە و زیانەکانی ئەم فەلسەفەیە بکە و، ببینە کە چۆن زەینەکانی دووچاری نزمی و دیلی کردووە!

دەسا ئافەرین بۆ "فەلسەفەی نوێ"[١] کە بە تەواوی هەر چوار دیوارەکانی ئەو فەلسەفە یۆنانی‌یە خۆسەپێنەی سەرەوژێر کرد و هەڵی وەشاندەوە!

کەواتە لەمانەی پێشوو ئەوە بە دڵنیایی سەلما کە:

کلیلی بەڵگەکانی ئیعجازی ئایەتی قورئان و دەرخەری نهێنی‌یەکانی ڕەوانبێژی، تەنها لە کانگای "ڕەوانبێژی"ی زمانی عەرەبیدایە، نەك لە دەزگای فەلسەفەی یۆنانیدا!

برای ئازیزم!

مادەم حەز و شەوق و بایەخدان بە دۆزینەوەی نهێنی‌یەکان ئێمەی گەیاندە ئەم مەقامە و، تۆشمان لەگەڵ خۆماندا کردە هاوەڵ و، ناچارمان کردیت هەزر و بیرت دووچاری نیگەرانی بکەین، هەست بە ماندوو بوونت دەکەین..

وا ئێستا لە (وتاری دووهەم)دا گەشتێکت بەناو گۆڕەپانی "توخمی ڕەوانبێژی" و "کلیلی ئیعجاز"دا پێ دەکەین.

بەڵام دەخیل! نەکەی داخراویی شێوازەکەی و ڕواڵەتی باسە شڕ و شێواوەکانی تۆ بتۆرێنێت.. چونکە وردیی واتاکانیەتی کە دایخستووە و، جوانیی خۆیی ماناکانیشیەتی کە پێویستیی ئەوانی بە ئارایشت نەهێشتووەتەوە..

بەڵێ، مارەیی نازەنینە بێ باك و نازدارەکان سەیرکردنیانە بە وردی و، جێگاشیان ناخ و قووڵایی دڵە! ئەو پۆشاکەش کە پۆشیومە بە بەریان پێچەوانەی مۆدیلی ئەم سەردەم و ڕۆژگارەیە، چونکە من لە نێوان چیاکاندا گەورە بووم و پێگەیشتووم کە قوتابخانەی ئاییینی کوردستانە و، فێری دروومانی تورکی نەبووم! پاشان شێوازی نووسینی هەر کەسێك لە ڕاستیدا کەسایەتیی ئەو دەنوێنێت، خۆ منیش - وەك دەبینن و دەبیستن - مەتەڵێکم شیکردنەوەم ئاسان نی‌یە!!

---

(١) مەبەستی دانەر "زانستی نوێ"یە، کە یاساکانی لەسەر بناغەی ئەزموون و توێژینەوە دامەزراون. (وەرگێڕ)

# وتاری دووهەم

# تۆخمی ڕەوانبێژی

ئەم وتارە چەند مەسەلەیەك ڕوون دەكاتەوە

كە پەیوەندییان بە گیانی "ڕەوانبێژی"یەوە هەیە

بسم الله الرحمن الرحيم

الطيّبات لله والصلوات على نبيه

## مەسەلەی یەکەم

مێژوو بۆمان دەگێڕێتەوە کە کاتێ "دەستەڵاتداریی عەرەب" عەجەمەکانی بەلای خۆیدا کێش کرد، ئەوا بە تێکەڵبوونی ئەوان بەهرە و لێهاتوویی "گوفتاری (موزەری)"[1] - بە داخەوە - تێکچوو کە بناغەی "ڕەوانبێژیی قورئان"ە. چونکە کاتێ عەجەمەکان و کەسانی نامۆ دەستیان دایە هونەری ڕەوانبێژیی عەرەبی ئەوا لە ڕەوتی سروشتیی فیکریی خۆی ترازاندیان (کە هۆنینی واتاکانە) و بەرەو پیشەسازیی "وشە" لایان دا.. ئەویش بەم جۆرەی خوارەوە:

ڕێڕەوی سروشتیی جۆگەی بیر و هەستەکان تەنها "هۆنینی واتا"یە.. هۆنینی واتاکانیش ئەوەیە کە بە یاسای "مەنتیق" بنیات نرابێت.. شێوازی مەنتیقیش ڕووی لە "ڕاستییە ڕیزبەستووەکان"ە.. ئەو بیر و هزرەش دەگاتە ڕاستییەکان ئەوەیە کە دەڕواتە ناخی لایەنە وردەکانی "ماهییەت" و ڕێژەکانی.. هەر تەنها لایەنە وردەکان و ڕێژەکانی ماهییەتیشن کە پەیوەندیدەری ڕێسای تەواو کاملی جیهانن.. ڕێسای تەواو کاملیش بریتییە لەوەی کە جوانیی پەتی (موجەڕڕەد)ی تێدا دانراوە، کە سەرچاوەی هەموو جوانییەکە.. جوانیی "پەتی"ش باخچە و گوڵزاری ڕەوانبێژییە، کە پێی دەوترێ تایبەتمەندییەکان و، ڕووە ناسک و نیانەکان.. ئنجا ئەو "گوڵزار"ە و "وردەکاری و ڕێژەی ماهییەتی شتەکان" ئەوەیە کە بولبولانی شەیدای گوڵ، واتە شاعیران و ڕەوانبێژان و شەیدایانی سروشت گەشتی تێدا دەکەن. ئاوازی ئەو بولبولانەش زایەڵەیەکی ڕۆحانی پشتی دەگرێ و پەرەی پێ دەدات کە "هۆنینەوەی واتاکان"ە!

---

(١) واتە زمانی عەرەبیی فوسحا. (وەرگێڕ)

بەلاّم کاتێ خەڵکانی عەجەم و نامۆ بە "ڕەوانبێژی" هەوڵیان دا بڕۆنە ناو ڕیزی ئەدیبانەوە، کار لە شوێنی خۆی ترازا و جڵەو لەدەست دەرچوو. چونکە هەروەك میزاجی هەر نەتەوەیەك سەرچاوەی هەست و نەستە کانیەتی، زمانی نەتەوەش ئەو هەستانە دەردەبڕێت و دەریاندەخات. خۆ مادەم میزاجەکانی نەتەوەش جۆراوجۆرن، ئەوا توانای "ڕەوانبێژی" لە زمانەکانیشدا جیاجیایە، نەخوازەلاّ زمانی ڕەوانی عەرەبی کە لەسەر بناغەی دەستوورەکانی "نەحوو" دامەزراوە.

**لەسەر بناغەی ئەمانەی پێشوو:**

"هۆنینەوەی وشە" کە زەوی یەکی ڕووتەنی وشك و برنگەو، هەرگیز بۆ ئەوە دەست نادات کە ببێت بە جۆگەو تاڤگەی هزر و بیرەکان و گوڵزاری ڕەوانبێژی..

"هۆنینەوەی وشە" کە ئەمە حاڵیەتی.. ڕێی لە ڕەوتی سروشتیی "ڕەوانبێژی" گرت کە "هۆنینەوەی واتا"یەو، لێرەوە "ڕەوانبێژی"ی شێواند.

جا لەبەر ئەوەی عەجەمەکان، کە لە سەرەتای فێربوونی زماندان و، بەهرەدار و کارامە نین لەو زمانەدا، چ بەهۆی هەڵەی خۆیان بێ لەو هەڵبژاردنەدا و، چ بەهۆی ڕاپێچکردنی ناچاری بێت، پتر پێویستیان بە ڕێکخستنی وشە و ڕازاندنەوەی و بەدەستهێنانی واتای زمانەوانیی وشەکانە.. ئەوا لەو ڕووەوە هەموو بایەخێکیان ئاراستەی "وشە" کرد و، زیاتر حەزیان لەو شتانە بوو کە بۆ ئەوان ئاسانتر و ئاشکراترە و، بە چاوی ڕووکەشبین ئاشناترە و، بۆ "عەوام"یش گونجاوتر و سەرنج ڕاکێش ترە و، زیاتر کاردانەوەی لەواندا دەبێت و لە دەوری کۆ دەبنەوە..

هەر لەبەر ئەوەبوو کە بەرەو ڕازاندنەوەی "وشەکان" کێش بوون و، زمانیان لە ڕێکخستنی "واتاکان" و ڕۆچوون لە ناویاندا نەخستە کار، ئەو واتایانەی کە هەتا هەنگاوێکی لێ ببڕن چەندین بیابانی درەخشانی فراوانتریان لێ دەردەکەوێت..

هەر بەم جۆرە لەسەر ئەم شێوازە ڕۆشتن هەتا لە هۆنینی وشەدا زەینیان پەرتەوازە بوو، بە ڕادەیەك کە هەر تەنها دوای تەسەورکردنی واتاکان[1] ئیتر "وشەکان" بە

(١) پێم وایە مەبەستی واتا یەکەمە نزیکەکان بێت. (وەرگێڕ)

هەرلایەکدا بڕۆشتنایە زەینەکانی ئەوانیش شوێنی دەکەوتن. تەنانەت "وشە" بە ڕادەیەك بەسەر "واتا"دا زاڵ بوو کە بە وێنەی خزمەتگوزارێك بۆ خۆی خستیە کار..

لە ئەنجامی ئەمەشدا ماوەی نێوان سروشتی "ڕەوانبێژی" - کە بریتی‌یە لەوەی "وشە" خزمەتگوزاری "واتا" بێت - لەگەڵ پیشەی شەیدایانی وشەدا هەتا بڵێی فراوان بوو.

ئەگەر دەتەوێ لەمە تێبگەیت فەرموو بڕۆرە ناو "مەقامات"ی حەریریی بلیمەت(1)، دەبینی کە - وێڕای شان و شکۆی بەرزی لە ئەدەبدا - چۆن حەزی وشە ڕازاندنەوە سەرنجی ڕاکێشاوە و، ئەدەبی بڵندی ئەوی لەکەدار و پەڵاوی کردووە، بەوەش بووەتە پێشەنگێکی چاولێکراو بۆ لاسایی و پۆزش هێنانەوەی شەیدایانی "وشە"، بە ڕادەیەك کە زانایەکی مەزنی وەکو "عەبدولقاهیری جورجانی" سێ‌یەکی هەردوو کتێبی: "دلائل الاعجاز" و " أسرار البلاغة"ی بۆ چارەسەری ئەم دەردە تەرخان کردووە!

بەڵێ، خۆشویستنی "وشە" نەخۆشی‌یە.. بەڵام نازانرێت کە نەخۆشی‌یە!

**وریاکردنەوەیەك:**

هەروەك "خۆشویستنی وشە" جۆرێکە لە نەخۆشی.. بە هەمان جۆر، مەیلی وێنەکێشانی هونەری و، خۆشویستنی شێواز و، حەزکردن لە تەشبیهـ و، شەیدا بوونی ئەندێشە و، بایەخدان بە "سەروا".. هەموو یەکێکی ئەمانەش نەخۆشی‌یەکی تری وەکو ئەون. تەنانەت لە داهاتوودا - بە زیادەڕەوی تیایاندا - دەبنە نەخۆشی‌یەکی درێژخایەن، وەك ئێستا لە نیشانەکانیەوە دەردەکەوێ، بە ڕادەیەك کە لە پێناوی ئەو خۆشەویستی‌یەدا

---

(١) حەریری: ناوی تەواوی: قاسمی کوڕی عەلیی کوڕی محەممەدی حەریری‌یە، سالی (٤٤٦ك) لە بەسرە لە دایك بووە و سالی (٥١٦ك) هەر لەوێ کۆچی دوایی کردووە، ماوەیەکیش لە بەغدا ژیاوە. لە ڕۆژگاری خۆیدا بە مرۆڤێکی وریا و زیرەك و ڕەوانگۆ و ئەدیب و شارەزای نەحوو بەناوبانگ بووە. جگە لەو بوارانە، وانەی حەدیسی خوێندووە و، و لە فیقهیشدا یەکێکە لە زانایانی فیقهی شافیعی و لای خاوەنی (موهەزەب) "ئەبوو ئیسحاقی شیرازی" (٣٩٣-٤٧٦ك) خوێندوویەتی. دیوانێکی شیعر و چەند کتێبێکی تری هەیە، لەوانە: "مُلحة الأعراب" ، "دُرة الغـوّاص" هەروەها "مەقامات" کە بە (مەقاماتی حەریری) بەناوبانگە. ئەم وشەیەش کۆی "مەقامە"یە و، بریتی‌یە لە گێڕانەوەی چیرۆك یان بەسەرهاتێك لە بابەتێکی تایبەتیدا کە گەلێ قسەی نەستەق و پەندی جوان و شیعری ناوازە لەخۆ دەگرێت و لەسەر شێوەی پەخشانی "سەجع" دادەڕێژرێت. (وەرگێڕ)

"واتا" بەخت دەکرێت، تەنانەت هەندێ لە ئەدیبان خەریکن لە پێناوی نوکتەیەك یاخود تەواوکردنی سەروایەکی بەزایەڵەدا سنووری ڕەوشت و ئەدەب دەبەزێنن!

بەڵێ، "وشە" دەڕازێنرێتەوە..

بەڵام کاتێ سروشت و پێویستیی واتاکە داخوازی بێت.

"شێوەی هونەریی واتا" بەرز و مەزن ڕادەگیرێت و سام و شکۆی پێ دەبەخشرێ..

بەڵام کاتێ واتا ڕوخسەت بدات.

"شێواز" ڕووناك دەکرێتەوە و درەخشانیی پێ دەدرێت..

بەڵام کاتێ کە "ئامانج" ئامادەیی ئەوەی تێدا بێت و یارمەتیی بدات.

"تەشبیهـ" ناسك و شۆخ و شەنگ دەکرێت..

بەڵام گەر لەسەر پەیوەندیی بە مەبەستەکەوە بنیات نرابێت و، ئامانجی گوفتار پێی ڕازی بێت.

"ئەندێشە" دەبوژێنرێتەوە و گەشتی پێ دەکرێت..

بەڵام بە مەرجێ "حەقیقەت" ئازار نەدات و، لەسەر شانی قورس و قەبە نەبێت و، نموونەیەکی گوڵ بەدەمی "ڕاستی" بێت!

## مەسەلەی دووهەم

ژیان و گەشەکردنی "گوفتار" بەوە دەبێت کە واتاکان بەرجەستە ببن و، ڕۆح بەبەر بێ گیانەکاندا بکرێت، بەوەی کە لە ڕێی "سیحری بەیان"ەوە - کە دەرەنجامی هێزی ئەندێشەیە - گفتوگۆ بخرێتە نێوانیانەوە.. ئەو هێزی ئەندێشەیەی کە لەسەر بناغەی "فریودانی وەهم" بنیات نراوە و، ئەویش لەسەر بنچینەی "دەوەران" دامەزراوە (واتە گومانی ئەوەی کە دوو شت یەکێکیان هۆکاری بوون و نەبوونی ئەوی تر بێت، وەك ئەوەی لە بیروباوەڕ و عورفی خەڵکیدایە).

جا هەرکات "سیحری بەیان" لە گوفتاردا دەرکەوت، ئەوا بە وێنەی کاری جادووگەر ژیان دەکاتەوە بەبەر گوفتارەکاندا و، گفتوگۆیەکیان لەنێواندا ساز دەکات کە ئەنجامەکەی: یان "خۆشەویستی" یاخود "نەیاری" دەبێت. ئیتر واتاکان بەرجەستە دەکات و دەیانژێنێتەوە و گەرمیی غەریزە(ژیان)یان تێدا جێگیر دەکات.

ئەگەر دەتەوێ ئەمەت بۆ ڕوون بێتەوە، فەرموو بڕۆرە ناو ئەم بەیتەی کە شایستەی ئەوەیە پێی بوترێ "ماڵێکی پڕ لە هەرا و هوریا":

يُناجِينِيَ الإخلافُ من تحتِ مَطْلِه فتختصمُ الآمال واليأس في صدري[1]

واتە:

"بێ بەڵێنی" لە ژێر پەردەی تەفرەدان و دەستی دەستی لە حەقدا، پێم دەڵێ: "مەخەڵەتێ"! ئیتر "ئومێد" و "نائومێدییەکان" لەناو سینەمدا دەبێتە هەرایان و ئەو مەنزڵە شێواوەم دەڕمێنن.

---

(١) ئەم بەیتە هی "ابن المعتز"ە (٢٤٩ك/٨٦١ز-٢٩٦ك/٩٠٨ز). لە کتێبی "دلائل الإعجاز"ی "عەبدولقاهیری جورجانیدا ص ٦١ بەو دەقەی سەرەوە هاتووە، بەڵام لە دیوانی شاعیردا بەم جۆرەیە: (تجاذبني الاطراف بالوصْل والقلى.. هتد). بڕوانە: (ديوان ابن المعتز) ص: ٣١٥، شرح الدكتور شكري فرحات، دار الجيل، بيروت ط١، ١٩٩٥م. (وەرگێڕ)

دەبینی کە چۆن ئەم شاعیرە جادووگەرە نموونەی شەڕ و دژایەتیی بەوە هێناوەتەوە کە "ئومێد" و "نائومێدییەکان"ی بەرجەستە کردووە و، ژیانی تێدا بووژاندوونەتەوە و، خستوونیەتە ململانێ لەگەڵ ورووژێنەری ئاژاوەکەدا کە "بێ بەڵێنی"یە، بە ڕادەیەك کە ئەم دێڕە شیعرەی بە وێنەی دیمەنێکی سینەمایی لە پێش چاوی ژیریدا دەرخستووە..

بەڵێ، ئەم سیحری بەیانە جۆرێکی خەو لێخستن(التنويم)ە!

یان لەم بەیتەی خوارەوەدا گوێ لە سکاڵا و عیشقی زەوی بگرە بۆ باران:

تشكي الأرضُ غيبتَه إليه وترشُفُ ماءه رشفَ الرضاب[1]

دەبینی حاڵەتی مەجنوون و لەیلا دەخاتە پێش چاوی ئەندێشەت، ئەوەتا "زەوی" مەجنوونە و، "هەور"یش لەیلای دڵخوازیەتی.

**بێدارکردنەوەیەك:**

ئەو هۆکارەی کە ئەم شیعرەی جوان کردووە لێکچوونی "ئەندێشە"یە - تا ڕادەیەك - لەگەڵ "ڕاستی"دا. ئەوەتا زەوی گەر بارانی درەنگ لێ بباریت، گیزە و دەنگی هەڵمژینی ئاوی بارانەکەی لێ دێت لە دەمی هەڵمژینیدا.

جا ئەو کەسەی کە ئەم چەشنە حاڵەی زەوی دەبینێت، ئەندێشەی دەڕوات بۆ دواکەوتنی باران و پێویستیی زەویی بە باران بارین. ئنجا بەهۆی نەهێنیی "دەوەران" و دەست تێوەردانی "وەهم"ەوە، "ئەندێشە" دێت و، لە شێوەی عیشق و گفتوگۆی نێوانیاندا خۆی هەڵدەڕێژێت.

**ئاماژەیەك:**

هەموو "ئەندێشە"یەك دەبێ - بە وێنەی ئەمە - ناوکێکی "حەقیقەت"ی تێدا بێت.

---

(١) ئەم بەیتە هی "موتەنەبی"یە. بڕوانە: (ديوان المتنبي، ص: ١٥٨ دار الجيل، بيروت، دون تأريخ). "موتەنەبی" ناوی ئەحمەدی کوڕی حسەینە و، ساڵی (٣٠٣ك/٩١٥ز) لە کووفە لەدایك بووە. شاعیرێکی زۆر بە توانا و مرۆڤێکی یەکجار بلیمەت و زیرەك بووە. ساڵی (٩٤٨ز) ڕۆشتووە بۆلای میری حەلەب: "سەیفوددەولەی حەمدانی" و مەدحی کردووە، ئەویش ڕێزی لێ ناوە و ساڵانەی بۆ بڕیوەتەوە. لە ساڵی (٩٥٧ز)دا ڕۆشتووە بۆ دیمەشق و لەوێشەوە بۆ میسر. پاش ماوەیەك گەڕاوەتەوە بۆ عێراق و ڕۆشتووە بۆ بەغدا، لەوێوە بۆ وڵاتی فارس. دواتر لە سەرەتای مانگی شەعبانی ساڵی (٣٥٤ك)دا گەڕاوەتەوە بۆ بەغدا و ئنجا بۆ کووفە. لە ڕێگادا و لە بەرواری ٢٨/ڕەمەزان/٣٥٤ك-٢٧/٩/٩٦٥ز) خۆی و کوڕەکەی کوژراون. (وەرگێڕ)

## مەسەلەی سێهەم

پۆشاکی قەشەنگی هەر گوفتارێك، یان جوانی و شێوەکەی، لە "شێواز"ەکەیدایە، واتە لەو قاڵبەدایە کە تیایدا دارێژراوە..

چونکە "شێواز" بەهۆی بەدوایەکدا هاتنی پارچەکانی: "ئیستیعارەی تەمسیلی"[1] روون دەبێتەوە و، پێکدێت و، پاراو دەبێت.. کە ئەویش لە وێنە و شێوەکان پێکدێت.. کە ئەوانیش ئەنجامی چەند تایبەتمەندییەکن کە لە ئەندێشەدا مەیلیان بەلای یەکتردا هەیە.. کە ئەویش بەهۆی موتوربەکردنی هونەری رەوانکاری، یان پەیوەندی پێوەکردن، یان تێدا رۆچوون، یاخود وردیی تێبینییەوە، پەیدا بووە.

کەواتە "شێواز" - بەمەی باس کرا - قاڵبی قسە و گوفتارە و، کانگەی جوانی و، کارگەی پۆشاکە نایابەکانیەتی. وەك بڵێی خاوەن گوفتار بە ویستی خۆی "بانگ" دەکات، کە ئەو بانگەش "ژیری" بێدار دەکاتەوە و، بەوەش واتا نوستووەکانی ناو گۆشە تاریکەکانی "دڵ" بەخەبەر دێنێ و، بە رووتی و پەتی لەوێ دێنە دەرەوە و، دەڕۆنە ناو "ئەندێشە" کە شوێنی وێنە و شێوەکانە. ئیتر واتاکان لەوێ پۆشاکی ئەو وێنانە دەپۆشن کە لەو گەنجینەی ئەندێشەیەدا دەیبینن. ئنجا کە دێنە دەرەوە نیشانەیەکیان پێوەیە هەرچەندەش کەم بێت، دەبینی مێزەرێك لە سەری دەپێچێتەوە، یان سۆڵێك دەکاتە پێی، یاخود شەرواڵێك دەپۆشێ، لانی کەم وشەیەك دەکاتە بەر کە بەڵگە بێت لەسەر ئەوەی لەوێ پەروەردە بووە.

جا ئەگەر بە وردی سەرنجی شێوازی گوفتاری سروشتی بدەیت، ئەوا خاوەن گوفتار لەناو ئاوێنەی شێوازەکەیدا دەبینیت، تەنانەت دەڵێی خودی قسەبێژ لەناو هەناسە و

---

(١) ئیستیعارەی تەمسیلی لە رەوانبێژیی زمانی عەرەبیدا بەو جۆرە دەستەواژە مەجازییانە دەوترێ کە لەبەر نیشانە و هۆیەکی تایبەتی لە واتایەکی تری جگە لە واتا راستەقینەکەیاندا بەکارهێنراون و، زیاتر ئەو پەندانە دەگرێتەوە کە لەناو خەڵکیدا دەماودەمیان پێ دەکرێت. وەك ئەوەی کە دەڵێن: (برا لە پشت برا بێت، مەگەر قەزا لای خوا بێت)! (وەر گێڕ)

دەنگەكەیدایە و، ماهییەتەكەشی لە نەفەس و فووی ئەودایە و، پیشە و میزاجەكەشی تێكەڵ بە گوفتاری بوون..

خۆ ئەگەر لە ئەندێشەتدا بەم شێوەیە بیری لێ بكەیتەوە، ئەوا هەرگیز لە ڕێچكەی "خەیاڵی"یەكاندا سەرزەنشت و گلەییت ئاراستە ناكرێت.

ئەگەر سەبارەت بەمە هەر "نەخۆشییەكی گومان" لە ئەندێشەتدا هەیە، فەرموو سەردانی نەخۆشخانەی "قەسیدەی بوردە" بكە و، ببینە كە چۆن "بووصیری"ی دانا و پزیشك ڕەچەتەكەی بە "فرمێسك ڕشتن" و پاریزی "پەشیمانی" نووسیوە:

واستفرغ الدمعَ من عينٍ قد امتلأتْ   من المحارمِ والزمْ حميةَ النَدَمِ(١)

خۆ ئەگەر پێت خۆش بوو ئاوی سازگاری واتا لە پەرداخی حەقیقەت( واتە شێواز)دا بنۆشیت و، ببینیت كە چۆن تێكەڵ بە یەك دەبن، ئەوا بڕۆ بۆلای "بادەفرۆش" و لێی بپرسە:

گوفتاری ڕەوان كامەیە؟

بێ گومان، بە هاندەرێتیی پیشەكەی، پێت دەڵێ:

ئەوەیە كە لە مەنجەڵی زانستدا كوڵابێت و، لەناو كووپەی دانستدا مابێتەوە و، بە پاڵێوەری تێگەیشتن پاڵێورابێت و، بادەگێرانی شۆخ و شەنگ گێڕابێتیان و، بیرو هزرەكان نۆشیبێتیان و، نهێنییەكانی بەناودا ڕۆشتبێت و، هەستەكانی پێ هاتبنە لەرزە و لەرینەوە!

خۆ ئەگەر قسەی ئەو مەستانەت بەدڵ نەبوو، فەرموو گوێ لە ئەندازیاری ئاو (پەپووی حەزرەتی سلێمان - دروودی لەسەر بێت) ڕابگرە لەو هەواڵەیدا كە لە سەبەئەوە هێنایەوە، بزانە كە چۆن وەسفی ئەو خواوەندە دەكات كە قورئانی بۆ مرۆڤ ناردووە و ئاسمانەكان و زەویی داهێناوە.. ئەوەتا "پەپووسلێمانە" دەڵێ:

"قەومێكم دی سوجدەیان نەدەبرد بۆ ئەو خوایەی كە شارراوەی ئاسمانەكان و زەوی دەهێنێتە دەر"!

---

(١) ئەم بەیتە هی شاعیری بەناوبانگ "محەمەدی كوڕی سەعیدی بووصیری"یە (٦٠٨-٦٩٦ك/ ١٢١٢-١٢٩٦ز) لە قەسیدەی "بردة المديـح"دا. بڕوانە: (ديوان البوصيري، ص: ٢٢٨، دار المعرفة، بيروت، ١٤٢٨هـ/٢٠٠٧م). (وەرگێر)

سەرنج بدە کە چۆن لە نێوان وەسفە "کەمالی"یەکانی خوای گەورەدا ئەوەیانی هەڵبژارد کە ئاماژە بۆ ئەندازیاریێتیی پەیوسلێمانە دەکات!

**ئاماژەیەك:**

مەبەستم لە "شێواز" قالب و شێوەی گوفتارە.. کەسانی تر هەن مەبەستیان لە "شێواز" شتی ترە.

سوودی ڕەوانبێژیی گوفتاریش ئاوێتەبوونی پارچە پەرش و بڵاوەکانی چیرۆك و بەسەرهاتە، تاکو بەپێی دەستووری "إذا ثبتَ الشيءُ ثبتَ بلوازمِهِ" تەنها بە جووڵاندنی هەر بەشێکی ئەو چیرۆکە هەموو چیرۆکەکە بلەرێتەوە. چونکە ئەگەر قسەبێژ چمکێکی شێوازەکەی بداتە دەست گوێ بیست، ئەوا ئەو گوێ بیستە دەتوانێ بۆخۆی - تەنانەت گەر هەندێ تەماوی و لێڵیش بێت - هەمووی ببینێت..

بڕوانە - بۆ نموونە - لە هەر شوێنێکدا وشەی "زۆران" هەبێت ئەوا وەکو پەنجەرەیەك وایە مەیدانی جەنگت پیشان دەدات!

بەڵێ، گەلێ وشەی وەکو ئەمانە هەن کە ئەگەر لەبارەیانەوە بوترێ:

"ئەوانە چەند دیمەنێکی سینەمای ئەندێشەن" ئەوا هیچ سەرزەنشتێکی تێدا نابێت!

**وریاکردنەوەیەك:**

پلەکانی "شێواز" تابلێی جیاوازن. هەندێکیان لە شنەی دەمی بەیان نیانترو، بەشێکی تریان لە فرت و فێڵی بلیمەتانی جەنگی ئەم ڕۆژگارە پەنهانترن؛ کەسانی زیرەك و بلیمەت نەبێ بۆنی ناکات. وەك ئەوەی کە "زومەخشەری" لە ئایەتی پیرۆزی: ﴿مَنْ يُحْيِي الْعِظامَ وهيَ رَميم﴾؟(يس:٧٨) بۆنی شێوازی کەسێکی کردووە کە ڕۆشتبێتە مەیدانی جەنگەوە!

بەڵێ، کەسێ لە فەرمانی خوای گەورە بەلەسە و یاخی بووبێت، لە واتا و ناوەرۆکدا، زۆرانبازی لەگەڵ بەدیهێنەری خۆیدا دەکات!

## مەسەلەی چوارەم

هێز و توانای گوفتار لەوەدایە کە بەستێن(قید)ەکانی بەدەم خواستی یەکترەوە برۆن و، چۆنێتییەکانیش یەك بکەون و، هەریەکەیان بە ئەندازەی خۆی یارمەتیی ئەوی تر بدات و، ئاماژە بۆ مەبەستە سەرەکییەکە بکات و، پەنجە لەسەر ئامانجی گوفتارەکە دابنێت. ئەو کاتەش نموونەیەك دەبێت بۆ هاتنەدیی دەستووری:

عباراتُنا شَتّى وحسنُكَ واحدٌ وكُلٌّ إلى ذاكَ الجمالِ يُشيرُ

وەك بڵێی بەند و بەستێنەکان لەو گوفتارەدا دۆڵ و شیوی لافاو بن و، ئامانجەکانیش گۆمێك بن لە ناوەڕاستیاندا ئاوی لەوانەوە بۆ بچێت!

**ئەنجامی ئەم قسانە:**

بەدەم یەکەوە چوون و، هاوکاری و، یارمەتیدان (لە نێوان پێکهێنەرەکانی گوفتاردا) کارێکی پێویستە، تاکو شێوەی ئامانجەکە نەئاڵۆزێ، کە بە ڕوانینی ژێری وێنەی گیراوە و لەسەر تۆڕی زەین دەرکەوتووە و پیشان دراوە.

**ئاماژەیەك:**

هەر بەهۆی سەرهەڵدانی "ڕێکوپێکی" لەم خاڵەوە "هاوڕێژەیی" پەیدا دەبێت و، "جوانی"ش بە درەخشانی دەردەکەوێت.

ئەگەر دەتەوێت لەمە تێبگەیت ئەوا فەرموو سەرنج لەم گوفتارەی پەروەردگاری شکۆمەند و بەتوانا بدە کە دەفەرموێ: ﴿وَلَئِن مَّسَّتْهُمْ نَفْحَةٌ مِّنْ عَذَابِ رَبِّكَ...﴾ (الأنبياء:٤٦) کە بە مەبەستی دەرخستنی گەورەیی سزای دۆزەخ و، مەترسی خستنە پێش چاوی مرۆڤ و، ناساندنی بە دەستەوسانی و لاوازیی خۆی، هێنراوە.

جا بەپێی ئەو دەستوورەی "ڕەوانکاری" کە دەڵێت: "دژ لە دژەکەیدا ڕەنگ دەداتەوە و دەردەکەوێت" دەبینی ئەم ئایەتە پیرۆزە بە نیازی گەورە پیشاندانی ئەو سزایە و ترساندنی مرۆڤ، دەچێ کاریگەریی کەمترینی ئەو سزایە دەردەخات. ئەوەتا

هەموو چمكێكی ئەم گوفتارە پشتی ئەو مەبەستە دەگرێت و بە دەمیەوە دەڕوات.. بەم جۆرەی خوارەوە:

گومان دروست كردن و دەرخستنی كەمیی ئەو سزایە لە وشەی "إِنْ"دا ..

بەكارهێنانی وشەی "مَسَّـــتْ" كە بەركەوتنێكی كەمە، نەك پێكان و ڕۆشتنە ناو دۆزەخ..

كەمكردنەوە و سووكەڵە پیشاندانی سزاكە لە ماددەی "نَفْحَــــةٌ" و، صیغەكەی و، بەكارهێنانی لە شێوەی وشەی نەكیرە(نەناسراو)دا..

ئاماژەدان بە "هەندێك"ی ئەو سزایە لە وشەی "مِنْ"دا..

كەم دەرخستن و سووك كردنەوەی سزاكە لە ڕێی بەكارهێنانی وشەی "عَــذاب" لە بریی "نَكال"..

ئاماژەی میهرەبانیش لە وشەی "رَبِّكَ"دا..

هەموو ئەمانە، لە ڕێی پیشاندانی "كەمی"ی سزاكە، مەزنی و گەورەیی ئەو سزایەیان دەرخست، چونكە ئەگەر ئەندازە كەمەكەی ئاوا بێت، دەبێ گەورەكەی چۆن بێت؟

لە خوای گەورە دەپاڕێینەوە كە بمانپارێزێت لە سزای خۆی.

**وریا كردنەوەیەك:**

ئەمە نموونەیەكی سەرمەشقە هێنامانەوە بۆت، ئەگەر دەتوانی بۆ خۆت مەشقی لەسەر بكە، چونكە هەموو ئایەتەكانی قورئان ئەم "ڕێكوپێكی" و "هاوڕێژەیی" و "جوانی"یەیان بە درەخشانی پێش چاو خستووە.

بەڵام هەندێ جار ئامانج و مەبەستەكان تێهەڵكێشی یەكتر دەبن و زنجیرەیەك پێكدەهێنن و، هەندێكیان لەچاو هەندێكی تردا - بێ هیچ ئاڵۆزی و تێكەڵ بوونێك - لەو شوێنەدا دەبێتە پاشكۆی ئەوی تر.

لەبەر ئەوە، دەبێ بە وردی و وریایی سەیر بكرێن، چونكە زۆر جار ڕوانینی سەرزارەكی و ڕێبوارانە لەم شوێنانەدا پێیان دەخلیسكێ.

## مەسەلەی پێنجەم

سوودی بناغە و شێوەی پێکهاتنی گوفتار هەروەك بۆ خودی مەبەستەکەیتی.. سامان و فراوانی‌یەکەشی لەوەدایە کە پێداویستی‌یەکانی ئەو مەبەستە و پاشکۆکانی ڕوون بکرێنەوە و، بە "تیلایی چاو" شوێنکەوتەکانی و، بە "ئاماژە"ش شێوازەکانی بلەرێنرێتەوە..

چونکە "تیلنیشان"(التلميح) یان "ئاماژە"(الإشارة) بناغەیەکی گرنگە بۆ هەژاندنی ئەندێشە سرەوتەکان و خستنە گۆی لایەنە کپ و بێ دەنگەکانی. ئیتر پەسەند کردن و نرخ شناسیی ئەو گوفتارە لەوپەڕی گۆشەکانی دڵدا دەورووژێنن.

بەڵێ، "تیلنیشان" یاخود "ئاماژە" تەنها بۆ بینین و خوێندنەوەی چمك و لێواری ڕێگایە، نەك بۆ ئەوەی لە خۆیدا مەبەست بێت و، داوا بکرێت و، دەستی تێوەربدرێت. بەو واتایەی کە قسەبێژ لەوانەدا بەرپرس نی‌یە.

گەر پێت خۆشە ئەمەت بۆ ڕوون ببێتەوە، ئەوا بڕۆرە ناو ئەم بەیتانە، تاکو بۆ خۆت ئەو شتانە ببینیت کە شایانی بینینن:

فەرموو سەیری تاڵە سپی‌یەکانی ڕیشی ئەو پیرە بکە لەو کاتەدا کە ویستی بە سواری ئەسپەکەیەوە لاوچاکیی خۆی لە پێش چاوی کیژێکی شۆخ و شەنگدا بنوێنێت! گەلێ کلیلی ڕەوانبێژیی تێدا دەبینیت..

دەسا فەرموو.. دەرگاکان لەسەر پشتن، بیانکەرەوە:

قالتْ كبرتَ وشبتَ قلتُ لها هذا غبارُ وقايعِ الدهرِ[1]

هەروەها:

(١) ئەم بەیتە هی (ابن المعتز)ە. کتێبی: (أسرار البلاغة) ص٣٢٢ بە نموونە هێناویەتەوە. واتە: ئەو کیژە پێی وتم: گەورە و پیر بوویت. پێم وت: ئەوە تەپوتۆزی ڕووداوەکانی ڕۆژگارە! بڕوانە: (ديوان ابن المعتز) ص: ٣٤٠، شرح الدكتور شكري فرحات، دار الجيل، بيروت ط١، ١٩٩٥م. (وەرگێڕ)

ولا يروعْكَ إيماضُ القَتيرِ بهِ    فإنَّ ذاكَ ابتسامُ الرأي و الأَدَبِ[١]

واته:

ڕەنگی ئەو چەند تاڵە مووە سپی‌یە تۆ نەترسێنێت، ئەوە ڕوونـاکیی ئەدەب و ژیری‌یە لە مێشکەوە بەسەر ڕیشمدا ڕژاون!

هەروەها:

وعينُكَ قد نامَتْ بليلِ شبيبَةٍ    فلمْ تنتَبِهْ إلاّ بصبحِ مَشيبِ[٢]

هەروەها:

وكأنَّما لَطَمَ الصَّباحُ جبينَه    فاقتَصَّ مِنه فخاضَ في أحشائِهِ[٣]

ئەم شاعیرە وەسفی ئەسپەکەی دەکات و دەیەوێ بڵێت:

مـارۆی ناوچـاوانی ئەسپەکەم هـی ئەوەیـە سپێدەی بـەیان زللـەی لـێ داوە، ئـەمیش تۆڵەی خۆی لـێ سەندەوە و بە هـەرچوار پـەلی ڕۆشـتە نـاو هـەناوی ئـەو سپێدەیە و، بـەو بۆنەیەوە پەلەکانی ڕەنگی سپی‌یان گرت!

---

(١) ئەم شیعرە هی (أبو تمام)ە، مەدحی (حەسەنی کوڕی سەهل)ی پێ دەکات کـە خـەزوور و وەزیـری "مەئموون" بووە. لە چاپە جیاجیاکانی دیوانەکەیدا وشەی یەکەمی بەیتەکە بەم جۆرەیە: (فلا يؤرقْـك) ، (ولا يؤرقْك). بۆ نموونە بڕوانە: (شرح الصولي لديوان أبي تمام) ص: ٢٢٣ دراسة وتحقيق: خلف رشيد نعمـان. الطبعة الأولى، وزارة الإعلام، العراق، ١٩٧٧. هەروەها (شرح ديوان أبي تمام) ١/٥٤، شرح وتقديم: إيمان البقاعي مؤسسة الأعلمي للمطبوعات. بيروت ١٤٢١هـ/٢٠٠٠م. (وەرگێڕ)

(٢) واته:

کاتێ چاوت نوست "لاوی"ی بوو بە شەو    سپێدەی "پیری" جا هەڵتسا لە خەو

دوای گەڕانێکی زۆر بۆم ساغ نەبووەوە ئەم بەیتە شیعرە هی کێیە. بەڵام ڕێم لە دوو بەیتی تر کەوت کە لەم بەیتەوە نزیکن. یەکەمیان هی "أيمن بن محمد الغرناطي"یە، کە ئەمە دەقەکەیەتی:

تناومتُ في أطلال ليلي شبيبتي    فأدركني بالفجر صبح مشيبي

دووهەمیان هي "ابن زمرك"ە و بەم دەقە هاتووە:

وكل مَن نام بليل الشباب    يوقظه الدهرُ بصبح المشيب.

بڕوانە: کتێبی (نفح الطيب في غصن الأندلس الرطيب) دانراوی (أحمد بن المقـري التلمسـاني) چاپی "دار صادر، بيروت". دەقی یەکەمیان: ٣٤٢/٤، دووهەمیان: ٧٥٦/٤. (وەرگێڕ)

(٣) ئەم شیعرە هی (ابن نباتة السعدي)یە لە وەسفی ئەسپێکدا کە "سيف الدولـة" بە دیاری پێی بەخشی. بڕوانە: (ديوان ابن نباتة السعدي) ٢٧٤/١، چاپی (دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٧٧م) هەروەها: "أسـرار البلاغة"ص٣٢٥. (وەرگێڕ)

هەروەها:

كأنَّ قَلْبي وشاحاها إذا خطَرَتْ     وقَلْبَها قُلْبُها في الصَّمْتِ والْخَرَسِ(١)

واته:

"دڵی شاعیر" بە وێنەی كەمەربەندی ناوقەدی دڵخواز لە جووڵە و خورپەدایـە، بـەڵام "دڵی ئەو" بە وێنەی بازنەكانی دەست و مەچەكی كپ و بێ دەنگە. جا ئەگـەر دڵـم لـە تاسەی ئەو مەچەكە توندوتۆڵ و قەدە باریكەدا بێت، ئەوا دڵی ئەو لە من بێ نیازە!

دەسا بڕوانە كە چۆن ئەم شاعیرە: عیشق و، جوانـی و، تاسـەمەندی و، بێ نیـازیی لـە یەك بەیتدا كۆكردەوە!

هەروەها:

وألقى بصحراءِ الغبيطِ بعاعَه     نزولَ اليَماني ذي العُيابِ الْمُحَمَّلِ(٢)

واته:

ئەو لافاوەی كە باران هەڵیساند بە وێنەی بازرگانی یەمەنی كەرەسە و شمەكەكانی لە بیابانی "غەبیت"دا هەڵدایەوە و خستیە پێـش چـاو، ئیـتر گوڵـەكان ڕەنگـی ئـەو كەرەسـە بازرگانی‌یە جۆراوجۆرەیان گـرت كـە تێكـەڵێكی ڕەنگـاوڕەنگ و پۆشـاكی نەخشـین و ڕازاوەیە، بەڕادەیەك كە ترۆپكی ئەو گوڵانە ڕەنگیان سوور هەڵگەڕاوە، وەك ئەوەی كـە ئەگـەر بازرگـانێك دەمـەو ئێـوارە بڕواتـە گوندێـك و، خـەڵكی گونـد شمەكـە ڕەنگاوڕەنگـەكانیان لـێ كـڕی، دەمـەو بـەیانی هەریەكـەیان بـە پۆشـاكی جـوان و جۆراوجـۆر لـەماڵـەكانیان دێنـە دەرەوە، تەنانـەت شوانەكەشـیان ناوچـەوانی بـە سەروپێچێكی سوور دەبەستێت!

---

(١) ئەم شیعرە هی (مسلم بن الولید)ە كە ناسراوە بە (صریـع الغوانـي) و سـاڵی (٢٠٨ك) لـە دنیـا دەرچـووە. بڕوانە: (شرح دیوان صریع الغواني مسلم بن الولید الأنصـاري) ص: ٣٢٥، تحقیـق الدكتور سـامي الدهـان، الطبعة الثانیة، نشر دار المعارف بمصر، ١٩٧٠م. (وەرگێڕ)

(٢) ئەم شیعرە هی شـاعیری جـاهیلی "امـرؤ القیـس"ە. واتـە هـەروەك ئەم بازرگانـە یەمەنی‌یـە كەرەسـە و پۆشاكەكانی لەسەر زەوی هەڵڕشـت و هەریەكـەیان بـە ڕەنگێـك بـوون، باراناوەكـەش ڕووەك و گوڵزارێكـی ڕەنگاوڕەنگی وەك ئەوی سەوز كرد و سەر ڕووی زەویی پێ خەملاند. بڕوانە: (شرح القصائد السبع الطـوال الجاهلیات لابن الأنباري. تحقیق عبد السلام هارون. دار المعارف، ص: ١٠٨) هەروەها: (شرح المعلقـات السبع للزوزني، ص: ٤٠ طبعة: (دار صادر بیروت) ١٣٧٧هـ/١٩٥٨م. (وەرگێڕ)

هەروەها:

غارَ الوفاءُ وفاضَ الغدرُ وانفَرَجَتْ     مسافةُ الْخُلْفِ بينَ القَولِ والعَمَلِ[١]

واتە: "وەفا" نەما و ڕۆشت بە ناخی زەویدا.. "غەدر"یش هێندە زۆر بوو کە لافاوی لێ هەڵسا.. جیاوازیی نێوان کردار و گوفتاریش مەودایەکی فراوانی تێکەوت.

ئەگەر دەتەوێ ئەم باسەت زیاتر بۆ ڕوون ببێتەوە، ئاوڕ لە پێش ئەم وتارە بدەرەوە، گەلێ نموونەی زۆر لەبارەیەوە دەبینیت.. یەکێك لەوانە ئەوەیە:

(کلیلی بەڵگەکانی ئیعجازی ئایەتەکان و دەرخەری نهێنیی ڕەوانبێژی تیایدا بریتییە لە ڕەوانبێژی زمانی عەرەبی، نەك فەلسەفەی یۆنانی)[٢]..

یان سەردانی ئەو ئاماژەیە بکە لە کۆتایی مەسەلەی یەکەمی وتاری یەکەمدا، لەوێ دەبینی کە:

(شەریعەتی داهێنانی سروشت ئەوەی بەسەر زەویی حاڵ لێهاتووی گەشتیاردا سەپاندووە کە لە ڕیزی ئەو ئەستێرانە لانەدات لە پشت سەری خۆرەوە ڕیزیان بەستووە.. ئەوە بوو زەوی لەگەڵ هاوتاکەیدا وتیان: ﴿أَتَيْنَا طَائِعِينَ﴾ (فصلت: ١١). واتە لە وەڵامی خوای گەورەدا وتیان: "بە گوێڕایەڵی و ملکەچییەوە بەرەو پیریی فەرمانی تۆ هاتین". خۆ گوێڕایەڵیش بە دەستە و لەناو کۆمەڵدا بێت باشترە لەوەی کە بە تەنها بێت)[٣].

ئیتر تۆش بیر لەم نموونانە بکەرەوە، چونکە هەموو یەکێکیان، لە بەردەم و پشتەوەیدا، چەندین پلە و مەقامی ئەوتۆت پیشان دەدات کە پلە و پایەی تریان لە پشتەوە دەربکەوێت.

---

(١) ئەم بەیتە هی "حسەینی کوڕی عەلیی کوڕی محەممەدی توغرائی"یە (٤٥٣-٥١٢ ك) لە "قەسیدەی لامیە"ی بەناوبانگدا. لە دیوانەکەیدا (ل: ٥٦ ط١ استانبول ١٣٠٠ هـ) هەروەها لە: "الغيثُ الْمُسْجَم شرح لامية العجَم، لصلاح الدين الصفَدي: ٣٤٣/٢، دار الكتب العلمية، بيروت - ١٩٧٥)دا لە بری "غار الوفاء" نوسراوە: "غاض الوفاء". (وەرگێڕ)

(٢) بڕوانە لاپەڕە (١٥٠)ی ئەم کتێبە. (وەرگێڕ)

(٣) بڕوانە لاپەڕە (١١٢)ی ئەم کتێبە. (وەرگێڕ)

## مەسەلەی شەشەم

بەروبوومەکانی گوفتار بریتین لەو واتایانەی کە لە چەند شێوەیەکی جۆراوجۆردا دەردەکەون و، لەناو چەند چینێکی جیاجیادا هەڵدەقوڵێن..

هەروەك کیمیاگەران ئاگادارن، بۆ بەدەستهێنانی "زێڕ" دەبێ بەناو لوولەکانی چەند کارگەیەکی جۆراوجۆردا ببرێت و، بە چەند شێوەیەکی جیاجیا لە بنکی ئەمبیقەکاندا و بە چەند چینێك و بە چەندەها شکڵ و شێوەی جیاواز لەوانی تر بنیشێت، هەتا لە کۆتاییدا هەندێ "زێڕ"یان لێ بەدەست دێت..

هەروەك "زێڕ" بەم جۆرە بە دەست دەهێنرێت، "گوفتار"یش بە هەمان جۆرە، کە پوختە نەخشەیەکە لە وێنە و شێوەی واتا جیاجیاکان وەرگیراوە. چونکە "واتا" و "چەمکە" جۆراوجۆرەکان بەم شێوەیەی خوارەوە شکڵ و شێوەکانیان پێکدێت:

کاتێ کە بەهۆی چەندین کاریگەری دەرەکی، هەندێ لە هەست و نەستەکانی دڵ دەلەرێنەوە، "مەیل و ئارەزووەکان" پەیدا دەبن و، چەند واتایەکی چەشنی "هەوا"یان لێ پێکدێت و خۆیان بە ڕوانینی ژیریدا هەڵدەواسن، بەوەش سەرنجی ژیری بۆ لای خۆیان ئاراستە دەکەن.. پاشان بە چڕبوونەوەی بەشێك لەو واتایەی کە وەك هەڵم وایە هەندێ لە مەیل و بۆچوونەکان بە هەڵواسراوی دەمێننەوە.. پاشان بە پاڵاوتن و دڵۆپاندنی بەشێکی تریان حەزی "ژیری" بەلایدا دەڕوات.. پاشان بەشە تواوە و شلەکە لەو وەردەگیرێت و، ئنجا ڕەق و پتەو دەکرێت، ئیتر "ژیری" دەیخاتە ناوەندی گوفتارەوە.. پاشان لەبەر ئەوەی ئەو بەشە توند و پتەو بووە لە وێنەیەکی تایبەتیدا دەردەکەوێت، ئەوا "ژیری" بە گوفتارێکی تایبەت بە قەد و باڵای خۆی دەری دەخات..

بەو واتایەی کە:

"ژیری" لە ناوەندی شێوەیەکی تایبەتیی گوفتاردا واتای بەرجەستە وەردەگرێت..

خۆ ئەگەر ئەو واتایە هێشتا ڕەق و پتەو نەبوو، بەڵکو هەر لە دۆخی شلیدا مابووەوە، ئەوا ژیری دەیسپێرێت بە ناوەرۆك (الفحوی)..

ئەگەر لە ئەنجامی پالاوتن وەرنەگیرابێت، ئەوا "ژیری" دەیخاتە ئەستۆی ئاماژەکانی گوفتار و چۆنێتی‌یەکانی..

ئەگەر هەر نەپالێورابێت، دەیگێڕێتەوە بۆ شوێنکەوتەکانی گوفتار..

ئەوەش کە نەبوو بێت بە هەڵم، دەیبەستێتەوە بە لەرینەوەکانی شێواز و، بار و چۆنێتی‌یەکانی قسەبێژ لە دەمی گوفتاریدا.

هەر لەم سەرچاوەیەوە:

ناولێنراوی "ئیسم" و، واتای "فیعل" و، چەمکی "حەرف" و، ناواخنی دەفری "هۆنین" و، واتای "ڕوخسار" و، هێما بۆکراوی "چۆنێتی" و، ئاماژە بۆکراوی "شوێنکەوتەکان" و، بزوێنەری "بارودۆخە هاوهەنگاوەکانی گوفتار" و، ئامانجی "گەیەنەر بە دەستەواژە" و، چەمکی "گەیەنەر بە ئاماژە" و، چەمکی قیاسیی "گەیەنەر بە ناوەرۆك" و، واتای پێویستی "گەیەنەر بە داخوازی" و.. چەمکەکانی تری هاوشێوەیان هەڵدەقوڵێت و، هەریەکەیان لە چینێکی ئەم زنجیرەیە گرێ دەبەستێ..

ئەگەر تاسەمەندی زانینی ئەمەیت، ئەوا سەیری ویژدانی خۆت بکە، هەموو ئەم پلانەی تێدا دەبینیت..

ئەوەتا ئەگەر خۆشەویستەکەت لە ڕێی پەنجەرەی "چاو"ەوە تیشك و بریسکەی جوانیی خۆی هاویشتە ناو ویژدانت، ئەوا ڕاستەوخۆ ئەو ئەوینەی کە پێی دەوترێ "ئاگری داگیرساو" سەرجەم هەستەکانت دەسووتێنی و گڕی تێبەردەدات. ئیتر ئاوات و حەز و مەیلەکان دەوروروژێن و، ڕاستەوخۆ بنمیچی ئەو ئەندێشەیە کوناودەر دەکەن کە لە چین و نهۆمی بالادایە، ئەویش هاواری فریاگوزاریی لێ بەرز دەبێتەوە..

ئنجا ئەو ئەندێشانەی کە جوانی‌یەکانی خۆشەویستیان بە دەستەوە گرتووە، یاخود لە جوانیی غەیری ئەو خۆشەویستە تێر بوون، بەرەو پێشوازیی ئەو ئاواتانەوە دەڕۆن و، پێکەوە هێرش دەبەن و، لەو ئەندێشانەوە ئاواتەکان بەرەو "زمان" دەردەچن و، مەیلی ویساڵی زوڵاڵی خۆشەویستیش بە دوای خۆیاندا دەهێنن!!

ئنجا لە لای ڕاستیانەوە: نازەکانی جوانی و، لە لای چەپیانەوە: مەزن ڕاگرتن و ئەدەب نواندن و تاسەمەندی و، لە بەردەمیشیاندا: جوانی‌یەکانی خۆشەویست دادەنێن کە داخوازی سۆز و بەزەیین، ئیتر سڵاوی سەنا و ستایشی خۆشەویست بڵاو دەکەنەوە و، ملوانکەی مەدح و پیاهەڵدانی بۆ دەهۆننەوە کە لە هەموو ئەمانەوە

دەردەکەون و، لە ڕێی وەسفی ئەو چاکەکاریانەی کە هۆکاری بەدەستهێنەری زوڵاڵی ئەو ویساڵەن، ئاگری هەڵگیرساوی سەر دڵەکان دەمرکێننەوە!

دەسا بڕوانە کە جگە لەو چینانەی کە خۆت دەیانزانیت، چەند "واتا"ی تر سەریان بەرز کردەوە؟!

جا ئەگەر ترست نییە، ئەوا بۆ "ویژدان"ی هەر یەك لە (ابن الفـــارض)[١] و (أبــو الطيب)[٢] بڕوانە کە زیاتر لە "چاو"یان سەرسام ماوە! دە فەرموو بیر لەم بەیتانە بکەرەوە کە ناخی ویژدانیان دەخاتە ڕوو:

غَرَسْتُ باللَّحْظِ ورداً فوقَ وجنَتِها    حقٌّ لِطَرْفِيَ أنْ يجنِيَ الذي غَرَسَا[٣]

هەروەها:

فَلِلْعَيْنِ والأحشاءِ أوَّلَ (هَلْ أَتَى)    تَلا عائِدي الآسي وثالثَ (تَبَّتِ)[٤]

هەروەها:

صدٌّ حَمى ظَمَأي لَماكَ لِماذا    وَهواكِ قلبي صارَ منه جُذاذا[٥]

هەروەها:

---

(١) (ابـــن الفـــارض): ناوی "عومەری کوڕی ئەبولحەسەن"ە و، لە بنەچەدا خەڵکی "حەما"یە. سالی (٥٧٦ك/١١٨١ز) لە میسر لەدایك بووە و هەر لەوێش ژیاوە. لە شیعرەکانیدا ڕێچکەی "سۆفیێتی"ی گرتووەتەبەر. سالی (٦٣٢ك/١٢٣٤ز) لە قاهیرە کۆچی دوایی کردووە. (وەرگێڕ)

(٢) مەبەست "موتەنەبیی"ی شاعیرە، کە پوختەی ژیانەکەی لە ل (١٥٨)دا ڕابورد. (وەرگێڕ)

(٣) ئەم شیعرە هی (ابن الفارض)ە. واتە:

چاوم گوڵزاری لەسەر گۆنای چاند    حەقیە دروێنەی هەرچێکی ڕواند

لە دیوانەکەیدا لە بریی "وجنتها" نووسراوە: "وجنته". بڕوانە: (ديوان ابن الفـــارض ص: ١٧٧، چاپی (دار صادر، دار بيروت). لبنان، ١٣٨٣هـ/١٩٦٢م. (وەرگێڕ)

(٤) ئەم شیعرە هی (ابن الفارض)ە. لەم بەیتەدا دەیەوێ بڵێ: هێندە خەفەتی بۆ خۆشەویستەکەی خواردووە هەتا پووکاوەتەوە و شتێکی ئەوتۆی نەماوە، دڵ و هەناویشی بە ڕادەیەك ئاگری ئەوینی تێبەربووە کە پێی دەوترێ: ئەبوو لەهەب، واتە ئاگری بە بڵێسە! بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو، ص: ٤٢. (وەرگێڕ)

(٥) ئەم شیعرە هی (ابن الفارض)ە. (لَما: اللَّمى: سمرةٌ مستحبة في الشـــفاه. واتە: گەنم ڕەنگیی لێوە، کە بەلایانەوە جوانە). (وهواك: پیتی واوەکە یان حەرفی عەتفە، یان حەرفی جەرە و بۆ قەسەمە) واتای بەیتەکە: (بۆچی ڕێت لێ گرتم و نەتهێشت بگەمە لێوەکانت؟ خۆ ئەوینی تۆ دڵی منی لەت لەت کردووە.. یان سوێند بە ئەوینت! دڵم بۆ هەڵمژینی ئاوی ئەو دەم و لێوە پارچە پارچەیە). بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو، ص: ٢٦، هەروەها: (شرح ديوان ابن الفارض، شرح وتحقيق: عبد القادر محمد مايو، ط١: ٢٠٠١، دار القلم العربي، حلب، سورية. ص: ٦٣ . (وەرگێڕ)

حَشايَ عَلى جَمرٍ ذَكِيٌّ مِنَ الْغَضا      وعيناي في روضٍ مِن الْحُسن ترتَعُ[(١)]

ئیتر بۆ خۆت ببینه و ببیسته كه چۆن چاوانیان لەناو بەهەشتێكدا گەشت دەكات و، لە هەمان كاتیشدا دۆزەخی ویژدانیان بە سۆی ئازارەوە دەتلێتەوە!

شاعیرەكان گەلێ ئەندێشەی تابلێی نەرم و ناسكیان دەرخستووە لە رێی ئاماژە كردن بۆ خۆشەویست و، هێمادان بە بێ نیازیی ئەو خۆشەویستە و، ئاماژەدان بە ئازاری جودایی و، باسكردنی راشكاوانەی تاسە و شەوق بۆ خۆشەویستان و، ئاماژەی داوای ویسالْ و، دان نان بەو خۆشەویستی‌یەدا كە سۆزی خۆشەویست بهەژێنێ، هاودەم لەگەڵ باسی ئەو بار و چۆنێتی‌یانەش كە هەستەكانی مرۆڤ دەبزوێنن.

**ئاماژەیەك:**

هەروەك لە رێسای هەر دەولەتێكدا دەبێ مووچە و پاداشتی كارمەند بە گوێرەی كارەكەی و، بە ئەندازەی خزمەتگوزاری‌یەكانی و، بەپێی توانا و لێهاتنەكانی بێت..

بە هەمان جۆر، دەبێ چاودێری و بایەخدان بە "واتاكان" بە جۆرێكی دادگەرانە دابەش بكرێن، بە شێوەیەك كە هەریەك لەو واتا چڕ و جەنجاڵ و شان بە شانانەی یەكتر، كە لەم چەشنە پلە جۆراوجۆرانەدان، بە رێژەی نزیكیی لە مەڵبەندی ئەو ئامانجە بنەرەتی‌یە هەمەكی‌یەی كە گوفتارەكەی لە پێناودا هێنراوە و، بە رێژەی خزمەتكردنی بۆ ئامانجە سەرەكی‌یەكە، بەشی خۆی وەربگرێت، تاكو لەو هاوكێشەیەوە: رێكوپێكی و، لەویشەوە: تەناسوب و، لەویشەوە: جوانیی یەككەوتن و، لەویشەوە: جوانیی پێكەوە بوون و، لەویشەوە: تەرازووی راستكردنەوە و رێكخستنی كەماڵی گوفتار، بێتەدی.

دەنا پێچەوانەی ئەمە، وەك ئەوەی كەسێك كە بە "كارمەندی" خزمەتگوزار بێت و، بە "سروشت"یش مناڵ بێت، بڕواتە ناو چەندین پلە و پایەی گەورەوە، ئەوا خۆی بە گەورە پیشان دەدات. ئەو كاتەش تەناسوبەكە تێكدەچێت و، پێكەوە بوونەكەش دەشێوێنێت..

(١) ئەم شیعرە هی (موتەنەبی)یە. واتە: هەناوم لەسەر پشكۆیەكی گەشی بەتین خەریكە دەبرژێت، بەڵام لەولاوە چاوەكانم لەناو بەهەشتی جوانیدا گەشتوگوزار دەكات! بڕوانە: (دیوان المتنبي) ص: ٣٠، دار الجیل، بیروت، دون تأریخ. (وەرگێڕ)

واتە دەبێ توانا و ئامادەیی بەند و بەستێنەکانی گوفتار بە هەند وەربگیرێن.

بەڵێ، دەبێ پلەی هەموو شتێ بە ئەندازەی بالآی توانا و لێهاتنی خۆی بەرز بکرێتەوە، چونکە هەریەك لە "چاو" و "لووت" و ئەندامەکانی تری هاوشێوەیان، چەندەش جوان بن بەلآم گەر لە سنووری خۆیان لایان دا، تەنانەت گەر لە ئالتوونیش بن هەر دەشێوێن و ناشیرین دەنوێنن.

**بێدارکردنەوەیەك:**

هەندێ جار "سەربازێکی ئاسایی" بۆ زانین و هێنانەوەی نهێنی‌یەکان دزە دەکات بۆ هەندێ شوێنی بەرەی دوژمن کە "موشیر" ناتوانێ بڕوات و ئەنجامی بدات.. یان قوتابی‌یەکی بچووك کارێك ئەنجام دەدات کە زانایەکی مەزن ئەنجامی نادات. چونکە مەرج نی‌یە مرۆڤی گەورە لە هەموو شتێکدا گەورە بێت، بەڵکو هەموو کەسێك لە سنعەتی خۆیدا گەورەیە.

بە هەمان شێوە، هەندێ جار واتایەکی بچووکی نێوان ئەو واتا چڕ و جەنجاڵانە دەبێتە سەرکردە و، لەو ڕێیەوە نرخێکی بالآتر بەدەست دەهێنێت، چونکە ئەرکەکەی سەرشانی گرنگە، وەك دوایی ڕوونی دەکەینەوە.

ئەوەی کە ئاماژە بۆ ئەو واتا چڕ و جەنجالآنە دەکات و، نیشانەی ڕوون لەسەر نرخ و بەهای بلندیان، دەست نەدانی "ڕاشکاویی دەقی بڕیار"ە، یان "لازمە نزیکە"کەیەتی بۆ ڕەوانە کردنی گوفتار و هێنانی قسە و ناردنی وشە(لەفز) لە پێناویدا.. ئیتر یان لەبەر ئەوەی بەڵگەنەویست و زانراوە.. یان لەبەر ئەوەی تەنك و لاوازە و لە ئامانجە بنەڕەتی‌یەکەدا جێی بایەخ نی‌یە.. یاخود لەبەر نەبوونی کەسێك قبوولی بکات و گوێی لێ بگرێت.. یان لەگەڵ حالی کەسی قسەبێژدا ناگونجێ و مافی تەواو نادات بە خواستی حەزی قسەکردن.. یان تێکەڵی نابێت و ئامادە نی‌یە لەگەڵ بارودۆخ و پلەی قسە بۆکراودا ئاوێتە ببێت.. یاخود لە پلەی پاشکۆی شوێنکەوتەکاندا بە نامۆ دەردەکەوێ.. یان ئامادەیی تێدا نی‌یە بۆ پارێزگاری کردنی ئامانجی گوفتار و ئامادەکردنی پێداویستی‌یەکانی..

بەو واتایەی کە هەموو یەکێك لە مەقامەکان گوێ بۆ یەکێك لەم هۆکارانە ڕادەگرێت. بەڵام ئەگەر هەموو هۆکارەکان یەکیان گرت بە گشتی، ئەوا بۆ بڵندترین پلە بەرز دەبێتەوە.

کۆتایی:

چەند واتایەکی هەڵواسراو هەن، کە نیشتمانێکی تایبەتی و شێوەیەکی دیاری کراویان نییە، بە وێنەی "پشکنیار" وان دەتوانن بڕۆنە ناو هەر فەرمانگەیەك بیانەوێت و، هەندێکیشیان خۆیان بە وشەیەکی تایبەتیدا هەڵدەواسن..

جا هەندێ لەم واتا هەڵواسراوانە "حەرفی" و "هەوایی"ن؛ لە توێی وشەیەکدا خۆیان دەشارنەوە، یاخود گوفتارێك هەڵیاندەمژێت، یان دەڕۆنە ناو ڕستەیەك یان چیرۆکێکەوە کە ئەگەر بگوشرێت ئەو واتایە بە وێنەی "گیان"ی ڕستە و چیرۆکەکە دەدڵۆپێت!

وەك واتاکانی: "حەسرەت دەربڕین".. "تاسەمەندی".. "خۆمەدح کردن".. "خەفەت دەربڕین" و، جگە لەمانەش.

## مەسەلەی حەوتەم

هەوێنی ژیان لە "ڕەوانبێژی"دا.. یان بە دەستەواژەیەکی تر "فەلسەفەی ڕەوانکاری".. یاخود "حیکمەتی شیعر": لەخۆگرتنی یاسا و پێوەرەکانی ڕاستییە دەرەکییەکانە..

واتە: بواردانە بە یاساکانی ڕاستییە دەرەکییەکان کە لە ڕووی قیاسی تەمسیلی و، لە ڕێی دەوەران و، بەهۆی دەست تێوەردانی وەهمەوە، بڕۆنە ناو شتانی مەعنەوی و حاڵەتە هەستیارەکان.

بە واتایەکی تر:

مرۆڤی ڕەوانگۆ بە وێنەی ئاوێنە تیشکی ئەو ڕاستییانە دەداتەوە کە لە دەرەوە ڕەنگیان داوەتەوە تیایدا، وەك بڵێی بە سنعەتە ئەندێشەییەکەی و بە نەخشی گوفتارەکەی لاسایی بەدیهاتووان دەکاتەوە و خەریکی چاولێکەریی سروشتە.

بەڵێ، گوفتار گەر "حەقیقەت"ی تێدا نەبێت، دەبێ لانی کەم شتێکی هاوشێوەی حەقیقەتی تێدا بێت، ئەوەندەی کە لە ڕێساکەی بەهرەمەند ببێت و لە ناوکەکەیەوە گوڵ بگرێ..

بەڵام هەموو ناوك و تۆوێك گوڵی تایبەت بە خۆی هەیە، ئەوەتا دەنکە "گەنم" هەرگیز درەختی لێ وەبەر نایەت!

جا ئەگەر "فەلسەفەی بەیان" بە هەند وەرنەگیرێت، ئەوا "ڕەوانبێژی" دەبێتە ئەفسانەیەکی ئەوتۆ کە جگە لە سەرسامی هیچ شتێکی تر بە گوێ بیست نابەخشێت.

**ئاماژەیەك:**

هەروەك "بەیان" فەلسەفەی هەیە، "نەحوو"(ڕێزمان)یش فەلسەفەی خۆی هەیە، کە حیکمەتی دانەری یاساکانی دەردەخات. ئەو حیکمەتەش لەسەر بناغەی پەیوەندییە بینراوەکان دامەزراوە و، کتێبەکانی "نەحوو" پڕن لە باسی ئەو پەیوەندییانە.

بۆ نموونە:

دوو "عاميل"(كارتێكەر) ناڕۆنە سەر يەك دانە "مەعموول"(كارتێكراو)..

هەروەها وشەی "هَل" هەر هێنـدەی "فيعـل" دەبينێـت يەكسـەر ئـارامی لـێ دەبڕێ و داوای ويسالّی دەكات..

هەروەها "فاعل"(بكەر) بەهێزە؛ بۆيە "ضمّة" بۆ خۆی دەبات..

ئەمانە و، پەيوەندیيەكانی تری وەك ئەمانە، هاوشێوەن لەگەڵ ئەو ياسـايانەی كـه لـه بوونەوەران و لـه دەرەوەی زەينەكاندا دەست بەكارن.

**بێداركردنەوەيەك:**

ئـەم پـەيوەندی و موناسـەبەتانەی "نـەحوو" و "صـەرف" - كـە بريتـين لـــە حيكمــەتی دانـەری ياسـاكانيان - هەرچـەندەش ناگەنـە پلـەی "فەلسـەفەی بـەيان" بـەڵام بەهايــەكی گەلـێ بەرزيان هەيە. بۆ نموونە: زانستە نەقلیيەكان، كە بـە لێكۆڵينـەوە و بـەدواداچوون سەلماون، دەگۆڕنە سەر شێوەی زانستە عەقلیيەكان.

## مەسەلەی هەشتەم

موتوربەکردن و ئاڵوگۆڕەکانی "واتا ڕەوانکاری‌یەکان" تەنها بە مژینی واتای ڕاستەقینەی وشە، یان ئامانجی گوفتار، یاخود ڕاکێشانی یەکێك لە واتا هەڵواسراوەکان دەبێت بۆ ناو گوفتار. خۆ هەر هێندەی دەڕواتە ناوی یەکسەر واتاکە دەگەڕێتەوە بۆ سەر حەقیقەتی خۆی و بناغەکەی، کە خاوەن ماڵە. ئەو واتایەش کە خاوەنی ئەسڵیی وشەکەیە دەڕواتەوە بۆ شێوەیەکی زیندوو کە پشتی دەگرێ و یارمەتیی دەدات و، بۆ خۆیشی یارمەتی لە "شوێنکەوتەکان" وەردەگرێت..

هەر لەم نهێنی‌یەشەوەیە کە تەنیا یەك وشە چەندین واتای زۆری هەیە و، هەر لەمەشەوەیە کە موتوربە کردن و گۆڕینەوە و ئاڵوگۆڕەکان سەرچاوە دەگرن.

جا هەرکەسێ لەم خاڵە تێنەگات "ڕەوانبێژی"یەکی گەورەی لە دەست چووە!

**ئاماژەیەك:**

زۆر شت هەیە "هۆکاری سوار بوون"ە و شایانی وشەی: "علی"یە، بەڵام کاتێ بە "زەرف" دادەنرێت یەکسەر داخوازی وشەی "في" دەبێت، وەك: "تجري في البحر".. یان شت هەیە ئامراز(آلة)ە و پیتی: "ب" دەخوازێت، وەك: "صعدت السطح بالسلم" بەڵام لەبەر ئەوەی "شوێن"ە، یان "هۆکاری سواربوون"ە، ئەوا "في" یان "علی" دەخوازێ.. یاخود لەبەر ئەوەی ئامانج و ئاکامە بۆ شتێك ئەوا داوای "إلی" و "حتی" دەکات، کەچی لەو ڕووەوە کە "هۆکار" و "زەرف"ە ئەوا "لـ" و "في"ی بۆ دەگونجێ، وەك:

﴿والشَّمسُ تجري لِمُستَقَرٍّ لها﴾. (يس: ٣٨).

ئەمانە بکە بە سەرمەشقێك و قیاسی شتی تریان لەسەر بکە.

**بێدارکردنەوەیەك:**

لە ناوەندی ئەم واتا تێهەڵکێشانەدا کامەیان پەیوەست ترە بە ئامانجی خۆتەوە، یان لەگەڵ ئامانجەکەدا سیلەی ڕەحمیان لە نێواندایە، پێشی بخە و ئاشکرای بکە. پاشماوەکەشیان بە ناواخنی گوفتاردا بەڕێ بکە. دەنا "واتا" و شێوەی دەربڕینەکەت لە پۆشاکی ڕازاوەی "ڕەوانبێژی" پەتی و بێ بەهرە دەبێ!

## مەسەلەی نۆهەم

بەرزترینی پلەکانی گوفتار، کە ویستی جوزئی و بۆچوونی ساکاری مرۆڤ دەستەوسان دەکەن، بریتی‌یە لە "توانا" و "لەخۆگرتن"ی:

ئامانجە جۆراوجۆرە تێهەڵکێش و یەك لە دوای یەکەکان و..

ڕیزبەستنی خواستە هاوپەیوەستە لەیەکبووەکان و..

کۆبوونەوەی ئەو بناغانەی کە یەك ئەنجام بەرهەم دەهێنن و..

هەڵێنجانی ئەو لقە زۆرانەی کە بەروبوومی جیاجیا دەبەخشن..

چونکە:

● خاڵی یەکەم:

ئەو شتەی کە فراوانی و مەزنی بە "گوفتار" دەبەخشێت بریتی‌یە لەوەی: ئەو ئامانجانەی لە دوورترین و بەرزترین مەبەستەوە - کە ئامانجی ئامانجەکانە - هاتوون، پەیوەستی یەکترین و، هەریەکەیان ناتەواویی ئەوی تر پڕ دەکاتەوە و، مافی دراوسێکەی دەدات، بە ڕادەیەك کە دانانی ئەمیان لە شوێنەکەی خۆیدا بوار بەوی تر دەدات کە ئەویش لە شوێنە تایبەتەکەی خۆیدا بێت و، بەوی تریش کە لە جێگاکەی خۆی دابمەزرێت..

بەم جۆرە، هەریەکەیان شوێنی شیاوی خۆی وەردەگرێت، ئیتر ئەو ئامانجانە لە تەلاری بنیاتنراوی گوفتاردا، بە ڕەچاوکردنی ڕاست و چەپ و سەرجەم لاکانی ئەم دانەیە ڕادەوەستن، وەك بڵێی بێژەر چەند ژێری‌یەکی دیکەی - بە نیازی هاوکاری - بۆ ژێریی خۆی خواستووە و، هەریەك لەو ئامانجانەش بووەتە بەشێك کە وێنە تێهەڵکێشەکان تیایدا بەشدارن. بە وێنەی ئەوەی کە ئەگەر وێنەکێشێك خاڵێکی ڕەش لە چەند وێنەیەکی تێهەڵکێشدا دابنێت، دەبێتە چاوی ئەم و، لووتی ئەو و، دەمی یەکێکی تر و، نیشانەی ئەوی تر..

بەم جۆرە، گوفتاری بەرز چەندین خاڵی وەك ئەمەی تێدایە.

● **خاڵی دووهەم:**

خواستەکانی گوفتار، بەهۆی قیاسی پێکهاتەی لق هاوێژەوە، زنجیرە دەبەستن و لەیەك دەکەونەوە، بە ڕادەیەك دەڵێی بێژەر ئاماژە بۆ "درەختی ڕەچەڵەك" دەکات، بە مەبەستی مانەوە و وەچە لێکەوتنەوەی خواستەکان.

بۆ نموونە:

(جیهان جوانە، کەواتە کردگاری دانایە؛ بە بێهوودە شتێك بەدی ناهێنێت و، لە هیچ شتێکیشدا ئیسراف ناکات و، توانا و لێهاتنەکان پشتگوێ ناخات. واتە بەردەوام تەواوکاری لە ڕێکوپێکی‌یەکاندا دەکات و دەیانڕەخسێنێت. بە واتایەکی تر: ئەو کردگارە هەرگیز "دەست لێ هەڵگرتن"ی هەمیشەیی و "نەبوون" - کە هیواکان دەمرێنێ و کەماڵەکان دەسڕێتەوە - بەسەر مرۆڤدا زاڵ ناکات. کەواتە دەبێ "بەختەوەری‌یەکی هەمیشەیی" بێت).

باشترین نموونەش لەسەر ئەمە: (ڕووی سێهەمی جیاوازی‌یەکانی نێوان مرۆڤ و ئاژەڵە) کە لە ناوەندی باسەکانی "پێغەمبەرێتی"دایە لە پێشەکیی شایەتیی دووهەمی وتاری سێهەمدا[1].

● **خاڵی سێ‌هەم:**

ئەو شتەی کە وا دەکات تەنها یەك "ئەنجام" چەندین ئەنجامی یەك لە دوای یەکی لێ بێتەوە، بریتی‌یە لە: کۆکردنەوە و باسکردنی چەند ئەسڵ و بناغەیەکی جیاجیا. چونکە هەریەك لەو بناغە و ئەسڵانە، ئەگەر ڕاستەوڕاست پەیوەندیی بە ئەنجامە بڵندەکەوە نەبێت و ئامانجیشی نەبێت، خۆ لانی کەم پلەیەك دەیلەرێنێتەوە و تا ڕادەیەك دەری دەخات. وەك بڵێی "گوفتار" بە جیاجیا بوونی بناغەکانی - کە دەرخەر و ئاوێنەن - و بە یەکبوونی ئەنجامەکەی و ئەو شتەی کە تیایدا دەردەکەوێت، ئاماژە بۆ بڵندی و موجەڕڕەدیی ئامانجەکە و بۆ پەیوەست بوونی هێزی ژیانی دەکەن بە ڕاستیی ژیانی هەمەکی‌یەوە، واتە ژیانی جیهان کە پێی دەوترێ: دەوەرانی گشتی.

---

(١) بڕوانە لاپەڕە (٢٢٢-٢٢٣)ی ئەم کتێبە. (وەرگێڕ)

جا مەبەستی یەکەمی سێ مەبەستەکەی کۆتایی وتاری سێهەم، نموونەی ئەمەیە. هەروەها ئەو "ئاماژە" و "ڕێنمایی" و "وریاکردنەوە" و، ڕێبازی "داوەریی ژیری"یەش کە لە مەسەلەی چوارەمی وتاری سێهەمدایە، نموونەیەکی تری باشی ئەمەیە.

[فانظر إلى كلام الرحمن الذي علَّم القرآن. فبأي آيات ربك لا تتجلى هذه الحقيقة؟ فويل حينئذٍ للظاهريين الذين يحملون ما لا يفهمون على التكرار].

واتە: (سەیری گوفتاری ئەو دلۆڤانە بکە قورئانی فێری ئادەمیزاد کردووە! ئایا بە کام لە ئایەتەکانی پەروەردگارت ئەم ڕاستی‌یە بە درەخشانی دەرناکەوێ؟ دەسا وای لە دەست ئەو ڕواڵەتبینانەی کە ئەو شتانەی خۆیان لێی تێناگەن بە "دووپات بوونەوە"ی لە قەڵەم دەدەن).

● خاڵی چوارەم:

ئەم خاڵە بریتی‌یە لە دارشتنی تەواوەتیی گوفتار و بەخشینی توانایەکی تەواو پێی، بە ڕادەیەك کە تۆوی چەندین لق و پەلی زۆر لەخۆ بگرێت و، ببێتە سەرچاوەی گەلێ بڕیار و، بەڵگە بێت لەسەر چەند ڕوویەکی جیاجیا و چەند دانەیەکی جۆراوجۆر. وەك بڵێی گوفتارەکە، بە لەخۆگرتنی ئەم توانایە، ئاماژە بەو هێزی گەشەکردنەی کە تیایدایە و، بە زۆر و زەبەندەیی بەروبووم و داهاتەکانی دەدات. چونکە لە مەسەلەیەکدا هەموو ئەو لق و ڕووە زۆرانە کۆ دەکاتەوە، تاکو بەراوردی نێوان جیاوازی و تایبەتمەندی‌یەکانی بکات و، هەموو یەکێکی لقەکان بەرەو ئامانجێکی دیاریکراو بداتەبەر و، هەریەك لەو ڕووانەش لە ئەرکێکی تایبەتیدا دابمەزرێنێت.

[فانظر إلى قصة موسى فإنَّها أجدى من تفاريق العصا، أخذها القرآن بيده البيضاء، فخرّت سحرة البيان ساجدين لبلاغته](١).

---

(١) ڕستەی: (أجدى من تفاريق العصا) پەندێکی عەرەبی‌یە، بۆ شتێك دەوترێ کە خێری لە شتێکی دی زیاتر بێت. هەندێ سەرچاوەی زمان و ئەدەبی عەرەبی دەگێڕنەوە کە ژنێکی دەشتەکی کوڕێکی لاسار و لاواز و شەڕانیی دەبێت، چەند جارێك شەڕ لەگەڵ خەڵکیدا دەکات و، ئەوانیش لە هەر شەڕێکدا ئەندامێکی؛ جارێ لووتی، جارێ گوێی، جارێکی تر لێوی دەبڕن و، دایکیشی هەموو جارێ خوێنی بڕینی ئەو ئەندامەی کوڕەکەی وەردەگرێت و، لەو ڕێیەوە دەوڵەمەند دەبێ و دەحەسێتەوە! بۆیە بە کوڕەکەی دەڵێ:

أُقسم بالمروة حقاً والصفا إنك خيرٌ من تفاريق العصا

واتە سوێندی ڕاستی بێت بە سەفا و مەروە کە تۆ لە کەرت و پەرتەکانی عەسا بە خێروبێرتریت! مەبەستی ئەوە بووە کە لەناو عەرەبدا ئەگەر دار عەسایەك کەرت ببووایە فڕێیان نەدەدا، بەڵکو تەوقی ملی سەگیان لێ

واتە: (سەيرى چيرۆكەكەى حەزرەتى مووسا بكە - لە قورئاندا - چونكە لە ئەركە زۆرەكانى عەساكەى بەسوودترە. ئەوەتا قورئان بە دەستى سپيى خۆى هەڵى گرت و جادووگەرانى "بەيان"يش سەرى سوژدەيان بۆ نايە زەوى)!

براكەم!

ئەو ئەندێشە "ڕەوانبێژى"يەى كە لەم مەسەلەيەدا هەيە، بەم چەشنە شێوازانە، وێنەى درەختێكى مەزنى ئەوتۆت بۆ دەكێشێت كە ڕەگەكانى ئەستوور و لێك ئاڵاون و، گرێ درێژەكانى پێكەوە گونجاون و، لقەكانيشى پەل پەل و دەست لە ملانن و، ميوە و بەروبوومەكانيشى جۆراوجۆرن. فەرموو سەرنجى مەسەلەى شەشەم بدە، چونكە هەرچەندەش ئاڵۆز و شێواوە، بەڵام نموونەيەكە بۆ ئەم مەسەلەيە.

**ورياكردنەوە و پۆزش هێنانەوەيەك:**

برام!

بە دڵنيايى دەزانم كە ئەم مەسەلەيەت بە تەماوى و داخراوى لێ دەردەكەوێ. بەڵام چار چىيە؟ سروشتى "پێشەكى" وايە؛ كورتى و پوختى دەخوازێ. دوايى لە سێ كتێبەكەدا بە جوانى بۆت ڕوون دەبێتەوە.

---

دروست دەكرد، ئەگەر ئەويش بشكايە مێخيان لێ دەتاشى، ئەگەر ئەويش بشكايە تەڵەزمەكەيان دەكرد بە مووررووى گەورە بۆ دەسكى جەواڵ، ئەگەر ئەويش بشكايە سەرەتەشىيان لێ دەتاشى، دواى ئەويش شتێكى تريان لێ دروست دەكرد، ئنجا شتى تر و شتى تر.. هتد. واتە لە هەموو شكاندنێكيدا سوودێكيان لێ وەردەگرت! جا ئەو دايكە پێى وايە كوڕە شەڕانىيە لێدراوەكەى لەو كەرت و پەرتانەى دار عەسا خێرى زياترە!

بڕوانە: القاموس المحيط للفيروزابادي: ٢٨٥/٣ مادة (فرق). البيان والتبيين للجاحظ: ٤٩/٣، تحقيق عبد السلام محمد هارون، مطبعة لجنة التأليف والترجمة والنشر، القاهرة، ١٩٤٩م. مجمع الأمثال للميداني: ٥١/١، منشورات مكتبة دار الحياة، بيروت، ١٩٦١.

مامۆستا نوورسى بەهۆى قەرينەى وشەى "عەسا" ئيستيعارەيەكى تەمسيليى جوانى بەكارهێناوە. لەوەدا كارە زۆرەكانى عەساكەى حەزرەتى مووساى، كە لە ئايەتى: ﴿هِيَ عصايَ أتوَكَّأُ عَلَيْها وَأهُشُّ بِها عَلى غَنَمي وَلِيَ فيها مَآرِبُ أُخرى﴾دا هەيە، شوبهاندووە بە لەت و كەرتەكانى دار عەسا لەناو عەرەبدا و، دەيەوێ بڵێ: چيرۆكەكەى حەزرەتى مووسا - درووودى لەسەر بێ - لە قورئاندا گەلێ سوودى "ڕەوانبێژى"ى زياترى تێدايە لەچاو سوودەكانى عەساكەى دەستى! (وەرگێڕ)

## مەسەلەی دەهەم

ڕەوانی(سلاسة)ی گوفتار بە: ئاڵۆز نەبوون و، بازنەدان لە هەستێکەوە بۆ هەستێکی تر دەبێت، هاودەم لەگەڵ لاسایی کردنەوەی سروشت و، لەخۆدا نواندنی ڕاستییە دەرەکییەکان و، ڕۆشتنی ڕاستەوڕاست بەرەو ئامانج و، لێك جیابوونەوە و دەرکەوتنی هەریەك لە "مەبەست" و "ئاکام".. بەم جۆرەی خوارەوە:

بازدان لە هەستێکەوە بۆ هەستێکی تر، پێش ئەوەی یەکەمیان تەواو ببێت و تێکەڵ کردنی لەگەڵ ئەوی تردا، ڕەوانیی گوفتارەکە دەشێوێنێ و دەیگۆڕێ. کەواتە هەنگاونانی یەك لە دوای یەك بەناو واتا ڕیزبووەکان و، خۆپارێزی لە ئاڵۆز بوونی هەڕەمەکیی بێ ڕێسا و بێ جێ، کارێکی پێویستە..

هەروەها دەبێ سنعەتی ئەندێشەی بێژەر شان بە شانی سروشت هەنگاو بنێت و شاگردی بێت، تاکو یاساکانی سروشت لە سنعەتەکەیدا دەربکەوێ و ڕەنگ بداتەوە..

هەروەها پێویستە بۆچوونەکانی بێژەر چاولێکردن و هاوشێوەی شتانی دەرەکی بن، بە ڕادەیەك کە ئەگەر ئەو بۆچوونانە لە مێشکی هەڵبێن و لە دەرەوەدا بەرجەستە ببن، "دەرەوەی زەین"ی دەست بە ڕوویەوە نەنێت و، نەیباتەوە سەر قسەبێژ و، نکوولی لەوە نەکات کە لە ڕەچەڵەکی خۆی بێت، بەڵکو بڵێت: ئەوە منە.. یان: دەڵێی منە.. یاخود: جگەرگۆشەمە!

هەروەها دەبێ ڕاستەوخۆ ڕووەو ئامانجەکەی بڕوات و بە ڕاست و چەپدا لار نەبێتەوە، تاکو ڕێ لە بڵاوبوونەوەی بگیرێ لەناو لافاوگەی ئامانج و، پەرتەوازەبوونی لە چەم و دۆڵی مەبەستدا، ئەمەش بۆ ئەوەی هێزی لاکانی بە لێمژین لاواز نەبن، بەڵکو ئەو لایانە، بە وێنەی حەوز، بە تەڕی و پاراویی خۆیان پتر پشتی ئەو ئامانجە بگرن و هێزی پێ بدەن..

هەروەها زەق دەرخستنی دوانیشتەجێی مەبەست و، دەستنیشان کردنی بەیەك گەیشتنەوەی ئامانج، بۆ ساغ و سەلامەتیی ڕەوانییەکە، کارێکی پێویستە.

## مەسەلەی یازدەهەم

ساغی و تەندروستیی "ڕەوانی"ی گوفتـار بریتی‌یە لـە چەسپاندنی بڕیارەکـەی بـەو شتانەی کە "پێداویست" و "بنەما" و "ئامڕازی داکۆکی لێکردن"ی ئەون.. بەم جۆرەی خوارەوە:

دەبێ پێداویستی‌یەکانی بڕیـاری ئـەو گوفتـارە تێکنـەدرێت و، ئارامیی نەشێوێنرێت، هاودەم لەگەڵ گەڕانەوەدا بۆ بنەماکانی، بە نیازی ئـەوەی کـە زیندوویـی گوفتارەکـەیان لـێ بەدەست بهێنرێت، ئـەوەش لـە ڕێی پابـەند بوونـەوە بـە بەستێنەکانی وەڵامـی هـەموو پرسیارێکی گریمان کراو لە دەمی بەرپەرچدانەوەی وەهم و گومانەکاندا.

واتە گوفتار درەختێکی بەردارە؛ پەرژینی دڕکـەکانی بـۆ دانـراوە تـاکو لـە ڕنینـەوەی بەرەکانی و هەر چەشنە دەستدرێژی‌یەك بیپارێزن..

وەك بڵێی گوفتار ئەنجامی چەندین وتوویژ و، پوختـەی گەلـێ داوەریـی ژیریـی ئـەوتۆ بێت کە شەیتانی وەهم و گومانەکان نەتوانن دزە بکەنە ئەوێ بۆ بیستنی هیـچ شتێك و، توانای ئەوەیان نـەبێت بـە نیـازی ناحەزانـە بـۆی بڕوانـن، چونکـە بێـژەر شـووورایەکی بـە دەوری هـەر شـەش لای گوفتارەکـەی خۆیـدا گـێڕاوە. واتـە: گوفتارەکـەی لـە ڕێـی پابـەندکردنی "مـەوزووع" یـان "مـەحموول" بـە بەسـتێنەکانەوە.. یـان بـەهۆی وەسـف کردنی.. یان بە شتێکی تر، پڕچەك کردووە بۆ بـەرگری لـەخۆ کـردن لـە دەمـی وەڵامـی هـەر پرسـیارێکی گریمـان کـراودا و، دانانیـان لـە چـەند سـەنگەرێکی ئـەوتۆدا کـە چاوەڕوانیی ئەوەیان لـێ بکرێ وەهم و گومانەکان لەوێوە هێرش ببەن.

ئەگەر نموونەت لەسـەر ئەمە دەوێ، فەرموو سـەرانسـەری ئەم کتێبـە نموونەیەکی دوور و درێژە لەسەری. نەخوازەلا وتاری سێهەم، کە نموونەیەکی درەخشانی ئەمەیە.

## مەسەلەی دوازدەهەم

سەلامەتی و سفت و سۆلیی گوفتـار و، ڕێکبوونـی مـیزاج و ئارەزووە کـانی، بـە دابەشکردنی "چاودێری" و پێ بەخشینی کالآی "شێوازەکان" دەبێـت بـەپێی شایستەیی هەریەك لە بەستێنەکانی..

جا ئەگەر گوفتارەکە گێڕانەوەی بەسەرهاتێك بوو، ئەوا بێژەر دەبێ خۆی لە شـوێنی ئەو کەسەدا دابنێت کە بەسەرهاتەکەی لـەبارەوە دەگێڕێتـەوە، چونکـە لـە کـاتی خستنە ڕووی بیر و هـەسـتەکانی ئـەو کەسـەدا پێویستە بێژەر بڕواتـە نـاو نـاخی و، ببێتـە میوانـی دڵی و، لەسەر زمانی ئەو بدوێ..

خۆ ئەگەر هەڵسوکەوتی لە ماڵ و سامانیدا کرد، دەبێ لە دابەشـکردنی چـاودێری و بایەخدا - کە بەڵگەن لەسەر پلە و بەها - دادگەر بێت. ئەوەش بەوە دێتە دی کە هـەموو بەستێنەکان، تەنانـەت پلـە و تواناکانیشـیان بـە هـەند وەربگـیرێن و، هەریەکـەیان بـە ئەندازەی قەد و باڵای خۆی پۆشاکی شـێوازەکانی لەبەر بکرێـت، تـاکو ئامانجەکـە بـەو جۆرە شێوازە پۆشتە و پەرداخ ببێت کە بۆی دەست دەدات..

چونکە بناغەی شێوازەکان سیانن:

**یەکەم:**

شێوازی پەتی( المجرد).

وەك شێوازی ڕەوانی سەیید شەریفی جورجانی و، نەصیرەدینی تووسی.

**دووهەم:**

شێوازی ڕازاوە.

وەك شێوازی ڕوون و درەخشانی عەبدولقاهیری جورجـانی لـە "دلائـل الإعجـاز" و "أسرار البلاغة"دا.

**سێهەم:**

شێوازی بلند.

وەك هەندێ گوفتاری شکۆداری سەککاکی و، زومەخشەری و، ئیبن سینا. یان هەندێ بڕگەی عەرەبیی ئەم کتێبە، بە تایبەتی لە وتاری سێهەمدا. هەرچەندەش ئالۆز و شێواو دەردەکەون، بەڵام چەند بڕگەیەکی قایم و توندوتۆڵیان لەخۆ گرتووە، چونکە بەرزیی بابەتەکە ئەم کتێبەی لە "شێوازی بلند"دا داڕشتووە و، کاری من تیایدا تەنها شتێکی جوزئییە.

**بە پوختی:**

ئەگەر لە باسی "ئیلاهیات" و "وێنەکێشانی بناغەکان"دا بوویت، فەرموو "شێوازی بلند" بەکاربهێنە، چونکە توندوتۆڵی و هێز و شکۆی لە دووتوێدایە، بەڵکو دەبێ دەستبەرداری ئەم شێوازە نەبیت.

ئەگەر سەرقاڵی ئاراستە کردنی گوفتار و قەناعەت بەخشین بوویت بە بەرامبەرەکەت، ئەوا "شێوازی ڕازاوە"ی بەئارایشت و پۆشتە و پەرداخ و پڕ لە تەرغیب و تەرهیب بەکاربهێنە و، هەتا دەتوانیت دەستی لێ هەڵمەگرە. بە مەرجێ فیز و خۆنواندن و شتی ئەوتۆی تێکەڵ نەبێت کە عەوامی خەڵکی بورووژێنێت.

خۆ ئەگەر باسەکەت لەمەڕ مامەڵە و گفتوگۆ و، لە بابەتی زانستە بەرزەکانەوە بوو، ئەوا تەنها و تەنها "شێوازی پەتی" بەکاربهێنە، چونکە هەر ئەو شێوازەیە کە ماف بە بابەتەکە و، پوختکردنەوەی باسەکە و، ساغ و سەلامەتیی ئامانجەکە دەدات و، لەسەر سەلیقەی سروشتیی بێژەر دەڕوات، تەنانەت بە "ڕەوانی"یەکەی جوانیی خۆی دەردەخات.

**کۆتایی ئەم مەسەلەیە:**

بزانە کە:

قەناعەت و بێ نیازی و بێ لایەنگیریی گوفتار بەوە دەبێت کە: چاو بۆ هیچ شێوازێکی دەرەوەی مەقام و مەبەستەکە نەگێڕیت..

جا ئەگەر ویستت شێوازێك بە بەری واتایەك لە واتاكان ببڕیت، ئەوا هەر هەمان واتا و، مەقام و، سنعەت و، چیرۆك و، سیفەت، بە پێداویستی و پاشكۆ پەرش و بڵاوەكانی خۆی یارمەتیت دەدات و، لەو سەرە بڕشتانە پۆشاكی شێوازەكەت بۆ دەدوورێت..

كەواتە مەگەر لە كاتی ناچاریدا دەنا چاو بۆ دەرەوە مەگێڕە..

یاخود بە دەستەواژەیەكی تر: لەگەڵ كەرەسە بیانییەكاندا مامەڵە مەكە، چونكە ئەو مامەڵە دابڕینە بناغەیەكی گرنگە بۆ ئەوەی بوار نەدرێ سەرووەتی وڵات پەرتەوازە ببێت..

كەواتە مامەڵە بڕین لەگەڵ بیانییەكاندا پەرە بە هێزی "گوفتار" دەدات. واتە هەریەك لە واتا و مەقام و سنعەت بەوەدەلالەتەی كە لە بناغەدا بۆ گوفتارەكە دانراوە (الدلالة الوضعية) سوود بە گوفتارەكە دەگەیەنن. جا هەروەك گوفتار بە "دەلالەتە بۆ دانراوەكەی خۆی" واتاكە دەردەخات، سروشتی ئەم چەشنە شێوازەش ئاماژە بۆ واتا دەكات.

ئەگەر نموونەیەكت لەسەر ئەمە دەوێ، فەرموو سەیری دەقە عەرەبییەكانی مەسەلەی نۆهەم بكە، وەك:

[فانظر إلى كلام الرحمن الذي علّم القرآن. فبأي آيات ربك لا تتجلى هذه الحقيقة؟ فويل حينئذٍ للظاهريين الذين يحملون ما لا يفهمون على التكرار].

هەروەها:

[فانظر إلى قصة موسى فإنّها أجدى من تفاريق العصا، أخذها القرآن بيده البيضاء، فخرّت سحرة البيان ساجدين لبلاغته].

گەر نموونەی تریشت ویست، ئەوا سەیری دیباچەی كتێبەكانی زانستە ئامرازەكان بكە، چونكە ئەو سەرەتا قەشەنگانە(بەراعەتی ئیستیهلال)ی كە لەو كتێبانەدا هەیە، هەرچەندەش لە ڕووی "ڕەوانبێژی"یەوە ورد و ناسك نەبن، بەڵام "سەرەتای قەشەنگ"ن بۆ ئەم ڕاستییە!

هەروەها لە سەرەتای ئەم كتێبەشدا چەند نموونەیەك هەن:

(چونکە پێغەمبەری ئازیز ﷺ مو عجیزەی لەسەر پێغەمبەرێتییەکەی خۆی دەرخستووە)..

یان لە دیباچەی وتاری سێهەمدا:

(هەردوو وشەی شایەتمان هەریەکەیان شایەتە لەسەر ئەوی تر)..

لە پێشەکیی حەوتەمیشدا بەو کەسانەی کە پێیان وا بووە دوای موعجیزەی "لەتبوونی مانگ" کەرتەکانی هاتوونەتە سەر زەوی، پێیان وتراوە:

(ئێوە بوون بەهۆی گیرانی موعجیزەی درەخشان و خۆرئاسای "مانگ" کە بەڵگەی پێغەمبەرێتییە و، ڕەفتارێکتان نواند کە ئەو موعجیزە ڕوون و ئاشکرایە بە وێنەی ئەستێرەی "سوها" پەنهان بێت).

بەپێی ئەمە، نموونەی زۆر لەسەر ئەم ڕاستییە دەبینیت، چونکە ڕێبازی ئەم کتێبە:

مامەڵە نەکردنە لەگەڵ سامانی دەرەوە و، هیچ وەرنەگرتنە لێیان، مەگەر لە کاتی ناچاریدا، وەك حاڵی خۆیشم کە هەر بەو جۆرەیە! تەنانەت لە مەسەلە و نموونە و شێوازەکانیشدا مامەڵەیان لێ دابڕێت. بەڵام لەوانەیە لەو ئەندێشانەی کە بە یادی مرۆڤدا دێن هەندێ لێکچوون ڕووبدات، چونکە "ڕاستی" هەر یەکێکە و، لە هەر دەرگایەکەوە بۆی بڕۆیت ڕووبەڕووی دەبیتەوە.

**کۆتایی:**

وتراوە:

(بۆ قسە بڕوانە، نەك بۆ قسەبێژ)..

بەڵام من دەڵێم:

بڕوانە کێ وتوویەتی؟ بە کێی وتووە؟ لەبارەی چییەوە دوا؟ بۆچی وتی؟

چونکە لە ڕوانینی "ڕەوانبێژی"دا هێندەی چاودێریی خودی قسەکە، چاودێریی هەموو ئەمانەش پێویستن، بەڵکو لە هەموو شتێ پێویست ترن.

**ئاماژەیەك:**

بزانە کە: مەرجێکی گرنگی تایبەتمەندییەکانی هەردوو زانستی گوزارەکاری و ڕەوانکاری (المعاني والبيان) لە ڕووی ڕەوانبێژییەوە، بریتییە لە بوونی مەبەست و

ئامانجێك لە گوفتاردا، لە ڕێی دانانی ئەو نیشانانەی کە بەڵگەن لەسەر ئامانجەکە. کەواتە لەم دوو زانستەدا نرخ بۆ شتی لەخۆڕا و هەڕەمەکی دانانرێت..

بەڵام لە زانستی "بەدیع" و جوانکاریی وشەدا: لە خۆڕا و مەبەست نەبوون، یان نزیکبوونەوە لە سروشتی ئەو واتایەی کە وەکو هەڕەمەکی و لەخۆڕابوون وایە، بە مەرج دادەنرێت.

**نیشانەیەك:**

شاراوە نییە: "إنَّ"ی تەحقیقی تیژترین ئامێرە کە ڕواڵەت کونادەر دەکات و دەڕواتە ناخی حەقیقەتەوە و، دەبێتە بەڵگە لەسەر سروشت و ڕاستیی دەرەکی و، بڕیاری زەینیش بە یاسای دەرەکییەوە پەیوەست دەکات. هەر لەسەر بناغەی ئەم تایبەتمەندییەشە کە لە قورئانی پیرۆزدا "إنَّ" زۆر بەکار هێنراوە.

برام!

ئەو یاسا ورد و نیانانەی کە ئەم وتارە لەخۆی گرتوون تۆ بە هەڵەدا نەبات، چونکە ئەو یاسایانە بەری بوون و نەفرینی خۆیان لەم شێوازە پەرێشانەم دەردەبڕن. کەواتە وا گومان نەبەیت کە بڵێیت:

(ئەگەر ئەم یاسایانە لەخۆیاندا باش و ڕێك بوونایە، وانەیەکی ڕەوانبێژیی بەهێزیان بە دانەرەکەیان دەوتەوە و، یاساکانیشی پۆشاکی شێوازە جوانەکانیان دەپۆشی، کەچی ئەو کەسەی کە ئەم یاسایانەی داناوە بۆ خۆی نەخوێندەوارە و، شێوازەکانیشی پەرێشان و شێواون)!

واز لەم چەشنە گومانە بهێنە و بایەخی پێ مەدە.. چونکە هیچ زانستێك مەرج نییە هەموو زانایەك تیایدا کارامە بێت.

جگە لەوەش، هێزی کێشی مەڵبەند هەمیشە زیاترە لە هێزی پاڵنەر و دەرکەر، هەروەها لەبەر ئەوەی "گوێ" خزمایەتیی لەگەڵ "مێشك"دا و سیلەی ڕەحمیشی لەگەڵ "ژیری"دا هەیە، کەچی "دڵ" - کە کانگای گوفتارە - لە "زمان"ەوە دوورە و نامۆیە لێی، تەنانەت زۆر جار "زمان" لە قسەی دڵ تێناگات، بگرە ئەگەر "دڵ" لە ناخی مەسەلە و بابەتەکان و لە چەندین قووڵایی دووری وەك بنکی بیردا بناڵێنێ، ئەوا زمان هەر گوێی لێ نابێت، ئیتر چۆن بتوانێ گوزارشتی لێ بکات؟

ئەنجامی ئەم قسانە:

تێگەیشتن لە تێگەیاندن ئاسانترە. والسلام!

پۆزشێك:

ئەی برای بەغیرەت و ئارامگر!

ئەی ئەو کەسەی کە لەم ڕێڕەوە باریك و تاریکانەدا هاوڕێیەتیم دەکەیت!

پێم وایە لەم وتاری دووهەمەدا تەنها بینەرێکی سەرسام بوویت، نەك گوێ بیست، چونکە لێی تێنەگەیشتیت!

لەمەشدا لەسەر حەقیت، چونکە مەسەلەکان تابڵێی قووڵن و، ڕەگ و دەمارەکانیان یەکجار دوور و درێژن و، دەستەواژەکانیش پوخت و داخراون و، زمانە تورکی‌یەکەشم تابڵێی ئاڵۆز و ناتەواوە و، کاتێکی یەکجار کەمیشم بە دەستەوەیە. جگە لەوەی کە من بە پەلە دەنووسم و، تەندروستیم تێکچووە و تووشی هەڵامەت بووم. دیارە نووسین لەم چەشنە حاڵەدا هەر تەنها ئەم جۆرە کاغەزە شڕ و شێواوانەی لێ دەردەچێت.

"والعذرُ عندَ كرامِ الناسِ مقبولٌ"!

برام!

"توخمی حەقیقەت" بکە بە هێزی هەرە گەورە و، "توخمی ڕەوانبێژی"ش بکە بە هێزی هەرە بچووك و ئاوێتەیان بکە، ئنجا حەدسی ڕاست، کە وەکو تیشکی کارەبا وایە، بەناو ئەم ئاوێتەیەدا ببە، تاکو "توخمی باوەڕ"ی ڕووناکی بەخشت بۆ بەرهەم بهێنێت و، توانایەکیش بە زەینت ببەخشێت بۆ تێگەیشتنی.

وا لە (وتاری سێهەم)دا لە "توخمی باوەڕ" دەدوێین.

بۆیە دەست پێدەکەم و، دەڵێم: نەخوو[1]:

* * *

---

(١) نەخوو: وشەیەکی کوردیی کرمانجیی ژووروووە، واتە: (کەواتە). (وەرگێڕ)

بسم الله الرحمن الرحيم

أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمداً رسول الله

ئەم وشە بەرزە، بناغەی ئیسلام و، ڕووناکترین و بەرزترین ئالآیەتی کە بەسەر هەموو بوونەوەرانەوە دەشەکێتەوە.

بەڵێ، "ئیمان" کە بەڵێنی ئێمەیە لەگەڵ پەیمانی ئەزەلیدا، لەم گوفتارە خاوێنەدا دانراوە..

"ئیسلام"یش کە ئاوی ژیانبەخشە، لە سەرچاوەی ژیانی ئەم وشەیەوە هەڵقوڵاوە.

ئەم وشەیە، پەیمانێکی ئەزەلی‌یە لە نێوان ئەو گرۆی مرۆڤەدا کە دەستنیشانکراوی نەمری و هەتاهەتاییە، بە دەستی ئەو کەسانە سپێرراوە کە مژدەی بەدەستهێنانی بەختیاریی هەمیشەییان دراوەتێ و بۆ ئەو بەختیاری‌یە دیاری کراون.

بەڵێ، ئەم وشەیە بەرنامەیەکی پەروەردگاری و ڕاگەیەنەرێکی ڕەوانگۆی فەرمانەکانی خوای گەورەیە، کە بە هۆیەوە ئەو لایەنە پەروەردگاری‌یە نیانەی پێ ڕووناك دەبێتەوە کە لەسەر پەنجەرەی دڵی مرۆڤدایە و بەسەر جیهانەکانی پەنهاندا دەڕوانێت.

ئەم وشەیە ڕێبازێکی ئەزەلی‌یە، ئەو زمانەی پێ دەکەوێتە گۆ کە ڕاگەیەنەرێکی ئەمینە لە لایەن "ئیمان بە خوا"ی دانا(حکیم)وە و.. گوفتارێکی پاراوە، ئەو ویژدانە عەودالیەتی کە لێوانلێوە لە نهێنی‌یەکان بەرامبەر بە بوونەوەران.

هەردوو وشەی شایەتمان هەریەکەیان شایەتێکی ڕاستن لەسەر ئەوی تر، ئەوەتا "خوایەتی"ی خوای گەورە بەڵگەیەکی "لیممی"یە بۆ پێغەمبەرایەتیی سەروەرمان و،

محەممەدی سەروەریشمانﷺ بە زات و زمانی خۆی بەڵگەیەکی "ئیننی"یە بۆ خوایەتیی خوای گەورە[١].

ڕاستییەکانی بیروباوەڕی ئیسلام، بە هەموو لق و پەلەکانیەوە، لەناو کتێبەکاندا و لە شوێنی خۆیاندا بە ڕاشکاوی و بەڵگەوە ڕوون کراونەتەوە و لە بەردەستدان.

بەڵام لەبەر ئەوەی ڕوونکردنەوەی "شتی ئاشکرا" ئاماژەیە بۆ بە نەزان دانانی بەرامبەر، ئەوا تەنها سێ چوار دانە لە توخمەکانی (باوەڕ) ڕوون دەکەمەوە و، پاشماوەکەیان بە کتێبەکانی کەڵەزانایان دەسپێرم، چونکە مافی تەواویان دراوەتێ.

* * *

(١) دانەر لە کتێبێکی تریدا وتوویەتی: (بەڵگە، یان "لیممی"یە کە بریتییە لە: بەڵگە هێنانەوە بە کاریگەر(المؤثر) لەسەر کارتێکراو.. یان "ئیننی"یە، کە بریتییە لە: بەڵگەهێنانەوە بە ئاسەوار و کارتێکراو لەسەر بوونی کاریگەر، کە ئەمەیان سەلامەتترە). (وەرگێڕ – لە "ئاماژەکانی ئیعجاز"ەوە هێناویەتی)

## پێشەکیی مەبەستی یەکەم

وەك لای وردەکاران زانراوە، ئامانجەکانی قورئان چوار دانەن:

(سەلماندنی بەدیهێنەری تاك و تەنیا.. پێغەمبەریتی.. حەشری جیسمانی.. دادگەری).

جا ئامانجی یەکەم تایبەتە بە بەڵگەکان لەسەر کردگاری مەزن و، حەزرەتی محەممەدیش ﷺ یەکێکە لە بەڵگەکانی.

لە ڕاستیدا بوون و تەنیایی کردگار ڕوون و ئاشکراتر و بێ نیازترە لەوەی کە پێویستی بە چەسپاندن بێت، نەخوازەلا لە دەمی ئاراستەکردنی گوفتاردا بۆ موسڵمانان! لەبەر ئەوە، ڕووی ئەم گوفتارەم لە بیانییەکان بوو، بە تایبەت "ژاپۆنییەکان" کە پێشتر کۆمەڵە پرسیارێکیان کرد و، لە کاتی خۆیدا وەڵامم دانەوە. وا لێرەدا بەشێکی ئەو وەڵامانە دەهێنم.

یەکێك لەو پرسیارانە ئەوەبوو کە وتیان:

[ما الدليلُ الواضحُ على وجودِ الإلهِ الذي تدعوننا إليه؟ والخَلقُ مِن أيِّ شيءٍ؟ أَمِنَ العدمِ أو المادةِ أو ذاتِه؟ إلى آخر أسئلتهم الْمُرَدَّدَة].

واتە: (ئایا بەڵگەی ڕوون) چییە لەسەر "بوون"ی ئەو خوایەی کە ئێمەی بۆ لا بانگ دەکەن؟ بەدیهێنان لە چ شتێکە؟ ئایا لە نەبوون، یاخود لە ماددە، یان لە زاتی خۆیەتی؟ ... هەتا دوا پرسیارە دووپات بووەکانیان.

داوای پۆزش و لێبوردن دەکەم لەوەی کە گوفتارەکەم تەماوی و ناڕوونە، چونکە ناسینی خوای گەورە، کە شتێکی بێ سنوورە، ناتوانرێت لەم گوفتارە سنووردارەدا جێ بکرێتەوە.

مەبەست لەم گوفتارەی کە لەمەولا دێت ڕوونکردنەوەی "ڕاستی"یە لە سەرجەمی هەموویدا، ئەویش بە دەرخستنی ڕێی داوەریی ژیری و سازدانی بەراوردەکان، چونکە گەڕان بە دوای تەواوی ئاکام لە هەموو بەشێکی کۆی حەقیقەتدا - لە ڕاستیدا - دەبێتە داپۆشین و شاردنەوەی حەقیقەت بە پەردەی وەهم و گومانەکان، بەهۆی ئەوەی زەینی مرۆڤ جوزئی‌یە و، هێزی وەهم و گومانیش بەسەریدا زاڵە.

ئەو پەردەیەی کە دەبێتە ڕێگر لە بینین و دەرکەوتنی "حەقیقەت" بریتی‌یە لە:

مەیلی نەیاری و.. گرتنی لایەنی ناحەز و.. پۆزش هێنانەوەی مرۆڤ بۆ خۆی بەوەی کە لایەنی دەروونی دەگرێ و.. گێڕانەوەی وەهم و گومانەکانی بۆ بنەچەیەکی جێی متمانە و.. بەدوادا گەڕانی وردە هەڵە و نەنگی‌یەکانی بەرامبەر و.. هێنانەوەی بڕوبیانووی منداڵانە و.. شتانی تری هاوشێوەیان.

جا ئەگەر توانیت خۆت لە هەموو ئەوانە دەرباز بکەیت، ئەوا مەرجەکەی منت هێناوەتە دی.

کەواتە بە دڵێکی بێدار گوێ ڕابگرە:

## مەبەستی یەکەم

هەموو یەکێك لە گەردیلـەکانی بوونـەوەران لـەو کاتـەدا کـە زات و سیفەتەکانی و سـەرجەم ڕووەکـانی لـە نێوان گریمانە بێ سـنوورەکاندان، کتوپـڕ دەبینـی ڕێبـازێکی دیـاریکراو دەگرێتەبـەر و، بـە ئاراسـتەیەکی تایبـەتیدا دەڕوات کـە چـەندین سـوود و بەرژەوەندیی ئەوتۆ بەرهەم دێنن ژیریی‌یەکان سەرسام دەکەن.

ئەمانـەش بەڵگـەن لەسـەر پێویستیی بوونـی خـوای گـەورە و شـایەتێکی ڕاسـتن لـە سـەری. لـە هـەمان کـاتدا درەخشـانیی ئیمـان پـتر ڕوون دەکەنـەوە کـە لـەناو لایەنـە پەروەردگاریی‌یـە نیانەکـەی مرۆڤدایـە، ئـەوەی کـە نموونەیـەکی جیهانـەکانی غـەیب دەنوێنێت.

بەڵێ، هەروەك هەموو گەردیلەیەك لە گەردیلەکانی گەردوون بـە زاتـی خـۆی و، بـە سیفەتەکانی و، تایبەتمەندیی‌یەکانی، بەڵگەیە لەسەر بەدیهێنەری بەخشندە، بە پارێزگـاری کردنیشـی بۆ هاوسـەنگیی یاسا گشتیی‌یەکانی گـەردوون، زۆر زیـاتر دەبێـت بـە بەڵگـە لەسەر ئەو بەدیهێنەرە. چونکە لـە هـەموو ڕێژە و پەیوەندیی‌یەکدا چەندین بـەرژەوەندیی جیاجیا و لە هەموو پلەیەکیشیدا گەلـێ سوودی مـەزن بەرهـەم دەهێنێـت، لەبـەر ئـەوەی بەشێکە لە چەندین پێکهاتەی تێهەڵکێشی بەرەو سەر هەڵچوو لە بەشـەکانی گـەردوونی فراواندا، ئـەوەش لـە ڕووی ئەو گریمانانـەی کـە لـە هـەموو پلەیـەکدا دەیانگرێتەبەر، بـە ڕادەیـەك کـە هـەموو بەڵگـەکانی بوونـی خـوای گـەورە لـە خۆیـدا دەخاتـە ڕوو بـۆ خوێنەرانی..

لەبەر ئەوە، بەڵگەکان لەسـەر بوونـی خـوای تـاك و تـەنیا زۆر زیـاترن لـە خـودی گەردیلەکان!

**ئەگەر دەڵێیت:** کەواتە بۆچی هەموو کەسێك بە ژیریی خۆی خوای گەورە نابینێت؟

**وەڵام:** لەبەر کەماڵی دەرکەوتنی خوای گەورە (جَلَّ جلالُه).

بەڵێ، گەلێ تەنی ماددی هەن - بە وێنەی خۆر - لەبەر زێدە ئاشکرایی و ڕوونییان بە چاو نابینرێن. ئەی دەبێ کردگاری مەزن چۆن بێت کە پاك و خاوێنە لە ماددیيەت؟

تأمَّلْ سُطورَ الْكائناتِ فإنَّها     منَ الْمَلإِ الأعلَى إلَيْكَ رَسائِلُ(١)

بە چاوی دانایی سەرنج لە لاپەڕەکانی کتێبی جیهان بدەو، ببینە کە چۆن بەدیهێنەری وێنەکێش زنجیرەی ڕووداوەکانی لەو دووری‌یە فراوانانەدا نووسیوەو، بە وردی بروانەرە ئەو نامانەی کە لە لایەن هاوڕازانی بلند(الملأ الأعلى)ەوە هاتوون، تاکو بەرەو بلندترین پلە بالاکانی دلنیایی بەرزت بکاتەوە.

ویژدانی مرۆڤ لەبەر ئەوەی دوو خاڵی (یارمەتی وەرگرتن و پشت پێ بەستنی) تێدا جێگیر کراوە، هەرگیز خوای گەورەی لەبیر ناچێتەوە، تەنانەت گەر "مێشك" دەستبەرداری کارەکانی خۆی ببێت هێشتا هەر "ویژدان"ی مرۆڤ خوای گەورەی لەبیر ناچێت، چونکە سەرقاڵە بەو دوو ئەرکە گرنگەوە، ئەویش بەم جۆرەی خوارەوە:

هەروەك دڵی مرۆڤ ژیان بە ناو هەموو شوێن و لایەکی جەستەدا بڵاو دەکاتەوە، "هەوێنی ژیان"ی ناو ویژدانیش - کە ناسینی خوای گەورەیە - ژیان لەناو سەرجەم ئاواتەکانی مرۆڤ و حەز و مەیلە جیاجیاکانی ناو بەهرە و توانا بێ سنوورەکانی - هەریەکەیان بەوەی کە بۆی بگونجێ - بڵاو دەکاتەوە. ئیتر لەم ڕێیەوە چێژ و لەزەتی تێدا دەپاڵێوێ و، نرخ و بەها و شان و شکۆی پتر بەرز دەکاتەوە، بگرە فراوانی و ساف و خاوێنیی پێ دەبەخشێ. ئەمە (خاڵی یارمەتی لێ وەرگرتن).

پاشان ناسینی خوای گەورە، تاقانە "خاڵی پشت پێ بەستن"ە بۆ مرۆڤ لە بەرامبەر تەپاوتل و ئاڵوگۆڕەکانی گێژەڵووکەی ژیان و، پاڵەپەستۆی گیروگرفتەکان و، بەدوای یەکداهاتنی گیرۆدەییەکان..

چونکە ئەگەر مرۆڤ باوەڕی بەو بەدیهێنەرە دانایە نەبێت کە سەرجەم فەرمانەکانی دانایی و ڕێسایە، بەڵکو کاروبار و ڕووداوەکانی بۆ ڕێکەوتە نابیناکان گێڕایەوەو، پاڵی

---

(١) کتێبی (قول علی قول)ی خوالێخۆشبوو (حسين سعيد الكرمي): ١١/١٥٧، پێی وایە ئەم بەیتە هی زانایەکی زانستەکانی "نەحو و تەفسیر"ە بە ناوی "رکن الدين بن القويع" کە خەڵکی توونسەو، بۆ خوێندن ڕۆشتووە بۆ قاهیرە، هەر لەوێش ژیاوە هەتا لە ساڵی (٨٣٨ك)دا کۆچی دوایی کردووە. (وەرگێڕ)

بەو ڕێکەوتانە و هێزە لاوازەکەی خۆیەوە دا کە بەرگریی هیچ شتێکی پێ ناکرێ، ئەوا لە سام و شکۆی ئەو بەڵا و گرفتانەی کە دەورەیان داوە مەترسی ڕووی تێدەکات و، لە بەردەمیاندا دەڕووخێت و، هەست بە چەند حاڵەتێکی ئازاربەخش دەکات کە ئازاری دۆزەخی یاد بخەنەوە. خۆ ئەمەش هەرگیز لەگەڵ کەماڵی ڕۆحی مرۆڤی ڕێزلێگیراودا ناگونجێ و یەك ناگرێت. چونکە داخوازی شۆڕبوونەوەی مرۆڤە بۆ دۆڵ و شیوی زەلیلی و ڕسوایی، دیارە ئەوەش دژی گیانی ئەو ڕێسا ڕێکوپێکەیە کە لە سەرانسەری گەردووندا جێبەجێ و دەستبەکارە.

ئەمەش (خالی پشت پێ بەستن)ە..

بەڵێ، مرۆڤ هیچ دالدە و پەنایەکی نییە جگە لە "ناسینی خوا"!

کەواتە "ویژدان" هەر بۆ خۆی لەم دوو پەنجەرەیەوە بەسەر ڕاستییەکاندا دەڕوانێت و، زاڵبوونی ڕێسا بەسەر هەموو جیهاندا دەبینێت. بەدیهێنەری بەخشندەش هەر لەم دوو پەنجەرەیەوە نووری ناسینی خۆی بڵاو دەکاتەوە و دەیهاوێتە ناو ویژدانی هەموو مرۆڤێك. ئیتر هەرچەندەش "ژیری" پێڵووەکانی لێك بنێ و چاوەکانی بنووقێنێ، هەر "سروشتی مرۆڤ" خواوەند دەبینێت و، چاوەکانی "ویژدان" هەمیشە والآن و، "دڵ"یش هەردەم پەنجەرەیەکی لەسەرپشتە.

**وریاکردنەوەیەك:**

ڕێبازەکانی بەرزبوونەوە بەرەو عەرشی "کەمالآت" کە ناسینی خوای گەورەیە، چوار دانەیە:

یەکەمیان: ڕێبازی زانا سۆفییەکانە، کە لەسەر بناغەی پاکژکردنی دەروون و، سلووکی ئیشراقی[1] دامەزراوە.

---

(١) (سلووکی ئیشراقی): ڕێبازێکی "تەسەووفی - فەلسەفی"یە بۆ گەیشتن بە خوای گەورە و بەڵگەهێنانەوە لەسەری. لەو باوەڕەدان کە ناسینی خوای گەورە بە وەرزشی ڕۆحی و پاکژکردنەوەی دەروون دەخرێتە ناخی مرۆڤەوە. سەرمەشقی ئەو ڕێبازە: کەسایەتیی فەلسەفیی ناوداری کورد شەهابەدینی سوهرەوەردی (سوورەبەردی)یە (سالی وەفاتی:٥٨٧ك). تێبینی: هەندێك لە لێکۆڵەران دەچن "ئیشراقییەکان" بە ئەهلی تەسەوف لە قەڵەم دەدەن و، هەندێکی تریش لەو باوەڕەدان کە لە دەرەوەی بازنەی تەسەوفدا بن، لەبەر ئەوەی ڕا و بۆچوونی جیاوازیان هەبووە کە هەندێکیان لەگەڵ ئیسلامدا یەك ناگرێتەوە و، ڕێڕەوەکەیان ئاوێتەیەکە لە فەلسەفەی ئەفلاتوونیی نوێ و ئایینی ئیسلام. (وەرگێڕ)

دووهەمیان: ڕێی زانایانی "کەلام"ە، کە لەسەر بناغەی "حدووث و ئیمکان"[١] بنیات نراوە.

هەرچەندە ئەم دوو بناغەیە دوو لقن لە قورئانی پیرۆزەوە پەلیان هاویشتووە، بەڵام مرۆڤ لە چەند شێوەیەکی تردا دایڕشتوونەتەوە و، دوو ڕێی پڕ لە گرفت و درێژ خایەنیان پێکهێناوە.

سێهەمیان: ڕێبازی فەیلەسووفەکانە.

ئەم سیانە لە دوودڵی و گومانەکان پارێزراو نین.

چوارەمیان: ئەو ڕێ میعراجییەی قورئانە کە بە ڕەوانبێژییە ئیعجازبەخشەکەی خۆی ڕایدەگەیەنێت و، لە گشتگیری و ڕاستەڕێیدا هیچ ڕێگایەك هاوتا و هاوشێوەی نییە. کەواتە کورتترین و ڕوونترین و نزیکترین ڕێیە بۆ لای خوای گەورە و، لە هەمووشیان گشتگیرترە بۆ ئادەمیزادەکان.

ئێمەش ئەم ڕێیەمان هەڵبژارد کە بەڵگەکانی دوو جۆرن:

**یەکەم: (بەڵگەی چاودێری)**

سەرجەمی ئەو ئایەتە پیرۆزانەی قورئان کە سوودەکانی شتان دەژمێرن، ئاماژە بۆ ئەم بەڵگەیە دەکەن و ڕێکی دەخەن.

پوختەی ئەم بەڵگەیە بریتییە لە: چاودێریی "دانایی" و "بەرژەوەندی"یەکان لە ڕێسای هەرە تەواوی جیهاندا. کە ئەوەش "ئامانج" و "دانایی" کردگار دەسەلمێنێت و، گومانی "ڕێکەوت" پووچەڵ دەکاتەوە.

**پێشەکی**

هەرچەند هەموو مرۆڤێك بۆ خۆی ناتوانێت بە تەواوی چاودێریی بەرژەوەندییەکان و بوونی ڕێکوپێکییەکان لە جیهاندا بخوێنێتەوە و، بە دوای هەموویاندا بگەڕێت و، ناتوانێت دەوراندەوریان بدات، بەڵام بەهۆی بەدوای یەکدا هاتنی بیر و هزرەکان لە گرۆی مرۆڤدا بە گشتی، بۆ هەر یەکێك لە "جۆر"ەکانی

---

(١) (حدوث) و (ئیمکان) : دوو زاراوەن بۆ دوو جۆر بەڵگەی "زانستی کەلام" لەسەر بوونی بەدیهێنەر. مامۆستا نوورسی بە شێوەیەکی ئاسانتر لەچاو سەرچاوەکانی "زانستی کەلام" لە چەند شوێنێکی پەیامەکاندا ڕوونی کردوونەتەوە. بۆ نموونە بڕوانە: (مەکتووبات، ل: ٨٤٨-٨٥٥). (وەرگێڕ)

بوونـەوەران "زانسـت"ێکـی تایبـەت پێکــهاتووە. ئـەو زانسـتەش ئـەنجامی ئـەو یاسـا و دەسـتووورە گشـتی و بەردەوامانـەن کـە لـە گـەردووندا کـار دەکـەن و، تـا ئێسـتاش ژێری‌یەکان بەردەوام زانستی یەك لە دوای‌یەکی تر دەدۆزنەوە..

جا لەبەر ئەوەی هەر شتێك ڕێسای تێدا نەبێت بڕیارێکی گشتی هەمووی ناگرێتەوە، ئەوا هەمەکی بوونی یاسا و دەستوور بەڵگەیە لەسەر جوانیی ڕێکوپێکیی ئـەو "جۆر"ەی بوونەوەران. جا لەسەر بناغەی ئەم هەمەکی بوونەی یاسـا و دەسـتوورەکان، هەریـەك لـە زانستە گەردوونی‌یەکان بەهۆی پشکنین و لێکۆڵینەوەی تەواو(الإستقراء التام) بـووە بـە بەڵگەیەك لەسەر ڕێسای هەرە تەواوی جیهان.

بەڵێ، دەرخستنی ئـەو بەرژەوەندییانـەی کـە پـەیوەندییان بـە زنجیرەی بوونەوەرانـەوە هەیە، بە هۆکاری زانستەکان و.. ڕوونکردنـەوەی سـوودەکانی ئـەو بەروبوومانـەی کـە لـەو بوونەوەرانـەوە شـۆڕ بوونەتـەوە و.. زەق کردنـەوەی دانـایی و سـوودە پـەرش و بڵاوەکـانی نـاو پێچـاوپێچی ڕووداوەکـانی هـەموو بارودۆخـەکان.. هـەموو ئەمانـە، شایەتی‌یەکی ڕاسـت دەدەن لەسـەر ئامـانج و مەبەستی کردگـاری دانـا و، ئامـاژەی بـۆ دەکەن و بە وێنەی ئەستێرەی کوناودەرکەر(النجم الثاقب) شەیتانی وەهـم و گومانـەکان دەردەکەن.

**ئاماژەیەك:**

ئەگەر خۆت لەو پەردەی "ڕاهاتن"ە دەرباز بکەیت کە هۆکاری نـەزانینی ئـاڵۆزە و، ڕوانیی ڕواڵەتی و سەرپێیی لای مرۆڤ دروست دەکات و، خۆت لەوە بێ نیاز کرد کـە هەوڵی دەمکوت کردنی لایەنی نەیار بدەیت کە هەوڵێکە وەهم و گومانەکان لە مرۆڤـدا موتوربە دەکات و ڕێگای بەرەو ژێری دادەخات، بەوەی کە تەنیا و تەنیا ملکەچی حـەق بیت و .. بڕوانیتە زیندەوەرێکی هێندە بچووك کە بە وردبین نەبێ نابینرێت و، بـە چـاوی خۆت ببینیت کە ئەو مەکینە بچووکە ورد و ناوازە خواییە چ بوونێکی ڕێکوپێـك و ورد لە خۆیدا دەردەخات، ئەوا هەرگیز ناتوانیت قەناعەت و دڵنیایی بە خۆت ببەخشیت کـە ئەم ئامێرە وردانە لە کارگەی هۆکـارە سروشتی‌یە بێ گیانەکانـەوە سـەریان هـەڵدابێت، کە هیچ هەست و نەستێکیان تێدا نی‌یـە و، بوارەکانیشیان بێ سنوورە و، هیچ کـام لـە

تواناکانیشیان لە پێش هیچی تریاندا نییە، مەگەر بتوانیت ئەو مەحاڵانە لا بدەیت کە ئەنجامی کۆبوونەوەی دوو شتی دژ بە یەکن (واتە هێزی کێش و هێزی پاڵنەر) لەو گەردیلە دابەش نەبووەدا!

جا ئەگەر دەروونت گریمانێك بۆ ئەم مەحاڵانە دابنێت، ئەوا ناوت لە تۆماری ئادەمیزادەکاندا لادەبرێت!

بەڵام دەگونجێ هەریەك لە هێزی "کێش و پاڵنەر و جووڵە" کە بە گومانی ئەوان بناغەی هەموو شتێکن، چەند ناوێك و چەند ناونیشانێك بن بۆ یاسا دەست بەکارەکانی خوای گەورە لە گەردووندا. بەڵام بەو مەرجەی یاساکان نەکرێن بە سروشتێکی خولقێنەر و، لەوە دەرنەچن کە شتێکی "زیهنی" بن و نەبن بە شتێکی "دەرەکی"ی بینراو، هەروەها لەوەی کە شتێکی ئیعتیباری(گوێرەیی)ن گۆڕانیان بەسەردا نەیەت و نەکرێن بە ڕاستییەکی بەرجەستە و، لەوەش کە ئامرازێکن لە ژێر کاریگەریدان، نەکرێن بە کاریگەرێکی ڕاستەقینە.

﴿فارجع البصرَ هل ترى من فطور﴾؟

(واتە: چاو بگێڕە، بزانە هیچ ناتەواوییەك دەبینیت)؟

نەخێر.. بینەر هەرگیز ناتەواوی لە بەدیهێنانی هیچ شتێکدا نابینێت، مەگەر بینایی دەروون و چاوی لەدەست دابێت، یاخود گرفتاری کورتبینی بووبێت.

ئەگەر دەتەوێت زیاتر لەمە تێبگەیت، فەرموو سەردانی قورئانی پیرۆز بکە، لەوێ بە تەواوترین شێوە "بەڵگەی چاودێری" لە ڕوخساری بوونەوەراندا دەبینیت، چونکە ئەو قورئانە پیرۆزەی کە فەرمان بە تێڕامان لە گەردوون دەدات، سوودەکانیش دەژمێرێت و نیعمەتەکانی خوای گەورەش دەخاتەوە یاد. جا ئەو ئایەتە مەزنانە دەرخەری ئەم بەڵگەیەن (بەڵگەی چاودێری).

ئەمەی کە باسمان کرد پوختەیەکە، دەستی لێ گیر بکە. درێژەپێدانەکەی لەو سێ کتێبەدا ڕاڤە دەکەین کە نیازمانە بیاننووسین لەبارەی باسی زانستەکانی ئاسمان و زەوی و مرۆڤ، وەك ڕێبازێك لە تەفسیری ئاسۆ و دەروونەکان (الآفاق والأنفس)دا، ئەگەر خوای گەورە ویستی لەسەری بێت و پشتمان بگرێ. ئەو کاتەش بە ڕوونییەکی تەواو ئەم بەڵگەیە دەبینیت.

**دووهەم بەڵگەی قورئان: "بەڵگەی داهێنان"ە.**

پوختەکەی بریتی‌یە لەوەی کە: خوای گەورە "بوون"ێکی تایبەتیی بە هەموو "دانە" و "جۆر"ێك بەخشیوە، کە شوێنی سەرهەڵدانی ئاسەوارە تایبەتی‌یەکانی و سەرچاوەی کەماڵاتە شایستەکانی خۆیەتی. ئیتر هیچ "جۆر"ێك هەتا ئەزەل زنجیرە نابەستێ، چونکە یەکێکە لە "مومکینات". جگە لەوەی کە پەیدابوونی بەشێکیان بە چاو دیارە و، بەشێکی دیکەش ژێری بە ڕوانینی دانایی دەیبینێ.

"هەڵگەڕانەوەی ڕاستی‌یەکان" مەحاڵە و، زنجیرەی "جۆری ناوەندی"ش بەردەوام نابێت. بەڵام "ئاڵوگۆڕی صنفەکان" جیایە لە هەڵگەڕانەوەی ڕاستی‌یەکان[1].

---

(١) لە زانستی مەنتیقدا شتانی هەمەکی (الکلیات) دەبن بە دوو بەش: (خۆیی، لاوەکی). خۆییەکەش دەبێ بە سێ بەش: (ڕەگەز، جۆر، فەصڵ). نموونەی ئەمانەش وەك: (زیندەوەر، مرۆڤ، ئاخاوتن). بە پێی ئەم دابەشکردنە مەنتیقی‌یە "ئاخاوتن" بە فەصڵ دادەنرێت، چونکە سیفەتێکی تایبەت بە جۆری "مرۆڤ"ە، کە ئەویش لە ڕەگەزی "زیندەوەر"ە. ئەمەی باسمان کرد کورتە ڕێگایەك بوو بۆ پەیوەندیی نێوان "جۆر و ڕەگەز". بەڵام بۆ تێگەیشتن لەو چەمکەی کە لە دەقەکەی دانەردا هاتووە، دەبێ بزانین کە زنجیرەی تەواوەتیی نێوان جۆر و ڕەگەز بەم شێوەیە:
(ڕەگەزی بنەڕەتیی ئەو شتانەی کە زەینی مرۆڤ دەرکیان پێ دەکات ← مومکین ← مەوجوود ← جەوهەر ← تەن ← تەنی بە نەشونما ← زیندەوەر ← مرۆڤ). هەریەك لە ئەڵقەکانی ئەم زنجیرەیە سەبارەت بە ئەڵقەکەی سەرووی خۆی پێی دەوترێ: "جۆر". جا ئەگەر ڕاستەوخۆ لەسەرروویەوە بێت، ئەوا ئەم ئەڵقەیە سەبارەت بەو "جۆری نزیك"ە، دەنا "جۆری دوور"ە. ئنجا هەریەکەشیان سەبارەت بەوەی خوارووی خۆی پێی دەوترێ: "ڕەگەز". جا ئەگەر ڕاستەوخۆ لە خوار خۆیەوە بوو، ئەم سەبارەت بەو "ڕەگەزی نزیك"ە، دەنا "ڕەگەزی دوور"ە. کەواتە هەر لە "مرۆڤ"ەوە بەرەو سەر تا دەگاتە "مومکین" پێیان دەوترێ: "زنجیرەی جۆرەکان". ئنجا سیفەتی "ئاخاوتن" - بۆ نموونە - لە مرۆڤدا پێی دەوترێ: "فەسڵ" چونکە مرۆڤ لە جۆرەکانی تری زیندەوەر جیا دەکاتەوە. بەڵام بەشەکانی مرۆڤ: (کورد، ئەڵمان، ڕەش پێست، سپی پێست.. هتد) پێی دەوترێ: "صینف".
دوای ئەم ڕوونکردنەوەیە دەگەڕێینەوە سەر ئەو چەمکانەی کە دانەر لێیان دوا:
کە دەڵێت: هەڵگەڕانەوەی ڕاستی‌یەکان مەحاڵە. مەبەستی ئەوەیە "بوون"ی هەموو دانە و جۆرێکی ئەم بوونەوەرانە حەقیقەتە و، مەحاڵە بە "نەبوو" دابنرێن. کە دەڵێت: زنجیرەی جۆری ناوەندیش بەردەوام نابێت: مەبەستی ئەوەیە کە - بۆ نموونە - لە نێوان "مرۆڤ" و "مومکین"دا چەند ئەڵقەیەکی تر هەیە و هەریەکەیان سەبارەت بەوەی سەرووی خۆی بە "جۆر" دادەنرێت، بەڵام ئەوانە لە شوێنێکدا کۆتاییان پێ دێت و هەرگیز ناکۆتا نین. کە دەشڵێت: ئاڵوگۆڕی صنفەکان جیایە لە هەڵگەڕانەوەی ڕاستی‌یەکان، مەبەستی ئەوەیە کە - بۆ نموونە - گۆڕانی "کورد" بە "ئەڵمان" دوای چەند وەچەیەك، ئەوە ناگەیەنێت کە ڕاستی‌یەکان هەڵگەڕابێتنەوە. (وەرگێڕ)

جا لەبەر ئەوەی هەموو "جۆر"ێك ئادەمێك و باپیرە گەورەیەکی خۆی هەیە، ئەوا وەچەکەوتنەوەی ناو زنجیرەی هەموو جۆرەکان هەرگیز ئەو ئادەم و باپیرە گەورانە ناگرێتەوە و گومانی لەو جۆرە سەبارەت بەوان گومانێکی بەتاڵە..

ئەوەتا فەلسەفە و زانستەکانی زەوی ناسی و زیندەوەرزانی و ڕووەکزانی شایەتی دەدەن کە جۆرەکانی زیندەوەران - کە لە دووسەد هەزار جۆر زیاترن - هەریەکەیان سەرەتا و بنەچەیەکی دیاریکراو و باپیرە گەورەیەکی هەیە کە وەکو "ئادەم"ی ئەو جۆرە وایە، هەریەك لەو سەرەتایانەش بە سەربەخۆ و جیاجیا لە غەیری خۆی بەدی هاتووە. یەك بە یەکی ئەو جۆرە زۆر و زەبەندانەش وەکو مەکینەیەکی ناوازەی سەرسووڕهێن وان کە تێگەیشتنەکان سەرسام دەکەن..

کەواتە ناگونجێت یاسا وەهمی و گوێرەییەکان و هۆکارە سروشتییە کوێر و نەزانەکان بەدیهێنەری ئەم زنجیرە سەرسووڕهێنەرەی "دانە" و "جۆر"ەکان بن، تەنانەت لە بەدیهێنانیاندا دەستەوسانی ڕەهان.

واتە هەموو "تاك" و هەموو "جۆر"ێك بۆ خۆی ڕایدەگەیەنێت کە سەربەخۆ لە دەستی توانستی دانای خوای گەورەوە بەدی هاتووە.

بەڵێ، کردگاری مەزن مۆری "حدووث و ئیمکان"ی لە ناوچەوانی هەموو شتێك داوە.

گریمانی پێکهاتنی جۆرەکان لە ئەزەلییەتی ماددە و، جووڵەی هەڕەمەکی و، بۆچوونە ناڕەواکانی تر، تەنها لەبەر قەناعەت پێکردنی دەروونە بە شتێکی دیکەی جگە لە "ئیمان بە خوا"! ئەم گریمانەش لە پەی نەبردن و، بێ کەڵکیی هزر و، ڕوانینی ڕووکەشی سەرپێیی نەبێ سەر هەڵنادات. بەڵام ئەگەر مرۆڤ ڕاستەوخۆ بیەوێت بگاتە "ڕاستی" لە قەناعەت بەخۆکردندا ئەوا بێ گومان مەحاڵی و ئەستەمیی ئەو بۆچوونەی بۆ دەردەکەوێت و، دەزانێ چەندە لە مەنتیق و ژیرییەوە دوورە. خۆ ئەگەر باوەڕی پێ بکات مەگەر بە ناچاری و خۆگێل کردن لە بەدیهێنەری مەزن!

مرۆڤ، کە لە ڕووی گەوهەری مرۆڤێتییەکەیەوە بوونەوەرێکی بەڕێزە، هەمیشە عەوداڵی "حەق"ە و، هەردەم بە شوێن "حەقیقەت"دا دەگەڕێت و، بەردەوام سۆراخی

"بەختەوەری" دەكات. بەڵام لە دەمی گەڕانی بە شوێن حەقدا، بە بێ ئەوەی هەست بكات، ڕێی لە ناحەق و گومڕایی دەكەوێت و، لەو كاتەشدا بە شوێن حەقیقەتدا دەكەوێتە پشكنین و لێكۆڵینەوە، بە بێ ئەوەی خۆی بیەوێ، ناحەق بەر سەری دەكەوێ..

واتە هەركات لە دۆزینەوەی "حەق"دا دەستەوسان ما و لە بەدەستهێنانی "حەقیقەت"یش نائومێد بوو لە ناچاریدا شتی مەحاڵ و بەدەر لە ژیری، بە ڕوانینی سەرزارەكی و شوێنكەوتە، قبووڵ دەكات، هەرچەندەش بە سروشتی ڕەسەن و ویژدان و بیری خۆی و بەوپەڕی دڵنیایی دەزانێت كە ئەوە ئەستەم و مەحاڵە.

ئەم "ڕاستی"یە بە گرنگی و بایەخ پێدانەوە وەربگرە و، لە پێش چاودا دایبنێ..

ئەو شتەی كە ئەوان لە ئەنجامی خۆ گێل كردنیان لە ڕێسای جیهان، بە گومانی خۆیان، بە "ئەزەلییەتی ماددە و جووڵە" لێكی دەدەنەوە.. هەروەها ئەو "ڕێكەوت"ە هەڕەمەكی‌یەش لە ئەندێشەیاندایە بۆ بەدیهاتنی ئەم سنعەتە ناوازەیەی كە ژیری‌یەكان سەرسام دەكات و.. باوەڕبوونیشیان بە كاریگەریی ڕاستەقینەی "هۆكار"ە بێ گیانەكان، سەرباری شایەتیدانی هەموو حیكمەتەكان لەسەر نەبوونی كاریگەرییان و.. ئەوەش كە خۆیانی پێ بە هەڵە دەبەن و دڵی خۆیانی پێ دەدەنەوە كە هەموو شتێك دەگێڕنەوە بۆ "سروشت"ێكی وەهمی و ئەندێشەیی بەرجەستەبوو، بەهۆی بەردەوامبوونی لەخشتە بردنیان لەلایەن وەهمەكانەوە.. سروشتیان سەرجەمی ئەم مەحاڵ و وەهمانە پووچەڵ دەكاتەوە و دەست بە ڕوویانەوە دەنێت!

بەڵام هەركات مرۆڤ ڕاستەوخۆ ڕوو بكاتە "حەق" و مەبەستی بێ پێی بگات، لەم لا و لەو لای ڕێگادا ئەم وەهمانە خۆیانی پێش چاو دەخەن، بێ ئەوەی كە ئەم بانگهێشت یاخود داوای كردبن، ئنجا ئەو كەسەی كە ڕوانینی خۆی ئاراستەی مەبەستەكەی بكات و ئامانجەكەی لە پێش چاوی خۆی دابنێت، بە ڕوانینی سەرپێیی و ڕووكەش دەڕوانێتە ئەو وەهمانە، بێ ئەوەی بڕواتە ناو ناوەرۆك و ناواخنە پڕ لە چەپەڵی‌یەكانی. خۆ ئەگەر ڕاستەوخۆ ڕوو بكاتە ئەو وەهمانە و نیازی وابێت كە بیانكرێت، دەبینێ شایانی تەنانەت ئاوڕلێدانەوەش نین، چ جای كڕینیان!

بگرە "ویژدان"ی بێزیان لێ دەکاتەوە و، "ژیری" بە ئەستەمیان دەزانێ و، "دڵ"یشی پێیان تێکەڵ دێت. مەگەر ئاژاوە بۆ خۆی بنێتەوە و، "سەفسەتە" بیورووژێنێ و، لە هەموو گەردیلەیەکدا ژیری دانایان و سیاسەتی کاربەدەستان قبوول بکات، تاکو لەگەڵ هەموو گەردیلەیەکی تردا پرس و را بکەن و لەگەڵ دەستە خوشکەکانیدا ببنە دراوسێ و لەسەر رێکوپێکی یەك بگرن! جا ئەم رێبازە - کە ئەمە حاڵیەتی - تەنانەت ئاژەڵیش قبوولی ناکات! بەڵام چار چییە کە لازمی بەڵگەکە لە هەمان رێبازەوە سەرچاوەی گرتووە و، ئەم رێبازەش بەم شێوەیە نەبێ پێش چاو ناخرێ.

بەڵێ، سروشتی "ناحەق" وایە کە ئەگەر مرۆڤ بە روانینی شوێنکەوتە و سەرپێیی بۆی بروانێت، ئەوا گریمانی ئەوەی بۆ دادەنێت کە راست بێت، بەڵام ئەگەر بە وردی سەرنجی بدات ئەو گریمانە لادەچێ و دوور دەخرێتەوە.

ئەوەی کە پێی دەڵێن "مادده" هەرگیز لە شکڵ و شێوە جیاوازەکان و جووڵە بەدیهاتووە لەناوچووەکان دانابڕێت و جیا نابێتەوە. واتە: پەیدابوون و بەدیهاتنی مادده راستەقینەیەکی بێ گومانە.

جا ئایا کەسێك کە ژیرییەکەی جێی تێگەیشتنی ئەزەلییەتی خوای گەورەی تێدا نەبێتەوە - کە سیفەتێکی لازم و پێویستی زاتی شکۆمەندی ئەوە - چۆن جێی ئەزەلییەتی ئەو ماددەیەی تیا دەبێتەوە کە بە شێوەیەکی رەها دژی ئەزەلییەتە؟!

بە راستی ئەمە جێی سەرسوورمانە!!

تەنانەت مرۆڤ کاتێ بیر لەوانە دەکاتەوە کە ئەم بەدیهاتووە ناوازانە بۆ رێکەوتی کتوکوێر و جووڵەی گەردیلەکان دەگێرنەوە و، بە کارێکی دوور و نامۆی دەزانن کە لە دەستی کردگاری شکۆمەندی خاوەن هەموو سیفەتە کامڵەکانەوە سەرچاوەیان گرتبێ، مرۆڤ کە بیر لەوانە دەکاتەوە لە مرۆڤێتیی خۆی پەشیمان دەبێتەوە!

**ئاماژەیەك:**

ئەو هێز و شێوە و وێنانەی کە - وەك دەڵێن - دەرەنجامی جووڵەی گەردیلەکانە، لەبەر ئەوەی "عەرەز"ن و "عەرەز"یش نابێت بە "جەوهەر"[(١)] ئەوا بە جیاوازیی

---

(١) "عەرەز" (العَرَض) ئەو شتەیە کە بۆ "بوون"ی پێویستی بە جێیەك هەبێت کە بەهۆیەوە دەربکەوێت، بە پێچەوانەی "جەوهەر" کە زیاتر ماهییەتی شتەکان دەگرێتەوە، چ موجەررەد بن، وەك "دەروون" و "ژیری" چ

"جەوهەریی" نێوان جۆرەکان دانانرێن. بەو واتایەی کە "فەصل"ەکانی ئەم "جۆر"انە[١] و تایبەتمەندیی جوداکەرەوەی عەرەزەکان بە گشتی تێکڕا لە "نەبوون"ی ڕووت و پەتی داهێنراون و، وەچەکەوتنەوەی زنجیرە لێبوونەوەش تەنها بەشێکن لە مەرجە ئاساییەکان.

ئەمە پوختەی "بەڵگەی داهێنان"ە. خۆ ئەگەر دەتەوێ بە ڕوونی و درێژی لێی تێبگەیت، ئەوا فەرموو برۆ بۆ ناو باخچەکانی قورئانی پیرۆز، چونکە هیچ شتێك نییە - لە تەڕ و لە وشك - تیایدا ڕوون نەکرابێتەوە.

خۆ ئەگەر خوای گەورە ویستی لەسەر بێت و، پشتم بگرێت و، ئەجەلیش یارمەتی بدات، ئەوا ئەو مرواریيانەی کە ئەم بەڵگەیە دەڕازێننەوە پێش چاو دەخەم و، لە صەدەفی وشەکانی قورئان دەریان دەهێنم.

**ئەگەر دەڵێیت:**

ئەم "سروشت" و "یاسا" و "هێز"انە چین کە خۆیانی پێ دەخلافێنن؟

**وەڵام:**

"سروشت" یاسایەکی فیترییی خوای گەورەیە، کە ڕێسایەکی وردی لەناو کردار و توخم و ئەندامەکانی جەستەی بوونەوەراندا، کە پێی دەوترێ "جیهانی بینراو" خستووەتە کار. هەر ئەم یاسا فیترییەی خوایە کە پێی دەوترێت "سروشت" و "چاپخانەی خوایی".

بەڵێ، "سروشت" دەرەنجام و پوختەی ئەو کۆمەڵە یاسا گوێڕەییانەیە کە لە گەردووندا ڕایی دەبن.. ئەوەش کە پێی دەڵێن "یاساکان" هەریەکەیان بڕیارێکی ئەو یاسا و شەریعەتەیە.. "یاساکان"یش هەریەکەیان بابەتێکە لە بابەتەکانی ئەو شەریعەتە..

---

نا موجەڕڕەد بن، وەکو "تەن" و "شێوە". بۆ زیادە ڕوونبوونەوەی ئەم زاراوە فەلسەفییە بڕوانە: "التعريفات"ی جورجانی. (وەرگێڕ)

(١) "جۆر"(نوع) و "فەصل": دوو زاراوەی زانستی "مەنتیق"ن. لەم زانستەدا "نەوع" بەو چەمکە گشتییە دەوترێت ماهییەتی هاوبەشی ئەو شتە جیاوازانە بگرێتەوە کە خاڵێکی هاوبەش یەکیان دەخات. وەك: (مرۆڤ، بولبول، ئاسك.. هتد) کە هەریەکەیان "نەوع"ێکن لە "ڕەگەز"ی (زیندەوەر). بەڵام "فەصل" چەمکێکی گشتییە تەنها ئەو بەشەی ماهییەت دەگرێتەوە کە "نەوع"ە هاوبەشەکانی ناو یەك ڕەگەز لە یەك جیا دەکاتەوە. بۆ نموونە کە بە (مرۆڤ) دەوترێ: "گۆیا" ئەوا بە "فەصل" دادەنرێت، چونکە مرۆڤ لە "نەوع"ەکانی تری ڕەگەزی (زیندەوەر) جیا دەکاتەوە. (وەرگێڕ)

بەڵام لەبەر ئەوەی بڕیارەکانی ئەم شەریعەتە بەردەوامن و، بابەتەکانیشی نەگۆڕن و، لەبەر ئامادەباشیی ئەو دەروونانەش کە ئەندێشە بە حەقیقەت دەبینن و هەر بەو جۆرەش پیشانی دەدەن، ئەوا "ئەندێشە" خۆی سەپاند و، تێگەیشتنەکانی لە سنوورێکی بەرتەسکدا هێنایەوە یەك، ئیتر "سروشت" بەرجەستە بوو هەتا بووە خاوەن بوونێکی دەرەکی و، لە جیهانی "ئەندێشە"وە دابەزی بۆ جیهانی میسال. دیارە "وەهم"یش فڕوفێڵی یەکجار زۆری هەیە کە برەویان پێ دەدرێت.

بەڵام نە "ژیری" قەناعەت دەکات و، نە "هزر و بیر"یش بۆی دەچێت و، نە "ڕوانینی حەقیقەت"یش لەگەڵ ئەوەدا هاودەنگە کە ئاسەوارەکانی ئەو توانستەی ژیرییەکانی تێدا سەرسامە، لە دەستی سنعەتی ئەم سروشتە دەرهاتبن کە لە چاپخانە دەچێت، یان لە شتانێکەوە کە ناوی "هێزە گشتییەکان"یان لێ دەنێن. چونکە چ "سروشت" و چ "هێزەکان" پێویستیان بە توانا و لێهاتنێکی ئەوتۆیە کە بە هۆیەوە بتوانن "سەرچاوە" یان "هۆکار"ی بوونی ئەم بوونەوەرانە بن..

کەواتە هەر تەنها خۆ گێل کردنە لە خوای گەورەی دانا و، ڕێکوپێکیی لە بەرچاوی گەردوونە کە ڕایاندەپێچێت لە ئەنجامدا بکەونە ئەندێشەی ئەوەی "سروشت" سەرچاوە بێت، لە کاتێکدا کە جگە لە ڕاستەی پێوانەکردن هیچ شتێکی تر نییە. هەوڵدانی بەرهەمهێنانی "الملزوم الاخص"یش لە "اللازم العام"[(١)] تەنها قیاسێکی نەزۆکە. هەر ئەم قیاسە نەزۆکەشە کە ڕێگا زۆر و زەبەندەکانی بەرەو دۆڵ و شیوی گومڕایی و سەرسامی لە مرۆڤ کردووەتەوە.

"شەریعەت" و "یاسا" ڕێکخەری کردارە ئیختیارییەکانن. وێڕای زۆریی لادان و خرووقات لەو یاسایە، کەچی زۆرێك لە خەڵکانی نەزان پێیان وایە "شەریعەت" دادوەرێکی ڕۆحانی بێت و، ئنجا "ڕێسا"ش بە وێنەی پادشایەکی مەعنەوی تێدەگەن و، لەو ئەندێشەیەدان کە ئەو دادوەر و پادشایە کاریگەرییان هەبێت!

---

(١) ئەمانە زاراوەی زانستی "مەنتیق"ن. وا لێرەدا نموونەیەك دەهێنینەوە بۆ تێگەیشتن: (بەرکەوتنی ئاو لە زەوی داخوازی تەڕبوونی زەوییە). ئەم داخوازییە پێی دەڵێن: (اللازم العام). بەڵام مەرج نییە لە هەموو تەڕبوونێکی زەویدا بڵێیت: "ئەوە هی بارانە". کە لێرەدا باران (الملزوم الاخص)ی پێ دەوترێ، چونکە دەگونجێ ئەو تەڕبوونە هی هۆکارێکی تری جگە لە باران بارین بێت. (وەرگێڕ)

ئەو دەشتەکی‌یەی کە شارستانێتیی نەدیوە، گەر لەناو تیپێکی سوپادا جوولەی سەربازەکان ببینێت کە بەردەوام دووپات دەبنەوە و، چەند ڕەفتار و بارودۆخێکی ڕێکوپێك و پەیوەستن بە یەکەوە، دەکەوێتە گومانی ئەوەی کە یەك بە یەکی ئەو سەربازە زۆرانە، یان ئەو دەستە سەربازی‌یە، بە پەتێکی مەعنەوی پەیوەستی یەکتر بن!

یان کەسێکی نەزان، یاخود مرۆڤێکی خاوەن سروشتی شاعیرانە ئەو "ڕێسا"یە بە خاوەن بوونێکی مەعنەوی دەبینێت کە خەڵکی بە یەکەوە پەیوەست دەکات.. یاخود "شەریعەتی گەردوونی" بە خەلیفە و پادشایەکی ڕۆحانی تێدەگات!

بەم جۆرە، ئەو کەسەش کە یاسا فیتری‌یەکەی خوای گەورە، کە پەیوەندیی بە بارودۆخەکانی بوونەوەرانەوە هەیە، بە "سروشت" دەزانێت، لە ڕاستیدا زیادەڕەوی دەکات، لە کاتێکدا کە ئەو شەریعەتە (لەبەر ئەوەی دەست بەکار و بەردەوامە) مەگەر لەبەر ڕێزنان لە پێغەمبەران - دروودیان لەسەر بێ - و پیاوچاکان - خوا لێیان خۆش بێت - دەنا بۆ کەسێکی تر لەکار نەخراوە. جا ئیتر چۆن وەهمەکان لەسەر ئەم جۆرە بۆچوونانە بەرجەستە و کەڵەکە نابن؟!

هەروەك بیستن و ئاخاوتن و تێبینی و بیرکردنەوەی مرۆڤ شتێکی جوزئی‌یە و، یەك لە دوای یەك پەیوەندی بە شتانی دەوروبەرەوە دەکات، هیممەتەکەشی بە هەمان جۆر جوزئی‌یە و، تەنها بە نۆرە و یەك لە دوای یەك پەیوەندی و سەرقاڵیی بە شتانەوە بۆ دروست دەبێت.

پاشان نرخی مرۆڤ بە ڕێژەی ناوەرۆك و ماهییەتەکەیەتی، کە ئەویش بە پلەی هیممەت و لێبڕانیەتی، کە ئەویش بە ئەندازەی گرنگیی ئەو ئامانجەیە کە سەرقاڵە پێیەوە.

پاشان مرۆڤ ڕوو بکاتە هەر شتێك تیایدا دەتوێتەوە و بەندی دەبێت، وەك بڵێی ناوەرۆکی "الفناء فی المقصد" لەودا هاتبێتە دی.

جا لەسەر بناغەی ئەم خاڵە، دەبینی خەڵکی لە داب و عورفی خۆیاندا شتی بێ نرخ و هەندەکی نادەنە پاڵ کەسێکی گەورە، بەڵکو دەیدەنە پاڵ هۆکارەکان، چونکە بە گومانی خۆیان پێیان وایە سەرقاڵ بوونی ئەو کەسە گەورەیە بە شتێکی بێ نرخ لەگەڵ ویقاری ئەودا ناگونجێت و، دانابەزێتە ئاستی و، شتی بێ نرخ جێی هیممەتی مەزنی

ئەوی تیا نابێتەوە و، شتانی بچووك و سووکەڵەش لەگەڵ ئەو هیممەتە مەزنەی ئەودا هاوسەنگ نابێت.

پاشان سروشتی مرۆڤ وایە کە هەرکات بیر لە شتێك بکاتەوە، لە "خۆی"دا بۆ پێوەر و بنچینەکانی ئەو شتە دەگەڕێت. خۆ ئەگەر ئەو پێوەرانەی لە خۆیدا شك نەبرد، لە دەوروبەری و لەناو هاوڕەگەزەکانیدا چاوی بۆ دەگێڕێت، تەنانەت کاتێك بیر لە خواوەندی "واجب الوجود" دەکاتەوە - کە لە بوونەوەران ناچێت - هێزی وەهم و گومانی ڕایدەپێچن کە ئەو وەهمە خراپە ناوبراوە بکات بە دەستوور و، ئەو قیاسە خەڵەتێنەرەش وەك دووربین بەکاربهێنێت! لە کاتێکدا کە نابێ لەم خاڵەوە بۆ خوای گەورە بڕوانرێت، چونکە توانستی ئەو سنووری نییە، لەبەر ئەوەی توانست و زانست و ویستی خواوەند بە وێنەی ڕووناکیی خۆر وایە - ولله المثل الاعلى - گشتگیر و گشتییە بە هەموو شتێك، ئەوەتا وەکو یەك پەیوەندی بە گەورەترین شت و بە بچووکترین و بێ نرخترین شتیشەوە دەکات. کەواتە پێوەری مەزنیی خوای گەورە و تەرازووی کەماڵی خواوەند، کۆی ئاسەوارەکانیەتی، نەك یەك بە یەکی بەشەکانی، چونکە دەست نادەن پێوەری ئەو کەماڵە مەزنە بن.

بەم جۆرە دەرکەوت کە قیاسی خوای گەورەی "واجب الوجود" بە بوونەوەرە مومکینەکان، قیاسە لەسەر شتێکی جیاواز لەو. هەروەك هەڵەیەکی سەرتاسەرییە کە مرۆڤ بچێت بەو وەهمە ناحەقە ناوبراوە داوەریی ژیری ئەنجام بدات.

هەر لەسەر بناغەی ئەم هەڵەیەی کە ئەدەب ناشیرین دەکات و، بەهۆی زاڵبوونی وەهمی ناڕەوا، "سروشت پەرستان" باوەڕیان بە کاریگەریی ڕاستەقینەی هۆکارەکان بۆ پەیدا بووە و.. "موعتەزیلە"ش وتوویانە: "زیندەوەر بۆ خۆی بەدیهێنەری کردارە ئیختیارییەکانی خۆیەتی" و.. "فەیلەسووفەکان"یش نەفیی ئەوەیان کردووە کە خوای گەورە زانیاریی لەبارەی شتە جوزئییەکانەوە ببێت و.. "مەجووسەکان"یش وتوویانە: "شەڕ بەدیهێنەرێکی تری جگە لە خوای گەورەی هەیە". چونکە هەموو ئەوانە لە وەهمی خۆیاندا پێیان وا بووە خوای گەورە چۆن دەچێ بە مەزنی و گەورەیی و پاکوخاوێنیی خۆی دادەبەزێتە پلەی سەرقاڵبوون بەم کاروبارە جوزئی و بێ نرخانەوە!

دەسا نەفرەت لە ژیریی هەریەك لەوان كە خۆی دیلی ئەم وەهمە ناڕەوایە كردووە!

برای بەڕێز!

ئەم وەهمـە ئەگـەر لـە ڕووی "بـاوەڕ"ەوە سـەر هەڵنـەدات، ئـەوا لەوانەیـە لـە ڕووی "وەسوەسە"وە بەسەر ئیمانداراندا زاڵ ببێت.

**ئەگەر دەڵێی:**

"بەڵگەی داهێنـان" بریتیـیە لـە بەخشـینی "بـوون". خـۆ بەخشـینی بوونیـش هاودەمـە لەگەڵ نەهێشتن و لەناودانی شتی خاوەن بووندا. لە كاتێكدا ژیرییەكانمان جێی ئەوەی تێدا نابێتەوە كە "بوون" لە "نـەبوون"ی پـەتی پـەیدا ببێـت و، بوونـی پـەتی و ڕاستەقینەش هەڵگەڕێتەوە و ببێت بە نەبوونی تەواوەتی؟

**وەڵام:**

كاكە! ئەوەی ئێوە بە لاتانەوە قورس و نامۆیە لـە تێگەیشـتنی ئـەم باسـەدا، ئـەنجامێكی ترسناكە و هـی قیاسـێكی خەڵەتێنـەری سـەر لـێ شـێوێنە. چونكـە بەدیـهێنان و داهێنـانی "خوای گـەورە" بـۆ هـەر شـتێك بـە وێنـەی دەسـكەوت و سنعەتی بـەندەكان تێدەگـەن و لێكی دەدەنەوە. لە كاتێكدا كە "بـەندە" لـە مراندن و زیندووكردنەوەی گەردیلەیەكدا دەستەوسانە و، جگە لە "سنعەت" و "دەسكەوت" هیچ بوارێكی تری لە شتە گوێرەیـی و پێكهاتووەكاندا بۆ نییە.

بەڵێ، ئەمە پێوەرێكی خەڵەتێنەرە، مرۆڤ لێی دەرباز نابێ.

**پوختەی ئەم قسانە ئەوەیە كە:**

لەبەر ئەوەی مرۆڤ هێز و توانایەكی ئەوتۆی لە بوونەوەراندا نەبینی كـە هـی خۆیـان بێت و، بەهۆیەوە بتوانێـت شتان لـە نـەبوونی تەواوەتییەوە بـەدی بـهێنێت، ئـەوا دەچـێ بڕیارەكانی لەسەر بناغەی بینینـەكانی دادەمـەزرێنێ و بنیاتیـان دەنێـت، ئـەوەتا لـە ڕووی مومكینـات(بوونـەوەران)ەوە دەڕوانێتـە ئاسـەوارەكانی خـوای گـەورە، لـەكاتێكدا كـە دەبـوو لـە ڕووی (توانستی خوایـی)ەوە بـۆی بڕوانیبایـە، كـە توانستێكە بـە ئاسـەواری سەرسووڕهێنی خۆی بێ گومان و سـەلماوە. دەبینـی گرێمـانی كردگـاری مـەزن لـە هێز و توانای ئەو بەندانەیدا دەكات كە كاریگەرییان تەنها لە شتە گوێرەییەكان (واتە لە هێزی

وەهمی)دا هەیە، ئیتر لەم گۆشەیەوە دەڕوانێتە بابەتەکە، لە کاتێکدا کە دەبوو لە لایەنی توانستی تەواوی "واجب الوجود"ەوە بۆی بڕوانیایە.

**ئاماژەیەك:**

ئەگەر لە داوەری‌یەکی ژیریدا ئاسەوارەکانی هەر کەسێك بە هەند وەربگریت، دەبێ تایبەتمەندی‌یەکەشی لەگەڵدا ڕەچاو بکەیت. کەچی ئەم یاسایە لەم مەسەلەیەدا وەرنەگیراوە! ئەوەتا لە ناوەندی دەستەوسانیی بەندە و لە ژێر پەردەی قیاسی تەمسیلیی[1] توانستی بوونەوەراندا سەیری توانستی خوایی کراوە!

کەچی ئێمە لە پێکهاتن و دروستکردنی جیهاندا دەبینین کە خوای گەورە هەندێ لە بوونەوەران بە داهێنان - واتە بێ مادذە - و بەشێکی تریش بە دروستکردن - واتە لە مادده - بەدی دەهێنێت. ئیتر بەم جۆرە، ئەم هەموو ئاسەوارە درەخشان و ناوازە و ئیعجازبەخشانەی لەم بوونەوەرانەدا بڵاو کردووەتەوە و، بە ئاشکرا توانستی ڕەهای خۆی پێش چاو خستووە.

جا ئەگەر مرۆڤ ڕوانینی خۆی لەمە وەربچەرخێنێ و، بەهۆی پێوەرێکی خەڵەتێنەر "نادیار" وەك شتانی دیار و لەبەرچاو ببینێت، یان هاوڕەگەزەکانی خۆی خستە ئەو داوەری‌یە ژیری‌یە، واتە لەم گۆشە سنووردارەوە بڕوانێتە خواوەندی "واجب الوجود" ئەوا زۆر لەو شتانەی کە ژیریی ساغ بەلایەوە ڕاست و ڕەوایە ئەو بە وەهمی خۆی دوور لە "ژیری"یان دەبینێت!

---

(١) "قیاسی تەمسیلی" بریتی‌یە لە شوبهاندنی شتێك بە شتێکی دیکە و هەڵێنجانی بڕیارێك لەسەر ئەو بناغەیە. ئەو قیاسەش دوو جۆرە. یەکێکیان پێوەرێکی هەڵەیە و پێی دەڵێن: "قیاسی فاسید" وەك ئەوەی کە ئەگەر کەسێك لە زانستێك یان لە پیشەیەکدا کارامە بێت، ئیتر لەسەر ئەو بناغەیە و بە بێ هیچ بەڵگەیەکی تر، وا گومان ببرێت کە لە هەموو زانست و پیشەیەکی دیکەشدا کارامە بێت! کورد بەم جۆرە قیاسە دەڵێت: "قیاسی کەشك لەسەر مشك"! (بڕوانە: "پەندی پێشینان"ی مامۆستا شێخ محەممەدی خاڵ، چاپی چوارەم، ٢٠٠٧ز، پیتی قاف، پەندی ژمارە: ١١١). دووهەمیان قیاسێکی ڕاستە. وەك ئەوەی ئەندازیارێکی بیناساز بە زانیاری و کارامەیی خۆی کۆشکێکی ناوازە بنیات بنێت و، ئەو کارەشی بکرێت بە قیاس (پێوەر) بۆ ئەوەی کە هەمان ئەندازیار دەتوانێ کۆشکێکی تر لە وێنەی ئەوەی پێشوو دروست بکات. قورئانی پیرۆز ئەم قیاسە بەکاردەهێنێت و، کرداری زیندووکردنەوەی دوای مردن دەداتە پاڵ هەمان ژیانبەخشی یەکەم جار، کە توانستی ناوازە و کارە دەراساکانی لە کرداری بەدیهێنانی یەکەمدا لە پێش چاودایە. بۆ زیادە ڕوونبوونەوەی ئەم پێوەرە بڕوانە: (وتەکان) لاپەڕە: ٧٧٧-٧٨٠، هەروەها (پەیامی حەشر و پاشکۆکانی کە لە (وتەکان)دا دەکەوێتە لاپەڕەکانی: (٥٩-١٧١). (وەرگێڕ)

ئەگەر ڕوانینی خۆمان لە "شتە داهێنراوەکان" وەربچەرخێنین، ئەوا هەر ئەو یاسا سەرسووڕهێنەرانەی "ڕووناکی" - کە نووری چاوی جیهان و درەخشانترینی بوونەوەرانە - هەروەها یاسا ناوازە بچووککراوەکانی لە چاوی مرۆڤدا کاتێ وێنە و شێوەکان لەسەر تۆڕی چاودا پیشان دەدات و ژیرییەکان دەستەوسان ماون لە شیکردنەوەیدا..

دەڵێم: هەر ئەم یاسایانەی کە بە دوور لە ژیری دادەنرێن گەر بکرێن بە پێوەرێك بۆ تێگەیشتن لە کەماڵی توانستی خوای گەورە، ئەوا مرۆڤ لەو توانستە تەواوەی خوای گەورە تێدەگات و، بە ئاسایی دەزانێت و، لە نێوان پێڵووی چاوەکانی ژیریدا دەیبینێت و دەیسەلمێنێت.

هەروەك شتانی "نەزەری" لە شتانی "زەرووری" بەدەست دێن، بە هەمان جۆر شتانی زەروریی ئاسەوار و سنعەتی خوای گەورەش بەڵگەیەکە - چۆن بەڵگەیەك! - لەسەر سنعەتە نادیارەکانی و، هەردووکیان پێکەوە ئەم بابەتە دەسەلمێنن.

ئایا دەکرێ ژیریی مرۆڤ تەسەووری سنعەتێکی وردتر و سەرسووڕهێنتر و نامۆتر بکات لە سنعەتی خوای گەورە لەم ڕێسایەی جیهاندا؟ یان تەسەووری توانستێکی ناوازەتر بکات لە هی خوای گەورە لە ڕەگەزی بوونەوەراندا؟

بێ گومان شتی وا بە بۆچوونی هیچ کەسێکدا نایەت، چونکە ئەو دانایی و سوودانەی بوونەوەران کە زانستەکان ڕوونیان کردوونەتەوە، بە جۆرێکی بەڵگەنەویست دەبنە شایەت لەسەر "مەبەست" و "سنعەت" و "دانستی"ی کردگار، بە ڕادەیەك کە ژیرییەکانیش ناچار بوون قبووڵی بوونی ئەو کردگارە بکەن. دەنا ژیری بە تەنیا خۆی بچووکترین ڕاستیی ئەم بەڵگە نەویستانە قبووڵ ناکات.

بەڵێ، ئەو کەسەی کە زەویی هەڵگرتووە و، بێ هیچ ستوونێك ئاسمانەکانی ڕاگرتووە و، تەن و قەبارەکانی گوێڕایەڵ کردووە و، بوونەوەرانی خستووەتە ژێر سایەی ڕێسایەك کە لە فەرمانی لانادەن، چۆن شتێکی بە چەندین پلەی زۆر لەوە ئاسانتر و سووکەڵەتر لەو کەسە بە نامۆ دەزانرێت؟

بەڵێ، گومان کردن لە توانستی کەسێکدا کە "چیا" بەرز دەکاتەوە، لەوەی کە بتوانێت بەردێك هەڵبگرێ، جگە لە "سەفسەتە" هیچی تر نییە.

**پوختەی ئەم قسانە ئەوەیە کە:**

هەروەك هەندێکی قورئان تەفسیری هەندێکی تری دەکات، دێرەکانی کتێبی جیهانیش تەفسیری ئەو وردەکاری و دانستانە دەکەن کە لە پشتیانەوەیە.

**ئەگەر دەڵێیت:**

لە قسەی بەشێکی ئەو کەسانەی لە ڕێبازی تەسەوفدان واتای: "پەیوەست بوون" و "یەکگرتن" و "چوونە ناو" دەردەکەوێت، ئیتر وەهمی مرۆڤ لە گوفتاری ئەوانەوە بوونی پەیوەندییەك دەبینێ لەگەڵ ڕێڕەوی "وحدة الوجود"دا کە بەشێکی ماددییەکان گرتوویانەتە خۆ و پشتی دەگرن؟

**وەڵام:**

"شەتەحات"ی[1] لێکۆڵەرانی زانا سۆفییەکان کە لە شێوەی "موتەشابیهات"دایە[2]، ماددییەکان لێی تێنەگەیشتوون. چونکە ڕێڕەوی ئەو لێکۆڵەرانە (کە لەسەر بناغەی نوقم بوون لە تێفکرینی خوای گەورە و، چڕکردنەوەی ڕوانین بۆ زاتی خوای گەورە و، دەستبەردار بوون لە بوونەوەران، دامەزراوە) بەرەو ئەوەی بردن کە ئاواتیان بینینی ئەنجام بێت لە ناوەندی بەڵگەدا، واتە ڕێبازی بینینی کردگاری مەزنیان لە ناوەندی جیهاندا گرتەبەر! ئیتر لەبەر تەنگەبەریی وشەکان بە: "الألوهيـة السارية" و "الحياة السارية" گوزارشتیان کرد لە ڕاستییەکانی: خوربوونەوەی بەردەوامی درەوشانەوە خواییەکان لە جۆگەی بوونەوەراندا و..

(١) دانەر لە کتێبی "مەکتووبات ل: ٧٥٧-٧٦٢" دا پێناسەی "شەتەحات" و هۆکارەکانی سەرهەڵدانی خستووەتە ڕوو، کە ئەمەی خوارەوە پوختەکەیەتی:
(ڕێگاکانی ویلایەت یان "ئافاقی"ن یان "ئەنفوسی"ن. ئەگەر ڕێبواری ڕێی "ئەنفوسی" لە نەهێشتنی دەروونی بەدخوازیدا دەستەوسان ما و نەیتوانی بە وازهێنانی لە خواست و ئارەزووەکانی دەروون "خۆپەرستی"ی خۆی نەهێڵێت، لە مەقامی شوکرەوە بەردەبێتەوە بۆ مەقامی شانازی، ئیتر بەرە بەرە لەخۆی بایی دەبێت. خۆ ئەگەر مەستیی جەزبەشی ئاوێتە بێت ئەوا لافی شتی بەدەر لە توانای خۆی لێ دەدات، کە پێی دەڵێن: شەتەحات). (پەراوێزی وەرگێڕ)
(٢) بۆ واتای "موتەشابیهـ" بڕوانە پەراوێزی لاپەڕە (٩٢)ی ئەم کتێبە. (وەرگێڕ)

تێپەڕبوونی ڕێژنە خواییەکان بەناو دیوی مەلەکووتی شتاندا و.. بینینی درەوشانەوەی سیفەت و ناوەکانی خوای گەورە لە ئاوێنەی بوونەوەراندا.

جا ئەو ماددییانە لەم ڕاستییانە تێنەگەیشتن، چونکە هاتن شەتەحاتی سۆفییە لێکۆڵەرەکانیان بەسەر چەند وەهمێکی لاوازی خۆیاندا شکاندەوە کە لە بەد تێگەیشتن و هەژاریی توانای خۆیانەوە سەرچاوەیان گرتووە..

دەسا دووری و ڕسوایی بۆ ژیرییان!

ئەو هزرە ڕووت و پەتییانەی زانا لێکۆڵەرەکان کە هێندەی کۆئەستێرەی سورەییا بەرز و باڵایە، زۆر دوورترە لە هزرە نزمەکانی چاولێکەرە ماددییەکان کە لە پلە نزمەکانی ناو خاکی زەویدایە!

بەڵێ، هەوڵی پێکەوە گرێدانی ئەم دوو هزرە لەم چەرخی پێشکەوتنەدا، بەڵگەی تووشبوونی ژیریی مرۆڤە بە دەردی لەکارکەوتنی مێشك! مرۆڤایەتیش بە داخ و خەفەتەوە دەڕوانێتە ئەم دیاردەیە و، ناچارە کە بە زمانی بەهرە و تواناکانی بۆ پێشکەوتن و لێکۆڵینەوەی زانستی بڵێت:

[كلاَّ.. والله.. أين الثرى من الثريا، وأين الضياء من الظلمة الدامسة]؟

واتە: (نەخێر.. بە خوا ئەم دوانە زۆر لە یەکەوە دوورن.. زەوی لە کوێ و کۆئەستێرەی سورەییا لە کوێ؟.. ڕووناکی لە کوێ و تاریکیی چڕ و پڕ لە کوێ)؟!

**ئاماژەیەك:**

ئەوانە (لێکۆڵەرە سۆفییەکان) لە ڕاستیدا شوێنکەوتەی "وحدة الشهود"ن، بەڵام لە ڕووی مەجازەوە بە شوێنکەوتەی "وحدة الوجود" ناو دەبرێن، چونکە "وحدة الوجود"ی ڕاستەقینە ڕێبازێکی بەتاڵ و ناڕەوای بەشێکی فەیلەسووفە دێرینەکانە.

**وریاکردنەوەیەك:**

گەورە و سەرۆکی ئەو زانا سۆفییانە[1] وتوویەتی:

(هەرکەسێك لافی "پەیوەست بوون" و "یەکگرتن" و "چوونە ناو" لێ بدات، بۆنی هیچ شتێکی لەمەڕ ناسینی خوای گەورەی نەکردووە. چونکە چۆن "مومکین" لەگەڵ

(١) پێدەچێ مەبەستی جونەیدی بەغدادی بێت، چونکە پێی دەڵێن: (شیخ الطائفة). (وەرگێڕ)

"واجب"دا یەکدەگرێت؟ تەنانەت "مومکین" چ نرخێکی هەیە تا "واجب" بڕواتە ناوی؟ خوای گەورە بەرز و پاك و پیرۆزە لە وەهمی خاوەن وەهم و گومانەکان)[1].

بەڵێ، یەکێك لە ڕێژنەکانی خوای گەورە لەناو بوونەوەراندا دەردەکەوێت. کەواتە ڕێبازی ئەمان هیچ پەیوەندییەکی بە هی ئەوانەوە نییە و، لە هیچ خاڵێکدا بەر یەك ناکەون. چونکە ڕێبازی ماددییەکان بریتییە لە ترنجاندن و ئاراستەکردنی ڕوانینیان لەناو ماددەدا و نوقم بوون تیایدا، بە ڕادەیەك کە بیر و زەینیان لە تێگەیشتنی "خوایەتیی خوای گەورە" دابڕاوە و دوور کەوتووەتەوە، تەنانەت نرخ و بایەخێکی هێندە مەزنیان بە "ماددە" داوە کە هەموو شتێکیان تێدا بینیوە، بگرە هەندێکیان ڕۆشتنە ناو ڕێبازێکی یەکجار نزمەوە، چونکە خوایەتیی خوای گەورەیان تێکەڵ بە "ماددە" کرد..

بەڵام شوێنکەوتەی ڕێبازی "وحدة الشهود" کە سۆفییە لێکۆڵەرەکانن، بە ڕادەیەك ڕوانینی خۆیان تەنیا و تەنیا ئاراستەی خوای گەورەی "واجب الوجود" کرد کە هیچ نرخێکیان بۆ "بوونەوەران" ڕەوا نەبینی و، وتیان: "تەنیا هەر خوا مەوجوودە"!

خەڵکینە!

ویژدان.. ویژدان!!

دووریی نێوان ئەم دوو ڕێڕەوە وەك هی زەوی و ئاسمان وایە. سوێند بەو خوایەی کە هەموو جۆر و شێوەکانی ماددەی بەدی هێناوە، لە هەموو دنیادا لەوە ناشیرینتر و نزمترم نەدیوە و، شتێکیش نییە خاوەنەکەی بلاوێنێتەوە لەسەر ترازانی میزاجی ژیرییەکەی وەك ئەو ڕا گەوجانەیەی کە بە دوای یەککەوتنی ئەم دوو ڕێبازەدا دەگەڕێت!

**ڕوونکرنەوەیەك:**

گریمان - بۆ نموونە - گۆی زەوی لە وردە شووشەی ڕەنگاوڕەنگی لەژمارەبەدەر پێکهاتبێ. ئەوا گومان لەوەدا نابێ کە هەریەکە لەو پارچە شووشانە - بە پێی پێکهاتن و قەبارە و ڕەنگ و ڕوخسار و شێوەی خۆی - لە درەوشانەوەی ڕووناکیی خۆر بەهرەمەند دەبێ..

جا ئەم بەهرەمەندییە ئەندێشەییە، نە خودی خۆرە، نە خودی ڕووناکیی خۆرە!

(١) دوای گەڕانێکی زۆر سەرچاوەی ئەم دەقەم دەست نەکەوت. (وەرگێڕ)

خۆ ئەگەر ڕەنگە قەشەنگەکانی گوڵـە هەمیشـە تـازە بووەکـان - کـە درەوشـانەوەی ڕووناکی و ڕەنگدانەوەی حەوت ڕەنگەکەی خۆرن - دەم بکەنەوە و بدوێـن، ئـەوا هـەر ڕەنگەیان دەڵێن:

"خۆر وەك من وایە".. یان "خۆر بە تایبەتی هی منە"!

آن خیالاتی کە دام اولیاسـت عکس مهرویان بوستان خداست[١]

بەڵام مەشرەبی ڕێڕەوانی "وحده الشهود": بێداری و.. شت لێـك جیاکردنەوە و.. وریاییە. لە کاتێکدا کە مەشرەبی ڕێڕەوانی "وحده الوجـود": فـەنا و.. مەستی‌یە! دیـارە مەشـرەبی خـاوێن و بێگـەرد و سـاف ئەوەیـە کـە دارای وریـایی و بێـداری و لێـك جیاکردنەوەی شتانە.

(تفكروا في آلاء الله ولا تفكروا في ذاته، فإنكم لن تقدروا)[٢].

حقيقة المرء ليس المرء يدركها فكيف كيفية الجبار ذي القدم

هو الذي أبدع الأشيا وأنشأها فيكف يدركه مستحدث النسم[٣]

**وریاکردنەوەیەك:**

ئەمانـە پوختـە بەڵگەکانی بوونـی پـەروەردگارن. درێژەپێدانیـان لـە سێ کتێبەکـەدا دێت.

**ئەگەر دەڵێیت:**

دەمەوێ بەڵگەکانی تەوحیدم - تەنانەت گەر بە پوختیش بووە - بۆ ڕوون بکەیتەوە؟

**دەڵێم:**

بەڵگەکانی تەوحید گەلێ زیاترن لەوەی کە ئەم کتێبە لەخۆیان بگرێت.

---

(١) ئەم شیعرە هی مەولانا جەلالەدینی ڕۆمی‌یە. بڕوانە: "مثنوی معنوی" ج١/ص١٦ چاپ انتشارات علمی. مامۆستا مەلا محەممەدی شڵماشی بەم جۆرەی خوارەوە بۆی کردم بە کوردی:

ئەو خەیاڵانەی کـە داوی ئەولیان عەکسی مەهڕوویانی بێستانی خودان

(وەرگێڕ)

(٢) حديث حسن. أخرجه الطبراني في الأوسط٦٥٤٦ و البيهقي في الشعب ١/٧٥ (الأحادث الصحيحـة ١٧٨٨: وله شواهد أخرى حسنة). (وەرگێڕ - لە چاپە عەرەبی‌یەکەوە)

(٣) ئەم دوو بەیتە دراونەتـە پاڵ ئیمـامی عـەلی، خـوا لێی ڕازی بێـت. بڕوانـە: (ديـوان الإمام علي، ص١٥٨، بيروت). (وەرگێڕ - لە چاپە عەرەبی‌یەکەوە)

خۆ بەڵگەی "التمانع" کە ئەم ئایەتە پیرۆزە لەخۆی گرتووە: ﴿لَوْ كانَ فِيهِما آلِهَةٌ إلاّ اللهُ لَفَسَدَتا﴾ (الأنبياء:٢٣) بەڵگەیەکی سەروزیادە و، ڕێ نیشاندەرێکی درەخشانە لەسەر ئەم ڕێبازە.

بەڵێ، "سەربەخۆیی" تایبەتمەندی‌یەکی زاتی و لازمێکی پێویستی "خوایەتی"یە..

لەیەکچوونی ئاسەوارەکانی جیهان و.. باوەش بەیەکداکردنی لاکانی و.. دەستگرتنی یەکتری لە نێوانیاندا و.. تەواوکاریی هەندێکیان بۆ ڕێکوپێکیی هەندێکی تر و.. بەدەم یەکەوەچوونی لایەنەکانی و.. وەڵامدانەوەی هەندێکی بۆ پرسیاری هەندێکی تر و.. ڕوانینی هەموویان بۆ یەك خاڵ و.. جوولەی هەموویان بەوپەڕی ڕێکوپێکی لەسەر تەوەرەی یەك ڕێسا.. هەموو ئەمانە، ئاماژەیە بۆ "تەنیایی کردگاریان". تەنانەت بە ڕاشکاوی دەری دەبڕێت کە کردگار و داهێنەری ئەم یەك دانە مەکینەیە کەسێکی تاك و تەنیایە و، ئەم بەیتە شیعرە بەسەر گوێی هەمواندا دەخوێنێتەوە کە دەڵێ:

وَفِي كُلِّ شَيْءٍ لَهُ آيَةٌ تَدُلُّ عَلَى أَنَّهُ واحِدُ[1]

(هەروەها):

پەڕە و صەفحەی کتێبی "عالەم"ن ئەنواعی نامەعدوود
وشە و پیتی ئەون سەرجەم هەموو ئەفرادی نامەحدوود
لە دەزگای لەوحی مەحفووزی حەقیقەتدا وەها نووسرا:
(وشەی بەرجەستەیە؛ پاراوە؛ پڕ واتایە: هەر مەوجوود)!

بێ گومان شاعیری بەڕێز "تەحسین"[2] مەبەستی لە "نامەعدوود" و "نامەحدوود" واتا ڕاستەقینەکەیان نی‌یە، بەڵکو مەبەستی شتێکی گوێرەییە.

---

(١) ئەم بەیتە هی شاعیری سەردەمی عەبباسی (أبو العتاهية)یە (١٣٠-٢١١ك/٧٤٧-٨٢٦ز). واتە:
هەموو شتێك بەڵگەی تیایە لەسەر ئەوەی خوا تەنیایە
بڕوانە: (ديوان أبي العتاهية) شرح: د. وفاء الباني قمر. ص: ٧١، نشر: دار الجيل، بيروت، ٢٠٠٣م/١٤٢٤هـ. (وەرگێڕ)

(٢) ئەم شاعیرە ناوی (حەسەن تەحسین عوسمان)ە و خەڵکی ئەلبانیایە و لە نێوان ساڵەکانی (١٨١١-١٨٨١ز)دا ژیاوە. لە پێشدا لە ئەستەمبووڵ و دواتر زانستە تازەکانی لە پاریس خوێندووە. کاتی خۆی سەرۆکی زانکۆی ئەستەمبووڵ بووە. زانایەکی بەڕێز و شاعیرێکی هەست ناسکە. دیوانی شیعرەکانی چاپ نەکراوە. (وەرگێڕ)

**ئاماژەیەك:**

کردگاری شکۆمەند هەموو سیفەتە تەواوەکانی هەیە. چونکە سەلماوە کە هەر ڕێژنەیەکی کەماڵ لە "بەدیهاتوو"دا ببێت، لە سایەی درەوشانەوەی کەماڵی کردگارەکەی وەرگیراوە..

خۆ بە دڵنیایی و بێ گومانی، هێندە جوانی و کەماڵ و شکۆمەندی لە بەدیهێنەردا – جل جلالە – هەیە، کە بە چەندین پلەی ناکۆتایی، بەرز و زیاتر بێت لەو جوانی و کەماڵ و شکۆمەندییەی کە لە سەرجەمی بوونەوەراندا هەیە. چونکە "چاکە" لقێکە لە سامانی "چاکەکار" و بەڵگەیە لەسەری.. "بەدیهاتن" بەڵگەیە لەسەر بوونی "بەدیهێنەر".. "ئیجاد" بەڵگەیە لەسەر بوونی "موجید".. "جوانکاری" بەڵگەیە لەسەر هەستی شایستە و گونجاوی جوانی بۆ "جوانی بەخش".

هەروەها کردگاری مەزن و شکۆمەند پاك و خاوێنە لە هەموو ناتەواوییەك، چونکە ناتەواوییەکان لە بێ توانایی ماهییەتی شتانی ماددییەوە سەرهەڵدەدەن، خوای گەورەش خاوێن و دەستبەرداره لە "ماددییەت"..

هەروەها خوای گەورە بەرز و خاوێنە لەو پێداویستی و وەسفانەی کە لە "ئیمکان"ی ماهییەتی بوونەوەرانەوە پەیدا بوون و، خوای گەورە – جل جلالە – "واجب الوجود"ە و، هیچ شتێك نییە کە لەو بچێت:

﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ﴾ (الشورى: ١١).

# پێشەکی

ئەگەر دەڵێیت:

لە پێشەکیدا وترا: دووهەم وشەی شایەتمان بینەر و بینراوی وشەی یەکەمە؟

وەڵام:

بەڵێ، بەهێزترین ڕێباز لە نێوان ئەو ڕێبازانەی کە مرۆڤ دەگەیەننە کەعبەی کەماڵات "واتە ناسینی خوا" و لە هەمووشیان ڕاست و ڕەواتر ئەو ڕاستەشەقامە درەخشان و ڕووناکەیە کە خاوەنی مەدینەی مونەووەرە ﷺ گرتوویەتیە بەر. ئەو ڕێبازەی کە زمانی ڕاستگۆ و پیرۆزی ئەو دەری بڕیوە، کە زمانێکە چەشنی ئاوێنە شتانی ناو دڵی پیرۆزی دەردەخات، ئەو دڵەی کە پەنجەرەیەکە بەسەر جیهانەکانی غەیبدا دەڕوانێت..

کەواتە پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ گیانی هیدایەتە و، ڕاستترین شایەتی زیندووە و، ڕەوانترین بەڵگەی گۆیایە و، بێ گومانترین بەڵگەیە لەسەر کردگاری شکۆمەند. چونکە لە ڕووی "خەلیقەت"(بەدیهاتن)ەوە زاتی خۆی بەڵگەیەکی درەخشانە و، لە ڕووی "ڕاستی"(حەقیقەت)یشەوە زمانی ئەو شایەتێکی ڕاستە.

بەڵێ، حەزرەتی محەممەد ﷺ بەڵگەیەکی بێ گومانە لەسەر: بوونی خوای گەورە و، پێغەمبەرێتی و، حەشر و، حەق و، ڕاستی. وەك لەمەولا بە درێژی باسی دەکەین.

**وریاکردنەوەیەك:**

ئەمە "دەور"ی لێ ناکەوێتەوە، چونکە "ڕاستگۆیی" ئەو بە چەندین بەڵگەی ئەوتۆ سەلماوە کە پەیوەست نین بە بەڵگەکانی بوونی بەدیهێنەر.

**سەرەتا:**

پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ بەڵگەیە لەسەر بوونی خوای گەورە. لەبەر ئەوە، پێویستە چ بە شێوە و چ بە ماددە ڕاستیی ئەم بەڵگەیە و، ئەنجامەکەی و، ڕاستی‌یەکەی بسەلمێنین.. کەواتە:

## مەبەستی دووهەم

بسم الله الرحمن الرحیم
اللّهم صَلّ علی سیِّدِنا محمدٍ الذي دلّ علی وجوبِ وجودِك

پاشان:

ئەی شەیدای حەقیقەت!

ئەگەر لە ڕێی خوێندنەوەی ویژدانی منەوە بە دوای ڕاستی‌یەکاندا دەگەڕێیت، ئەوا دڵی خۆت – کە لایەنێکی ناسك و نیانی پەروەردگاری‌یە – پاك بکەرەوە لە "ژەنگ" واتە لە حەزی بەربەرەکانێ و، خیلاف و، گرتنی لایەنی دژ و نەیار.. هەروەها لە "پۆزش هێنانەوەی دەروون" واتە بە گێڕانەوەی گومانەکانت بۆ بناغەیەك تاکو بێنەدی و.. لە دوای بینینی ئەنجامی کۆی بابەتەکە لە دانەدانەیدا، کە بە جیاجیا توانای هەڵگرتنی ئەنجامیان نی‌یە و ئامادەییەکی بەد و بێ کەڵکیشت بۆ دەڕەخسێنێ کە ئەنجامەکە وەرنەگریت.. یان ئەوەی کە بە سروشتی منالآن و ڕەفتار و خووی دوژمنان بڕوانیت، واتە دەست بە داوێنی چەند بەڵگەیەکی لاوازەوە بگریت.. یان سروشتی کڕیار بپۆشیت کە بە دوای نەنگی و ناتەواوی‌یەکاندا دەگەڕێت و.. لە شتانی تری وەك ئەمانەش..

دەسا ئەو ئاوێنەیە لە هەموو ئەوانە پاك بکەرەوە و، ئنجا دەست بدەرە بەرامبەرکاری و بەراوردکردن و، ئەو ڕۆشناییە بزۆکەی کە ئەنجامی تێکەڵبوونی زۆربەی نیشانەکانە، بکە بە قەرینەیەکی ڕووناکی بەخش لەسەر کەمترینی نیشانەکان، تاکو ئەم بەشە کەمەی گومانە تاریکەکانت ڕووناك ببێتەوە و بڕەوێنەوە..

پاشان بە دڵێکی بێدار و بە وریایی ویژدانەوە گوێ ڕابگرە و، هەتا قسەکان تەواو دەبن ڕەخنە و بیانوو مەگرە، چونکە هەموویان تا کۆتایی یەك ڕستەن، یەك بڕیارن.. دوای ئەوە، ئەگەر هەر قسەیەکت ما، بیڵێ.

کەواتە گوێم لێ ڕابگرە.. وا من لە پێشدا بە بەڵگە هەرە بچووکەکەیان (واتە بەڵگەی پێغەمبەریێتی بە شێوەیەکی ڕەها) دەست پێدەکەم، پاشان لە هەرە گەورەکەیان (پێغەمبەریێتیی حەزرەتی محەممەد ﷺ) دەدوێم.

بزانە کە:

دانستی کردگاری مەزن و.. نەبوونی بێهوودەیی لە کردارەکانیدا و.. چاودێری کردنی بۆ ڕێسا لە کەمترینی شتانی ناو جیهاندا و.. پشتگوێ نەخستنی بێ نرخترین شتی جیهان و.. پێویستیی گرۆی مرۆڤ بۆ ڕابەرێك.. هەموو ئەمانە، بێ هیچ گومانێك داخوازی بوونی "پێغەمبەریێتی"ن لەناو نەوەی ئادەمیزاددا.

**ئەگەر دەڵێیت:**

لەم پوختەیە تێنەگەیشتم، تکایە بە درێژی ڕوونی بکەرەوە.

**دەڵێم:**

کەواتە گوێ ڕابگرە.. دەبینیت "پێغەمبەریێتی" بە شێوەیەکی ڕەها، کە وەکو کانزای ماددی و مەعنەویی ئادەمیزادە و، مەڵبەندی ڕێکوپێك بوونی بارودۆخی زۆر لەو جۆر و ڕەگەزانەیە کە هێزی ژیری خستوونیەتە ژێر دەسەڵات و چاودێریی مرۆڤەوە..

بەڵگەی ئەم پێغەمبەریێتییە ڕەهایە، بریتییە لە بەرزبوونەوە و سەرکەوتنی "مرۆڤ" بەسەر "ئاژەڵێتی" لە سێ خاڵدا:

**خاڵی یەکەم:**

تێگەیشتنی مرۆڤ و پەی بردنیەتی بە ڕیزبەستن و بەدوایەکداهاتنی شتەکان، کە ئەویش ئەنجامی هۆکارە یەك لە دوای یەك و زنجیرەییەکانی ناو بەدیهاتووانە.. هەروەها توانای زانستی و پێکهێنان و زانینە لە لای مرۆڤ، کە ئەویش دەرەنجامی شیکردنەوەیەتی بۆ پێکهاتە ئاڵۆزەکانی تۆوی ڕەفتارە کامڵەکانی مرۆڤ بۆ چەند کەماڵێکی سادە و گێڕانەوەیان بۆ بنەچەکانیان.. هەروەها توانای مرۆڤە کە بە سنعەت و کارامەیی خۆی لاسایی سروشت بکاتەوە و شان بە شانی یاسا دەست بە کارەکانی خوای گەورە لە گەردووندا بڕوات، ئەویش بەهۆی ئەو نهێنییەی کە لەم دەستوورەدایە:

(سەرەتای بیرکردنەوە: کۆتایی کارە و، کۆتایی بیرکردنەوەش: سەرەتای کارە).

جا ئەو مرۆڤەی کە ئەم توانا و لێهاتنانەی هەیە، پەی بە کورت بینیی خۆی لە سنعەتەکەیدا و، پالەپەستۆی گومانەکان لە سەری و، هەژاریی ناو سروشتی مرۆڤانەی خۆی، دەبات. ئەمەش ڕێنمایی دەکات بەرەو پێویستیی لەڕادەبەدەری بۆ "پێغەمبەرێکی ڕابەر" کە هاوسەنگیی ڕێسای وردی جیهان بپارێزێت.

خاڵی دووهەم:

بریتی‌یە لە: توانای ناکۆتای مرۆڤ و، ئاوات و حەزە نەبڕاوەکانی و، هزر و بۆچوونە بێ سنوورەکانی و، هێزە ئارەزوویی و تووڕەییە دەستنیشان نەکراوەکانی..

دەبینین "مرۆڤ" گەر ملیۆنان ساڵ تەمەنی بدرێتێ و، هەموو لەزەتەکانی دنیاش بچێژێ و، فەرمانڕەوایەك بێت کە لە هەموو شتێکدا فەرمانی جێبەجێ بێت، کەچی هەر ئاخ و پەژارە دەردەبڕێت و، دەڵێ: خۆزگە فلان شت ئاوا و ئاوا بوایە. ئەویش لەبەر ئەو ناکۆکییەی کە لە تواناکانیدا جێگیر کراوە. وەك بڵێی ئەم نارازی بوونە هێمایەك بێت و ئاماژە بۆ ئەوە بکات کە مرۆڤ بۆ هەتاهەتایی پالێوراوە و، بۆ بەختەوەریی هەمیشەیی بەدی هێنراوە، تاکو بتوانێت توانا بێ سنوورەکانی لە دۆخی "هێز"ەوە بگۆڕێت بۆ دۆخی "کردار". ئەوەش لە جیهانێکی نەبڕاوەی بێ سنووری گەلێ فراوانتر لەم جیهانە.

نەبوونی هەڕەمەکێتی و چەسپاندنی بوونی ڕاستیی شتەکان، ئاماژەن بۆ ئەوەی کە ئەم دنیا نزم و بەرتەسك و سنوورداره و، پالەپەستۆی زۆرێك لە ئامانجەکان تیایدا، کە بەدەر نی‌یە لە حەسوودی بە یەك بردن و پشێوی و شێواوی، هەرگیز جێی ڕەوشت و ڕەفتارە کامڵەکانی مرۆڤایەتیی تێدا نابێتەوە، بەڵکو ئەو کەمالاتانەی مرۆڤ پێویستیان بە جیهانێکی فراوانترە کە پالەپەستۆی تێدا نەبێت، بۆ ئەوەی توانا و لێهاتنی مرۆڤ بە تەواوی گەشە بکات و گوڵ بگرێت. ئەو کاتەش بەهۆی ڕێکوپێکیی بارودۆخەکانی، کەمالاتی خۆی لەگەڵ ڕێسای جیهاندا تەبا و شان بەشانی یەك دەبن.

لێرەدا بە شێوەیەکی سەرپێیی ئاماژە بۆ "حەشر" کرا. لە جێی خۆیدا بەڵگەی بێ گومانی لەسەر دەهێنرێتەوە.

بەڵام ئەو شتەی دەمەوێ باسی بکەم ئەوەیە کە:

*"تواناکانی مرۆڤ" ڕووەو ئەبەد ئاراستە کراون..*

ئەگەر دەتەوێ لەمە تێبگەیت ئەوا فەرموو سەرنج لە گەوهەری مرۆڤایەتی و، نرخ و بەهای لایەنی هۆش و ژیری و گوفتاری و، خواستی توانا و لێهاتنەکانی بدە. پاشان بۆ "ئەندێشە" بڕوانە کە بچووکترین خزمەتگوزارەکانی گەوهەری مرۆڤایەتین و، بڕۆ بۆلای و پێی بڵێ: ئەی ئەندێشەی گەورە و مەزن! مژدە بێت، تەمەنێکی زیاد لە ملیۆنان ساڵت هاودەم لەگەڵ دەسەڵاتی دنیا و هەموو شتێکی ناو دنیات پێ دەبەخشرێت، بەڵام کۆتاییەکەت نەمان و نەبوون و نەگەڕانەوە دەبێت بۆ ژیان! پاشان بڕوانە کە ئایا "ئەندێشە" بە چی ڕووبەڕووت دەبێتەوە؟ ئایا بە مژدە و دڵخۆشی.. یان بە حەسرەت و پەشیمانی؟

دڵنیابە گەوهەری مرۆڤایەتیی مرۆڤ لە ناخی ویژدانیەوە هاوار دەکات کە:

"ئاخ و حەسرەت بۆ لەدەست چوونی بەختەوەریی هەمیشەیی"!

هەروەها بە توندی سەرزەنشتی "ئەندێشە" دەکات و، پێی دەڵێت:

بەم دنیا فانی‌یە ڕازی مەبە!

برای ئازیز!

ئەگەر هەموو دەسەڵاتی دنیای فانی، نەتوانێ خزمەتکاری پادشای مرۆڤایەتی، یان شاعیرەکەی، یان پیشەسازەکەی، یان وێنەگرەکەی - کە ئەندێشەیە - تێر و ڕازی بکات، ئیتر چۆن خودی پادشا تێر و ڕازی دەکات کە ئەو سەردارە مەزنەیە چەندین خزمەتکاری زۆر و زەبەندەی ئاوا لە بەردەستیدا کار دەکەن؟

بەڵێ، ناتوانن تێری بکەن. مەگەر "بەختەوەریی هەمیشەیی" کە لەناو سەدەفی حەشری جیسمانیدایە بتوانێ تێری بکات.

**خاڵی سێهەم:**

بریتی‌یە لە میانەڕەویی میزاجی مرۆڤ و، نیانیی سروشتی و، حەزی بۆ جوانی و ئارایشت. واتە حەز و مەیلی سروشتی مرۆڤ بۆ ژیانێك کە شایانی "مرۆڤایەتی" بێت.

بەڵێ، مرۆڤ وەکو ئاژەڵەکان ناژی و، بواری ژیانی لەو جۆرەی نی‌یە. ئەوەتا بۆ بەدەستهێنانی پێداویستی‌یەکانی لە خواردن و پۆشاك و نشینگە، پێویستی بەوەیە کە لە

ڕێی چەند پیشەسازی‌یەکی زۆر ڕێکوپێك و خاوێن، نەرم و پوختیان بکات کە بە تەنیا خۆی توانای هەموو ئەو کار و پیشانەی نی‌یە. لەبەر ئەوە، پێویستی بە تێکەڵبوونە لەگەڵ هاوڕەگەزەکانیدا، تاکو پێکەوە هاوبەش و هاوکاری یەك بن و، پاشان بەروبوومی هەوڵ و کۆششیان لەگەڵ یەکتردا ئاڵوگۆڕ پێ بکەن.

بەڵام لەبەر سنوورشکاندنی هێزە مرۆییەکان بەرامبەر بە خەڵکانی تر (بەهۆی نەهێنیی بێ سنووریی ئەو هێزانە) کۆمەڵی مرۆڤ لە ئاڵوگۆڕی بەرهەمی کۆششیاندا پێویستیان بە "دادگەری" هەیە..

پاشان لەبەر ئەوەی ژیریی هەموو یەکێکی ئەوان ناتوانێ پەی بە "دادگەری" ببات، ئەوا ڕەگەز و جۆری مرۆڤ پێویستی بە دانانی "چەند یاسایەکی گشتی" دەبێت..

پاشان بۆ پارێزگاریی کاریگەری و بەردەوامیی ئەو یاسایانە دەبێ "یاسادانەر"ێك هەبێت کە جێ‌بەجێ‌یان بکات..

پاشان بۆ بەردەوامیی حوکم و فەرمانی ئەو یاسادانەرە بەسەر ڕواڵەت و پەنهاندا دەبێ لە ڕووی ماددی و مەعنەوی‌یەوە خاوەنی تایبەتمەندی و بەرزی بێت و، پێویستیشی بە بەڵگەیەکە لەسەر توندوتۆڵیی پەیوەندی‌یەکانی لە نێوان خۆی و خاوەنی موڵکی ئەم جیهانەدا..

پاشان بۆ دامەزراندنی گوێڕایەڵیی فەرمانەکان و دابینکردنی دوورەپەرێزی لە قەدەغەکراوەکان، پێویستە تەسەووری گەورەیی کردگار و خاوەن موڵکی جیهان لە زەینەکاندا بەردەوام بێت..

ئنجا بۆ بەردەوامیی ئەم تەسەووورە و جێگیربوونی بیر و باوەڕەکان پێویست بە یادخەرەوەیەکی دووپاتکەر و کارێکی هەردەم تازەوەبوو هەیە، خۆ ئەو یادخەرەوە دووپات بووەش شتێکی تری جگە لە "پەرستن" نی‌یە..

ئەم پەرستنەش هزر و بیرەکان بەرەو کردگاری دانا ئاراستە دەکات و، ڕووی پێ دەکاتە دامەزراندنی ملکەچی و گوێڕایەڵی. کە ئەوەش بۆ ئەوەیە مرۆڤ بگاتە ڕێکوپێکیی هەرە تەواو لە جیهاندا و، پەیوەست بوون بەو ڕێکوپێکی‌یە و، شوێنکەوتنی ڕێسا لەبەر هێنانەدیی نهێنیی حیکمەت، ئەو حیکمەتەی کە وردەکاریی سنعەت و نەبوونی بێهوودەیی شایەتە لەسەری..

جا ئەگەر ئەم سێ لایەنەی جیاوازیی مرۆڤت لە سەرجەم زیندەوەرانی تر زانی، ئەوا بە پێویستی و بێ گومانی ئەو ئەنجامەت پێ دەبەخشێت کە پێغەمبەریتی - بە شێوەیەکی رەها - لەناو گرۆی مرۆڤدا جەمسەرێك، بگرە مەڵبەند و تەوەرەیەکە بارودۆخەکانی مرۆڤ لە دەوری دەخولێنەوە، ئەویش بەم جۆرەی خوارەوە:

بە وردی سەرنجی رووی یەکەم بدە:

ئەوەتا لەبەر ئەوەی مەیلی سروشتیی مرۆڤ و، هاندانی مرۆڤایەتی‌یەکەی و، کورتیی بینینی و، تێکەڵبوونی وەهمەکان لە رێی ژێریی ئەودا بەشیان نەکرد و دادی ئەویان نەدا، ئەوا مرۆڤ ئەوپەڕی پێویستیی بە رابەر و مامۆستایەك بۆ پەیدا بوو. ئەو رابەرەش بریتی‌یە لە پێغەمبەر ﷺ.

پاشان بیر لە رووی دووهەم بکەرەوە:

ئەو "ناکۆتایی"یەی کە لە مرۆڤدا دانراوە و، مەیلی سنوورشکاندنی ناو سروشتی و، بێ سنووریی هێزەکانی و، رێك نەخستنی ئاواتەکانی.

هەموو ئەم ناکۆتاییە لە حەز و ئاواتەکانی مرۆڤدا، هەرگیز لەو یاسایەی مرۆڤدا جێی نابێتەوە کە هیچ کات پڕاوپڕی قەد و باڵای توانا و لێهاتنەکانی مرۆڤ نی‌یە کە وەك بەروبوومێکی حەز و مەیلەکانیەتی بۆ ئەو پێشکەوتنەی لقێکی درەختێکی بەرەو کامڵ چوونە لە جیهاندا..

جا لەبەر بەش نەکردنی ئەم یاسا مرۆڤانەیە، کە دەرەنجامی بەدوای‌یەکدا هاتنی هزرەکان و ئەزموونە پلەپلەکانە، بۆ گەشەکردنی تۆوی درەختی توانا و لێهاتنەکانی مرۆڤ، ئەوا پێویستیی بە شەریعەتێکی زیندووی نەمر و خوایی بۆ دروست بوو کە بەختەوەریی هەردوو دنیای پێکەوە لە رووی ماددی و مەعنەوی‌یەوە بۆ بهێنێتە دی و، بەپێی قەد و باڵای توانا و لێهاتنەکانی فراوان بێت و گەشە بکات.

جا ئەو کەسەی کە ئەو شەریعەتەی هێنا بریتی‌یە لە پێغەمبەر ﷺ.

**ئەگەر دەڵێیت:**

ئێمە دەبینین حاڵی مولحیدان و خاوەن ئایینە لە رێ ترازاوەکان بەپێی دادگەری و رێکوپێکی بەڕێوە دەچێت؟

وەڵام:

ئەو دادگەری و ڕێکوپێکی‌یە تەنها بە ئامۆژگاری و ڕێنمایی خاوەن ئایینەکان سەریان هەڵداوە، چونکە پێغەمبەران - درووديان لەسەر بێت - بناغەکانی "دادگەری" و "ڕەوشت بەرزی"یان بنیات ناوە.

واتە هەر تەنها پێغەمبەران بوون کە ئەو بنچینە و بناغانەیان دامەزراندووە. دواتر ئەوانیش لەو ڕەوشت بەرزی‌یەیان وەرگرتووە و چەندەیان بۆ لەواوە ڕەفتاریان پێ کردووە. زیاد لەوەش ڕێساکەیان - بە هەمان جۆر بەختەوەری‌یەکەشیان - هەمیشەیی نی‌یە، بەڵکو کاتی‌یە. چونکە ئەگەر بۆ ماوەیەك و تەنها لە ڕوویەکەوە ڕێکوپێك بێت، ئەوا لە چەندین ڕووی ترەوە لار و لە ڕێ ترازاوە. واتە هەرچەندە لە شێوە و ماددە و وشە و ژیاندا بە ڕێکوپێك دەربکەوێت، لە ژیان و ناوەرۆك و گیانیدا هەر بەد و بێ کەڵك و ئاڵۆزاوە.

براکەم!

ئێستاش نۆرەی ڕووی سێ‌هەم هاتووە. بە باشی بیر لەمەی خوارەوە بکەرەوە:

"زیادەڕەوی" و "کورتڕەوی" لە ڕەوشتەکاندا بەهرە و تواناکان دەشێوێنن.. ئەم شێواندنەش "بێهوودەیی" لێ دەکەوێتەوە.. ئەم بێهوودەییەش پێچەوانەی دانستی زاڵ و فەرمانڕەوای خوای گەورەیە لەوەدا کە تەنانەت لە بچووکترین شتی جیهاندا چاودێریی بەرژەوەندی‌یەکان دەکات.

ئەوەی لەبارەی "هەستی ناسینی مافەکان" دەوترێ، واتە هەستکردنێکی ماددی بە زیانی هەر شتێکی بەد.. هەروەها ئەوەش کە باس دەکرێ لەبارەی "هەستی چاودێریی مافەکان" کە دەرەنجامی بێداربوونەوەی بیرە گشتی‌یەکان و بڵاوبوونەوەی هۆشیاری‌یە لەو بیرانەدا، مولحیدان دەچن ئەم دوانە لە بریی "شەریعەتی خوایی" دادەنێن..

ئەم بۆچوونەیان و بێ نیازییان لە "شەریعەت" جگە لە وەهمێکی بەتاڵ هیچی تر نی‌یە! چونکە هیچ شتێکی لەم جۆرە تەنانەت پێشەکی‌یەکانیشی لە دنیادا -کە پیر بووە - دەرنەکەوتووە. بەڵکو پێچەوانەکەی ڕاستە، چونکە هەتا چاکەکاری‌یەکان پێش بکەون خراپکاری‌یەکانیش بە هەمان جۆر برەویان دەبێت و، لەناو برەودارترین و خەڵەتێنەرترین پۆشاکدا خۆیان دەڕازێننەوە!

بەڵێ، هیچ کاتێ یاساکانی حیکمەت لە دەستوورەکانی حکوومەت بێ نیاز نابێت، هەروەك مرۆڤایەتیش پێویستیی لەڕادەبەدەری بە یاساکانی شەریعەت و ڕەوشت بەرزی هەیە کە بەسەر ویژداندا فەرمانڕەوان.

بەم جۆرە، "هەستی ڕێککردنی ڕەوشتەکان" کە شتێکی وەهمییە، بەشی پاریزگاریی هەرسێ هێزەکەی مرۆڤ ناکات لە "دانایی و، داوێن پاکی و، ئازایەتی"دا.

لەبەر ئەوە، مرۆڤ بە دڵنیایی پێویستی بە پێغەمبەرێکە تەرازووی "دادگەریی خواوەند" بە دەستەوە بگرێت، کە لە ویژدان و سروشتەکاندا جێبەجێیە و خاوەنی کاریگەرییە.

**ئاماژەیەك:**

هەزاران پێغەمبەر - درووودیان لەسەر بێت - هاتوون و، پێغەمبەرێتییان ڕاگەیاندووە و، بە هەزاران موعجیزەش پێغەمبەرێتیی خۆیان سەلماندووە. جا هەموو ئەو پێغەمبەرە بەرێزانە - درووودیان لەسەر بێت - لە ڕێی موعجیزاتیان و، بە یەك زمان، بوونی پێغەمبەرێتی بە شێوەیەکی ڕەها لەناو گرۆی مرۆڤدا ڕادەگەیەنن. کە ئەمەش بەڵگەیەکی گومانبڕە لەسەر "پێغەمبەرێتی بە شێوەیەکی ڕەها" کە بچووکترینی بەڵگەکانە و، پێی دەوترێ "تەواتوری مەعنەوی" یان هەر ناوێکی تری لێ دەنێن کە پێتان خۆش بێت، چونکە بەڵگەیەکی بەهێزە.

**ورياکردنەوەیەك:**

لایەنی یەکبوون لەم داوەرییە ژیرییانەدا ئەوەیە کە:

ئەگەر هەموو زانستەکان پێکەوە وەربگیرێن و.. سەیری ئەو ڕێکوپێکییەی گەردوون بکرێت کە ئەو زانستانە بە یاسا و دەستوورە گشتییەکانیان دەریان خستووە و.. بە وردی سەرنجی چەند کردارێکی بێ هێز و کاروبارێکی لاواز بدرێت کە بە هەوێنێك پەیوەستی یەك دەبن و بەرژەوەندییە جوزئییە بڵاوەکانیان کۆ دەکاتەوە کە "لەزەت" یان "خۆشەویستی" یان شتێکی ترە و چاودێریی خوایی لەو کردار و کاروبارانەدا دایناوە، وەك ئەوەی کە لە خواردن و نیکاحدایە..

هەروەها ئەگەر بە شایەتیی حیکمەت و پشتگوێ نەخستنی هیچ شتێك "نەبوونی بێهوودەیی لە گەردووندا" بزانرێت، ئەوا ئەو ئەنجامەی، کە لە ڕێی پشکنین و لێکۆڵینەوەی تەواو (الإستقراء التام)ەوە بەدەست دێت، بریتی دەبێت لەوەی کە:

ئەو "پێغەمبەرێتی"یەی جەمسەر و تەوەرە و کانگای بەرژەوەندییە گشتییەکانە، گەلێ پێویستە بۆ ڕەگەزی مرۆڤ. خۆ ئەگەر "پێغەمبەرێتی" نەبوایە ئادەمیزاد لەناو دەچوو، چونکە وەکو ئەوە دەبوو کە لە جیهانێکی پشێوەوە فڕێ درابێتە ناو جیهانێکی ڕێکوپێك و، ئیتر یاسا دەستبەکارە گشتییەکانی دەشێواند.

**بێدارکردنەوەیەك:**

برام! ئەگەر ئەم گریمانە قبووڵ بکرێت، ئایا - دوای ئەوە - مرۆڤایەتی چۆن و بە چ ڕوویەك ڕووبەڕووی بوونەوەرانی تری جیهان دەبێتەوە؟!

جا ئەگەر بچووکترینی بەڵگەکانی کردگار لە زەینتدا نەخش بوو، ئەوا ئامادەبە بۆ ئەوەی بڕۆینە ناو باسی گەورەترین بەڵگەکانی، کە پێغەمبەرێتیی حەزرەتی محەممەدە ﷺ.

**ئاماژە و ڕێنماییەك:**

"بەڵگەی هەرە گەورە" شایەتێکی ڕاستە. جا ئەگەر سەیری ئاسەواری پێغەمبەران - درووودیان لەسەر بێت - بکەیت کە لەسەر لاپەڕەی پەندەکانی جیهان نەخش کراون و، گوێت لە حاڵ و بەسەرهاتیان گرت کە بە زمانی مێژوو باس دەکرێت و، توانیت "ڕاستی" - واتە ڕووی یەکبوون - لە کاریگەریی شێوەکانی کات و شوێن داماڵیت، دەبینیت چەند شتێکی زۆر هەن وای لە مرۆڤایەتی کردووە ناوی "پێغەمبەران"یان لێ بنێت، کە بریتییە لەوەی:

"مافەکانی خوا" و "مافەکانی بەندەکان" کە ڕووناکیی چاودێریی خوا و ڕۆشنایی جوانییە پەتییەکانن، پێغەمبەران - درووودیان لەسەر بێت - کردوویانە بە دەستووری بزووتنەوەیان.. هەروەها مامەڵەی پێغەمبەران - درووودیان لەسەر بێت - لەگەڵ نەتەوەکانیان و.. پێشوازیی نەتەوەکانیان لێیان و.. وازهێنانیان لە سوودە کەسییەکانی خۆیان لە پێناوی بانگەوازیاندا و.. گەلێ شتی تریش، گرۆی مرۆڤی هان داوە کە ناوی "پێغەمبەران"یان لێ بنێن.

ئەو بناغانەش کە خولگەی پێغەمبەرایەتین، بە تەواوترین و ئاشکراترین شێوە لە پێغەمبەری سەروەرماندا ﷺ دەرکەوتووە، چونکە ئەو سەروەرە مامۆستای نەوەکانی ئادەمیزادە لە تەمەنی کەماڵی مرۆڤدا و، سەرچاوە و مامۆستای زانستە باڵاکانە لە قوتابخانەی دوورگەی عەرەبدا.

بەو واتایەی کە لێکۆڵینەوەی تەواو، نەخوازەڵا لەناو یەك جۆردا، بە تایبەتی لە ڕێی پشتگیریی "القیاس الأولوي" و،[1] بە یارمەتیدانی "قیاسی پەنهان"[2] کە لەسەر بناغەی ڕێکوپێکیی بەردەوام دامەزراوە، ئەنجامی "پێغەمبەرایەتیی حەزرەتی محەممەد ﷺ" بەدەست دێت. ئنجا بە پوخت و پەتی کردنی تایبەتمەندییەکان کە پێی دەوترێت "تنقیح المناط"[3] هەموو پێغەمبەران - درووديان لەسەر بێت - بە زمانی موعجیزاتیان شایەتی لەسەر ڕاستیی حەزرەتی محەممەد ﷺ دەدەن کە بەڵگەی درەخشانە لەسەر بوونی کردگاری شکۆمەند.

(١) "قیاس" زاراوەی زانستی ئوسوولی فیقهە. لەم زانستەدا دوو جۆر پێوانە (قیاس) هەیە، یەکەمیان: "جەلی" واتە ئاشکرا.. دووهەمیان: "خەفی" واتە پەنهان. "قیاسی جەلی"ش سێ بەشە، یەکەم: "ئەولا" کە ئەوەیە عیللەتی حوکمەکە لە فەرعدا بەهێزتر بێت تاکو ئەسڵەکە.. دووهەم: "موساوی" کە ئەوەیە لە هەردووکیاندا یەکسان بێت.. سێهەم: "ئەدنا" کە ئەوەیە لە فەرعەکەدا هێندەی ئەسڵەکە بەهێز نەبێت. بڕوانە: (الوجیز في أصول الفقه، ص: ٢١٨-٢١٩). (وەرگێڕ)

(٢) "قیاسی پەنهان - خەفی" پێیشی دەوترێت (ئیستیحسان): وازهێنانە لە "قیاسی جەلی" بۆ قیاسێکی تر، یان هەڵاوێرانی بابەتێکی جوزئییە لە بنەڕەتێکی کوللی، لەبەر بەڵگەیەك کە موجتەهید دڵنیایە لێی. واتە: ئەگەر مەسەلەیەکی فیقهی بۆ موجتەهیدێك هاتە پێش کە بە "قیاسی جەلی" بڕیارێکی تایبەتیی دەخواست و، بە "قیاسی خەفی"ش بڕیارێکی جیاواز لەو، ئنجا بەڵگەیەك لای موجتەهیدەکە دروست بوو کە بڕیار بە "خەفی"یەکە بدات، پێی دەڵێن: "قیاسی خەفی" یان "ئیستیحسان". بڕوانە: (الوجیز في أصول الفقه، ص: ٢٣٠-٢٣١). (وەرگێڕ)

(٣) "تنقیح المناط": لە زانستی "أصول الفقه" و بابەتی (القیاس) و باسی (مسالك العلة)دا ئەم زاراوەیە بەکاردێت. مەبەست پوخت کردنی "عیللەت"ی حوکمە شەرعییەکەیە لەو وەسفانەی کە ئاوێتەی بوون و پەیوەندییان بە "عیللییەت"ەوە نییە. ئەوەش لە کاتێکدایە کە ئەو دەقەی حوکمە شەرعییەکەی تێدایە "عیللەت"ەکەشی لەخۆ گرتبێت، بەڵام چەند وەسفێکی تری لەگەڵدا بن پەیوەستی "عیللەت"ەکە نەبن و، دەقەکەش بۆخۆی عیللەتەکەی لەناویاندا دەستنیشان نەکردبێت. کاری "موجتەهید" لێرەدا پوختکردن و دەرهێنانی عیللەتەکەیە لە نێوان ئەو وەسفانەدا. دیارە ئەمەش جیایە لە "سەبر و تەقسیم" کە بریتییە لەوەی دەقەکە هەر لە بناغەدا "عیللەت"ی لەخۆ نەگرتبێت و، موجتەهید لە نێوان چەند گریمانێکدا بە شەن و کەو بیدۆزێتەوە. بڕوانە: (علم أصول الفقه، عبد الوهاب خلاف، ص: ٧٨) ، (الوجیز في أصول الفقه، د. عبد الکریم زیدان، ص: ٢١٥-٢١٦). (وەرگێڕ)

پۆزش:

من گوفتارەکانم لە چەند ڕستەیەکی کورتدا ناهێنم کە تەماوی و هەندێکیش داخراو بێت، چونکە لەبەر ئەوەی ئەم ڕاستییانە ڕەگیان بە هەموو لایەکدا بڵاوکردووەتەوە ئەوا باسەکە درێژە دەکێشێت..

لەبەر ئەوەیە کە نامەوێ شێوەی باسەکە لەت لەت بکەم و، تێکی بدەم و، ئازاریش بە "حەقیقەت" بگەیەنم، بەڵکو دەمەوێ شووورایەکی بازنەیی بە دەوری حەقیقەتدا بگێڕم، تاکو بگیرێت و لەدەست دەرنەچێت، خۆ ئەگەر من نەمتوانی بیگرم، با کەسێکی تری غەیری من بیگرێت.

ئەگەر پۆزشم وەردەگرن باشە، دەنا هەرکەس ئازادە لە ڕا و بینینەکانیدا و، هیچ ڕێگایەك بۆ زۆرەملێ نییە.

* * *

# بەڵگەکانی پێغەمبەرێتیی حەزرەتی
# محەممەد ﷺ

## پێشەکی

هەموو حاڵ و بارودۆخێکی پێغەمبەر ﷺ هەروەها هەموو جموجوڵێکی، بەڵگەی ڕاستیی ئەوە.

بەڵێ، دوودڵ نەبوونی لە هیچ جموجوڵێکیدا و، سڵ نەکردنەوەی لە ڕەخنەگرانی و، نەترسانی لە نەیارانی، شایەتە لەسەر ڕاستی و جیدییەتی ئەو سەروەرە ﷺ..

هەروەها پێکانی گیانی حەقیقەت لە هەموو فەرمانەکانیدا، بەڵگەی ئەوەیە کە لەسەر حەقی ڕوون و ئاشکرایە.

لەمانەوە دەگەینە ئەو دەرەنجامەی کە:

لەو کاتەدا کە لە هەموو ترس و دوودڵی و شڵەژان و شتانێکی وەك ئەمانەوە دوورە، کە ئاماژەن بۆ فێڵ و باوەڕ بەخۆنەبوون و بێ متمانەیی، دەبینی سەرنجی خەڵکانی وردەکار بۆ لای هەموو کردار و ڕەفتارێکی خۆی ڕادەکێشێ..

ئەوەتا لە سەرەتاوە سەرنجیان بۆلای "ڕاستی"ی خۆی و لە کۆتاییشدا بۆلای ئەوەی کە "حەقی پێکاوە"ڕادەکێشێ!

چونکە لە مەترسیدارترین شوێندا، بێ هیچ سڵەمینەوەیەك و، بە هێزی باوەڕ و متمانەیەکی لەڕادەبەدەر کار دەکات، دوای ئەوەش لە کۆتاییدا دەگاتە ئامانج، ئەویش بە دامەزراندنی ئەو یاسا و دەستوورە زیندووانەی کە بەختەوەریی هەردوو دنیا بەرهەم دەهێنن. بە تایبەتی ئەگەر تێبینیی کۆی جموجوڵەکانی و تێکەڵبوونیان لەگەڵ یەکتردا بکرێت، جیدییەت و حەق پێکانی بە وێنەی مەشخەڵێکی گەڕۆك تیشك دەبەخشن و، لە ڕووناکیدانەوەیان و بەراوردکردنیان بەڵگەی پێغەمبەرێتیی ئەو لە پێش چاواندا دەردەکەوێت.

**ئاماژەیەك:**

کاتی "ڕابوردوو" و کاتی "ئێستا" - واتە چەرخی بەختەوەریی پێغەمبەرێتیی ئەو - هاودەم لەگەڵ "داهاتوو"دا، چەندین بەڵگەی ڕووناکی بەخشیان لەسەر پێغەمبەرێتیی ئەو لەخۆ گرتووە و، هەموو زەمانەکان پێکەوە و بە یەك زمان بەڵگەی زاتی ئەو پێغەمبەرە ﷺ دووپات دەکەنەوە کە: کانگای ڕەوشتە بەرزەکانە و، بانگخوازی ڕاستییە و، ڕێ پیشاندەری پێغەمبەرێتییە.

ئەو زەمانە ناوبراوانە دەبن بە بەڵگە و، پێغەمبەرێتیی ئەو ڕادەگەیەنن و ڕوونی دەکەنەوە، تەنانەت بۆ ئەو کەسانەش کە بینایی چاویان لەدەست داوە. لەبەر ئەوە، ئەم سێ لاپەڕەیە و بابەتی هەرە مەزنی ئەو کتێبە دەخوێنینەوە، کە زاتی پیرۆزی ئەوە ﷺ؛ سەردانی دەکەین و ئەم خواستەمان کە "بەڵگەی هەرە مەزنە" ڕوون دەکەینەوە.

لەسەر بناغەی ئەم خاڵانە، ڕێبازەکانی پێغەمبەرێتی چوار دانەن. پێنجەمیشیان بەناوبانگ و نووسراوە.

## یەکەم ڕێبازی پێغەمبەرێتی

واتە دەبێ چوار سەرنج بزانرێت تاکو زاتی پیرۆزی ئەو ببینین:

**یەکەمیان:** "لیس الکحل کالتکحل". واتە: شتی سنعەت و دەستکرد - با لە تەواوترین شێوەشدا بێت - ناگاتە پلەی سروشتی و فیتری و، هەرگیز جێی ئەو ناگرێتەوە، بەڵکو هەڵە و زەللەی شێوە گشتییەکەی ئاماژە بۆ کاری دەستکرد و خۆنواندن دەکات.

**دووهەمیان:** ڕەوشتە بەرزەکان تەنها بەهۆی "جیددییەت" پەیوەست دەبن بە زەویی حەقیقەتەوە.. بەردەوامیی ژیانیان و ڕێکوپێکیی کۆی هەمووشیان تەنها بە "ڕاستی" دەبێت. خۆ هەرکات پەیوەندییەکانی "ڕاستی" و "جیددییەت" بڕان، ئەوا ئەو ڕەوشتانە بە وێنەی درك و داڵی وشکیان لێ دێت بەدەم ڕەشەباوە.

**سێهەمیان:** یەکێك لە دەستوورەکان: بوونی مەیل و کێش بوونە بەرەو یەکتر لەو شتانەدا کە پێکەوە دەگونجێن و، بوونی پاڵنان و دوورەپەرێزی لە یەکترە لەو شتانەدا کە دژی یەکترین. جا هەروەك ئەم دەستوورە لە شتە ماددییەکاندا جێبەجێیە، لە ڕەوشتەکان و شتانی مەعنەویشدا جێبەجێ و دەستبەکارە.

**چوارەميان:** "للكل حكم ليس لكل". (واتە: ئەو بڕيارەی کە بۆ کۆی چەند شتێك هەيە، بۆ دانە دانەی هەموو يەکێکی نی‌يە).

ئاسەوارەکانی حەزرەتی محەممەد ﷺ هەروەها ژيانی پيرۆزی و مێژووی ژيانی، شايەتی دەدەن - تەنانەت بە سەلماندنی دوژمنانيشی - لەسەر ئەوەی کە خاوەنی ڕەوشت و خوويەکی گەورەيە و، سەرجەم ڕەوشتە بەرزەکانی تێدا کۆيە.

خۆ ئاشکرايە کە تێکەڵبوون و کۆبوونەوە و گشتگيريی زۆرێك لەو ڕەوشتانە دەبێتە هۆی بەرهەمهێنانی "دەروون بەرزی"يەك کە بەرهەمهێنی ئەو شەرەف و ويقارەيە بەسەر کاروبارە نزمەکاندا بەرز و بڵندن، بە وێنەی بەرز و خاوێنيی فريشتەکان لەوەی کە تێکەڵی شەيتانەکان ببن، ڕەوشتە بەرزەکانيش بە هەمان جۆرن، هەرگيز بوار بە تێهەڵکێش بوونی فێڵ و درۆ لە نێوان خۆياندا نادەن، بەڵکو پاك و بەری و بەرز و بڵند دەبن لە ئاستياندا، بەپێی خواست و حيکمەتی دژايەتيی نێوانيان.

پاشان ژيان و گيانی ئەم ڕەوشتە بەرزانە بريتی‌يە لە: ڕاستی و پێکاندنی حەق، چونکە ئەم دوانە بە وێنەی ڕۆشنايی درەخشان "ڕووناکی" پەخش دەکەن و ئەو ڕەوشتە بەرزانە پێش چاو دەخەن.

برای بەڕێز!

ئايا نابينی کەسێك کە تەنها بە "ئازايەتی" ناوبانگی دەرکردبێت چۆن خۆی بەرز و بڵند ڕادەگرێت لە "درۆ" تاکو ئەو پلەوپايەيە نەشێوێنێت کە ئەو چۆنێتی و سيفەتە پێی دەبەخشێ؟ ئەی ئەگەر هەموو ڕەوشتە بەرزەکان لە کەسێکدا کۆببنەوە دەبێ چۆن بێت؟ بەڵێ، ئەو بڕيارەی کە بۆ کۆی "هەموو" (سيفەتەکان) هەيە بۆ دانەدانەکانی نی‌يە (للكل حكم ليس لكل)!

لەم سەردەمەی ئێستادا دەبينين ماوەی نێوان "ڕاستی" و "درۆ" هێندەی پەنجەيەك زياتر نی‌يە! ئەوەتا هەردووکيان لە يەك بازاڕدا دەفرۆشرێن. بەڵام هەموو زەمانێك حوکمی خۆی هەيە، چونکە لە هيچ کاتێکی پێشوودا ڕووی نەداوە کە ماوەی نێوان "ڕاستی" و "درۆ" بەو ڕادەيە فراوان بووبێت کە لە چەرخی بەختەوەريی پێغەمبەرايەتيی ئەودا ڕووی دا. ئەوەبوو "ڕاستی" بە جوانی و درەخشانيی ڕاستەقينەی خۆی و بەوپەڕی سام و شکۆوە دەرکەوت و، حەزرەتی محەممەدی "الصادق الأمين"يش ﷺ گەيشتە پلەی هەرە بەرزی ڕاستگۆيان و، ئاڵوگۆڕێکی مەزنی لە جيهاندا بەرپا کرد..

بەوەش دووریی "ڕاستی"ی لە "درۆ"وە هێندەی دووریی نێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوا پیشان دا، ئیتر لەو سەدە و کاتەدا بازاڕ و کاڵای "ڕاستی" برەوی پەیدا کرد.

کەچی "درۆ" کە وەك ئەندامەکانی تەرمی مردوو وایە، ناشیرینی و قێزەونی‌یەکەی بە تەواوی دەرکەوت و، ئەوانەشی بەرەو نزمترین پلە نزمەکانی مرۆڤایەتی هێنایە خوار کە دەستیان لێ گیر کردبوو، بە وێنەی "موسەیلەمەی درۆزن". ئیتر لەو سەدەیەدا بازاڕ و کاڵاکەی (درۆ) ڕەواج و برەوی نەما.

هەر بەم جۆرە یەکێك لە سروشتەکانی عەرەب فەخر و شانازی و حەزکردنە لەو کاڵایەی کە برەوی هەیە. لەبەر ئەوە، بە خێرایی و پێشبڕکێ خۆیان بە "ڕاستی" ڕازاندەوە و، لە "درۆ" دوورکەوتنەوە و، ئاڵای دادپەروەری‌یان بەسەر هەموو جیهانەکاندا بەرز کردەوە.

هەر لێرەوەیە کە لە ڕووی ژێری‌یەوە "دادپەروەری"(عدالـة)ی هاوەڵان سەری هەڵدا..

ئەگەر مرۆڤ بە وردی سەیری سیرەت و مێژوو و ئاسەوارەکان بکات و، لە حاڵی پێغەمبەر ﷺ هەر لە تەمەنی چوار ساڵی‌یەوە هەتا چل ساڵی ورد ببێتەوە، هەرچەندەش قۆناغی لاوێتی و داگیرسانی گەرمیی غەریزەکان کارێك دەکات کە شتە پەنهانەکان دەردەخات و فروفێڵە شاراوەکانی ناو سروشت دەخاتە ڕوو، کەچی دەبینی ئەم سەروەرە - دروودی خوای لەسەر بێت - لە هەموو ساڵەکانی تەمەنیدا بە ڕاسترەوی‌یەکی تەواوەتی و، توندوتۆڵی‌یەکی لەڕادەبەدەر و، داوێن پاکی‌یەکی تەواو، هاوکات لەگەڵ بەردەوامی و، ڕێکوپێکیی ئەم ڕەوشتانەیدا پلە بە پلە سەرکەوتووە و، هیچ حاڵێکی ئاماژەی تێدا نی‌یە بۆ ئەوەی کە فێڵی بەکارهێنابێت، نەخوازەڵا لە بەرامبەر دوژمنانی سەرسەخت و زیرەکدا..

لەو کاتەدا کە دەبینی پێغەمبەر ﷺ بەو جۆرەیە، سەیری دەکەیت لە سەری چل ساڵەی تەمەنیدا، کە تەمەنێکە حاڵەتەکانی مرۆڤ دەکات بە "خوو"ی بەردەوام و، عادەتەکانیشی دەگۆڕێت بە سروشتێکی دامەزراو کە ڕەفتاری پێچەوانە ناکات، ئا لەم تەمەنەدا ئاڵوگۆڕێکی مەزنی لە جیهاندا نایەوە. کە ئەوەش تەنها لەلایەن خوای گەورەوەیە. ئیتر ئەگەر کەسێك نەیسەلمێنێ کە پێغەمبەر ﷺ لەسەر ڕاستی و حەقیقەتی ڕوون و پەتی‌یە، ئەوا "سۆفستائی"یەك لە زەینی ئەودا خۆی شاردووەتەوە..

ئایا نابینی حالی پێغەمبەر ﷺ لە هاووێنەی ڕووداوی ئەشکەوتەکەدا چۆن بووە کە بە پێی عادەت ئومێدی ڕزگاریی نەمابوو؟ دەبینی بە کەمالی باوەڕبوون و بەوپەڕی متمانە و جیدییەت هەڵسوکەوت دەکات!

هەموو ئەوانە، شایەتێکی سەروزیادن لەسەر پێغەمبەرێتی و جیدییەتی ئەو سەروەرە ﷺ و، بەڵگەیەکی گومان بڕن لەسەر ئەوەی کە دەستی لە "حەق" گیر کردووە.

## ڕێبازی دووهەم

لاپەڕەی "ڕابوردوو" بەڵگەیەکە لەسەر پێغەمبەرێتیی ئەو خۆشەویستە. ئەویش بە ڕەچاوکردنی (چوار) سەرنج:

**یەکەمیان:**

هەرکەسێك بناغەکانی زانست و هونەرێك - یان هی چیرۆکەکان - بگرێت و، گیان و هەوێنی ژیانی بزانێت و، بە باشی لە شوێنی خۆیاندا بەکاریان بهێنێت، پاشان دەعواکەی خۆی لەسەر ئەوانە بنیات بنێت، ئەو کارەی بەڵگەیە لەسەر کارامەیی و شارەزایی ئەو کەسە لەو زانستەدا.

**دووهەمیان:**

برام!

ئەگەر شارەزای سروشتی مرۆڤ بیت، کەسێك نابینیت کە بە ئاسانی پڕکێشی درۆ و سەرپێچییەك بکات، تەنانەت گەر شتێکی بێ نرخیش بێت و لە نێوان خەڵکانێکدا کە ژمارەیان کەم بێت و لە بابەتێکدا کە بایەخی نەبێ و بە شێوەیەکیش کە لاواز بێت..

ئەی ئیتر چۆن کەسێك کە خاوەنی چۆنێتییەکی لەوپەڕی مەزنیدایە و، خاوەنی داوایەکە لەوپەڕی شکۆمەندیدایە و، لە نێوان کۆمەڵێك خەڵکدا دەژی کە تابلێی زۆرن و، سەرسەختییەکی لە بەرامبەرەوەیە کە لەوپەڕی توندوتیژیدایە؟! ئنجا هەرچەند بۆ خۆی نەخوێندەوارە (ناخوێنێتەوە و نانووسێت) کەچی لە چەند کاروبارێك دەدوێ کە ژیری بە تەنیا خۆی سەریان لێ دەرناکات، بەڵام بەوپەڕی جیدییەت و، لە پێش چاوی هەموو دنیادا ئاشکرایان دەکات و ڕایاندەگەیەنێت.. ئایا ئەمە بەڵگە نییە لە سەر ڕاستیی ئەو؟!

**سێهەمیان:**

گەلێ لەو زانستانەی کە لە ڕێی فێرکردنی عادەتەکان و بارودۆخەکان و ڕووداوەکان و کردارەکانەوە لەلای خەڵکانی شارنشین زانراون، لای خەڵکانی گوندنشین نەزەری و نەزانراون. لەبەر ئەوە، هەرکەسێك داوەریی ژیری ئەنجام دەدات و بە دوای حاڵی گوندنشینەکاندا دەگەڕێت، دەبێ بە گریمان خۆی لەو دەشت و دەرەدا دابنێت..

جا ئەگەر پێت خۆشە لەمە تێبگەیت، ئەوا بگەڕێرەوە بۆلای پێشەکیی دووهەم، چونکە ئەم سەرنجەی ڕوون کردووەتەوە.

**چوارەمیان:**

ئەگەر کەسێکی نەخوێندەوار مونازەرەی لەگەڵ زانایانی زانستێکدا کرد و، پاشان ڕای خۆی لە باس و بابەتەکانی ئەو زانستانەدا دەربڕی و، لە شوێنی یەکگرتنی ئەواندا پشتڕاستی کردنەوە و، لە شوێنی ڕا جیاوازەکانیشدا هەڵەکانی بۆ ڕاست کردنەوە، ئایا ئەمە نابێتە بەڵگەی ئەوەی کە لە سەرووی ئەو زانایانەوەیە و، زانستەکەشی بەخششێکی خواییە، نەك دەستکەوتی مرۆڤ؟

لەسەر بناغەی ئەم سەرنجە دەڵێین:

پێغەمبەری سەروەر ﷺ هەرچەندەش نەخوێندەوارە، بەڵام دەڵێی بە گیانی گەشتیار و ڕەهای خۆی "کات" و "شوێن"ی بڕیوە و، ڕۆشتووەتە ناو قوڵایی "ڕابوردوو" ئنجا لەوێ بە وێنەی بینەرێك حاڵی پێغەمبەرانی پێشینی - درووودیان لەسەر بێ - دەرخستووە و، لە پێش چاوی هەموو جیهاندا نهێنییەکانی ئەوانی ڕوون کردووەتەوە.

ئەوەش لە کێشەیەکی هێندە مەزندا کە ڕوانینی خەڵکانی زیرەك بەلای خۆیدا ڕادەکێشێت..

ئەوەتا بێ پەروا و، بە بێ دوودڵی و، لەوپەڕی باوەڕ و متمانەدا بەسەرهاتەکانیان دەگێڕێتەوە و، هەوێنی ژیانی چیرۆکەکانیان و بناغەی ئەو چیرۆکانەش بە دەستەوە دەگرێ و دەیکاتە پێشەکی بۆ دەعواکەی. بۆ ئەمەش لە هەر شوێنێکدا ئەو کتێبانە لەسەر "ڕاستی" یەکیان گرتبێت پشتیان دەگرێت و، ئەو شوێنانەش کە جیاوازییان لە نێواندایە هەڵەکانیان بۆ ڕاست دەکاتەوە.

ئەم حاڵەش دەیسەلمێنێت کە بەڵگەی پێغەمبەرێتیی ئەوە، درووودی خوای لەسەر بێت.

کۆی بەڵگەکانی پێغەمبەرێتیی سەرجەم پێغەمبەران - درووودیان لەسەر بێت - بەڵگەیە لەسەر ڕاستیی ئەم پێغەمبەرە سەروەرە ﷺ و، هەموو موعجیزاتیشیان موعجیزەیەکی مەعنەوین بۆ ئەم.

برام! هەندێ جار "سوێند" لە شوێنی "بەڵگە"دا دەبێت، چونکە بەڵگە لەخۆ دەگرێت. لەبەر ئەوە:

[والذي قصَّ عليه القصصَ للحصص، وسَيَّرَ روحَه في أعماق الماضي وفي شواهق المستقبل، فكشفَ له الأسرارَ في زوايا الواقعات، إن نظرَه النَّقّادَ أدقُّ مِن أن يُدَلَّسَ عليه، ومسلكَه الحقَّ أغنى مِنْ أن يُدْلِسَ على الناس]!

واتە: (سوێند بەو کەسەی کە چیرۆکەکانی بە مەبەستی ڕوونکردنەوە بۆ ئەو خۆشەویستە گێڕاوەتەوە و، گیانی ئەوی بەناو قووڵاییەکانی ڕابوردوودا و بەسەر بەرزاییەکانی داهاتوودا گێڕاوە و، نهێنییەکانی لە گۆشەی ڕووداوەکاندا بۆ دەرخستووە، ڕوانینی ڕەخنەگری ئەو خۆشەویستە لەوە وردترە کە چەواشە بکرێ و، ڕێبازە ڕەواکەشی لەوە بێ نیازترە کە خەڵکی چەواشە بکات)!

بەڵێ، "ئەندێشە" ناتوانێت خۆی وەك "حەقیقەت"ێك بۆ نووری بینینی ئەو دەربخات و، ڕێبازە "حەق" و ڕەواکەشی زۆر لەوە بێ نیازترە کە فێڵ بەکاربهێنێت و خەڵکی بە هەڵەدا ببات!

## ڕێبازی سێهەم

لەبارەی ڕوونکردنەوەی لاپەڕەی حاڵی حازر (مەبەستم چەرخی بەختەوەریی پێغەمبەرێتییە).

لێرەشدا چوار سەرنج و، یەك خاڵ هەیە کە دەبێ بە وردی سەیر بکرێن.

**یەکەمیان:**

ئەگەر سەرنج لە حاڵی جیهان بدەیت، دەبینی کارێکی یەکجار قورس و دژوارە کە عادەتێك، با بێ نرخیش بێت، لابرێت لە ناو قەومێکدا، با کەمیش بن.. یان ڕەوشتێك

هەڵبگیرێت، با لاوازیش بێت، لە ناو دەستەیەکدا با زەلیلیش بن، کە پادشایەك ئەنجامی بدات، با مەزنیش بێت، بە هیممەتێك هەرچەندەش توندوتیژ بێت، لە ماوەیەکی درێژخایەندا و، بە زەحمەت و ڕەنجێکی زۆر..

ئەی چی دەڵێیت سەبارەت بە کەسێك کە کاربەدەست نەبووە و، لە ماوەیەکی کەمدا هیممەتێکی جوزئیی سەبارەت بە کارتێکراو خستووەتە کار و، چەندین داب و نەریتی ڕیشەکەن کردووە و، چەندەها ڕەوشتیشی لابردووە کە تەواو ڕیشەیان داکوتاوە، لەو شتانەی کە بە تەواوی پێیان ڕاهاتوون و تا بیشڵێی لە ناویاندا بەردەوام بووە. ئنجا کتوپڕ لەبریی هەموو ئەوانە چەندین نەریت و ڕەوشتی تری بە خێرایی لە دڵی قەومێکی تابڵێی زۆردا دامەزراند کە بۆ شتانی خوو پێوەگرتوویان تابڵێی دەمارگیر بوون. ئایا ئیتر بە کەسێکی بازدەری نابینی بەسەر شتانی ئاساییدا؟

خۆ ئەگەر ئەمە نەسەلمێنیت ئەوا ناوت لە لیستی سۆفستائیەکاندا تۆمار دەکەم!

**دووهەمیان:**

"دەوڵەت" کەسێتیەکی مەعنەویە. پێکهاتنیشی - بە وێنەی گەشەکردنی منداڵ - پلە پلەیە و، زاڵبوونیشی بەسەر دەوڵەتە کۆنەکاندا - کە فەرمانەکانیان وەك سروشتێکی جێگیریان لێ هاتووە بۆ میللەتەکانیان - لەسەرخۆ و پلە پلەیە.

ئەی ئایا ئەو حکومەتە مەزنەی حەزرەتی محەممەد ﷺ کارێکی بەدەر لە عادەتی پێکهێنانی دەوڵەتان نییە کە لە ماوەیەکی کەم و کورتدا پێکی هێنا و، بە یەك جار و کتوپڕ بەسەر دەوڵەتە مەزنەکاندا زاڵ بوو، لەگەڵ هێشتنەوەی فەرمانڕەوایەتیی خۆی نەك تەنها بەسەر ڕواڵەتدا، بەڵکو لە ڕووی ڕواڵەت و پەنهان و ماددی و مەعنەویەوە؟!

جا ئەگەر نەتوانیت ئەم شتە دەراسایانە ببینیت، ئەوا لە کۆمەڵی نابینایانیت!

**سێیەمیان:**

بە زەبر و زۆر دەتوانرێ خۆسەپاندنی ڕواڵەتی و ڕووکەش ئەنجام بدرێت، بەڵام زاڵبوون بەسەر بیر و هزرەکاندا و کاریگەری تیایاندا لە ڕێی بەخشینی تامی شیرینیی خۆی بە گیانەکان.. هەروەها زاڵبوون بەسەر سروشتەکاندا، هاودەم لەگەڵ

پارێزگاریی دەسەلاتی خۆی بە هەمیشە و بەردەوامی لەسەر ویژدانەکان.. جگە لە کاری دەراسا هیچی تر نی‌یە و، تەنیا و تەنیا تایبەتمەندی‌یەکی نایابی پێغەمبەریتی‌یە.

جا ئەگەر ئەمە نەزانیت، ئەوا نامۆیت لەم ڕاستی‌یە.

**چوارەمیان:**

هەلسووڕاندنی بیر و هزرەکانی هەموان و ڕێنماییان بە ڕێگاکانی "تەرهیب" و "تەرغیب" کاریگەرییان جوزئی و ڕووکەش و کاتی دەبێت و، ماوەیەکیش ڕێی "داوەریی ژێری" دەگرێت..

بەلام کەسێك بە ڕێنماییەکانی خۆی ڕۆشتبێتە ناو قوولایی دلەکان و، وردترینی هەست و نەستەکانی وروژاندبێت و، خونچەی توانا و لێهاتنەکانی ئەوانی والا کردبێت و، ڕەوشتەکانی ناخی مرۆڤی بێدار کردبێتەوە و، پەنهانەکانیشیانی خستبێتە ڕوو، هەروەها گەوهەری مرۆڤایەتیی ئەوانی بە وروژم هەلقوولاندبێت و، نرخ و بەهای هۆشمەندی و مرۆڤایەتیی ئەوانی دەرخستبێت..

ئەو کەسە، لە تیشکی حەقیقەت بەهرەمەندە و، کارەکانی دەراسان..

بەلێ، پاکژکردنەوەی دل و دەروون لە هاوشێوەی ئەو دلڕەقییەی کە لە زیندەبەچال کردنی کچاندا بەرجەستەیە و، نەرمکردنەوەی ئەو دلانە بە ڕادەیەك کە بەزەییان بە مێروولەی بچووکدا بێتەوە.. لە ڕاستیدا، ئالوگۆڕێکی مەزنە، نەخوازەلا لەناو ئەو دەشت نشینانەدا، بە ڕادەیەك کە خاوەن بەسیرەتەکان بە بێ گومانی دەیسەلمێنن و، دەلێن: ئەوە کارێکی لە ئاسایی بەدەرە و، هیچ یاسایەکی سروشتی نایگرێتەوە.

جا ئەگەر خاوەنی بینایی دل و دەروون بیت، بێ هیچ گومانێك ئەمە دەسەلمێنیت.

ئێستاش گوێ بۆ ئەم (خال)ە ڕابگرە:

مێژووی جیهان شایەتە کە "بلیمەتی هەلکەوتوو" ئەو کەسەیە توانای بووژاندنەوەی توانا و لێهاتنێکی گشتی و بێدارکردنەوەی ڕەوشتێکی هەمەکیی هەبێت و، ببێتە هۆی دەرکەوتنی هەست و نەستێکی گشتی. چونکە کەسێك گەر هەستێکی نوستووی وەك ئەمە بێدار نەکاتەوە ئەوا هەول و کۆششی کاتی دەبێت و، وەك تەپوتۆز با دەیبات و، بەردەوام نابێت.

هەر بەم جۆرە، گەورەترین کەسی زیرەك و بلیمەت توانیویەتی یەك دانە، یاخود دوان، یان سێ دانە لەم هەستە گشتی‌یانە بێدار بکاتەوە، وەك هەستی سەربەستی و، هەستی پەرۆشیی نەتەوایەتیی و، هەستی خۆشەویستی.

جا ئایا بێدارکردنەوەی هەزاران هەستی بەرزی پەنهان و نوستوو کە بە یەك جار و بە وێنەی ئاوی بەرووژمی هەڵقوڵاو دەربخرێن، لە نێوان قەومێکی دەشت نشینی پەرش و بڵاو لە دوورگەی عەرەبدا و، لەو بیابانە فراوانەدا، بە کارێکی نائاسیی دانانرێت؟

گەر کەسێك ئەم خاڵە نەخاتە ناو ژیریی خۆی، ئێمە بە "دوورگەی عەرەب" تەحەددای دەکەین کە لە پێش چاویدایە..

وا پاش سیازدە چەرخ و دوای بەرزبوونەوەی مرۆڤ بە پلەکانی پێشکەوتندا با نەیارە سەرسەختەکان سەد کەس لە فەیلەسووفە تەواو کاملەکان هەڵبژێرن و، ئنجا سەد ساڵی ڕەبەق هەوڵ و تەقالا بدەن، بزانین ئایا بە هەموویان لە سەدا یەکی ئەو کارانە ئەنجام دەدەن کە پێغەمبەر ﷺ سەبارەت بە زەمان و ڕۆژگاری خۆی ئەنجامی دا؟!

ئاماژەیەك:

هەرکەسێك دەیەوێت لە کارەکانیدا سەرکەوتوو بێت، پێویستە لەگەڵ یاسای عادەتەکانی خوای گەورەدا پەیوەندیی خۆش بێت و، ئاشنای یاساکانی سروشت بێت و، پەیوەستی پەیوەندی‌یە کۆمەڵایەتی‌یەکان بێت.

دەنا "فیترەت" بە پشت نەگرتن و سەرنەخستن وەڵامی بێدەنگکەری دەداتەوە! ئنجا یاسا گشتی‌یە دەست بەکارەکانیش هەموو ئەو کەسانە دەهاونە بیابانی "نەبوون" کە دژایەتییان دەکەن!

سەرنج لەمە بدە، دەبینی ڕاستی‌یەکانی "شەریعەت" - کە چەند یاسایەکی ورد و قووڵ و دەست بەکارن لە سروشتی جیهاندا - چەندە پارێزگاریی هاوسەنگیی یاساکانی فیترەت و پەیوەستە کۆمەڵایەتی‌یەکانیان کردووە کە لەبەر وردییان پێش چاوی ژیریی ئەو کەسانە ناکەوێت!

بەڵێ، پارێزگاری کردنی ڕاستی‌یەکانی شەریعەت لەم چەرخە دوور و درێژانەدا، بگرە دەرکەوتنی زیاتریان، هاودەم لەگەڵ ئەو گرفتە مەزنانەی ڕووبەڕوویان بووەتەوە،

بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ڕێبازی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ لەسەر ئەو "حەق"ە دامەزراوە کە لەناو ناچێت.

ئەگەر ئەم چوار سەرنجەت لەگەڵ ئەم خاڵەدا زانی، ئەوا بە زەینێکی کراوەی فراوانی ئەوتۆ کە هێزی "داوەریی ژیری" و "وردیی تێبینی"ی هەبێت گوێ بۆ ئەمەی خوارەوە ڕابگرە:

محەممەدی هاشمی ﷺ هەرچەند نەخوێندەوارێکە (نەیخوێندووە و نەینووسیوە) و، لەگەڵ نەبوونی هێزی ڕواڵەتی و، نەبوونی حەز و مەیلی خۆسەپاندن و دەسەڵات، کەچی بەوپەڕی باوەڕ و متمانە و لە شوێنێکی پڕ مەترسی و پلەیەکی گرنگدا، لە دڵەوە دەستی بە شتێکی مەزنەوە گرتووە و، لەو ڕێیەوە بە سەر هزرەکاندا سەرکەوتووە و، خۆی لای گیانەکان خۆشەویست کردووە و، بەسەر سروشتەکاندا زاڵ بووە و، نەریت و ڕەوشتە وەحشیگەری‌یە خوو پێوەگیراوە دامەزراوە بەردەوام و زۆرەکانی ناخی دڵی ئەوانی لە ڕیشەوە دەرهێناوە.. پاشان بەوپەڕی هێز و توندوتۆڵی، کە دەڵێی تێکەڵ بە گۆشت و خوێنیان بووە، لە جێی هەموو ئەوانەدا چەندین ڕەوشتی بەرز و داب و نەریتی جوانی ڕواندووە..

هەروەك دڵڕەقیی خەڵکانێکی کش و ماتی ناو گۆشەکانی وەحشەتی گۆڕی بە چەند هەست و نەستێکی نەرم و نیان و، گەوهەری مرۆڤێتیی ئەوانی دەرخست..

پاشان لە گۆشەکانی لەبیرچوونەوەدا ئەوانی هێنایەدەر و، بە پلەکانی پێشکەوتندا هەتا لوتکەی شارستانێتی سەری خستن و، کردنی بە مامۆستای جیهانی خۆیان و، لە ماوەیەکی کەمدا دەوڵەتێکی گەورەی بۆ دامەزراندن کە بە وێنەی ڕۆشنایی بزۆك و نووری ڕووناکی بەخش، بگرە وەکو عەسای مووسا - درووودی لەسەر بێت - دەوڵەتەکانی قووت دا و سڕینیەوە.

بەمەش ڕاستی و، پێغەمبەرێتی و، دەستگرتنی بە "حەق"ەوە، بۆ هەموو ئەوانەی کە بینایی بەسیرەتیان لەدەست نەداوە، دەرخست.

جا ئەگەر ئەم ڕاستگۆییەی ئەو نەبینیت، ئەوا ناوت لە تۆماری مرۆڤدا دەسڕێتەوە.

## ڕێبازی چوارەم

لە مەسەلەی لاپەڕەی "داهاتوو"دا، بە تایبەت مەسەلەی شەریعەت، دەبێ تێبینیی چوار سەرنج بکرێت:

**یەکەمیان:**

کەسێك لە چوار پێنج زانستدا نابێتە پسپۆڕ و خاوەن مەلەکە[١]، مەگەر کەسێکی نائاسایی(خارق) بێت.

**دووهەمیان:**

تەنیا یەك مەسەلە هەندێ جار جیاواز دەبێت، ئەگەر لە دوو قسەکەری جیاجیاوە دەربچێت..

چونکە یەکێکیان بۆ سەرەتا و کۆتایی ئەو مەسەلەیەی ڕوانی و، تێبینیی ئەوەی کرد کە لەگەڵ سیاق و سیباقی[٢] ڕستەکەدا دەگونجێ و، ئەوەشی لەیاد بوو کە لەگەڵ دەستە خوشکەکانیدا تەبایە و، شوێنێکی شیاوی دۆزیەوە بە باشی بەکاری هێنا تیایدا و، بە دوای زەوی‌یەکی بەپیتدا گەڕا، کە دۆزی‌یەوە تیایدا ڕواند. ئەم گوفتارەشی دەبێتە بەڵگە لەسەر لێهاتوویی و کارامەیی ئەو..

بەڵام ئەوی تریان، لەبەر ئەوەی ئەم خاڵانەی پشتگوێ خست، ئەوا گوفتارەکەی لەم مەسەلەیەدا بوو بە بەڵگەی سەرزارەکی و چاولێکەری و نەزانیی ئەو. لە کاتێکدا کە گوفتارەکەش هەمان گوفتارە. جا ئەگەر (ژیری)ت ئەمە لە یەك جیا نەکاتەوە (گیان)ت هەستی پێدەکات.

---

(١) "مەلەکە": سیفەتێکی جێگیرە لە دەروونی مرۆڤدا. واتە: بەهۆی یەکێك لە کردارەکانەوە شتێك لە ناخی مرۆڤدا دروست دەبێت پێی دەڵێن: "چۆنێتیی دەروونی". جا ئەگەر ئەو چۆنێتی‌یە بە خێرایی نەما پێی دەوترێ: "حاڵەت". بەڵام ئەگەر چەند جارێك دووپات بووەوە و جێی خۆی گرت و بوو بە چۆنێتی‌یەکی بەردەوام کە لابردنی ئەستەم بێت، پێی دەوترێ: "مەلەکە". خۆ ئەگەر بە کرداریش بەرجەستە بوو، پێی دەڵێن: ڕەوشت و خوو. بڕوانە: (التعریفات) للسید الشریف الجرجاني. ص: ١٢٦، طبع ونشر دار الشؤون الثقافیة – بغداد. هەروەها: (کشاف اصطلاحات الفنون) للتهانوي. ١٦٤٢/٢. (وەرگێڕ)

(٢) واتە لەگەڵ دارشتن و هێنانی دەستەواژەکان و، پێشخستن و دواخستنی وشەکانیدا. (وەرگێڕ)

**سیٚ‌هەمیان:**

زۆر لەو دۆزراوانەی کە پێش دوو چەرخ بە کاری دەراسا دادەنران، بەهۆی کامڵبوون و پێگەیشتنی بنەما و هۆکارەکان، تەنانەت وایان لیٚ هاتووە کە منالآن یاریی پێدەکەن، وەك لە پێشەکی دووهەمدا باس کرا.

ئەمە لە زەینی خۆتدا ئامادە بکە و لە پێش چاوتدا دایبنیٚ و، ئنجا بە ئەندێشەت بگەڕێرەوە بۆ سیازدە سەدە پێش ئێستا و، خۆت لە گاریگەری‌یەکانی کات و شوێن داماڵە و، سەیری کاروبارەکانی ناو دوورگەی عەرەب بکە، دەبینی: تەنیا مرۆڤێك کە هیچ شارەزاییەکی پێشووی لە ئیشوکاری ڕێسا و کۆمەڵگادا نی‌یە و، بارودۆخی کات و ژینگەکەشی یارمەتیی نەداوە، کەچی ڕێسایەکی بنیات ناوە و دادگەری‌یەکی دامەزراندووە کە ئەو شەریعەتیە وەك پوختەی هەموو یاساکانی سەرجەم زانستەکانە و، دەڵێی دەرەنجامی گەلیٚ ئەزموونی زۆرە، تەنانەت زیرەکیی مرۆڤ چەندەش فراوان بێت هێشتا پیٚی ناگات. ئەو شەریعەتە ڕووی لە ئەزەلە و، ڕایدەگەیەنێت کە لە گوفتاری ئەزەلی‌یەوە هاتووە و، بەختەوەریی هەردوو دنیا دەهێنێتەدی..

جا ئەگەر ویژدان بخەیتە کار، دەبینی ئەمە لەو ڕۆژگارەدا لە توانای مرۆڤدا نی‌یە، بگرە بەدەر لە وزەی سەرانسەری ڕەگەزی ئادەمیزادە. مەگەر چەند وەهمێکی بەد، بەهۆی ڕۆچوونی لە شتانی مادديدا، ئەو لایەنەی "سروشت"ی تۆی تێکدابێت کە ڕووی لەم ڕاستیانەیە!

**چوارەمیان:**

وەك لە "پێشەکیی دەهەم"دا وترا و، وەك ئەوەش کە لە وەڵامی خاڵی ڕەخنەکەی وەك ئەمەی خوارەوەدا دێت:

"ڕێنمایی" کاتیٚ سوودی دەبیٚ کە بەپێی پلەی ئامادەیی بیر و تێگەیشتنی زۆرینەی جەماوەر بێت، خۆ جەماوەریش لە ڕووی زۆرینەوە "عەوام"ن، عەوامیش توانای بینینی "حەقیقەت"یان بە شێوەیەکی پەتی نی‌یە و لەگەڵیدا ڕانایەن، مەگەر ئەندێشەی پێوە ڕاهاتووی خۆیانی بەبەر پۆشرابێت..

لەبەر ئەوە، شەریعەت ئەو حەقیقەتانەی بە چەند موتەشابیهـ و تەشبیهێك پیشان داوە. دەبینی لە بابەتەکانی زانستە گەردوونی‌یەکاندا، لەبەر ئەوەی بنەما و هۆکارەکان ئەو

کاتە پێنەگەیشتبوون، جەماوەر بە گوێرەی هەستی ڕواڵەتی و بەپێی باوەڕی خۆیان پێچەوانەی واقیعی ڕاستەقینەیان بە پێویست زانیوە، بۆیە "شەریعەت" بە تەماوی و ڕەهایی لەو زانستانە دواوە. لەگەڵ ئەوەشدا بە دانانی چەند نیشانەیەك ئاماژەی بۆ حەقیقەتی ئەو بابەتانە کردووە.

**وریاکردنەوەیەك:**

"ڕاستی" لە هەموو کردار و حاڵەتێکی پێغەمبەردا ﷺ دەبریسکێتەوە.

بەڵام ئەمە نابێتە هۆی ئەوەی کە هەموو کردار و حاڵەتەکانی دەراسا (خارق) بن. چونکە موعجیزات و کاری دەراسا بۆ پشتڕاست کردنەوەی بابەتی دەعوا لەسەرکراوە. خۆ ئەگەر پێویست نەبێت ئەوا مل بۆ یاسای عادەتەکانی خوای گەورە کەچ دەکرێت، ئەویش بە شوێنکەوتنی ئەو یاسا گشتییانەی کە لە گەردووندا پیادە و دەستبەکارن.

برام! ئەم وریاکردنەوەیە لە دەستەی پێشەکیی "ڕێبازی یەکەم"ە، بەڵام بەهۆی لەبیرچوونەوە لە ڕێگادا ون بوو، ئیتر خۆی کرد بێرەدا!

بە وریایی لەم چوار سەرنجە تێبگە.. وا دەڕۆینە ناو ئەنجامەوە:

ئایین و شەریعەتی ئیسلام - کە لەسەر "بەڵگە" دامەزراوە - پوختەی چەندین نوور و زانستە و، هەوێنی ژیانی سەرجەم زانستە بناغەییەکانی لە خۆ گرتووە، وەك: هونەری پاكژكردنی "گیان" و، زانستی ماڵ بەڕێوەبردن و، هونەری سیاسەتی شارستانی و، زانستی ڕژێمەکانی جیهان و، هونەری مافەکان و، زانستی مامەڵەکان و، هونەری داب و نەریتە کۆمەڵایەتییەکان، هەروەها و هەروەها.. هتد.

"شەریعەت" ڕوونکردنەوە و ڕاڤەی لە شوێنی پێویستدا پێشکەش کردووە و.. لەو شوێنانەشدا کە پێویست نین، یان زەینەکان بۆی ئامادە نین، یاخود ڕۆژگار یارمەتیی نەداوە، مەبەستەکەی بە پوختەیەك کورت کردووەتەوە و بناغەیەکی بۆ داناوە، ئیتر لێی هەڵێنجان و لق لێکردنەوە و نەشونمای ئەو شتەی بە ڕاوێژ و پرس و ڕای "ژیری"یەکان سپاردووە. لە کاتێکدا کە نە هەموو ئەم زانستانە و، نە سێیەکیشیان، دوای سیازدە چەرخ و لە شوێنە شارستانییەکاندا و، لەناو کەسە زیرەکەکاندا، لە یەك کەسدا نابینرێت!

کەسێك ناخی خۆی بە ویژدان ڕازاندبێتەوە، دەیسەلمێنێ کە ڕاستیی ئەم شەریعەتە هەمیشە بەدەر لە وزەی مرۆڤە، نەخوازەلا لەو زەمانەدا.

"چاکە ئەوەیە کە دوژمنان شایەت بن لەسەری"..

ئەوەتا "کارلایل"ی فەیلەسووفی جیهانی نوێ[1]، لە کەسێکی دانا و سیاسەتمەداری ئەڵمانییەوە دەگێڕێتەوە کە دوای وردبوونەوەی لە ڕاستییەکانی ئیسلام، وتوویەتی:

"ئەگەر ئیسلام ئاوا بێت، ئایا شارستانێتیی ئێستا دەکرێ لە چوارچێوەی ئیسلامدا بژی"؟

هەر خۆی وەڵامی داوەتەوە کە:

"بەڵێ، تەنانەت ئەوانەی کە لە ڕاستی دەکۆڵنەوە ئێستا لە ناوەندی ئەو بازنەیەدا دەژین"!

پاشان کارلایل دەڵێ:

(هێشتا ئیسلام بە تەواوی سەری هەڵنەدابوو کە بت پەرستییەکانی عەرەب و جەدەلی نەصرانیەت تیایدا گڕی گرت و سووتا. هەر شتێك حەق و ڕەوا نەبوو لە ڕاستیدا تەختە دارێکی بێ گیان و مردوو بوو بڵێسەی ئیسلام هەموویانی کرد بە خۆڵەمێش)[2].

بەڵێ، ماوەی سیازدە سەدەیە، وێڕای ئالوگۆڕ و گرفتەکانی ڕۆژگار، ئیسلام پارێزگاریی ڕاستییەکانی خۆی کردووە، تەنانەت ئەو ئالوگۆڕانە تەپوتۆزی وەهم و گومانەکانی لەسەر شانی ئیسلام تەکاندووە.

---

(١) تۆماس کارلایل (١٧٩٥-١٨٨١ز/١٢١٠-١٢٩٨ك) نووسەر و مێژووزان و فەیلەسووفێکی ئینگلیزە. باوکی ئاواتەخواز بووە کوڕەکەی ببێت بە قەشە، بەڵام گومان و دوودڵییە زۆرەکانی لە بارەی ئایینەوە ڕێی لە هێنانەدیی ئاواتەکەی باوکی گرت. زنجیرە بارێکی لەمەڕ پەرێشانیی دەروونی بە خۆوە بینی کە نزیکی حەوت ساڵی خایاند، لە ئاکامدا لەسەر بابەتەکانی ئیمان دامەزرا. گەلێ موحازەرەی گرنگی پێشکەش کردووە، کە لە یەکێکیاندا سەبارەت بە مەزنیی پێغەمبەری ئیسلام ﷺ دواوە و بە ڕێزەوە ستایشی کردووە و، دەری خستووە کە پێغەمبەری ڕاست و ڕەوایە. هەروەك چەندین بوختانیشی لەم ڕووەوە پووچەڵ کردووەتەوە. بابەتەکانی ئەو وتار و موحازەرانەش لە کتێبێکدا بە ناونیشانی (قارەمانەکان) کۆکراوەتەوە و بە چەند زمانێکی جیاجیا چاپ کراوە. وەسیەتی کردووە کە سەروەت و سامانەکەی بەسەر قوتابییە هەژارەکاندا ببەخشرێتەوە و، کتێبخانەکەشی بدرێت بە (زانکۆی هارفارد) لە ئەمریکا. کاریگەریی گەلێ قووڵی لەسەر ڕۆشنبیریی ئینگلیز و تێڕوانینیان بۆ جیهان بەجێ هێشتووە. بە پوختی لە فەرهەنگی تورکیی (Yeni Lugat)ەوە. (وەرگێڕ)

(٢) وەرگێڕانی عەرەبییەکەی ئەم دەقە دەکەوێتە لاپەڕە (٧٣-٧٤)ی چاپێکی کۆنی کتێبی (الأبطال)ی تۆماس کارلایل، وەرگێڕانی "محمد السباعي". (وەرگێڕ)

بەڵێ، وجوود و کاتی ئێستای جیهان شایەتە لەسەر ئەمە.
هەروەها دەبێ پێشەکییەکانی "وتاری یەکەم" بە هەند وەربگیرێت.
**ئەگەر دەڵێیت:**
زانینی پوختە و کورتەیەك لە هەموو زانستێك لە توانای تاکە کەسێکدا هەیە.
**وەڵام:**
بەڵێ.. نەخێر..
چونکە زانینی پوختەی ئەو زانستانە بەو شێوەیەی کە بتوانێ لە شوێنی گونجاوی خۆیدا بە جوانی دایبنێت و، لە زەوییەکی بەپیتدا بەکاری بهێنێت، هاودەم لەگەڵ چەند کاروبار و چەند خاڵێکدا کە زووتر باس کراون، کە ئەوەش – بە وێنەی شووشە – مەلەکەیەکی ڕەگداکوتاو لەو زانستەدا و ئاگادارییەکی تەواوەتی تیایدا دەردەخەن. ئەوکاتەش زانینی ئەو پوختەیە لە حوکمی زانینی هەموو زانستەکەدا دەبێ. خۆ هاوشێوەی ئەمە بۆ یەك دانە کەس لە تواناداا نییە و هەرگیز ناگونجێ.
تەنها یەك گوفتار کە دوو قسەکەر بیکەن – لەبەر هەندێ لەو شتانەی باس کران و، تا ئێستا نەبیستراون – دەبێتە بەڵگەی نەزانی ئەم و کارامەیی ئەو!
ئەی برای بەویژدانم!
ئەی ئەو کەسەی کە لە یەکەم مەنزڵی ئەم کتێبەوە بە ئەندێشەی خۆی هاوڕێیەتیم دەکات!
فەرموو بە چاویلکەیەکی فراوان بڕوانە و، شتەکان بەراورد بکە و، لە ئەندێشەی خۆتدا ئەنجومەنێکی باڵا بۆ ئەنجامدانی چەندین داوەریی ژیری پێکبهێنە و، سەرجەمی ئەو شتانە بخەرە پێش چاو کە لە هەر دوازدە پێشەکییەکان هەڵیان دەبژێریت.. پاشان ڕاوێژ بەم دەستوورانەی خوارەوە بکە:
تاکەکەس لە چەند زانستێکی زۆردا پسپۆڕ نابێت و..
تەنها یەك گوفتار کە دوو کەس بیڵێن جیاواز دەبێت و..
زانستەکان ئەنجامی بەدوای یەکدا هاتنی هزرو بیرەکانە و، بە تێپەڕبوونی کاتیش کامڵ دەبن و..
ئەوەی لە داهاتوودا بەڵگەنەویستە لەوانەیە لە ڕابوردوودا نەزەری بوو بێت و..

ئەو شتەی لای خەڵکی "شارستانی" زانراوە لەوانەیە لای کەسی "دەشتەکی" نەزانراو بێت و..

قیاس کردنی حاڵەتی "ڕابوردوو" لەسەر "داهاتوو" پێوەرێکی خەڵەتێنەری سەر لێ شێوێنە و..

سادە و ساکاریی دەشت نشین، فرت و فێڵەکانی خەڵکی شاری پێ هەڵناگیرێ. بەڵێ، فێڵەکان لەوانەیە لە ژێر پەردەی شارستانێتیدا خۆیان بشارنەوە و..

زۆرێك لە زانستەکان بە تەڵقینی عادەتەکان و ڕووداوەکان بەدەست دێن و..

ڕووناکیی ڕوانینی مرۆڤ ناڕواتە ناو داهاتوو، هەروەك چۆنێتییە تایبەتەکانیان نابینێت و..

یاساکانی مرۆڤیش بە وێنەی مرۆڤەکان تەمەنێکی سروشتییان هەیە؛ لە شوێنێکدا دەبڕێ و کۆتایی پێ دێت و..

دەوروبەر و ژینگەی کات و شوێن کاریگەرییەکی مەزنیان لە حاڵەت و بارودۆخەکانی دەروونەکاندا هەیە و..

زۆر لەو شتانەی کە لە ڕابوردوودا "دەراسا" بوون، لەوانەیە ئێستا بەهۆی کامڵ بوونی بنەماکانەوە "ئاسایی" بن و.

"زیرەکی"ش با ناوازە و دەراسا بێت، بۆ کەماڵی تەنیا یەك زانست سەروزیاد نییە، چ جای چەند زانستێکی زۆر.

براکەم!

ڕاوێژ بەم دەستوورانە بکە و، ئنجا خۆت لە کاریگەریی شتی تر داماڵە و، پۆشاکی ئەندێشەکانی دەوروبەر و وەهمەکانی زەمان فڕێ بدە و، لەسەر لێواری ئەم چەرخەی دەریای زەمانەوە بە کەشتییەکی ژێر دەریایی بڕۆ هەتا لە دوورگەی چەرخی بەختەوەریی پێغەمبەرێتی ئەو دێیتە دەرەوە.. لەوێ یەکەم شت کە پێش چاوت دەکەوێت ئەوەیە کە دەبینی:

مرۆڤێکی تەنیای بێ پشت و پەنا و بێ دەسەڵات، بە تەنیا خۆی، ڕۆشتووەتە زۆرانەوە لەگەڵ هەموو جیهاندا و، حەقیقەتێکیشی لەسەر شانی خۆی هەڵگرتووە کە لە گۆی زەوی مەزنترە و، شەریعەتێکیشی بە دەستەوە گرتووە کە بەختەوەریی

سەرانسەری مرۆڤایەتی دەستەبەر دەکات، ئەو شەریعەتەی کە دەڵێی پوختەی سەرجەم زانستە خواییەکان و کاکڵەی هەموو هونەرە ڕاستەقینەکانە..

ئەو شەریعەتە ژیانێکی وەهای تێدایە کە نەك وەکو پۆشاك بەڵکو بە وێنەی پێست وایە بە گەشەکردنی توانا و لێهاتنەکانی مرۆڤ ئەویش فراوان دەبێت و، بەختەوەری هەردوو دنیا بەرهەم دەهێنێت و، حاڵەت و بارودۆخەکانی سەرجەم گرۆی مرۆڤ - وەك بڵێی تەنیا یەك ئەنجومەن بن - ڕێك دەخات.

جا ئەگەر پرسیار لە یاساکانی بکەیت: لە کوێوە؟ بەرەو کوێ؟

ئەوا بە زمانی ئیعجازەکەی دەڵێت:

لە گوفتاری "ئەزەلی"یەوە دێین و هاوڕێی بیری مرۆڤین بە مەبەستی دەستەبەر کردنی سەلامەتیی مرۆڤ و ڕوومان لە "ئەبەد"ە. کاتێکیش کە ئەم دنیا فانی‌یە دەبڕین، مەعنەویاتی ئێمە بە ڕێ پیشاندەر و خۆراکێکی ڕۆحی دەمێننەوە بۆ نەوەی ئادەمیزاد، هەرچەندەش بە ڕواڵەت لێیان جیا دەبینەوە.

**کۆتایی:**

سەرچاوەی شوبهە و گومانەکان سێ شتە کە بریتی‌یە لەوەی:

ئەگەر خۆت گێل بکەیت لە ئامانجی خاوەنی شەرع و، لەوەش کە "ڕێنمایی" بە ڕێژەی ئامادەیی هزر و بیرەکانە و، لە ڕێی خۆ بەهەڵەبردنەوە - کە هێلانەی گومانە خراپەکانە - ڕەخنە لەو قورئانە پیرۆزە بگریت کە بناغەی شەریعەتە و، پێت وا بێت سێ خاڵی تێدایە:

یەکەمیان:

بوونی چەند موتەشابیهـ و گرفتێك لە قورئاندا، کە ئەمەش پێچەوانەی ئیعجازی دامەزراویەتی لەسەر ڕەوانبێژی، کە ئەویش لەسەر بناغەی ڕوونیی بەیان و ئاشکرایی گەیاندنەکانی دامەزراوە..

دووهەمیان:

ڕەهاکردن و تەماوی‌بوون لە باسەکانی لەمەڕ زانستە گەردوونی‌یەکاندا، لە کاتێکدا کە ئەمە پێچەوانەی ڕێبازی فێرکردن و ڕێنماییە، کە ئەویش ئامانجی ڕاستەقینەی شەریعەتە.

سێ هەمیان:

بەشێك لە ڕوالەتەکانی قورئان بەلای پێچەوانەی بەڵگەی ژێریدا دەبینرێت و، گریمانی پێچەوانەی واقیع هەڵدەگرێت، کە ئەوەش دژی ڕاستگۆیی قورئانە.

برام!

پشت بە خوای گەورە دەبەستم و دەڵێم:

ئەوەی کە ئێوە لەم سێ خاڵەدا بەهۆی ناتەواویی تێدەگەن، هەرگیز بەو جۆرە نییە، بەڵکو ڕاسترین شایەتە لەسەر ئیعجازی قورئان!

سەبارەت بە وەڵامی گومانی یەکەم، کە دوو جار بە شێوەیەکی ناوەکی ئەم وەڵامەت بینی، دەڵێم:

بزانە کە زۆرینەی جەماوەر "عەوام"ن، کەمایەتیش لە ڕوانگەی خاوەنی شەرعەوە شوێنکەوتەی زۆرینەن. چونکە ئەو گوفتارەی کە ئاراستەی "عەوام" دەکرێت "تایبەتمەندان"یش سوود و بەهرەی خۆیانی لێ وەردەگرن. خۆ ئەگەر ئەمە پێچەوانە بوایە، ئەوا عەوام بێبەش دەمانەوە.

ئنجا جەماوەری عەوام زەینی خۆیان لە شتانی پێڕاهاتوویان و لە ئەندێشەکانیان دانامالن، کەواتە توانای تێگەیشتنی ڕاستییە پەتییەکان و ئەو شتانەیان نییە کە تەنها لە بازنەی "ژیری"دان، مەگەر بە چاویلکەی ئەو شتانەی کە لە ئەندێشەیاندایە و، بە شێوەی شتانی لەگەڵ ڕاهاتوویان پیشانیان بدرێت، بەلام بەو مەرجەی کە ڕوانینیان هەر لەسەر وێنەکە نەمێنێتەوە، تاکو مەحالەکانی چەشنی بوونی "جەستە" و "لا" سەر هەڵنەدات، بەڵکو ڕوانینیان لەو شێوەیەوە بڕوات بەرەو "ڕاستییەکان".

بۆ نموونە: جەماوەر ڕاستیی هەڵسوکەوتی خوای گەورە لە بوونەوەراندا بە شێوەی هەڵسوکەوتی پادشایەك تەسەوور دەکەن کە لەسەر تەختی پادشایی نیشتەجێ بووبێت، وەك لەم گوفتارە پیرۆزەی خوای گەورەدا دەبینرێ:

﴿الرحمنُ على العرشِ استَوَى﴾ (طه: ٥)..

جا مادەم هەست و نەستەکانی جەماوەر لەم ناوەندەدایە، ئەوا ڕێبازی ڕەوانبێژی و ڕێگاکانی ڕێنمایی وا پێویست دەکەن کە چاودێریی تێگەیشتنی جەماوەر بکرێت و، ڕێز

لە هەست و نەستیان بگیرێت و، شان بە شانی ژیریی ئەوان هەنگاو بنرێت و، هزر و بیرەکانیان بە هەند وەربگیرێت..

جا ئەم مەنزلگایانەی کە چاودێریی ژیرییەکانی مرۆڤیان تێدا دەکرێت و، ڕێزیان لێ دەگیرێت، پێیان دەوترێت "التنزلات الالهية" (واتە: دابەزاندنەکانی گوفتاری خوای گەورە بۆ ئاستی تێگەیشتنی ژیریی مرۆڤ). ئەم دابەزاندنەش بە مەبەستی ئەوەیە کە بە زەینی ئەوان ئاشنا و هاوڕاز بێت.. سەر لە "پێشەکیی دەهەم" بدەرەوە..

لەبەر ئەمە، شێوەی شتە موتەشابیهەکان - کە چاودێریی ئەو جەماوەرە دەکات پابەندی هەست و نەست و ئەندێشەکانیانن - بە وێنەی چاویلکەیەك لەسەر بینینیان دانراوە، تاکو ڕاستییە پەتییەکان ببینن. هەر لەبەر ئەمەشە کە خەڵکی لە قسە و گوفتارەکانیاندا بە زۆری "خواستن"(إستعارة) بەکاردەهێنن، تاکو لە شێوەیەکی سادە و ئاساندا تەسەووری واتا قووڵەکان بکەن، یان وێنەی واتا پەرش و بڵاوەکان بکێشن. بەو واتایەی کە ئەم موتەشابیهانە لە هەموو بەشەکانی "ئیستیعارە" تەماوی ترن، چونکە چەند وێنەیەکی میسالین بۆ پەنهانترین ڕاستییە تەماوی و نادیارەکان. واتە گرفتەکە لە وردی و قووڵیی واتادایە، نەك لە داخراوی و گرێ بەستراوی وشەکان.

ئەی کەسی خاوەن گومان!

بە ویژدانەوە بڕوانە! ئایا نزیك خستنەوەی ئەم ڕاستییە قووڵ و دوورانە بە ڕێگایەکی ڕوون و ئاسان لە بیری خەڵکی، نەخوازەڵا عەوام، هەر بۆ خۆی خودی "ڕەوانبێژی" نییە کە بریتییە لە: "یەکاویەك بوونی گوفتار لەگەڵ خواستی حاڵ و مەقام"دا؟! ئایا ئەمە لەگەڵ واتادا بە ڕوونی یەکاویەکە، یان ئەو وەهمەی کە لە زەینی تۆدایە؟ خۆت لەمەدا دادوەر بە!

سەبارەت بە وەڵامی گومانی دووهەمیش، کە لە "پێشەکیی دووهەمدا" بە درێژی باس کرا.. ئەوا بزانە کە:

درەختی جیهان مەیلی بەرەو کامڵبوونی تێدایە، ئەو لقەش کە لە مرۆڤ بووەتەوە مەیلی پێشکەوتنی لەخۆ گرتووە، زانستەکانیش - کە وەك پلیکانەی پێشکەوتن وان - لە بەروبوومەکانی ئەو مەیلەن کە بە ئەزموونی زۆر و بە دوای یەکداهاتنی هزر و بیرەکان بەدەست هاتوون. ئەم زانستانە زنجیرەیەکی ڕیز بەستووی یەك لە دوای یەك و

هاوکارن کە هەتا ئەوەی پێشوویان پێك نەیەت ئەوەی دواتر دروست نابێت، هەروەها ئەوەی پێشوو نابێتە پێشەکیی زانستەکەی دوای خۆی هەتا بە وێنەی زانستە ناسراوەکان ئاشناییان لەگەڵدا بۆ دروست نەبێت.

لەسەر بناغەی ئەم نهێنی‌یە: ئەو زانستەی کە بە ئەنجامی چەندین ئەزموونی زۆر لەم سەردەمەدا پەیدا بووە و سەری هەڵداوە، گەر دە چەرخ پێش ئێستا بووایە و کەسێکیش بیویستایە خەڵکی‌یان لێ تێبگەیەنێت، ئەوا سەری لێ دەشێواندن و، دووچاری سەفسەتە و هەڵەی دەکردن!

بۆ نموونە، گەر ئەو دەمە بوترایە: "سەیری وەستانی خۆر و جووڵەی زەوی و کۆبوونەوەی یەك ملیۆن زیندەوەر لە یەك دڵۆپدا بکەن، تاکو پەی بە مەزنیی کردگار ببەن".. ئەوا لەبەر ئەوەی ڕوانینی جەماوەری عەوام بەهۆی هەستی ڕواڵەتی، یان بەهۆی هەڵەی هەستەوە، پێچەوانەی ئەو بەڵگەنەویستانەیە کە پێیان وتراوە، بەدرۆیان دەخستەوە.. یان خۆیان بەهەڵەدا دەبرد.. یاخود سەرسەختی‌یان بەرامبەر شتێکی دیاریکراو دەردەبڕی! لە کاتێکدا کە شێواندنی زەینەکان - نەخوازەڵا لە ماوەی دە چەرخدا - دژی ڕێبازی "ڕێنمایی"یە.

**وریا کردنەوەیەك:**

ئەم چەشنە بابەتانە بەو شتە نەزەری‌یانە قیاس ناکرێن کە لە داهاتوودا دەردەکەون، چونکە هەستی ڕواڵەتی پەیوەندی بەو شتانەوە ناکات کە هی "داهاتوو"ن. لەبەر ئەوە، گریمانی هەردوو ڕووەکە هەیە. چونکە لە بازنەی "مومکینات"دایە و دەکرێ باوەڕ و متمانەی پێ بکرێ. کەواتە مافی ئاشکرای خۆی لەوەدایە کە بە ڕاشکاوی باس بکرێت، بەڵام ئەوەی کە لێی دەدوێین لە پلەی ئیمکان و گریمان دەرچووە و، گەیشتووەتە پلەی "بەڵگە نەویستی"، واتە نەزانیی ئاڵۆز..

کەواتە مافی خۆی لە پێش چاوی ئەو ڕەوانبێژی‌یەی کە ناگونجێ ئینکاری بکرێت ئەوەیە بە نادیار و ڕەها باس بکرێت، تاکو زەینەکان نەشێوێن.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە هێما و ئاماژە بۆ "حەقیقەت" بکرێت و، دەرگاکان لە ڕووی هزر و بیرەکاندا بخرێنە سەرپشت و، خوڵکی چوونە ژوورەوە بکرێن، وەك ئەوەی کە شەریعەتی خاوێن و بێگەرد ئەنجامی داوە.

دەسا کاکە!

ئایا گومان بردنی ئەو شتەی کە ڕێنماییەکی بێگەرد و خودی ڕەوانبێژی و کاکڵەی هیدایەتە، بەوەی کە دژی ڕێنمایی بێت و، لێی جیا بێت و، ئەو شتەش کە کەماڵی ڕەوانبێژی‌یە، لە ئەندێشەتدا بە ناتەواوی ببینیت.. ئایا ئەمە کاری ویژدان و هەقویستی‌یە؟!

ئایا "ڕەوانبێژی" لە زەینی نەخۆشی تۆدا بەو جۆرەیە کە ئەرکێکی ئەوتۆ بخاتە ئەستۆی خەڵکی: زەینەکانیان بە هەڵەدا ببات و، بیرەکانیان بشێوێنێ بە جۆرێ کە بە ژیریی ئەوان هەرس نەکرێت، چونکە لەگەڵ ژینگە و ئامادەباشیی ڕۆژگاریاندا ناگونجێن؟!

نەخێر.. بەڵکو دەستووری: (كَلِّمِ الناسَ على قَدْرِ عقولِـــهم) واتە: (بە ئەندازەی تێگەیشتنی ژیریی خەڵك لە گەڵیان بدوێ)[1] دەستوورێکی دانایانەیە. ئەگەر دەتەوێت لەمە تێبگەیت، ئەوا سەر لە پێشەکی‌یەکان بدە، بە تایبەت "پێشەکیی یەکەم" و، بە باشی لێی ڕامێنە.

وەڵامی گومانی سێ‌هەمیش:

کە لارکردنەوەی هەندێ ڕواڵەتی ئایەتەکانە بۆ ئەو شتانەی کە پێچەوانەی بەڵگەی عەقڵین، ئەوا:

سەرنج لە "پێشەکیی یەکەم" بدە و، ئنجا گوێ بگرە بۆ ئەوەی کە:

ئامانجی بنەڕەتیی خاوەن شەرعی دانا لە ڕێنمایی جەماوەردا، تایبەتە بە "چەسپاندنی بەدیهێنەری تاك و تەنیا و، پێغەمبەرێتی و، حەشر و، دادگەری"..

---

(١) (كلم الناس على قدر عقولهم) دەستوورێکە لە "حیکمەتی بانگەواز"دا، زانایان لە چەند ڕیوایەتێك وەریان گرتووە کە لە نێوان "مەوقوف"ی صەحیح و "مەرفووع"ی زەعیفدان، وەك:

روى البخاري عن علي موقوفاً: "حَدِّثُوا الناسَ بما يعرفون، أتحبون أنْ يُكذَّبَ اللهُ ورســـولُه"؟ البخـــاري: ٥٨/١ رقم ١٢٧.

روى مسلم عن ابن مسعود موقوفاً: "ما أنت بمُحَدِّثٍ قوماً حديثاً لا تبلُغه عقولُهم إلا كان لبعضِهم فتنـــة". مسلم: ١١/١ رقم ٥.

روى الديلمي عن ابن عباس مرفوعاً: "أمرتُ أن نكلِّمَ الناسَ على قَدْرِ عقولِهم". الفردوس بمأثور الخطـــاب: ٣٩٨/١ رقم ١٦١١.

ئەمانە و چەندین ڕیوایەتی تریش. (وەرگێڕ)

لەبەر ئـەوە، باسـی بوونـەوەران لـە قورئـاندا باسێکی لاوەکـی و شـوێنکەوتەی باسـە سەرەکی‌یەکانە، بە نیازی ئەوەی بکرێن بە بەڵگە. واتە بەڵگەهێنانەوە بە ڕێسای ناوازەی بەدیـهاتووان، کـە لـە پێـش چـاوی تێگەیشـتنی جەماوەردایـە، لەسـەر ڕێسـاداهێنەری ڕاستەقینە، کە خوای گەورەیە. خۆ ئاسەواری سنعەتی خوا و ڕێکوپێکیی ڕێسـاکەی لـە هەموو شتێکدا دەبینرێ، ئیتر پێکهاتنەکەی هەرچۆن بووبێت، ئێمـە کارمـان بەسـەریەوە نی‌یە، چونکە پەیوەندیی بە ئامانجی سەرەکی‌یەوە نی‌یە.

**بێدارکردنەوەیەك:**

یـەکێك لـە سـەلماوەکان ئەوەیـە کـە: پێـش ئـەوەی "داوا"(دەعـوا)ی هـەر کێشـەیەك بزانرێت چی‌یە، دەبێ بەڵگەکەی زانراو بێـت. دەبینی لەبەر ڕوونیی بەڵگە و ڕاهـاتنی بیرەکان لەگەڵ باوەڕی جەماوەر بەو شتانەی کە هەستی پێدەکەن، ڕواڵەتی هەندێ دەق بۆلای ئەو بیروباوەڕانە خوار کراوەتەوە، نەك بـۆ ئـەوەی بەڵگـە بێـت لەسـەریان. بـەڵکو قورئانی پیرۆز لە پێچاوپێچی ئایەتەکانیدا چـەندین نیشـانەی دانـاوە کـە لای لێکۆڵـەران ئاماژە بۆ گەوهەرەکانی ناو ئەو سەدەفانە و ڕاستی‌یەکانی ناو ئەو ڕواڵەتانە بکەن.

بەڵێ، ئەو کتێبە ڕوونەی کە گوفتاری خوای گەورەیە، هەندێکی تەفسیری هەندێکی تری دەکات، واتە هـەندێ لـە ئایەتـەکانی ئـەو شـتانە دەردەخـەن کـە لـە نـاو دڵـی دەستە خوشـکەکانیدایە. لەبـەر ئـەوە، ڕێ دەکـەوێت هـەندێ ئایـەت نیشـانە بـن لەسـەر چـەند ئایەتێکی تر. کەواتە مەبەست تیایاندا واتای ڕواڵەتی نی‌یە.

بۆ نموونە، ئەگەر لە بواری بەڵگەهێنانەوەدا بوترایە:

بیر لە وەستانی خۆر بکەنـەوە، هـاودەم لەگـەڵ جووڵـە ڕواڵەتی‌یەکـەیدا و.. سـەیری جووڵـەی ڕۆژانـە و ساڵانەی زەوی بکـەن، هـاودەم لەگـەڵ وەسـتانی ڕواڵـەتییدا و.. سەرنج لە کارە ناوازەکانی کێشـی گشـتیی نێـوان ئەستێرەکان بـدەن و.. بڕواننە کـارە سەرسووڕهێنەرەکانی کارەبا و.. کارە نامۆکانی ئاوێتە کیمیاییەکانی نێـوان توخمـەکان کە لە حەفتا توخم زیاترن.. تاکو بەدیهێنەری شکۆمەند بناسن!!

ئەگەر ئاوا بوترایە، ئایا بەڵگەکـە - کـە سنعەتی بەدیهاتووانـە - پەنـهانتر نـەدەبوو لـە ئەنجامەکەی، کە ناسینی کردگارە؟!

خۆ دیارە ئەمەش پێچەوانەی دەستووری بەڵگەهێنانەوەیە.

لەبەر ئەوە، هەندێ لە واتا ڕواڵەتی‌یەکان بەپێی بیر و هزرەکان خوار کراونەتەوە، چونکە ئەم کارە لە جۆری "پاشکۆی داڕشتنەکان"ە و، جۆرێکە لە "کینایە". واتە ڕاستی و درۆ ڕوو ناکاتە واتاکانیان. نابینی ئەلفی "قال" ئەسڵەکەی چ "واو" یان "قاف" بێت کار لە هیچ شتێك ناکات!

برام! بە ویژدان بە! ئایا ئەم سێ خاڵە نابنە چەند بەڵگەیەکی ڕوون لەسەر ئیعجازی ئەو قورئانەی کە بۆ سەرجەم خەڵکانی هەموو چەرخەکان نازڵ بووە؟

بەڵێ، (والذي علَّمَ القرآنَ المُعجزَ إنَّ نظرَ البشيرِ النَّذير وبصيرَتَهُ النَّفّاذةَ أدقُّ وأجلُّ وأجلى مِن أنْ يلتَبِسَ أو يشتَبِهَ عليه الحقيقةُ بالخيال، وإنَّ مسلَكَهُ الحقُّ أغنى وأعلى وأنزَهُ وأرفَعُ مِنْ أنْ يُدلِسَ أو يُغالِطَ على الناس)!

واتە (سوێند بەو کەسەی کە قورئانی خاوەن "ئیعجازی ڕەوان"ی فێری مرۆڤ کردووە، ڕوانینی ئەو خۆشەویستە مژدەدەر و ترسێنەرە و، بینایيە تیژەکەی، لەوە وردتر و گەورەتر و ئاشکراترە کە حەقیقەت و ئەندێشەی لێ بشێوێ و، ڕێبازە ڕەواکەشی لەوە بێ نیازتر و بڵندتر و خاوێنتر و بەرزترە کە فێڵ لە خەڵکی بکات و بەهەڵەیاندا ببات)!

بەڵێ، "ئەندێشە" لە کوێ دەتوانێ خۆی بە "حەقیقەت" پیشان بدات لە ئاستی ئەم قورئانەدا کە نووری لێ هەڵدەقوڵێت؟!

بەڵێ، ڕێبازی قورئان خودی حەقە و، ڕێڕەوەکەشی خودی ڕاستی‌یە. خۆ "حەق"یش لەوە بێ نیازترە کە فێڵ بکات، یان خەڵکی بە هەڵەدا ببات.

## ڕێبازی پێنجەم

ئەم ڕێبازە تایبەتە بە کارە دەراسا بەناوبانگەکان و، موعجیزە ئاشکراکان، کە کتێبەکانی سیرەت و مێژوو پڕن لەو باسانە و، زانایانی بەڕێزیش - خوا پاداشتی خێریان بداتەوە - مافی تەواوی تۆمارکردن و لێکدانەوەیان داوەتێ. بۆیە درێژەی ئەم باسەمان بە کتێبەکانی ئەوان سپارد، چونکە فێرکردنی شتی زانراو کارێکی بێهوودەیە.

هەرچەند هەموو یەکێکی کارە دەراسا ئاشکراکان لە خۆیدا "موتەواتیر" نەبێت، بەڵام ڕەگەزەکەی و زۆر لە جۆرەکانی "موتەواتیری مەعنەوی"ن.

پاشان ئەم كارە نائاساييانە چەند جۆرێكن:

هەندێكيان:

ئيرهاصە جۆراو جۆرەكانە[1]. وەك بڵێى ئەو چەرخەى كە پێغەمبەرى خۆشەويستى ﷺ تێدا لەدايك بووە، بەهرەمەندى ڕێژنەى پيت و بەرەكەتى ئەو بووە و، ئەستێرەيەكى خاوەن كەرامەتى وەهاى بەدەست هێناوە و، لە ڕێى ئيرهاصەكانەوە و بە هەستى پێش ڕوودان مژدەى هاتنى فەخرى عالەمى - دروودى لەسەر بێت - ڕاگەياندووە.

هەندێكى تريان:

هەواڵدانە غەيبىيە زۆرەكانە. بە ڕادەيەك كە دەڵێى "گيان"ى پەتى و باڵندەى ئەو، بەربەستەكانى كات و شوێنى دياريكراوى بڕيوە و، بەناو لايەنەكانى "ڕابوردوو" و "داهاتوو"دا گەڕاوە و، باسى ئەو شتانەى بۆ گێڕاوينەتەوە و ڕوونى كردوونەتەوە كە لە هەموو ئەو شوێنانەدا بينيونى.

هەندێكى تريان:

ئەو كارە نائاساييە هەست پێ كراوانەيە كە لە دەمى تەحەددى و ڕاگەياندنى داواكەيدا پێش چاوى خستوون. ئەم جۆرەيان دەگاتە نزيكى هەزار دانە. بەو واتايەى كە كۆى ئەم جۆرە "موتەواتيرى مەعنەوى"يە، هەرچەندەش دانە دانەيان "ئاحاد" بن.

هەندێكى تريان:

بريتىيە لە هەڵقوڵانى ئاو لە نێوان پەنجە پيرۆزەكانيەوە. وەك بڵێى بە هەڵقوڵانى ئاوى ژيانبەخش لە دەستى پيرۆزى، كە كانگاى سەخاوەتە، شێوەيەكى هەست پێ كراو بكێشێت بۆ هەڵقوڵانى ئاوى زوڵاڵى هيدايەت كە گيانەكان دەبووژێنێتەوە، لە زمانى پيرۆزيەوە كە سەرچاوەى هيدايەتە.

هەندێكى تريان:

بريتىيە لە قسەكردنى درەخت و بەرد و ئاژەڵ لە خزمەتيدا. وەك بڵێى ئەو ژيانە مەعنەوىيەى كە لە ڕێنماييەكانى ئەو پێغەمبەرەدايە ﷺ تەنانەت بێ گيان و ئاژەڵەكانيشى گرتووەتەوە و خستوونيەتە گۆ!

---

(١) "ئيرهاص" بەو ڕووداوە لەعادەت بەدەرانەى ژيانى پێغەمبەر ﷺ دەوترێ كە لە پێش پێغەمبەرێتيدا ڕوويان داوە، بەڵام "موعجيزە" هى كاتى پێغەمبەرێتىيە. (وەرگێڕ)

یەکێکی تر:

بریتی‌یە لە دوولەت بوونی مانگ. وەك بڵێی ئەو مانگەی کە دڵـی ئاسمـان دەنوێنێـت، لە شەوق و تاسەی ئـەودا و بـە ئاماژەیـەکی پەنجـەی پـیرۆزی ئـەو، دوولـەت بـووە، تـاکو پەیوەندی‌یەك لەگەڵ دڵی پیرۆزی ئەودا ببەستێت!

"لەتبوونی مانگ" بە دەقی ئایەتی پیرۆز چەسپاوە و، موتەواتیری مەعنەوی‌یە. تەنانەت ئەو کەسەش کە سەرسەختیی لـە ڕووی قورئـاندا نوانـدووە، دەستکاریی واتـای ئایـەتی پیرۆزی ﴿وانشقّ القمر﴾ی نەکردووە و، مەگـەر بـۆ گریمـانێکی لاواز دەنـا لێکدانـەوەی تری لەسەر ئەم ئایەتە نەبووە و لە واتا ڕواڵەتی‌یەکەی خۆی نەیگۆڕیوە.

لەبەر جیاوازیی هەڵاتگەکان و، بوونی هەور و، سەیرنەکردنی ئاسمان وەك ئەوەی کە لەم ڕۆژگارەدا سەیر دەکرێت و، ڕوودانی لەتبوونی لە دەمی بـێ ئاگـایی خـەڵکی و، لـە شەودا و، کەمیی ماوەکەی.. لەبەر هەموو ئەمانە، پێویست ناکـات کـە هـەموو خـەڵکی یاخود زۆرینەیان "لەتبوونی مانگ" ببینن.

ئنجا لە ڕیوایەتەکاندا سەلماوە کە زۆر لەو کاروانانـەی هەڵاتگـەیان هـەمان هەڵاتگـە بووە، بینیویانە.

پاشـان گـەورەترین و یەکـەمینی ئـەم موعجیزانـە بریتی‌یـە لـە قورئـانی پـیرۆز، کـە لــە حەوت ڕووەوە بەڵگە لەسەر ئیعجازەکەی هێنراوەتەوە و، پێشتر ئاماژەی بۆ کراوە(١).

پاشماوەی موعجیزەکانی تر بە کتێبە باوەڕ پێ کراوەکان دەسپێرم(٢).

کۆتایی:

ئەی ئەو بەڕێزانەی کە قسەکانم دەخوێننەوە!

تکام وایە بە بیرێکی فراوان و، ڕوانینێکی تیژ و، بەسیرەتێکی هەڵسەنگێنەر سەرنج لە کۆی قسەکانم، واتە هەر پێنج ڕێبازەکە بدەن و، بیخەنە نێوان شـووورایەك کـە لـە خۆیـدا کۆیـان بکاتـەوە و، پێغەمبـەرێتیی حـەزرەتی محەمـەدیش ﷺ بخەنـە چـەق و نـاوەندی ئـەو بازنەیە و، ئنجا بـە وێنـەی سـەربازە جۆراوجۆرەکـانی ڕیزبەستووی دەوری پادشـا بـۆی

(١) پەیامی "موعجیزاتی قورئانی" – کە وتەی بیست و پێنجەمی کتێبی (وتەکان) ە – بـە باشـترین شێوە ئەو ڕووانەی ئیعجازی قورئانی پیرۆزی چەسپاندووە. (وەرگێڕ)

(٢) خوێنـەری بـەڕێز دەتوانێ لـە "پـەیامی موعجـیزاتی ئەحمـەدی"دا – کـە مـەکتووبی نۆزدەهـەمی کتێبـی (مەکتووبات)ە – درێژەی ئەو موعجیزانە و سەرچاوە باوەڕ پێکراوەکانیان ببینێت. (وەرگێڕ)

بڕوانن، تاکو سەرجەم لاکان بتوانن ئەو وەهم و گومانانە دوور بخەنەوە کە لە گۆشە و تەنیشتەکانەوە هێرش دەهێنن.

بەم جۆرە و، لە وەڵامی پرسیاری ژاپۆنییەکاندا کە وتیان:

[ما الدليلُ الواضحُ على وجودِ الإلهِ الذي تدعوننا إليه]؟

(بەڵگەی ڕوون لەسەر بوونی ئەو خوایە چییە کە ئێمەی بۆ لا بانگ دەکەن)..

دەڵێم:

ئەو بەڵگەیە محەممەدە ﷺ!

**ئاماژە و ڕێنمایی و ورياكردنەوەیەك:**

کاتێ ڕەگەزی مرۆڤ ڕووی لە داهاتوو کرد، هونەری حیکمەت، کە لەلایەن بوونەوەران و حکوومەتی بەدیهاتووانەوە ڕەوانە کراوە، هاتە گۆ و پرسیی:

ئەی ئادەمیزادەکان لە کوێوە هاتوون؟ بۆ کوێ دەڕۆن؟ چی دەکەن؟ کێ پادشاتانە؟ سەرەتای ئێوە لە کوێ و کۆتاییتان بەرەو کوێیە؟

لەو کاتەدا کە ئەم گفتوگۆیە لە ئارادا بوو، یەکسەر گەورەی ڕەگەزی مرۆڤ و، وتاربێژ و ڕابەریان، کە حەزرەتی محەممەدە ﷺ هەڵسا و، وەڵامی دایەوە و، وتی:

ئەی خاوەنی پرسیار!

ئێمەی بوونەوەران بە فەرمانی پادشای ئەزەلی هاتووین و.. لە ناوەندی بازنەی توانستی خوادا کارمان پێ سپێرراوە و.. خوای گەورەی "واجب الوجود" کە خاوەنی هەموو سیفەتێکی تەواوە و فەرمانڕەوای ئەزەلییە، ئەم پۆشاکی "بوون"ەی لەبەر کردووین و.. توانا و لێهاتنێکیشی پێ بەخشیوین کە سەرمایەی بەختەوەرییە و.. ئێمەی مرۆڤیش ئێستا سەرقاڵی ئامادەکردنی هۆکارەکانی ئەو بەختەوەرییە هەمیشەییەین و.. ئامادەی سەفەرین کە لە ڕێی حەشرەوە بەو بەختەوەرییە هەمیشەییە شاد ببین.

دەسا ئەی حیکمەت!

تۆ شایەت بە و، چی دەبینیت بەو جۆرە بدوێ و، لە ڕێی "سەفسەتە"وە شتەکان مەئاڵۆزێنە!

## مەبەستی سێهەم

## کە حەشری جیسمانی‌یە

بەڵێ.. بەدیهێنانی "بوونەوەران" بە بێ هاتنەدیی "حەشر" کارێکی بێهوودەیە. تەنانەت گەر "حەشر" نەبێت بوونەوەرانیش نەدەبوون.

کەواتە "حەشر" ڕاست و ڕەوایە و، ڕووناکترین بەڵگەکانیشی حەزرەتی محەممەدە ﷺ.

### پێشەکی

قورئانی پیرۆز هێندە بە ڕوونی و ئاشکرایی "حەشری جیسمانی"ی ڕوون کردووەتەوە کە بواری بۆ هاتنە ژوورەوەی هیچ گومانێك نەهێشتووەتەوە.

ئێمەش لێرەدا ئاماژە بۆ بەشێك لە ئامانج و هەڵوێستەکانی "قورئان" دەکەین و، بە لێکدانەوەیەکی جوزئی بۆ حەشری جیسمانی پشت بە بەڵگەکانی قورئانی پیرۆز دەبەستین.

## ئامانجی یەکەم

بوونەوەران ڕێسایەکی هەرە کامڵ و بەدیهاتووانیش حیکمەتێکی تابڵێی تەواویان تێدایە و..

بێهوودەیی لە جیهاندا نییە و..

ئیسراف و زیادەڕەویش لە فیترەتدا نەکراوە و..

لێکۆڵینەوەی تەواوەتی کە بە هەموو زانستەکان سەلماوە و..

قیامەتی نەوعی کە بە وێنەی ڕۆژ و ساڵ و لە زۆربەی جۆرەکاندا دووپات دەبنەوە و..

گەوهەری تواناکانی مرۆڤ و..

ناکۆتایی ئاواتەکانی و..

میهرەبانیی بەخشندەی میهرەبان و..

زمانی پێغەمبەری ڕاستگۆ و ئەمین ﷺ و..

ڕوونکردنەوەی قورئانی خاوەن ئیعجاز..

هەموو ئەمانە.. شایەتی ڕاست و، بەڵگەی حەق و ڕاستەقینەن لەسەر حەشری جیسمانی.

**هەڵوێست و ئاماژەیەك:**

١ - ئەگەر بوونەوەران بەرەو "بەختەوەریی هەمیشەیی" نەڕۆن، ئەوا ئەم یاسا و ڕێسایە دەبێتە وێنەیەکی ساختەی خەڵەتێنەری لاواز و، سەرجەم مەعنەوییات و پەیوەست و پەیوەندییەکانی ناو ئەم ڕێسایەش وەك تەپوتۆزی بابردوویان لێ دێت. واتە تەنها "بەختەوەریی هەمیشەیی"یە کە کردوویەتی بە یاسا و ڕێسا!

٢ - حیکمەتی خوای گەورە، کە نموونەی چاودێریی ئەزەلیی ئەوە، "بەختەوەریی هەمیشەیی" ڕادەگەیەنێت. چونکە بە چاودێریی بەرژەوەندی و دانستەکان لە

بوونەوەراندا پڕچەك کراوە. لەبەر ئەوەی گەر بەختەوەریی هەمیشەیی نەبێت، دەبێ ئینکاریی ئەم هەموو حیکمەت و سوودانە بکەین کە "بەڵگەنەویستی" ناچارمان دەکات دانیان پێدا بنێین.

٣ - نەبوونی بێهوودەیی و هەڕەمەکێتی، کە بە شایەتیی ژیری و حیکمەت و لێکۆڵینەوە سەلماوە، ئاماژە بۆ بەختەوەریی هەمیشەیی لە حەشری جیسمانیدا دەکات، بگرە بەڵگەیە لەسەری، چونکە "نەبوونی تەواوەتی" هەموو شتێك دەکات بە "بێهوودەیی".

٤ - نەبوونی ئیسراف لە فیترەت (واتە لە بەدیهێنانی شتان)دا کە بە شایەتیی زانستی سوودی ئەندامەکان، نەخوازەلا لە جیهانی هەرە بچووك (مرۆڤ)دا سەلماوە، بەڵگەیە لەسەر نەبوونی ئیسراف و زیادەڕەوی لە توانا و لێهاتنە مەعنەوی‌یەکانی مرۆڤ و، ئاواتەکانی و، بیرەکانی و، حەز و مەیلەکانیدا. ئەمەش ڕایدەگەیەنێت کە مرۆڤ بۆ بەختەوەریی هەمیشەیی پاڵێوراوە.

٥ - بەڵێ، گەر "بەختەوەریی هەمیشەیی" نەبوایە، سەرجەم لایەنە مەعنەوی‌یەکان دەهاتنەوە یەك و، دەپووکانەوە و، دەبوونە تەپوتۆزی بابردەڵە.

گەلێ سەیرە! ئەگەر بەرگی گەوهەری ڕۆح، کە "جەستە"یە، تا ئەم ڕادەیە بایەخی پێ بدرێت و چاودێری بکرێت، بەڕادەیەك کە دەپارێزرێ لەوەی تەپوتۆزی بۆ بڕوات، دەبێ چاودێری کردنی خودی گەوهەری "ڕۆح" چۆن بێت؟ ئیتر چۆن لەناو دەبرێت؟ نەخێر.. بایەخدان بە جەستە تەنها لەبەر ئەو گیانەیە!

٦ - ئەو ڕێسا ورد و ڕێکوپێکەی کە بەو لێکۆڵینەوە تەواوە سەلماوە کە - وەك زووتر باس کرا - هەموو زانستەکانی پێکهێناوە، بەڵگەیە لەسەر بەختەوەریی هەمیشەیی. چونکە هەر تەنها بەختەوەریی هەمیشەیی نێو حەشری جیسمانی‌یە کە ڕێکوپێکیی گەردوون لە تێکچوون دەپارێزێ و، ڕووی پێ دەکاتە خۆ کامڵ کردن و، تەمەنی هەمیشەیی.

٧ - هەروەك کاتژمێری ئاسایی چەند چەرخێکی جیا جیا و بزۆك و خولاوەی ئەوتۆی تێدایە کە میلی چرکە ژمێر و دەقیقە ژمێر و سەعات ژمێر و ڕۆژ ژمێرەکان

بزوێنن و، هەریەكەیان هەواڵی هاتنی ئەوەی دوای خۆی دەگەیەنێت، بە هەمان جۆر ڕۆژ و ساڵ و تەمەنی مرۆڤ و خولانەوەی دنیا وەك ئەو سەعاتە وان و، هەریەكەیان پێشەكیی ئەوی تریانە..

كەواتە دیاردەی هاتنی بەیانی لە دوای هەموو شەوێك و، هاتنی بەهار لە دوای هەموو زستانێك ئەوە ڕادەگەیەنن كە دوای مردنیش قیامەتێك هەیە.

بەڵێ، هەموو كەسێكی مرۆڤ وەكو "جۆر"ی غەیری مرۆڤ وایە. چونكە "ڕووناكیی بیر" فراوانی و كرانەوەیەكی ئەوتۆی بە ئاواتەكان و گیانی مرۆڤ بەخشیوە كە ئەگەر هەموو كاتەكان هەڵبلووشێت هێشتا تێر نابێت..

كەچی ماهییەتی دانە دانەی جۆرەكانی تر و، نرخ و بەهایان و، ڕوانین و، كەماڵ و، لەزەت و، ئازارەكانیان جوزئی و كەسی و سنووردار و كاتی و دیاری كراوە، بەڵام لە هەمان كاتدا ماهییەتی مرۆڤ بڵند و، گشتی و، هەمیشەییە. كەواتە قیامەتە نەوعییە دووپات بووەكانی ناو ڕۆژ و شەو هێما و ئاماژەن بۆ قیامەتی كەسیی مرۆڤایەتی، تەنانەت شایەتیشە لەسەری.

٨ - بیر و بۆچوونە ناكۆتاكانی مرۆڤ.. كە لە ئاواتە نەبڕاوەكانیەوە پەیدا بوون.. كە ئەویش دەرەنجامی حەز و مەیلە ڕێك نەخراوەكانیەتی.. كە ئەویش لە توانا بێ سنوورەكانیەوە پەیدا بووە.. كە ئەویش لە لێهاتنە كۆتا نەهاتووەكانیدا شارراوەتەوە.. كە ئەویش لە گەوهەری ئەو گیانەیدا چێنراوە كە خوای گەورە ڕێزی لێ ناوە..

هەموو ئەمانە.. بە پەنجەی شایەتی ئاماژە بۆ ئەو بەختەوەرییە هەمیشەییەی ئەو دیو حەشری جیسمانی دەكەن و بۆی دەڕوانن!

٩- بەڵێ، سۆز و میهرەبانیی بەخشندەی میهرەبان و كردگاری دانا، مژدەی هاتنی بەختەوەریی هەمیشەیی دەدەن. چونكە بەهۆی ئەو بەختەوەرییەوە میهرەبانی دەبێت بە "میهرەبانی" و نیعمەتیش بە "نیعمەت" و دەربازی دەكات لەوەی كە بەڵا و گرفت بێت و، بوونەوەرانیش لە گریانی جودایی ڕزگار دەكات. چونكە ئەگەر بەختیاریی هەمیشەیی- كە گیانی نیعمەتەكانە - نەیەتە كایەوە، ئەوا سەرجەمی نیعمەتەكان دەبنە گرفت و، ئەو كاتەش ئینكاریی ئەو میهرەبانییە دەبێتە شتێكی پێویست كە بە شایەتیی سەرجەمی بوونەوەران و بە پێویستی و بەڵگەنەویستی سەلماوە.

دەسا برام!

سەیری ناسکترینی ئاسەوارەکانی میهرەبانیی خوا، واتە: "خۆشەویستی و شەفەقەت و عیشق" بکە و، ئنجا بیر لە جودایی هەمیشەیی و لێکدابرانی هەتاهەتایی بکەرەوە و، بزانە کە چۆن ئەو خۆشەویستی‌یە دەبێت بە گرفتێکی یەکجار گەورە. واتە جودایی هەمیشەیی هاوتای خۆشەویستی نی‌یە و هاوسەنگی دەرناچێت. کەواتە "بەختەوەریی هەمیشەیی" زللەی خۆی لەو "جودابیە هەمیشەیی"یە دەسرەوێنێت و فڕێی دەداتە ناو نەبوون و نەمان!

١٠ - زمانی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ کە بە هەر پێنج ڕێبازەکەی پێشوو چەسپاوە و بەڵگەی لەسەرە، کلیلی ئەو بەختەوەری‌یە هەمیشەییەی ناو حەشری جیسمانی‌یە.

١١- بەڵێ، قورئانی پیرۆز کە بە حەوت ڕوو لە ماوەی سیازدە چەرخدا ئیعجازەکەی چەسپاوە، دەرخەر و کلیلی حەشری جیسمانی‌یە.

# ئامانجی دووهەم

لەمەولا دوو ئایەت تەفسیر دەکرێت کە "حەشر" ڕوون دەکەنەوە و ئامـاژەی بـۆ دەکەن:

"نەخو[1] : بسم الله الرحـــمن الرحیم".

* * *

**مامۆستای دانەر (بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی) لـــە سـەرەتای تیشکی نۆهەمی "سەرجەمی پەیامەکانی نـوور"دا، کـە دوای سـی سـاڵ دایناوە، دەڵێ:**

لە ڕاستیدا ئەوە چاودێری و ئاوڕ لێدانەوەیەکی نەخشین و جوانی پـەروەردگار بـوو کە "ســەعیدی کۆن" سـی سـاڵ پێش ئێسـتا لـە کۆتـایی ئـەو کتێبـەی کـە نـاوی: "موحاکـەمات"ە و پێشـەکیی تەفسـیری "ئاماژەکـانی ئیعجـاز"ە، ئەمـەی خـوارەوەی نووسی:

(ئامـانجی دووهــەم: لەمــەولا دوو ئایـەت تەفسـیر دەکـرێت کـە "حـەشـر" ڕوون دەکەنەوە و ئاماژەی بۆ دەکەن).

بـەڵام ئـەو باسـە نـاوبراوەی بـەوە دەسـت پـێ کـرد کـە نووسیی: "نـەخو: بســـم الله الرحـــمن الرحیم". ئیتر لـە نووسین ڕاوەستا و بۆی نەڕەخسا تەواوی بکات.

وا ئێسـتا هـەزار و یەك جـار و بە ئـەندازەی ژمـارەی بەڵگـە و نیشـانەکانی حـەشـر، سوپاس و پـێزانین بـۆ بەدیهێنـەری بەخشـندەم کـە دوای تێپـەڕبوونی مـاوەی "سـی" سـاڵ بەسەر ئەو نووسینەدا، یارمەتیی دام ئەو تەفسیرە ڕوون بکەمەوە.

---

(١) نەخو: وشەیەکە بە شێوە زاری کرمانجیی ژووروو، بـە واتـای: "کەواتـە" دێـت لـە شێوە زاری کرمـانجیی خواروودا. (وەرگێڕ)

بەرهەمی دووهەم:

# مونازەرات

ڕەچەتەی پزیشکی بۆ:

کیشوەرێکی فراوانی گرنگ.. بەڵام بێ شانس و..

دەوڵەتێکی بەناوبانگی خاوەن ڕابوردووی شکۆدار.. بەڵام بێ بەخت و..

نەتەوەیەکی خاوەن عیززەتی مەزن.. بەڵام بێ پێشەوا.

یاخود: مونازەراتی بەدیعوززەمان.

بەدیعوززەمان

## سەعیدی نووڕسی

دایناوە

## فارووق ڕەسووڵ یەحیا

کردوویە بە کوردی

بسم الله الرحمن الرحيم

تێبینی:

لە هەر شوێنێکی ئەم کتێبەدا وشەی (رجتة الأكراد) بەکارهات، مەبەست لەم پەیامی (مونازەرات)ەیە کە دانەر وەکو ڕەچەتەیەکی پزیشکی بۆ دەردە کۆمەڵایەتییەکانی گەلی کورد لە شێوەی گفتوگۆدا بە زمانی کوردی پێشکەشی کردوون. پاشان وەکو کتێب بە زمانی تورکی دایڕشتووەتەوە بە ناوی (مونازەرات). ئنجا هەر خۆی وەری گێڕاوە بۆ زمانی عەرەبی بە ناوی (رجتة العوام).

(وەرگێڕ)

# ڕوونکردنەوەیەك لەم وەرگێڕانە کوردییەی (مونازەرات)دا

خوێنەری ئازیز!

پێشەکییەکەی مامۆستا "ئیحسان قاسم صالحی" لەو شەش لاپەڕەیەدا کە دێت، زانیاریی پێویستی سەبارەت بە دۆخ و مێژووی دانانی پەیامی "مونازەرات" و، قۆناغەکانی پوختەکاریی دانەری بەڕێزی لەم بەرهەمەیدا، باس کردووە.

لەبەر ئەوە، بە پێویستمان نەزانی شتێکی تر - لەو بارەیەوە - بۆ ئەم وەرگێڕانە کوردییە بنووسین.

بەڵام ئەوەی کە لێرەدا بە پێویستی بزانین لێی بدوێین، ئەمانەی خوارەوەیە:

یەکەم: قسە زۆر کراوە و دەکرێت لەسەر ئەم بەرهەمەی مامۆستا نوورسی. بەڵام لە ڕووی "بابەتی" و "زانستی"یەوە تەنها ئاوڕ لەو قسانە دەدرێتەوە کە "بەڵگە" پشتیان بگرێت.

دووهەم: هیچ گومانێك لەوەدا نییە کە دانەر لە ساڵی (١٩١٣ز)دا ئەم بەرهەمەی خۆی بە هەردوو زمانی (تورکی و عەرەبی) بڵاو کردووەتەوە. نوسخەی چاپکراوی ئەو دەمە شایەتە لەسەری. بەڵام - تا ئێستا - نەسەلماوە کە وەك دەستنووس یان چاپ نوسخەی (کوردی)ی هەبێت.

سێهەم: گومان لەوەشدا نییە کە دانەر لە دوا ساڵەکانی تەمەنیدا پوختەکاریی لە بەرهەمە کۆنەکانیدا کردووە (کە یەکێکیان ئەم بەرهەمەیە). چونکە بە گۆڕین و، لێ زیادکردن و، لێ کەمکردنەوە و، نووسینی پەراوێزی نوێ، قەڵەمی تێ بردوون.

چوارەم: مرۆڤی بە ویژدان پێی ئەستەمە - بێ هیچ بەڵگەیەك - پەنجەی تاوانبارکردن ڕابکێشێت بۆ یەکەم دەستەی ئەو قوتابییانەی مامۆستا نوورسی کە هەرچەندەش

زۆربەيان بە رەگەز لە نەتەوەی دانەر نەبوون، بەڵام نموونەی راستی و دڵسۆزی و خۆبەختكاری بوون. چونكە تەمەنی گرنگی خۆيان لە بەندیخانە و دادگا و كوێرەوەریدا بردەسەر لە پێناوی بەرگری كردن لە "پەيامەكانی نوور" و بڵاوكرنەوەيان و، لە خزمەتی مامۆستاكەياندا.

پێنجەم: تەنها رێگای زانستی و باوەڕ پێ كراو بۆ سەلماندنی ئەوەی كە ئەم دەستكارييانە بە قەڵەمی مامۆستا نوورسی خۆی كراون، نەك كەسی تر، سەردانەوەيە لەو نوسخانەی كە بە خەتی خۆی ئەو پوختەكارييانەی تێدا ئەنجام داون و، لە لای قوتابييە دێرينەكانی پارێزراون. خۆ دوای ئەوەی كە لەم رێگايەوە سەلما دانەر بۆ خۆی قەڵەمی بردووەتە بەرهەمەكانی و پاكژكاريی تێدا كردوون، كە هەر تەنها خۆيشی خاوەن مافە لەوەدا، ئيتر كەسانی تری بێ ماف و بێ بەڵگەی مەنتيقی چ كارەن؟

شەشەم: سەبارەت بە خۆم و بۆ دڵنيابوونم لەو دەرەنجامەی كە لەو رێگايەوە بە دەستم هێنابێت، چەندين پاكژكاريی خودی دانەرم بە خەتی خۆی بينی كە لە چەند نووسينێكی بەرهەمەكانی پێشوويدا ئەنجامی داون، تەنانەت فۆتۆكۆپيی هەندێك لەوانەشم لای خۆم هەڵگرت.

من لە لايەنی خۆمەوە ئەم مشتە دڵنيابوونەم دەكەمە نموونە بۆ خەرمانی پاكژكارييەكانی تر، بە تايبەت كە ويژدانم رێم پێ نادات بێ هيچ بەڵگەيەك ئەو كەسانە تاوانبار بكەم كە جێی متمانەی دانەر بوون. خۆ ئەگەر كەسێك بە "بەڵگە" پێچەوانەی ئەمەی بۆ سەلماندم، بە چاوان قبووڵی دەكەم.

حەوتەم: لە وەڵامی ئەو پرسيارەشدا كە ئايا لێكدانەوەت بۆ ئەو دەستكارييانەی دانەر چیيە؟ دەڵێم:

هۆكاری هەندێك لەو دەستكارييانە خودی دانەر لە دوو نامەيدا باسی كردوون كە لە شاری "قەستەمۆنی" و "ئەميرداغ"ەوە ناردوونی بۆ قوتابييانی[1]. ئەم بەشەيان پێويستی بە لێكدانەوەی كەسی تر نیيە.

هۆكاری هەندێكی تريان بواری لێكدانەوە و ئيجتيهادی تێدايە..

(١) لە دوای ئەم پێشەكیيانە و لە پێش دەقی كتێبەكە، ئەو دوو نامەيەی دانەرمان هێناوە. تاكو خوێنەری بەرێز بە ئاسانی سەردانيان بكات. (وەرگێر)

مەبەستم ئـەو چەشـنە دەسـتکارییانەیە کـە دانـەر بـە خـەتی خـۆی وشـەکانی "کوردستان"ی لـەو بەرهەمانـەدا گۆڕیـوە بـە "ویلایەتـەکانی خۆرهـەڵات". هـەروەها ئیمزای "سەعیدی کوردی"ی کردووە بە "سەعیدی نوورسی". هـەروەك هەندێ باسی لابردووە کە پەیوەندیی تایبەتی و ڕاستەوخۆیان بە کورد و کوردستانەوە بوویێت..

ئەمەش لە کاتێکدایە کە دەزانین مامۆستا نوورسـی هـەتا دواسـاتەکانی تەمـەنی بـیری لای خاك و خەڵکی وڵاتەکەی خۆی بووە.

تەنانەت هەوڵی داوە کاربەدەستان بخافڵێنێ و لـە چاودێرییـان هـەڵبێت و، بگەڕێتـەوە لـە وێسـتگەی کوردستانەوە دواهـەمین کۆچی بـەرەو بارەگـای پـەروەردگاری بـەرێ بکات و، لەناو خـاکی خۆی و باپیرانیدا ئەسپەردە بکرێـت. خـوا کـردی بـەو ئاواتـەی گەیشت و لە شاری "ئورفە"ی کوردستان کۆچی دوایی کرد.

جا ئەو کەسانەی شارەزای بارودۆخی تورکیان لەو ساڵانەدا کە مامۆستا نوورسیی تێدا ژیاوە، دەزانن کە:

هەتا دەوڵـەتی عوسمـانی مـابوو، بـەکارهێنانی هیـچ کـام لـە وشـەکانی وەك: کـورد و کوردسـتان لــە ڕووی یاســاوە قەدەغــە نــەبوو، تەنانــەت نــاوی ئاشــکرای ناوچــە کوردنشینەکانی دەوڵەت و خەڵکەکەی بوون.

بەڵام بە هاتنی کەمال و کەمالیستەکان بۆ سـەر کورسیی دەسـەڵات، ئەو وشـانە و وشەکانی تری هاوچەشنیان بە تەواوی قەدەغە کران. بـە ڕادەیـەکی وا کـە نـەوەی نوێـی تورك - بە ئێستاشەوە - لەسەر نەفرین کردن لەو وشانە گۆش کراون!

هـەر لەبـەر ئـەوەبوو کـە مامۆسـتا نوورسـی لـە قۆنـاغی دەسـتەڵاتی نوێـدا هـەتا بەرهەمـەکانی بـە دەستنووس بڵاودەبوونـەوە، دەسـتکاریی ئەو وشـانەی نـەکردووە لـە بەرهەمـەکانیدا، چونکـە لـەناو خـەڵکانێکدا بـڵاو دەبوونـەوە کـە دۆسـتی بـوون و کاردانەوەی نادروستیان بەرامبەر وشەکانی نەبوو.

بەڵام کە لە ساڵەکانی پەنجای سەدەی ڕابوردوو بە ڕەسمی ڕێ بە چاپکردنیان درا و، مامۆستا نوورسـی زانیی ئـەمجارەیان نووسینەکانی دەگەنـە هـەموو دەسـتێك و هـەموو شوێنێك، تەنانەت دەستی ئەوانەش کە لەسەر ئەو پـەروەردە چەوتـە گۆش کـراون، ئـەوا تەنها دوو ڕێی لە بەردەمدا بوو:

یان هەر چاپیان نەکاتەوە.. یاخود چاپیان بکاتەوە، بەڵام ئەو وشانەی کە دژە هەستێك بەرامبەر بە نووسینەکانی لای زۆرێك لەو خەڵکە دەوروژێنن، بگۆڕێت بە چەند وشەیەکی تر کە بۆ مرۆڤی بە سەلیقە هەمان واتا بگەیەنن، بێ ئەوەی دەماری کەسێکی پێ گرژ ببێت، یان هەبوونی ئەو وشانە بکاتە بیانوو بۆ ڕەتکرنەوەی سەرجەمی بەرهەمەکانی!

ئەوەبوو ڕێی دووهەمیانی هەڵبژاردا!

لەبەر ئەم خوێندنەوە و تێگەیشتنەمان بۆ نیازی مامۆستا نوورسی، هاتین لەم وەرگێڕانە کوردی‌یەدا، سەبارەت بەم بەشەی پوختەکاری‌یەکانی دانەر، وشەکانی یەکەم جارمان دانایەوە، چونکە لەم بەشە ئازادەی کوردستاندا هیچ بەهانەیەك نی‌یە بۆ نەگێڕانەوەی ئەو وشانە.

ئەو بڕگانەش کە دانەر لە دوا چاپەکانی ئەم بەرهەمەیدا لایبردوون، لەبەر ئەو هۆیەی کە لە دوو نامەکەیدا بۆ قوتابیانی باسی کردووە و، لەبەر هەمان هۆ لە چاپە عەرەبی‌یەکەشدا نی‌یە، ئێمە ئەوانەشمان لە جێی خۆیاندا دانایەوە و شوێنەکانیمان بۆ خوێنەر دەستنیشان کرد. ئەمەش نەك لەبەر ڕەفتارکردن بە پێچەوانەی ویستی دانەر، نەخێر. تەنها لەبەر ئەوەی کە لای توێژەران بایەخێکی مێژوویان هەیە سەبارەت بە خودی نوورسی و گەلەکەی و نیشتمانەکەی. خۆ ئەم کارەی ئێمەش وەرگێڕانی ئەو بەرهەمەیەتی بۆ زمانی نەتەوەکەی خۆی و، لە بەشێکی نیشتمانەکەیدا بڵاو دەبێتەوە.

ئنجا دوای تەواوبوونی کاری وەرگێڕانی ئەم پەیامە، برای دڵسۆزم (مامۆستا حسەین حەسەن کەریم) لە زانکۆی سلێمانی بە داڕشتنی ئەم کوردی‌یەدا ڕۆشتەوە و لەگەڵ دەقە عەرەبی‌یەکەدا بەرامبەری کرد و، کۆڵێ تێبینیی گرنگی خستە ڕوو کە سوودی زۆرمان لێ وەرگرت.

دوای ئەو، هاوڕێی لاوم (دکتۆر دیدار کامەران) لەگەڵ دەقی تورکیی کۆن و نوێدا بەرامبەری کرد و، گەلێ ڕێنمایی بەنرخی پێشکەش کردین و، چەند بڕگەیەکیشی ڕاستەوخۆ لە تورکی‌یەکەوە کرد بە کوردی.

خوای گەورە پاداشتی چاکەی هەردووکیان بداتەوە.

*فارووق ڕەسووڵ یەحیا*

## پێشەکیی وەرگێڕی چاپە عەرەبییەکە

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله والصلاة والسلام على رسول الله ومن والاه، وبعد:

لە بەرواری (١٩٠٨/٧/٢٣ز)دا سوڵتان عەبدولحەمیدی دووهەم "مەشرووتیەت"ی ڕاگەیاند[١]، کە دامەزراندنی سیستەمی پەرلەمانی دەگەیەنێت لە دەوڵەتی عوسمانیدا. بەو پێیە وەزارەت لە بریی ئەوەی لە بەردەم سوڵتاندا بەرپرس بێت، لە بەردەم پەرلەماندا بەرپرس کرا و، دەستەڵاتی یاسادانانیش بوو بە ئەرکی پەرلەمان. دوای ئەوەش، ئازادیی ڕامیاری و ئازادیی ڕۆژنامەگەری و ئازادییەکانی تر ڕاگەیەنران.

تێڕوانین و بۆچوونەکانی خەڵکی ئەو ڕۆژگارە بە گشتی و ڕای ڕۆشنبیران بە تایبەتی سەبارەت بە "مەشرووتیەت" زۆر جۆراوجۆر بوو، چونکە دەستە و کۆمەڵە جیاجیاکان هەریەکەیان بەو شێوەیەی پێی خۆش بوو "سەربەستی"ی لێك دەدایەوە..

ئەوەبوو لە لایەکەوە دەستەیەك زۆر بە توندی پشتی سەربەستییان دەگرت و، دەیان ویست بەرەو چەند ئامانجێکی ڕامیاری و کۆمەڵایەتی کێشی بکەن، تاکو بگەن بە ئامانجیان لە ڕووخاندنی دەوڵەتی عوسمانیدا..

---

(١) مەبەست لە "مەشرووتیەت" ڕاگەیاندنی سیستەمی پەرلەمانییە لە دەوڵەتی عوسمانیدا. سوڵتان عەبدولحەمید دوو جار "مەشرووتیەت"ی ڕاگەیاندووە. یەکەم جار لە سەرەتای هاتنە سەر حوکمی، کە پێی دەوترێ "مەشرووتیەتی یەکەم" و لە بەرواری ١٨٧٧/٣/١٩زدا بووە. بەڵام دواتر لەبەر چەند هۆکارێکی ناوخۆ و بەهۆی ڕوودانی جەنگی (دەوڵەتی عوسمانیلەگەڵ ڕووسیا)دا، ئەو ئەنجومەنەی هەڵوەشاندەوە بێ ئەوەی خودی "مەشرووتیەت" هەڵبووەشێنێتەوە. پاشان لە ١٩٠٨/٧/٢٣زدا جارێکی تر مەشرووتیەتی هێنایەوە گۆڕێ کە پێی دەوترێت "مەشرووتیەتی دووهەم". ئەمەش درێژەی کێشا هەتا پەیمانی مۆندرۆس لە ١٩١٨/١٠/٣٠ز.

کەچی لە لایەکی ترەوە کەسانێکی تر هەبوون مەترسی‌یان لێ نیشت لەم ئالوگۆڕەی کە لە سیستەمی دەولەتدا هاتە کایەوە..

هەر لەو کاتەدا خەلکانێکی تر سەرسام مان، بێ ئەوەی هەنگاوێك بەرەو پێش یان بەرەو دواوە بنێن و ڕایەکیان هەبێت..

شەیدایانی ئەورووپا و ئەوانەش بریقەی شارستانێتی‌یەکەی بە شەوارەی خستبوون کەوتنە چەپلە لێدان..

بەم جۆرە، ڕای جۆراوجۆر دروست بوو.

بەلام "بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی" میانەڕەویی هەلبژارد و، ڕێنمایی لە ڕێبازی خاوێنی ئیسلام وەرگرت، کە دوورە لەو "دەمارگیری"یە بەدەی کۆسپی سەر ڕێی هەموو تازەگەری‌یەکە و، لەوەش بەرزترە کە بە دوای خۆرئاوادا هەناسەبڕکێی بێت و بێ هەلوێستانە چاوی لێ بکات..

بەو بێ‌یە پشتی چەمکی "سەربەستی" و "شوورا"ی گرت، بەو شێوەیەی کە لە ئیسلامدا ڕوون کراونەتەوە و، داکۆکیی لەو "مەشرووتیەت"ە کرد کە لە سنووری شەرعدا بێت.

ئەوەبوو لەو دەمەدا چەندین وتاری زۆری لە ڕۆژنامە ناوخۆییەکاندا نووسی و، گەلێ گوتاریشی لەو کۆبوونەوانەدا ئاراستەی جەماوەر کرد کە لە گۆڕەپانە گشتی و مزگەوتە گەورەکاندا دەگیران. لە هەمووشیاندا چەمکی ئازادی و شوورای لە ڕووناکیی ئایینی ئیسلامدا ڕوون دەکردەوە و، ئاکامە ترسناکەکانی هەریەك لە "دەمارگیری"ی بێزلێکراو هەروەها "چاولێکەری"ی ئابڕووبەری پێش چاو دەخستن. چونکە هەستی کرد کە بە نهێنی و لە پشتی پەردەوە چەند هەول و تەقالایەك خراونەتە کار بۆ قۆزتنەوەی "مەشرووتیەت" و ئاراستە کردنی لە بەرژەوەندیی خەلکانێکی ڕق لە دل و نەیاری ئیسلام.

هەر لەو کاتەدا کە هەولەکانی خۆی لەم بوارەدا خستبووە گەڕ، کەسانی سیاسەتمەدار و بیریار و ڕۆژنامەنووسانیشی پشتگوێ نەخست، بەلکو لە چەندین چاوپێکەوتن و دیداردا ئامۆژگاری و ڕێنمایی پێشکەش دەکردن و، ئەو ڕێبازە ساغ و ڕاستەی ئایینی ئیسلامی بۆ ڕوون دەکردنەوە کە خێری بۆ ولات و هاوولاتیان تێدایە.

دوای ئەوەی کە هەستی کرد هەرچی لە توانایدا بووە لە مەڵبەندی خەلافەتدا خستوویەتیەکار، لە ساڵی (١٩١٠ز)دا ڕووی کردەوە خۆرهەڵاتی وڵات و، گەشتێکی فراوانی بەناو هۆزە کورد و تورکەکاندا کرد و، چەندین کۆڕ و کۆبوونەوەی لەگەڵ بەستن کە گەلێ باس و گفتوگۆی جۆراوجۆری کۆمەڵایەتی و ڕامیاری لە نێوانیاندا ڕووی دا و، لایەنە باشەکانی "مەشرووتیەت"ی لە ڕوانگەی ئیسلامەوە بۆ ڕوون کردنەوە..

شێوازی پرسیار و وەڵامی بۆ ئەو گفتوگۆیانە هەڵبژارد، کە تێگەیشتنی بۆ ئەوان ئاسانە و لە زەینیانەوە نزیکە. هەرچەندەش چەند ڕستەیەکی ئەوتۆی بەکارهێناوە کە هێندە چڕوپڕن وەکو پەرلە(شفرە) وان و، هەندێکی تری لە شێوەی مەجاز و تەشبیهدا هێناوە و، هەندێ جاریش گوفتاری ئاراستەی نەوەکانی داهاتوو کردووە.

مامۆستا نوورسی هەموو هەوڵ و بایەخدانێکی بە چڕی ئاراستەی تێکشکاندنی کۆت و زنجیرەکانی ئەو نائومێدییە کردبوو کە لەو ڕۆژگارەدا خەڵکی پێوەی گیرۆدە بوون. لەبەر ئەوە بە هەموو توانای خۆی تێدەکۆشا تروسکایی ئومێد لە دڵ و دەروونیاندا هەڵبگیرسێنێت..

هەروەك چەندین پێوەر و تەرازووی شەرعی و مەنتیقیی بۆ دادەنان، تاکو بە عەقڵێکی هێمنانە و هاوسەنگ و ئیماندار ئەو ڕووداوانەی پێ هەڵبسەنگێنن کە هاتبوونە پێش، دوور لە هەموو جۆرە هەڵچوون و کاردانەوەیەك.

دوای گەشتەکەی، هەموو ئەو گفتوگۆیانەی بە زمانی تورکی لە نامیلکەیەکدا نووسی و، ساڵی ١٩١٣ز لە چاپخانەی "أبو الضیاء" لە ئەستەمبووڵ چاپی کرد و، بە ناوی (بدیع الزمانك مناظراتی) واتە "مونازەرات(گفتوگۆکان)ی بەدیعوززەمان" بڵاوبووەوە.

پاشان هەر خۆی وەری گێڕا بۆ زمانی عەرەبی و، بە ناوی (رجتة العوام) بڵاوی کردەوە. دەستەواژەکانی ئەم وەرگێڕانە عەرەبی‌یە تەماوی و داخراو بوون، ئەمەش مامۆستای ناچار کرد (پۆزشێکی درێژ داوێن) لە پێشەکی‌یەکەیدا بنووسێت، کە تیایدا دەڵێت:

(ئەم نامیلکە عەرەبی‌یەم لە تورکی‌یەوە وەرگێڕاوە، کە ئەویشم لە کوردی‌یەوە وەرگێڕاوە، کە ئەویش وەڵامی زارەکی و سەرپێیم بوو بۆ پرسیاری کوردە دەشتەکی‌یەکان. کەواتە وەرگێڕراو، لە وەرگێڕراو، لە گوتارێکی زارەکی و سەرپێیی نەخوێندەوارێك (مەبەستی خۆیەتی) کە ئاراستەی خەڵکانێکی گوندنشین کرابێت، هەرگیز لە زبریی واتا و وشە ڕزگاری نابێت).

دوای چل و پێنج ساڵ لە دانانی ئەم کتێبە ئنجا مامۆستا نوورسی بۆی ڕەخسا چاوی پێدا بخشێنێتەوە. چونکە لەو ماوەیەدا چەند گەردەلوولێکی وێرانکار بەسەر نەتەوەی ئیسلامدا بە گشتی و وڵاتی تورکیادا بە تایبەتی هەڵی کرد..

ئەوەبوو دوای بەشداریی دەوڵەتی عوسمانی لە جەنگی یەکەمی جیهانیدا و، شکستی لەو جەنگەدا، بیانی‌یەکان ڕۆشتنە ناو وڵاتەوە، ئنجا زنجیرە جەنگێکی خوێناوی لە دژیان بەرپا بوو تا لە ئەنجامدا وەدەرنران و، ڕووداوەکان بە ڕاگەیاندنی "سیستەمی کۆماری" و هەڵوەشاندنەوەی "خەلافەت" کۆتایی پێ هات. دوا بە دوای ئەم ڕووداوانەش دوژمنایەتی‌یەکی بێ شەرمانە لە دژی ئایینی ئیسلام لەو وڵاتەدا هاتە کایەوە کە زیاد لە چارەکە سەدەیەکی خایاند.

لەو قۆناغە تاریکەدا "مامۆستا نوورسی" گیرۆدەی دژوارترین جۆرەکانی ستەم کرابوو، چونکە بەردەوام لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر ڕادەگوێزرا و، هەر هێندەی لە دادگایەکدا بێ تاوانیی ڕادەگەیەنرا یەکسەر بۆ دادگایەکی نوێ ڕاپێچ دەکرا. سەرانسەری ئەو ماوەیەی ژیانی بەم جۆرە لێ گوزەرا هەتا دوای ساڵی ١٩٥٠ز، ئنجا بواری بۆ ڕەخسا بەم کتێبەیدا بڕواتەوە و قەڵەمی تێدا بگێڕێت.

کاتێ پیایدا ڕۆشتەوە گەلێ پوختەکاریی تێدا بە ئەنجام گەیاند، چونکە هەر لە سەرەتای پەیامەکەوە نزیکەی "سێ یەکی" لێ لابرد و، ئەوانەشی فەرامۆش کرد کە گریمانی ئەوە هەبێت تێگەیشتنی هەڵەی لە بارەوە دروست ببێت یان کاتی بەسەرچووبێت، هەروەك بۆ زیادە ڕوونکردنەوە هەندێ پەراوێزی نوێی بۆ دانا. کاتێکیش کە ساڵی ١٩٥٩ز ویستیان لە چاپی بدەنەوە دانەر زۆر بە وردی جارێکی تر

پیایدا ڕۆشتەوە و، بە لابردن و لێ زیادکردن قەڵەمی پوختەکاری و ڕاستکردنەوەی تێدا گێڕا. ئێمەش ئەم چاپە دوا پوختەکراوەی دانەرمان وەرگێڕا.

جگە لەمەش، خودی مامۆستای دانەرکاتێ بۆ شاری "قەستەمۆنی" دوورخرابووەوە، نامەیەکی تایبەتیی بۆ قوتابیانی نووسیوە کە تیایدا ڕای خۆی سەبارەت بە نووسینەکانی "سەعیدی کۆن" بە گشتی و ئەم پەیامە بە تایبەتی، دەردەبڕێت. دواتریش کە دوورخرایەوە بۆ شاری "ئەمیرداغ" نامەیەکی تری لە هەمان بابەت بۆ ناردوون و، هەردوو نامەکە گرنگیی خۆیان هەیە بۆ تێگەیشتن لە ناوەرۆکی بەرهەمەکانی "سەعیدی کۆن"[(١)].

* * *

کارەکانی من لەم وەرگێڕان و لێکۆڵینەوەیەدا، بریتی‌یە لەم هەنگاوانەی خوارەوە:

١ – دانانی دەقی تورکیی: (Munazarat) بە بناغە و نوسخەی سەرەکی، کە چەندین جار دەزگای چاپ و پەخشی (سۆزلەر) لە ئەستەمبووڵ چاپی کردووە و، دانەر خۆی پیایدا ڕۆشتووەتەوە.

٢ – بەرامبەر کردنی ئەم دەقە لەگەڵ چاپی یەکەمدا کە ساڵی ١٩١٣ز لە چاپخانەی (أبو الضیاء) لە ئەستەمبووڵ چاپ کراوە.

٣ – بەرامبەر کردنیشی لەگەڵ وەرگێڕانە عەرەبی‌یەکەیدا کە خودی دانەر وەری گێڕاوە و، لە ناوەندی کتێبی (الصیقل الإسلامي)دا بڵاو کراوەتەوە کە ساڵی ١٩٥٨ز لە چاپخانەی نوور لە ئەستەمبووڵ چاپ کراوە.

٤ – بەرامبەر کردنی بەو نوسخە عەرەبی‌یەی کە لە کتێبخانەی نیشتمانی لە شاری ئیزمیر بە ژمارەی: (٢٠/٢٨٨/٢٢٦٢) پارێزراوە، بێ ئەوەی ناوی چاپخانە و ساڵی چاپی لەسەر بێت.

---

(١) ئێمەش دوابەدوای ئەم پێشەکی‌یە، ئەو دوو نامە ناوبراوەمان دانا، تاکو خوێنەری بەڕێز بە ئاسانی بتوانێت ئاگاداری ناوەرۆکی هەردوو نامەکە بێت و، لە نیازی دانەر تێبگات کە بۆچی لە قۆناغی نوێی ژیانیدا ئەو دەستکاری‌یە ناوبراوانەی لە کتێبەکەیدا کردووە. (وەرگێڕ)

٥ - هێشتنەوەی دەستەواژە و بڕگە عەرەبی‌یەكانی دانەر لەناو دەقە توركی‌یەكەدا وەكو خۆیان و دانانیان لە نێوان دوو كەوانەی گۆشەداردا وەك ئەم دوو كەوانەیە: [ ]. كەواتە هەر دەقێكی عەرەبی لە نێوان دوو كەوانەی لەم جۆرەدا بوون دەستەواژەی خودی دانەرن.

٦ - نووسینی چەند پەراوێزێك بۆ هەندێ لەو شتانەی كە ئەو كاتە لای خوێنەر زانراو بوون، بەڵام ئێستا پێویستیان بە ڕوونكردنەوە هەیە، چ لە بارەی ڕووداوە مێژووییەكانەوە بن، یان شوێنەكان، یاخود دەستەواژە سیاسی‌یەكان.

٧ - گێڕانەوەی ئایەتە پیرۆزەكان بۆ ژمارە و شوێنی خۆیان لە سوورەتەكانیانیدا و، تەخریجی فەرموودە پیرۆزەكان لەسەر كتێبە متمانە پێكراوەكانی فەرموودە.

لە خوای گەورە داواكارین كە یارمەتیمان بدات بۆ نیازی جوان و تێگەیشتنی ڕاست و ڕاستیی گوفتار و تەواویی كردارەكان.

وصل اللهم وسلم على سيدنا محمد وعلى آله وأصحابه أجمعين.

**ئیحسان قاسم صاڵحی**

## دوو نامەی دانەر
## سەبارەت بە پەیامی (مونازەرات)

◆ نامەی یەکەم:

**ڕوانینێك بە پەیامی "مونازەرات"دا[1]**

دوای تێپەڕبوونی سی و پێنج ساڵ بەسەر دانانی پەیامی "مونازەرات"دا، چاوێکم پێدا خشاندەوە. بینیم ئەم پەیامە و دانراوەکانی تری "سەعیدی کۆن" هەندێ شتی نادروست و هەڵەی سووکەڵەیان تێدایە. چونکە ئەو بەرهەمانە لە حاڵەتێکی ڕۆحیی ئەوتۆدا نووسرابوون کە ئاڵوگۆڕە سیاسی‌یەکە[2] و چەند کاریگەرێکی دەرەکی و هەندێ هۆکاری لەمەڕ دەوروبەر پێکیان هێنابوو.

وا من ئێستا بە هەموو توانایەکم داوای لێبوردن لە خوای گەورە دەکەم لەسەر ئەو قسوور و ناتەواوی‌یانەم و، لە میهرەبانی‌یەکەشی ئومێدەوارم چاو لەو هەڵانەم بپۆشێت کە بە مەبەست و نیازێکی جوان و، بۆ ڕەواندنەوەی نائومێدیی ئیمانداران، دووچاریان بووم.

بەرهەمەکانی "سەعیدی کۆن" - وەك ئەم پەیامە - دوو بناغەی گرنگ بەسەریاندا زاڵن. ئەو دوو بناغەیەش حەقیقەتن، بەڵام هەروەك کەشفی ئەولیاکان پێویستیان بە تەئویلە و خەونە ڕاستەکانیش پێویستیان بە تەعبیرە، ئەو حەقیقەتەش کە "سەعیدی کۆن" لە ڕێی هەستی پێش ڕوودانەوە هەستی پێ کرد، ئەویش بە هەمان جۆر پێویستی بە لێکدانەوە و تەعبیرە، بەڵام تەعبیرێکی ورد.

---

(١) دانەر ئەم نامەیەی لە دوا ساڵی مانەوەی لە شاری قەستەمۆنی‌یەوە ناردووە بۆ قوتابیانی، کە تیایدا بە چاوی "سەعیدی نوێ" پەیامی (مونازەرات)ی "سەعیدی کۆن" هەڵدەسەنگێنێت. ئەم نامەیەمان لە بەرگی پێنجەمی سەرجەمی پەیامەکانی نووردا کە ناوی (پاشبەندەکان)ە لە لاپەڕە (١٦٨-١٧٢)دا بڵاوکردووەتەوە. (وەرگێڕ)

(٢) مەبەست ڕاگەیاندنی "مەشرووتییەتی دووهەم"ە لە دەوڵەتی عوسمانیدا. (وەرگێڕ)

کەچی لەبەر ئەوەی بە بێ هیچ لێکدانەوە و تەعبیرێك هەواڵی ئەو ڕووداوەی ڕاگەیاند و، ئەو دوو حەقیقەتەی دەخستە ڕوو، ئەوا هەندێ ناتەواوی و شتی پێچەوانەی واقیع لە هەواڵەکەیدا دەرکەوت. (دوو بناغەکەش ئەمانەن):

*بناغەی یەکەم:*

بریتی‌یە لەو مژدە خۆشەی کە ئەو دەمە دەیدا بە ئیمانداران سەبارەت بە سەرهەڵدانی نوورێك لە ئاییندەدا، تاکو نائومێدی‌یان لەسەر هەڵبگرێت و بێ هیوایی لە دڵیاندا لاببات..

چونکە بە هەستێکی پێش ڕوودان پەیی بەوە بردبوو کە "پەیامەکانی نوور" ئیمانی زۆر کەس لە ئیمانداران دەپارێزن و لە ڕۆژگارێکی سەخت و گێژەڵووکاویدا پشتیان دەگرن. بەڵام لە ناوەندی ئەو ڕووداوە سیاسی‌یانەی کە لەگەڵ ئەو ئاڵوگۆڕەدا پەیدا بووبوون بۆ ئەو نوورەی ڕوانی و، ویستی بێ هیچ تەعبیر و لێکدانەوەیەك بەسەر واقیعی حاڵدا بیشکێنێتەوە و، پێی وابوو ئەو نوورە لە جیهانی سیاسەت و بواری هێز و مەیدانێکی فراواندا دەردەکەوێت!

کەواتە هەستەکەی ڕاست بوو، بەڵام بە تەواوەتی لە لێکدانەوە و تەعبیری ئەو مژدەیەدا سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا!

*بناغەی دووهەم:*

"سەعیدی کۆن" بە وێنەی چەند کەسێك لە سیاسەتمەدارانی بلیمەت و ئەدیبانی وریا و زیرەك، زووتر هەستی کردبوو کە "ئیستبداد"ێکی سامناك بۆ ئەم نەتەوەیە بەڕێوەیە، بۆیە هەموویان بەرەنگاری بوونەوە. بەڵام ئەم هەستە پێش وەختە پێویستی بە لێکدانەوە بوو..

چونکە ئەوان هێرشیان بۆ سەر سێبەرێکی لاوازی شتێك برد کە بینیبوویان و لە "ئیستبداد"دا هەر تەنها ناوەکەی پێ بڕا بوو، بەڵام هی چەندین ئیستبدادی تر بوو کە دوای ماوەیەکی درێژخایەن هاتە گۆڕێ و، هەر ئەو کاتە ترس و سامی هاویشتبووە دڵی ئەمانەوە.

کەواتە ئامانجەکەیان ڕاست بوو، بەڵام نیشانەکەیان نەپێکابوو!

سەعیدی کۆن"یش - بە هەمان جۆر - کاتی خۆی هەستی بەم ئیستیبدادە ترسناکە کردبوو، هەروەك لە هەندێ بەرهەمی ئەو کاتەیدا بە ڕوونی هێرشی بردووەتە سەر و، پێی وابووە کە تەنها "مەشرووتییەتی شەرعی" هۆی ڕزگاربوونە لەو ئیستبدادە سامناکانە. بۆیە تێدەکۆشا کە بە "سەربەستیی شەرعی" و "شوورا" و لە چوارچێوەی "ئەحکامەکانی قورئان"دا پشتی ئەو مەشرووتیەتە شەرعی‌یە بگرێت، بەو هیوایەی کە ئەو گرفت و موسیبەتەیان پێ بگێڕێتە دواوە.

بەڵێ، ڕۆژگار دەری خست کە دەولەتێك بە هەڵگری بانگەوازی "ئازادی" ناو دەبرێت، ماوەی سێ سەدساڵ بە سێ سەد کەسی کارمەندی ستەمکار و خۆسەپێنی خۆی، سێ سەد ملیۆن کەسی لە هیندی‌یەکان بە کۆت و زنجیرەوە چەوساندەوە و، هیچ بوارێکی نەدان کە بجوولێنەوە و، بە سەختترین شێوەی ستەمی دڕندانە یاسای خۆی بەسەردا سەپاندن و، لەسەر تاوانی یەك کەسی تاوانبار هەزاران بێ تاوانیان تێوە دەگلاند. ئنجا ناوی "دادگەری" و "سەقامگیرکردنی یاسا"یان لەم ستەمەیان نا و، بەم کارەشیان هەموو جیهانیان خەڵەتاند و بە ئاگری ئەم ستەمە ئەوانیشیان سووتاند!

جا ئەم دەولەتە، ئێستا بووە بە پێشەنگێکی چاولێکراو بۆ ئەو ئیستیبدادەی کە لە ئایندەدا هات!

پەیامی "مونازەرات" چەند تێبینی و کورتە پەراوێزێکی تێدایە کە لە شێوەی نوکتە و قسەی نەستەقدا لەگەڵ قوتابی‌یە وریا و قسەخۆش و زیرەکەکانی ئەو کاتەیدا کراون، چونکە کاروبار و ڕووداوەکانی بە شێوازی دەرس و ڕێنمایی بۆ ڕوون کردوونەتەوە.

پاشان پوختە و گیان و بناغەی ئەم پەیامی مونازەراتە بریتی‌یە لە ڕاستیی دامەزراندنی "قوتابخانەی زەهراء" کە لە کۆتاییەکەیدا باسی هاتووە. کە ئەویش - لە ڕاستیدا - بریتی‌یە لەو لانکەی لە ئاییندەدا سەرهەڵدانی "پەیامەکانی نوور" دەبینێت. ئەوەبوو بە بێ ویستی خۆی بەرەو دامەزراندنی ئەو قوتابخانەیە دەدرایە بەر و، بە هەستێکی پێش ڕوودان لە شێوەیەکی ماددیدا بە دوای ئەو ڕاستی‌یە نوورانی‌یەدا دەگەڕا، تەنانەت ڕووە ماددی‌یەکەشی دەرکەوت، چونکە سوڵتان ڕەشاد نۆزدە هەزار لیرەی زێڕینی بۆ دامەزراندنی ئەو قوتابخانەیە بەخشی و، بناغەکانی ئەو قوتابخانەیە دامەزران و بەرز کرانەوە، بەڵام هەڵگیرسانی جەنگی یەکەمی جیهانی ڕێی لە تەواو کردنی ئەو پرۆژەیە گرت.

پاشان دوای نزیکەی شەش ساڵ ڕۆشتم بۆ ئەنقەرە و لە پێناوی جێبەجێ کردنی ئەو ڕاستی‌یەدا هەوڵەکانی خۆمم خستەوە گەڕ. ئەوەبوو لە کۆی دووسەد ئەندامی پەرلەماندا سەد و شەست و سێ ئەندام ڕەزامەندی‌یان لەسەر ئەوە نواند کە پازدە هەزار لیرەی وەرەقی بۆ بنیاتنانی قوتابخانەکەمان تایبەت بکرێت.

بەڵام هەزار هەزار داخ و ئەسەف بۆ ئەوەی کە هەموو قوتابخانە ئایینی‌یەکان داخران و، منیش ئیتر نەمتوانی لەگەڵ ئەواندا خۆم بگونجێنم و، دیسانەوە پرۆژەکە دواکەوتەوە.

بەڵام میهرەبانیی فراوانی خوای گەورەی بەتوانا تایبەتکاری‌یە مەعنەوی‌یەکان و کاکڵە و جەوهەری ئەو قوتابخانەیەی لە "ئیسپارتە"دا دامەزراند و، "پەیامەکانی نوور"ی هێنایە وجوود. پشت بە خوا "قوتابیانی نوور" ڕووە ماددی‌یەکەی ئەو ڕاستی‌یەش دەهێننەدی و دایدەمەزرێنن.

هەرچەند ئەو کاتە "سەعیدی کۆن" زۆر بە توندوتیژی لە دژی ڕێکخراوی "ئیتتیحاد و تەرەقی" ڕاوەستا، بەڵام لایەنی حکوومەتەکەی، بە تایبەت سوپاکەی، گرتن. ئەوەبوو هەڵوێستی ڕێز و سەرسووڕمان و گوێڕایەڵیی لە بەرامبەرەوە نواندن. ئەمەش هی ئەوەبوو کە بە هەستی پێش ڕوودان پەیی بەوە بردبوو کە ئەو دەستە و تاقمە سەربازی و کۆمەڵە میللی‌یانە، دوای حەوت ساڵ، یەك ملیۆن شەهیدیان لە نێواندا پەیدا دەبێت، کە لە پلەی ئەولیادان. بۆیە بە بێ ویست و ئیختیاری خۆی، دوای چوار ساڵ لایەنی گرتن، کە ئەمەش پێچەوانەی مەشرەبی خۆی بوو.

بەڵام هەر کە جەنگی یەکەمی جیهانی بەرپا بوو، هەموو ئەوانی ڕاتەکاند و، ڕۆن و کەرەی پیرۆز و بەنرخی لەو ماستە جیا کردەوە و، پاشماوەکەی کرد بە دۆیەکی بێ نرخ. ئیتر "سەعیدی نوێ" دەستی دایە جیهادەکەی خۆی و بە پێچەوانەی سەعیدی کۆنەوە ڕەفتاری نواند.

* * *

◆ **نامەی دووهەم:**

**ڕەخنەی وەلی‌یەکی مەزن**[١]

باسمه سبحانه

**برا ئازیزەکانم!**

کتێبێکی چاپکراوی سەعیدی کۆنم دەست کەوت کە ناوی "مونازەرات"ە و، بە وردبینی و تاسەمەندی‌یەوە تێم ڕوانی. یەکسەر ئەم بڕگەیەی خوارەوە هاتە دڵمەوە:

**یەکەم:**

ئەم کتێبەی کە ساڵی ١٣٢٩ك لە چاپخانەی "أبو الضياء" چاپ کراوە، بریتی‌یە لەو دەرسەی کە لە ساڵی سێ‌هەمی سەردەمی سەربەستیدا و بۆ ئەوەی هۆز و خێڵەکان بە ڕاستی و دروستی لە شووڕای شەرعی تێبگەن و وەری بگرن، سەعیدی کۆن بە عەشرەتەکانی "ئەرتووش" بە تایبەت "گەڤەدان" و "مامە خووران"ی وتووەتەوە. بەڵام هەرچەند سی ساڵ بە دوای ئەم نووسراوەمدا دەگەڕام بە داخەوە دەستم نەکەوت، تا لەم نزیکانەدا یەکێك نوسخەیەکی دەست کەوت و بۆی ناردم.

کتێبەکەم بە وردی و بە عەقڵی سەعیدی کۆن و بە سنووحاتی سەعیدی نوێ خوێندەوە. تێگەیشتم کە سەعیدی کۆن بە هەستێکی سەیر و سەرسووڕهێنەری پێش وەخت نزیکەی چل ساڵ پێش ئێستا هەستی بەم ڕووداوە ماددی و مەعنەوی‌یانە کردووە کە ئێستا ڕوو دەدەن. چونکە لە پشت پەردەی هۆز و عەشیرەتە کوردەکانەوە ئەو خیانەتکارانەی بینی کە ئەم ڕۆژگار و زەمانەیان کردبوو بە ڕووپۆشی خۆیان و، بریتین لەو مولحید و جاهیلە ڕاستەقینە و کۆنەپەرستانەی کە دەیانەوێت لە ژێر پەردەی نیشتمان پەروەریدا ئەم نەتەوەیە بەرەو داب و نەریتە پێشینەکانی پێش سەردەمی ئیسلام بوونیان بگێڕنەوە و، سەعیدی کۆنیش بە توند و تیژی لەگەڵیان دواوە.

**دووهەم:**

ئەو لاپەڕانەم لەم کتێبەدا خوێندەوە کە تیایاندا دەردەکەوێت وەلی‌یەکی گەورە لەناو گوێ بیستانی ئەو دەرسەمدا بێت، بێ ئەوەی من پێی بزانم. چونکە لەو مەقامەدا ڕەخنەیەکی توندی گرت و وتی:

---

(١) (پاشبەندەکان) لاپەڕە (٥٤٦-٥٥٢). (وەرگێڕ)

- تۆ زیاد لە پێویست ڕۆ دەچیت و پێی لێ ڕادەکێشیت، چونکە "ئەندێشە" بە "حەقیقەت" پیشان دەدەیت و، لەو ڕووەوە کە پێت وایە ئێمە "نەزان" بین. سووکایەتیمان پێ دەکەیت. خۆ ئێمە لە چەرخی ئاخر زەماندایین و فەساد و خراپکاری پەرە دەسێنێت و لەمەولاش لە خراپەوە بەرەو خراپتر سەردەکێشێت.

وەڵامی ناو کتێبەکەش بەم جۆرە بوو کە:

بۆچی دەبێ دنیا بۆ هەموو کەسێك گۆڕەپانی پێشکەوتن بێت و، تەنها بۆ ئێمە مەیدانی دواکەوتن بێت؟! جا ئەگەر وایە، ئەوا سوێند بێت لەگەڵ ئێوە نەدوێم و پشتتان لێ هەڵبکەم و، ڕووی گوفتارم بکەمە ئەوانەی کە لە ئاییندەدا دێن:

(ئەی ئەو کەسەی وا لە پشت چەرخێکی بڵندی دوای سێ سەد ساڵەوە و بە ئەسپایی و بێ دەنگی گوێ لە وتەکانی "نوور" ڕادەگرێت و، بە تەماشا کردنێکی غەیبی و پەنهان بۆمان دەڕوانێت!

ئەی ئەوانەی ناوتان: "سەعید و حەمزە و عومەر و عوسمان و تاهیر و یووسف و ئەحمەد" و ئەم چەشنە ناوانەیە!

من لەگەڵ ئێوە دەدوێم.. سەرتان بەرز بکەنەوە و تەسدیقم بکەن و بڵێن: "ڕاستت وت" با ئەم تەسدیق کردنەش قەرز بێت لە ئەستۆتاندا!

با واز لەم هاوچەرخانەم بێنین کە گوێ بۆ وتەکانم ڕاناگرن. من لەگەڵ ئێوەمە و، هەر لە شیوە قووڵەکانی ڕابوردووەوە - کە ناوی مێژووی لێ نراوە - تا دەگاتە لوتکە بڵندەکانی ئاییندەی ئێوە و، لە ڕێی شەپۆلەکانی "ئەثیرەوە" لەگەڵتان دەدوێم..

چی بکەم؟ ناچار بووم زوو بێم و بە دەستی خۆم نەبوو، ویستی قەدەر وا بوو کە لە زستانی ژیاندا بێمە ناو ئەم ژیانە. بەڵام خۆزگەم بە ئێوە، لە بەهارێکی خۆشی بەهەشت ئاسادا دێنە مەیدان و، ئەو تۆوانەی "نوور" کە ئێستا دەچێنرێن، لە زەویی ئێوەدا بە چەندین گوڵی گەش دەمیان دەپشکوێت.

ئێمە بەرامبەر بە خزمەتگوزاری‌یەکانمان تەنها داوای ئەوەتان لێ دەکەین کە هەر کات هاتن و بە قەدپاڵی ڕابوردوودا گوزەرتان کرد، سەرێك لە گۆڕەکانمان بدەن و دیاری‌یەکانی ئەو بەهارەتان لەسەر لووتکەی قەڵاکەدا بڕوێنن).

(واتە وەك ئەوەی لە ئومێدی سیازدەهەمی "پەیامی پیران"دا باس کراوە کە: بە مردنی قوتابخانەی خورخوری ژێر قەلا سەختەکەی وان، کە قوتابخانەیەکی سەرەتایی قوتابخانەی زەهرایە و، بە مردنی سەرجەمی قوتابخانە شەرعی‌یەکانی ئەنادۆڵ، هەموو قوتابخانەکان مردن و گیانیان لەدەست دا. وەك بڵێی قەلاکەی وان بووە بە کێلێك بۆ گۆڕە مەزنەکەیان. دەسا ئەی ئەوانەی کە دوای سێ سەد ساڵ دێن! گوڵی قوتابخانەیەکی نوور لەگەڵ خۆتاندا بهێنن و لەسەر لوتکەی ئەم قەلایە بیڕوێنن).

واتە جەستەی ئەو قوتابخانەی زەهرایە بنیات بنێن کە گیانەکەی لە ناوەندی دەستەیەکی فراواندا دەژی و هێشتا جەستەکەی نەبووژاوەتەوە. هەرچەند "سەعیدی کۆن" زۆربەی ژیانی لە پێناوی هێنانەدیی ئەو قوتابخانەیەدا بەسەر برد و، گەلێ ڕاستیی گرنگیشی - چ لە بارەی دامەزراندن و چ لە بارەی سوودەکانی ئەو قوتابخانەیە - لەو دانراوەیدا تۆمار کردووە.

جێی خۆشحاڵی و مایەی گەشبینی‌یە کە دوای شکست هێنانی زەبر و زەنگی ئەو ئیستبدادە ترسناکەی کە بیست و پێنج ساڵی خایاند و کۆتایی بە ژیانی قوتابخانە شەرعی‌یەکان هێنا، "تۆفیق ئیلەری"ی وەزیری پەروەردە بڕیاری دامەزراندنی قوتابخانەی زەهرای داوە لە "وان"دا بە ناوی "زانکۆی خۆرهەلات" و، "جەلال بایار"ی سەرۆك کۆماریش - بێ ئەوەی پێی بزانێت - بڕیارەکەی وەزیری پەسەند کردووە و خستوویەتیە لیستی مەسەلە گرنگەکانەوە. خۆ ئەمەش ئەو شتەیە کە چل ساڵ پێش ئێستا "سەعید" ئاواتەخوازی بوو. پشت بە خوا ئاواتەکەی دێتە دی.

لێرەدا سێ "ڕاستی" بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو وەلامەی سەعیدی کۆن پێش چاو دەخەین کە چل و پێنج ساڵ پێش ئێستا داویەتەوە:

**ڕاستیی یەکەم:**

"سەعیدی کۆن" بە هەستی پێش وەخت هەستی بە دوو ڕووداوی سەرسووڕهێنەر کردبوو، بەلام بە وێنەی خەونە ڕاستەکان ئەو هەستەش پێویستی بە تەعبیر بوو. چونکە هەروەك ئەگەر کەسێك لە پشت پەردەیەکی سوورەوە سەیری شتێکی سپی بکات بە سوور دەیبینێت، سەعیدی کۆنیش لە پشت پەردەی سیاسەتی ئیسلامی‌یەوە سەیری ئەو

ڕاستییەی کرد، ئیتر تا ڕادەیەك شێوەی ڕاستییەکە لە بەرچاویدا گۆڕا. ئەو وەلییە پیاوچاکەش کە ئامادەی کۆڕەکە بوو، بەو هەڵەیەی سەعیدی کۆنی زانی و، لەو ڕووەوە ڕەخنەی لێ گرت.

ئەو ڕاستییەش دوو بەشە:

بەشی یەکەم:

"نوورێکی درەخشانی گەورە لە وڵاتی دەوڵەتی عوسمانیدا سەرهەڵدەدات". تەنانەت لە پێش سەردەمی سەربەستیدا سەعید چەندین جار ئەم مژدەیەی - وەك دڵدانەوەیەك - بە قوتابییەکانی داوە..

هەروەها "سەرەڕای ئەو کاولکاری و فەسادەی لە پێش چاودایە، ئەو نوورە بەختەوەریی ئەم نیشتمانە دەهێنێتە دی". ئەوەبوو لە دوای چل ساڵ "پەیامەکانی نوور" ئەم ڕاستییەی تەنانەت بۆ چاوە نابیناکانیش دەرخست.

"سەعیدی کۆن" هەستی بە سوودە مەزن و فراوانەکان و جۆرە بەرز و بڵندەکەی ئەو نوورە کردبوو، بەڵام لە ناوەندی "سیاسەت"ەوە بۆی ڕوانی و، بە چەشنێك لێکی دایەوە کە وەك بڵێی لە هەموو وڵاتی عوسمانیدا سەرهەڵبدات، بێ ئەوەی "چەندایەتی"یە کەمەکەی ئەو نوورە و ئەندازە تەسکەکەی ڕەچاو بکات.

کەواتە سەعیدی کۆن تا ڕادەیەك حەقی پێکاوە و، ئەو وەلییەش هەر لەسەر حەق بووە کە ڕەخنەی لێ گرتووە لەوەدا کە بازنە تەسکەکەی بە فراوانی بینیوە..

چونکە بازنە تەسکەکەی "پەیامەکانی نوور"، لە ڕووی پاراستنی ئیمانەوە، گەلێ فراوانە، چونکە ژیانی هەمیشەیی ڕزگار دەکات. ئەوەتا یەك ملیۆن کەس لە قوتابیانی لە حوکمی ملیارێکدان. واتە هەوڵی بەختەوەر کردنی ئەودنیای هەزار کەس زۆر چاکترە و، لە ناوەرۆکدا گەلێ فراوانترە لەوەی کە لە ژیانی دنیا و شارستانیدا بەختەوەر بکرێن.

جا ئەمە ئەو ڕاستییە بوو کە "سەعیدی کۆن" بە هەستی پێش وەختی چەشنی خەونە ڕاستەکان بینیی. واتە ئەو نوور و ڕووناکییە کەم و تەسکە، دەوراندەوری سەرانسەری وڵاتی عوسمانی دەدات.

جێی ئومێدە کە خوای گەورە لــە ڕێی نەشونما کردنی ئەو تۆوە نوورانی‌یانەی کە "پەیامەکانی نوور" دەیانچێنن، ئەو بازنە فراوانــە ڕوونـاك بکاتـەوە. ئـەو کاتـەش ڕاستیی تەعبیر و لێکدانەوە هەڵەکەی سەعیدی کۆن دەردەکەوێت.

ڕاستیی دووهەم:

سەعیدی کۆن لە نووسراوە کۆنەکانی و لە "إفادة المرام"ی "إشارات الإعجـــاز"دا هەواڵی بە قوتابی‌یەکانی دەدا و بە دووپات کردنەوەی یەك لە دوای یەك پێی دەوتن کە:

بوومەلەرزەیەکی مـاددی و مەعنـەویی کۆمەڵایـەتیی یـەکجار گـەورە لــەناو گــرۆی مرۆڤدا ڕوو دەدات و، ئــەو کاتــەش خــەڵکی خۆزگــە بــە گۆشــەگیری و ژن نــەهێنانم دەخوازن.

تەنانەت لە یەکەم ساڵی سـەردەمی سەربەستیدا "شێخ بەخیت"ی موفتیی میسر لە "سەعیدی کۆن"ی پرسی:

– سـەبارەت بـەم سەربەستی‌یەی دەوڵـەتی عوسمـانی و، شارسـتانێتی ئـەورووپا، ڕات چۆنە؟

سەعیدی کۆن وەڵامی دایەوە:

– دەوڵەتی عوسمانی سکی بە دەوڵەتێکی ئەورووپایی پڕ بووە و ڕۆژێك دێت دەزێت.. ئەورووپاش سکی بە ئیسلامەتی پڕ بووە و ڕۆژێك دێت دەبێت!

شێخی بەڕێزیش وتی:

– منیش تەسدیقی قسەکەی دەکەم.

پاشان بە زانایانی دەوروبەری خۆی وت:

– من مونازەرەی ئەم لاوە ناکەم و ناتوانم بەسەریدا زاڵ ببم.

ئەوەبوو دوایی بە چاوی خۆمان لەدایکبوونی یەکەمان بینـی، کـە بریتـی بـوو لـەوەی دەوڵەتی عوسمانی لە دوور کەوتنەوەیدا لە ئایین چارەکە سەدەیەك پێش ئەورووپا کەوتەوە!

بەڵام لەدایکبوونی دووهەم – پشت بە خوا – دوای نزیکەی سی ساڵێك دێتـە دی و، چ لە خۆرهەڵات و چ لە خۆرئاوادا دەوڵەتێکی ئیسلامی پەیدا دەبێت.

**ڕاستیی سێهەم:**

سەعیدی کۆن و نوێ، بە هەستێکی پێش وەخت و جەختێکی لەڕادەبەدەر و دووپات کردنەوە، هەواڵی ڕووداوێکی گەورەی ماددی و مەعنەوی و سەرهەڵدانی بوومەلەرزەیەکی مرۆیی کۆمەڵایەتیی ترسناك و ڕووخێنەری لە دەوڵەتی عوسمانیدا، ڕادەگەیاند.. هەر بەو هەستە پێش وەختەش ئەو ڕووداوانەی بازنە یەکجار فراوانەکەی لە بازنەیەکی بچووکدا بینی.

خۆ هەرچەندە ڕۆژگار بە "جەنگی جیهانیی دووهەم" تەسدیقێکی تەواوەتیی ئەو هەواڵەی کرد، لەگەڵ ئەوەشدا هەر "سەعید" بۆ خۆی بینینی ئەو بازنە فراوانە لە وڵاتی عوسمانیدا بەمەی خوارەوە لێك دەداتەوە:

سەرەڕای فراوانیی لەڕادەبەدەری ئەو کاولکاری‌یەی کە جەنگی جیهانیی دووهەم بەرهەمی هێنا، کەچی هێشتا بە کەم و بەرتەسك دادەنرێت لەچاو ئەو کاولکاری‌یەی کە لە دەوڵەتی عوسمانیدا ڕووی دا. چونکە کاولکاری‌یەکەی لەمەڕ جەنگی جیهانی ڕووی لە ژیانی دنیا و شارستانێتیی قەڵب و ساختەیە، بەڵام ئەوەی لە دەوڵەتی عوسمانیدا ڕووی دا کاولکاریی ژیانی نەبڕاوە و بەختەوەریی هەمیشەییە و، لە ناوەرۆکدا بوومەلەرزەیەکی ئیسلامیی گەلێ سەخت و ترسناکترە لە هی ئەو جەنگە!

بەم جۆرە "سەعیدی نوێ" سەهووەکەی "سەعیدی کۆن" ڕاست دەکاتەوە و، خەونە ڕاستەکەی لێك دەداتەوە و، هەستە پێش وەختەکەی پێش چاو دەخات و، لە هەمان کاتیشدا بەرپەرچی ڕەخنەکەی ئەو وەلی‌یە بەڕێزەش دەداتەوە کە وا دەردەکەوێت لەسەر حەق بێت. بەوەی کە دەیچەسپێنێت هەستە پێش وەختەکەی سەعیدی کۆن لە چاو ڕەخنەکەی ئەو زیاتر لەسەر حەقە.

* * *

**پێشەکیی دانەر بۆ تەرجەمە عەرەبی‌یەکەی خۆی:**

# پۆزشێکی درێژ داوێن(١)

ئەی ئەو کەسەی کە دەڕوانێتە بەرهەمەکانم!

مرۆڤێك کرداره باشەکانی بەسەر گوناهەکانیدا و ڕاستەکانی بەسەر هەڵەکانیدا زاڵ بوو بێت، چاوپۆشیی لێ دەکرێت.

هەردوو ئاڵوگۆڕ(کوودەتا)ەکە(٢) منیان ناچاری نووسینی دوو دانراوی ئاڵۆزکاو کرد کە قەد و بالآیان تورکی‌یە و(٣)، هەردوو گەشتەکەش بوونە هۆی نووسینی دوو کتێب کە لەشولاریان عەرەبی‌یە و(٤)، دوانی تریش بوونە تورك(٥) و، یەکێکی دیکەش کە وەکو خۆم کوردە(٦)!

جا هەروەك شێوە درووماني عەرەبی بە هەموويانەوە دەبینرێت، لە لای خوارەوەشیان داوێنی کورد بە سرتە دەدوێ و، لەناو پێچاوپێچی لۆچەکانیشیدا کراسی ئاودامانی تورك ڕاز و نیازی لەگەڵ بینەردا دەگۆڕێتەوە.

---

(١) دانەر لە لە دواچاپەکانی (مونازەرات)دا کە پاکژکاریی تێدا کردوون، ئەم پۆزشەی لابردووە. ئێمە لە دەقە عەرەبی‌یەکەی یەکەم جارەوە کردمان بە کوردی. (وەرگێڕ)

(٢) ئەو دوو ئاڵوگۆڕە بریتین لە: ڕاگەیاندنی مەشرووتییەتی دووهەم (١٩٠٨/٧/٢٣ز) هەروەها ڕووداوی (٣١/ مارت/١٣٢٥ بە تەقویمی ڕۆمی) کە دەکاتە (١٩٠٩/٤/١٣ز). (وەرگێڕ)

(٣) واتە دوو کتێبی خۆی بە زمانی تورکی، کە پێم وایە بریتی بن لە: (نوتق) کە سالی ١٩٠٨ نووسراوە و، سالی ١٩١٢ چاپکراوە، هەروەها کتێبی (بڕوانامەی هەردوو قوتابخانەی موسیبەت وەیاخود دیوانی حەربی عورفی و سەعیدی کوردی ) کە سالی ١٩١١ دانراوە و هەر لەو ساڵەدا چاپی یەکەم و سالی دوای ئەویش چاپی دووهەم کراوە. (وەرگێڕ)

(٤) مەبەست دوو کتێبی خۆیەتی بە زمانی عەرەبی، پێم وایە بریتی بن لە: (وتاری شام) و پاشکۆکەی بە ناوی (دەستنیشان کردنی نەخۆشی) کە یەکەم جار (١٩١١) بە زمانی عەرەبی بوون. (وەرگێڕ)

(٥) لەوانەیە مەبەستی ئەوە بێت کە وەری گێڕاون بۆ تورکی، پێدەچێ کە (موحاکەمات) و (مونازەرات) بن کە سالی (١٩١١ز) کردوونی بە عەرەبی و دواتر بە زمانی عەرەبی یەکەمیان بە ناوی (رجتة العلماء) و دووهەمیشیان بە ناوی (رجتة العوام) چاپکراون. (وەرگێڕ)

(٦) لەوانەیە مەبەست ئەو دەستنووسە کوردی‌یە بێت کە لە ڕووداوەکانی جەنگی یەکەمی جیهانی لە مالی تاهیر پاشای والیی واندا تیاچووە. (وەرگێڕ)

دەسا ئێوەش لە زات و سیفەتی بەرهەمەکەمدا چاوپۆشیم لێ بکەن، چونکە دانراوێکی ئاوا کە شکڵ و شێوەیەکی سەیری هەبێت، تۆ نازانیت چۆن چۆنی دانراوە! کە حەق بوو بێدەنگ بوومایە، چونکە "دەستەوسانی" خاوم دەکاتەوە و دامدەنیشێنێت.

من خۆم باش دەزانم کە بەرهەمەکانم شایانی ئەوە نین کەس حەزیان پێ بکات..

بەڵام لەبەر ئەو هیممەتەی کە لەو بەیتەی "سەعدیی شیرازی"یەوە سەری هەڵداوە، کاتێ نەوەی ئادەمیزادی لەم سروودەی خۆیدا لاواندووەتەوە و، وتوویەتی:

غرض نقشیست که از ما باز ماند　　که هستی را نمی یابم بقائی[1]

هەروەها بە هیوای ئەوەی ببمە نموونەیەك بۆ پیادەکردنی جەسارەتی چوونە مەیدانی غیرەت و پەرۆشی، بە لابردنی پەردەی سام و شەرم لە کەسانی بێ توانای هاوشێوەی من..

هەروەها ڕەچاوکردنی گریمانی حەز بە شتی عەنتیکە، لە دەرچوونی بەرهەمێك - هەرچەندەش جوزئی بێت - لە کەسێك کە شتی لەو جۆرە لە هاوشێوەی ئەو بە نامۆ دابنرێت..

ئەم سیانە.. بۆ دانانی ئەم کتێبە هانیان دام.

دەسا ئەی خوێنەری بەڕێز!

من بێ ئاگا نیم لەوەی کە بەرهەمەکەم هەروەك حەقیقەت تێکدەشکێنێت، هۆنینی دارشتنیش پەرت دەکات.. هەروەك شێواز دەئاڵۆزێنێت، ئەندێشەی مرۆڤیش بەم لا و ئەولادا پەرتەوازە دەکات.. هەروەك بە ناڕەوایی هەست بەکاردەهێنێت، دەشکەوێتە ناو زیادەڕەوییەوە.. بەڵام چی بکەم، هەر بەم شێوەیە بە دەستەوە هات..

چونکە ئەو شەوقەی لەو کوودەتا "تەمموز"ییەوە سەری هەڵدا کە چەرخێکی ترنجاندە ساڵێك و[2]، ئەندێشەی منی لە سەدەکانی ناوەڕاستەوە کێش کردە ناو

---

(١) واتە:

مەبەست نەخشێکە دوای من جێ بمێنێ　　کە "بوون" بۆ مانەوەی خۆی دائەمێنێ

ئەم بەیتەی سەعدیی شیرازی لە سەرەتای کتێبی "گلستان"دایە و، لە چاپەکەی بەردەستمدا بەم جۆرەیە:

غرض نقشیست کز ما بازماند　　که هستی را نمی بینم بقایی

بڕوانە: (کلیات سعدی) ص ٣٥، به اهتمام محمد علی فروغی، انتشارات امیر کبیر، تهران ١٣٦٩. (وەرگێڕ)

(٢) ئاماژەیە بۆ ڕاگەیاندنی مەشرووتییەتی دووهەم لە ١٩٠٨/٧/٢٣دا. (وەرگێڕ)

خۆی و، سەدە لە دوای سەدە تلۆری کردمەوە و، لە هەر چەرخێك کاریگەری و هەستێکم وەرگرت، ئنجا ئیلهامی یەکەم دانراوی پێ بەخشیم..

هەروەها ئەو هەڵچوونەی کە پشێویی ئەو "مارت"ە بەرهەمی هێنا کە بازنە هاوچەقە نزمبووەکانی توێژەکانی مرۆڤی کردە ئاژاوە و هەراوهوریایەکی بێ شێوە و ڕوخسار و[1]، ئەو دانراوەی منیشی تەواو کرد کە لە دەرگای نەخۆشخانە لە "نەبوون"ەوە هاتە "وجوود" بە هۆی زللەی پزیشکانی ژیری و گوشاری ئیستیبدادی دێوانە و، ناچاری کردم (بروانامەی هەردوو قوتابخانەی موسیبەت) بخەمە ڕوو..

هەروەها ئەو وانە و فەرمانەی کە بیری نەتەوایەتی‌یەکی ئەوتۆی پێ بەخشیم هەستی ئیسلامییەتی لەخۆ گرتووە و، دەرەنجامی چەندین هەست و نەستی جۆراوجۆر و سروشتی جیاجیای توێژە جیاوازەکانە و، دەستی ئەم دوو ڕەچەتەیەی بەرەو ئەو نیشتمانە گرت کە بووەتە نەخۆشخانە..

ئەمانەی کە باس کران، هەر تەنها ئاکامی شێواوی لەم جۆرە بەرهەم دەهێنن.

بەمەش سەلما کە هەموو یەکێکی دانراوەکانم وەکو پێرستێك وایە بۆ چەندین چەرخ و، پوختەی گەلێ توێژی چەندین هەست و نەستە و، نموونەیەکە لە سروشتەکانی تیرە کوردەکان و، ناونیشانی قۆناغە جیاجیاکانمە.

کەواتە بۆ سۆراخکردنی ڕێکوپێکیی ڕاستەقینە لەو بەرهەمانەمدا، خۆتان ماندوو مەکەن، چونکە کارێکی بێهوودەیە!

لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا.. حەوت هۆکاری تر بۆ ئەو ئاڵۆزی‌یە هەیە:

یەکەم:

هەر لە منالیمەوە هەتا ئێستا حالەتەکانی تێگەیشتنم لە یەکتر جیاوازن. ئەوەتا کاتی وا هەیە وەکو ئەوەم کە لەسەر منارەیەك بم، کەچی لە کاتێکی تردا لە بنی بیردام.. گەلێ "ڕاستی" هەن کە خۆشەویستمن و دەمناسن، کەچی لە ماوەی چرکەیەکدا لێم دەبنە بیانی و ئینکاری‌یان لێ دەکەم. پاشان لە کاتێکی دیکەدا، بێ هیچ بانگهێشتێك،

(١) ئاماژەیە بۆ ڕووداوی بێ سەرەوبەرەی (٣١/ مارت/١٣٢٥ ڕۆمی) لە ١٣/٤/١٩٠٩زدا. (وەرگێڕ)

"ڕاستی"ی هێندە وردم دێنە دەست کە تەنانـەت ناویشـم نەبیستوون.. هـەروەك هـەندێ کات لە "باقل"[١] نەزانتر دەبم، کەچی لە سیاسەتدا خۆم بە وێنەی "سەحبان"[٢] دەبینم.

دووهەم:

پێشتر لە دارشتندا عەجەم و لە نووسیندا نەخوێندەوار بووم، هـەتا بوومـە قوتـابی لای "مەشرووتییەت". چونکـە هـەر ئەو وانـەی پێ وتمـەوە و ئیجازەنامەشـی پـێ بەخشـیم. کەواتە بەروبوومەکان لە باخی دڵـدا هێشتا پێنەگەیشتبوون کـە مـن بـە بەرسیلەیی لێـم کردنەوە. جا ئەگەر تامیان لای ئێوە ترش بوو، ڕووی خۆتانم لـێ گرژ مەکەن!

سێهەم:

ئەو ناوبانگە درۆینەیەم کـە ئـەنجامی ڕووتێکردنـی خەڵکی‌یـە لێـم و منیـش شایستەی نیم، ئەرکێکی گرنگی خستە ئەستۆم و، لەبەر دەستەوسانیم ناچاری ئەوەی کردم بڕۆمـە نمایشکردنی شایستەییەکی ساختە بۆ شتێك کە من شایانی نیم.

چوارەم:

ئەو لـەخۆبایی بوونـەی کـە بـە سروشـت لـە منـدا هەیـە و، شـانازی کـردنم لـە ڕووی نەتەوایەتیمـەوە و، ڕێبـازی باسـکردنی نیعمـەت کـە مـن گرتوومەتەبـەر و، مەشـرەبی سـەرکەوتنیش بەسـەر کەسـانی تـردا و، مـەیلی خۆڕاگریـم و خۆنوانـدن و ئازایـەتیی نەتـەوەییم، ئـەوە پیشـانی چـاوخێلی سـەیرکەری ئاسـەوارەکانم دەدەن کـە خۆویسـتی و خۆپەسەندی‌یەکی زیاد لەوەی لە ڕاستیدا هەیە، لە مندا هەبێت..

ڕاستە، "خۆویستی" هەیە، بەڵام هی من نی‌یە.. بەڵکو خۆویستیی گەل و ڕەگەزمە..

بەڵێ، "خۆپەسەندی"یان تێدایە، بەڵام هی من نی‌یە، بـەڵکو سـەربەرزیی هاوڕێبازانمـە کە فریشتەی قوتابخانەکانن.

پێنجەم:

من کوردانە بۆچوونەکانم بە بیردا دێن، پاشـان بـە عـەرەبی یـان تورکـی دەریـاندەبڕم. ئیتر وەرگێڕێکی عەجەم لە چاپخانەی ئەندێشـەم دادەنیشێت. ئـەو وەرگێڕەش هـەروەك

(١) باقل: ناوی کەسێکە لە ئەدەبی عەرەبیدا بە نموونەی بێ توانایی لە قسەکردندا دەیهێننەوە. (وەرگێڕ)

(٢) سەحبان: کوڕی زوفەری کوڕی ئیاسە. بـە سـەحبانی وائیـل ناسـراوە. گوتـاربێژێکی زمانپـاراو بـووە، بـە نموونـەی قسـەزانی و ڕەوانبێژی و حـازروەڵامی دەیهێننـەوە. لـە پێـش ئیسـلام لـەدایك بـووە و هـەتا سـاڵی (٥٤ کۆچی) ژیاوە. (وەرگێڕ)

هەندێ جار لە گوفتاری دڵ تێناگات، هەندێ جاری تریش ئاشنای زمانی زمان نی‌یە هەتا لەمیانی وەربگرێت و بەوی تریانی بسپێرێت..

هەروەها وەك ئەوەی كە سەرف و نەحووی زمانی توركی نازانم، سەلیقەشم لە پەیوەندی‌یەكانی زمانی عەرەبیدا نی‌یە. هەر لەبەر ئەوەیە كە ئەو شێوازانەی بە بەری واتاكانم بڕیوە و، ئەو پۆشاكەش كە بۆم دووریون و پێم پۆشیون، دوگمەكانیان ناڕێك دەرچوون..

تەنانەت دووپات بوونەوەی (ئەوەت، ئیشتە، هەمدە، زیرا، شوو، بوو) هەروەها دووبارە بوونەوەی: (نَعَم، إلاّ، إنَّ، ثُمَّ، فـ، الذي، ذلك) .. . هتد، منیشی وەكو ئێوە بێزار كردووە.

لەگەڵ ئەوەشدا بە هەڵەگیری و ڕاستكردنەوەی كەسێكی تری جگە لە خۆم ڕازی نابم. چونكە هەروەك كارێكی نەگونجاوە، تەنانەت قەبە و ناقۆلاّ و قورسە لەسەرم كە گولنگەی "تەربووش"ی تورك بە "كلاّوەكەم"دا هەڵبواسرێت، بە هەمان جۆر وشەی جگە لە خۆم لەگەڵ وشەكانی مندا ناسازێن، تەنانەت هێندە پێیان نامۆیە كە لێیان هەڵدێن.

شەشەم:

تێهەڵكێش بوونی "هەڵە" و ڕۆشتنی بۆ ناو بیركردنەوەم بەهۆی زیادەڕەویی سروشتم، هەروەها بۆ ناو وەرگێڕانی وەرگێڕەكەی ئەندێشە و، بۆ ناو ئیملای نووسەر و، بۆ ناو چاپی چاپكەر و، بۆ ناو تێگەیشتنی خوێنەر، زۆر جار حەقیقەتێكی جوانخاس بە ناشیرین و ئاڵۆز پێش چاو دەخات.

حەوتەم:

ئەم دوو پەیامە (صيقل الإسلام)[1] و (رجتة الاكراد)[2] لە ماوەی چل پەنجا ڕۆژدا هەم سەوز بوون و، هەم لەسەر قەدی خۆیان ڕاوەستان و، هەم بەریشیان گرت!

ئەوەش لە دەمی ئەو گەشتەمدا بوو كە چیاكان منیان هەڵدایە دەستی زبری دۆڵ و شیوەكان. ئیتر دەستی شیوەكان بە من زللەیان لە دەموچاوی بیابانەكان وەشاند، ئنجا پەرۆشیی ئیسلامی و غیرەتی نەتەوەیی ئەم دوو بەروبوومەیان بە كرچ و كاڵی و

(١) واتە: كتێبی (موحاكەمات). (وەرگێڕ)

(٢) واتە: كتێبی (مونازەرات). (وەرگێڕ)

بەرسیلەیی لەسەر لوتکەی شاخەکان لێ کردەوە، یان لەوانەی کە بەناو شیوەکاندا پەرش و بڵاو بوون، پاشان بۆ دەرمان هەردووکیان ناردن بۆ بازاڕی شاری شارستانێتی. تەنانەت هەندێ لەو بەروبوومانە چیای "باشید" بەرهەمیان هێنا و، هەندێکیشیان میوەی دەشتی "فەراشین"ن و، بەشێکیشیان لە دۆڵی "بیت الشباب" سوور هەڵگەڕان..

ئیتر بزانن کە کاتێ من ئەم دوو کتێبەم دانا:

کات کورت و، شوێن چۆڵ و سامناك و، زەین ئاڵۆز و، ئەم هەژارە گەشتیار و، جەستەش نیوە نەخۆش و، نووسینیشیان بە پەلە بوو.. کەواتە بەناچاری هەر دەبێ بەم جۆرە ئاڵۆز دەربچن!

لەگەڵ ئەوەشـدا، وەرگێڕانی "رجتة الاکراد" بۆ زمانی عەرەبی لە دیمەشقدا، کە شاری کانزای حەقیقەتی دامەزراوە، بە ماوەی پێنج ڕۆژ ئەنجام درا.

دەسا ئەی کەسانی بەویژدان!

ئەمە پۆزشی منە کە بۆم هێنانەوە. جا ئەگەر ئێوەی بەڕێز وەری بگرن، ئەوا فەرمانی ویژدان جێبەجێ دەکەن. بەڵام گەر بە چاوی ڕازی بوون بۆی نەڕوانن، ئەوا دوور بکەونەوە لێم و منیش گوێ نادەمە ڕەتکردنەوەی ئێوە. دەبا منەتتان لەسەر دەرگا و بانی خۆتان بێت. من بۆ ئەوە کتێبەکەم دانەناوە کە لە بەرچاوتاندا بیرازێنمەوە و مەراییتان بکەم، بەڵکو تەنها لەبەر خزمەتکردنی "حەق" دامناوە. جا ئەگەر حەقیقەت پێشوازیی لێ کرد، ئەوا زۆر باشە و جێی دڵخۆشی‌یە.

پاشان ئەم نامیلکە عەرەبی‌یەم لە تورکی‌یەوە وەرگێڕاوە، کە ئەویشم لە کوردی‌یەوە وەرگێڕاوە، کە ئەویش وەڵامی زارەکی و سەرپێیم بوو بۆ پرسیاری کوردە دەشتەکی‌یەکان. کەواتە وەرگێڕراو، لە وەرگێڕراو، لە گوتارێکی زارەکی و سەرپێیی نەخوێندەوارێك (مەبەستی خۆیەتی) کە ئاراستەی خەڵکانێکی گوندنشین کرابێت، هەرگیز لە زبریی واتا و وشە ڕزگاری نابێت.

بەڵێ، "لیس الکحل کالتکحل". دەبا کەسی گوێ بیست گیانی خۆی بە ڕێبواری بنێرێتە جەستەی مرۆڤێکی دەشتەکی، هەتا بە ئەندێشەی ئەو دەشتەکی‌یە لەم گوفتارە تێبگات. کەواتە کەسێك نەبێتە کورد و، چۆڵ نشین نەبێت، گوێ لێگرتنی ئەمەی پێ حەڵاڵ نی‌یە و، تامی ئەو بیستنەشی لە لا شیرین نابێت.

باوکی هیچ:

**سەعید**

دەقی پەیامی:

# مونازەرات

بسم الله الرحمن الرحيم

وبه نستعين

والصلاة والسلام على سيّد العالَم.

بزانن کە: کاتێ دووهەم ساڵی "مەشرووتییەت" گەشتەکەم دەستی پێکرد و، لەو سەردەمەوە کە ئەستەمبووڵ نوێنەرایەتیی دەکات بەرەو دوا گەڕامەوە و، بەرەو چەرخەکانی ناوەڕاست شۆڕ بوومەوە و، بەناو هۆزە کوردەکاندا گەڕام و، "هاوینە گەشتەکەم" لە باخی بەهارەوە بەرەو پایز دەستی پێکرد، ئنجا لەویشەوە کەوتمە ڕێ بۆ "گەشتی زستان" لە وڵاتە عەرەبییەکاندا.. لەم کاتەدا، چیا و دەشتەکانم کردە قوتابخانەیەك وانەی "مەشرووتییەت"م تێدا پێ وتنەوە.

هەر ئەو کاتە لە دوودڵی و گومانەکانیانەوە بۆم دەرکەوت کە بە شێوەیەکی نامۆ لە "مەشرووتییەت" تێگەیشتوون، هەروەك زانیم زۆربەی گومانەکان و پرسیارەکانیان هی یەك دۆڵ و شیون. ئیتر بە مەستی دەستنیشان کردنی ئەو نەخۆشییە، کلیلی گوفتارم دایە دەستی خۆیان و، وتم:

"پرسیار بکەن" تاکو وەڵامەکەم نەخۆشییەکەتان چارەسەر بکات.

ئەوانیش ئەم شێوازەیان پەسەند کرد، چونکە سروشتیان وایە کە لە ڕێی وتووێژ و گفتوگۆکردنەوە وانەکانیان وردەگرن.

جا بەو نیازەی کە سوودەکەی گشتی بێت، پرسیارەکانی ئەوانم لەگەڵ وەڵامەکانی خۆمدا نووسی، تاکو پشتی ئەو وەڵامانە بگرن و، نووسراوەکەم لە بریی من بدوێت و، ڕووی گوفتاری لە کوردەکان و هاوشێوەیان بێت کە نەمبینیون، هەروەها بۆ ئەوەش کە بە زمانی پرسیارەکان مەبەستی ئەو کەسانە دەربڕێت کە زمانیان توانای دەربڕینی ناخی خۆیانی نییە.

واتە ئەم کتێبە لە بری من وەڵام دەداتەوە و لە بریی ئەوان پرسیار دەکات. هەروەك پارمەتیی پزیشکانی سیاسەتیش دەدات بۆ دیاری کردنی نەخۆشییەکە.

دەسا ئەی کەسانی بە پەرۆش و خاوەن غیرەت!

ئاگادارتان دەکەمەوە کە وەك بیر و هزر کوردەکان و هاوشێوەکانیان بوون و دەشبن بە "مەشرووتییەت خواز". بەڵام هەندێ لە کارمەندان بە "کرداریان" شوورا بەرجەستە ناکەن. کە ئەمەش گرفتی لەوە زیاترە، لە کاتێکدا کە مامۆستای ئەو عەوامانەی ژێرییان لە چاویاندایە بریتیە لە "کردار"!

* * *

وا من دەست بە پرسیار و وەڵامەکان دەکەم:

پ: مامۆستا! تۆ رۆشتیت بۆ ئەستەمبووڵ و ئاڵوگۆڕێکی مەزنت بینی و خۆت هاویشتە ناو چەندین ڕووداوی گرنگەوە، ئایا چ دیارییەکت لەو بازاڕە گەورەیەوە بۆ هێناوینەتەوە؟

و: مزگێنی!

پ: مزگێنیی چی؟ خۆ دەیانوت وریا بن زیانی تێدایە؟!

و: خوا نەکات. "ڕووناکی" زیان بەرهەم ناهێنێت، مەگەر بۆ کەلاك و شەمشەمەکوێرە.

وا من بە دەنگێکی وا بەرز ڕایدەگەیەنم کە هەموو دنیا بیبیستێت:

سپێدەی ڕاستی بەختەوەریی ئیسلام هەڵهات؛ با ئەبولعەلای مەعەڕڕی لووتی لە خۆڵ بژەنێ. خۆ ئەگەر (لەم پێناوەدا و بۆ ڕاماڵینی ئەو تاریکییە) نیوەی ئەم نەتەوەیە لەگەڵ تاریکیدا بسووتێت هێشتا بە گران دانانرێت!

پ: سبحان الله! ئێمە وامان نەبیستووە!؟

و: بەڵێ: شەیتانەکان یاریدەدەریان هەیە؛ ئەوان لە پێش ئێمەوە گەیشتوونەتە لاتان!

پ: مادەم وایە، وەڵامی گومان و پرسیارەکانمان بدەرەوە، تاکو دوودڵییەکانمان نەمێنێت.

و: "شارەزاتان دیوەتەوە".. بەڵام منماڵی خۆم تەنها بە کەسێك دەفرۆشم کڕیار و نرخشناسی بێت!

پ: ئیستیبداد چییە و مەشرووتییەت چییە؟

یەکێکی تر: گەڕانە دواوە و میشوەریت[١] چییە؟

کەسێکی تر: چۆن چۆنی ئەرمەنەکان بوونە سەرکردە و ئێمەش کەوتینە لای خوارەوە؟ چۆن ناموسڵمان دەچێتە سەربازییەوە؟

---

(١) پێدەچێ وشەی سەر زاری نەخوێنەوارێکی عەرەبی نەزان بێت، دانەر وەك زاری کەسەکە خۆی گوزارشتی لێ کردبێت. (وەرگێڕ)

یەکێکی تر: سەربەستی چی‌یە؟
یەکێکی تر: ئایا زیانی بۆ ئایین هەیە؟
کەسێکی تر: "جۆن تورك" ئاوا و ئاوان، دەترسین زیانمان پێ بگەیەنن.
یەکێکی تر و، یەکێکی تر.. هتد..
(پرسیارەکانیان تا بڵێیت زۆر و تێکەڵ و پێکەڵ و بە غەڵبەغەڵب و پڕ لە هەڵە بوون)!

* * *

و: چۆن چۆنی وەڵامی ئەم هەموو پرسیارە تێهەڵکێش و ئاڵۆزکاوانە بدەمەوە کە ناڕێکوپێکیتان دەردەبڕێت؟!
پ: دە فەرموو تۆ خۆت دەستوورێك دابنێ.
و: یاسای مەشرووتییەت پیادە بکەن.. واتە یەکدوانێکتان هەڵبژێرن کە لە بریی ئێوە پرسیار بکات و، ئێوەش گوێ ڕابگرن.

* * *

پ: کەواتە "ئیستیبداد" چی‌یە و "مەشرووتییەت" چی‌یە؟
و: ئیستیبداد خۆسەپاندنە.. واتە مامەڵەی ئارەزووکارانەیە.. واتە "زەبر"ی پشت بەستووە بە "هێز".. واتە ڕای تاکڕەوانەیە.. واتە ڕێخۆشکەرە بۆ خراپە ڕەفتار کردن.. واتە ئەوەیە کە دەرگاکانی لەسەر پشتن بۆ خۆتێهەڵکێشانی خراپکاری‌یەکان..
ئەوەش لە ڕاستیدا بناغەی ستەم و لەناوبەری مرۆڤێتی‌یە.. هەر ئەوە کە مرۆڤی ڕێزلێگیراوی بەرەو نزمترینی نزمی‌یەکان تلۆر کردەوە.. ئەوەیە کە جیهانی ئیسلامی خستە ژیانی زەلیلی‌یەوە.. هەر ئەوە کە ئامانجە بەدە کەسی‌یەکان و ڕقەبەرایەتی‌یەکانی بێدار کردەوە.. هەر ئەوە کە ژیانی موسڵمانانی ژەهراوی کردووە و ژەهرەکەشی بەناو دەمارەکانی جیهانی ئیسلامیدا بڵاو بووەتەوە.. هەر ئەویشە کە جیاوازی‌یە سەرسووڕهێنەرەکانی خستە ناوەندەکانەوە..
تەنانەت ئەو ئیستیبدادە زانستی‌یەی کە جگەرگۆشەی ئیستیبدادی سیاسی و باوکی چاولێکەری‌یە، هەریەك لە تاقمەکانی (جەبرییە و مورجیئە و موعتەزیلە و ڕافیزە) و، دەستە و پێڕە گومڕاکانی هاوشێوەی ئەوانی بەرهەم هێنا.
پ: زۆر سەیرە! پێشتر نەماندەزانی کە ئیستیبداد ژەهرێکی کوشندەی وەهایە. سوپاس بۆ خوای گەورە کە لەتوپەت بوو. کەواتە ئێستا پێویستمان بە ڕوونکردنەوەی دەرمانەکەیەتی کە مەشرووتییەتە.

و: ئەو مەشرووتییەتەتان بۆ ڕاڤە ناکەم کە هەندێ لە کارمەندان فێریان کردوون، چونکە ئەوە لەبەر پێڕانەهاتن و نەشارەزایی تیایدا هەندێ هەڵەی لە دوو توێدایە.. ئەوەشتان بۆ شی ناکەمەوە کە لە حاڵی حازرەوە خۆتان لێی تێگەیشتوون، چونکە ئەوەش لەبەر تیژپەڕی و هەڵپەی زۆرەوە شێوێنراوە.

بەڵکو ڕووی ئەو مەشرووتییەتەتان بۆ دەردەخەم کە ئامانجی حکوومەتە. مەشرووتییەت دەرخەر و ڕاڤەکاری ئەم دوو ئایەتەیە:

﴿وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ﴾ (آل عمران: ١٥٩)..

﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ﴾ (الشورى: ٣٨)..

کەواتە مەشرووتییەت "شووراى شەرعی"یە. هێزی ئەو بوونە ڕووناکەش بریتییە لە "حەق" و.. ژیانەکەی "دادگەری"یە و.. دڵیشی بریتییە لە "زانین" و.. زمانەکەی "خۆشەویستی"یە و.. ژیرییەکەشی بریتییە لە "یاسا" نەك هیچ کەسێك!

بەڵێ، شوورا بریتییە لە حوکمڕانیی میللەت. ئێوەش بە هەمان جۆر بوونەتە میللەتێکی حوکمڕان!

هەر شوورایە کە هۆکاری بەختەوەریی نەتەوەکانە، وا بەم جۆرە دەرگای بەختەوەریتان لە ڕوودا کرایەوە!

هەروەها شوورا بێدارکەرەوەی هەستە بەرزەکان و شەوقە گڕگرتووەکانە. کەواتە ئێوەش وریابن. ئای چەندە خەوتان درێژخایەنە!

هەروەها شوورا مرۆڤایەتی لە ئاژەڵێتی ڕزگار دەکات. کەواتە ئێوەش ببنە مرۆڤ..

هەر شوورایە کە بەختی جیهانی ئیسلامی دەکاتەوە و چارەنووسی ئاسیا دەردەخات. کەواتە مژدە بێت شوورا ئاوی ژیانە و، هەتا میللەت بمێنێت تەمەنێکی هەتاهەتاییش بە دەوڵەت دەدات. لەبەر ئەوە نائومێد مەبن..

هەروەها تەنها شوورایە کە ئەو تاکڕا ئیستیبدادییەی تەنها بە هەڵکردنی بای هەوا و هەوەس ئامادەیە بە وێنەی تاڵە موویەکی باریك لەرزەی پێ بکەوێت، دەگۆڕێت بەو هزر و بیرە گشتییەی کە بە وێنەی ستوونە ئاسنینەکان لەرزەی پێ ناکەوێت و، بە وێنەی شمشێری ئەڵماسیش وایە کول نابێت. کەواتە ئێوەش وەکو کەسێك چووبێتە ناو کەشتییەکەی نووح پشتی پێ ببەستن..

هەروەها شوورا هەموو تاکە کەسێك لە جیهانەکەی خۆیدا وەکو پادشایەکی سەربەست لێ دەکات. دەسا ئێوەش بە خۆشویستنی مەشرووتییەت و ڕەفتار پێکردنی ببنە پادشای خۆتان..

هەر شوورایە کە هەوێن و بناغەی مرۆڤایەتی (کە جوزئی ئیختیاری‌یە) ئازاد دەکات. دە ئێوەش ڕازی مەبن بەوەی کە وشك و بێ گیان بن!

هەر شوورایە کە "سێ سەد ملیۆن" موسڵمان وەکو خێڵێکی هاوپەیوەندی لێ دەکات. دەسا ئێوەش ئەو پەیوەندی‌یە بپارێزن، چونکە مەشرووتییەت پەردەی لاداوە، ئیتر "نەتەوایەتی" کەوتە جووڵە و هەناسەی ئاسوودەی هەڵکێشا و، "ئیسلامەتی"ش لەرییەوە و درەوشایەوە.

بەڵێ، نەتەوایەتیمان لە دووانەی "حەقیقی" و "نیسبی" پێکهاتووە. دەسا بزانە چەندە توندوتۆڵە!

پ: ئەمە دەعوایەکە دەیڵێیت، بەڵگەی لەسەر بهێنەرەوە. بەڵگە لەسەر ناشیرینیی ئیستیبداد تا ئەم پلە نزمە و جوانیی مەشرووتییەتیش هەتا ئەو ڕادە بەرزە چی‌یە؟

و: لەبەر ئەوەی ئێوە "عەوام"ن و، بە ئەندێشەتان بیردەکەنەوە و، ژیریتان لە چاوتاندایە، ئەوا نموونەهێنانەوە خۆشترە بەلاتانەوە هەتا بەڵگەی نەزەری. وا نموونەیەکتان بۆ دەهێنمەوە کە ناوەرۆکی هەریەك لە "ئیستیبداد" و "شوورا"تان بۆ ڕوون بکاتەوە:

بزانن کە حکوومەت وەکو پزیشك وایە و میللەتیش نەخۆشە. وا دابنێن کە من پزیشکێکم لەم خێمەیەدا دانیشتووم. لەم ناوچانەش – خوا نەکات – چەندین نەخۆشی هەن، کە هی هەر گوندە جۆرە نەخۆشی‌یەکە. منیش نەخۆشی‌یەکانم دیاری نەکردووە و کەسم نەبینیوە جگە لە خەڵکانێکی خۆبەرەوە پێشەوە کە نایانەوێت دەستەوسان بم.. ئەگەر من لەم حاڵەدا و بێ هیچ پێودانێکی زانستی، ڕەچەتە و چارەسەرێکم نارد بۆ نەخۆشێك کە هەر نەمدیوە و بۆ نەخۆشی‌یەك کە دەستنیشانم نەکردووە، ئایا نەخۆشەکە چاك دەبێتەوە؟ یان مردن دەبێتە میوانی؟!

بەڵێ، بەم چارەسەرە بوو کە نهێنیی (موتوا قبل أن تموتوا) لە ئێوەدا هاتەدی!

بەڵێ، ئەگەر کوردستان بەهۆی دەردی برسێتی بەدەست سك ئێشەوە ناڵاندی، ئنجا پزیشك چارەسەری هەرسکردنی خواردنی بۆ نارد.. یان ئەگەر کوردەکان بە دەردی دوژمنایەتی و بەدبەختی نەخۆش کەوتن و جەستەیان دووچاری هەوکردن بوو، کەچی پزیشك بە دەرمانێك چارەسەری کردن کە هەوکردنەکە زیاد بکات، وەك ناردنی "سەربازانی ئالائی" کە پتر هێز بە ئیستیبدادە پەرتەوازەکان دەبەخشێت.. هەروەها کارەکانی تری هاوشێوەیان.. ئایا ئەمانە چارەسەرن؟ یان ژەهراوی کردن و یارمەتیدانی مەلائیکەتی گیان کێشانن؟!

ئەمە نموونەیەکی تاریکی ئیستیبدادە. چونکە پادشا لە سەردەمی پێشوودا وەکو بەندکراوێك وابوو لەناو خانووەکەیدا و، ئاگای لە حاڵی میللەت نەبوو.. یان

بەهۆی لاوازیی دڵ و هێزی وەهمەکانی حەزی نەدەکرد بزانێت.. یاخود بەهۆی هەوەس و دڵەڕاوکێی خۆیەوە هۆکارێکی یارمەتیدەر نەبوو بۆ زانینی شتەکان.

ئیتر ئەم ئیستیبدادە سیاسی‌یە بکە بە نموونەیەك بۆ ئیستیبدادەکانی تر!

تەنانەت ئەو ئیستیبدادە زانستی‌یەی کە بەرهەمهێنی لاسایی کردنەوەیە و، ئەویش بەرهەمهێنی جیاجیایی ئامانجەکانە، هەر لەم ڕشتەیەدا هۆنراوەتەوە!

بەڵام نموونەی نوورانی‌یەتی ئەو مەشرووتییەتەی کە حکوومەتی ئیسلام ڕووی تێکردووە و دەشبێت ڕووی تێبکات.. ئەوا فەرموون وا دابنێن کە من پزیشکم و ئەم ڕەشماڵەش کە تیایدا دانیشتووم دەرمانخانەیەکە و، لە هەر گوندێکیش کە نەخۆشەکانی تێدایە کەسێکی هەڵبژێردراو دێت بۆ لام کە نەخۆشەکانی ئەوێی دیوە و بە ڕەچەتەیەك دەردە جۆراوجۆرەکانی دەستنیشان کردووە..

بۆ نموونە: لاپەڕەی هەندێکیان ئەو نەخۆشی‌یە دەردەخات کە:

"ئێمە بە دەردی نەزانی دووچاری سەرێشە بووین".

منیش یەکەم جار لەناو دەفری زمانیان و دواجاریش لە ڕێڕەوی ڕەسمیی زمانیاندا دەرمانی زانستە شارستانی‌یەکان ڕۆ دەکەم..

نووسراوی یەکێکی تریان بەوە دەدوێت کە:

"دڵی بە نەخۆشیی لاوازیی ئایین نەخۆش کەوتووە".

منیش هونەرە تازەکان لەگەڵ زانستە ئیسلامی‌یەکاندا تێکەڵ دەکەم و هەویرێکیان لێ پێکدەهێنم، ئنجا دەیدەمە دەستی وانەبێژە زاناکان و دەیاننێرم بۆ لایان..

لە نامەیەکی تردا ئەم سکاڵایە هەیە کە:

"ئێمە بە دەردی دوژمنایەتی و دووبەرەکی تامان لێ هاتووە".

منیش هزری نەتەوایەتییان تێدا بێدار دەکەمەوە، هاوکات "ڕووناکی" ئاراستەی ئەو هزرە دەکەم و، دەرمانی "خۆشەویستی و دادگەری و سۆزی هاوڕەگەزی"شی لەگەڵدا تێهەڵکێش دەکەم و چارەی ئەو غیرەتمەندی‌یەیان دەدەمێ.

ئەی پرسیارکەری بەڕێز!

ئەمەیە ئەو پزیشکەی کە مناڵانی هەژار و هەتیو لە خەستەخانەی نیشتماندا لە تیاچوون ڕزگار دەکات. جا بە پێی حیکمەتی: "كُلُّكُمْ راعٍ وكُلُّكم مَسؤولٌ عَن رعيَّتِهِ" دەبێ ئەم یاسایە لە پێش چاوی هەموو سەرۆکێکدا هەبێت.

پ: دەرمان هەر دەرمانە.. ئەدی بۆچی وتت: دەگۆڕێت بە "ژەهر"؟

و: دەرمانی دەردێك، لەوانەیە سەبارەت بە دەردێکی تر ببێت بە نەخۆشی.. بە زیادبوونیشی لە سنووری خۆی لەوانەیە بگۆڕێت بە "ژەهر".

پ: تۆ مرۆڤی ئاوساوت بە قەڵەو زانیوە! ئایا نابینیت کە ئەم حکوومەتەی ئێستا، لە ستەم و لاوازی و زۆرێك لە خراپەکانیدا، لەوەی پێشوو دەچێت؟ خۆ ئەو مەشرووتییەتەی کە تۆ ڕاڤەی دەکەیت هێشتا سڵاوی لێ نەکردووین هەتا پێی بڵێین: بەخێر بێیت سەرچاو؟!

و: نەخێر.. من خوازیاری نۆشکردنی کوپە ئاوێکی سازگارم و، بە ئەسپێکی تیژڕەویش غارغارێن دەکەم و، مەدحی ئازادی‌یەکیشم کردووە کە لە خۆیدا حۆری‌یەکی ئازادە، بەڵام چونکە لە شێتیی ئێوە دەترسا نەهات بۆلاتان! کەواتە ستەمەکە هەڵەی "شوورا" نی‌یە، بەڵکو ستەمەکە لە تاریکیی ئەو نەزانی‌یەدایە کە لەناو سەری ئێوەدایە، چونکە لە حوکم و دەسەڵاتی میللەت تێنەگیشتوون. کەواتە ئەو نەزانی‌یەتان کەسانی خاوەن غیرەت دەکاتە خۆسەپێن و، بەو نەزانی‌یەش ڕێگا کورتەکە لەخۆتان درێژ دەکەنەوە.

بۆ نموونە:

ئەگەر پێت بڵێین: "گوێچکەتم پیشان بدە"، دەستت لە پشتی ملتەوە بۆلای گوێچکەت دەسووڕێنیت!

زۆر سەیرە! ئەگەر هۆزەکانی: "گەودان و مامەخۆران و هاجان" باجەکانی دەوڵەتیان پێش هاتنی سەربازەکان ئامادە بکردایە، کە ناچارن بیدەن، ئایا ستەم و دەستدرێژیی لەو جۆرە ڕووی دەدا؟ دیارە نەخێر.

هەروەها ئێوە دەڵێین: ئەم حکوومەتە وەك ئەوەی پێشوو لاوازە..

بەڵێ، منداڵێکی نۆ ساڵە و پیرێکی تەمەن نەوەد ساڵ لە ڕووی لاوازی و بێ هێزییەوە لەیەك دەچن، بەڵام ئەمیان بە شۆڕبوونەوەیەکی کەوانەیی بەرەو گۆڕ دەڕوات و، ئەوی دیکەشیان بەرەو لاوی گەشە دەکات و بەرز دەبێتەوە.

پ: بۆچی بە تەواوی حکوومەت دانەمەزرا و سیاسەتیش پاڵفتە نەبوو. ئەوەتا حکوومەت لەرزۆك و لارە و، سیاسەتیش لێڵە؟

و: قەڵایەك بەرەو ڕووخان لار بووبێتەوە و سەدان ساڵ بێت لێی هەڵبووەرێت، چۆن دەکرێ بە تەنها یەك هەڵمەت نۆژەن بکرێتەوە؟ جوان سەرنج بدەن کە ئەگەر سەرچاوەی ئاوێك گەلێ شتی پیس و ژەهراوی و گەنیوی لە دێر زەمانەوە تێکەوتبێت و، هەوڵ بدرێت پاڵفتە بکرێت و، سەرچاوەی "ئاو لێهاتوو" بکرێت بە حەوزێکی "ئاو بۆ هاتوو" ئایا هەتا ماوەیەك ئاوەکەی هەر بە لێڵی و بە ڕەنگ و بۆن و تامی گۆڕاو لەبەر ناڕوات؟!

کەواتە بە "نائومێدی" خۆتان لێڵ مەکەن. دوا ئەنجام بۆ ئەو ساف و بێگەردی‌یە دەبێت کە خەمەکەتان دەشواتەوە. ئیتر بە زوڵاڵ و سازگاری نۆشی دەکەن.

پ: زۆرمان لەو لایەنە جوان و خزمەتگوزارانەی مەشرووتییەت بەر گوێ کەوت کە تۆ پێناسەیان دەکەیت، ئەی بۆچی خۆیشی لەگەڵ ئەو خزمەتگوزارانەیدا نەهات؟

و: یەك لە دەیتان بۆ هاتووە. چونکە مەشرووتییەتی نەرم و ناسك و شارستانی هیچ کات پرکێشیی ئەوە ناکات کە سەلامەتیی مێر بخاتە بەر مەترسیی دوژمنایەتی و، گورگی ڕکەبەری و، ماری نەزانی و، ورچی سامناکی و، بەناو شیوە قووڵەکانی ئێوەدا تێبپەڕێت کە دوژمنایەتیی لێ دەڕوێت و، بڕواتە سەر چیاکانتان کە لەوەڕگەی نەزانی و سامناکی‌یە، ئنجا بگاتە لاتان و بێت بۆ سەردانتان.

کەواتە ئێوە بە لەناوبردنی ئەو مێرووانە سەلامەتیی ڕێی بۆ دەستەبەر بکەن. خۆ ئەگەر سستی بنوێنن و ڕێیەکی بێ وەی و ئەمینی بۆ ساز نەکەن، ئەوا مەگەر دوای چەند ساڵێکی زۆر دەنا چاوتان بە ڕوخساری جوانی ئەو ناکەوێت. چونکە هەرچەندە ماوەی نێوان‌ئێوە و ئەستەمبووڵ مانگە ڕێیەکە؛ بەڵام ماوەی نێوانتان لەگەڵ مەشرووتییەتدا هەزار مانگە! لەبەر ئەوەی ئێوە لە خەڵکی سەردەمی ئادەم دەچن کاتێ دەهاتنە وجوود، گەر ڕادەوەستان دەکەوتنە ژێر پێی ڕێبوارانەوە.

هەروەها ئەگەر شووڕای نەرم و نیان و خۆش گوزەران بۆ خۆیشی لە هەژدیهاکانی دەوروبەری ئەستەمبووڵ ڕزگاری ببێت و، بەسەر ئەم ماوە دوور و درێژەدا تێپەڕ ببێت، ئەوا دەبێ ئەو زەوی‌یە ببڕێت کە بە هەڵمژینی نەزانی بووەتە زەوی‌یەکی ناتەندروست و بۆگەن و، بەناو قوڕولیتەی خنکێنەر و لمی ترسناکی هەژاریدا گوزەر بکات و، بەسەر ئەو چیا بەرداوییانەدا بڕوات کە بەردەکانیان بە "دوژمنایەتی" نووکیان تیژ بووە! لەگەڵ ئەوەشدا ڕێی لە هەندێ چەتە و تاڵانچی دەکەوێت لەوانەی کە هەندێکیان ئەو سزایە هەرس ناکات کە شایانیەتی و، هەندێکی تریشیان بە خواردنی گۆشتی غەیرە خۆی قەڵەو دەکات و بە فیزکردنەوە لەخۆی بایی دەبێت. هی وەهاشیان تێدایە کە بە وێنەی ئەو بەگتاشی‌یە بەناوبانگە لە ڕاستی‌یەکانی ئیسلام تێدەگات کە بیانووی وازهێنانی لە نوێژ بەو ئایەتە دەهێنێتەوە کە دەفەرموێ: ﴿لا تقرَبُوا الصَّلاةَ﴾.. هەندێکی تریشیان دەیەوێت بە بیانووی نەبوونی مەرکەزییەتی سیاسەت ئەو ڕاستییانە لەتوپەت بکات.

جا ئەگەر ئەمە ئاوا بێت، ئەوا ئەی خەڵکانی غیرەتمەند! ڕێگایەکی وەکو هێڵی ئاسن بۆ هەڵگری بەختەوەریتان لێبدەن، یان بە کەرەستەی زانستەکان فڕۆکەیەك لە ئاسمانی سیاسەتدا بەدەست بهێنن؟

پ: زۆریی ڕێگرەکان دەمانخاتە نائومێدی‌یەوە؟

و: "نائومێدی" لە دەستەوسانی‌یەوە پەیدا دەبێت، هەروەك ڕێگرە لە هەموو کەماڵێك. "غیرەت"یش بریتی‌یە لە گورجوگۆڵ بوونەوەی "توندوتۆڵی" لە دەمی

توندوتیژیی ڕێگرەکاندا. لەکاتێکدا کە ئەم ڕۆژگارە ڕێگرە ئاساییەکان دادەبەزێنێتە پلەی "ئیمکان". ڕێگرەکانیش بەو نیازە خراونەتە ڕوو کە غیرەت و پەرۆشیتان بجزوێنێت و لە تەمبەڵی ڕزگارتان بکات. نەیزانیبوو غیرەتی ئێوە بەم جۆرە لاوازە و خێرا دەگۆڕێت بە نائومێدییەکی نابینا و کوێرکراوە.

جا ئەگەر دەتانەوێت لە کاتێکی نزیکدا "شوورا" سڵاوتان لێ بکات، دەبێ بە کانزای زانیاری و ئاکارە بەرزەکانەوە وابەستە بن و هێڵێکی ئاسنینی لێ دروست بکەن، تاکو "مەشرووتییەت" سەربکەوێتە سەری و بە سواری شەمەندەفەری کەمالات کە پێی دەوترێت "شارستانێتی" بێت و تۆوی "پێشکەوتنەکان"یش لەگەڵ خۆیدا بهێنێت بۆتان و، لە نزیکترین کاتدا سڵاوتان لێ بکات. واتە هەتا ئێوە زووتر ڕێگاکەی بۆ ئامادە بکەن، ئەویش خێراتر دەگاتە لاتان!

پ: بە پشتیوانیی خوا ئەگەر بەختمان هەبێت بە هەڵهاتنی ئەو خۆرە شەرەفمەند دەبین. بەڵام ئایا "تەوەککول" سەروزیاد نییە بۆ ئەوە؟

و: بەڵێ، بەڵام دەبێ یارمەتیی بەختە هەژارەکەتان بدەن و، بە وێنەی گیرفان بڕ و تەمەڵەکانی بەغدا نەبن، چونکە ئەگەر مەبەست لە "تەوەککول" ڕەتکردنەوەی ڕێسای هۆکارەکان بێت ئەوا لە ڕاستیدا دەبێتە ڕەتکردنەوەی ئەو ویستە خواییەی کە ڕێکخەری ئەو ڕێسا و سیستەمەیە. ئەو کاتەش تەوەککولەکەتان خۆی هەڵدەوەشێنێتەوە.

پ: چاکە و خراپەش دەبینین. ئایا کامیان لە سەرچاوەی شوورای ڕووناکی بەخشەوە هەڵقوڵاوە و، کامیشیان لە کەلاکی ئیستیبدادەوە پەیدا بووە؟

و: چاکەکارییەکان هەندێکن لە ڕووناکیی مەشرووتییەت. سەبارەت بە خراپکارییەکانیش ئەوا یان لە تاریکیی ئیستیبدادی پێشوو پەیدا بوون، یان لە ستەمی ئەو ئیستیبدادەی کە ناوی مەشرووتییەتی لە خۆی ناوە و، لەو دواکەوتووە تاکو خواحافیزی و سەرەخۆشیی لێ بکرێت، پاشان دوا بە دوای ئیستیبداد ئەویش بەرەو نەمان دەڕوات.

کەواتە دڵنیا بن کە دواڕۆژ بۆ زاڵبوونی ڕووناکی دەبێت، هەرچەندەش ماوەیەکی پێ بچێت.

پ: زۆر بە گەورە "مەشرووتییەت" دەبینیت و لە پیاهەڵدانیدا زیادەڕەوی دەکەیت. خۆ لە ڕاستیدا لەوە بەدەر نییە کە جاران تەنها یەك ڕا دەسەپێنرا و میللەتیش بێدەنگ دەبوو، بەڵام ئێستا شوورا هەیە و میللەتیش دەپرسێت و پرسینەوەشی لێ دەکرێت. لەوە زیاتر نییە. کەواتە ئیتر ئەو شتە زیادانە چین کە هەڵیاندەواسیت پیایدا؟

و: هەردوو خاڵی "شوورا" و "پرسینەوە" سەرجەم زیادکراوەکانی من لەخۆ دەگرن. چونکە لەبەر ئەوەی "شوورا" لە حکوومەتدا دەرکەوت، ئەوا بە بیری ئازادی جۆرە شوورایەکی خستە ناو هەموو جۆرە دەستە و کۆمەڵێکەوە، تەنانەت ناو زانایان و قوتابخانەکان و قوتابیانی زانستیش و.. هتد. بەڵێ، ڕاستەوڕاست ئاگادار کرانەوە کە لە ڕێبازەکانیاندا پێویستیان بە "شوورا" هەیە.

ڕاستە ئەم بریسکانەوانە لە دوورەوە ئاماژە بۆ ئەو خۆری بەختەوەری‌یە دەکەن کە "مەشرووتییەتی سیاسی"ی لەلا خۆشەویست کردم.

من پێم وایە ئەو شتەی کە بناغەی "چاولێکەری"ی دامەزراندووە.. کە ئەویش بەرهەمهێنی جیاوازیی ئامانجەکانە.. کە ئەویش هۆکاری پەیدابوونی دەستە و کۆمەڵە گومڕاکانن لەناو موسڵماناندا چەشنی "جەبرییە و، مورجیئە و، موجەسسیمە" و هاوشێوەیان، تەنها بریتی‌یە لە ئیستیبدادی زانستی لە بابەتە ئاینی‌یەکاندا و، ڕەهاکردنی ئەو شتانەیە کە بەستێنراون.

جا ئەگەر "شوورای زانستی" بە شێوەیەکی ڕاست و دروست و بە حەقی خۆی دابمەزرێت، هاوکات لەگەڵ پشتگیریی مەیلی سۆراخکردنی حەقیقەت و، هاوکاریی زانستە ڕاستەکان و، میانە خۆشکردن لەگەڵ ویژداندا، ئەوا بێ هیچ گومانێک ئەو دەستە و پێڕە ناوبراوانە دێنە ڕیزەوە و لەگەڵ ئەهلی سوننەت و جەماعەتدا یەکدەگرن.

پێتان وا نەبێت کە ئەو پێڕانە ئێستا دەستە و کۆمەڵی خۆیان نەبێت، نەخێر. بەڵکو لەناوماندا پەرش و بڵاو بوونەتەوە. جگە لەوەش، کەسێک نی‌یە کە مەیلێکی بەلای ئەو شتانەدا نەبێت کە مەیلی ئەوانی بەلادا ڕۆشتووە! خۆ ئەگەر مێشکی یەکێکیان هەڵبووەشێت و واتاکانیش بەرجەستە ببن، ئەوا ئەو دەستە و پێڕانە لە مەیلەکانیاندا و لە کۆڕی ناو مێشکیاندا بەرجەستە دەبن! ئەمەش چیرۆکێکە لێرەدا جێی نابێتەوە!

پ: حیکمەت لە رووخانی زۆرێک لە سەردار و سەرۆکەکانمان چی‌یە؟ هەرچەندەش هەندێکیان شایستەی بوون و، هەر تەنها ناوی "شوورا"یان بیستبوو، بە بێ هیچ کاریگەرییەکی ماددی؟

و: هەموو زەمانێك حوکمێکی تایبەتی و هەر وەختەش حوکمدارێکی تایبەت بە خۆی هەیە، یان بە زاراوەی ئێوە ئاغایەکی خۆی هەیە کە مەکینەی کۆمەڵگا هەڵدەسووڕێنێت.

ئەوەش بزانن کە کاربەدەستی مەعنەوی لە ئیستیبدادا تەنها هەر "هێز"ە، کەواتە کێ شمشێرەکەی تیژ و دڵی ڕەق بێت لە ئیستیبدادا پێش دەکەوێت.

بەڵام کاربەدەست و زەمبەلەك و گیان و هێز و ئاغا لە "مەشرووتییەت"دا بریتییە لە: حەق و، ژیری و، زانین و، یاسا و، هزرە گشتییەکان (مەبەستم ڕای گشتییە)..

جا هەر کەسێك ژیریی تیژ و دڵیشی گەرم و ڕووناك بێت پێش دەکەوێت!

دەسا ئەی کوردەکان!

ئەگەر گەورەکەتان پاڵی بە "هێز"ەوە دابێت و، تەنها بایەخی بە دەمەزەردکردنی شمشێرەکەی خۆی دابێت و، هەست و نەستەکانیشی بیروڕاکانی ئەویان بە دوای خۆیاندا هێنابێت، ئەوا بێ گومان بەردەبێتەوە و دەکەوێت. شایانی ئەوەشە.

بەڵام ئەگەر پاڵی بە ژیرییەوە دابێت و، لە بریی زەبر و زۆر "خۆشەویستی" بەکاربهێنێت و، بیر و هزرەکانیشی هەست و نەستەکانی ئەو بخاتە خزمەتی خۆی، ئەوا نەك هەر بەرنابێتە خوارەوە، بەڵکو بەرەو پێش دەڕوات و سەردەکەوێ.

پ: بۆچی ئاڵوگۆڕە سیاسییەکە جۆرە ئاڵوگۆڕێکی لە هەموو جۆرە شتێکدا تەنانەت لە ڕەوشت و نەریتەکانیشدا هێنایە ناو؟

و: ئیستیبداد بەپێی نهێنیی "الناس علی سلوك ملوکهم" هەنگاو دەنێت و، بەناو موولوولەکانی خوێندا دەڕوات و، دەماری کۆمەڵگاش دەیخواتەوە.

پاشان ئیستیبداد لە چەند شێوەیەکی زۆردا خۆی دەرخستووە و، چەندین ناوی جۆراوجۆریشی لەخۆی ناوە و، گەلێ داوی ڕاوی ناوەتەوە. تەنانەت چەندین پیاوی وەکو من "زانست"ی کردووە بە هۆکاری خۆسەپاندن و، گەلێ کەسی هاوشێوەی ئەو شێخەش بە فێڵی "نەجابەت" خۆیان هەڵدەقورتێنن و، لەو وەهمەدان کە خاترگرتنی ئەوان شتێکی پێویستە لەسەر خەڵك! هەروەك کارێکی گەلێ خراپیان ئەنجام دا کاتێ کە بە ناوی سەخاوەتی نەتەوەیی زەوییەکی بێ پیتی لماوییان ئاودێری کرد!

پ: ئەم قسەیەت ئەوەی لێ وەردەگیرێت کە ئیستیبدادی حکوومەت پارمەتیی لە چەند جۆرێکی دیکەی خۆسەپاندن وەردەگرت بۆ کوشتنمان؟

و: بەڵێ، ئەو شتەی ژیانی ئێمەی ژەهراوی کردووە و بە چەکی نەزانیمان پارچە پارچەی کردووین، ئەم ئیستیبدادە دابەشبووانەن کە چەندین شێوەی نامۆیان لەخۆ گرتووە.

بەڵام ئەسڵی گوناهەکە لە ئەستۆی باوکیاندایە، کە مەبەستم خۆسەپاندنی حکوومەتە، کەواتە بەم پێیە سەر و سەرۆکەکان دوو بەشن.

پ: جیاوازییان چییە؟

و: بە وێنەی جیاوازیی نێوان ئیستیبداد و مەشرووتییەتە. مادەم وایە ناوەرۆکی هەردوو بەشەکەتان بۆ لێکدەدەمەوە، تاکو ناوەرۆکی ئیستیبداد و مەشرووتییەت بەرجەستە ببێت.

پ: چۆن؟

و: ئەگەر گەورەکەتان پشتی بە هێزی ماددی بەستبێت، یان بە خەیاڵکردنی هێزی مەعنەوی یاخود فرتوفێڵ و، خەڵکی وەکو کۆیلە بەکارهێنابێت و، بە ترساندن و زەبر و زۆر تەنگی پێ هەڵچنیبن و، لە پلەی مرۆڤێتییەوە دایبەزاندبنە پلەی ئاژەڵی و، حەزی میللەتی تێکشکاندبێت و، ئاواتەکانی ئەوانی بە با دابێت و، گەر خێرێك دەربکەویت زەوتی بکات و بە هی خۆی پیشانی بدات تاکو پێی بڵێن: مەردێکی لێ هاتووە، بەڵام گەر خراپەیەك ڕووبدات بیخاتە ئەستۆی میللەت..

گەورەی ئاوا بە کەسێکی قەڵەو دانانرێت، بەڵکو ئاوساوێکە بە هۆی بچووکیی شوێنکەتووانیەوە ئیستیبداد بەرجەستە دەکات. چونکە شوێنکەوتووەکانی بۆ بێگاری بە خەڵك و خاترگرتنی ئەو تێدەکۆشن. ئەگەر کارێکی باش بکەن مەرایی دەکەن و، بە درۆ و خۆبردنە پێشەوە و چەورەیی خۆیانی لە لا خۆشەویست دەکەن. ئیتر بەرەو نزمترینی پلەکان تلۆر دەبنەوە، چونکە لەو ڕێیەوە ئەو شەوقە دەکوژێتەوە کە وەکو هەڵم وایە بۆ بەگەڕخستنی مەکینەی کۆششە مرۆییەکان. ئیتر سەر و سەرۆکەکەیان لەبریی ئەوەی بڕواتە ژێر باڵیان تاکو هەڵیان بسێنێت، سواری شانیان دەبێت تاکو تەنها خۆی ببینرێت و، لە گۆشتی ئەوان دەخوات تاکو بئاوسێت و، دەبێتە پەردە و بەربەستێك ڕووناکی پیشانی توانا و لێهاتنەکانی ئەوان نادات کە وەکو گوڵ وایە لە توێی خونچەکاندا، بەڵکو تەنها خۆی گەشە دەکات و بڵاودەبێتەوە و دەردەکەوێت و گوڵی دەگەشێتەوە.

جا ئەگەر دەتانەوێ ئیستیبدادی بەرجەستە ببینن، فەرموون سەیری ئەم پیاوە بکەن!

پ: زۆر سەیرە! ئەی ئایا چۆن ئێمە تا ئێستا ماوین، لە کاتێکدا کە ئیستیبداد ئەم ژەهرەی لەخۆ گرتووە؟

و: سوودتان لە جیاوازی و جۆراوجۆری و ناکۆکیی "خۆسەپاندنەکان" وەرگرتووە!

پ: بەشی دووهەمی تایبەتکارییەکان چییە کە شوورای تێدا بەرجەستەیە؟

و: گەورەی بە ڕاستی گەورە ئەو کەسەیە کە پشتی بە "حەق" بەستبێت و، "ژیری"ی بەکارهێنابێت و، "خۆشەویستی"ی کردبێتە خزمەتگوزار، ئیتر میللەت بەرەو ڕووی کێش دەبێت. ئنجا لەبەر ئەوەی ناچێتە سەر سەریان، بەڵکو دەڕواتە

ژێر باڵیان و بەرزیان دەکاتەوە و شەوقیان تێدا بێدار دەکاتەوە، ئەوا ئەگەر "چاکە"یەك ڕوویدات لە ناوەڕۆکدا دابەش دەبێت بەسەر شوێنکەوتووانیدا. ئنجا بە قەدەر ئەو بەشە شانازی‌یەی کە بەر هەریەکێکیان دەکەوێت، پلەی شەوقی ئەو کەسە زیاد دەکات.

ئەو گەورەیە لەپێناوی ئەوەی کە "حەق" پێگەی خۆی ببینێت و تیایدا نیشتەجێ ببێت، میللەتەکەی خۆی دەبینێت تاکو ڕووناکیی زانین بەدەست بهێنن. هەروەها بۆ ئەوەی کە ئەو خونچە و گوڵانە بە ئاوی زوڵاڵی خۆشەویستی و ژێری بدێرێن تاکو گەشە بکەن و پێ بگەن و گوڵ بگرن.

ئەمە بریتی‌یە لە نموونەی "سید القوم خادمهم". جا ئەگەر دەتانەوێت بڕواننە شووڕای بەرجەستە، ئەوا فەرموون ئێوە و ئەم مرۆڤە، چونکە ئاوێنەی شوورایە.

پ: کەواتە دەرکەوت "گەورە" ئەو کەسەیە "ژێری"ی بەبڕشت بێت، نەك شمشێرەکەی.. هەروەها خۆی بەخت بکات بۆ میللەتەکەی، نەك میللەت بکات بە قوربانی خۆی.

و: ئا ئێستا ڕووناکیی "حەقیقەت"تان بینی! بەڵێ، موریدەکانی شێخێکی پیاوچاك و خزمەتکارەکانی سەرۆکێکی ستەمکار یەکسان نین.

زۆر بە داخەوە دەڵێم: تایبەتمەندیی کەسانی خەواص هەرچەند هۆکارێکە بۆ خۆنەویستی و خاکی بوونی ئەو کەسە، کەچی بوونەتە هۆکارێك بۆ خۆسەپاندنی. هەروەك دڵنەرمی و دڵسافی و کێش بوون بەرەو گوێڕایەڵیی کوێرانە کە لە توێژی عەوامدا هەیە، هەرچەند هۆکارێکە بۆ شەفەقەت و بەزەیی پێداهاتنەوەیان، کەچی بوونەتە هۆکارێك بۆ دیلی و پابەندی‌یان.

پ: لە چ کاتێکەوە ئەم ئیستیبدادە چەپەڵە دەستی پێ کردووە و هاتووە پێشێلمان بکات؟

و: لەو کاتەوە کە مرۆڤ لە وڵاتی ئاژەڵێتی‌یەوە هات، بێ ئەوەی بە خۆی بزانێت ئەم هەژدیهایەی لەگەڵ خۆیدا هێنا!

پ: ژیانی ئاژەڵێتی چۆن بووە نیشتمانی ئیستیبداد و لەوێوە بڵاو بووەوە؟

و: بەڵێ، زاڵبوونی "بەهێز" بەسەر "لاواز"دا، یەکێکە لە یاسا بنەڕەتی‌یەکانی ژیانی ئاژەڵێتی، ئەوەش بەپێی دەستووری ململانێ لەسەر مانەوە! نابینن کە چۆن گورگی خۆسەپێن مەڕی داماو پارچە پارچە دەکات؟

پ: پاشان چیی تر؟

و: پاشان پێغەمبەران ڕەوانە کران، هەتا ئەم شەریعەتە بێگەردە هات و بەرەو زەوی شۆڕ بووەوە تاکو ڕووی زەوی لەو شتانە پاك بکاتەوە کە چەپەڵی دەکەن و،

ڕووی مرۆڤیش لەو شتانە سپی بکاتەوە کە ڕەشی دەکەن! لە ڕاستیدا "زەمان" چەندە هاوکاریی کردبێت شەریعەت ئەو کرداری پاکژی و سپی کردنەوەیەی ئەنجام داوە.

بەڵام بە داخەوە دەوروبەری کات و شوێن کاریگەریی خۆی هەیە، ئەوەبوو کاتێ بەو کاریگەرییە "خەلافەت" گۆڕا بە "پادشایەتی" ئیستیبدادیش جۆرە بووژانەوەیەکی بەخۆیەوە بینی، زەمانیش لە کەسی "یەزید"دا پتر بووژاندیەوە.

جا هەرئەوەندەی "خۆسەپاندن" سەری بەرز کردەوە "پێشەوا حسەین" – خوا لێی ڕازی بێت – شمشێری سەربەستیی شەرعیی هەڵبڕی و ئاراستەی گەردنی "خۆسەپاندن"ی کرد، بەڵام نەزانی و وەحشیگەری کە دوو پایە و دەماری ئیستیبدادن، لە هەموو لایەکی جیهانەوە هێرشیان هێنا بۆ پشتگیریی یەزید لە کەربەلادا، بەو کارەش دڵی حەق و دادگەریان لە تینواندا سووتاند!

پ: مەشرووتییەت و ئیستیبداد جیاوازن لە خەلافەت و پادشایەتی، ئیتر چۆن دەیانکەیتە هاوتای یەکتری و دەستیان دەخەیتە دەستی یەکتر لە کاتێکدا کە چەندین سەدەیان لە نێواندایە؟

و: گیانی "مەشرووتییەت" بریتی‌یە لەوەی کە هێز لە یاسادا بێت و، فەرمان و نەهی بە دەستی حەق بێت و، مرۆڤیش خزمەتگوزار بێت..

گیانی "ئیستیبداد"یش بریتی‌یە لەوەی کە هێز بەدەست کەسەوە بێت و، فەرمان لە دەستی کەیف و ئارەزووی ئەودا بێت و، یاسا شوێنکەوتەی ئەو بێت و، هێزی حەق بەزیو بێت.

ئەم دوو "گیان"ە، لە هەر زەمانێکدا بە شێوەیەك لە شێوەکان بەرجەست دەبن و ئەو پۆشاکە دەپۆشن کە ڕۆژگارەکەیان بەبەری دووریون. جا ئەم زەمان و ڕۆژگارە ئاوا دەنوێنێت و بەم شێوەیەش پۆشاك دەدوورێت.

دەسا ئەی ئەو کەسانەی کە گوێ بیستی منن!

پێتان وا نەبێت ئیستیبداد هەرکاتێ زاڵ بوو بە تەواوی دەستەڵات پەیدا دەکات و، شوورایش کاتێ شکستی هێنا بە تەواوی نامێنێ و تیادەچێت! نەخێر..

بەڵکو لەبەر ئەوەی لە بوونەوەراندا "خێر" زاڵی ڕەهایە، ئەوا بە درێژایی ڕۆژگار و، لە زۆر لق و لە چەندین کۆمەڵگادا "شوورا" فەرمانڕەوا و قسە ڕۆیشتوو بووە. بەڵام مشتومڕی نێوانیان بەردەوامە و جەنگیش هەر لە گەرمەدایە.

پ: ئایا چۆنە وا لە ڕابوردوودا ڕای تاکە کەس سەروزیادیان بووە، بەڵام لە داهاتوودا جێیان بۆ ناگرێت؟

و: گـەر بیسـەلمێنین کـە سـەروزیادیان بـووە، ئـەوا لەبـەر سـاکاریی ژیـانی دەشتەکێتی بووە. بەڵام لە کاتی ئێستادا، لەبەر ئەوەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان جۆراوجۆرن و لقە وردەکانی سیاسەتیش زۆر و زەبەندەن و، ڕۆژگار خەڵکی ناچار کردووە کە پێداویستییەکانیان زۆر ببێت و، بۆنە و پێویستییەکانیش فراوان بوون، ئەوا جگە لە دڵ و زمـانی میللـەت (مەبەسـتم ئەنجومـەنی شـوورا و ڕای گشـتییە) شتێکی تر ئەو بازرگانییە هاوبەشەی پێ هەڵناسووڕێت.

پ: ئەم شتە گەورە و ئاواتانە چین کـە دڵـی خۆتیـان پـێ خـۆش دەکـەیت، لـە کاتێکدا کە خەڵکانی داهاتوو هەر لەوانەی ڕابوردوون و لە یەك جۆرن؟

و: بە حوکمی ئەو سەردەمەی ڕابوردوو، بازنەی بۆچوونەکان و بواری هیممەت و لێبڕانـەکانی هـەموو تـاکێك هێنـدە تەسك بووبووەوە کە وەك زیندەوەرێك دادەنرا لە شێوەی مرۆڤدا و، بیری هەر تەنها لەخۆی دەکردەوە. وەك بڵێی "جۆر"ێك بێت لەناو "کەس"یکدا قەتیس مابێت! بەڵام کاتێ کە ئەو بەربەستانە لەت بوون و بازنەکەش فراوان بوو، هـەروەها هیممەتـەکانیش تـا هێشـووە ئەسـتێرەی سـورەییا بڵندییـان بەدەسـت هێنـا، هـەموو تاکـە کەسـێك لـە ڕێـی کرانـەوەی هیممـەت و فراوانیـی هزرەکانیـەوە وەکـو میللـەتێك و بـە وێنـەی تـاکێکی لـێ هـات کـە "کرانـەوە" و "فراوانـی"یەکـەی سـەرجەمی "جـۆر"ی گرتـەوە، دەڵێـی ڕەگـەزی مـرۆڤ لـەودا کۆبووەتەوە.

پ: دەوترێ مەشرووتییەت لە هەندێ کەسدا سنووری شەریعەت دەبەزێنێت؟

و: هەموو ئەو شتانەی کە دەوترێن گوێیان لێ ناگیرێت! من ئەوەم بە گوێدا دان کـە گیـانی مەشـرووتییەتی ڕاستەقینە لـە شـەریعەتەوەیە و، ژیـان لـەو بەدەسـت دەهێنێـت و، فـەرمانیش لـەو وەردەگرێـت و، ڕووی لـە کەعبـەی کەماڵاتـە. لەگـەڵ ئەوەشدا دەگونجێ لە هەندێ سەرکەوتنی و لە هەندێ لق و هەندێ هێرشیدا بۆ سەر بەرامبەرەکەی "پێویستی" ناچاری ئەوەی بکات پێچەوانەی شەریعەت ڕەفتار بکات، لە کاتێکدا کە ئەو ڕەفتارە پێچەوانەیەی شتێکی کاتییە نەك بەردەوام. مـەرجیش نییە هەر شتێك لـە سـەردەمی مەشـرووتییەتدا ڕووی دابێـت لـە مەشـرووتییەتەوە سەرچاوەی گرتبێت. بریا ئێوە پەڕەی دڵیتان هەڵبدایەتەوە تاکو بزانن کامـەیان لە مەشرووتییەتەوە پەیدا بووە و کامەشیان بە تـەواوی لەگـەڵ عەزیمەتەکانی شـەرعدا یەکدەگرێتەوە؟ کوا ئەو کەسەی کە بە پێی شەریعەت لە هەموو حاڵەتەکانیدا ڕەفتار دەکات؟

کەواتە حکوومەت کەسێکی مەعنەوییە و وەکو گەردیلەکانی وایە هیچ کاتێ لە هەڵە بەدەر نابێت، مەگەر لە شارە خەیاڵکردە بەناوبانگەکەی ئەفلاتووندا نـەبێت!

ئنجا وێڕای بەدەرنەبوونی ئەو فەیلەسووفە لە هەڵە، لە ڕێی بەکارهێنانی حیکمەتی "شوورا"وە زۆربەی ئەو دەرگایانەش دادەخرێن کە لێیانەوە فەساد و بەکارهێنانی خراپ دەڕۆنە ناو شاری شارستانێتییەکەی، لە کاتێکدا کە ئەو دەرگایانە لە دەمی "ئیستیبداد"دا لە سەرپشت بوون.

پ: بۆچی وەڵامی ئەو ڕەخنانە دەدەیتەوە کە پێشتر خۆیشت دەتگرتن؟

و: (جیاوازییەك هەیە لە نێوان ڕەخنەی من و ڕەخنەی ئێوەدا) من ڕەخنەم لە خودی حکوومەت نەگرتووە، بەڵکو لە شێوە و پۆشاکەکەی. چونکە من حکومەتی دەستووری بە مرۆڤێکی پیاوچاك وێنا دەکەم کە پۆشاکی کەسێکی فاسقی لەبەر کردبێت. بۆیە دەمویست ئەو پۆشاکە بدڕێنم یاخود بیشۆم، بەڵام "زەمان" ڕوخسەتی نەدام، منیش بە زەمانم سپارد تاکو بەرە بەرە دووچاری ڕزانی بکات، چونکە هەڵبژاردنی سووکەڵەترینی دوو شتی خراپ بە "دادگەرییەکی نیسبی" دادەنرێت..

بەڵام بەوپەڕی تاسەمەندییەوە دەڵێم و دەنگی لێ هەڵدەبڕم:

ئاوێتەبوونی ئەو بیری تۆڵەسەندنەوەیەی کە هەڵگەڕایەوە بۆ توندوتیژی، هاوکات لەگەڵ ئەو بێ ئەزموونییەی کە بەرهەمهێنی وروژاندنەکانە، کارەکەیان بە ڕادەیەکی وا لەسەر توند کردین کە جۆرە ئیستیبدادێك هاتە کایەوە دنیای لە ئێمە تاریك کرد، بەڵام لەمەولا بچووك دەبێتەوە و دێتەوەیەك.

بەڵێ، حکوومەت نوێژی دەکرد، یان نییەتی نوێژی دادگەریی هێنا، بەڵام نەشارەزای قیبلە بوو، ئێمە پێمان ناساند!

پ: بۆچی چەرخەکانی حکوومەت بە شێوەی شیاو ناچەرخێن و ڕێك نابن؟

و: چونکە ئەوانەی کە غیرەت و ئەزموون، یاخود ڕووناکیی دڵ و ڕووناکیی هزریان پێکەوە کۆکردووەتەوە، بە تەواوی لە کارەکان تێناگەن. ئەوەتا مەیلی وێرانکاری لە هەندێ کەسی پەرۆش و بە غیرەتدا بووەتە خوویەکی دامەزراو کە هەندێ جار دەگۆڕێت بە توندوتیژیی لە جۆری لەخۆبایی بوون، خۆ ئەگەر کاری نۆژەنکردنەوە ئەنجام بدەن، تێکی دەدەن!

خاوەن ئەزموونەکان و ئەوانەش دەیانەوێت ئاوەدانکاری ئەنجام بدەن، لەوەدا سەرکەوتوو نابن کە پێوەرەکانیان لەگەڵ ئەم مەکینە نوێیەدا ڕێك بخەن.

کەواتە کرانەوەی بەختمان بە هاتنی نەوەی نوێ دەبێت.

پ: لە هەردوو حاڵەتەکەدا کاری پێچەوانەی هەندێ دەستووری ئیسلام ڕوو دەدات؟

و: بەڵێ، ئەگەر "شوورا" بە ئەندازەی باڵێك لە "شەرع" دوور بکەوێتەوە، ئەوا ئەو حاڵەتەی پێشوو سەد باڵ دوور دەکەوتەوە!

پ: بۆچی؟

و: چونکە دەزووی باریك لە دەمی هەڵکردنی "با"دا دووچاری شپرزی دەبێت و لەسەر یەك حاڵەت ڕاگیر نابێت، کەچی پەتی توندوتۆڵی دەرەنجامی کۆبوونەوە و یەکگرتن "ڕەشەبا"یش هەڵبکات لەرزەی پێ ناکەوێت. ئنجا کۆدەنگیی نەتەوە و ڕای جومهوور لە شەریعەتدا بە دوو بناغەی توندوتۆڵ دادەنرێن و، مەیلی گشتینەش بایەخ و ڕێزی خۆی هەیە لە شەرعدا و، گەڕانەوەش لە هەر سنعەتێکدا بۆ لای خاوەن سنعەت ڕەچاو کراوە تیایدا.

جا لەسەر ئەم بناغەیە:

سەرنج بدەن کە هەرکات بای بەلەرزەخەری "ئەرمەن" و گێژەڵووکەی "بیانی" و وەسوەسەی "گومان" هەڵی دەکرد، چۆن ویستی پادشا لە سەردەمی ئیستیبدادا لەرزەی پێ دەکەوت و، هەندێ جاریش "دادگەریی شەرع"ی بە وێنەی بەرتیلێکی مەعنەوی دەکردە قوربانی تاکو ئەو بایە لە هەڵکردن بکەوێت!

بەڵام ئەو زەمانەی کە دەستی پشتگیریی بۆ ڕاکێشاوین، تاکو لە دەستی ئەم زەمانە ڕزگارمان بکات کە بەزەیی پێماندا نایەتەوە و، بە نەرمی ڕەفتارمان لەگەڵ ناکات و، لێمان ڕازی نابێت بەوەی کە دەستی دەکەوێت، ئەوا ئێمە لە چاویلکەی ئەم زەمانەی خۆمانەوە دەڕوانینە ڕوخساری و لە جوانییەکەیدا ناشیرینی دەبینین..

بزانن کە سێ سەد ڕا و هزری ڕووناك و جیاواز و ئازاد و ڕووبەڕوو، تەنها لەسەر "حەق" و "بەرژەوەندی" پێکدێن و یەکدەگرن. خۆ "بەرژەوەندی" و "هەڵبژاردنی سووکەڵەترینی دوو شت کە شەڕیان تێدا بێت" دوو بناغەی بەهێزن. لەگەڵ ئەوەشدا بە پێی دەستووری "إن الضرورات تبيح المحظورات" هەندێ جار "پێویستی" شتی حەرام دەکات بە واجب و، ئەو پەنجەیەش دەبڕرێتەوە کە گەنیبێت تاکو هەموو دەستەکە دووچاری بڕینەوە نەبێت و، هەندێ دەکرێت بە فیدای سەلامەتی و مانەوەی میللەت.

بەڵێ، ئەگەر سەلامەتیی میللەت بەند بێت لەسەر بەختکردنی گیانەکان، لێی ڕاناوەستین. هەروەك لێی ڕانەوەستاین!

کارێکی سەیرە!

ئایا ئەو ئامانج و سوودە جوزئییانە چین کە پارێزگارییان لێ دەکرێت و بەخت ناکرێن؟! ئایا لەو کەسە سەرسووڕهێنەرتر هەیە کە گیانی خۆی بەخت بکات، بەڵام ڕەزیلی لە بەخشینی ئەو ئامانجەیدا بکات کە بە وێنەی گەزندەیەك پێوەی دەدات؟!

ئەوەش بزانن كە ئەو كەسەى داواى شەريعەت دەكات، گەر لە رێى بەراورد كردن و داوەرييەوە بێت و، پێويستى و بەرژەوەنديى لەبەرچاو گرتبێت، ئەوە خۆيەتى و شتێكى باشە.. بەلام ئەگەر وەكو بەگتاشى‌يە بەناوبانگەكە بێت و رێگايەكى داخراو بگرێتەبەر، ئەوا لە ژێرىيەكەيدا فريودراوە و، لە مامەڵەكەشيدا مافى خوراوە و، گەر دۆستيش بێت دۆستێكى شێتە!

پ: ئەنجومەنى نوێنەران ديان و جوولەكەى تێدايە. ئايا راى ئەوان چ نرخێكى هەيە لە ديدى شەريعەتدا؟

و: يەكەم: لە "شوورا"دا بريار بۆ زۆرينەيە. لەوێيش زۆرينە موسلمانن، تەنانەت حەفتا زانايان تێدايە. نوێنەريش ئازادە، دەشبێ ئازاد بێت و لە ژێر هيچ كاريگەرىيەكى ناديياردا نەبێت. جا ئەگەر ئەو ئەنجومەنە بە شێوەيەكى راست و دروست رێك بخرێت، ئەوا جڵەوى فەرمان هەر بە دەست ئيسلام دەبێت.

دووهەم: ئەگەر "خاچۆ" و "خاخان" وەستاى مەكينە و سەعات بن، ئەوا راوێژ پێ كردنيان لە كارپێكردنى مەكينە و دروستكردنى سەعاتدا جێى بايەخە و شەريعەت رێ لەوە ناگرێت. بە هەمان جۆر، زۆربەى ئەو شتانەى كە لە ئەنجومەنى شووورادا سەرقاڵى دەكات بريتى‌يە لە بەرژەوەندى‌يە سياسى‌يەكان و سوودە ئابوورى‌يەكان، كە بە وێنەى سنعەتى مەكينە و سەعاتەكەن. كەواتە دەبێ شەريعەت راى ئەوان لەو شتانەدا رەت نەكاتەوە كە تيايياندا پسپۆرن.

بەلام خودى "حوكم" و "مافەكان" گۆڕانيان بەسەردا نايەت، بەڵكو جێبەجێ كردنيان و هەڵبژاردنى هەندێكيان بەسەر هەندێكى ترياندا پێويست بە "شوورا" دەكات.

بەڵێ، هەزار جار بەڵێ، ئەگەر "شوورا" سنوور ببەزێنێت و بناغەكەى خۆى بگۆڕێت، ئەوا حكوومەت كارێكى خۆكوژى دەكات. كارى "نوێنەرايەتى" لەوە زياتر نى‌يە كە هەندێ دەستوور بە وێنەى قەڵا و شوورا لە دەورى حوكم و مافەكاندا دروست بكەن، تاكو "بەكارهێنانى خراپ" بۆ ئەو حوكم و فەرمانانە و "فرتوفێڵى هەندێ لە دادوەرەكان و ئەهلى فەتوا" دزە بۆ ناو ئەو قەڵايە نەكەن.

پ: تۆ باسى دادگەرى و بەختەوەرى دەكەيت. بەختەوەرى چۆن دێتەدى ئەگەر ئەركە قورسەكانى دەوڵەت لەسەر شانى هەژاران سووك نەكرێت؟

و: جياوازى‌يەكى تەواو لە گۆڕێدا هەيە. پێشتر هەرشتێكتان لێ وەردەگيرا لە تاريكيدا بە زايە دەچوو. بەلام ئێستا ميللەت بۆ خۆى چاودێرە و دەبينێت چۆن سەرف دەكرێت. واتە لە رابوردوودا وەكو ئەوە وابوو فڕێ بدرێتە ناو ئاو يان زەوييەكى قوڕوليتاوى. بەلام ئێستا، مەبەستم لە داهاتوودا، هەرچيتان لێ

وەردەگیرێت دەخرێتەوە ناو کێڵگەکەی خۆتان. خۆ ئەوەش جۆرە کارئاسانی‌یەکە بۆتان.

پ: حکوومەت و تورك هەرچۆن بن، ئێمە نە قازانج دەکەین و نە دەحەوێینەوە و نە بەرزیش دەبینەوە. کەواتە پێویستە ئێمە خۆمان سەر بەرز بکەینەوە تاکو لە سەرووی ئەوانەوە، لە نێوان سەر وناوشانی ئەوانەوە بروانینە دنیای شارستانیی ئەودیوی ئەوان و، لەگەڵ ئەواندا دەست بۆ ئاوی خاوێنی سازگار رابکێشین و، پیشانیان بدەین کە ئێمەش نەتەوەیەکی خاترگیراوین. واتە پشت بە خۆمان ببەستین، چونکە حکوومەت ئاڵۆزە و ئەستەمبووڵیش گۆڕاوە، جا ئەگەر پشت بەوان ببەستین، ئەوا دەبێ لە ئاوە بۆگەنەکە بخۆینەوە.

و: دڵنیا بن کە نەك تەنها ئێوە، تەنانەت ڕەگەزەکانی تریش.. نەك هەر ئێستا، بەڵکو هەتا چل ساڵی تر ناتوانن بێ نیاز ببن لە ڕێنمایی تورك و، جۆرە چاودێری‌یەکیان بەسەرتانەوە و، ئاوێتەبوون لەگەڵیان و، برایەتیی ڕاستەقینە لە تەکیاندا. کەواتە لە یەکتر دامەبڕێن: ﴿فَتَفْشَلُوا وَتَذْهَبَ رِيحُكُمْ﴾!

سەبارەت بە حکوومەتیش، ئەوا چەندین جار دووپاتم کردەوە کە دەستووری "شوورا" بریتی‌یە لە حوکم کردنی میللەت. واتە ئەنجومەنی شوورا، کە نموونەیەکی بەرجەستەی ڕای گشتی‌یە، فەرمانڕەوا و ئەندازیارە و، حکوومەتیش خزمەتکار و بنیاتنەرە. کەواتە سکاڵا لە خۆتان بکەن، نەك لەوان. گێڕانەوەی هەموو خراپکارییەکان بۆ حکوومەت و تورکەکان خۆخەڵەتاندنە و بێ ئاگاییە لە نهێنیی مەشرووتییەت.

بەڵێ ئەی میللەت ڕاستە! ئەگەر پارێزگاریی حوکمڕانیی خۆتان نەکەن، خەڵکانێکی تر زەوتی دەکات لێتان و ئیستیبداد دەسەپێنێت بەسەرتاندا. وا نموونەیەکتان لەسەر ئەمە بۆ دەهێنمەوە:

ئەو سەرچاوەیەی کە جۆگەلەی زۆری لێ جیابووەتەوە، ئەگەر ئاوەکەی بگۆڕێت لقەکانیشی دەگۆڕێن. کەواتە یەکەم شت کە پێویست بێت بایەخی پێ بدرێت سەرچاوەکەیە. خۆ ئەگەر سەرچاوەکە بوو بە حەوز و جۆگەلەکانیش ببن بە کانی و برژێنە ناو حەوزەکە، ئەوا حەوزەکە چاوەڕێی کانی‌یەکانە و دەبێتە شوێنکەوتەی ئەوان. ئیتر ئەگەر حەوزەکە – خوا نەخواستە – گۆڕانی بەسەردا بێت یان تێکبچێت ئەوا کاریگەریی لەسەر کانی و سەرچاوەکان نابێت، گەر بە ڕاستی سەرچاوە بن و، دووچاری نابینایی و یەکچاوی و چاوێشە نەبووبن!

زەمانی پێشوو، بەڵکو بەشێکی ئەم زەمانەش، حکوومەت وەکو سەرچاوەکە وابوو، سکاڵاکانتان لە جێی خۆیاندا بوون. بەڵام ئێستا، مەبەستم ئەوەیە کاتێ کە

دەرگا لەسەر داهاتوو خرایە سەرپشت، حکوومەت بوو بە حەوز و تەواوییەکەشی لەمەولایە، ئەستەمبوولیش بوو بە ئەستێر و، تورک تەنکە ئاو و، ئێمەش سەرچاوە، گەر چاومان بە کلی زانست برێژین.

کەواتە ئەی کوردەکان و ئەی ئەوانەش کە شوێن پێی ئێوە هەڵدەگرن!

گلەیی چاونووقاندن و خۆگێل کردن لە خۆتان بکەن، چونکە کانی و سەرچاوە لەناو خۆماندا نابینم. لەبەر ئەوەیە لەو ئاوە تێکچووە دەخۆینەوە کە لە دوورەوە دێت و، ئیستیبدادە یەك لە دوای یەکەکان بەسەرماندا زاڵ دەبن.

جا لەسەر ئەم بناغەیە، پێویستە غیرەت بنوێنن و، پشتی لێ شل نەکەن. بەڵکو هەوڵی بەهێزکردنی ئەو مەشرووتییەتە بدەن کە هۆکاری بەختەوەریمانە. ئەوەش بەوەی هێزی میللەت پەروەری بکرێت بە وەستایەکی زەوی هەڵکەن و، ئامێری هەڵکەندنی زانست و ڕەوشت بەرزیشی بدرێتە دەست، تاکو لە داوێنی ئەم چیا دوور لە ئاوەدانییانەدا کانیاوی کەماڵات بتەقێنێتەوە. دەنا دەبنە سواڵکەر، یان لە تینواندا دەمرن. لە کاتێکدا خۆکردنە سواڵکەر ئێستا هیچ سوودێکی نابێت. خۆ ئەگەر کەسێك سواڵ دەکات دەبا سواڵ لە خۆی بکات.

من پێم وایە ئەو کەسەی کە داوای بەزەیی لە خەڵکی دەکات، یان لەسەر ناحەقە، یان دەستەوسانە، یان تەمبەڵە، یاخود گومانی خراپ دەبات..

جا ئەگەر ئێوە مرۆڤ بن، ئەوا چ حکوومەت و چ ئەستەمبووڵ و چ تورك هەرچی چۆن بن، ئێوە کارتان بەسەریانەوە نەبێت، چونکە ئەگەر خێرێکیان تێدا بێت، بەر ئێوەش دەکەوێت؛ گەر شەڕێکیش ڕوو بدات، ئەوا بەرەو ئێوە خل نابێتەوە.

پ: بۆچی شەڕ لەگەڵ خێردا نایەت؟ خۆ هەردووکیان دەستە بران؟

و: بەڕێزان! کەمێك پێش ئێستا وتمان: حکوومەت بووەتە حەوز. حەوزیش لای خوارەوەیە. "شەڕ"یش قورسە. قورس بەرەو لای سەرەوە خل نابێتەوە و حەوزەکەش ئەو ئاوە پیس ناکات کە بۆی دێت، مەگەر بە نەزانیی خۆتان ئەو "شەڕ"ە کێش ببێت.

ئنجا "خێر"یش وەکو ڕووناکی وایە لە خوارەوە بەرەو سەرەوە ڕووناکی دەداتەوە و بۆ ئەوێ کێش دەبێت[١].

---

(١) هەتا ئێرە ئەو بەشەی (مونازەرات) بوو کە دانەر خۆی لە سەرەتای دوا چاپەکاندا لایبردووە. بەڵام ئێمە نەك لەبەر ئەوەی پێمان وابێت ڕای دانەر لەگەڵ بڵاوکردنەوەیدایە، بەڵکو لەبەر بایەخی مێژوویی ئەم بەشە، هاتین لەبەر دەقە عەرەبییەکەی خودی دانەرەوە لە چاپە کۆنەکەدا کردمان بە کوردی و، لێرەدا بەم فۆنتە جیاوازە بڵاومان کردەوە. (وەرگێڕ)

(بەشێکە[1] لە وەڵامەکانی "سەعیدی کۆن" بۆ ئەو پرسیارانەی کە چل و پێنج ساڵ پێش ئێستا[2] هۆزەکان ئاراستەیان کردبوو).

پ: هەر ئایین زیانی پێ نەگات ئیتر چی دەبێت با ببێت، گوێی نادەینێ!

و: ئیسلام وەکو خۆر وایە؛ ڕووناکی‌یەکەی بە فوو ناکوژێتەوە و.. بە وێنەی ڕۆژیش وایە؛ بە چاونووقاندن ناگۆڕێ بە شەو. خۆ ئەو کەسەی کە چاوی دەنووقێنێت تاریکی هەر تەنها بەشی خۆی دەبێت.

گریمان ئەرکی پاراستنی ئایین بە سەرکردەیەکی شکست خواردوو.. یان چەند بەرپرسێکی خۆبەرە پێشەوە.. یان دەستە ئەفسەرێکی لێنەهاتوو بسپێررێت.. ئایا ئەوە باشترە، یان پشت بەو ستوونە نوورانی‌یە ببەسترێت کە شمشێرێکی ئەڵماسە و، ئاکامی ئاوێتە بوونی پزیسکی ڕۆشناییەکانی پەرۆشیی ئیسلام و، بریسکەی نوورەکانی خوای گەورەیە کە لە سۆزی ئیمانەوە لە دڵی هەموو کەسێکەوە تیشك دەدات و، کانگای ئەو هەست و نەستە ئیسلامی‌یەشە کە یارمەتی بەخش و پشتگیری هزر و بیری گشتیی خەڵکە؟

بۆ خۆتان دەتوانن بەراوردی بکەن کامیان باشترە کە بۆ پاراستنی ئایین پشتی پێ ببەسترێت؟

بەڵێ، ئەم ستوونە نوورانی‌یە[3] پاراستنی ئایین دەخاتە سەرشانی مەردایەتی و چاوی چاودێری و ئەستۆی غیرەت و پەرۆشیی خۆی. ئەوەتا خۆتان دەبینن کە بریسکە پەرتەوازەکان خەریکە دەدرەوشێنەوە. بە پشتیوانیی خوای گەورە بە کێش بوونیان بەرەو یەکتر وردە وردە تێکەڵ بە یەکدی دەبن. چونکە لە هونەری "فەلسەفە"دا چەسپاوە کە هەست و نەستی ئایینی - نەخوازەڵا هی ئایینی ڕاستەقینە - پتر لە هەموو

(١) لێرەوە دەقی پوختەکراوی پەیامی (مونازەرات) دەست پێدەکات کە دانەر لە دوا ساڵەکانی تەمەنیدا بڵاوی کردووەتەوە. (وەرگێڕ)

(٢) مەبەستی دانەر ساڵی (١٩١٠ز)یە. (وەرگێڕ)

(٣) ئەو کاتە هەستی بە "پەیامەکانی نوور" کردبوو، تەنانەت وەڵامی پرسیارەکەی بە سێ لاپەڕە دایەوە. بەڵام پەردەکانی سیاسەت بە ڕەنگێکی تر ڕەنگیان کردبوو. (دانەر)

هەست و سۆزێکی تر قسەی دەڕوات و بڕیارەکانی بەرز و باڵاترە و کاریگەریشی گەلێ زیاترە.

**بە پوختی:**

هەر کەسێك پشت بە خەڵکانی تر نەبەستێت، هەوڵ و تەقالاکانی خۆی دەخاتە گەڕ.

نموونەیەکتان لەسەر ئەمە بۆ دەهێنمەوە:

ئێوە دەشت نشینن و سەرمایەکەتان مەڕومالاتە. خۆیشتان لە کاروباری خۆتاندا باشتر شارەزان. هەریەك لە ئێوە بەشێك لە مەڕوماڵاتەکەی بە شوانێك سپاردووە، کەچی شوانەکە تەمبەڵ و تەوەزەلە و، یاریدەدەرەکەشی سارد و سڕ و کەمتەرخەمە و، سەگەکانیشی ترسنۆکن. خۆ ئەگەر پشت بەو شوانە ببەستن و بێ خەم لە ماڵەوە بخەون، مەڕە بەستەزمانەکانتان دەکەونە ژێر زەبر و زەنگی گورگی دڕندە و، دز و، چەتە و، بەلا و گیروگرفتەکان..

جا ئایا ئەم کارە باشە، یان هەست کردن بە لێنەهاتوویی شوانەکە لە پاراستنی مەڕوماڵاتەکاندا و، ئنجا هەریەکەتان وەك قارەمان لە ماڵی خۆی ڕابپەڕێ و لە خەوی بێ ئاگایی بەخەبەر بێت و، بۆ پارێزگاریی مەڕوماڵاتەکەی تێبکۆشێت و، لە بریی یەك دانە شوان ببن بە هەزار.. ئیتر ئەو کاتە هیچ گورگ و هیچ دزێك نەوێرێ توخنی مەڕەکانتان بکەوێت؟

ئایا هەر ئەم نهێنییە نەبوو کە چەتەکانی "مامە خووران"ی[1] گۆڕی بە کەسانی تۆبەکار، تەنانەت بە "موریدی سۆفی"ش؟ بەڵێ، "گیان"ی ئەوان وای لێ هات کە ئارەزووی گریان بکات و، کەسێك[2] بوو بەهۆی وورووژاندنی گیانیان و، فرمێسکی گەرمی پەشیمانییان هەڵڕشت..

بەڵێ.. بەڵێ.. ئەرێ.. ئەرێ.. گەر ویزەی مێشوولە و گیزەی هەنگ لە دەنگ و هەرا بکەون، ئێوە خەم مەخۆن و حەز و تاسەتان با هەرگیز نەکوژێتەوە، چونکە مۆسیقای مەزنی خوایی کە سەرانسەری گەردوونی خستووەتە مەستی و هێناویەتە

(١) هۆزێکی باکووری کوردستانە، لە دەوروبەری شارەکانی: (پاتنوس.. ئەرجەس)دا نیشتەجێن. (وەرگێڕ)
(٢) مەبەست "شێخ ئەحمەد"ە، کە یەکێکە لە پیاوچاکانی ئەو ناوچەیە. لەمەولا باسی دێت. (وەرگێڕ)

سەما و، بە پەژارە خەم بزوێنەکانی نهێنیی ڕاستیەکانیشی ڕاچڵەکاندووە، هێمن نەبووەتەوە و لە ئاوازی خۆی ڕانەوەستاوە، بەڵکو بە دەنگێکی بەرز و زوڵاڵ[1] ئاوازەکانی هەر بەردەوامە.

پادشای سەرجەم پادشایان، مەلیکی ئەزەل و ئەبەد، بە قورئانە پیرۆزەکەی - کە مۆسیقا خواییەکەیەتی - بانگ دەکات و، لە گومەزی ئاسماندا گەردوونی لە دەنگێکی زوڵاڵ و دلێر پڕ کردووە و، زایەڵەی ئاوازی خاوێنی ئەو بانگە پیرۆزەش گەڕاوەتەوە ناو صەدەفی سەری زانایان و دڵی ئەولیاکان و ئەشکەوتی زاری وتاربێژان، ئنجا ئەو زایەڵەیەش لەسەر زمانیان بە لێشاوێکی بزۆك و جۆراوجۆر ڕەنگی داوەتەوە و سەرجەمی دنیای بە توندوتۆڵیی شەپۆلەکانی هێناوەتە لەرزە و بە بەرجەستەیی لە سەرجەم کتێبەکانی ئیسلامدا پێش چاو کەوتووە و، بە وێنەی ژێی سەمتوورێك یان هی ئامێری قانوونێکی لێ کردووە و، هەریەك لەو ژێیانە جۆرێك لە جۆرەکانی ئەو زایەڵە ئاسمانی‌یەی ڕاگەیاندووە..

جا هەرکەسێ بە گوێی دڵی ئەو زایەڵەیە نەبیستێ یان گوێی لێ نەگرێ کە جیهانی لە ڕووناکی پڕ کردووە، لە کوێ گوێ لە ویزەی مێشوولە ئاسای میری دەوڵەت و گیزەی مێش ئاسای پیاوانی حکومەت دەگرێت؟!

**ئاکام:**

ئەو کەسەی لە ڕوودانی ئاڵوگۆڕێکی سیاسیدا خەمی ئایینەکەی لێ دێت، جگە لە "نەزانی" کە بە وێنەی تانوپۆی جاڵجاڵۆکە لاوازە و دووچاری ترسی دەکات، هیچ شتێکی تری سەبارەت بە ئایینەکەی تێدا نی‌یە و، تەنها "چاولێکەری"یەکی ئەوتۆی پێ بڕاوە کە دەیهاوێتە ناو باوەشی شڵەژاوی و پەشۆکانەوە. چونکە لەبەر ئەوەی بە دەستەوسانی و متمانە بەخۆ نەبوون لەو گومانەدا بوو کە بەختەوەری‌یەکەی تەنها لەناو گیرفانی حکوومەتدایە ئەوا پێی وایە "دڵ" و "ژیری"شی وان لە هەمبانەی حکوومەتدا! ئیتر بێ گومان دڵی لە ترس پڕ دەبێت.

پ: هەندێکیان وەکو تۆ نالێن.. بەڵکو دەڵێن:

---

(١) مامۆستا نوورسی لە دەقە تورکی‌یەکەدا وشەی کوردیی (زرم زرم)ی بەکارهێناوە. (وەرگێڕ)

پێویست بە هاتنی "حەزرەتی مەهدی" دەکات، چونکە دنیا - لەبەر پیریی خۆی - ئاڵۆز و شلەژاوە و، ئیسلامیش - بەهۆی بووژانەوەی بەرژەوەندییە کەسی و ئامانجە دنیاییەکان - قەوارەکەی شل و لەرزۆك بووە.

و: ئەگەر "حەزرەتی مەهدی" پەلە بکات و هەر ئێستا بێت، با تەشریف بهێنێت.. لەسەر چاومان و سەرمان دایدەنێین. چونکە کاتی هاتنی هاتووە، ئەوەتا هەلێکی باش و بارێکی گونجاوی بۆ رەخساوە. کەواتە کەش و هەوای هاتنی تێك نەچووە، وەکو ئەوەی کە ئێوە گومان دەبەن. ئەوەتا گوڵە پێگەیشتووەکان لە بەهاردا گەشە دەکەن. سۆز و میهرەبانیی خوای گەورە بەرامبەر بەم نەتەوەیە ئەوەی لێ چاوەڕوان دەکرێت کە کۆتایی بە زەلیلییەکەی بێت.

لەگەڵ ئەوەشدا، گەر کەسێك بڵێت: رۆژگار بە تەواوی خراپ بووە و لێمان تێکچووە، بەمەش مەیلێك بەلای سەردەمی پێشوودا دەرببڕیت، ئەوا - بە بێ ئەوەی هەست بە خۆی بکات - هەموو خراپکارییەکانی سەردەمی پێشوو، کە ئەنجامی رەفتاری پێچەوانەی ئیسلام بوون، دەداتە پاڵ خودی ئیسلام، کە ئەمەش گومانی هەندێ لە بیانییەکانە.

پ: ئەوانە کێن کە هزر و بیرەکان دەشێوێنن و رێزی شایانی (سەربەستی و)[1] "مەشرووتیەت" ناگرن؟

و: کۆمەڵەیەکە بە سەرۆکایەتیی "نەزانی ئاغا" و، "سەرسەختی ئەفەندی" و، "ئامانج بەگ" و، "تۆڵە سەندنەوە پاشا" و، "حەزرەتی چاولێکەری" و، "مسیۆ چەنەبازی" پێکهاتووە!

کۆمەڵە خەڵکانێکن ئەو "شوورا"یە دەشێوێنن و لێڵی دەکەن کە سەرچاوەی بەختەوەریمانە[2]. لەناو گرۆی ئادەمیزاددا ئەو کەسانە پەیوەستی ئەم کۆمەڵەیە دەبن کە یەك درهەمی حسابی خۆیان بۆ مەزنترین سوود و بەرژەوەندیی نەتەوە بەخت ناکەن..

ئەوانەن کە سوودی خۆیان لە زیانی خەڵکیدا و، قەڵەوییان لە لاوازیی کەسانی تردا دەبینن..

---

(١) ئەوەی ناو کەوانەکە دانەر خۆی لە چاپەکانی دواییدا زیادی کردووە. (وەرگێڕ)

(٢) لێرەدا هەواڵ لەبارەی ماسۆن و کۆمەڵەکانی ئەو سەردەمانە دەدات و، هەواڵی ئەوەش کە بۆ ماوەی چارەکە سەدەیەك دەسەڵاتێکی پەنهان بە ئیستیبدادی رەها حوکم دەکات. (دانەر)

ئەو کەسانەن کە بێ هیچ "داوەرییەکی ژیریی دادگەرانە" شتان لێك دەدەنـەوە و بـە هەرەمەکی و لـە خۆڕا ئەو واتا و مەبەستانەی دەیانەوێ، دەریان دەبڕن..

دەبینی لەو کاتەدا کە هیچ کامیـان نـاتوانێت خـۆی ڕابگرێـت و تۆڵـە نەسێنێتەوە و، دەست لە بەرژەوەندیی کەسیی خۆی هەڵبگرێت؛ بەوپەڕی لەخۆباییی بوونەوە لافی ئەوە لـێ دەدات کە ئامادەیە گیانی خۆی لە پێناوی نەتەوەدا بەخت بکات!!

هەر ئەوانەن کە چـەند بیرۆلۆکەیەکی ناژیرانـەیان هـەڵگرتووە، چەشنی: پێکـهێنانی میرنشینەکان (بەگلـەك) یـان ئۆتۆنۆمـی (خودموختـاری) - کـە پێشـەکییەکە بۆ تیرەی پادشایان (طوائف الملوك)[1] - (یاخود کۆماری بە واتای خۆسەپاندنی ڕەها)[2]..

ئەوانەن کە ستەمیان بینی دڵیان پڕ بوو لـە ڕق و حـەزی تۆڵەسەندنەوە، بـە ڕادەیـەك "لێبوردنـی گشـتی" و "ئاسایشـی گشـتی"یـان بـۆ هـەرس نـەکرا کـە لـە یەکـەم چاکەکارییەکانی "سەربەسـتی" و "مەشرووتیەت"ن، ئـەوەتا دەچـن خـەڵکانی تـر هـان دەدەن ئاسایش تێك بدەن و دەیان ورووژێنن تاکو ئاڵۆزی و پشـێوی بنێنـەوە، ئەمـەش بـۆ ئەوەی داخی دڵی خۆیان بە تۆڵە لـێ سەندنەوەیان و تەمێ کردنیان سارێژ بکەن!

پ: بۆچی هـەموویان بـە خراپکـار دادەنێـت و ڕەتیـان دەکەیتـەوە؟ خـۆ ئـەوان وا دەردەکەون کە ئامۆژگاریی ئێمە بکەن؟

و: خراپکـارێکم پیشـان بـدەن کـە بڵـێ: "مـن خراپکـارم"! ئەوانـە هەرچـەندەش خراپکارن کەچی هەمیشە لە شێوەی حەقدا خۆیان دەردەخەن، یـاخود ناحـەق بـە حـەق دەزانن.

بەڵێ، (کەس بە دۆی خۆی نالێ ترشـە)[3]! کەواتـە هیـچ شتێ لـە کـەس وەرمـەگرن هەتا لـە سەنگی مەحەکی نەدەن. چونکە لـە "بازرگـانیی بیر و ڕاکـاندا" وتـەی سـاختە و قـەڵب یـەکجار زۆر بـووە. تەنانـەت ئـەو وتانەش کە لـە منـی دەبیسـتن، لەبـەر خـۆش باوەڕیتان بە من، ڕاستەوخۆ وەری مەگرن. دەگونجێ من خراپکار بم، یـان بـێ ئـەوەی بـە خۆم بزانم ئەوانەی دەیانڵێم و دەیانکەم خراپ بن!

---

(١) واتە هەر دەستەیە و خۆی حوکمڕانی خۆی بێت. مەبەست پاشاگەردانییە. (وەرگێڕ)

(٢) ئەوەی ناو کەوانەکە دانەر خۆی لە چاپەکانی دواییدا زیادی کردووە. (وەرگێڕ)

(٣) دانەر ئەم پەندە کوردییەی وەك خۆی بە تورکی و عەرەبی داڕشتووەتەوە! (وەرگێڕ)

کەواتە وریا بن! هەرکەس لە دەرگای دڵتان بدات یەکسەر لێی مەکەنەوە! هەرشتێك من پێتان دەڵێم با لە دەستی ئەندێشەتاندا بمێنێتەوە و لە سەنگی مەحەکی بدەن، جا ئەگەر دەرکەوت "زێڕ" بوو ئەوا بینێرن بۆ دڵتان و لەوێ پارێزگاریی لێ بکەن. خۆ ئەگەر دەرکەوت "مس" بوو، ئەوا غەیبەتێکی زۆر لە ئەستۆی ئەو وتە شوومە بکەن و، بە دوعای بەدەوە ڕەوانەی بکەنەوە و بیدەنەوە بە سەروچاوی خۆمدا.

پ: بۆچی گومانی خراپ بە گومان باشیی ئێمە دەبەیت؟

خۆ پادشایان (و حکوومەتەکان)[1]ی پێشوو نەیانتوانی تۆ لە "حەق" بترازێنن و، ئەندامانی "جۆن تورك"یش[2] لە توانایاندا نەبوو بتخەنە ناو ڕیزەکانی خۆیانەوە و، هیچ کاتێ مەراییت بۆ نەکردن تا ئەو ڕادەیەی تۆیان خستە بەندیخانە و نزیك بوو لە سێدارەت بدەن، کەچی هەر سەری بەرزت بۆ نەوی نەکردن و زەلیلیت بۆ نەنواندن، بەڵکو بە وەرنەگرتنی ئەو مووچە گەورەیەی بەڵێنیان پێ دایت، بوویت بە قارەمانێکی مەرد و ئازا..

کەواتە تۆ هەر لایەنگری حەق و ڕاستیت و لێی لانادەیت و، قسەکانت بۆ لایەنگرتنی ئەوان نییە.

و: بەڵێ، ئەو کەسەی "حەق"ی ناسیبێت بە هیچ شتێك نایگۆڕێتەوە. چونکە شان و شکۆی "حەق" هێندە بەرز و بڵندە کە نابێ لە پێناوی هیچ شتێکدا بەخت بکرێت. بەڵام من ئەم گومان باشییەی ئێوەم پێ قبووڵ نییە چونکە هەندێ جار گومان باشیتان تەنانەت بەرامبەر فێڵباز و خراپکارانیش هەیە! باشتر وایە لە بریی ئەو گومان باشییە، سەیری بەڵگە و ئەنجامی بیر و بۆچوونەکەی بکەن.

(١) ئەوەی ناو کەوانەکە دانەر لە چاپەکانی دوایيدا زیادی کردووە. (وەرگێڕ)

(٢) "تورکیای لاو" یان "جۆن تورك" لە دەستەواژەی فەرەنسیی (Jeunes Turces)ەوە وەرگیراوە و، بەو کەس و کۆمەڵانە دەوترێت کە لە سەردەمی سوڵتان عەبدولعەزیزەوە تاکو لەسەرکار لابردنی سوڵتان عەبدولحەمید لە ساڵی ١٩٠٩زدا نەیاری ڕژێمی فەرمانڕەوا بوون لە دەوڵەتی عوسمانیدا. لەوانە هەردوو شاعیری بەناوبانگ: نامیق کەمال و ضیاء پاشا بوون کە داواکاری "ئازادی" بوون. پوختەی داخوازییەکانی ئەم کەس و کۆمەڵانە ڕاگەیاندنی دەستوور و دامەزراندنی سیستەمی پەرلەمانی بوو. لە هەموویان بەهێزتر: کۆمەڵەی "ئیتیحاد و تەرەقی" بوو، کە توانییان بە هاوکاریی هێزە دەرەکییەکان سوڵتان عەبدولحەمید لەسەر کار لابدەن. (وەرگێڕ، لە چاپە عەرەبییەکەوە)

پ: جا چۆن لەوە تێبگەین؟ لە کاتێکدا ئێمە کەسانێکی "نەزان"ین و، چاو لە زانایانی وەکو ئێوە دەکەین؟

و: ئێوە ئەگەر "زانا" نەبن، خۆ "ژیر و هۆشمەند"ن. بە بەڵگەی ئەوەی کە ئەگەر مێووژ لەگەڵ یەکێکتاندا بەش بکەم لەوانەیە (بە زیرەکیی خۆی)[1] گزیم لێ بکات! کەواتە "نەزانی"تان نابێتە بەهانە.

باش بزانن ئەو درەختانەی کە لە یەك دەچن، بەروبوومەکانیان لە یەکیان جیا دەکاتەوە..

لەبەر ئەوە، بە وردی بڕواننە بەروبوومی بیر و هزری من و ئەنجامی بیر و هزری ئەوانیش. ئەوەتا لە یەکێکیاندا بێ وەیی و گوێڕایەڵی دەبریسکێتەوە و، لەوی تریشیاندا خراپکاری و دووبەرەکی خۆی شاردووەتەوە.

وا نموونەیەکی ترتان بۆ دەهێنمەوە:

گریمان لەم دەشتاییەدا ئاگرێکی ڕووناکی بەخش لە دوورەوە دەربکەوێت.. من مژدەتان دەدەمێ کە ئەوە "ڕووناکی"یە و ئاگر نییە. تەنانەت گەر ئاگریشی تێدا بێت هەر تەنها چینێکی سەرەوە و لاواز و پاشماوەیە.. دەبا بڕۆین لە نزیکەوە شارەزای ببین و، لە دەوراندەوریدا بە وێنەی بازنەیەك کۆ ببینەوە و بۆی بڕوانین و، لە ڕووناکییەکەی بەهرەمەند ببین و، هەتا توێژی ئاگرەکەی تەواو دەبێت سوودی لێ وەربگرین..

جا ئەگەر ڕووناکی بوو، وەك ئەوەی من پێم وتن، ئەوا سوودی خۆمان لێ وەرگرتووە.. بەڵام ئەگەر وەکو ئەوان دەڵێن "ئاگر" بوو ئەوا هیچ زیانێکمان نەکردووە، چونکە نەڕۆشتووینەتە ناوی.

بەڵام ئەوان دەڵێن: "ئاگر سووتێنەرە". جا ئەگەر "ڕووناکی" بوو ئەوا دڵ و چاویان کوێر دەکات، خۆ گەر ئاگریش بوو ئەوا بەرگ و پۆشاك و گیانیشیان دەسووتێنێت..

چونکە ئەو ڕووناکییەی ئەوان بە ئاگری تێدەگەن لە ڕاستیدا "نووری بەختەوەری"یە[2]، لە هەر شوێنێك هەڵبێت ناکوژێتەوە، تەنانەت گەر هەزاران کوندە

---

(١) ئەوەی ناو کەوانەکە دانەر خۆی لە چاپەکانی دواییدا زیادی کردووە. (وەرگێڕ)

(٢) لێرەشدا هەستی بە "پەیامەکانی نوور" کردووە، بەڵام لە پشت پەردەی سیاسەتەوە بۆی ڕوانی و، شێوەی حەقیقەتی لێ گۆڕا. (دانەر)

خوێنی ملیۆنـەها خەڵکیشی بەسەردا بڕژێت. بگرە هەندێ کەسی ناو ئێمە لەم دوو ساڵەدا چەند جارێك هەوڵی دا بیکوژێنێتەوە، کەچی شکستی هێنا[1].

پ: تۆ وتت: "ئاگر" نییە.. بەڵام قسەکانت ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە ئاگر بێت!

و: بەڵێ، "ڕووناکی" بۆ خراپکاران "ئاگر"ە.

پ: سەبارەت بە کەسانی بەڕێز و باشی ناو ئەو پێڕە چی دەڵێیت؟

و: زۆر کەسی باش هەیە ڕەفتاری خراپ دەنوێنن و پێیـان وایـە کـارێکی بـاش ئـەنجام دەدەن.

پ: ئایا "باش" چۆن "خراپە"ی لـێ دەوەشێتەوە؟

و: داواکردنی شتی مەحاڵ گەوجییە و، ناکامییە بۆ خاوەنەکـەی. ئـەو کەسـەی بـە نیازی فڕین لە شاخێکەوە خۆی فڕێ بدات، بێ گومان پارچە پارچە دەبێت.

جـا ئـەو کەسـەی کـە ئامـانجی هێنانەکایـەی حکوومـەتێکی بـەری و بـێ تاوانـە، داواکارییەکەی مەحاڵێکی ئاساییە! لـە کـاتێکدا کـە نەگونجێ یـەك دانـە کـەس ئێستا بـەری و بێ گوناهـ بێـت، چۆن دەکرێ کەسی مەعنـەوی (حکوومـەت) کـە هـەموو گەردیلەکانی گوناهبارییە، بێ تاوان بێت؟!

کەواتـە لـەم گۆشـەیەوە دەبێ بۆ زاڵبوونـی چاکەکارییـەکانی حکوومـەت بەسـەر خراپەکانیدا – چ لە ڕووی چەندایەتی و چ لە ڕووی چۆنێتییەوە – بڕوانرێت.

من ئەوانـە بـە ئـاژاوەچی دادەنێـم و دەیـانبینم. چونکـە ئەگـەر یـەکێك لەوانـە – خـوا نەخواستە – هەزار ساڵ بـژی و وێنـەی مومکـین و گونجـاوی حکوومەتـەکانی ئـەو مـاوە درێژخایەنە ببینێت، بە هیچیان ڕازی نابێت. لەبـەر ئـەو بۆچوونـەی لـە ئەندێشـەیدایە بـۆ حکوومەتی بەری و بێ تاوان! ئیتر ئەو خـەیاڵ و ئەندێشـەیە ئـارەزووی وێرانکـاریی تێـدا دروست دەکات و ئەو وێنە گونجاوانە دەدڕێنێت[2].

---

(١) ئەوانەی هەوڵیان دا بیکوژێننەوە، خۆیان کوژانەوە*! (دانەر)

* ئەو حیزبەی بیست و پێنج ساڵ ئازاری "سەعید"ی دا، بە کوژانەوە و نەمانی خۆی، ئـەو ستەمکارییەی پشت ڕاست کردەوە. (دانەر)

(٢) ئەو دەمـە وەك ئـەوەی کـەمالیزم و سـەردەمی کوودەتاکـەیانی بینیبێـت، کـە لـە واتـایدا کۆمۆنیسـتی و ئاژاوەگێڕییە، ئاوەها هەواڵیان لەبارەوە دەدات! (دانەر)

هەر لەبەر ئەوەیە کە تەنانەت ئەندامە خراپکارەکانی "جۆن تورك"یش - کە بە حسابی ئەوان خراپکارن - ئەو جۆرە کەسانە بە دەستەیەکی ئاژاوەچی و گێرەشێوێن دادەنێن، چونکە لەبەر ئەوەی داوای شتێکی مەحاڵ دەکەن، ئەوا ئەنجامی کارەکەیان خراپکاری و تێکدانی ئاسایشە!

پ: بۆچی نابێ ئەو حکومەتەی کە ئەوان بە دوایدا وێڵن، ئەوەی سەردەمی پێشوو بێت؟

و: من یاسایەکی کورتە بالای بڵند هیممەت بە گوێی ئێوەدا دەدەم، کە دەتوانن بیپارێزن. دەسا فەرموون ڕاوێژی پێ بکەن.. کە بریتییە لەوەی:

(ئەو حاڵەتە مەحاڵە. جا یان ئەوەیە کە بەم حاڵە ڕازی بن، یان تیا دەچن و نامێنن)..

* * *

**پ: کەواتە ئایا جارێکی تر پادشایەکی وەکو سوڵتان عەبدولحەمید ناچێتەوە سەر حوکم و تەختی پادشایەتی؟ ئایا ئەو بارودۆخەی پێشوومان چیتر بۆ پێش نایەتەوە؟**

**و: ئەگەر ئەم چادرە ڕەشەی کە تیایدان پارچە پارچە بکرێت و بسووتێنرێت، ئنجا سووتووەکەشی بدرێت بە بادا، ئایا دەگونجێ سەرلەنوێ یەك چادری تر لەو سووتووە دروست بکرێت و لەناویدا دابنیشین؟**

**پ: بۆچی؟**

**و: چونکە پێشتر لە کاتێکدا کە لەناو هەزار کەسدا دە کەسیان وریا و بە ئاگا بوون، ئیستیبداد بەو هێزە سامناکەی خۆیەوە نەیتوانی خۆی لە بەردەمیاندا ڕابگرێت، ئەوەبوو وردوخاش بوو.. خۆ ئێستا هێزی ئیستیبداد لە هەزارەوە بۆ یەك دابەزیوە و، وریایی و وروژانی بیرکردنەوەی خەڵکیش لە یەکەوە بۆ هەزار زیادی کردووە.**

**پ: مادەم ئیستیبداد هێندە خراپە، ئەدی بۆچی هەموو کەسێ بە جۆرێك لە جۆرەکان بەکاری دەهێنا؟**

**و: چونکە چێژێکی بێ خێر و نەگبەتی فێرعەونانە و، حەز و ئارەزوویەکی نەمرودانەی تێدا بوو.**

**پ: لەم ڕۆژگارەی ئێستاماندا زۆر شتی پێچەوانەی شەریعەت دەکرێت؟**

**و: بە بڕوای من ئەو شتانەی کە پێچەوانەی شەریعەتن، دژی مەشرووتییەتیشن. ئەوانە یان گوناھ و تاوانەکانیانە، یاخود ئەوەیە کە "پێویستی" زۆری بۆ هێناون.**

**گریمان سیاسەتیش شتێکی ناتەبا بێت لەگەڵ شەریعەتدا، هەر دیسان پێویست بە ترس و پەشۆکان ناکات، چونکە لە هەزار بەشی شەریعەتدا یەك بەشی پەیوەندیی بە سیاسەتەوە هەیە. بە پشتگوێ خستنی ئەو بەشە، شەریعەت پشتگوێ ناکەوێت.**

**بەڵێ، نەگونجان لەگەڵ شتێکدا و نەکردنی بە نموونە بۆ خۆت، ئینکاری کردن ناگەیەنێت لەو شتە.**

**خۆ پازدە هێندەی ئەو موسڵمانانەی کە لە قەڵەمڕەوی عوسمانیدان، موسڵمان هەن کە بە تەواوی لە ژێر دەسەڵاتی سیاسەتی بیانییەکاندان. ئەوەش زیانی بۆ ئایینەکەیان نییە.**

**مادەم وایە، ئیتر سەبارەت بەو شوێنەی کە حکومەتەکەی موسڵمان و ئەو میللەتەش کە حوکمی دەکات میللەتێکی موسڵمانە، ئنجا سەرجەم بناغەکانی سیاسەتیش ئەم دەستوورەیە کە دەڵێت: "ئیسلام ئایینی دەوڵەتە و پاراستنی ئەرکی سەرشانمانە، چونکە مایەی شانازیی نەتەوەکەمانە"، ئەوا هەرگیز زیانێکی ئەوتۆ بە بیردا نایەت کە ڕوو لە ئایینەکەمان بکات[1].**

* * *

پ: ئایا لەمەولا حکوومەت لە خزمەتی ئیسلام و بەهێزکردنی ئاییندا بەردەوام دەبێت؟

و: بەڵێ، بەوپەڕی شادمانییەوە. چونکە، جگە لە چەند مولحیدێکی نەزان کە لەناو حکوومەتدان، ئامانجی حکوومەت – هەرچەندە پەنهانە و لە ئێمەوە دوورە – پارێزگاری لێکردنی زنجیرەی نوورانیی ئیسلامە و، بەهێزکردنی پەیوەندییەکانیەتی کە بەهۆی نهێنیی برایەتیی ئیمانەوە سێ سەد ملیۆن موسڵمان دەکات بە یەك قەوارە. چونکە هەر تەنها ئەو برایەتییە ئیمانییە "خاڵی پشت پێ بەستن" و "خاڵی یارمەتی لێ وەرگرتن"ی سەرجەمی موسڵمانانە. نابینی دڵۆپەکانی باران و بریسکەکانی ڕووناکی هەتا پەرتەوازە بن و لە یەك دابڕێن خێرا وشك دەبنەوە و دەکوژێنەوە؟

---

(١) ئەم چەند بڕگە و پرسیار و وەڵامەی کە لەسەرەوە بە فۆنتی جیاواز نووسیمان، دانەر لە چاپە تازەکاندا لایبردوون و، تەنها دوا بڕگەی بەم جۆرەی خوارەوە داناوەتەوە:
(چونکە حکوومەت موسڵمانە و، ئەو نەتەوەیەش کە حوکمی دەکات نەتەوەیەکی موسڵمانە. ئنجا بناغەی سەرجەم بناغەکانی سیاسەتی حکوومەتیش ئەم دەستوورەیە کە: "ئیسلام ئایینی دەوڵەتە". کەواتە ئەرکی سەرشانی ئێمە پاراستنی ئەم بناغەیەیە، چونکە کاکڵەی ژیانی نەتەوەکەمانە). (پەراوێزی وەرگێڕ)

بۆیە پەروەردگاری مەزن بانگمان دەکات و پێمان دەفەرموێ: ﴿وَلا تَفَرَّقُوا﴾ (آل عمران:١٠٣) ، ﴿لا تَقْنَطُوا﴾ (الزمر:٥٣) تاکو نەیەڵێت بکوژێینەوە یاخود تیابچین.

بەڵێ، ئاواز و زایەڵەکانی ﴿لا تَقْنَطُوا﴾ لە شەش ڕووەوە بە دەم یەکەوە دەڕۆن: ناچاری.. کێش بوون.. مەیل بەلای یەکتردا.. ئەزموونەکان.. بە دەم یەکەوە چوون.. تەواتور..

هەموو ئەمانە، ئەو دڵۆپ و بریسکە پەرتەوازانە بە تەوقە و دەست لە ملی یەکتر کردن کۆ دەکاتەوە و، ماوەی نێوانیان دەپێچێتەوە و، حەوزە ئاوێکی ژیانبەخش پێکدەهێنن و، ڕووناکییەك دەهێننە کایەوە کە سەرانسەری جیهان ڕۆشن بکاتەوە. چونکە ئایین: جوانیی گەردوون و، ڕووناکیی بەختەوەری و، گەشە کردنی هەست و نەستە بەرزەکان و، سەلامەتیی ویژدانە[1].

پ: ئێستا لەبارەی "سەربەستی"یەوە پرسیارت لێ دەکەین.. ئایا ئەم سەربەستییە چییە کە لێکدانەوە جۆراوجۆرەکان بەلای خۆیاندا کێشی دەکەن و، خەونی نامۆ و سەیر و سەمەرەی پێوە دەبینرێت؟

و: ئەو کەسەی بیست ساڵ لەگەڵ شەبەنگی سەربەستیدا ژیابێت و، تەنانەت لە خەونەکانیشدا شوێن پێی هەڵگرتبێت و، لە پێناویدا دەستی لە هەموو شتێك داشۆردبێت، دەتوانێ وەڵام بداتەوە، چونکە شارەزای وەسفەکانیەتی..

پ: "سەربەستی"یان بە جۆرێکی هەڵە بۆ لێکداینەوە، وەك بڵێی مرۆڤ لە سایەیدا هەر چەشنە هەرزەیی و کردارێکی بەد و بێ ئابڕوویی بکات لێپرسینەوەی لەسەر نەکرێت، مادەم زیانی بە خەڵك نەگەیاندبێت..

بەم شێوەیە سەربەستییان تێگەیاندووین؟ جا ئایا بەم جۆرەیە؟

و: ئەو کەسانەی کە بەو جۆرە لێکیان داوەتەوە، تەنها ئەوەیان کردووە کە بە ئاشکرا و لە پێش چاوی خەڵکیدا پەردەیان لەسەر هەرزەیی و ڕەفتارە چەپەڵەکانی خۆیان لاداوە! ئەوانە بەو چەنەبازییە دەچن بە وێنەی مناڵ بیانووی لاواز دەهێننەوە،

(١) لەسەرخۆبە! ئەمانە چەند ئاماژەیەکیان تێدایە کە وەکو پەرلە(شفرە) وایە. (دانەر)

چونکە سەربەستیی قەشەنگ و جوان ئەوەیە کە پابەند بێت بە ئادابی شەریعەت و، بە ڕەوشت بەرزی‌یەکانی شەرع ڕازابێتەوە..

دەنا ئەوە نی‌یە کە لە هەرزەیی و کرداره بەد و چەپەڵەکانداییە. بەڵکو ئەوە هەڵسوکەوتێکی ئاژەڵانە و، خۆسەپاندنێکی شەیتان ئاسایە و، بەند بوونە لە دیلیی دەروونی بەدخوازدا!

سەربەستیی گشتی ئاکامێکی وەهایە کە لە ئەنجامی سەربەستیی تاکە کەسەکانەوە بەدەست دێت و، سروشتی وایە کە زیان نە بە خۆی و نە بە خەڵکانی تر ناگەیەنێت.

(على أنَّ كمالَ الحريةِ، أن لا يتفرعنَ، وأن لا يستهزئَ بحريةِ غيرِه، إنَّ المرادَ حــقٌ لكنَّ المجاهدةَ ليست في سبيلِها)[1]!

واتە:(سەربەستیی تەواوەتی لەوەدایە کە مرۆڤ نەبێت بە فیرعەون و، گاڵتە بە ئازادی و سەربەستیی کەسانی تر نەکات. مەبەست"موراد"ەکە حەقە، بەڵام تێکۆشان"جیهاد"ەکە لە پێناوی ئازادی و سەربەستیدا نی‌یە)!

پ: زۆر کەسمان بینی کە بە وێنەی ئەم لێکدانەوەیەی تۆ "سەربەستی" لێك ناداتەوە. جگە لەمەش، کرداری هەندێ لە ئەندامانی "جۆن تورك" دژی لێکدانەوەکەی تۆیە و، گوفتارەکانیشیان پێچەوانەی گوفتارەکانتە، چونکە هەندێکیان لە ڕەمەزاندا بەڕۆژوو نابن و ئارەق دەخۆنەوە و واز لە نوێژ دەهێنن..

جا کەسێك خیانەت لە خوای گەورە بکات و لە گوێڕایەڵیی فەرمانەکانیدا ڕاست نەکات، گەلێ دوورە لەگەڵ نەتەوەدا ڕاست بکات.

و: بەڵێ، حەق لای ئێوەیە.. بەڵام "پەروەشی" جیایە لە "کردار".

من پێم وایە گەر دڵ و ویژدان بە ڕەوشتە بەرزەکانی ئیسلام نەڕازێنەوە هەرگیز چاوەڕوانیی پەروەشیی ڕاستەقینە و، وەفای ڕاست و، دادگەریی خاوێن و بێگەردی لێ ناکرێت.. بەڵام لەبەر ئەوەی "سنعەت" جیایە لە "ڕەوشت بەرزی" ئەوا ڕێ دەکەوێ کەسێکی لە ڕێ ترازاو بە ڕێکوپێکی شوانی مەڕومالات بێت و، ئارەق خۆرێك بە باشی سەعات چاك بکاتەوە کاتێ کە مەست نەبێت.

---

(١) لەسەرخۆبە! مەبەستی ئەم ڕستەیە ئەوەیە کە "موراد"ی خاوەنی ڕۆژنامەی (میزان) لەسەر حەقە و، "حسەین جاهید"ی سەرنووسەری ڕۆژنامەی (تەنین) هەڵە و ناحەقە. (دانەر)

بەڵام بە داخەوەم بۆ دەگمەنیی ئەو کەسانەی کە هەردوو ڕووناکیی‌یەکەیان پێکەوە کۆکردبێتەوە: ڕووناکیی "دڵ" و ڕووناکیی "هزر و بیر".. یان بە دەستەواژەیەکی تر: "ڕەوشت بەرزی" و "سنعەت"! چونکە ئەو جۆرە کەسانە هێندە کەم و دەگمەنن کە بەشی پڕکردنەوەی کارمەندی‌یەکان ناکەن. کەواتە یان باشیی کەسەکە، یان کارامەیی لە سنعەتدا. خۆ ئەگەر تەنها یەکێك لەم دوانە لەو کەسەدا هەبوو، حساب بۆ کارامەیی سنعەتەکەی دەکرێت.

ئنجا ئەوەش بزانن کە ئەو کەسە هەرزە ڕەفتارانەی وازیان لە نوێژ هێناوە "جۆن تورك" نین، بەڵکو "شەین تورك"ن. واتە خراپکار و ڕافزین! کەواتە ئەوانە "ڕافزیی جۆن تورك"ن. جا هەروەك هەموو شتێ ڕافزیی خۆی هەیە، ڕافزیی "سەربەستی"ش هەرزە و خراپکارانن.

دەسا ئەی کورد(و تورك[1])ەکان! بەویژدان بن! ئایا گەر کەسێکی ڕافزی فەرموودەیەکی پیرۆز بە خراپی لێکبداتەوە، یان کردار بە پێچەوانەی ئەو فەرموودەیە بکات، ئایا دەست بە ڕووی فەرموودەکەوە دەنرێت و ئینکاری دەکرێت؟ یان دەبێ لە پێناوی پاراستنی پلە و پایە و ڕێزی فەرموودە پیرۆزەکەدا ڕافزی‌یەکە بە هەڵە دابنرێت؟

دەبا بزانین "سەربەستی" بریتی‌یە لەوەی کە مرۆڤ لە هەڵسوکەوتە ڕەواکانیدا جڵەوی بۆ شل بکرێت و، دەستدرێژی نەکرێتە سەری و، مافەکانی پارێزراو بن و، کەس لە کاروباری کەسی تردا خۆی هەڵنەقورتێنێت، تاکو واتای ئەو نەهی‌یەی خوای گەورەی تێدا دەرکەوێ کە دەفەرموێ: ﴿ولا يَتَّخِذَ بعضُكُم بعضاً أرباباً مِنْ دونِ اللهِ﴾ (آل عمران: ٦٤).. هەروەها جگە لە یاسای "دادگەری" و پابەند بوون بە ئەدەب، هیچ شتێکی تر فەرمانی بە سەردا نەسەپێنێ، تاکو "سەربەستی"ی برایانی تێك نەدات.

پ[2]: کەواتە ئێمەی دەشتەکی چ کارێکمان پێیەتی؟ خۆ ئێمە هەر لە دێر زەمانەوە سەربەستین و، ئازادیمان — بە وێنەی منداڵی دووانە — لەگەڵدا لە دایك بووە. کەواتە با کەسانی تری جگە لە ئێمە دڵیان پێی خۆش بێت.. ئەم باسە پەیوەندیی بە ئێمەوە نی‌یە!

---

(١) ئەوەی ناو کەوانەکە دانەر لە چاپەکانی دواییدا زیادی کردووە. (وەرگێڕ)

(٢) ئەمە پرسیاری دەشتەکی‌یە ڕەوەندەکانە کە لە ڕەشماڵەکاندا نیشتەجێن. (دانەر)

و: بەڵێ، بەهۆی خۆشەویستیی ئازادی و سەربەستییەکەتانەوەیە ئێوە دەتوانن بەرگەی ئەو گیروگرفتانەی ژیانی دەشتەکێتی بگرن کە لە توانای کەسدا نییە. هەروەك ئەو ڕەفتارانەتان، کە ئاوێتەی قەناعەتە، پێویستیی ئێوەی نەخستووەتە لای لایەنە جوانەکانی شارستانێتی.

بەڵام ئەی دەشت نشینان! بزانن کە ئەو سەربەستییەی لای ئێوە هەیە نیوەیەتی.. نیوەکەی تری بریتییە لە دەست نەدان لە سەربەستی و ئازادیی کەسانی تر. ئنجا ئەوەش بزانن کە ئەو سەربەستییەی ئاوێتەی ژیانی دەشتەکێتی و گوزەرانی مایەی بژێوە، تەنانەت بەشێکی لە لای ئاژەڵانی کێویی ناو هەرد و دەشتەکانیشدا هەیە. لە ڕاستیدا هەر چێژ و دڵنەواییەك گەر لای ئەو ئاژەڵانە هەبێت تەنها لەو سەربەستییەدایە.

بەڵام ئەو سەربەستییەی ئێوە لە کوێ و ئەو ئازادییە مرۆڤانەیەش لە کوێ کە وەك خۆر درەخشانە و، هەموو گیانێك شەیدایەتی و، هاوتای جەوهەری ئادەمیزادە و، لەسەر کۆشکی بەختەوەریی شارستانێتی دانیشتووە و، بە پۆشاکی زانیاری و خشڵ و ئاکاری بەرز و پەروەردەی ئیسلامی ڕازاوەتەوە.

پ: لەبارەی ئەم سەربەستییەی تۆ باسی دەکەیت، وتراوە:

حُـــرِيَّةٌ حَـــرِيَّةٌ بالنَّارِ   لأنَّها تَخْتَصُّ بالْكُفَّارِ[1]

ڕات چییە بەرامبەر بەم وتەیە؟

و: ئەو شاعیرە هەژارە "سەربەستی" بە ڕێبازی بەلشەفی و ڕێچکەی بەرەڵایی تێگەیشتووە. نەخێر.. بەڵکو سەربەستی سەبارەت بە مرۆڤ بەندایەتیی ئەو بۆ خوای گەورە بەرهەم دەهێنێت..

کەسانێکی زۆرم بینی هێرشیان دەکردە سەر "سوڵتان عەبدولحەمید" زیاتر لەو هێرشەی کە دەیانکردە سەر "ئازادیخوازەکان"[2] و، دەیان وت:

---

(١) واتە:

ئازادییەکە شایستەی ئاگر   چونکە تایبەتە بە پێڕی کافر

(وەرگێڕ)

(٢) (ئازادیخوازەکان) حیزبێکی ڕکەبەری دەستەی "ئیتیحاد و تەرەقی" بوون لەو ماوەیەی پێش لابردنی سوڵتان عەبدولحەمیدەوە هەتا بە تەواوی ئیتیحادییەکان دەستیان بەسەر حوکمدا گرت. (وەرگێڕ، لە چاپە عەرەبییەکەوە)

(گەلێ هەڵە بووە کە سی ساڵ پێش ئێستا "سەربەستی" و "یاسای بنەڕەتی"ی[1] پەسەند کرد).

جا ئایا ئێوە ڕا و بۆچوونتان بەرامبەر بەو کەسە چی‌یە کە ئەو "ئیستیبداد"ەی سوڵتان عەبدولحەمید ناچار بوو بیکات بە "سەربەستی" دادەنێت و، لە تاو ئەو "یاسای بنەڕەتی"یەش لەرزی لێ دێت کە ناوێکی بێ ناوەرۆکە؟ ئایا نرخی ئەو قسەیەی چەندەیە؟ لەگەڵ ئەوەشدا، موجاهیدێك - کە بیست ساڵ خزمەتی پێشکەش بە ئایینی ئیسلام کرد - وتوویەتی:

حُـــرِيَّةٌ عَطِيَّةُ الرَّحمـــنِ    إِذْ إِنَّها خاصِيَّةُ الإِيمانِ[2]

پ: چۆن چۆنی "سەربەستی" بە تایبەتمەندیی "ئیمان" دادەنرێت؟

و: ئەو کەسەی بە پەیوەستی "ئیمان" پەیوەندی بە پادشای گەردوونەوە دەکات و دەبێت بە بەندەی، سۆز و شەفەقەتی ئیمانەکەی لەوە خاوێنتر دەبێت کە دەستدرێژی بکاتە سەر ئازادیی کەسانی تر. هەروەك سەربەرزی و جوامێریی ئیمانەکەی لەوە بەرز و بڵندتر دەبێت کە بە زەلیلی سەر بۆ خەڵکانی تر نەوی بکات و خۆی بخاتە ژێر ڕکێف و خۆسەپاندنیان.

بەڵێ، خزمەتگوزارێکی ڕاست و دڵسۆزی پادشا، خۆی زەلیل و ژێردەستەی خۆسەپاندنی شوانێك ناکات، هەروەك دانابەزێتە ئەو ئاستەش کە دەستەڵات و زەبر و زەنگی خۆی بەسەر هەژارێکی لاوازدا بسەپێنێت. کەواتە بە ئەندازەی هێزی ئیمان "سەربەستی"یەکەشی دەبریسکێتەوە و درەخشان دەبێت. باشترین سەدە.. چەرخی بەختەوەری.. کە چەرخی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانە - خوایان لێ ڕازی بێت - باشترین نموونە و شایەتە لەسەر ئەمە.

پ: بەڵام ئەم سەربەستی‌یە لە ئێمەوە گەلێ دوورە! چونکە ئێمە چۆن دەتوانین بەرامبەر بە کەسایەتی‌یە مەزنەکان، یان ئەولیا و پیاوچاکان و زانا گەورەکان، ئازاد و

---

(١) مەبەست لە یاسای بنەڕەتی "دەستوور"ە. (وەرگێڕ)

(٢) پێناسەیەکی جوانە*! (دانەر)

* واتە:

ئازادی‌یەکە بەخششی ڕەحمان    چونکە وەسفێکە تایبەت بە ئیمان

(وەرگێڕ)

سەربەست بین؟ ئایا ئەوان بەهۆی تایبەتمەندی‌یەکانیانەوە مافی ئەوەیان نی‌یە لە کاروبارماندا خۆیان بسەپێنن؟ ئێمە چۆن لە ژێر تینی تایبەتمەندی و تەوژمی ئاکارە بلندەکانیاندا نابین؟

و: ویلایەت و شێخایەتی و مەزنایەتی، داخوازی "تەوازوع" و "دەستبەرداری"ن لە هەموو شتێ. ئەم دوانەش لە پێداویستی‌یەکانی بەرزایەتی و کەمالی مرۆڤن، نەك خۆ بە گەورە زانین و خۆسەپاندن. جا هەر کەسێ خۆی بە گەورە بگرێ، مانای وایە منالێکی خۆ بەتەمەن زانە، ئێوەش مەیکەن بە گەورەی خۆتان!

پ: بۆچی خۆ بە گەورە زانین نیشانەی بچووك بوونەوەیە؟

و: هەموو کەسێك پەنجەرەیەکی هەیە؛ لێیەوە دەڕوانێت و لە کۆمەڵ دەردەکەوێت. ئەویش پلە و پایەی ڕێز و ناوبانگە.. جا ئەگەر ئەو پەنجەرەیە لە بالآی توانا و لێهاتنی بەرزتر بوو، ئەوا بە "تەکەببور" بالآی نرخ و بەهای خۆی درێژ دەکات.. بەلآم گەر پەنجەرەکە لە بالآی هیممەتی ئەو نزمتر بوو، ئەوا بە "تەوازوع"ەوە خۆی دەنوشتێنێتەوە و دادەنەوێت تا لەو پلەیەدا دەبینێت و دەشبینرێت!

پ: زۆر باشە.. بەوە ڕازی بووین کە "سەربەستی" جوان و قەشەنگە. بەلآم سەربەستیی (ڕۆم و)[1] ئەرمەنەکان ناشیرین و ئالۆز دەبینرێن و، هانمان دەدەن بۆ دوودلی و نیگەرانی.. ئایا ڕات بەرامبەر سەربەستیی ئەوان چی‌یە؟

و: یەکەم: سەربەستیی ئەوان لەوەدایە کە ستەمیان لێ نەکرێ و حەوانەوەیان تێك نەدرێت، کە ئەمەش فەرمانی شەرعە. بەلآم لەوە زیاتر هەرچی بێت، دەستدرێژیی ئەوانە بۆ سەر هەلەشەیی و ڕەفتاری خراپی ئێوە، یان قۆزتنەوەی نەزانیتانە.

دووهەم: گەر ئازادیی ئەوان – وەك ئێوە دەلێن – زیانتان پێ بگەیەنێت، ئەوا ئێمەی موسلمان دووچاری زیان نەبووین، چونکە ژمارەی ئەرمەنەکان کە لەناو ئێمەدا دەژین ناگاتە سێ ملیۆن و، هەموو ناموسلمانەکانیش لەناوماندا ناگەنە دە ملیۆن، کەچی نەتەوەی موسلمان و برایانی ڕاستەقینە و هەمیشەییمان لە سێ سەد ملیۆن زیاترن، بەلآم بە سێ کۆت و زنجیری سامناکی ئیستیبداد پابەندن و بەستراونەتەوە و، لە ژێر ئەو ئیستیبدادە مەعنەوی‌یەی بیانی‌یەکاندا موسلمانان دەپلیشێنەوە.

(١) ئەوەی ناو کەوانەکە دانەر لە چاپەکانی دواییدا زیادی کردووە. (وەرگێڕ)

بەم جۆرە، سەربەستی و ئازادیی ناموسڵمانەکان - کە لقێکە لە سەربەستی و ئازادیی ئێمە - پێشەکی و باج و سەرانەیە بۆ ئازادی و سەربەستیی سەرجەمی نەتەوەکەمان و، هەڵگری ئەو ئیستیبدادە مەعنەوی‌یە ترسناکەیە لەسەرمان و[1]، کلیلی کردنەوەی ئەو کۆت و زنجیرانەیە و، لابەری ئەو خۆسەپاندنە مەعنەوی و سامناکەشە کە بیانی‌یەکان خستوویانەتە سەر شانمان.

بەڵێ، ئازادیی قەڵەمڕەوی عوسمانی، پێشەکی و پیشاندەری بەختی ئاسیای مەزن و، کلیلی بەختەوەریی ئیسلام و، بناغەی شوورای یەکێتیی ئیسلامی‌یە.

پ: ئەو سێ پێوەندە چین کە "ئیستیبدادی مەعنەوی" جیهانی ئیسلامیی پێ بەستووەتەوە؟

و: بۆ نموونە: ئیستیبدادی حکومەتی ڕووسیا پێوەندێکە.. خۆسەپاندنی گەلی ڕووس پێوەندێکی ترە.. زاڵبوونی نەریتە ستەمکار و کافرانەکەیان بەسەر نەریتە ئیسلامی‌یەکاندا پێوەندێکی تری سێهەمە..

هەروەها حکومەتی ئینگلیز هەرچەند وا دەردەکەوێ کە خۆسەپێن نەبێت، بەڵام لە ڕاستیدا خۆسەپێنە و، داب و نەریتەکانیشی زاڵ و بەدەستەڵاتن. فەرموون ئەوە "هیندستان" بەڵگەیەکە لەسەر ئەمە و "میسر"یش نیو بەڵگەیە.

ئایا هێشتا ئەوە نەسەلماوە کە نەتەوەی ئیسلامیی ئێمە بە سێ کۆت و زنجیر پێوەند کراوە، یان بە پێوەند و نیوێك؟ ئێمەش بەرامبەر بەوە تەنها پێوەندێکی درۆینە و وەهمی و لاوازمان هەیە کە خستوومانەتە پێی ناموسڵمانەکانی ناوخۆمان و، لە بریی ئەوەش گەلێ نازمان هەڵگرتن. ئەوەتا وەچە و سامانیان زیادی کرد و، وەچە و سامانی ئێمەش لە بەرامبەرەوە کەم بوونەوە، بەهۆی ئەوەی "کارمەندی" - کە جۆرێکە لە کاری خزمەتگوزاری - هەروەها "سەربازی"ش تایبەت کران بە خۆمانەوە.

بیری میللی(نەتەوایەتی)[2] باوکی "سەربەستی"یە، دیلەکانیش تەنها کورد و تورکەکان بوون.

---

(١) دەبوو ئەم گوفتارەی دوای چل و چوار ساڵ بوتایە، کەچی ئەو کاتە وتی! (دانەر)

(٢) مامۆستای دانەر لە لاپەڕەکانی دواتردا بەوە پێناسەی دەکات کە: (میللی‌یەتی ئێمە بوونێکی سەربەخۆیە؛ "گیان"ەکەی ئیسلام و "ژیری"شی قورئان و ئیمانە). (وەرگێر، لە چاپە عەرەبی‌یەکەوە)

بەم جۆرە ئەو كۆت و زنجیرە درۆینەیە لە پێی سێ ملیۆن یان دە ملیۆن دەكەینەوە، تاكو بوار برەخسێ و ڕێگا خۆش بێت لە بەردەم سەربەستیی سێ سەد ملیۆن موسڵماندا كە بە سێ كۆت و زنجیر پێوەند كراون[1]. بێ گومان كەسێ ئێستا سێ ببەخشێ و ماوەیەكی تر سێ سەد بباتەوە هەرگیز تووشی زیان نەبووە.

[وسيأخذُ الإسلامُ بيمينه مِنَ الحجةِ سيفاً صارماً جزاراً مُهَنَّداً.. وبشمالِه من الحرِّيةِ لُجامَ فَرَسٍ عربي مُشْرِقِ اللونِ.. فالقاً بفأسِه وقوسِه رؤوسَ الإستبدادِ الذي به انْـــدَرَسَ بساتينُنا][2].

واتە: (لە ئایندەدا ئیسلام شمشێرێكی تیژی بە بڕشت لە بەڵگە سەلمێنەرەكان بە دەستی ڕاستی هەڵدەبڕێ و، بە دەستی چەپیشی جڵەوی سەربەستیی ئەسپێكی عەرەبیی ڕەنگ گەش دەگرێتە دەست و، بە كەوان و تەورەكەشی سەری ئیستیبداد دوو كەرت دەكات كە باخ و بێستانەكانی ئێمەی لەناو برد).

پ: ئای چەندە ئەم بۆچوونە لە ڕاستییەوە دوورە! چۆن سەربەستیی ئێمە دەبێت بە پێشەكی بۆ سەربەستی و سپێدەی ڕاستی جیهانی ئیسلام؟

و: لە دوو ڕووەوە:

**یەكەم:**

ئەو ئیستیبدادەی لەناو ئێمەدایە بەربەستێكی سامناكی ستەمكارانەی لە بەردەم ئازادیی ئاسیا دانابوو. كەواتە هەرگیز ڕووناكیی ئازادی ناتوانێت لە ناوەندی ئەو پەردە چڕە تاریكەوە بڕواتە دەر و چاوان بكاتەوە و ئاكارە تەواوەكان پیشان بدات. بەڵام بە تێكچوونی ئەم بەربەستە، بیری ئازادی و سەربەستی بڵاو بووەوە و دەشبێتەوە تا دەگاتە چین. (بەڵام چین زیادەڕەویی تێدا كرد و بوو بە شیووعی)[3].

---

(١) سوپاس بۆ خوا ئێستا خەریكە دەست بە كردنەوە دەكەن. (دانەر)

(٢) چاوی پێدا بگێڕەوە؛ چونكە چەند برگەیەكن پەرلەیان لەخۆ گرتووە. وەك بڵێی هەواڵی پەیدا بوونی كۆمەڵە پەیامەكانی نوور دەدەن، وەك: "زولفەقار"، "حجة الله البالغة".. هەروەك هەواڵی گەلە موسڵمانەكان ڕادەگەیەنێ، چەشنی: یەمەن و میسر و جەزائیر و هیند و فاس (مەغریب) و قەفقاس و فارس و عەرەب. (دانەر)

(٣) لە (آثار بديعية) دا ص: ٥٣١ (چ ٢) ئەوەی ناو كەوانەكە لە پەراوێزدا دانراوە. (وەرگێڕ)

جا لەبەر ئەوەی لە تەرازووی جیهاندا تای "ئازادی" قورسی هێناوە، ئەوا بە تەواوەتی وەحشیگەری و ئیستیبدادی تاکەی تری هەڵگرتووە و، بە ڕۆشتن و بەسەرچوونی کات دەڕۆن و نامێنن.

ئەگەر ئێوە لاپەڕەی بیر و هزرەکان بخوێننەوە و، لە ڕێگاکانی سیاسەت ڕامێنن و، گوێ لە گوتاربێژە گشتییەکان - واتە ئەو ڕۆژنامانەی هەواڵی ڕاست بڵاو دەکەنەوە - ڕابگرن، ئەوا دەزانن کە لە ئەنجامی هەڵچوون و قوڵپدانی بیرۆکەی "ئازادی" ئاڵوگۆڕێکی مەزن و سەرسووڕهێن لە هزر و بیری جیهانی ئیسلامیدا و، پێشکەوتنێکی فیکری و، بێداربوونەوەیەکی تەواوەتی لە جیهانی عەرەب و هیند و جاوە و قەفقاس و ئەفریقیا و هاوچەشنیاندا هاتووەتەدی.

خۆ ئەگەر لەو پێناوەدا سەد ساڵمان لە نرخ و بەهایدا بدایە هەر هێشتا هەرزان بوو، چونکە ئازادی "میللییەت"ی دەرخست و ئاشکرای کرد و، وردە وردە جەوهەری نوورانیی ئیسلام لە صەدەفەی میللییەتدا دەرکەوت.

ئنجا بە بزووتنی ئیسلام و جموجووڵەکەی ڕایگەیاند کە: موسڵمان یەك بەشی تاك و بەرباد و تەنها نییە، بەڵکو بەشێکە لە پێکهاتەیەکی ئاوێتە و بەرەوسەر کە لە ڕووی هێزی کێشی گشتیی ئیسلامەوە پەیوەندیی سیلەی ڕەحمی لەگەڵ سەرجەم بەشەکانی تردا هەیە.

ئەم هەواڵە هیوایەکی بەهێز دەبەخشێ بەوەی کە خاڵی پشت پێ بەستن و خاڵی یارمەتی وەرگرتنمان لەوپەڕی توندوتۆڵی و تۆکمەییدایە. هەر ئەم هیوایەش ورەی ئێمەی زیندوو کردەوە، دوای ئەوەی کە "نائومێدی" گیانی کێشابوو.

جا ئەم ژیانەی کە لە بیرۆکە و چەمکی سەربەستییەوە بەدەست هاتووە و ئەم چەمکەی تێدا قوڵپ دەدات، لەمەولا سەرجەم پەردەکانی ئیستیبداد دەدڕێنێ کە بەسەر هەموو جیهانی ئیسلامیدا زاڵە[1]. (بە کوێرایی چاوی باوکی نائومێدی).

ڕووی دووهەم:

تا ئێستاش بیانییەکان بە چەند بروبیانوویەکی لاواز و بێ نرخ نەتەوەکەمان بە فڕوفێڵ ژێر دەست و زەلیل دەکەن. بەڵام ئێستا بەڵگەیەکی ئەوتۆیان بە دەستەوە نەماوە

---

(١) سوپاس بۆ خوا، دوای چل و پێنج ساڵ ئەو پەردانە دەستیان بە دڕان کرد. (دانەر)

کار بکاتە سەر دەماری مرۆڤایەتی‌یان، یاخود دەمارەکانی دەمارگیری‌یان بورووژێنێت، یان ژێ فێڵبازە خەڵەتێنەرەکانیان ببزوێنێت. خۆ ئەگەر هەر بیانوویەکیش بدۆزنەوە ناتوانن بیکەن بە بەهانە. چونکە یەکێك لە خواستەکانی شارستانێتی و تایبەتمەندی‌یەکانی: خۆشویستنی مرۆڤایەتی‌یە.

پ: ئای چەندە بۆچوونێکی دوورە! لە کوێ ئەم هیوا مەزنەی کە دڵی ئێمەی پێ خۆش دەکەیت لەو مارە ترسناکانەی دەوروبەرمان چاوەڕوان دەکرێت کە دەمیان واڵا کردووە تاکو ژەهرەکانی خۆیان بەناو ژیانماندا بپرژێنن و، دەوڵەتەکەمان پارچە پارچە بکەن. کە ئەمەش کارێك دەکات ئەو هیوا و ئاواتە گەشە بگۆڕێت بە نائومێدی‌یەکی ڕەش و تاریك[1]؟

و: مەترسن. وا هەریەك لە (شارستانێتی و فەزیلەت و ئازادی) خەریکە باڵ بەسەر جیهانی مرۆڤایەتیدا دەکێشن، کە ئەمەش تای تەرازووەکەی ئەوی قورس کردووە، دیارە بەرامبەر بەمە تاکەی تر وردە وردە کێشی سووك دەبێت.

بە گریمانی مەحالیش گەر وا دابنێین کە - خوا نەخواستە - ئەوان ئێمەیان کوشت و پارچە پارچەیان کردین، دڵنیا بن کە لەو کاتەدا دەمرین تەنها بیست کەسین، بەڵام کە زیندوو دەبینەوە سێ سەد کەسین و، تەپوتۆزی ڕەفتارە نزمەکان و دووبەرەکی لە خۆمان دەتەکێنین و، یەکدەگرین و، ڕێزی شایانی ئەرکی سەرشانمان دەزانین و، ئاڵاکە وەردەگرین تاکو سەرکردەیی کاروانی مرۆڤایەتی بگرینە ئەستۆ.

جا ئێمە لەم مردنەی کە ژیانێکی توندوتۆڵتر و بەهێزتر و بەردەوامترمان بۆ بەرهەم دێنێ، ناترسین. تەنانەت گەر بیشمرین، ئەوا خۆ ئیسلام بە زیندوویی و بێ وەیی دەمێنێتەوە. دەسا هەر بژی ئەو ئایینە پاك و پیرۆزە.

* * *

**پ: ئەرمەنی‌یەکان "زیممی"ن. ئایا چۆن دەگونجێ ئەوان کە زیممین و ئێمەش کە زیممەتیانین، یەکسان بین؟**

**و: ئێمە نابێ لە ئاوێنەی دێوێکی گەورەوە بۆ خۆمان بڕوانین. گوناهەکە هی ئێمەیە کە نەمانتوانی ئەوان بگرینە خۆمان و بە ڕاست و دروستی دادگەریی شەرعی**

(١) پرسیارێکی سەرسووڕهێن و خاوەن حەقیقەتە. (دانەر)

پیشان بدەین. چونکە نەمانتوانی بە ڕەفتارە بەدەکانی ئیستیبداد پارێزگاری لە مافە شەرعی‌یەکانی ئەوان بکەین. لە دوا کاتیشدا کە ویستمان ئەو کارە ئەنجام بدەین، هێزمان نەمابوو! بۆیە منیش ئەرمەنەکان وەك "زیممییی موعاهەد" (پەیمان لەگەڵ بەستراو" دەبینم.

پ: لە کاتێکدا ئەرمەنەکان دوژمنایەتی و فێڵکاری و خیانەتمان لەگەڵدا دەکەن، چۆن دەکرێت یەکبگرین و هەموو هاودەنگ بین لەسەر دۆستایەتی کردنیان؟

و: ئەو ئیستیبدادەی کە هۆکاری دژایەتی بوو، مرد. بە نەمانی ئیستیبدادیش دۆستایەتی بۆ خۆی دێتە ژیان.

با بە دڵنیاییەوە ئەوەتان پێ بڵێم:

بێگومان بن لەوەی کە ژیانی ئاسوودەی ئەم نەتەوەیە وابەستەی دۆستایەتی کردنە لەگەڵ ئەرمەنەکاندا. بەڵام نەك دۆستایەتیی زەلیلانە، بەڵکو بریتی‌یە لە درێژکردنی دەستی چاکسازی و چاکخوازی بۆیان، هاودەم لەگەڵ پاراستنی سەروەریی نەتەوەیی.

با شتێکتان پێ بڵێم:

ئەگەر بگونجێت لە ناکاودا "با" ئەرمەنی‌یەکان لە لاپەڕەی "بوون"دا بسرێتەوە، ئەوا لەوانەیە دوژمنایەتی تەنها یەك سوودی هەبووبێت بۆتان.

لە ڕاستیدا "دوژمنایەتی" بە تەواوی بریتی‌یە لە زیان. نەك هەر تەنها نەمانی ڕەگەزێك، کە لە سەردەمی ئادەمەوە لە گەڵمان هاتوون و لە ڕێ و باندا هاوڕێمان بوون، بەڵکو سڕینەوەی نەتەوەیەکی بچووکیش کارێکی مەحاڵە.

هۆزی "عەمر دەللان" هەزار ساڵە هەر عەمر دەللانە. وا ئەوان ڕاپەڕیون، کەچی ئێوە تا ئێستاش لە خەوی بێ ئاگاییدان و خەون دەبینن..

ئەوان لەسەر بیری نەتەوایەتیی خۆیان یەکگرتوو و بەهێزن، بەڵام ئێوە بەهۆی دووبەرەکی‌یەوە لاواز و بەتاڵن.

ئەگەر دەتانەوێ پێشیان بکەون، ئەوا دەبێت بە هەمان چەك بجەنگن، ئەو چەکەی کە ئەوان بەکاریان هێناوە و بەهۆیەوە پێشتان کەوتن. واتە دەتوانن بە چەکی "ژیری" و "بیری نەتەوایەتی" و "ئارەزووی پێشکەوتن" و"مەیلی دادگەری" شکستیان پێ بهێنن.

بە بڕوای من ئەوەی کە ئەمڕۆ شمشێر بەکاردەهێنێت بۆ ئەوەی لە خەڵکی بدات، ڕۆژێك دێت کە ئەو شمشێرە دەگەڕێتەوە و لە هەتیوەکانی خۆی دەدات.

ئەمڕۆ سەرکەوتن بە شمشێر نی‌یە. ڕاستە پێویستە شمشێر هەبێت، بەڵام دەبێ بە دەستی "ژیری"یەوە بێت!

دوای ئەوەش چەند هۆکارێك هەن بۆ ئەوەی ئێوە دۆستایەتییان بکەن:

ئەوان دراوسێتانن. "دراوسێیەتی"ش دراوسێی دۆستایەتی‌یە.

**وا ئـەوان لەخـەو ڕابـوون و بـە دنیـادا بڵاوبوونـەوە و، تۆوەكـانی پێشـكەوتنیان كۆكردووەتەوە، لە داهاتووشدا لە وڵاتی ئێمەدا دەیچێنن و، ناچاری شارستانێتی و پێشكەوتنمان دەكەن و، بیری نەتەوایەتیشمان تێدا بێدار دەكەنەوە.**

**هەر لەبەر ئەمانەیە كە پێویستە لەگەڵیاندا ڕێك بكەوین.**

**دوژمنـە ڕاستەقینەكانمان كە ئێمـەیان لـەناوبرد، بریتـین لـە: "نـەزانی ئاغـا" و، كوڕەكـەی: "زەرووڕەت ئەفـەندی" و، كوڕەزاكـەی: "دوژمنایـەتی بـەگ"! كاتـێ ئەرمەنـەكان دوژمنایـەتیی ئێوەیـان دەكـرد ئێـوە لـە ژێـر فـەرماندەیی ئـەو سـێ خراپكارەدا بوون[1].**

* * *

پ: چۆن لەگەڵ نامو‌سڵمانەكاندا یەكسان دەبین؟

و: یەكسانی لە فەزیلەت و شـەرەفمەندیدا نییـە، بـەڵكو لـە مافەكاندایـە. ئـەوەتا لـە ڕووی مافەكانەوە پادشا و هەژار یەكسانن.

بە خوا گەلـێ سەیرە! ئایا ئەو شەریعەتەی كە نەهیی لە ئازاردانی مێروولە كـردووە و فەرمانی داوە بە ئەنقەست پێی پێدا نەنرێت، ئایا مافی ئادەمیزاد پێشێل دەكات؟ نەخێر!

بەڵام ئێمەین كە شەریعەتمان لە خۆماندا بەرجەستە نەكردووە.

ئایا بۆ ڕاستكردنەوەی هەڵەكەتان ئەوە سەروزیاد نییە كە مـیری ئیمـانداران ئیمـامی عـەلی - خـوای لـێ ڕازی بێـت - لەگـەڵ جوولەكەیـەكی هـەژار پێكـەوە لـە بـەردەم دادوەردا دادگـایی كـران؟ هـەروەها صەلاحـەددینی ئـەییوبی - كـە مایـەی شـانازیتانە - لەگەڵ دیانێكی هەژاردا وەك یەك لە بەردەم دادگادا ئامادە بوون[2]؟

---

(١) ئەم چەند برگە و پرسیار و وەڵامەی كە لەسەرەوە بە فۆنتی جیاواز نووسیمان، دانـەر لـە چاپـە تازەكـاندا لایبردوون. (وەرگێڕ)

(٢) لەو كاتەدا كە سەعیدی كۆن بە حەماسەتەوە لە پێنـاوی "ئـازادی"دا تێدەكۆشـا و، سیاسـەتی كردبـوو بـە هۆكـارێك بـۆ خزمـەتی ئیسـلام، لەسـەر بناغـەی ئـەو هیـوا بـەهێز و دڵدانـەوە تـەواوەی كـە لـە تایبـەتكاریی درەخشانی "نوور"دا پرشنگ دەدات و، بە هەستێكی لە جـۆری هەسـتی پێـش وەخـت پـەیی بـەوە بردبـوو كـە: ئیستیبدادێكی ڕەهـا و ترسـناك و دوور لـە ئـایین بەڕێوەیـە. كـە ئەوەشـی لـە واتـای فەرموودەیـەكی پـیرۆز وەرگرتبوو. ئیتر پەنجا ساڵ پێش ڕوودانی، هەواڵی لە بارەوە دا. ئنجا هەسـتی كـرد ئـەو هەواڵـە دڵخۆشـكەر و هیوا و ئاواتە گەشانە، ماوەی بیست و پێنج ساڵ ئەو ئیستیبدادە ڕەهایە بـە درۆی دەخاتـەوە. لەبـەر ئـەوە، سـێ ساڵ پێش ئێستا دەستی لە سیاسەت هەڵگرت و، وتی: "أعوذ بالله من الشیطان والسیاسة" و، بوو بە سـەعیدی نوێ. (دانەر)

پ: بەخشینی ئازادی بە ڕۆم و ئەرمەن نیگەرانمان دەکات، چونکە جارێك دەستدرێژی دەکەنە سەرمان و، جارێکی تر شانازیمان بەسەردا دەکەن و، دەڵێن: ئازادی و مەشرووتیەت بەرهەمی کۆششی ئێمەیە. ئیتر ئێمە لە چاکەی ئەو ئازادییە بێ بەش دەکەن.

و: لام وایە سنوور بەزاندنی ئێستایان لە داخی ئەوەیە کە گومانیان وایە ئێوە لە ڕابوردوودا دەستدرێژیتان کردووەتە سەریان.. یان خۆنواندن و هەڕەشەیەکە لە لایەن ئەوانەوە بەرامبەر بەو دەستدرێژییەی کە بە وەهمی خۆیان ئێوە لە داهاتوودا دەیکەنە سەریان.

جا ئەگەر ئەوان متمانەیان پێ کردن و لەوە دڵنیا بوون کە هیچ دەستدرێژییەکیان ناکەنە سەر، ئەوا بێ گومان مل بۆ دادگەری دەنەوێنن و باوەڕی پێ دەهێنن.

خۆ ئەگەر ئەو قەناعەتەشیان بۆ پەیدا نەبێت، ئەوا "حەق" بە هێزی خۆی لووتیان پێ نەوی دەکات و بە ناچاری بەرەو ئەو قەناعەتە دەیانداتەبەر.

ئەو وتەیەشیان کە دەڵێن:

"ئێمە مەشرووتیەتمان بەدەست هێنا"..

درۆیەکی ئاشکرایە.. چونکە تەنها بە نێزەی سەربازەکانمان و، قەڵەمی کۆمەڵگاکەمان، کە هەڵگری گیانی نەتەوەیە، ئازادی و مەشرووتیەت هاتە کایەوە.

تەنانەت ئامانجی ئەوانە و چەنەبازەکانی هاوچەشنیان "ناناوەندی(اللامركزية)ی سیاسی" بوو کە ئامۆزای "میرنشینی" و "خود موختاری"یە. لەگەڵ ئەوەشدا لە سەدا نەوەدی ئەوان شوێنمان کەوتن و، پێنج لە دەی ئەوانەش کە مانەوە چەنەبازی دەکەن. ئەوانی تریش دەستیان دایە پۆزش هێنانەوە و نایانەوێ لە وەهمەکانی ڕابوردوویان لابدەن.

پ: چۆن ئاماژەمان پێ دەدەیت بە خۆشویستنی جوولەکە و دیانەکان، لە کاتێکدا کە قورئانی پیرۆز نەهیی ئەوەی لێ کردووین، بە دەقی ئایەتی: ﴿لاَ تَتَّخِذُوا الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى أَوْلِيَاءَ﴾ (المائدة:٥١)؟

و: یەکەم: هەروەك دەبێ بەڵگە "قطعي المتن" بێت، دەبێ "قطعي الدلالـــة"ش بێت. لەگەڵ ئەوەشدا بواری گریمان دانان و تەئویل هێنانەوەی تێدایە، چونکە نەهییەکەی

قورئان "گشتی" نییە، بەڵکو "ڕەها"یە. خۆ "ڕەها"ش هەندێ جار بە "بەستین"(قەید)ێك سنووری بۆ دادەنرێت، ئنجا زەمانیش موفەسسیرێکی مەزنە، گەر "بەستێن"ەکەی دەرخست ئەوا ئیتر هیچ ڕەخنەیەکی لێ ناگیرێت..

هەروەها ئەگەر حوکمێك لەسەر "موشتەق" بنیات نرابێت ئەوە دەگەیەنێت کە چاوگی "موشتەق"ەکە عیللەتی ئەو حوکمەیە. جا بەو پێیە ئەو شتەی کە لەم ئایەتەدا نەهیی لێ کراوە خۆشویستنیانە لە ڕووی ئایینەکەیانەوە کە ئایینی جولەکە و دیانە..

هەروەها مرۆڤ لەبەر خۆی مایەی خۆشەویستی نییە، بەڵکو لەبەر سیفەتەکەی یاخود سنعەتەکەیەتی. چونکە هەروەك مەرج نییە هەموو سیفەتێکی موسڵمان وەك خۆی موسڵمان بێت، بە هەمان جۆر مەرج نییە هەموو سیفەت و سنعەتێکی مرۆڤی کافر وەك خۆی کافر بێت..

لەسەر ئەم بناغەیە دەڵێم:

بۆچی دەبێ دروست نەبێ سیفەتێکی موسڵمانانە، یاخود سنعەتێکی موسڵمانی ئەو کافرە وەرنەگرین؟ خۆ ئەگەر هاوسەرێکی "کیتابی"ت هەبێت بێ گومان خۆشت دەوێ!

دووهەم: لە سەردەمی بەختەوەریی ژیانی پێغەمبەری ئازیزدا ﷺ ئاڵوگۆڕێکی مەزنی "ئایینی"ی ئەوتۆ ڕووی دا کە هەموو بیر و زەینەکانی بەرەو لای ئایین ئاراستە کرد، ئیتر هەموو هەست و نەست و سۆزێك بە ئایینەوە پەیوەست بوو.. "دوژمنایەتی" و "خۆشەویستی" لە تەوەرەی ئاییندا دەخولانەوە. لەبەر ئەوە، بۆنی نیفاق لە خۆشویستنی کەسێکی ناموسڵمان دەهات.

بەڵام ئەم ئاڵوگۆڕە سەیر و سەمەرەیەی ئێستا کە لە جیهاندا ڕووی داوە ئاڵوگۆڕێکی "شارستانی" و "دنیایی"یە، ئەوەتا شارستانێتی و پێشکەوتنی دنیایی سەرجەمی ژیرییەکان بەلای خۆیاندا کێش و سەرقاڵ دەکەن و، هەموو بیر و زەینەکانی پێوە گرێ دەدەن. ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە ناموسڵمانەکان هەر لە بناغەدا بە گەرموگوڕی پابەندی ئایینەکەیان نین!

لەسەر بناغەی ئەمە، دەڵێم:

ئەو خۆشویستنەمان بۆیان تەنها بریتییە لە وەرگرتنی ئەو شتانەی کە لە شارستانی و پێشکەوتنی ئەواندا بە دڵمانە و، بە مەبەستی پاراستنی سیستەم و ئاسایشی وڵاتە کە

بنچینەی بەختەوەریی دنیان. کەواتە ئەم هاوڕێیەتی‌یە هەرگیز ناڕواتە ناوەندی نەهی‌یەکەی قورئانی پیرۆزەوە.

پ: هەندێ کەس لە دەستەی "جۆن تورك" دەڵێن: بە گاڵتە پێ کردنەوە بە دیانەکان مەڵێن: "ئەی کافر" چونکە ئەوان ئەهلی کیتابن!

ئایا بۆچی نابێ بە کافر بڵێین: "ئەی کافر"؟!

و: وەك ئەوەی کەسێك کە چاوێکی نابینا بێت، پێی ناڵێن: "ئەی یەکچاو"! تاکو ئازاری پێ نەگات، چونکە نەهی کراوە لە ئازاردانیان، وەك لە فەرموودەدا هاتووە:

(من آذى ذمياً.. الخ)[1].

پاشان "کافر" دوو واتای هەیە:

یەکەم: ئەو واتا باوەیە کە خێرا بە زەیندا دێت، کە ئەو کەسەیە ئینکاریی بوونی بەدیهێنەر بکات و، مولحیدی بێ ئایین بێت. دیارە مافی ئەوەمان نی‌یە کە ئەم واتایە بۆ ئەهلی کیتاب بەکاربهێنین.

دووهەم: ئەو کەسەیە کە ئینکاریی پێغەمبەری مەزنمان ﷺ و ئایینی ئیسلام بکات. ئێمە مافی ئەوەمان هەیە کە ئەم واتایە بۆ ئەوان بەکاربهێنین و، خۆیشیان پێی ڕازین..

بەڵام لەبەر ئەوەی کە لەگەڵ وتنی وشەکەدا، بەهۆی داب و نەریتەوە، ڕاستەوخۆ واتای یەکەم بە زەیندا دێت، ئەوا بووە بە وشەیەکی سووکایەتی و ئازاردان. جگە لەمەش، هیچ پێویستی‌یەکی ناچاری لە ئارادا نی‌یە بۆ تێکەڵ کردنی بازنەی "باوەڕ" لەگەڵ بازنەی "مامەڵە"دا.

لەوانەیە هەر ئەمەش مەبەستی ئەو بەشەی ئەندامانی "جۆن تورك" بووبێت.

پ: زۆر جار هەواڵی دڵتەزێن و ڕووداوی ناخۆش دەبیستین، بە تایبەت لە ناموسڵمانەکانەوە، وەك ئەوەی کە یەکێکیان ژنێکی موسڵمانی مارە کردبێت.. هەروەها فلان و فلان شت لە شوێنێکدا و.. فیسار و فیسار لە شوێنێکی تر و.. ئەو شتە لە جێ‌یەکدا ڕووی دا.. هتد..

(١) فەرموودەکە بە تەواوی بەم جۆرەیە: (من آذى ذمياً فأنا خصمه). رواه أبو داود عن عدة أبناء أصحاب رسول الله ﷺ. قال في المقاصد: وسنده لا بأس به. بڕوانە: العجلوني: كشف الخفاء ٢/٢٨٥ (٢٣٤١)؛ الخطيب البغدادي: تأريخ بغداد ٨/٣٦٧؛ الذهبي: ميزان الإعتدال ٢/٣٨١؛ السخاوي: الأجوبة المرضية ١/١٧، ٢/٤٣٥؛ الشوكاني: الفوائد المجموعة ٣١٣. (وەرگێڕ، لە چاپە عەرەبی‌یەکەوە هێناویەتی)

و: بەڵێ، ڕوودانـی ئـەم شتە نـاخۆش و خراپانـە و هاوشێوەیان – بـە داخـەوە – وەك شتێکی نـاچـارییان لـێ هـاتووە لـە دەوڵـەتێکی نوێـی دانەمـەزراودا و، لـە نەتەوەیـەکی نەزان و دواکەوتوودا.

دەبێ بزانین کە لە ڕابوردوودا لەمانە ناخۆشتریش ڕووی داوە، بەڵام لـە ئێمـە پەنـهان بووە و ئێستا پێش چاو کەوتووە. خۆ هەر نەخۆشییەك دەربکەوێت، چارەسەری ئاسـان دەبێت.

هەروەها ئەو کەسەی کە لە شتە مەزنەکاندا جگە لە کەموکوڕییەکان هیچ شتێکی تـر نـابینێت، بـە هەڵـەدا دەچێـت و بـە هەڵەشـەیی چەپـەڵی خـۆی خـەڵکانی تریـش دەخەڵەتێنێـت. چونکە ئەم ڕەفتارە دەبێتە هـۆی ڕوانـدن و وەبـەرهێنانی یـەك خراپـە تـاکو بەسەر چاکەکارییەکاندا زاڵ ببێت.

. . . [1]

جـا ئەو ڕەفتارە سـەیرەی کە لەم هەڵەشـــەییەوە پـەیدا دەبێـت، بریتییـە لـەوەی شـتە پەرش و بڵاوەکانی ناو کات و شوێنە جیاجیاکان پێکەوە کۆدەکاتەوە و لە ناوەندی ئـەو پەردە ڕەشەوە دەڕوانێتە شتان.

بە ڕاستی هەڵەشەیی – بە هەموو جۆرەکانیەوە – بووە بـە مەکینـە و کارگـەی شـتانی سەیر و نامۆ. نابینی عاشقێکی هەڵەشە و جەربەزە چۆن بوونەوەران لە سەما و پێکەنین و خۆشەویستی و کێشبووندا بۆ یەکتری دەبینێت و، دایکێکی خەمبار بە مردنی منداڵەکەی چـۆن بوونـەوەران لـە بـەرچاویدا بـە جـەرگ سـووتاوی خـەمناك و چـاو بـە گریـان دەردەکەوێت؟

دیارە هەرکەسە بەری ئەو حەزەی دەچنێتەوە کە پێی خۆشە و بۆی دەگونجێ.

وا نموونەیەکتان لەسەر ئەمە بۆ دەهێنمەوە:

سەرنج بدەن، گەر کەسێك لە ئێوە بڕواتە ناو باخێکی ڕەنگین و جوان، کـە پـڕ بێـت لە گوڵ و بەروبوومی جۆراوجۆر، تاکو بۆ ماوەی سەعاتێك بگەڕێت و بحەسێتەوە. لـە چەند شـوێنێکی باخەکەشـدا چـەند چەپـەڵی و بۆگەنییـەك هـەبوو – چونکـە بوونـی

(١) لەم شوێنەی چاپە کۆنەکەدا دانەر نموونەیـەکی بـۆ نزمیـی چێـژی هـەندێ کـەس هێناوەتـەوە، تـاکو مایـەی بێزلێکردنەوە بێت. خۆی لە چاپە تازەکاندا لایـبردووە. ئێمـەش وەك خـۆی بـە کـارێکی شیاومان نـەزانی ئـەو نموونەیە دابنێین. (وەرگێڕ)

"ناتەواوی" شان بە شانی "تەواوی" شتێکە لە داخوازییەکانی ئەم جیهانەیە و، جگە لە بەهەشت هیچ شتێك لە ناتەواوی بەدەر نییە - ئەو کەسە لەبەر چەوتییەك لە میزاجیدا، تەنها بە دوای بۆگەنەکاندا دەگەڕا و تەنها بۆ شتانی پیس و چەپەڵی دەڕوانی، وەك بڵێی لەوانە زیاتر هیچ شتێك لەو باخە دڵگیرەدا نەبێت..

ئنجا بەهۆی گومان و ئەندێشەوە، ئەو خەیاڵە نارێکە لە پێش چاویدا هێندە فراوان دەبێت و گەشە دەکات تا ئەو ڕادەیەی کە سەرانسەری باخە ڕەنگینەکەی لێ دەبێت بە قەسابخانەیەکی پۆخڵ و سەرەنوێلکێکی پیس و چەپەڵ. ئیتر تووشی ورِی و گێژ بوون دەبێت و، دڵی تێکەڵ دێت و، دەست بە ڕشانەوە دەکات و، بەرەو دوا دەگەڕێتەوە!

جا ئایا ڕووی گەشی "دانایی" و "بەرژەوەندی" بەم چەشنە خەیاڵ و ئەندێشانە ڕازی دەبن کە چێژ و لەزەتی ژیانی مرۆڤ لێڵ و تاڵ دەکەن؟

ئایا نابینن کەسێ بینینی بۆ شتان جوان بێت ڕەفتار و بیرکردنەوەشی جوان دەبێت و، ئەو کاتەش خەونەکانی خۆش و جوان دەبن و لەزەت لە ژیانی وەردەگرێت[1]!

پ: لە کوێ دروستە ناموسڵمان بکرێت بە سەرباز و بخرێتە ناو ڕیزەکانی سوپا؟

و: بە چوار ڕوو:

یەکەم:

"سەربازی" بریتییە لە جەنگ.. خۆ ئێوە دوێنێ لەگەڵ ورچێکی کەتە و زەبەلاحدا کەوتنە جەنگەوە و، ژنان و منالان و تەنانەت قەرەچ و سەگیش، یارمەتییان دان و پشتیان گرتن.

ئایا ئیتر هیچ خراپییەك یان هیچ عەیب و عارێکی تێدایە؟

دووهەم:

پێغەمبەر ﷺ لە نێوان "بت پەرستان"ی عەرەبدا هاوپەیمانی هەبوو کە لەگەڵیدا دەڕۆشتن بۆ جەنگی دوژمنان. خۆ ئەمانە "ئەهلی کیتاب"ن. ئنجا لەبەر ئەوەش لەناو سوپادا پەرش و بڵاون و کۆ نین، ئەوا زۆریی زاڵی ئێمە و، ورە و هێزی هەست و نەستمان سنوورێك بۆ ئەو زیانە دادەنێن کە بە وەهمدا دێت.

---

(١) "مردن" جۆرێك "خەوتن"ە. (دانەر)

سێهەم:

لە سوپای دەوڵەتەکانی ئیسلامدا ناموسڵمان - با بە دەگمەنیش بوو بێت - لە سوپادا بەکارهێنراون. سوپای "ئینکیشاری"[١] بەڵگەیە لەسەر ئەمە.

**چوارەم:**

**هۆی دواکەوتنی ئێمە و پێشکەوتنی ناموسڵمانەکان لە ڕووی نەوە و سامانەوە، بریتییە لەوەی کە لای ئێمە "سەربازی" تایبەت بووە بە خۆمانەوە!**

**چەند سەدەیەك پێش ئێستا ژمارەی موسڵمانان لەم دەوڵەتەدا لە چل ملیۆن زیاتر بوو، ئەو ناموسڵمانانەش کە ئێستا لەناوماندان ئەو کاتە ژمارەیان پێنج تا شەش ملیۆن دەبوو.**

**ئەو کاتە بازرگانی و سەروەت و سامان بە دەستی ئێمەوە بوو.**

**بەڵام ئێمە کەوتین و ژمارەمان بۆ بیست ملیۆن دابەزی و، کەوتینە لیتاوی "هەژاری"یەوە. ئەوانیش لە ژێر پێی هەژاری ڕزگاریان بوو و سواری سەروەت و سامان بوون و، ژمارەیان بۆ دە ملیۆن زیادی کرد.**

**هۆکاری هەرە گرنگی ئەوەش بریتی بوو لەوەی کە - بۆ نموونە - ئەگەر تۆ چوار کوڕت هەبێت، جاری لەبەر "سەربازی" ژن ناهێنن. خۆ ئەگەر بیهێنن ئەوا بە ئەرکی زۆری مەئموورییەت دەچن بۆ هەموو شوێنێك و بە وێنەی بێچووەپشیلە هەموو شوێنێك دەگەڕێن، ئیتر ئەوەی تۆ لە ژیانتدا دەستت کەوتووە ئەوان بە زایەی دەدەن.**

**ئەگەر بەڵگەشت دەوێت، فەرموو بڕۆ بۆ "وان" و لە دەرگای ماڵە ئەرمەنییەك و ماڵە موسڵمانێك بدە و، تەماشا بکە!**

---

(١) سوپای ئینکیشاری ڕێکخراوێکی سەربازی بوو کە دامەزرێنەری دەوڵەتی عوسمانی: (ئۆرخانی کوڕی عوسمان ١٣٢٦-١٣٦١ز) دایناوە. سەرەتا لە چەندین بنەچە و ڕەگەزی جۆراوجۆر پێکهاتبوو کە لە بنەماڵە و کەسوکاریان دابڕ کرابوون و، جگە لە سوڵتان کەس باوك و فەرماندەیان نەبوو. سوپایەکی پیشەگەر و کاری تەنها ڕاپەڕاندنی ئەرکی سەربازی بووە. ئەم ڕێکخراوە سەربازییە لە سەرەتادا خزمەتێکی زۆری پێشکەش بە دەوڵەتی عوسمانی کرد. پاشان وردە وردە گەندەڵیی تێدا پەیدا بوو تا گەیشتە ئەو ڕادەیەی کە گرفتێکی گەورەی بۆ دەوڵەت پێکهێنا و چارەسەر کردنیشی گەلێ دژوار بوو، بەڵام سوڵتان مەحموودی دووهەم (١٨٠٨-١٨٣٩ز) توانیی هەڵی بووەشێنێتەوە و "سیستەمی نوێی سەربازی"ی لە بری دانا، کە سیستەمێکە هەوڵی تازەگەریی دا لەناو سوپای عوسمانیدا. بڕوانە: (الدولة العثمانية من الميلاد إلى السقوط) د. عدنان العطار. ص: ٢٣-٢٤، ١٣٧-١٣٨، ط١. دار القلم دمشق. ٢٠٠٦م. هەروەها: (الدولة العثمانية، عوامل النهوض والسقوط) د. علي محمد الصلابي. ص: ٦٧-٧٠، ٣٧٠-٣٧٢، ط٥. دار المعرفة، بيروت، لبنان. ٢٠٠٨م. (وەرگێڕ)

**بێگومان دەبینیت ماڵە ئەرمەنییەکە دە بەڵگەی بەهێزیت پیشان دەدات و، ماڵە موسڵمانەکەش دوو بەڵگەی لاواز بۆ پەند لێ وەرگرتن دەخاتە ڕوو**[1]!

پ: ئەو کاتە "دەوڵەمەندەکان" موسڵمانان و، ئەوانی تر "هەژارەکان" بوون.. کەچی بابەتەکە ئێستا لە هەموو شوێنێك پێچەوانە بووەتەوە..

ئایا چ حیکمەتێك لەمەدا هەیە؟

و: بە پێی زانیاریی من ئەمە دوو هۆکاری هەیە:

**یەکەم:**

خاوبوونەوە لە هەوڵ و کۆشش و حەز پێ نەکردنی، بە پێچەوانەی ئەو وانەیەی کە لەم ئایەتە پیرۆزە وەردەگیرێت: ﴿وَأَنْ لَيْسَ لِلإِنْسَانِ إِلاَّ مَا سَعَى﴾ (النجم: ٣٩)، هەروەها کوژانەوەی پشکۆی شەوقی کار و کەسابەت کە لەم فەرمانەی پێغەمبەر ﷺ وەردەگیرێت: (الكاسب حبيبُ الله)[2].

ئەمەش لە ئەنجامی تەڵقینداان و پێشنیاز کردنی هەندێ لە واعیزە نەزانەکان.. ئەوانەی کە نازانن بەرزکردنەوەی ئاڵای ئیسلام لەم ڕۆژگارەدا پشت بە پێشکەوتنی ماددی دەبەستێت. هەروەها لە نرخ و بەهای دنیا لەو ڕووەوە کە (کێڵگەی دواڕۆژە) تێنەگەیشتوون و، ئەو شتانەی کە خواستی سەدەکانی ناوەڕاست بوون لە خواستی سەدەکانی تر جیایان نەکردووەتەوە. ئنجا بە جیاوازیی نێوان دوو قەناعەتی دوور لە یەکیان نەزانیوە: قەناعەت لە هەوڵ و کەسابەتدا، کە باش نییە و زەم کراوە. قەناعەتیش لە داهات و پاداشتدا، کە باشە و پەسەند کراوە..

هەروەها جیاوازیی فراوانی نێوان ئەم دوانەیان بۆ دەرنەکەوتووە: "تەواکول" (واتە پاڵدانەوە) کە ناونیشانی تەمبەڵییە و، "تەوەککول" (واتە پشت بەستن بە خوا) کە لەپکەی ئیخلاسی ڕاستەقینەیە..

---

(١) ئەم ڕووەی چوارەم کە لەسەرەوە بە فۆنتی جیاواز نووسیمان، دانەر بۆ خۆی لە چاپە تازەکاندا لایبردووە. (وەرگێڕ)

(٢) ئەم وتەیە فەرموودە نییە. بەڵام نزیك لەم واتایە ئەم فەرموودەیە هاتووە: (ما أكلَ أحدٌ طعاماً قط خيراً من أنْ يأكلَ من عمل يده، وإنّ نبيّ الله داوادَ كان يأكل من عمل يده). رواه البخاري: رقم: ١٩٦٦. هەروەها بڕوانە: الطبراني: المعجم الأوسط ٣٨٠/٨؛ البيهقي: شعب الإيمان ٨٨/٢؛ القضاعي: الشهاب ١٤٨/٢. (وەرگێڕ، لە چاپە عەرەبییەکەوە هێناویەتی)

یەکەمیان: تەمبەڵی کردنە لە ڕێکخستنی "پیشەکییەکان" و، وەکو هەڵگەڕانەوە وایە لەو سیستەم و ڕێسایەی کە لەناو هۆکارەکاندا دانراون و، خواستی ویستی خوای گەورەن..

ئەوی تریان: پشت بەستنێکی ئیمانییە بە خوای گەورە بۆ بەدەست هاتنی "ئەنجامەکان". کە ئەمەش یەکێکە لە خواستەکانی ئیسلامەتی و، دەستی خاوەنەکەی بەرەو سەرکەوتن دەگرێت، تەنانەت لە ئەنجامەکانیشدا، بە مەرجێ خۆی لە تەقدیراتی خوای گەورەدا هەڵنەقورتێنێت.

جا ئەوان ئەم دوو شتەیان لە لا تێکەڵ بوو..

هەروەك لە پەیبردندا بە نهێنیی (أمتي .. أمتي)[1] بێ فیراسەت بوون و، لە حیکمەتی: (خير الناس أنفعهم للناس)[2] تێناگەن. هەر ئەوانەشن کە ئەو مەیلەیان تێکشکاند و ئەو حەزەشیان کوژاندەوە.

**هۆکاری دووهەم:**

بریتییە لەوەی کە بۆ ژیان و گوزەرانمان ڕێبازێکی ناسروشتیمان گرتووەتەبەر، ڕێبازێکی وا کە لەگەڵ تەمبەڵیدا بگونجێت و، ختووکەی لەخۆبایی بوونی مرۆڤ بدات و ئافەرینی بکات. ئەویش پشت بەستنە بە کارمەندیی حکوومەت بۆ ژیان و گوزەران. ئیتر ڕووبەڕووی سزای ئەو هەڵەیەمان بووینەوە کە بە دەستی خۆمان دووچاری بووین.

پ: چۆن؟

و: ڕێی سروشتی و ڕەوا بۆ بەدەستهێنانی مایەی ژیان و گوزەران بریتییە لە (پیشەسازی، کشتوکاڵ، بازرگانی). بەڵام ڕێگای ناسروشتی کارمەندیی حکوومەت و هەموو جۆرەکانی "میرایەتی"یە!

من پێم وایە ئەو کەسانەی "میرایەتی"یان - لە ژێر هەر ناوێکدا بێت - کردووە بە مایەی بژێوی خۆیان، لە ڕاستیدا لە ڕیزی سواڵکەرانی دەستەوسان و خەڵەتێنەر و

---

(١) رواه البخاري ومسلم والترمذي. (وەرگێڕ)

(٢) حديث حسن أخرجه القضاعي في مسند الشهاب وابن عساكر في تأريخ دمشق ٢/٤٢٠/٢ وانظر الصحيحة ٤٢٦ وصحيح الجامع الصغير وزيادته برقم ٦٥٣٨. (وەرگێڕ)

فێڵبازاندان. هەروەها لام وایە ئەو کەسەی دەڕواتە ناو ڕێبازی "کارمەندی" یان "میرایەتی"یەوە با تەنها لە پێناوی پەروەشی و خزمەتی نەتەوەدا بڕوات، دەنا گەر تەنها بۆ ژیان و سوودی خۆی بێت، ئەوا لە ڕاستیدا جۆرێك لە سوالکەری ئەنجام دەدات[1].

چونکە بە دڵنیایی دەرکەوت کە تایبەتکردنی "کارمەندی" بە خۆمانەوە سەروەت و سامانی ئێمەی بە زایە دا و بە دەستی ئیسرافی سپارد. هەروەك تایبەتکردنی "سەربازی" بە خۆمانەوە ڕۆڵە و نەوەکانی ئێمەی تەفروتووناى هەموو لایەك کرد. خۆ ئەگەر ئەم دیاردەیە هەر ئاوا بڕۆشتایە، ئەوا بە تەواوی تیا دەچووین و قڕ دەبووین.

لەسەر بناغەی ئەمە، مەسەلەی بردنی ئەوانە بۆ سەربازی، بەرژەوەندیی دەستنیشان نەکراو (مصلحة مرسلة)[2]ی نزیك لە "زەروورەت"ی تێدایە. وێڕای ئەوەی کە ئێمە تا بڵێی ناچارین بۆ ئەم کارە. خۆ (بەرژەوەندیی دەستنیشان نەکراو)یش لە ڕێڕەوی ئیمامی مالیکدا بە هۆکارێکی شەرعی دادەنرێت.

پ: چۆن دەگونجێ ئەرمەنی ببێت بە پارێزگار و قایمقام، وەك ئەوەی کە ئێستا ڕوو دەدات؟

و: وەك چۆن دەبێت بە سەعاتساز و میکانیکی و کارمەندی ژینگەپارێزی! چونکە مەشرووتیەت بریتی‌یە لە فەرمانڕەوایی نەتەوە. خۆ حکوومەتیش لە خزمەتکار زیاتر شتێکی تر نی‌یە.

ئەگەر مەشرووتیەت بە ڕاستی پیادە بکرێت، ئەوا قایمقام و پارێزگار لە خزمەتکارێکی کرێ گرتە بەولاوە زیاتر نین، ناموسڵمانیش نابێ بە سەرۆکی ڕەها بەسەر موسڵمانانەوە، بەڵام دەکرێ ببێت بە خزمەتگوزار.

خۆ ئەگەر وا دابنێین کارمەندی و میرایەتی جۆرێکی سەرۆکایەتی و گەورەیی بن، ئەوا بەشدار کردنی سێ هەزار ناموسڵمان لە گەورەیی و سەرکردایەتیماندا ڕێگای

---

(١) ئەی کارمەندان!

لەم گوفتارەی "سەعیدی کۆن" نیگەران مەبن کە چل و پێنج ساڵ پێش ئێستا وتوویەتی! (دانەر)

(٢) (المصالح المرسلة) بریتی‌یە لە هەر سوودێك لە ناوەندی ئامانجەکانی شەرعی ئیسلامدا بێت، بێ ئەوەی هیچ پشتگیرێکی هەبێ (لە دەقەکاندا) بە وەرگرتن یان وەرنەگرتن. بڕوانە: (ضوابط المصلحة في الشريعة الإسلامية) نووسینی زانای هاوچەرخی کورد: پرۆفیسۆر دکتۆر (محمد سعید رمضان البوطي) ص٣٣٠ ط٢، مؤسسة الرسالة، بيروت. (وەرگێڕ)

سەرکردایەتی دەکاتەوە لە بەردەم سێ سەد هەزار برای موسڵمانمان لە جیهاندا. دیارە ئەو کەسەی کە لە بەرامبەر "یەك" زیانەوە "هەزار" قازانج دەکات تووشی زیان نەبووە.

پ: ئەی ئایا نابینی هەندێ فەرمانی شەرع - بۆ نموونە - پەیوەندیی بە دانان و پشتگیریی (والی)ەوە هەیە؟

و: بێ گومان ئەو لایەنەی کە لەمەولا نوێنەری خەلافەتە: مەشیەخەتی ئیسلامی (و سەرۆکایەتیی کاروباری ئایینی)[1]یە و، شتێکی نایاب و خاوێن و بەرز دەبێت. هەروەك سەربەخۆ و چاودێر دەبێت بەسەر هەموانەوە.. ئەوەی کە ئێستا دەسەڵاتدارە تاکە کەس نییە، بەڵکو بیرورا گشتییەکانە. لەبەر ئەوە، پێویست بە (کەسایەتییەکی مەعنەوی)[2]ی وەك خۆی دەکات کە ئەمیندار بێت لەسەر دەرکردنی فەتوا.

* * *

**کەواتە کەسێتیی مەعنەویی ئەوەی کە ئێستا دەسەڵاتدارە - کە ئەنجومەنێکی پەرلەمانی زانستییە و، لە چل پەنجا زانای پایەبەرز و لێکۆڵەر لە هەر چوار مەزهەبەکە پێکهاتووە - ئەرکی ئەمینداریێتی لەسەر فەتوا بۆ کەسێتیی مەعنەویی نەوەکانی تر رادەپەڕێنێت.**

**خۆ ئەگەر کاربەدەست و موفتی لە یەك رەگەز نەبن، لە زمانی یەکتر تێناگەن. چونکە یەك کەسی تەنها ناتوانێت کەسایەتییەکی مەعنەوی بخەڵەتێنێت، یاخود شتی فێر بکات**[3].

* * *

پ: ئێمە لە مێژە و تا ئێستاش دەبیستین کە زۆربەی ئەندامانی "جۆن تورك" ماسۆنین، کە دوژمنایەتیی ئایین دەکەن؟

و: ئیستیبداد لە پێناوی هێشتنەوەی خۆیدا ئەم جۆرە پروپاگەندانەی خستووەتە ناوتانەوە[4]! بایەخ نەدانی هەندێکیان بە ئایین، پشتی ئەم گومانەی گرتووە و هێزی داوەتێ!

---

(١) ئەوەی ناو کەوانەکە دانەر خۆی لە چاپەکانی دواییدا زیادی کردووە. (وەرگێڕ)

(٢) ئەوەی ناو کەوانەکە دانەر خۆی لە چاپەکانی دواییدا زیادی کردووە، هەروەك ئەم برگە وەڵامەشی کورت کردووەتەوە. (وەرگێڕ)

(٣) ئەم دوو برگەیە کە بە فۆنتی جیاواز نووسیمان، دانەر بۆ خۆی لە چاپە تازەکاندا لایبردووە. (وەرگێڕ)

(٤) هەروەك ئەوانەی کە بیست و پێنج ساڵ ئیستیبدادی رەهایان دەکرد، ئایینداراکانیان بە "کۆنەپەرست" وەسف دەکرد، تاکو ئەو لە رێ ترازانەی پێ بشارنەوە کە هاودەمی ئیستیبدادی رەهایە! (دانەر)

بەڵام دڵنیا بن! ئەوانەیان کە نەرۆشتوونەتە ناو ماسۆنییەتەوە، ئامانجیان زیان گەیاندن نی‌یە بە ئایین، بەڵکو خزمەت کردن و دابین کردنی ئاسایشی نەتەوەیە. بەڵام هەندێکیان زیاد لە پێویست هێرش دەکەنە سەر ئەو دەمارپەرستی‌یە نەفرەت لێکراوەی کە شایانی ئایین نی‌یە.

وا دیارە ئێوە ناوی "جۆن تورك" لەو کەسانە دەنێن کە پێشتر چەند خزمەتێکیان پێشکەشی (سەربەستی و)[1] مەشرووتیەت کردووە، یان ئەوانەی کە بە سەربەستی و مەشرووتیەت ڕازی بوون.

بەڵام باش بزانن کە هەندێك لەوانە موجاهیدی ئیسلامن و هەندێکی تریشیان خۆیان بۆ سەلامەتی و ئاسایشی نەتەوە بەخت کردووە. بەشی هەرە زۆری ئەوان و پێکهێنەری گرێی ژیانیان لە غەیری ماسۆنی‌یەکانن و، زۆرینەی ئیتیحاد و تەرەقی لەوان پێکهاتووە. ئەوەتا بە ئەندازەی ژمارەی هۆزەکانی ئێوە شێخ و زانا لەناو ڕیزەکانی "جۆن تورك"دا هەیە؛ هەرچەندەش تاقمێکی هەرزە و خراپکاری ماسۆنیشیان لە نێواندایە، بەڵام ئەوانە ژمارەیان کەمە و لە سەدا دە زیاتر نابن. لە کاتێکدا کە نەوەد کەسەکەی تریان موسڵمان و باوەڕداری وەك ئێوەن. خۆ دیارە بڕیاریش بە گوێرەی زۆرینە دەردەکرێت..

کەواتە گومانی باشیان پێ ببەن، چونکە گومان خراپی زیان بە ئێوەش و بەوانیش دەگەیەنێت، بە پێی دەستووری:

[إن زين عين الرضا، حسن النظر باللطف والشفقة، وإن نور الفؤاد بالرفق والرحمة، ولقد سما على الحق باقدام التوفيق وسعد من اختار الاستضاءة بمصباح: "أنا عند ظن عبدي بي"[2].][3]

واتە: (جوانیی چاوی ڕازی بوون لە جوان ڕوانیندایە بە سۆز و نیانی، ڕووناکیی دڵیش لە نەرمی و میهرەبانیدایە. ئەو کەسەی ڕووناکیی لە فەرموودەی قودسیی: "أنا

(١) ئەوەی ناو کەوانەکە دانەر خۆی لە چاپەکانی دواییدا زیادی کردووە. (وەرگێڕ)

(٢) رواه البخاري ومسلم. (وەرگێڕ)

(٣) چاو بەم بڕگە عەرەبی‌یەی دواییدا بگێڕەوە، چونکە چەند پەرلەیەکی تێدایە و چەند ئاماژەیەکیشی لەخۆ گرتووە. (دانەر)

عنـــد ظـــن عبـــدي بي" وەرگرتووە ئەوا بە هەنگاوی سەرکەوتن بەرز بووەتەوە و بەختەوەریی بە دەست هێناوە).

پ: بۆچی گومانی خراپی ئێمە زیان بەوان دەگەیەنێت؟

و: چونکە زۆر کەسی ئەوان - وەکو ئێوە - لە ئیسلام نەکۆڵیونەتەوە تاکو بگەنە کاکڵەکەی، بەڵکو لە ڕێی چاولێکەری‌یەوە تەنها بە ڕواڵەتەکەی ئاشنا بوون. خۆ ئاشکرایە کە "چاولێکەری" خۆی ڕاناگرێ و بە هاویشتنی دوودڵـی و گومانەکان لەتوپەت دەبێت.

بۆ نموونە: گەر ئێوە بە هەندێك لەوانە بڵێن: (ئێوە بێ دینن)! بە تایبەت ئەوانەیان کە ئایینی بە ڕووکەشی وەرگرتووە و لە فەلسەفەی ماددیدا ڕۆچووە، ئەوا لەوانەیە بکەوێتە دوودڵی‌یەوە لەوەی کە ڕێبازەکەی لە دەرەوەی ئیسلام بێت. ئیتر لە نائومێدیدا دەست دەداتە کار و جموجووڵی پێچەوانەی ئیسلام و، زمانی ئەوە دووپات دەکاتەوە کە:

چی دەبێت با ببێت، من گوێی نادەمێ.

دەسا ئەی دوور لە ویژدانەکان!

ئایا بینیتان کە چۆن ئێوە دەبنە هۆی گومڕاکردنی هەندێ کەسی کڵۆڵ؟!

ئەوەش بزانن کە زۆر جار مرۆڤی خراپکار و لە ڕێ ترازاو گەڕاوەتەوە و بووە بە مرۆڤێکی باش، تەنها بەوەی کە چەند جارێك پێی وتراوە: "تۆ مرۆڤێکی باشیت.. تۆ بەڕێزیت"..

بە هەمان جۆر مرۆڤی باش گەر پێی بوترێ: "تۆ کەسێکی خراپیت.. باش نیست" لە ڕێ دەترازێ و دەبێت بە کەسێکی خراپ.

ئەمەش تاقیکراوەیە و زۆر جار ڕووی داوە.

پ: بۆچی؟

و: چونکە ئەگەر هەندێ کەس نیازی خراپی لەخۆدا شاردبێتەوە، دەبێ هێرش نەکرێتە سەری. ئەوەتا زۆر شتی "خراپ" هەن ئەگەر لە ژێر پەردەی "چاکە"دا بشاررێنەوە و، پەردەیان لە ڕوو هەڵنەماڵرێ و، مرۆڤ خۆی گێل بکات لێیان، ئەوا لە چوارچێوەیەکی تەسکدا دەمێننەوە و، لەوانەیە خاوەنەکەی لە ژێر پەردەی شەرم و حەیادا هەوڵی چاك کردنی بدات.. بەڵام ئەگەر پەردە لەسەر ڕووی لاببرێ، ئەوا

شەرم و حەیا دەخاتە لاوە! خۆ ئەگەر لەگەڵ ئەوەشدا هێرشی بکرێتە سەر، دیارە ئەو کاتە خراپەکە لەو سنوورەدا نامێنێتەوە و پتر گەورە و فراوان دەبێ!

لە ڕووداوی (٣١ی مارت)دا[1] بە چاوی خۆم حاڵەتێکی نزیك لەمەم بینی:

ئەوەبوو کاتێ ئەو کەسە هیممەت بەرزانەی کە گیانی خۆیان پێشکەش بە ئیسلام دەکەن، بانگەشەیان بۆ مەشرووتیەت کرد و، ئەوانەی کە لەو باوەڕەدا بوون نیعمەتی مەشرووتیەت ئەوپەڕی ئاوات و کاکڵەی ژیانە و، بە چوست و چالاکی بۆ جێبەجێ کردنی لق و پەلەکانی لێبڕان بەپێی شەریعەت و، بەرپرسانی دەوڵەتیان ڕێنمایی دەکرد تاکو لە نوێژی دادگەریدا ڕوو لە قیبلە بکەن و، داواکاری ئەوە بوون کە بە هێزی مەشرووتیەت و بە ڕاستی "شەریعەتی خاوێن" بەرز ڕابگیرێت و، شەریعەتیش بە هێزی مەشرووتیەت بمێنێتەوە و، هەموو خراپکاریەکانی پێشوویان خستە ئەستۆی گوێ نەدان بە شەریعەت..

هەر هێندەی ئەو کەسانە دەنگی ئەم بانگەشەیان بەرز کردەوە و هەندێ کاروباری لاوەکیشیان جێبەجێ کرد، چەند کەسێکیان لێ پەیدا بوو لەوانەی کە ڕاست و چەپی خۆیان لە یەك جیا ناکەنەوە و، لەو گومانەدا بوون کە - حاشا وا نییە - شەریعەت

---

(١) ڕووداوی ٣١/مارت/١٣٢٥ (بە تەقویمی ڕۆمی) بریتییە لە هەڵگەڕانەوەیەکی سەربازی و ملنەدانی سەربازەکان بۆ فەرمانی فەرماندەکانیان. ئەم ڕووداوە یەکەم جار لە سەربازگەی "تاش قشلە"ی ئەستەمبوڵ سەری هەڵدا، پاشان سەربازگەکانی تری شاری گرتەوە و، ئنجا سەربازە هەڵگەڕاوەکان ڕژانە ناو شەقامەکان و هەندێ وەزیر و پەرلەمانتار و ئەفسەریان کوشت. خۆ ئەگەر ئەو وتارانەی "مامۆستا نوورسی" نەبوایە کە دەرۆشت لەناو سەربازگەکانیاندا ئاراستەی دەکردن، لەوانەبوو گەلێ ئاکامی ناهەموارتر لەو هەڵگەڕانەوە سەربازییە بکەوتایەتەوە، بەڵام وتارەکانی مامۆستا هۆکارێکی گرنگ بوون لە هێدی کردنەوەی سەربازە هەڵگەڕاوەکاندا. ئەم ڕووداوەش لە ڕۆژی ١٣/نیسان/١٩٠٩زدا دەستی پێ کرد، واتە دوای ڕاگەیاندنی مەشرووتیەت(ڕژێمی پەرلەمانی)ی دووهەم و هاتنەسەرحوکمی کۆمەڵەی ئیتیحاد و تەرەقی. ئنجا سوڵتان عەبدولحەمید تاوانبار کرا بە سازدانی ڕووداوەکە و، کۆمەڵەی ناوبراو کۆمەکی سەربازیی لە شاری سەلانیکەوە - کە بنکەی سەرەکییانی لێ بوو - هێنایە ناو شاری ئەستەمبوڵ. دوابەدوای گەیشتنی هێزە سەربازییەکەش یەکسەر باری نائاسایی لە شاردا ڕاگەیەنرا و، هەڵگەڕانەوەکە سەرکوت کرا و، دادگای سەربازی پێکهێنرا و، گەلێ کەسی پێ لە سێدارە درا. ئنجا کۆمەڵەی ئیتیحاد و تەرەقی ئەم ڕووداوەی قۆزتەوە و لە ٢٧/نیسان/١٩٠٩دا سوڵتان عەبدولحەمیدی لەسەر کورسیی خەلافەت و پادشایی لابرد. بەم جۆرە و لە ماوەیەکی کورتدا دەرکەوت کە ڕووداوەکە هەر لە بناغەدا بۆ ئەو دەرەنجامە ساز کرابوو! (وەرگێڕ)

پشتی ئیستیبداد دەگرێت. ئیتر وەکو تووتی لاسایی ئەوانیان کردەوە و وتیان: (ئێمە داواکاری شەریعەتین)! ئەوەبوو ئامانجەکە بەم جۆرە لەو ناوەدا ون بوو، تەنانەت وای لێ هات مەبەستە ڕاستەقینەکە نەدەزانرا و، ئاشکرا شە بارودۆخەکە گەیشتە ئەوەی کە بینیتان. ئاشکراشە کە پێشتر پلانەکان سازکرابوون و داڕێژرابوون!

جا کاتێ کار گەیشتە ئەوە، هەندێ لەوانەی کە بە درۆ دەمامکی پەرۆشی و غیرەتیان پۆشیوە، هێرشیان کردە سەر ئەو ناوە بەرز و پیرۆزە و، ڕەخنە و تەنانەت دەستدرێژی‌یان ئاراستە کرد.

جا ئەمەی سەرەوە خاڵێکی ڕەشی شایانی پەند لێ وەرگرتنە!

[ولقد قعدت الهمةُ بتلك النقطة و لم تقدرْ على النهوض. ولقد شوّشَتْ طنطنةُ الأغراضِ صَدى موسيقى الحرية، ولقد تقلصت المشروطيةُ منحصرةً اسماً على قليلين، فتفرقَ عنها حُماةُ ذمارها][1].

واتە: (بەو خاڵە "هیممەت" لە دەست و پێ کەوت و نەیتوانی هەڵبسێتەوە. زرم و هۆڕی ئامانجەکان زایەڵەی مۆسیقای ئازادیی شێواند. مەشرووتیەتیش هێندە هاتەوەیەك کە تەنها ناوەکەی مایەوە، ئەوەش چەند کەسێکی کەمی گرتەوە و، پارێزگارانی بڵاوەیان لێ کرد).

پ: بۆچی زیانمان لەوانەوە پێ دەگات کە گومانمان وایە بێ دینن؟

و: وا لەسەر تابلۆی ئەندێشە وێنەی نموونەیەکتان بۆ دەکێشم کە زیانەکانی ئەوەتان بۆ روون دەکاتەوە:

وا دابنێن لەم بیابانەدا کۆشکێك لە ناوەندی باخێکی دڵگیردا بیێت. گۆشەیەکی کۆشکەکەش گەرماوێکی ئاوە کانزاییەکانی وەك ئەو گەرماوەی ئێوەی تێدا بێت کە لە دۆڵی "بەیتوششەباب"[2]دا هەیە..

(١) لە بەردەم ئەم برگەیەدا بووەستە و بەجێی مەهێڵە.. جوان سەرنجی بدە.. لەو ڕووداوەدا کەسانی مەرد و بە غیرەت و نەجیب و بەڕێز لە خاوەن عەزم و هیممەتە بلندەکان، بێ دەنگ و کش ومات بوون و، ڕۆژنامە ڕق لە دڵەکانیش دەنگی ئازادی‌یان کپ کرد. ئیتر مەشرووتیەت لە چەند کەسێکی یەکجار کەمی خەڵکدا مایەوە و، خۆبەختکار و گیان لەسەر دەستەکانی بڵاوەیان لێ کرد و لێی دوور کەوتنەوە! (دانەر)

(٢) ناوچەیەکی باکووری کوردستانە، مەڵبەندی هۆزە کوردەکانی (ئارتووش)ە. (وەرگێڕ، بە سوود وەرگرتن لە چاپە عەرەبی‌یەکە)

ئێوەش لەبەر ئەوەی لە سەرمادا لەرزتان لێ هاتووە و بەفر و ڕەشەبا زللەتان تێ دەسرەوێنن، ناچارن بڕۆنە ناو کۆشکەکەوە. بەڵام لەبەر ئەوەی بیستووتانە - یان بینیوتانە - کە ناو کۆشکەکە چەند کەسێکی نابینا و، حەوزی ئاوەکەش چەند پیاوێکی ڕووت و قووتی تێدایە، ئیتر لەمەوە گومانی ئەوە دەبەن کە سەرانسەری کۆشکەکە خانەی نابینایان و نیشتەجێی ڕووت و قووتان بێت!

خۆ کاتێ کە بەو وەهم و گومانەوە ویستتان بڕۆنە ناو کۆشکەکە، ئەوا بۆ ئەوەی خۆتان لەگەڵیاندا بگونجێنن، پۆشاکی گوێڕایەڵی لەبەر خۆتان دادەماڵن و چاوی حەقیقەتیش - کە بیروباوەڕە - دەنووقێنن تاکو بۆ ئەندامی شەرمیان نەڕوانن!

لە کاتێکدا کە ئەوان چاویان کراوە و شەرم و حەیاشیان داپۆشراوە و، لە نێوان خۆیاندا و لە چەند ژوورێکی بەشەرم وشکۆدا بە وردی و تێڕامانەوە گفتوگۆ دەکەن و، لە چەند گۆشەیەکدا سەرگەرمی تیماری نابینایان و خزمەتی ڕووتەکانن تاکو پۆشتە و پەرداخیان بکەن..

کەواتە ئەگەر تۆ بەم شێوە شێتانەیە بڕۆیتە ناویان، کە شەرم و حەیات بە دەرەوە و چاویشت بەستراوە، ئایا لەم دیمەنە ئابڕووبەرتر هەیە کە مایەی سووکایەتی و گاڵتە پێ کردن بێت؟!

من پێم وایە وەچەیەك کە بە ڕاستی لە موسڵمان کەوتبێتەوە، ئەگەر ژیری و بیریشی لە ئیسلام دەستبەردار ببن، هێشتا ویژدان و سروشتی بە تەواوی دەست لە ئیسلام هەڵناگرن. تەنانەت ئەوانەش کە لە هەموو کەس هەرزە و گەوجترن، نەخوازەڵا ئەوانەیان کە شارەزای سیاسەتن، هەر لایەنگری ئیسلامن، کە شوورایەکی قایمی پشت و پەنامانە.

مێژووی ئیسلام، هەر لە سەردەمی زێڕینی پێغەمبەرەوەﷺ هەتا ئێستا، موسڵمانێکی بەخۆیەوە نەدیوە کە بە "داوەریی ژیری" ئایینێکی تری لە ئیسلام پێ باشتر بوویێت، یان لە ڕێگەی بەڵگەی عەقلییەوە ڕۆشتبێتە ناو ئایینێکی تر!

بەڵێ، کەسانێك هەن لە ئایین دەردەچن، ئەوە باسێکی ترە!

سەبارەت بە "چاولێکەری"ش ئەوا هیچ بایەخێکی نییە.

کەچی شوێنکەوتەی ئاینە کانی تر لە ئەنجامی داوەریی ژیری و لە ڕێی بەڵگەی گومان بڕەوە، هاتوون و تا ئێستاش پۆل پۆل دێنە ژێر سایەی ئایینی ئیسلام. خۆ ئەگەر ئێمە ئیسلامی ڕاست و ڕەوانیان نیشان بدەین و، ڕاستی و دروستیی شایانی ئیسلامیان بخەینە پێش چاو، ئەوا پۆل پۆل دێنە ناو ئایینی ئیسلامەوە..

هەروەها "مێژوو" شایەتە و بۆمان دەگێڕێتەوە کە پێشکەوتن و شارستانێتیی موسڵمانان هاوڕێژە و بەندە بە شوێنکەوتنیان بۆ ڕاستی و کاکڵەی ئیسلام، لە کاتێکدا کە پێشکەوتن و شارستانێتیی ئەوانی تر دژە هاوڕێژەیە لەگەڵ پابەندی‌یان بە ئایینەکەیانەوە..

هەروەك "ڕاستی" شایەتی ئەوەیە کە مرۆڤی "بێدار" ناگونجێ فەرامۆش و بێ ئایین بێت. بە تایبەت ئەو بێدارەی کە تامی مرۆڤێتیی چەشتووە و، ماهیەتی خۆی ناسیوە و، زانیویەتی ئامادە کراوە و، بەرەو نەمری و هەتاهەتایی نێرراوە.

ئەو جۆرە کەسە هەرگیزاو هەرگیز ناگونجێ بە بێ ئایین بژی. چونکە کەسی بێدار گەر دەست لە ئایینی ڕاست و ڕەوا گیر نەکات، کە کاکڵەی حەقیقەتە، ئەوا ناتوانێ بە بێ "خاڵی پشت و پەنا" بژی لە بەرامبەر هێرشی بوونەوەران لەسەری. بە بێ "خاڵی یارمەتی لێ وەرگرتن"یش بۆ وەبەرهێنانی ئاواتە لەسنوور بەدەرەکانی، ناتوانێ هەڵ بکات.

هەر لەم نهێنی‌یەوەیە کە ئێستا حەز و مەیلی گەڕان و پشکنین بە دوای ئایینی ڕاست و ڕەوادا لە لای هەموان خرۆشاوە، کە دەیسەلمێنێ ئەوە دەستپێکێکی ناوازە و چالاکانەیە بۆ ئەوەی کە ئیسلام ئایینی سروشتیی گرۆی مرۆڤە لە ئایندەدا.

ئەی ئەوانەی کە ویژدان ناخەنەکار!

چۆنە وا "ڕاستیی ئیسلام" کە توانای ئەوەی هەیە سەرانسەری جیهان بگرێتەوە و یەکیان بخات و پەروەردەیان بکات و بە نووری خۆی ڕووناکیان بکاتەوە، لە بەرچاوی ئێوەدا هێندە بچووك بووەتەوە کە ترنجاندووتانەتە هەژاران (و هەندێ لە زانا دەمارگیرەکان)[1] و، دەتانەوێ نیوەی موسڵمانانی لێ بەدەر نێن؟

(١) ئەوەی ناو کەوانەکە دانەر خۆی لە چاپەکانی دواییدا زیادی کردووە. (وەرگێڕ)

چۆن پڕ کێشیی ئەوەتان کرد ئەم ئیسلامە مەزنەی کە لە ڕاستیدا کۆشکێکی نوورانیی ئەوتۆیە هەموو ڕەوشتە کاملەکانی مرۆڤایەتیی لەخۆدا کۆکردووەتەوە و، سەرجەم هەست و نەستە بەرز و بڵندەکانی ئادەمیزادی پوخت و پەروەردە کردووە، لە ئەندێشەتاندا بە خێوەتێکی ڕەشی ماتەمینیتان دانا کە بەسەر دەستەیەك هەژار و دەشتەکیی برسیدا هەڵدرابێت؟!

بەڵێ، بیری هەموو مرۆڤێك بەپێی ئەوەیە کە ئاوێنەکەی پیشانی دەدات.. کەواتە ئاوێنە ڕەشە درۆزنەکەتان ئەوەی لە بەرچاودا وا پیشان داون!

پ: تۆ زۆر زیادەڕەوی دەکەیت، چونکە "ئەندێشە" وەك خودی "حەقیقەت" پیشان دەدەیت و، بەو گومانەشت کە بە نەزانمان دادەنێیت سووکایەتیمان پێ دەکەیت. ئێمە لە سەردەمی ئاخر زەماندا دەژیین و[1]، خراپکاری تەشەنەی کردووە و لە خراپەوە بەرەو خراپتر دەڕوات.

و: بۆچی دەبێ دنیا بۆ هەموان گۆڕەپانی بەرزبوونەوە و پێشکەوتن بێت، کەچی تەنها بۆ ئێمە مەیدانی نزم بوونەوە و دواکەوتن بێت؟

جا ئایا وایە؟! دەسا سوێند بێ من لەگەڵ ئێوە نەدوێم، وا پشت لە ئێوە هەڵدەکەم و، ڕووی گوفتارم ئاراستەی ئەوانە دەکەم کە لە ئاییندەدا دێن:

ئەی ئەو کەسەی وا لە پشت چەرخێکی بڵندی دوای سێ سەد ساڵ و، بە ئەسپایی و بێ دەنگی گوێ لە وتەکانی (نوور)[2] ڕادەگرێ و، بە تەماشا کردنێکی غەیبی و پەنهان بۆمان دەڕوانێ!

ئەی ئەوانەی ناوتان: "سەعید و حەمزە و عومەر و عوسمان و تاهیر و یووسف و ئەحمەد" و ئەم چەشنە ناوانەیە!

---

(١) لەوانەیە ئەم ڕەخنەیە لە لایەن وەلی‌یەکی مەزنەوە ئاراستە کرابێت کە ئەو دەمە ئامادە بووە و، ڕەخنەی لەوە گرتووە کە "سەعیدی کۆن" چل و پێنج ساڵ پێش ئێستا بە "هەستی پێش ڕووداو" وا هەستی کردبوو مەیدانی بەرتەسکی "پەیامەکانی نوور" زۆر فراوانە و "مەیدانێکی سیاسی"یە. بۆیە زۆربەی وەڵامەکانی لەبەر ڕووناکیی ئەو هەست کردنەیدا داوەتەوە.

جا لەوانەیە ئەو وەلی‌یە مەزنە ڕەخنەکەی تەنها لەم خاڵە گرتبێت. (دانەر)

(٢) لە چاپە کۆنەکەدا لە بریی ئەوەی ناو کەوانەکە نوسراوە: "من". (وەرگێڕ)

من لەگەڵ ئێوە دەدوێم.. سەرتان بەرز بکەنەوە و تەسدیقم بکەن و، بڵێن: "ڕاستت وت". با ئەم تەسدیقەش قەرز بێ لە ئەستۆتاندا!

با واز لەم هاوچەرخانەم بێنین کە گوێ بۆ وتەکانم ڕاناگرن. وا من بە تەلەگرافێکی بێ تەل لەگەڵ ئێوە دەدوێم کە هەر لە شیوە قووڵەکانی ڕابوردووەوە - کە ناوی مێژووی لێ نراوە - تا لوتکە بڵندەکانی ئاییندەی ئێوە، درێژ دەبێتەوە..

چی بکەم؟ ناچار بووم زوو بێم و بە دەستی خۆم نەبوو، ویستی قەدەر وا بوو کە لە زستانی ژیاندا بێمە ناو ئەم ژیانە، بەڵام خۆزگەم بە ئێوە، چونکە لە بەهارێکی خۆشی بەهەشت ئاسادا دێنە مەیدان و، ئەو تۆوانەی "نوور" کە ئێستا دەچێنرێن، لە زەویی ئێوەدا بە چەندین گوڵی گەش دەمیان دەپشکوێ.

ئێمە بەرامبەر بە خزمەتگوزارییەکانمان تەنها داوای ئەوەتان لێ دەکەین کە هەر کات هاتن بە قەدپاڵی ڕابوردوودا گوزەرتان کرد، سەرێك لە گۆڕەکانمان بدەن و دیارییەکانی ئەو بەهارەتان لەسەر لووتکەی قەڵاکە(1) بروێنن کە وەك کێلێك وایە بۆ گۆڕی قوتابخانەکەم و، ئێسکی پرتووکاوی ئێمەی لە ئامێز گرتووە و پاسەوانی خاکی "خورخور"ە(2).

ئێمە وەسیەت بۆ ئەو پاسەوانە بەجێ دەهێڵین و بیری دەخەینەوە. ئێوەش هەرکات هاتن بانگمان بکەن.. دڵنیا بن کە زایەڵەی: "لێتان پیرۆز بێت" لە گۆڕەکانمانەوە دەبیستن! [ولو من الشاهد علی طیف الضیف]. (واتە: تەنانەت گەر ئەو زایەڵەیەش لە شایەتیی تارمایی میوانەکەوە بێت).

---

(1) مەبەست "قەڵای وان"ە کە وەکو کێلی گۆڕی قوتابخانە رووخاوەکەی "خورخور"* وایە، کە ئەویش نموونەیەکی قوتابخانەی زەهرا بوو لە وان. (دانەر)

* ناوی قوتابخانەکەی مامۆستا نوورسییە لە شاری "وان" کە هەتا جەنگی جیهانیی یەکەم ئەرکی زانستیی خۆی ڕادەپەڕاند. ناوەکەشی لە ناوی کانیی "خورخور"ەوە هاتووە کە لە بنی قەڵاکە و نزیکی قوتابخانەکەوە هەڵدەقوڵێت. (وەرگێر)

(2) ئەم بڕگەیە لە چاپە کۆنەکەدا بەم جۆرەیە:

**(من بەرامبەر بە خزمەتگوزارییەکانم چاوەڕوانی ئەوەتان لێ دەکەم کە هەرکات هاتن بە قەدپاڵی ڕابوردوودا گوزەرتان کرد، سەرێك لە گۆڕەکەم بدەن و، چەند گوڵێك لەو گوڵانە بهێنن و بە بەردی گۆڕەکەمدا هەڵیبواسن کە پێی دەوترێ "کێل" و، دەرگاوان و پاسەوانی ئەو گڵەیە کە میوانداریی ئێسکەکانم دەکات).** (وەرگێر)

ئەم هاوچەرخانەم، کە وەك ئێمە گۆشکراوی مەمکی ئەم سەردەمە و پەروەردەی باوەشی ئەم چەرخەن، چاویان لە پشتی سەریاندایە و هەمیشە بەرەو دواوە بۆ ڕابوردوو دەڕوانن و، بۆچوونەکانیشیان - وەك خۆیان - لە ڕاستی دوور و لە واقیع دابڕاوە!

جا هەرچەند ئەو منالآنە کە سەیری ڕاستییەکانی ئەم کتێبە[1] دەکەن بە ئەندێشەیان دادەنێن، من گوێیان نادەمێ! چونکە دڵنیام لەوەی کە ناوەڕۆکەکانی ئەم کتێبە چەند ڕاستییەکن بە ئاشکرا لە ئێوەدا دێنەدی!

ئەی ئەوانەی لەگەڵتان دەدوێم!

بمبورن کە من لەسەر لوتکەی منارەی چەرخی سیازدەهەمی کۆچییەوە بە دەنگی بەرز هاوار دەکەم! چونکە بانگی ئەوانە دەکەم بۆ مزگەوت کە بە شێوە و ڕواڵەت شارستانین و، لە کاروباری ئاییندا بە ڕاستی سست و کەمتەرخەمن و، بە بیرکردنەوەش لە چاڵ و شیوەکانی ڕابوردوودا دێن و دەڕۆن:

دەسا ئەی ئەو گۆڕە بزۆکانەی کە بە دوو پێ بەرێدا دەڕۆن!

ئەی تەرمە بەرجەستەکان!

ئەی بەدبەختانی وازهێنەر لە گیانی هەردوو ژیان کە ئیسلامە!

لەسەر ڕێی بەرەی ئاییندە لاچن، مەبن بە کۆسپ لە ڕێیاندا..

گۆڕەکانتان چاوەڕوانتانن.. ڕێ چۆڵ بکەن تاکو بەرەی ئاییندە بێنە مەیدان، ئەوانەی کە ئاڵای ڕاستییەکانی ئیسلام بە بلندی هەڵدەکەن و بەسەر ڕووی بوونەوەراندا دەیشەکێننەوە!

پ: پێشینانمان لە ئێمە باشتر بوون، لانی کەم وەك ئێمە وا بوون. ئایا نەوەکانمان لە ئێمە خراپتر دەبن؟

و[2]: ئەی کورد(و تورك)[3]ەکان! ئەگەر بێت و من کۆبوونەوەیەکی مەزن ساز بکەم و، باپیرانی پێش هەزار ساڵتان هاودەم لەگەڵ نەوەکانتان کە دوای دوو چەرخی تر

(١) بە هەستێکی پێش وەخت، هەواڵی دانانی "سەرجەمی پەیامەکانی نوور" دەدات لە داهاتوودا. (دانەر)

(٢) ئەم وەڵامە لەبەر عەنتیکەیی نووسراوە. (دانەر)

(٣) ئەوەی ناو کەوانەکە دانەر لە چاپەکانی دواییدا زیادی کردووە. (وەرگێڕ)

دێن، بانگهێشت بکەم بۆ ئەم کۆبوونەوە و ئەنجومەنە جەنجاڵەی ئەم چەرخەی ئێستا، ئایا باپیرانتان کە لە لای ڕاستەوە ڕیز بوون، پێتان نالێن:

ئەی ڕۆڵــە بێ نـرخ و نـەوە هەڵەخـەرج و دەسـت بڵاوەکـان! بۆچی ئێـوەن پوختـە و ئاکـامی ژیانمـان؟ چـەندە لــە ئێمــەوە دوورن؟ ئێمـەتان کـردە پێشـەنگێکی نــەزۆك و کەسانێکی وەجاخ کوێر!

هەروەها ڕۆڵەکانیشتان، کە لە لای چەپەوە ڕیزیان بەستووە و لە لایەن شارسـتانێتیی ئایندەوە هاتوون، ئایا پشتگیری لە باپیرانی لای ڕاستیان ناکەن و پێتان نالێن:

ئەی باوکانی تەمبەڵ و تەوەزەل!

ئایا ئێوەن کە ورد و درشتی ژیانمان دەنوێنن؟ یان ئایا ئێوەن هێمـای ژیانمـان و نـاوەندە سنوور بۆ پەیوەندیمان بەو باپـیرە قارەمانانـەوە؟ چـەندە دوورە ئێـوە لـە ئێمـە بچـن! ئـەوەتا بوونەتە "نموونەیەکی بێ نرخ و دوور لە ڕاستی" و "پێوەرێکی تێکەڵ و پێکەڵ"[١].

ئەی دەشتەکییە ڕەوەندەکان (و ئەی لاف لێدەرانی کودەتا)[٢]!

خۆ لەسەر تابلۆی ئەندێشە[٣] بە چاوی خۆتان بینیتـان کـە چـۆن لـەم کۆبوونەوەیـەدا هەردوو لا ئێوەیان بە بەڵگە بەستەوە!

پ: ئێمە شایانی سووکایەتی پێ کردنی تـا ئـەم ڕادەیـە نیـین. بـەڵێن دەدەیـن کـە لـە پابەند بوونمان بە پاشینان کەمتەرخەمی نەکەین و، چیی تر دەسـت بـە داوێنـی پێشـینانەوە نەگرین. وا گوێ بیستی قسەکانت دەبین و پێشوازیی لـێ دەکەین.

و: ئێستا دەتوانن بگەڕێنەوە بۆ ئاراستە کردنـی پرسیارەکانتان، چونکـە پەشیمانیتان دەربڕی.

پ: ئایا زانایانی پێشین لە لایەنە خراپەکانی ئیستیبداد[٤] دواون؟

---

(١) ئەمانە لە دەستەواژەکانی زانستی "مەنتیق"ە. بۆیە بەکاری هێناون چونکە – ئـەو دەمـە – ئامـادەی کـۆڕی قوتابییەکانی بووە کە پێشتر وانەیەکیان لە مەنتیق خوێندبوو . (دانەر)

(٢) دواتر زیاد کراوە. (دانەر).. لە پێشدا بەم جۆرە بووە: (ئەی کوردەکان!). (وەرگێڕ)

(٣) ئەندێشەیش لە لایەن خۆیەوە وەکو دیمەنە سینەماییەکان وایە. (دانەر)

(٤) ئەو وانەیەی کە چل و پێنج ساڵ پێش ئێستا پێشکەش کـراوە، وانەیـەکی گەلـێ پێویسـتە بۆ ئـەم کاتـەش. چونکە ئەم گفتوگۆیەی کـە بـە پرسـیار و وەڵام خراوەتـە ڕوو، دەتوانێ لەگـەڵ ژیانـدا هـاودەم بێـت و هـەموو کاتێك بژی، تەنانەت ئێستا لە گەرمەی ژیاندایە! (دانەر)

و: بەڵێ، هەزار جار بەڵێ..

زۆرینــەی شــاعیران لــە قەســیدەکانیاندا و، زۆرێــك لــە نووســەران لــە پێشــەکیی کتێبەکانیاندا، سکاڵایان لە دەست زەمان دەربڕیوە و، ڕەخنەیان لە ڕۆژگـار گرتـووە و، هێرشیان بۆ فەلەك[1] بردووە و، دنیایان خستووەتە ژێر پێ و وردوخاشیان کردووە..

جا ئەگەر ئێوە بە گوێی دڵ گوێ بیستیان بن و بە چاوی ژیری بۆیان بڕوانـن، دەبینـن کە هەموو تیری ڕەخنەکان بەر سنگی ئـەو ئیستیبدادە دەکـەوێ کـە بـە پـەردەی تـاریکی ڕابوردوو خۆی پێچاوەتەوە و، دەبیستن کـە هـەموو قیـژە و هاوارەکـان لـە ژێـر چنـگ و چڕنووکی ئیستیبدادەوە دەردەچێت.

خۆ هەرچەندە ئیسـتیبداد نـەدەبینرا و نـاوێکی تایبـەتی و ڕوونـی نـەبوو، بـەڵام گیـانی هەموان بە واتاکەی ژەهراوی دەبوون و ئازاریـان پـێ دەگـەیشـت و، دەیـانزانی کەسـێك هەیە ژەهرەکە دەڕێژێـت. تەنانـەت هـەندێ لـە زیرەکە بلیمەتـەکان هـەر کاتێ هەناسـەی هەڵدەکێشا لە ناخەوە هاواری لێ بەرز دەبووەوە..

بـەڵام "ژیـری" بـە باشـی دەرکـی حەقیقەتەکـەی نـەدەکرد، چونکـە لەسـەر شـێوە و حاڵەتێك کۆ نەبوو، بەڵکو لەناو تاریکاییەکاندا پەرش و بڵاو بوو. هـەر لەبـەر ئـەوە بـوو لەو دەمانەی پێیان وابووە کە ئەو بەڵایانەی لابردنیان ئەستەمە چـەند بەڵایـەکی ئاسمـانین، ئەوا هێرشیان دەکردە سەر زەمان و، کـرداری ڕۆژگـار و، تیرەکانیـان ئاراستەی فەلـەك دەکرد.. چونکە یەکێ لە دەستوورە بڕیار دراوەکان ئەوەیە کە دەڵێ:

هـەر شتێك دەرچـوو لـە بازنـەی جوزئـی ئیختیـاریی مرۆڤ و، لـە هەندەکێتیـەوە ڕۆشتبووە بازنـەی هەمـەکێتی و گشـتی بوونـەوە، یـاخود بـەپێی توانـای ئاسـایی لابردنـی ئەسـتەم بـوو، ئـەوا ئۆبـاڵەکەی دەخرێتـە ئەسـتۆی "زەمـان" و گلــەیی لــە "ڕۆژگــار" دەکرێت و، گومەزی "فەلەك" بەردەباران دەکرێت.

خۆ ئەگەر بە وردی سەرنج بدەیت بـەردەکان لەگەڕانـەوەیاندا دەبـن بـە نـائومێدی و دڵی خاوەنەکەیان دەکەن بە بەرد.

(١) واتە: چەرخی ڕۆژگار. مەبەست ڕۆژگارەکانی ژیانە. (وەرگێڕ)

(انظر كيف أطالوا فيما لا يلزم. وكُلَّما أضاءت لهم السعادةُ أثْنَوْا على مَن سادَهم، وكُلَّما أظلَمَ عليهم شتموا الزمان)[١].

واتە: (بڕوانە چۆن درێژەیان بە شتی وا داوە كە پێویست نی‌یە و، هەركات "بەختەوەری" ڕووناكیی خۆی ئاراستە كردبن، سوپاس و ستایشی سەرۆكەكانیان كردووە و، كاتێكیش تاریكی‌یان لێ داهاتووە جنێویان بە "زەمان" داوە).

پ: ئایا سكاڵا كردن لە "زەمان" و ڕەخنە گرتن لە "ڕۆژگار" بە ڕەخنە دانانرێت لە سنعەتە ناوازەكانی كردگاری مەزن؟

و[٢]: نەخێر.. نەخێر. بەڵكو لەوانەیە سكاڵا كردن ئەمەی خوارەوە بگەیەنێت:

كەسی سكاڵاكار وەك ئەوە وایە كە بڵێت:

ماهییەتی جیهان، كە بە دەستووری دانستی ئەزەلی ڕێك خراوە، بۆ ئەنجامدانی ئەو شتەی من دەمەوێت و ئەو حاڵەتەی حەزم لێیەتی ئامادە نی‌یە و.. ئەو یاسایەی گەردوون كە بە دەستی چاودێریی ئەزەلی نەخشێنراوە، بواری پێ نادات و.. سروشتی ڕۆژگار، كە لە چاپخانەی ویستی ئەزەلیدا چاپ كراوە، لەگەڵیدا یەك ناكەوێت و.. دانستی خواوەندیش، كە لەسەر بناغەی بەرژەوەندی‌یە گشتی‌یەكان بنیات نراوە، ڕوخسەتی نادات!

بۆیە، ئەو بەروبوومانەی كە ئێمە لە جیهانی "مومكینات"دا بە ئەندازیاریی مێشكی خۆمان و حەزی هەوا و ئارەزووەكانمان داوای دەكەین، دەستی توانستی پەروەردگار بە جیهانی مومكیناتی نابەخشێت. تەنانەت گەر "توانستی خوایی"ش ئەو بەروبوومانە بە مومكینات ببەخشێت، ئەوا مومكینات ناتوانن وەری بگرن و پارێزگاریی لێ بكەن. ئەگەر بەروبوومەكان بۆ خۆیان دابكەونە خوارەوە، ئەوا هەر مومكینات ناتوانن هەڵیان بگرن.

بەڵێ، هەرگیز ناگونجێت لەبەر ئارەزووی كەسێك بازنەیەكی گەورە لە جووڵە و بزووتنی گرنگی خۆی ڕابووەستێت!

(١) لەسەرخۆ بە، ئەم برگەیە بەجێ مەهێڵە، باش لێی تێبگە. مەبەست ئەوەیە كە ئەوانە هەرچی چاكەكاری هەیە بە هی سەركردەكانی دادەنێن و، خراپكاری‌یەكانیش دەلكێنن بە "زەمان"ەوە، ئیتر لێرەوە سكاڵاكەیان لە شێوەی جنێودا دەردەبڕن. (دانەر)

(٢) ئەمە وەڵامێكی زۆر گرنگە. (دانەر)

پ: چی سەبارەت بەو شاعیر و زانایانە دەڵێیت کە - لە ڕۆژگاری خۆیاندا - زیادەڕەوی‌یان لە مەدح و سەنای میر و دەسەڵاتدارەکاندا کردووە؟ لە کاتێکدا کە تۆ زۆربەیان بە کەسانی خۆسەپێن دەبینیت؟ کەواتە ئەوانە بەو ستایشەیان خراپەیان ئەنجام داوە؟

و:

ولولا خِلالٌ سنَّهُ الشِّعرُ ما دَرى بُناة المعالي كيفَ تُبنى المكارمُ[1]

نیازی ئەوان بەپێی ئەم دەستوورە:

هاندانی میرەکان بووە، بە فێڵێکی نەرم و نیان، تاکو خۆیان بەرز ڕابگرن لە خراپکاری‌یەکان و، بیانخەنە مەیدانی پێشبڕکێی کردەوە چاکەکان، بەوەی کە خەڵاتی شیعریان خستووەتە بواری پێشبڕکێ لە ناوەندەکاندا.

بەڵام بە وەرگرتنی ئەو خەڵاتەی کە لەسەر وتنی شیعرەکە بەخشراوە، ڕەفتارێکی خۆسەپێنیان ئەنجام داوە، چونکە ئەو خەڵاتە لە ئارەقی ناوچاوانی ڕەنج و کۆششی میللەتێکی مەزنەوە داڕنراوە.

واتە هەرچەندە نیازیان باش بووە، بەڵام کارەکەیان بە خراپ شکاوەتەوە.

پ: بۆچی؟

و: ئایا نابینن بەرەنجامی هەموو گوفتارەکانیان لە قەسیدەکانیان و هەندێ کتێبیاندا لە ڕاستیدا پەلاماردان و دەست بەسەرداگرتنێکی ناوەکیی چاکەکاریی قەومێکی مەزنە و، پاشان بەخشینی ئەو چاکەکاری‌یە زەوتکراوەیە بە کەسێکی خۆسەپێن؟ ئەوان بە پیشاندانی ئەوەی کە ئەو چاکەکاری‌یانە هی ئەو کەسە خۆسەپێنە بن، لەم گۆشەیەوە و بە بێ ئەوەی بە خۆیان بزانن، سەنا و ستایشی ئیستیبدادیان کردووە.

---

(١) ئەم شیعرە هی "ئەبوو تەممام"ە. واتە: (ئەگەر چەند ئاکارێکی جوان نەبوایە کە شیعر ڕێچەی بۆ شکاندن، بنیاتنەرانی سەربەرزی نەیاندەزانی ڕەوشتە باشەکان چۆن بنیات دەنرێت).

لە دوو چاپی جیای دیوانەکەیدا بەم جۆرەی خوارەوە هاتووە:

ولولا خِلالٌ سنَّها الشعرُ ما دَرى بُغاةُ النَّدَى مِن أينَ تُبْنَى المكارِمُ

بڕوانە: (شرح ديوان أبي تمـام) شـرحه وضبطـه شـاهين عطيـة. دار الكتـب العلميـة. بـيروت. ١٩٨٧م/١٤٠٧هـ. هەروەها: (ديـوان أبي تمـام) مؤسسـة الأعلمـي للمطبوعـات، بـيروت ٢٠٠٠م/١٤٢١هـ. (وەرگێڕ)

پ: ئێمەی تورك و كورد پڕ بە دڵ، بەڵكو پـڕ بـە جەستەمان خـاوەنی "ئازایـەتی"یـن، تەنانەت ئازایەتیمان لەناو ئەم دۆڵ و شیوانەدا هێندە پەلی هاویشتووە کە لەم شـاخ و چیـا سەخت و سەرکەشانەدا بەرجەستە بووە. هەروەك سەرمان لە زیرەکی و سنگیشمان پـڕە لە غیرەت و، پڕ بە جەستە و ئەندامەکانمان گوێڕایەڵیمان تێدایە. ئـەوەتا کەسـەکانی ئێمـە دۆڵ و شیوەکانیان پڕ لە ژیان کردووە و چیاکانمان بەوان خۆیان ڕازاندووەتەوە[1].

ئیـتر بۆچـی ئـاوا بـە نزمـی و زەلیلـی و مایـەپووچ ماوینەتـەوە؟ بـە ڕادەیـەك بوویـن بـە فرێدراوی سەر ڕێ و بانـەکان و، هـەموو ئەوانـە پێشـێلمان دەکـەن کـە بـەرەو بـەرزی و پێشکەوتن ئەسپیان غار داوە و، بە پەلە و چوست و چالاکی و لێبڕانـەوە بـەرەو داهـاتوو هـەنگاویان نـاوە. لـە کاتێکـدا نەتـەوەکانی دراوسـێ هەرچـەندەش ژمـارەیان لـە ئێمـە کـەمترە و هێنـدەی ئێمـەش بـەهێز نـین، کـەچی دەسـتدرێژیمان دەکەنـە سـەر و خۆیـان بەسەرماندا زاڵ دەکەن [إنَّ رِكْسَهُمْ يَغْلِبُ طاهِرَنا][2]!

و: مادەم بـە "مەشرووتیەت" دەرگایـەکی تۆبـە و پەشیمانی کرایـەوە و خـەڵکانێکی زۆر تۆبەیان کرد، ئەوا مافی ئەوەم نی‌یـە سەرزەنشـتی سـەرۆکەکانی ئێسـتا بکـەم، بـەڵام بـەرد دەگرمـە پێشـینانی ئـەوان و هـەر ئەوانیشـم مەبەستە. خـۆ ئەگـەر هەسـت و ڕێـزی هەندێك بە قسـەکانم زامـدار بـوو بـا ببووریـت، چونکـە ڕێزگرتـن لـە "حـەق" و زامـدار نەکردنی پێویست تـر و لـە پێشـترە، ئـەوەتا ڕێزنـان لـە هەسـت و نەستی نەتـەوە بـەرزتر و بەنرختره لە هی ئەوان.

بزانن کە هۆکارێکی ئەو نزم بوونەوەیە هەندێك لە سـەرۆکەکان و ئـەو فێڵبازانەشـن کە بە ڕواڵەت پەرۆشی بۆ نەتـەوە دەردەبـڕن و، وا پیشـان دەدەن کـە خۆیـان لـە پێنـاویدا بەخت دەکەن. یان بەشێك لەو خۆ بە شێخ زانانەیە کە لافی ناشایستەی ویلایـەت لـێ دەدەن.

جـا ئـەم ڕەفتـارە بـەد و بـێ کەڵکـەی ئـەوان، کـە دژ بـە ڕەفتـاری سـوننەتی خـاوێنی پێغەمبەرە ﷺ، یەکێکی ترە لە خراپکاری‌یەکانی ئیستیبداد.

(١) کەواتە ورەیان سارد نەبووەتەوە. (دانەر)

(٢) گـەر دەتـەوێ تێبگـەیت ئـەوا فـەرموو بـە وردی بڕوانـە؛ ئـەم دەستەواژەیە ئاماژە بۆ (وارتکـس)ی ئـەندام پەرلەمانی ئەرمەن و، سەیید مەلا (طاهير) دەکات کە ئەو دەمە نوێنەری "هەکاری" بووە لە پەرلەماندا. (دانەر)

پ: چۆن؟

و: هەموو نەتەوەیەك حەوزێكی مەعنەویی هەیە كە "بوێری"ی ئەو نەتەوەیە پێكدەهێنێت و ئابرووی دەپارێزێت و هێزەكەشی تێدا كۆ دەبێتەوە. هەروەك گەنجینەیەكی مەعنەویی هەیە كە سەخاوەتی نەتەوە دەنوێنێت و، سوودە گشتییەكانی لەخۆ دەگرێت و، زیادە ماڵ و سامانەكانیشی تێدا پاشەكەوت دەكرێت..

جا ئەو دوو بەشە ناوبراوەی سەركردەكان – بە خۆیان زانیبێت یان نەیان زانیبێت – چەند كەلێن و كەلەبەرێكیان لەو حەوز و گەنجینەیەدا كردەوە و، هەموو دەرامەتەكانی مانەوەی نەتەوە و مایەكانی ژیانیان لێ هێنایەدەر و، حەوزەكەیان وشك و گەنجینەكەشیان خاڵی و چۆڵ كرد.

(خۆ ئەگەر لەسەر ئەو حاڵە كارەكەیان بەردەوام بێت، ئەوا دەوڵەت لە ژێر پاڵەپەستۆی قەرزەكاندا كە خۆی لە ملیارەها دەدات، شكست دەهێنێت و دادەڕمێت)[1].

جا هەروەك ئەگەر مرۆڤ هێزی تووڕەیی و هەڵچوونی – كە بەرگریی لێ دەكەن – هەروەها هێزی حەز و ئارەزووەكانی – كە سوود و بەرژەوەندییەكانی بۆ كێش دەكەن – لە دەست بدات، دەبێ بە كەسێكی مردوو، با لە ڕواڵەتیشدا زیندوو بێت.. هەروەها وەك ئەوەی كە ئەگەر كون بكرێتە عەمباری هەڵمی شەمەندەفەر ئەوا لە كار دەكەوێت.. یان ئەگەر كشتەكی تەزبێح بپچڕێت، ئەوا دەنكەكانی هەڵدەوەرێن و بڵاو دەبنەوە..

نەتەوەش – كە لە خۆیدا كەسایەتییەكی مەعنەوییە – بە هەمان جۆرە؛ چونكە ئەو سەرۆكانەی كە حەوزی هێزەكەی وشك دەكەن و گەنجینەی سامانەكەی بە با دەدەن و پەتی بیری نەتەوایەتیی دەقرتێنن، ئەوا بەو كارەیان نەتەوە پارچە پارچە دەكەن و، بوون و قەوارەی لێ دادەماڵن و، بە ڕسوایی و بەربادی دەیتلێننەوە.

بەڵێ، (حقیقت كتم نمی كنم برای دل عامی چند).

واتە: لەبەر زامدار نەكردنی دڵی چەند كەسێكی عەوام، ڕاستی ناشارمەوە.

پ: ئەم شوێنە زیاتر شایانی درێژە پێدانە، بە كورتی و تەماوی بەجێی مەهێڵە!

---

(١) ئەوەی ناو كەوانەكە لە چاپی یەكەمدا نییە، دانەر خۆی لە چاپەكانی دواییدا زیادی كردووە. (وەرگێڕ)

و: سەردەمی پێشوو دەرفەتی لە دەشتەکێتی و نەزانیتان وەرگرتبوو، بۆیە چەند پلانێکی دارشتبوو. هەندێك لە خاوەن پلە و پایە گەورەکان بە شێوازێکی چەپەڵ قۆزتیەوە و، زەبر و هێزی زۆرەملێی بەکارهێنا و، بەوەش کەلێن و کەلەبەریان کردە ئەو گەنجینە و سەرچاوەیە و، ئاوە زوڵاڵەکەی ژیانیان ڕشتە ناو بیابانێکی وشك و برنگ و زەوی‌یەکی شۆرەکات. ئیتر جگە لە کەسانی تەوەزەل و هەلپەرست شتی تری لێ سەوز نەبوو.

تەنانەت لایەنی لاوازیی مرۆڤ و سۆزە هەستیارەکانی ئەو هەژارانەیان دەقۆزتەوە کە لە هەژاریدا دەستیان بۆ نێچیرێکی بچووکیش دەبرد، بەوەی کە وایان لێ کردن بێزیان لە سەروەت و سامانی دنیا بێتەوە، بۆ ئەوەی پەنجەیان لەو نێچیرە شل بێت و لە دەستیان دەربچێت، تاکو ئەوان بە چرنووکەکانیان بۆ خۆیانی بفرێنن!

بەڵێ، هەموو نەتەوەیەك خاوەنی سەخاوەت و مەردایەتیی خۆیەتی، کە بریتی‌یە لە بەخشینی برێکی سامانەکەی لە پێناوی سوود و بەرژەوەندیی نەتەوەدا. کەچی لای ئێمە ئەم سەخاوەتی‌نەتەوەیە بە جۆرێکی بەد بەکارهێنرا، بە پێچەوانەی نەتەوەکانی تر کە سەخاوەتیان لەناوخۆدا پاشەکەوت دەکرێت، تاکو بە وێنەی حەوزێکی گەورە و فراوان باخ و بێستانی زانست و زانیاری ئاودێری و پاراو بکات..

هەروەها سروشتی هەموو نەتەوەیەك ئازایەتی و جەسارەتێکی تێدایە، تاکو شەرەف و ئابرووی نەتەوەکە بپارێزێت. کەچی هەندێ کەس لە بەرپرسەکانی سەردەمی پێشوو ئەم ئازایەتی و جەسارەتەیان بە جۆرێکی خراپ بەکارهێنا، ئەوەبوو خستیانە بیابانی دووبەرەکی و لەناویان دا، بە ڕادەیەك کە هەریەکەیان کێلانێکی‌ئەو هێزەیان بە گەردنی ئەوی تردا دەکێشا، هەتا شکاندیان و هێزەکەشی لەگەڵدا شکا. تەنانەت ئەو هێزە مەزنەی کە لە پێنج سەد پاڵەوانی ئەوتۆ پێکهاتبوو ئامادەی پاراستنی شەرەف و ئابرووی نەتەوە بوون، ئەوان لە نێوان خۆیاندا و لە زەویی دووبەرەکی و جیاوازی‌یەکاندا لەناویان برد و، خۆیان شایستەی تەمێ کردن وسەرزەنشت کرد.

جا ئەگەر سوودتان لە "مەشرووتیەت" و "سەربەستیی شەرعی" وەرگرت و، ئەو کەلێن و کەلەبەرانەتان گرت، یاخود بە وێنەی "حەوز" ئازایەتی‌یەکانتان تێدا کۆ کردەوە و، ئەو هێزە جوانەشتان خستە دەستی دەوڵەتەوە تاکو بۆ دوژمنی دەرەکی

بەکاریان بهێنێت، ئەوا لە بەرامبەر ئەوەدا نرخ و پاداشتەکەی وەردەگرن کە: میهرەبانی و دادگەری و شارستانێتی‌یە.

پ: ئەگەر پێتان خۆشە لەمەولا شێوازی گفتوگۆکەمان دەگۆڕین.. من دەپرسم و ئێوە وەڵامم بدەنەوە؟

و: [فاسألْ ولا تجِدُ به خبيراً]!

واتە: (بپرسە و، کەسی شارەزاشی تێدا نابینیت)!

پ: ئایا دەگونجێ نەتەوەی ئەرمەن لە ئێوە ئازاتر بن(1)؟

و: نەخێر.. نەخێر.. نە شتی وا بووە و، نە دەشبێت..

پ: گەر وایە بۆچی گیانفیدایەکی ئەوان تەنانەت ئەگەر پارچە پارچەش بکرێت و بسووتێنرێت نهێنی‌یەکانی خۆی و هیچ شتێکی براکەی نادرکێنێت، لە کاتێکدا کە ئەگەر ئەو کەسە نووکە خەنجەرێك لە کەسێکی ئازای ئێوە بدات، هاودەم لەگەڵ خوێنە ڕژاوەکەیدا هەموو نهێنی‌یەکانیشی هەڵدەڕێژێت؟!

هۆی ئەم جیاوازی‌یە گەورەیەی ئازایەتیی نێوانتان چی‌یە؟

و: ئێمە لە ڕاستی و حەقیقەتی ئەم جیاوازی‌یە ئاگادار نین، بەڵام هێندە دەزانین کە شتێك هەیە گەردیلە دەگۆڕێت بە چیایەکی گەورە و شێریش ملکەچی ڕێوی دەکات!

ئەوە ئەرکی سەرشانی تۆیە کە وەڵامی ئەو پرسیارە بدەیتەوە، هەڵگرتنی ئەو ئەرکە لە توانای ئێمەدا نی‌یە. هەر هێندە دەزانین کە ئەو شتە هەیە، دەسا تۆیش حەقیقەتەکەیمان بۆ ڕوون بکەرەوە.

و: کەواتە گوێ ڕابگرن و هەمووتان گوێ بیست بن:

هیممەتی کەسێکی ئەرمەنی کە بە بیری میللی و نەتەوەیی بێدار بووبێتەوە، بریتی‌یە لە کۆی نەتەوەکەی. وەك بڵێی نەتەوەکەی لەودا بچووك بووەتەوە و بووە بەو کەسە خۆی، یاخود لەناو دڵی ئەودا جێگیر بووە. ئیتر چەندەش گیانی خۆی بەلاوە ئازیز و بەنرخ بێت، هێشتا نەتەوەکەی بەرز و ئازیزترە بەلایەوە. تەنانەت گەر هەزار "گیان"شی ببێت ئەوا هەموویان بۆ ئەو بیرەی کە هەڵی گرتووە و بەلایەوە بەرزە، بەخت دەکات.

---

(١) لەبەر ئەوەی تورك و کورد زانای مەزنن لە هونەری ئازایەتیدا، ئەوان وەڵام دەدەنەوە و منیش پرسیاریان ئاراستە دەکەم. (دانەر)

لە کاتێکدا ئازاترین کەسی پێشینتان - نەك ئەمانەی ئێستا - کە بێدار نەبووبێت و نەکەوتبێتە ڕووناکی‌یەوە و لە شەرەف و شکۆی نەتەوەی ئیسلام بێ ئاگا بووبێت، ئەوپەڕی بیروبۆچوونی ئەو تەنها لەمەڕ شەرەف و ئابڕووی خۆی و بەرژەوەندی‌یەکانی بووە، یان شەرەف و ئابڕووی عەشیرەت یاخود سەرۆکەکەی. کەواتە ئەو کەسە بە ڕوانینێکی کورت دەڕوانێت و بە بیرێکی تەسکیش بیر دەکاتەوە.

بێ گومان ئەو کەسانە زۆر کەمن کە ئامادە بن لە پێناوی ئەم چەشنە ئامانجە بچووکانەدا گیانی ئازیزی خۆیان بەخت بکەن!

جا ئەگەر ئێوە بیر و بۆچوونەکانتان بەپێی نەتەوایەتیی ئیسلام[1] بوایە، وەك ئەوەی کە ئەوان بە نەتەوایەتیی خۆیان دەڕواننە کاروبارەکان، ئەوا ئازایەتی و قارەمانێتیی خۆتان لە پێش چاوی هەموو جیهاندا ڕادەگەیاند و، بەرەو بڵندی‌یەکان بەرز دەبوونەوە.

ئەگەر بیرو بۆچوونەکانی ئەرمەنەکانیش وەکو هی ئێوە کورت و ڕووکەش بوایە، ئەوا بە وێنەی شتی فڕێدراوی سەر ڕێ و بانەکان، بێ فەڕ و پێشێل کراو دەبوون.

لە ڕاستیدا ئێوە توانا و لێهاتنتان بۆ ئازایەتی‌یەکی بێ وێنە و بێ هاوتا تێدایە، بە بەڵگەی ئەوەی هی واتان هەیە لە پێناوی شتە بچووکەکانی وەك سوودێکی ساکار، یاخود عیززەتێکی جوزئی، یان شەرەفێکی ڕەمزی و ئیعتیباری، یان لەبەر ئەوەی پێی بوترێ ئازایە، یاخود لەبەر بە گەورە زانینی شان و شکۆی سەرۆکەکەی، ژیانی خۆی بە سووك دەبینێت و گیانی خۆی بە ئاسانی بەخت دەکات.

ئەی ئەگەر ئەوانە بێدار ببنەوە دەبێ چۆن بن؟

ئایا بەوپەڕی ئاسانی گیانی خۆیان - گەر هەزار گیانیشیان هەبێت - ناکەنە قوربانی نەتەوایەتیی ئیسلام کە بە هیچ نرخێك هەڵناسەنگێنرێت؟ چونکە برایەتی و پشتگیری و یارمەتیی مەعنەویی سێ سەد ملیۆن موسڵمانیان دەست دەخات، بێ گومان ئەو کەسەی

---

(١) نەتەوایەتیی ئێمە بوونێکی سەربەخۆیە، گیانەکەی بریتی‌یە لە "ئیسلام" و ژیری‌یەکەشی "قورئان" و "ئیمان"ە*. (دانەر)

* ئەم پەراوێزە لە چاپە کۆنەکەدا بەم جۆرەیە:

**(نەتەوایەتی جەستەیەکە ڕۆحەکەی ئیسلامەتی‌یە، ژیری‌یەکەی عوسمانی‌یەتە، جەستەشی ئەو کوردایەتی یاخود تورکایەتی‌یەی ئێوەیە.** (وەرگێڕ هێناویەتی)

ژیانی خۆی بۆ دە قورش بەخت بكات، بەوپەڕی حەز و شەوقەوە ئامادەیە بۆ دە لیرە ئەو ژیانەی ببەخشێت.

بە داخەوە! هەروەك چاكەكارییەكانمان ڕۆشتن بۆ لای ناموسلمانان، هەر ئەوانیش ڕەوشتە باشەكانیان لێ دزین. وەك بڵێی بەشێك لـە ڕەوشتە كۆمەڵایەتییـە بڵندەكانمـان لای خۆمان برەویان نەما، لەبەر ئەوە لێمان بێزار بوون و ڕۆشتن بۆ لای ئـەوان. بەشێك لـە ڕەوشـت و خـووە نزمـەكانی ئـەوانیش لای خۆیـان ڕەواجـی نـەما، بۆیـە هێنرانـە نـاو بازاڕی نەزانیی ئێمە!

ئایا بەوپەڕی سەرسامییەوە نابینن كە چۆن ناموسلمانەكان ئەو وشە سـپی و ڕەفتـارە سوورەی ئێمـەیان بـۆ خۆیـان دزی، چەشـنی ئـەوەی كـە دەڵـێ: (گـەر مـن مـردم، بـا دەوڵەتەكەم بێ وەی بێت و نەتەوە و خۆشەویستانیشم هـەر بژیـن و بمێنـن) كـە وشـەیەكە بەردی بناغەی كەماڵ و بەرزبوونـەوە و پێشـكەوتنی ئـەم ڕۆژگارەیـە، تەنانـەت خواستی ئایینی خاوێنمانـە. ئـەوەتا گیانفیدایـەكی ئـەوان دەڵێـت: (گـەر مـن مـردم، بـا نەتەوەكـەم بژی.. بە ژیانی ئەوان من ژیانێكی مەعنەویم دەبێت).

لە كاتێكدا ئەو وتە گەوجانەیە و، ئەو ڕەفتارە خوار و خێچەی كە بناغـەی زەلیلـی و خۆپەرستییە و، سەركردایەتیمان دەكات و، هیممەتی ئێمەی لە دەست و پێ خسـتووە، ئەم دەستەواژەیە كە دەڵێت:

(إذا مِتُّ ظمآنَ فلا نَزَلَ القطرُ)[1]!

بـەم جـۆرە، بـەرزترین ڕەوشـتی ئێمـە و خواستی ئایینەكـەمان ئەوەیـە كـە بـە گیـان و جەستە و ویژدان و هزر و بیر و هەموو هێزێكمان بڵێین:

(گـەر ئێمە مردین، نەتەوەی ئیسـلامـان زینـدووە و دەمێنێتـەوە. دەسـا بـا نەتەوەكـەم بژی و بێ وەی بێ. من پاداشتی دواڕۆژم لـێ سـەروزیادە. چونكـە ژیـانی مەعنـەویی مـن كە لە ژیانی نەتەوەدایە دەمژیێنێـت و، لـە جیـهانی بڵنـد و بـەرزی خۆمـدا دەمخاتـە چێـژ و لەزەت و خۆشحاڵییەوە).

---

(١) ئەمە نیوە بەیتێكی (ئەبوو فیراسی حەمدانی)یە (٣٢٠-٣٥٧). بە واتای: (ئەگەر خۆم لە تینووانـدا مـردم، یاخوا ئیتر هەر باران نەبارێت). (وەرگێڕ)

کەواتـە بـا دەستووره ڕووناکی بەخشەکانی نـوور و، پەرۆشیی نەتـەوە بکـەین بـە دەستوورمان و، بڵێین:

[والموتُ يومُ نَوْرُوزِنا].

واتە: (مردن ڕۆژی نەورۆزمانە).

پ: چۆن هێزەکانمان کۆ بکەینـەوە و پارێزگـاری لـە شـەرەفی نەتـەوەی ئیسـلام بکەین[1]؟

و: بـە فیکری میللـی لـەناو نەتەوەدا حـەوزێکی وەك حـەوزی کەوسـەر بـۆ زانـین و خۆشەویستی هەڵبکەنن و، بە زانیاری و زانستەکان هەموو کەلێنێکی بنکی حەوزەکەش بگرن کە ئاوی لـێ دەڕوات..

ئنجا بـە ئاکـارە بـەرزەکانی ئیسـلامیش ئـەو پلووسك و جۆگانـەی بکەنـە سـەر کـە ئاویان لـێ دەڕواتە ناو حەوزەکە..

کانیاوێکی گەورەی بەفیڕۆدراو هەیە کە تا ئەمڕۆ بە خراپی بـەکارهێنراوە و کراوەتـە سـەر زەویـی لمـاوی و شـۆرەکات و، تەنـها کەسـانی سـواڵکەر و دەستەوسـانی لــێ پێگەیشتووە. دەسا ئێوە جۆگەیەکی جوانی بـۆ دروسـت بکـەن و، بـە هـەوڵ و کۆششـی شەرعی و ڕەوا ئاو بکەنە ناو حەوزەکەوە و، پاشان باخی کەماڵاتی خۆتانی پێ بدێرن..

ئەوە کانیاوێکە هەرگیز وشك ناکات و تەواو نابێت.

پ: ئەو کانیاوە چییە؟

و: زەکاتە، ئێوە حەنەفی و شافیعین.

پ: [حَبَّذا ونِعْمَتْ إنْ لَمْ تَذْهَبْ غائِضَةً، بَلْ فاضَتْ إلى تِلكَ الخزينة][2].

واتـە: (شتێکی زۆر باشـە، گـەر بـە زەویـدا ڕۆ نەچێـت، بـەڵکو بڕژێتـە نـاو ئـەو گەنجینەیەوە).

---

(١) ئەوە بە دڵدا هات کە: دەگونجێ ئەم وانانەی چل و پێنج ساڵ پێش ئێستا بە هۆزە دەشتەکییەکان وتـراوە، بکرێن بە چەند وانەیەك بۆ قوتابیانی نووری ئێستاش. وا منیش ڕەوانەی کەسە گەورەکانی قوتابخانەی زەهرای دەکەم. با ئەوان ئـەو وشـانەی لـێ دەربهێنن کە نـەگونجاون و پێویسـت نین و، ئەو بەشـانەی بنووسـنەوە کە لەگەڵ ئەم ڕۆژگارەدا و لەگەڵ شـوێنکەوتووانی ڕێبـازی نـووردا گونجـاون. تـاکو سـەعیدی کۆنیـش لـەو زەمەنەدا بە تەنها نەمێنێتەوە و، ئەویش ببێت بە شوێنکەوتەی ڕێبازی نوور. (دانەر)

(٢) بێزار مەبە، ئەم گوفتارە پۆشاکی زەکاتی پۆشیوە. (دانەر)

و: [أجَلْ إنَّ فيكم ذكاوةً إنَّما تتزاهَرُ بالزكاةِ].

واتە:

(بەڵێ، ئێوە بێ گومان زیرەکی‌یەکی وەهاتان تێدایە کە تەنها بە زەکات گوڵ دەگرێ).

پ: چۆن؟

و: ئەگەر زیرەکەکان زەکاتی زیرەکی‌یان بدەن و، دەوڵەمەندانیش گەر تەنها زەکاتی زەکاتەکەیان بۆ سوودی نەتەوە ببەخشن، ئەوا نەتەوەکەمان دەکەوێتە پێشبڕکێ لەگەڵ نەتەوەکانی تردا.

پ: پاشان چیی تر؟

و: یاریدەدەری ئەو سەرچاوەیەش بریتی‌یە لە یارمەتیی میللیی موسڵمانان، ئەویش ئەو سەدەقە و نەزرانەن کە ئامۆزای زەکاتن و، دەماریان بە هی زەکات لێ دەدات و، یارمەتیدەرێکە بۆ خزمەتگوزاری‌یەکان.

پ: بۆچی زۆر جار گاڵتە بە داب و نەریتە بەردەوامەکانمان دەکەیت و بە قەڵبیان لەقەڵەم دەدەیت[1]؟

و: چونکە هەموو زەمانێك حوکم و بڕیاری خۆی هەیە. ئەم زەمان و ڕۆژگارەی ئێمەش حوکمی مردن و هەڵوەشانەوەی بۆ چەند داب و نەریتێکی پیر دەرکردووە، چونکە زیانەکانیان گەلێ زیاترە لە سوودیان. ئەم زیادبوونی زیانەشیەتی کە فەتوای ئیعدام و لەناودانی بۆ دەرکردووە.

پ: یەکەم شت کە پێویستە ئەنجامی بدەین چی‌یە؟

و: ڕاستگۆیی!

پ: پاشان؟

و: درۆنەکردن!

پ: پاشان؟

(١) وا هەست دەکەیت کە هەندێ لە پرسیارەکان پەیوەندی‌یان بە باسەکەوە نی‌یە و، دەڵێی چەند شوێنێکیان لە نێواندایە، بەڵام گەر ئەندێشە بڕواتە ناو بالۆنێك و دووربینێکیش لەگەڵ خۆیدا ببات، لەوانەیە شوێنی شیاویان بۆ ببینێتەوە. (دانەر)

و: ڕاستگۆیی (و دڵسۆزی و وەفا و دامەزراوی و پشتگیریی یەکتر)[(١)].

پ: هەر ئەوەندە؟

و: بەڵێ.

پ: بۆچی؟

و: حەقیقەتی کوفر بریتی‌یە لە "درۆ" و.. حەقیقەتی ئیمانیش بریتی‌یە لە "ڕاستی".

ئایا ئەم بەڵگەیە سەروزیاد نی‌یە کە: مانەوەی ژیانمان بەندە بە بەردەوامیی ئیمان و ڕاستگۆیی و پشتگیریی نێوانمان؟

پ: ئایا لە پێشدا چاکسازیی سەرۆکەکانمان پێویست ناکات؟

و: بەڵێ، سەرۆکەکان هەروەك سامانەکانی‌ئێوەیان برد و لە گیرفانیاندا هەڵیان گرت، ژێری‌یەکانی ئێوەشیان بردووە، یان لەناو مێشکتاندا بەندیان کردوون! لەبەر ئەوە، من ڕووی دەمم دەکەمە ژێری‌یەکانتان، کە لای ئەوانە و، دەڵێم:

ئەی سەرەکان و سەرۆکەکان! نەکەن کەمتەرخەمی بکەن و پاڵی لێ بدەنەوە، کە خۆی لە خۆیدا تەمبەڵی‌یە. کارەکانتان دوا مەخەن و مەیانخەنە ئەستۆی یەکتر. بەو سامانەمان کە لاتانە و بەو ژێری‌یانەی هەتانە خزمەتمان بکەن. ئێوە پێشتر لە ڕێی خستنەکاری ئەو هەژارانەوە کرێ و پاداشتی خۆتان وەرگرتووە، وا ئێستا کاتی کار و خزمەت هاتووەتە پێش. [فَعَلَيْكُم بالتَّدارُكِ لما ضَيَّعتُم في الصَّيف][(٢)].

واتە: (فریای بەدەستهێنانەوەی ئەو هەلە بکەون کە هاوین لە دەستتان دا).

پ: یەك دوو ساڵە وا دەردەکەوێ ئارەزووی دینداری و بێداربوونەوەی هەستی ئایینی و لایەنگرتنی "حەق" لای خەڵکی وریا بووەتەوە، تەنانەت چەتە و ڕێگرانی "گەڤەدان" و "مامە خووران" بە یەك نەسیحەتی شێخ ئەحمەد تۆبەی یەکجاری‌یان کردووە و، بوون بە صۆفی. [وقد قطع الطريقَ على الشقاوة هذا الميلان].

واتە: (ئەم مەیل و ئارەزووە ڕێی لە ڕێگران و خراپکاران داخستووە).

---

(١) مادەم شوێنکەوتووانی ڕێبازی نووریش هاتنە ناو ئەوانەی کە ڕووی گوفتارم لێیانە، ئەوا وشەکانی وەك: دڵسۆزی و، وەفا و، دامەزراوی و، پشتگیری کردنی یەکتر، دەخرێنە سەر وشەی "ڕاستگۆیی". (دانەر)
واتە: وشەکانی دوای وشەی "ڕاستگۆیی" دانەر خۆی لە دواییدا زیادی کردووە. (وەرگێڕ)

(٢) ئاماژەیە بۆ پەندی بەناوبانگی عەرەبی: (في الصيفِ ضَيَّعْتِ اللبن) کە بە کەسێك دەوترێ بە دوای هەڵێکدا بگەڕێ کە هەر بۆخۆی پێشتر لە دەستی دابێت. (وەرگێڕ)

و: تەنها "مەشرووتیەت"ی ژیر و هۆشیار (و شێخ پەیامی نوور)[1] ئەوانی ڕێنمایی کرد، چونکە کاتێ مەشرووتیەت لەسەر تەخت و عەرشی هزر و بیرەکان دانیشت، پەت و گوریسی قایمی نەتەوایەتیی ڕاتەکاند و، "ئیسلام"یش - کە دەستاوێزێکی مەحکەمە - لە لایەنی خۆیەوە ڕاتەکانی پێ کەوت و، هەموو موسڵمانێك تێگەیشت لەوەی کە بەری بۆ بەرەڵا نەکراوە، بەڵکو بە چەند هۆکارێکی وەك: بەرژەوەندی و، سوودی هاوبەش و، هەستی موجەڕڕەد پەیوەستی کەسانی ترە، لەبەر ئەوەی موسڵمانان بە وێنەی یەك هۆز و تیرە وان هەموویان پەیوەندییان بە یەکترەوە هەیە.

نابینی گەر کردەوەیەکی باش لە لایەن یەك تاکە کەسی هۆزێکەوە ئەنجام درابێت هەموو کەسانی تری هۆزەکە شانازیی پێوە دەکەن و هاوبەشن تیایدا و، ئەو شەرەف و شانازییە لەو تاکە کەسەدا نامێنێتەوە، بەڵکو بە وێنەی ئەو مۆمەی کە دەبێت بە هەزار مۆم لە هەزار ئاوێنەدا، ئەو کردەوە چاکەش بە هەمان شێوە دەبێت بە هەزار. ئیتر پەیوەندیی ژیانی ئەو هۆزە پتر بەهێز و ڕووناك دەکاتەوە..

بە هەمان جۆر گەر یەکێکیان تاوانێك ئەنجام بدات ئەوا هەموو کەسێکی هۆزەکە تا ڕادەیەك لەگەڵ ئەودا بە تاوانبار دادەنرێن. بۆ نموونە: ئەگەر کەسانی ناو ئەم کۆڕە خۆیان بە پەتێك بەستەوە و، پاشان یەکێکیان خۆی فڕێ دایە ناو قوڕاوێکەوە، ئەوا یان هاوڕێکانیشی دەخاتە ناو قوڕاوەکەوە، یان بە جموجووڵی زۆر بێزاریان دەکات.

لەسەر بناغەی ئەمە: تەنها یەك خراپە هەتا بۆ هەزار سەردەکەوێت و، تەنها چاکەیەکیش دەبێ بە:

﴿كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنْبَتَتْ سَبْعَ سَنَابِلَ فِي كُلِّ سُنْبُلَةٍ مِئَةُ حَبَّةٍ﴾ (البقرة:٢٦١).

واتە: (وەك دەنکی دانەوێڵەیەکی لێ دێت کە حەوت گوڵ بگرێت و هەریەك لەو گوڵانەش سەد دەنکی تێدا بێت).

جا ئەم نهێنییەی کە مرۆڤ بەرەو تۆبە کردن دەبات، هەموو ئەوانەی خستە گریان کە بە هزر و گیان بێدار بوونەتەوە. بەڵام ئەو ژیرییەی کە لەسەر لوتکەی منارەکەدایە بە باشی هۆکاری ئەوە نازانێت کە لە بنکی بیری ویژداندایە.

---

(١) مادەم ڕێبازی نوور ڕۆشتووەتە ناو چەتەکانی "مامە خووران"ەوە، ئەوا دەبێت لە بریی "شێخ مەشرووتییەت" بوترێت: "شێخ پەیامەکانی نوور" کە بەرگی سەربەستی و غیرەت و پەرۆشیی نەتەوەیی و ئایینیی پۆشیوە و، بە دڵنیاییەوە لە بازنەی "یەکێتیی محەممەدی"دایە. (دانەر)

**بە پوختى:**

موسڵمانان بێدار بوونەتەوە، يان لەوەدان بێدار ببنەوە[1]و، خەريكە "خێر" بە خێر و "شەڕ"يش بە شەڕ ببينن! هەر ئەم نهێنى‌يەشە كە واى لە هۆزەكانى ئەم دۆڵ و شيوانە كردووە كە بە يەكجارى و بە ڕاستى تۆبە بكەن و بگەڕێنەوە بۆ لاى خواى گەورە. موسڵمانانيش لە لايەنى خۆيانەوە وردە وردە خۆيان بۆ بەدەستهێنانى ئەم نهێنى‌يە ئامادە دەكەن.

بەڵام ئێوە لەبەر ئەوەى دەشتەكين و سروشتى ئەسڵيتان تێك نەچووە، لە نەتەوايەتيى ئيسلامى‌يەوە نزيكترن.

پ: تۆ دەزانيت كە ڕێز گرتن لە ميوان داب و نەريتێكى جوانى ئێمەيە. ئەى بۆچى نابيت بە ميوانى هيچ كەسێكمان و خۆتمان لێ دەبوێريت؟ خۆ ئەم نەريتەمان دێرين و ڕەسەنە. كەواتە لەبەرچى ئەم دابانەى ئێمە بە سووكايەتيى سەير دەكەيت و، ڕێ لەوەش دەگريت كە قوتابيانت خواردنمان بخۆن و دياريمان لێ وەربگرن؟ لە كاتێكدا كە خزمەتكردنتان و چاكە نواندن لەگەڵتاندا ئەركى سەرشانمانە و مافى ئێوەشە بەسەرمانەوە؟

و:

يەكەم: زانست ئازيزە و نامەوێ زەليلى بكەم.. هەروەها دەمەوێ پيشانتان بدەم كە لەناو زانايانىدا كەسێك هەيە دانابەزێت بۆ دنيا و، سنعەتى زانست ناكاتە هۆكارى بەدەستهێنانى گوزەران و، قوتابيانى زانستيش سوالكەر و دەروازەگەڕ نين.

دووهەم: دەمەوێ بە كردەوە ئامۆژگاريى هەندێ لە فەرمانبەران بكەم كە لە ئەركى سەرشانياندا كەمتەرخەمى و تەمبەڵى دەنوێنن و، قەناعەت پيشان دەدەن، بەڵام قەناعەت بە مووچەكانيان ناكەن. دەبينى خەرجيى ڕێگاوبان دەستيان لە ميوانداريێ ناگێڕێتەوە.

سێ‌هەم: هەندێ لەو سەرۆكانەى كە ڕێگاى دەرامەتى ستەمكارانەيان بڕاوە، دادەبەزنە تاريكستانى ستەمكردن، ئەويش بە كردنەوەى چەندين دەرگاى خەرجى و مەسرەف. منيش دەمەوێ ڕێگايەكيان بۆ داخستنى ئەو دەرگايانە پيشان بدەم.

---

(١) بەڵێ، دواى چل و پێنج ساڵ هۆزەكانى هەريەك لە وڵاتە عەرەبى‌يەكان و پاكستان سەربەخۆييان بەدەست هێنا و، پشتى سەعيدى كۆنيان لەم وانەيەدا گرت. لە داهاتووشدا هەر پشتى دەگرن. (دانەر)

چوارەم: دەمەوێ پێوەرێکتان نیشان بدەم ئەو کەسانەی پێ هەڵبسەنگێنن کە گەشت و گەڕان بەناوتاندا دەکەن، تاکو بەهۆیەوە بزانن ئایا لەبەر میللەت ئەم کارە دەگرنە ئەستۆ، یان بۆ هەوا و ئارەزووی دەروونی خۆیان؟ کەواتە بەم کارەم مەحەکێك لە نێوان حیلە و حەمییە (واتە فێڵ و پەرۆشی)دا دەخەمە پێش چاو.

پ: ئاخر بەمە دەبیتە ڕێگر لە بەردەم چاکەی خەڵکیدا.. ئایا ئەنجامی ئەمە سووکایەتی نابێت بە سەخاوەتیان؟

و: چاکە کاتێ لە ڕاستیدا بە چاکە دادەنرێت کە بۆ نەژاد و ڕەگەزی مرۆڤ بێت، یان بۆ نەبوو، یاخود هەژار. تەنها لەو کاتەدا سەخاوەتی ڕاستەقینەیە. جا ئەگەر ئەو سەخاوەتە لە پێناوی نەتەوە، یان بۆ ئەو تاکە کەسە بوو کە نەتەوەی لەخۆ گرتووە، ئەوا سەخاوەتێکی جوانە، بەڵام گەر بۆ کەسێکی ناموحتاج بێت، ئەوا فێری تەمەڵی و سواڵی دەکات و، لەسەری ڕایدەهێنێت.

بە کورتی: نەتەوە دەمێنێتەوە، بەڵام تاکە کەسەکان دەڕۆن و نامێنن.

پ: [ما تقول في الإحسانات الشخصيةِ في السلفِ، أمنـــاءِ الأمـــة، ورشـــدائِها، وسيوفِ الدولة وصلاحِها.. تجلت العبوسيةُ بمكارمِها بإهداء عشرةِ دنانـــيرَ لشِـــعرٍ لا يوزن شَعيرة]؟

واتە: (ڕات بەرامبەر چاکەکاریيە کەسیيەکان چیيە کە پێشینانی دەستپاکی نەتەوە و هۆشمەندانی و شمشێرانی دەوڵەت بەخشیویانە، ئەوەتا مۆنی و ڕووگرژیيان لە سەخاوەتیاندا دەرکەوتووە، بەوەی کە دە دیناریان لە خەڵاتی شیعرێکدا بەخشیوە تەنانەت دەنکە جۆیەکیش ناهێنێت)؟

و: (١) [فيه ما فيه.. مع أنـــها بالنهاية قد انجرّتْ إلى النوعِ والملّة، لأن اللسانَ الذي خَدَمَه الشعرُ خيطُ الملّية، مع أن هذا الزمان هو الذي كشفَ عن احتياج الملّيةِ وفتـــحَ البابَ لهذا المقصدِ العالي].

واتە: (ئەوەی تیایە کە تیایەتی.. لەگەڵ ئەوەشدا ئەنجامەکەی خێری بۆ ڕەگەزی مرۆڤ و میللەت تێدا بوو، چونکە ئەو زمانەی کە شیعر خزمەتی کرد تاڵە دەزووی

(١) ئەم دەستەواژەیە لە کارگەی بابەتەکەوە سەرچاوەی گرتووە و، ئەو شێوازە خۆجێیيەی پۆشیوە کە پێشکەشی کراوە. (دانەر)

میللی‌یەتە. هەرچەندە ئەم ڕۆژگار و زەمانەش بوو کە پێویستیی میللییەتی دەرخست و دەرگای بۆ ئەو ئامانجە بەرزە کردەوە).

پ: ئەو سەرۆکانەی خۆیان زاڵ کردبوو، ئێستا کەوتوونەتە خوار و ، دەرگای ستەمیان لێ داخراوە. کەواتە واز لەوانەیان بهێنە بەربوونەتەوە، با بە دەردی خۆیانەوە بتلێنەوە. ئەوانەش فەرامۆش بکە لە گیانەڵادان، با سەرەمەگی خۆیان تەواو بکەن.

و: من دەمەوێ پارێزگاریی ڕێ و ڕەسمی سەربەستیی شەرعی بخەمە ئەستۆتان، تاکو ئەوان هەتا لە ژیاندان لە خۆیاندا بەرجەستەی بکەن. بەڵێ، ئەو سەرۆکانەی کە تەنها بە هێز و زەبری ئیستیبداد پێگەشتبوون، یەك بە یەك هەڵوەرین. شایانی ئەوەشن. بەڵام کەسانێکی پارێزەر(ی میللەت)یان تێدایە.

[نعم إن بينهم حُماةً للمليّة فنشكرُهم.. ومتكاسلين فنشكوهم.. ومتحيرين فنرشدُهم.. وأمواتاً فنحافظُ على ميراثهم لئلا يأخذه مَنْ..] برز حديثاً إلى الميدان.

واتە: (بەڵێ، کەسانێکیان لە نێواندایە کە میللییەت دەپارێزن، سوپاسیان دەکەین و.. چەند تەمبەڵێکیش، سکاڵایان لە دەست دەردەبڕین و.. چەند سەرگەردانێك، ڕێنماییان پێشکەش دەکەین و.. کەسانێکی مردووش، میراتەکەیان دەپارێزین تاکو کەسێك نەیبات کە..) تازە هاتووەتە مەیدانەوە.

پ: پێشتر تۆ هەموو شێخەکانت خۆش دەویست و گومانی باشت هەبوو بەرامبەریان، تەنانەت بەوانەش کە هەر بەناو شێخ بوون. ئێستا ئەم هێرشە چی‌یە دەیکەیتە سەر بەشێکی ئەو خۆ بە شێخ زانانەی کە دووچاری بیدعەت بوون؟

و: هەندێ جار دوژمنایەتی لە خۆشویستنی زۆر و زیادەوە پەیدا دەبێت! بەڵێ، هەروەك لەبەر خۆم خۆشم دەویستن، چەندین ئەوەندەش لەبەر خودی ئیسلام شەیدایان بووم.

[لقد انتقشَ في سويداءِ قلوبِهم الطاهرةِ الصبغةُ الربّانيةُ وفي خَلَدِهم ضياءُ الحقيقة][1].

---

(١) ئەم شێوازە لە پارچە پارچەکانی خەرقەی پیرۆزی یەکێك لە زنجیرەکانی پیاوچاکان چنراوە. واتە: ئاماژەی تێدایە بۆ چەند وەلی‌یەکی مەزنی وەك: شاهی نەقشبەند و، ئیمامی ڕەببانی و، مەولانا خالید ضیائەددین و، سەیید طاها و، سەیید صیبغەتوڵڵا و، سەیدا. (دانەر)

واتە: (لەناو کرۆکی دڵە خاوێنەکانیاندا ڕەنگرێژیی پەروەردگاری و، لە ناخیشیاندا ڕووناکیی حەقیقەت نەخشێنراوە).

ندیمان بادها خوردند و رفتند تهی خمخانها کردند و رفتند[1]

بەڵام بەردی بناغەی ڕێبازەکەیان ڕووناك کردنەوەی دڵان و پەیوەست کردنیانە بە سیفەتە جوانەکانی ئیسلام و بەردەوام بوون لەسەری. واتە: ڕەنگ گرتنیان بە ڕەنگی پەرۆشی و غیرەتی ئیسلام. بە واتایەکی تر: دەستبەرداربوون لە سوودە کەسی‌یەکان بە نیازی بەدەستهێنانی ئیخلاس. کە ئەوە دەگەیەنێت ڕوو بکەنە دامەزراندنی خۆشەویستیی گشتی. واتە خزمەتکردنی یەکێتیی ئیسلامی و بانگەشە بۆ کردنی.

[فوا أسفا لقد أساؤا متكئين وتكاسلوا في خدمتهم، فحينئذٍ أريدُ تحويلَ هِمَمِهِم إلى مجراها الحقيقي القديم].

واتە: (بەڵام بە داخەوە بە پاڵ لێدانەوە و کەمتەرخەمی‌یان، خراپەیان بەرامبەر خزمەتەکەیان نواند. بۆیە منیش دەمەوێ هیممەتەکانیان ئاراستە بکەمەوە بەرەو ڕێڕەوی پێشوویان).

پ: هەمیشە تۆ باسی "یەکێتیی ئیسلامی"مان بۆ دەکەیت.. ئایا پێناسەی ناکەیت بۆمان؟

و: لە کتێبەکەمدا: "دادگای عورفیی سەربازی" پێناسەم کردووە. وا بەردێکی ئەو کۆشکە بڵندە و نەخشونیگارێکیتان پیشان دەدەم:

"کەعبەی پیرۆز" بەردە ڕەشی کەعبەی بەختەوەریمانە، کە یەکێتیی ئیسلامی‌یە.. "ڕەوزەی خاوێن"یش گەوهەری سپیی ئەو بەختەوەری‌یەمانە.. "دوورگەی عەرەب"یش مەککە پیرۆزەکەیەتی و.. "دەوڵەتی عوسمانی"ش کە بە تەواوی سەربەستیی شەرعی جێبەجێ دەکات "مەدینەی منەووەرە"ی شارستانێتی‌یەکەیەتی.

ئەگەر دەتەوێت نەتەوایەتیی ئیسلام و بەردی بناغە و نەخشی یەکێتیی ئیسلامی ببینیت، ئەوا فەرموو:

---

(١) شیعرێکی فارسی‌یە، بۆم ساغ نەبووەوە هی کێ‌یە. واتە:
یاران دوای ئەوەی بادەیان نۆشی ڕۆشتن، مەیخانەش ما بە خامۆشی
(وەرگێڕ)

ڕێزگرتنی شایستە و بەغیرەتانە، کـە لـە شـەرم و پەرۆشـی‌یەوە هـەڵقوڵاوە.. خـەندەی خاوێن و بەری، کە لە ڕێز و میهرەبانی‌یـەوە پەیدا بـووە.. شیرینیی ڕۆحـی، کـە ئـەنجامی جوانـی و زمانپاراوی‌یـە.. مەسـتیی ئاسمـانی، کـە لـە عیشـقێکی گـەنج و شـەوقێکی بەهارانەوە سەری هەڵداوە.. تام و چێژێکـی مەلـەکووتی، کـە بەرهـەمی پـەژارەی دەمـی خۆرئاوا و دڵخۆشیی کاتەکانی سەحەرە.. ئارایشـتی خـاوێن و پیرۆز، کـە لـە جوانییـی موجەڕڕەد و قەشەنگیی ئاشکراوە دەرکەوتووە[١]..

دەتوانرێ لە ڕەنگی نوورانیی بەرەنجامی تێکەڵکردنی ئەم ڕەوشـتە بەرزانـەوە، شـتێك لـە دیمـەنی ڕەنگی ئەرخـەوانی ببینـرێت لـە نێـوان حـەوت ڕەنگـی پەلکـە زێڕینـەی دوو کەوانەی خۆرهەڵات و خۆرئاوا و، تاقی بڵندکراوی کەعبەی بەختەوەری‌یان.

بەڵام ئەم "یەکێتی"یـە بـە نـەزانی دروسـت نـابێت، بـەڵکو یـەکێتی بریتی‌یە لـە تێکـەڵ کردنی بیر و هزرەکان..

ئەم تێکەڵ کردنەش تەنها بە نووری درەخشانی "زانین" دێتە دی.

پ: بۆچی لە ڕابوردوودا بێ دەنگ بوویت؟

و: [لأنَّ الإستبدادَ كان مانعاً، فكنتُ سكتُّ على جَمْرِ الغَضى][٢].

واتـە: (چونکـە ئـەو دەمـە ئیسـتیبداد ڕێگـر بـوو، منیـش وەکـو کەسێك پێـی لەسـەر پشکۆی "غەضا"[٣] دانابێت، بە ناچاری بێدەنگ بووم).

پ: هێرش کردن بۆ سـەر ئـەو شـێخانەی کەوتوونەتـە نـاو بیدعەتەکانـەوە، مەترسیی لەسەر خۆت هەیە. چونکە ئەوان کەسانی ئەولیا و پیاوچاکیان تێدایە.

[ألا تخافُ أنْ تُصيبَهم بجهالةٍ فَتُصبِحَ على ما فَعَلْتَ مِن النّادمين]؟

واتە: (ئایا لـەوە ناترسیت کـە بـە نـەزانیی خـۆت ئـەوان تـووش بکـەیت و پاشـان لـە کردەوەکەت پەشیمان ببیتەوە)؟

(١) هـەموو یـەکێ لـە برگـەکانی ئـەم شـێوازە، ئاماژەیـە بـۆ یـەکێك لـە تیشکەکانی ئیسـلام و، جوانی‌یـەك لـە جوانی‌یەکانی و، ڕەوشتێکی بەرزی و، یەکێك لە پەیوەندی‌یەکانی و، بناغەیەك لە بناغەکانی. (دانەر)

(٢) کاتێ ئەم گوفتارەم وتووە کە بیرم لە پێویستیی زمانی عەرەبی دەکردەوە. (دانەر)

(٣) درەختێکە ئاگری دارەکەی زۆر تیژ و سووتێنەرە. (وەرگێڕ)

و: [إنّ المولى – جلّ جلالُه – قد وَسَم بقدرتِه على جباهِهِم الرفيعةِ نقشَ الحقيقــة. ومُرادي أن أُرشدَ مَن طاشَ فهمُه من ذلك النقش][١].

واته: (خوای گەورە بە توانستی خۆی نیشانەی حەقیقەتی لەسەر ناوچاوانی ئەوان نەخشاندووە، مەبەستی منیش ڕێنمایی ئەو کەسەیە کە تێگەیشتنی لەو نەخشە سەری کردووە).

بەڵێ، هێرشی من لە دژی ئەوان نی‌یە، بەڵکو لە بەرژەوەندیی ئەوانە. تاکو ئەو کەسە بێ توانا و لێنەهاتووانەی کە پۆشاکی ئەوان دەپۆشن، لە شان و شکۆیان کەم نەکەنەوە.

لەسەر ئەم بناغەیە و بێ پەروا ڕایدەگەیەنم کە:

بڕیاری تەواوی و یەکجاریم داوە کە:

لە پێناوی ئامانجەکەمدا – کە سەلامەتیی ئیسلامە – ڕووبەڕووی هەموو مەترسی‌یەك بىمەوە و، هیچ هەڕەشە و گوڕەشەیەك هەرگیز لە نیاز و بڕیارەکەم نەمگێڕێتە دواوە.

ئایا دەبێ ئەم ژیانەی دنیا چ نرخێکی هەبێت کە نزمترین ئەرمەنی لە پێناوی نەتەوەکەیدا بەختی دەکات؟! چۆن ترسی "ژیان"م هەبێت لە کاتێکدا کە پەیوەندیم پێوەی لاوازە، نەخوازەڵا کە حەوت جار نزیك بوو بفڕێ و بەجێم بهێڵێت، بەڵام خوای گەورە بە ئەمانەت هێشتیەوە لەلام؟ کەواتە مافی ئەوەم نی‌یە منەتی بەخت کردن و بەخشینی بکەم! خۆ هەرچەندە "گیان" ویستی لە قەفەس دەرچێ و بۆ سەر درەخت بفڕێت، "ژیری"ش لایەنی ئەوەی دەگرت کە بەرەو نائومێدی هەڵبێت، کەچی هەردوو کیانی هێشتەوە لەلام تاکو لە ئاییندەدا "ژیان" هەر خۆی خۆی بەخت بکات!

کەواتە هەڕەشەی لێ سەندنەوەی ئەم "ژیان"ە، هیچ نرخ و بایەخێکی لای من نی‌یە..

هەر تەنها "ژیانی ئەودنیا" ماوە بیکەن بە مایەی هەڕەشەیان. بەڵام گەر لەو ژیانەش بێ بەش بکرێم هێشتا هەر لە ئامانجەکەم پاشگەز نابمەوە و، ڕازی نابم بڕۆمە ژێر منەت و قورسایی تەنانەت ئەو ژیانەش!

---

(١) مورشیدەکان لەم تەکیەیەدا (واتە لەم دەستەواژە)یەدا کۆبوونەتەوە. تۆیش بە بێ زیارەت و سەرلێدان بەجێیان مەهێڵە. چونکە ئاماژەی تێدایە بۆ هەریەك لە تەریقەتەکانی: مەولەوی و، قادری و، نەقشبەندی و، بەکتاشی. (دانەر)

خۆ ئەگەر "گیان"م کە ئێستا بە ئاگری خەم و پەژارە هەڵدەقرچێ، ئەوان دوعای لـێ بکەن کە بە ئاگری دۆزەخ بسووتێ، با بسووتێ باکم نی‌یە؛ چونکە بە دەرچوونی بلێسەی خەم و خەفەتی ناخی ویژدانم، ئەم "ویژدان"ە پڕ بەهەشتێك ئامانج لـەخۆ دەگرێت، هەروەك "ئەندێشە"ش بەهەشتێك بۆ خۆی لە ئاواتەکانی پێکدەهێنێت.

با هەموان بزانن کە من هەردوو ژیانی خۆمم لەسەر هەردوو دەستم داناوە و، سەرگەرمی جەنگی دوو دوژمنم لە دوو مەیدانی زۆران و کێبەرکێدا. دەسا با ئەو کەسەی خاوەنی یەك ژیانە نەیەتە مەیدانی زۆرانم!

پ: داوای چی لەم شێخانەی ئێستا دەکەیت؟

و: ئەو "ئیخلاس"ەی کە هەمیشە ناوی لەسەر زاریانە و..

ئەو "جیهادە هەرە گەورە"یەی کە لە پێناویدا بوونەتە ئێشکگری ناو ئەو خانەقا و تەکیانەی کە بەهۆی تەریقەتەوە - کە خۆی لە خۆیدا سەربازێتیی ڕۆحانی‌یە - بوونەتە چەند سەربازگەیەکی مەعنەوی و..

وازهێنان لە "لایەنی خۆگرتن" و دەستبەرداری لە "سوودە کەسی‌یەکان" کە هەر ئەم وازهێنانە واتای ئەو زوهدەی لەخۆ گرتووە کە ئەوان کردوویانەتە دروشمی خۆیان و..

پیادە کردنی ئەو "خۆشەویستی"یەی کە ئیدیعای دەکەن و کاکڵەی میزاجی ئیسلامە.

خۆ ئەوان، بەوەی کە ئێمەیان بەکارهێناوە، پاداشتی خۆیان وەرگرتووە. وا ئێستا ئێمە داوای کار کردنیان لـێ دەکەین کە قەرزە لە ئەستۆیاندا.

پ: دەتەوێ چۆن بن؟

و: یان بڕۆن و لە کونجەکانیان بنەوە.. یاخود "سەرسەختی" و "غەیبەت" و " لایەنگیری" لە نێوانیاندا لابەن. چونکە بەشێك لـە خۆبەشێخ زانە بیدعەتکارەکان بوونەتە هۆی پێکهاتنی چەند دەستەیەکی گومڕا و بیدعەتکار.

پ: جا چۆن دەگونجێ لە نێوان خۆیاندا یەك بگرن لە کاتێکدا کە هەریەکەیان ئینکاریی ئەوی تر دەکات و، لە یاسا و دەستوورەکانیشیاندا خۆشەویستیی ئەو کەسە حەرامە کە ئینکاریی بکات، تەنانەت دڵیشی پێی بکرێتەوە؟ بێ گومان ئەم مەسەلەی "ئینکار"ە شتێکی گرنگە؟

و: کەواتە من مافی ئەوەم هەیە بەم گوفتارەی خوارەوە بدوێم:

ئەی نەزانەکان!

ئایا نەتان بیستوە یان نـەتان زانیـوە کـە ئـەم ئایەتـە پیرۆزە: ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ﴾ (الحجرات:١٠) یاسایەکی خواییە؟

ئایا چاوتان لەو دەستوورە بەرزە نەبەویەیە نووقاندووە کە دەفەرموێ:

(لا يُؤمِنُ أحدُكُم حتى يُحِبَّ لأخيه ما يُحِبُّ لنفسِهِ)[1]؟

زۆر مایـەی سەرسـوورمانە! ئایـا چـۆن دەگونجـێ ئـەم مەسـەلەی "ئینکـار"ەی کـە لـە خۆیدا لاوازە و لە نێوان ڕاست و درۆدایـە، ئـەم دوو بناغـە مـەزن و پێویسـتە بسـڕێتەوە و هەڵیان بووەشێنێتەوە؟ خۆ مەسـەلەی "ئینکـار" گوفتـاری خـوا نی‌یـە هـەتا سـڕینەوە هەڵنەگرێت..

ئایا نازانن ڕۆژگار ئـەو ئینکـارەی بـە فـەتوای: "زاڵبوونـی زیـانی بەسـەر سـوودی"دا سڕیوەتەوە و، دروستیش نی‌یە کار بە شتی سڕراوە و هەڵوەشاوە بکرێت؟

پ: ئایا ناگونجێ دوژمنایەتیی نێوانیان هی ئەوە بێت کە هـەندێکیان کـاری نـاڕەوای لە هەندێکی تریان بینیبێت؟

و: زۆر جێـی سەرسـوورمانە! بـە چ حـەق و چ ویژدانێـك و بـە چ بیانوویـەك هۆکارەکـانی "دوژمنایـەتی" – کـە لـە چـەند ڕەفتـارێکی لاواز و نـاڕەوای چەشـنی بڕوبیانووی منداڵانەوە سەری هەڵداوە – بەسەر هۆکارەکانی ئەو "خۆشەویستی"یەدا زاڵ کـراوە کـە وەك چیـای سـوبحان[2] مەزنـە و، لـە ئیمـان و ئیسـلام و مرۆڤایـەتی و هاوڕەگەزی‌یەوە سەرچاوەی گرتووە؟!

بەڵێ، ئیسلام و مرۆڤایەتی کە داخوازی خۆشەویستین، وەکو چیـای "ئوحـود" وان. بەڵام ئەو هۆکارانەی کـە دوژمنایـەتی بەرهـەم دەهێنـن، وەکـو بـەردە وردە وان. جـا ئـەو کەسـەی کـارێك دەکـات کـە "دوژمنایـەتی" بەسـەر "خۆشەویسـتی"دا زاڵ ببێـت، لـە ڕاستیدا گەوجایەتی‌یەکی گەورە دەردەخات و، بە وێنەی کەسێك وایە لە نرخ و بـەهای چیای ئوحود دابشکێنێت و لە وردە بەردێك بچووکتریش سەیری بکات.

---

(١) صحيح رواه البخاري ومسلم. (وەرگێڕ)

(٢) ناوی چیایەکە لە باکووری کوردستان، پێیشی دەوترێ: سیپان. (وەرگێڕ)

"دوژمنایەتی" و "خۆشەویستی" بە وێنەی تاریکی و ڕووناکی وان؛ هەرگیز پێکەوە کۆنابنەوە! جا ئەگەر "دوژمنایەتی"یەکە زاڵ بوو، ئەوا "خۆشەویستی" دەبێتە ڕیا و خۆپێکەوە گونجاندنی درۆینە. بەڵام ئەگەر "خۆشەویستی" زاڵ بوو ئەوا "دوژمنایەتی"یەکە دەگۆڕێت بە: سۆز و، بەزەیی هاتنەوە و، دڵنەرمی.

من ڕێباز و ڕێرەوم نواندنی خۆشەویستی‌یە بۆ "خۆشەویستی" و، دەرخستنی دوژمنایەتی‌یە بۆ "دوژمنایەتی"!

واتە: خۆشەویست ترین شت بەلامەوە لەم دنیایەدا: "خۆشەویستی"یە و.. بێزراوترین شتیش بەلامەوە: "دوژمنایەتی"یە.

پ: جیاوازی چی‌یە لە نێوان شێخێك "وەلی" بێت و، خۆبەشێخ زانێك کە لاف لێدەری ویلایەت بێت؟

و: کەسێك بەهۆی یەکگرتنی ڕووناکیی "دڵ" و نووری "فیکر"ەوە ئامانجی "یەکگرتن" بێت و.. "خۆشەویستی" ڕێبازی بێت و.. دروشمیشی بریتی بێت لە "خۆنەویستی" و دەستبەرداربوون لە خۆشویستنی خۆی و.. مەشرەبی توانەوەی خۆی(مەحوییەت) بێت و.. تەریقەتەکەی بریتی بێت لە پەروشی بۆ ئیسلام، ئەوا لەوانەیە ببێت بە شێخێکی ڕابەری ڕاستەقینە..

بەڵام ئەگەر ڕێبازەکەی دەرخستنی تایبەتمەندی‌یەکانی خۆی بێت، بە پیشاندانی هەڵە و ناتەواوی‌یەکانی ئەوانی تر و.. لە ڕێی دوژمنایەتیی کەسانی ترەوە خۆشەویستیی خۆی بخاتە دڵی موریدەکانی و.. بە جۆرێك لایەنی خۆی بگرێت کە جیاوازی و چەند بەرەکی لە نێوان موسڵماناندا بنێتەوە و.. وا پیشان بدات کە خۆشەویستیی ئەم بەندە لەسەر دوژمنایەتیی کەسانی تر، کە ئەوەش غەیبەت و پێخۆشبوونی غەیبەت بەرهەم دەهێنێت..

کەسێك گەر وا بێت، ئەوا خۆ بەشێخ زانێکە ئامانجی بەدەستهێنانی سەرۆکایەتی‌یە. یاخود گورگە لە پێستی مەڕدا هێندەی پێ ناچێ ئایین دەکاتە هۆکارێك بۆ کێش کردنی دەستکەوتەکانی دنیا.. یان بە تام و چێژی لەزەتێکی شووم خەڵەتاوە.. یاخود بە ئیجتیهادێکی هەڵە هێندە لەخشتە چووە کە گومانی باش بە خۆی دەبات و، دەرگاش دەخاتە سەرپشت بۆ گومانی خراپ بەرامبەر شێخە بەرێز و کەسایەتی‌یە بەرزەکان.

پ: قسەکانت نایاب و جوانن، بەڵام کێ دەیبیستێ؟ ڕێبازەکەت بەرز و بڵندە، بەڵام کێ شوێنی دەکەوێت؟

و: [ما لا يُدرَكُ كُلُّهُ لا يُترَكُ كُلُّهُ][1].. [إنَّما الأعمالُ بالنِّياتِ][2].. [الملامُ على مَن اتَّبعَ الهوى والسَّلامُ على مَن اتَّبعَ الهدى].

واتە: (هەر شتێك هەمووی کە بەدەست نەیەت، واز لە هەموویشی ناهێنرێت).. (پاداشتی کردەوەکان تەنها لەسەر نیازی دڵە).. (گلەیی لەوانە بێ شوێن هەوا و ئارەزوو دەکەون و.. سڵاویش لەوانەی شوێنکەوتەی ڕێی ڕاستن).

پ: ڕات بەرامبەر جیاوازیيە ترسناکەکانی نێوان زانایانی جیهانی ئیسلامی چی‌یە؟ چییان لە بارەوە دەڵێیت؟

و: جیهانی ئیسلامی لە پێش چاوی مندا وەکو "پەرلەمان"ێکی نارێکوپێك وایە.. یان بە وێنەی "ئەنجومەنی شوورا"یەکە ڕێسای تێکچووبێت..

ئنجا ئەوەش کە لە فیقهدا دەیبیستیت و دەوترێ: (ئەمە ڕای جومهوورە و فەتوا لەسەر ئەمەیە) بە وێنەی ڕای زۆرینەی ئەنجومەنی شوورا وایە..

وتە و ڕاکانی تری جیاواز لە ڕای جومهوور، گەر بە تەواوی لە کاکڵە و ناوەرۆك خاڵی و بەتاڵ نەبن، ئەوا بە ڕای خاوەن توانا و بەهرە و لێهاتنەکان دەسپێررێن، تاکو هەر خاوەن توانا و بەهرەیەك ئەوەیان لێ هەڵبژێرێت کە لەگەڵ پەروەردەی ئەودا بگونجێت..

بەڵام لێرەدا دوو خاڵ هەیە[3]:

یەکەم:

ئەو "وتە"یەی کە بە مەیلی ئەم توانا و لێهاتنە هەڵبژێرراوە و تا ڕادەیەك حەقیقەتی لەخۆ گرتووە و لەناو کەمایەتی‌یەکی خەڵکدا ماوەتەوە، خۆی لە خۆیدا وتە و ڕایەکی پابەندە بە سنوورێك (واتە موقەیەدە) و، تایبەتە بەو توانا و لێهاتنەی کە هەڵی بژاردووە،

---

(١) ئەمە دەستوورێکی زانستی‌یە، نەك فەرموودە. لە واتای ئەم ئایەتە وەرگیراوە: ﴿فاتَّقُوا اللهَ ما اسْتَطَعْتُمْ﴾ (التغابن:١٦) و، هەروەها لە فەرموودەی: (اتق الله ما استطعت). بڕوانە: (جامع العلوم والحكم) لابن رجب الحنبلي. ص: ١٦٥. ط١ دار المعرفة، بيروت ١٤٠٨هـ. (وەرگێڕ، لە چاپە عەرەبی‌یەکەوە)

(٢) صحيح رواه البخاري ومسلم. (وەرگێڕ)

(٣) زۆر بە وردی تەماشای ئەم دوو خاڵە بکە. ئەگەر بایەخیان پێ بدەیت کارێکی باش دەکەیت. (دانەر)

بەڵام خاوەنەکەی ئەو موقەیەدی‌یەی فەرامۆش کرد و بە ڕەهایی(موتڵەقی) هێشتیەوە. ئنجا شوێنکەوتووانیشی پابەندی بوون و بە شتێکی "گشتی" وەریان گرت. تەنانەت "چاولێکەری" هێندە دەمارگیریی بۆ نواند کە لە پێناوی پاراستنیدا هەوڵی شکاندنی نەیارەکانی دا..

ئیتر لەم خاڵەوە پێکدادانی ڕاکان و، دەمقاڵیی نێوانیان و، زامدار کردن و بەرپەرچدانەوەی یەکتر پەیدا بوو، بە ڕادەیەك کە لە تەپوتۆزی ژێر پێیان و ئەو هەڵمەی لە دەمیان و ئەو بریسکانەش لە زاریان دەرچوون هەورێکی بە "بروسکە" و هەندێ جاریش "میهرەبان" پێکهات، کە بوو بە پەردە و بەربەستێك لە بەردەم خۆری درەخشانی ئیسلامدا.

کەچی ئەو هەورە مژدەدەرەی میهرەبانی کە لە ڕێژنەی ڕووناکیی خۆرەوە ڕووناکی بە توانا و لێهاتنەکان دەبەخشێت، هەروەك بارانی نەباراند، ڕووناکیی خۆریشی شاردەوە!

دووهەم:

ئەو "وتە"یەی کە لەناو کەمایەتیدا ماوەتەوە، گەر ئەو حەقیقەت و گەوهەرەی تیایدایە بەسەر "هەوا و هەوەس" و "ئاییندارییی بۆماوە" و "میزاج"ی ناو ئەو توانا و لێهاتنەدا زاڵ نەبێت، ئەوا مەترسی‌یەکی زۆری دەبێت، چونکە لە بریی ئەوەی توانا و لێهاتنەکە ڕەنگی ئەو بگرێت و خۆی بەپێی ئەو بگۆڕێت، کەچی دەچێ بۆ خۆی بەکاری دەهێنێت و دەیپێنێت و بۆ کاروباری خۆی ڕام و ژێرباری دەخات.

ئا لێرەوە "هودا" (واتە: ڕێنمایی ڕێی ڕاست) دەبێ بە "هەوا" و ئارەزوو. هەروەك مەزهەب و ڕێڕەوەکەش ڕەنگ و ڕوخساری میزاجەکە دەگرێت.

هەنگ ئاو دەخواتەوە و هەنگوین دەچۆڕێنێت، بەڵام مار ئاو دەخواتەوە و ژەهر دەرێژێت.

پ: ئایا ئەم ئەنجومەنە ئیسلامی‌یە بڵندە جارێکی تر لە سەرزەویدا ڕێکوپێکی بەخۆیەوە دەبینێت؟

و: لەو باوەڕەدام کە سەرانسەری جیهانی ئیسلامی لەناو گرۆی ئادەمیزاد و مرۆڤایەتیدا وەکو پەرلەمانێکی خاوێن و پیرۆزی لێ دێت و، پێشینان و پاشینان لە نێوان

خۆیاندا ئەنجومەنێکی شوورا پێکدەهێنن و، بە درێژایی سەردەمەکان ڕوو دەکەنە یەکتر. بەڵام بەشی یەکەم – باپیران – بە ئەسپایی و هێمنی گوێ بیست دەبن.

پ:[1] هەندێ کەسانی بیانی چەند گومانێك لەبارەی هەندێ مەسەلەی شەریعەتەوە دەهێنن، وەك "فرە ژنی" و "کۆیلایەتی". وەك بڵێن ئەمانە لەگەڵ شارستانێتیدا ناگونجێن. ئیتر لەم ڕێیەوە دوودڵی و گومان لەبارەی شەریعەتەوە بڵاو دەکەنەوە.

و: وا بە پوختی دەستوورێکتان بۆ باس دەکەم، چونکە نیازم وایە بە درێژی لە پەیامێکی سەربەخۆدا بڵاوی بکەمەوە:

ئەحکامی ئیسلام دوو بەشن:

یەکەم: ئەوەیە کە شەریعەتی لەسەر بنیات دەنرێت، کە خێر و جوانیی بێگەرد و ڕاستەقینەیە.

دووهەم: شەریعەتی ڕاستێنەر(تەعدیل کار)ە. واتە: کاتێ شەریعەت دێ ئەو شتە لە شێوە ناشیرینە ستەمکارانەکەیەوە دەگۆڕێت بە شێوەیەکی ئەوتۆ لەگەڵ کات و دەوروبەردا گونجاو بێت و، بەپێی سروشتی مرۆڤ شایانی جێبەجێ کردن بێت..

ئەم کارەی شەرع بۆ وەرگرتنی شێوە "تەعدیل کراوەکە" مەبەست هەڵبژاردنی ئەو یەکەیانە کە زیان و شەڕی کەمتری تێدایە، تاکو کاتێ دێتە پێشەوە کە هێنانەدیی جوانیی ڕاستەقینە بە تەواوی لە توانا دەبێ. چونکە لابردنی کتوپڕیی شتێ کە لە سروشتی مرۆڤدا ڕەگی داکوتابێت، داخوازی سەرەوخوون کردنی سروشتی مرۆڤە!

جا لەسەر بناغەی ئەم دەستوورە:

شەریعەت "کۆیلایەتی"ی دروست نەکردووە، بەڵکو تەنها شەریعەت بوو کە ڕێی بۆ ئەوە ئاسان کرد کۆیلایەتی لە توندترین و سەخت ترین و ناخۆشترین شێوەیەوە بگۆڕێت، هەتا وردە وردە بە ئاسانی دەتوانرێ بۆ "سەربەستی" و ئازادیی تەواو بگوێزرێنەوە. واتە شەریعەت هات ئەو شێوە نارەوا و ناشیرینەی تەعدیل کرد و دیاردەکەشی کەم کردەوە.

پاشان "فرەژنی" تا ڕادەی چوار، هەرچەند کارێکە لەگەڵ سروشت و عەقڵ و دانایيدا گونجاوە، لەگەڵ ئەوەشدا شەریعەت نەهاتووە لە یەکەوە بیگەیەنێتە چوار،

---

(١) ئەم پرسیارە لە لایەن کەسێکی ئەرنائووت (ئەلبانی نەژاد)ەوە ئاراستە کرا. (دانەر)

بەڵکو لە هەشت و نۆوە کەمی کردووەتەوە بۆ چوار! بە تایبەت کە چەندین مەرجی ئەوتۆی داناوە کە ئەگەر ڕەچاو بکرێن زیانێکی ئەوتۆی تێدا نابێت. جا ئەگەر لە هەندێ خاڵیدا "شەڕ"ێك ڕوو بدات ئەوا شەڕێکی "سووکتر" و "کەمتر"ە. خۆ "شەڕی کەمتر" دادگەری‌یەکی نیسبی‌یە، چونکە زۆر دوور و مەحاڵە خێری ڕووت و بێگەرد لە هەموو حاڵەتێکی ئەم جیهانەدا دەست بکەوێت!!

* * *

**پ[1]: دە ساڵ پێش ڕوودانی کوودەتاکە، لە کاتێکدا کە بە تەواوی ڕەخنەگرێکی توند بوویت لە حکومەت، کەچی ڕەخنەشت لەوانە دەگرت کە هێرشیان دەکردە سەری..**

**جاری وا هەبوو بە زیادەڕەوییەوە ستایشی پادشا عوسمانی‌یەکانت دەکرد، تەنانەت دەتووت: لەوانەیە لە توانای عەبدولحەمیددا نەبێت ڕێ بە ئاسوودەیی و خۆشبەختیی میللەت بدات و جڵەویان بۆ شل بکات، یاخود لەوانەیە لەبەر ئیجتیهادێکی خۆی هۆکارێکی هەبێت کە بیکاتە بەهانە.. یاخود بووەتە دیلی دەستی وەهم و ئەو بیر بۆچوونانەی کە لە خراپەدا یارمەتیی دەدەن..**

**دواتر لە پڕێکدا هەموو ئۆباڵەکانت خستە ئەستۆی ئەو!**

**بۆچی هەم ڕەخنەت دەگرت و هەم هێرشت دەبرد؟ کەچی لە لایەکی دیکەوە بەرگریت لە هەندێکی تر دەکرد؟**

**و: شازدە ساڵ پێش ئێستا لە دەوروبەری شاری "ماردین"دا زاتێکم بینی کە بۆ ڕێی ڕاست ڕێنمایی کردم و، ڕاستیی کاری سیاسەتی پیشان دام. منیش تا ئەو کاتە لە خەونێکی وەك (خەون)ەکەی کەمالدا[2] بووم[3].**

* * *

بەڵام بەهۆی هەڵکەوتی بەدەوە، لە دەمی هێرشم بۆ سەر حکوومەت و ڕەخنە لێ گرانی، ڕێم لە ڕەخنەگرە "زیادەڕەوەکان" و "کورتبڕەکان" کەوت..

بەشێك لەو "زیادەڕەوان"ە، تورکیان – کە لە دوای عەرەب ماددەی ئیسلامن – بە گومڕا دادەنا، تەنانەت هەندێ نەزانی ئەم بەشە یاسادانەرانیان بە کافر لەقەڵەم دەدا، بە

(١) ئەم پرسیار و وەڵامە، هەرچەندەش گرنگ نین، بەڵام یەکدوو خاڵی گرنگیان تێدایە. (دانەر)

(٢) مەبەست کتێبێکی نووسەری تورك "نامیق کەمال"ە بە ناوی "خەونێك" ساڵی ١٩٠٨ز لە میسر بڵاوکرایەوە. تیایدا "ئازادی" بە حۆری دەچوێنێت و بە "خەون" وەسفی دەکات! (وەرگێڕ، لە ئاساری بەدیعیە و چاپە عەرەبی‌یەکەوە)

(٣) ئەم چەند بڕگەیەی کە بە فۆنتی جیاواز نووسیمان، دانەر بۆ خۆی لە چاپە تازەکاندا لایبردووە. (وەرگێڕ)

بیانووی دانانی "یاسای بنەڕەتی" و "ڕاگەیاندنی سەربەستی" پێش سی ساڵ. ئەم ئایەتە پیرۆزەشیان دەکردە بەڵگەیان: ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِما أنْزَلَ اللهُ..﴾ (المائدة:٤٤).

ئەو هەژارانە نەیاندەزانی کە ﴿وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ﴾ لە واتای (وَمَن لَم يُصَدِّقْ)دایە..

چەندە سەیرە! چۆن ڕەخنە لە کەسێك ناگرم کە ئیستیبدادی پێشووی بە سەربەستی داناوە و هێرشی کردووەتە سەر "یاسای بنەڕەتی"!

بەڵام ئەوانە هەرچەندە نەیاری حکوومەت بوون و ڕەخنەیان لێ دەگرت کەچی ئیستیبدادێکی سەخت و دژوارتریان دەویست. لەبەر ئەوە، دەستم بە ڕوویانەوە دەنا و بەرپەرچم دەدانەوە. جا لە خشتەبەرانی "ئازادیخوازان" ئێستا لەم بەشەن.

بەڵام بەشی دووهەم، ئەو "کەمتەرخەمانە"ن کە شارەزاییان لە ئاییندا نی‌یە و، بە ناحەق و ستەم ڕەخنە لە موسڵمانان دەگرن و، بە بێ ویژدانی و بە بیانووی "دەمارگیری" هێرشیان دەکەنە سەر..

جا ئەوانەی کە خۆیان لە "عوسمانێتی"یان داماڵیوە و، ئەوانەش کە دەیانەوێ بە تەواوی وەك ئەوروپا بن و لاساییان بکەنەوە.. هەموو ئەوانە، ئێستا لەم بەشەن.

* * *

**لەگەڵ ئەمەشدا، ئیستیبداد بۆ ئەوەی خۆی پارێزراو بێت، هەموو کەسێکی دووچاری گومان کرد. تەنانەت دە ساڵ پێش ڕوودانی کودەتاکە منیشی هەڵخەڵەتاند کە گوایا زۆرینەی ڕاپەڕیوەکان ماسۆنین. سوپاس بۆ خوا ئەو گومانەم لە ماوەی یەکدوو ساڵدا نەما. ئیتر لەو کاتەوە تێگەیشتم کە زۆرینەی سەرۆکەکانمان بە دڵنیاییەوە موسڵمانن.**

**بە پوختی: ئەوانەی کە هێرشیان دەکردە سەر حکوومەت، هەندێکیان هاواریان دەکرد: (حەیدۆ..حەیدۆ).. هەندێکی تریان دەیانووت: (حەیدەر ئاغا.. حەیدەر ئاغا). بەڵام من ئەو کاتە دەمووت: (حەیدەر)..ئێستاش هەردەڵێم: (حەیدەر). والسلام[1].**

* * *

دەسا ئەی چینی "عەوام"!

ئێستا بە خواتان دەسپێرم.. چاوەڕوان بن.

(١) ئەم دوو برگەیەی کە بە فۆنتی جیاواز نووسیمان، دانەر بۆ خۆی لە چاپە تازەکاندا لایبردووە. (وەرگێڕ)

داوایەکم هەیە دەمەوێ لەگەڵ تایبەتمەندان(خـواص)دا لێـی بکۆڵمـەوە و، مەسەلەیەکی گرنگیشم هەیە لەگەڵ حکوومەت و ئەشرافدا.. لەگەڵ ئەوانەی کە ماسۆنی نین لەناو کۆمەڵی "ئیتتیحاد و تەرەقی"دا:

ئەی چینی تایبەتمەندان!

ئێمەی عەوام و کەسانی ناو قوتابخانەی ئایینی، داوای مافی خۆمانتان لێ دەکەین:

پ: چیتان دەوێ؟

و: داواتـان لـێ دەکـەین گوفتارەکانتـان بـە کـردار بسەلمێنن و.. قسـووری غـەیری خۆتان بە بەهانە مەهێننەوە و.. لە نێوان خۆتاندا کـار مەخەنـە ئەستۆی یـەکترەوە و.. لـە خزمەتی ئێمەشدا - کە واجبی سەرشانتانە - تەمبەڵی مەکەن و.. ئەو شتانەی کە بەهۆی ئێوەوە لـە دەستمان دەرچـوون، فریایـان بکـەون و بیانخەنـەوە دەسـتمان و.. گـوێ لـە بارودۆخی ئێمە ڕابگرن و، لە پێداویستییەکانماندا ڕاوێژمـان پـێ بکـەن و، لـە چۆنێتیی ژیان و گوزەرانمان بپرسن و.. گاڵتەوگەپی خۆتان بخەنە لاوە!

به پوختی:

داوای دەستەبەرکردنی دواڕۆژی (کوردەکان و زانایانیان)[1] دەکەین و، داواکاری بەشی خۆمانین لە واتای "ئیتتیحاد" و واتـای "تـەرەقی" نـەك ناوەکـەی! داوای شـتێکتان لـێ دەکەین کە لای ئێوە ئاسانە و بە لای ئێمەشەوە گەلـێ گرنگ و مەزن و بایەخدارە.

پ: مەبەستەکەت ڕوون بکەرەوە و، بە ئاڵۆزی و تەماوی بەجێی مەهێڵە.. ڕاسـت و ڕاست تۆ چیت دەوێ؟

و: داوای دامـەزراندنی (قوتابخانـەی زەهـراء) دەکـەین، کـە خوشـکی مزگـەوتی ئەزهـەرە و زانکـۆی لـەخۆ گرتـووە". داواکـارین لـە "بـەتلیس" (کـە وەك مەڵبـەندی کوردستان وایـە)[2] دابمـەزرێت و، لـە هـەردوو باڵەکەشـی کـە "وان" و "دیاربـەکر"ە زانکۆی هاوشێوەی ئەوەی بەتلیس بکرێتەوە. بێ گومان ئێمەی کورد وەك خەڵکانی تـر نین؛ دڵنیـاین لـەوەی کـە ژیـانی کۆمەڵایـەتیمان لـە ژیـانی کۆمەڵایـەتی و بەختـەوەریی تورکەکانەوە سەرچاوە دەگرێت.

(١) لە چاپە تازەکاندا بەم جۆرەیە: (زانایان و ویلایەتەکانی خۆرهەڵات). (وەرگێڕ)

(٢) ئەوەی ناو کەوانەکە هی چاپی یەکەمە. (وەرگێڕ)

پ: چۆن؟ وەکو چی؟ بۆچی؟

و: ئەو زانکۆیە چەند هەلومەرجێکی پەروەردەیی هەیە و، پێویستی بە چەند سەرچاوەیەکی دەرامەت دەبێت و، چەند بەروبوومێکی جوانیش پێشکەش دەکات.

پ: مەرجەکانی چین؟

و: هەشت مەرجن[1]:

یەکەمیان: ناوی "قوتابخانە"ی لێ بنرێت. چونکە خەلکی لەگەڵ ئەو ناوەدا ڕاهاتوون وسەرنج ڕاکێشە و بەلایانەوە ئاساییە.

خۆ هەرچەندە ناوی "قوتابخانە" ناونیشانێکی ئیعتیبارییە، بەڵام ڕاستییەکی مەزن لەخۆ دەگرێت، کە ئەوەش دەبێتە هۆی بزواندنی حەز و شەوقەکان و بێدارکردنەوەی ئارەزووەکان.

دووهەمیان: تێکەڵ کردن و خوێندنی زانستە گەردوونییە نوێکانە لەگەڵ زانستە ئایینییەکاندا، هاودەم لەگەڵ ئەوەشدا زمانی عەرەبی واجب و کوردی دروست و تورکی پێویست بن کە زمانی خوێندنی ناو ئەو قوتابخانەیە بن.

پ: چ حیکمەتێك لەم ئاوێتەکردنەدا هەیە وا هەمیشە و بە داکۆکییەوە بانگەشەی بۆ دەکەیت؟

و: بۆ دەربازکردنی داوەریی زەین و ژیرییە لە تاریکستانی فێڵ و گزیی چوار پێوەری نموونەیی بەد و بێ کەڵك و[2]، لەبەر لابردنی ئەو بەهەڵەدا بردنەی کە بەهرە و توانای "خۆ بە دانا زان" لە بواری چاولێکەریی خۆهەڵقورتێنەر و مشەخۆردا بەرهەمی دەهێنێت.

---

(١) دانەر خۆی لە چاپەکانی دواییدا حەوت مەرجی هێناوە و مەرجی هەشتەمی لابردووە. (وەرگێڕ)

(٢) لە نموونەکانی ئەو پێوەرە هەڵە و بێ کەڵکانە:

یەکەم: قیاس کردنی شتانی مەعنەوییە لەسەر شتانی ماددی و، بە بەڵگە دانانی هەرچی ئەورووپا لە بواری مەعنەویاتدا دەیڵێ. واتە: هەروەك لە شتانی ماددیدا کارامەن و چاویان لێ دەکرێ، وا بزانرێت لە بابەتەکانی عەقیدە و باوەڕیشدا ئاوا کارامە بن.. دووهەمیان وەرنەگرتنی وتەی ئەو زانایانەی شارەزای زانستە نوێکان نین، لە بواری زانستە ئایینییەکاندا.. سێهەم: پشت بەخۆبەستن و بەخۆنازین لە بواری ئاییندا، تەنها لەبەر ئەوەی کە لە زانستە نوێکاندا کارامەیە.. چوارەم: قیاس کردنی پێشینانە لەسەر پاشین و، ڕابوردووە لەسەر ئێستا، پاشان هێرش کردن و دەربڕینی ڕەخنەی ناڕەوا و نابەجێیە. (عەبدولمەجیدی برای دانەر)

پ: چۆن؟ وەکو چی؟

و: ڕووناکیی دڵ: زانستە ئایینییەکانە و، نووری عەقڵیش: زانستە گەردوونییە نوێکانە. بە تێکەڵ کردنی ئەم دوانە "ڕاستی" دەردەکەوێت و، هیممەتی قوتابی پەروەردە دەبێت و بە هەردوو باڵەکە بەرز دەبێتەوە. بە لێك جیابوونەوەشیان: دەمارگیریی بێ کەڵك و نەفرەت لێکراو لە یەکەمیاندا و، فڕوفێڵ و گومانیش لە دووهەمیاندا، سەر هەڵدەدات.

مەرجی سێهەم: هەڵبژاردنی وانەبێژەکانیەتی یان لە زانایانی کوردی خاوەن دوو باڵ، واتە لەوانەی کە لە لایەن زانایانی کورد(و تورك)ەوە[1] بڕوایان پێ کراوە و پشتیان پێ دەبەسترێ.. یان لەوانەی کە زمانی خۆجێیی ناوچەکە دەزانن، تاکو هۆگری و هاودەمیان لەگەڵدا دروست ببێت.

مەرجی چوارەم: ڕاوێژ و پرس و ڕایە بە توانا و لێهاتنی کوردەکان و، ڕەچاوکردنی قۆناغی منداڵیی میللییان و، سادە و ساکارییان. چونکە گەلێ پۆشاك هەیە بە قەد و باڵایەك جوانە، بەڵام بۆ قەد و باڵایەکی تر ناشیرینە. دیارە فێرکردن و پێ خوێندنی منداڵ یان بە زۆرەملێ و سەپاندن دەبێ، یان بە ناز هەڵگرتنی حەز و ئارەزوویان.

مەرجی پێنجەم: جێبەجێ کردنی سەرتاسەریی یاسای (کار دابەشکردن)ە، تاکو هەموو لق و بەشێك کەسانی پسپۆڕ و کارامەی لێ دەربچێت، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم لق و بەشانە تێهەڵکێشی یەکترین.

مەرجی شەشەم: دوای تەواو کردنی خوێندن و دەرچوونی خوێندکارانی ئەم قوتابخانەیە، چەند ڕێگایەك بگیرێتە بەر بۆ دەستەبەرکردنی بەرەو پێش چوون و سوود وەرگرتنیان، تاکو لەگەڵ دەرچووانی قوتابخانە باڵاکان و پەیمانگا ڕەسمییەکاندا یەکسان بن و، بە هەمان شێوەی ئەوان مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێت و، تاقیکردنەوەکانیشیان بە وێنەی ئەو قوتابخانانە بەرهەم بەخش بێت، نەك نەزۆك و بێ ئەنجام.

مەرجی حەوتەم: بە جۆرێکی کاتی (خانەی مامۆستایان) بکرێت بە کۆڵەکە و پاڵپشتی ئەم قوتابخانەیە و تێکەڵ بکرێت لەگەڵیدا، تاکو "ڕێسا" و "بەهرە وەرگرتن لە

---

(١) ئەوەی ناو کەوانەکە دانەر خۆی لە چاپەکانی دواییدا زیادی کردووە. (وەرگێڕ)

زانست" لەو خانەیەوە بۆ ناو ئەم قوتابخانەیە و، ڕەوشت بەرزی و ئایینداریش لەم قوتابخانەیەوە بۆ ناو ئەو خانەیە بڕوات و تەشەنە بكات، هەتا هەردووكیان بەم ئاڵوگۆڕە دەبن بە خاوەنی هەردوو باڵەكە.

* * *

**مەرجی هەشتەم:**

**گۆڕینی ئەو نەریتە بەردەوامەی كە لە كوردستاندا هەیە، ئەوەی كە خوێندن و فێركردن بۆ تاكە كەسە. بەوەی كە تایبەت بكرێت بە كۆمەڵ و بازنەیەك لە خەڵكان.**

**[إنَّ هذه عادة درس عليها الدهر ودرب]. (واتە نەریتێكە كۆن بووە)**[1].

* * *

پ: دەرامەتەكانی ئەم قوتابخانەیە چی دەبێت؟

و: غیرەت و پەرۆشی.

پ: پاشان؟

و: ئەم قوتابخانەیە بە وێنەی "تۆو" درەختێكی تووبا - لە دۆخی هێزدا - لەخۆ دەگرێت. جا ئەگەر بە "غیرەت" و "پەرۆشی" سەوز بوو، ئەوا پێویستی بە ئێوە و گەنجینە وشك و برنگەكانتان نابێت، بەوەی كە بە جۆرێكی سروشتی ژیانی ماددیی خۆی كێش دەكات.

پ: لە چ ڕوویەكەوە؟

و: لە چەند ڕوویەكەوە:

یەكەم: ئەوقاف. ئەگەر بە جۆرێكی ڕاستەقینە ڕێك بخرێت، ئەوا بە یەكخستنی قوتابخانەكان كانیاوێكی بەخوڕ دەكاتە سەر ئەم حەوزە.

دووهەم: زەكات. چونكە ئێمە (هەم حەنەفی هەم)[2] شافیعیین[3]. جا ئەگەر دوای ماوەیەك ئەم قوتابخانەی زەهرایە خزمەتگوزارییەكانی بۆ ئیسلام و مرۆڤایەتی خستە

---

(١) ئەم مەرجەی كە بە فۆنتی جیاواز نووسیمان، دانەر بۆ خۆی لە چاپە تازەكاندا لایبردووە. (وەرگێڕ)

(٢) ئەوەی ناو كەوانەكە دانەر خۆی لە چاپەكانی دواییدا زیادی كردووە. (وەرگێڕ)

(٣) مەبەست ئەوەیە كە بە پێی ئەو دوو مەزهەبە ناوبراوە دەتوانرێت بەشێك لە زەكات بدرێت بە قوتابیانی زانست كە بە ڕاستی لێبڕاون بۆ خوێندن. (وەرگێڕ)

ڕوو، ئەوا بێ گومـان و، بـە شایستەیی، بەشێکی زەکـات ڕووی تێدەکـات و بۆ خـۆی دەستەبەری دەکات. تەنانەت گەر زەکاتی زەکاتیش بێت سەروزیادیەتی.

سێهەم: نـەزر و سـەدەقەکان. چونکـە هـەروەك ئـەم قوتابخانەیـە لـە لای ژێرییـەکان بەرزترین قوتابخانە پێکدەهێنێت، لـە بـەرچاوی دڵ و ویژدانـەکانیش خاوێنـترین تەکیـە و خانـەقا دەنوێنێـت، ئـەوەش بـەهۆی ئـەو بەروبوومانـەی بڵاویـان دەکاتـەوە و، ئـەو ڕووناکییانەی کە بە هەموو لایەکیان دەگەیەنێت و، ئەو خزمەتە مەزنانـەی پێشکەشیان دەکات بە ئیسلام.

واتە: هەروەك قوتابخانەی ئایینییە.. قوتابخانـەی نوێیـە..بـەڵکو تەکیـە و خانەقاشـە. دیارە ئەو کاتە بەشێکی نەزر و سـەدەقەکان - کـە لـە نێـوان هاوبەرپرسیی کۆمەڵایـەتیی موسڵماناندان - ڕوو دەکاتە ئەو قوتابخانەیە.

چوارەم: خواستن. ئەویش بە فراوانکردنی ڕێژەی دەرامەتەکانی خانەی مامۆستایان، دوای ئەو تێکەڵ کردنەی لەبەر ئاڵوگۆڕی ناوبراو ئەنجام دەدرێت. چونکە دەگونجـێ بـە جۆرێکی کاتی دەرامەتەکەی بۆ ئـەو قوتابخانەیە بخوازرێ. خۆ کـە دوای ماوەیـەك ئـەو قوتابخانەیە کەوتە سەرخۆ و دەوڵەمەند بوو، ئەو دەمە ئەمانەتە خوازراوەکە دەدرێتـەوە بـە خاوەنەکەی.

پ: بەروبوومـەکانی ئـەو قوتابخانەیـەی کـە وا دە ساڵە[1] بـە چوسـت و چـالاکی و پەرۆشەوە هاوار و بانگەشەی بۆ دەکەیت، چین؟

و: بە کورتی و پوختی:

دابین کردنـی ئایندەی زانایـانی کـورد(و تـورك)[2]ە و[3].. تێخزاندنـی زانسـتە بـەناو کوردستاندا لـە ڕێـی قوتابخانـەوە و.. دەرخستنی لایەنـە جوانـەکانی "مەشـرووتیەت" و "سەربەستی"یە و، سوود وەرگرتنە لێیان.

---

(١) تەنانەت وا پەنجا ساڵیشە. (دانەر)

(٢) ئەوەی ناو کەوانەکە دانەر خۆی لە چاپەکانی دواییدا زیادی کردووە. (وەرگێر)

(٣) سێهەم ساڵی ڕاگەیاندنی "سـەربەستی" ئەم باسانەم لـە شـێوەی وتـاردا بـە گوێـی خـەڵکی شـارەکانی بەتلیس و وان و دیاربەکر وشوێنەکانی تردا دا، هەمووشیان پشـتگیرییان لـێ کـردم و پێیـان وابـوو کـە ئەمـە بابەتێکی ڕاستەقینەیە و، لە تواناداهەیـە بێتـە دی. بۆیـە دەتـوانم بڵێـم: مـن لـەم مەسـەلەیەدا هـەموو ئـەو شـتانەم درکاندووە کە بە دڵی ئەواندا هاتووە. (دانەر)

پ: باشتر وایە کە زیاتر ڕوونی بکەیتەوە و درێژەی پێ بدەیت.

و:

یەکەم:

یەکخستنی قوتابخانە ئایینیەکانە و ئەنجامدانی چاکسازییە تیایاندا.

دووهەم:

ڕزگارکردنی ئیسلامە لە ئەفسانە و ئیسرائیلیات و دەمارگیریی بێزلێکراو، کە هەر ئەمانە بوون شمشێری بەبڕشتی ئیسلامیان ژەنگاوی کرد.

بەڵێ، ئیسلام داخوازی توندوتۆڵیی موسڵمانە لە ئاییندا، کە بریتییە لە دین قایمی و دامەزراوی و پابەند بوون بە "حەق"ەوە.. نەك "دەمارگیری" کە ئەنجامی نەزانی و بەکارنەهێنانی داوەریی ژیرییە.

من لام وایە مەترسیدارترین جۆرەکانی دەمارگیری ئەوەیە کە لای هەندێ چاولێکەرانی ئەوروپا و مولحیدانی دەبینرێت، چونکە بە سەرسەختییەوە سوورن لەسەر گومانە بێ بنەماکان!!

دیارە ئەوە هەرگیز ڕەفتار و خووی زانایان نییە کە پابەندی بەڵگەکانن.

سێهەم:

کردنەوەی دەرگایە کە بۆ بڵاوبوونەوەی لایەنە جوانەکانی مەشرووتیەت.

بەڵێ، لەناو هۆزەکاندا هیچ هزر و بیرێك نییە "مەشرووتیەت" زامدار بکات. بەلام گەر بەلایانەوە جوان نەبێت سوودی لێ وەرناگرن.

دیارە ئەممەش زیانی گەلێ زیاترە.

بێ گومان نەخۆش دەرمانێك بەکار ناهێنێت کە پێی وابێت ژەهری ئاوێتە بووە.

چوارەم:

کردنەوەی دەرگایە کە بۆ ڕۆشتنی زانستە گەردوونییە نوێکان بۆ ناو قوتابخانە ئایینیەکان. ئەوەش بە کردنەوەی کانیاوێکی سازگاری بێ خلتە لەو زانستانە، بە جۆرێك شوێنکەوتووانی قوتابخانە ئایینیەکان نەفرەتی لێ نەکەن.

چەندین جار وتوومە:

تێگەیشتنێکی هەڵە و گومانێکی شووم تا ئێستا دوو بەربەستیان لە بەردەم ڕۆشتنی زانستەکاندا (بۆ ناو قوتابخانە ئایینی‌یەکان) داناوە.

پێنجەم:

ئەوە دووپات دەکەمەوە کە چەند جار - بەڵکو سەد جاریش - وتوومە:

ئەم قوتابخانەیە ئاشتی و سازش دەخاتە نێوان ئەهلی "قوتابخانەی ئایینی" و "قوتابخانەی نوێ" و شوێنکەوتووانی "تەکیە و خانەقاکان" و، وایان لێ دەکات- بە لای کەمەوە - لە ئامانجدا یەك بگرن، بەهۆی گۆڕینەوەی مەیل و بیروڕاکان کە لە نێوانیاندا پێکدێت.

بەڵێ، بەوپەڕی داخ و پەژارەوە دەبینین کە هەروەك جیاوازیی بیر و بۆچوونەکانیان یەکێتیی نێوانیانی لەتوپەت کردووە، جیاوازیی مەشرەبەکانیشیان پێشکەوتن و بەرزبوونەوەی ئەوانی لە شوێنی خۆیدا ڕاگرتووە..

چونکە بەهۆی دەمارگیریی هەریەکەیان بۆ ڕێبازەکەی و، ڕوانینی ساکار و ڕواڵەتیی بۆ ڕێبازی ئەوی تر، ملیان بەرەو زیادەڕەوی و گوێ پێ نەدان ناوە. ئەوەتا ئەمیان بەوە زیادەڕەوی دەکات کە ئەو بە "گومڕا" دادەنێت و، ئەویش بەوە تەقسیربارە کە ئەم بە "نەزان" لەقەڵەم دەدات!

پوختەی ئەمانە:

ئەگەر ئایینی ئیسلام بەرجەستە ببێت، ئەوا لە شێوەی کۆشکێکی هێندە ڕووناك و درەخشاندا دەبێت کە سەرانسەری زەوی ڕووناك دەکاتەوە و دەیخەملێنێ..

یەکێك لە مەنزڵەکانی ئەو کۆشکە: "قوتابخانەیەکی نوێ" و، ژوورێکی: "قوتابخانەیەکی ئایینی" و، گۆشەیەکیشی: "تەکیە" و، هەیوانەکەشی شوێنی کۆبوونەوەی هەموویان و ئەنجومەنی شوورای نێوانیان دەبێت، بە جۆرێ کە هەریەکەیان ناتەواویی ئەوانی تر پڕ بکاتەوە.

جا هەروەك ئاوێنە خۆری تێدا دەردەکەوێ و وێنەکەی دەداتەوە، ئەم قوتابخانەی زەهرایەش بە هەمان جۆر لە لای وڵاتە بیانی‌یەکان و لە پێش چاویاندا وێنە و شێوەی ئەو کۆشکە ئیلاهی‌یەی تێدا دەردەکەوێ.

دەسا ئەی پیاوماقوولان!

خزمەتمان بکەنەوە، وەك ئێمە خزمەتمان کردن.. دەنا..

ئەی دامودەستەی حکوومەت کە لەو گومانەدان ئێمە نابالغین و لافی سەرپەرشتیارێمان بەسەرەوە لێ دەدەن! هۆکارەکانی بەختەوەریمان دابین بکەن، تاکو گوێڕایەڵتان بین.. دەنا..

ئەی ئەندامە پێشینەکانی "ئیتیحاد و تەرەقی" کە پەیمانتان دا و لە ڕاستیشدا ئەرکی کۆمەڵایەتیی کورد(و تورك)[1]ەکانتان خستە ئەستۆ و، بەم ئاوێتە کردنەش کارێکی باشتان ئەنجام دا! ئەگەر چاکە ئەنجام بدەن، باشە.. دەنا: [فَرُدُّوا الأمانات إلى أهلِـها][2].
واتە: (سپاردەکەی ئەستۆتان بە دەست کەسانی شایستەی هەڵگرتنی بسپێرن).

پ: گلەییەکی زۆر لەسەر زانایان هەیە، تەنانەت..

و: ئەوە ستەمێکی گەورە و بێ ویژدانییەکی دژوارە.

پ: بۆچی؟

و: چونکە گەوجایەتییەکی وەك هی ئەو کەسە وایە کە "بوون" بە گوناهێك دەبەخشێت لە "نەبوون"ەوە دەرچوو بێت!

پ: مەبەستت چییە؟

و: تاوانبارکردنی "زانست" لەسەر تاوانێك ئەنجامی "نائارامی"ی کەسێك بێت کە زانستەکەی هاودەم بێت لەگەڵ نائارامییەکەیدا، چەندە نەفامی و گەمژەییە، بە هەمان جۆر تاوانبارکردنی ئەو زانا بێچارە و داماوانەی کە هەمیشە ڕابەری خەڵکی بوون بۆ بەرزی و خاوێنیی ئیسلام و، بەپێی توانای خۆیان ئەحکامی ئایینیان ڕاگەیاندووە و، لەم کات و سەردەمەدا شایانی ڕێز و خۆشەویستی و میهرەبانیی زیاترن..

---

(١) ئەوەی ناو کەوانەکە دانەر خۆی لە چاپەکانی دواییدا زیادی کردووە. (وەرگێڕ)

(٢) بێدارکردنەوەیەك: ئەی ئەندامانی حکوومەت و ئەو سیاسەتمەدارانەی خۆتان بە توێژی تایبەتمەندان(خواص) دادەنێن! دڵی خۆتان بەوە مەدەنەوە کە ئەم کتێبە ئاراستەی توێژی "عەوام" کراوە و وانەی تێکشکاندنی نائومێدییان پێ دەڵێتەوە. نەخێر.. چونکە خراپ بەکارهێنانی ئەو ئەرکەی لە ئەستۆی ئێوەدایە گەلێ بەد و خراپترە لە خراپ تێگەیشتنی ئەوان! جا بۆ ئەوەی ڕێنماییتان بکەم "زەمان"م کردە بریکاری خۆم. کەچی گوێتان بە وانەی "زەمان" نەدا، لە ئەنجامدا زللەیەکی تەمێ کردنتان چەشت. (دانەر)

تاوانبارکردنی ئەوانە لەسەر تاوان و گوناهێك کە ئەنجامی "نەبوون"ی چەند زانایەکی شایستەی ئاستی ئەم سەردەمەیە، پاشان خستنە ئۆبالی ئەو تاوان و گوناهە لەسەر ئەستۆی ئەو هەژارانە، ئەگەر ئەمە گەورەترین گەوجی نەبێت چییە؟!

بەڵێ، زیانمان لە "بوون"ی ئەوانەوە پێ نەگەیشتووە، بەڵکو لە "نەبوون"ی ئەو زانا بەرزە هەڵکەوتووانەی پێویستمان پێیانە!

چونکە زۆربەی کەسە زیرەکەکان ڕوویان کردە قوتابخانە تازەکان و.. دەوڵەمەندانیش دانەبەزین بۆ ئاستی ئەو شێوە گوزەرانەی کە لە قوتابخانە ئایینییەکاندا هەیە و.. خودی قوتابخانە ئایینییەکانیش - لەبەر نەبوونی ڕێکوپێکی و، زیاد نەکردنی سوود وەرگرتن لە زانستەکان و، بڕینی ڕێی دەرچوون تیایاندا - نەیانتوانی چەند زانایەك پێ بگەیەنن کە بەپێی خواستی سەردەم بن.

وریا بن! قین هەڵگرتن لە زانایان و ڕق لێ بوونیان مەترسییەکی گەورەیە[1].

پ: ئەگەر نیازت پاك بێت، سەرکەوتوو دەبیت. کەم کەسیش هەیە نیازی پوخت و خاوێن بێت. سەیری نیازەکەت بکە!

و: سوپاس و ستایش هەر تەنها بۆ خوایە. ئەمەش دەیڵێم شانازی نییە[2]:

توخمەکانی بەرژەوەندی و ئامانجە کەسییەکان کە نیازخاوێنیی مرۆڤ دەشێوێنن - وەك نەسەب و نەوە و ترس و تەماع - نە دەمناسن و نە دەیانناسم. بەڵکو هەر نامەوێ پێیان ئاشنا ببم، چونکە من خاوەنی نەسەبێکی بەناوبانگ نیم تاکو هەوڵی پاراستنی ڕابوردووی بدەم. منداڵیشم نییە هەتا بۆ دەستەبەرکردنی داهاتوویان تێبکۆشم.

بەڵام شێتییەکم تێدایە - چۆن شێتییەك - کە تەنانەت دادگای بەسام و شکۆ و تۆقێنەری "سەربازی"ش لە چارەسەرکردنیدا دەستەوسان ما!

نەزانییەکیشم تێدایە - چۆن نەزانییەك - کە لە ڕادەیەکدایە منی کردووە بە نەخوێندەوارێك ناتوانم نووسراوی سەر دینار و درهەم بخوێنمەوە!

---

(١) ئەی ئەهلی قوتابخانە ئایینییەکان! نائومێد مەبن. لەم وەخت و ڕۆژگارەی ئێستادا زانستە ئایینییەکان و زانستە تازەکان زاڵن. ڕێگای پێشکەوتن و بەرزبوونەوەش بە هەموو جۆرەکانی "زانست" دەبێت و، هەرە بەرزەکەیان دەگاتە بلندترین چین و پایە. (دانەر)

(٢) باسکردنی نیعمەتەکانی خوای گەورە جۆرێکە لە شوکرانەبژێریی ئەو نیعمەتانە. بە وێنەی ئەو شێخەی کە بە مەبەستی دەربڕینی شوکرانە بۆ نیعمەتەکانی خوا کەرامەتی خۆی دەگێڕێتەوە. (دانەر)

ئنجا "بازرگانیی دوارۆژ"یش، ئەوا بڕیارم داوە و سوێندم خواردووە کە لەو ڕێگایەی گرتوومەتەبەر پاشگەز نەبمەوە، تەنانەت گەر سەرمایەکەشم دابنێم تیایدا. هەر لە ئێستاشەوە لە زیانکردن و دانانی سەرمایەکەمدام، چونکە دەکەومە ناو گوناهی زۆرەوە.

کەواتە جگە لە "ناوبانگی درۆینە" هیچی تر نەماوەتەوە، خۆ من لەویش بێزار بووم و لە دەستی هەڵدێم، چونکە چەند ئەرکێکی وەهام دەخاتە ئەستۆ کە توانام نییە هەڵیان بگرم.

پ: بۆچی – هەرکات بۆت بلوێت – گومانی باش بەرامبەر حکوومەتی مەشرووتیەت و کەسانی نامولحیدی دەستەی "جۆن تورك" دەردەبڕیت؟

و: لەبەر ئەوەی هەرکات ئێوە بۆتان بلوێت گومانی خراپیان پێ دەبەن، ئەوا من گومانی باشیان پێ دەبەم! جا ئەگەر بەو جۆرە بن ئەوا شتێکی باشە، دەنا بەو باسکردنەم ڕێنماییان دەکەم بەرەو ڕێی ڕاست، تاکو بیگرنەبەر.

پ: ڕات سەبارەت بە "ئیتیحاد و تەرەقی" چییە؟

و: هەرچەندە من نرخ و بەهایان دەزانم، بەڵام ڕەخنە لە توندوتیژیی سیاسییەکانیان دەگرم و، لە هەمان کاتیشدا و تا ڕادەیەك پیرۆزبایی لە بەش و لقە ڕۆشنبیری و ئابوورییەکانیان دەکەم، بە تایبەت لە پارێزگاکانی خۆرهەڵاتدا[1].

پ: چی ئێمەی بە زایە داوە و لە کاروباری بەرز سستی کردووین؟

و: "ژیان" بریتییە لە جموجووڵ و چوست و چالاکی.. "شەوق"یش ئەسپە بۆ ژیان و هیممەتی مرۆڤ..

جا هەرکات هیممەتی ئێوە سواری ئەسپی شەوق دەبێ، ئەوا لە مەیدانی ژیاندا بە دوای کاروبارە بەرزەکاندا دەگەڕێ. ئا لەم کاتەدا یەکەم شت دێتە ڕێی "نائومێدی"یە، کە دوژمنێکی سەرسەختە و هێزی هیممەت لاواز دەکات..

---

(١) "ستەم" لە دابەشکردنی نادادگەرانەی "دادگەری"دا دەردەکەوێت! چونکە ناکرێ لەبەر خراپیی یەك دانە کەس هەست و نەستی هەزاران زامدار بکرێت. "توندوتیژی" جیایە لە "پەرۆشی". چونکە ئەگەر کەسێکی لەخۆبایی و لەخۆڕازی لایەنی "حەق" بگرێت ئەوا زۆر کەس بەرەو "ناحەق" دەبات، لەوانەشە لەبەر ئەو توندوتیژییەی دەینوێنێت، بەرەو ناحەق ڕاپێچیان بکات! (دانەر)

ئێوەش بە شمشێری ئەم ئایەتە پیرۆزە لێی بدەن کە دەفەرموێ: ﴿لا تَقْنَطُوا..﴾ (الزمر:٥٣)..

پاشان "حەز لە خۆدەرخستن" و "ئارەزووی سەرکەوتن بەسەر کەسانی تردا" دێتە مەیدان، کە مەیل و ئارەزوویەکە لە مرۆڤدا ڕەگی داکوتاوە و دەیەوێ لە ئیشوکاری خزمەت کردنی حەقدا - کە خزمەتێکە لە حەسوودی و قرە دوور و بێگەردە - زاڵ بێت. بەم پێیە دەستی خۆی لە سەروگوێلاکی هیممەت دەوەشێنێ و لەسەر ئەسپەکەی دەیخاتە خوار..

ئێوەش لەم کاتەدا حەقیقەتی ئەم ئایەتە پیرۆزەی ئاراستە بکەن کە دەفەرموێ: ﴿کونوا قوّامین..﴾ (النساء:١٣٥)..

پاشان "پەلەکردن" لە مەیداندا دەردەکەوێ و پێی هیممەت دەخلیسکێنێ و، بازی بەسەر هەنگاوەکانی ڕێکخستنی "هۆکار" و "بەهۆکراوەکان" پێ دەدات و، قۆناغە یەك لە دوای یەکەکانی هۆکارەکانی لێ تێك دەدات، بەمەش بەرەو دواوە پاشەوپاش دەیباتەوە..

ئێوەش دەبێ لە سەنگەری بێ وەیی ئەم ئایەتە پیرۆزەدا خۆتان بپارێزن کە دەفەرموێ: ﴿اصبروا وصابروا ورابِطُوا..﴾ (آل عمران:٢٠٠)..

پاشان "ڕای شەخسیی خۆسەپێن" و "بیرکردنەوەی تاکە کەسی" کە ئەنجامی کردەوەی مرۆڤ تەفروتوونا دەکات، لە هیممەت دەردەپەڕێ، کە دەبوو ئەمەی نەکردایە و بەپێی سروشتی خۆی لە نێوان مافی کەسانی تردا چاودێریی مافی خۆی بکردایە..

دەبێ ئێوەش بە حەقیقەتی بەرزی ئەم فەرموودە پیرۆزە بەرەنگاری ببنەوە و بەربەستی بکەن کە دەفەرموێ: (خیرُ الناسِ أَنْفَعُهُم للنّاسِ)[1]..

ئنجا دوژمنێکی تر دێتە مەیدان؛ ئەویش "چاولێکەری"یە. ئیتر بەمە دەرفەتی دەست دەکەوێ بۆ چاولێکردنی تەمبەڵان و دواکەوتووان. ئەم چاولێکەری‌یە پشتی هیممەت دەشکێنێ..

---

(١) تەخریجەکەی لە لاپەڕە (٣٤٠)دا ڕابورد. (وەرگێڕ)

ئێوەش بە حەقیقەتی بەرزی ئەم ئایەتە لێی دەربپەڕێن کە دەفەرموێ: ﴿لایضرُّکُمْ مَنْ ضَلَّ إذا اهتَدَیْتُم﴾ (المائدة:١٠٥). تاکو دەستی دوژمن نەگاتە داوێنی هیممەت.

پاشان دوژمنێکی غەددار دەردەکەوێ، کە "کار دواخستن"ە. ئەمەش لە ئەنجامی دەستەوسانی و متمانە بەخۆ نەبوونەوە پەیدا دەبێ و، لەمەشەوە دواخستنی کارەکانی دواڕۆژ "لەمڕۆوە بۆ سبەینێ" دروست دەبێ و، ئەم کارەش درێژە دەکێشێ هەتا دەستی هیممەت دەبەستێت و نایەڵێ هەڵسێتەوە..

ئێوەش دەبێ شوێن نهێنیی ئەم ئایەتە پیرۆزە بکەون کە دەفەرموێ:

﴿وعلى اللهِ فَلْیَتَوَکَّلِ الْمُتَوَکِّلوُن﴾ (إبراهیم:١٢).

واتە: تەنها پشت بە خوا ببەستن، نەك غەیری خوا. کەواتە "تەوەککول" بکەن بە قەڵای هیممەت..

پاشان دوژمنە مولحیدەکە دێتە مەیدان کە "خۆهەڵقورتاندنە لەو ئیشوکارانەی تەنها هی خوای گەورەن". ئەم دوژمنە، زللە توند و سەخت و بەئازارەکانی خۆی لە سەروگوێی هیممەت دەوەشێنێ، تا کوێری دەکات..

ئێوەش ئەو حەقیقەتە جیددی و هەمیشە سوودبەخشەی ئەم ئایەتە پیرۆزەی ئاراستە بکەن کە دەفەرموێ:

﴿فاسْتَقِمْ کَما أُمِرْت﴾ (هود:١١٢)..

تاکو لە سنووری خۆی ڕایبگرێ و نەیەڵێ ئەو سنوورە بشکێنێ، چونکە بەندە بۆی نی‌یە ببێت بە فەرماندەی گەورەکەی خۆی.

لە کۆتاییدا "حەز لە حەوانەوە و ڕابواردن" دێتە گۆڕێ، کە سەرچاوەی هەموو بەڵایەك و هێلانەی گشت کردەوەیەکی خراپە و، بە کۆت و زنجیرەکانی خۆی هیممەت دەبەستێتەوە و، نایەڵێ بە دوای کاروبارە بەرزەکاندا بگەڕێ و، بەم حاڵەوە دەیهاوێتە هەڵدێری نزمی و زەلیلی‌یەوە..

دەبێ ئێوەش بەرەو ڕووی ئەم ساحیرە خوێن مژە ئەو پاڵەوانە موجاهیدە بنێرن کە وا لە ئایەتی: ﴿وَأَنْ لَیْسَ لِلإنْسانِ إلاّ ما سَعَى﴾دا (النجم:٣٩).

بەڵێ ڕاستە، لە جیهاد و هەڵگرتنی ئەرکە قورسەکاندا گەلێ حەوانەوەتان دەست دەکەوێ. هەر کەسێکیش خاوەنی سروشتێکی هەستیار بێت، حەوانەوەی خۆی تەنها لە کار و کۆششدا دەبینێتەوە.

* * *

ئەوانەی کە لە دەمی گەشت و گەڕانەکەمدا نەیاندەناسیم و سەیری پۆشاکەکانی منیان دەکرد، وایان دەزانی بازرگانم و، دەیانپرسی:

پ: ئایا تۆ بازرگانیت؟

و: بەڵێ.. کیمیاگەریشم!

پ: چۆن؟

و: دوو مادده هەیە تێکەڵیان دەکەم دەرمانێکی شیفابەخش و ڕووناکی‌یەکی وەك هی کارەبا بەرهەم دەهێنن.

پ: کامانەن؟

و: لە بازاڕی شارستانێتی و ڕەوشت بەرزیدا، سندووقێك هەیە لەسەر دوو پێ دەڕوات لەسەری نووسراوە: "مرۆڤ". گەوهەرێکی تێدایە کە درەخشانە، یان ڕەش و تاریکە، ئەویش بریتی‌یە لە "دڵ"!

پ: دوو ماددەکە چین؟

و: ئیمان و خۆشەویستی.. وەفا و پەرۆشی.

ڕۆژنامەی گەڕۆك
باوکی هیچ، کوڕی زەمان، برای شتانی
سەرسووڕهێنەر، ئامۆزای شتە نامۆکان
بەدیعوززەمان
**سەعیدی کوردیی نوورسی**

بەرهەمی سێهەم:

# بڕوانامەی هەردوو قوتابخانەی موسیبەت

## یان

# دادگای عورفیی سەربازی و سەعیدی کوردی


بەدیعوززەمان

سەعیدی نوورسی

دایناوە

فارووق ڕەسووڵ یەحیا

کردوویە بە کوردی

## ڕوونکردنەوەیەك

## لەم وەرگێڕانە کوردییەدا

ئەو پۆزشەی "مامۆستا عەبدولقادر بادللی" کە دوای ئەم ڕوونکردنەوەیە دێت و، سەبارەت بەم بەرهەمەی مامۆستا سەعیدی نوورسی لە کتێبی (ئاساری بەدیعییە)دا نووسیویەتی، چەند تێبینییەکی باشی لەخۆگرتووە لەبارەی نوسخە جیاوازەکانی ئەم بەرهەمە. بەڵام بە پێویستم زانی لە پێش هێنانی ئەو پۆزشەدا ئەم چەند خاڵەی خوارەوە بخەمە پێش چاوی خوێنەری بەڕێزی ئەم چاپە کوردییە:

١ - بێ گومان ئەم کتێبە بە پیتی کۆن (عوسمانی) دوو جار (ساڵی ١٩١١و ١٩١٢ز) چاپکراوە (خۆم وێنەیەکی چاپی یەکەمم لە لایە).

٢ - گومان لەوەشدا نییە کە هەموو نووسەرێك مافی خۆیەتی پاکسازی و دەستکاری لە بەرهەمی خۆیدا بکات بۆ هەر بڵاوکردنەوەیەکی نوێی بەرهەمەکەی. هەر لە ڕاستیدا نووسەران ئەو مافەی خۆیان ئەنجام دەدەن.

ئەوەش دیاردەیەکی ئاساییە بۆ مرۆڤەکان کە ئەستەمە لە کاریگەریی دەوروبەر لەسەریان و، کاردانەوەیان بەرامبەری، ڕزگاریان بێت. بۆیە دەبینی نووسەران بە چاوی هەڵسەنگاندنەوە بەرهەمەکانیان بەسەر دەکەنەوە و، قەڵەمی تیا دەگێڕن و، ئەوەی بە پێویستی بزانن دەیگۆڕن، یان بە شێوەیەکی جیاواز دایدەڕێژنەوە، یاخود هەندێ مەبەستی نوێی بۆ زیاد دەکەن و هەندێکی دیکەی لێ لا دەبەن.

٣ - ئاسەوارە کۆنەکانی مامۆستا نوورسیش لەو یاسایە بەدەر نییە، بە تایبەت کە وەك مامۆستا عەبدولقادر لەو پۆزشەدا ئاماژەی پێ داوە لە چەند کات و شوێنێکی جیاجیا و، لە چەند نوسخەیەکی جیاوازدا دەستکاری و هەڵەگیری و چاکسازی و پێداچوونەوەی بە خەتی خۆی ئەنجام داوە. ئەمەش بە هەمان جۆر گومانی تێدا نییە. من بە چاوی خۆم هەندێ لەو دەستکاری و هەڵەگیرییانەی مامۆستا نوورسیم بە خەتی خۆی بینیوە، لەوانەی کە لای مامۆستا عەبدولقادر پارێزراون.

٤ - ئنجا ئـەم نووسـینەی مامۆسـتا سـەعیدی نوورسـی لـە نێـوان بەرهەمـەکانی پێشوویدا تایبەتمەندیی خۆی هەیە، چ لـە ژیـانی دانـەردا، چ سـەبارەت بـە مێژووی نوێـی میللەتی کورد لە ڕووی فەرهەنگییەوە..

چونکـە ئـەو ڕووداوانـەی لـەم کتێبـەدا باسیان هـاتووە هـی ئـەو کاتـەن کـە مامۆسـتا نوورسـی لـە سـالی (١٩٠٧ز)دا بـە نیـازی ئـەوەی داوای کردنـەوەی "قوتابخـانەی کوردی" و دامەزراندنی "زانکۆ" لە کوردستاندا بکـات و، داواکـەی بخاتـە بەردەستی کاربەدەستان، ڕۆشتووە بـۆ ئەستەمبوول. لـەوێ، لـە ڕێـی چاوپێکـەوتنی هـەندێ لـە بەرپرسان و بلاوکردنەوەی داواکارییەکـەی لـە ڕۆژنامـەکاندا، ئامـانجی هاتنەکـەی بـۆ ڕوون کردوونەتەوە.

بەڵام کاردانەوەی دەسـەلات بەرامبەر بەم هەولەی نوورسی، بردنی بوو بۆ بەندیخانە، لە بریی ڕێز و قەدرزانی! ئنجا بە بیانووی ئەوەش کە داوای کردنەوەی "زانکۆ" دەکات، تۆمەتی "شێتی"یان دایە پاڵ و ڕەوانەی نەخۆشخانەی شێتان کرا!

کاتێ کە بەو هۆکارانەی پێشوو نەیانتوانی لە داواکەی پەشیمانی بکەنەوە، هـەولیان دا بـە مووچـە و پـارە لـەخشتەی ببـەن و دووری بخەنـەوە. دیـارە لەوەشـدا سـەرکەوتنیان بەدەست نەهێنا، چونکە مامۆستا سەعیدی نوورسی کەسێکی وا نەبووە کە لە ژێر نـاوی "خزمەت بە گەل و نەتـەوە"دا هیـچ ئامـانجێکی تایبـەت بـەخۆی هـەبێت! تەنانـەت ئامـادە بووە ژیانیشی لەپێناوی نەتەوەکەیدا بەخت بکات!

هەر لەو ماوەیەدا کە مامۆستا نوورسی بە نیازی هێنانەدیی ئاواتەکەی لە ئەستەمبوول مابووەوە، لـە بـەرواری ١٩٠٨/٧/٢٧زدا سیسـتەمی پەرلـەمانی لـە دەولـەتی عوسمـانیدا ڕاگەیـەنرا، کـە پێـی دەلێـن "مەشـروتییەتی دووهـەم". دوای ئـەوەش ڕووداوی (٣١ی مـارت) و لابردنـی سـولتان عەبدولحـەمیدی بـەدوادا هـات لـە ١٩٠٩/٤/٢٧زدا. ئنجـا ڕووداوی نـاوبراو قۆزرایـەوە بـۆ ئـەوەی کـە زۆرێـك لـەو ئازادیخوازانـەی بـە نـەمانی ئیستیبدادی تاکـە کـەس دلخۆش بووبـوون، ئیستیبدادی بەکۆمـەلی "ئیتتیحادییـەکان" بەرەو بەندیخانەکان ڕاپێچیان بکات و بیانباتە بەردەم داداگای عورفیی سەربازی..

یەکێك لەو ئازادیخوازانە مامۆستا سەعیدی نوورسی بوو!

دانەری بەڕێز لەم بەرهەمەیدا گرنگترینی ئەو ڕووداوانە تۆمار دەکات کە لەو قۆناغە ئاڵۆزەدا بەسەری هاتوون.

٥ - ئنجا لەبەر ئەوەی لە سەردەمی عوسمانیدا وشەکانی (کورد، کوردستان) لە ڕووی یاساییەوە قەدەغە نەبوون، بەڵکو ئاسایی بوون، ئەوا زۆر کەس لە تورکەکانی ئەو کاتە - بە پێچەوانەی زۆرێك لەوانەی ئێستا - کاردانەوەی سەلبی‌یان بەرامبەر بەو وشانە نەبوو. بۆیە دەبینیت دانەر لە چەند شوێنێکی ئەم بەرهەمەیدا ئەو وشانەی بەکارهێناوە و، گوفتاری تایبەتی و ڕاشکاوانەی ئاراستەی گەلەکەی کردووە..

بەڵام دواتر لە سەردەمی کۆماریدا، بە تایبەت لە لایەن دەوڵەت و ڕێکخراوە نهێنی‌یەکانی پشتی پەردەوە، سڵ نەکراوەتەوە لە هیچ جۆرە دژایەتی‌یەك بەرامبەر بە "کورد" و "ئیسلام" کە دوو ئامانجی گرنگی دانەرن. تەنانەت نەوەکانی نوێی تورك لەسەر ئەو پەروەردەیە گۆش کراون کە ئامادەی بیستنی وشەکانی "کورد" و "کوردستان" نەبن! مەگەر کەسێك دینداریی "ڕاستەقینە" ڕێی لێ بگرێت.

ئەوەش دەری دەخات کە مامۆستا نوورسی چەندە وەك (زانایەکی گەورەی موسڵمان) نیشانەی تیری دوژمنانی ئیسلام بووە، هێندەش وەکو کەسایەتی‌یەکی (کورد) چاوی ئەو دوژمنانە هەڵنەهاتووە بەوەی کە ساتێك بە ئاسوودەیی ببینن!

لە لایەکی دیکەشەوە ئارامیی لە ڕادەبەدەری مامۆستا نوورسیمان بۆ دەردەکەوێت کە ئەو سی و پێنج ساڵەی دوایی تەمەنی، لە ڕووی جەستەیی و دەروونی‌یەوە چەندە بە سەختی ژیاوە، لە دەوروبەرێکدا کە چ دەوڵەت و چ میللەت -کەسانێکی کەم نەبێت لە قوتابی و دۆستانی - بە چاوی دوژمن بۆیان ڕوانیوە. کەچی ئەو هەوڵی داوە بەوپەڕی دانایی و وریایی بەسەر دڕك و خاشاکدا بفڕێت و، پێی خۆی لە نووکی ئەو دڕکانە و چمکی پۆشاکی لە تەپوتۆزی ئەو خاشاکانە بپارێزێت!

ئێستاش وەك یادخستنەوەیەك، ئەو چەند بڕگەیە دەهێنینەوە ئێرە کە لە پێشەکیی پەیامی "مونازەرات"دا نووسیمان سەبارەت بە وشەکانی "کورد" یان "کوردستان". تاکو ئەو مەبەستە پتر ڕوون ببێتەوە کە لەم کتێبەدا زیاتر ڕەچاو کراوە:

"مامۆستا نوورسی لە قۆناغی دەسەڵاتی نوێدا هەتا بەرهەمەکانی بە دەستنووس بڵاودەبوونەوە، دەستکاریی ئەو وشانەی نەکردووە لە بەرهەمەکانیدا، چونکە لەناو

خەڵکانێکدا بڵاو دەبوونەوە کە دۆستی بوون و کاردانەوەی نادروستیان بەرامبەر وشەکانی نەبوو.

بەڵام کە لە ساڵەکانی پەنجای سەدەی ڕابوردوو بە ڕەسمی ڕێ بە چاپکردنیان درا و، مامۆستا نوورسی زانیی ئەمجارەیان نووسینەکانی دەگەنە هەموو دەستێك و هەموو شوێنێك، تەنانەت دەستی ئەوانەش کە لەسەر ئەو پەروەردە چەوتە گۆش کراون، ئەوا تەنها دوو ڕێی لە بەردەمدا بوو:

یان هەر چاپیان نەکاتەوە.. یاخود چاپیان بکاتەوە، بەڵام ئەو وشانەی کە دژە هەستێك بەرامبەر بە نووسینەکانی لای زۆرێك لەو خەڵکە دەورووژێنن، بگۆڕێت بە چەند وشەیەکی تر کە بۆ مرۆڤی بە سەلیقە هەمان واتا بگەیەنن، بێ ئەوەی دەماری کەسێکی پێ گرژ ببێت، یان هەبوونی ئەو وشانە بکاتە بیانوو بۆ ڕەتکرنەوەی سەرجەمی بەرهەمەکانی!

ئەوەبوو ڕێی دووهەمیانی هەڵبژاردا!"[1].

بەڵگەش لەسەر ئەوەی کە دانەر هەتا بەرهەمەکانی بە نووسینەوەی دەستی بڵاو دەبوونەوە ئەو وشانەی نەگۆڕیوە، دوو نوسخە دەستنووسەکەی ئەم کتێبەیە کە مامۆستا عەبدولقادر ئاماژەی پێداوە، کە لە ساڵەکانی (١٩٤٤ز) و (١٩٤٦ز) لە لایەن دوو قوتابیی نزیکی دانەرەوە نووسراونەتەوە و، خۆیشی هەڵەگیریی تێدا کردوون، چونکە لەو دوو نوسخەیەدا دەستکاریی وشەکانی (کورد و کوردستان) نەکراون، مەگەر دانەر خۆی بڕگەیەکی بە تەواوی لابردبێت کە ئەو وشانە تێدا بووبێت.

بەڵام کاتێ لە دوا ساڵەکانی پەنجای سەدەی پێشوودا و لە پێش وەفاتی خۆی ویستی لە چاپی بدا، ئەوا بەپێی ئەو دانستەی باسمان کرد کە لە حیکمەتی (ما لا یدرك کله لا یترك کله) وەرگیراوە، دەستکاریی چەند شوێنێکی ئەم بەرهەمەی کردووە، تەنانەت هەندێ وشە و بڕگەشی لێ لابردووە کە بۆ مێژووی فەرهەنگی کوردی و مێژووی ژیانی خودی نوورسی، لای ئێمەی کورد گرنگییان هەیە.

ئەو نوسخەیەش کە بە خەتی دانەر خۆی دەستکارییەکانی تێدا کردووە، هەتا ساڵی (٢٠١١ز)ش نەکەوتبووە دەستی مامۆستا عەبدولقادر بادللی، کە قوتابیی دانەرە و، بۆ

---

(١) بڕوانە لاپەڕە (٢٦٧-٢٦٨)ی ئەم کتێبە.

پاراستنی ئاسەوارە دێرینەکانی مامۆستاکەی لێبڕاوە. بۆیە لەو پۆزشەی کە لە کتێبی (ئاساری بەدیعییە)دا نوسیویەتی، کە پێش دەسکەوتنی ئەو نوسخە ناوبراوە چاپی کردووە، تەنها ئاماژە بەوە دەدات کە لە لایەنی خۆیەوە هیچ کەسێك بەو دەستکارییانە تاوانبار ناکات و، دەبێ کاری دانەر خۆی بن.

بەڵام لەو ساڵەدا فۆتۆکۆپی‌یەکی ئەو نوسخەیە کەوتە دەستی مامۆستای ناوبراو.

لەم نوسخەیەدا بە جوانی خەتی نوورسی دیارە کە بۆ خۆی ئەو بڕگانەی لابردووە و، ئاڵوگۆڕی لە هەندێ وشەیدا کردووە!

بە دۆزینەوەی ئەم نوسخەیە، ئەو قسە سەیر و سەمەرانە لای مرۆڤی بە ویژدان کۆتاییان پێ دێت کە پێچەوانەی فەرمانی ئەم ئایەتە پیرۆزەن:

﴿يا أيُّها الذينَ آمنوا اجتنبُوا كثيراً من الظَّن..﴾ (الحجرات: ١٢).

ئەو ستەم و ناحەقی‌یە ئاشکرایەی کە لە ڕووی "نیشتمانی" و "نەتەوەیی"یەوە تورك بە کوردی کردووە و، کاردانەوەی کوردیش بەرامبەری، شتێکە و.. کاری بابەتییانەی "نووسین"یش شتێکی تری تەواو جیاوازە!

دەبێ نووسەر و توێژەر لە دەمی توێژینەوەکانیدا هێندە قەدری "نووسین"ی لە لایێت کە ئەوەی دەینووسێت "بابەتییانە" بێت و، خۆی لەو بڕیارانە بپارێزێت کە تەنها لە خانەی "زاتییەت"دا جێیان دەبێتەوە، تاکو دەرەنجامی بەهەڵەبردنی خوێنەری لێ نەکەوێتەوە، تەنانەت گەر نیازیشی پاك بێت! چونکە پەتی ئەو چەشنە ڕەفتارانە کورتە و لە دواییدا هەموو ڕاستی‌یەکان دەردەکەون[1].

٦ - ئێستاش دێینە سەر باسی ڕێبازمان لە وەرگێڕانی ئەم پەیامەدا ،کە بەم جۆرەی خوارەوەیە:

أ - بە سوود وەرگرتن لە تەرجەمە عەرەبی‌یەکەی مامۆستا ئیحسان، پاشتر لە کتێبی (ئاساری بەدیعییە) دەقە کۆنەکەی دانەرمان کرد بە بناغەی ئەم وەرگێڕانە کوردی‌یە، لەبەر ئەو هۆیانەی کە لە پێشەکیی پەیامی مونازەراتدا خستمانە ڕوو.

---

(١) بە پشتیوانیی خوای گەورە لە چاپی سەربەخۆی ئەم بەرهەمەدا ڕوونکردنەوەی زیاتر لەم ڕووەوە دەخەمە پێش چاوی خوێنەران، لێرەدا هەر هێندە بواری هەیە.

ب – دەستکارییەکانی دانەرمان بۆ چاپەکانی دوایی دەستنیشان کرد و، لە پەراوێزدا ئاماژەمان پێدان.

ج – دانانی پەراوێز لەو شوێنانەدا کە بە پێویستمان زانیبێت.

د – دوای پاکژکردن و پێداچوونەوەی ورد، برای بەڕێزم مامۆستا "حسەین حەسەن کەریم" بەم وەرگێڕانەدا ڕۆشتەوە و، لەگەڵ وەرگێڕانە عەرەبی‌یەکەدا بەرامبەری کرد و، سوودمان لە تێبینی‌یەکانی وەرگرت.

هـ – "دکتۆر دیدار"یش هێندە ماندوو بوو لە پێداچوونەوەی ئەم پەیامە و، بەرامبەرکردنی لەگەڵ دەقی کۆن و نوێی تورکی‌یەکە و، دەستنیشان کردنی جیاوازییەکاندا، کە مەگەر تەنها خوا بتوانێت پاداشتی بداتەوە. خوای گەورە بە سۆزی خۆی لێی وەربگرێت.

لە کۆتاییدا عەرزی خوێنەری بەڕێز دەکەم کە:

مرۆڤ هەرچەندەش تەقالای باشکردنی کارەکانی بدات، هێشتا هەر لە هەڵە و ناتەواوی بەدەر نابێت. بە تایبەت ئەم چەشنە کارە وردانەی کە لەم بەرگەدا بە گشتی و، لەم پەیامە و پەیامی مونازەراتدا بە تایبەتی پێیانەوە ماندوو بووین.

هیوادارم خوێنەری بەڕێز هەر تێبینی‌یەکی بەسوود، یان هەر ڕەخنەیەکی بنیاتنەری هەبوو، دریغی نەکات لە ناردنیدا بۆمان، تاکو بە سوپاسەوە وەری بگرین و، بۆ چاپەکانی داهاتوو مایەی سوودی ئەم کتێبە بێت.

هەروەك لە خوای گەورە دەپاڕێمەوە کە ئەم ڕەنجانەی لە پەیامەکانی نووردا خۆم و هاوکارانم دەیکێشین، بە میهرەبانیی خۆی وەریان بگرێت و، خوێنەرانی خۆشەویست بەهرەمەند بکات لێیان و، مایەی بەختەوەریی ئەودنیای ئێمە و ئەوانیش بێت. ئامین.

وصلى الله على النبي الأمي محمد وعلى آله وصحبه أجمعين.

والحمد لله رب العالمين.

فاروق ڕەسووڵ یەحیا

# پۆزشێك[1]

**بە پێنووسی مامۆستا**

**عەبدولقادر بادللی**

**قوتابیی دانەر و ئامادەکاری ئەم بەرگە**

**بە زمانی تورکی**

لە کاتی چاپکردنی ئەم کتێبەدا (بڕوانامەی هەردوو قوتابخانەی موسیبەت) پێنج نوسخەیمان لە بەردەستدا بوو:

* دوو نوسخەی یەکەم کە بە پیتی کۆن چاپکرابوون[2].
* نوسخەیەك بە خەتی "ئیبراهیم فاقازلی"[3] نووسراوەتەوە و، لە لایەن مامۆستای خوالێخۆشبوومان بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسیەوە پێداچوونەوە و هەڵەگیریی تێدا کراوە.
* نوسخەیەك کە بە پیتی نوێ چاپکراوە.

---

(١) ئەم پۆزشەی مامۆستا عەبدولقادر لەناو کتێبی (ئاساری بەدیعییە)دا ساڵی (١٩٩٩ز) لە ئەستەمبوڵ بڵاوکراوەتەوە. (وەرگێڕ)

(٢) مەبەستی سەرو نوسخەیە لە چاپی یەکەم و دووهەم کە بە پیتی کۆن چاپکراون. (وەرگێڕ)

(٣) ساڵی ١٩١٠ز لە ناحیەی "ئەینەبولوو" لەدایك بووە. ساڵی ١٩٤١ز لە "قەستەمۆنی" سەردانی مامۆستا نوورسیی کردووە. لە ڕێی پەیامەکانی نوورەوە خزمەتی ئیمانیی بە ئەنجام گەیاندووە. لە بەندیخانەی ئافیون لەگەڵ مامۆستا نوورسیدا بەندکراوە و لە دادگاکەی ئەوێشدا بەرگرییەکی ڕەنگینی لە پەیامەکانی نوور کردووە (دەقی ئەو بەرگرییە لە لاپەڕە ٨١٣-٨١٥ی کتێبی "تیشکەکان"دا بڵاوکراوەتەوە). ٢٠٠٣/١١/٣ز کۆچی دوایی کردووە. خوا لێی خۆش بێت. (وەرگێڕ)

* نوسخەیەك بە خەتی خوالێخۆشبوو "جەیلان"ی ئەمیرداغی[1] نووسراوەتەوە و، لە لایەن مامۆستا خۆیەوە هەڵەگیریی تێدا کراوە.

ئێمە لە نێوان ئەمانەدا ئەو دوو نوسخەیەمان بە بناغە دانا کە لە لایەن مامۆستای خوالێخۆشبوومانەوە پێداچوونەوە و هەڵەگیرییان تێدا ئەنجام دراوە.

پاشان هەر پێنج نوسخەکەمان بە وردی و وریاییەکی زۆرەوە بەراورد کرد.. بۆمان دەرکەوت کە هەردوو نوسخەی دەستنووس و هەردوو نوسخەی چاپە کۆنەکەش لە یەك دەچن، جگە لەو شوێنانەی کە مامۆستای خوالێخۆشبوو چاکسازیی تێدا کردوون.

زۆربەی ئەو شتانەش کە لە چاپە نوێیەکەدا هەبوون بەڵام لەم دوو نوسخەیەدا نەبوون یاخود لە شێوەی ڕوونکردنەوەدا بوون، ئێمە لێرەدا وەك پەراوێز نووسیمانن.

بەشێکی تریشمان لە شێوەی ڕوونکردنەوە و سادەکردنەوەی هەندێ وشەی هاوواتادا بینی و، ئەو قەناعەتەمان بۆ دروست بوو کە شێوازی بەرز و شکۆداری مامۆستا نین.

لەبەر ئەوەی ئەم کتێبە ئاسەوارێکی مامۆستایە، ئەوا ئێمە بە نیازی پاراستنی ڕوخسار و شێوازە ئەسڵییەکەی و هێشتنەوەی وەك بەرهەمێکی بەڕێزیان بڵاوی دەکەینەوە، کە چەند تابلۆیەکی پڕ واتامان سەبارەت بەو کاتە پێش چاو دەخات کە پەڕاوەکەی تێدا نووسراوە.

---

(١) ناوی (عەبدولقادر جەیلان چالیشقان)ە. ساڵی (١٩٢٩ز) لە شاری (ئەمیرداغ) لە خۆرئاوای تورکیا لەدایك بووە. بنەماڵەی چالیشقان (محەممەد و عوسمان و خەلیل و جەیلان خۆیشی) لە ماوەی مانەوەی مامۆستا نوورسی لە ئەمیرداغ گەلێ خزمەتی مەزنیان پێشکەشی پەیامەکانی نوور کردووە. جەیلان لە بەندیخانەی ئافیوون لەگەڵ مامۆستا نوورسیدا بەندکراوە و لە دادگاکەی ئەوێشدا بەرگرییەکی جوانی لە مامۆستا نوورسی و پەیامەکانی نوور کردووە (دەقی ئەو بەرگرییە لە لاپەڕە ٧٩٨-٨٠٠ی کتێبی "تیشکەکان"دا بڵاوکراوەتەوە). کاتێ کە بە ڕووداوێکی هاتووچۆ لە ساڵی ١٩٦٣زدا کۆچی دوایی کرد، ئەم بەڵگەنامەیە دۆزرایەوە لە گیرفانیدا کە بەخەتی مامۆستا نوورسییە و، جەیلان لەبەر تەوازوعی خۆی بە درێژایی تەمەنی پیشانی کەسی نەدابوو:
(جەیلان بریکاری منە. ئەو کارانەی کە تایبەتن بە نوورەوە لە بری من ئەو جێبەجێیان دەکات. سەعیدی نوورسی). (پەراوێزی وەرگێڕ)

ئنجا هەروەك زاتی ئەوەمان نەکرد دەستکاریی ئەو شوێنانە بکەین کە مامۆستا بۆ خۆی دەستکاریی نەکردوون، ئەوەشمان بە خۆمان ڕەوا نەبینی بیر لە هەڵە و کەموکورتییان بکەینەوە.

هەروەها بۆ ڕوونکردنەوەی بناغەی ئەو گومان و ئەندێشانەی کە بە پێی دەستوری: (مرۆڤ دوژمنی ئەو شتەیە کە نایزانێت) هەندێ کەسی نەزان و کاڵفام سەبارەت بە مامۆستا و ڕوونکردنەوەی هۆکاری نووسینی چەند وتارێکی دەیورووژێنن، کە لە دەماری وەهمی هەندێکیان دەدات، تێبینیمان کرد گەیاندنی ڕاستییەکان وەکو خۆیان بە کەسانی زانا و بەویژدان، سوودی دەبێت..

بۆیە بڕیارمان دا وەك خۆی بیهێڵینەوە و دەستی لێ نەدەین.

ئنجا ئەو نوسخانەش کە مامۆستا پێداچوونەوە و هەڵەگیریی تێدا کردوون[1] و ئاماژەمان پێ دان، لای ئێمە پارێزراون. هەرکەسێك بیەوێت دەتوانێ بێت و بیانبینێت.

عەبدولقادر بادللی

(١) بەپێی گێڕانەوەی هەندێ لەوانەی کە خزمەتی مامۆستا بەدیعوززەمانیان کردووە و خۆیان شایەتحاڵی ڕووداوەکان بوون: سەرچاوەی ئەم نوسخە نوێیانەی کە بە نووسینی نوێ چاپ کراون، ئەو نوسخانەن کە مامۆستای بەڕێز خۆی دەستکاریی تێدا کردوون.
بەڵێ، ئەم گێڕانەوانە ڕاستن و، ئێستا ئەو چەشنە نوسخانە بە نووسینی نوێ بڵاو دەکرێنەوە. ئێمە - خوانەکردە - ڕەخنەیەکمان لەو کارە نییە. بەڵام وەك پێشتر وتمان، ئێمە لەم کارەی خۆماندا هێشتنەوە و پاراستنی ئەسڵییەتی ئەو بەرهەمانەمان مەبەستە.
بەڵێ، ئەوە ڕاستە کە مامۆستا چەند جارێك دەستکاری و هەڵەگیریی لەم بەرهەمەیدا کردووە. لە هەندێکی ئەو دەستکارییە گرنگ و پێویستانەشدا کە لە چەند کات و شوێنێکی جیاوازدا ئەنجامی داون، بە مەبەستی ئاسانکاری لە بڵاوکردنەوەی خزمەتی نووردا، کات و شوێنی ڕەچاو کردووە. بەڵام لە پاڵ ئەمانەدا چەند نوسخەیەکی تر هەن کە یەکەم جار چاپکراون. ئێمەش لەم کتێبەدا هەست دەکەین کە ناچارین ئەو نوسخانە لە بەرچاو بگرین. (عەبدولقادر بادللی)

سەرەتایەك[1]

## ڕوونکردنەوەی بڵاوکار

ساڵی ١٣٢٣[2] هەواڵێك لە هەموو لایەکەوە دەنگی دایەوە کە لە پشتی چیا سەخت و لوتکە بڵندەکانی کوردستانەوە کەسێك بە ناوی "سەعیدی کوردی" بەسەر ئاسۆی ئەستەمبوڵدا هەڵهاتووە و، یەکێکە لە مرۆڤە هەڵکەوتووە دەگمەنەکان و بلێسەیەکە لە زیرەکی..

هەندێ کەس لەوانەی کە بە سروشت حەسوود بوون، کاتێ ئەو بلیمەتە ناوازەیان ڕووبەڕوو بینی، نەیانتوانی ئەو بەخششەی خوای گەورەیان پێ هەرس بکرێت کە لە گەنجینەی نەبڕاوەی خۆی بەوی بەخشیوە. هەروەك تێگەشتنیان لەوە ئاسان نەبوو کە چۆن بلیمەتێکی ناوازەی ئاوا لە پۆشاکی شاڵ و شەرواڵی کوردیدا هەڵکەوتووە!

ئەو زۆرینە تەڵەکەباز و بێ بەهرەیە (بە نیازی ئەوەی کە هەر خۆیان لە پێش چاودا بمێننەوە و نەکەونە سێبەرەوە) هەموو تۆڵە و داخێکی دڵی خۆیان بەرامبەر بەو لە وشەیەکدا بە پوختی دارشت کە وتیان: "شێت"ە!

لە ڕاستیدا زیرەکیی لە ڕادەبەدەری "سەعیدی کوردی" گەیشتووەتە سنووری "شێتی".. بەڵام ئەو شێتی‌یەی کە ئەم بەیتانەی خوارەوە وەسفی بڵندیی "گیان" و لوتکەی "ژیری"ی ئەو دەکەن:

---

(١) بێدارکردنەوەیەك: ئەم بەرهەمە لە ساڵەکانی (١٩١١) و (١٩١٢ز) دا دوو جار چاپکراوە. هەردوو چاپەکەش لە لایەن "کوردی زادە ئەحمەد ڕامیز"ەوە بڵاوکراوەتەوە. لە سەرەتای چاپی دووهەمی (١٩١٢)ی ئەم بەرهەمەدا لە لایەن چاپکار و بڵاوکار "ئەحمەد ڕامیز"ەوە ئەم پێشەکی‌یە بڵاو کراوەتەوە کە ئەویش گرنگیی خۆی هەیە، چونکە دوای ئەوەی کە مامۆستا بەدیعوززەمان پیایدا ڕۆشتووەتەوە و هەندێ دەستکاری و چاکسازیی تێدا کردووە ئنجا لەگەڵ گرنگترین بەشەکانی بەرهەمەکەیدا بڵاو کراوەتەوە. وا ئێمەش هەمان شت وەك خۆی بە تەواوی پێش چاو دەخەین. (عەبدولقادر بادللی)

(٢) بە تەقویمی ڕۆمی، کە دەکاتە ساڵی ١٩٠٧ز. (وەرگێڕ)

*شێتیی سەرم..*
*ئاگرێكە بۆ "سەربەرزی" هەڵگیرساوە*
*یەك زیرەكیی تەواو بلند لەناو شێتیی سەری مندا..*
*دانراوە*
*لە شێتیمدا: مەشخەڵی پایە بەرزەكان*
*رِووناكی و رِابەری رِێمە*
*نیازێكی یەكجار مەزن.. لە شێتمیدا*
*چاوەرِێمە.*

بەڵێ، هاتنی سەعیدی كوردی بۆ ئەستەمبووڵ لەو كوردستانەوە - كە بە پێچەوانەی ئێرە - لە زانست بێ بەشە و هەوڵ دراوە بە نەزانی لەناوبرێت، بەو نیازە بوو كە سیاسەتی كۆشكی "یڵدز"[١] بلەرزێنێت.

لە پێش هاتنی بۆ ئەستەمبووڵ چەند جارێكی تریش لە وان و بەتلیس و سیرت و ماردین و ئەرزرۆم دووچاری دوورخستنەوە بووە[٢].

هاوكات لەگەڵ گەیشتنی بۆ ئەستەمبووڵ لە لایەن عەبدولحەمیدەوە خرایە ژێر چاودێریی ورد و، دواجار برا بۆ بەندیخانە.

لە ئەنجامدا رِۆژێ هاتە پێش كە سەعیدی كوردییان بۆ "تۆپ تاشی" (نەخۆشخانەی "تۆپ تاشی" بۆ چارەسەری شێتان) بەرِێ كرد لە ناوچەی "ئوسكودار". چونكە دەترسان لە بەندیخانەدا بەندكراوان بێدار بكاتەوە!

ناو بەناو دەچوون لەناو شێتەكاندا دەیانهێنایەدەر و، وەك هەوڵێك بۆ كارتێكردنی بەڵێنی برِینەوەی مووچە و بەخشینی پایەی بەرزیان پێ دەدا[٣]..

---

(١) "یڵدز" ناوی ئەو كۆشكە بەناوبانگەی ئەستەمبوولە كە جێی پادشایانی عوسمانی بووە و، سوڵتان عەبدولحەمیدیش هەندێ جار لەوێ دەمایەوە. (وەرگێرِ)

(٢) خوالێخۆشبوو "ئەحمەد رِامیز" كەمێ زیادەرِەویی لەمەدا كردووە، چونكە مامۆستا لە قۆناغی پێشووی ژیانیدا بەو رِادەیە دووچاری دوورخستنەوەی زۆر نەبووە. ئەو رِووداوانەش لە كتێبەكەمدا تۆمار كراون كە بۆ مێژووی ژیانی مامۆستا نووسیومە. (عەبدولقادر بادللی)

(٣) "ئەحمەد رِامیز" لەمەدا نەپێكاوە. چونكە لەناو خەستەخانەكەدا ئەم هەوڵە لەگەڵ مامۆستا نەدراوە، بەڵكو لەناو دیوانی وەزارەت و دوای دەرچوونی لە تیمارخانە، داوای وەرگرتنی "مووچە" و "پارە"ی لێ كراوە. (عەبدولقادر بادللی)

بەڵام جەنابی مامۆستا سەعید دەیفەرموو:

"من لە کوردستانەوە بە نیازی کردنەوەی قوتابخانە (زانکۆ) هاتووم بۆ ئێرە و، هیچ نیازێکی دیکەم نی‌یە.. هەر ئەم داواکاری‌یەم هەیە و هیچ شتێکی ترم ناوێ".

بە دەستەواژەیەکی دی: بەدیعوززەمان داوای دوو شتی دەکرد:

دەیویست لە هەموو ناوچەکانی کوردستاندا قوتابخانە بکرێتەوە.. بەرامبەر بەوەش هیچ شتێکی نەوێت.

*"قەناعەت" وەك عەرشێك وایە*

*بەهەشت ئاسا بەرزە لامان*

*دانابەزین بەرەو زەویی "ڕووپامایی"*

*بۆ ناحەزان*

*لە ناخماندا بلندترین پلە و پایە*

*سووکایەتی نواندنە*

*بە کۆمەڵی ستەمکاران.*

شەوێکیان لە ناوچەی "شەهزادە باش"ی ئەستەمبووڵ لە کۆنفرانسێکدا ڕۆشتە سەر سەکۆکە و، گوتارێکی هێندە ڕەوان و میانەڕەوانەی ئاراستەی ئامادەبووان کرد کە هەروەك بەڵگە بوو لەسەر فراوانی و هەمە لایەنیی زانستی مامۆستا سەعید، بە هەمان جۆر حەماسەت و فیداکاریی ئەویان دەنواند.

ئنجا چ ئەو شەوە و، چ لە ڕووداوی شوومی (٣١ی مارت) لە دەمی ئاراستەکردنی ئامۆژگاری‌یەکانیدا، کاتێ مامۆستای دانا ئاگادار کرایەوە و پێی وترا کە:

"لەم کاتە ترسناکەدا خۆپارێزیی بوونی بەنرخی ئێوە پێویستە بۆ سوودی گشتی"..

وەڵامی دایەوە:

"گەورەترین وانەیەك پێشکەش بکرێت وانەی نەسڵەمینەوەیە لە مردن لە پێناوی ڕوونکردنەوەی ڕێی ڕاستدا"!

کە پێی وترا:

"ئەوەی تۆ دەیڵێیت ڕاستە.. بەڵام پاراستنی ئەم ژیانەش پێویستە هەتا کاتی مردن دێتە پێشەوە"..

بەم بەیتە وەڵامی دانەوە:

*لامان نامۆیە.. هەرچەند پێی ئاشناین:*
*ئەندێشەی "مردن"*
*گیانمان لە ڕێگای حەق و دادگەری*
*هەر زوو داناوە، بۆ بەخت کردن.*

جا بۆ ئەوەی مەودای هۆشیاری و بێگەردیی گیانی ئەو بزانین، هەروەها لە ئازایەتی و چابوکی و ناکۆتایی فیداکارییەکانی تێبگەین و، ئێمەش تا ڕادەی شەیدا بوون پابەندی بین، هێندە بەسە کە گوێ بیستی ئەم پارچە شیعرە حەماسی‌یەی "قەهریات"[(١)] بین کە بەڕێزیان زۆر جار لەبەرخۆیەوە دەیوتەوە:

*کۆشکی زیندان بڕووخێنە..*
*بەردەکانی بەسەریاندا ببارێنە*
*خۆر بۆ زەوی دابەزێنە*
*"یڵدز"ەکان[(٢)] ڕووەو خولگەکانی ئاسمان*
*بڕەتێنە*
*ئەستۆی زۆرداری و بێدادی بقرتێنە*
*دڵی ستەم بسووتێنە*
*ئەی ئاگری بە خوڕی "مەرگ"!*
*"ئاوی ژیان"یش بۆ ئێمە*
*لەگەڵ دەستی خۆتدا بێنە.*

ڕۆژێکیان کەسێکی قۆشمە باسی ئەوە لەگەڵ بەدیعوززەماندا دەکات کە پێویستە پۆشاکێك لەبەر بکات لەگەڵ پلەی زانستیی ئەودا بگونجێت[(٣)]!

---

(١) ناوی خوازراوی عەبدوڵلا جەودەتە. (وەرگێڕ)
(٢) یڵدز لە زمانی تورکیدا واتە: (ئەستێرە) لێرەدا ئاماژەیە بۆ کۆشکی یڵدز. (وەرگێڕ)
(٣) چونکە مامۆستا بەرگی کوردیی دەپۆشی. (وەرگێڕ)

وەڵامی دەداتەوە کە:

"ئێوە گوایا بایکۆت لە دژی نەمسا ڕادەگەیەنن، کەچی ئەو شەپقانەش لەسەر دەکەن کە ئەوان ناردوویانە. بەڵام بایکۆتی من هەموو ئەوروپا دەگرێتەوە، دەبینن تەنها بەرهەمەکانی وڵاتەکەم دەپۆشم"!

وا ئەمڕۆ سەعیدی کوردی گەڕایەوە کوردستان، پاش ئەوەی کە ئەو هەموو ساختە و فرت و فێڵەی لە ئەستەمبوولدا بینی.. کە بینیی هەندێ لە ڕۆژنامەکان سەرچاوە و هۆکاری ڕوودانی هەڵە و کێشەکانن، لە کاتێکدا کە دەبوو پێوەرێکی ڕاست و دروست بوونایە بۆ هزرە ڕووناکەکان..

هەر بۆیە ئارامی بۆ نەگیرا لەسەر ئەم تاوانانەی کە دەرگایان بۆ خراوەتە سەرپشت و، بە نائومێدی و دڵشکاوی گەڕایەوە بۆ ئەو چیا بەرزانەی کە هەرچەندە سەخت و سامناکن، بەڵام وەفا و هاودەمی و غیرەتیان لە ئامێز گرتووە..

کارێکی باشی کرد کە گەڕایەوە.. چونکە کێ دەزانێ؟ لەوانەیە ئەم هەڵوێستەشی یەکێك بێت لە شاکارەکانی!

**کوردی زادە: ئەحمەد ڕامیز**[1]

---

(١) قەدری جەمیل پاشا (زنار سلۆپی) لە یاداشتنامەکانی خۆیدا "ئەحمەد ڕامیز"ی بە خوێنەرانی ناساندووە، کە پوختەکەی بەم شێوەیە:

(ئەحمەد ڕامیز یەکێکە لەو ڕۆشنبیرە کوردانەی کە بە خۆشەویستیی کێشەی گەلەکەیان ناسراون و، خەڵکی قەزای "لیجێ"ی سەر بە پارێزگای "دیاربەکر"ە. سالی ١٩٠٠ پەیوەندیی بە "کۆمەڵەی خۆڕاگریی کوردستان"ەوە کردووە و، سالی ١٩٠٤ ڕۆشتووە بۆ میسر و لەوێ نوێنەری کۆمەڵەی ناوبراو بووە. دواتر بووە بە بەڕێوەبەری ئەو پەیمانگایەی کە "کۆمەڵەی بڵاوکردنەوەی زانستی" لە ئەستەمبووڵ دوای ڕاگەیاندنی دەستوور دایمەزراند. چەندین بەرهەمی بەجێهێشتووە، لەوانە: "پاشمڤانا کوردان و کوردستان"، "حیمایەت کرنا مەعاریف". دواساڵەکانی تەمەنی لەناو کوردەکانی دیمەشقدا بەسەربردووە و، هەر لەوێش کۆچی دوایی کردووە و نێژراوە). بڕوانە: (مذكرات زنار سلوپي، ترجمة: ر.علي، من منشورات: رابطة كاوا للثقافة الكردية، ص: ٢٢-٢٣). (وەرگێڕ)

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين. والصلاة والسلام على سيدنا محمد،

وعلى آله وصحبه أجمعين.

**پێشەکی:**

کاتێ کە "سەربەستی" بوو بە هاوتای "شێتی"، ئیستیبدادی لاواز "**خەستەخانەی شێتان**"ی بۆ کردم بە قوتابخانە..

کاتێکیش "دادگەری و ڕاستە ڕێ" لەگەڵ کۆنەپەرستیدا تێکەڵ و ئاڵۆز بوون، ئیستیبدادی بەهێزی مەشرووتیەت "بەندیخانە"ی بۆ کردم بە قوتابخانە.

ئەی ئەو بەڕێزانەی کە بۆ ئەم شایەتی‌یەم دەڕوانن!

تکام وایە گیان و ئەندێشەتان بە میوانی بنێرن بۆ لای زەین و جەستەی قوتابی‌یەکی (کوردی)[1] تووڕە، کە پەرێشان حاڵ و شڵەژاوە و، تازەکی ڕۆشتووەتە ناو ژیانی شارستانی‌یەوە.. تاکو نەکەونە هەڵەی بە هەڵە دانانی کەسانی ترەوە!

لە دادگای عورفیی سەربازی و لە دەمی ڕووداوەکەی (٣١)ی مارتدا وتم:

من قوتابیی شەریعەتم. هەر لەبەر ئەوەش هەموو شتێك بە تەرازووی شەریعەت هەڵدەسەنگێنم. تەنها ئیسلام ئایین و ڕێبازمە و، پێوەر و ڕوانینەکانم بۆ هەر شتێك بەپێی ڕوانینی ئیسلامە.

لەو کاتەدا کە من لە دەرگای ئەو جیهانی بەرزەخەدا ڕاوەستاوم کە ناوی "بەندیخانە"تان لێ ناوە و، لە وێستگای سێدارەدا چاوەڕوانی ئەو شەمەندەفەرەم کە دەمگوێزێتەوە بۆ ئەودنیا، ڕەخنە و ناڕەزایی خۆم لەو بارودۆخە غەددار و ستەمکارانەیە دەردەبڕم کە لە کۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا پیادە دەکرێت.

---

(١) لە چاپە تازەکاندا لە بریی ئەوەی ناو کەوانەکە نووسراوە: (گوندنشینی). (وەرگێڕ)

ڕووی ئەم گوفتارەم تەنها لە ئێوە نییە، بەڵکو ئاراستەی سەرجەم ڕەگەزی ئادەمیزادی ئەم ڕۆژگارەی دەکەم. ئەوەتا بەهۆی نهێنیی ئایەتی: ﴿يَوْمَ تُبْلَى السَّرائِرُ﴾ (الطارق:٩) هەموو ڕاستییەکان بێ پەردە لەناو گۆڕی دڵەوە هاتوونەتەدەر. دەبا ئەو کەسەی نامەحرەمە بۆیان نەڕوانێت.

من بەوپەڕی حەز و شەوقەوە ئامادەی سەفەرم بۆ ئەودنیا و لە سەرپێی کۆچ کردنم لەگەڵ ئەوانەی کە بە سێدارەکاندا هەڵواسراون.

گوندنشینێکی شەیدای شتانی نامۆ، گەر لایەنە سەیر و سەرسووڕهێن و خۆشی و جوانییەکانی ئەستەمبووڵ ببیستێت، دەبێ چەندە تامەزرۆی بینین و سەرلێدانی ئەستەمبووڵ بێت؟

منیش وەکو ئەو دەشتەکییە بووم؛ گەلێ تاسەمەندی کۆچ بووم بەرەو ئەودنیا، کە کۆگا و پیشانگای شتانی نامۆ و سەرسووڕهێنە. ئێستاش هەر وام.

کەواتە دوورخستنەوە و نەفی کردنم بۆ ئەوێ، سەبارەت بە من بە "سزا" دانانرێت. بەڵام گەر دەتوانن سزای "ویژدانی"م بدەن، چونکە جگە لەو شێوە سزایە هیچ شتێکی تر بۆ من سزا نییە، بەڵکو شان و شەرەف و بڵندییە.

ئەم حکومەتە چەتەیە لە ڕۆژگارانی "ئیستیبداد"دا دوژمنایەتیی "ژیری"ی دەکرد. کەچی وا ئێستا دوژمنایەتیی سەرانسەری "ژیان" دەکات. جا ئەگەر حکومەت بەم شکڵ و شێوەیە بێت، ئەوا با بژی "شێتی".. بژی "مردن".. "دۆزەخ"یش هەر بژی بۆ ستەمکاران.

من بۆ خۆم لە زەمینەیەك دەگەڕام کە بیروبۆچوونەکانمی تێدا بخەمە ڕوو. وا ئەم دادگا عورفییە بوو بە باشترین شوێن کە لێیەوە هزر و بیرەکانم بڵاو بکەمەوە.

(ئەم وتانەی خوارەم یەکەم جار لە دادگای سەربازیدا لەسەر زار هەڵقوڵاوە. پاشان دوو لەسەر سێی وتارەکەم ئاراستەی دووهەم دادگای سەربازی کردووە و لە هەمان کاتیشدا وەڵامی چەند پرسیارێك بوون کە لە چەند کاتێکی جیاجیادا ئاراستەم کراون. بەشی پرسیارەکانم لە دووهەم ڕۆژی ئازادبوونمدا جارێك نارد بۆ "خورشید پاشا"ی سەرۆکی یەکەم دادگای سەربازی و، چەند جارێکیش بە مەبەستی بەرگری کردن لە

گیراوە بێ تاوانەکان ئەم پرسیارانەم ئاراستە کردووە. پارچەیەکیشیم لە چەند شوێنێکی جیاوازدا بە شێوەی وتوویژ دەربڕیوە)[١].

لە یەکەم ڕۆژەکانی لێکۆڵینەوەدا لێیان پرسیم، وەك لە کەسانی تریشیان پرسی:

"تۆیش داوای شەریعەتت کردووە"؟

وتم:

ئەگەر هەزار "گیان"م هەبێت، ئامادەم هەموویان لە پێناوی یەك دانە ڕاستیی "شەریعەت"دا بەخت بکەم. چونکە شەریعەت هۆکاری بەختەوەرییە و.. دادگەریی بێگەرد و خاوێنە و.. فەزیلەت و سەربەرزییە.. "شەریعەتی ڕاستەقینە" دەڵێم، نەك بە وێنەی داواکاریی هەڵگەڕاوەکان.

هەروەها وتیان:

ئایا پەیوەندیت بە "یەکێتیی محەممەدی"[٢]یەوە کردووە؟

وتم:

بەڵێ، من بە سەربەرزی و شانازییەوە بچووکترینی ئەندامەکانیم. بەڵام بەو ڕووەی کە خۆم دەیناسێنم.

دەسا فەرموون کەسێکم نیشان بدەن - جگە لە مولحیدان - کە لە دەرەوەی ئەو یەکێتییەدا بێت؟

* * *

وا من ئەمڕۆ بەم جۆرەی خوارەوە وتارەکەم بڵاو دەکەمەوە، تاکو "مەشرووتیەت" لە چەپەڵ بوون بپارێزم و، "ئەهلی شەریعەت"یش لە نائومێدی ڕزگار بکەم و، "ڕۆڵەکانی ئەم چەرخ"ەش لە بەرچاوی ڕوانینی مێژوودا لە ناتۆرەی شێتی و نەزانی دەرباز بکەم و.. "ڕاستی"ش لە ناو گومان و دوودڵییەکان دەربهێنم.

---

(١) ئەم برگەیەی ناو کەوانەکە لە چاپە تازەکاندا نییە. (وەرگێڕ)

(٢) ئەو کۆمەڵەیە لە بەرواری: ١٩٠٩/٤/٥زدا پێکهات و، لە کۆبوونەوەیەکی ئایینی پرشکۆدا لە مزگەوتی ئەیاسۆفیا ڕاگەیەنرا. "مامۆستا نوورسی" وتارێکی ڕەنگینی تێدا ئاراستەی ئامادەبووان کرد. (وەرگێڕ)

وا دەست بە وتارەکەم دەکەم:

ئەی سەرکردەکان! ئەی ئەفسەرەکان!

پوختەی تاوانەکانم کە داخوازی بەند کردنم بوون ئەوەیە کە:

إذا محـــاسِـــــنِي اللاّتِي أُدِلُّ بـــها كانَتْ ذُنُوبِي، فَقُلْ لِي كيفَ أعْتَذِرُ[1]؟

واتە: ئەگەر ئاکارە بەرز و جوانەکانم کە مایەی شانازییمن بە تـاوان دابـنرێن، دە پێـم بڵێ ئیتر چۆن پۆزش بهێنمەوە؟

لە سەرەتاوە دەڵێم: مرۆڤی مەرد دانابەزێتە ئاستی ئەنجامدانی تـاوان. خۆ ئەگـەر پێـی تۆمەتبار بکرێت لە تۆڵە و سزا ناترسێت..

جا ئەگەر من بەناحەق لـە سێدارە بدرێـم، دەسکەوتم پاداشتی دوو شـەهید دەبێت. (چونکە شەهیدانی تر نیوەی پاداشتەکەیان بە ناوبـانگی دنیـایی دەگۆڕنـەوە)[2].. ئەگـەر لـە بەندیخانەشـدا بمێنمـەوە، ئـەوا بێ گومـان باشـترین شـوێنە لـە سـایەی ئـەم حکوومەتـە ستەمکارەی کە لە ئازادی و سەربەستیدا تەنـها وشـەکەی پێ بڕاوە! کەواتـە مـرۆڤ بـە ستەملێکراوی بمرێت باشترە لەوەی بە ستەمکاری بژی!

هەروەها دەڵێم:

هـەندێ کـەس لەوانـەی کـە سیاسـەتیان وەك ئـامرازێك بـە دەسـتی ئیلحـادەوە بەکارهێناوە، خەڵکانی تر بە "کۆنەپەرستی" و "قۆزتنەوەی ئایین لە پێنـاوی سیاسـەت"دا تۆمەتبار دەکەن، تاکو خراپکاری و تاوانەکانی خۆیان بپۆشن.

جاسووس و سیخوڕەکانی دەستەڵاتداران، گەلـێ لەوانـەی پێـش خۆیـان دڵڕەقـترن، ئیتر چۆن متمانەیان پێ دەکرێت و پشـتیان پـێ دەبەسـترێ و، "دادگـەری" لەسـەر قسـە و گوفتاری ئەوان بنیات دەنرێت؟

جگە لەوەی کە مـرۆڤ لـە کـەموکووڕی و ناتـەواوی دەربـازی نـابێت، ئـەوەتا لـەو کاتەدا کە بە جەربەزەیی هەوڵی "دادگەری" دەدات، دەکەوێتە نێوان "ستەم"ەوە!

---

(١) ئەم بەیتە شیعرە هی وەلیدی کوڕی عوبەیدی ناسراو بە (بوحتوری)یە (٢٠٥-٢٨٤ك/٨٢١-٨٩٧ز) کە یەکێکە لە شاعیرە ناودارەکـانی سـەردەمی عەبباسـی. بڕوانـە: دیـوان البحـتري: ١/٤٦٨. دار الجیـل، بیروت. دون تاریخ. (وەرگێڕ)

(٢) لە چاپە تازەکاندا ئەم ڕستەیەی ناو کەوانەکە نەنووسراوە. (وەرگێڕ)

بەڵام کۆکردنەوەی چەندین کەموکووڕیی زۆر و زەبەندە کە لە چەند ماوەیەکی درێژخایەن و لە هەڵسوکەوتی چەندین کەسی زۆرەوە ڕوویان دابێت - کە بکرێ بەو چاکەکارییانەی کە ناوبەناو لە نێوانیاندا ڕوویان داوە، چاوپۆشی لە کەموکووڕییەکان بکرێت - و، گومان بردنی ئەوەی کە ئەو هەموو کەموکووڕییانە هی یەك کەس بن و لە یەك کاتیشدا ئەنجامی دابن، کارێ دەکات ئەو کەسە شایانی سزایەکی گەلێ سەخت بێت. دیارە ئەوەش لەخۆیدا ستەمێکی یەکجار گەورەیە!

وا ئێستاش لە تاوانەکانم دەدوێم کە یازدە تاوان و نیون[1]. بەم جۆرەی خوارەوە:

تاوانی یەکەم:

ساڵی پار لە سەرەتای ڕاگەیاندنی "سەربەستی"دا نزیکەی پەنجا شەست بروسکەم لە ڕێی دیوانی سەرۆکایەتیی وەزارەتەوە بۆ (هۆزە کوردەکان)[2] نارد. ناوەرۆکی ئەو بروسکانەش بریتی بوو لەوەی کە:

(ئەو مەسەلەیەی بیستووتانە، کە "مەشرووتیەت" و "یاسای بنەڕەتی"یە، لە ڕاستیدا بریتییە لە دادگەریی ڕاستەقینە و شووراى شەرعی. ئێوە بە نیازێکی باش وەری بگرن و هەوڵی پاراستنی بدەن، چونکە بەختەوەریی دنیامان بەندە بە "مەشرووتیەت"ەوە. ئەوەبوو ئێمە لە هەموو کەسێ زیاتر تاڵی و سوێریمان لە دەستی "ئیستیبداد" چەشت).

وەڵامی ئیجابیی ئەو بروسکانەم لە هەموو شوێنێکەوە بۆ هاتەوە. بەو واتایەی کە من (کوردەکانم)[3] بێدارکردەوە و نەمهێشت لێی بێ ئاگا بن و ئیستیبدادێکی نوێ بیانخەڵەتێنێت.

جا لەبەر ئەوەی من نەموت: "هەقم بەسەر خەڵکەوە چییە"؟ ئەوا تاوانم ئەنجام داوە، بە ڕادەیەکی وا کە گەیشتمە ئەم دادگایە!

تاوانی دووهەم:

لە یەك بە یەکی مزگەوتەکانی: "ئەیاصۆفیا و بایەزید و فاتیح و سولەیمانییە"دا چەندین وتارم ئاراستەی زانایان بە گشتی و زۆر کەس لە قوتابیانی شەریعەت کرد و،

---

(١) هەریەك لەم تاوانانە پوختەی چل لاپەڕەی پەرێشانمە لە وەڵامی داداگای سەربازیدا و، وەڵامی چەند پرسیارێکی چاوەڕوانکراوە کە لە چەند شوێنێکی جیاوازدا هاتوونەتە زەینمەوە. (دانەر)

(٢) لە چاپە تازەکاندا لە بریی ئەوەی ناو کەوانەکە نووسراوە: (هۆزەکانی خۆرهەڵات). (وەرگێڕ)

(٣) لە چاپە تازەکاندا لە بریی ئەوەی ناو کەوانەکە نووسراوە: (ویلایەتەکانی خۆرهەڵاتم). (وەرگێڕ)

پەیوەندیی ڕاستەقینەی نێوان شەرعی ڕاستەقینە و مەشرووتیەتم دەرخست و، ئەوەشم ڕوون کردەوە کە: ئیستیبدادی خۆسەپێن هیچ پەیوەندییەکی بە شەریعەتی خاوێنی ئیسلامەوە نییە. شەریعەت بۆ ئەوە هاتووە کە سەرانسەری جیهان هیدایەت بدات، تاکو خۆسەپاندنی ستەمکاران و ئیستیبدادیان نەهێڵێت، وەك ئەوەی لە ناوەرۆکی ئەو فەرموودە پیرۆزەدا هاتووە کە دەفەرموێ: (سيد القوم خادمهم)[1].

(ئەگەر ئیستیبداد و شەریعەت بەرجەستە ببن ئەوا ئیستیبداد لە شێوەی "دێو"ێکی دڕندە و، مەشرووتیەتی سولەیمان و شەریعەتیش لە شێوەی "مستیلەی سولەیمان"دا دەردەکەوێت. جا ئەو مستیلەیەی کە تایبەتمەندیی فەرمانڕەوایی تێدایە و شایانی پەنجەی سولەیمانی مەشرووتیەتە، بریتییە لەو شەریعەتەی کە لەسەر تەختی شارستانێتی دانیشتووە و بیری گشتی قبوولی دەکات. بەڵام تا ئێستا دێوی ئیستیبداد زەوتی کردبوو)[2].

ئامادەشم بەڵگەی گومان بڕ لەسەر هەموو یەکێکی ئەو وشانەم بهێنمەوە کە لە هەر کامێکی وتارەکانمدا هاتوون، بۆ هەر کەسێك ڕەخنەی لێیان هەبێت.

هەروەها وتم: ڕێبازی ڕاستەقینەی شەریعەت لە ڕاستیدا بریتییە لە حەقیقەتی "مەشرووتیەت"ێك کە مەشرووع و ڕەوا بێت.

بەو واتایەی کە من بە مەشرووتیەتێك ڕازیم بەڵگەکانی شەرع پشتی بگرێت، نەك بەو جۆرەی کە هەندێ لە هەڵگرانی بانگەشەی شارستانێتیی خۆرئاوایی پێی ڕازین. چونکە ئەوانە بە چەشنێکی چاولێکەری وەریان گرتووە و بە پێچەوانەی شەریعەتیش لێی تێگەیشتوون. بۆیە من هەرگیز دەستم لە شەریعەت هەڵنەگرت و نەمدا بە بەرتیل بۆ هیچ شتێك.

جا لەبەر ئەوەی بەپێی توانای خۆم هەوڵم بۆ دەرباز کردنی شەریعەت و پاراستنی زانایانی دا لە وەهم و گومانە خراپەکانی ئەورووپا، ئەوا دیارە کە تاوانم ئەنجام داوە، بە ڕادەیەکی وا کە ئەم جۆرە مامەڵەیەم بینی کە ئێوە لەگەڵ مندا نواندتان.

---

(١) بروانە: البيهقي، شعب الإيمان: ٦/٣٣٤؛ المناوي، فيض القدير: ٤/١٢٢. (وەرگێڕ، لە چاپە عەرەبییەکەوە)

(٢) ئەم بڕگەیەی ناو کەوانەکە لە چاپە تازەکاندا نەنووسراوە. (وەرگێڕ)

تاوانی سێهەم:

هەستم بە مەترسیی ئەوە کرد کە دڵپاکیی (کوردەکان)[1] ببێتە هۆی ئەوەی هەندێ لە بانگەشەچیانی حیزبەکان ڕۆڵەکانی نەتەوەکەم لەخشتە ببەن و، بەمەش (نەتەوەی کورد)[2] لەکەدار بکەن، کە ژمارەیان نزیکەی بیست هەزار کەس دەبێت و لە ئەستەمبووڵدا کاری حەماڵی دەکەن و خەڵکانی ساویلکە و خۆش باوەڕن. بۆیە ساڵی پار ڕۆشتم بۆ هەموو ئەو شوێنە گشتی و چایخانانەی کە ئەو (کوردانەی)[3] تێدان و، بە ڕادەی تێگەیشتنی خۆیان "مەشرووتیەت"م بۆ ڕوون کردنەوە و، بەم واتایەی خوارەوە پێم وتن:

"ئیستیبداد" ستەم و خۆسەپاندنە بەسەر خەڵکانی تردا، بەڵام "مەشرووتیەت" دادگەری و شەریعەتە.

سوڵتان گەر گوێڕایەڵی فەرمانەکانی پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ بێت و لەسەر ڕێبازە پیرۆزەکەی ئەو بڕوات، ئەوا خەلیفەیە و ئێمەش گوێڕایەڵی دەبین. دەنا ئەو کەسانەی کە سەرپێچی لە فەرمانەکانی پێغەمبەر ﷺ و ستەم لە خەڵکی دەکەن، تەنانەت گەر سوڵتانیش بن هەر چەتە و ڕێگرن.

دوژمنانی ئێمە (هەژاری و، نەزانی و، دووبەرەکی)یە و.. بە چەکی (پیشەسازی و، زانست و، یەکگرتن) بەگژی ئەو سێ دوژمنەدا دەچینەوە.

(بەڵام بەوپەڕی خۆشحاڵیەوە دەبینە دۆستی ئەرمەنەکانی دراوسێمان، کە تا ڕادەیەك و لە ڕوویەکەوە هۆکاری بێداربونەوەمان بوون لە بێ ئاگایی و هاندانمان بۆ گرتنەبەری ڕێی پێشکەوتن، هەروەها دەست لەناو دەست هاوکاری و هاوڕێیەتیی ئەو تورکانەش دەکەین کە برای ڕاستەقینەمانن)[4].

---

(١) لە چاپە تازەکاندا لە بریی ئەوەی ناو کەوانەکە نووسراوە: (هاوشاریەکانم). (وەرگێڕ)

(٢) لە چاپە تازەکاندا لە بریی ئەوەی ناو کەوانەکە نووسراوە: (ویلایەتەکانی خۆرهەڵات). (وەرگێڕ)

(٣) لە چاپە تازەکاندا لە بریی ئەوەی ناو کەوانەکە نووسراوە: (حەماڵانەی). (وەرگێڕ)

(٤) لە چاپە تازەکاندا ئەم برگەیەی ناو کەوانەکە بەم جۆرە نووسراوە: (هەروەها دەست لەناو دەست هاوکاری و هاوڕێیەتیی ئەو تورکانە دەکەین، کە برای ڕاستەقینەمانن و، تا ڕادەیەك و لە ڕوویەکیشەوە هۆکاری بێداربونەوەمان بوون لە بێ ئاگایی و هاندانمان بۆ گرتنەبەری ڕێی پێشکەوتن). (وەرگێڕ)

بەڵێ، لەگەڵ ئەوان و هەموو هاوسێکانماندا هاوکاری دەکەین، چونکە ناکۆکی و دوژمنایەتی کارێکی لەڕادەبەدەر تێکدەرانە بوو. ئێمەش کاتی دوژمنایەتیمان بە دەستەوە نییە.

هەروەها خۆمان لەکاری حکوومەت هەڵناقورتێنین، چونکە حیکمەتی کارەکانی نازانین.

ئەم ئامۆژگارییانەش کاریگەریی خۆیان لەسەر ئەو حەماڵانە بەجێ هێشت کە بەرامبەر کەلوپەلی نەمسا - بە وێنەی من بەرامبەر کەلوپەلی هەموو ئەورووپا - مامەڵەیان دابڕیبوو. ئەوەبوو لەو بارودۆخە یەکجار شڵەژاوەدا ژیرانە ڕەفتاریان نواند.

جا لەبەر ئەوەی کە من بووم بەهۆی ڕاستکردنەوە و ڕێکخستنەوەی پەیوەندییان بە سوڵتانەوە و کردنەوەی جەنگێکی ئابووری لەگەڵ نەمسادا، ئەوا تاوانێکی وام ئەنجام دا کە بەهۆیەوە کەوتمە ئەم گرفتەوە!

**تاوانی چوارەم:**

ئەورووپا وا گومان دەبات کە "شەریعەت" هێز و پێز بە ئیستیبداد دەدات و پشتی دەگرێت.

نەخێر هەرگیز وا نییە.. لە ڕاستیدا ئەو نەزانی و دەمارگیرییەی لەناو ئێمەدا بڵاوبووەتەوە، یارمەتیی ئەورووپایان داوە کە لەو گومانە هەڵەیەدا بێت گوایا شەریعەت یارمەتیدەری ئیستیبدادە. بۆیە لە ناخی دڵەوە گەلێ ئازارم بەم گومانە هەڵەیە چەشت کە بەرامبەر شەریعەت هەیانە.

جا من بۆ ئەوەی گومانەکەیان بەدرۆ بخەمەوە، ئەوا لە هەموو کەس زیاتر بە ناوی شەریعەتەوە چەپڵەم بۆ "مەشرووتیەت" لێدا..

بەڵام ترسم لێ نیشت کە ئیستیبدادێکی تر بەرپا ببێت بۆ پشت ڕاستکردنەوەی ئەو گومانەی ئەورووپاییەکان. لەبەر ئەوە، بە هەموو هێزێکمەوە لە وتارێکمدا لە مزگەوتی ئەیاصۆفیا بە پەرلەمانتارەکانم وت:

"مەشرووتیەت" لە ڕووناکیی "مەشرووعییەت"دا وەربگرن و، لەسەر ئەو بناغەیەش لێی تێبگەن و، خەڵکیشی لێ تێبگەیەنن، تاکو دەستی چەپەڵی ئیستیبدادێکی نوێ و پەنهان و خوانەناس لەکەداری نەکات و، ئەو بارودۆخە خاوێن و پیرۆزە بۆ مەبەستە

کەسی‌یەکانی خۆی وەك قەڵغانێك بەکار نەهێنێت. هەوڵ بدەن کە "سەربەستی" بە "ئادابی شەرع"ەوە گرێ بدەن، دەنا عەوامی خەڵکی و نەزانەکان دەبن بە کەسانی هەرزە و چەتە و ملنەدەر. ئەو کاتەش کە سەربەستیی بێ قەید و شەرتیان پێ درا، مل بۆ فەرمانەکان کەچ ناکەن.. با قیبلەتان لە نوێژی "دادگەری"دا لەسەر هەر چوار مەزهەبەکە بێت، تاکو ئەو نوێژەتان دروست بێت، چونکە من ئەو دەعوایەم ڕاگەیاند کە چ بە "ڕاشکاوی" و چ بە جۆرێکی "ناوەکی و ڕوخسەت وەرگرتن" دەتوانرێت ڕاستی‌یەکانی "مەشرووتیەت" لە چوار مەزهەبەکان دەربهێنرێت.

جا لەبەر ئەوە من کە (کوردێکی)[1] ئاساییم، سەرجەمی ئەو کارمەندی و ئەرکانەم خستە ئەستۆی خۆم کە ئەرکی زانایانە بەجێیان بهێنن، ئەوا تاوانێکم ئەنجام داوە. هەر لەبەر ئەوەش بوو کە ئەم چەشنە سزایەم چەشت!

**تاوانی پێنجەم:**

"ڕۆژنامەکان" لە ڕێی دوو پێوەری نارەوا و بێ کەڵك و، بە چەند بڵاوکراوەیەکی سەربەرزی شکێن، لەرزەیان بە ڕەوشتە ئیسلامی‌یەکان خست، بە ڕادەیەکی ئەوتۆ کە بیروڕای گشتی‌یان لەناوبرد. بۆیە منیش بە چەند وتارێك ڕووبەڕوویان بوومەوە کە لە ڕۆژنامەکاندا بڵاوکرانەوە و، پێم وتن:

ئەی ڕۆژنامە نووسەکان! دەبێ ئەدیبان پابەند بن بە ئەدەبەوە و، بەو ئادابەی شایانی ئیسلامە ڕەفتار بکەن. هەروەها دەبێ گوفتارەکانیان لە سینەیەکی دوور لە لایەنگری دەربچێت و لە دڵ و دەروونێکەوە سەرچاوە بگرێت کە گوزارشت لە ڕای گشتیی خەڵکی بکات و، سەرانسەری نەتەوە لە وتارەکانیاندا هاوڕا و هاوسۆزیان بێت. هەروەها دەبێ ئەو هەستە ئایینی و نیازە پاکەی کە لە ویژدان و ناخیاندایە، بەرنامەی چاپەمەنی ڕێك بخات..

کەچی ئێوە بە پێوەرێکی بێ کەڵك، واتە: سەیرکردنی لادێ بە چاوی ئەستەمبووڵ و ئەستەمبوولیش بە چاوی ئەورووپا، ڕای گشتی و بیروڕای باوی ناو کۆمەڵتان خستووەتە ناو زەلکاوێکی بۆگەنەوە. بەم کارەشتان دەماری ئامانجە کەسی‌یەکان و، سوودە خۆییەکان و، حەزی تۆڵەسەندنەوەتان لەو خەڵکەدا بێدار کردووەتەوە..

---

(١) لە چاپە تازەکاندا لە بریی ئەوەی ناو کەوانەکە نووسراوە: (قوتابی‌یەکی). (وەرگێڕ)

"فەلسەفەی سروشتی" بەگوێی منداڵێکدا نادرێت کە هێشتا نەڕۆشتووەتە قوتابخانە!

جا هەروەك پۆشاکی (ئافرەتان)[1] شایانی پیاو نی‌یە، بە هەمان جۆر نابێ هەست و نەستە ئەوروپاییەکان لە ئەستەمبووڵدا پیادە بکرێن. چونکە جیاوازیی نەتەوە و شوێنەکان وەکو جیاوازیی کات و سەردەمەکان وایە؛ پۆشاکی ئەم بۆ ئەو نابێت. واتە شۆڕشی فەرەنسی ناگونجێ بکرێت بە دەستوور بۆ ئێمە. هەڵە لەوەدایە کە تیۆرەکان جێ‌بەجێ بکرێن و، ئاوڕ لە داخوازی‌یەکانی ڕۆژگار و سەردەم نەدرێتەوە.

جا منی (کوردی)[2] گوندنشینی نەخوێندەوار، کە بە تەواوی نووسین نازانم، ئامۆژگاریم پێشکەش بەو ڕۆژنامەنووسانە کرد کە ئامانجی کەسی‌یان لەخۆدا هەڵگرتووە و، بە زیرەکیی خۆیان و لە بواری ڕۆژنامەنووسیدا خەڵکی بە هەڵەدا دەبەن. کەواتە من، بەم کارەم، تاوانم ئەنجام داوە!

**تاوانی شەشەم:**

لە چەند کۆڕ و کۆبوونەوەیەکی گەورەدا هەستم کرد خەڵکی ورووژاوە، ئیتر ترسی ئەوەم لێ نیشت کە عەوامی ئەو خەڵکە بە خۆهەڵقورتاندن لە کاروباری سیاسەتدا سیستەم و ئاسایشی وڵات تێکبدەن. بۆیە بە گوفتارێکی گونجاو بۆ زمانی (کوردێکی زانستخواز)[3]، ئەو هەست و نەستە ورووژاوەم هێور کردەوە.

بۆ نموونە: لە کۆبوونەوەی قوتابیاندا لە مزگەوتی بایەزید و، ئاهەنگی یادی لەدایکبوونی پێغەمبەر ﷺ لە مزگەوتی ئەیاصۆفیا و، لە شانۆی فەرەحدا، تا ڕادەیەك هەڵچوون و تووڕەیی خەڵکەکەم هێمن کردەوە. خۆ ئەگەر ئەو وتارانە نەبوونایە، ئەوا زریانێکی گێژەڵووکاوی دەیپێچانەوە!

جا منی گوندنشین، کە هێشتا تێکەڵی شارستانێتی نەبووم، بەڵام ئاگادار و شارەزای فرتوفێڵی شارستانی‌یەکانم، بەم ڕەفتارەم، خۆم لە کاروباری ئەواندا هەڵقورتاندووە. کەواتە تاوانم ئەنجام داوە!

---

(١) لە چاپە تازەکاندا لە بریی ئەوەی ناو کەوانەکە نووسراوە: (ئافرەتە تیاترۆکان)، مەبەستی دانەر لە وشەی (تیاترۆ)ی چاپە تازەکاندا "سەماکار"ە، نەك "ئەکتەری شانۆ" بە گشتی. (وەرگێڕ)

(٢) لە چاپە تازەکاندا ئەوەی ناو کەوانەکە نەنووسراوە. (وەرگێڕ)

(٣) لە چاپە تازەکاندا لە بریی ئەوەی ناو کەوانەکە نووسراوە: (زانستخوازێکی گوندنشین کە تازەکی فێری زمانی تورکی بووبێت). (وەرگێڕ)

تاوانی حەوتەم:

بیستم کۆمەڵەیەك بە ناوی "یەکێتیی محەممەدی" دامەزراوە. لە لایەنی خۆمەوە مەترسییەکی زۆرم لێ نیشت کە لە ژێر پەردەی ئەم ناوە پیرۆزەدا هەندێ لە ئەندامەکانی جموجوڵی هەڵەیان لێ بووەشێتەوە.

پاشان بیستم کە چەند کەسێکی دیار و بەڕێزی چەشنی "سوهەیل پاشا" و "شێخ صادق"[(١)] ناوەڕۆکی ئەم ناوەیان گۆڕیوە بە شتێکی ساکار و ئاسان، چونکە تایبەتیان کردووە بە تەنها پەرستش و شوێنکەوتنی سوننەتی خاوێن و، پەیوەندییان بەو (کۆمەڵە)[(٢)]وە پچڕیوە و دەست وەرنادەنە سیاسەت..

بۆیە جارێکی تر ترسم لێ نیشتەوە و، پێم وتن: ئەم ناوە مافی سەرجەمی موسڵمانانە، تایبەتکردن و سنوور بۆ دانان هەڵناگرێت. جا هەروەك لە ڕوویەکەوە من پەیوەندیم بە (حەوت کۆمەڵە)[(٣)]وە هەیە، چونکە بینیم ئامانجەکانیان یەکێکە، پەیوەندیشم بەم ناوە پیرۆزەوە هەیە.

بەڵام ئەو "یەکێتیی محەممەدی"یەی کە من دەیزانم و پەیوەندیم پێوەی هەیە (و، لە ڕۆژنامەکاندا ڕوونم کردووەتەوە)[(٤)]: بازنەیەکی پەیوەستە بە زنجیرەیەکی نوورانیی ئەوتۆ کە هەر لە خۆرهەڵاتەوە بۆ خۆرئاوا و لە باشوورەوە بۆ باکوور درێژ بووەتەوە.. ئەو کەسانەش کە لە ژێر ئاڵاکەیدا ڕیزیان بەستووە لەم سەردەمەدا ژمارەیان لە سێ سەد ملیۆن زیاترە و.. لایەنی یەکبوون و پەیوەندی لەم کۆمەڵەیەدا "تەوحید"ی خوای گەورەیە و.. سوێند و پەیمانی بریتییە لە ئیمان و.. ئەوانەش کە پەیوەندییان پێوە کردووە هەموو ئیماندارانن هەر لە سەرەتای بەدیهێنانی مرۆڤەوە و.. تۆماری ناوی ئەندامەکانیشی لەوحی مەحفووزە و.. بڵاوکەرەوەی بیر و بۆچوونەکانیان سەرجەم کتێبە ئیسلامییەکانە و، ڕۆژنامەکانیشیان هەموو ئەو ڕۆژنامە ئایینییانەیە کە ئامانجیان بەرزکردنەوەی ئاڵای ئیسلامە و.. شوێنی کۆبوونەوەکانی سەرجەم مزگەوت و تەکیە و خانەقا و قوتابخانە ئایینییەکانە و.. مەڵبەندەکەشی هەردوو حەرەمی پیرۆزە..

(١) لە ئەندامانی دامەزرێنەری کۆمەڵەی "یەکێتیی محەممەدی"ن. (وەرگێڕ)

(٢) لە چاپە تازەکاندا لە بریی ئەوەی ناو کەوانەکە نووسراوە: (کۆمەڵە سیاسییەوە). (وەرگێڕ)

(٣) لە چاپە تازەکاندا لە بریی ئەوەی ناو کەوانەکە نووسراوە: (بە چەندین کۆمەڵەی ئایینی). (وەرگێڕ)

(٤) لە چاپە تازەکاندا ئەوەی ناو کەوانەکە نەنووسراوە. (وەرگێڕ)

ئیتر کۆمەڵەیەکی وەك ئەمە، سەرۆکەکەی فەخری عالەم پێغەمبەری سەروەرمانە ﷺ.. بەرنامە و ڕێبازیشی ئەوەیە کە هەموو کەسێك موجاهەدەی دەروونی خۆی بکات، واتە ڕەفتار کردنە بە ڕەوشتە بەرز و بڵندەکانی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ و، زیندوو ڕاگرتنی سوننەتی پیرۆزی و، خۆشەویستیی خەڵکانی تر و، ئامۆژگاری‌یان بە گوفتارێکی هێندە نەرم کە زیانی لێ نەبێتەوە.

پرۆگرامی ناوخۆییشی سوننەتی پیرۆزی پێغەمبەرە ﷺ و.. یاساکانی فەرمان و نەهی‌یەکانی شەرعە و.. شمشێرەکانی بەڵگە بەهێز و گومان بڕەکانە، چونکە سەرکەوتن بەسەر خەڵکانی شارستانی و ڕۆشنبیردا بە قەناعەت پێ بەخشین دەبێت، نەك بە گوشار و زۆرەملێ. سۆراخ کردن و بەدوادا گەڕانی "ڕاستی"ش بە "خۆشەویستی" ئەنجام دەدرێت، کەچی دژایەتی تەنها بەرامبەر وەحشیگەری و دەمارگیری دەبێت.

(ئەو کەسانەش وەحشیگەر و دەمارگیرن، زڵلەی دەستی سەردەم و شارستانێتی دەخۆن)[1].

ئامانجیشی بەرزکردنەوەی ئاڵای ئیسلامە.

ئەوەش هەیە کە ڕێژەی ڕەوشت و پەرستش و ڕەفتارە بەرزەکان[2] لە شەرعدا لە سەدا نەوەدونۆیە و، ڕێژەی سیاسەتیش لە سەدا یەك تێپەڕ ناکات. دەبا کاربەدەستانمان بیری لێ بکەنەوە.

ئێستاش ئامانجمان ورووژاندنی شەوق و حەزی ناو ویژدانی هەموانە لە ڕێی پێشکەوتنەوە بەرەو کەعبەی ئاکارە بەرز و بڵندەکان. ئەمەش بە بزواندنی ئەو زنجیرە نوورانی‌یە، چونکە پێشکەوتنی ماددی لەم سەردەمەدا هۆکارێکی گەلێ مەزن و گرنگە بۆ بەرزکردنەوەی وشەی (الله) و ئاڵای ئیسلام.

بەم جۆرە، من یەکێکم لە تاکەکانی ئەم کۆمەڵەیە و، هەوڵدەران بۆ شەکاندنەوەی ئاڵاکەی و، دەرخستنی ناوەکەی. دەنا هەرگیز لەو جۆرە حیزب و کۆمەڵانەدا نیم کە دووبەرەکی و جیاوازی لە نێوان خەڵکیدا دەنێنەوە.

---

(١) ئەوەی ناو کەوانەکە لە چاپە تازەکاندا نی‌یە. (وەرگێڕ)

(٢) لەم شوێنەی چاپە تازەکاندا ئەمەش نووسراوە: (کارکردن بۆ ژیانی دواڕۆژ). (وەرگێڕ)

**بە پوختی:**

مـن بەیعـەتم بـە "سـولتان سـەلیم"[١] داوە و بیرۆکـەی ئـەوم سـەبارەت بـە "یـەکگرتنی ئیسلامی" لە لا پەسەندە، چونکە هەر ئەو بیرۆکەیە بوو (کوردەکانی)[٢] بەخەبەر هێنا و، لەسەر ئەوە بەیعەتیان پێ داوە[٣]..

(کوردەکانی)[٤] ئێستا هەر ئەوانەی پێشوون و نەگۆڕاون.

پێشـینانی مـن لـەم مەسـەلەیەدا: سـەیید جەمالـەددینی ئـەفغانی یـە و، لـە زانـا پایەبەرزەکانیش: شێخ محەممەد عەبدەی موفتیـی وڵاتی میسـرە و، عـەلی سـواعی و، زانـا: تەحسین و، نامیق کەمالی شاعیرە[٥] کە بانگەشەی بۆ "یەکگرتنی ئیسلامی" کردووە..

---

(١) "سولتان سـەلیم" کوڕی سولتان بایـەزیدی دووهەمـە و کـوڕەزای محەممەد فاتیحـە. لـە نێـوان ساڵەکانی (١٤٧٠-١٥٢٠ز)دا ژیـاوە و، لـە بـەرواری (١٥١٢ز)شـدا ڕۆشتووەتە سـەر تـەخت و، یەکـەم خەلیفەیـە لـە سولتانە عوسمانییەکاندا. (وەرگێڕ)

(٢) لە چاپە تازەکاندا لە بریی ئەوەی ناو کەوانەکە نووسراوە: (ویلایەتەکانی خۆرهەڵاتی). (وەرگێڕ)

(٣) دانـەر ئامـاژە بـەو فـەرمانی خـود موختارییە دەدات کـە سـولتان سـەلیم سـەبارەت بـە کوردسـتان دەری کردبوو. ئـەوەبوو دوای جـەنگی بـەناوبانگی "چاڵدێران" (١٥١٤ز) و سـەرکەوتنی سـوپای عوسمـانی بەسـەر سەفەوییەکاندا و دابەشبوونی کوردستان بە دوو بەشەوە، بـەهۆی تێکۆشـانی "مـەلا ئیدریسـی بەدلیسـی" کـە ڕاوێژکاری سولتان بوو لە کاروباری کورد و کوردستاندا، سولتان سەلیم "فەرمان"ێکی دەرکرد بۆ میرنشینە کوردییەکانی سنووری عوسمانی کە سەربەخۆ لە لایەن میرەکانیانەوە بەڕێوەببرێن، بەرامبـەر بـەوەش بـاجێکی ساڵانە بدەن بە دەوڵەتی عوسمانی و، لە کاتی پێویستیشدا بە ناردنی جەنگاوەر یارمەتیی دەوڵەت بدەن. بە پێـی ئەو فەرمانە میرنشینەکانی (بۆتان، بادینان، سۆران، بابان) خـاوەنی خـود موختـاری بوون و، کۆمەڵـە مـاف و ئیمتیازێکیـان هـەبوو، دەوڵـەتیش دەستی نەدەخستە نـاو کاروبـاری ناوخۆیـان. بـەڵام بـە درێژایـی کـات دوا حوکومەتەکانی دەوڵەتی عوسمانی ئەو پەیمانەیان لەبیر خۆیان بردەوە و، دەسـەڵاتە کوردییەکانیان نەهێشت. بڕوانە: (الأكراد حتى معاهدة سيفر ١٩٢٠، سایتی: http://www.kdps.info/tarikh). (وەرگێڕ)

(٤) لە چاپە تازەکاندا لە بریی ئەوەی ناو کەوانەکە نووسراوە: (خۆرهەڵاتییەکانی). (وەرگێڕ)

(٥) (سەیید جەمالەددینی ئەفغانی): کەسایەتیی ناوداری خۆرهەڵاتە. داواکاری یەکێتی و شوورای ئیسـلامی بووە. بە زۆربـەی وڵاتـانی ئیسـلامیدا گـەڕاوە و بیروبـاوەڕی خـۆی بـە گـەلان و حکوومەتـەکانی گـەیاندووە. ساڵی (١٨٩٧ز) لە ئەستەبووڵ کۆچی دوایی کردووە. (شێخ محەممەد عـەبدە): (١٨٥٠-١٩٠٥ز) زانایـەکی هەڵکەوتووی میسرە. لە هەڵگرانی هزری سەیید جەمالەددینە. دوورخراوەتەوە بۆ سوریا. پاشان ڕۆشتووە بـۆ پاریس. کە گەڕاوەتەوە بووە بـە مامۆستا لـە ئەزهـەر، پاشان هـەتا کۆچی دوایی موفتیی میسر بـووە. (عـەلی سواعی): (١٨٣٩-١٨٧٨ز) شاعیر و نووسەرێکی شارەزای زانسـتە ئیسلامی و کۆمەڵایەتییەکانە و، نەیاری سیاسەتی عوسمانی و ئیستیبداد بووە. ماوەیەك لە فەرەنسـا ماوەتـەوە. لـە دامەزرێنـەرانی کۆمەڵـەی "تورکیـای لاو"ە. لـە ڕووداوێکـدا کـوژراوە. زانـا (تەحسـین): نـاوی حەسـەن تەحسـین عوسمانـە (١٨١١-١٨٨١ز). خوێندنی لە ئەستەمبووڵ و پاریس تەواو کردووە. کراوە بە سەرۆکی زانکۆی ئەستەمبووڵ. دیوانێکی شیعری

هەروەها "سولتان سەلیم"یش کە وتوویەتی:

(جیاوازی و دووبەرەکی تەنانەت لەناو گۆڕەکەشمدا حەوانەوەم لێ دەسێنێت. چەکمان لە شکاندنی هێرشی دوژمناندا تەنها یەکگرتنە. گەر نەتەوەی ئیسلام یەك نەگرێت، من بە خەفەتەوە دەتلێمەوە). (سولتان سەلیم)

من لە پێناوی دوو ئامانجی مەزندا بە ئاشکرا بانگهێشتی خەڵکیم بۆ ئەم "یەکێتیی محەممەدی"یە دەکرد:

*ئامانجی یەکەم*: پاراستنی ئەو ناوە لەوەی کە بخرێتە ناو سنوورێکەوە و تایبەت بکرێت پێی، بەڵکو ڕاببگەیەنم کە سەرانسەری ئیمانداران دەگرێتەوە، تاکو جیاوازی و دووبەرەکی ڕوو نەدات و، شوبهە و گومانەکانیش ڕووی تێ نەکات.

*ئامانجی دووهەم*: بۆ ئەوەی ببێت بە بەربەستێك لە بەردەم جیابوونەوە و لێکترازانی ئەو حیزب و دەستە و تاقمانەی کە هۆکاری ڕوودانی ئەم گرفتە مەزنە بوون کە ڕابورد[1]، ئەوەش بە هەوڵی یەکخستنیان. کەچی بە داخەوە کات یارمەتیی نەداین و، لافاوەکە هات و منیشی لەگەڵ خۆیدا ڕامالی!

پاشان من دەموت: گەر ئاگرێك بکەوێتەوە، لانی کەم هەوڵی کوژاندنەوەی بەشێکی دەدەم، کەچی تەنانەت بەرگ و پۆشاکە زانستییەکەی خۆیشم سووتا و، بە سوپاسەوە ئەو ناوبانگە درۆینەیەم تیاچوو کە ناتوانم پارێزگاریی لێ بکەم.

جا من، کە جگە لە پیاوێکی ئاسایی زیاتر نیم، کێشەیەکی هێندە گرنگم خستە ئەستۆی خۆم کە وا لە نوێنەران و پیاوماقووڵان و وەزیرەکان بکات بیربکەنەوە. کەواتە تاوانێکم ئەنجام داوە!

---

چاپ نەکراوی جێ هێشتووە. (نامیق کەمال): (١٨٤٠-١٨٨٨ز) ئەدیب و شاعیر و ڕۆژنامەنووسێکی نوێخوازی بەناوبانگی تورکە. یەکێکە لە دامەزرێنەرانی کۆمەڵەی "تورکیای لاو". گەلێ شیعر و ڕۆمانی نووسیوە. باوەڕی بە یەکێتیی ئیسلامی و، شەریعەت بە سەرچاوەی یاسا، بووە.

تێبینی: هەموو یەکێکی ئەو کەسایەتییە ناوبراوانە - وەك هەموو مرۆڤێکی تر - لایەنی ئیجابی و سەلبییان هەبووە. مامۆستا نوورسی وەکو زانایەکی چاکساز و شەریعەتخوازی ئەو دەمە و، بەپێی ئەو دەستوورەی ژیانی: (خُذْ ما صفا، دَعْ ما كَدَر) سوودی لە لایەنە ئیجابییەکانیان وەرگرتووە. (وەرگێڕ)

(١) مەبەست ڕووداوی (٣١)ی مارتە. (وەرگێڕ)

**تاوانی هەشتەم:**

کاتێ بیستم بەشێك لە سەربازەکان پەیوەندییان بە هەندێ "کۆمەڵە"وە کردووە، یەکسەر ڕووداوە ترسناکەکەی "ئینکیشاری"م[١] وەبیرهاتەوە. بۆیە گەلێ نیگەران و پەشێو بووم و، لە ڕۆژنامەیەکدا نووسیم:

(بەرزترین و پیرۆزترین "کۆمەڵە" لەم کاتەی ئێستاماندا کۆمەڵەی سەربازانی ئیمانداره. سەرجەمی ئەو کەسانەی ڕۆشتوونەتە ڕیزی سەربازییەوە، هەر لە سەربازێکی ئاساییەوە تا دەگاتە سەرکردە، هەموویان لەم کۆمەڵەیەدان. چونکە پیرۆزترین ئامانجی خاوێنترین کۆمەڵە لە سەرانسەری جیهاندا بریتییە لە: یەکێتی و برایەتی و گوێڕایەڵی و خۆشەویستی و بەرزکردنەوەی ئاڵای ئیسلام. ئەوەتا سەرجەمی سەربازانی ئیماندار بانگهێشت بۆ ئەم ئامانجە ڕادەگەیەنن. بەڵام سەربازەکان خۆیان مەڵبەندن و، دەبێ سەرجەمی نەتەوە و هەموو کۆمەڵەکانیش پەیوەندی بە سەربازەکانەوە بکەن. چونکە هەموو کۆمەڵەکانی تر تەنها بۆ ئەوەن کە نەتەوە بکەن بە سەرباز لە ڕێبازی خۆشەویستی و برایەتیدا. سەبارەت بە "یەکێتیی محەممەدی"یشەوە، ئەوا هەموو ئیمانداران دەگرێتەوە و، نە کۆمەڵەیە و نە حیزبە. چونکە مەڵبەندەکەی و ڕیزی پێشەوەی: موجاهیدان و شەهیدان و زانایان و ڕابەرەکانن. هیچ ئیماندار و سەربازێکی گیانفیدا نییە - چ ئەفسەر بێت و چ سەرباز - لەم یەکێتییە بەدەر بێت. کەواتە هیچ پێویستییەك نییە بە پەیوەندی کردن بە کۆمەڵەکانی ترەوە. لەگەڵ ئەوەشدا خۆم لە کاروباری هەندێ لەو کۆمەڵە خێرخوازانە هەڵناقورتێنم کە مافی خۆیانە ناوی یەکێتیی محەممەدی بۆ خۆیان دابنێن).

جا من کە جگە لە قوتابییەکی ئاسایی زیاتر نیم، بەم کارەم ئەرکی زانا مەزنەکانم بۆ خۆم قۆرخ کرد. کەواتە تاوانێکم ئەنجام داوە!

**تاوانی نۆهەم:**

بۆ ماوەی چەند خولەکێك ئەو جموجووڵە ترسناکەم لە دوورەوە بینی کە لە (٣١ ی مارت)دا ڕووی دا..

(١) بۆ زانیاری لەسەر "سوپای ئینکیشاری" بڕوانە پەراوێزی لاپەڕە: (٣٣٨)ی ئەم کتێبە. (وەرگێڕ)

گەلێ داواکاریم بەر گوێ کەوت، بەڵام هەروەك ئەگەر حەوت ڕەنگ لە بازنەیەکدا بە خێرایی بخولێنرێنەوە تەنها ڕەنگی سپی دەردەکەوێت، بە هەمان جۆر لە نێوان ئەو داواکاری‌یانەدا تەنها وشەی "شەریعەت" دەرکەوت، کە ئەویش ڕێژەی خراپیی ئەو داواکاری‌یە جۆراوجۆرانە لە هەزارەوە دەهێنێتە خوارەوە بۆ یەك و، عەوامی خەڵکی لە نانەوەی ئاژاوە و پشێوی دەپارێزێت و، بە شێوەیەکی دەراسا سیاسەت لەوە ڕزگار دەکات کە بکرێت بە گەمەی دەستی تاکە کەسەکان.

پاشان هەستم کرد ڕووداوەکە بەخراپی دەشکێتەوە، چونکە گوێڕایەڵی شێواوە و ئامۆژگاری بێ سوودە. دەنا هەڵمەتم دەبرد بۆ کوژاندنەوەی ئەو ئاگرە، وەك ئەوەی کە ئاگرەکانی ترم دەکوژاندەوە. بەڵام کە سەرنجم دا زۆرینەی خەڵکەکە لە توێژی عەوام بوون و، (کوردەکانیشمان)[1] کەسانێکی بێ ئاگا و ساویلکەن و، منیش بە ڕواڵەتی ناوبانگی درۆینەوە دەردەکەوم..

بۆیە دوای سێ خولەك کشامەوە و، ڕۆشتم بۆ (مەقری کۆی)[2] تاکو نەهێڵم هاوەڵانم خۆیانی تێوە بگلێنن و، هەر کەسێکم بینی ئامۆژگاریم کرد خۆی دوور بگرێت.

خۆ ئەگەر هێندەی گەردیلەیەك خۆم تێوە بگلاندایە ئەوا بە جوانی دەردەکەوتم، چونکە بەرگ و پۆشاکەکەم دەرم دەخات و ناوبانگەکەشم[3] لەناوخەڵکدا بڵاوە، بەهۆیەوە دەردەکەوتم. لەوانەیە بوونی خۆمم بەوە دەربخستایە کە - تەنانەت گەر بە تەنیا خۆیشم بوومایە - بەرهەڵستی سوپای بزووتنەکەم تا "ئەیاستافانووس" بکردایە، پاشان بە مردنێکی شەرفمەندی و مەردانە بمردمایە. ئەو کاتەش خۆهەڵقورتاندنم شتێکی بەڵگەنەویست دەبوو، بێ ئەوەی پێویست بە لێکۆڵینەوە بکات!

لە ڕۆژی دووهەمدا پرسیارم لە سەربازە گوێڕایەڵەکان کرد، کە گرێی ژیانی ئێمە دەنوێنن، وتیان: ئەفسەرەکان پۆشاکی سەربازیان پۆشیبوو. کەواتە "گوێڕایەڵی" زۆر نەشێواوە.

---

(١) لە چاپە تازەکاندا لە بریی ئەوەی ناو کەوانەکە نووسراوە: (هاوشاری‌یەکانم). (وەرگێڕ)

(٢) یەکێکە لە گەڕەکەکانی "ئەستەمبوڵ". شایانی باسە لە چاپە تازەکاندا لە بریی "مەقری کۆی" نووسراوە: (باقر کۆی). (وەرگێڕ)

(٣) لەم شوێنەی چاپە تازەکاندا ئەمەش نووسراوە: (کە نامەوێ و پێم خۆش نی‌یە). (وەرگێڕ)

پاشان پرسیم: چەند ئەفسەر پێکراون؟

خەڵەتاندمیان و، وتیان: تەنیا چوار، ئەوانەش لە خۆسەپێنەکان بوون، دواتر ئادابی شەریعەت و سزاکانی جێبەجێ دەکرێن.

پاشان دەستم دایە ڕۆژنامەکان، بینیم کە ئەوانیش ڕووداوەکە بە بزووتنەوەیەکی ڕەوا دەبینن و، لەسەر ئەو شێوەیە وێنەکەی دەکێشن. ئیتر لە ڕوویەکەوە دڵخۆش بووم، چونکە پیرۆزترین ئامانجی من جێبەجێ کردنی تەواوەتیی فەرمانەکانی شەرعە.

بەڵام لە لایەکی ترەوە گەلێ نائومێد بووم و، بە تێکچوونی گوێڕایەڵیی سەربازی ئازارم پێ گەیشت. بۆیە بە زمانی ڕۆژنامەکان گوفتارم ئاراستەی سەربازەکان کرد و، پێم وتن:

ئەی سەربازەکان!

ئەگەر ئەفسەرەکان بە یەك دانە گوناه ستەم لە خۆیان بکەن، ئێوە بە هەڵگەڕانەوە و سەرپێچیتان لە فەرمانەکان، ستەم لە مافی سی ملیۆن هاووڵاتیی دەوڵەتی عوسمانی و سێ سەد ملیۆن موسڵمان دەکەن، چونکە شەرەف و بەختەوەری و ئاڵای یەکێتیی هاووڵاتیانی عوسمانی و سەرجەمی موسڵمانان لە ڕوویەکەوە بەندە بە گوێڕایەڵیتانەوە بۆ فەرمانەکان.

پاشان داواکاریی ئێوە جێبەجێ کردنی شەریعەتە، کەچی بەم سەرپێچییەتان کارێکی پێچەوانەی خواستی شەریعەت ئەنجام دەدەن.

ئافەرین و پیرۆزباییم بۆ بزووتنەوەکەیان و ئازایەتییەکەیان دەربڕی، چونکە ڕۆژنامەکان - کە زمانێکی درۆزنی ڕای گشتین - بزووتنەوەکەی ئەوانی بە "ڕەوا" پیشان دا.

جا بەپێی ئەو هەڵسەنگاندنەی ئەوان، توانیم کاریگەریی ئامۆژگارییەکانم لەواندا بەجێ بهێڵم و، تا ڕادەیەك هەڵگەڕانەوە و سەرپێچییەکەی ئەوان هێور بکەمەوە، دەنا کارەکە ئاسان نەدەبوو.

جا من کە هەر لە ڕاستیدا ڕۆشتبوومە خەستەخانەی شێتانەوە و، نەموت: "چیم لە خەڵکی داوە؟ با خەڵکانی خاوەن ژیری بیری لێ بکەنەوە" ئەوا تاوانێکم ئەنجام داوە!

**تاوانی دەهەم:**

ڕۆژی هەینی هاوڕێ لەگەڵ زانایاندا ڕۆشتم بۆ لای ئەو سەربازانەی کە لە وەزارەتی جەنگدا بوون..

لەوێ بە چەند وتارێکی یەکجار کاریگەر، هەشت تیپی سوپام هێنایەوە ژێر فەرمان و گوێڕایەڵی. ئامۆژگارییەکانیشم پاش ماوەیەك سوودەکانیان دەرکەوت.

وا وێنەی وتارەکەمتان بۆ دەهێنم:

ئەی سەربازە یەکتاپەرستەکان!

شەرەف و کەرامەت و بەختەوەری و هێمای یەکێتیی سێ ملیۆن هاووڵاتیی عوسمانی و سێ سەد ملیۆن موسڵمان - لە ڕوویەکەوە - پەیوەستە بە گوێڕایەڵیتانەوە بۆ فەرماندەکانتان.

گەر ئەو فەرماندانە بە یەك دانە گوناهـ ستەمیان لە خۆیان کردبێت، ئێوە بەم سەرپێچییەتان ستەم لە سێ سەد ملیۆن موسڵمان دەکەن، چونکە بەم کارەتان برایەتیی ئیسلامی دەخەنە مەترسییەوە.

باش بزانن کە ڕێ و شوێنی سەربازان گەلێ مەزنە، چونکە وەکو کارگەیەك وایە. ئەوەتا ئەگەر هەر کارگەیەك چەرخێکی تێکبچێت ئەوا سیستەمی کار لەناو سەرجەمی کارگەکەدا دەشێوێت.

هەرگیز نابێ سەربازەکان وەك تاکە کەس خۆیان لە سیاسەتدا هەڵبقورتێنن. "ئینکیشارییەکان" باشترین بەڵگەن لەسەر ئەمە.

ئێوە داواکاری شەریعەتن، کەچی ڕەفتاری پێچەوانەی شەریعەت دەنوێنن و بە ناشیرینی ناوی دەزڕێنن.

بە شەریعەت و قورئان و فەرمووده و دانست و ئەزموونەکان سەلماوە کە: گوێڕایەڵیی کاربەدەستی دینداری ڕاستڕەوی پابەند بە حەق کارێکی فەرزە. کاربەدەستان و مامۆستایانی ئێوەش ئەفسەرەکانتانن.

جا هەروەك ئەگەر ئەندازیاری لێزان، یان دکتۆری شارەزا، گوناهباری و ڕەفتاری ناڕەوایان لێ بووەشێتەوە، زیان لە پیشەی "پزیشکی" و "ئەندازیاری" نادات، بە هەمان

جۆر ئەفسەرە ڕووناکبیرەکانتان کە شارەزای هونەری جەنگن و کەسانی ئیماندار و خاوەن غیرەت و حەماسەتی ئیسلامین (کە هەریەکەیان بەرامبەر بە هەزارن)[1]، گەر هەندێکیان لە ئەنجامی جموجوولێکی جوزئی‌یەوە کارێکی نارەوای لێ ڕوو بدات، نابێت بکرێت بە بیانوو بۆ سەرپێچی نواندن لە فەرمانەکانیان و، لەم ڕێیەوە ستەم لە هاوولاتیانی دەولەتی عوسمانی و سەرجەمی موسلمانان بکەن..

چونکە سەرپێچی لە فەرمان تەنها یەك دانە تاوان نی‌یە، بەلکو دەستدرێژی‌یە بۆ سەر مافی ملیۆنەها کەس.

دەزانن کە ئالای یەکتایی خوای گەورە[2] لە دەستی ئازایەتیی ئێوەدایە و، هێزی ئەو دەستەش لە گوێڕایەلی و پابەندبووندایە بە سیستەمی سەربازی‌یەوە، چونکە هەزار کەسی گوێڕایەل و ڕێکخراو سەد هەزار کەسی وێل و بەرەلا دەهێنێت.

ئاشکرایە کە سێ ملیۆن عوسمانی لە ماوەی سەد سالدا نەیانتوانی ئەم دوو ئالوگۆڕ(کودەتا)ە خوێناوی‌یە بەرپا بکەن. کەچی ئێوە بە گوێڕایەلیتان ئەنجامتان دا.

زیاد لەوانەش، لەدەستدانی یەك دانە ئەفسەری بە پەرۆش و شارەزا و ڕۆشنبیر، لەدەستدانی ورە و هێزی مەعنەویی خۆتان دەگەیەنێت. چونکە لە ڕۆژگاری ئێستادا پتر ئازایەتیی ئیمانی و عەقلی و زانستی زالە و، هەندێ جار یەك دانە ڕۆشنبیری ناو ئەوان سەد کەسی تری جگە لەوان دەهێنێت..

بیانی‌یەکان تێدەکۆشن بەم ئازایەتی‌یەیان بەسەرتاندا زال ببن. واتە ئازایەتیی سروشتی بە تەنیا خۆی داد نادات.

**بە پوختی:**

من فەرمانەکانی پێغەمبەری مەزنتانﷺ پێ ڕادەگەیەنم، کە:

گوێڕایەلیی کاربەدەستان فەرزە..[3].

بژی سەربازەکان.. بژی مەشرووتیەتی ڕەوا.

---

(١) لە چاپە تازەکاندا ئەوەی ناو کەوانەکە نەنووسراوە. (وەرگێڕ)

(٢) لەم شوێنەی چاپە تازەکاندا ئەمەش نووسراوە: (لەم سەردەمەدا). (وەرگێڕ)

(٣) لەم شوێنەی چاپە تازەکاندا ئەمەش نووسراوە: (کەواتە سەرپێچی لە ئەفسەرەکانتان مەکەن). (وەرگێڕ)

جا من کە ئەم ئەرکە هەرە قورسانەم خستە ئەستۆی خۆم - لە کاتێکدا کە چەندین زانای بەتوانا هەبوون - ئەوا تاوانێکم ئەنجام داوە.

**تاوانی یازدەهەم:**

من بارودۆخی پەرێشانی (کوردەکانی دانیشتووی کوردستانم)[1] بینی و، تێگەیشتم کە ڕوویەکی بەختەوەریی دنیامان بە زانستە نوێکانی ئێستا دێتە دی. زانایانیش یەکێك لە ڕووبارە سازگارەکانی ئەو زانستانە دەبن و، سەرچاوەکەی تریشی بە بێ گومانی، قوتابخانە ئایینی‌یەکان دەبێت، تاکو زانایانی ئایین لەگەڵ زانستە نوێ‌یەکاندا ڕابێن.

جا لەبەر ئەوەی جڵەوی ئیختیاری (کوردەکان)[2] بە دەست زانایانەوەیە، ئەوا ئەم هەستەم هانی دام بێم بۆ ئەستەمبووڵ، چونکە ئەو کاتە پێم وابوو کە بەختەوەری (السعادة) لە "دار السعادة"[3]دا بەدەست دەهێنین!

کەچی بینیم ئیستیبداد - کە ئێستا بە چەند شێوەیەکی جۆراوجۆرە و پتر بەهێزیش بووە - بە گشتی دەدرایە پاڵ[4] سوڵتانی لەسەرکار لابراو..

ئەوەبوو بە چاکەی خۆی لە ڕێی وەزیری ئاسایشەوە مووچەیەکی وەك بەرتیلێك بۆ بێدەنگ کردنم بۆ بڕیمەوە! بەڵام من وەرم نەگرت و، نەمویست و، ناوی میللەتەکەی خۆم لەکەدار نەکرد[5]!

ئیتر بەو کارەم قوربانیم بە "ژیری"ی خۆم دا! بەڵام دەستم لە "ئازادی"م هەڵنەگرت و، سەریشم بۆ ئەو سوڵتانە میهرەبانە دانەنەواند و وازم لە سوود و بەرژەوەندی‌یە کەسی‌یەکانی خۆم هێنا.

---

(١) لە چاپە تازەکاندا لە بریی ئەوەی ناو کەوانەکە نووسراوە: (هۆزەکانی ویلایەتەکانی خۆرهەڵاتم). (وەرگێڕ)

(٢) لە چاپە تازەکاندا لە بریی ئەوەی ناو کەوانەکە نووسراوە: (هاووڵاتیانی ئەو ویلایەتە نیمچە دەشتەکی‌یانە). (وەرگێڕ)

(٣) "دار السعادة: یەکێکە لە ناوەکانی "ئەستەمبووڵ" لەو کاتەدا. (وەرگێڕ)

(٤) لەم شوێنەی چاپە تازەکاندا ئەمەش نووسراوە: (خوالێخۆشبوو). (وەرگێڕ)

(٥) لەم شوێنەی چاپە تازەکاندا ئەمەش نووسراوە: (ئەم ڕەفتارەشم هەڵەیەك بوو! بەڵام ئەو هەڵەیەم بوو بە خێر، چونکە هەڵەی ئەو کەسانەی دەرخست کە نیازی بەدەستهێنانی ماڵی دنیایان بە زانستە ئایینی‌یەکانیان هەیە). (وەرگێڕ)

ئەو مێشوولانەی تر[١] بە "خۆشەویستی" و بـە ویستی خـۆم، نـەك بـە ناچـار کـردن و زۆرەملـێ، دەتوانن هاوڕایی من بۆ خۆیـان دەستەبەر بکـەن. مـن وا سـاڵ و نیوێکـە لـێرە هـەوڵی بڵاوکردنـەوەی زانستەکان دەدەم (لـە کوردستاندا)[٢]. زۆربـەی ئەسـتەمبووڵ ئاگاداری ئەمەن.

جا منی کوڕە حەماڵێکی هەژار، لە خۆم نـەگۆڕام و حاشام لـەوە نـەکرد کـە کـوڕە حـەماڵێکی هـەژارم، هەرچـەندەش هـەل و مەرجـەکانی دنیاشـم بـۆ ڕەخسـا. هـەروەها پەیوەندیەکانی خۆم لەگەڵ دنیادا توندوتۆڵ نەکرد، بەڵکو خۆشەویست تریـن ناوچـەم بە لای دڵمەوە بـەجێ هێشـت، کـە لوتکـەی چیاکـانی (کوردستانە)[٣] و، هـاتم بـۆ ئێرە تـاکو بـۆ بەختـەوەریی نەتەوەکـەم هـەوڵ بـدەم، کـەچی ڕۆشتمە خەستەخانەی شـێتان و بەندیخانەکان و، لە سەردەمی مەشرووتیەتدا گرفتاری ئەشکەنجە و سووکایەتی کرام..

هەموو ئەوانەش لەبەر ئەوەی کە سەرم بـۆ ئـەم چەشنە کاروبارانـە بـەرز کـردەوە. تـا گەیاندمیانە ئەم دادگا ترسناکانە..

کەواتە تاوانێکم ئەنجام داوە!

**نیو تاوان:**

لـە ڕووی چەمـکی پارێزگـاری کردنـی مەڵبـەندی خـەلافەتەوە، کـە لـە ڕاسـتیدا مەڵبەند و چەقە خاڵی موسڵمانانە و شوێنی پەیوەندیيانە و، بۆ ئەوەی ڕێ نەدرێ بـەوەی گرفتاری تیاچوون ببێت..

هەروەها بەو بۆچوونەی کە وامدەزانی سـوڵتانی پێشـوو[٤] ئامادەیـە کارەکـان ڕوون بکاتەوە و لە هەڵە کۆمەڵایەتیەکانی ڕابوردووی پەشیمان ببێتەوە..

هەروەها بەپێی ڕەفتار کردن بە دەستووری: ﴿والصُّلْحُ خَـيْرٌ﴾ تـاکو ڕووداوەکـانی ئێسـتا کـە بـە توندوتیژیيەوە ڕوویـان دا و تـۆوی ئـاشـووب و دووبـەرەکیيان چـاند، سووك و تەنك بکرێنەوە..

---

(١) مەبەستی ئیتیحادیيەکانە. (دانەر)

(٢) لە چاپە تازەکاندا لە بریی ئەوەی ناو کەوانەکە نووسراوە: (لە وڵاتەکەمدا). (وەرگێڕ)

(٣) لە چاپە تازەکاندا لە بریی ئەوەی ناو کەوانەکە نووسراوە: (ویلایەتەکانی خۆرهەڵاتدا). (وەرگێڕ)

(٤) لەم شوێنەی چاپە تازەکاندا ئەمەش نووسراوە: (خوالێخۆشبوو عەبدولحەمید خان). (وەرگێڕ)

لەبەر هەموو ئەمانە، بە زمانی ڕۆژنامەکان بە[1] سوڵتانی پێشووم وت:

(کۆشکی یڵدز کە ئەستێرەیەکی کزی تین لێ بڕاوە، بکە بە زانکۆی زانست، تاکو بە وێنەی ئەستێرەی "کۆ"(ثریا) بەرز ببێتەوە..

لە بریی گەشتیاران و دەرگاوانی دۆزەخ، ڕاستیخوازان و فریشتەی میهرەبانیی تێدا نیشتەجێ بکە، تاکو بە وێنەی بەهەشت خۆش و دڵرفێن بێت..

ئەو سەروەت و سامانانەی ناو کۆشك کە نەتەوە پێشکەشی کردوویت، لە ڕێی دامەزراندنی زانکۆ ئایینی‌یەکانەوە بیانگێڕەوە بۆیان، تاکو ئەو نەزانی‌یە لەناو بەیت کە دەردێکی کوشندەیە و ئەم نەتەوەیە پێوەی گیرۆدەیە..

پڕ بە دڵ متمانەت بە خۆشەویستی و جوامێریی نەتەوەکەت ببێت، چونکە هەر ئەوە کە ویستی پادشایی ئێوە لە ئەستۆ دەگرێت.. پێش ئەوەی دنیا واز لە تۆ بهێنێت تۆ واز لەو بهێنە و.. زەکاتی تەمەنت لە پێناوی تەمەنی داهاتووتدا سەرف بکە. دەبێ لە دوای ئەم تەمەنەت تەنها بیر لەو دواڕۆژت بکەیتەوە.

ئێستا با بەراوردێك لەنێوان ئەم دوانەدا بکەین، تاکو بزانین کامیان باشترە: ئایا کۆشکی یڵدز شوێنی گەمە و گاڵتە بێت، یان زانکۆیەك بۆ پێشکەش کردنی زانستەکان؟ ئایا گەشتیاران تیایدا بگەڕێن، یان زانایان وانەی تێدا بڵێنەوە؟ دەستی بەسەردا بگیرێت، یان ببەخشرێت؟ دەبا کەسانی خاوەن ویژدان لەم کێشەیەدا بڕیار بدەن).

جا منی هەژاری کەمدەست، بەم وتارانەم ئامۆژگاریم پێشکەش بە سوڵتانێکی مەزن کرد. کەواتە نیو تاوانم ئەنجام داوە!

بەڵام نیوەکەی تری تاوانەکە هێشتا کاتی باسکردنی نەهاتووە[2].

بە داخەوە، ئەو کەسانەی کە زیادەڕەوی‌یان پێ خۆشە، لەم ڕووداوەدا بەربەستێکی قایمیان لە بەردەم حەز و ئارەزووەکانی ئەم نەتەوەیەدا دانا کە تاسەمەندە بۆ ئەو

---

(١) لەم شوێنەی چاپە تازەکاندا ئەمەش نووسراوە: (خوالێخۆشبوو). (وەرگێڕ)

(٢) سەیری ئەو باسە بکەن کە لە کۆتایی کۆمەڵە پەیامی "سراج النور"دایە، تاکو بۆخۆتان نیوەی تری تاوانەکە بزانن، کە بیست و هەشت ساڵە دانەر لەسەری سزا دەدرێت. (دانەر)(*)

(*)مەبەست: "تیشکی پێنجەم"ە لە کتێبی (تیشکەکان). (وەرگێڕ)

مەشرووتیەتە ڕەوایەی بەختەوەریی ئێمەی لەخۆ گرتووە و، سەرچاوەی ژیانی کۆمەڵایەتیمانە.. ئەم نەتەوەیەی کە تینووی ئەو چەشنە زانستانەیە و ئەو زانستانەش کە لەگەڵ ئیسلامدا تەبا و گونجاون.

بەڵێ، ئەو زیادەڕەوانە بەربەستێکی قایمیان لە بەردەم ئاواتەکانی ئەم نەتەوەیەدا دانا، بەوەی کە ئامانجە کەسی و ئاژاوەکانیان خستە ناو مەشرووتیەتەوە. جگە لە کردارە ئیلحادییەکانی ڕۆشنبیران و بایەخ نەدانیان بە ئایین..

جا ئەو کەسانەی کە ئەم بەربەستەیان دانا، دەبێ لایبەرن. ئەمەشیان بە ناوی نیشتمانەوە لێ چاوەڕوان دەکەین.

ئەی پاشا و ئەفسەرەکان!

شایەتەکان لەسەر ئەم یازدە تاوان و نیوەم هەزاران کەس دەبن، تەنانەت لەوانەیە نیوەی خەڵکی ئەستەمبووڵ شایەت بن لەسەر هەندێکی.

بەڵام منیش داوای وەڵامدانەوەی یازدە پرسیار و نیو دەکەم. وێڕای ڕازی بوونم بە هەر سزایەك لەسەر تاوانەکانم.

لەگەڵ ئەوەشدا، لە بریی ئەم هەموو خراپکارییانە، تەنیا یەك چاکەم هەیە. کە ئەمەیە:

من نەیاری ئەو لقە خۆسەپێنەی ئێرەی "ئیتتیحاد و تەرەقی" بووم کە شەوقی خەڵکیی نەهێشت و، خۆشحاڵیی لێ زڕاندن و، دەماری دووڕوویی و لایەنگیریی تێدا وورووژاندن و، بوو بە هۆی نانەوەی جیاوازی و پەرتەوازەیی لە نێوان خەڵکیدا و، حیزب و دەستە و تاقمە قەومییەکانی هێنایە گۆڕێ و، بە ڕواڵەت ناوی "مەشرووتیەت"ی لە خۆی نا، بەڵام لە ڕاستیدا "ئیستیبداد"ی ڕاستەقینەی نواند، تەنانەت ناوی ئیتتیحاد و تەرەقیشی چەپەڵ کرد.

هەر کەسەو بیروبۆچوونی خۆی هەیە. منیش لە دەربڕینی هزر و بیری خۆمدا ئازادم.

من پێم وایە کە ئاشتەوایی هەمە لایەنە و لێبوردنی گشتی کارێکی گەلێ پێویستە، تاکو سووکایەتی کردنی خاوەن ئیمتیاز بە کەسانی تر "دوو ڕوویی" لێ پەیدا نەبێت.

بێ ئەوەی نیازم دەربڕینی فەخر و شانازی بێت، دەڵێم:

ئێمەی (کورد)[١] دەخەڵەتێنرێین، بەڵام کەس ناخەڵەتێنین و لە پێناوی ژیانێکدا دانابەزینە ئاستی درۆکردن. چونکە دەزانین کە: "فێڵ لەوەدایە واز لە فێڵ بهێنرێت"!

بەڵام من لەبەر ئەوەی پەیمانم بە مەشرووتیەتی ڕاستەقینە و ڕەوا داوە، گەر ئیستیبدادم بێتە ڕێ - هەر پۆشاکێکی لەبەردا بێت - زللەی تێ دەسرەوێنم، تەنانەت گەر بەرگی مەشرووتیەتیشی پۆشیبێت، یاخود ناوی ئەوی لە خۆی نابێت!

من لەو باوەڕەدام کە دوژمنانی مەشرووتیەت ئەوانەن کە شێوەکەی دەشێوێنن و، بە شتێکی پێچەوانەی "شەریعەت"ی پیشان دەدەن و، بە وێنەی ستەمکارێك دەری دەخەن. بەم کارەیان دوژمنانی "شورا" زیاد دەکەن. لە کاتێکدا کە دەستوورێکی چەسپاو هەیە دەڵێت: "بە گۆڕینی ناو ڕاستی‌یەکان ناگۆڕێن".

ئنجا لەبەر ئەوەی گەورەترین هەڵە ئەوەیە کە مرۆڤ گومانی وابێت خۆی هەڵە ناکات، ئەوا من دان بەم هەڵەیەی خۆمدا دەنێم کە:

ویستم ئامۆژگاریی خەڵکی بکەم، پێش ئەوەی ئامۆژگاریی ئەوان وەربگرم و.. هەوڵی ڕێنمایی کەسانی ترم دا، پێش ئەوەی ڕێنمایی خۆم بکەم! بەم کارەش لە شان و شکۆی "فەرمان بە چاکە"م داگرت و، خستمە ئەو دۆخەی کە هیچ سوودێکی نەبێت.

تاقیکردنەوەکان چەسپاندوویانە کە "سزا" ئەنجامی "گوناهێك"ە. کەچی هەندێ جار "سزا" دەردەچێت لەسەر گوناهێك کە نەکراوە، بەڵام لە بری گوناهێکی تر شێوەی گوناهی لەخۆ گرتووە. جا ئەو کەسە هەرچەندە لەم تاوانە بەری‌یە، بەڵام لەبەر گوناهێکی تری نادیار شایانی ئەو سزایە دەبێت. کەواتە خوای گەورە تووشی گرفتێکی دەکات و دادگەری دەهێنێتە دی و دەیخاتە بەندیخانەوە لەسەر گوناهێکی پەنهان. بەڵام "دادوەر" ستەمی لێ دەکات، چونکە سزای تاوانێکی دەدات کە ئەو کەسە ئەنجامی نەداوە.

---

(١) لە چاپە تازەکاندا لە بریی ئەوەی ناو کەوانەکە نووسراوە: (موسڵمانی ڕاستەقینە). مامۆستا عەبدولقادر یادللی لە پەراوێزی ل (٧٣٤)ی (ئاساری بەدیعیە)دا دەڵێ: لە نوسخەیەکدا نووسراوە: (ئێمە کە موسڵمانی ڕاستەقینەین). (وەرگێڕ)

دەسا ئەی کاربەدەستان!

کەرامەت و سەربەرزی‌یەکم هەبوو دەمویست خزمەتی نەتەوەکەمی پێ بکەم، کەچی ئێوە سووکایەتیتان پێ کرد..

بە بێ حەز و ئارەزووی خۆم ناوبانگێکی درۆینەم هەبوو بە هۆیەوە ئامۆژگاریی عەوامەکانم دەکرد، کەچی ئێوە - بە سوپاسەوە - لەناوتان برد!

ئێستاش تەنها ژیانێکی لاوازم ماوە، لێی بێزارم.. خوا لەناوم بەرێ گەر لە ترسی ئیعدام هەوڵی پاراستنی بدەم.. نامەرد بم گەر بە ڕووی گەشەوە پێشوازی لە مردن نەکەم!

هەر بڕیارێك کە - بە ڕواڵەت - لەسەر من دەربکرێت، بڕیار دەرکردنە - لە ڕووی ویژدانەوە - لەسەر خۆتان.

ئەمەش زیانم پێ ناگەیەنێت، بەڵکو شەرەف و سەربەرزی‌یە بۆم. بەڵام بەو کارەتان زیان بە نەتەوە دەگەیەنن، چونکە کاریگەریی ئامۆژگاری‌یەکانم دەسڕنەوە. جگە لەوەی کە زیان لە خۆشتان دەدەن، لەبەر ئەوەی دەبن بە بەڵگەیەکی بێ گومان بە دەست دوژمنانتانەوە.

ئێوە منتان خستە سەر مەحەك. ئەی ئەوانەی کە پێیان دەڵێن: پیرە خاوێنەکان (واتە حیزبەکان) ئەگەر لەم چەشنە مەحەکانە بدرێن، ئایا چەندیان بە سەلامەتی دەرباز دەبن؟

خۆ ئەگەر مەبەست لە "مەشرووتیەت" ڕەفتاری پێچەوانەی شەریعەت و خۆسەپاندنی کۆمەڵێکی دیاریکراو بێت، ئەوا با هەموو گرۆی جیننی و ئادەمیزاد شایەت بن کە من کۆنەپەرستم[1]!

چونکە هەر یەکێتی‌یەك لەسەر بناغەی درۆ دامەزرابێت، ئەویش هەر درۆیە و.. مەشرووتیەتێك بنچینەکەی بێ کەڵك و کرمۆڵ بێت، خۆیشی بێ کەڵك دەبێت.

---

(١) ئەم وتەیە هاوشێوەی بەیتە شیعرەکەی ئیمامی شافیعی‌یە کە دەفەرموێت:

ان كان رفضاً حبُّ آلِ محمدٍ فليشهدِ الثقلان أني رافضي

بڕوانە: (ديوان الإمام الشافعي ص: ٥٥) جمع و تعليق: محمد عفيف الزعبي، نشر: دار النور، بيروت، ١٩٧١م. (وەرگێڕ)

مەشروتیەتی ڕاستەقینە كە سیفەتی مانەوە و بەردەوامیی هەبێت ئەوەیە كە لەسەر بناغەكانی حەق و ڕاستی و خۆشەویستی بنیات نرابێت، نەك لەسەر بناغەی جیاوازی.

بەوپەڕی داخ و نیگەرانییەوە ئەم بێدارکردنەوەیە دەخەمە ڕوو:

بۆ نموونە:

زانایەكی هەڵەشە سیفەتی "زانست" ڕێی خراپكاریی لێ دەگرێت، بەڵام هەركات باسی زانستەكەی بكرێت لەگەڵیشیدا باسی ئەو خراپەیە بكرێت كە لە ئەنجامی "هەڵەشەیی"یەكەیەوە پەیدا بووە، ئیتر لەمەوە سیفەتی "زانست" بە خراپی ناو ببرێت. ئایا ئەم كارە ئاماژە نییە بۆ دوژمنایەتی كردن لەگەڵ زانستدا؟

بە هەمان جۆر، كاتێ دەستە و پێرەكان (حیزبەكان) بە پێچەوانەی خواستی "شەریعەت"ەوە تۆوی دووبەرەكی و ئاژاوەیان چاند و، یەك ملیۆن گوللە بە هەڕەمەكی تەقێنرا و، سیاسەت و سیستەم كەوتە دەستی كەسانی ئاسایی و، بەرەڵایی و كاری بەربادی هەموو ناوەندەكانی كۆمەڵی گرتەوە.. لەو كاتەدا، جگە لە موعجیزەی "شەریعەت" هیچ شتێكی تر ئەو تۆفانەی هێور نەكردەوە، بە ڕادەیەك كە ئەو زریانە بە بێ ڕشتنی تەنانەت دڵۆپە خوێنێك و بە بێ وەی كۆتایی پێ هات. بەو واتایەی كە ناوی "شەریعەت"ی خاوێن و یەكێتیی محەممەدی كاریگەریی ئەو خراپكارییە ترسناكەیان لە ڕێژەی هەزارەوە هێنایە خوارەوە بۆ یەك..

لە كاتێكدا مەسەلەكە بەم جۆرەیە، كەچی ناوهێنانی ئەو ناوە پیرۆزەی "شەریعەت" لەگەڵ ناوهێنانی ئاشووبگێڕان و كردنی بە قەڵغانێك بۆ ئەوان، لە ڕاستیدا دەستدانە لە خاڵێكی یەكجار مەترسیدار. تەنانەت دەست وەردانە لە جەرگە و كاكڵەی ژیان، بە ڕادەیەكی ئەوتۆ كە هەموو خاوەن ویژدانێكی ساغ لە تاوا تەزووی پێدا دێت و بە داخیەوە سەردەنێتەوە.

ئەو كەسەی كە پێی وایە دەتوانرێت هێشووە ئەستێرەی كۆ(سورەیا) وەك گسك بەكاربهێنرێت، یان دەتوانێ بە فووی دەم بیكوژێنێتەوە، تەنها گەلحۆیی خۆی دەردەخات!

ئەگەر فریشتەیەك لە بەرزایی ئاسمان، بۆ نموونە لەسەر هەسارەی کەیوان(زوحەل) تەرازوویەکی هێندە گەورە بە دەستەوە بگرێت کە هەردوو چیای ئەرارات و سوبحان بکێشێت، ئنجا هێندەی کێشی درهەمێك قورسایی بخرێتە تای چیای ئەراراتەوە، ئەوا کەسانی کورت بین کاتێ دابەزینی تای ئەرارات بۆ زەوی و بەرزبوونەوەی تای سوبحان بۆ ئاسمان دەبینن، دیاردەکە و قورساییەکە دەدەنە پاڵ ئەو کێشە ساکارەی کە هێندەی درهەمێکە.

بە هەمان جۆر، ڕێز و حورمەتی سەربازی و، پەرۆشی و خەم بۆ ئیسلام و شەریعەتی محەممەدی، بە وێنەی ئەو چیا گەردن کەشانەن، هۆکارە دەرەکییەکانیش تەنها کێشی درهەمێکیان هەیە. جا دانانی ئەو هۆکارە بێ نرخانە بە بناغەی کارەکان بەڵگەی نەزانینی نرخی مرۆڤایەتی و ئایینی ئیسلامە و سووکایەتی پێ کردنیانە.

وا من تەنها حەقیقەت دەڵێم و هەرگیز لێی لانادەم، چونکە پلە و پایەی حەق گەلێ بەرزە و، لە پێناوی هیچ کەسێکدا بەختی ناکەم. لەبەر ئەوە، لێرەدا کێ دەڕەنجێ با بڕەنجێت، بەڵام حەق و ڕاستی شتێکی لێ نەیەت:

ئەو تۆفانە ترسناك و زریانە سووتێنەرەی کە ناوی ڕووداوی (٣١ی مارت)ی لێ نراوە، لە ژێر کاریگەریی چەند هۆکارێکی ئاساییدا توانا و لێهاتنێکی سروشتیی ئەوتۆی ئامادە کرد کە ناوی ئەو "شەریعەت"ەی هەمیشە موعجیزەی خۆی دەردەخات، لە لایەن خوای گەورەوە، بەسەر زمانی هەڵسووڕێنەرانی ئەو ڕووداوەدا هێنا، هەرچەندەش ئاکامەکەی پشێوی و ئاڵۆزی بوو.

جا لەبەر ئەوەی ناوی "شەریعەت" ئەو تۆفانەی بەو ئاراستەیەدا برد کە بە بێ وەی تێپەڕ ببێت، ئەوا ئەم ناوە لە بەردەم خوای گەورەدا هەموو ئەو ڕۆژنامانە تاوانبار دەکات کە لە ناوەڕاستی مانگی نیسان بەولاوە زمانی بەدیان درێژ کرد.

خۆ ئەگەر ئەم حەوت هۆکار و بارودۆخەی خوارەوە ڕەچاو بکرێن کە ئەو ڕووداوەیان هێنایە گۆڕێ، ئەوا "ڕاستی" بە ڕوونی دەردەکەوێت:

١ – لە سەدا نەوەدی ئەم بزووتنەوەیە لە دژی ئیتیحاد و تەرەقی و دیکتاتۆریەتیان ئاراستە کرابوو.

٢ – هەروەها ئامانجێکی تری: گۆڕینی ئەو وەزیرانە بوو کە مایەی قسە لەسەر کردنی پیر و حیزبەکان بوون.

٣ – دەرباز کردنی سولتانی ستەم لێکراو لەوەی لەسەر کار لابرێت، کە پێشتر بڕیار و نەخشەی بۆ داڕێژرابوو.

٤ – ڕێ نەدان و کۆتایی هێنان بەو ڕێنمایی و دەرس دادانەی کە لەگەڵ نەریتی سەربازی و ئادابی ئایینیدا یەك ناگرنەوە.

٥ – دۆزینەوەی بکوژی بەڕێز "حەسەن فەهمی"[١] دوای ئەوەی کە بابەتی کوشتنەکەی گەلێ بە گەورە گیرا.

٦ – چارەسەر کردنی بە ویژدانانەی کێشەی ئەفسەرانی "ئەلایلی"[٢] کە لە خزمەتی سەربازی کەنار دران.

٧ – ڕێ گرتن لە گشتاندنی چەمکی "ئازادی" بۆ ڕەفتارە هەرزەکان. واتە: سنووردانانێك بە ئادابەکانی شەرع بۆ واتای "سەربەستی". پاشان جێبەجێ کردنی یاسا و سزاکانی شەرع کە عەوام جگە لە دەست بڕینەوە و تۆڵە سەندنەوە هیچی تری لێ تێنەگەیشتوون.

بەڵام پێشتر زەمینەی بۆ گەن ساز کرابوو، هەروەك پیلان و پێخلیسکە ئامادەکانیش بە ڕادەیەك داڕێژرابوون کە گوێڕایەڵیی یەکجار بەرز و بڵندی سەربازی لەو پێناوەدا کرا بە قوربانی.

بناغەی هەموو بناغەکانی ئەو هۆکارانەش وتووێژی توندوتیژ و لایەنگریی دەستە و پێرەکان بوو، هاودەم لەگەڵ ڕۆچوونی ڕۆژنامەکان لەو گفتوگۆیانەدا کە لە بریی ڕەوانبێژیی گوفتار زیادەڕەویی درۆی تێدا بەکارهاتبوو.

---

(١) حەسەن فەهمی: ڕۆژنامەنووسێکی نەیاری کۆمەڵەی ئیتیحاد و تەرەقی بووە. لەسەر پردی "غەڵەتە سەرای" لە ئەستەمبووڵ لە لایەن ئەو کۆمەڵەیەوە تیرۆر کراوە. ئەم کردارە، بێزاری و ڕقێکی گشتیی لە دژی ئیتیحادییەکان لە ناوەندی خەڵکیدا وروژاند. (وەرگێڕ)

(٢) ئەفسەرانی ئەلایلی: ئەوانە بوون کە لە پێشدا سەربازی ئاسایی بوون و دواتر پلەیان بەرز کرابووەوە، بێ ئەوەی قۆناغەکانی خوێندنی کۆلیجی سەربازییان بڕیبێت. (وەرگێڕ)

جا هەروەك خولاندنەوەی خێرای تەنێکی ڕەنگاوڕەنگ بە خڕی، هەر تەنها ڕەنگی سپی دەردەخات، بە هەمان جۆر لە نێوان ئەم حەوت داواکاری‌یە ناوبراوەدا تەنها ناوی "شەریعەت"ی خاوێن دەرکەوت و، ڕێی لە ڕوودانی خراپکاری‌یەکان گرت.

(هەروەها ئەگەر بیر لەو حەوت پێشەکی‌یە بکرێتەوە، موعجیزەی ناوی پیرۆزی شەریعەت لە هەموو یەکێکیاندا دەبینرێت)[1].

به پوختی:

بە هۆی ئەو وتارە هاندەرانەی کە ڕۆژنامەکان لە ماوەی هەشت نۆ مانگدا بڵاویان کردەوە و.. ناونووس کردنی خۆبەختکاران لە لایەن دەستە و پێڕە جیاجیاکانەوە و.. زاڵبوونی سەرکردەکانی کوودەتاکە و.. تەشەنە کردنی سەربەستیی ڕەها بۆ ناو سەربازەکان بە شێوەیەك کە دژی بنەمای گوێڕایەڵیی سەربازی بێت و.. تەڵقیندانی سەربازەکان لە لایەن کەسانی نابەرپرس و بێ ئامانجەوە بەو شتانەی کە پێیان وابوو دژ و پێچەوانەی ئادابی ئایین بێت..

بەهۆی هەموو ئەمانە، تۆقاندن و بەربادی و هەڕەمەکێتی سەرانسەری ناوەندەکانی گرتەوە.

ئنجا دوای ئەوەی کە شیرازەی گوێڕایەڵی پچڕا، کەسانی خۆسەپێن و دەمارگیرە نەزانەکان و ئەوانەش کە بێ بەشن لە داوەریی ژیری لە ئاییندا، بە گومانی چاکەکاری تۆوی خۆیان لەو زەلکاوە بۆگەنەدا چاند و، سیاسەتی گشتیی دەوڵەت کەوتە دەستی نەفامان و، نزیکەی یەك ملیۆن گوللە بە هەوادا تەقێنرا و، دەستە ناوخۆ و دەرەکی‌یەکانیش خۆیان لە بارودۆخەکەدا هەڵقورتاند.

جا لەو کاتەدا کە چاوەڕێی ئەوە لەو ڕووداوە دەکرا بە شێوەیەکی سروشتی هەرا و هوریا و پشێویی لێ بکەوێتەوە و، بیانی‌یەکان دەست لە کاروباری وڵات وەربدەن، کەچی بە چاودێری و چاکەی خوای گەورە، ناوی "شەریعەت" سەرجەمی ئەو گیانە چەپەڵانەی کە لەو هۆکارە ناوبراوانەوە سەریان هەڵدابوو گەڕاندەوە بۆ ناو هێلانەکانی

(١) ئەوەی ناو کەوانەکە لە چاپە تازەکاندا نی‌یە. (وەرگێڕ)

خۆیـان و، بـەم کـارەش - دوای سـیازدە سـەدە - موعجیزەیـەکی تـری شـەریعەت دەرکەوتەوە!

پاشان ئەو دەنگە دلێر و زوڵاڵەی زانایان و سوپا لەو کوودەتا ڕابوردووە مەزنەدا کە دەیوت: "مەشرووتیەت پاڵی بە شـەریعەتەوە داوە"، بە وێنەی تـەزووی کارەبا ویژدانـی موسڵمانانی ڕاچڵەکاند و، وای لەو کوودەتایە کرد کە یاسای سروشـتیی کوودەتاکـان بـبڕێت و بـازی بەسـەردا بـدات و، کاریگـەریی ئیعجازبەخشـی شـەریعەتی خـاوێن دەربخات..

بە پشتیوانیی خوای گەورە هەمیشە هەر دەریشی دەخات.

من ڕەخنـە لـە بناغـەی ئـەو بیروبۆچوونانـەی ڕۆژنامەکان دەگرم کـە لـە ناوەڕاستی مانگی نیسان بە دواوە سەری هەڵدا.

چونکـە ئـەوان دەلاقـە و پاسـاوێکیان بـۆ ڕەخسـا بـۆ لەدەسـتدانی سـەربەرزی و کەرامـەت و بنـەمای گوێڕایـەڵیی سەربازی، کـە چـەند شتێکن لـە "ژیـان" بـەنرخترن، تەنانەت ژیانیان لە پێناودا بەخت دەکرێت، ئەوەش لە پێناوی چەند کردارێکـی نـاڕەوا و نزمی ئەوتۆدا کـە لای کەسـانی خـاوەن ویـژدان ئـەو کردارانـە بـە "خزمـەتکاری خـودی ژیان" دادەنرێن.

ئنجا ئەو "شەریعەت"ەی کە هەموو ڕاسـتی و حـاڵ و بارودۆخـەکان بـە لایـدا کێـش دەبـن و پەیوەسـتن پێـوەی، ئـەوان لـەو گومانـە هەڵەیـەدا بـوون کـە شـوێنکەوتەی دەسـتەڵاتدارانە و، جڵـەوی بـە دەسـت خەلافەتەوەیـە، یـان ئـامڕازی دەسـتی هـەر سیاسەتێکی ترە..

بەم باوەڕەشیان وایـان پیشـان دا کـە خـۆری درەخشان شـوێنکەوتەی ئەستێرەیەکی گیراوی ڕۆچووی پووکاوە بێت. بەمەش ناڕەواییان کرد[1].

وا من بە هەموو هێزێکم دەڵێم:

بە پێشـکەوتنی ئـەم ئیسـلامە نـەبێت کـە ئـایین و نەتەوەمانـە، هیـچ پێشـکەوتنێك بـە خۆمانـەوە نـابینین و.. بـە دەرکـەوتنی ڕاسـتییەکانی شـەریعەتیش نـەبێت، هیـچ

(١) لەم شوێنەی چاپە تازەکاندا ئەمەش نووسراوە: (و بە هەڵەدا چوون). (وەرگێڕ)

بەرزبوونەوەیەك بەدەست ناهێنین. دەنا هەر کارێکی پێچەوانەی ئەمە واتای ئەو پەندەمان تێدا بەرجەستە دەکات کە دەڵێت: "أضاع المشيتين"[١].

بەڵێ، دەبێ هەست بە شەرەف و سەربەرزیی نەتەوە و، پاداشتی دوارۆژ و ، کاروبار و بەهاکانی کۆمەڵ و، پەرۆشیی ئیسلامی و، خۆشەویستیی نیشتمان و ئایین بکەین. چونکە لە دوو چەندانەکاندا هێزێکی گەورەی لەبن نەهاتوو هەیە.

ئەی ئەفسەر و سەرکردەکان!

داواتان لێ دەکەم لەسەر تاوانەکانم سزام بدەن و، هەر ئێستاش وەڵامی ئەم پرسیارانەی خوارەوەم بدەنەوە[٢]، چونکە ئیسلام مرۆڤایەتیی مەزنە و تەنها شەریعەتی خاوێنیش شارستانێتیی هەرە چاکی نموونەییە. لەبەر ئەوە، جیهانی ئیسلامی شایانی ئەوەیە کە ئەو شارە نموونەییە بێت ئەفلاتوون بیری لێ دەکردەوە:

**پرسیاری یەکەم:**

سزای ئەو کەسە خۆشباوەڕ و ساویلکانە چی‌یە کە بە ڕۆژنامەکان لەخشتە چوون و، ئەو تەوژمە گشتی‌یە ڕایماڵیون کە ئێستا لەو نەریتانەوە پەیدا بووە کە بە ڕەوای دەزانن؟

**پرسیاری دووهەم:**

سزای ئەو کەسە چی‌یە کە لە ڕووی مرۆڤێك دەوەستێتەوە شێوەی ماری لەخۆ گرتووە و، بەرامبەر پیاوچاکێك پۆشاکی کەسێکی خراپکاری پۆشیوە و، دژی مەشرووتیەتێك بەرگی ئیستیبدادی لەبەردایە.. کە لە ڕاستیدا جگە لە مار و خراپکار و خۆسەپێن هیچی تر نین؟

**پرسیاری سێهەم:**

ئایا خۆسەپێن (مستبد) یەك دانە کەس دەبێت، یان دەگونجێ کە چەند کەسێکی زۆر بن؟

---

(١) پەندێکی عەرەبی‌یە. لە واتای ئەو پەندە کوردی‌یەدایە کە دەڵێت: (بوو بە کوردەکەی لە هەردوو جەژن بوو)! واتە هەردوو کیانی لە کیس دەچێت. (وەرگێڕ)

(٢) ئەم پرسیارانە بوونە هۆی ڕزگاربوونی چل تا پەنجا بەندکراوی بێ تاوان. (دانەر)

ئەوەش هەیە کە من پێم وایە دەبێ هێز لە یاسادا بێت، دەنا ئیستیبدادەکە دابەش دەبێت و، لە ڕێی ڕێکخراوەکانەوە زیاتر توندوتۆڵی بەدەست دەهێنێت.

**پرسیاری چوارەم:**

ئەم دوانە کامیان زیانی زیاترە: لەسێدارەدانی بێ تاوانێك، یان لێخۆشبوون لە دە تاوانبار؟

**پرسیاری پێنجەم:**

ئایا گوشار خستنە سەر خاوەن ڕێباز و بیر و هزرەکان، ڕێگاکانی دووڕوویی زیاتر ناکات؟ لە کاتێکدا کە دەزانین ئەم گوشارە دەرەقەتیان نایەت؟

**پرسیاری شەشەم:**

ئایا بە بێ لابردنی "تایبەتمەندییەکان بۆ هەندێ کەس جگە لە هەندێکی تر" دەتوانرێت یەکێتیی نەتەوە بێتە دی، کە کانگای ژیانی کۆمەڵایەتیمانە؟

**پرسیاری حەوتەم:**

شێواندنی "یەکسانی" و تایبەت کردنی بە تەنها چەند کەسێکەوە و، جێبەجێ کردنی یاسا تەنها سەبارەت بەوان، هەرچەند بە ڕواڵەت "دادگەری" دەگەیەنێت، بەڵام لە ڕوویەکی ترەوە نەبوونی "یەکسانی" ستەم و دووڕوویی بەرهەم دەهێنێت. وێڕای ئەوەی کە بێ تاوانیی زۆربەی بەندکراوان بە ئازاد کردنی لە سەدا هەشتایان دەرکەوت و، ئاشکرا بوو کە هیچ تاوانێکیان نەبووە. جا ئەگەر لە گۆشە نیگای زۆرینەوە ئەم حاڵە فەرمانڕەوا بێت، ئایا ڕق و بیری تۆڵەسەندنەوەی لێ ناکەوێتەوە؟

من لێرەدا شتێکم نییە بە دادگای بڵێم، بەڵکو دەبێ هەواڵگرەکان بیری لێ بکەنەوە!

**پرسیاری هەشتەم:**

گەر دەستەیەکی دیاریکراو خۆی بە خاوەن ئیمتیاز دانا بەسەر خەڵکانی تردا و ئەوانی ناچار کرد لە شێوەی نەیاری مەشرووتیەتدا دەربکەون، لەبەر ڕەخنەی زۆری ئەو دەستەیە لێیان و زامدارکردنی هەست و نەستیان.. گەر هەموو خەڵکەکە ڕەخنەیان لەو ئیستیبدادە سەرسەختەی ئەو دەستەیە گرت کە لە ژێر پەردەی مەشرووتیەتدا خۆی شاردووەتەوە، ئایا کێ بە گوناهبار دادەنرێت؟

**پرسیاری نۆهەم:**

ئەگەر باخەوانێك دەرگای باخەکەی بە کراوەیی بەجێ هێشت، بە شێوەیەکی وا کە هەر کەسێ ویستی لێ بێت بڕواتە ناوی، پاشان دەرکەوت دزی لەناو باخەکەدا ڕووی داوە.. ئایا کێ بەرپرسە؟

**پرسیاری دەهەم:**

ئەگەر سەربەستیی بیروبۆچوون و ئازادیی قسە بە خەڵکی درا، پاشان لێپرسینەوە لە کەسێك کرا لەسەر بیر و بۆچوون و گوفتارەکانی، ئایا دەرناکەوێت کە پلانێکی داڕێژراو بووە بۆ پاڵ پێوەنانی ئەو نەتەوە کلۆڵە بەرەو دۆزەخ؟

ئایا ئەوە بە خەیاڵدا نایەت کە ئەگەر ئەمەش نەبوایە هەر بەهانەیەك بۆ هەمان مەبەست دەدۆزرایەوە؟

**پرسیاری یازدەهەم:**

دەبینین هەمووان پەیمان بە "مەشرووتیەت" دەدەن و سوێندی پێ دەخۆن، کەچی ڕەفتارەکانی خودی پەیماندەر دژی ناوەرۆکی مەشرووتیەتە، یان لە کەسانی دژی مەشرووتیەت بێ دەنگە..

ئایا ئەو دیاردەیە پێویستی بە کەفارەتی سوێند نییە؟ ئایا ئیتر نەتەوە بە درۆزن دانانرێت؟ ئایا ئەو ڕای گشتییەی کە دەبێ لەو کاتانەدا خاوێن بێت، بە درۆزن و کەودەن و گەمژە لە قەڵەم نادرێت؟

**بە پوختی:**

ئەو شتەی کە بەسەر بارودۆخی ئێستادا زاڵە ئیستیبداد و خۆسەپاندنێکی توندوتیژە، ئەوەش بە قۆزتنەوەی ئەو نەزانییەی کە بە هەموو لایەکدا بڵاوبووەتەوە. وەك بڵێی "جاسووسی" و "خۆسەپاندن" گیانیان لەگەڵ یەکتردا گۆڕیوەتەوە. وا دەردەکەوێ کە مەبەست لەو ڕووداوە سەندنەوەی "سەربەستی" نەبوو لە سوڵتان عەبدولحەمید، بەڵکو گۆڕینی ئیستیبدادێکی بچووك و لاواز بوو بە ئیستیبدادێکی گەورە و بەهێز! (چونکە کڕین و فرۆشتن بە سەربەستییەوە ناکرێت)[1].

(١) لە چاپە تازەکاندا ئەوەی ناو کەوانەکە نەنووسراوە. (وەرگێڕ)

**نیو پرسیار:**

کەسێکی لاواز و پێست ناسك بە هەموو توانایەکی هەوڵی دوورخستنەوەی مێشوولە و زەردەواڵەکان لەخۆی دەدات، چونکە توانای ئازاری پێوەدانی ئەوانەی نی‌یە..

ئایا کەسێك هەیە تەنانەت گەمژەیەکی نەفام قەناعەت پێ بکات کە ئەو مرۆڤە پێست ناسکە بۆیە ئەو مێشوولە و زەردەواڵانە لە خۆی دوور دەخاتەوە تاکو (هەژدیهایەکی گەورەی نیوە مردوو زیندوو بکاتەوە)[1] و بەسەر خۆیدا زاڵی بکات؟

**نیوەکەی تری پرسیارەکە:**

ڕوخسەت نەدرا..

دەسا ئەی سەرکردە و ئەفسەرەکان!

بە هەموو هێزێکم دەڵێم:

من بە جەختەوە لەسەر هەموو ئەو ڕاستی‌یانە سوورم کە لە ڕۆژنامەکاندا بڵاوم کردوونەتەوە و لە سەرجەم وتارەکانی تریشم. خۆ ئەگەر لە لایەنی "ڕابوردوو" و دادگای چەرخی بەختەوەریی پێغەمبەرەوە ﷺ بە ناوی شەریعەتی دادگەرەوە بانگ بکرێم، هەمان ئەو ڕاستی‌یانە دەخەمەوە ڕوو، هیچ شتێکی لێ ناگۆڕم، مەگەر لەبەرکردنی ئەو بەرگ و پۆشاکەی کە ئەو چەرخە داخوازی دەبێت..

هەروەها گەر لە لایەنی "داهاتوو" و دادگای ژیر و هۆشمەندە ڕەخنەگرەکانی دوای سێ سەد ساڵ بە ناوی مێژووەوە بانگ بکرێم، هەمان ئەم ڕاستی‌یانە بە بێ دەستکاری دەخەمەوە ڕوو، مەگەر نۆژەنکردنەوە و گرتنی هەندێ کەلێن و شوێنی درز بردووی[2].

بەو واتایەی کە "ڕاستی" ناگۆڕێت بە شتی تر. چونکە حەق هەر حەقە. وەك فەرموودە ڕوونی کردووەتەوە:

---

(١) لە چاپە تازەکاندا لە بریی ئەوەی ناو کەوانەکە نووسراوە: (شێرێك بێدار بکاتەوە). (وەرگێڕ)

(٢) لەم شوێنەی چاپە تازەکاندا ئەم پەراوێزە هەیە:

مامۆستا بەدیعوززەمان بە درێژایی ئەم چل و پێنج ساڵە لە هەموو دادگاییە مەترسیدارەکاندا ئەم یازدە تاوان و نیوە و، ئەم یازدە پرسیار و نیوەی بە هەمان شێوە دووپات کردووەتەوە و دەیشیکاتەوە. (بە ناوی قوتابیانی نوورەوە: خەسرەو)

"الحق يعلو ولا يُعلى عليه"[١]..

نەتەوەش بێدارە. تەنانەت گەر بە فرتوفێڵ بخافلێنرێت و بەهەڵەدا ببرێت، ئەوا درێژە ناکێشێت و چاو دەکاتەوە.

ئەو "ئەندێشە"یەش کە وا گومان دەبرێت "ڕاستی" بێت، تەمەنی کورتە. پشت بە خوا ئەو هزر و بیرە لەخشتەبەرانەش لە بەردەم هەڵقوڵانی ڕای گشتیدا پەرتەوازە دەبن و، "ڕاستی" بە درەخشانی و بێگەردی لە مەیدانا دەردەکەوێت.

بس کنم، چون زیرکانرا این بس است بانگ ده کردم اگر در ده کس است[٢]

وێڕای ئەوەی کە:

بارودۆخی ناو زیندانەکەتان ئازاربەخشە و.. ڕۆژگارەکە ترسێنەرە و.. شوێنەکەش ترسناکە و.. بەندکراون بێزارن و.. ڕۆژنامەکان درۆ و دەلەسە هەڵدەبەستن و.. هزر و بیرەکان ئالۆزاون و.. دڵان زویر و خەمبارن و.. ویژدانەکان بە ئازار و نائومێدن و.. کارمەندان ڕەشبینن بە بارودۆخەکە و.. پاسەوانەکانیش مرۆڤ وەڕس دەکەن..

وێڕای هەموو ئەمانە، بارودۆخەکە سەبارەت بە من جێی خۆشحاڵی بوو! چونکە ویژدانم ئازاری نەدام. بەڵکو جۆراوجۆریی گرفتەکان بۆ من وەکو جۆراوجۆریی ئاوازی مۆسیقاکان بوو!

---

(١) کتێبی "كشف الخفاء" بەم جۆرە ڕیوایەتی دەکات: "الإسلام يعلو ولا يُعلى". پاشان دەڵێت: "رواه الدارقطني والروياني عن عائذ بن عمرو المزني رفعه، والطبراني والبيهقي عن معاذ رفعه، وعلقه البخاري في صحيحه. والمشهور على الألسنة زيادة (عليه) آخراً، بل هي رواية أحمد. والمشهور أيضاً على الألسنة: (الحق يعلو ولا يُعلى عليه)... " أهـ. بڕوانە: "كشف الخفاء"ج١ ص١٢٧ الحديث رقم٣٦٢. (وەرگێڕ)

(٢) بەیتە شیعرێکی فارسیی مەولانا جەلالەددینی ڕۆمییە. واتە: (لێرەدا کۆتایی بە قسەکانم دەهێنم، چونکە ئەوەی وتوومە کەسانی هۆشمەند و زیرەك لێی تێدەگەن. بانگی خەڵکی گوندەکەم کردووە، خۆ ئەگەر کەسێکی تێدا بێت دەیبیستێ). بە واتای: (کەسی شارەزا تەنها ئاماژەیەکی بەسە بۆ تێگەیشتن) هەروەها: (ئەو کەسەی کەسە حەرفێکی بەسە)! لەم سەرچاوانەدا لە بریی (بانگی دە) نووسراوە: (بانگی دو). واتە: (دوو جار بانگی گوندەکەم کرد).

بڕوانە: (مثنوی معنوی) تالیف (مولانا محمد جلال الدين بلخى) دفتر چهارم، ص: ٦٥٤، انتشارات علمى، چاپخانه مهارت، تهران، ١٣٧٤ هـ.ش. هەروەها: (شرح جامع مثنوى معنوى) ٧٨١/٤، نووسراوی: (كريم زمانى) انتشارات اطلاعات، تهران، چاپ چهاردهم ١٣٨٧ هـ.ش. (وەرگێڕ)

هەروەها لەم بەندیخانەیەی ئێرەدا ئەو وانەیەم تەواو کرد کە ساڵی پار لە خەستەخانەی شێتان خوێندم[1]. ئەوەبوو لەبەر درێژخایەنیی ماوەی موسیبەتەکە، گەلێ وانەی دوور و درێژ فێر بووم. چونکە ئەو "خەم"ە بێ تاوان و ستەم لێکراوەی کە چێژێکی ڕۆحییە لەم دنیایەدا، سۆز و بەزەیی بە لاوازاندا و، نەفرینی توندوتیژی لە غەدر و ستەم، فێر کردم.

ئومێدێکی گەورەم هەیە کە ئەو داخ و حەسرەت و هەناسە گەرمانەی کە بە وێنەی هەڵم لە دڵە شکاوە بێ تاوانەکانەوە بەرز دەبنەوە، دوایی هەورێکی ڕەحمەت پێکبهێنن، هەر لە ڕاستیشدا ئەو هەورانە دەستیان بە پێکهێنانی چەند دەوڵەتێکی ئیسلامیی نوێ کردووە لە سەرانسەری جیهانی ئیسلامیدا.

*(لە درێژەی وتەکانمدا قسەیەکی خۆشتان بۆ دەکەم" مەبەستیشم لەوەی کە لەم کاتە جیلدییەدا قسەی خۆشتان بۆ دەکەم ئاماژەدانمە بەوەی کە من وەکو یاریگایەك دەڕوانمە دنیا و، کاروبارەکانیشی -لە خۆیاندا - هەر لە یاریی شەترنج دەچن" :*

*من ساڵی پار غەریبوززەمان بووم.. دواتر بووم بە بەدیعوززەمان.. ئێستاش بوومەتە بیدعەتوززەمان!! من کەسێکی شووم بووم بۆ ئەستەمبووڵ و، ئەویش بۆ من شووم بوو! ئەوەتا لەسەر ڕووی خۆی وەرم ناگرێت و دەیەوێ بمخاتە ناوەوەی! بە تایبەتی مانگی مارت و مایس دوو مانگی خۆسەپێنن..*

*پێویستە مانگی "مارت" لە نێوان مانگەکاندا بکرێتە دەرەوە و، "مایس"یش خانەنشین بکرێت، تاکو هاوسەنگی بێتەدی، چونکە هەردووکیان ئاماژەن بۆ ڕێگایەکی داخراو.*

*بە پوختی:*

*یان ئەوەیە من لە ئەستەمبووڵ دەمێنمەوە، یان ئەم دوو مانگە. خۆ ئەگەر ئەوان نەڕۆن، ئەوا من دەڕۆم و ماڵئاوایی دەکەم!*

---

(١) لەم شوێنەی چاپە تازەکاندا ئەم پەراوێزە هەیە:
ئەو وانەیەی کە بەرێز جەنابی مامۆستا بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی چل و پێنج ساڵ پێش ئێستا لەو دادگا ستەمکارەدا خوێندی کە لە حوکمی خەستەخانەی شێتاندا بوو، لەم قوتابخانە بێ بەزەییەی ئێستادا ئیمتیحانەکەی دا و، بەم جۆرە دوو بڕوانامەی وەرگرت. (نەزیف، خەسرەو)

## *ماڵئاوایی لە ئەستەمبووڵ*

*ئەی ئەستەمبووڵی گەورە و فراوان!*

*"سەردەمی ئیستیبداد" لەناو تۆدا برایەتی و یەکسانیم تەنها لە خەستەخانەی شێتاندا بینی و.. لە "سەردەمی مەشرووتیەت"یشدا تەنها لە بەندیخانە!*

*ماڵئاوا ئەی ئەو پیرەژنە چرچەی کە جلی بووکێنیی پۆشیوە! بێزار بووم لێت! تۆ لە هەنگوینی ژەهراوی دەچیت، یان وەکو کەسێکی کێوی و دەشتەکی وایت کە بەرگی شارستانیی پۆشیبێت. لە ڕواڵەتدا چەندە شارستانیت لە ناوەرۆکدا هێندە دووڕوویی و هەرزەیی و ڕق و وەحشیگەریت لەخۆدا هەڵگرتووە؛ هەر تەواو لە دنیا دەچیت! منیش پەشیمانم لە هاتنەدنیام. هەرکات لە زەینی خۆمدا تۆ دەهێنمەوە پێش چاوم، وشەی "ڕیاکاری"م بیر دەکەوێتەوە)*[1]!

جا ئەگەر شارستانێتیی ئێستا زەوی‌یەکی ئاوا بەپیت بێت بۆ گەشە پێکردنی ئەم ڕەفتارانەی کە دەستدرێژین بۆ سەر ڕێز و حورمەتی مرۆڤ و.. ئەم بوختان و درۆیانە بێت کە ئاکامەکەی دووڕوویییە و.. ئەم بیر و بۆچوونانە بێت کە پەرە بە ڕق و تۆڵە دەدات و.. ئەو فرتوفێڵە شەیتانانە بێت کە خەڵکی بە هەڵەدا دەبەن و.. بریتی بێت لە دەست داشۆردن لە دابە ئایینی‌یەکان..

ئەوا با هەمووان شایەت بن کە من لوتکەی چیا گەردنکەشەکانی (کوردستان)[2] و ژیانی گوندنشینیم لەناو چیاکانی وڵاتەکەمدا[3] کە ئازادی و سەربەستیی ڕەهای تێدایە، گەلێ پێ خۆشترە لەو نیشتمانی نیفاقەی کە جێی مار و دووپشکەکانە و ناوی "شارستانێتی"تان لێ ناوە! هەر یەك لە سەربەستیی بیر و ڕا و، ئازادیی قسە و، نیازپاکی و، دڵساغی، کە (لێرەدا)[4] نەمبینین، بە هەموو واتاکانیانەوە بەسەر چیاکانی (کوردستاندا)[5] زاڵ و فەرمانڕەوان!

---

(١) ئەم بڕگانەی لاپەڕەی پێشوو هەتا ئێرە کە لەناو کەوانەکەدا بە لاری نووسراون، هی چاپە کۆنەکانە، لە چاپە تازەکاندا نی‌یە. (وەرگێڕ)

(٢) لە چاپە تازەکاندا لە بریی ئەوەی ناو کەوانەکە نووسراوە: (ویلایەتەکانی خۆرهەڵات). (وەرگێڕ)

(٣) لێرەی چاپە تازەکاندا ئەمەش نووسراوە: (و لە ژێر دەواری کۆچەری و نەخوێندەواریدا). (وەرگێڕ)

(٤) لە چاپە تازەکاندا لە بریی ئەوەی ناو کەوانەکە نووسراوە: (لەم مەدەنییەتە بێ مێمەدا). (وەرگێڕ)

(٥) لە چاپە تازەکاندا لە بریی ئەوەی ناو کەوانەکە نووسراوە: (خۆرهەڵاتی ئەنادۆڵدا). (وەرگێڕ)

بەپێی زانیاری‌یەکانم "ئەدیبەکان" بە ئەدەبن (و پەروەردەی بیری خەڵکی دەکەن)[١]! کەچی دەبینم هەندێ لە ئەدیبەکان لـە ئـەدەب بێ بەشـن و لـە ڕۆژنامـەکاندا دووڕوویـی بڵاو دەکەنەوە..

جا ئەگەر "ئەدەب" بریتی بێت لەمە و، بیر و ڕا گشتی‌یەکان تـا ئـەم ڕادەیـە تێکـەڵ و پێکەڵ بن، ئەوا ئێوە بە شایەت بن کە وازم لەم ئەدەبە هێناوە و تیایدا بەشدار نیـم. بـەڵکو دەچم لەسەر لوتکەی چیا بەرزەکانی (کوردستان)[٢]، لەسەر دوندی چیای "باشید" لـە بریـی خوێندنـەوەی ئـەو ڕۆژنامانـە، تـەن و قـەبارەکانی ئاسمـان و تـابلۆ ڕەنگـین و ڕووناکەکانی دەخوێنمەوە.

جیهـانی فـەیزی ئێمـە پـاکـە لـەو عـەیبـی تـەمەننایە
ئـەزەل بـڕیاری بەرزیی دام بـەسـەر چی زێڕی دنیایە
لـە چێژی نۆشـی ئـاوات و درێـژ هیـوایـی بێـزارم
کە مەجنوونم بەڵام "وازهێنەر"م لەو وەصلی لەیلایە[٣]

* * *

ولولا تكاليفُ العــلا ومقاصــدٌ عوالٍ وأعقابُ الأحــاديثِ في غدِ
لأعطيتُ نفسي في التخلي مرادَها وذاكَ مُرادي مُذْ نشأتُ ومقصَدي[٤]

* * *

---

(١) چاپە تازەکاندا ئەوەی ناو کەوانەکە نەنووسراوە. (وەرگێڕ)

(٢) لە چاپە تازەکاندا لە بریی ئەوەی ناو کەوانەکە نووسراوە: (نیشتمانەکەم). (وەرگێڕ)

(٣) شیعرێکی تورکی‌یە، کردمان بە کوردی. دەقەکەی خۆی بەم جۆرەیە:
معرادر فضای فیضمز شین تمنادن
بزە داد أزلدر زیردن بالادن استغنا
چکیلدك نشوەء أمیددن طول أمللردن
او مجنونز کە ایتدك وصلت لیلادن استغنا
بە دڵنیایی ناوی شاعیرەکەم دەست نەکەوت. (وەرگێڕ)

(٤) واتە: ئەگەر لەبەر ئەرکەکانی سەربەرزی و، ئامانجە بڵندەکان و، قسەڵۆکی ئایندە نەبوایە، وازم لە هەموو شتێك دەهێنا و ئەو ئامانجەی دەروونی خۆم دەهێنایەدی کە لەو کاتەوە پێگەیشتووم ئاواتمە.
ئەم دوو بەیتە هی "حسەینی کوڕی عەلیی کوڕی محەممەدی توغرائی"یە. بەڵام لە دیوانەکەیدا لە بریی: (مقاصدٌ عوالٍ) نووسراوە: (مغارمٌ ثقالٌ). بڕوانە: (دیوان الطغرائي، ص: ٥٦ ط١ استانبول ١٣٠٠ هـ). (وەرگێڕ)

وأكتمُ أشــياءَ ولو شئتُ قلتُها ولو قلتُهــا لم أُبقِ للصلحِ مَوْضِعا[1]

**بێدارکردنەوەیەك:**

وازهێنانم لە شارستانێتی ئێوە سەرسام دەکات!

بەڵێ، من ژیانی دەشتەکێتیم گەلێ پێ باشترە لەم شارستانێتی‌یەی کە ئاوێتەی ئیستیبداد و هەرزەیی و زەلیلی‌یە. چونکە ئەم شارستانێتی‌یە خەڵکی دەکات بە هەژار و هەرزە و بەدڕەوشت..

بەڵام شارستانێتیی ڕاستەقینە بۆ بەرەو پێش چوونی ڕەگەزی مرۆڤ تێدەکۆشێت و بەرەو تەواوکاری هانی دەدات. هەروەك کاکڵە و جەوهەری مرۆڤایەتی لە قۆناغی لەکارخراوی و نادیاری دەردەهێنێت و دەیخاتە کار و بەرجەستەی دەکات. لەبەر ئەوە، لەم گۆشەیەوە نەویستنی شارستانێتی، نەویستنی مرۆڤایەتی‌یە.

هۆی شەیدا بوونم بە "واتا"ی مەشرووتیەت، ئەوەیە کە لەو باوەڕەدام یەکەم دەروازەی پێشکەوتنی ئاسیا و جیهانی ئیسلامی لە ئایندەدا بریتی‌یە لە "مەشرووتیەت"ێك کە ڕەوا بێت و، "سەربەستی"یەك کە لە چوارچێوەی شەریعەتدا بێت..

کلیلی بەختەوەری و پێشکەوتنی موسڵمانانیش لەو "شورا"یەدایە کە "مەشرووتیەت" لە خۆی دەگرێت. چونکە - تا ئێستا - (سێ سەد)[2] ملیۆن موسڵمان لە ژێر پێی ئیستیبدادی مەعنەویی بیانی‌یەکاندا پلیشاونەتەوە.

جا لەبەر ئەوەی ئێستا فەرمانڕەوایەتیی ئیسلام لە جیهاندا - بە تایبەت لەمەودوا لە ئاسیادا - زاڵە، ئەوا هەموو موسڵمانێك بەشێکی ڕاستەقینەی لەو فەرمانڕەوایەتی‌یەدا هەیە. هەروەها ڕێگا چارەی ڕزگار کردنی (سێ سەد)[3] ملیۆن موسڵمان لە دیلی،

---

(١) واتە: من هەندێ شت نادرکێنم، هەرچەندەش گەر ئارەزووم لە وتنیان بێت دەیانڵێم، بەڵام بە درکاندن و وتنیان هیچ بوارێك بۆ ئاشتی و ڕێککەوتن ناهێڵمەوە. تێبینی: دوای گەڕانێکی زۆر، سەرچاوەی ئەم بەیتەم دەست نەکەوت. (وەرگێڕ)

(٢) لە چاپە تازەکاندا لە بریی ئەوەی ناو کەوانەکە نووسراوە: (سێ‌سەد و حەفتا). (وەرگێڕ)

(٣) لە چاپە تازەکاندا لە بریی ئەوەی ناو کەوانەکە نووسراوە: (سێ‌سەد و حەفتا). (وەرگێڕ)

تەنها "سەربەستی"یە. خۆ ئەگەر بە گریمانی مەحالێش لە کاتی دامەزراندن و سەقامگیرکردنی "سەربەستی"دا بیست ملیۆن کەس زیانیان پێ بگات، ئەوا با ئەو زیانە ببێت بە قوربانیی ئەو ئامانجە، چونکە بیست دەبەخشین و سێ سەد وەردەگرین.

بە داخەوە کە ڕەگەز و نەتەوەکانی لای ئێمە بە وێنەی بەشەکانی هەوا لەگەڵ یەکدا تێکەڵ بوون و هێشتا وەکو بەشەکانی ئاو ئاوێتەی یەکتری نەبوون. لەمەولا ئەم ڕەگەز و نەتەوانە، بەهۆی ئایینی ئیسلامەوە، بە تەواوی تێکەڵی یەکتر دەبن، کە ئایینێکە بە وێنەی تەزووی کارەبا کاریان تێدەکات. پشت بە خوای گەورە ئاوێتەی ئەو دادگەرییە بەویژدانەی کە لە گەرمی و تینی نووری زانستە ئیسلامییەکانەوە سەری هەڵداوە، دێتە کایەوە.

دەسا هەر بژی "مەشرووتیەتی ڕەوا".. ئەو "سەربەستی"یە ڕووناکەش هەر بەردەوام بێت کە ڕێنمایی لە پەروەردەی ڕاستیی شەریعەت وەردەگرێت[1].

غەریبوززەمانی ئیستیبداد
بەدیعوززەمانی مەشرووتیەت
بیدعەتوززەمانی ئێستا:
سەعیدی (کوردی)[2]

* * *

(١) تا ئێستا ئەم ئومێد و هیوا سیاسییانەت مایەپووچ دەرچوون. بە پشتیوانیی خوا لە داهاتوودا بە شێوەیەکی تر دەردەکەون. (دانەر) (*)

(*) تێبینی: ئەم پەراوێزەی دانەر، کە تیایدا لەگەڵ خۆی دەدوێ، هی چاپە کۆنەکانە. (وەرگێڕ)

(٢) لە چاپە تازەکاندا لە بریی ئەوەی ناو کەوانەکە نووسراوە: (نوورسی). (وەرگێڕ)

## خەباتی سەعیدی کوردی لە دەوری ئیستیبدادا(1)

### بەسەرهاتی نێوان من و پزیشك لە نەخۆشخانەدا:

ئەی پزیشکی بەڕێز!

من دەدوێم و، تۆش گوێم لێ ڕابگرە..

وا بەڵگەیەکی ترت دەدەمێ لەسەر شێتی‌یەکەم! ئەویش وەڵامدانەوەی خەڵکە، بێ ئەوەی پرسیارم لێ کرابێت!

بێ‌گومان ئێوە حەز لە بیستنی گوفتاری شێتێکی نامۆ دەکەن!

من داواکارم لە شێوەی داوەری‌یەکی ژێریدا پشکنینم بۆ ئەنجام بدەن، با ویژدانیشت لەمەدا حەکەم بێت.

دیارە وتنەوەی وانەیەك لە زانستی پزیشکیدا بە پزیشکێك کارێکی بێهوودەیە، بەڵام دەبێ نەخۆش لە دەستنیشان کردنی نەخۆشی‌یەکەیدا یارمەتیی پزیشکەکەی بدات.

---

(1) لە چاپە تازەکاندا سەرتاسەری ئەم باسە نی‌یە. ئێمە لەم سەرچاوانەوە وەرمان گێڕا:

1 – سيرة ذاتية، بديع الزمان سعيد النورسي، إعداد وترجمة: إحسان قاسم الصالحي. ص: ٦٩-٧٤. ط١. دار سوزلر، استانبول، ١٤١٩هـ/ ١٩٩٨م.

2 – ڕۆژنامەی تەعاون و تەرەقیی کورد: (کرد تعاون وترقی غزتەسی) ژمارە (٥) لاپەڕە (٣٦-٣٨).

3– چاپی یەکەمی کتێبەکە بە تورکی: (ایکی مکتب مصیبتلك شهادتنامەسی، یاخود دیوان حرب عرفي وسعید کردی) ١٣١٧ ڕۆمی / ١٩١١ز.

4– آثار بديعية. چاپی دووهەم: ص ٧٤٩-٧٥٥ کۆکردنەوە و لێکۆڵینەوەی مامۆستا عەبدولقادر بادللی. نوسخەیەکی پاکژکراو بە دەستی خودی مامۆستا عەبدولقادر کە خۆی بۆی ناردم،ماڵی ئاوەدان بێت.

5 – وێنەی دەسنووسێکی وەرگێڕانی عەرەبیی (شوکری ئەسلان) بۆ پەیامەکە.

6 – دەسنووسێکی وەرگێڕانی (ئاساری بەدیعییە) بۆ کرمانجیی ژووروو لە لایەن سەیدا مەلا ئیبراهیم خەلیلی ئامەدی‌یەوە. (وەرگێڕ)

هەروەها بە پێویستی دەزانم کە بە باشی گوێ بیستم بن، تاکو ئاینده بە درۆتان نەخاتەوە..

کەواتە بە بایەخ پێدانەوە سەرنج لەم چوار خاڵە بدەن:

(ئەمە وێنەیەکی هەندێ لەو ڕوونکردنەوانەیە کە دوایی لە نەخۆشخانەدا پێشکەشم کردن):

*یەکەمیان*:

من لە چیاکانی کوردستاندا گەورە بووم. کەواتە ئەو حاڵەتانەی من کە ئێوە پەسەندی ناکەن و بە قەبەی دەزانن، دەبێ بە تەرازووی کوردستان هەڵبسەنگێنن، نەك بە تەرازووی هەستیار و شارستانیی "ئەستەمبووڵ"..

خۆ ئەگەر بە تەرازووی ئەستەمبووڵ هەڵیان بسەنگێنن، ئەوا بەربەستێکی ئەوتۆ لەبەر دەممماندا دادەنێن کە ڕێی سەرچاوەی بەختەوەریی دوارۆژمان لێ دەگرن و، دەبێ ئەو کاتە زۆربەی کوردەکان بەرەو خەستەخانەی شێتان بەڕێ بخەن!

چونکە ئەو ڕەوشتانەی کە بەلای خەڵکی کوردستانەوە پەسەند و جوانن، بریتین لە: جەسارەت و، عیززەتی نەفس و، دین قایمی و، یەکبوونی دڵ و زمان..

کەچی ئەو شتەی لە شارستانێتیدا پێی دەڵێن نەزاکەت و نەرمونیانی، بەلای ئەوانەوە ڕیا و دووڕوویییە!

*دووهەمیان*:

خوو و ڕەفتارەکانم - بە وێنەی بەرگ و پۆشاکم - پێچەوانەی خەڵکییە. کەواتە سەرنجی خۆتان ئاراستەی واقیع و ڕاستی بکەن و، ئەو نەریت و باوە خراپانە مەکەن بە تەرازوو بۆ پێوانەی شتانێ کە ڕۆژگار برەوی پێ داون و بوونەتە نموونەی سەرمەشق بۆ خەڵکی..

من موسڵمانم و، لەم ڕووەوە ئەرکی سەرشانمە کە وەفادار و پابەند بم بە ئایینەکەمەوە..

کەواتە دەبێ بیر لەو شتانە بکەمەوە سوودی نەتەوە و ئایین و دەوڵەتیان تێدایە و، ئەو قسە بێ گیان و مردووە نەڵێمەوە کە خەڵکی دەیڵێن:

(من چیم لەمە داوە، با خەڵكانی تر بیری لـێ بكەنەوە)!

*سێ‌هەمیان*:

زووتر گەلـێ كەسی "دەگمەن" هاتوون و ڕۆشتوون لەوانەی كـە هەریەكـەیان پێش كات و زەمانی خۆیان كەوتبوون..

خەڵكی ئەو سەردەمانە یەكەم جار هەڵسوكەوت و ڕەفتاری ئـەوانیان بـە شـێتی و بـێ سەرەوبەرە دەدایە قەڵەم، پاشان بە سیحر و شتی نائاسایی..

دیارە دژایەتیی نێوان خـاڵی یەكـەم و دووهـەم ئاماژەیـە بـۆ دژایـەتیی نێـوان ئیددیعا و بەڵگەكانی ئەوانەی كە بڕیاری "شێتی"یان بۆ دەركردووم. چونكە بـە كـردەوە و زمـانی حاڵ وتبوویان:

"ئـەم كەسـە شـێتە؛ چونكـە وەڵامــی هــەموو پرسـیارێك دەداتـەوە و گشــت گــرێ كوێرەیەكیش دەكاتەوە"!

خۆ بێ گومان ئەو كەسە شێتە كە ئەم بەڵگەیە دەهێنێتەوە!

*چوارەمیان*:

هەر كەسێك خاوەنی میزاجێكی تووڕەی - بە تایبەت - وەك مـیزاجی مـن بێـت، بـێ هیچ گومانێك دەبێ كەسێكی تووڕە بێت! چونكە ئەو كەسـەی كـە مـاوەی پـازدە سـاڵە بیرێكی بەرزی - واتە سەربەستیی شەرعی - لـەگەڵ خۆیدا هەڵگرتووە و، نزیـك بـوو بـە چاو ببینێت هاتبێتە دی، كەچی لەم كاتەدا خـۆی لـە مەترسیدا ببینێتـەوە و، خـەریك بـێ تیابچێت و، بەهۆی ڕوودانی ئاڵوگۆڕێكی مەزنەوە لە بینینی ئاواتەكەی بێ بەش ببێت.. كەسێكی وا چۆن تووڕە نابێت؟!

پاشان وەزیری ئاسایش گەلــێ لـە مـن شـێت ترە، چونكـە لـەچاو مـن تووڕەترە! لـە كاتێكدا كە مەگەر یەك لە هەزاری خـەڵكی، دەنـا كـەس لـەم شـێتی‌یە كاتی‌یـە ڕزگـاری نابێت:

فكلُّ الناسِ مجنـــــونٌ ولكن    على قَدْرِ الهوى اختلفَ الجنونُ!

جا ئەگـەر ماستاوچێتی و مـەرایی و لاڵانـەوەی پشیلەئاسـا و كلكەلـەقێی سـەگانە و بەختكردنی بەرژەوەندی گشتی لە پێناوی بەرژەوەندیی تایبەتیدا، بە "ژیـری" دابـنرێت..

ئەوا ئێوە شـایەت بن کە مـن دەسـت لـەم جۆرە "ژیـری"یـە هـەڵدەگرم و، شـانازی بـەو شێتییەوە دەکەم کە بە ڕای من وەك پلەیەك وایە لە پلەکانی بێ تاوانی.

ئنجا "چوار خاڵ"یش هەن کە گومان و دوودڵییان سەبارەت بـە مـن ورووژانـدووە. لە کاتێکدا کە من لـەسەر بناغەی زانین و لـەبەر هەندێ حیکمەتی پەنهان ئەنجامم داون.

○ **یەکەمیان:** شکڵ و شێوە نامۆکەمە.

من بەم بەرگ و پۆشاکانەم کە لە هی خەڵکی ناچێت، ڕایدەگەیەنم کە هیچ نیـازێکم بە ئامانجە دنیاییەکان نییە و.. بەهانە دەهێنمەوە بۆ گوێ نەدانم بەو عادەتانـەی کە لـەناو خـەڵکی ئـەم وڵاتـەدا پیـادە دەکرێـن و، دەری دەخـەم کـە خـوو و ڕەفتارەکـانم وەك هـی خـەڵکی نین و، ئـەوەش دەخـەمـە پێـش چـاو کـە مرۆڤایەتییەکەم بریتییـە لـە یـەکبوونی ناوەوە و ڕواڵەتی دەرەوەم.. هەروەها خۆشویستنی میللەتەکەم بەمە دەردەخەم..

پاشان "واتای نامۆ" بـۆ ئـەوەی سـەرنج ڕابکێشێت دەبێ لـەناو "وشـەیەکی نـامۆ"دا بێت.. ئنجا لە ڕێـی ئـەم شێوە نامۆیەمـەوە بـە ڕەفتـار و کـردار ئامۆژگـاری پێـش چـاوی خـەڵکی دەخەم کە هاندەری بەرهـەمی نـاوخۆیی بـن و بـرەوی پێ بـدەن.. هـەروەها ئـەو شێوەیەم ئاماژەیە بۆ ئەو مەیلی نوێ بوونەوەیەی کە لە زاتی خۆمدا هەستی پێ دەکەم، لە هەمان کاتیشـدا ئاماژەیـە بـۆ تازەبوونـەوەی زەمـان و ڕۆژگـار.. هـەروەها مـن پـەیامم بـە سوڵتان سەلیم داوە.

○ **دووهەمیان:** مونازەرە کردنمە لەگەڵ زانایاندا.

هۆکـاری ئەمـە بریتـی بـوو لـەوەی کـە کاتێ هـاتم بـۆ ئەسـتەمبووڵ بینیـم قوتابخانـە ئایینییەکان، بە وێنەی بوارەکانی تری ژیان، لە وڵاتـدا پێـش نەکـەوتوون. هـۆی ئەمـەش دەگەڕێتـەوە بـۆ ئـەوەی کـە ئـەو کتێـب خوێندنـەی ئامادەکارییـە بـۆ هـەڵێنجانی مەسەلەکان، خراوەتە جێی "مەلەکەی زانست"[١].

ئنجا لە ئەنجامی نەبوونی مونازەرەی زانستی و پرسیار و وەڵام لـە نێـوان قوتابییـاندا، هەندێ حاڵەتی وەك پشتگوێ خستنی خوێندن و، نـەمانی شـەوق و، لاوازیـی "مەلەکـە" لەناویاندا سەری هەڵداوە.

---

(١) "مەلەکە": بۆ واتاکەی بڕوانە پەراوێزی لاپەڕە (٢٤١)ی ئەم کتێبە. (وەرگێڕ)

دەبێ بزانین کە "زانستە خواییەکان" بە وێنەی زانستەکانی تر بەدەست ناهێنرێن، چونکە خۆیان لە خۆیاندا مەبەست و جێی ئامانجن و، لەزەتێکی ڕاستەقینە بەرهەم دەهێنن. کەواتە نە وەکو زانستە گەردوونییەکانن – کە سەرسامی و سەرسووڕمان دەورووژێنن – نە وەکو ئەو زانستانەشن کە بۆ گاڵتە و گەپ بەکاردێن و کاتیان پێ بەسەر دەبرێت..

لەبەر ئەوە، فێربوون و دەستخستنیان پێویستی بە هیممەتێکی بەرز، یان ڕۆچوونێکی تەواوەتی، یان هاندەرێکی شەوق بزوێن و دەرەکی هەیە کە بە وێنەی پرسیار و وەڵام پێشبڕکێ بەرهەم بهێنێت، یان دەبێ بەپێی جێبەجێ کردنی دەستووری "کار دابەش کردن" هەر یەك لە قوتابیان بە گوێرەی توانای خۆی لە هەندێ زانستدا ڕۆبچێت، تاکو تیایدا ببێت بە پسپۆڕ و زانینەکەی ڕووکەش و سەرپێیی نەبێت. چونکە هەموو یەکێك لەو زانستانە "وێنەیەکی ڕاستەقینە"ی خۆی هەیە، جا هەرکاتێ مرۆڤ "مەلەکە"ی نەما زانستەکەشی وەکو وێنەیەکی ناتەواو دەردەچێت..

چارەسەری ئەمەش بەوە دەبێ کە هەموو قوتابییەکی لێهاتووی بەتوانا یەکێك لە زانستەکان بکات بە بەردی بناغەی زانستەکانی خۆی، ئنجا چەردەیەك لە یەك بە یەکی ئەو زانستانەی تریش دەستی خۆی بخات کە پەیوەندییان بە زانستە سەرەکییەکەوە هەیە، تاکو "وێنەی ڕاستەقینە"ی ئەو زانستەی تەواو بکات. چونکە هەموو پوختە و چەردەیەکی ئەو زانستانەی تر دەکرێت ببێت بە تەواوکەری زانستە سەرەکییەکە، بێ ئەوەی بتوانێت "وێنە"یەکی سەربەخۆ پێکبهێنێت!

ئەی قوتابیانی زانستە شەرعییەکان لەوانەی کە گوێیان لە دەنگمە!

دەبا وەك ئەوەی کە قوتابیانی قوتابخانە نوێیەکان بوون بە باشترین "جێنشین" بۆ "پێشینان"ە ناتەواوەکانیان، با ئێمە ببین بە باشترین "جێنشین" بۆ "پێشینان"مان کە گەیشتبوونە چڵەپۆپەی "تەواوی"!

جا مەبەستی من لەو مونازەرانە ئەوەبوو کە – بە کردەوە – بۆ ئەم دوو خاڵە بێداریان بکەمەوە.

○ سێ‌هەمیان: من – وێڕای ناشایستەییم – ئەم دوو چەمکەی خوارەوەم ڕوون کردەوە:

یەکەم:

ئیسلام – کە بریتی‌یە لە شارستانێتیی ڕاستەقینە – لەم چەرخی پێشکەوتنەدا بە وێنەی شارستانێتیی ئەم ڕۆژگارە هەنگاوی بەرەو پێش نەناوە.

گەورەترین هۆکاری ئەمە بریتی‌یە لە جیاوازیی بیروڕا و مەشرەبەکان لە نێوان ئەهلی قوتابخانە ئایینی‌یەکان و، قوتابخانە نوێ‌یەکان و، تەکیە و خانەقاکاندا، ئەوانەی واتای ئەو پەندەیان تێدا هاتووەتە دی کە دەڵێ:

(ئامانجیان یەکە و جیا جیا لێی دەدوێن)..

ئەوەتا ئەهلی قوتابخانەی ئایینی کەسانی قوتابخانە نوێ‌یەکان بەوە تۆمەتبار دەکەن کە دەڵێن: بیروباوەڕیان لاوازە، لەبەر ئەوەی دەچن ڕواڵەتی هەندێ ئایەت و فەرموودەی پیرۆز بە شێوەیەك لێکدەدەنەوە کە واتایەکی تری جگە لە مەبەستی خۆیان بە دەستەوە بدەن..

ئنجا ئەوانیش ئەمان بە باوەڕ پینەکراو دادەنێن، چونکە بایەخ بە زانستە نوێ‌یەکان نادەن..

پاشان ئەهلی قوتابخانە (ئایینی‌یەکان) خەڵکانی ناو تەکیە و خانەقاکان بە ئەهلی بیدعەت لە قەڵەم دەدەن و، ئەم ڕا و بۆچوونە بەتاڵەشیان لەسەر ئەو گومانە نارەوایەی عەوام و هەندێ نەزان بنیات ناوە کە پێیان وایە هەندێ لەو جموجووڵ و هەڵسوکەوتە شەوق بەخش و موباحانەی لە زیکردا دەکرێن لە خودی زیکرەکە بێت..

لە کاتێکدا ئەوەی "عیبادەت"ە تەنها زیکرەکەیە و، ئەو جموجووڵانەش بەشێك لە زیکرەکە نین..

ئنجا کردنەوەی دەرگای گوێ پێ نەدان و چاوپۆشی لە هەندێ شت، لە ڕێی گوێ نەدانی ئەوان و ڕۆچوونی زیاد لە پێویستی ئەمانیش، کارێکی کرد کە هەندێ "بیدعەت" ئاوێتەی زیکر ببێت!

ئەم جیاوازی‌یەی کە لە نێوان بیر و بۆچوون و مەشـرەبەکاندا بـەدی دەکرێـت، ڕەوشتی موسڵمانانی ترازاندووە و لە کاروانی شارستانێتی دوای خستوون.

چارەسەری ئەمەش بەوە دەبێت کە:

بە چەشنێکی دروست و ڕاستەقینە زانستە ئایینی‌یەکان لە قوتابخانە نوێ‌یەکاندا بخوێنرێن..

لە قوتابخانە ئایینی‌یەکانیشدا لە جێی ئەو زانستی حیکمەتە کۆنەی کە هیچ جێ‌یەك ناگرێت، هەندێ لەو زانستە نوێیانە بخوێنرێت..

هەروەها دانانی زانای پایەدار و ئاگادار بۆ تەکیە و خانەقاکان..

ئەو کاتە و دوای ئەم چارەسەرانە، ئومێدێکی توندوتۆڵ دەبێت بەوەی کە ئەم سێ لایەنە ببن بە دەزگایەکی هاوکار و تەبای ئەوتۆ کە پێکەوە پلەکانی پێشکەوتن ببڕن.

**بیری دووهەم:**

(تایبەتە بە واعیزەکان، کە وانەبێژی گشتین)

کاتێ گوێم لە واعیزەکان ڕاگرت، بینیم وەعـز و ئامۆژگاری‌یان هیچ کارێکی تێ نەکردم.

کە بیرم لـە هۆکاری ئەمە کردەوە، بۆم دەرکـەوت، جگـە لـە دڵڕەقیی خۆم، سێ هۆکاری تر هەن:

**یەکەمیان:**

ئەو واعیزانە لە دەمی ڕوونکردنەوەی مەبەستەکاندا، بە یەك چاو سەیری ئێستا و کاتەکانی ڕابوردوو دەکەن و، ئەوە ڕەچاو ناکەن کە سەردەمەکانی پێشوو لەبەر ئەوەی خاوێنیی دڵ و دەروون و چاولێکردنی زانایـان بەسەر خەڵکیدا زاڵ بوو، ئەوا زانایان پێویستیان بە هێنانەوەی بەڵگە نەبوو لەسەر قسەکانیان..

بەڵام ئێستا هەرکەسەو بۆ خۆی حەزی بەدواداچوونی حەقیقەتی تێدا ورووژاوە. لەبەر ئەوە، ڕوونکردنەوەکان بە بێ هێنانەوەی بەڵگە بۆیان کاریان تێناکات.

جا بۆ ئەوەی لەم سەردەمەدا کاریگەرییان هەبێت، پێویستیان بە سەلماندن و قەناعەت پێ بەخشین هەیە.

**هۆکاری دووهەم:**

ئەوان کاتێ خەڵکی بۆ کارێکی چاك هـان دەدەن.. یـان مەترسـی‌یەکانی کردارێکـی خراپیان پێش چاو دەخـەن، دەچـن لـەو پێنـاوەدا نـرخ و بـەهای شـتە گـەورەکان دەهێننـە خوارەوە!

بۆ نموونە دەڵێن:

دوو ڕکاتی شەونوێژ خێری حەجێکی هەیە و، هەرکەسیش غەیبـەت بکـات هێنـدەی زینایەك پێی گوناهبار دەبێت!

**سێهەمیان:**

ئەوان گوفتارێك ئاراستەی خەڵکی ناکەن، کە وەك "ڕەوانبێژی" دەخوازێ، لەگەڵ حاڵ و مـەقامی ڕۆژگـار و سـەردەمدا یەکاویـەك بێـت. وەك بڵێـی خـەڵکی ئێـستا بـەرەو سەردەمە پێشووەکان کێش بکەن، ئنجا بە زمانی ئەو سەردەمانە لەگەڵیان بدوێن!

من دەمویست ئـەوە بخەمـە ڕووکـە مەرجـە "واعیزەکـان" هـەم "زانـای لێکۆڵـەر"بن، تاکو بتوانن گوفتارەکانیان بچەسپێنن.. هـەم "دانـای وردەکـار" بـن، تـاکو هاوسـەنگیی شەریعەت لێك نەترازێن.. هەم "ڕەوانگۆی قەناعەتبەخش" بن.

**چوارەمیان:**

من وتوومە: "زەینم شێواوە".

مەبەستیشم لەم قسەیە ئەوە بوو کە "بیر"م گرفتاری لە بیرچوونەوە بووە و، هەست بـە زەین تەسکی و بێ تاقەتی لە سروشتمدا دەکەم.

خۆ مادەم شێت بە خۆی ناڵێت "شێت" ئیتر چۆن ئەم قسەیەم دەبێت بە بەڵگە لەسـەر شێتیم؟!

هەروەها وتبووم:

دوای خوێندنی کتێبی "إظهار" تەنها سێ مانگ دەرسم خوێندووە.

جا ئەم قسەیەم لە دوو ڕووەوە گومان و دوودڵی دەورووژێنێت:

چونکە یان ئەوەیە پێچەوانەی ڕاستی‌یە، لە کاتێکدا کە زۆربەی خەڵکی کوردسـتان پشـتڕاستی دەکەنەوە..

یان هەرچەندەش ڕاستە، بەڵام ئاماژەی تێدایە بۆ مەدحی خۆکردن و لەخۆ بایی بوون - کە یەکێکە لە توخمەکانی شێتی - وەك تۆ دەڵێیت کاکی دکتۆر!

وەڵامی ئەمەش:

ئەو قسەیەم بە ویستی ڕاست و دروستی خۆم بوو لە وەڵامی پرسیارێکدا کە یەکێك لە پیاوانی دەوڵەت لێی کردم، هەرچەند خۆمەدحکردنی پێوە دەبینرێت.

ئێستاش پێم وایە دوای نەمانی گومانتان لە "هەست و شعوور"م، دوودڵیتان لە "بیر و بۆچوون"م هەبێت. خۆ ئەوەش بە بچووکترین داوەریی ژێری نامێنێت..

چونکە مرۆڤێکی کوردی دەشتەکی و ئازاد، گەر وەفا و ڕاستیی تێدا نەبێت بۆ نەتەوەیەکی پێشکەوتووی چەشنی ئەڵماس و، لە خۆیدا خاوەنی بیرێکی بەرزی وەکو گەوهەر نەبێت، چۆن دەتوانێت فڕوفێڵەکانی و بیری بێ کەڵك و خراپی خۆی بە درێژایی ئەم هەموو کاتە بشارێتەوە، بەم هەموو جیاوازییانەوە کە پێوەی دەبینرێت؟

لای من فێڵ لەوەدایە کە واز لە فێڵ بهێنرێت!

کەواتە لە دڵی خۆیدا هەستی بە وەفایەکی بێگەردی ئەوتۆ کردووە کە لە هی هەموو کەس زیاتر بێت، چونکە کەسی ڕاستگۆم لەگەڵ میللەتدا نەبینی. بۆیە خۆی لەو جۆرە بارودۆخانەدا بینی‌یەوە.

وكم من عائبٍ قولاً صحيحاً وآفتـــه من الفهم الســـقيم[1]!

بەو واتایەی "تێگەیشتن"ی پزیشکەکانمان تێگەیشتنێکی نەخۆشە و، هەر ئەوان بەپێی ڕاپۆرتە پزیشکی‌یەکانیان تووشی شێتی بوون!

یەکێکی تر لەو شێتانە وەزیری "ئاسایش"ە، چونکە زیاد لە پێویست هەڵدەچێت!

جا ئەی کاکی پزیشك!

تۆ پزیشکێکی وریا و کارامەیت.. فەرموو ئەو بێچارانە پێش من چارەسەر بکە!

ئەی ئەو کەسانەش کە سەیری ئەم گوفتارەم دەکەن!

---

(١) ئەم شیعرە هی موتەنەبیی‌یە. واتە:

هەندێ توانجیان لە قسەی جوانە دەردی ناساغیی تێگەشتنیانە

بڕوانە دیوانەکەی: ٤/٢٤٦. (وەرگێڕ)

گەر ئەم قسانەم شتێکی ئەوتۆی تێدایە هەستی ئێوە زامدار بکات، یان گەدەی لاوازتان پێی هەرس(هضم) نەکرێت، داوای لێبوردن دەکەم، چونکە لە کاتی شێتی و لە نێوان چوار دیواری خەستەخانەی شێتاندا وتوومە!

خۆ کاریگەریی دەوروبەر لە گوفتاردا شتێکی سەلماوە چونکە: "دیوانەرا قلم نیست" واتە: قەڵەم لەسەر شێت هەڵگیراوە.

دیارە نەخوێندەوارێکی دەشتەکی، واتە کوردێکی ئازاد کە تورکی بە باشی نازانێت، هەر ئەوەندە دەتوانێت مەبەستی خۆی دەربڕێت.

والسلام"[1].

بەدیعوززەمانی کوردی

* * *

(١) مامۆستا عەبدولمەجیدی برای مامۆستا سەعیدی نوورسی، سەبارەت بە کاردانەوەی پزیشك لەسەر ئەم وەڵامەی مامۆستا و، کاردانەوەی کۆشکیش لەسەر ڕاپۆرتی پزیشکەکە، ئەمەی خوارەوەی لە یادداشتنامەکەی خۆیدا نووسیوە:
(پاش بیستنی ئەم گوفتارە، پزیشکەکە نوقمی سەرسامی بوو، چونکە مەودای دڵسۆزی و هەوڵ و تێکۆشانی ئەوی بۆ دەرکەوت لە پێناوی خزمەتی نیشتمان و سوودگەیاندنی بە هاووڵاتیان لە ڕێی بەدەستهێنانی زانستەوە. هەروەها بۆی دەرکەوت کە چۆن لە چڵەپۆپەی زیرەکیدایە. بۆیە ڕاپۆرتێکی ئامادە کرد و ئەم گوفتارەی تێدا نووسیبوو:
- لە نێوان هەموو ئەوانەی کە هاتوونەتە ئەستەمبوولەوە هیچ کەسێك نی‌یە کە وەك ئەو وریا و زیرەك بێت. لە هەموو جیهاندا دەگمەن و بێ وێنەیە.
لە ئەنجامی ئەم ڕاپۆرتەدا سەرسامی و ترس کەوتە ڕیزەکانی بەرپرسانی کۆشك. بۆیە لەگەڵ "شەفیق پاشا"ی وەزیری "ئاسایش"دا فەرمانێکی کارگێڕی‌یان بۆ نارد کە مووچەیەکی مانگانەیان تێدا بۆ بڕیبووەوە بە بڕی سی لیرەی زێڕ، جگە لەو بەخششانەی کە بۆیان دەستنیشان کردبوو، هەموو ئەمانەش بۆ مەبەستی دوورخستنەوەی لە ئەستەمبووڵ)! (پەراوێزی وەرگێڕ)

## گفتوگۆم لەگەڵ (شەفیق پاشا)ی وەزیری ئاسایش

## کاتێ لە بەندیخانە بووم

### دوای دەرچوونم لە نەخۆشخانە لە دەوری ئیستیبداددا[(١)]

وەزیری ئاسایش:

سوڵتان سڵاوت لێ دەکات و، "هەزار قروش" مانگانەشی بۆ بڕیویتەوە و، دەڵێ کە دوایی بۆت دەکات بە "بیست - سی لیرە".

وەڵامم دایەوە:

من سواڵکەری مووچە نیم. ئەگەر هەزار لیرەشم بدەنێ هەر وەری ناگرم. من بۆ مەبەستی کەسیی خۆم نەهاتووم، بەڵکو لە پێناوی بەرژەوەندیی نەتەوەکەمدا هاتووم. ئەوەی ئێوە دەتانەوێ پێشکەشی منی بکەن بەرتیلێکە بۆ بێدەنگ کردنم.

---

(١) لە چاپە تازەکاندا سەرتاسەری ئەم باسە نی‌یە. ئێمە لەم سەرچاوانەوە وەرمان گێڕا:

١ - سيرة ذاتية، بديع الزمان سعيد النورسي، إعداد وترجمة: إحسان قاسم الصـــالحي. ص: ٦٩-٧٤. ط١. دار سوزلر، استانبول، ١٤١٩هـ/ ١٩٩٨م.

٢ - ڕۆژنامەی تەعاون و تەرەقیی کورد: (کرد تعاون وترقی غزتەسی) ژمارە (٥) لاپەڕە (٣٨-٣٩).

٣ - چاپی یەکەمی کتێبەکە بە تورکی: (ایکی مکتب مصیبتك شهادتنامەسی، یاخود دیوان حرب عرفي وسعید کردی) ١٣١٧ ڕۆمی / ١٩١١ز.

٤ - آثار بديعية. چاپی دووهەم: ص ٧٤٩-٧٥٥ کۆکردنەوە و لێکۆڵینەوەی مامۆستا عەبدولقادر بادللی. نوسخەیەکی پاکژکراو بە دەستی خودی مامۆستا عەبدولقادر کە خۆی بۆی ناردم.

٥ - وێنەی دەسنووسێکی وەرگێڕانی عەرەبیی (شوکری ئەسلان) بۆ پەیامەکە.

٦ - دەسنووسێکی وەرگێڕانی (ئاساری بەدیعییە) بۆ کرمانجیی ژووروو لە لایەن سەیدا مەلا ئیبراهیم خەلیلی ئامەدی‌یەوە. (وەرگێڕ)

وەزیر:

بەم کارەت دەست بە ڕووی فەرمانی سوڵتانەوە دەنێیت، فەرمانی ئەویش ڕەت ناکرێتەوە.

لە وەڵامدا وتم:

ڕەتی دەکەمەوە، تاکو سوڵتان لەم کارەم بێزار بێت و بنێرێت بە شوێنمدا، ئەو کاتە دەتوانم ڕاستەوخۆ لای خۆی قسەی هەق بکەم.

وەزیر:

ئاخر ئەنجامی ئەمە باش نابێت!

وتم:

ئەگەر ئەنجامەکەی ئەوە بێت بمخەنە ناو دەریاوە، ئەوا دەریا دەبێتە گۆڕێکی فراوان بۆم.. گەر لە سێدارەشم بدەن ئەوا لە ناو دڵی نەتەوەکەمدا ئەسپەردە دەکرێم.

بیشزانە کاتێ کە هاتم بۆ ئەستەمبووڵ گیانی خۆمم - لەو پێناوەدا - بەخشیبوو.. چیتان لێ دێت درێغی مەکەن.

من بە دڵسۆزی پێتان دەڵێم:

ویستم بە کردار ڕۆڵەکانی نەتەوەکەم بێدار بکەمەوە کە هەرکامێکیان پەیوەندیی بە دەوڵەتەوە هەبێت با تەنها لە پێناوی خزمەتی نەتەوەدا بێت، نەك بۆ لێکێشانەوەی مووچە و مانگانە.

هەروەها خزمەتی کەسێکی وەکو من بۆ میللەت و دەوڵەت تەنها بە پێشکەشکردنی ئامۆژگاری دەبێت، ئامۆژگاریش دەبێ کاریگەریی جوانی هەبێت، ئەوەش بە وازهێنان لە بەرژەوەندیی خۆیی دێتە دی، ئەوەش بەوە دەبێت کە ئامۆژگارییەکە بێ بەرامبەر بێت و واز لە سوودە کەسییەکان بهێنرێت.

بەم پێیە من بەهانەم بە دەستەوەیە بۆ وەرنەگرتنی مووچە و مانگانە.

وەزیر:

ئەو مەبەستەی بۆی هاتوویت، کە بڵاوکردنەوەی زانستە لە کوردستاندا، لە بەردەستی ئەنجومەنی وەکیلان (وەزیران)دایە و لێی دەکۆڵنەوە.

وەڵامم دایەوە:

ئەمە جێی سەرسوورمانە!

بە چ یاسایەك دەچن مەسەلەی بڵاوكردنەوەی زانست دوادەخەن و، بۆ بڕینەوەی مانگانەش پەلە دەكەن؟

بۆچی بەرژەوەندیی كەسیم بەسەر بەرژەوەندییە گشتییەكانی میللەتدا پێش دەخەن؟!

(وەزیر لەمە تووڕە بوو)..

وتم:

من هەر بە ئازادی ژیاوم و لە چیاكانی كوردستاندا - كە لانكی ئازادیی ڕەهایە - گەورە بووم..

بە تووڕە بوون خۆت ماندوو مەكە، چونكە سەبارەت بە من تووڕەبوون هیچ جێیەكت بۆ ناگرێت.

بێ منەتیش بن بۆ هەر جێگایەك نەفیم دەكەن، چ "فەززان"[1] بێت و چ "یەمەن" بكەن، ئەو كاتە ئێوەش لە پینەكردن و ڕووپامایی ڕزگارتان دەبێت و، منیش لە ئازاری كەوتنە خوارەوە دەرباز دەبم.

وەزیر:

مەبەستت چییە؟ دەتەوێ بڵێی چی؟

لە وەڵامیدا وتم:

ئێوە ویستتان بە ناوی یاساوە هەست و بیری هەڵچووی خەڵكی بە پەردەیەكی تەنكی وەك هی كاغەزی جگەرە داپۆشن.

هەموو كەسێك لە ژێر زەبر و زۆری ئێوەدا وەكو مردوویەكی بزۆك دەناڵێنێت!

من نەشارەزای ئەم شتانە بووم، بۆیە لە سەرووی ئەو پەردانە مامەوە و نەڕۆشتمە ژێریان.

پۆشاكی بەریشم، بە وێنەی ڕەوشتم، قورس بوو لە لاتان.

---

(١) ناوی بیابانی گەورەی لیبیایە كە ئەو دەمە لە ژێر دەستەڵاتی دەوڵەتی عوسمانیدا بووە. (وەرگێڕ)

ئیتر پەردەی ڕێزی نێوانمان یەکەم جار لە "مابەین"دا[١] لاچوو، پاشان کەوتمە ماڵی ئەرمەنی یەك لە "شیشلی"[٢] لەوێش جارێکی تر پەردە لە نێواندا لاچوو، ئنجا کەوتمە "خانی شەکەرچی"[٣] لەوێش جارێکی دی ئەو پەردەیە لە نێواندا لادرا و، پاشان کەوتمە بەندیخانە و لەوێش جارێکی تر ئەو پەردەیە لاچوو، دوای ئەوە خرامە نەخۆشخانەی شێتان و، ئێستاش لە بەندی و ژێر چاودێریدام.

بە پوختی:

هەروەك ئێوە ناتوانن تا ئەم ڕادەیە لەسەر پینەکردن بەردەوام بن، چونکە: (اتسع الخرق على الراقع)[٤] منیش لە شوێنی خۆمدا ئازاری ئەم بارودۆخانەم پێ دەگات.

هەروەها کاتێ لە کوردستان بووم ئێوەم بە باش دەزانی، بەڵام ئەم بارودۆخانە هەموو نهێنی یەکانی ئێوەی بە باشی پێ ناساندم، بە تایبەتی نەخۆشخانەی شێتان ئەم دەقانەی بە باشی بۆ ڕاڤە کردم.

هەروەك سوپاس و پێزانین ئاراستەی ڕووداوەکان دەکەم، چونکە پێش ئەوەی ئەم ڕووداوانە ببینم لە بری گومانی خراپ گومانی باشم پێ دەبردن!

بەدیعوززەمان

**سەعیدی کوردی**

* * *

---

(١) "مابەین" زاراوەیەکە بۆ ئەو بەشە زۆر مەحرەمەی کۆشکی پادشایانی عوسمانی بەکارهێنراوە کە پێشوازیی میوانی تێدا کراوە. (وەرگێڕ)

(٢) ناوی گەڕەکێکی ئەستەمبوولە. (وەرگێڕ)

(٣) ناوی ئەو ئوتێلەیە کە مامۆستا نوورسی لە ناوچەی "فاتیح"ی شاری ئەستەمبووڵ تیایدا دەمایەوە. هەموو ئەو شوێنانەش کە لە سەرەوە ناویان هات مامۆستا نوورسی تیایاندا لەگەڵ پیاوانی دەوڵەت کەوتووەتە گفتوگۆ لەسەر کارگێڕی دەوڵەتی عوسمانی لە کوردستاندا. (وەرگێڕ)

(٤) پەندێکی عەرەبی یە. واتە: "دڕاوییەکە بەرە بەرە فراوانتر دەبێت و پینەچی پێی ڕاناگات"! مەبەست ئەوەیە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ گرفتەکان لە زیادبووندان. (وەرگێڕ)

# کۆتایی

**پێم وایە ئەگەر چەند وشەیەك ئاراستەی ڕۆڵەکانی هاوڕەگەزم نەکەم، ئەم باسە بە ناتەواوی دەمێنێتەوە.**

ئەی شێرە کوردەکان! ئەی نەوەی سەربازە ئازاکانی سوپای بە هەڵمەتی پێشووی ئاسووری و کیانی‌یەکان[١]!

پێنج سەد ساڵ خەو بەسە! لە خەو هەڵسن.. وا بانگی بەیانە..

دەنا لە دەشتایی وشك و برنگی نەزانیدا، دەشتەکێتی و بێ ئاگایی هێرشتان بۆ دێنێ!

ئەو "دانستی خوایی"یەی کە بریتی‌یە لە سیستەمی مەکینەی جیهان و، دامەزرێنەری ئەو یاسا نوورانی‌یەی خوای گەورەیە کە بە وێنەی هێڵی تەلەگراف بە هەموو لایەکدا بڵاوە و لە سەرانسەری جیهاندا دەست بەکارە.. ئەو دانستە خواییە، هەر لە ئاسۆی ئەزەلەوە پەنجەی قەدەری هەڵبڕیوە و، فەرمانتان پێ دەدات کە:

(ئەو پەرۆشی و هێزە لەناوچووەتان، کە بە وێنەی دڵۆپەکانی ئاو لە دووبەرەکیدا زایە و پەرتەوازە بووە، لەگەڵ بیری "میللییەت"دا یەك بخەن و تێهەڵکێشی یەکتریی بکەن و، هێزێکی کێشی گشتیی لە جۆری کێشی جوزئیی گەردیلەکان لێ پێکبهێنن و، بارستاییەکی مەزنی وەك کورد بە وێنەی گۆی زەوی لە خولگەی خۆیدا بخولێننەوە و، ئنجا بەشەکانی کۆڕەوی خۆری شکۆداری ئیسلام و عوسمانییەتیش بە وێنەی هەسارەیەکی درەخشان بە دوای ئەودا بهێنن و، هاوسەنگی و ئاهەنگی گشتی بپارێزن)[٢].

---

(١) لە چاپە تازەکاندا لە بریی ئەم بڕگەیە، نووسراوە: (ئەی ڕۆڵەکانی نیشتمانەکەم و برایانم! ئەی نەوەی سەربازە ئازاکانی سوپای بە هەڵمەتی سەدەکانی پێشووی ئاسیا!). (وەرگێڕ)

(٢) ئەم بڕگەیەی ناو کەوانەکە هی چاپە کۆنەکانە، لە تازەکاندا بەم جۆرەیە:

(ئەو پەرۆشی و هێزە لەناوچووەتان، کە بە وێنەی دڵۆپەکانی ئاو لە دووبەرەکیدا زایە و پەرتەوازە بووە، لەگەڵ بیری "میللییەت" (واتە نەتەوەیی ئیسلام)دا یەك بخەن و تێهەڵکێشی یەکتریی بکەن و، هێزێکی کێشی

(هەروەها ئەو "سەربەستی"یەی)[1] کە لەسەر لوتکەی ئایندە و بە وێنەی گەردنکەشیی چیاکانی "سوبحان" و "ئاگری" لەسەر پێ ڕاوەستاوە و، پشتی بە شەریعەت بەستووە و ڕێی ملکەچ بوونتان بۆ دەروونی بەدخواز لێ دەگرێ و، لە مەترسیی دەستدرێژی بۆ سەر خەڵکانی تر بێدارتان دەکاتەوە و، بە دەنگێکی بەرز فەرمان بە (نەتەوەی)[2] ئێوە و بێ ئاگایانی هاوشێوەتان دەدات، لەوانەی کە لە شیوە قووڵەکانی ڕابوردوودا دووچاری پەرتەوازەیی و جیاوازی بوون و، پێتان دەڵێ:

بە چەکی زانست و پیشەسازی هێرش بۆ سەر نەزانی و هەژاری ببەن.

(هەروەها ئەو "حەقیقەت"ەش کە هەواڵی ڕاستییەکان ڕادەگەیەنێت و لە ژێر چەندین چینی ئیستیبدادا دیل و شاراوە بوو، وا ئێستا لە ئەنجامی سڕینەوە و نەمانی ئیستیبداد خەریکە چینەکانی نەزانی و بێ ئاگایی لەسەر شانی خۆی دەتەکێنێت و، لە هەموو لایەکەوە پێتان دەڵێت: ئەو توانا و لێهاتنانەی کە دەستی قەدەر لە سروشتی ئێوەدا چاندوونی تاکو ڕەوشتە پەنهانەکانتان دەربکەون و بێنەدەر، ئێستا کاتی ئەوەیان هاتووە کە بە "ئاوی ژیانی زانستەکان" ئاودێری بکرێن. دەنا وشك دەبن یاخود بۆگەن دەکەن)[3].

هەروەها ئەو مامۆستای "پێویستی"یەش کە باوکی شارستانێتی و دامەزرێنەری پێشکەوتنەکانە، دەستی هەڵبڕیوە تاکو زڵلەتان تێ بسرەوێنێ و، فەرمانتان پێ دەدات کە: یان (ژیان و سەربەستیتان)[4] لەم دەشتاییە سامناکەی نەزانیدا بدەنە دەستی تالانچییان، یاخود دەبێ بە هەڵەداوان بەرەو کەعبەی ئاکارە بڵندەکان هەنگاو بنێن و، لە مەیدانی شارستانێتیدا سواری باڵۆنی زانست و شەمەندەفەری پیشەسازی ببن، تاکو بەرەو پێشوازیی ئایندەیەکی گەش بڕۆن و، سامانی زەوتکراوی "یەکگرتن" بگێڕنەوە!

---

گشتیی نیشتمانی لە جۆری کێشی جوزئیی گەردیلەکانی لێ پێکبهێنن و، بارستاییەکی مەزنی وەکو گۆی زەوی بخولێننەوە و، ئنجا کۆڕەوی جەماوەری یەکگرتووی موسلمان و خۆری شکۆداری ئیسلام بە وێنەی هەسارەیەکی درەخشان بە دوای ئەودا بهێنن و، هاوسەنگی و ئاهەنگی گشتی بپارێزن). (وەرگێڕ)

(١) لە چاپە تازەکاندا: (هەروەها ئەو "سەربەستیی شەرعی"یەی کە ڕاستییەکی کۆمەڵایەتییە). (وەرگێڕ)

(٢) وشەی ناو کەوانەکە هی چاپە کۆنەکانە و لە تازەکاندا نییە. (وەرگێڕ)

(٣) لە چاپە تازەکاندا ئەم بڕگەیە نییە. (وەرگێڕ)

(٤) لە چاپە تازەکاندا نووسراوە: (ژیانی سەربەستیتان). (وەرگێڕ)

هەروەها ئەو "نەتەوایەتی‌یە"ی[1] کە خێوەتی خۆی بەسەر شیوەکانی ڕابوردوودا و لەسەر دەشتاییەکانی ئێستا و لوتکە و دوندەکانی ئاییندەدا هەڵداوە و، باپیرانتان لە چەشنی: (ڕۆستەمی زاڵ و صەلاحەددینی ئەییوبی و هاوشێوەیان لەو کوردە قارەمانانەی)[2] کە لە ژێر ئەو خێوەتەدا بە وێنەی یەك دانە خێزان ژیاون و، هەریەکەیان بە چۆنێتی و پلەی ئەوی تر شەرەفمەند بووە (و، نموونەی هەست و نەستە بڵندەکان و نەتەوایەتیی ئیسلامیان تێکەڵ کردووە)[3].. ئەم "بیری نەتەوایەتی‌یەی ئیسلام" فەرمانێکی توندوتۆڵتان پێ دەدات کە:

دەبێ هەر یەکەتان ئاوێنەیەکی وێنەدەرەوەی ژیانی (میللەت)[4] و، پارێزەری شان و شکۆی و، نموونەیەکی بەرجەستەی بێت. (ئیتر وەکو ئێستا گەورەبوون و بەرزبوونەوەتان لە تاکە کەسدا قەتیس نەدەما، بەڵکو هێندەی میللەتێك بە گشتی پێگەیشتنی بەخۆوە دەبینی)[5].

چونکە هەتا ئامانجەکانی مرۆڤ بەرز و بڵند بن هیممەتیشی پتر بەرز دەبێتەوە و، ڕەوشتەکانیش هەتا بە غیرەت و پەرۆشیی (ئیسلامەتیی تورك و کورد)[6] قوڵپ بدەن زیاتر تەواوکاری و بەرزی بەدەست دەهێنن.

هەروەها ئەو "مەشرووتیەت"ەی[7] کە یەکێکە لە هۆکارەکانی بەختەوەریی دنیای مرۆڤ، بە دەستەبەر کردنی سەروەریی نەتەوە، ئەو "ویستە جوزئی"یەی کە دینامۆی مەکینەی ژیانە لە خۆسەپاندنی ئیستیبداد ڕزگار کرد.

جا ئەم مەشرووتیەتەی کە بە هەوێنی شووراى شەرعی هەڵهاتووە، ئێوە بۆ تاقیکردنەوە بانگێشت دەکات و، دەیەوێ بتانبینێت کە گەیشتوونەتە تەمەنی ئاوزان و فامین و، پێویستتان بە سەرپەرشتیکار و ئامۆژگار نی‌یە!

---

(١) لە چاپە تازەکاندا نووسراوە: (ئەو نەتەوایەتی‌یە ئیسلامی‌یەی). (وەرگێڕ)

(٢) لە چاپە تازەکاندا نووسراوە: (صەلاحەددینی ئەییووبی و جەلالەددین خوارەزم شا و سولتان سەلیم و خەیرەددین باربارۆس و ڕۆستەمی زاڵ و هاوشێوەیان لەو قارەمانانەی). مامۆستا عەبدولقادر لە پەراوێزدا نووسیویەتی کە ئەمە لە نوسخەیەکدا هەیە. (وەرگێڕ)

(٣) ئەم ڕستەیەی ناو کەوانەکە هی چاپە کۆنەکانە و لە تازەکاندا نی‌یە. (وەرگێڕ)

(٤) لە چاپە تازەکاندا نووسراوە: (میللەتی ئیسلام). (وەرگێڕ)

(٥) ئەوەی ناو کەوانەکە لە چاپە تازەکاندا نی‌یە. (وەرگێڕ)

(٦) لە چاپە تازەکاندا نووسراوە: (ئیسلامەتی). (وەرگێڕ)

(٧) لە چاپە تازەکاندا نووسراوە: (ئەو مەشرووتیەتە ڕەوایەی). (وەرگێڕ)

دەسا خۆتان بۆ تاقیکردنەوە ئامـادە بکـەن و، بـە "یـەکێتی"ی نێوانتـان بوونـی خۆتـان بسەلمێنن و، بۆ مەشرووتیەتی دەربخەن کە بیر و ویژدانی کەسیی خۆتـان وەك دڵ و ژیریـی هـاوبەش وان لــە غـیرەت و پـەرۆشـی (نەتەوایـەتیدا)[1]. دەنـا سـفرتان دەداتــێ و، بڕوانامەی "سەربەستی"تان پێ نادات!

بەڵێ، ئەو پشێوی و ئاڵۆزیيانەی کە لە ئەنجامی: حەزی سەروەری و، خۆویستی و، بیری کەسیی هەر یەکێکتانـەوە لـە دەشتاییەکانی ڕابوردوودا ڕووی دا، بە پشتیوانیی خوای گەورە لە ئایندەدا دەگۆڕێت بە بیری بەرهەمـهێنان و هـەوڵی بـەردەوام و چـەمکی سەربەستی.

تەنانـەت دەتـوانم بڵێـم:[2] قوتابخانـە پڕ لـە دەنـگ و جەنجاڵـەکانتان لـەچاو قوتابخانـە هێورەکانی تردا وەکـو پەرلـەمانێکی زانستی وایـە، لەبـەر زۆریـی وتوویـژ و گفتوگۆی زانستی تیایاندا..

پاشان ئێوە[3] لە پشت سەری ئیمامەوە فاتیحەی نوێژەکانتان بـە دەنگێکـی ئاسمـانی و ڕۆحـانی دەخوێنـن و، بـەپێی مەزهـەب و قوتابخانـە و (نەتـەوە)تان[4] لـە لایـەن قـەدەرەوە نیشانە و هێمایەك لە ماهییەتی ئێوەدا هەیە کە ئامادەییتان بۆ مەشرووتیەت دەردەخات و، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَأَنْ لَيسَ لِلإِنْسَــانِ إلاّ مَــا سَــعَى﴾ (النجم:٣٩) بۆ تێکۆشان و هەوڵ وتەقالای کەسی هانتان دەدات.

هەروەها ئەو "ئازایــەتی و شــەرەفی نەتـەوەیی"[5]یـەی کـە بناغـە و پـارێزەری هـەموو ئاکارە بڵندەکانە، فەرمانتان پێ دەدات کە:

هـەروەك ئێـوە لـە نووسینی شمشێرەکانتانەوە فێری زانستەکان بـوون و، لـە بـواری ئازایەتیی ماددیدا پێشکەوتنتان بەدەست هێنا و، ڕێیەکتان لـە "مێشـك"ەوە بـەرەو "دڵ" لێدا و، "ژیری"تان ئاوێتەی"هێز" کرد، ئێستاش ڕاڕەوێـك لـە "دڵ"ەوە بـەرەو "بیر" لـێ

(١) لە چاپە تازەکاندا نووسراوە: (نەتەوایەتیی ئاییندا). (وەرگێڕ)
(٢) لەم شوێنەی چاپە تازەکاندا نووسراوە: (ئەی هاووڵاتیانم لە ویلایەتەکانی خۆرهەڵاتدا!). (وەرگێڕ)
(٣) لەم شوێنەی چاپە تازەکاندا نووسراوە: (لەسەر ڕێڕەوی "شافیعی"ن). (وەرگێڕ)
(٤) لە چاپە تازەکاندا نووسراوە: (فیترەت)تان. (وەرگێڕ)
(٥) لە چاپە تازەکاندا نووسراوە: (ئازایەتی و شەرەفی نەتەوەیی ئیسلامی). (وەرگێڕ)

بـدەن و، یـارمـەتی لـە "هێز"ەوە بـۆ "ژیـری" و لـە هـەسـت و نەستەکانیشـەوە بـۆ ئەودیوی هزر و بیرەکان بنێرن، تاکو شەرەفی (نەتەوە)[1] لـە مـەیدانی ئازایـەتیی عـەقڵییی شارستانێتیدا بە تاڵان نەبرێت.

دەسـا شمشـێرەکانتان (وەك ئـەوەی قورئـانی پـیرۆز فـەرمانتان پـێ دەدات)[2] لـە گەوهەرەکانی زانست و پیشەسازی و پشتگیریی یەکتر پێکبهێنن.

هـەروەها[3] "زمانەکـەتان" کـە "زمـانی دایـك"ە و.. ئاوێنـەی پیشـاندەری هەسـت و نەستی نەتەوەیە و.. درەختێکە "ئەدەب" بەروبوومیەتی و ڕووبـاری زانستەکانیش ئـاوی ژیانیەتی و.. پێوەری بەها و پێشکەوتنتانە و.. لەبـەر ئـەوەی ڕاستەوخۆ ڕێڕەوێـك بـەرەو ویژدانی هەموو کەسێك دادەمەزرێنێت ئەوا بە وێنەی تیشك کاریگەریی خۆی دەبێت..

هەرچـەند ئـەم زمانـە ئێسـتا بـەهۆی کەمتەرخەمیتانـەوە حـاڵی پەشـێوە و هـەندێ لـە لقەکانی بە بیری بیانی موتوربە کراوە، بەڵام ئامادە و شایانی ئەوەیە ببێـت بـە درەختێکی وەك درەختی توبـا، کـەچی بـەم چەشـنەی ئێسـتای وشـك و پەرێشـانە و، بێ بەشـە لـەو ئەدەبیاتەی کە زمانی شارستانێتی‌یە. بۆیە ئەم زمانە لەلای پەرۆشی و غیرەتی نەتەوەیی بە کەساسی و خەمباری‌یەوە سکاڵاتان لـێ دەکات.

"زمـان" مـۆری ڕێـزە لـە مرۆڤـدا.. "ڕەوانبێـژی" شـکڵ و شـێوەی مرۆڤایـەتی لەسـەر لاپەڕەی زمان دەنەخشێنێت. زمانی دایکیش چونکە سروشتی‌یە، ئەوا بە بێ بانگهێشـت کردن دەستەواژەکانی دەڕژێنە ناو زەینەوە. ئنجا لەبەر ئەوەش ئاڵوگۆڕەکان تەنـها لـەناو واتاکاندا دەبێت، ئەوا بەملا و ئەولادا پەرتەوازە نابێت و ناشێوێت. ئـەو زانستانەش کـە دەڕۆنـە نـاو ئـەو زمانـەوە وەکـو نەخشـی سـەر بـەرد نـەمری بەدەست دەهێنن و، زمـانی نەتەوەییش لە هەر بەرگێکدا دەربکەوێت، جوان و ڕەنگین دەبێت.

وا لـێرەدا نموونەیـەکی پەرۆشـیتان بـە نموونـە بـۆ دەهێنمـەوە، ئـەویش بـەڕێز "خـەلیل خەیاڵی"ی مۆتکی‌یە[4]، کە وەك لە هەموو بوارەکـانی غیرەتی نەتـەوەییدا دەسـتی بـاڵای

---

(١) لە چاپە تازەکاندا نووسراوە: (نەتەوەی ئیسلام). (وەرگێڕ)

(٢) ئەوەی ناو کەوانەکە زیادەی چاپە تازەکانە. (وەرگێڕ)

(٣) لێرەوە تا کۆتایی پەیامەکە هی چاپە کۆنەکانە، لە تازەکاندا نی‌یە. (وەرگێڕ)

(٤) یەکێکە لە کەسایەتی‌یە کوردە ناسراوەکانی ئەستەمبوول لە سەرەتای سـەدەی بیسـتەمدا. لـە هـۆزی مۆدان و خەڵکی ناوچەی مۆتکیی سەر بە پارێزگای بەدلیسە. لە قوتابیانی دێرینی مامۆستا نوورسی‌یە. وێـڕای

هەیە، لە بواری زمانیشدا پێشبڕکێی بردووەتەوە و، بناغەی زمانەکەمانی بە ئەلفوبێ و سەرف و نەحوەوە دامەزراندووە..

تەنانەت دەتوانم بڵێم:

بە ئاوێتە کردنی چەرخی پەرۆشی و غیرەت و فیداکاری و پاراستنی لاوازان، قەوارە و بوونی مەعنەویی زمانەکەمانی پێکهێناوە.

جا مادەم لە کانزاکانی کوردستاندا گەوهەرێکی بەپەرۆشی وەها هەڵکەوتووە، ئەوا ئومێد دەکرێ لە داهاتوودا چەندین گەوهەری وەک ئەو بدرەوشێنەوە.

ئەوەتا ئەم زاتە نموونەیەکی غیرەتی نەتەوەییە و شایانی شوێن پێ هەڵگرتنە و، بناغەیەکی بۆ زمانی نەتەوەییمان دارشتووە کە پێویستی بە پێشخستن و گەشە کردنە.

ئامۆژگاریی مەردانی خاوەن پەرۆشی و غیرەت دەکەم کە چاوی لێ بکەن و لەسەر بناغەکەی ئەو هەوڵەکانیان بنیات بنێن.

سەعیدی کوردی

* * *

هەڵگۆزینی زانست و دانایی لە خزمەتی ئەم مامۆستایەیدا، غیرەت و ئازایەتیی لەڕادەبەدەریشی گەلێ جێی سەرسوورمان و ڕێزی خەلیل خەیالی بووە. خوێندنی لە ئەستەمبوڵ تەواو کردووە و هەر لەوێ بە کارمەندی دامەزراوە. لە هەردوو زمانی عەرەبی و فەرەنسیدا گەلێ شارەزا بووە. لە دامەزرێنەرانی "کۆمەڵەی تەعاون و تەرەقیی کورد" و "کۆمەڵەی نەشری مەعاریف" و "قوتابخانەی کوردی"یە لە ئەستەمبوڵ. ڕێزمانی کوردی و فەرهەنگێکی بە کرمانجیی ژووروو نووسیوە. لە ئەستەمبوڵ وەفاتی کردووە و نێژراوە. بڕوانە: مذکرات زنار سلوپی (قدری جمیل باشا) ص: ٢٠-٢١. (وەرگێڕ)

بەرهەمی چوارەم:

# وتاری شام

بە دیعوززەمان

## سەعیدی نوورسی

داینـاوە

## فاروق ڕەسووڵ یەحیا

کردوویە بە کوردی

بسم الله الرحمن الرحیم

## وتەیەك بۆ ئەم وەرگێڕانە كوردی‌یە:

خوێنەری بەڕێز!

پێشەكی‌یەكەی مامۆستا "ئیحسان قاسم صالحی" لەم چوار لاپەڕەیەدا كە دێت، زانیاریی پێویستی سەبارەت بە مێژووی ئەم وتارە و قۆناغەكانی پێشكەش كردووە. لەبەر ئەوە، بە پێویستمان نەزانی لەم وتە كورتە زیاتر پێشەكی بۆ ئەم وەگێڕانە كوردی‌یە بنووسین. هێندە دەڵێین كە: ئێمەش لە پێشدا هەمان دەقی وەرگێڕانەكەی مامۆستا ئیحسانمان وەرگێڕا بۆ كوردی، دوای ئەوە هاتین وەكو دوابەشی ئەم بەرهەمە دەقی كۆنی وتارە عەرەبی‌یەكەشمان كردە كوردی كە تەنها بایەخی مێژوویی ماوە. ئەوەش بە مەبەستی ئاسانكاری بۆ هەر توێژەرێكی بەڕێز كە بیەوێت لەو ڕووەوە لێكۆڵینەوەی لەسەر بكات.

(فارووق ڕەسووڵ یەحیا)

# پێشەکیی وەرگێڕانە عەرەبییەکە

به پێنووسی:

**مامۆستا ئیحسان قاسم صالحی**

مامۆستا "بەدیعوززەمان سـەعیدی نوورسـی" لـە تـافی لاویـدا ئـەم وتـارەی بـە زمـانی عەرەبی لەسەر مینبەری مزگەوتی ئەمەوی لە دیمەشـق، بـە تکـا و جـەختی زانایـانی شـام، ئاراستەی جەماوەرێکی زۆر کردووە کە بە شەوق و تاسەمەندی‌یەوە گوێبیستی بوون و، ژمارەیان لە دە هەزار کەس زیاتر دەبوو. تەنانەت کاتـێ گوتارەکـەی بـۆ یەکـەم جـار لـە چاپ درا، لە ماوەی چەند ڕۆژێکی کەمدا هەموو نوسخەکانی قۆزرانـەوە و لـە بـازاڕدا نەمان، بۆیە سەرلەنوێ - هەر لەو هەفتەیەدا - چاپ کرایەوە.

ئەمەش لە زستانی سالّی ١٩١١ز دا بوو، واتـە پێـش هەڵگیرسـانی جـەنگی جیـهانیی یەکەم.

پاشان ڕۆژانی خوێناویی ئەو جەنگە هاتە پێش، کە بە ئـاوابوونی ئەستێرەی دەوڵـەتی عوسمانی کۆتایی پێ هات. دوای ئەوەش ڕۆژگارانی پڕ لە مەینەتی هاتنە سەر ڕێـی ژیـانی مامۆستا نوورسی، کە بریتی بوون لە زنجیرەیەك "گرتن" و "دوورخسـتنەوە" و "دادگـایی کردن". هەموو ئەوانەش هەتا سالّی ١٩٥٠ز بەردەوام بوون.

بـە درێژایـی ئـەم وشـکە سـاڵانە، مامۆسـتا نوورسـی پێداچوونـەوەی ئـەم وتـارەی بـۆ نەڕەخسا، تەنانەت هەر چاویشی پێ نەکەوتەوە، هـەتا سـالّی ١٩٥١ز، کـە ئـەو دەمـە لـە تاراوگەی شارۆچکەی "ئەمیرداغ" ژیانی بەسەر دەبرد، یەکێك لە هاوڕێیـانی لـە شـاری "وان" نوسخەیەکی چاپکراوی بۆ نارد..

مامۆستا نوورسی چاوی بەم گوتارەی خۆیدا گێڕایەوە کە چل ساڵ لەوەوپێش ئاراستەی کردبوو. ئنجا دەستی دایە وەرگێڕانی بۆ زمانی تورکی. یان وا شایانترە کە بڵێین: دەستی کرد بە پاکژکردن و دارشتنەوەی سەرلەنوێی بە زمانی تورکی. چونکە چەند برگەیەکی گرنگ و چەندین پەراوێزی بەنرخی بۆ زیاد کرد و، ئەوانەشی لێ لابرد کە لەوانە بێت گشتگیریی وتارەکە سنووردار بکەن و، هەندێ لە باسەکانیشی حەواڵەی بەشەکانی (پەیامەکانی نوور) کرد، ئنجا لە شێوەی واندا بە چەند کەسێکی لە قوتابییانی خۆی وتەوە.

مەلا عەبدولمەجیدی برای، لەسەر داوای دانەر، ئەم دەقە تورکی‌یەی بە شێوازەکەی خۆی وەرگێڕایە سەر زمانی عەرەبی و، بە نووسینەوەی دەستی و لە ناوەندێکی تەسکدا بڵاو کرایەوە، چونکە ئەو دەمە چاپەمەنی بە پیتە عەرەبی‌یەکان لەو وڵاتەدا قەدەغە کرابوو.

ئنجا لە سەرەتای شەستەکاندا "دکتۆر محەممەد سەعید رەمەزان بۆتانی" ئەم وەرگێڕانەی مەلا عەبدولمەجیدی بە شێوازە سازگارەکەی خۆی دارشتەوە و، لە کاتی خۆیدا چەند جارێکی زۆر لە چاپ درایەوە..

بەڵام لەبەر ئەوەی وەرگێڕانە عەرەبی‌یەکە لە بناغەدا بە ناتەواوی مابووەوە و، تەرجەمەی هەموو بابەتەکانی لەخۆ نەگرتبوو، ئەوا بە داخەوە ئەم دارشتنەوە جوانە گەلێ برگەی گرنگ و مەسەلەی گەورەی تێدا نەبوو کە پەیوەندییان بە رووداوەکانەوە هەیە، جگە لەوەی کە تەنها دارشتنەوەی وەرگێڕانی ناوبراوی وتارەکە بوو، بێ ئەوەی پاشکۆ و پاشبەندەکانی لەخۆ بگرێت.

پاش ئەوە، مامۆستا "عاصم الحسيني" دەقە تورکی‌یەکەی سەرلەنوێ وەرگێڕایەوە سەر زمانی عەرەبی. ئەم وەرگێڕانەی ئەو، چ لە رووی شێواز و چ لە رووی گەیاندنی واتادا وەرگێڕانێکی باش بوو. لەبەر ئەوە، قوتابییانی نوور ساڵی ١٩٧٤ز لە چاپخانەی "بولسيه" لە بەیروت لە چاپیان دا.

منیش لە لایەنی خۆمەوە هاتم وەرگێڕانەکەی کاك "عاصم"م سەرتاسەر لەگەڵ دەقە تورکی‌یەکەدا بەرامبەر کردەوە و، گەیشتمە ئەم دەرەنجامانەی خوارەوە:

١ - بینیم هێنده بەنرخە کە وەرگێرانی تر ناگاتە ئاستی، نە لە گەیاندنی واتاکان و نە لە دارشتنی توندوتۆلی رستەکاندا و، وەختە لەگەڵ دەقی تورکیی وتارەکەدا رێکاورێك دەربچێت، مەگەر لە هەندێ رستە، یان لە چەند بەشێکی هەندێ برگەیدا نەبێت.

٢ - بەڵام وا دیارە ئەو برا بەرێزە دەرفەتی بۆ نەلواوە کە وەرگێرانەکەی تەواو بکات، ئەوەتا هەموو پاشکۆکانی وتارەکەی بە تەواوی وەرنەگێراوە. چونکە ئەو وتارانەش کە مامۆستا نوورسی لە رۆژنامە ناوخۆییەکانی سەردەمی ئیتیحادی‌یەکاندا بلاوی کردوونەتەوە و دوایی کردوونی بە پاشکۆی دەقە تورکی‌یەکە، گرنگیی خۆیان هەیە لە پیشاندانی وێنەیەکی تەواوەتی و روونی بارودۆخە سیاسی و کۆمەڵایەتی‌یەکانی ئەو دەمە، تەنانەت هی تەوژمە فیکری‌یەکانیش کە ئەو کاتە لە کۆمەڵگادا شەپۆلیان دەدا.

٣ - لەبەر هەموو ئەمانە، بە پێویستم زانی کە سەرلەنوێ دەقی تورکیی وتارەکە لەگەڵ تەواوی پاشکۆکانیدا بۆ زمانی عەرەبی وەربگێرم، تاکو خوێنەری بەرێز بۆ خۆی پەی بە هەموو لاکانی ئەو بابەتانە ببات کە مامۆستا نوورسی لێیان دواوە و، لە هەموو روویەکەوە شارەزایان ببێت.

لە دەمی وەرگێران و بەرامبەرکردنی دەقە تورکی و عەرەبی‌یەکەدا، بەم هەنگاوانەی خوارەوەدا رۆشتم:

١ - دانانی ئەو دەقە تورکی‌یەی کە خودی مامۆستا نوورسی دایرشتووەتەوە، لەگەڵ پاشکۆکانیدا، بە بناغەی کارەکەم. ئەویش ئەو دەقەیە کە مامۆستا نوورسی خۆی لە نێوان باسەکانی کتێبی (تأريخچهء حيات: Tarihce-i Hayat)دا دایناوە، کە ژیاننامەی خۆیەتی و، قوتابی‌یە نزیکەکانی نووسیویانە و، دوای پێداچوونەوە و بەسەرپەرشتیی خۆی پێی قایل بووە و، لە ژیانی خۆیشیدا چاپ کراوە.

ئەو نوسخەیەی وتارەکەش کە پشتم پێ بەست لە بلاوکراوەکانی سالی (١٩٧٩)ی دەزگای "سۆزلەر"ە، لە ئەستەمبوول.

٢ - بەرامبەر کردنەوەی هەموو برگەیەکی دەقە تورکی‌یەکە لەگەڵ نوسخەی عەرەبیی دەقی وتارەکەدا، ئەوەی کە سالی ١٩٢٢ز بۆ یەکەم جار لە ئەستەمبوول لە چاپخانەی ئەوقافی ئیسلامی چاپ کراوە.

دەبێ ئەوەش بزانین کە ئەم یەکەم دەقە عەرەبییەی وتارەکە، تەنها گرنگیی مێژوویی ماوە، چونکە وەك ڕوونمان کردەوە دانەر خۆی پاکژکاریی تێدا ئەنجام داوە.

٣ - هێشتنەوەی وەرگێڕانەکەی کاك "عاصم" وەکو خۆی لە هەر شوێنێکدا کە ڕێکی دەقە تورکییەکە بوو بێت، لەگەڵ ئاڵوگۆڕی پێویست لە بڕگە و ڕستەکاندا، تاکو زیاتر لە دەقە تورکییەکە نزیکی بخاتەوە و بە تەواوی ئامانجی دانەر بە دەستەوە بدات. هاوکات لەگەڵ تەواوکردنی وەرگێڕانی ڕستە و بڕگە ناتەواوەکانی وەرگێڕانی ناوبراو.

٤ - وەرگێڕانی تەواوەتیی سەرجەم پاشکۆکانی و، هەموو ئەو وتارانەش کە خراونەتە ناو ئەو پاشکۆیانە.

٥ - دانانی چەند پەراوێزێکی پێویست بۆ خوێنەری بەڕێز، تاکو ئەو زاراوە سیاسی و مێژووییانەی بۆ ڕوون ببێتەوە کە ئەو کات و سەردەمە باویان هەبووە.

٦ - دەستنیشان کردنی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز و، دیاری کردنی ناوی سوورەت و ژمارەی ئایەتەکە.

٧ - تەخریجی فەرموودە پیرۆزەکان، بە پشت بەستن بە کتێبە باوەڕ پێ کراوەکان.

**ئیحسان قاسم صالحی**

مانگی موحەڕڕەمی ١٤٠٩ك

## پێشەکیی دانەر بۆ (وتاری شام)[1]

باسمه سبحانه

﴿وإنْ مِنْ شَيْءٍ إلاّ يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِ﴾

السلام عليكم ورحـــمة الله وبركاته أبداً دائماً

برا ئازیز و بەوەفاکانم!

ئەم پەیامە عەرەبی‌یە چل ساڵ پێش ئێستا بە دەرس لـە مزگـەوتی ئەمـەویی دیمەشقدا و لەسەر جەختی زانایانی ئەوێ پێشکەش کراوە و، نزیکـەی دە هـەزار کـەس گوێیـان لـێ ڕاگرت، کە بەلای کەمەوە سەد کەس لە گەورە زانایانی شامیان لە نێواندا بوو.

"سـەعیدی کـۆن" بـە هەسـتی پێش ڕوودان هەستی بەو ڕاستی‌یانە کردبوو کـە بـە دڵنیایی و یەقینێکی تەواوەتی وەك مژدەیەك لەو وتارەدا ڕایگـەیاندن، چونکـە پێـی وابـوو ئەو ڕاستی‌یانە نزیکن بێنە دی. بەڵام هەردوو جەنگە گەورەکـە و ئیسـتیبدادی ڕەهـایش، کە چارەکە سـەدەیەکی خایـاند[2]، بـوون بـەهۆی ئـەوەی چـل پـەنجا سـاڵ هاتنـەدیی ئـەو ڕاستی‌یانە دوا بکەوێت.

---

(١) ئەم پێشەکی‌یە مامۆستا نوورسی بۆ دەقی تەرجەمەی "وتاری شام"ی نووسیوە، کە خۆی وەری گێڕاوە بۆ تورکی. (وەرگێڕ)

(٢) واتە لە کۆتایی خەلافەتی عوسمانی‌یەوە لە سالی (١٩٢٤ز) تاکو سالی (١٩٥٠ز). (وەرگێڕ)

وا ئێستا خەریکە نیشانەکانی هاتنەدیی ئەو مژدانەی کە هەواڵی لە بارەیانەوە دا، لە ئاسۆی جیهانی ئیسلامیدا هەڵدێت..

بەو واتایەی کە ئەم وانە گرنگە تەنها وتارێکی کۆن نییە کاتی بەسەرچووبێت، بەڵکو وانەیەکی ئیسلامیی کۆمەڵایەتیی وەهایە کە بە درێژایی ئەم ماوەیە تازەیی و تەڕی و پاراوی و ڕاستیی خۆی پاراستووە. تەنها ئەوەندە نەبێت کە ساڵی (١٣٢٧ك) بووە بە ساڵی (١٣٧١ك) و، مزگەوتی "جیهانی ئیسلامی"ش کە سێ سەد و حەفتا ملیۆن دانیشتووی لەخۆ گرتووە[1] ڕۆشتووەتە شوێنی "مزگەوتی ئەمەوی".

لەو باوەڕەدام وانەیەکی وەکو ئەمە شایانی وەرگێڕانە.

سەعیدی نوورسی

* * *

(١) ژمارەی موسڵمانان بووە لەو کاتەدا. (وەرگێڕ)

## ڕێبازی پەیامی نوور
## لە گەیاندنی بانگەوازیدا

**(لێرەدا وەڵامێکی بایەخدار بۆ پرسیارێکی تەواو گرنگ تۆمار دەکرێت، چونکە "سەعیدی کۆن" بەهۆی "هەستی پێش ڕوودان"ەوە، وانە دەراساکانی پەیامەکانی نوور و کاریگەریی ئەو وانانەی وەك بە چاو بیانبینێت ئاوا لەو وانەیەدا خستووەتە ڕوو کە چل ساڵ پێش ئێستا بە وتار ئاراستەی کردبوو).**

زۆر کەس لە من و لە برایانی نووریان پرسیوە و ئێستاش هەر دەپرسن کە:

بۆچی پەیامەکانی نوور لە بەردەم ئەم کۆمەڵە زۆرەی گومڕایان و فەیلەسووفە نەیار و سەرسەختەکانیدا نابەزێت و شکست ناهێنێت؟

خۆ هەرچەندە بەربەستێکی - تا ڕادەیەك - وەهایان داناوە کە ڕێ لە بڵاوبوونەوەی ملیۆنان کتێبی بەنرخی ئیسلامی بگرێت و، وێڕای ئەوەش کە زۆرینەی خەڵکیان بە تایبەتی لاوانیان لە ڕاستییەکانی ئیمان بێ بەش کردووە، بەهۆی ئاسانکردنی ڕێی هەرزەیی بۆیان و لەخشتە بردنیان بە تام و چێژەکانی ژیانی دنیا و، سەرباری هەوڵدان بۆ شکاندنی شان و شکۆی پەیامەکانی نوور بە هەموو هۆکارێکی غەدر و ستەم و، شێوازەکانی هێرشی توندوتیژ و، هەڵبەستنی درۆ و دەلەسە و، بڵاوکردنەوەی پروپاگەندەی ساختە و، ترساندنی خەڵکی لەو پەیامانە و، هاندانیان بۆ دەست لێ بەردانیان.. کەچی سەرباری هەموو ئەمانەی باس کران، پەیامەکانی نوور هەر بڵاو بوونەوە.

ئایا چ حیکمەتێك لەم بڵاوبوونەوە بێ وێنەیەدا هەیە، کە بە ڕادەیەکە تەنها ئەو پەیامانەی بە دەست نووسراونەتەوە گەیشتوونەتە شەش سەد هەزار نوسخەو، بەوپەڕی شەوق و تاسەمەندی‌یەوە بە پەنهانی بڵاو دەبنەوەو، خەڵکیش چ لە ناوخۆی وڵات و چ لە دەرەوەیدا بەوپەڕی خۆشەویستی و شادمانی‌یەوە پێشوازیی لێ دەکەن و، دەخوێنرێنەوە؟

جا لە وەڵامی چەند پرسیارێکدا کە بەم واتایەی سەرەوە ئاراستەمان دەکرا، دەڵێین:

وەڵام:

پەیامەکانی نوور - کە تەفسیری ڕاستەقینەی قورئانی پیرۆزن - بە ڕوونکردنەوەی ئیعجازی واتا مەزنەکانی قورئان، ڕوونی دەکەنەوە کە:

" گومڕایی" دۆزەخێکی مەعنەویی هەر لەم دنیایەدا بۆ مرۆڤ تێدایە. هەروەك دەیچەسپێنن کە "ئیمان"یش بەهەشتێکی مەعنەویی - هەر لەم دنیایەدا - بۆ ئیمانداران لەخۆ گرتووە.

هەروەها بەڵگە دەهێننەوە لەسەر ئەوەی کە گوناهـ و فەساد و چێژ و لەزەتە حەرامەکان گەلێ ئازاری مەعنەوی دەرخواردی گیانی مرۆڤ دەدەن، هەروەك کردەوەی چاك و ڕەوشتە جوانەکان و ڕەفتارکردن بە ڕاستی‌یەکانی شەرع هێندە چێژ و لەزەتی مەعنەویی ئەوتۆیان تێدایە کە زۆر لە هی لەزەتەکانی بەهەشت دەچن.

پەیامەکان - بەم شێوازەیان - گومڕایان و کەسانی هەرزە لەوە ڕزگار دەکەن کە لەسەر هەڵە و گومڕایی بەردەوام بن، بە مەرجێ هێندەی تۆزقاڵێك ژیریان مابێت!

چونکە ئەم چەرخەی ئێمە دوو حاڵەتی ترسناکی تێدایە:

یەکەمیان:

هەست و نەستە ماددی‌یەکانی مرۆڤ پاشەڕۆژ نابینن. هەر لەبەر ئەوەیە کێشی "درەم"ێك لەزەتی حازری ئێستایان لە چەندەها "باتمان"[1] چێژ و لەزەتی درەنگ و دوا وەخت پێ باشترە.

(١) "درەم" کێشێکە بەرامبەر بیست گرام. (هەنبانە بۆرینە) مەبەست کەمی‌یە. "باتمان"یش کێشێکە لە تورکیا بەرامبەر هەشت کیلۆ دەردەچێ. (Yeni Lugat) لێرەدا مەبەست زۆری‌یە. (وەرگێڕ)

بەڵێ، لەم چەرخەی ئێمەدا ئەم چەشنە هەست و نەستانە بەسەر هۆش و ژیری و بیری مرۆڤدا زاڵ بووە. لەبەر ئەوە، تاکە ڕێگای ڕزگار کردنی کەسی هەرزە، لە هەرزەییەکەی، لەوەدایە کە هەر لەناو خودی چێژ و لەزەتەکانیدا ئازاری ئەو لەزەتەی پیشان بدرێت و، یارمەتی بدرێت کە بەسەر ئەو هەست و نەستەیدا زاڵ بێت..

چونکە مرۆڤ لەم ڕۆژگارەی ئێمەدا هەرچەندەش شارەزا و ئاگاداری چێژ و ناز و نیعمەتە بەنرخە ئەڵماس ئاساکانی دوارۆژ بێت، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا فەزڵی چەند تام و لەزەتێکی بێ نرخی دنیایان بەسەردا دەدات کە لە بێنرخیدا وەك چەند وردە شووشەیەکی شایستەی شکان و ورد بوونن. وەك ئەوەی کە ئەم ئایەتە پیرۆزە ئاماژەی بۆ کردووە:

﴿الَّذِينَ يَسْتَحِبُّونَ الْحَيَاةَ الدُّنْيا عَلَى الآخِرَةِ﴾ (إبراهيم: ٣).

جا لەسەر بناغەی ئەمە و، لەبەر خۆشویستنی لەڕادەبەدەری بۆ دنیا، شوێن گومڕایان دەکەوێت، هەرچەندەش لە پێشدا لە ئیمانداران بوو!

تاقانە ڕێی ڕزگاری لە مەترسیی ئەم شوێنکەوتنە: دەرخستن و نیشاندانی ئازارەکانی دۆزەخە – هەر لەم دنیایەدا – بۆ ئەو کەسانەی گیرۆدەی بوون.

ئەمەش ئەو ڕێبازەیە کە "پەیامەکانی نوور" لەسەری دەڕۆن.

سەرسەختیی ئیلحاد لەم چەرخەدا و.. بەربەستەکانی ئەو گومڕاییانەی کە لە غروور و ستەمی زانستە نوێکانەوە سەرچاوەی گرتووە و.. ئەو ملنەدان و پشت هەڵکردنەی کە ئەنجامی ڕاهاتنە لەسەر هەرزەیی و لە ڕێ ترازان..

هەموو ئەمانە، کارێکیان کردووە کە ڕێژەی ئەو کەسانەی پەند وەردەگرن لە دە کەسدا تەنها یەك، تەنانەت لە بیست کەسدا یەك کەس بێت! ئەوەش دوای ئەوەی کە بەدیهێنەری شکۆمەندی پێ دەناسێنرێت و، بوونی دۆزەخی بۆ دەچەسپێنرێت و دەترسێنرێت لە سزاکەی، تاکو خۆی لە کردەوەی خراپ و گوناهەکان بپارێزێت. کەچی دواتریش دەڵێت:

"خوای گەورە لێبوردە و میهرەبانە.. دۆزەخیش گەلێ دوورە"!

پاشان لەوانەیە لەسەر گەمە و کاری بێهوودەی بەردەوام بێت. ئیتر "دڵ" و "گیان"ی لە بەردەم زەبر و زەنگ و خۆسەپاندنی ئارەزووەکانیدا دەڕووخێن.

بەم جۆرە "پەیامەکانی نوور" لە زۆربەی ئەو بەراوردانەی کە سازیان دەکات، ئەو ئەنجامە ئازاربەخشانە ڕوون دەکاتەوە کە هەر لەم دنیایەدا کوفر و گومڕایی دەیهێننە ڕێی مرۆڤ و، لەم ڕێیەوە تەنانەت سەرسەخت ترین مرۆڤـی ئارەزووپەرست لـە هـەرزەیی و ڕابواردنە حەرام و شوومەکانیان دوور دەخاتەوە و، لە پێش چاویـانی ناشیرین دەکات. هەروەك هانی مرۆڤانی ژیر و هۆشمـەندیش دەدات کـە لـە دەرگـای تۆبـە و لێخۆشبوونی خواوەند بدەن.

بۆ نموونە:

بـەراوردە ڕوون و ئاسـانەکانی وتـەی شـەشەم و حەوتـەم و هەشـتەمی "وتـە بچووکـەکان" و، بـەراوردە دوور و درێژەکـانی هەڵوێستی سێ‌هەمی وتـەی سـی و دووهـەم، گـومڕاترین و هـەرزەترین کـەس دەخـەنە ترس و لـەرزەوە لـەو پاشـەڕۆژ و ئەنجامانە و، هانیان دەدەن کە پەند و دەرس و ڕێنماییان لێ وەربگرن.

لێرەدا وەك نموونەیەك بە پوختی ئاماژە بۆ ئەو ڕاستی‌یانە دەکەین کە "سەعیدی کۆن" لە دەمی گەشت و گەڕانی ئەندێشەییدا و لە ناوەندی وردبوونەوە و تێڕامانی لـە "ئایەتی نـوور" هەستی پێ کـردن و بینینی. درێژەکـەی لـە کۆتـایی کتێبـی "مـۆری تەسـدیقی غەیبی"دایە، هەرکەسێك پێی خۆشە ئاگاداری ئەو درێژەپێدانە بێت با سەرێك لەو کتێبـە ناوبراوە بدات. ئەو پوختەیەش بەم جۆرەیە:

لـە دەمی ئـەو گەشـتە ئەندێشـەییەمدا جیـهانی "زینـدەوەران"م دی، کـە جیهانێکـە پێویستی بە ڕۆزی و بژێوە. جا کاتێ لە گۆشەنیگای فەلسەفەی ماددییـەوە سـەرنجم دا، جیهانی زیندەوەرانی بە جیهانێکی ترسناك و ئازاربەخش پیشان دام، لەبەر ئەو لاوازی و دەستەوسانی‌یەی تیایاندایە و بەهۆی موحتاجی و برسێتیی لەڕادەبەدەریان.

لەبەر ئەوەش کە من لەو سـەرنجەدا بـە چاوی بێ ئاگـا و گومڕایـان بـۆ ئـەو جیهانـەم دەڕوانی، ئەوا لەتاو ئەو دیمەنە هاوارێکی پڕ لە داخ و خەم و ئازارم هەڵکێشا! کتوپڕ ئەو جیهانەم بە چاویلکەی ئیمـان و حیکمـەتی قورئـان هاتـە بـەرچاو! دەبینـم نـاوی جوانـی: "الرحمن" لە بورجی "الرزاق"ەوە بە وێنەی خۆری درەخشان هەڵدێت، ئیتر ئـەو جیهانـە برسی و بەدبەختەی زیندەوەرانی ڕوونـاك کـردەوە و، نـووری سـۆز و میـهرەبانیی خـۆی بەسەردا پەخشاندن.

پاشان هەر لە ناوەندی ئەم جیهانی زیندەوەرانەدا جیهانێکی ترم بەدی کرد کە جووجەڵە و بێچووە بچووکەکانە و، لە ناوەندی لاوازی و دەستەوسانی و موحتاجیدا دەتلێنەوە. کە لە سۆنگەی یەکەمەوە سەیری ئەو جیهانەم کرد، بە جۆرێك هاتە بەرچاوم کە تاریکاییەکی خەمناك و ئازاربەخش دایپۆشیبوو، بە ڕادەیەك کە هەموو مرۆڤێك بەزەیی پێیاندا دەهاتەوە. جا لەبەر ئەوەی بە چاوی گومڕایان بۆ ئەو جیهانەم دەڕوانی، ئەوا لەتاوا هاوارێکم کرد و وتم: ئاخ و داخ بۆ ئەم بارە ناهەموارە!

یەکسەر ئیمان چاویلکەیەکی پێ بەخشیم و، لە ناوەندی ئەم چاویلکەیەوە ناوی "الرحیم"م بینی کە لە بورجی "شەفەقەت"ەوە هەڵدەهات و، ڕەنگە نەخشاوە جوانەکانی خۆی بڵاو دەکردەوە، بە ڕادەیەك کە ئەو جیهانە خەمناکەی گۆڕی بە جیهانێکی شاد و کامەران، هەروەك فرمێسکەکانی سکاڵا و ئازار و خەم و خەفەتی هەردوو چاوەکانیشمی گۆڕی بە فرمێسکی خۆشی و شوکرانە و سوپاسگوزاری.

پاشان جیهانی "مرۆڤ"م بە وێنەی پەردەیەکی سینەمایی هاتە بەرچاو. منیش بە چاویلکەی گومڕایان سەرنجم دا، بینیم جیهانێکی تاریك و ترسناکە. ئیتر خۆم بۆ ڕانەگیرا و، لە ناخی دڵمەوە ئاخ و هاوارێکی ئازاربەخشم هەڵکێشا و، وتم: ئاخ، بە داخەوە!

چونکە هیوا و ئاواتەکانی خەڵکی کە هەتا ئەبەد درێژخایەنە و.. بیر و بۆچوونەکانیشیان کە دەوراندەوری گەردوونی داوە و.. ئارەزووە بەتین و، توانا و لێهاتنە سروشتییەکانیان کە تاسەمەندی هەتاهەتایی و بەهەشت و بەختەوەریی هەمیشەییە و.. هێزەکانیان کە هەر بە سروشت بێ سنوورە و.. پێویستییەکانیان کە ڕووی لە ئامانج و مەبەستە لە سنوور بەدەرەکانە و.. تووشبوونیان بە چەندین هێرشی بێ کۆتایی و نەبڕاوەی بەڵا و موسیبەت و دوژمنانیان، سەرباری دەستەوسانی و لاوازییان..

کەچی لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، تەمەنەکەیان تابڵێی کورتە و.. ژیانێکی پڕ لە نیگەرانی و غەڵبە و هەرا بەسەر دەبەن و.. هەموو ڕۆژێك تەنانەت هەموو سەعاتێك لە ئەندێشەی مردندان و.. دووچاری دەردیسەریی گوزەران دەبن و.. ڕووبەڕووی ئازاری جودایی و لێکدابڕان دەبنەوە کە لە هەموو شتێ زیاتر ئازاری دڵ و دەروون دەدات و پتر

قورسە لەسەر ناخ و ویژدانی مرۆڤ.. سەرەڕای ئەوەی کە بە چاوی بێ ئاگاییەوە سەیری گۆڕ و گۆڕستان دەکەن و، لەمەشەوە بە وێنەی دەرگای تاریکستانێکی هەمیشەیی دەبینن و، چاوەڕوانن یەك لە دوای یەك و کۆمەڵ لە دوای کۆمەڵ فڕێ بدرێنە ناوی!

لەم کاتەدا کە جیهانی مرۆڤم بەم جۆرە بینی نوقمی ئەم چەشنە تاریکاییانە بووبوو.. لەم دەمەدا کە خەریك بوو لە ناخی دڵ و ڕۆح و ژیرمەوە، تەنانەت بە هەموو هەست و نەستەکانم و بگرە بە هەموو گەردیلەکانی وجوودم، هاوارم لێ هەڵبسێت..

ئا لەم کاتەدا، ئەو نوورەی کە لە قورئان و ئیمانی دامەزراو بە قورئانەوە سەرچاوەی گرتووە، هات و ئەو چاویلکە گومڕاکەر و ڕێ تێکدەرەی تێکشکاند و، چاوێکی پێ بەخشیم کە بە هۆیەوە ناوی "العادل"م بینی لە بورجی "الحکیم"ەوە - واتە لە واتای ئەودا - هەڵهاتبوو.. ناوی "الرحمن"یش لە بورجی "الکریم" و.. ناوی "الرحیم"یش لە بورجی "الغفور" و ناوی "الباعث" لە بورجی ناوی "الوارث" و.. ناوی "المحیي" لە بورجی ناوی "المحسن" و.. ناوی "الرب"یش لە بورجی "المالك"ەوە چەشنی خۆر هەڵهاتن..

ئیتر ئەو ناوانە، بە نووره درەخشانەکانی خۆیان، چەندین جیهانی زۆری ناو جیهانی تاریکی مرۆڤیان ڕۆشن کردەوە و گۆڕییان بە جیهانێکی گەش و شادمان.. هەروەك بە کردنەوەی چەند پەنجەرەیەك بەسەر جیهانی دوارۆژی قیامەتدا ئەو حاڵەتە دۆزەخ ئاسایانەشی ڕەواندەوە، بە ڕادەیەك کە ڕووناکییەکانی گەیشتنە هەموو لایەنێکی ئەو جیهانە داماوەی مرۆڤ. ئیتر لەبەر خۆمەوە وتم:

بە ژمارەی گەردیلەکانی جیهان "شوکر و سوپاس بۆ خوای گەورە"..

هەروەك بە "عین الیقین" بینیم و بە "علم الیقین"یش زانیم کە: "لە ڕاستیدا ئیمان بەهەشتێکی مەعنەویی تێدایە و، گومڕاییش دۆزەخێکی مەعنەویی هەر لەم دنیایەدا لەخۆ گرتووە".

پاشان لەو گەشتەمدا جیهانی "گۆی زەوی"م لێ دەرکەوت. بەڵام ئەو یاسا زانستییانەی کە فەلسەفەی دابڕاو لە ئایین تاریکایی خۆی هاویشتووەتە سەریان،

جیهانێکی لەوپەڕی نامۆیی و سەرسامی‌یان پیشانی ئەندێشەم دا. چونکە سەرنجم لەم زەوی‌یە دا کە:

حەفتا هێندەی خێرایی گولله تۆپ خێراترە و.. لە تەنها یەك ساڵدا ماوەیەکی بیست و پێنج هەزار ساڵی دەبڕێت و.. هاودەم لەگەڵ پێربوونیدا هەموو چرکەیەك لەوانەیە دووچاری تێکشکان و پارچە پارچە بوون ببێت و.. لەناوجەرگەی خۆیدا چەندین بوومەلەرزەی ترسناکی حەشار داوە و.. ئەم مرۆڤە بەدبەختەشی لەسەر پشتی خۆی هەڵگرتووە کە شوێنە بێ سنوورەکانی ئەم گەردوونە فراوانەی پێ دەگێڕێت..

ئیتر لەم ڕوانینەوە بەزەییم بە حاڵی ئەم مرۆڤەدا هاتەوە کە لە ناوەندی ئەم تاریکاییە ترسناکەدایە و، سەرم دایە ژان لەتاو سام و هەیبەتی ئەو دیمەنەی کە بینیم و، دنیام لە بەرچاودا تاریك داهات.. بۆیە لە تاوا چاویلکەی فەلسەفەم فڕێ دا و بە تەواوی تێکم شکاند.

ئنجا بەهۆی بینایییەکەوە کە بە دانستی قورئان ڕووناك بووبووەوە، سەیری زەویم کرد.. یەکسەر ناوە جوانەکانی بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی، چەشنی : (القدیر، العلیم، الرب، الله، رب السماوات والارض، مسخر الشمس والقمر) لە بورجی میهرەبانی و مەزنی و پەروەردگاریتی‌یەوە بە چەشنی "خۆر" هەڵهاتن و، ئەو جیهانە تاریك و سامناکەیان بە ڕووناکی‌یەکی هێندە جوان و درەخشان ڕازاندەوە کە بەم دوو چاوە ئیماندارەم بینیم:

گۆی زەوی لەوپەڕی ڕێکوپێکی و تەواوی و ملکەچیدایە بۆ مرۆڤ و، لە دۆخێکی ئارام و ئاسایشدایە و، ڕۆزیی هەموو ئەوانەی لەخۆ گرتووە کە لەسەر پشتی ژیان بەسەر دەبەن و، چەشنی کەشتی‌یەکی گەشتوگوزار وایە؛ بۆ سەیران و حەوانەوە و بازرگانی ئامادە کراوە و، هاودەم لەگەڵ بەدیهاتووانی سەرنشینیدا و لە قەڵەمڕەوێکی پەروەردگاری و فراواندا بە دەوری خۆردا هاتووچۆ دەکات و، لە وەرزەکانی بەهار و هاوین و پایزدا هێندە ڕزق و ڕۆزیی لە ئەستۆ نراوە کە وەکو شەمەندەفەر یان کەشتی یاخود فرۆکەیەکی پڕ لە ڕۆزی وایە..

ئیتر کە ئەمەم دی، یەکسەر وتم: بە ژمارەی گەردیلەکانی زەوی سوپاس بۆ خوا لەسەر نیعمەتی ئیمان (الحمد لله علی نعمة الایمان).

لە ڕۆشنایی ئەم نموونەیەدا دەتوانیت زۆربەی ئەو بەراوردانەی تر لێك بدەیتەوە کە "پەیامەکانی نوور" لە خۆی گرتوون و، دەیچەسپێنن کە:

هەرزە و گومڕایان هەر لە دنیادا ئازار و سزای دۆزەخێکی مەعنەوی دەچێژن.. هەروەك چاکەکار و ئیماندارانیش - هەر لەم دنیایەدا - لەناو بەهەشتێکی مەعنەویدا دەژین و، دەتوانن لە ڕێی هەست و نەستە ئیسلامی و مرۆییەکانیان و دەرکەوتنی ئیمانەکەیان تامی لەزەتەکانی ئەو بەهەشتە مەعنەوی‌یە بچێژن. تەنانەت بە گوێرەی بەرزی و نزمیی پلەکانی ئیمانیان دەتوانن لەو چێژانە سوودمەند ببن.

بەڵام سروشتی ئەم چەرخە زریاناوی‌یەی کە ئەو تەوژمانەی تێدا باڵادەستن هەست و نەستەکان لەکار دەخەن و، سەرنجی مرۆڤ بۆ ئاسۆ چۆڵ و بەتاڵەکان و نوقم بوون تیایاندا ڕادەکێشن..

ئەم چەرخەی کە سروشتی وایە، ڕاتەکاندنێکی هێناوەتە کایەوە لەو جۆرەی کە هەستەکان لەکار دەخات و مرۆڤ لە هۆشی خۆی دەبات. لەبەر ئەوەیە کە گومڕایان بە جۆرێکی کاتی هەست بە سزا مەعنەوی‌یەکانیان ناکەن. ڕێڕەوانی ڕێی هیدایەتیش لە لایەنی خۆیانەوە بێ ئاگایی داویەتی بە سەریاندا، بۆیە ناتوانن ڕێزی شایستە لە چێژی ڕاستەقینەی ئیمان بگرن.

* * *

**دووهەم حاڵەتی ترسناکی ئەم چەرخە:**

ئەگەر جۆرەکانی گومڕایی هەڵقوڵاوی ئیلحاد و زانستە سروشتی‌یەکان و، سەرسەختی نواندنی بەرهەمی کوفری عینادیی ڕابوردوو لەگەڵ هی باری ئێستادا بەراورد بکرێن، هێندە لە چاو ئەمانەی سەردەمدا بچووك دەنوێنن کە هەر شایانی باس نابن.

بۆیە بەڵگەکانی زانایانی ئیسلام و لێکۆڵینەوەکانیان، سەروزیادی نەهێشتنی پێویستی و، پڕکردنەوەی کەلێنەکانی ڕۆژگاری خۆیان بوون..

چونکە "کوفر"ی سەردەمەکانی ئەوان، لەبەر ئەوەی لەسەر بناغەی "گومان" دامەزرابوو، بە خێرایی لایان دەبرد. ئەوەبوو "ئیمان بە خوا" لەو دەمەدا هێندە شتێکی

گشتی بوو کە دەیانتوانی لە ڕێی ناساندنی خوا و یادخستنەوەی سزای دۆزەخەوە خەڵکانێکی زۆر لە هەرزەیی و گومڕایی دەربهێنن و بیانگێڕنەوە.

بەڵام ئەمڕۆ حاڵ گۆڕاوە؛ چونکە لە ڕابوردوودا ئەگەر تەنها یەك مولحید لە شارێکدا ببوایە، ئێستا دەتوانرێ سەد کافر لە شارۆچکەیەکدا بدۆزرێتەوە! ژمارەی ئەوانەی کە بەهۆی لەخشتەچوونیان بە زانستە نوێکان خەڵکی لەڕێ دەترازێنن و، بە سەرسەختی و هەڵگەڕانەوە لە ڕووی ڕاستییەکانی ئیمان ڕادەوەستن، چەندین ئەوەندە، بگرە سەد هێندەی جاران پەرەی سەندووە..

جا لەبەر ئەوەی سەرسەختەکانی ئەمڕۆ بە خۆپەسەندیی فیرعەون ئاسا و گومڕاییەکی ترسناکەوە نەیاری و بەرهەڵستی ڕاستییەکانی ئیمان دەکەن، ئەوا دەبێ بە چەند ڕاستییەکی خاوێن و پیرۆزی ئەوتۆ بەرهەڵست بکرێنەوە کە هێزی بۆمبای ئەتۆمییان هەبێت، تاکو بنەما و بناغەکانیان لەم دنیایەدا هەڵبتەکێنێت و، هێرش و پەلاماریان لە شوێنی خۆیدا ڕابگرێت، تەنانەت هەندێکیشیان بەرەو تەسلیم بوون و باوەڕهێنان بیات.

شوکر و سوپاسی بێ کۆتایی بۆ خوای گەورە کە "پەیامەکانی نوور" - کە موعجیزەیەکی مەعنەویی قورئانی حەکیمو، بریسکەیەکی ئیعجازەکەی ئەون - بوون بە دەرمانێکی شیفابەخش لە دژی ژەهرەکانی سەرجەم زامەکانی ئەم چەرخە خوێناوییەمان، چونکە توانییان لە ڕێی بەراوردە زۆرەکانیان و شمشێری ئەڵماسیی قورئانی پیرۆزەوە لەگەڵ سەرسەختترین کەللەڕەقدا بجەنگێن و، بە ئەندازەی گەردیلەکانی گەردوونیش بەڵگەی توندوتۆڵ و بەهێز لەسەر "یەکتایی خوا" و "ڕاستییەکانی ئیمان" بخەنە ڕوو.

لەوانەیە ئەم نهێنییە بێت کە وا ماوەی بیست و پێنج ساڵە ئەم پەیامانە لە ڕووی دژوارترین هێرشی دڕندانە ڕاوەستاون و شکستیش ناهێنن، بەڵکو هەمیشە و بەردەوام لەو بەربەرەکانێیەدا هەر زاڵ و سەرکەوتوون.

بەڵێ، بەراوردەکانی نێوان "کوفر و ئیمان.. هیدایەت و گومڕایی" کە پەیامەکانی نوور لە خۆی گرتوون، هێندە بە ئاشکرایی ئەم ڕاستییە ناوبراوە دەچەسپێنن کە بە چاو دەبینرێت. ئەوەتا - بۆ نموونە - هەرکەسێك بەڵگە و بریسکەکانی هەردوو مەقامی

"وتەی بیست و دووهەم" دەخوێنێتەوە.. یان سەیری هەڵوێستی یەکەمی "وتەی سی و دووهەم" دەکات.. یاخود پەنجەرەکانی "مەکتووبی سی و سێهەم" دەبینێت.. یان بە وردی سەرنجی یازدە بەڵگەکەی کۆمەڵە پەیامی "عەسای مووسا" دەدات و، بە هەمان شێوە سەرجەم بەراوردەکانی تری ناو پەیامەکانی نوور لێکدەداتەوە، بە باشی پەی بەوە دەبات کە:

ئەو ڕاستییانەی قورئان کە لە پەیامەکانی نووردا دەدرەوشێنەوە، دەتوانن دوای ئیلحاد و سەرسەختیی گومڕایانی سەرکەشی ئەم ڕۆژگارەی خۆمان ببڕن و، لە ڕیشەوە دەریان بهێنن.

جا هەروەك ئەو بەشە پەرش و بڵاوانەی پەیامەکانی نوور کە پەردە لە ڕووی مەتەڵ و ڕاستییەکانی بەدیهێنانی جیهان لادەدەن و گرنگترین وردەکاریی نهێنییەکانی ئایینیان لەخۆ گرتووە، لە کۆمەڵە پەیامی "شیکردنەوەی مەتەڵەکان"دا کۆ کرانەوە..

ئومێدێکی زۆرم بە خوای گەورە هەیە کە ئەو پارچە بڵاوانەش بە هەمان جۆر کۆبکرێنەوە کە بە بەڵگەوە دەیسەلمێنن گومڕایان هەر لەم دنیایەدا لەناو دۆزەخدا دەژین و، ئیمانداران و ئەهلی هیدایەتیش هەر لە دنیادا تام و چێژەکانی بەهەشت دەچێژن و، ئیمان تۆوێکی مەعنەوییە لە تۆوەکانی بەهەشت و کوفریش ناوکێکە لە ناوکەکانی زەققوومی دۆزەخ. بەڵێ، ئومێدەوارم ئەم بەشە پەرش و بڵاوانەی "پەیامەکانی نوور" لە کۆمەڵە پەیام(بەرگ)ێکدا کۆببنەوە و بە پشتیوانی و پشتگیریی خوای گەورە بڵاو بکرێنەوە(١).

**سەعیدی نوورسی**

* * *

(١) مامۆستای دانەر هەر لە ژیانی خۆیدا ئەو ئاواتەی هاتەدی، چونکە ئەو باسە ناوبراوانەی "پەیامەکانی نوور"ی لە بەرگێکی خنجیلانەدا کۆکردەوە بە ناونیشانی: (بەراوردەکانی نێوان ئیمان و کوفر.. هیدایەت و گومڕایی). (وەرگێڕ)

## دەقی وتاری شام

بسم الله الرحمن الرحیم

یەکەم شت ئـەو دیاری‌یـە مەعنەوییانـە پێشکەش دەکـەین کـە هـەموو گـیاندارێك بـە زمـانی حـاڵی ژیانەکـەی پێشکەشـی بەدیهێنـەری خـۆی دەکـات و، ئـەو شـوکر و سوپاسەشی ئاراستە دەکەین کە هەریەکەیان بە زمـانی حـاڵ لـە بارەگـای ئـەو خـواوەنـدە "واجب الوجود"ەدا دەری دەبڕێ کە فەرموویەتی:

﴿لا تَقْنَطُوا مِنْ رَحْمَةِ اللهِ﴾ (الزمر: ٥٣)..

هـەروەها صـەلات و سـەلامێکی بـێ کۆتـایی لەسـەر ئـەو محەمـەدە هەڵبژاردەیـەی پێغەمبەرمان ﷺ کە فەرموویەتی: (إنما بُعِثْتُ لأُتَمِّمَ مَکـارِمَ الأخـلاق). واتـە: خـوای گـەورە تەنـها لەبەر ئەوە منی بۆ لای خـەڵکی نـاردووە کـە تـەواوکاری بـە ڕەوشـتە جوانەکانی ئادەمیزاد ببەخشم و، مرۆڤایەتی لە ڕەفتـار و خـووە نـەفرەت لـێ کراوەکـان ڕزگار بکەم.

پاش حەمد و صەلات و سەلام..

ئەی برایانی عەرەبم کە گوێ بیستی ئەم وانەیەن لەم مزگەوتی ئەمەوی‌یەدا!

من بە نیازی ڕێنمایی کردنی ئێوە سەرنەکەوتوومەتە سەر ئەم مینبەر و مەقامەی کە لـە سەرووی سنووری خۆمەوەیە، نەخێر.. ئەوە کارێکی بەدەر لە وزە و توانای منە. چونکە لەوانەیە نزیکەی سەد گەورە زانای بەڕێز لە نێوان ئێوەدا هەبێت.

حاڵی من لە ئاراستە کردنی ئەم وتارەمدا بۆ ئێوەی بەڕێز وەکو هی ئەو منداڵە وایە کـە بـەیانیان دەڕوات بـۆ قوتابخانـە و، ئێوارانیـش دێتـەوە هـەرچی فـێر بـووە بـۆ بـاوکی دەگێڕێتەوە، تاکو هەڵەکانی بۆ ڕاست بکاتەوە و، بە نەرمونیانی و لەسەرخۆیی ڕێنمـایی بکـات. کەواتـە پـەیوەندیی ئێمـە لەگـەڵ ئێـوەدا وەك هـی منداڵـەکان وایـە لەگـەڵ گەورەکانیاندا. چونکە ئێمە سەبارەت بە ئێوە بە قوتابی دادەنرێین و، ئێوەش مامۆستای ئێمە و سەرجەمی نەتەوەی ئیسلامن. وا من هـەندێ لـەو شتانەی فێری بـووم، دەیانخەمـە ڕوو لە پێش چاوی مامۆستاکانمدا:

من وانەکانم لە قوتابخانەی ژیانی کۆمەڵایەتیی ئادەمیزاددا خوێندووە و، لەم کات و شوێنەدا فێری ئەوە بووم کە شەش نەخۆشی هەن ئێمەیان - لە ڕووی ماددییەوە - لە دەرگای سەدەکانی ناوەڕاستدا ڕاگرتووە، لە کاتێکدا کە بیانییەکان - بە تایبەت ئەوروپاییەکان - بەرەو داهاتوو هەڵفڕیون.

ئەو نەخۆشییانەش ئەمانەی خوارەوەن:

یەکەم: ژیانی نائومێدی و بێ هیوایی، کە لەناو ئێمەدا هۆکاری سەرهەڵدانی بەدەست هێناوە.

دووهەم: مردنی "ڕاستی" لە ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسیماندا.

سێهەم: حەز بە دوژمنایەتی.

چوارەم: نەزانینی ئەو پەیوەندییە نوورانییانەی کە ئیمانداران پێکەوە گرێ دەدەن.

پێنجەم: بڵاوبوونەوە و تەشەنە کردنی خۆسەپاندن (ئیستیبداد) بە وێنەی تەنینەوەی پەتا و درمە جۆراوجۆرەکان.

شەشەم: پەستاندنی ورە و چالاکی لە بازنەی بەرژەوەندییە کەسییەکاندا.

وا بە مەبەستی چارەسەر کردنی ئەم "شەش نەخۆشی"یە کوشندەیە، بە "شەش وشە" ئەو ڕێگا چارانە دەخەمە ڕوو کە لە دەرمانخانەی قورئانی حەکیم - کە وەك کۆلیژێکی پزیشکی وایە لە ژیانی کۆمەڵایەتیماندا - وەرم گرتوون، چونکە ئەوانە بە بناغەی چارەسەرەکە دەزانم.

## وشەی یەکەم

## (هیوا)

واتە:

پشت بەستنی توندوتۆڵ و تەواوەتی بە "میهرەبانیی خوای گەورە" و متمانە پێ بوونی.

بەڵێ، ئەی جەماوەری موسڵمان! لەسەر بناغەی وانەکانم کە لە ژیاندا فێریان بووم، خۆشحاڵم مژدەی ئەوەتان بدەمێ کە نزیکە نیشانەکانی سپێدەی بەیان لە ئاسۆدا

دەربکەون و، خۆری بەختەوەریی ئەم دنیای جیهانی ئیسلامە، بە تایبەت قەڵەمڕەوی عوسمانی و پێشکەوتنی ئیسلام هەڵبێت، نەخوازەڵا عەرەبەکان کە بێداری و پێشکەوتنی جیهانی ئیسلامی بەندە بە ڕابوون و بێداریی ئەوان.

وا من بە کوێرایی چاوی "نائومێدی" و، بەوپەڕی هێز و توانای خۆم و، بە دڵنیاییەکی ئەوتۆ کە هەموو گێتی بیبیستێ، ڕایدەگەیەنم کە[1]:

ئاینده تەنها هەر بۆ ئیسلامە و، جڵەوی فەرمانڕەواییش تەنها بە دەست ڕاستییەکانی قورئان و ئیمانەوە دەبێت. کەواتە با بەو قەدەرەی خوای گەورە و ئەو بەشەی کە بۆی دیاری کردووین ڕازی بین، چونکە ئێمە ئاییندەیەکی گەش چاوەڕوانمانە و، بیانییەکانیش ڕابوردوویەکی ئاڵۆز و شێواویان تۆمار کردووە.

ئەمە دەعواکەمە و، گەلێ بەڵگەشم لەسەری هەیە. بەڵام - دوای ڕێ خۆش کردن بە چەند پێشەکییەك - تەنها بەڵگە و نیوێکیان لێ باس دەکەم.

پێشەکییەکانیش ئەمانەن کە:

ڕاستییەکانی ئیسلام بەوە تایبەتمەندە کە بە تەواوی ئامادە و لەسەر پێیە بۆ پێشخستنی موسڵمانان بەرەو پێشکەوتنی ماددی و مەعنەوی.

● **سەبارەت بەوەی کە ئامادەیە بۆ پێشکەوتنی مەعنەوی:**

بزانن کە: ئەو مێژووەی ڕووداوە ڕاستەقینەکان تۆمار دەکات، ڕاستگۆترین شایەتە لەسەر ڕاستیی ڕووداوەکان. ئەوەتا مێژوو پیشانمان دەدات کە ئەو سەرکردە ژاپۆنییەی ڕووسی تێکشکاند، سەبارەت بە مەزنی و حەق بوونی ئیسلام ئەم شایەتییەی خوارەوەی داوە:

(مێژوو پیشانمان دەدات کە بە ڕێژەی توندوتۆڵیی ڕاستییەکانی ئیسلام و ڕێژەی پابەند بوونی موسڵمانان بەو ڕاستییانەوە، لە پێشکەوتندا هەنگاوی زیاتر دەنێن.

---

(١) چل و پێنج ساڵ پێش ئێستا "سەعیدی کۆن" لە ڕێی هەستێکی پێش ڕوودانەوە هەواڵی ئەوەی دا کە جیهانی ئیسلامی - لە پێشەنگیانەوە وڵاتە عەرەبییەکان - لە خۆسەپاندن و زاڵبوونی بیانییەکان ڕزگاریان دەبێت و، ساڵی (١٣٧١ك) چەندین دەوڵەتی ئیسلامی پێکدەهێنن. بەڵام ئەو کاتە بیری لە دوو جەنگە جیهانییەکە و ئەو ئیستیبدادە ڕەهایەش نەکردبووەوە کە نزیکەی چل ساڵی خایاند، بۆیە مژدەی ئەوەی کە لە (١٣٧١ك)دا هاتەدی وا ڕاگەیاند کە (١٣٢٧ك) ڕوو بدات، بێ ئەوەی هۆی دواکەوتنەکە ڕەچاو بکات.

(دانەر)

هەروەك بە ئەندازەی لاواز بوونی دەستگرتنیان بەو ڕاستی یانەوە، دووچاری دواکەوتن و پووکانەوە و ئالۆزی و پشێوی دەبن و شکست دەهێنن).

بەلاّم ئایینەکانی تر بە پێچەوانەی ئیسلامەوەیە؛ واتە هەتا شوێنکەوتووانیان بە لاوازی دەست بە ئایینەکەیانەوە بگرن و دەمارگیری و توندوتۆڵی یان لە ئاییندا ڕوو لە کزی بێت، پتر پێش دەکەون و.. تا چەندەش دەمارگیر و پابەند بن بە ئایینەکەیانەوە، دووچاری دواکەوتن و پشێوی و ئالۆزی دەبن!

ئەمە بڕیاری مێژووە.. ڕۆژگاریش تا ئێستا هەر وا گوزەراوە.

هەر لە باشترینی سەدەکان و چەرخی بەختەوەری یەوە هەتا ئێستا، مێژوو موسڵمانێکی پیشان نەداوین کە لە ئەنجامی داوەریی ژیری و بەڵگەی یەقینی یەوە دەستی لە ئایینەکەی خۆی هەڵگرتبێت و ئایینێکی تری پێ باش بووبێت. لە کاتێکدا کە خەڵکانێکی زۆر لە شوێنکەوتەی ئایینەکانی تر - تەنانەت دەمارگیرەکانیشیان، چەشنی ڕووس و ئینگلیز - لە ئەنجامی داوەریی ژیری و بەڵگەی عەقڵی یەوە ئایینی ئیسلامیان لە ئایینەکانی خۆیان بەلاوە باشتر بووە و، موسڵمان بوون. لێرەدا ئاوڕ لە چاولێکەریی خەڵکانی عەوام نادرێتەوە، چونکە پشتی بە هیچ بەڵگەیەك نەبەستووە. هەروەك بایەخ بە کاری لە ئایین دەرچوون و هاتنەدەرەوە لە ڕاستی یەکانی نادرێت، چونکە ئەوە بابەتێکی ترە. لای هەموانیش ئاشکرا و زانراوە کە مێژوو بۆمان دەردەخات ژمارەی ئەوانەی دوای بەکارهێنانی "داوەریی ژیری" دەستە دەستە و کۆمەڵ بە کۆمەڵ دێنە ناو ئایینی ئیسلامەوە، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لە زیادبووندایە[1].

---

(١) بەڵگە لەسەر ئەم دەعوایە ئەوەیە کە سەرباری ڕوودانی دوو جەنگی جیهانی و سەرهەڵدانی ئیستیبدادی ڕەها و دژوار، دەبینین کە دوای چل و پێنج ساڵ:

١ - هەندێ دەوڵەتی بچووکی چەشنی سوید و نەرویج و فنلەندا وتنەوەی وانەکانی قورئانیان لە قوتابخانەکانیاندا قبووڵ کردووە، تاکو ببێت بە بەربەستێك لە بەردەم شیووعیەت و ئیلحاددا.

٢ - هەوڵدانی چەند وتاربێژێکی بەناوبانگی ئینگلیز کە قەناعەت بە هاوولاّتیانی خۆیان ببەخشن سەبارەت بە قبووڵ کردنی قورئان.

٣ - لایەنگرتنی گەورەترین دەوڵەتی ئەمڕۆی جیهان - کە ئەمریکایە - بە هەموو هێزێکیەوە بۆ ڕاستی یەکانی ئایین و، دان نانی بەوەدا کە ئاسیا و ئەفریقا بەختەوەری و ئاسوودەیی و ئاسایشیان لە سایەی ئیسلامدا دەست دەکەوێ. وێڕای هاوسۆزیی لەگەڵ چەند دەوڵەتێکی ئیسلامیی تازە لەدایکبوو و هەوڵی ڕێککەوتن لەگەڵیاندا.. هەموو ئەمانە، ڕاستیی ئەو دەعوایە دەسەلمێنن کە چل و پێنج ساڵ پێش ئێستا وتراوە و، شایەتێکی بەهێزە لەسەری. (دانەر)

خۆ ئەگەر ئێمە بە کردار و ڕەفتاری خۆمان ڕەوشتە بەرزەکانی ئیسلام و بڵندیی ڕاستی‌یەکانی ئیمانمان پێش چاوی خەڵکی بخستایە، ئەوا پۆل پۆل و دەستە بە دەستە شوێنکەوتەی ئایینەکانی تر دەهاتنە ناو ئایینی ئیسلامەوە، تەنانەت دەوڵەتان و کیشورەکانی جیهانیش لەوانە بوو ملیان بۆ ئایینی ئیسلام کەچ بکردایە.

گرۆی ئادەمیزاد کە لە ڕێی ئەنجامە بەدەست هاتووەکانی زانستە نوێکانەوە وردە وردە خەریکە بێدار دەبێتەوە، هەستی بە ڕاستی و کاکڵە و حەقیقەتی "مرۆڤ" کردووە. جا بە دڵنیاییەوە ناتوانن بە بەربادی و بێ ئایین بژین. تەنانەت سەرسەخت ترین کەسی موڵحید و دژ بە ئایین ناچارە لە دوا قۆناغدا هانا بۆ ئایین ببات.. چونکە:

"خاڵی پشت پێ بەستن"ی مرۆڤ لە کاتی هێرشی گێروگرفت و دوژمنە ناوخۆ و دەرەکی‌یەکاندا، هاودەم لەگەڵ بێ دەستەڵاتی و دەستەوسانیی خۆیدا..

هەروەها "خاڵی یارمەتی لێ وەرگرتن"ی بۆ هێنانەدیی ئاواتە بێ سنوورە هەتا ئەبەد خایەنەکانی، هاوکات لەگەڵ دەستکورتی و هەژارییدا..

تەنها لە ناسین و باوەڕ پێ هێنانی "بەدیهێنەر" و، باوەڕکردندایە بە "دوارۆژی ئەودنیا". جگە لە دان نان بەمەدا، هیچ ڕێگایەکی تری ڕزگاری لە بەردەم ئەم مرۆڤە بێداربووەدا نی‌یە.

خۆ ئەگەر کاکڵە و ناوەرۆکی ئایینی ڕاستەقینە و ڕەوا لەناو لەپکەی دڵدا نەبێت، ئەوا چەندین قیامەتی ماددی و مەعنەوی لەسەر ئەم مرۆڤە هەڵدەستێت و، دەبێت بە ڕسواترین و بەدبەختترین زیندەوەر.

**پوختەی ئەم قسانە:**

مرۆڤی هاوچەرخ لە ڕێی زانستەکان و بەهۆی هەڕەشەی جەنگەکان و مەترسیی ڕووداوە سەرسووڕهێنەکانەوە بێدار بووەتەوە و، هەستی بە نرخ و بەهای کاکڵە و جەوهەری مرۆڤایەتی و توانا و لێهاتنە هەمە لایەنەکانی کردووە و، پەیی بەوە بردووە کە "مرۆڤ" بەم هەموو توانا کۆمەڵاتی‌یە سەرسووڕهێنەرەیەوە بۆ ئەوە بەدی نەهێنراوە کە ئەم ژیانە پڕ لە ئاڵوگۆڕ و کەم و کۆتایەی دنیا بەسەر بەرێت، بەڵکو مرۆڤ – بە بەڵگەی هیوا تا ئەبەد خایەنەکانی – بۆ ژیانی هەتاهەتایی و نەمری بەدی هێنراوە. هەروەك بە

گوێرەی توانا و لێهاتنەکانی خۆیشی هەستی بەوە کردووە کە ئەم دنیا فانی و بەرتەسکە جێی هێنانەدیی ئەو هەموو حەز و ئاوات و خواستە بێ سنوورانەی ئەوی تێدا نابێتەوە..

تەنانەت گەر بە توانای "ئەندێشە" - کە یەکێکە لە خزمەتگوزارانی ماهییەتی مرۆڤ - بوترێ:

"فەرموو هاودەم لەگەڵ دەستەڵاتداریی هەموو دنیادا یەك ملیۆن ساڵ بژی، بەرامبەر بەوەی کە دوای ئەو ژیانە بمریت و هەتاهەتایە زیندوو نەبیتەوە". ئەوا بێ گومان ئەندێشەی ئەو مرۆڤە بێدارەی کە مرۆڤێتیی خۆی لە دەست نەداوە، لە بریی دڵخۆش بوون، ئاخ و داخی خەفەت هەڵدەکێشێت بۆ لەدەستچوونی بەختەوەریی هەمیشەیی.

هەر تەنها ئەمەش هۆکاری سەرهەڵدانی حەزێکە لە ناخی هەموو مرۆڤێکدا بۆ پشکنین و گەڕان بە دوای ئایینی ڕاست و ڕەوادا. ئەوەتا مرۆڤ پێش هەموو شتێ عەوداڵی دۆزینەوەی ڕاستیی ئایینی ڕەوا و ڕاستەقینەیە، تاکو لە مردنی هەتاهەتایی ڕزگاری بکات. بارودۆخی ئێستای جیهان باشترین شایەتە لەسەر ئەم ڕاستی‌یە.

وا ئێستا کیشوەرەکان و دەوڵەتانی جیهان، دوای چل و پێنج ساڵ و بەهۆی سەرهەڵدانی ئیلحادەوە، بە وێنەی هەموو تاکە کەسێك، خەریکە هەست بەم پێویستی و خواستە مرۆییە بەتین و تەوژمە دەکات.

پاشان سەرەتا و کۆتایی زۆرێك لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز مرۆڤ بۆ لای "ژیری" ڕەوانە دەکەن و پێی دەڵێن: ئەی ئادەمیزاد! سەر لە بیر و ژیریت بدە و ڕاوێژیان پێ بکە، تاکو ڕاستیت بۆ دەربکەوێ.

بۆ نموونە سەیری سەرەتا و کۆتایی ئەم چەشنە ئایەتانە بکە:

﴿فاعْلَمُوا..﴾.. ﴿فاعْلَمْ..﴾.. ﴿أفَلا يَعْقِلُون﴾.. ﴿أفَلَمْ يَنْظُرُوا..﴾.. ﴿أفَلا يَتَذَكَّرُون..﴾.. ﴿أفَلا يَتَدَبَّرُون..﴾.. ﴿فاعْتَبِرُوا يا أُولِي الأبْصار..﴾[1].

هەر کاتێ سەیری ئەمانە و ئایەتەکانی تری هاوشێوەیان دەکەیت، کە مرۆڤ ڕەوانەی ڕاوێژ بە بیر و ژیری دەکەن، دەبینی هەموویان دەپرسن:

---

(١) تێبینی: دەقە تورکی‌یەکە واتای ئایەتەکانی هێناوە. بەڵام تەرجەمە عەرەبی‌یەکە دەقی ئایەتەکان. ئێمەش لەم کوردی‌یەدا دەقی ئایەتەکانمان هێنا، چونکە دانەر دوا بە دوای هێنانی واتای ئایەتەکان، لە شێوەی پرسیاردا ئەو تەفسیرەشی بۆ هێناون کە دەکرێ لەو ئایەتانە بدرێنەوە. (وەرگێڕ)

بۆچی واز لە زانست دەهێنن و ڕێی نەزانی هەڵدەبژێرن؟
لەبەر چی چاوەکانتان دەبەستن و خۆتان لە بینینی ڕاستی کوێر دەکەن؟
چی هانتان دەدات کاری شێتانە بنوێنن لە کاتێکدا کە خاوەنی عەقڵ و ژیرین؟
چ شتێك ڕێی بیرکردنەوەتان لە ڕووداوەکانی ژیان لێ دەگرێت بە ڕادەیەك کە پەندیان لێ وەرناگرن و ڕێی ڕاست نادۆزنەوە؟
بۆچی بە وردی سەرنج نادەن و پرس و ڕا بە ژیریتان ناکەن، تاکو بە هەڵەدا نەچن؟
پاشان هەر ئەم ئایەتانە دەفەرموون:
خەڵکینە! بێدار ببنەوە و پەند وەربگرن.. بە سوود وەرگرتن لەو ئامۆژگارییانەی کە سەدەکانی پێشین بەجێیان هێشتوون، خۆتان لەو گرفتانە بپارێزن کە لەوانەیە بەسەرتاندا ببارێت.

* * *

دەسا ئەی براکانم کە ئەم مزگەوتی ئەمەوی‌یە لە خۆی گرتوون! ئەی ئەو برایانەشم کە لە مزگەوتی جیهانی ئیسلامیدان!
ئێوەش پەند وەربگرن و، کارەکان لە ڕۆشنایی ئەو ڕووداوە گەورانەدا هەڵبسەنگێنن کە ماوەی ئەم چل و پێنج ساڵەی پێشوو ڕوویان دا. کەواتە ئەی ئەوانەی خۆیان لە ڕیزی بیریار و زانایاندا دەبیننەوە! ژیر و وریا بن!
**لەمانەی پێشەوە دەگەینە ئەوەی کە:**
ئێمەی موسڵمانی خزمەتگوزاری قورئان شوێنی بەڵگە دەکەوین و، بە دڵ و بیر و ژیریمان ڕاستی‌یەکانی ئیمان وەردەگرین. هەرگیز بە وێنەی شوێنکەوتەی ئایینەکانی تر نابین کە دەچن لەبەر چاولێکەریی ڕاهیبەکانیان دەستبەرداری بەڵگەکان دەبن!
جا لەسەر ئەم بناغەیە، ئەو ئایندەیەی کە تەنها زانست و ژیری جڵەو بە دەستی بڕیارەکانی دەبێت، بێ هیچ گومانێك فەرمانەکانی ئەو قورئانە پیرۆزە تیایدا دەمڕاست دەبێت کە بڕیارەکانی پاڵیان بە ژیری و بەڵگە و مەنتیقەوە داوە!
نابینی ئەو پەردانەی کە لە ڕابوردوودا خۆری ئیسلامیان داپۆشیبوو، وردە وردە لادەچن و دەڕەوێنەوە و، لەمپەر و ڕێگرەکانیش خەریکە دەچنەوە یەك و دەکشێنە

دواوە؟ نۆبەرەکانی سەرهەڵدانی ئەو بەرەبەیانە چل و پێنج ساڵ لەمەوبەر دەرکەوت. وا ئێستاش (ساڵی هەزار و سێ سەد و حەفتا و یەك) سپێدەی ئەو بەیانە هەڵهاتووە، یاخود لەوەدایە هەڵبێت. خۆ تەنانەت گەر بەیانی‌یەکی درۆینەش بێت، ئەوا بە پشتیوانیی خوای گەورە سپێدەی بەیانیی ڕاستەقینە دوای سی چل ساڵی تر هەڵدێت.

بەڵێ، جاران هەشت ڕێگر هەبوون کە نەیاندەهێشت ڕاستی‌یەکانی ئیسلام بە تەواوەتی بەسەر زەمانی "ڕابوردوو"دا زاڵ بێت، کە ئەمانەن:

**ڕێگری یەکەم و دووەم و سێ‌هەم:**

◆ نەزانیی بیانی‌یەکان.

◆ دواکەوتنیان لە چەرخەکانی خۆیان، (واتە دوورییان لە شارستانێتی).

◆ دەمارگیرییان بۆ ئایینەکەیان.

ئێستا بەهۆی پێشکەوتنی زانستی و چاکەکاری‌یەکانی شارستانێتی، خەریکە ئەم سێ ڕێگرە نامێنن.

**ڕێگری چوارەم و پێنجەم:**

◆ خۆسەپاندنی قەشەکان و زاڵبوونی سەرکردە ڕۆحانی‌یەکانیان بەسەر بیر و زەینی خەڵکیدا.

◆ چاولێکەریی کوێرانەی بیانی‌یەکان بۆ ئەو قەشانە.

ئەم دوو ڕێگرەش، دوای بڵاوبوونەوەی ئازادیی بیروڕا و، حەز و ئارەزووی گرۆی مرۆڤ بۆ گەڕان بە دوای ڕاستی‌یەکاندا، بەرەو نەمان دەڕۆن.

**ڕێگری شەشەم و حەوتەم:**

◆ پەرەسەندنی گیانی خۆسەپاندن(ئیستیبداد) لەناو ئێمەدا.

◆ بڵاوبوونەوەی ڕەوشتە نابەجێ‌کان لە ناوماندا، کە ئەنجامی دوورکەوتنەوەمانە لە شەریعەت و گوێڕایەڵی نەکردنیەتی.

نەمانی زەبر و هێزی خۆسەپاندنی تاکە کەس لە کاتی ئێستادا، ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە سی چل ساڵی تر ئیستیبدادی کۆمەڵ و ڕێکخراوەکانیش نامێنێت. ئنجا قوڵپدانی غیرەت و پەرۆشی ئیسلامی و، ئاگادار بوونەوە لە ئاکامە ترسناکەکانی ڕەوشتە

نزمەکان، سەروزیادن بۆ لابردنی ئەم دوو ڕێگرە. تەنانەت هەر ئێستا لەوەدان کە لابیرێن و، بە پشتیوانیی خوای گەورە بە تەواوی نامێنن.

**ڕێگری هەشتەم:**

◆ گومان بردنی ئەوەی کە ناسازی لە نێوان چەند باس و بابەتێکی زانستی نوێ و واتای ڕوالەتیی ڕاستییەکانی ئیسلامدا هەبێت. هەر ئەم هۆکارەش بوو لە ڕابوردوودا تا ڕادەیەك ڕێی لە زالبوونی ڕاستییەکانی ئیسلام گرتبوو.

بۆ نموونە:

"گا و نەهەنگ" کە دوو مەلائیکەتی جیهانی ڕۆحانین و بە فەرمانی خوای گەورە سەرپەرشتیی گۆی زەوییان پێ سپێرراوە، ئەندێشەی هەندێ کەس بە دوو گیانەوەری ڕاستەقینە و بەرجەستە (واتە گایەکی زەبەلاح و نەهەنگێکی مەزن) وەری گرتبوو. ئیتر هەڵگرانی زانستی نوێ، لەبەر نەشارەزاییان لە ڕاستیی شتەکان، هەڵوێستی نەیاریان بەرامبەر بە ئیسلام نواند.

سەدان نموونەی وەك ئەمە هەن..

جا دوای شارەزایی و ئاگادار بوون لە ڕاستییەکان، سەرسەخت ترین فەیلەسووفیش جگە لە تەسلیم بوون و ملکەچی بۆ ئەو ڕاستییانە ڕێگای تری بۆ نامێنێتەوە.

تەنانەت پەیامی "موعجیزاتی قورئانی" بە ئاماژە کردن لە هەموو ئەو ئایەتانە دواوە کە لە لایەن ئەهلی زانستە نوێکانەوە ڕەخنەیان لێ گیراوە و، دەری خستووە کە هەریەك لەو ئایەتانە بریسکەیەکی ڕەنگینی ئیعجازیان لەخۆ گرتووە و، ئەو ڕستە و شانەی قورئانیش کە زانایان بە گومانی خۆیان بە مایەی ڕەخنەیان زانیوە، ئەو پەیامە بە ڕوونی دەری خستووە کە هەریەکەیان هێندە ڕاستیی بەرزیان تێدایە هەرگیز دەستی زانستیان پێ ناگات و، فەیلەسووفە سەرسەختەکانیشی ناچاری ملدان و قایل بوون کردووە.

ئەم پەیامانەش لە بەردەستی هەموو کەسێکدان و، بە ئاسانی دەتوانرێت زانیارییان لێ بە دەست بهێنرێت و، پێویستە هەموو کەسێك بیانبینێت، تاکو بۆ خۆی بزانێت کە

ئەم ڕێگرە، دوای تێپەڕ بوونی چل و پێنج ساڵ بەسەر ئەوەی کە لە بارەیـەوە وترا، چۆن لە ڕاستیدا هەرەسی هێنا.

بەڵێ، گەلێ کتێبی بەنرخ لەم بوارەدا لە لایەن زانایانی ئیسلامەوە دانراون. هەموو نیشانەکانیش بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە ئەم ڕێگری هەشتەمە بە تەواوی دەڕەوێتەوە..

خۆ ئەگەر ئێستا ئەمە ڕوو نەدات، ئەوا دوای سی چل ساڵ هەر یەك لە "زانست" و "مەعریفەی ڕاستەقینە" و "چاکەکاری‌یەکانی شارستانێتی" خۆیان بە کەرەسەی پێویست و تەواو پڕچەك دەکەن و.. گیانی پشکنین و گەڕان بە دوای ڕاستی‌یەکاندا و، ویژدان و، خۆشویستنی مرۆڤایەتی، بۆ هەر هەشت بەرەکەی جەنگی ئەم هەشت دوژمنە دەنێرن و لەناویان دەبەن. هەر لە ڕاستیشدا خەریکە شکستیان پێ دەهێنن و، بە پشتیوانیی خوای گەورە لە دوای نیو سەدە بە تەواوی لەناویان دەبەن.

بەڵێ، وەك وتراوە: چاکە ئەوەیە کە تەنانەت دوژمنیش شایەت بێ لە سەری و دانی پێدا بنێت: (الفضلُ ما شَهِدَتْ به الأعداءُ).

وا لە خوارەوە و لە نێوان سەدان نموونەدا تەنها دوو دانە دەهێنین:

**نموونەی یەکەم:**

"میستەر کارلایل" کە یەکێکە لە فەیلەسووفە ناودارەکانی سەدەی نۆزدەهەم و بەناوبانگترینی فەیلەسووفەکانی کیشوەری ئەمریکایە[1]، بەم وتەیەی خۆی - بێ هیچ سڵەمینەوەیەك - سەرنجی فەیلەسووف و زانایانی نەصرانی ڕادەکێشێت:

(ئایینی ئیسلام هات بەسەر ئەو هەموو ئایینە درۆینە و ڕێچکە ناڕەوا و بەتاڵانەدا و هەموویانی هەڵلووشی، مافی خۆیشی بوو کە هەڵیان بلووشێت، چونکە ئیسلام ڕاستی‌یەکە لە ناخی سروشتەوە هەڵقوڵاوە (واتە: تاقانە ڕێبازە لەگەڵ سروشتی مرۆڤدا تەبا بێت). خۆ هێشتا ئیسلام بە تەواوی سەری هەڵنەدابوو کە بت پەرستی‌یەکانی عەرەب و جەدەلی نەصرانیەت تیایدا گڕی گرت و سووتا. هەر شتێك حەق و ڕەوا نەبوو لە ڕاستیدا تەختە دارێکی بێ گیان و مردوو بوو بلێسەی ئاگری ئیسلام هەموویانی کرد بە خۆڵەمێش و خۆی مایەوە).

(١) بۆ زانیاری لەبارەیەوە بڕوانە پەراوێزی لاپەڕە (٢٤٤)ی ئەم بەرگە. (وەرگێڕ)

میستەر کارلایل درێژە بە قسەکانی دەدات و، سەبارەت بە پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ دەڵێ:

(ئەو پیاوە مەزنەیە کە خوای گەورە زانایی و دانایی فێر کردووە. دەبێ لە پێش هەموو شتێك گوێ لەو بگرین).

هەروەها دەڵێ:

(ئەگەر گومانت لە ڕاستی‌یەکانی ئیسلام هەیە، ئەوا باشتر وایە گومان لە هەموو شتێکی بێ گومان و بەڵگە نەویست بکەیت، چونکە ئیسلام لە هەموو ڕاستی‌یەکی پێویست بێ گومانتر و بەڵگەنەویست ترە).

بەم جۆرە ئەم فەیلەسووفە بەناوبانگە لە چەند شوێنێکی جیاجیای کتێبەکەیدا ئەم ڕاستی‌یانە سەبارەت بە ئیسلام تۆمار دەکات.

**نموونەی دووهەم:**

ئەمیر "بسمارك"ە، کە بە ناودارترینی بیریارانی مێژووی نوێی ئەورووپا دادەنرێت[1].

ئەم فەیلەسووفە دەڵێت:

(بە وردی لە کتێبە ئاسمانی‌یەکانم کۆڵیوەتەوە و، بەهۆی ئەو دەستکاری‌یانەی تیایاندا ئەنجام دراوە تەنانەت دانستێکی ڕاستەقینەشم تێدا نەبینین کە بەختەوەریی مرۆڤایەتی دەستەبەر بکات. بەڵام قورئانەکەی محەممەد ﷺ لە سەرووی هەموو کتێبەکانەوەیە و، هەموو وشەیەکی دانستێکم تێدا دەبینی. هیچ کتێبێك نی‌یە هاوشێوەی بێت و بتوانێت وەك ئەو بەختەوەریی ئادەمیزاد بهێنێتەدی. هەرگیز ناگونجێ کتێبێ وا گوفتاری ئادەمیزاد بێت. ئەو کەسانەش وا پیشانی دەدەن کە ئەو گوفتارانە هی محەممەد بن، لە ڕاستیدا سەرسەختی و ناحەقی دەنوێنن و ئینکاریی بەڵگەنەویستێکی زانستی دەکەن کە ئەوەیە قورئان گوفتاری خوایە).

منیش بە پشتگیری لەو ڕاستی‌یەی کە کێڵگەکانی زیرەکیی ئەورووپا و ئەمریکا ئەم چەشنە توێژەرە زیرەکانەی وەك "کارلایل" و "بسمارك"ی بەرهەمهێناوە، بەوپەڕی دڵنیایی و قەناعەتەوە دەڵێم:

---

(١) یەکێکە لە سیاسەتمەدارە بەناوبانگەکانی ئەڵمان و، لە نێوان ساڵەکانی (١٨١٥-١٨٩٨ز)دا ژیاوە و، لەو سەرکردانەیە کە یەکێتیی ئەڵمانیایان هێنایەدی و، خستیانە پێشەنگی دەوڵەتە مەزنەکانی سەدەی نۆزدەهەم. (وەرگێڕ)

ئەوروپا و ئەمریکا سکیان بە ئایینی ئیسلام پڕە و، ڕۆژێك دێت کە دەوڵەتێکی ئیسلامییان دەبێت، بە وێنەی ئەوەی کە دەوڵەتی عوسمانی سکی بە ئەوروپا پڕ بوو، دواتر دەوڵەتێکی ئەوروپایی لێ کەوتەوە.

دەسا ئەی برایانی ناو مزگەوتی ئەمەوی!

ئەی ئەو برایانەشم کە دوای نیو سەدە دێن بۆ ناو مزگەوتی جیهانی ئیسلامی!

ئایا ئەو پێشەکییانەی کە تا ئێستا لێیان دواین ئەوە بەرهەم ناهێنن کە:

تەنها ئیسلام لە ئایندەدا بە شێوەیەکی ڕاستەقینە و مەعنەوی بالادەست و فەرمانڕەوای هەموو کیشوەرەکان دەبێت و، جگە لە ئایینی ئیسلام و ئەو نەصرانیەتە حەق و ڕەوایەش کە - دوای پاڵفتە بوونی لە دەستکاری و خورافات - دەگۆڕێت بە ئیسلام و یەك دەگرێ لەگەڵیا و شوێن قورئان دەکەوێ، هیچ شتێکی تر مرۆڤایەتی بەرەو بەختەوەریی دنیا و دواڕۆژ نابات؟

● **لایەنی دووهەم کە بریتییە لەوەی ئیسلام ئامادەیە بۆ پێشکەوتنی ماددی:**

ئەو هۆکارانەی کە ئیسلام بەرەو پێش دەبەن، دەری دەخەن کە لە ڕووی ماددیشەوە هەر ئیسلام لە ئایندەدا بالادەست دەبێت.

هەروەك لە لایەنی یەکەمدا بۆمان سەلما کە ئیسلام لە ڕووی مەعنەوییەوە ئامادەیە بۆ پێشکەوتن، ئەم لایەنەش بە هەمان شێوە ئامادەیی ئیسلام دەردەخات بۆ بالادەستی و پێشکەوتنی ماددی لە داهاتوودا. چونکە لەناو دڵی کەسایەتیی مەعنەویی جیهانی ئیسلامیدا پێنج هێزی شکست نەخواردوو کۆبوونەتەوە و ئاوێتەی یەکتری بوون کە لەوپەڕی دامەزراوی و توندوتۆڵیدان[1]:

---

(١) بەڵێ، لە مامۆستایی قورئانی پیرۆز و ئاماژەی وانەکانیەوە ئەوە تێدەگەین کە: قورئان بە باسکردنی موعجیزاتی پێغەمبەران - درووددیان لەسەر بێت - ئادەمیزاد بۆ هاوشێوەی ئەو موعجیزانە ڕێنمایی دەکات کە لە داهاتوودا و لە ڕێی پێشکەوتنی شارستانییەوە دێنەدی و، هانی مرۆڤ دەدات بۆ بەدەست هێنانیان. وەك ئەوەی قورئان بە مرۆڤ بڵێت: هەڵسە ڕاپەڕە و بۆ بەرهەمهێنانی هاوشێوەی ئەم موعجیزانە تەقالا بدە. بۆ نموونە: لە یەك ڕۆژدا ماوەی دوو مانگ ڕێ ببڕە، وەك ئەوەی کە حەزرەتی سلێمان - درووددی خوای لەسەر بێت - دەیبڕی.. بۆ چارەسەرکردنی دژوارترین نەخۆشیی قورس و بێ دەرمان هەوڵ بدە، وەك ئەوەی کە حەزرەتی عیسا - درووددی خوای لەسەر بێت - ئەو جۆرە نەخۆشییانەی چارەسەر دەکرد.. ئاوی ژیانبەخش لەناو بەردەکاندا دەربهێنە و مرۆڤایەتی لە تینوێتی ڕزگار بکە، وەك ئەوەی کە حەزرەتی مووسا -

**▢ هێزی یەکەم:**

بریتی‌یە لە "ڕاستیی ئیسلام" کە مامۆستای هەموو ڕەفتار و ئاکارە بەرز و بڵندەکانە و، سێ سەد و حەفتا ملیۆن موسڵمانی بە وێنەی تاقە کەسێك یەکخستووە و، بە شارستانێتیی ڕاستەقینە و زانستە ڕاست و دروستەکان پڕچەك بووە و، هێندە بەتوانایە کە هیچ هێزێك نەتوانێت شکستی پێ بهێنێت.

**▢ هێزی دووهەم:**

بریتی‌یە لە "پێویستیی لە ڕادەبەدەر" کە مامۆستای ڕاستەقینەی شارستانێتی و پیشەسازی‌یە و، بە هۆکار و بنەما تەواوەکان تەیار کراوە.. هەروەها بریتی‌یە لە "هەژاری" کە پشتی ئێمەی شکاندووە. جا "پێویستی و هەژاری" دوو هێزی شکست نەخواردووی ئەوتۆن کە بێدەنگ ناکرێن.

**▢ هێزی سێهەم:**

بریتی‌یە لە "سەربەستیی شەرعی" کە مرۆڤایەتی بۆ ڕێی پێشبڕکێ و بەربەرەکانێی ڕاست و ڕەوا، بە مەبەستی بەدەستهێنانی ئامانجە بەرز و بڵندەکان، ڕێنمایی دەکات و.. هەموو جۆرەکانی خۆسەپاندن لەناودەبات و.. ئەو هۆش و بڕستە بڵندانەی مرۆڤ دەورووژێنێت کە بە چەند هەستێکی چەشنی: ئیرەیی و، بەربەرەکانێ و، ئاواتەخوازی و، تەواو بێداری و، حەزی تازەگەری و، ئارەزووی بەدەستهێنانی شارستانێتی، تەیار و پڕچەك کراون.

---

درورودی خوای لەسەر بێت - بە عەساکەی دەستی ئاوی لەناو بەردەکان دەردەهێنا.. ئەو مادده و کەرەسانە پەیدا بکە لە زیانی سووتان بە ئاگر دەتپارێزن و لەبەریان بکە، وەك حەزرەتی ئیبراهیم - درورودی خوای لەسەر بێت - لەبەری کرد.. دوورترین دەنگ بهێنە و گوێی لێ بگرە و، وێنەکانی ئەمسەر و ئەوسەری خۆرهەڵات و خۆرئاوا ببینە، وەك ئەوەی کە هەندێ لە پێغەمبەران - درورودی خوای لەسەر بێت - کاری لەو شێوەی ئەنجام دا.. بە چەشنی حەزرەتی داوود - درورودی خوای لەسەر بێت - تۆش ئاسن وەکو مۆم و هەویر لە دەستی خۆتدا نەرم بکە، تاکو ببێت بە تەوەرەی سەرجەم پیشەسازی‌یەکانی ئادەمیزاد.. هەروەك سوودی یەکجار گەورە و مەزنیش لە "سەعات" و "کەشتی" وەردەگرن کە هەندێکن لە موعجیزاتی حەزرەتی یووسف و نووح، درورودی خوایان لەسەر بێت. هەروەها سوود لە هەموو ئەو موعجیزانەی تریش وەربگرن و چاویان لێ بکەن کە پێغەمبەرانی دیکە فێرتان دەکەن.
بەم جۆرە و بەپێی ئەمانەی پێشوو، دەبینین قورئانی پیرۆز مرۆڤایەتی بەرەو پێشکەوتنی ماددی و مەعنەوی دەداتەبەر و وانەکانی خۆیمان پێ دەڵێتەوە و، دەیسەلمێنێ کە مامۆستای هەموانە. (دانەر)

جا ئەم هێزی سێ‌هەمە (سەربەستیی شەرعی) پابەند بوون دەگەیەنێت بە بڵندترینی پلەکانی کەماڵ و تاسە و چاوەڕوانی‌یەکی ئەوتۆ کە شایانی مرۆڤایەتی بێت.

□ **هێزی چوارەم:**

"جوامێریی ئیمان"ە کە بە هەستی "سۆز" و "میهرەبانی" ساز و ئامادە کراوە. واتە: ڕازی نابێت زەلیل و ڕسوای بەردەم ستەمکاران بێت و، ناشچێتە ڕیزی ستەم لێکراوانەوە. بە دەستەواژەیەکی تر: مەرایی لە ڕووی کەسانی خۆسەپێندا نانوێنێت و، خۆیشی بەسەر هەژاراندا ناسەپێنێت و، بە گەورەتر لەوان بۆ خۆی ناڕوانێت. ئەمەش بناغەیەکی گرنگی سەربەستیی شەرعی‌یە.

□ **هێزی پێنجەم:**

"سەربەرزیی ئیسلامی"یە، کە واتای بەرز ڕاگرتنی ئاڵای ئیسلام دەگەیەنێت. لەم ڕۆژگارەی خۆماندا بەرزکردنەوەی ئاڵای ئیسلام بەندە بە پێشکەوتنی ماددی و ڕۆشتنە ناو گۆڕەپانی شارستانێتیی ڕاستەقینەوە. بێ گومان کەسێتیی مەعنەویی جیهانی ئیسلامی لە ئایندەدا بە تەواوی ئەو فەرمانە جێبەجێ دەکات کە سەربەرزیی ئیسلام وەك خواستێکی ئیمانی دەری کردووە.

هەروەك پێشکەوتنی ئیسلام لە ڕابوردوودا بە لەناوبردنی دەمارگیریی دوژمن و شڕکردنی سەرسەختی‌یەکەی و گێڕانە دواوەی دەستدرێژی‌یەکانی لە ڕێی هێزی چەك و شمشێرەوە هاتەدی، پشت بە خوا لەمەولاش دوژمنان، لە بری شمشێری ماددی، بە شمشێری مەعنەویی شارستانێتیی ڕاستەقینە و پێشکەوتنی ماددی و حەق و ڕاستی، شکست دەهێنن و پەرتەوازە دەبن.

دەسا برایانم!

بزانن کە مەبەستمان لە شارستانێتی: لایەنە جوان و سوودبەخشەکانیەتی بۆ ئادەمیزاد، نەك خراپکاری و گوناهەکانی، وەك ئەوەی کە خەڵکانی دەبەنگ پێیان وابوو ئەو لایەنە بێ کەڵکانەی شارستانێتی شتێکی جوان بن و، دەستیان دایە لاسایی کردنەوەی و، وڵاتیان وێران کرد و ئایینیان دا بە بەرتیل بۆ بەدەستهێنانی، کەچی نە بەدەستیان هێنا و نە هیچ شتێکی تریشیان پێ برا!

بەهۆی زاڵبوونی گوناهەکانی شارستانێتی بەسەر لایەنە جوانەکانیدا و، قورس بوونی تای خراپەکانی بەسەر تای چاکەکانیدا، مرۆڤایەتی دوو زللەی توندوتیژی بە دوو جەنگی جیهانی لێ درا و، ئەو شارستانێتی‌یە تاوانبارەی تیابرد کە بەو جەنگانە خوێنێکی وای لە گەرووی خۆی ڕشاندەوە سەرانسەری ڕووی زەویی چەپەڵ کرد.

بە پشتیوانیی خوای گەورە و بەهۆی ئەو هێزەی ئیسلام کە لە داهاتوودا زاڵ دەبێت، لایەنە باشەکانی شارستانێتی سەردەکەوێت و، ڕووی زەوی لە چڵك و چەپەڵی‌یەکانی لایەنەکەی تر پاك دەکاتەوە و، ئاسایشی گشتی بۆ تێکڕای مرۆڤایەتی دەهێنێتەدی.

بەڵێ، لەبەر ئەوەی شارستانێتیی ئەوروپا لەسەر بنەمای چاکەکاری و ڕێگای ڕاست دانەمەزراوە، بەڵکو هەوا و هەوەس و ئارەزوو، هاوکات لەگەڵ حەسوودی و خۆسەپاندن، جڵەوی شارستانێتیی ڕۆژگاریان بە دەستەوە گرتووە، ئەوا لەم کاتەی ئێستادا تای لایەنە خراپەکانی بەسەر تای چاکەکانیدا زاڵ بووە و، وەك درەختێکی لێ هاتووە کە بە کرمی ڕێکخراوە تۆقێنەرەکان پووکابێتەوە و داڕزابێت. ئەمەش بەڵگەیەکی بەهێزە و ئاماژەیە بۆ نزیکیی کاتی داڕمانی و، هۆکارێکی گرنگە بۆ دەرکەوتنی پێویستیی جیهان بە شارستانێتیی "ئیسلامی"ی ئاسیا کە لە داهاتوویەکی نزیکدا زاڵ و فەرمانڕەوا دەبێت.

جا ئەگەر ئەم چەشنە هۆکارە بەهێز و ڕاست و دروستانە لە بەردەم ئیمانداراندا هەبێت بۆ پێشکەوتنی ماددی و مەعنەوی و، ڕێگایەکی تەخت و ئاسانی وەك هێڵی شەمەندەفەریان بێت کە بیانگەیەنێتە بەختەوەریی ئایندە، ئیتر چۆن دەبێ ئێوە نائومێد بن و، ورەی جیهانی ئیسلامی سارد بکەنەوە و، گومانی بەد ببەن و، بە هیوابڕاوی و نائومێدی‌یەوە بڵێن: دنیا بۆ بیانی‌یەکان و هەموو خەڵکانی تر خانەی پێشکەوتنە و، تەنها بۆ موسڵمانە هەژارەکان خانە و لانەی شۆڕبوونەوە و دواکەوتنە؟

ئێوە بەم کارەتان هەڵەیەکی گەلێ مەزن دەکەن..

چونکە مادەم حەز و مەیلی ڕۆشتن بەرەو کەماڵ یاسایەکی سروشتی‌یە لە ناخی گەردووندا و، لەناو سروشتی ئادەمیزادیشدا دانراوە، ئەوا بە پشتیوانیی خوای گەورە لە

ئاییندەدا حەق و ڕاستی لەسەر دەستی ئیسلام لە شێوەی بەختەوەریی دنیادا دێتەدی، وەك کەفارەتێکی ئەو تاوانانەی کە گرۆی مرۆڤ ئەنجامی داون، بە مەرجێ لە تۆڵەی خراپکاری و ستەمەکاندا قیامەتێکی کتوپڕی بەرپا نەبێت!

فەرموون سەیری "کات" بکەن.. ئەوەتا بەسەر ڕاستەهێڵدا ناڕوات هەتا سەرەتا و کۆتاییەکەی لە یەکتر دوور بکەونەوە، بەڵکو بە وێنەی خولانەوەی گۆی زەویمان ئەویش لەناو بازنەیەکدا دەخولێتەوە؛ تاوێ هاوین و بەهارمان لە دەمی پێشکەوتندا و، تاوێکی تر زستان و پاییزمان لە حاڵی دواکەوتندا پیشان دەدات..

خۆ هەروەك زستان بەهاری بە دوادا دێت و، شەویش ڕۆژی ڕووناك جێی دەگرێتەوە، بە پشتیوانیی خوای گەورە گرۆی مرۆڤیش بەهار و ڕۆژگارێکی ڕووناکی لە ڕێدایە.

دەتوانن لە لایەن میهرەبانیی خوای گەورەوە چاوەڕوانی هەڵهاتنی خۆری حەقیقەتی ئیسلام بن و، بە چاوی خۆتان لە ژێر سایەی ئاشتی‌یەکی گشتی و هەمە لایەنەدا شارستانێتیی ڕاستەقینە ببینن.

لە سەرەتای ئەم وانەیەدا وتمان:

بەڵگە و نیوێك لەسەر دەعواکەمان دەهێنینەوە..

وا ئێستا بە پوختی "بەڵگە"کە کۆتایی پێ هات و، کاتی ئەوە هاتووە کە:

○ **"نیو بەڵگە"کەش باس بکەین.. کە ئەمەی خوارەوەیە:**

بە توێژینەوە و پشکنینی ورد و، بەدواداگەڕان و ئەزموونی زۆر و زەبەندەی زانستەکان چەسپاوە کە:

خێر و، جوانی و، ڕێکوپێکی و، تەواوی، بە جۆرێکی ڕەها لە ڕێسا و سیستەمی گەردووندا زاڵن و، هەر ئەوانەش ئامانج و مەبەستی ئەو بەدیهێنەرە شکۆمەندەن کە فەرمانڕەوای زاڵی ڕەهایە و هەر خۆی جێی مەبەستە. بە بەڵگەی ئەوەی کە هەموو یەکێك لەو زانستانەی کە پەیوەندییان بە گەردوونەوە هەیە، لە ڕێی یاسا و دەستوورە گشتی‌یەکانیانەوە، تێمان دەگەیەنن کە هەموو "جۆر" و "دەستە" و "کۆمەڵ"ێکی بەدیهاتووان ڕێکوپێکی و داهێنانێکی ئەوتۆیان تێدایە کە هەرگیز بۆچوونی "ژیری" لەوە تەواوتر و ناوازەتر شك نابات.

بۆ نموونە:

زانستی توێکاری، کە تایبەتە بە پزیشکی‌یەوە.. زانستی کۆمەڵەی خـۆر، کـە تایبەتـە بـە گەردووناسـی‌یەوە.. هـەروەها زانسـتەکانی تریـش کـە پـەیوەندییان بـە ڕووەك و گیانەوەرانـەوە هەیـە.. هـەر یەکـەیان لـە ڕێـی یاسـا و دەسـتووره هـەمەکی‌یەکانیان و توێژینەوە زۆرەکانیانـەوە، ئـەو ڕێکوپێکی‌یـە وردەی "کردگـاری شـکۆمەند" و توانستی داهێنەرانە و دانستی تەواوی ئەومان لەو جۆرەدا تێدەگەیەنن و، هەمووشیان ڕاستیی ئەو ئایەتە پیرۆزە ڕوون دەکەنەوە کە دەفەرموێ:

﴿الَّذي أَحْسَنَ كُلَّ شَيْءٍ خَلَقَهُ﴾ (السجدة: ٧).

هەروەك بەدواداگەڕانی تەواوەتی و، ئەزموونە هەمە لایەنەکان دەیسەلمێنن کە:

شـەڕ و، ناشیرینی و، نـاڕەوایی و، خراپکاری‌یـەکان، چـەند شـتێکی پاشـکۆ و پلـە دووهەمن لە بەدیهێنانی گەردووندا.

بۆ نموونە:

ئەو "ناشـیرینی"یـەی لـەناو گـەردوون و بەدیـهاتوواندا دەبیـنرێت، خـۆی لـە خۆیـدا ئامانج و مەبەستێکی سەربەخۆی تێدا نی‌یە، بەڵکو یەکەیەکی پێوانەیـە، تـاکو تەنـها یـەك دانە ڕاستیی "جوانی" ببێت بە چەندین ڕاستیی زۆر و زەبەندە..

"شەڕ"یش بە هەمان جۆر.. تەنانەت خودی "شەیتان"یش لەبەر ئەوە بـەدی هێـنراوە و بەسەر خەڵکیدا زاڵ کراوە تاکو ببێت بە هۆیەك بۆ هاتنەدیی پێشکەوتنە بێ سنوورەکانی ئـادەمیزاد بـەرەو سـەرجەمی ئـەو ئاکـارە تـەواو بڵندانـەی کـە تەنـها بـە پێشـبڕکێ و بەربەرەکانێ نەبێت بەدەست نایەن..

هەموو ئەم چەشنە شەڕ و ناشیرینی‌یە جوزئی‌یانە، بە مەبەستی دەرخسـتنی جۆرەکـانی خێر و جوانیی هەمەکی، لەناو ئەم گەردوونەدا بەدی هێنراون.

بەم جۆرە و، لە ڕێی پشکنین و بەدواداگەڕانی تەواوەتی‌یەوە دەچەسپێت کە:

ئامانجی ڕاستەقینە و بنەڕەتیی بەدیهێنانی گەردوون "خێر و، جوانی و، تەواوی"یە.

لەبەر ئەوە، ئەو مرۆڤەی کە بە کوفری ستەمکارانە و سەرپێچیی فەرمانەکانی خـوای گـەورە ڕووی خـاوێن و جوانـی گـۆی زەویـی ناشـیرین و چەپـەڵ کـردووە، هـەرگیز لـە چنگی سزا دەرباز نابێت و، بێ ئەوەی ئامانجی ڕاستەقینەی بەدیهێنانی گەردوونی لەسەر

جێ‌بەجێ بکرێت، ناتوانێت بڕوات بۆ "عەدەم". بەڵکو دەڕواتە ناو بەندیخانەی دۆزەخەوە.

هەروەك لە ڕێی بەدواداگەڕانی تەواوەتی و پشکنین و توێژینەوەی زانستەکانەوە چەسپاوە کە:

"مرۆڤ" بەڕێزترین و پایەدارترینی بەدیهاتووانە، چونکە دەتوانێ بە "ژیری"ی خۆی پلە ڕواڵەتی‌یەکانی بەدیهێنانی بوونەوەران و ئەنجامەکانیشیان دەربخات و، پەیوەندی‌یەکانی نێوان زنجیرە هۆکارەکان بناسێنێت و، لە کارامەیی و لێهاتنە جوزئی‌یەکانی خۆیدا لاسایی سنعەتە خوایی و بەدیهێنانە پەروەردگاری‌یە پڕ لە دانایی و ڕێکوپێکەکان بکاتەوە و، بە زانستە کەم و کۆتاکەی و توانا و لێهاتنە جوزئی‌یەکەشی دەتوانێ پەی بە وردیی کارەکانی خوای گەورە ببات. ئەوەش بەوەی کە جوزئە ئیختیاری‌یەکەی خۆی دەکات بە پێوەرێکی هەندەکی و بچووك بۆ تێگەیشتن لەو کاروبارە هەمەکی‌یانەی خوای گەورە و سیفەتە مەزن و ڕەهاکانی..

هەموو ئەمانە دەیچەسپێنن کە:

مرۆڤ بەڕێزترینی بەدیهاتووانی خوای گەورەیە.

هەروەك بە شایەتیی ئەو ڕاستی‌یانەی تایبەتن بە مرۆڤ و بوونەوەرانەوە و، ئیسلام پێشکەشی مرۆڤایەتیی کردوون، چەسپاوە کە:

موسڵمانان بەڕێزترین و پلەبەرزترینی نەوەکانی مرۆڤن و، شوێنکەوتەی حەق و ڕاستین..

هەروەك بە شایەتیی مێژووی مرۆڤ و ڕووداوەکان و بەدواداگەڕانی تەواوەتیش سەلماوە کە: گەورەترین و پلەبەرزترینی شوێنکەوتووانی حەق و ڕاستی لە نێوان مرۆڤە ڕێز لێ گیراوەکاندا، ئەو حەزرەتی پێغەمبەرەیە ﷺ کە هەزاران موعجیزەی خۆی و، بەرزیی ڕەوشتەکانی و، ڕاستی‌یەکانی ئیسلام و قورئان شایەتیی بۆ دەدەن.

ئنجا دوای ئەوەی کە ئەم نیو بەڵگەیە ئەم سێ ڕاستی‌یەی ڕوون کردەوە، ئایا بەدبەختیی ڕەگەزی مرۆڤ دەتوانێ شایەتیی سەرجەمی ئەو هەموو زانستانە زامدار بکات و، ئەم لێکۆڵینەوە و بەدواداگەڕانە تەواوە هەڵبووەشێنێتەوە و، لە ڕووی ویستی

خـوای گـەورە و دانسـتی ئـەزەلیدا - کـە هـەموو بوونــەوەران لــەخۆ دەگرێــت - هەڵبگەڕێتــەوە و، لــە دڵڕەقیــی ســتەمکارانە و کوفـری یـاخی بووانــە و کاولکاریی‌یــە ترسناکەکانیدا هەر بەردەوام بێت؟

ئایا دەگونجێ ئەم حاڵەی دوژمنایەتی کردنی ئیسلام هەر بەم جۆرە بمێنێتەوە؟

مـن لـە لایـەنی خۆمـەوە بـە هـەموو هـێزێکم، تەنانــەت گــەر چــەندەها زمــانی لەژمارەبەدەریشم هەبێت، بە هەر هەموویان سوێند دەخۆم بەو خوایەی کە ئەم جیهانـەی لـەم سیستەمە هـەرە تـەواوەدا و گەردوونیشی لەوپـەڕی دانـایی و ڕێکوپێکیـدا بـەدی هێناوە، هەر لە گەردیلەکانەوە هەتا هەسـارە گەڕۆکـە مەلەوانـەکانی نـاو بۆشـایی و، لـە باڵی مێشەوە تا دەگاتە گلۆپی ئەستێرە درەخشانەکانی ئاسمان..

بەڵێ، بە چـەندین زمـانی بێ سنوور سوێند بـەو دانـا شـکۆمەند و کردگـارە خـاوەن جوانی‌یە دەخۆم کە:

هەرگیز ئادەمیزاد ناتوانێ لەو یاسا خواییە دەربچێت کە لە سەرانسەری گـەردووندا دەسـت بـە کـارە و، بـەهۆی شـەڕ و خراپـە هەمــەکی و گشـتی‌یەکانی خـۆی ڕەفتـاری پێچەوانەی برایانی تری لە بەشەکانی بەدیـهاتووان بنوێنێـت و، ئـەو زەقوومانـە بخـوات و هەرسیان بکـات کـە هـەزاران سـاڵە لـەناو گـرۆی ئـادەمیزاددا هۆکـاری ئـەوەن "شـەڕ" بەسەر "خێر"دا زاڵ ببێت؟

نەخێر، شتی لەو جۆرە هەرگیز ناگونجێ ڕوو بدات.

بەڵێ، شتی وا ناگونجێ.. مەگـەر بـە دانـانی گریمـانی مـەحاڵی ئـەوەی کـە: "مـرۆڤ" جێنشینی خوا لـە زەویـدا و، هـەڵگری ئەمانـەتی هـەرە مـەزن و، بـرای گـەورەی بـەڕێزی سـەرجەم بوونـەوەرانی تـر نـەبێت. بـەڵکو نزمـترین و بـێ کـەڵکترین و ڕسـواترین و زیانبەخشترین و بێ نرخترینی بەدیهاتووان بێت و، بـە دزی‌یـەوە خـۆی بـەناو گـەردووندا کـردبێت، تـاکو بیشـێوێنێ و تێکی بدات!

خۆ ئەم گریمـانە مەحـاڵە هەر لە بناغەدا بەتاڵە و لە هیچ ڕوویەکەوە وەرناگیرێت.

لەبـەر ئـەم ڕاسـتی‌یە، دەتوانـرێ لــەم نیــو بەڵگەیەمانـەوە بگەینـە ئـەم دەرەنجامـەی خوارەوە:

هەروەك بوونی بەهەشت و دۆزەخ پێویستە بۆ ئەودنیا، بە هەمان جۆر زاڵبوونی ڕەهایش لە ئایندەدا تەنها بۆ "خێر" و "ئایینی ڕاست" دەبێت و، بەو ڕادەیەی کە وەك لە بەدیهاتووانی تردا دەبینرێت، لەناو گرۆی مرۆڤیشدا خێر و چاکە و ڕەوشت بەرزی زاڵ دەبن و، مرۆڤ و برایانی تری بوونەوەرانی لە لایەنەکانی چاکەدا یەکسان دەبنەوە، تا ئەو ڕادەیەی کە بوترێ:

نهێنیی دانستی ئەزەلیی خوای گەورە لە ڕەگەزی مرۆڤدا هاتووەتەدی.

**پوختەی ئەم قسانە ئەوەیە کە:**

مادەم بەپێی ئەو ڕاستی‌یانەی باس کران "مرۆڤ":

باشترین ئەنجامی هەڵبژاردەی ناو بوونەوەرانە و، بەڕێزترینی بەدیهاتووانە لای بەدیهێنەری بەخشندە..

مادەم ژیانی هەمیشەیی بە ڕوونی و بەڵگەنەویستی داخوازی بوونی بەهەشت و دۆزەخە، چونکە ئەو ستەمانەی کە تا ئێستا گرۆی مرۆڤ ئەنجامی داون دۆزەخ دەخوازن، هەروەك توانا و لێهاتنە تەواوەکانی ناو سروشتی و ڕاستی‌یە ئیمانی‌یەکانیشی کە مایەی بایەخی سەرانسەری بوونەوەرانن، بە ڕوونی داواکاری بوونی بەهەشتن..

ئەوا دەبێ بە بێ هیچ گومانێك گرۆی ئادەمیزاد لەو تاوانانە خۆش نەبن کە لە ناوەندی ئەو دوو جەنگە جیهانی‌یە گەورەیەدا ئەنجام دران کە چەندین گرفت و کارەساتی بەسەر هەموو جیهاندا هێنا و، بوونەوەرانی خستە گریان و، زەقوومی شەڕ و خراپەکانی - کە بۆی قووت نەچوو- هەڵهێنایەوە و ڕووی زەویی پێ چەپەڵ و ناشیرین کرد و، مرۆڤایەتیی بە نەگبەتی و بەدبەختیی خۆیەوە تلاندەوە و، کۆشکی ئەو شارستانێتی‌یەشی ڕووخاند کە مرۆڤایەتی بە ماوەی هەزار ساڵ بنیاتی نابوو.

جا ئەگەر قیامەتێکی ناکاو لەسەر ئادەمیزاد بەرپا نەبێت، ئەوا ئومێدمان بە سۆزی خوای بەخشندە و میهرەبان وایە و چاوەڕوانیشین کە ڕاستی‌یەکانی قورئان هۆکارێك بن بۆ ڕزگاریی گرۆی مرۆڤ لە بەربوونەوەی بەرەو بنکی نزمایی‌یەکان و، ڕووی زەوی لە چڵك و چەپەڵی‌یەکان پاك بکاتەوە و، ئاسایشێکی گشتی و هەمە لایەنە دابمەزرێنێت.

## وشەی دووهەم
## (نائومێدی دەردێکی کوشندەیە)

یەکێك لە وانەکانی ئەزموونەکانی ژیانم و بەرهەمێکی ئالوگۆڕە فیکرییەکانم ئەوەیە کە:

"نائومێدی دەردێکی کوشندەیە". کە بە داخەوە لە ناوجەرگەی جیهانی ئیسلامیدا تەشەنەی کردووە و، هەر ئەوەشە کە – بە وێنەی مردوو – ئێمەی خستە بەردەستی دوژمن، بە ڕادەیەك دەولەتێکی خۆرئاوا کە ژمارەی دانیشتووانی دوو ملیۆن نابێت توانیویەتی خۆی بەسەر دەولەتێکی موسلمانی خۆرهەلاتیی بیست ملیۆن کەسیدا بسەپێنێت و داگیری بکات!

هەر ئەم "نائومێدی"یەشە کە ڕەوشتە بەرزەکانی لە ئێمەدا کوشتووە و، ڕوانینی ئێمەی لە بەرژەوەندیی گشتییەوە وەرچەرخاندووە و، ترنجاندوویەتە سوودە تایبەت و کەسییەکانەوە..

هەر ئەم "نائومێدی"یە، وره و گیانی مەعنەویی لە ئێمەدا مراند، ئەو گیانەی کە موسلمانانی پێشین بەهۆیەوە توانییان تەنها بە هێزێکی کەم دەستەلاتی خۆیان بەسەر خۆرهەلات و خۆرئاوای زەویدا بلاو بکەنەوە، بەلام هەر هێندەی ئەو هێزە مەعنەوییە دەراسایە بە "نائومێدی" مرد، یەکسەر بیانییە ستەمکارەکان – وا ماوەی چوار سەدەشە – توانییان خۆیان بەسەر سێ سەد ملیۆن موسلماندا بسەپێنن و بە کۆت و زنجیر بیان بەستنەوە..

تەنانەت کەسی وا هەیە بەهۆی ئەم "نائومێدی"یەوە سستی و کەمتەرخەمیی خەلکانی تر دەکات بە بیانووی خۆدزینەوەی لە بەرپرسیاری و ئەرکی سەرشانی و، بۆ خۆی پال دەداتەوە و دەلێ: "من حەقی خەلکیم چییە؟ خۆ ئەو خەلکەش وەکو من سارد بوونەتەوە و ورەیان بەرداوە".

ئیتر بەو جۆرە دەست لە جوامێریی ئیمانی هەلدەگرێت و، واز لە کاری گەرموگوڕ و مەردانە دەهێنێت لە خزمەتی ئیسلامدا.

جا مادەم ئەم دەردە هەتا ئەم ڕادەیە قەڵاچۆی کردووین و، هەر لە بەرچاوی خۆماندا دەمانکوژێ و لەناومان دەبات، ئەوا ئێمە بڕیارمان داوە تۆڵەی خۆمان لە بکوژەکانمان بسێنینەوە و، بە شمشێری ئایەتی: ﴿لا تَقْنَطُوا مِنْ رَحْمَةِ اللهِ﴾ (الزمر: ٥٣) لە گەردنی ئەو "نائومێدی"یە بدەین و، بە حەقیقەتی فەرموودەی پیرۆزی: (ما لا يُدْرَكُ كُلُّه لا يُتْرَكُ جُلُّه)یش[1] پشتی بشکێنین.

"نائومێدی" چەشنی شێرپەنجە وایە؛ دەردێکی سەخت و سامناکە گەل و نەتەوەکان دووچاری دەبن و.. ڕێگرە لە گەیشتنی مرۆڤ بە ئامانج و ڕەفتارە بڵند و تەواوەکان و.. پێچەوانەی گیانی ئەو فەرموودە قودسی‌یە پیرۆزەیە کە دەفەرموێ: (أنا عندَ ظَنِّ عبدي بي)[2] و.. کار و بیانووی کەسانی ترسنۆك و نزم و دەستەوسانە و.. هەرگیز کار و پیشەی جوامێریی ئیمانی نی‌یە و.. لە شان و شکۆی عەرەبەکانیش ناوەشێتەوە کە بە چەند ڕەوشتێکی هێندە جوان تایبەتمەندن مایەی شانازیی ئادەمیزاد بێت. ئەوەبوو جیهانی ئیسلامی لە دامەزراوی و خۆڕاگریی ئەوان پەند و ئامۆژگاریی وەرگرت.

ئێستاش ئومێدی زۆرمان بە خوای گەورە هەیە کە دەستبەرداری "نائومێدی" ببن و، دەستی یارمەتی و یەکگرتنی ڕاست بۆ ئەو تورکانە درێژ بکەن کە سوپای قارەمانی ئیسلامن، تاکو پێکەوە و بە پشتیوانیی خوای گەورە ئاڵای شەکاوەی ئیسلام لە سەرانسەری جیهاندا بە بەرزی ڕابگرن.

## وشەی سێ‌هەم

## (ڕاستی بناغەی ئیسلامە)

هەموو بە دواگەڕان و لێکۆڵینەوەکانی ماوەی ژیانم و، پوختە و سەرتوێژی ئاڵوگۆڕەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی، بە دڵنیایی تێیان گەیاندووم کە:

---

(١) ئەوەی لە دەقەکەدا هاتووە فەرموودە نی‌یە، بەڵکو دەستوورێکی زانایانە. بڕوانە پەراوێزی (١)ی لاپەڕە (٣٧٥)ی ئەم کتێبە. (وەرگێڕ)

(٢) حديث قدسي صحيح، رواه البخاري ومسلم. (وەرگێڕ)

"ڕاستی"(الصدق) بنچینەی تۆکمەی بناغەکانی ئیسلامە و، پەیوەندیدەری نێوان ڕەوشتە جوان و هەست و نەستە بەرزەکانیەتی. کەواتە دەبێ ئەو "ڕاستی"یەی کە بەردی سەرگۆشەی ژیانی کۆمەڵایەتیمانە، لە دەروونی خۆماندا زیندوو بکەینەوە و، نەخۆشییە مەعنەوییەکانی خۆمانی پێ تیمار و چارەسەر بکەین.

بەڵێ، "ڕاستی" پەیوەندیدەری ژیانی کۆمەڵایەتیی موسڵمانانە. بەڵام "مەرایی" جۆرێکی درۆیە کە بە کردار ئەنجام دەدرێت.. "زمان لووسی" و "خۆنواندن" درۆیەکی تری نزم و ڕسوایە.. "دوو ڕوویی"ش درۆیەکی یەکجار زیانبەخشە.. خودی "درۆ"ش بۆ خۆی بوختانە بە دەم توانستی کردگاری شکۆمەندەوە!

"کوفر" بە هەموو جۆرەکانیەوە بریتییە لە "درۆ".. کەچی "ئیمان" تەنها "ڕاستی" و حەقیقەتە.. کەواتە هێندەی دووریی نێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوا جیاوازیی نێوان ڕاست و درۆش بەرین و فراوانە. هەروەها دەبێ بە وێنەی تێکەڵ بوونی ڕووناکی و ئاگر، ڕاست و درۆش بەو شێوەیە تێکەڵ بە یەکتر نەبن. بەڵام "سیاسەت"ی غەددار و پڕوپاگەندەی ستەمکار ئەو دوانەی تێکەڵی یەکتری کردووە و، لە ئەنجامی ئەمەشەوە ڕەوشت و ڕەفتارە بڵندەکانی مرۆڤایەتی تێکەڵ بە ناتەواوی و نزمامییەکانی بوون[1].

(١) برایانم! لەم وانەیەوە کە چل و پێنج ساڵ پێش ئێستا "سەعیدی کۆن" ئاراستەی کردووە، دەردەکەوێت کە: سەعید پەیوەندییەکی توندوتۆڵی بە سیاسەت و کاروباری کۆمەڵایەتیی ئیسلامەوە هەبووە. بەڵام هەرگیز گومانی ئەوە نەبەن کە ڕێبازەکەی بەکارهێنانی ئایین بوبێت وەك ئامراز و هۆکارێك بە دەستی سیاسەتەوە. نەخێر! بەڵکو بە هەموو هێزێکی خۆی هەوڵی دەدا سیاسەت بکات بە ئامراز بە دەستی ئایینەوە و، دەیوت: "من یەك دانە ڕاستیی ئایینم لە هەزار کێشەی سیاسیی دنیا پێ باشترە".

بەڵێ، ئەو کاتە – نزیکەی پەنجا ساڵ پێش ئێستا – هەستی کرد بەوەی کە هەندێ لە مولحیدانی دوو ڕوو تێدەکۆشن ئایین بکەن بە ئامرازی دەستی سیاسەت. ئەمیش بە هەموو هێز و توانایەکی خۆی ڕووبەڕووی نیاز و هەوڵ و تەقالا فیکرییەکانی ئەوانە بووەوە و، تێکۆشا کە سیاسەت بکات بە یەکێك لە خزمەتگوزار و هۆکارەکانی هێنانەدیی ڕاستییەکانی ئیسلام.

بەڵام دوای بیست ساڵ بینیی کە هەندێ کەس لە سیاسییە ئاییندارەکان هەوڵ دەدەن ئایین بکەن بە ئامرازێك بە دەستی سیاسەتی ئیسلامییەوە، لە بەرامبەر ئەو مولحید و دووڕووانەی پشتی پەردەوە کە بە بیانووی خۆبەخۆرئاوایی کردن دەچن ئایین دەکەن بە ئامرازی دەستی سیاسەت. بەڵام هەرگیز خۆری ئیسلام ناگونجێ ببێت بە شوێنکەوتەی ڕووناکییەکانی زەوی، یان ئامرازی دەستی. هەوڵی ئەوەش کە بکرێت بەو ئامرازە، لە ڕاستیدا کەم کردنەوە و داگرتنی شان و شکۆی ڕێزی ئیسلام دەگەیەنێت، کە ئەوەش تاوانێکی یەکجار گەورەیە بەرامبەری. تەنانەت "سەعیدی کۆن" ئەو جۆرە لایەنگرتنەی سیاسەتی لە ڕووداوێکدا بینی کە: زانایەکی پیاوچاك بە گەرمی ستایشی مونافیقێکی کرد لەبەر ئەوەی هاوبیری سیاسیی خۆی بوو، کەچی

"ڕاست و درۆ" هێندەی دووریی "کوفر و ئیمان" لە یەکترەوە دوورن. چونکە بەرزبوونەوەی حەزرەتی محەممەد ﷺ لەو سەردەمە بەپیت و بەرەکەتەی ئیسلامدا بەرەو پلە هەرە بەرزەکان بەهۆی "ڕاستی"یەوە بوو، هەروەك کردنەوەی گەنجینەکانی سەرجەم ڕاستی‌یەکانی ئیمان و نهێنی‌یە داخراوەکانی گەردوون لە لایەن ئەو زاتە ڕاستگۆیەوە، پلەی "ڕاستی"ی هێندە بەرز کردەوە کە لە بازاڕی ژیانی کۆمەڵایەتیی ئەو ڕۆژگارەدا بە برەوترین و بەنرخترینی کەرەسە و شمەکەکان بێت.. کەچی موسەیلەمەی درۆزن و هاوشێوەکانی بەهۆی "درۆ"وە دابەزینە خوارەوە بۆ ناو بنکی هەموو نزماییەکان..

چونکە لەبەر ئەو ئاڵوگۆڕە مەزنەی لە کۆمەڵگادا ڕووی دا، بۆ خەڵکی دەرکەوت کە "درۆ" کلیلی دەرگای کوفر و ئەفسانەکان و، بێ کەڵکترین و چەپەڵترینی کەرەسەکانە. کەواتە کەرەسە و شمەکێك تا ئەو ڕادەیە بێزکردنەوە و بێزاری لای هەموو خەڵکی بورووژێنێت، هەرگیز ناگونجێ دەستی ئەو کەسانەی بۆ درێژ ببێت لە ڕیزی پێشەوەی ئەو ئاڵوگۆڕە مەزنەوە بوون، کە ئەو هاوەڵە بەڕێزانەن سروشتیان لەسەر وەرگرتنی باشترین و بەنرخترین کاڵا خولقابوو.

---

لە هەمان کاتدا ڕەخنەی لە زانایەکی پیاوچاك گرت لەبەر ئەوەی لە دژی بیرو ڕا سیاسی‌یەکانی ئەم بوو، تەنانەت بە "فاسق"یش ناوزەدی کردا! "سەعیدی کۆن" پێی وت: "گەر شەیتانێك پشتی بیروڕای سیاسیت بگرێت بارانی ڕەحمەتی بەسەردا دەبارێنیت، کەچی گەر کەسێك بیرێکی پێچەوانەی بیری سیاسیی تۆی هەبێت، تەنانەت گەر مەلائیکەتیش بێت لەعنەتی بۆ دەنێریت"! لەبەر ئەوە بوو کە سی و پێنج ساڵ پێش ئێستا "سەعیدی کۆن" وتی: "أعوذ بالله من الشيطان والسياسة" و، دەستبەرداری سیاسەت بوو. (دانەر)

لەبەر ئەوەی "سەعیدی نوێ" بە تەواوی دەستی لە سیاسەت داتەکاند و بە هیچ شێوەیەك بۆی ناڕوانێت، ئەوا لە بریی دەرسەکەی "وتاری شام" کە تایبەتە بە سیاسەتەوە ئەم تەرجەمەیە بڵاو دەکەینەوە.

پاشان هەرگیز ئەوە نەسەلماوە کە لە درێژایی ژیانی سیاسییدا کە زیاد لە چارەکە سەدەیەکی خایاندووە ئایینی وەك ئامرازێك بۆ سیاسەت قۆزتبێتەوە. هەروەها لە نووسین و پەیامەکانیشیدا کە لە سەد و سی دانە زیاترن و، لە لایەن کارشناسانی دادگاکانەوە لێ وردبوونەوەیان لەسەر کراوە، تەنانەت لە دژوارترینی ئەو بارودۆخانەشدا کە بەهۆی توندوتیژیی گوشارەکان هەر کەسێکی تر لەجێی ئەو بوایە ناچار دەبوو پەنا بۆ بەکارهێنانی سیاسەت ببات، کەچی ئەو توخنی نەکەوت. بگرە لەو کاتەشدا کە بە نهێنی بڕیاری لە سێدارەدانی دەرکرابوو، هیچ کەسێك نیشانەیەکی لێ نەبینی کە بەڵگەی ئەوە بێت ئایینی لە پێناوی سیاسەتدا بەکارهێنابێت.

ئێمەی قوتابیانی نوور کە لە نزیکەوە چاودێریی دەکەین و شارەزای هەموو لایەنێکی وردین لە ژیانیدا، بەرامبەر بەم حاڵەتە دووچاری حەپەسان و سەرسووڕمان بووین و، بە بەڵگەیەکی دادەنێین لەسەر ئیخلاسی ڕاستەقینەی ناو بازنەی پەیامەکانی نوور. (قوتابیانی نوور)

خـوا نـه‌کا ئـه‌وان ده‌سـته پیرۆزه‌کانیـان بـه ئه‌نقه‌سـت بـۆ "درۆ" بـه‌ن و، پـاك و خاوێنی‌یه‌که‌ی له‌ده‌ست بده‌ن و، چـاو لـه موسـه‌یله‌مه‌ی درۆزن بکـه‌ن.. بـه‌ڵکو لـه ڕێـی حه‌ز و نیازی خۆیانه‌وه که هه‌ر به سروشت ساغ و بێ عه‌یبه، بـه هـه‌موو هێزێکیانـه‌وه لـه پێشه‌نگی کڕیارانی که‌ره‌سه‌ی "ڕاستی"یه‌وه بوون که به بره‌وتریـن و بـه‌نرخترینی کـاڵا و سـامانه‌کانه، ته‌نانـه‌ت کلیلـی کردنـه‌وه‌ی سـه‌رجه‌م ڕاسـتی‌یه‌کانه و، پلیکانـه‌ی سه‌رکه‌وتنی حه‌زره‌تی محه‌ممه‌ده ﷺ بۆ پله هه‌ره به‌رزه‌کان.

جا له‌به‌ر ئه‌وه‌ی هاوه‌ڵه به‌ڕێزه‌کان به هه‌موو توانایـه‌کیان پابـه‌ندی "ڕاستی" بـوون و لێیان لانه‌دا، زانایانی فیقهـ و فه‌رمووده بڕیاریان داوه که:

(هاوه‌ڵه به‌ڕێزه‌کان "دادگه‌ر"ن و، شایه‌تییان پێویست به هیچ پشتگیری‌یه‌ك ناکـات. به‌ڵکو هه‌ر فه‌رمووده‌یه‌ك ئه‌وان له زاری پێغه‌مبه‌ره‌وه ﷺ بیگێڕنه‌وه، ڕاست و دروسته).

هه‌روه‌ها هۆکاری سه‌ره‌کیی یه‌کگرتنی ئـه‌هلی شـه‌ریعه‌ت و ئه‌هلی حه‌دیسیش ئـه‌م ڕاستی‌یه‌یه که باسمان کرد.

به‌م جۆره، ئه‌و ئاڵوگۆڕه مه‌زنه‌ی که له باشترینی سه‌ده‌کانی مێـژوودا ڕووی دا، بـوو به‌هۆی ئه‌وه‌ی کـه بـه ئـه‌ندازه‌ی دووریـی ئیمـان لـه کوفـره‌وه مـه‌ودای نێـوان "ڕاسـت و درۆ"ش له یه‌کتر دوور بێت.

به‌ڵام به تێپه‌ڕبوونی کات و به‌سه‌رچوونی ڕۆژگاره‌کان ماوه‌ی نێوان "ڕاست و درۆ" هـه‌تا هـات کـه‌می کرد و بـه تـه‌واوی لـه یـه‌کتر نزیـك بـووه‌وه. ته‌نانـه‌ت هـه‌ندێ جـار پڕوپاگـه‌نده‌ی سیاسـی بـره‌وی زیـاتر بـه "درۆ" ده‌دات. ئیـتر درۆ و خراپکـاری هاتنـه مه‌یدانه‌وه و تا ڕاده‌یه‌ك بواریان بۆ ڕه‌خسا.

له‌سه‌ر بناغه‌ی ئه‌م ڕاستی‌یه:

هیچ که‌سێك ناتوانێت بگاته پله‌ی هاوه‌ڵه به‌ڕێزه‌کان.

لێره‌دا ئه‌م ئه‌ندازه‌یه‌مان له‌م باسه پێ سه‌روزیاده و، خوێنه‌ری به‌ڕێز ڕه‌وانـه‌ی (پـه‌یامی هاوه‌ڵان) ده‌که‌ین، که پاشکۆی وته‌ی بیست و حه‌وته‌م(په‌یامی ئیجتیهاد)ه.

ئه‌ی برایانم له‌م مزگه‌وتی ئه‌مه‌وی‌یه‌دا! ئه‌ی چوارسه‌د ملیۆن برا ئیمانداره‌کانیشم که دوای چل ساڵ دێنه ناو مزگه‌وتی گه‌وره‌ی جیهانی ئیسلامی‌یه‌وه!

تاقانە ڕێی ڕزگاری "ڕاستی"یە.. چونکە هەر "ڕاستی" دەستاوێزێکی مەحکەم و قایمە..

"درۆی مەسڵەحەت"یش ڕۆژگار هەڵی وەشاندەوە. ڕاستە هەندێ زانا بە شێوەیەکی کاتی و لەبەر ناچاری و بەرژەوەندی فەتوایان بۆ درۆی لەو جۆرە دابوو، بەڵام لەم ڕۆژگارەدا کار بەو فەتوایە ناکرێت، چونکە هێندە بە شێوەیەکی خراپ بەکارهێنرا کە مەگەر لە نێوان سەد شتی خراپدا یەك سوود و بەرژەوەندیی تێدا بەدەست بێت. هەر لەبەر ئەوەشە کە حوکم و بڕیارە شەرعی‌یەکان لەسەر بناغەی "بەرژەوەندی" بنیات نانرێن.

نموونەی ئەوە:

حیکمەت و هۆی کورتکردنەوەی نوێژەکان لە سەفەردا "مەشەققەت"ە. بەڵام "مەشەققەت" نابێت بە عیللەتی شەرعیی ئەو کورتکردنەوەیە، چونکە سنوورێك نی‌یە دەستنیشانی بکات و، لەوانەیە بە خراپی بەکاربهێنرێت. لەبەر ئەوە عیللەتەکە هەر خودی "سەفەر"ەکە خۆیەتی.

هەروەك ئەمە لەم نموونەیەدا بەو جۆرەیە.. "مەسڵەحەت"یش بە هەمان شێوەیە و، ناگونجێ بکرێت بە عیللەتی حەڵاڵ کردنی "درۆ"، چونکە درۆ سنوورێکی دیاری کراوی نی‌یە تیایدا ڕاگیر بکرێت. هەروەك زەلکاوێکی لەباریشە بۆ بەکارهێنانی خراپ، بۆیە هیچ حوکمێکی شەرعیی پێوە نابەسترێت.

کەواتە مرۆڤ تەنها دوو ڕێی لە بەردەمدایە کە سێ‌هەمی نی‌یە: (یان ڕاستی.. یان بێ دەنگی). هەرگیز درۆ لەو ناوەندەدا نی‌یە هەتا بوترێ: یان ڕاستی.. یان درۆ.. یان بێ دەنگی!

پاشان نەمانی ئاسایش و ئارامی لەم کاتەی ئێستاماندا بەهۆی ئەو درۆ ترسناکەی کە مرۆڤایەتی ئەنجامی دەدات و ڕاستی‌یەکان ئاوەژوو دەکات و دەیانشێوێنێ و بوختان هەڵدەبەستێ، تەنها ئاکامی درۆ کردن و بەکارهێنانی خراپیەتی لە پێناوی بەرژەوەندیدا. هیچ ڕێگا چارەیەك لە بەردەم گرۆی مرۆڤدا نی‌یە جگە لە داخستنی ڕێی سێ‌هەم (درۆ). دەنا ئەو هەموو جەنگە جیهانی و ئاڵوگۆڕە ترسناك و کاولکاری‌یە تۆقێنەرەی کە لە نیوەی ئەم سەدەیەدا ڕوویان دا لەوانەیە قیامەتێك لەسەر گرۆی مرۆڤ بەرپا بکەن.

بەڵێ، دەبێ لە هەموو گوفتارەکانتدا ڕاستگۆ بیت. بەڵام کارێکی ڕاست نییە کە هەموو ڕاستییەك بڵێیت. چونکە ئەگەر وتنی ڕاستی هەندێ جار زیانێکی لێ دەکەوتەوە، دەبێ مرۆڤ بێ دەنگ بێت و، درۆیش بە هیچ جۆرێ ڕێی پێ نادرێ.

دەبێ هەرچی دەڵێیت "حەق" بێت. بەڵام مافی ئەوەت نییە هەموو حەقێك بڵێیت. چونکە ئەگەر ئەو حەقە پاك و بێگەرد نەبوو، لەوانەیە کاریگەریی خراپ بەجێ بهێڵێت و، حەقەکەش لە ناحەقییەکدا بە زایە بچێت.

## وشەی چوارەم

## (خۆشەویستی)

یەکێك لەو شتانەی کە لە ماوەی تەمەنمدا لە ژیانی کۆمەڵایەتیی ئادەمیزادەوە فێری بووم و، گەڕان و پشکنین و لێکۆڵینەوەکانم داویانە بە دەستمەوە، ئەوەیە کە:

شایستەترین شت بۆ خۆشویستن خودی "خۆشەویستی"یە و.. شایانترین سیفەتیش بۆ دوژمنایەتی کردن خودی "دوژمنایەتی"یە..

واتە سیفەتی "خۆشەویستی" کە دەستەبەری ژیانی کۆمەڵایەتیی گرۆی مرۆڤە و، هاندەری هێنانەدیی بەختەوەرییەتی، شایستەترین شتێکە مرۆڤ خۆشی بوێت.. هەروەك سیفەتی "دوژمنایەتی" و ڕق و قین، کە هۆکاری ڕووخێنەری ژیانی کۆمەڵایەتییە، ناشیرینترین و زیانبەخشترین سیفەتەکانە و لە هەموویان شیاوترە بۆ ئەوەی دوورەپەرێزیی لێ بکرێت.

جا لەبەر ئەوەی لە مەکتووبی بیست و دووهەمدا (واتە پەیامی برایەتی) ئەم ڕاستییەمان ڕوون کردووەتەوە، ئەوا لێرەدا تەنها بە پوختە ئاماژەیەك لێی دەدوێین:

سەردەمی دوژمنایەتی و ڕقەبەرایەتی کۆتایی پێ هات. هەر دوو جەنگە جیهانییەکە ڕادەی ئەو ستەمە چەپەڵ و وێرانکارییە سامناکەیان دەرخست کە لە "دوژمنایەتی"دا هەیە و، دەرکەوت کە هیچ سوودێکی تێدا نییە. کەواتە نابێ خراپکاریی دوژمنەکانمان - بە مەرجی سنوور نەشکاندن - ڕقی ئێمە لە دژیان بورووژێنێت. سزای خوا و ئاگری دۆزەخ سەروزیادیانە.

لەخۆبایی بوونی مرۆڤ و خۆشویستنی خۆی، هەندێ جار بە ناحەق و ستەم و بێ ئەوەش بە خۆی بزانێت، دەیبەن بەرەو دوژمنایەتیی برا ئیماندارەکانی و، لای وا دەبێ کە خۆی لەسەر حەق بێت.

لە کاتێکدا ئەم دوژمنایەتی‌یە - لە ڕاستیدا - سووکایەتی کردنە بەو پەیوەندی و هۆکارانەی کە ئیمانداران پێکەوە گرێ دەدەن و، شکاندنی ڕێز و شان و شکۆیانە، چەشنی: ئیمان و ئیسلام و مرۆڤایەتی. هەروەها وەك نەفامیی ئەو کەسە وایە کە چەند هۆکارێکی دوژمنایەتیی بێ نرخی وەك بەردە وردەی بەلاوە باشتر بێت لە چەندین هۆکاری مەزنی خۆشەویستی کە هێندەی چیا گەردن کەشەکان دەبن.

جا مادەم "خۆشەویستی" دژی "دوژمنایەتی"یە، ئەوا بە وێنەی تاریکی و ڕووناکی وان؛ هەرگیز پێکەوە کۆنابنەوە. ئیتر هۆکارەکانی کامیان بەسەر هی ئەوی تردا زاڵ بێت، ئەوەیان بە ڕاستی جێی خۆی لەناو دڵدا دەکاتەوە. بەڵام دژەکەی هەرگیز بە جۆرێکی ڕاستەقینە لەوێ جێی نابێتەوە!

بۆ نموونە:

ئەگەر خۆشەویستیی ڕاستەقینە لە دڵدا هەبێت، دوژمنایەتی‌یەکە دەگۆڕێت بە سۆز و بەزەیی. دەبێ ئیمانداران لە نێوان خۆیاندا حاڵیان وا بێت.

بەڵام گەر دوژمنایەتیی ڕاستەقینە لەناو دڵدا جێگیر بوو بێت، ئەوا خۆشەویستی‌یەکە دەگۆڕێت بە خۆگونجاندن و لەگەڵدا ڕۆشتن و هاوڕێیەتیی ڕواڵەتی. ئەمەش دەبێ تەنها لەگەڵ ئەو گومڕایانەدا بەکار بهێنرێت کە سنووریان نەشکاندووە.

بەڵێ، هۆکارەکانی خۆشەویستی بریتین لە ئیمان و ئیسلام و هاوڕەگەزایەتی و مرۆڤایەتی و زنجیرە نوورانی‌یە توندوتۆڵ و قەڵا و شوورا سەخت و پۆڵایینەکانی تری هاوچەشنیان. بەڵام هۆکارەکانی ڕق و دوژمنایەتی بەرامبەر بە ئیمانداران چەند شتێکی تایبەتی و بێ نرخ و بێ بەهای وەك بەردە وردە وان.

بۆیە دوژمنایەتی و ڕق هەڵگرتنی ڕاستەقینەی موسڵمان بەرامبەر برای موسڵمانی، لە ڕاستیدا هەڵەیەکی یەکجار گەورەیە، چونکە سووکایەتی کردنە بەو هۆکارانەی خۆشەویستی کە بە وێنەی چیا مەزنەکانن.

**لەمانەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە:**

خۆشەویستی و برایەتی هەندێکن لە سروشت و هۆکارەکانی پەیوەندی لە نێوان موسڵماناندا. کەواتە ئەو کەسەی دوژمنایەتی لە دڵی خۆیدا هەڵدەگرێت، وەکو منالێکی بێ زەوق وایە کە بە بچووکترین بیانوو دەیەوێ بگری و، لەوانەیە شتێکی لە باڵەمێش بچووکتریش سەروزیاد بێت بۆ ئەوەی بیخاتە گریان! یان وەکو پیاوێکی ڕەشبین و بێ ویژدانە کە هەتا بواری بردنی گومانی خراپی لە بەردەمدا بێت، گومانی باش بە هیچ شتێك نابات! ئیتر لەبەر تەنها یەك دانە خراپە دەچێ دە چاکەی براکەی دەشارێتەوە. دیارە ئەمەش لەگەڵ ڕەوشتی ئیسلامیدا ناگونجێت، کە داوای گومانی باشی و بەکارهێنانی ویژدان لە موسڵمان دەکات.

## وشەی پێنجەم
## (دووچەندانە بوونەوەی خراپە و چاکە)

ئەو وانەیەی کە لە شوورای شەرعی‌یەوە وەرم گرتووە، ئەوەیە کە:

خراپەی یەك کەس لەم ڕۆژگارەدا هەر بە یەك دانە خراپە نامێنێتەوە، بەڵکو لەوانەیە گەورە ببێت و پەرە بسێنێت تا دەگاتە ئەوەی کە ببێت بە سەد کردەوەی خراپ.

هەروەها یەك دانە کردەوەی چاکیش بەو یەك دانە چاکەیەوە نامێنێتەوە، بەڵکو لەوانەیە دوو چەندانە ببێتەوە هەتا دەگاتە هەزاران چاکە.

حیکمەت و نهێنیی ئەمەش لەوەدایە کە: سەربەستیی شەرعی و شوورای ڕەوا، سەروەریی ڕاستەقینەی نەتەوەکەی ئێمەی دەرخست. چونکە بەردی بناغە و ڕاگری گیانی نەتەوەکەمان تەنها هەر ئیسلامە. خەلافەتی عوسمانی و سوپای تورکیش لەو ڕووەوە کە هەڵگری ئالای ئەو نەتەوە موسڵمانەن، وەکو لەپکە و شوورای قەڵای نەتەوەوان. عەرەب و تورکیش دوو برای ڕاستەقینەن و، هەر بەو جۆرەی ئێستایان بە پاسەوانی ئەمینی ئەو قەڵا پۆڵایین و لەپکە قایم و توندوتۆڵە دەمێننەوە.

بەم جۆرە و بەهۆی ئەم پەیوەندی‌یە پیرۆزەی کە نەتەوەی ئیسلام پێکەوە دەبەستێ، سەرجەمی موسڵمانان بە وێنەی یەك دانە هۆزیان لێ دێت. ئیتر هەموو تیرەکانی ئیسلام،

بە وێنەی پەیوەندی‌یەکانی نێوان یەك هۆز، بەهۆی پەیوەندیی برایەتیی ئیسلامەوە پێکەوە پەیوەست دەبن و بە جۆرێکی مەعنەوی، تەنانەت گەر پێویست بکات لە ڕووی ماددیشەوە، دەبنە پشتگیر و یارمەتیدەری یەکتری. وەك بڵێی سەرجەم دەستە و تیرە موسڵمانەکان بە وێنەی ئەڵقەکانی زنجیرەیەکی نوورانی هۆنرابنەوە.

جا بە وێنەی ئەوەی کە تاکە کەسێك لە هۆزێکدا گەر تاوانێکی ئەنجام دابێت، هەموو کەسانی ئەو هۆزە بە لای هۆزەکەی ترەوە بە تاوانبار دادەنرێن، وەك بڵێی یەك بە یەکیان تاوانەکەی کردبێت و، ئەو یەك دانە تاوانە بووبێت بە هەزاران دانەی تری وەك خۆی.. هەروەها گەر کەسێکیان کردەوەیەکی چاکی لەسەر دەست ڕوو بدات، ئەوا یەك بە یەکی کەسانی ئەو هۆزە شانازیی پێوە دەکەن، وەك بڵێی هەموو یەکێکیان ئەو چاکەیەی ئەنجام دابێت..

بە هەمان جۆر و لەبەر ئەم ڕاستی‌یە، لەم سەردەم و ڕۆژگارەی خۆماندا - بە تایبەت دوای چل پەنجا ساڵی تر - مرۆڤی خراپکار تەنها خۆی بەرپرس نی‌یە لە کردەوە خراپەکەی، بەڵکو هەموو نەتەوەی ئیسلام بە ملیۆنەها کەسیەوە لەو تاکە خراپەیەوە دووچاری زیان دەبن. لە دوای چل پەنجا ساڵی تر نموونەی ئەم ڕاستی‌یە بە زۆری بەرچاو دەکەون.

ئەی برایانی گوێ بیستی وتەکانم لەم مزگەوتی ئەمەوی‌یەدا و، ئەی برایانی موسڵمانی ناو مزگەوتی جیهانی ئیسلامیش لە دوای چل پەنجا ساڵ!

کەستان بیانوو بەوە نەهێنێتەوە کە بڵێت:

(ئێمە زیانمان بۆ کەس نی‌یە، بەڵام ناشتوانین سوودمان بۆ کەسێك هەبێت. کەواتە پۆزشمان هەیە و گلەییمان لێ ناکرێ)!

ئەم بەهانەیەتان وەرناگیرێت. چونکە هەر تەنها تەمبەڵی و گوێ نەدان و سارد و سڕیتان لەوەی کارێك ئەنجام بدەن بۆ هێنانەدیی یەکێتیی موسڵمانان و یەکگرتنی ڕاستەقینەی نەتەوەی ئیسلام، خۆی بۆ خۆی زیانێکی گەورە و ستەمێکی ئابڕووبەرە.

جا هەروەك تەنها یەك کردەوەی خراپ دەبێ بە هەزاران خراپە، لەم ڕۆژگارەدا یەك دانە کردەوەی چاکیش - واتە هەر کردەوەیەك پەیوەندیی بە پیرۆز ڕاگرتنی ئیسلامەوە هەبێت - سوودەکەی تەنها بۆ ئەنجامدەرەکەی ناگەڕێتەوە، بەڵکو لە ڕووی

مەعنەوی‌یەوە پەرە دەسێنێت هەتا سوودەکانی دەگاتە ملیۆنەها موسڵمان و، پشتگیری دەبەخشێت بە ژیانی ماددی و مەعنەوی‌یان.

کەواتە ئەم سەردەم و ڕۆژگارە هی پاڵدانەوەی ناو پێخەفی تەمبەڵی و حەوانەوە و بایەخ نەدان بە حاڵی موسڵمانان نی‌یە و، نابێ هیچ کەسێك بڵێ: "من حەقم نی‌یە.. چیم لە خەڵکی داوە"؟

ئەی برایانی ناو ئەم مزگەوتەم و، ئەی برایانی ناو مزگەوتی گەورەی جیهانی ئیسلامیش لە دوای چل پەنجا ساڵ!

وا گومان نەبەن کە من بۆ ئەوە هاتوومەتە سەر ئەم مینبەرە ڕێنمایی و ئامۆژگاریتان بکەم. نەخێر..

بەڵکو بۆ ئەوە هاتووم کە مافی خۆمان بیر بخەمەوە بەسەرتانەوە و داوای ئەو مافەشمان لە ئێوە بکەم. چونکە بەرزەوەندی‌یەکانی دەستە و تیرە بچووکەکان و بەختەوەری‌یەکانی دنیا و قیامەتیان پەیوەستە بە هاوشێوەکانی ئێوە لە دەستە و تیرە مەزنەکان و، مامۆستایان و کاربەدەستانی تورك و عەرەب. چونکە تەمبەڵی و ساردوسڕیی ئێوە زیانێکی یەکجار گەورە لە دەستە و تیرە بچووکەکانی وەك ئێمە دەدات.

ئەم وتەیەشم بە تایبەتی ئاراستەی ئێوە دەکەم ئەی عەرەبە گەورە و بەڕێزەکان! ئەی ئەوانەی کە بەشی خۆتان لە بێداریی ڕۆژگار بەدەست هێناوە، یان لە داهاتوودا بە تەواوی بێدار دەبنەوە! چونکە ئێوە مامۆستا و پێشەوای ئێمە و هەموو نەتەوە موسڵمانەکانی تر و، موجاهیدانی یەکەمی ئیسلام بوون. ئنجا دوای ئێوەش نەتەوەی گەورەی تورك هات تاکو لەو ئەرکە پیرۆزەتاندا یارمەتی‌یەکی گەورەتان بدات.

ئێوە هەروەك کردەوە چاکەکانتان گەلێ بەرز و مەزنە، سستی و تەمبەڵیشتان تاوانێکی یەکجار گەورەیە!

ئێمە هیوایەکی زۆرمان بە خوای گەورە هەیە کە هەروەك جەماوەرانی ئەمریکا یەکیان گرت، ئێوەش بە هەمان جۆر دوای چل پەنجا ساڵی تر لە نێوان خۆتاندا یەك بگرن و، پلە و پایەی بڵندی خۆتان بەدەست بهێنن. ئەو کاتەش خوای گەورە پشتیوانتان دەبێت لە گێڕانەوەی سەروەریی لەدەستچووی ئیسلامدا و، بە وێنەی ڕابوردوو ئەو

سەروەری‌یە لە نیوەی گۆی زەویدا، بەڵکو لە زۆربەیدا دادەمەزرێنن. جا ئەگەر قیامەتێکی ناکاو بەرپا نەبێت، نەوەی داهاتوو هاتنەدیی ئەم ئاواتە دەبینن.

برایانی بەڕێزم!

تکام وایە گومانی ئەوە نەبەن کە من بەم قسانەم بمەوێت هیممەت و لێبڕانی ئێوە هان بدەم بۆ خەریك بوون بە سیاسەتەوە! خوا نەکا شتی وام مەبەست بێت. چونکە ڕاستیی ئیسلام لە هەموو سیاسەتێك بەرز و باڵاترە. بەڵکو هەموو جۆرەکانی سیاسەت دەکرێ لە خزمەتی ئیسلامدا هەنگاو بنێن و، هەوڵ و تەقالای بۆ بدەن و، هیچ سیاسەتێك مافی ئەوەی نی‌یە کە ئایینی ئیسلام بۆ هێنانەدیی ئامانجەکانی خۆی بەکاربهێنێت.

من بە تێگەیشتنی کەم و کۆتای خۆم، کۆمەڵگای ئیسلامیم بە گشتی لەم ڕۆژگارەدا وەکو کارگەیەکی پێکهاتوو لە چەندین چەرخ و ئامێری جۆراوجۆر دێتە پێش چاو، کە ئەگەر چەرخێك لەو کارگەیەدا لەکار بکەوێت یان سنووری پێچکە و چەرخەکەی تەنیشتی ببەزێنێت، بە بێ گومانی سیستەمی ئەو کارگە ئۆتۆماتیکی‌یە تێکدەچێت. جا لەبەر ئەوەی کاتی ئەوە هاتووە کە یەکێتیی ئیسلامی بێتەدی یان نزیکە بێتەدی. ئەوا دەبێ چاو لە قسووری کەسیی خۆتان بپۆشن و لە یەکتری خۆش ببن.

هەر لێرەدا بەوپەڕی پەژارەوە لەوەش ئاگادارتان دەکەمەوە کە بەشێك لە بیانی‌یەکان هەروەك نیشتمانیان زەوت کردین و بە نرخێکی کەمی چەند دراوێکی قەڵبیش سامانی بەنرخیان لە دەست دەرهێناین..

بەشێکی ڕەوشتە بەرز و جوانەکانی ئێمەشیان، لەوانەی کە کۆمەڵگاکانمان پێکەوە گرێ دەدات، بە تاڵانی برد و، کردیان بە تەوەرەی پێشکەوتنی خۆیان. لە بەرامبەر ئەوەشەوە ڕەوشت و خووە ڕسوا و نالەبار و هەرزە ڕەفتارەکانی خۆیان خستە نێوانمانەوە!

بۆ نموونە: یەکێك لەو ڕەوشتە نەتەوەییانەی لە ئێمەیان وەرگرت ئەوەیە کە هەموو یەکێکیان دەڵێت:

"ئەگەر من مردم، یاخوا نەتەوەکەم هەر بژی. چونکە بە ژیانی ئەو منیش ژیانێکی نەبڕاوەم دەبێت".

ئەم ڕەوشتەی کە بەهێزترین وتوندوتۆڵترین بناغـەکانی پێشکەوتنیانە، لـە ئێمـەیان بـە تـالانی بـردووە. چونکـە ئـەم وتەیـە تەنـها لـە ئـایینی ڕاستەقینە و ڕاستی‌یەکانی ئیمانـەوە سەرچاوە دەگرێت. کەواتە هی ئێمە و هەموو ئیماندارانە لێمان زەوت کراوە..

کـەچی لـە بریـی ئـەوە، چـەند ڕەوشـت و خوویـەکی نـزم و بـێ کـەڵك هاتووەتـە ناومانەوە. دەبینی مرۆڤی خۆپەرستی وا هەیە دەڵێت:

(ئەگەر من بە تینوویی مردم، یاخوا دڵۆپێك باران نەبارێت)!

یان دەڵێت:

(گەر خۆم بەختەوەری نەبینم، با هەموو دنیا لەناوچێت)!

ئـەم چەشـنە وشـە گەوجانەیە تەنـها لـە نـەبوونی ئـایین و ئاشـنا نـەبوون بـە دوارۆژەوە سەرچاوە دەگرن. کەواتە بە ئێمە نامۆیە و ژەهرمان دەرخوارد دەدات.

هەر ئـەو ڕەوشتە جوانـەی ئێمـە کـە گەیشـتە دەستی بیانی‌یـەکان، نـرخ و بەهایـەکی گەورەی بە هەموو یەکێکی ئەوان بەخشـی، بـە ڕادەیـەك کـە هـەر یـەکێك لـەوان دەڵێـی نەتەوەیەکە بۆ خۆی. چونکە نرخ و بەهای هەر کەسێك بەندە بە هیممەتیەوە؛ جا ئەگـەر هیممـەتی هـەر کەسێك نەتەوەکـەی بێـت، دڵنیابـە ئـەو کەسـە نەتەوەیـەکی بچووکـی سەربەخۆیە لە خۆیدا!

بەسەر ئەو هەموو بەرزی و پیرۆزی‌یەشەوە کە لە نەتەوەکەماندا هەیە، کەچی بـەهۆی بێدار نەبوونـەوەی کەسـانێکی نـاو ئێمـە و، وەرگرتنـی ڕەوشـت و ڕەفتـارە بـێ کـەڵك و خراپەکانی بیانی‌یەکان، کەسی وامان تێدایە دەڵێت:

"هەر خۆم.. هەر خۆم"!

جا هەزار کەسی وەك ئەمەی کە تەنها بیر لە بەرژەوەندیی کەسیی خـۆی دەکاتـەوە و بایەخ بە بەرژەوەندیی نەتەوە نادات، لە جێی یەك دانە کەسدایە!

(مَن كانَتْ هِمَّتُهُ نَفْسَهُ فليسَ مِنَ الإنسان، لأنه مَدَنِيٌّ بالطبع)!

واتە: "هەر کەسێك هیممەتی تەنها بۆ خۆی بخاتە کار مـرۆڤ نی‌یـە، چونکـە مـرۆڤ بـە سروشـت شارسـتانی‌یە و پەیوەسـتە بـە کۆمەڵـەوە"! کەواتـە ناچـارە چـاودێریی هاوڕەگەزی خۆی بکـات، چونکـە دەگونجـێ ژیـانی کەسـیی خـۆی بـەهۆی ژیـانی کۆمەڵایەتیی کۆمەڵەکەیەوە بەردەوام بێت..

بۆ نموونە:

ئەو کەسەی کولێرەیەك دەخوات، دەبێ بیر لەوە بکاتەوە کە پێویستی بە چەند دەست هەیە تا ئەو کولێرەیەی بۆ ئامادە بکەن؟ کەواتە لە ڕاستیدا هەموو ئەو دەستانە ماچ دەکات.

یان ئەو بەرگەی دەیپۆشێت، چەند دەست و ئامێر و کەرەسە و تفاق بۆ ئامادەکردنی لێبڕاون و پشتی یەکیان گرتووە؟

لە ڕوانگەی ئەم دوو نموونەیەوە دەتوانن گەلێ شتی تر لێکبدەنەوە، تاکو بزانن مرۆڤ لەسەر ئەو سروشتە بەدی هاتووە کە پەیوەندیی بە ڕۆڵەکانی هاوڕەگەزی خۆیەوە بێت، چونکە ناتوانێت لێیان دابڕێت و بە تەنیا بژی. بەڵکو ناچارە نرخێکی مەعنەوی‌یان لە بەهای ئەوەدا پێ ببەخشێت کە پێویستی‌یە مەعنەوی‌یەکانی لەکۆڵ دەکەنەوە. کەواتە مرۆڤ هەر بە سروشت بەدیهاتوویەکی شارستانی و کۆمەڵایەتی‌یە.

خۆ ئەو کەسەی کە هەموو بیر و تێڕوانینێکی خۆی دەترنجێنێتە سوود و بەرژەوەندی‌یە کەسی‌یەکانی، لە ڕاستیدا خۆی لە مرۆڤێتی دادەماڵێت و دەبێ بە گیانەوەرێکی دڕندە. مەگەر کەسێك هیچ چارە و دەسەڵاتێکی خۆی لەوەدا نەبێت، یاخود پۆزش و بەهانەیەکی ڕاستەقینەی بە دەستەوە بێت.

## وشەی شەشەم
## (ڕاوێژ)

کلیلی بەختەوەریی موسڵمانان لە ژیانی کۆمەڵایەتی‌یاندا بریتی‌یە لە ڕاوێژ (شوورا). ئایەتی قورئانی پیرۆز فەرمانمان پێ دەدات کە لە هەموو ئیش و کارێکدا ڕاوێژ بە یەکتری بکەین. خوای گەورە لە وەسفی موسڵماناندا دەفەرموێ:

﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ﴾ (الشورى: ٣٨).

بەڵێ، هەروەك بە دوای یەکدا هاتنی بیر وبۆچوونەکانی ڕەگەزی مرۆڤ لە ڕاستیدا ڕاوێژێکی نەپچڕاوی نێوان هەموو سەردەمەکانە لە ڕێی مێژووەوە، بە ڕادەیەکی ئەوتۆ کە بووە بە خولگەی پێشکەوتنی ئادەمیزاد و بناغەی زانستەکانی..

به هه‌مان جۆر، یه‌کێك لـه هۆکاره‌کـانی دواکـه‌وتنی کیشـوه‌ری مـه‌زنی ئاسیاش لـه ڕه‌وڕه‌وه‌ی شارستانێتی: ئه‌نجامنه‌دانی ئه‌و ڕاوێژه‌یه به جۆرێکی ڕاسته‌قینه.

کلیل و ده‌رخه‌ری داهـاتووی کیشـوه‌ری ئاسیا ته‌نـها لـه ڕاوێژدایـه. واتـه بـه وێنـه‌ی ئه‌وه‌ی که خه‌ڵکی بۆ کاروباره‌کانیان ڕاوێژ و پرس و ڕا به یه‌کتری ده‌که‌ن، ده‌بێ هه‌موو ده‌سته و تیره‌کان و سه‌رجه‌م هه‌رێمه‌کانیش له نێوان خۆیاندا هه‌مان ڕێباز بگرنه‌به‌ر و، له ڕێی ڕاوێژه‌وه ڕا و بۆچوونه‌کان بخه‌نه ڕوو، تاکو ئه‌نجامی باش به‌ده‌ست بهێنن.

کردنه‌وه‌ی هه‌موو جۆره‌کانی ئـه‌و کۆت و زنجیرانـه‌ی کـه سێ سـه‌د ملیـۆن، بـه‌ڵکو چوارسـه‌د ملیـۆن موسـڵمانی به‌سـتووه‌ته‌وه و، لابردنـی خۆسـه‌پاندن( ئیسـتیبداد) له‌سه‌ریان، ته‌نها به شوورا و سه‌ربه‌ستیی شه‌رعی ده‌بێت، که لـه جوامێریی ئیسـلامی و سۆز و به‌زه‌یی ئیمانی‌یه‌وه سه‌رچاوه‌ی گرتبێت. ئه‌و سه‌ربه‌ستی‌یه شه‌رعی‌یه‌ی که به دابـه جوانه‌کانی شه‌رع ڕازابێتـه‌وه و ده‌ستبه‌رداری خراپکاری‌یـه‌کانی شارستانێتیی ئـه‌وروپا بووبێت.

سه‌ربه‌ستیی شه‌رعی و هه‌ڵقوڵاوی سه‌رچاوه‌ی ئیمان فه‌رمان به دوو شت ده‌دات:

١ – موسڵمان زه‌لیل نه‌کرێت و خۆیشی خۆی زه‌لیل نه‌کات، چونکه ئـه‌و کـه‌سـه‌ی به‌نده‌ی خوای گه‌وره بێت هه‌رگیز نابێته به‌نده‌ی کۆیله‌کان.

٢ – هیچ که‌سێکیان که‌سانی تـر، لـه بریی خـوا، نـه‌کات بـه چـه‌ند پـه‌روه‌ردگارێك به‌سه‌ر خۆیه‌وه.

واته "ئیمان" داخوازی ئه‌وه‌یه که به‌خۆسه‌پاندن و ئیستیبداد که‌سانی به‌رامبه‌ر زه‌لیـل نه‌کرێن و، له به‌رامبه‌ر سته‌مکارانیشه‌وه زه‌لیلی پیشان نه‌درێت. چونکه هه‌ر که‌سێك بـه ناسینی شایسته و شیاو خـوای گـه‌وره نه‌ناسێت، لـه هــه‌موو شـتێکدا و بـه گوێـره‌ی په‌یوه‌ندیی به‌و شته‌وه، گومانی جۆره په‌روه‌ردگارێتی‌یه‌ك ده‌بـات و، به‌سـه‌ر خۆیـدا زاڵـی ده‌کات!

بـه‌ڵێ، سه‌ربه‌سـتیی شــه‌رعی به‌خششـێکی میــهره‌بانیی خوایــه و، یه‌کێکــه لــه دره‌وشانه‌وه‌کانی به‌دیهێنه‌ری به‌خشنده‌ی میهره‌بان و، تایبه‌تمه‌ندی‌یه‌کی ئیمانه.

دەسا با هەر بژی "ڕاستگۆیی" و.. نەژی "نائومێدی"..

بەردەوام بێت "خۆشەویستی" و.. بەهێز بێت "شوورا".

گلەیی و سەرزەنشت لە شوێنکەوتووانی هەوا و ئارەزوو.. سڵاویش لە ڕێڕەوانی ڕێی هیدایەت. ئامین.

**ئەگەر بوترێت:**

بۆچی تا ئەم ڕادەیە بایەخ بە "ڕاوێژ" دەدەیت و.. چۆن دەگونجێ مرۆڤایەتی بە گشتی و، ئاسیا و ئیسلام بە تایبەتی بەو "شوورا"یە پێش بکەون؟

**لە وەڵامدا دەڵێم:**

وەك بریسکەی بیست و یەکەمی "ئیخلاس" ڕوونی کردووەتەوە: شووورای ڕاستەقینە ئیخلاس و پشتگیری بەرهەم دەهێنێت. چونکە هەروەك کۆبوونەوەی سێ پیتی ئەلف لە شێوەی سێ دانە "یەك"دا بەم جۆرە: (١١١) دەبێت بە سەد و یازدە، سێ دانە کەسیش بە ئیخلاس و پشتگیریی ڕاستەقینە دەتوانن سوودی سەد دانە کەس بە نەتەوەکەیان بگەیەنن. مێژوو بە چەندین ڕووداوی زۆر هەواڵمان دەداتێ کە تەنها دە کەس، بەهۆی ئیخلاس و پشتگیریی ڕاستەقینە و ڕاوێژی نێوانیان، دەتوانن کاری هەزار کەس ئەنجام بدەن.

جا مادەم پێویستی‌یەکانی مرۆڤ بێ سنوورن و دوژمنەکانیشی لە ژمارە نایەن و، هێزەکەی و سەرمایەکەشی تابلێی کەم و جوزئین، بە تایبەت کە لە ئەنجامی پەرەسەندنی ئیلحادەوە ژمارەی تێکدەران و وەحشیگەرە دڕندەکان بەردەوام لە زیادبووندایە..

ئەوا دەبێ لە بەرامبەر ئەو دوژمنە لە ژمارەبەدەر و پێویستی‌یە بێ سنوورانەوە، خاڵێکی پشت پێ بەستنی ئەوتۆ هەبێت کە لە ئیمانەوە هەڵقوڵابێت. جا هەروەك ژیانی کەسیی ئیماندار پاڵ بەو خاڵەوە دەدات، ژیانی کۆمەڵایەتیشی تەنها بەو "شوورا شەرعی"یە دەتوانێت بەردەوام بێت و خۆی ڕابگرێت کە لە ڕاستی‌یەکانی ئیمانەوە سەرچاوەی گرتبێت. ئیتر ئەو دوژمنە دڕندانە لە سنووری خۆیاندا دەوەستێنێ و، بە دەم جێ‌بەجێ کردنی پێویستی‌یەکانیشەوە دەڕوات.

پاشکۆی یەکەمی (وتاری شام)

# دەستنیشان کردنی نەخۆشی

**(ئەم پاشکۆیە قارەمانێتی‌یەکی مەعنەویی هەڵقوڵاوی "ئیمان" ڕوون دەکاتەوە کە هەرگیز کەل نابێت. ئـەوەش لـە نـاوەندی چـیرۆکێکی ناسکۆڵەدا کە بە بۆنەی ئـەو مەسـەلانەی لـێـان دوایـن، پوختەکـەی دەهێنین).**

بە نوێنەرایەتیی پارێزگاکانی خۆرهـەڵات هاوڕێـیەتیی "سـوڵتان ڕەشـاد"م[١] کـرد لـە گەشتەکەیدا بۆ "ڕۆم ئەیلی"[٢] لە سەرەتای سەردەمی "سەربەستی"دا[٣].

لەناو شەمەندەفەرەکەماندا گفتوگۆیەك ڕووی دا لە نێوان من و دوو برادەر لەوانـەی کە زانستیان لە قوتابخانە تازەکاندا خوێندبوو.. لێیان پرسیم:

غیرت و پەرۆشیی "ئـایینی" و "نەتـەوەیی" کامیـان بـەهێزتر و باشترە مرۆڤ شوێنی بکەوێت و پشتی پێ ببەستێ؟

هەر ئەو کاتە وەڵامم دانەوە کە:

لای ئێمـەی موسـڵمان "ئـایین" و "نەتـەوە" یـەکیان گرتـووە. خـۆ ئەگـەر جیاوازی‌یەکیش هەبێت، تەنها ڕواڵـەتی و لاوەکی‌یـە. تەنانـەت ئـایین لای ئێمـە گیـان و ژیانی نەتەوایەتیمانە.

بەڵام گەر بەو چاوە تەماشا بکرێن کە لە یەك جیا بن، ئەوا دەبینین حەماس و پەرۆشی ئایینی سەرجەمی کەسانی تایبەتمـەند و خـەڵکانی عـەوامیش دەگرێتـەوە، کـەچی غـیرەتی

---

(١) ڕەشاد: سوڵتان محەممەدی پێنجەمی عوسمانی‌یە، دوای لابردنی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووهـەمی بـرای لـە سالی ١٩٠٩ز ڕۆشتە سەر تەخت. (وەرگێڕ)

(٢) بەو ناوچانەی کیشوەری ئەوروپا دەوترا کە لە قەڵەمڕەوی عوسمانیدا بوون. (وەرگێڕ)

(٣) زاراوەیەك بوو ئیتتیحادی‌یەکان بۆ سەردەمی حوکمی خۆیان بەکاریان دەهێنا. (وەرگێڕ)

نەتەوەیی تایبەت دەبێت بە یەك لە سەدی خەڵکی لەوانەی کە بتوانن سوود و بەرژەوەندیی کەسیی خۆیان لە پێناوی نەتەوەدا بەخت بکەن.

کەواتە دەبێ لە مافە گشتی‌یەکاندا پەروەشی ئایینی بکرێت بە بناغە، ئنجا هی نەتەوەییەکەش خزمەتگوزاری گوێڕایەڵ و پشتگیرێکی توندوتۆڵی ئەو بێت.

ئێمەی خۆرهەڵاتی لە خۆرئاواییەکان ناچین، چونکە هەست و نەستی ئایینیٚ بەسەر دڵماندا زاڵە. ئەوەتا قەدەری خوای گەورە بە ناردنی پێغەمبەران - درووودیان لەسەر بێت - لە خۆرهەڵاتدا ئاماژە دەکات بۆ ئەوەی کە تەنها هەست و نەستی "ئایینی"یە بێداری بە خەڵکانی خۆرهەڵات دەبەخشێت و بەرەو پێشکەوتن دەیانبات. چەرخی بەختەوەری و سەدە نزیکەکانی دوای ئەوە، بەڵگەیەکی زۆر باشن لەسەر ئەمە.

دەسا ئەی هاورێیانم لەم قوتابخانە گەرۆك(شەمەندەفەر)ەدا!

ئەی ئەوانەی پرسیار لەمەڕ جیاکاریی نێوان غیرەتی ئایینی و نەتەوەیی دەکەن!

ئەی ئەو قوتابییانەش کە لەناو قوتابخانەی شەمەندەفەری زەماندا لەگەڵ ئێمەدان و دەڕۆن بۆ داهاتوو!

ڕووی گوفتارم لە هەمووتانە و، دەڵێم:

پەروەشیی ئایینی و نەتەوەیی ئیسلامی بە تەواوی و بە جۆرێك کە نەتوانرێ لە یەك جیا بکرێنەوە لە نەتەوەکانی تورك و عەرەبدا تێکەڵی یەکتری بوون. جا ئەم پەروەشی‌یە ئیسلامی‌یە ئاوێتەیە، بەهێزترین و توندوتۆڵترین پەتی نوورانی‌یە کە لە عەرشی هەرە مەزنەوە نازڵ بووە و، قایمترین دەستاوێزە کە هەرگیز ناپچڕێت و، ئەو قەڵا پۆڵایینەیە کە ناڕووخێنرێت.

ئەو دوو مامۆستایە وتیان:

بەڵگەت چی‌یە؟ ئەم دەعوا مەزنە پێویستی بە بەڵگەیەکی گەورە و بەهێز هەیە..

هەر لەو کاتەدا شەمەندەفەرەکەمان لە تونێلەکە هاتە دەرەوە و، لە پەنجەرە و جامەکانەوە بۆ ئەم لا و ئەو لامان ڕوانی.. لەو دەمەدا منالێکمان بینی کە تەمەنی شەش ساڵ زیاتر نەدەبوو لە تەنیشتی هێڵی ئاسنی شەمەندەفەرەکەوە ڕاوەستابوو..

یەکسەر بە دوو هاورێکەمم وت:

ئەم منالە بە زمانی حالی خۆی وەڵامی پرسیارەکەمان دەداتەوە. دەبا لە بری من، ئەو منالە لەم قوتابخانە گەڕۆکەدا مامۆستامان بێت؛ چونکە زمانی حالی دەڵێت:

بۆ ئەم شەمەندەفەرە بڕوانن کە دەڵێی گیانەوەرێکی گەورە و زەبەلاحە و، گوێ لە دەنگ و هەرای بگرن و، ببینن کە چۆن لە تونێلەکەوە دەردەپەڕێ..

سەرنج لەم منالە ڕووخۆشە بدەن کە چۆن بە لەسەرخۆیی و بە بێ ترس لە نزیکیەوە ڕاوەستاوە، هەرچەندەش هاتنی ئەم گیانەوەرە زەبەلاحە (شەمەندەفەرەکە) هەڕەشەیەکە هێرش دەباتە سەر ئەو شتانەی دێنە ڕێی و دەڵێ: هاوار بۆ حالی ئەوەی دێتە سەر ڕێم و بەردەمم دەگرێ.. وێڕای ئەوەش، دەبینی ئەو منالە بەوپەڕی دڵنیایی و ئازادی لە نزیك هێڵی شەمەندەفەرەکەوە ڕاوەستاوە و، بایەخ بە هەڕەشە و گوڕەشەی نادات و، ئازایەتی‌یەکی هێندە ناوازە دەردەبڕێت دەڵێی گاڵتەی بەو هەڕەشانە دێت..

چونکە بە زمانی ڕاوەستان و نەجووڵانی لە شوێنەکەیدا و، بەو منالی‌یەی خۆی دەڵێت:

ئەی شەمەندەفەرەکە!

هەرگیز تۆ بەم دەنگ و هەرایەت کە دەڵێی هەورە گرمەیە من ناترسێنیت، چونکە پابەندی سیستەمێکیت ناتوانیت لێی لابدەیت. ئەوەتا جڵەوت بە دەستی شۆفێرەکەتە و، لە تواناتدا نی‌یە لەو سنوورە لابدەیت کە بۆت دانراوە و، بێیت بەسەر مندا دابخورپێت. بڕۆ بە ڕێی خۆتەوە.

دەسا هاوڕێیانی ناو شەمەندەفەرەکەم و.. ئەی برایانی دوای پەنجا سالیشم کە توێژینەوە لە زانستەکاندا دەکەن!

بە ئەندێشەتان گریمانی ئەوە دابنێن کە "ڕۆستەم"ی فارسەکان و "هەرقل"ی یۆنانی‌یەکان، بەو قارەمانێتی‌یە سەیر و سەمەرانەی خۆیانەوە بێن و باز بەسەر زەماندا بدەن و ئێستا لە شوێنی ئەو منالەدا ڕاوەستن..

دەبینی لەبەر ئەوەی زانیاری‌یان لە بارەی شەمەندەفەرەوە نی‌یە و لەو باوەڕەشدا نین کە بەپێی سیستەمێك کار بکات، ئەوا لەو کاتەدا ئەم شەمەندەفەرە لە تونێلە تاریکەکەیەوە ڕووەو ئەوان بێتەدەر و، دوو کەڵکێشەکەی لە سەرەوە ئاگر فڕێ

بدات و، دەنگی بگاتە ئاسمان و، چاوەکانیشی بە گڵۆپەکانی بریسکێتەوە و، بەو دەنگ و نەعرەتەیەوە ڕووبەڕوویان بێت وەك ئەوەی هێرشیان بۆ بهات..

بەڵێ، بە ئەندێشەتان ئەم حاڵە بهێننە پێش چاوتان و، ئنجا ڕادەی ترس و بیمی ئەو دوانە لێکبدەنەوە کە دووچاری دەبن و، چۆن بەو هەموو قارەمانێتییەوە تا بتوانن هەڵدێن و، هەرچی ئازایەتییان هەیە لە بەردەم هەڕەشەی ئەم شەمەندەفەرەدا، کە دەڵێی گیانەوەرێکی یەکجار زەبەلاحە، دەپووکێتەوە!

هۆی ئەو ترسەشیان لەوەدایە کە نازانن ئەو شەمەندەفەرە شۆفێری هەیە و، باوەڕیان بە بوونی سیستەمێك نییە لەسەری کار بکات، تەنانەت هەر ناشزانن ئامێرێکی دەستەمۆیە، بەڵکو بە شتێکی وەك شێرێکی ترسناك و دڕندەیەکی گەورەی تێدەگەن کە چەندین شێر و دڕندەی تر لە پشتیەوە ڕیزیان بەستبێت!

دەسا ئەی برایانم!

ئەی هاوڕێیانی دوای پەنجا ساڵم کە گوێ لەم گوفتارە دەگرن!

ئەو شتەی کە ئازادی و ئازایەتییەکی زۆر لە هی ئەو دوو پاڵەوانەی بەو منالە بەخشیوە و لەوانیش زیاتر دڵنیایی و ئارامیی داوەتێ، ئەوەیە کە "ناوکێکی حەقیقەت" لەناو دڵی ئەو منالەدا هەیە و، بریتییە لەوەی کە: بە دڵنیاییەوە باوەڕی بەوە هەیە شەمەندەفەرەکە بەپێی سیستەمێك دەڕوات و جڵەوی بە دەستی شۆفێرەکەیەتی و لە ژێر فەرمانی ئەودایە و لێی لانادات.

ئەو شتەش کە دوو پاڵەوانە ناودارەکەی ترساند و ویژدان و هەناوی دیل کردن: بێ ئاگاییانە لەوەی شەمەندەفەرەکە شۆفێری هەبێت و باوەڕ نەبوونیانە بەوەی کە سیستەمێکی ببێت لەسەری بڕوات. واتە نەزانی و بێ باوەڕییانە.

هاوشێوەی ئەم قارەمانێتییەی کە لە باوەڕی ئەو منالەوە هەڵقوڵاوە، بە درێژایی هەزار ساڵ لە دڵی دەستە و تیرەکانی ئیسلامدا (لە تورك و ئەوانەش چاویان لێ کردن) لە شێوەی ئیمان و باوەڕدا ڕیشکی داکوتاوە و، پاڵەوانێتییەکی وای پێ بەخشین کە بەهۆیەوە توانییان چەندین دەوڵەتی ئەوتۆ فەتح بکەن سەد هێندەی خۆیان بەتواناتر و لە پێشتر بوون و خۆیان لە بەردەمدا ڕابگرن. ئەوەبوو ڕەفتار و ڕەوشتە کامڵ و بڵندەکانی

ئیسلامیان لە هەموو شوێنێکی دنیا: ئاسیا، ئەفریقا، نیوەی ئەوروپادا بڵاو کردەوە و، بە شادمانی و دڵخۆشی‌یەکی لەڕادەبەدەر دەڕۆشتن بە پێشوازیی مردنەوە و، دەیان وت: "ئەگەر کوژرام شەهیدم و، ئەگەر دوژمنیشم کوشت موجاهیدم"!

تەنانەت هەر بەهۆی ئەم ئیمانەوە لە بەردەم هەموو ئەو شتانەدا خۆیان ڕاگرت کە هەڵوێستی دوژمنایەتیی لێ گرتبوون، هەر لە میکرۆبەکانەوە تا دەگاتە کلکدارەکانی ئاسمان، وەك بڵێی هەریەکەیان شەمەندەفەرێکی ترسناك بێت، کەچی ئەوان بایەخیان بە هەڕەشەکانی نەدا.

کاتێ سەرجەم تیرە و نەتەوەکانی ئیسلام (لە پێشەنگیانەوە تورك و عەرەب) جۆرە بەختەوەری‌یەکی دنیایان بەدەست هێنا، تەنها هی ئەوە بوو کە کارەکانیان دەدایە دەست خوا و.. بە قەزای ئەو ڕازی دەبوون و.. داناییان لە هەموو شتێکدا دەبینی و.. پەند و ئامۆژگارییان لە ڕووداوەکان وەردەگرت، لە بریی ئەوەی لێیان بترسن.

دەربڕینی ئەو ئازایەتی‌یە لەڕادەبەدەرەی ئەو موسڵمانانە - بە وێنەی دەرکەوتنی ئازایەتیی منالەکە - بەڵگەیەکە ڕێنماییمان دەکات بۆ ئەوەی کە نەتەوەی ئیسلام هەروەك لەودنیادا براوە دەبن، سەرورەریی ئەم دنیاش لە ئایندەدا هی ئەوان دەبێت.

ئەو شتەی کە ترس و بیم و نیگەرانی و بریاری هەڵهاتنی خستە دڵی ئەو دوو قارەمانەوە، بێ بەهرەییانە لە ئیمان و باوەڕ و، نەزانی و گومڕاییانە..

ئەوەتا "پەیامەکانی نوور" بە سەدان بەڵگەی گومان بڕ ئەو ڕاستی‌یەیان چەسپاندووە کە لە سەرەتای ئەم پەیامەشدا چەند نموونەیەکی لێ باس کراوە و، بریتی‌یە لەوەی:

"کوفر" و "گومڕایی" گەردوون بەو شێوەیە پیشانی شوێنکەوتووانی خۆیان دەدەن کە پڕە لە دوژمنی ترسناك. تەنانەت هەر لە کۆمەڵەی خۆرەوە تا دەگاتە میکرۆبەکانی سیل، زنجیرەیەکی یەك لە دوای یەکن کە هەر هەموویان بە دەستی هێزە کوێر و ڕێکەوتە هەڕەمەکی و سروشتە کەڕو کاسەکان دوژمنایەتیی ئەم مرۆڤە هەژارە دەکەن، بەڵکو بە ترس و ئازار و نیگەرانی و پشێوی‌یەکی بەردەوامەوە دەیتلێننەوە. هەرچەندەش ئەم مرۆڤە چییەتی(ماهیە)یەکی گشتگیر و توانا و لێهاتنێکی گشتیی لەخۆدا هەڵگرتووە و چەندین پێویستیی لەژمارەبەدەر و حەز و ئارەزووی بێ سنووری هەیە.

تەنانەت "کوفر" و "گومڕایی" هەر لە دنیادا مرۆڤ دەخەنە بارێکی سەختی وەك سزای دۆزەخەوە، بە ڕادەیەك کە دەڵێی زەقوومی دەرخوارد دراوە و بۆی قووت ناچێت.

ئیتر هەزاران هونەر و زانستی بەدەر لە ئایین و پێشکەوتنی مرۆڤایەتی، دادی نادەن و فریای ناکەون، بە وێنەی ئەوەی کە قارەمانێتیی دوو پاڵەوانە ناودارەکە فریایان نەکەوت. بەڵکو گەمە و هەرزەیی لەناو خوێنەکەیدا هاتوچۆ دەکات بۆ لەکارخستنی هەست و نەستەکانی، تاکو بە شێوەیەکی کاتی بە ئازارەکانی خۆی نەزانێت و هەستیان پێ نەکات!

هەروەك بەراوردی نێوان ئیمان و کوفر لەودنیادا ئاکامەکەی بەهەشت و دۆزەخ دەبێت، هەر لەم دنیاشدا "ئیمان" جۆرە بەهەشتێکی مەعنەوی دەهێنێتەدی و، وا لە مرۆڤ دەکات کە مردن بە پشوودانێك لە ئەرکی سەرشان ببینێت.. کەچی "کوفر" هەر لە دنیاشدا دەیخاتە ناو دۆزەخێکی مەعنەوییەوە و بەختەوەریی لێ دەسێنێتەوە، چونکە مردنی بە لەناودان و تیاچوونی هەمیشەیی پیشان دەدات.

ئەمەشمان لە "پەیامەکانی نوور"دا بە بێ گومانیی تەواوەتی و تا ڕادەی پلەی بینین بەچاو چەسپاندووە. بۆیە خوێنەری بەڕێز ڕەوانەی خوێندنەوەی ئەو پەیامانە دەکەین.

جا ئێوە - برایانم!- ئەگەر پێتان خۆشە ڕاستیی ئەم نموونەیە ببینن، ئەوا فەرموون سەرتان بەرز بکەنەوە و بۆ گەردوون بڕوانن، بزانن لەو بۆشاییەی سەرەوەدا چەندە گۆی ئەستێرەکان و تەن و قەبارەی جیهانەکان و زنجیرەی ڕووداوە یەك لە دوای یەکەکانی چەشنی شەمەندەفەر و باڵۆن و ئۆتۆمبێلی خوایی دەبینن کە دەڵێی کەشتیی دەریایی و وشکایی و فڕۆکەی هەوایین کە دەستی توانستی خوای گەورە بە ڕێسا و دانایی بەدیی هێناون!

هەروەك توانستی خوایی لەم جیهانە ماددییە بینراوەدا هاووێنەی ئەمانەی هەیە، لە جیهانی مەعنەوی و گیانەکانیشدا زنجیرە هاوشێوەی لەوانە سەرسووڕهێنەرتری هەیە. هەر کەسێك خاوەنی ژیری بێت بە ژیری دەیسەلمێنێ، تەنانەت ئەو کەسەی خاوەنی بینایی دڵە زۆربەشی دەبینێت!

جا ئەم هەموو زنجیرە شتە هاوپەیوەندی‌یانەی ناو گەردوون، چ ماددی بن چ مەعنەوی، هێرش بۆ سەر گومرایانی بێ بەش لە ئیمان دەبەن و، هەڕەشەیان لێ دەکەن و، دەیانترسێنن و، هێزی مەعنەوییان تێکدەشکێنن. کەچی ناتوانن ئیمانداران بترسێنن یان هەڕەشەیان لێ بکەن، بەڵکو شادمانی و بەختەوەری و هاودەمی و ئاوات و هێز و وزەیان تێدا دەبووژێننەوە.

چونکە ئەوان بە نووری ئیمان بوونەوەران دەبینن و، دەزانن کە ئەو شەمەندەفەرە ماددی و مەعنەوی و جیهانە گەڕۆك و زنجیرە ڕووداوانە لە لایەن کردگارێکی داناوە بەرەو ئەنجامدانی ئەرکێکی دیاریکراو دەبرێن، تاکو لە ناوەندی ڕێسا و داناییدا و بێ هیچ تێکەڵ بوون و سنوور شکاندنێك ئەنجامی بدەن.

کەواتە "ئیمان" ئەوە پیشانی "ئیماندار" دەدات کە هەموو شتێك ڕۆشناییەك لە درەوشانەوەی ناوە جوانەکانی خوای گەورە و وردەکاریی سنعەتی ئەو بەدەست دەهێنێت. هەروەك هێزێکی مەعنەویی هێندە مەزن بە ئیماندار دەبەخشێت کە چەندین نموونەی بەختەوەریی هەمیشەیی پێش چاو بخات.

بەم جۆرە، دەبینین کە ئازارە ترسناکەکانی ئەنجامی لەدەستدانی ئیمان کە گومرایان پێوەی دەتلێنەوە و، ئەو ترس و بیمە سەختەش کە لە کۆڵیان نابێتەوە، هەموو پێشکەوتنێکی مرۆڤایەتی لە ئاستیدا دەستەوسانە و ناتوانێت دڵدانەوەیەکیان پێ ببەخشێت، تەنانەت هەر ناشتوانێت هێزێکی مەعنەوییان بۆ دەستەبەر بکات. ئیتر هەڵمەت و ئازایەتییان تێکدەشکێت.. مەگەر "بێ ئاگایی" پەردەی لەبیربردنەوەیان بەسەردا بداتەوە و بیانخەڵەتێنێت!

بەڵام ئیمانداران بەهۆی ئیمانەکەیانەوە - بە وێنەی نەترسانی منالەکە - هەرگیز ئەو ڕووداوانە نایانترسێنێت و ورەیان ناڕووخێنێت، بەڵکو پتر هێزی مەعنەوییان توندوتۆڵ دەکاتەوە. چونکە لە ڕوانگەی ڕاستیی ئیمانەکەیانەوە بۆ ڕووداوەکان دەڕوانن و، تیایدا ویستی کردگاری دانا و، بەڕێوەبردن و، کارسازیی ئەو لە ناوەندی دانستە فراوانەکەیدا دەبینن.

ئیتر لە وەهم و گومانەکان خۆیان ئازاد دەکەن. لەبەر ئەوەی دەزانن کە ئەگەر بە فەرمان و ڕوخسەتی کردگاری دانا نەبێت، هەرگیز ئەم جیهانە گەڕۆکانە نەیاندەتوانی بجوولێن.

دەبینی ئەو ئیماندارانە، بەم ئیمان و زانینەیان، دڵنیاییەکی ئەوتۆ بەدەست دەهێنن کە هەموویان - هەر کەسە و بەپێی پلەی ئیمانەکەی - بەختەوەر بکات.

ئەو کەسەش کە تۆوی ئەم ڕاستی‌یەی لە دڵ و هەناودا نەبێت، کە لە ئیمان و ئایینی ڕاستەقینەوە هەڵقوڵاوە و، پاڵی بە پشت بەستێکی قایم و مەحکەمەوە نەدابێت، کتومت وەکو ئەو دوو پاڵەوانە بەناوبانگەی لێ دێت؛ چونکە ئەویش بە وێنەی دارمانی ئازایەتی و قارەمانێتی‌یەکەی، هێزە مەعنەوی‌یەکەشی لەگەڵدا دەڕووخێت و، دەبێتە دیلی ڕووداوەکانی لەمەڕ بوونەوەران. ئیتر ویژدان و هەناوی دادەڕزێت و، لە بەردەم هەر ڕووداوێکدا وەکو سوالکەرێکی زەلیل و ڕسوای لێ دێت!

بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم ڕاستی‌یە فراوانە لێرەدا ئەم ئەندازەیەمان پێ سەروزیادە، چونکە "پەیامەکانی نوور" بە بەڵگە بەهێزەکانیان ڕوونیان کردووەتەوە کە ئەم نهێنی‌یە لە ئیماندایە، بەڵام "گومڕایی" هەر لە دنیاشدا بەدبەختیی بۆ شوێنکەوتووانی هەڵگرتووە.

ئەم مرۆڤەی کە لەم چەرخەدا هەستی بە پێویستیی بەتینی کردووە بۆ هێزێکی مەعنەوی و، بۆ توندوتۆڵی و دامەرزاوی و دڵدانەوەیەك کە پشتی پێ ببەستێ، کەچی وازی لەو ڕاستی‌یانەی ئیمان هێناوە کە مەزنترین پاڵپشتن بۆی و، هێزی مەعنەوی و دڵدانەوە و بەختەوەریی بۆ دەستەبەر دەکەن و، حەزی لە چاولێکەریی خۆرئاوا کردووە و، پاڵی بە هەرزەیی و گومڕاییەوە داوە.

هەروەها لە بریی ئەوەی سوودی لە نەتەوایەتیی ئیسلام وەربگرتایە، دەستی دایە تێکشکاندنی تەواوەتیی ورە و هێزی مەعنەویی خۆی. ئیتر بەو جۆرە و بە هەناسەبڕکێ و ڕاکردنی بە دوای گومڕایی و هەرزەیی و سیاسەتی درۆیینەدا، هەموو دڵدانەوەیەکی لە ڕێی خۆیدا لابرد و توندوتۆڵیی ورەی مەعنەویشی لاواز کرد.

جا بێ گومان لـه داهاتوویـه کی نزیکـدا هـەموو مرۆڤایـەتی، بـه تایبـەتی موسـڵمانان، لـەوه تێده گـەن کـه ئـەم کـاره چـەنده لـه سـوود و بەرژەوەندییـه کانی مرۆڤـەوه دووره. ڕۆژێك دێت – ئەگەر دنیا تەمەنی به بەریەوه مابێت – پەی به ڕاستیی قورئان ببات و ، به توندی دەستی پێوه بگرێت.

* * *

لـه سـەرەتای سـەردەمی "سەربەسـتی"دا چـەند ئـەندام پەرلـەمانێکی ئـایینداری لـه "سەعیدی کۆن"یان پرسی:

تـۆ لـه هـەموو شـتێکدا سیاسـەت ده کـەیت بـه شـوێنکەوتەی ئـایین، تەنانـەت بـەهۆکارێکی گوێڕایـەڵ بـۆ شـەریعەت و، تەنـها لەسـەر بناغـەی شـەرعی و ڕەوا "سەربەستی" قبووڵ ده کەیت. واته: به بێ شەریعەت به مەشرووتییەت ڕازی نابیت. هەر لەبەر ئەمەش بوو له ڕیزی ئەوانەدا دایـان نـایت کـه لـه ڕووداى (٣١)ی مـارتدا داوای جێبەجێ کردنی شەریعەتیان ده کرد.

"سەعیدی کۆن"یش بەمەی خوارەوه وەڵامی دانەوه:

بەڵێ، نەتەوەی ئیسلام به هێنانەدیی ڕاستییه کانی ئیسلام بەختەوەر دەبێـت، دەنـا بـێ ئەوه هەرگیز بەختەوەری به خۆیەوه نابینێت..

به جێبەجێ کردنی شەریعەتی ئیسلام نەبێ ئەم نەتەوەیه تـامی بەختـەوەریی ژیـانی دنیـا ناچێژێت و به ژیانێکی کۆمەڵایەتیی بەرز و بڵند ناژی، دەنـا هـەرگیزاو هـەرگیز بـه هیـچ شتێکی تر دادگەری و ئاسـایش لـه ژیـانیدا نایەتـەدی. چونکـه ئـەو کاتـه، ڕەوشـته بـێ کـەڵك و سـیفەته خراپـه کان زاڵ دەبـن و، جڵـەوی کاروبـار بـه دەسـت درۆزن و مەراییکەرانەوه دەبێت!

وا له نێوان هەزاران بەڵگەدا، وەك نموونەیه کی بچووك، چیرۆ کێکتان بۆ ده گێڕمـەوه که ئەو ڕاستییەتان بۆ دەچەسپێنێت.

کەسێك به سەفەر ڕۆشت بۆ نـاو تیرەیـه کی دەشته کی لـه بیابـاندا و، بـوو بـه میوانـی پیاوێکی بەڕێز..

سەرنجی دا بایەخ بە شاردنەوەی شتومەكەكانیان نادەن و، خاوەن مالیش پارەكانی خۆی بە ئاشكرا و بێ شاردنەوە، لە گۆشە و قوژبنێكی مالەكەیدا فڕێ داوە!

ئەو میوانە بە خانەخوێكەی وت:

ئایا ئێوە بەو بێ خەمی‌یە مال و سامانتان فڕێ دەدەنە ئەو قوژبنانە، لەوە ناترسن بدزرێت؟

وەلامی دایەوە:

لای ئێمە دزی ڕوو نادات!

میوانەكە وتی:

ئێمە پارە و پوولمان لە قاسە و سندووقی ئاسن و داخراودا هەلدەگرین، كەچی لەگەل ئەوەشدا زۆر جار دزی لە ناوماندا ڕوو دەدات.

خانەخوێ وتی:

ئاخر لای ئێمە گەر دزی‌یەك ڕوو بدات، بە فەرمانی خوای گەورە و بەپێی خواستی دادگەریی شەریعەت، دەستی دزەكە دەبڕین.

وتی:

كەواتە دەبێ زۆر كەس لە ئێوە دەستێكیان نەمابێ!

خاوەن مال وتی:

وا گەیشتوومەتە پەنجا سال تەمەن، لەم ماوەیەدا یەك جار بینیومە دەستێك برابێ.

میوانەكەش وتی:

لە ولاتی ئێمەدا هەموو ڕۆژێك نزیكەی پەنجا كەس بەهۆی دزی‌یەوە بەند دەكرێن، كەچی وێڕای ئەوەش مەگەر هێندەی یەك لە هەزاری ئەو دادگەری‌یەی ئێوە خەلكی بسلەمێنەوە و واز لە دزی بهێنن!

وەلامی دایەوە:

ئێوە ڕاستی‌یەكی مەزنتان پشتگوێ خستووە و، لە نهێنی‌یەكی سەرسووڕهێنەر و ڕەسەن بێ ئاگان. بۆیە لە "دادگەری" بێ بەش دەبن. چونكە لە بریی "بەرژەوەندی"ی

مرۆڤایەتی، ئامانجە کەسی‌یەکان و لایەنگیری و شتانی هاوچەشنیان لە کاری ئێوەدا خۆی هەڵدەقورتێنێ کە سروشتی بڕیارە یاساییەکان دەگۆڕن و دەیشێوێنن.

حیکمەتی ئەو ڕاستی‌یەش ئەوەیە کە:

لای ئێمە گەر کەسێك بیەوێت دەست بۆ دزی‌یەك ببات، لەو چرکە وەختەدا ئەوەی وەبیردێتەوە کە فەرمانی شەرعی لەسەر جێ‌بەجێ دەکرێت، ئنجا بیر دەکاتەوە لەوەی کە ئەو بڕیارە فەرمانێکی خوای گەورەیە و لە عەرشی هەرە مەزنەوە هاتووە. وەك بلێی بەهۆی تایبەتمەندیی ئیمانەوە و بە گوێی دڵ هەر بە ڕاستی هەست دەکات و ئەو گوفتارە ئەزەلی‌یە دەبیستێ کە دەفەرموێ:

﴿وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُوا أَيْدِيَهُما﴾ (المائدة: ٣٨)..

ئیتر ئەو ئیمان و باوەڕەی کە هەیەتی دەورووژێت و هەست و نەستە بەرزەکانی دەهەژێن و، بارێکی ڕۆحیی وای بۆ دروست دەبێت وەك ئەوە وابێت کە لە هەموو لایەکی "ویژدان" و ناخی "گیان"یەوە هێرش بکرێتە سەر ئەو مەیلی دزی‌یە. ئیتر ئەو ئارەزووەی کە لە دەروونی فەرماندەری خراپکاریەوە سەری هەڵداوە، نامێنێت و تەفروتوونا دەبێت و، خۆی دەکشێنێتە دواوە..

بەم جۆرە و بە یادکردنەوەی یەك لە دوای یەکی ئەم زنجیرە بیرکردنەوەیە، ئەو مەیل و ئارەزووە بە تەواوی دەڕوات و نامێنێت. چونکە نەك هەر تەنها بیر و وەهمەکەی هێرش دەکەنە سەر ئەو مەیلەی بۆ دزی کردن، بەڵکو جگە لەوانەش چەندین هێزی مەعنەویی وەك "ژیری" و "دڵ" و "ویژدان" هەموو بە یەکجار و پێکەوە هێرش دەکەنە سەر ئەو مەیل و حەز و ئارەزووە.

جا ئیتر بە بیرکردنەوەی سزای شەرع سەرزەنشتێکی ئاسمانی و سڵەمینەوەیەکی ویژدانی بەرامبەر بەو مەیلە دەوەستنەوە و بێدەنگی دەکەن.

بەڵێ، "ئیمان" هەمیشە پاسەوانێکی مەعنەوی و ئەمین لەناو دڵ و ژیریی مرۆڤدا دادەنێت، ئیتر هەر کاتێ لە حەز و هەست و نەستە ماددی‌یەکانی دەروونەوە مەیل و ئارەزوویەك دەربچێت، ئەو پاسەوانە ڕێ پێ‌نەدەرە دەری دەکات و، پێی دەڵێ:

ڕێگات پێ نادرێ.. قەدەغەیە!

کردارەکانی مرۆڤ تەنها لە مەیل و ئارەزووەکانی دڵ و هەست و نەستەکانیەوە سەرچاوە دەگرن.. ئەوانیش لە گوڕوتینی هەست پێکردنی گیان و پێویستییەکانیەوە دەردەچێت..

جا ئەگەر ئەو کردارە "چاکە" بوو ئەوا مرۆڤەکە جێبەجێی دەکات، دەنا هەوڵی کشانەوە و دوورەپەرێزی دەدات، ئەو کاتەش هەست و نەستە ماددییە دوارۆژ نەبینەکان بە سەریدا زاڵ نابن.

**پوختەی ئەمانەی باس کران:**

کاتێ "سزا" بە مەبەستی گوێڕایەڵیی فەرمانی خوای گەورە و بە نیازی هێنانەدیی دادگەریی پەروەردگار جێبەجێ دەکرێ، ئەوا گیان و ژیری و ویژدان و هەموو لایەنە ناسکەکانی مرۆڤ دەکەونە ژێر کاریگەریی ئەو سزایە و، هەریەکەیان پەیوەندییەکی تایبەتیی پێیەوە دەبێ.

لەبەر ئەم واتا و ناوەرۆکەش بوو کە یەك جار جێبەجێ کردنی سزا لە ماوەی پەنجا ساڵدا سوودی گەلێ زیاتری بە ئێمە گەیاند، لەچاو ئەو گرتن و بەندییەی کە لای ئێوە ڕۆژانە ڕوو دەدات..

چونکە سزاکانی ئێوە کە بە ناوی "دادگەری"یەوە جێبەجێی دەکەن کاریگەریی تەنها لە وەهم و ئەندێشەتاندا دەبێت و، کەسێك لای ئێوە لەو کاتەدا دەست بۆ دزی دەبات ئەو سزایەی بە ئەندێشەدا دێت کە تەنها لەپێناوی بەرژەوەندیی نەتەوە و وڵاتدا دانراوە و، دەڵێ:

ئەگەر خەڵکی پێم بزانن ئەوا بە چاوی سەرزەنشت و سووکایەتی بۆم دەڕوانن، خۆ ئەگەر بەڵگەشم لەسەر ڕوون بووەوە حکومەت دەمخاتە بەندیخانەوە.

ئیتر تەنها وەهم و ئەندێشەی بە شێوەیەکی جوزئی لەو کارە ناڕەوایە دەسڵەمێتەوە، کەچی لەولاوە ئارەزووی بەتینی بۆ دزی کە لە دەروونی بەدخواز و هەست و نەستە ماددییەکانیەوە سەرچاوەی گرتووە بەسەریدا زاڵ دەبێت، بە تایبەت گەر موحتاج بێت.

دیاره ئـەو کاتـەش سزاکەی ئێـوە هیـچ سوودێکی پێ ناگەیـەنێت و لـەو کارە بـەدە نایگێڕێتە دواوە.

ئنجا مادەم سزاکەتان لەبەر جێبەجێ کردنی فەرمانی خـوای گـەورە نی‌یـە، ئـەوا لـە ڕاستیدا بە "دادگەری" دانانرێت. بەڵکو هـەر لـە بناغـەدا نـاڕەوا و بەتاڵـە و، وەکـو نوێـژ کردن وایە بە بێ دەستنوێژ و بێ ڕوو کردنە قیبلە!

واتـە دادگـەریی ڕاستەقینە و سزایەك سڵەمینەوە و وازهێنـانی تـەواوەتیی لـە تـاوان بـەدوادا بێـت، تەنـها لەوەدایـە کـە بـە مەبەستی گوێڕایـەڵیی فـەرمانی خـوا بێـت، دەنـا کاریگەریی یەکجار کەمی دەبێت.

جـا ئەگـەر سـەرجەمی فەرمانـەکانی تـری شـەرع بـە گوێـرەی ئـەم بابەتـە جوزئی‌یـە لێکبدەیتـەوە، تێدەگـەیت کـە بەختـەوەریی گـرۆی مـرۆڤ بـەندە بـە پیـادەکردنی "دادگەری"یەوە..

ئەویش هەرگیز نایەتەدی بەو جۆرە نەبێت کە "قورئانی پیرۆز" ڕوونی کردووەتەوە.

(پوختەی چیرۆکەکە کۆتایی هات)

* * *

ئەوەم بە دڵدا هات کە:

ئەگەر مرۆڤ بە زووترین کات لە بێ ئاگایی خۆی بێدار نەبێتەوە و..

بە ڕێنمایی ژیریی هەنگاو نەنێت و..

لە ناوەندی ڕاستی‌یەکانی ئیسلامدا دەرگای دادگاکانی لە ڕووی جێبـەجێ کردنـی "دادگەریی خوای گەورە"دا والآ نەکات..

ئەوا چەندین قیامەتی ماددی و مەعنـەویی لەسـەر بـەرپا دەبێـت و، چـەك دادەنێـت بـۆ گێرەشێوێن و تۆقێنەران و ئەوانەی وەکو یەئجووج و مەئجووج وان!

* * *

بەم جۆرە، "سەعیدی کۆن" ئەم چیرۆکەی بۆ هەندێ لە پەرلەمانتارە ئاییندارەکان گێڕایەوەو، چل و پێنج ساڵ پێش ئێستا خرایە نێوان پاشکۆی (وتاری شام)ەوە، کە بە زمانی عەرەبییە و کاتی خۆی لە ماوەی یەك هەفتەدا دوو جار چاپ کرایەوە.

پەرلەمانتارە ئاییندارەکانی ئێستا لەوانەی پێشوو زیاتر سوود لەم چیرۆکە و نموونەکەی یەکەم وەردەگرن. بۆیە وەك وانەیەکی پەند و ئامۆژگاری دەیخەینە پێش چاویان[1].

* * *

(١) تکامان لە مامۆستامان کرد کە ئەو (وتاری شام)ەی بە زمانی عەرەبییە لە ماوەی دوو ڕۆژدا بە دەرس پێمان بڵێتەوە، چونکە بە باشی زمانی عەرەبی نازانین. ئەویش ئەرکی کێشا و بۆی ڕاڤە کردین. لە لایەنی خۆمانەوە ئێمەش لێکدانەوەکەمان نووسییەوە. مامۆستا لە کاتی وتنەوەیدا هەندێ ڕستەی دووبارە دەکردەوە تاکو لە زەینماندا جێگیری بکات. جا لەبەر ئەوەی چیرۆك و نموونەکەی دوایی زۆر ڕوون بوو لە لامان، ئەوا لە پێشدا بە زەقی خستمانە پێش چاوی قوتابیانی زانکۆ و پەرلەمانتارە ئاییندارەکان، چونکە مامۆستا لە سەرەتای دەرسەکەوە وتی: من ئێوە لە بەردەمی خۆمدا لە بریی دوو مامۆستای ناو شەمەندەفەرەکە و، پەرلەمانتارە بە ڕاستی ئاییندارەکانیش لە بریی ئەو پەرلەمانتارە دیندارانە دادەنێم کە چل و پێنج ساڵ پێش ئێستا لە بارەی شەریعەتەوە پرسیاریان لێ کردم. وا دەڕوانمە کارەکە و لە ڕۆشنایی ئەوەشدا دەدوێم.

کەواتە لە پێشدا واتاکانی ئەم پەیامە بۆ خاوەن مەعریفە و پەروەردەکاران و پەرلەمانتارە ئاییندارەکان ڕوون دەکەینەوە. ئەگەر ویستیان ئەو وانانەشیان بۆ ڕوون دەکەینەوە کە لە دەمی ڕاڤە و لێکدانەوەی وتارەکەدا لە مامۆستامان وەرگرت. گەر ڕاشیان لەسەری بێت چاپی دەکەین و بڵاوی دەکەینەوە.

پێمان خۆش بوو وانەیەك لە بارەی ئەو سیاسەتە ئیسلامییەی ئێستا لە جیهانی ئیسلامیدا هەیە فێر بین، بەڵام لەبەر ئەوەی مامۆستا سی و پێنج ساڵە وازی لە سیاسەت هێناوە، ئەوا ئەم وتارەی کە پەیوەندیی بە سیاسەتەوە هەیە یەکێکە لە وانەکانی "سەعیدی کۆن".

قوتابیانی نوور:
طاهری، زوبەیر، بایرام، جەیلان،
صونگور، عەبدوللا، ضیاء، صادق،
صالح، حوسنی، حەمزە

# پاشکۆی پاشکۆ[1]

## حەقیقەت

رۆژنامەی ئایینی (وولقان) ژمارە (٧٠)
بەرواری ٧/مارت/١٩٠٩ز

ئێمە هەر لە ئەزەلەوە لەناو "کۆمەڵەی محەممەدی"داین. چونکە لایەنی یەکبوون و یەکێتیی نێوانمان بریتی‌یە لە "تەوحید" و، سوێند و پەیمانیشمان بریتی‌یە لە "ئیمان".

جا مادەم ئێمە یەکتاپەرست و یەکگرتووین، ئەوا هەموو ئیماندارێك ئەرکی بەرزکردنەوەی ئایینی ئیسلامی لە ئەستۆدایە. گەورەترین هۆکاریش بۆ بەرزکردنەوەی ئایینی ئیسلام لەم ڕۆژگارەماندا بەرزکردنەوەی ماددی‌یە. چونکە بیانی‌یەکان بە چەکی زانست و پیشەسازی‌یەکان ئێمە لە ژێر خۆسەپاندنی مەعنەویی خۆیاندا دەهاڕن. ئێمەش بە چەکی زانست و پیشەسازی جیهادی نەزانی و هەژاری و دووبەرەکی دەکەین کە سەرسەخت ترین دوژمنانی بەرزکردنەوەی ئاڵای ئیسلامن.

سەبارەت بە "جیهادی دەرەکی"ش ئەوا بە شمشێری ئەلماسیی بەڵگە گومان بڕەکانی شەریعەتی خاوێنی دەسپێرین، چونکە سەرکەوتن بەسەر خەڵکانی شارستانیدا تەنها بە قەناعەت پێ بەخشین دەبێت نەك بە زۆرەملێ، بە وێنەی ئەو نەزانانەی کە لە هیچ شتێك تێناگەن.

---

(١) ئەم وتارانەی لێرەدا نووسەر کردوونی بە پاشکۆی "پاشکۆی یەکەم" پێشتر لە ساڵی (١٩٠٩ز) و لە رۆژنامەی (وولقان)دا بڵاوی کردوونەتەوە. ئنجا دوای پوخت و پاکژکردنیان - کە خۆم ئەو پوختکردنەی نووسەرم بە قەڵەمی خۆی بینیوە و، لای مامۆستا عەبدولقادر پارێزراون کە لە قوتابیانی دانەرە و، خۆیشم وێنەی هەندێکیانم لایە - کردوونی بەم پاشکۆیەی "وتاری شام". ئێمە لێرەدا دوای وەرگێڕانیان لە عەرەبی‌یەوە، هاتین سەرلەنوێ بەرامبەرمان کردنەوە لەگەڵ تورکی‌یە پوختەکراوەکەدا، ئنجا بەپێی بەرواری بڵاوبوونەوەیان لە رۆژنامەی ناوبراودا، ڕیزبەندمان لەم کوردی‌یەدا پێدان. شایانی باسە خۆم وێنەی نۆ دانەم لەو ژمارانەی (وولقان) لەلایە. (وەرگێڕ)

ئێمە گیانفیدای خۆشەویستیین، جێی دوژمنایەتی لە نێوانماندا نابێتەوە.
ڕژێمی کۆماری[1] بریتییە لە: دادگەری و، شوورا و، کۆکردنەوەی هێزەکان لە یاسادا. ئایا سوالکردنی یاساکان لە ئەورووپا لە کاتێکدا خۆمان شەریعەتێکی خاوێنی ئەوتۆمان هەیە سیازدە سەدەیە دامەزراوە، تاوان نییە بەرامبەر بە ئیسلام؟ ئەم سوالکردنە وەك ئەوە وایە کە لە نوێژدا ڕوو بکرێتە شوێنێکی تری جگە لە قیبلە!

دەبێ هێز لە یاسادا بێت، دەنا ئیستیبداد لە لای زۆر کەس تەشەنە دەکات.

دەبێ ئەم فەرمایشتەی خوای گەورە: ﴿إِنَّ اللهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ﴾ (الحج: ٤٠،٧٤) دەستەڵاتدار و فەرماندەری ویژدانی بێت. ئەمەش بە زانیاریی تەواوەتی و شارستانێتیی گشتی، بە دەستەواژەیەکی تر: بە ئیسلام دێتەدی. دەنا هەمیشە ئیستیبداد زاڵ و خۆسەپێن دەبێت.

یەکگرتن تەنها لە ڕێی هیدایەتدایە، نەك هەوا و هەوەس.

بەڵێ، مرۆڤەکان ئازاد و سەربەست بوون، بەڵام ئێستاش هەر بەندەی خوای گەورەن. ئەوەتا هەموو شتێك سەربەست و ئازادە. جا ئێمە بە گوێڕایەڵیمان بۆ شەریعەت ئازادین و بە دەست گرتنمان بە مەشرووتیەتەوە بە هەمان جۆر سەربەستین و، هەرگیز لە بابەتە شەرعییەکان دەست هەڵناگرین و نایاندەین بە بەرتیل. کەمتەرخەمیی کەسێك سەبارەت بە هەر شتێك نابێتە بەهانە بۆ ناتەواوی و کەمتەرخەمییەکی تر.

بزانن کە "نائومێدی" ڕێگرە لە هەموو تەواوی و کەماڵێك.

دیاری و یادگاری ئیستیبداد بریتییە لەمە:

(من حەقم چییە؟ با یەکێکی تر بیری لێ بکاتەوە)!

پەیوەندیی نێوان ئەم ڕستانە بە بیری خوێنەری بەڕێز دەسپێرم، چونکە بە باشی زمانی تورکی نازانم.

سەعیدی نوورسی

* * *

(١) ئەم وشەیە تازەکی دانراوە، لە بری وشەی "مەشرووتیەت" کە پێشتر دانرابوو. (دانەر)

# بژی شەریعەتی خاوێن

ئەمە وتارێکی سەعیدی کۆنە، چل و دوو ساڵ پێش ئێستا[1]
لە ڕۆژنامە ئایینی‌یەکاندا بڵاو کراوەتەوە.

ڕۆژنامەی ئایینی (ووڵقان) ژمارە (٧٣)
بەرواری ١٤/مارت/١٩٠٩ز

ئەی پەرلەمانتارەکان!

تەنها یەك ڕستەتان ئاراستە دەکەم، هەرچەندەش دووررودرێژە. هیوادارم بە گرنگی‌یەکی زۆرەوە ڕەچاوی بکەن، چونکە وێڕای دووررودرێژییەکەی پوخت و پڕ واتایە. کە ئەمەی خوارەوەیە:

"مەشرووتیەت" و "یاسای بنەڕەتی" بریتین لە:

دادگەری و، شوورا و، کۆکردنەوەی هێزەکان لە یاسادا.

وێڕای ئەم ناونیشانەش، دەڵێم: ئایینی ئیسلام و شەریعەتە پاك و خاوێنەکەی:

خاوەنی ڕاستەقینەی ئەم ناونیشانە مەزنەیە و..

کاریگەری ڕاستەقینە و لەخۆگری دادگەریی تەواوەتی‌یە و..

خاڵی پشت پێ بەستنمان دەهێنێتەدی و..

لەسەر بناغەیەکی توندوتۆڵ مەشرووتیەت دادەمەزرێنێت و..

ئەوانەش گومانیان لە دڵدایە، لە گێژاوی سەرسامی دەریان دەهێنێت و..

داهاتوومان دەستەبەر دەکات و..

دەربازتان دەکات لەوەی کە بە بێ ڕوخسەتێکی خوایی دەستکاریی ئەو مافانەی بکەن کە بەرژەوەندیی سەرجەمی خەڵکیان لەخۆ گرتووە و..

---

(١) بەرواری ئەم تێبینی‌یەی کە دانەر نووسیویەتی: (١٩٥١ز)یە. (وەرگێڕ)

پارێزگاریی ژیانی نەتەوەییمان دەکات و..

ژێری و زەینەکان بە لای خۆیدا ڕادەکێشێت و..

دامەزراوی و تەواویمان دەردەخات و، بوونی ئێمە لە بەردەم بیانی‌یەکاندا دەهێنێتە دی و..

لە بەرپرسیاریی دنیا و قیامەت ڕزگارتان دەکات و..

لە ئەنجامیشدا یەکێتیی گشتی و هەمەلایەنە دادەمەزرێنێت و..

هزر و بیرە گشتی‌یەکان (ڕای گشتی) کە گیان و کاکڵەی ئەو یەکێتی‌یەیە، بەرهەم دەهێنێت و..

ڕێ لە هاتنە ژوورەوەی خراپکاری‌یەکانی شارستانێتی بۆ ناو سنووری ئازادی و شارستانێتیمان دەگرێت و..

لە زەلیلیی سواڵکردن لە ئەورووپا دەمانپارێزێت و..

لە ماوەیەکی کەمدا و لەسەر بناغەی نهێنیی ئیعجاز ئەو ماوە فراوانەمان بۆ نزیک دەخاتەوە کە تیایدا لە پێشکەوتنی شارستانێتی دواکەوتبووین و..

لە ماوەیەکی کەمدا بە یەکخستنی عەرەب و توران و ئێران و سامی‌یەکان، لە شان و باڵی ئێمە بەرز دەکاتەوە و..

کەسایەتیی مەعنەویی دەوڵەت لە شێوە و ڕواڵەتی ئیسلامدا پێش چاو دەخات و..

بە پارێزگاری کردن لە ماددەی یازدەهەمی یاسای بنەڕەتی، لە سوێند شکاندن ڕزگارتان دەکات و..

ئەو گومانە خراپانەش کە پێشتر ئەورووپا لە دڵی خۆیدا هەڵی گرتبوون، پووچەڵ دەکاتەوە و، هانیان دەدات دان بنێن بەوەدا کە محەممەد پێغەمبەر ﷺ دواهەمینی پێغەمبەرانە و، شەریعەتەکەشی هەتاهەتایی‌یە و..

بەربەستێك لە بەردەم ئەو بێ ئایینی‌یەدا دادەمەزرێنێ کە شارستانێتی دەڕمێنێت و..

بە ڕووی ڕووناك و درەخشانی خۆی تاریکیی جیاوازیی هزر و بیرەکان و پەرتەوازەیی ڕا و بۆچوونەکان، دەڕەوێنێتەوە و..

سەرجەم زانایان و ئامۆژگاران لە پێناوی بەختەوەریی نەتەوە و پاڵفتە کردنی بەڕێوەبردنی کار و بارەکانی دەوڵەتدا یەکدەخات و، دەیانکات بە خزمەتگوزاری مەشرووتییەتی ڕەوا و..

دڵی ناموسڵمانەکان یەکدەخات و زیاتر پەیوەستیان دەکات بە شەریعەتەوە، چونکە دادگەریی سەرتاسەریی شەریعەت یەك پارچە میهرەبانی‌یە و..

ترسنۆکترین و پلە نزمترین کەس دەکات بە ئازاترین و بەرزترین مرۆڤ و، هەر بەو شێوەیەش مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات و..

هەست و نەستی پێشکەوتن و فیداکاری و خۆشویستنی نیشتیمانیان تێدا دەورووژێنێت و..

لە ئارەزووپەرستی و زیادەڕۆیی و خواستە ناپێویستەکان - کە ئەمانە شارستانێتی دەڕمێنن - ڕزگارمان دەکات و..

چالاکیمان تێدا دەبووژێنێتەوە سەبارەت بە کارکردنمان بۆ دنیا، هاودەم لەگەڵ یادکردنەوەی دواڕۆژدا و پارێزگاری لێ کردنی و..

ئەو ڕەوشت و ڕەفتارە پەسەندانەی کە ژیانی شارستانێتین و، دەستوورەکانی هەست و نەستە بەرزەکانیشمان فێر دەکات و..

ئێوەی نوێنەرانی نەتەوەش لە داواکاریی مافی پەنجا هەزار کەس، بێ تاوان دەردەکات و..

بە وێنەی نموونەیەکی ڕەوای ئیجماعی نەتەوە پێش چاوتان دەخات و..

کردەوەکانتان بەپێی نیازی خاوێنی خۆتان وەکو "پەرستش" لێ دەکات و..

لەو تاوانە ڕزگارتان دەکات کە بەرامبەر ژیانی مەعنەویی سێ سەد ملیۆن موسڵمان ئەنجام دەدرێت.

جا ئەگەر ئایینی ئیسلام و شەریعەتە پاك و خاوێنەکەیتان پێش چاو خست و، بە بناغەی بڕیار و فەرمانەکانی خۆتان دانا و، یاسا و دەستوورەکانیتان جێبەجێ کرد..

ئایا دوای دەستکەوتنی چەندین سوودی تا ئەم ڕادەیە، هیچ شتێکتان لە دەست دەچێت؟ والسلام.

با بژی شەریعەتی خاوێن.

**سەعیدی نوورسی**

* * *

# بژی شەریعەتی ئەحمەدی

(دروودی خوا لەسەر خاوەنی)

ڕۆژنامەی ئایینی (وولقان) ژمارە (٧٧)
بەرواری ١٨/مارت/١٩٠٩ز

شەریعەتی خـاوێن هەتاهەتایە دەمێنێتەوە، چونکە لـە گوفتـاری ئەزەلی‌یـەوە هـاتووە. ڕزگاربوونیش لـە خۆسەپاندنی بەدخواز تەنها بە پشت بەستن بـە ئیسـلام و دەست گرتن دەبێت بە پەتی مەحکەم و توندوتۆڵی ئەو (واتە قورئانی پیرۆز).

بەرچنیی سـوودەکانی سەربەستیی ڕاستەقینە، بە جۆرێکی تـەواوەتی، پەیوەستە بە سەرچاوە گرتنی هەموو هەڵسوکەوتێك لە "ئیمان"ەوە. چونکە هەر کەسێك خوازیاری بەندایەتیی پوخت و خاوێن بێت بۆ پەروەردگاری جیهانیان، نابێ لە لای خەڵکی خـۆی زەلیل بکات و ببێت بە بەندەی کۆیلەکان.

ئنجا مادەم هەموو مرۆڤێك لەناو موڵك و جیـهانی خۆیـدا سەرپەرشـتیاری ئـەو جیهـانەیە، ئەوا جیـهادی گـەورەی لـەو جیهانە بچکۆلەیـەدا لـە ئەسـتۆدایە و، دەبـێ ڕەوشت و ڕەفتارە شیرینەکانی پێغەمبـەری خۆشەویست ﷺ لـە خۆیـدا بهێنێتـە دی و سوننەتە خاوێنەکەی ئەو زیندوو بکاتەوە.

ئەی کاربەدەستان!

ئەگەر دەتانەوێ لە کاروبارتـاندا سەرکەوتوو بن، ئەوا بە یەکخستنی کارەکانتـان لەگەڵ یاسا گەردوونی‌یەکانی خوای گەورەدا ئەو سەرکەوتنە بەدەست دەهێنن، دەنا لـە هەر کارێکی پێچەوانـەی ئەمـەدا جگـە لـە بـەزین و شکسـت هێنـان دروێنـەی هیـچ بەرهەمێکی تر ناکەن..

چونکه سەرهەڵدانی پێغەمبەران – درووديان لەسەر بێت – بە گشتی لە وڵاتەكانی ئیسلام و قەڵەمڕەوی عوسمانیدا هێما و ئاماژەیەكی قەدەری خوای گەورەیە بۆ ئەوەی كە تەنها ئایین ڕۆڵەكانی ئەم وڵاتە بەرەو پێش دەبات و، گوڵزارەكانی كێڵگەی ئاسیا و ئەفریقا و بێستانەكانی نیوەی ئەورووپاش بە نووری ئیسلام دەپشكوێن.

باش بزانن كە: هەرگیز ئایین لە پێناوی بەدەستهێنانی دنیادا بەخت ناكرێت.

جاران بابەتەكانی شەریعەت دەدران بە بەرتیل لە پێناوی هێشتنەوە و پارێزگاری كردنی ئیستیبدادی لەناوچوودا[1]. دەفەرموون پیشانم بدەن جگە لە زیان و نائومێدی چییان دروێنە كرد لە بەختكردن و واز لێهێنانی بابەتەكانی ئاییندا؟

پێكان و زامدار كردنی جەرگ و دڵی نەتەوە هی لاوازیی ئایینە و، هەرگیز نیعمەتی تەندروستی بەدەست ناهێنرێت گەر هێز و گوڕ و تین بە ئایین نەدرێتەوە.

مەشرەبی ئێمە: خۆشویستنی خۆشەویستی و، ڕقەبەرایەتیی دوژمنایەتی‌یە.

واتە پشت گرتنی سەربازەكانی خۆشەویستی‌یە لە نێوان موسڵماناندا و، پەرتەوازە كردنی سوپای دوژمنایەتی‌یە لە نێوانیاندا.

ڕێبازمان: پابەندبوونە بە ڕەوشتە محەممەدی‌یەكان ﷺ و، زیندووكردنەوەی سوننەتی خاوێنی ئەوە.

ڕابەرمان لە ژیاندا: شەریعەتی خاوێنە.

شمشێرمان: بەڵگە گومان بڕەكانە.

ئامانجمان: بەرز كردنەوەی ئاڵای ئایینی ئیسلامە.

هەموو ئیماندارێك لە واتا و ناوەرۆكدا پەیوەندیی بە كۆمەڵەكەمانەوە كردووە[2].

---

(١) مەبەست سەردەمی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووهەمە. مامۆستا نوورسی هەرچەند لە دژی ئیستیبداد دەدوا، بەڵام گومانی باشی بە خودی سوڵتان هەبوو، چونكە لەو كاتەدا خراپكاری‌یەكانی ئیستیبدادی دەخستە ڕوو كە بە ناوی سوڵتانەوە ئەنجام دەدران، سوڵتانی بە بەری و بێ تاوان دادەنا و، لەبارەیەوە دەیوت: (سوڵتانی ستەم لێكراو.. یەكێكە لە ئەولیا و پیاوچاكان). (وەرگێڕ، لە چاپە عەرەبی‌یەكەوە)

(٢) ئەم وتارە و وتارەكەی دوای ئەمەش بانگەوازێكی ڕوون و ئاشكرایە بۆ یەكگرتنی ئیسلامی و، گەڕانەوە بۆ لای شەریعەت و، دەست گرتن بە داوێنی ئایینەوە و، دەست بەردار بوون لە هەموو شێوەكانی جیاوازی و دووبەرەكی. لە هەمان كاتیشدا ڕێ خۆشكردنە بۆ هەموو بیر و زەینەكان كە "ئیتیحادی محەممەدی" بە واتا فراوانەكەی لە نێوان هەموو موسڵماناندا قبووڵ بكەین، كە بە ڕەسمی لە ١٩٠٩/٤/٥ لە ئاهەنگێكی پڕ شكۆدا لەناو مزگەوتی "ئەیا صۆفیا"دا لە ئەستەمبوڵ ڕاگەیەنرا. (وەرگێڕ، لە چاپە عەرەبی‌یەكەوە)

شێوەی ئەم پەیوەندی کردنەش بڕیاری یەکجاری و بێ گومانیەتی بۆ زیندوو کردنەوەی سوننەتی خاوێنی پێغەمبەر ﷺ لە جیهانە تایبەتییەکەی خۆیدا.

ئنجا ئێمە بە ناوی شەریعەتەوە داوا لە هەموو ڕابەران (لە زانایان و شێخان و قوتابیانی هەموو زانستەکان) دەکەین کە پێش هەموو خەڵکانی تر یەکبگرن.

سەعیدی نوورسی

* * *

(بێدارکردنەوەیەکی تایبەت)

ڕۆژنامەنووسەکان - کە وتاربێژی گشتین - بە دوو پێوەری هەڵە نەتەوەیان خستووەتە ناو زەلکاوێکی بۆگەنەوە:

یەکەم:

بە چاوی ئەستەمبووڵ سەیری پارێزگاکانی تر دەکەن. لە کاتێکدا دەزانین کە ئەگەر وانەی فەلسەفە بەو منالانە بوترێتەوە کە توانای خوێندنەوەیان نییە، دەرس وتنەوەیەکی ڕووکەش دەبێت.

دووهەم:

بە پێوەری ئەوروپا سەیری ئەستەمبووڵ دەکەن. ئاشکرایە کە ئەگەر پیاو پۆشاکی ئافرەت لەبەر بکات، نزم دەبێتەوە و دەبێتە مایەی گاڵتە پێکردنی خەڵکی!

سەعیدی نوورسی

* * *

# زایەڵەی حەقیقەت

ڕۆژنامەی ئایینی (وولقان) ژمارە (٨٢)
بەرواری ٢٧/مارت/١٩٠٩ز

شاڕێگای محەممەدی ﷺ لەبەر ئەوەی ڕێگایەکی پاکە لە هەموو فێڵ و گومانێك، ئەوا بێ نیازە لە "شاردنەوە" کە هێمایەکە بۆ فێڵ و گومانەکان!

پاشان ڕاستییەکی گەورە و فراوان و گشتگیری تا ئەم ڕادەیە - بە تایبەت بەرامبەر خەڵکانی ئەم ڕۆژگارە - هەرگیز ناگونجێت بشاررێتەوە.

ئایا دەریای مەزن لەناو پیاڵەیەکدا دەشاررێتەوە؟

دووپاتی دەکەمەوە کە:

تەنها (تەوحیدی خوای گەورە) لایەن و هۆکاری یەکبوونە لە "ئیتتیحادی محەممەدی"دا، کە ڕاستیی یەکێتیی ئیسلامە (یەکێتیی ئیسلامی).

سوێند و بەیعەتیشی بریتی‌یە لە: ئیمان.

بارەگا و شوێنی کۆبوونەوەکانی: مزگەوتەکان و قوتابخانە ئایینی‌یەکان و تەکیە و خانەقاکانە.

شوێنکەوتووانی: سەرجەمی ئیماندارانە.

پەیڕەو و پرۆگرامی ناوخۆییشی بریتی‌یە لە: سوننەت و ڕەفتارەکانی پێغەمبەر ﷺ و، یاساکەشی بریتی‌یە لە فەرمان و نەهی‌یەکانی شەرع.

ئەم یەکێتی‌یە لە عادەتەوە سەرچاوەی نەگرتووە، بەڵکو "عیبادەت"ە.

شاردنەوە و ترس لە مەرایی و ڕیاوە پەیدا دەبن. فەرزەکانی ئایینیش ڕیایان تێدا نی‌یە.

خۆ لە هەموو فەرزێك پێویست تر و واجب تر لەم ڕۆژگارەدا: یەکێتیی ئیسلامی‌یە.

مەبەست و ئامانجی ئەم یەکێتی‌یە: بزواندنی ئەو پەیوەندی‌یە نوورانی‌یەیە کە پەرستگا ئیسلامی‌یە بەش بەش و پەرش و بڵاوەکان بە یەکەوە گرێ دەدات و، بێدارکردنەوەی

ئەو کەسانەیە کـە بـەم بزواندنـە پەیوەسـتن پێیانـەوە و، هاندانیانـە بـە فـەرمانێکی ویژدانـی بەرەو ڕێی پێشکەوتن.

مەشرەبی ئەم یەکێتی‌یە: خۆشەویستی‌یە.

دوژمنەکەشی: نەزانی و ناچاری و دووڕوویی‌یە.

با ناموسڵمانەکان دڵنیا بن کە مەبەستی یەکێتیمان تەنها هێرش کردنە بۆ سەر ئەم سێ سیفەتە ناوبراوە. تاکە ڕێگای نێوان ئێمە و ئەوان: (قەناعـەت پێ کـردن)ە، چونکـە لـەو باوەڕەداین کە ئەوان خەڵکانێکی شارستانین و ئێمەش ئەو ئەرکەمان خراوەتە ئەستۆ کـە ئـاینی ئیسـلام لـە ڕواڵـەتێکی جـوان و خۆشەویسـت و قەشـەنگدا بخەینـە ڕوو، چونکـە پێمان وایە ئەوان خاوەنی ویژدان بن.

دەسـا بـا ئەوانـەی بـە بـێ بایەخی‌یـەوە ئایینەکـەیان پشـتگوێ دەخـەن، بزانـن بـە خۆداماڵینیان لە ئایین ناتوانن لای هیچ بیانی‌یەك خۆیان خۆشەویست بکەن!

بەڵکو دەری دەخەن کە بە بێ هیچ بەرچاوڕۆشنی و ڕێ دۆزینەوەیەك هەنگاو دەنێن. خۆ دیارە کەسێك بە سەرگەردانی ڕێی ئاژاوەچێتیی گرتبێتە بەر هـەرگیز لـە لایـەن هیـچ کەسێکەوە خۆشەویست نابێت. ئەوانەش کـە دوای توێژینـەوە و پشـکنین و وردەکـاریی زانستی‌یانە پـەیوەندی‌یان بـەو یەکێتی‌یـەوە کـردووە و ڕۆشتوونەتە نـاوی، هـەرگیز بـە چاولێکەریی ئەوانی تر دەستبەرداری نابن.

ئێمە بیر و بۆچوونەکانی یـەکێتیی ئیسـلامی کـە بریتی‌یـە لـە "ئیتیحـادی محەممـەدی" و ڕاستی و ڕێبازەکـەی، بۆ سـەرجەمی خـەڵك دەخەینـە ڕوو. ئامادەشـین بـۆ بیسـتنی هـەر ڕەخنەیەك کە ئاراستەمان بکرێت.

جملە شیران جهان بستەء این سلسلە اند
روبە از حیلە چەسان بگسلد این سلسلە را

واتە:

سەرانسەر شێرانی جیهان پابەندی ئەم زنجیرەیەن
ڕێوی بە فێڵ چۆن دەتوانێ ئـەم زنجیرە بقرتێنێ

**سەعیدی نوورسی**

* * *

## بەرپەرچدانەوەی گومانەکان

ڕۆژنامەی ئایینی (وولقان) ژمارە (٩٠-٩١)

بەرواری:

٣١/مارت/١٩٠٩ز

١/نیسان/١٩٠٩ز

لێرەدا ئەو نۆ دانە گومانە هەڵەیە دەهێنم کە دراونەتە پاڵ کۆمەڵی "یەکێتیی محەممەدی":

**گومانی یەکەم:**

باسکردنی بابەتی ئایینی لە ناوەندەکاندا بۆ ئەم چەشنە بارودۆخە ناسکە ناگونجێت.

**وەڵام:**

ئێمە ئایینمان خۆش دەوێت و، هەر لەبەر ئایینیش دنیامان خۆش دەوێت (لا خیر في دنیا بلا دین).

**دووهەم:**

مادەم لە سیستەمی مەشرووتییەتدا میللەت فەرمانڕەوایە، ئەوا دەبێ میللەت بوونی خۆی بەرجەستە بکات.

میللەتی ئێمەش هەر تەنها موسڵمانە. چونکە جگە لە ئایینی ئیسلام هیچ پەیوەستێکی ڕاستەقینە و بەهێز نییە کە (عەرەب و تورك و کورد و ئەلبان و چەرکس و لاز) پێکەوە گرێ بدات.

ئاشکرایە کە پشتگوێ خستنێکی یەکجار کەمی ئایین، بوو بەهۆی قایمکردنی بناغەی دەستە و تیرەی پادشایان و، زیندوو بوونەوەی دەمارگیریی جاهیلیی مردووی پێش سیازدە سەدە و، سەرهەڵدانی ئاشووب و پشێوی. ئەوەبوو هەموو ئەمانە هاتنە دی و بە چاوی خۆشمان بینیمان.

**گومانی دووهەم:**

تایبەت کردنی ئەم ناونیشانە (واتە یەکێتیی محەممەدی) ئەو کەسانە دەخاتە گومان و دوودڵی‌یەوە کە پەیوەندییان پێوە نەکردووە.

**وەڵام:**

پێشتر وەڵامی ئەمەم داوەتەوە. یان نەخوێندراوەتەوە، یاخود بە هەڵە لێکدراوەتەوە. بۆیە ناچارم دووپاتی بکەمەوە و بڵێم:

ئێمە کاتێك کە دەڵێین: (یەکێتیی محەممەدی) کە یەکێتیی ئیسلامە، مەبەستمان ئەو یەکێتی‌یە جێگیر و دامەزراوەیە کە چ لە ڕاستیدا هەیە و چ لە دۆخی هێز و توانا و لێهاتندایە لە نێوان سەرجەمی ئیمانداراندا و، هەرگیز مەبەست کۆمەڵە خەڵکێك نی‌یە لە ئەستەمبوڵ یان لە ئەنادۆڵدا. چونکە یەك دڵۆپ "ئاو" سیفەتی ئاوی لە خۆگرتووە. کەواتە کەس لەم یەکێتی‌یە بەدەر نی‌یە و، ئەم ناونیشانەش تایبەت نەکراوە بە هیچ کەسێکەوە.

پێناسە ڕاستەقینەکەی ئەمەیە:

بناغەی ئەم یەکێتی‌یە: لە خۆرهەڵاتەوە بۆ خۆرئاوا و لە باشوورەوە بۆ باکوور درێژەی هەیە و..

مەڵبەندەکەشی: هەردوو حەرەمی پیرۆزە و..

لایەنی یەکبوونی: تەوحیدی خوای گەورەیە و..

سوێند و پەیمانی بریتی‌یە لە: ئیمان و..

پەیرەو و پرۆگرامی ناوخۆشی: سوننەتی پیرۆزی پێغەمبەرە ﷺ و..

یاساکانی: فەرمان و نەهی‌یەکانی شەرعە و..

شوێنی کۆبوونەوەکانی: سەرجەم قوتابخانە و مزگەوت و تەکیە و خانەقاکانە و..

بڵاوکەرەوە هەمیشەییەکانی بیر و بۆچوونەکانی ئەو کۆمەڵە: هەموو کتێبە ئیسلامی‌یەکانە، کە لە پێشەنگیانەوە قورئانی پیرۆز و تەفسیرەکانیەتی (پەیامەکانی نوور یەکێکن لەو تەفسیرانە لەم ڕۆژگارەی خۆماندا) هەروەها سەرجەمی ئەو ڕۆژنامە ئایینی و خاوێنانەیە کە ئامانجیان بەرز کردنەوەی ئاڵای ئایینی ئیسلامە و..

شوێنکەوتووانیشی: هەموو ئیماندارانە و..

سەرۆکەکەشی: فەخری عالەمە ﷺ.

ئێستا ئەو خاڵەی مەبەستمانە: بێداربوونەوەی ئیمانداران و ڕۆشتنیانە بەرەو ئیسلام. دیارە کاریگەریی ڕای گشتی ئینکاری ناکرێت..

ئامانج و مەبەستی ئەم یەکێتییە: بەرزکردنەوەی ئاڵای ئیسلامە و..

ڕێبازیشی: جیهادی هەرە گەورەی دەروون و ڕێنمایی خەڵکانی ترە و..

هیممەت و لێبڕانی ئەم کۆمەڵ و دەستە پیرۆزە بە ڕێژەی لە سەدا نەوەد و نۆ لە شتانی غەیری سیاسەتدا وەك: پاکژ کردنی ڕەوشت و ڕێککردنەوەی ڕەفتارەکان و ئامانج و فەزیلەتە ڕەواکانی هاوشێوەیاندا بەکار دەبرێت، چونکە ئەو کۆمەڵانەی کە بایەخ بەم شتانە بدەن زۆر دەگمەن و کەمن، لە کاتێکدا کە بوونیان زۆر گرنگە. تەنها یەك لە سەدی ئامانجەکانی ئەو کۆمەڵە پەیوەندیی بە سیاسەتەوە هەیە، ئەویش ڕێنمایی کردنی سیاسییەکانە.

شمشێرەکانیشی: بەڵگە بەهێز و گومان بڕەکانە.

مەشرەبی: خۆشەویستییە و پەرەپێدانی ئەو خۆشەویستییەیە کە لەناو تۆوی برایەتیی ئیمانداراندا هەیە، تاکو ببێت بە درەختێکی تووبای بە فەڕ و پیرۆز.

گومانی سێهەم:

ئەم کۆمەڵەیە زیاد لەوەی کە دووبەرەکی دەنێتەوە و کەسانی تر تووشی نائومێدی دەکات، چ سوودێکی هەیە؟

وەڵام:

ئەمە دووبەرەکی نییە، یەکگرتنە.. نائومێدی نییە، بەڵکو ئومێد بەخشینە.

ئەو ڕاستییە زۆر گەورەیەی کە وەك گەنجینەیەکی ئاڵتوون وایە، بە دۆزینەوەی سوچێکی لە نیوەی گۆی زەویدا، وەك مەشخەڵێك درەوشاوەتەوە.

هەروەك دەریایەکی گەورە لە پیاڵەیەکدا جێی نابێتەوە، "یەکێتیی محەممەدی"ش نە لە بەڕێوەبەرایەتیی ڕۆژنامەی "وولقان" و نە لە ئەستەمبوڵیشدا قەتیس نابێت.

بەڵکو ئەو "یەکێتیی محەممەدی"یەی کە ئێستا بەشێکی لە دۆخی "هێزە"وە ڕۆشتووەتە دۆخی "کردار" - چەشنی لێدانی دکتۆرێك بە مەبەستی پشکنین - بریتییە لە ورياکردنەوەیەك.

هـەروەها بزواندنـی ئـەو زنجـیرە درێـژ و یـەك لـە دوای یەكـە نوورانی‌یـەی كـە مەڵبـەندەكانی موسـڵمانان بـە یەكـەوە دەبەسـتێتەوە، بێدارکردنـەوەی هـەموو ئـەو موسـڵمانانە دەگەیـەنێت كـە پێیـەوە پەیوەسـتن و، هاندانیانـە - بـە حـەز و فـەرمانێكی ویژدانی - بۆ پێشكەوتنی ماددی و مەعنەوی كە لەم سەردەمەدا گەورەترین هۆكـارن بۆ بەرزڕاگرتنی وشەی "الله" (ئاڵای ئیسلام)..

چونكە ڕزگار بوون لە ئیستیبداد، بە هاندەری حەز و شەوقی ویژدان دەبێت..

دەبینیت لە نێوان هەزار كەسدا تەنها یـەك دانـەیان ڕۆشنبیرە و، لـە نـاخی ویژدانیـدا هەسـت بـەو حـەز و شـەوقە دەكـات، جـا ئەگـەر بـە هەسـتی ئـایینی بێـت، ئـەوا لـە ڕێـی پێشـكەوتندا تایبـەترین كەسـی چینـی تایبەتمـەندان و عـەوامترین كەسـی ئاسـایی وەكـو ڕۆشنبیرەكەوان و، لەو هەستە ئایینی‌یەدا یەكسانن.

هەروەها لەبەر ئەوەی ئێمە زانیاریی گشتی و شارستانێتی تەواوەتیمان لـە بەردەستدا نی‌یە - كە هۆكاری ڕۆشنبیر كردنن - ئەوا دەبێت ئایینی ئیسـلام، كـە ڕۆشـنایی هـەموو ڕووناكی‌یەكانە، بكەینە مەشـخەڵێكی ڕوونـاكی بەخش، تـاكو ئاهـەنگی پێشـكەوتن نەشێوێت.

**گومانی چوارەم:**

ناموسڵمانەكانی ناومان دەترسن، یاخود وڕك دەگرن!

**وەڵام:**

وڕك گرتن پیشـەیەكی منداڵانـە و ناپاكانەیـە.. ترسـانیش نەزانی‌یە، یـان خۆدانـە لـە نەزانی..

بەرزیی ئایینی ئیسلام و نەبوونی ئەو گرفتەش كە ئەوان بـە گومـان دروستی دەكـەن، لێرەدا وەك خۆر ئاشكرایە، چونكە ناموسڵمانان لە سەدەكانی ناوەڕاستدا و لەو كاتـەدا كە نەزان و ناشارسـتانی بـوون، بـە فـەرمانی: ﴿لا إكــراهَ في الدِّيــن﴾ هـاوڕێ لەگـەڵ سەرجەم ئایین و نەتەوە جیاوازەكانی ناو شارستانێتیی ئیسلامدا بە پارێزراوی ماونەتەوە. هەروەها سەلامەتیی ناموسڵمانان لە ئاسوودەیی وڵاتدایە.

"بەردەوامیی گیان" و "خاڵی پشت پێ بەسـتن" و "ڕابـەر"ی مەشرووتییەتیش ئـایینی ئیسلامە، كە شەریعەت و نەتەوایەتیمانە.

کەواتە ناموسـڵمانەکان نابێت لەم یەکێتی‌یە بترسن، بەڵکو دەبێت دڵیان پێـی خـۆش بێت و بە پیرۆزی ڕایبگرن.

**گومانی پێنجەم:**

لەوانەیە بیانی‌یەکان لەم یەکێتی‌یە بێزار بن.

**وەڵام:**

ئەو کەسەی کە ئەم گریمانە دادەنێت بێ گومان کەسێکی بێ ئاگـا و نەزانـە، چونکـە ئـەو هـەموو وتـار و موحازەرانـەی کـە لـە کۆنفرانسـەکانیاندا سـەبارەت بـە گـەورەیی و بـەرزیی ئیسـلام لـە مەڵبـەندی دەمارگیریی پایتەختـەکانی ئـەواندا پێشـکەش دەکرێـن[1] دەست بە ڕووی ئەم گریمانەوە دەنێت:

پاشـان دوژمنـانی ئێمـە ئـەو بیانییانـە نین، بـەڵکو ئـەو شـتەی کـە ئێمـەی بـەرەو ئـەم بارودۆخەی ئێستامان دابەزاند و ڕێی بەرزکردنەوەی ئاڵای ئیسلامی لـێ گرتین، تەنـها سەرپێچی کردنمانە لە فەرمانەکانی "شەریعەت" کە ئەویش ئەنجامی "نەزانی"مانـە و، هـی "زەروورەت"ێکـە بەدڕەوشـتی و بـەدڕەفتاری لـە ئێمـەدا بەرهـەمی هێنـا و، هۆکـاری "دووبـەرەکی"ی نێوانمانــە کـە ئامانجـە کەسـی‌یەکان و دووڕوویـی لـە ئێمـەدا هێنایـە دەرخستن. کە هێرشی ئەم یەکێتی‌یەی ئێمە بۆ سەر ئەم سێ دوژمنە بێ ویژدانەیە.

نەزانی و بێ ئاگایی بیانی‌یەکانیش سـەبارەت بـە ئیسـلام لـە سـەدەکانی ناوەڕاستدا، ئەوا ئیسلام هەرچەندە ناچار بووە دوژمنایەتیی نـەزانی و وەحشـیگەری بکـات، کـەچی پارێزگاریی دادگەری و میانەڕەویی لەگەڵ ئەواندا کردووە، ئەوەتا لە مێژووی ئیسلامدا شـتانی وەك "دادگاکـانی پشـکنین" نـەبینراوە. ئنجـا لەبـەر ئــەوەی لــەم ســەردەمی شارستانێتی‌یەدا "بیانی‌یـەکان" هـێز و شارسـتانێتی‌یان بەدەسـت هێنـا، ئـەوا دەمارگـیریی نەفرەت لێکراویان لە لا نەما.

لە ڕوانگەی ئایینەوە سەرکەوتن بەسەر کەسانی خاوەن شارستانێتیدا بـە "قەناعـەت" پێ کردن دەبێت، نەك بە زۆرەملـێ.. هەروەها بە پیشاندانی ئیسلام لە پێش چاویـاندا لـە شـێوەیــەکی بـەرز و خۆشـەویســتدا، ئـەویش بـە گــوێڕایەڵیی جـوان و ڕێکــوپێکی فەرمانەکان و پێش چاو خستنی ڕەوشتە بەرزەکان.

---

(١) ئاماژەیە بۆ وتار و ڕوونکردنەوەکانی بسمارك و میستەر کارلایل و هاوشێوەکانیان. (دانەر)

بـەڵام دوژمنایـەتی و بـەکارهێنانی زەبـر و زەنـگ تەنـها بەرامبـەر دڕندەیـی وەحشیگەرەکانە.

**گومانی شەشەم:**

هەندێ کەس دەڵێن:

هـەڵبژاردنی "پـەیڕەوی کـردن لـە سـوننەتی خـاوێنی پێغەمبـەر ﷺ" وەك ئامـانجی "یـەکێتی"یەکـە، سنوورێك بۆ ئـازادی دادەنێـت و لەگەڵ خواستەکانی شارسـتانێتیدا ناگونجێ.

**وەڵام:**

ئیماندار لە ماف و زاتی خۆیدا ئازادە. چونکە ئەو کەسەی بەندەی خوای گـەورەی پەروەردگاری جیهانیانە، هەرگیز نابێ زەلیلی بۆ هیـچ کەسێك بنوێنێـت. بـەو واتایـەی کە: هەتا ئیمان دامەزراوتر بێت ئازادی و سەربەستی پتر بەهێز دەبێت.

هەرچی ئازادی و سەربەستیی ڕەهایە، لە ڕاستیدا بریتی‌یـە لـە: وەحشیگەریی ڕەهـا، تەنانەت "ئاژەڵێتی"یە. لە گۆشە ڕوانینی مرۆڤایەتی‌یەوە سنوور دانـان بـۆ ئـازادی گەلـێ پێویستە.

دووهـەم: ئەوانـەی کـە وەکـو منـاڵ حـەزیان لــە هـەوا و هـەوەس و ئارەزووەکانـە، خراپکاری‌یـەکانی شارستانێتی بـە چاکـە دەزانـن. لـە کـاتێکدا کـە هیـچ چاکەیـەکی ڕاستەقینەی شارستانێتی نی‌یە لـە ئـایینی ئیسـلامدا، چ بـە ڕاشـکاوی و چ بـە شـێوەیەکی ناوەکی نەبێت، یاخود ڕوخسەتی پێ نەدرابێت، یان لەوەی ئیسلام جوانتر و باشتر بێت.

سێ‌هەم: هـەندێ کەسی هـەرزە و بێ ئامـانج دەیانـەوێت هـەر لـە زەلیلـی و دیلیـی دەروونی بەدخوازدا بمێننەوە و، ژیانی ئازادانە و سەربەستی‌یان پێ خۆش نی‌یە.

**بە پوختی:**

ئەو ئازادی‌یەی کە لە بازنەی شەرع بەدەرە، لـە ڕاستیدا بریتی‌یە لـە ئیستیبداد، یـان دیل بوونە بە دەستی دەروونی بەدخواز، یاخود دڕندەیی و ئاژەڵێتی‌یە.

جا با ئەو مولحید و بێ ئامانجانەی کە ئایینیان پشتگوێ خستووە، بزانـن کـە هـەرگیز بـە ئیلحـاد و هـەرزەیی نـاتوانن لـە لای هیـچ بیانی‌یـەکی خـاوەن ویـژدان خۆیـان خۆشەویست بکـەن، تەنانـەت هـەر ناشتوانن کـارێك بکـەن لـەوان بچـن. چونکە ئـەو

هەرزە و نەفامەی بێ ئامانج و بێ بەرنامەیە و بێ هیـچ بـەرچاو ڕۆشنییەکە، لـە ڕاستیدا کەس خۆشی ناوێت. ئەوەتا پۆشاکێك بۆ قەد و بالآی ئافرەت بشێت گـەر پیـاو لەبـەری بکات دەبێتە مایەی سووکایەتی و گالتەجاڕی!

**گومانی حەوتەم:**

کۆمەڵەی "یەکێتیی ئیسـلام" لـە ڕاستیدا دووبـەرەکی لـە نێـوان سـەرجەمی کۆمەڵـە ئیسلامییەکانی تردا دەنێتەوە و حەسوودی و نەفرین بەرهەم دەهێنێت.

**وەڵام:**

یەکەم: کاروبارە قیامەتییەکان حەسوودی و پالپالێن و موناقەشەیان تێـدا نییـە. جـا هەر موناقەشـە و ئێرەییـەك سـەبارەت بـەو کۆمەڵانـە، وەکـو ئـەوە وایـە کـە دووڕوویـی و ڕیاکاری لە خواپەرستیدا بکرێت.

دووهەم: ئێمە بە دوو مـەرج لەگـەڵ ئـەو کۆمەڵانـەدا یـەکدەگرین و پیرۆزباییـان لـێ دەکەین کە بە هاندەری خۆشەویستیی ئایین و خزمەتکردنی پێکهاتوون:

مەرجی یەکەم: پاراستنی ئاسایشی گشتیی وڵات و سەربەستیی شەرعی.

مـەرجی دووهـەم: گرتنەبـەری ڕێبـازی خۆشەویستی لــە هــەموو جموجووڵێکــدا و، هەوڵ نەدان بۆ لـەکەدارکردنی کۆمەڵەکانی تر بۆ ئـەوەی بـەها و بـرەوی زیـاتر بـە خـۆی بدات. خۆ ئەگەر هەڵەیەکیش پێش چاو کـەوت، بـۆ مەبەستی چارەسـەرکردنی بـۆ لای موفتیی نەتەوە و کۆمەڵەی زانایان بگەڕێنەوە.

سـێهەم: ئـەو کۆمەڵـەی کـە ئامـانجی بـەرز کردنـەوەی ئـالآی ئیسـلام بێـت هـەرگیز نابێت بە هۆکار و ئامراز بۆ هیچ چەشنە ئامانجێك، هەرچییەك بێت..

خۆ ئەگەر دەست لە داوێنی هـەر ئامـانجێکی تـر بگرێـت ئـەوا لـەبـەر ئـەوەی دەبێ بـە نیفاق و دووڕوویی هەرگیز سەرکەوتن بەدەست ناهێنێت. کەواتە شان و شـکۆی حـەق بەرز و بلندە و لە پێناوی هیچ شتێکدا بەخت نـاکرێت. چونکـە چـۆن دەکـرێ هێشـووە ئەستێرەی سـوورەیا بکرێـت بـە گسـك؟ یـان بـە وێنـەی هێشـووی تـرێ بخورێـت؟ ئـەو کەسـەی دەیـەوێت بـە فـووی دەم خـۆری "حەقیقـەت" بکوژێنێتـەوە شـێتیی خـۆی دەردەخات!

دەسا ئەی ڕۆژنامە ئایینییەکان!

ئامانجمان یەكگرتنی كۆمەڵە ئایینی‌یەكانە لە مەبەست و ئامانجەكاندا. چونكە یەكگرتن لە ڕێباز و مەشرەبەكاندا هەروەك لە توانادا نی‌یە، دروستیش نی‌یە، چونكە چاولێكەری ڕێی خۆی لەوێدا دەكاتەوە و وا لە مرۆڤ دەكات بڵێ: "من چیم لەم كارە داوە؟ با یەكێكی تر بیری لێ بكاتەوە".

**گومانی هەشتەم:**

زۆربەی ئەوانەی پەیوەندییان بە "یەكێتیی ئیسلام"ەوە كردووە – چ لە ڕاستیدا و چ لە ناوەڕۆكدا – لە چینی عەوامن و، هەندێكیشیان نەناسراون. ئەمەش هۆكارێكە بۆ سەرهەڵدانی ئاشووب و دووبەرەكی.

**وەڵام:**

پەیوەندی كردنی ئەوانە تەنها لەبەر ئەوەیە كە لەم یەكێتی‌یەدا بوار بە جیاوازی و ئامانجە كەسی‌یەكان نەدرێت. پاشان لەبەر ئەوەی مرۆڤ لەم یەكێتی‌یەدا بانگەشە بۆ بەرز كردنەوەی ئاڵای ئیسلام دەكات ئەوا هەر كردارێك لەو پێناوەدا ئەنجام بدات پاداشتی پەرستشی بۆ دەنووسرێت. نابینی مزگەوت كە شوێنی خواپەرستی‌یە پادشا و سوالكەر بە بێ هیچ جیاوازی‌یەك تیایدا یەكسانن، تەنانەت یەكسانیی ڕاستەقینە دەستوورێكی جێبەجێ كراوە و، ئیمتیاز بۆ كەس نی‌یە، چونكە بەڕێزترین كەس لای خوا ئەوەیە لە هەموویان زیاتر خاوەنی تەقوا بێت، خۆ ئەو كەسە هەرە بەتەقوایە بریتی‌یە لە مرۆڤی خۆنەویست.

جا لەسەر بناغەی ئەم یاسایە، ئەو كەسەی بە نیازی خزمەتی ئایین و بانگەواز بۆ قیامەت پەیوەندی بەم كۆمەڵە ئایینی و قیامەتی‌یەوە دەكات، خۆی شەرەفمەندی و سەربەرزی بەدەست دەهێنێت، دەنا هیچ شەرەف و سەربەرزی‌یەك بۆ ئەم یەكێتی‌یە زیاد ناكات، چونكە بە دڵۆپێك ئاو هیچ لە دەریا زیاد نابێت..

پاشان هەروەك مرۆڤ بە كردنی گوناهی كەبیرە كافر نابێت، دەرگای پەشیمانی و تۆبەش هەتا هەڵهاتنی خۆر لە خۆرئاواوە هەر كراوەتەوە و، دەریاش بە لەوێچێك ئاو پیس نابێت، بەڵكو دەستەكە پاك دەكاتەوە.

جا ئەو كەسەی پەیوەندی بەم نموونە بچووكەی "یەكێتیی ئیسلامی"یەوە دەكات، ئەوەی لێ دەگیرێت بە مەرج كە: شوێن سوننەتی پێغەمبەر ﷺ بكەوێت و، لە ژیانی

خۆیدا زیندووی بکاتەوە و، فەرمانەکانی ئەو سوننەتە جێبەجێ بکات و، لەو شتانەش دوورەپەرێزی بکات کە سوننەت نەهیی لێ کردوون و، ئاسایش و سیستەمی وڵات تێك نەدات.

جا ئەگەر کەسێکی نەناسراو بە نیازی خراپ پەیوەندی بەم یەکێتیەوە بکات، هەرچەندەش هەوڵ بدات ناتوانێت ئەم ڕاستییە چەپەڵ بکات، تەنانەت گەر مرۆڤ سەبارەت بە خۆی گوناهباریش بێت، خۆ ئیمانەکەی پاك و خاوێنە و، ئەو پەیوەندییەش بە یەکێتیی ئیسلامەوە پەیوەستی دەکات تەنها "ئیمان"ە، نەك شتی تر.

ئیتر شێواندن و ناشیرین کردنی ئەم ناونیشانە پاك و پیرۆزە بەم چەشنە بڕوبیانووە لاوازانە، تەنها ئەنجامی بێ ئاگاییە لە مەزنیی ئیسلام، جگە لەوەی کە ئەو کەسەی بەهانە و بڕوبیانووی لەم جۆرە دەهێنێتەوە دەری دەخات کە لە هەموو کەسێك گەوج و نەزانترە.

ئێمە بە هەموو هێزێکمانەوە ڕووبەڕووی هەر هەوڵێك دەوەستین کە بیەوێت ناوبانگی باشی "یەکێتی"یەکەمان بشێوێنێت کە نموونەی (یەکێتی)یە، یان بە وێنەی کۆمەڵە دنیاییەکان توانجی تێ بگرێت. ئێمە ئەوپەڕی ئامادەباشیمان بۆ وەڵامدانەوەی هەر پرسیار و ڕەخنەیەك تێدایە.

ئەو کۆمەڵەی کە پەیوەندیم پێوە کردووە ئەم یەکێتییە ئیسلامییەیە کە بە درێژی لێی دوام. ئەوەتا شتێك نییە لەوانەی کە بیانووگران بە ئەندێشەی نارەوای خۆیان بیری لێ دەکەنەوە. تاك تاکەکانی ئەم دەستە و کۆمەڵە ئایینییە هەمیشە پێکەوەن، چ لە خۆرهەڵات بن یان خۆرئاوا، چ لە باشوور بن یان باکوور.

**گومانی نۆهەم:**

لە کاتێکدا کە کۆمەڵەکانی تر "نهێنی پاراستن"ی تێدایە، کەچی لە "یەکێتیی محەممەدی"دا دەرخستنی نهێنییەکان بە پێویست زانراوە؟

**وەڵام:**

ئایینی ئیسلام ئاشکرایە.. خۆ ئەگەر ئەو هێزی فراوانبوونەی کە لە خۆی گرتووە، بەرتەسك بکرێتەوە، ئەوا بوومەلەرزە بە هەموو "بوون"ی دەخات..

ئنجا "شاردنەوە"ش لەبەر ئەوەی فێڵ و گومان لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت، ئەوا ئەو ڕاستی‌یەی کە لە فێڵ و گومان بەری‌یە، لە "پەنهانی"ش بێ باکە! فێڵیش - لە ڕاستیدا - بریتی‌یە لە وازهێنان لە فێڵ.

"سەرڕاستیی" ئەم کۆمەڵەیە، لەگەڵ کۆمەڵەکانی دیکەدا بەراود ناکرێت. چونکە ئەوان وا تازە خەریکن بناغە دادەنێن، کەچی ئەم لە کاتێکدا کە خۆی دامەزرێنەرە، لە هەندێ گۆشەیەوە خەریکە دەبریسکێتەوە.

هەروەها ئەم لە سەرەتای ئیسلامدا - کە ژمارەی هەڵگرانی چل کەس بوو - نەشاررایەوە، ئێستا چۆن دەشاررێتەوە کە هەڵگرانی سێ سەد ملیۆن کەسن؟

هەروەها شتێك کە "ژیری" ببینێت و پەسەندی بکات، "هزر"یش سەرقاڵ دەبێت پێیەوە و ملی بۆ نەوی دەکات.. "حەقیقەت"یش پەردەی پەنهانی قبووڵ ناکات.

* * *

پرسیار[1]:

تۆ کۆتایی وتارەکانت بە ناوی (بەدیعوززەمان) واژوو دەکەیت، خۆ ئەمەش هێمایەکە بۆ مەدحی خۆ کردن!

وەڵام: نەخێر بۆ مەدح کردن نی‌یە، بەڵکو دەمەوێ بەم واژووە قسوورەکانم و بەڵگەی کەموکورتیی خۆم دەربخەم.

ڕوونکردنەوەی ئەمەش بریتی‌یە لەوەی کە:

"بەدیع" واتە: نامۆ: چونکە ڕەوشتەکانم بە وێنەی ڕواڵەتم غەریب و نامۆن و، شێوازی نووسینەکانیشم وەکو بەرگ و پۆشاکەکانم پێچەوانەی خەڵکانی ترن.

جا من بە زمانحاڵی ئەم ناونیشانە تکای ئەوە دەکەم کە داوەری‌یە ژیری‌یەکان و شێوازە باوەکانی نووسین نەکرێت بە پێوەرێك بۆ داوەری‌یە ژیری‌یەکانم و سەنگی مەحەك بۆ شێوازەکانی نووسینم.

پاشان مەبەستم لە بەدیع "عەجیب"ە، چونکە واتای ئەو وتەیەم تێدا هاتووەتە دی کە وتراوە:

(١) لێرەوە هەتا کۆتایی باسەکە و تا دەگاتە واژووی دانەر، بە شێکە لە وتارێکی تری خۆی بە ناوی: (ڕووناکیی حەقیقەت) هەر لە لایەن خۆیەوە لە چاپە تازەکاندا هێنراوە بۆ ئێرە. (وەرگێڕ)

إلَيَّ لَعَمْري قَصْدُ كُلِّ عَجيبَةٍ    كَأنّي عَجيبٌ في عيونِ الْعَجائِبِ[١]

نموونەی ڕوونی ئەمەش، بریتی‌یە لەوەی کە:

ماوەی ساڵێکە هاتووم بۆ ئەستەمبووڵ، کەچی هێندە ئاڵوگۆڕ و ڕووداوم بینی کە لە سەد ساڵدا ڕوو دەدەن.

والسلام علی من اتبع الهدی.

لەسەر زمانی هەموو ئیمانداران و بە ژمارەی هەموو مرۆڤەکان دەڵێین:

بژی شەریعەتی ئەحمەدی، سەلات و دروود لە خاوەنی.

**بچووکترین ئەندامی (یەکێتیی محەممەدی)**

**بەدیعوززەمانی کوردی: سەعید**

* * *

برای بەڕێزم سەرنووسەر[٢]!

دەبێ ئەدیبان بە ئەدەبەوە ڕەفتار بکەن و پابەندی ئادابی ئیسلامی بن.. دەبا ئەو هەستە ئایینی‌یەی کە لە ویژدان و ناخیاندا هەیە سیستەمی چاپەمەنی ڕێك بخات. چونکە ئەم ئاڵوگۆڕە ئیسلامی‌یە دەری خست کە:

ئەو شتەی بەسەر ویژدان و هەناوی خەڵکیدا زاڵ و دەمڕاستە تەنها غیرەتی ئیسلامی‌یە. ئەوەش زانراوە کە: ئەم "ئیتتیحادی ئیسلامی"یە هەموو ئیمانداران و سەرانسەری سوپا دەگرێتەوە. کەواتە کەسێك نی‌یە لە دەرەوەی بێت.

**سەعیدی نوورسی**

---

(١) واتە: بۆ هەموو شتێکی سەرسووڕهێنەر بێگومان ڕوو لە من دەکرێت، وەك بڵێی من شتێکی سەیرم لە پێش چاوی شتە سەیرەکاندا. (وەرگێڕ)

(٢) مەبەست سەرنووسەری ڕۆژنامەی "وولقان"(واتە: گڕکان)ە کە ناوی "دەرویش وەحدەتی"یە و، خەڵکی قوبرسە. ئەو کاتە وتاری توندوتیژی لە دژی کۆمەڵەی ئیتتیحاد و تەرەقی بڵاو دەکردەوە و هەست و سۆزی خوێنەرانی دەورووژاند. مامۆستا نوورسیش جار بە جار لە نووسینگەی ڕۆژنامەکە سەردانی دەکرد و، لەسەر ئەو هەڵەشەییەی هۆشیاریی پێ دەدا. بەڵام سوودی لە ئامۆژگاری‌یەکانی مامۆستا وەرنەگرت و، سۆز و هەڵەشەییەکانی بەرەو پەتی سێدارەیان برد. (وەرگێڕ)

## دواپارچەی

# پاشکۆی پاشکۆ

ئەم پارچەیە بریتی‌یە لە دوو وانە کە ئاراستەی ئەو هەشت تیپە سەربازی‌یە کران لە ڕووداوی بەناوبانگی (٣١ی مارت)دا لە فەرماندەکانیان هەڵگەڕانەوە، بەڵام دوای ئەم دوو وانەیە قەناعەتیان کرد کە بگەڕێنەوە بۆ گوێڕایەڵی و، ڕێژەی گرفتەکە لە سەدەوە دابەزی بۆ یەك.
ساڵی ١٣٢٥ی ڕۆمی (١٩٠٩ز) ئەم دوو وانەیە لە ڕۆژنامە ئایینی‌یەکاندا بڵاو کرانەوە[1].

## بۆ سەربازە قارەمانەکان

ڕۆژنامەی (میزان) ژمارە (١٢٨)
بەرواری ١٥/نیسان/١٩٠٩ز

ڕۆژنامەی ئایینی (وولقان) ژمارە (١٠٧)
بەرواری ١٧/نیسان/١٩٠٩ز

ڕۆژنامەی (سەربەستی) ژمارە (١١١)

ئەی سەربازە یەکتاپەرستە پاڵەوان و بەڕێزەکان!

ئەی ئەو قارەمانانەی کە ئەم نەتەوە ستەم لێکراوە و ئایینی پیرۆزی ئیسلامتان لە دوو کارەساتی گەورە ڕزگار کرد!

---

(١) ئەو پەراوێزەی لە کۆتایی وتاری (بۆ سەربازە قارەمانەکان)دایە هی خودی دانەرە و، کتێبی (آثار بدیعیە) لە ڕۆژنامەی (میزان) و (وولقان)ەوە هێناویەتی. جا لەبەر ئەوەی ڕوونکردنەوەی زیاتری دوابڕگەی وتارەکەی لەخۆ گرتووە، ئێمەش لەو شوێنەدا دامانناوە و، برای بەڕێز " دکتۆر دیدار کامەران" ئەرکی وەرگێڕانی ئەو پەراوێزەشی گرتە ئەستۆ، خوا پاداشتی بداتەوە و، هاووێنەی زۆر بکات. (وەرگێڕ)

سەربەرزی و جوامێریی ئێوە لە گوێڕایەڵی و پابەند بووندایە بەو فەرمانانەی ئاراستەتان دەکرێت.

ئەمەشتان لە ئاڵۆزترین بارودۆخدا پێش چاو خستووە.

ژیان و هێزی ئێوە لە گوێڕایەڵیدایە.

دەسا ئەم تایبەتکاری‌یە پیرۆز و خاوێنە بۆ بچووکترین فەرماندەشتان دەربڕن. چونکە شەرەفی سی ملیۆن هاوولاتیی عوسمانی و سێ سەد ملیۆن موسڵمان پەیوەستە بە گوێڕایەڵیتانەوە بۆ فەرماندەکانتان.

ئالای ئیسلام و تەوحیدی خوای گەورە لە دەستی ئازایەتی و قارەمانێتیی ئێوەدایە و، هێزی پیرۆزی بازووتان لە ئەنجامدانی گوێڕایەڵیدایە. ئەفسەرەکانی ئێوە وەکو باوکی دڵسۆزتان وان.

بە دەقی قورئان و فەرموودە و بەپێی خواستی حیکمەت و بە تاقیکردنەوەش چەسپاوە کە:

گوێڕایەڵیی فەرماندە لە شتی حەقدا فەرزە.

خۆشتان دەزانن کە سی ملیۆن کەس لە ماوەی سەد ساڵدا نەیانتوانی ئەم دوو ئاڵوگۆڕ(کودەتا)ە بەرپا بکەن..

کەچی ئەو هێزەی ئێوە کە لە گوێڕایەڵیتانەوە سەرچاوە دەگرێ نەتەوەی ئیسلامی خستووەتە دۆخی ڕێز و سوپاسەوە.

مانەوەی ئەم شانازی‌یەشتان و پارێزگاری لێ کردنی تەنها لە گوێڕایەڵی کردنی ئێوەدایە بۆ ئەفسەرەکانتان.

من دەزانم کە ئێوە خۆتان لە پشێوی و ئاڵۆزی‌یەکاندا هەڵنەقورتاند، تاکو ئەفسەرەکانتان دووچاری لێپرسینەوە نەکەن کە بە وێنەی باوکی دڵسۆز وان بۆتان.

بەڵام وا ئێستا کۆتایی بە کێشەکە هاتووە.

کەواتە بڕۆنەوە باوەشی بە شەفەقەت و میهرەبانی فەرمانی ئەفسەرەکانتان.

شەریعەتی خاوێن بەم جۆرە فەرمانمان پێ دەدات..

چونکە ئەفسەرەکان "أولو الأمر"ن و، لە رووی بەرژەوەندیی نیشتمان و نەتەوە - بە تایبەت لە سیستەمی سەربازیدا - گوێڕایەڵیی کاربەدەست فەرزە و، پارێزگاری کردن لە شەریعەتی محەممەدی ﷺ لە گوێڕایەڵیدایە[1].

**سەعیدی نوورسی**

* * *

# وتارێك بۆ سەربازەکان

| | |
|---|---|
| ڕۆژنامەی (میزان) ژمارە (١٢٩)<br>بەرواری ١٧/نیسان/١٩٠٩ز | ڕۆژنامەی ئایینی (وولقان) ژمارە (١١٠)<br>بەرواری ٢٠/نیسان/١٩٠٩ز |

ئەی سەربازەکانی یەکتاپەرستان!

من فەرمانەکانی فەخری عالەمتان ﷺ پێ ڕادەگەیەنم، کە:

گوێڕایەڵیی کاربەدەستان لە بازنەی شەرعدا فەرزە.

کاربەدەستانی ئێوەش ئەفسەرەکانتانە و، سەربازگەکانیشتان وەکو کارگەیەکی ڕێکوپێك وایە؛ کە ئەگەر چەرخێکی لەکار بکەوێت و سەرکێشی بنوێنێت، کاریگەریی دەبێت لە ئاڵۆزی و لەکارکەوتنی سەرجەمی کارگەکەدا.

---

(١) لە ڕۆژنامەی (میزان) و (وولقان)دا دانەر ئەم ڕوونکردنەوەیەشی داوە:
بە پشت بەستن بە شەریعەت هەموومان "یاسای بنەڕەتی"مان پێ قبوولە. هەزار کەسی ئەوتۆ کە گوێڕایەڵی فەرمان بن، دەتوانن بەسەر سەد هەزار کەسی نارێك و ناگوێڕایەڵدا سەربکەون. ئەم دوو کودەتایە ئەمەی سەلماند، چونکە ئەوەی کە بە هەموو میللەت نەکرا، ئێوە کردتان! خۆ ئەگەر دوژمن کەمێ لاوازی لە گوێڕایەڵیی ئێوەدا ببینێت، جەسارەتێکی گەورەی بۆ دروست دەبێت و سنوورەکان دەبەزێنێت. ئێوە ئەگەر گوێڕایەڵیتان پتر زیاد نەکەن بۆ فەرماندەکانتان، ئەوا بەرامبەر شەریعەت لێپرسراو دەبن. پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ هەروەك لە سەردەمی بەختەوەریدا فەرمانی داوە، ئێستاش لە هەردوو حەرەمی پیرۆزەوە دەستی بەرزکردووەتەوە و، فەرمانتان پێ دەدات کە گوێڕایەڵی بکەن، چونکە مانەوە و بەرز ڕاگرتنی شەریعەت بەندە بە گوێڕایەڵیی سەربازەکانەوە. (دانەر)

کارگەی بەهێز و ڕێکوپێکی سەربازیی ئێوەش خالی پشت پێ بەستن و یارمەتیدەری سی ملیۆن هاوولاتیی عوسمانی و سێ سەد ملیۆن موسڵمانە.

کوشتنی دوو ئیستیبدادی گەورە لەسەر دەستی ئێوەدا، بە بێ ڕشتنی دڵۆپە خوێنێك، کارێکی نائاسایی بوو.

جا لەبەر ئەوەی ئێوە دوو موعجیزەی شەریعەتی خاوێنتان پێش چاو خست، ئەوا لە دوو بەڵگەدا هێزی حەماسەتی ئیسلامی و بەرزی و خاوێنیی شەریعەتتان پیشانی ئەوانە دا کە بیروباوەڕیان لاوازە.

خۆ ئەگەر هەزاران شەهیدمان لە پێناوی ئەم دوو کودەتایەدا بەخت بکردایە هێشتا بە کەممان دەزانی. بەڵام ئەگەر یەك لە هەزاری گوێڕایەڵیتان بەخت بکرێت ئەوا گەلێ گران دەکەوێت لەسەرمان، چونکە کەم بوونەوەی گوێڕایەڵیی ئێوە - بە وێنەی کەم بوونەوەی پلەی گەرما و ئەو شتەی مایەی ژیانە - مردن بەرهەم دەهێنێت.

مێژووی سەرانسەری جیهان شایەتە لەسەر ئەوەی کە خۆهەڵقورتاندنی سەربازەکان لە سیاسەتدا گەلێ زیانی گەورەی بە دەوڵەت و نەتەوە لێ کەوتووەتەوە. بێ گومان پەرۆشیتان بۆ ئایینی ئیسلام لەو چەشنە زیانانە دەتانپارێزێ کە دووچاری ئەو ژیانی ئیسلامییە دەبێت پاراستنی خراوەتە ئەستۆتانەوە.

ئەو کەسانەی کە بیرکردنەوەی کاروباری سیاسەتیان لە ئەستۆدایە، لە ئەفسەرەکان و کاربەدەستان، لە جێی هێزی بیرکردنەوەی ئێوەدان. ئەو شتەی کە ئێوە هەندێ جار بە زیانی تێدەگەن ئاکامەکەی خێر دەبێت، چونکە لە بواری سیاسەتدا زیانێکی گەورەتر دوور دەخاتەوە..

جا ئەفسەرەکانتان، بەپێی ئەزموونی خۆیان، ئەو شتە دەبینن و، هەر بەو پێیەش فەرمان بۆ ئێوە دەردەکەن.

دەبێ ئێوەش بێ دوودڵی و چەند و چۆن گوێڕایەڵی فەرمانەکان بن، چونکە دوودڵی و سستی نواندن لە جێبەجێ کردنی فەرماندا کارێکی نابەجێیە و دروست نییە.

کارە تایبەتە ناڕەواکان هەرگیز ڕێ لە کارامەیی و بە سەلیقەیی سنعەتکاری چابوك و بە توانا ناگرن لە سنعەتەکەیدا و، کارە نایابەکەی لە پێش چاو ناخەن. نابینیت - بۆ نموونە - دکتۆری شارەزا، یان ئەندازیاری لێزان، گەر ڕەفتارێکی ناڕەوایان لێ بووەشێتەوە، نابێتە هۆی ئەوەی سوود لە زانستی "پزیشکی" و "ئەندازیاری"یەکەیان وەرنەگیرێت!

هونەری جەنگیش بە هەمان جۆرە، ئەوەتا ئەفسەرە خاوەن ئەزموون و کارامە و چابوکەکانتان کە هزر و بیریان بە غیرەت و حەماسەتی ئیسلامی ڕووناك بووەتەوە، گەر هەندێکیان کارێکی ناڕەوا ئەنجام بدات، نابێت بکرێت بە بیانوو بۆ سەرپێچی کردن لێیان و جێبەجێ نەکردنی فەرمانەکانیان، چونکە هونەری جەنگ کارامەیی‌یەکی گرنگە.

شەریعەتی خاوێن، کە مایەی ژیانی ئێوەیە، بە وێنەی دەستی سپیی حەزرەتی مووسا - دروودی خوای لەسەر بێت - کە ساحیرەکانی ناچاری کڕنووش بردن کرد بۆ خوای گەورە، هەموو ئەو کۆمەڵانەی هەڵلووشی کە بیر و زەینەکان پەرتەوازە دەکەن و دووبەرەکی و جیاوازی لە نێو خەڵکیدا دەنێنەوە.

کارەکانتان تا ئێستا "چارەسەر" بوون بۆ ئەم بزووتنەوە کودەتاییانە. بەڵام ئەگەر کەمێك زیادی بکەن ئەوا دەبێت بە ژەهرێکی کوشندە و، ژیانی ئیسلامی دووچاری چەندین نەخۆشیی سەخت و دژوار دەکەن..

پاشان ئەو ئیستیبدادەی کە لەناو ئێمەدا هەبوو، بە هیممەت و لێبڕانی ئێوە نەما. بەڵام هێشتا لە بواری پێشکەوتندا لە ژێر ئیستیبدادی مەعنەویی ئەورووپادایین.

دەبێ پابەندی ئەوپەڕی پلەکانی حەزەر و هێمنی و لەسەرخۆیی بن.

بژی شەریعەتی خاوێن.. بژی سەربازەکان.

**سەعیدی نوورسی**

* * *

## بەشی دووهەمی

## پاشکۆی دووهەمی

# وتاری شام

(واتە: بەشی دووهەمی ناوکەکانی حەقیقەت[1])

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين، والصلاة والسلام على محمد سيد المرسلين

### هێمایەکی سوورەتی (ئیخلاس)

﴿قُلْ هُــوَ﴾ دەستنیشـان کردنی ڕەهـا لـێرەدا[2] ئاماژەیـە بۆ " تـەوحیدی شـهوود ". (واتە: لە بەرچاوی حەقیقەتدا هیچ بینراوێك نییە جگە لەو).

﴿اللهُ أحَدٌ﴾ ڕاگـەیاندنێکی ڕاشـکاوانەیە سـەبارەت بـە " تـەوحیدی ئولووهییـەت ". (واتە: هیچ پەرستراوێك نییە جگە لەو).

﴿اللهُ الصَّمَدُ﴾ هێما بۆ " تەوحیدی پەروەردگاری " دەکات. (واتـە: جـگە لـەو هیـچ بەدیهێنەر و پەروەردگارێك نییە). هەروەك بەشێوەیەکی ڕەها ئاماژەشـە بـۆ " تـەوحیدی جەبـەرووت ". (واتـە: جگـە لـەو هیـچ ڕاگیرکـەرێك بـۆ ئـەم گەردوونـە و هیـچ دەوڵەمەندێکی ڕەهای تێدا نییە).

---

(١) بەڵام بەشی یەکەمی (ناوکەکانی حەقیقەت) لە کۆتایی کۆمەڵە پەیامی (مەکتووبات)دا بڵاوکراوەتەوە، با خوێنەری بەڕێز لەوێ بیخوێنێتەوە. (وەرگێڕ)

(٢) واتە: "لا هو إلا هو". (دانەر)

﴿لَـمْ يَلِـدْ﴾ ئاماژەیە بۆ "تەوحیدی شکۆمەندی" و، دەست بە ڕووی هەموو جۆرەکانی شیرکەوە دەنێت و دەریان دەکات. واتە: ئەو شتەی ئاڵوگۆڕی بەسەردا دێت و لەت لەت و پارچە پارچە دەبێت، یان وەچەی لێ دەکەوێتەوە، هەرگیز ناگونجێ خوا و پەرستراو بێت. کەواتە ئەم دەستەواژەیە کوڕایەتیی دەزیرییەکان و، فریشتەکان و، عیسا و عوزەیر - درووديان لەسەر بێت - بۆ خوای گەورە، پووچەڵ دەکاتەوە.

﴿ولم يُولَـد﴾ تەوحیدێکە ئەزەلییەت بۆ خواوەند دەچەسپێنێت و، دەرگا لەسەر هاوبەش دانانی هۆکار پەرست و ئەستێرە پەرست و بت پەرست و سروشت پەرستان دادەخات و دەست بە ڕوویانەوە دەنێت. واتە: هەرشتێك پەیدا بووبێت، یان لە ئەسڵێك جیا بووبێتەوە، یا خود لە مادده لە دایك بووبێت و سەری هەڵدا بێت، ناگونجێ خوا و پەرستراو بێت[1].

﴿ولم يكن له كفواً أحد﴾ تەوحیدێکی کۆکەرەوەی تەوحیدەکانی ترە. واتە: نە لە زات و نە لە سیفەتەکانیدا هاوشێوەی نییە و، لە کردارەکانیشیدا بێ هاوبەشە:

﴿ليسَ كمثلِهِ شيْءٌ وَهُوَ السَّميعُ البصيرُ﴾ (الشورى:١١).

ئەم سوورەتە بەرپەرچی هەموو جۆرەکانی شیرك دەداتەوە و، هەر شەش ڕستەکانی حەوت پلەی تەوحیدیان لەخۆ گرتووە و، هەر یەك لەو پلانەش ئەنجامی ئەوی ترە و لە هەمان کاتدا بەڵگەشە لەسەری.

* * *

## دوو بەڵگەی گەورەی تەوحید

گەردوون کە خۆی لە خۆیدا یەکتاناسی هەرە مەزن و بەڵگەی هەرە گەورەی تەوحیدە، زمانی پایە و ئەندامەکانی، تەنانەت زمانی خانەکانی، بگرە هەی گەردیلەکانیشی بە " تەوحید " کەوتۆتە گوفتار؛ ئەوەتا هەر هەموویان پێکەوە - بە

(١) واتە: کەسێك " واجب الوجود " و ئەزەلی نەبێت، ناکرێ خوا بێت. (دانەر)

وێنەی موریدی تەریقەتی مەولەوی - لە خۆشەویستی و کێشی زایەڵەی ئەم بەڵگە مەزنەدا بەشدارن و، زیکری "لا إلهَ إلاّ الله" دەکەن.

قورئانی پیرۆزیش - کە بەڵگەی گۆیای تەوحیدە - گەر گوێت بە سنگیەوە بنووسێنیت، دڵنیابە کە زایەڵەیەکی ئاسمانیی ئەوتۆی لێ دەبیستیت کە لە قوڵایی ناخی دڵیەوە و بەوپەڕی جیددیەت و ئیخلاس و هاوڕازیەوە دەردەچێت و، بە بەڵگەی گومان بڕی قەناعەت بەخش پڕچەك کراوە و، زیکری (لا إلــهَ إلاّ هـــو) دووپات دەکاتەوە.

بەڵێ، هەر شەش لای ئەم بەڵگە ڕووناکی بەخشە: تەنك و ناسکە و.. مۆری ئاشکرای ئیعجازی لەسەر نەخشاوە و.. ناوەوەشی نووری هیدایەتە و.. لای ژێرەوەشی مەنتیق و بەڵگەیە و.. لای ڕاستی هێنانە گوفتاری ژیریەکانە و.. لای چەپیشی بە شایەتگرتنی ویژدانە و.. ئامانج و بەردەمیشی خێر و بەختەوەریی دنیا و قیامەتە و.. خاڵی پشت پێ بەستنیشی سرووش(وەحی)ی پاك و خاوێنە.

کەواتە ئیتر وەهم و گومان لە کوێوە دەتوانن بڕۆنە ژوورەوە؟!

* * *

### ئامانجی ئامانجەکان

چوار توخمەکانی ویژدان و چوار هەستیارەکانی گیان بریتین لە: "ویست و زەین و شعوور و لایەنێکی ناسك و نیانی پەروەردگاری"..

هەر یەك لەمانەش ئامانجێکی ئامانجەکانی هەیە. بۆ نموونە:

ئامانجی هەموو ئامانجەکانی ویست: خواپەرستیە و.. هی زەینیش: ناسینی خوایە و.. هی شعووریش خۆشەویستیی خوایە و..هی لایەنە ناسك و نیانەکەش: بینینی خوای گەورەیە.

"تەقوا"ش کە خواپەرستیی تەواوەتیە، هەموو ئەم چوارەی لە خۆیدا کۆکردووەتەوە..

هەر تەنها "شەریعەت"ە کە گەشە بەم چوارە دەدات و، پاکژی دەکات و، هەریەکەیان بەرە و ئامانجی ئامانجەکانی خۆی دەداتەبەر.

* * *

## جگە لە خوا هیچ شتێك کاریگەریی لە گەردووندا نی‌یە

ئەگەر بوونی ئەو هۆکارانەی کە لە بەدیهێنانی شتاندا هەن، بوونێکی ڕاستەقینە بوایە و کاریگەریی ڕاستیی ببوایە، واتە ڕواڵەتی نەبوایە، ئەوا دەبوو هەست و شعوورێکی هەمەکی‌یان پێ بدرایە و، وردەکاری و تەواویی سنعەت لە بەدیهاتووەکەشدا جۆراوجۆر دەربهاتایە..

کەچی دەبینین وردەکاری لەوپەڕی تەواویدایە و، پڕاوپڕی قەد و باڵای بەدیهاتووەکەیە، هەر لە ئاساییترین شتەوە تا دەگاتە ئاڵۆزترین و، هەر لە بچووکترینیانەوە هەتا دەگاتە گەورەترینیان.

کەواتە هیچ کەموکووڕی و ناتەواوی‌یەك لە بەدیهێنانیاندا نی‌یە.

بەو واتایەی کە:

لەناو بەدیهاتوواندا شتێك نی‌یە دوور یان نزیك یاخود هەندێك بەهۆکار پەیدا بووبێت و هی تریش بە بێ هۆکار بێت.

ئەو ناتەواوی‌یەی کە لە ئاسەوارە ئیختیاری‌یەکانی مرۆڤدا بەدی دەکرێت، دەست بە ڕووی "جەبر"ەوە دەنێت و "ویست و ئیختیار"ی مرۆڤ دەچەسپێنێت.

شایانی تێبینی‌یە کە:

بەشەکانی شارێك کە مرۆڤ بەهۆی ئیختیاری جوزئیی خۆی بنیاتی نابێت، کە ئەوەش ئاسەوارێکی زیرەکی و ژیری‌یەتی، لە ڕووی ڕێکوپێکی‌یەوە ناگاتە کاری کۆمەڵی هەنگ لە شانەکەیدا کە بەرووبوومی سرووش و ئیلهامە.. ئنجا شانەکانی هەنگیش کە شاری هەنگ دەنوێنێت کەم و کۆتایە لە چاو ئەو ڕێکوپێکی‌یەی کە لە "هەنار"دا هەیە!

بەو واتایەی کە: ئـەو قەڵەمـەی هـێزی کێشـی هەمەلایـەنگری گـەردوونی نووسـیوە، کێشە بچووکەکانی ناو گەردیلە و گەوهەرە یەکتاکانیش کە دابـەش نـاکرێن، هـەر لـەو قەڵەمەوە داچۆڕاون.

* * *

## ڕوانینی ئیسلام و نەصرانیەت بۆ پیاوچاکان و ئازیزان

دروشمی ئیسلام بریتی‌یە لـە: (لا خـالق إلا هـو). واتـە جگـە لـە خـوا کـەس بەدیهێنـەر نی‌یـە. بۆیـە نـاوەند و هۆکارەکـان بـە کاریگـەری ڕاستەقینە دانـانێت، بـەڵکو بـە وێنـەی "پیتەکان" (واتە: بە واتای حەرفی) بۆ هەموو هۆکارەکان دەڕوانێت..

چونکە باوەڕی یەکتاپەرستی و، تەسلیم بـوون بـۆ خـوا و، سپاردنی هـەموو کـارێك بەو، وا دەخوازێ..

کەچی نەصرانیەتی ئێستا – واتە هی دوای تەحریف – لـەو باوەڕەدایـە کـە هۆکـار و ناوەندەکان خاوەنی کاریگەریی ڕاستەقینە بن و، بە واتای "ئیسمی" بۆیان دەڕوانێت..

چونکە بیروباوەڕی "کوڕایەتی" (واتە: ئەوەی کە خوای گـەورە کـوڕی هـەبێت) وا دەخوازێ و، چەمکی "ڕەبەنایەتی"ش ئەو ئاکامەی لێ دەبێتەوە..

ئەوەتا بە واتای "ئیسمی" دەڕواننە گەورە و ئازیزانیان، واتە پێیان وایە گەنجینەی ئـەو چرایەن کە هی ڕووناکیی خۆرە و ئێستا لەواندایە. بە واتایـەکی تـر: لـەو بـاوەڕەدان کـە ئەو گەورە مرۆڤانە خاوەنی ڕووناکی بن. کەواتە سەرچاوەی ڕێژنە و کانگای نوورێکن کە هی خۆیانە!

بەڵام ئێمە بە واتای "حەرفی" دەڕوانینە پیاوچاکان. واتە: هەروەك ئاوێنە وێنەی خۆر وەردەگرێ و ئنجـا دەیداتـەوە و بـڵاوی دەکاتـەوە، پیاوچاکـانیش ڕوونـاکی لـە نـووری نبووەت وەردەگرن، کەواتە تەنها ڕووناکی دەرەوەی درەوشانەوەی ئەو نوورەن[١].

---

(١) "ڕابیتـە" لـە تەریقـەتی نەقشـبەندیدا لەسـەر ئـەم نهێنی‌یـە بنیـات نـراوە. واتـە ئەگـەر شـێخەکە خـاوەنی تایبەتمەندی و پلەی بەرز بێت، ئەوا وەکو هـەموو شتێکی تری فانی بۆی دەڕوانرێت. خۆ ئەگەر خاوەنی ئەوەش نەبێت، ئەوا زیانێکی نی‌یە. (دانەر)

ئا لێرەوەیە کە گرتنەبەر(سلوك)ی ڕێی خواناسی و پیاوچاکی لای ئێمە لە تەوازوعەوە دەست پێ دەکات و، بە "توانەوە"(مەحوو)دا تێدەپەڕێ تا دەگاتە پلەی "الفناء في الله".

واتە: لای ئێمە ئەو کەسەی ڕێی خواناسی و بەرەو خوا چوون دەگرێتەبەر بە چەندین مەقامی بێ کۆتاییدا دەڕوات، ئیتر "من"ی ئەو کەسە، لەخۆبایی بوونی دەشکێ و نامێنێت، هەروەك دەروونی بەدخواز و کەش و فشی دەکوژێتەوە.

بەڵام لە نەصرانیەتدا – مەبەستم ڕاستەقینەکەیان نییە – کە بەهۆی دەستکاری و ئاوێتە بوونی فەلسەفەوە لەرزەی پێ کەوتووە، "من"ی مرۆڤ و هەرچییەکیش پەیوەندیی پێیەوە هەیە، بەرە بەرە بەهێز دەبێت.

واتە هەرکەسێك "من"ێکی بەهێزی لە خۆدا هەڵگرتبێت و ئنجا خاوەنی پلە و پایە و تایبەتکاریی بەرزیش بێت، بە توندی دەست لە ئایینەکەی گیر دەکات و دەمارگیریی بۆ دەنوێنێت..

کەچی لە ئیسلامدا ئەم جۆرە کەسەی کە "من"ی تێدا بەهێز بووە، بایەخ بە ئایین نادات!

* * *

## چێژ لە "کارایی"دایە

ئەو چێژە بەتین و جۆراوجۆرەی کە لە توێی "کارایی"(الفعالیـــة)دا هەیە کاتێ لە دۆخی هێزەوە دەڕواتە دۆخی بوونی ڕاستەقینە، لە ڕاستیدا ناوکی یاسای تەواوکاری و هەوێنی ئاڵوگۆڕی جیهانە.

بۆ نموونە ئەو چێژەی لە هاتنە دەرەوەی مرۆڤدا هەیە لە تەنگەبەریی بەندیخانەوە بۆ ناو باخچەیەکی فراوان، هەمان چێژە کە تۆو هەستی پێ دەکات کاتێ دەڕواتە دۆخی گوڵە گەنمەوە. خۆ ئەگەر "کارایی" چەند ئاڵوگۆڕێکی لە دۆخێکەوە بۆ دۆخێکی تر لەخۆ گرتبوو، ئەوا چێژەکەش پتر زیاد دەبێت.

کەواتە هەر تەنها ئەم چێژەیە کە قورسیی ئەرك و کارمەندیی هەر شتێك دەخاتە ئەستۆی خۆی و گرفتەکانی لەسەر شان سووك دەکات.

جا هێزی کێش کردنی ئەو تەواوی(کمـال)یـەی کـە هـەموو گیانـەوەرێك هـەوڵ بـۆ بەدەستهێنانی دەدات، هـەمان هـێزی کێشـە کـە بەدیـهاتووە بـێ هەسـت و گیانـەکانیش بەرەو کارایی و تێکۆشان دەداتەبەر.

هەر لە سۆنگەی ئەم نهێنییەوەیە کە ڕەحمەت زەحمەتە و، زەحمەتیش ڕەحمەت!

* * *

## هەڵپەکردن هۆی بێ بەشییە

"هەڵپە" و "پەلـە" بێ بەشـی و نـائومێدی بەرهـەم دەهێنـن. ئـەوەتا هەڵپەکار هەمیشـە نائومێد و زەرەرمەندە. چونکە جموجووڵە بە پەلە و خێراکانی ئەو کەسە، بە هیچ جـۆرێ ڕەچـاوی ئـەو ڕیزبـەندی و زنجـیرە یـەك لـە دوای یـەك هاتنـەی نـەکردووە کـە بـە وێنـەی پلەکانی پلیکانە وایـە و، خـوای گـەورە لـە "سروشـت" و "بەدیـهاتنی هـەموو شـتێك"دا دایناوە.

جـا هـەر هێنـدەی کەسی هەڵپەکار ئـەم ڕیزبەندییـەی نـاو سروشتی بەدیــهاتووانی پشتگوێ خسـت و، لەبـەر پەلـە کـردن بـازی دا بەسـەر پلـەکانی ئـەو پلیکانەیـەدا، ئـەوا دووچاری نائومێدی دەبێ کاتێ دەبینێ دەرگای هیوا و ئاواتەکـەی لـە ڕوودا داخـراوە. چونکە ئەگەر لە ناوەندی ئەو ڕیزبەندییە سروشتییەدا ڕێگای بۆ نەگیرێتەبـەر و مـرۆڤ پلە پلە بۆی سەرنەکەوێ، ئەوا دەرگا لە ڕووی کەس ناکرێتەوە.

کەواتە کورتکردنەوەی ماوە و کات، ناتەبایە لەگەڵ ئەو حیکمەتەی کە لە سروشتی بەدیهاتوواندایە و، مرۆڤ نـاگـەیەنێتە ئـامانج و، خاوەنەکەی دووچاری ئەو نائومێدییـە دەبێت کە بێ ئاگایی و کەمتەرخەمی بەرهەم دەهێنن.

خوای گەورە ناوەوەی دڵی مرۆڤی بۆ ئیمان پێ هێنــانی و ناسینی و خۆشویستنی و، دەرەوەشی بۆ شتانی تر بەدی هێنـاوە. بـەڵام "هەڵپـە" تاوانێکـە بەرامبـەر "دڵ" کـە کونـی تێدەکات و بتەکانی بۆ دەباتە ژوورەوە، ئیتر خـوای گەورەش لـەم کارە تـووڕە دەبێـت و، بە هێنانەدیی پێچەوانەی نیاز و مەبەستی ئەو هەڵپەکارە، سزای دەدات.

ئەو کەسانەی کە بەهۆی هەڵپەی خۆیانەوە چەندین بیروبۆچوونی سیاسی‌یان تەنانەت هێنایە ناو بیروباوەڕی ئیسلامەوە، لە بریی بەدەستهێنانی ناوبانگ و شانازی، جگە لە خراپکاری و سووکایەتی، بەرچنیی هیچ شتێکی تریان نەکرد.

هەر لەم ڕوانگەیەوە:

○ ئەو گرفت و شکست و نائومێدی‌یەی کە لە خۆشەویستیی هەوا و ئارەزوودا هاودەمی مرۆڤە، تەنها هی ئەم نهێنیی هەڵپەکردنەیە.

○ سەرجەمی دیوانەکانی ئەو چەشنە شەیدایانە جگە لە ماتەمینی و ئاخ و داخ شتی تری تێدا نی‌یە.

○ سووربوونت لەسەر خەو لێکەوتن لە سەرەتای شەودا، پاشماوەکەی تری شەو خەو لە چاوت دەزڕێنێت!

○ گەر دوو سواڵکەر ڕوو بە ڕووت ببنەوە؛ یەکێکیان: بە هەڵپە و ورك گرتن پێ لە سواڵ دابگرێ و، ئەوی تریان: قایل و دووره پەرێز لەو ڕەفتارە.. لە خۆتەوە حەز دەکەیت خێر بە دووهەمیان بکەیت! ئەوەش نموونەیەکی بچووکی ئەم یاسا فراوانەیە.

* * *

## مەترسیی ڕەخنە لە یەك گرتن

ڕەخنەیەك لەسەر بناغەی لە خۆبایی بوون و جەربەزەیی دامەزرابێت، ترسناکترین نەخۆشی‌یە کە ئێمە لەناو دەبات و دژوارترین گرفتە هاتووەتە ڕێمان. چونکە ئەگەر "ڕەخنە" لە ویژدانەوە سەرچاوەی گرتبێت مرۆڤ دەگەیەنێتە "ڕاستی" و، ئەو ڕاستی‌یە پوخت و خاوێن دەکاتەوە. بەڵام گەر "لە خۆبایی بوون" هاندەری ئەو ڕەخنەیە بێت، ئەوا دارمان و پەرتەوازەیی لێ دەبێتەوە.

مەترسیدارترینی ئەم چەشنە ڕەخنە ترسناکە ئەوەیە کە ڕۆشتبێتە ناو بیروباوەڕی ئیمانی و بابەتە ئایینی‌یەکانەوە. چونکە "ئیمان" هەروەك باوەڕهێنانە، لە هەمان کاتدا ملکەچ بوونیشە.. هەروەك پابەندبوونە، گوێڕایەڵیی مەعنەویشە..

جا ئەم چەشنە ڕەخنەیە گوێڕایەڵی‌یەکە زامـدار دەکـات و، لـە ڕادەی پابەندبوونەکـە دادەگـرێ و ملکەچی‌یەکەش دەشـکێنێت و، لـە ئاستی باوەڕهێنانیشـدا بـە بـێ لایـەنی دەمێنێتەوە و بایەخی پێ نادات.

لەم ڕۆژگارەی ئێمەدا، کە ڕۆژگارێکە بـە زۆریـی دوودڵـی و گومانـەکان ناسـراوە، دەبێ بە گومـان باشـی - نـەك ڕەخنـە - بڕوانرێتـە ئـەو ڕوونکردنـەوە ئاشـکرا و بـیروڕا نوورانی و ئیجابی‌یانەی کە لە دڵانێکی گەشاوە بە ئیمانەوە سەرچاوە دەگرن و، پەرە بـە ملکەچی و پابەند بوون دەدەن.

خۆ ئـەو شتەش کـە پێـی دەوترێ: "داوەریـی بێ لایـەن" لـە بوارەکـانی ئـاییندا - لـە ڕاستیدا - کوفرێکی کاتی‌یە، لەوانەیە کەسێکی نۆ موسڵمانی تـازە هـاتوو بۆ نـاو ئـایین شتی وا بڵێ.

* * *

## ئەو بینایییەی کە نە کەس دەخەڵەتێنێ و نە بۆخۆیشی دەخەڵەتێ

بەو خوایەی کە قورئانی خاوەن ئیعجازی فێری مرۆڤ کردووە، ڕوانینی پێغەمبـەری خۆشەویست ﷺ و بینایی ڕەخنە ئامێزی ئەو، لەوە مەزنتر و وردتر و ڕوونتر و تیژتـرە کـە ڕاستیی لەگەڵ ئەندێشەدا لـێ بئاڵۆزێت و، ڕێبازەکەشی بـێ نیـازتر و خاوێنـتر و بـەرزترە لەوەی کە فێڵ بکات و، خەڵکی بە هەڵەدا ببات..

چونکە ئەو بینایییەی کە "حەق" دەناسێت ناخەڵـەتێ و، ئـەو دڵـەش "حـەق"ی خـۆش بوێت کەس ناخەڵەتێنێت!

* * *

## قێزەونیی "غەیبەت"

"قورئـانی پـیرۆز" ناشـیرینی و قـێزەونیی "غەیبـەت"ی لـەم فەرمایشـتەدا بەرجەسـتە کردووە کە دەفەرموێ:

﴿أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَنْ يَأْكُلَ لَحْمَ أخيهِ مَيْتاً..﴾ (الحجرات:١٢).

دەبینی لە شەش وشەدا و بە شەش پلەی زەمکردن ناشیرینیی ئەو ڕەفتارە دەخاتە ڕوو.

واتە بەو پیتی "هەمزە"یەی کە بە وێنەی ئاو خوڕ دەبێتەوە بۆ ناو ڕستەکان، دەپرسێ: بۆ ژیریی خۆت بڕوانە.. ئایا ئەم کارە بەدەی پێ باشە؟

خۆ ئەگەر لە ژیریی ساغ بێ بەشیت.. سەیری دڵت بکە، ئایا دەگونجێ ئەم شتە ئازاربەخشەی پێ خۆش بێت؟

ئەگەر دڵی ساغ شك نابەیت.. دە بۆ ویژدانت بڕوانە، ئایا بە تێکدانی ژیانی کۆمەڵایەتی ڕازی دەبێت، کە وەکو ئەوە وایە بە ددانەکانت گاز لە گۆشتەکەی خۆت بگریت؟

خۆ ئەگەر خاوەنی ویژدانێکی کۆمەڵایەتی نیت، سەیری مرۆڤایەتیت بکە بزانە حەز لە ڕاوکردنێکی وەحشیگەرانەی لەو جۆرە دەکات؟

ئەگەر لە ناوەرۆکدا لە مرۆڤایەتی بێ بەشیت.. بڕوانەرە شەفەقەت و بەزەییت بۆ هاوڕەگەز و خزمانت، ئایا مەیلت دەچێت بەلای ئەوەدا کە هەر بۆخۆت پشتی خۆت بشکێنیت؟

خۆ ئەگەر ئەم شەفەقەت و بەزەییەشت تێدا نییە، ئایا سروشتێکی ساغ و خاوێنیشت نییە وا بە ددانەکانت لەشی مردوو پارچە پارچە دەکەیت؟

بەو واتایەی کە:

"غەیبەت" لە ڕوانینی: ژیری و، دڵ و، ویژدان و، مرۆڤایەتی و، سیلەی ڕەحم و، سروشتی مرۆڤ و، شەریعەتەوە، دەست بە ڕوویەوە نراوە و ڕەت کراوەتەوە.

* * *

## نهێنیی هاوکاری

ئەو مرۆڤەی کە پەی بە نهێنیی "هاوکاری" نابات، لە بەرد ڕەق و بێ گیانترە. چونکە بەردی وا هەیە شێوەی کەوانەیی دەگرێتە خۆ بۆ یارمەتی و هاوکاریی براکەی؛ نابینی

بەرد لە بنمیچی چەماوەدا هەر هێندەی لە دەستی وەستای بەننا دەردەچێت یەکسەر لار دەبێتەوە و سەری خۆی نەوی دەکات تاکو بگاتەوە بە سەری براکەی بۆ ئەوەی هیچیان نەکەونە خوارەوە؟!

* * *

## مرۆڤی ڕێز لێگیراو

هەر لە بچووکترینی بەدیهاتووانەوە، واتە هەر لە بەشەکانی گەردیلەوە هەتا دەگاتە مرۆڤ و، لە مرۆڤیشەوە تا دەگاتە خۆری خۆرەکان (گەلەستێرەکان) گەوهەری یەکتای نێوان ئەم قووچەکە زنجیرەییە تەنها ئەم مرۆڤە ڕێز لێگیراوەیە.

* * *

## چەند هەستێکی تر

جگە لە پێنج هەستە زانراوەکان، مرۆڤ چەندین هەستی تری هەیە.

بۆ نموونە:

هەستێکی لە وێنەی "هەستی چێژ"ی هەیە کە دەیداتەبەر بۆ ئەنجامدانی کارەکان، هەستێکی تریش کە شەوقی تێدا دەهەژێنێت..

گەلێ هەستی تریش کە پێی نازانرێت.

* * *

## وێنەکانی هزر و بیر

هەندێ جار حەز و ئارەزوو شێوەی هزر و چەمك دەپۆشێت. ئەوەتا کەسی "هەڵپەکار" پێی وایە حەز و ئارەزووە دەروونییەکانی چەمك و هزر و بیرن!

* * *

## فریوی دەروون

هەندێ جار مرۆڤ دەکەوێتە ناو چڵپاوێکی پۆخڵەوە، کەچی خۆی فریو دەدات و دەموچاوی پێ دەهەنوێ، وەك ئەوەی میسك و عەنبەر بێت!

* * *

## شەهید وەلیە

شەهید وەلـیە.

جیـهادیش دوای ئـەوەی کـە فـەرزی کیفایـەت بـوو، ئێستا بـووە بـە فـەرزی عـەین. تەنانەت حوکمەکەی هێندە دووچەندانـە بووەتـەوە کـە بـووە بـە فـەرزی عـەینی چـەندین جارە.

جێدەستی نییەتیش لە جیهاددا - وەك لە زەکات و حەجدا - تا بڵێی کەمە.

تەنانەت لە گۆشە ڕوانینی سەرەکییەوە نەبوونی نییەت وەك بوونی وایە.

واتـە: ئەگـەر بـە دڵنیاییـەوە بزانرێ دژە نییـەتی جیـهاد لـە ئـارادا نییـە، ئـەوا جیـهاد شـەهیدیی ڕاستەقینە بەرهـەم دەهێنێـت، چونکـە واجـب بوونـی هـەر شـتێك گـەر دووچەندانە ببێتەوە هێندە دەبێت بە فەرزی عـەین کـە ئیـتر کاریگـەریی نییـەتی تێدا کـەم دەبێتەوە، کە شتێکە لە ئیختیاری مرۆڤدایە.

شتێکی کەم نییە کە دەیان هەزار ئەولیا، لە کاتێکی کەمدا، لەم نەتەوە گوناهبارەدا هەڵبکەوێت.

* * *

## ڕەوشتەکانمان بەندن بە ئایینەکەمانەوە

گـەر کەسێکی ئێمـە لـە ڕێ لابـدات، زۆربـەی جـار بەدڕەوشـت و بـێ ویـژدان دەردەچێت. چونکە حەز و ئارەزووی گوناهکردن کاتێ سـەر هـەڵدەدات کـە زایەڵـەی ئیمان لەناو ویژداندا بێدەنگ کرابێت..

واته: ناگونجێ کەسێك هەبێت کە بە ئیختیار و ئازادیی تەواوەتیی خۆی کردەوەی خراپ ئەنجام بدات، مەگەر دوای ڕووخاندن و سووکایەتی کردن بە ویژدان و لایەنە مەعنەوی‌یەکانی خۆی.

هەر لەم سۆنگەیەوە ئایینی ئیسلام کەسی فاسق بە خائین دادەنێت و شایەتیی وەرناگرێت و، کەسی مورتەددیش لەناودەبات و خوێنی دەڕێژێت. کەچی ژیانی نەصرانیی زیممی و کافری پەیمان لەگەڵ بەستراو دەپارێزێت، هەروەك لای ڕێڕەوانی مەزهەبی "حەنەفی"ش شایەتیی ناموسڵمانی زیممی وەردەگیرێت.

* * *

## پیادەکردنی دادگەری

جێبەجێ کردنی "دادگەری" دەبێ بەناوی ئایینەوە بێت، تاکو هەریەك لە: ژیری و، دڵ و، گیان، بکەونە ژێر کاریگەریی ئەو دادگەری‌یە و لەخۆیاندا جێبەجێی بکەن. دەنا دادگەری تەنها لە "وەهم"دا کاریگەریی دەبێت، ئیتر جگە لە سزای دەوڵەت - گەر ئەو سزایە بێتەدی - لە هیچ شتێکی تر ناترسێت و، دوورەپەرێزیش تەنها لە سەرزەنشت و لۆمەی خەڵکی دەکات، لە حاڵێکدا گەر تاوانەکەی ئاشکرا ببێت.

* * *

## مافی ئیماندار بەسەر ئیماندارەوە

نابێ کەشتی‌یەك نغرۆ بکرێت ئەگەر تاوانبارێکی لەگەڵ چەندین بێ تاواندا تێدا بێت!

کەواتە دروست نی‌یە دوژمنایەتیی ئیماندارێك بکرێت لەسەر ئەوەی کە سیفەتێکی تاوانباری تێدا بێت، مادەم گەلێ سیفەتی تری بێ تاوانی هەبێت. نەخوازەڵا کە هۆکاری "خۆشەویستی" هێندەی چیای ئوحود مەزنە و، هۆکاری دوژمنایەتیش بە وێنەی وردە بەردی بێ نرخ و بەهایە.

جا هەروەك پێشخستن و فەزڵدانی وردە بەرد بەسەر "چیای ئوحود"دا ئەوپەڕی گێژی و گەلحۆییە.. دوژمنایەتیی ئیمانداریش بۆ برای ئیماندار، بە هەمان شێوە، بەڵگەی نەمانی دڵ و ویژدانە.

کەواتە دوژمنایەتی لە نێوان ئیمانداراندا دەبێ تەنها بە واتای بەزەیی پێدا هاتنەوە بێت، نەك شتی تر.

لەمەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە:

ئیمان داخوازی "خۆشەویستی"یە و..

ئیسلامیش خوازیاری "برایەتی"یە.

(گوفتار وەکو سامان وایە؛ نابێ ئیسرافی تێدا بکرێت).

سەعیدی نوورسی

## دەقی یەکەمجاری (وتاری شام)
## کە دانەر بە زمانی عەربی لەسەر دوانگەی مزگەوتی ئەمەوی لە دیمەشق پێشکەشی کردووە[1]

بسم الله الرحمن الرحيم

التحيات لله الذي قال:

﴿لا تَقْنَطُوا مِنْ رَحْمَةِ اللهِ﴾ (الزمر: ٥٣)..

والصلاة على محمد ﷺ الذي قال:

(جِئْتُ لأُتَمِّمَ مَكارِمَ الأخلاق).

پاشان..

ئەی برایانی عەرەب!

من بە نیازی ڕێنمایی کردنی ئێوە نەهاتوومەتە ئەم مەقامەی کە لە سەرووی سنووری خۆمەوەیە.

حاڵی من لەگەڵ ئێوەدا وەکو هی ئەو منالە وایە کە بەیانیان دەڕوات بۆ قوتابخانە و، ئێوارانیش دێتەوە هەرچی فێر بووە بۆ باوکی دەگێڕێتەوە. کەواتە ئێمەی کورد سەبارەت بە ئێوە وەکو ئەو منالە واین و، ئێوەش مامۆستای ئێمەن.

من لەم ڕۆژگارەمانەوە فێری ئەوە بووم کە شەش نەخۆشی هەن ئێمەیان لە سەدەکانی ناوەڕاستدا ڕاگرتووە، لە کاتێکدا کە بیانییەکان بەرەو داهاتوو هەڵفڕیون.

ئەو نەخۆشییانەش بریتین لە:

---

(١) ئەم دەقە عەرەبییەم لەبەر فۆتۆکۆپیی نوسخەیەکی دووهەم چاپی (وتاری شام) وەرگێڕاوە کە لە ئەستەمبوڵ ساڵی (١٩١٢ز) چاپکراوە و، بە خەتی دانەر هەڵەگیری و دەستکاریی تێدا کراوە. (وەرگێڕ)

ژیانی نائومێدی.. مردنی "ڕاستی".. حەزکردن بە دوژمنایەتی.. نەزانینی پەیوەندی‌یە نوورانی‌یەکان.. تەشەنە کردنی ئیستیبدادە جۆراوجۆرەکـان.. پەستاندنی هیممـەت لـە بەرژەوەندی‌یە کەسی‌یەکاندا.

وا "شەش وشە"تان پێشکەش دەکەم کە بە بناغەی چارەسەریان دەزانم.

## وشەی یەکەم: (هیوا)

لە لایەنی خۆمەوە مژدەی ئەوەتان دەدەمێ کە بەختەوەریی جیهانی ئیسلام بـە تایبـەت هی عەرەبەکان، کە بێداری و پێشکەوتنی جیهانی ئیسلامی بەندە بـە ڕابوون و بێداریـی ئـەوان، سپێدەی لـە ئاسۆدا دەرکـەوتووە و، بـە کوێرایـی چـاوی "نـائومێدی"ش نزیکـە خۆری بەختەوەری هەڵبێت.

وا من بە دەنگێکی ئەوتۆ کە هەموو گێتی ببیستێ، ڕایدەگەیەنم کە:

ئـاینده تەنـها بـۆ ئیسـلامە. بـەو بەشـە ڕازیـین کـە داهـاتوو بـۆ ئێمەیـە و، ڕابـوردووی ئالۆزیش بۆ خەڵکانی تر.

ئەمە دەعواکەمە و، گەلـێ بەڵگەشم لـەسەری هەیە. بەڵام تەنها بەڵگە و نیوێکیان لـێ باس دەکەم.

بەڵگەکەش چەند پێشەکی‌یەکی لەخۆ گرتووە، کە بریتی‌یە لەوەی:

ڕاستی‌یەکانی ئیسـلام بـەوە تایبەتمـەندن کـە بـە تـەواوی ئامـادەن بـۆ پێشـکەوتنی مەعنەوی و ماددی.

● لە ڕووی یەکەمەوە:

بزانن کە ئەو مێژووەی ڕاستگۆترین شایەتە لەسـەر ڕاسـتی، ئـەوەمان پیشـان دەدات، وەك کەسایەتی‌یەکی ژاپۆنی بە ڕاشکاوی دەری بڕیوە، کە:

(بە ڕێژەی توندوتۆڵـیی ڕاستی‌یەکانی ئیسـلام و پابـەند بوونـی موسـڵمانان پێیانـەوە، موسـڵمانان دەبنـە شارسـتانی. بـە ئـەندازەی لاواز بوونیشـی دووچـاری دواکـەوتن و ئالۆزی و پشێوی دەبن).

بەڵام ئایینەکانی تر بە پێچەوانەوەیە؛ هەتا شوێنکەوتووانیان لە ئایینەکەیاندا لاواز بن، پتر پێش دەکەون و، تا چـەندەش بـە توندوتۆڵـی پابـەند بـن بـە ئایینەکەیانـەوە، دووچـاری دواکەوتن و پشێوی دەبن! تا ئێستا هەر وا گوزەراوە!

هەروەها مێژوو، هەر لە چەرخی بەختەوەرییەوە هەتا ئێستا، موسڵمانێکمان پیشان نادات کە لە ئەنجامی داوەری و بەڵگەی ژیرییەوە ڕۆشتبێتە ناو ئایینێکی تری کۆن یان تازەوە و ئەوی پێ باش بووبێت. لێرەدا ئاور لە چاولێکەری نادرێتەوە و، کاری لە ئایین دەرچوونیش بابەتێکی ترە..

لە کاتێکدا کە شوێنکەوتەی ئایینەکانی تر - تەنانەت زۆر دەمارگیرەکانیشیان، چەشنی ڕووس و ئینگلیز - بە بەڵگەی بێ گومان ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ڕۆژ بە دەستە دەستە موسڵمان دەبن.

خۆ ئەگەر ئێمە ڕەوشتە بەرزەکانی ئیسلاممان پێش چاوی خەڵکی بخستایە، ئەوا بە چەندین پۆل و دەستەی زۆر دەهاتنە ناو ئایینی ئیسلامەوە.

هەروەها گرۆی ئادەمیزاد بە تایبەت گەر بەهۆی زانستە شارستانییەکانەوە بێدار بنەوە، ناتوانن بە بەربادی و بێ ئایین بژین، چونکە "خاڵی پشت پێ بەستن"ی مرۆڤ لە دەمی هێرشی دوژمنە دەرەکییەکان و گیروگرفتەکانی جیهاندا.. هەروەها "خاڵی یارمەتی لێ وەرگرتن" بۆ هێنانەدیی ئاواتە بێ سنوورە هەتا ئەبەد خایەنەکانی مرۆڤ.. تەنها لە "ناسینی بەدیهێنەر" و باوەڕکردنی ڕاست و دروستدایە بە "ئایینی ڕەوا" لەناخی دڵدا.

**پوختەی ئەم قسانە:**

مرۆڤ بێدار بووەتەوە و، لە کاکڵە و جەوهەری مرۆڤایەتی تێگەیشتووە و، پەیی بەوە بردووە کە "مرۆڤ" بۆ ژیانی هەتاهەتایی بەدی هێنراوە و، ئەم ژیانە بەرتەسك و فانییەی دنیا جێی هاتنەدیی هیوا و ئاواتە هەتا ئەبەد خایەنەکانی ئەوی تێدا نابێتەوە.

تەنانەت دنیا ناتوانێت یەکێك لە خزمەتگوزارانی ماهییەتی مرۆڤ و هەستەوەرەکەی (مەبەستم ئەندێشەیە) تێر بکات، بە ڕادەیەکی ئەوتۆ کە ئەگەر بە توانای "ئەندێشە" بوترێ:

"هەموو دنیا بۆ تۆ و یەك ملیۆن ساڵیش بژی، بەرامبەر بەوەی کە دوای ئەو ژیانە لەناوبچیت و هەتاهەتایە نەگەڕێیتەوە". ئەوا لە بریی دڵخۆش بوون، ئاخ و داخی خەفەت هەڵدەکێشێت بۆ لەدەستچوونی بەختەوەریی هەمیشەیی.

هەر تەنها ئەمەش هۆکاری سەرهەڵدانی حەزێکە لە ناخی هەموو مرۆڤێکدا بۆ گەڕان بە دوای ئایینی ڕاست و ڕەوادا. ‌بارودۆخی جیهان شایەتە لەسەر ئەم ڕاستی‌یە.

هەروەها سەرەتا و کۆتایی زۆرێك لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز مرۆڤ بۆ لای "ژیری" و "شوورا" هاودەم لەگەڵ "بیرکردنەوە"دا ڕەوانە دەکەن..

بڕوانن چۆن دەفەرموون:

**﴿فاعْلَمُوا..﴾.. ﴿فاعْلَمْ..﴾.. ﴿أَفَلا يَعْلَمُــــون﴾.. ﴿أَفَــلا يَعْقِلُــون﴾.. ﴿أَفَــلا يَنْظُرُون﴾.. ﴿أَفَــلا يَتَذَكَّــرُون..﴾.. ﴿أَفَــلا يَتَدَبَّــرُون..﴾.. ﴿فَــاعْتَبِرُوا يــا أُوْلِي الأَبْصار..﴾**.. هتد.

کەواتە ئێوەش ئەی مرۆڤە ژیرەکان! پەند وەربگرن.

**لەمانەی پێشەوە دەگەینە ئەوەی کە:**

ئێمەی موسڵمان شوێنی بەڵگە دەکەوین و، بە وێنەی شوێنکەوتەی ئایینەکانی تر نیین کە دەچن لەبەر چاولێکەریی ڕاهیبەکانیان دەستبەرداری بەڵگەکان دەبن!

هەروەها ئەو پەردەیەی کە خۆری ئیسلامی داپۆشیبوو، لادراوە و، لەمپەر و ڕێگرەکانیش خەریکە دەکشێنە دواوە.

بەڵێ، ئەو ڕێگرانەی کە نەیاندەهێشت ڕاستی‌یەکانی ئیسلام بە تەواوەتی بەسەر زەمانی "ڕابوردوو"دا زاڵ بێت، بریتین لە:

نەزانیی بیانی‌یەکان و، دوورییان لە شارستانێتی و، دەمارگیرییان. ئێستا بە هیممەتی زانست و شارستانێتی، ئەم ڕێگرانە نەمان..

هەروەها چاولێکەرییان بۆ قەشەکانیان و، سەرکردەیی و زاڵبوونی ئەو قەشانە بەسەریاندا. ئەم دوو ڕێگرەش بە بڵاوبوونەوەی بیری ئازادی و، حەز و ئارەزووی گەڕان بە دوای ڕاستیدا، نەمان..

هەروەها ئیستیبداد و بڵاوبوونەوەی ڕەوشتە نابەجێ‌کان لە ناوماندا، کە ئەنجامی گوێڕایەڵی نەکردنمانە بۆ شەریعەت. وا بە قوڵپدانی غیرەت و پەرۆشی میللی هێزی ئیستیبداد نەما و، لەرزەش بە ڕەوشتە نزمەکان کەوت..

هەروەها گومان بردنی ئەوەی کە ناسازی لـە نێوان چەند باس و بابەتێکی زانستی نوێ و هەندێ ڕواڵەتی ئیسلامدا هەبێت. ئەم ڕێگرەش بـە هیممەتی هـەندێ لێکۆڵـەری موسڵمان نەماوە و نامێنێت. خۆیشم کتێبێکم بۆ بەرپەرچی ئەو گومانە نووسیوە.

بـەڵێ، ئێستا زانسـت و شارسـتانێتی هـەر یـەك لـە: "مـەیلی گـەڕان بـە دوای ڕاستی‌یەکاندا" و "ویـژدان" و "خۆشویستنی مرۆڤایەتی"یـان بـە کەرەسـەی پێویسـت پڕچەك کردووە و، بۆ بەرەی جەنگی ئەم ڕێگرانەیان ناردوون و، پەرتەوازەیان دەکـەن و لەناویان دەبەن.

(والفضلُ ما شَهِدَتْ به الأعداءُ)..

ئـەوەتا "میستەر کـارلایل" کـە یەکێکـە لـە فەیلەسووفە ناودارەکـانی ئـەمریکا، لـە وتەیەکیدا، کە ئەمە واتاکەیەتی، بە دەنگی بەرز دەڵێت:

(ئایینی ئیسلام بە وێنەی بڵێسەی ئاگر هەموو ئایینەکانی تـری هەڵلووشـی کـە وەکـو پەلی وشکی دەرەختیان لـێ هـاتبوو، مـافی خۆیشـی بـوو کـە هـەڵیان بلووشێت، چونکـە ئایینەکانی تر بەرامبەر بە ئیسلام، کە ناوەرۆکی ئیسلامیان تێدا نی‌یە، وەکو نـەبوو وایـە. شایانترین گوفتار بۆ بیستن وتەکانی محەممەدە ﷺ. چونکـە تەنـها وتـەکانی ئـەو گوفتـاری ڕاستەقینەن. خۆ ئەگەر گومانت لە ڕاستی‌یەکانی ئیسلامدا هەیە، ئـەوا دەبـێ گومـان لـە هەموو شتێکی بێ گومان و بەڵگە نەویست بکەیت).

پوختەی قسە جیاجیاکانی تەواو بوو.

منیش بێ پەروا و بە پشت بەستن بەو ڕاستی‌یەی کە کێڵگـەکانی ئـەورووپا و ئـەمریکا هاوشێوەی "بسمارك" و ئەم چەشنە توێژەرەی بەرهەمهێناوە، بڕیار دەدەم و دەڵێم:

ئەورووپا سکی بە ئایینی ئیسلام پڕە و، ڕۆژێك دێت کە دەیبێت.

دەسا برایان! ئایا ئەو پێشەکی‌یانەی کە تا ئێستا لێیان دواین ئەوە بەرهەم ناهێنن کە: تەنها ئیسلام باڵادەست و فەرمانڕەوای لوتکە بڵندەکانی ئایندە دەبێت.

● **بەڵام لایەنی دووهەم، مەبەستم پێشکەوتنی ماددی‌یە:**

ئـەوا بزانـن کـە لـەناو دڵـی جیـهانی ئیسـلامیدا پێنـج هـێزی توندوتۆڵـی شکسـت نەخواردوو کۆبوونەتەوە و ئاوێتەی یەکتری بوون:

**□ هێزی یەكەم:**

بریتییە لە "ڕاستیی ئیسلام" كە مامۆستای هەموو ڕەفتار و ئاكارە تەواوەكانە و[1]، سێ سەد و سێ ملیۆن موسڵمانی بە وێنەی تاقە كەسێك یەكخستووە و، بە شارستانێتیی ڕاستەقینە و زانستە ڕاست و دروستەكان پڕچەك بووە.

**□ هێزی دووهەم:**

بریتییە لە "پێویستیی لە ڕادەبەدەر" كە مامۆستای شارستانێتی و ئەو پیشەسازییەشە كە بە هۆكار و بنەما تەواوەكان تەیار كراوە.. هەروەها بریتییە لەو "هەژاری"یەی كە پشتی ئێمەی شكاندووە.

**□ هێزی سێهەم:**

بریتییە لە "سەربەستیی شەرعی"ی ئاوێتە لەگەڵ مەیلی سەربەرزیدا. كە ئەوەش مامۆستای ئاكارە بەرزەكان و، لەناوبەری ئیستیبدادەكان و، وروژێنەری هەستە بڵندەكانە و.. بە ئیرەیی و، بەربەرەكانێ و، بێداریی تەواوەتی و، شەوقی پێشبڕكێ و، حەزی تازەگەری و، ئارەزووی بەدەستهێنانی شارستانێتی تەیار و پڕچەك كراون. لە كاتێكدا ئێمە لە نزمی و دواكەوتنێكی تەواودایین.

**□ هێزی چوارەم:**

"جوامێریی ئیمان"ە كە بە هەستی "سۆز و میهرەبانی" ساز و ئامادە كراوە.

واتە: ڕازی نابێت زەلیل و ڕسوای بەردەم ستەمكاران بێت و، كەسیش زەلیل بكات.

---

(١) تەنانەت من لە ئاماژەی مامۆستایی قورئانی پیرۆزەوە لە باسكردنی چیرۆكی موعجیزاتی پێغەمبەراندا - درووديان لەسەر بێت - كە بۆ پەند وەرگرتنە، ئەوە تێدەگەم كە قورئان پیشانی مرۆڤیان دەدات و پەنجە دەخاتە سەر هاوشێوەی ئەنجامی هەوڵ و كۆششی مرۆڤ بۆ پێشكەوتن لە داهاتوودا كە ئاوێنەی ڕابوردووە. وەك بڵێی قورئان دەستی خۆی بەسەر پشتی مرۆڤدا بهێنێت وپێی بڵێت: بە هۆكارەكانت هەوڵ بدە تاكو بگەیتە هاوشێوەی ئەم كارە نائاساییانە. وەك: ﴿غدوُها شهرٌ ورَواحُها شهر﴾ و ﴿وتبرئُ الأكمهَ والأبرصَ بإذني﴾ و ﴿فانفجرَتْ منه اثنتا عَشْرَةَ عيناً﴾ و ﴿يا نارُ كوني برداً وسلاماً﴾ و ﴿لولا أنْ رأى برهانَ ربه﴾ واتە وێنەی یەعقوب - درووودی لەسەر بێت - هەروەها هاوشێوەكانیان. هەروەها وتراوە كە "سەعات" و "كەشتی" یەكەم دیاریی دەستی موعجیزەی پێغەمبەرانن بۆ گرۆی مرۆڤ. (دانەر)

ئەم دوانەش بناغەی سەربەستیی شەرعین.

□ **هێزی پێنجەم:**

"سەربەرزیی ئیسلامی"یە، کە فەرمان بە بەرز ڕاگرتنی ئاڵای ئیسلام دەدات، کە ئەوەش لەم ڕۆژگارەدا بەندە بە پێشکەوتنی ماددی و ڕۆشتنە ناو گۆڕەپانی شارستانێتیی ڕاستەقینەوە، وەك ئەوەی کە لە ڕابوردوودا بە لەناوبردنی دەمارگیریی دوژمن و، شکاندنی سەرسەختی‌یەکەی، هاتەدی.

بزانن کە مەبەستم لە شارستانێتی: لایەنە جوان و سوودبەخشەکانیەتی بۆ ئادەمیزاد، نەك گوناهەکانی کە پێتان وایە لایەنە جوانەکانی بن.

بەڵێ، لەبەر ئەوەی شارستانێتیی بیانی‌یەکان لەسەر بنەمای چاکەکاری و ڕێگای ڕاست دانەمەزراوە، بەڵکو لەسەر بناغەی هەوا و هەوەس و ئارەزوو دامەزراوە، ئەوا لایەنە خراپەکانی بەسەر چاکەکانیدا زاڵ بووە و، وەکو درەختێکی لێ هاتووە کە بە کرمی ڕێکخراوە تۆقێنەرەکان پووکابێتەوە و دارزابێت. ئەم حاڵەش خولگەیەکە بۆ زاڵبوونی شارستانێتیی.

جا ئەگەر ڕێگامان بەرەو ئایندە ڕێگایەکی ئاوا تەختی وەك هێڵی شەمەندەفەر بێت، ئیتر چۆن دەبێ نائومێد ببین؟ چۆن پێتان وایە کە دنیا بۆ هەموو خەڵکانی جیهان، بەهۆی مەیلی بەرەو کەماڵ ڕۆشتنیان، خانەی پێشکەوتنە و، تەنها بۆ ئێمە خانە و لانەی شۆڕبوونەوە و دواکەوتنە؟

فەرموون سەیری "کات" بکەن.. ئەوەتا بەسەر ڕاستەهێڵدا ناڕوات هەتا سەرەتا و کۆتاییەکەی لە یەکتر دوور بکەونەوە، بەڵکو بە جووڵەیەکی بازنەیی لەناوەندی پێشکەوتنێکی بەرەوسەرروودا دەخولێتەوە؛ ئەوەتا لە دوای هەموو زستانێك بەهار دێت و، دوای هەموو شەوێکیش ڕۆژ دەبێتەوە.

○ "نیو بەڵگە"کەش ئەمەیە:

بە پشکنینی تەواوەتی و لە ڕێی هەواڵگەیەنەری زانستەکانەوە سەلماوە کە:

خێر و، جوانی و، تەواوی، بە جۆرێکی ڕەها لە سیستەمی گەردووندا زاڵن و، هەر ئەوانیش ئامانج و مەبەستی بەدیهێنەرن، بە بەڵگەی ئەوەی کە هەموو یەکێك لەو

زانستانەی کە پەیوەندییان بە گەردوونەوە هەیە، لە ڕێی یاسا و دەستوورە گشتی‌یەکانیانەوە، ڕێکوپێکی و ڕێسایەك دەر دەخەن کە هەرگیز بۆچوونی "ژیری" لەوە تەواوتر شك نابات.

هەروەها بەدواداگەڕانی تەواوەتی ئەوەی بە دەستەوە دا کە:

شەڕ و، ناشیرینی و، ناڕەوایی، چەند شتێکی جوزئی و پاشکۆ و داپۆشراون لەناو بەدیهاتووەاندا.

هەروەهاسەلماوە کە:

"مرۆڤ" بەڕێزترینی بەدیهاتووانە، بە بەڵگەی ئەوەی کە زنجیرەی هۆکارە یەك لە دوای یەکەکانی بەدیهێنانی بوونەوەرانی دەرخستووە و، بە سنعەتەکەشی لاسایی بەدیهێنانە پەروەردگاری‌یەکانی کردووەتەوە.

هەروەها سەلماوە کە:

موسڵمانان بەڕێزترینی نەوەکانی مرۆڤن و، شوێنکەوتەی حەق و ڕاستین..

هەروەها گەورەترینی هەموویان محەممەدی سەروەرە ﷺ، بە شایەتیی موعجیزە و ڕەوشتە بەرزەکانی.

جا ئەگەر ئەمە وابێت، ئایا بەدبەختیی ڕەگەزی مرۆڤ دەتوانێ شایەتیی سەرجەمی ئەو هەموو زانستانە زامدار بکات و، ئەم لێکۆلینەوە و بەدواداگەڕانە تەواوە هەڵبووەشێنێتەوە و، لە ڕووی ویستی خوای گەورە و دانستی ئەزەلیدا هەڵبگەڕێتەوە؟

سوێند بەو خوایەی کە ئەم جیهانەی لەم سیستەمە هەرە تەواوەدا بەدی هێناوە، ئادەمیزاد ڕەفتاری پێچەوانەی برایانی تری لە بەشەکانی بەدیهاتووان پێ هەرس ناکرێت، کە هەزاران ساڵ لەناو گرۆی ئادەمیزاددا "شەڕ" بەسەر "خێر"دا زاڵ ببێت، مەگەر ئەو مرۆڤەی کە هەڵگری پلەی "جێنشین"ە بە مشەخۆرێك دابنرێت لەم جیهانەدا!

ئەم نیو بەڵگەیە ئەو دەرەنجامە بە دەستەوە دەدات کە:

لە ئایندەدا تەنها "خێر" و "ئایینی ڕاست" زاڵی ڕەها دەبێت کە چاکە و ڕەوشت بەرزیی لەخۆگرتووە. بە ڕادەیەکی وا کە مرۆڤ و برایانی تری بوونەوەرانی لە لایەنەکانی چاکەدا یەکسان دەبنەوە، تا ئەو ڕادەیەی کە بوترێ:

نهێنیی دانستی ئەزەلیی خوای گەورە لە ڕەگەزی مرۆڤدا هاتووەتەدی.

## وشەی دووەم: (نائومێدی دەردێکی کوشندەیە)

بەرهەمێکی ئەزموونەکانم ئەوەیە کە:

"نائومێدی" سەخت ترین دەردە کە موسڵمانانی پێوە گیرۆدە بووە و، هەر ئەویشە ئێمەی لەناوداوە و ڕەوشتە بەرزەکانی لە ئێمەدا مراندووە.

تەنانەت کەسی وا هەیە بەهۆی سستی و کەمتەرخەمیی خەڵکانی ترەوە دووچاری سستی و نائومێدی دەبێت و، پێی وایە کەمتەرخەمیی کەسانی تر دەبێتە بەهانە و پاساو بۆ کەمتەرخەمیی خۆی.

دەسا با تۆڵەی خۆمان لە بکوژەکەمان کە "نائومێدی"یە بسێنینەوە و، بە شمشێری: ﴿لا تَقْنَطُوا..﴾ (الزمر: ٥٣) لە گەردنی بدەین و، بە: (ما لا يُدْرَكُ كُلُّه لا يُتْرَكُ كُلُّه)یش پشتی بشکێنین.

بەڵێ، "نائومێدی" شێرپەنجەیە کە نەتەوەکان دووچاری دەبن..

بەڵێ، "نائومێدی" ڕێگرە لە گەیشتنی مرۆڤ بە ئامانجە تەواوەکان و، پێچەوانەی: (أنا عندَ ظَنِّ عبدي بي) و، کاری کەسانی دەستەوسانە و.. هەرگیز ئەو نائومێدییەی کە لە "دەستەوسانی"یەوە سەرهەڵدەدات لە شان و شکۆی جوامێریی موسڵمانان ناوەشێتەوە، بەتایبەت عەرەبەکان کە بە چەند ڕەوشتێکی هێندە جوان تایبەتمەندن مایەی شانازییانە.

بەڵێ، لەو گومانەدا بووین کە ئێمە تزمین، ئیتر نزم بووینەوە!

## وشەی سێهەم: (ڕاستی بناغەی ئیسلامە)

پوختەی لێکۆڵینەوەکانم تێیگەیاندم کە:

"ڕاستی"(الصدق) بنچینەی تۆکمەی بناغەکانی ئیسلامە و، پەیوەندیدەری نێوان ڕەوشتە بڵندەکانی و، ئاوێتەی ناو هەست و نەستە بەرزەکانیەتی.

دەسا ئەو شتە زیندوو بکەنەوە کە مایەی ژیانمانە و، نەخۆشیەکانیشی پێ تیمار و چارەسەر بکەن.

بەڵێ، "ڕاستی" پەیوەندیدەری ژیانی موسڵمانانە. بەڵام "مەرایی" جۆرێکی درۆیە کە بە کردار ئەنجام دەدرێت.. "دوو ڕوویی" جۆرێکی تری درۆیە.. خودی "درۆ"ش بوختانە بە دەم توانستی کردگاری شکۆمەندەوە..

"کوفر" بریتی‌یە لە "درۆ"..

کەچی "ئیمان" بریتی‌یە لە "ڕاستی"..

کەواتە هێندەی دووریی نێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوا و، جیاوازیی نێوان ئاگر و ڕووناکی، ماوەی نێوان ڕاست و درۆش بەرین و فراوانە و، بە چەندین قۆناغ لەیەکەوە دوورن.

لە درێژەی ئەمەدا سەرنجێکتان لە زانستی فەرموودەوە بۆ باس دەکەم، کە بریتی‌یە لەوەی:

ڕیوایەتی هاوەڵە بەڕێزەکان پێویستی بە تەزکیە نی‌یە، چونکە هەموویان "دادگەر"ن و دادگەریان جێی دڵنیاییە. بە پێچەوانەی خەڵکی سەردەمەکانی تر کە پێویستیان بە تەزکیە هەیە.

نهێنیی ئەم حیکمەتە ئەوەیە کە:

لەبەر ئەوەی "ڕاستی" لە سەردەمی بەختەوەریدا هەموو چاکەیەکی خستە پێش چاوەکان و، پلەشی لە "درۆ" دوور کەوتەوە و، ئاڵوگۆڕێکی سەرسووڕهێنەری خستە ناو جیهانەوە، ئیتر بەهۆی "ڕاستی"یەوە حەزرەتی محەممەد ﷺ لەو سەردەمەدا بەرەو پلە هەرە بەرزەکان بەرزبووەوە، ئەوا "ڕاستی" لە بازاڕی جیهانی ئەو ڕۆژگارەدا بە وێنەی "ئازادی" لەم ڕۆژگارەدا برەوی پەیدا کرد..

ئنجا هەر لەو سەردەمەدا "درۆ" ئەوپەڕی ناشیرینیی خۆی و دووریی لەڕادەبەدەری لە "ڕاستی"یەوە دەرخست، بە ڕادەیەك کە هاوشێوەکانی موسەیلەمەی درۆزن بەهۆی "درۆ"وە دابەزینە خوارەوە بۆ ناو بنکی نزمایی‌یەکان، ئیتر بە وێنەی ئەوەی کە "جاسووسی" لەم ڕۆژەدا برەوی نەماوە، بازاڕی درۆش لەو ڕۆژگارەدا برەوی نەما و کەسێکی دەست نەکەوت کڕیاری بێت.

بەو جۆرە، نێوانی "ڕاست" و "درۆ" ماوە و مەیدانێکی فراوانی تێکەوت. ئیتر گەوهەری "ڕاستی" برەوی پەیدا کرد و، کەرەسەی لەخۆبایی "درۆ"ش دووچاری بێ بازاڕی بوو.

کاتێ کە ئەو ئاڵوگۆڕە مەزنە ڕووی دا، ئەو عەرەبانەی کە مەیلی ئاکارە بەرزەکان لە فیترەتیاندایە و، سروشتیان وایە کە لە هەر شتێکدا ئەوە دەستی خۆیان دەخەن برەوی هەبێت و، حەزیان لە پەیداکردنی ئەو شتانەیە کە مایەی شانازی بێت، بە پەلە ڕۆشتن کەرەسەی "ڕاستی"یان کڕی و بە "حەق"یش خۆیان ڕازاندەوە. ئیتر ئاڵاکانی شایەتیدانیان لەسەر دادگەریی هاوەڵان هەڵکرد.

پاشان بە تێپەڕبوونی کات ماوەی نێوان "ڕاست و درۆ" تەسك بووە و هێندەی پەنجەیەکی مایەوە. تەنانەت وای لێ هات کە پیاو گوێ ناداتە ئەوەی ڕاست دەڵێت یان درۆ! بارودۆخەکان وەها شێواوە کە خۆتان بە چاوی پەژارەوە دەیبینن. خۆ ئەگەر بە وردی سەرنج بدەن دەبینن پیاوانی سیاسەت بۆ ئەوەی زیانی درۆ بگێڕنە دواوە چۆن ناچار بوون چەند کارمەندیەك دابمەزرێنن کە لەوانەیە بە شێوەیەکی زنجیرەیی درێژە بکێشێت.

دەسا برایان! تاقانە ڕێی ڕزگاری "ڕاستی"یە.. چونکە هەر "ڕاستی" دەستاوێزێکی مەحکەم و قایمە..

"درۆی مەسڵەحەت"یش ڕۆژگار هەڵی وەشاندەوە.

چونکە "مەسڵەحەت" بە وێنەی "مەشەققەت" وایە لە سەفەردا؛ سنوورێك نییە دەستنیشانی بکات، هەتا عیللەتی حوکمی لەسەر دابمەزرێت.

کەواتە یان "ڕاستی".. یان "بێ دەنگی"!

## وشەی چوارەم: (خۆشەویستی)

مەبەستم ئەوەیە کە یەکێك لەو شتانەی لێکۆڵینەوەکانم داویانە بە دەستمەوە، ئەوەیە کە:

شایستەترین شت بۆ خۆشەویستی "خۆشەویستی"یە و.. شایانترین سیفەتیش بۆ دوژمنایەتی "دوژمنایەتی"یە!

جا ئەگەر ویستتان دوژمنایەتیی شتێك بکەن فەرموون هی "دوژمنایەتی" بکەن، چونکە دوژمنی غەددار هەر ئەوە.

سەردەمی دوژمنایەتی و ڕقەبەرایەتی کۆتایی پێ هات. تەنانەت هیچ سوودێکی تێدا نییە.

کەواتە بەوە لەخشتە نەچن کە دەروونتان پێتان بلێت:

دوژمنایەتیمان بەرامبەر خراپکاریی دوژمنەکانمانە.

نەخێر.. بەڵکو هی لەخۆبایی بوون و خۆویستیتانە.

چونکە بێ ئەوەش بە خۆتان بزانن و بە خووی دوژمنایەتی، دەچن هۆکارەکانی خۆشەویستی کە لەچاو هۆکارەکانی دوژمنایەتیدا ئەوەندە گەورەن کە هێندەی چیا گەردن کەشەکان دەبن، دادەگرنە خوار و بە سووکی و کەمی بۆی دەڕوانن.

"خۆشەویستی" و "دوژمنایەتی" بە وێنەی تاریکی و ڕووناکی وان؛ هەرگیز پێکەوە کۆنابنەوە..

جا یان ئەوەیە "خۆشەویستی" زاڵ دەبێت، ئەوا ئەو کاتە دوژمنایەتییەکە دەگۆڕێت بە سۆز و بەزەیی و ئازارچەشتن.

یان "دوژمنایەتی" زاڵ دەبێت، ئەو کاتە "خۆشەویستی"یەکە دەگۆڕێت بە خۆگونجاندن و هاوڕێیەتیی ڕواڵەتی.

هۆکارەکانی "خۆشەویستی" بریتین لە ئیمان و ئیسلام و هاوڕەگەزایەتی و مرۆڤایەتی، کە لە چیاکان قورسترن.

هۆکاری "دوژمنایەتی"ش هەندێ خراپەی تایبەتییە کە بە وێنەی خانۆچکەکان وایە.

جا هەر کەسێك دوژمنایەتی لە سروشتیدا بەرامبەر موسڵمان زاڵ ببێت، وەکو ئەو کەسە وایە کە گاڵتە بە چیای ئوحود بکات و بڵێ لە بەردە وردەیەك بچووکترە.

بە پوختی:

"خۆشەویستی" ئاوێتەی موسڵمانێتییە.

پێم وایە ئەو چەشنە دوژمنایەتی‌یە وەکو کاری منالێك وایە کە میزاجی نارێك بێت و بیبەوێت بگری.. ئیتر بۆ بیانوویەك بگەڕێ تاکو بیکاتە بەهانەی گریانێکی دەستکردا

ئایا کاتێ کە بواری گومانی خراپتان لە بەردەمدایە بۆچی گومانی باش نابەن!

## وشەی پێنجەم:

یەکێك لەو وانانەی کە لە شوورای شەرعی‌یەوە فێری بووین، ئەوەیە کە:

خراپەی تاکە کەس لەم رۆژگارەدا تەنـها یـەك دانـە خراپـە نی‌یـە، بـەڵکو لەوانەیـە لـە هەزاران زیاتر بێت.

هەروەها یەك دانە کردەوەی چاکیش بەو یەك دانە چاکەیە نامێنێتەوە، بەڵکو لەوانەیە زیاد ببێت هەتا لە هەزاران چاکە تێپەڕ دەکات.

نهێنیی ئەمەش لەوەدایە کە "شوورا" سەروەریی میللەتی دەرخست.

میللییەتی ئێمەش خشـتەیەکی تۆکمـە و توندوتۆڵـە و، ئاوێتەیەکە لـە ئیسـلامییەت و عوسمانی‌یـەت و ڕەگـەز و میللییـەت پێکـهاتووە و لەپکـەی ئیسـلامییەتە و، پەیوەسـتێکی ئەوتۆیە کە سەرجەمی موسڵمانان بە وێنەی یەك دانە "هۆز" لـێ دەکات کـە پـەیوەندییان بە یەکترەوە هەیە و پشتی یەکتری دەگرن. وەکو ئەوە وان کە بـە زنجیرێکی نوورانی‌یـەوە پەیوەست بن.

جا بە وێنەی ئەوەی کـە تاکـە کەسێك لـە هۆزێکـدا گـەر تـاوانێکی ئەنجام دابێـت، هەموو کەسانی ئەو هۆزە بە لای هۆزەکەی ترەوە بە تاوانبار دادەنرێن، وەك بڵێی یەك بـە یەکیان تاوانەکەی کردبێت..

هەروەها گەر کەسێکیان کردەوەیەکی چاکی لەسەر دەست ڕوو بدات، ئەوا یەك بە یەکی کەسانی ئەو هۆزە شانازیی پێوە دەکەن، وەك بڵێی هەموو یەکێکیان ئەو چاکەیەی ئەنجام دابێت..

بە هەمان جۆر، لەم سەردەم و ڕۆژگارەی خۆماندا خراپەی مرۆڤی خراپکار تەنها لە خۆیدا نامێنێتەوە، بەڵکو سنووری مافی ملیۆنەها کەس دەبەزێنێت.

بیانوو بەوە مەهێننەوە کە بڵێن:

(ئێمە زیانمان بۆ کەس نییە و، ناشتوانین سوودمان بۆ کەسێك هەبێت)!

نەخێر.. چونکە تەمبەڵی و دوورەپەرێزیتان، خۆی بۆ خۆی زیانێکی یەکجار گەورەیە.

بە هەمان جۆر سوودی یەك دانە کردەوەی چاکیش تەنها بۆ ئەنجامدەرەکەی ناگەڕێتەوە، بەڵکو پەرە دەسێنێت هەتا ملیۆنەها کەس دەگرێتەوە و، دەبێتە هۆی پتەوکردنی پەیوەندیی نێوان ژیانی ئەوان.

برایان!

وا گومان نەبەن کە من بۆ ئەوە هاتوومەتە سەر ئەم مینبەرە تاکو ڕێنمایی و ئامۆژگاریتان بکەم. نەخێر..

بەڵکو بۆ ئەوە هاتووم کە داوای مافێکی خۆمانتان لێ بکەم بەسەرتانەوە. چونکە بەرژەوەندییەکانی ئێمە پەیوەستە بە ئێوەوە و، تەمبەڵی و ساردوسڕیی ئێوەش زیان بە ئێمە دەگەیەنێت.

ئەم وتەیەشم بە تایبەتی ئاراستەی ئێوە دەکەم ئەی عەرەبەکان! چونکە ئێوە مامۆستا و پێشەوا و پارێزگاری ئێمە بوون.

گوناهی ئێوە یەکجار گەورەیە و، کردەوەی چاکیشتان گەلێ بەرز و بڵندە!

برایانی بەڕێزم!

تکایە وا گومان مەبەن کە من بەم قسانەم بمەوێت هانی هیممەتی ئێوە بدەم بۆ خەریك بوون بە سیاسەتەوە! نەخێر..

چونکە ئێوە ئەو خەتە وردانە ناخوێننەوە کە لە پەراوێزی سیاسەتدا نووسراون.

من کۆمەڵگا لە شێوەی کارگەیەکی پێکهاتوو لە چەندین چەرخ و ئامێری هاوپەیوەندیدا وێنا دەکەم کە ئەگەر چەرخێك لەوانە سستی لە کارەکەیدا بکات، یان سنووری پێچکە و چەرخەکەی تەنیشتی ببەزێنێت، ئەوا میکانیزمی ئەو مەکینەیە تێکدەچێت.

لەگەڵ ئەمەشدا، بەوپەڕی داخ و پەژارەوە دەڵێم:

بیانی‌یەکان هەروەك بە نرخێکی کەم سامانی بەنرخیان لە دەست دەرهێناین، بە هەمان جۆر ڕەوشتە بەرزەکانی ئێمەشیان، لەوانەی کە لە کانگای ئایینی ڕاست و ڕەواوە پەیدا بووبوون بە تالآنی برد و، لە بەرامبەریەوە ڕەوشت و خووە خراپەکانی خۆیان خستە نێوانمانەوە!

بۆ نموونە:

مرۆڤێکی ئەوان دەڵێت:

"ئەگەر من مردم، یاخوا نەتەوەکەم هەر بژی. چونکە بە ژیانی ئەو منیش ژیانێکی نەبڕاوەم دەبێت".

ئەم وتەیە لە بنچینەدا هی ئێمەیە و لە ئایینی ڕاستەقینەوە سەرچاوەی گرتووە. هەروەك بناغەیەکی توندوتۆڵی پێشکەوتنیانە، لە ئێمەیان زەوت کردووە..

کەچی لەناو ئێمەشدا کەسی وا هەیە دەڵێت:

(ئەگەر من بە تینوویی مردم، یاخوا دڵۆپێك باران نەبارێت)!

یان دەڵێت:

(ئەگەر خۆم نابینا بم، دنیا چۆن دەبێت با ببێت)!

ئەم وتە گەوجانەیەی کە لە نەبوونی ئایین و، باوەڕ نەبوونەوە بە دوارۆژ سەرچاوەی گرتووە، لە دەرەوە هاتووەتە ناومان.

هەروەها بەهۆی بیری نەتەوەییەوە هەموو یەکێکی ئەوان وەکو نەتەوەیەکی لێ دێت، چونکە نرخ و بەهای هەر کەسێك بە ڕێژەی هیممەتەکەیەتی؛ جا ئەگەر هیممەتی هەر کەسێك نەتەوەکەی بێت، ئەوا ئەو کەسە لەخۆیدا نەتەوەیەکی سەربەخۆیە!

ئنجا لەبەر ئەوەی هەندێ کەس لە ئێمە بە کورتی دەڕوانێت، هەرچەندەش توانا و لێهاتنی گەورەمان تێدایە، ئەوا هەندێ جار هەزار کەسی ئێمە لە جێی یەك دانە کەسدایە!

هەر کەسێك هیممەتی تەنها بۆ خۆی بخاتە کار، مرۆڤ نی‌یە. چونکە مرۆڤ بە سروشت شارستانی‌یە و پەیوەستە بە کۆمەڵەوە!

## وشەی شەشەم:

کلیلی بەختەوەریی موسڵمانان بریتی‌یە لە ڕاوێژ (شوورا).

لەبارەی ڕاستی و ناوەرۆکی ڕاوێژەوە کتێبێکم داناوە. هەرکەس دەیەوێت با بگەڕێتەوە بۆ ئەو کتێبە.

دەرخەری بەختی ئاسیا و، کلیلیی کردنەوەی کۆت و زنجیری ئیستیبدادە جۆراوجۆرەکان لە پێی سێ سەد ملیۆن موسڵمان تەنها ئەو ئازادی‌یەیە کە لە مەردایەتی و سۆزی ئیمانەوە هەڵقوڵابێت و بە ئادابی شەرعی ڕازابێتەوە.

مەبەستم ئەوەیە کە:

موسڵمان زەلیل نەکرێت و خۆیشی خۆی زەلیل نەکات، چونکە ئەو کەسەی بەندەی خوای گەورە بێت هەرگیز نابێتە بەندەی کۆیلەکان.

هەروەها هەندێکتان هەندێکی ترتان، لە بریی خوا، نەکات بە چەند پەروەردگارێك بەسەر خۆیەوە.

بەڵێ، "سەربەستی" بەخششێکی میهرەبانیی خوایە و، تایبەتمەندی‌یەکی ئیمانە.

دەسا با هەر بژی "ڕاستگۆیی" و.. نەژی "نائومێدی"..

بەردەوام بێت "خۆشەویستی" و.. بەهێز بێت "شوورا".

گلەیی لە شوێنکەوتووانی هەوا و ئارەزوو..

سڵاویش لە ڕێڕەوانی ڕێی هیدایەت.

بەرهەمی پێنجەم:

# وتارەکان

بەدیعوززەمان

## سەعیدی نوورسی

داینـاوە

## فارووق ڕەسووڵ یەحیا

کردوویە بە کوردی

# پێشەکی یەك

## بۆ ئەم کۆمەڵە وتارە

به ناوی خوای گەورە و میهرەبان

ئەم بەشەی بەرهەمەکانی مامۆستا نوورسی دەگەڕێتەوە بۆ قۆناغی "سەعیدی کـۆن". ئەوانەش دوو دانەیان نەبێت کە لـە سـاڵی (١٩٢٠ز)دا بلاوبوونەتـەوە، ئەوانی دیکـە لـە ســاڵانی (١٩٠٨ و ١٩٠٩ز)دا، یــان بــە نووســین لــە ڕۆژنامــەکانی ئــەو دەمــەی ئەستەمبووڵدا بـلاوی کردوونەتـەوە، یـاخود وەك بێژەوتـار (خطبــة) کـە خـۆی نـاوی (نُطق)ی لـێ ناون، ئاراستەی گوێ بیستانی کردووە.

مامۆستا سەعیدی نوورسی لەو کاتەوە کە ساڵێك پێش ڕاگەیاندنی "مەشرووتییەت" (دەستوور) ڕۆشتووەتە ئەستەمبووڵ و چـاوی بەسـەر دەوروبـەردا کراوەتـەوە، هـەتا ئـەو کاتـەی گەڕاوەتـەوە بـۆ کوردسـتان لـە سـاڵی (١٩١١ز)دا هـەموو هـەل و دەرفـەتێکی قۆزیوەتەوە بۆ هێنانەدیی ئەو ئامانجانەی کە لە پێناویدا ئەو سەفەرەی کردووە، کە بریتی بووە لە:

یەکەم: کردنەوەی قوتابخانە بە زمانی کوردی لە شار و شارۆچکەکانی کوردستان و ناوەندی هۆزە کوردەکاندا.

دووهەم: کردنەوەی زانکۆی مۆدێرن لە شارە گەورەکانی کوردستاندا کە بە وێنەی زانکۆی ئەزهەر زانستی نوێ و زانستە ئایینییەکانی تێدا بخوێنرێت و، ببێتـە مەڵبـەندێکی ڕووناککردنەوەی زانستی لە کوردستان و وڵاتانی دراوسێیدا.

سێهەم: هـەوڵی چڕوپڕ بـۆ یەکخستنی ڕیزەکـانی گـەلی کـورد و ڕزگـارکردنی لـە دەردی دووبەرەکی و ناکۆکیی نێوان هۆز و تیرەکان.

لە پێناوی ئەم ئامانجانەشدا هەموو ڕێگایەکی گونجاوی گرتووەتەبەر.

یەکێك لەو ڕێگایانە: دیدار و چاوپێکەوتنی بووە لەگەڵ هەندێ لە بەرپرسان و، ڕوونکردنەوەی ئەو ئامانجانەی کە لە پێناویدا هاتووە.

هۆکارێکی تر: سەرنج ڕاکێشانی نوخبەی کاربەدەستانی دەوڵەت و نوخبەی ڕۆشنبیرانیش بووە، لە ڕێی زیرەکی و زانایی و وریایی و بێ نیازیی خۆیەوە، بەڵای ئەوەدا کە ئەم کەسێکی ئاسایی نییە و، زۆر بە پەرۆشە بۆ پێشخستنی وڵاتەکەی. ئەوەتا ئەگەر هەموو دنیاشی بدەنێ بۆ خۆی نایەوێت، بەڵکو ئامانجی تەنها ئەو خاڵە ناوبراوانەیە، بە بێ منەی هیچ دەسکەوتێکی کەسی بۆ خۆی، لەوانەی کە خەڵکانی تر لە هەموو ڕێیەکەوە ڕەنجی فەرهادانەی بۆ دەدەن!

هۆکارێکی تر، بەڵکو گرنگترینیان، ئاراستەکردن و بڵاوکردنەوەی ئەم وتارانە بووە کە لەم کتێبەدا خوێنەری بەڕێز دەیانخوێنێتەوە.

ئەم تەقالا جۆربەجۆر و وتارە یەك لە دوای یەکانە، چەندە بۆ زانینی بەسەرهاتەکانی ئەو قۆناغەی ژیانی مامۆستا بەدیعوززەمان گرنگن، پتر لەوەش دارای بایەخ و گرنگین بۆ مێژووی کاروانی ڕۆشنبیری و خەباتی زانستییانەی شێرە کوردانی ئەو دەمە، کە وەکو سەربازی گومناو ڕۆژ و شەویان خستبووە سەریەك بۆ بەرەوپێش بردنی گەلەکەیان لەو قۆناغە دواکەوتووەدا کە لە لایەکەوە دەوڵەت و، لە لایەکی دیکەوە نەزانی و هەژاری و ناکۆکیی ناوخۆ بە دەردە کوشندەکانی بردبوون.

لەو بڕوایەدام کە ئەگەر هەر توێژەرێکی بێ لایەن، دوور لە بڕیار و کاردانەوەی پێش وەخت، بە ویژدانەوە بۆ دەستنیشان کردنی پلەی مامۆستا نوورسی لە نێوان ئەو مەردە دڵسۆزانەدا هەڵسەنگاندن و لێکۆڵینەوە بکات، دەگاتە ئەو دەرەنجامەی کە بەدیعوززەمان لە پێشەنگی هەموویانەوە دێت، لەو ڕووەوە کە:

یەکەم: داواکارییەکانی بناغەیەکی توندوتۆڵ و بڕبڕە پشتەی پێشکەوتنی گەلی کوردە لە سەرجەم بوارەکاندا و، دووربینییەکی یەکجار دانایانەی تێدا ڕەچاو کراوە بۆ داهاتوو، کە ئەستەمە کەسانێك تەنها ئامانجی سیاسیی هەنووکەییان هەبێت بەو جۆرە بیرکردنەوە بین درێژە داهاتوو بینە ڕەنجی بۆ بکێشن!

دووهەم: نەك هەر لەو پێناوەدا سڵی لە مردن نەکردووەتەوە، بەڵکو بێ هیچ ئاوڕدانەوەیەك لە ژیانی شیرینی دنیا، بە پێشوازیی مردنەوە ڕۆشتووە، کەچی مردن لە دەستی ئەو هەڵهاتووە!

سێهەم: تاقانە كەسێكە هیچ جۆرە ئامانجێكی گەورە یان بچووك، دنیایی یان قیامەتیی، لە هیچ تەقالا و خەباتێكیدا و لە ژێر هیچ ناوێكدا بۆ خۆی نەویستبێت! ئەمەشی وەنەبێ تەنها بە یەكدوو هەڵوێست پێش چاو خستبێت، بەڵكو بە سەرجەم ڕووداوەكانی ژیانی بۆ دوور و نزیكی سەلماندووە!

* * *

وەك پێشتر وتمان، بەشێكی ئەم وتارانە لە شێوەی خوتبەدا ئاراستەی كردوون. ئەمانە لە لایەن خوالێخۆشبوو "ئەحمەد ڕامیز ئەفەندی"ی خاوەنی كتێبخانەی (ئیجتیهاد)ەوە كۆكراوەتەوە و بە ناوی (نُطق) ساڵی (١٩١٢ز) چاپ كراوە. من نوسخەیەكی فۆتۆكۆپیی ئەو چاپەم لە لایە، وێڕای كتێبی (آثار بدیعیە)ش كە ئەو بەرهەمەی لەخۆ گرتووە.

ئەم جۆرە وتارەم كردە بەشی یەكەمی وتارەكان و، ناوی (بێژە وتارەكان)م لێ نا، بە مەبەستی جیاكردنەوەی لە بەشی دووهەم كە ناوی (نووسینە وتارەكان)م لێ نا و، مەبەستیشم وتارە بڵاوكراوەكانیەتی لە ڕۆژنامەكاندا. خۆ ئەگەر لەم ناونانەدا بە هەڵەدا چووبم، هیوادارم خوێنەری بەڕێز ڕێنماییمان بكات بۆ ناولێنانی باشتر.

سەبارەت بە بەشی یەكەم (بێژە وتارەكان) بە دووری نازانم - وەك لە سیاقی هەندێكیانەوە هەستی پێ دەكرێت - كە لە پێشدا وەك خوتبە و دواتریش وەك وتاری بڵاوكراوە لە ڕۆژنامەكاندا بڵاوی كردبنەوە. هەروەك هەندێكی دیكەشیان پێدەچێ هەر وتاری ناو ڕۆژنامە بووبێتن، یان بۆ بڵاوكردنەوە ئامادەی كردبن، بەڵام لە ناوەندی ئەو خوتبانەدا لە چاپی دابن. بە هەر حاڵ ئەم گریمانانە لەسەر پشتن بۆ لێدوان و لێكۆڵینەوەی دامەزراو لەسەر بەڵگە.

ئەم بەشە لە (حەوت) وتار پێكهاتووە. بەڵام تەنها یەكەمیان كە بریتییە لە (وتارێك بۆ سەربەستی) دانەر لە دوا ساڵەكانی تەمەنیدا بایەخی پێداوە و بە هەندێ دەستكارییەوە جەختی لەسەر كردووەتەوە. هەر لەبەر ئەوەش بووە كە تەنها ئەو دانەیان تەرجەمە كراوە بۆ زمانی عەرەبی.

سەبارەت بەم وتارەیان، یەکەمجار لە عەرەبییەکەوە کردم بە کوردی، دواتر هاوکاری لاوم کاك دکتۆر دیدار کامەران لەگەڵ دەقە کۆنە تورکییەکەدا بەرامبەری کرد و، بڕگە لابراوەکانی وەرگێڕا، منیش وەك داڕشتن بە تەرجەمەکەیدا ڕۆشتمەوە.

بەڵام هیچ کام لە شەش وتارەکەی ترم بە زمانی عەرەبی چنگ نەکەوت. بۆیە ئەو ئەرکەم بە کاك دکتۆر محەممەد خالید سپارد کە ناوەڕۆکەکەیانم بۆ بکات بە کوردی. ئەویش، ماڵی ئاوەدان بێت، ڕەنجێکی زۆری لەگەڵدا کێشا. منیش سەر لەنوێ و دوای تێگەیشتن لە مەبەستەکەی مامۆستا نوورسی، ڕۆحی گشتیی پەیامەکانم کردە ڕابەرم و بە شێوە داڕشتنی خۆم سەر لەنوێ دامڕشتنەوە. بەوەش قایل نەبووم، بەڵکو بۆ زێدە دڵنیابوون لە پێشدا کاك دکتۆر دیدار و، ئنجا خۆم و ئەحمەدی کوڕم پێکەوە لەگەڵ دەقە تورکییە کۆنەکەدا بەرامبەرمان کردنەوە.

* * *

بەڵام بەشی دووهەم، کە (نووسینە وتارەکان)ن، ئەوا ژمارەیان زیاترە. مامۆستای دانەر کاتێ لە ساڵەکانی کۆتایی تەمەنیدا چاوی پێدا خشاندوونەتەوە، هەندێکیانی لێ کەنار داوە و جارێکی دی بڵاوی نەکردوونەتەوە، هەندێکی تریشی بە قەڵەم تێبردن و زیاد و کەمکردن بڵاو کردووەتەوە.

ئەمانەش کە بڵاوی کردوونەتەوە، (حەوت) دانەیانی کردووە بە پاشکۆی کتێبی (وتاری شام). ئێمەش بە هەمان شێوەی کاری دانەر خۆی، ئەو حەوت وتارەمان لەوێ داناوەتەوە. با خوێنەری بەڕێز لە پاشکۆی بەرهەمی ناوبراودا بیانخوێنێتەوە.

(دوو) وتاریشی لە قۆناغی سەعیدی کۆندا خستبووە کۆتایی کتێبی (بڕوانامەی هەردوو قوتابخانەی موسیبەت)ەوە، یەکێکیان بە ناوی: (خەباتی سەعیدی کوردی لە دەوری ئیستیبداددا، بەسەرهاتی نێوان من و پزیشك لە نەخۆشخانەدا). دووهەمیان بە ناوی: (گفتوگۆم لەگەڵ شەفیق پاشای وەزیری ئاسایش کاتێ لە بەندیخانە بووم). بەڵام لە قۆناغی سەعیدی نوێدا لایبردبوون. ئێمە وەك چاپە کۆنەکە لە شوێنی خۆیان لە بەرهەمی ناوبراودا دامانناپەوە.

(دوو) وتاری تریشی خستووەتە نێوان باسەکانی کتێبی (سنووحات)ەوە. یەکەمیان بە ناوی: (فەرمانڕەوایی ڕەهای قورئانی پیرۆز) و، دووهەمیشیان بابەتێکی یەکجار کەموێنە و ناوازەیە، تیایدا داوای ئەنجومەنێکی ڕاوێژکاری دەکات بۆ ئیجتیهاد. ئێمە ئەو دوو وتارەمان جیا نەکردەوە و، هەر لە ناوەندی (سنووحات)دا هێشتمانەوە.

واتە کۆی ئەو وتارانەی کە بۆ خۆی هەڵی بژاردوون و لە کۆتایی تەمەنیدا بڵاوی کردوونەتەوە، (نۆ) وتارە.

ئەوانەشیان کە سەرلەنوێ بڵاوی نەکردوونەتەوە، (جگە لە دوو وتارەکەی قوتابخانەی موسیبەت) ئێمە دوای سۆراخکردن، تا ئەو ڕادەیەی توانیمان، (دوازدە) وتاری دیکەمان بەدەست هێنا..

ئەمانە، (دە) دانەیان مامۆستا عەبدولقادر بادللی لە کتێبی (آثـــار بديعيـه)دا بڵاوی کردوونەتەوە و، (دوو) وتاری تریشیان لە ڕۆژنامەی (تەعاون و تەرەقیی کورد)دا بڵاوکراونەتەوە. پێدەچێ ئەو ژمارانە بەردەستی مامۆستای ناوبراو نەکەوتبن تاکو لەو کتێبەدا بڵاویان بکاتەوە، بۆیە لە لایەنی خۆمەوە فۆتۆکۆپیی ئەو وتارانەم پێشکەشی مامۆستا بادللی کرد، بەو هیوایەی لە چاپەکانی داهاتوودا سوودیان لێ ببینێت.

یەکێکی ئەم دوو وتارەش، لەبەر دووروودرێژییەکەی، لە دوو ژمارەدا بڵاو کراوەتەوە.

ئنجا هەر وتارە و لە شوێنی خۆیدا ناوی ڕۆژنامە و ژمارە و بەروارەکەیم نووسیوە.

هەندێ وتار لە یەك ژمارەدا و هەندێکی دیکەش لە دوو ژمارەدا، تەنانەت وتارێکی تێدایە لە چوار ژمارەی یەك لە دوای یەکی ڕۆژنامەیەکدا بڵاوی کردوونەتەوە.

ئەم (دوازدە) وتارە، دوانیان نەبێ کە وەرگێڕانیم بە زمانی عەرەبی دەستکەوت و لە عەربییەوە کردم بە کوردی، ئەوانی دی هەموویان بە زمانی تورکی بوون. بۆ وەرگێڕانی ئەمانەش بە کوردی هەریەك لەم ئازیزانەم بەشدار کرد، بەو جۆرەی کە لە پەراوێزی وتارەکاندا باسیان دەکەم، خوا پاداشتیان بداتەوە:

کاك دکتۆر دیدار کامەران؛ ئەحمەدی کوڕم؛ کاك دکتۆر محەممەد خالید.

لێرەدا وەڵامی پرسیارێکی گریمانکراو دەدەمەوە، کە:

ئایا تەرجەمەی بابەتێك لە تورکی‌یەوە ئەو هەموو ماندووبونەوەی دەوێت؟

دەڵێم: تورکی زانەکانی ئەمڕۆ، زمانی تورکیی سەردەم دەزانن کە پێی دەوترێ: (تورکیی نوێ) و جیاوازە لە (تورکیی عوسمانی). ئەمەیان تەنانەت نەوەی نوێی تورکیش بە باشی لێی تێناگات.

نووسینە تورکی‌یەکانی مامۆستا نوورسی هەموویان بە زمانی تورکیی عوسمانین.

خۆ ئەم بەشەی نووسینەکانی (واتە وتارەکان) هەر زۆر قورسترە لە نووسینەکانی دواتری کە لە سەرجەمی پەیامەکاندا دەبینرێن، چونکە مامۆستا نوورسی بە گەورەیی فێری زمانی تورکی بووە و، یەکەم ئەزموونەکانی لە نووسینی تورکیی ئەو کاتەدا ئەم وتارانەیە!

با خوێنەری بەڕێز شێوە نووسینی مەلایەکی کورد بهێنێتە پێش چاوی خۆی کە بە گەورەیی فێری زمانی تورکیی عوسمانی بوویێت و، ئنجا وشە و زاراوەی عەرەبی و فارسی و کوردی موتوربەی نووسینەکانی بکەن! ئایا تورکی زانی نوێ چەندە توانای بەسەر تێگەشتنیدا دەشکێت، چ جای وەرگێڕانی؟

مامۆستا نوورسی هێشتا لە دەمی نووسینیدا و لە سەردەمی عوسمانیدا بووە کە هەستی بە نامۆیی دارشتنەکانی لای خوێنەرانی کردووە، بۆیە گەلێ جار پۆزشی بۆ خوێنەرانی هێناوەتەوە.

لەو بڕوایەدام کە تەنها لەبەر ئەو ئامانجە بلند و ناوەرۆکە گرنگانە بووە، کە لە وتارەکانیدا خستوونیەتە ڕوو، ئەو نووسینانەی بلاوکردووەتەوە. نەك لەبەر خودی نووسین!

ئێستاش دوای ئەم زانیاریانەی کە لەبارەی ئەم وتارانەوە خستمانە پێش چاو، خولکی خوێنەری بەڕێز دەکەین بۆ خوێندنەوەیان.

وصلى الله على النبي الأمي محمد وعلى آله وصحبه أجمعين.

والحمد لله رب العالمين.

فارووق ڕەسووڵ یەحیا

# بەشی یەکەم

# بێژە وتارەکان

# (نُطق)

## ڕوونکردنەوەی مەبەست

"قەدەر" زمانی تورکیی کەم پێ بەخشیوم.. بەڵام خەتی هەر پێ نەبەخشیوم. "زمان"یشم بە باشی لە زمانی دڵم تێناگات تاکو تەرجەمەی بکات.. هەروەها واتاکانیش لە شوێنێکی قووڵەوە دێنە دەرەوە، هەندێ لە ڕاستی‌یەکان بەملا و ئەولادا پەرتەوازە دەبن. دەبا وردەکاری و تێگەیشتنی ئێوەی ئازیز یارمەتیم بدات.

بەدیعوززەمانی کوردی

**وتاری یەکەم:**

**بەدیعوززەمانی کوردی ئەم وتارەی لە سێهەم ڕۆژی ڕاگەیاندنی سەربەستیدا بە ئیرتیجالی وتووە و، پاشان لە گۆڕەپانی "ئازادی" لە شاری "سەلانیك" هەمان گوتاری دووبارە کردووەتەوە[1].**

# میوەی کێوی هەرچەندە تاڵە لەگەڵ ئەوەشدا دەرمانە، بەڵام هەرس کردنی قورس و گرانە!

(پۆزشێك)[2]

شتێکی سروشتییە کە: یەکەم ئەزموون.. یەکەم داڕشتن.. یەکەم گوفتار، داخراو بێت و هەندێ ناتەواویی پێوە دیار بێت.

ئەگەر پۆزشم بزانن سوپاستان دەکەم، گەر نەشیزانن من پۆزشتان وەردەگرم، چونکە ئازادی هەیە.

جا هەروەك پۆشاکەکانم لە پێستی پڵنگ دەچێ، شێوازی بەیانیشم پێچەوانەی مۆدێلی ڕۆژگارە، چونکە شێوەی درومانی تورکی نازانم، تاکو پۆشاکی باش بە بەری ئەم واتایانە بپۆشم و دوگمەی لێ بدەم.

تکام وایە دەرگای خانەی ئەندێشەتانی لێ دامەخەن، وەکو من بن کە دەرگای ئەندێشەم لەسەر پشتە، تاکو بڕواتە ناو دڵەوە، چونکە ئێشیان بە غیرەت و پەرۆشی و ئایینتان هەیە و تاقییان دەکەنەوە و، لە گۆشە تاریکەکانی دڵدا ڕووناکی دادەگیرسێنن.

---

(١) ئەم سێ دێرە لە پێشەکیی ئەم وتارەدا، ڕوونکردنەوەی بڵاوکار "ئەحمەد ڕامیز"ە. (وەرگێڕ)

(٢) ڕۆژنامەی (مصباح) لە ژمارەی ٢/١٠/١٩٠٨ز دا لە سەرەتای یەکەم بەشی ئەم گوتارەدا پێناسەیەکی بەم جۆرەی بۆ تۆمار کردووە:

(مامۆستای کوردی ناسراوی ئەستەمبوولمان بەڕێز و ناودار بەدیعوززەمان سەعیدی کوردی لە سەرەتای کودەتای بەنرخەوە یەکەم جار لە ئەستەمبووڵ و دواتر چەند جارێك لە سەلانیك ئەم گوتارە ئیرتیجالییەی ئاراستە کردووە و، پاشان بە تایبەتی پێشکەشی ڕۆژنامەکەی ئێمەی کردووە). (بادللی)

# وتارێك بۆ سەربەستی

ئەی سەربەستیی شەرعی!

گوێم لێیە کە تۆ بە دەنگێکی دلێر بانگمان دەکەیت.. بەڵام دەنگێکی خۆش و سازگار کە مژدەیەکی خۆشی پێیە و، کوردێکی گوندنشینی وەك منی پێ بێدار دەکەیتەوە کە لە ژێر چینەکانی بێ ئاگاییدا خەوی لێ کەوتووە. گەر تۆ نەبوویتایە من و سەرجەمی نەتەوەش لە بەندیخانەی کۆت و دیلیدا دەماینەوە.

من مژدەی تەمەنێکی بێ کۆتاییت دەدەمێ.

خۆ ئەگەر شەریعەت - کە کانیاوی ژیانە - بکەیت بە سەرچاوەی ژیان و لەو بەهەشتە دڵگیر و خەملاوەدا گەشە بکەیت، ئەوا مژدەیەکی تر ڕادەگەیەنم کە ئەم نەتەوە ستەم لێکراوە هەزار هێندەی حاڵی ڕابوردووی پێش دەکەوێت. جا ئەگەر نەتەوە تۆ بە ڕابەری خۆی پەسەند بکات و، بە ڕەنگی ئامانجە کەسییەکان و حەزی تۆڵە سەندنەوە ڕەنگاوڕەنگت نەکات، ئەوا ئیتر ئەو کەسەی کە خاوەنی گەورەیی و منەت لێنانە ئێمەی لە گۆڕی ستەم و بێزاری دەرهێناوە و، بۆ ناو بەهەشتی یەکێتی و خۆشەویستی بانگهێشتی کردووین.

دەسا ئەی پەروەردگار!

چەندە ئەم قیامەت و زیندووبوونەوەیە خۆشە! چەندە ئەم حەشرە مەزنە جوانە کە لەم ڕۆژگارەدا وێنەی ڕاستیی: " زیندووبوونەوەی پاش مردن"ی بە شێوەیەکی بچووك بۆ کێشاوین.. ئەویش بەم جۆرەی خوارەوە:

ئەو شارستانێتییە پێشووەی کە لە گۆشەکانی ئاسیا و ڕۆم "ئەیلی"دا[1] لە ژێر خاکدا ئەسپەردە کرابوو، وا ئێستا ژیانی تێدا بووژاوەتەوە. ئەو کەسانەش کە لە ناو زیانی زۆرینەی خەڵکیدا بە دوای سوودی خۆیاندا دەگەڕان و ئاواتەخوازی ئیستیبداد بوون، ئێستا خەریکن دەڵێن:

(١) ڕۆم ئەیلی بەو ناوچانەی کیشوەری ئەورووپا دەوترا کە ئەو دەمە لە ژێر دەستەڵاتی حوکمی عوسمانیدا بوون. (وەرگێڕ)

﴿يا ليتَني كنتُ تراباً﴾ (النبأ: ٤٠)!

ئەم حكوومەتە نوێیەمان، كە حكوومەتی مەشرووتییەتە، وەك "موعجیزە"یەك لە دایك بوو. لەبەر ئەوە بە پشتیوانیی خوا لە ماوەی یەك ساڵدا نهێنیی ئەو كەسە بەدەست دەهێنین كە هێشتا لە بێشكەدا بوو لەگەڵ خەڵكیدا قسەی دەكرد[1].

سی ساڵی ڕابوردوو كە تیایدا ڕۆژوومان لە قسە گرتبوو و، ئارامی و خۆڕاگریمان كردبوو بە پیشە و، پشتمان بە خوای گەورە بەستبوو، بە كردنەوەی دەرگاكانی بەهەشتی پێشكەوتن.. دەرگاكانی شارستانێتی‌یەك كە ئازار و ئەشكەنجەی تێدا نی‌یە، پاداشتی ئەو سی ساڵە دەدرێینەوە.

یاسای شەرعی، كە سەرەتایەكی جوانە بۆ فەرمانڕەوایەتیی نەتەوە، وەكو دەرگاوانی بەهەشت وایە و، خولكمان دەكات بڕۆینە ناوی.

دەسا ئەی برایانی ستەمدیدەی نیشتمان!

وەرن با پێكەوە بڕۆینە ناو ئەو بەهەشتە. چونكە دەرگاكانی ئەمانەن:

یەكەم: یەكێتیی دڵەكان.

دووهەم: خۆشەویستیی نەتەوە.

سێهەم: زانستەكان.

چوارەم: هەوڵ و كۆششی مرۆڤانە.

پێنجەم: وازهێنان لە هەرزەیی..

زانینی پاشماوەی دەرگاكان بۆ زەینی خۆتان بەجێ دەهێڵم.

دەبێ بیشزانین كە بە دەمەوە چوونی بانگهێشت واجبێكی شەرعی‌یە.

ئنجا مادەم دەستپێكی ئەم ئاڵوگۆڕە مەزنە وەكو موعجیزەیەك وابوو، ئەوا هەر ئەو سەرەتایە گەشبینی‌یە بۆ ئەوەی كە كۆتاییەكەشی باش دەبێت.

ئەویش بەم جۆرەی خوارەوە:

---

(١) ئاماژەیە بۆ ئەو موعجیزەیەی حەزرەتی عیسا - دروودی خوای لەسەر بێت - كە لە قورئاندا بەم ئایەتانە ڕوون كراوەتەوە:
﴿كيفَ نُكلّمُ مَنْ كانَ في المهدِ صبيّاً﴾ (مريم: ٢٩).
﴿ويكلّمُ الناسَ في المهدِ﴾ (آل عمران: ٤٦). (وەرگێڕ)

ئەم ئالوگۆڕە، کۆت و زنجیرە قورسەکانی هزری ئادەمیزاد تێکدەشکێنێ و، ئەو بەربەستانەش کە رێ لە پێشکەوتن دەگرن دەرووخێنێ و، حکوومەت لە کارەسات و چەڵەمەی مردن رزگار دەکات و، کاکڵەی مرۆڤایەتی لەم نەتەوە ستەمدیدەیەدا دەردەخات و ئازادی دەکات و، بەرەو کەعبەی رەوشتە بەرزەکان رەوانەی دەکات.

بەڵێ، ئەم گەشبینییە خۆشە مژدەمان پێ دەدات کە کۆتایی ئەم ئالوگۆڕە بە رەوینەوەی ئەو هەورە چڕ و تاریکە دەبێت.. ئەویش بە بووژانەوەی حەز و ئارەزووی گشتی لە لای خەڵکی و هەست کردنیان بە زیانی ماددیی خراپکارییەکانی شارستانێتیی رۆژگار کە بە جۆرەکانی هەرزەیی و ئیسراف و چێژ و لەزەتە نارەواکان و شتانی تری وەك ئەمانە داپۆشراون و، بە وێنەی نەمانی حکوومەتە ئیستیبدادییەکە، دەوڵەتی شارستانێتیشی بەرەو دوابران و لەناوچوون دایە بەر.

هەر لەو کاتەدا خۆری شەریعەت و مانگی شارستانێتی لە کەش و هەوای ئاسمانی گەش و خاوێندا بە درەخشانترین شێوە هەڵدێن و، ئاسیا و رۆم ئەیلی رووناك دەکەنەوە و، ئنجا بە داکردنی بارانی سەربەستی تۆوی توانا و لێهاتنەکان گەشە دەکەن و، گۆی زەویش بە جوانترین پۆشاکە رەنگاورەنگەکانی، خۆی دەرازێنێتەوە.

بەڵێ، ئەوە موعجیزەیەکی پێغەمبەر ﷺ و چاودێرییەکی خواییە بۆ ئەم نەتەوە ستەم لێکراوە و، کەرامەتی نییەت پاکیی سەرجەمی کۆمەڵگایە.

ئەم یەکێتییە، واتە یەکێتیی دڵان و خۆشویستنی سەرجەمی نەتەوە لە بازنەی شەریعەتدا، کە کانگای بەختەوەری و ئازادییە، خوای گەورە بە خۆڕایی و بێ بەرامبەر پێی بەخشیوین، لە کاتێکدا نەتەوەکانی تر دوای بەخشینی ملیۆنەها گەوهەری بەنرخی مرۆڤەکان بەدەستیان هێناوە.

زایەڵەی "سەربەستی" و "دادگەری" لە فووی ئیسرافیل دەکات و، ژیان لە ناو هەست و نەستی شارستانێتیی ئێمە و ئاواتە کپ بووەکانمان و حەز و ئارەزووە نەتەوەییە بەرزەکانمان و رەوشتە ئیسلامییە جوانەکانماندا دەبووژێنێتەوە، بە رادەیەك کە گوێی زەویی حاڵ لێهاتووی چەشنی موریدی مەولەوی دەزرنگێتەوە و، سەرجەمی نەتەوە دەهەژێنێت و، بە وێنەی کەسێکی جەزبە لێهاتوو رایدەوەشێنێ.

دەسا ئەی برایانی نیشتمانم!

نەکەن جارێکی تر بە هەرزەیی و پشتگوێ خستنی ئایین بڕیاری مردنی بۆ دەر بکەن. ئەو یاسا بنەڕەتییەی کە لە سەر بناغەی ئەم شەریعەتە خاوێنە دامەزراوە، بووە بە مەلائیکەتی گیان کێشانی سەرجەم بیر و هزرە بێ کەڵك و ڕەوشتە ناشیرین و پلانە شەیتانی و ڕیا نزمەکان.

دەسا برایانی بەپەرۆشی نیشتمان!

هەرگیز بە ئیسراف و ڕەفتاری پێچەوانەی شەریعەت و تام و چێژە حەرامەکان، ژیان بە بەر ئەو شتە نزمانەدا مەکەنەوە.

کەواتە تا ئێستا لە گۆڕدابووین و ئێسکەکانمان پرتووکابوون.. بەڵام وا ئێستا بە یەکگرتنی نەتەوە و ڕاگەیاندنی مەشرووتییەت ڕۆشتووینەتە ڕەحمی دایکەوە و نەشونما دەکەین.

تێپەڕبوونی سەد و ئەوەندە ساڵ کە تیایدا لە ڕەورەوەی پێشکەوتن بەجێ مابووین، بە پشتیوانیی خوای گەورە و بە موعجیزەیەکی پێغەمبەر ﷺ بە جێی دەهێڵین و، بە کردار سوار شەمەندەفەری یاسای بنەڕەتیی شەرع دەبین و، بە هزر و بیریش دەڕۆینە سەر پشتی بوراقی شوورای شەرعی و پێش دەکەوین..

ئیتر ئێمەش بەکاتێکی کەم - لە ڕووی تەواوکاریی بنەماکانەوە - ئەم دەشتاییە سامناکە دەبڕین و، شان بە شانی نەتەوە خاوەن شارستانێتییەکان دەکەوینە پێشبڕکێ..

چونکە ئەوان بە سواربوونی ئەو گالیسکانە ڕاهاتوون کە گاکان ڕایان دەکێشن، بەڵام ئێمە - بە تەواوکاریی ئەو هۆکارانەی زانست پشتیان پێ دەبەستێت - ڕاستەوخۆ سواری فڕۆکە و باڵۆن دەبین و، بە چەندین قۆناغ پێشیان دەکەوینەوە، بەهۆی ئەوەی کە ڕاستیی ئیسلام، کە ڕەوشتە جوانەکانی ئیسلامی لە خۆدا کۆ کردووەتەوە و، بە توانا و لێهاتنی سروشتیی خۆمان و ڕێژنەی ئەو ئیمانەی کە لە خۆماندا هەڵمان گرتووە و، ئەو برسێتییە زۆرەش هەستی پێدەکەین، هەرس کردنی ئەو هۆکارانەمان بۆ ئاسان دەکەن.

ئیتر بە پشتیوانیی خوا پێشیان دەکەوینەوە، وەك ئەوەی کە لە ڕابوردوودا پێشیان کەوتبووین.

من بەهۆی ئەو ئەرکەی کە وەك قوتابی‌یەك خراوەتە ئەستۆم و، بە بڕوانامەی پلەی دەرچوونیش لە ڕێبازی ئازادی و سەربەستیدا، ئەمەی خوارەوەتان یاد دەخەمەوە:

ئەی ڕۆڵەکانی نیشتمان!

نەکەن بە هەڵە و شێوەیەکی خراپ سەربەستی لێك بدەنەوە، با لە دەستمان دەرنەچێت.. بە دەرخوارددانی کۆیلایەتی‌یە بێ کەڵکەکەی پێشوو لە دەفرێکی تردا مەمان خنکێنن[1].

چونکە تەنها بە چاودێری کردنی فەرمان و دابەکانی شەریعەت و ڕەفتار کردن بە ڕەوشتە جوانەکان، سەربەستی و ئازادی پەرە دەسێنێ و گەشە دەکات.

بەڵگەی درەخشانیش لەسەر ئەم دەعوایە، بریتی‌یە لەو سەربەستی و دادگەری و یەکسانی‌یەی کە وێڕای وەحشیگەری و خۆسەپاندنی نەفرەت لێکراوی ئەو قۆناغەی مێژوو، کەچی سەردەمی هاوەڵە بەڕێزەکانی - خوایان لێ ڕازی بێت - ڕازاندبووەوە.

دەنا کاری پێچەوانەی ئەمە و لێکدانەوەی "سەربەستی" و "کار پێکردنی" بەو تێگەیشتنەی کە ڕزگاربوون بێت لە پابەندی بە یاسا و نوقم بوون بێت لە هەرزەیی و چێژ و لەزەتە ناڕەواکان و هەڵەخەرجی و ئیسرافدا و، شکاندنی سنووری هەموو شتێك بێت لە پێناوی هەوا و ئارەزووی دەروونندا..

کاری لەم جۆرە، وەك ڕەفتاری ئەو کەسە وایە کە خۆی لە دیلیی دەستەڵاتی یەك پادشا دەرباز دەکات و، دەڕواتە ژێر ڕکێفی خۆسەپاندنی چەندین کەسی نزمی بێ نرخەوە! ئەمە وێڕای ئەوەی کە تێگەیشتنی لەم شێوەیە بۆ "سەربەستی" دەری دەخات کە ئەم نەتەوەیە نائیاوزێ و هێشتا لە قۆناغی منداڵیدایە و شایانی "سەربەستی" نی‌یە. کەواتە هەرزەیە و، دەبێ مامەڵە کردنی لێ قەدەغە بکرێت. ئەوەش بە گێڕانەوەی بۆ ژێر دەستەڵاتی ئیستیبدادی پێشوو.

شایستە نەبوون بۆ سەربەستیی شەرعیی نوێ و درەخشان و فراوان، یەکێتیی مەزنی نەتەوە بەرەو نەخۆشی‌یەکی سامناك دەبات و، نەتەوە دووچاری چەند بارێکی بێ کەڵکی بۆگەن دەکات.

---

(١) بەڵێ، بە ئیستیبدادێکی ترسناکتر و توندوتیژتر، کۆیلایەتی‌یەکی یەکجار لەوە ژەهراوی تریان دەرخوارد داین. (دانەر)

کەچی لێکدانەوەی کەسانی خاوەن تەقوا و ویژدان بۆ "سەربەستی" بەو جۆرە نی‌یە و، ڕێبازیان پێچەوانەی ئەو لێکدانەوە و تەفسیرەیە.

چونکە ئێمەی نەتەوەی عوسمانی سیفەتی مەردایەتیمان تێدایە، کەواتە کراسێکی ژنانە کە بە هەرزەیی و ئیسراف و هەوا و ئارەزوو ڕازابێتەوە، هەرگیز بۆ قەد و بالای توانا و لێهاتنی نەتەوە پالەوانەکەمان دەست نادات.

لە سەر بناغەی ئەمانەی پێشوو:

ئێمە نابێ بخەلەتێین، بەلکو دەبێ ئەم یاسایەی خوارەوە بکەین بە یاسای کارمان، کە بریتی‌یە لە: "خُذ ما صفا دع ما كدر"..

ئیتر لەبەر ڕووناکیی ئەم دەستوورەدا بە سوپاسەوە ئەو زانست و پیشەسازی‌یانە لە بیانی‌یەکان وەردەگرین کە یارمەتیی پێشکەوتنی شارستانیمان بدات. بەلام داب و ڕەوشتە خراپەکان لە ڕاستیدا بریتین لە گوناهـ و خراپکاری‌یەکانی شارستانێتی، کە لەبەر ئەوەی چاکەکاری‌یە زۆرەکانی شارستانێتی دەورەی داون چەپەلی و ناشیرینی‌یان بە زۆری دەرناکەوێت.

جا ئەگەر ئێمە بەهۆی بەدبەختی و خراپیی هەلبژاردنمانەوە، بە وێنەی منال، ئەو شتانە لە شارستانێتی وەربگرین کە لەگەل هەوا و ئارەزووەکاندا یەکدەگرن و، واز لە چاکەکاری‌یەکانی شارستانێتی بهێنین کە بۆ بەدەستهێنانی دەبێ هەول و تەقالا بدەین، کتومت وەکو پیاوی ژنانی و ژنی نێرەکوڕکەمان لێ دێت و دەبینە گالتەجاڕی خەلکی، چونکە هەروەك ژن ئەگەر پۆشاکی پیاوان و پیاویش پۆشاکی ژنان بپۆشێت دەبێتە مایەی گالتە و سووکایەتی، ئێمەش وەهامان لێ دێت.

کەواتە نابێ مەردی خاوەن هیممەتی بلند بە وێنەی خانمێکی بەناز وابێت کە بە هۆکارەکانی ئارایشت ڕازێنرابێتەوە.

**پوختەی ئەم قسانە:**

بە مەبەستی پاراستنی پاراوی و لاویی شارستانێتی‌یەکەمان بە کانیاوی زولالی ژیانی شەریعەت، هەر بە شمشێری ئەو شەریعەتە ڕێ لە خراپکاری و گوناهەکانی شارستانێتی دەگرین و نایەلین بێتە ناو سنووری سەربەستی و شارستانێتیمانەوە.

دەبێ ئێمە لە بواری شارستانێتیدا چاو لـە ژاپۆنی‌یەکان بکـەین؛ ئـەوەتا پارێزگـاریی داب و نەریتە نەتەوەییەکانی خۆیان کردووە کە هۆکاری مانەوەیانە و، لـە هـەمان کـاتدا چاکەکاری‌یەکانی شارستانێتیشیان لە ئەوروپا وەرگرتووە.

جا مادەم داب و نەریتە نەتەوەییەکانمان لە ئیسلامەوە پەیدا بووە و هەر بـە ئیسـلامیش گەشـە دەکـات، ئـەوا پێویسـتی وا دەخـوازێ کـە بـە توندی لـە دوو ڕووەوە دەسـت بـە ئیسلامەوە بگرین.

ئەی ڕۆڵە بە غیرەتەکانی نیشتمان!

دەبێ ئێمە بە وازهێنانمان لە بەشێکی چێژ و لەزەتەکان، یارمەتیی "کۆمەڵەی میللـی" بدەین و پشتیان بگرین کـە گیـانی خۆیـان بـەخت کـردووە و ڕێگـای بەختـەوەری‌یان بـۆ کردووینەتەوە. چونکە هەمووومان پێکەوە لەسەر سفرەی ئەو نیعمەتە دانیشتووین.

هەڵگرانی هزر و بیرە بێ کەڵکەکان دەیانەوێت لە ژێر پەردەی سەربەستی و ئازادیدا خۆسەپاندن و ستەمکاری باڵادەست بێت.

جا بۆ ئەوەی جارێکی تر ئـەو خۆسـەپاندنانەی کـە لـە گـۆڕی ڕابـوردوودا ئەسپەردە کـران و ئـەو ستەمکاری‌یانەش کــە لافـاوی ڕۆژگــار ڕایمــاڵین نەیانبیننـەوە، دەمـەوێ بەربەسـتێکی ئاسـنین لــە نێــوان ڕابــوردوو و داهــاتوودا بنیــات بنێــم، ئــەوەش بــە ڕوونکردنەوەی " مێژووی ژیانی سەربەستی"..

ئەوەش بەم جۆرەی خوارەوە:

ئـەم ڕۆڵـەی "سەربەستی"یـەی کـە ئـەم ئاڵوگۆڕە بوویــەتی، گــەر بیخاتــە باوەشـی شوورای شەرعی‌یەوە بۆ پەروەردە و بەخێوکردنی، ئەوا شانازی‌یەکانی ڕابوردووی ئـەم نەتەوەیـە بـە شـێوەیەکی بـەهێز و دەسـتەڵاتدار زینـدوو دەکاتـەوە. بـەڵام گـــەر ئـەو سەربەستی‌یە لەگەڵ ئامانجە کەسـی‌یەکاندا بکەونـە یـەك، ئـەوا دەبێـت بـە ئیسـتیبدادێکی ڕەها.

"سەربەستی" لە کاتێکی گونجاودا لە دایك بوو، گەشەکردنیشـی پێویسـتی بـە چـەند بـارودۆخێکی سروشتی هەیـە، نـەك هێنانەکایـەی چـەند بـارودۆخێکی دەسـتکرد کـە پێویستیان بە گەلـێ گیروگرفت دەبێت.

پەرۆش و غیرەتی ئیسلامی کە لە ڕابوردوودا گەلێ تەنگانە و دەردیسەریی ئەوتۆی چەشت کە شایانیان نەبوو، ئێستا بە ڕادەیەك لە قولپدان و هەلچووندایە کە "سەربەستی" لەو ڕەحمەدا بە تەواوی و کاملی خولقاوە. خۆ هەر هێندەی لە کاتی لەدایکبوونیدا هاتە دنیاوە، ئەوا دەستەلات و زالبوونی خۆی ڕادەگەیەنێت. ئەوکاتەش هیچ شتێك ناتوانێ بەرەنگاری بێتەوە و لەرزەی پێ بخات. چونکە بە وێنەی "تەختی بەلقیس" یاخود "بەربەستی ئاسنین" لەسەر چەندین بناغەی توندوتۆل و بنچینەی ئەم پێنج ڕاستی‌یەی خوارەوە دادەمەزرێت:

ڕاستیی یەکەم:

کۆی گشتیی هەر شتێك هێزێکی هێندە گەورەی تێدایە کە لە دانە دانە و تاك تاکەکانیدا نی‌یە. وەك توندوتۆلیی ئەو پەتە قایمەی کە لە چەند تالە دەزوویەکی ورد و باریك پێکهاتووە. یان وەك حکوومەتە نوێکەمان کە بیرو ڕای گشتیی لە خۆگرتووە و، حکوومەتەکانی پێشوومان.

دەسا ئەی نەتەوە! ئێستا ئێمە ئەو پەتە قایمەین. خۆ هەرکەسێك بەهۆی ئاماجە کەسی و ڕا و بۆچوونە تاکرەوی‌یەکانەوە لاوازی بکات تاوانێکی وای ئەنجام داوە کە لێخۆشبوون هەلناگرێت، چونکە دەستدرێژیی بۆ سەر مافی سەرجەمی نەتەوە کردووە.

ڕاستیی دووهەم:

لە سەردەمانی پێشوودا ئەو جۆرە دەستەلاتە فەرمانڕەوا بوو کە پالی بە هێز و زەبر و زەنگەوە دابوو. دیارە دەستەلاتی لەو شێوەیە لەبەر ئەوەی ئاکامی وەحشیگەری‌یە، ئەنجامەکەشی هەر نزمبوونەوە و تیاچوونە. چونکە هەردەولەتێك خوێنی دەستەلاتی خۆسەپێن بەناو دەمارەکانیدا هاتووچۆ بکات، ئەوا ئەو دەستەلاتە تەمەنی سروشتیی دەولەتەکەشی وەك خۆی سنووردار کردووە و خستوویەتیە بەر چنگی ئەجەلی تیاچوون و، دێرەکانی لاپەڕەی مێژووەکەشی بە وێنەی خوێندنی کونەپەپوو ئاوازی قڕتێکەوتن و نەمان دەلاوێنێتەوە.

بەلام لە سەردەمی شارستانێتیدا زانست و شارەزایی فەرمانڕەوایەتیی جیهان دەکەن. جا مادەم بەرهەمهێنی ئەم دەستەلاتە بریتی‌یە لە شارستانێتی و ئەویش خۆی لە خۆیدا پەرە

دەسێنێ و تەمەنیشی هەمیشەییە، ئەوا گەر ئەم چەشنە دەستەڵاتە فەرمانڕەوایە بکرێت بە ئەنجامدەر و کارسازی کارەکانی هەر دەوڵەتێك حکومەتەکەی لە سنووری تەمەنی سروشتی و ئەجەلی تیاچوون و نەمان ڕزگار دەکات و، هەتا زەوی بمێنێت ژیانی ئەویش هەر بەردەوام دەبێت. کتێبی ئەوروپا و لاپەڕەکانی بە ئاشکرا ئەمە ڕادەگەیەنن.

ئەگەر نموونەشتان لەسەر ئەمە دەوێت، ئەوا فەرموون سەیری حکومەتی پێشوومان و حکومەتی ئێستامان بکەن.

ئەگەر بوترێت:

دەتوانرا حکوومەتە لاوازەکەی پێشوو لە لایەن چەند کەسێکی ئاساییەوە بەڕێوە ببرێت. ئەی ئایا ئەنادۆڵ و ڕۆم ئەیلی ئێستا پیاوانی هێندە زیرەك و بلیمەتیان تێدا هەڵدەکەوێت تا ئەم حکومەتە لەسەر شانیان هەڵبگرن کە هەموو ئاواتێکمان پێ بەستووە؟

لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا دەڵێین:

بەڵێ، ئەگەر کودەتا و ئاڵوگۆڕێکی تر ڕوو نەدات.

ئێستاش سەرنج بدە لە:

**ڕاستیی سێهەم:**

مرۆڤی جاران هەرچەندە توانا و لێهاتنەکانی بێ کۆتایی بوون، کەچی لە مەیدانێکی تەسك و بچووکدا جموجوڵی دەکرد. تەنانەت وێڕای ئەوەی کە "مرۆڤ" بوو کەچی بە وێنەی "ئاژەڵ" دەژیا. هەر لەبەر ئەوە بوو کە بیر و بۆچوون و ڕەوشت و خووەکان، بە ڕێژەی سنووردارێی ئەو بازنە بەرتەسکەی، نزم و تەسك بووبوونەوە.

جا ئەگەر ئەم سەربەستییە شەرعییە دادگەرە هەر بژی و تێك نەچێت، ئەوا کۆت و زنجیرەکانی بیر و هزری مرۆڤ تێکدەشکێنێ و ئەو ڕێگرانە ورد و خاش دەکات کە لە بەردەم توانا و لێهاتنیدا بۆ پێشکەوتن دانراون.

ئیتر مەیدانی جموجوڵی هێندەی دنیا فراوانی بەدەست دەهێنێت، بە ڕادەیەك کە لادێ نشینێکی وەك من دەتوانێت بڕوانێتە بەڕێوەبردنی کاروباری دەوڵەت کە بە چەشنی هێشووە ئەستێرەی کۆ(سورەیا) لە لوتکەی بەرزیی خۆیدایە و، ئاوات و توانا و

لێهاتنەکانی خۆی پێوە پەیوەست بکات. جا لەبەر ئەوەی هەموو کردار و ڕەفتارێك کە ڕوو بدات لەوێ دەنگ دەداتەوە، ئەوا بە وێنەی هێشووە ئەستێرەی "کۆ" هیممەتی ئەو کەسەش بەرز دەبێتەوە و، بە هەمان پلەش ڕەوشتەکانی تەواوی و بڵندی بەدەست دەهێنن و، هێندەی فراوانیی قەڵەمڕەوی دەوڵەتی عوسمانی بیر و بۆچوونەکانیشی فراوان دەبن و، بە پشتیوانیی خوای گەورە پێش بلیمەتە هەڵکەوتووەکانی چەشنی ئەفلاتون و ئیبن سینا و بسمارك و دیکارت و تەفتازانی دەکەوێتەوە.

ئێمە ئومێدێکی گەورەمان بەوە هەیە کە کێڵگەی ئەنادۆڵ و ڕۆم ئەیلی گەلێك لاوی بەغیرەت بەرهەم بهێنێت. بێ گومان وڵاتەکانی قەڵەمڕەوی عوسمانی شوێنی پەیدا بوونی پێغەمبەران و لانکی دەوڵەتە خاوەن شارستانێتییەکان و هەڵاتگەی خۆری ئیسلامە.

جا ئەگەر ئەم توانا و لێهاتنانەی کە لە سروشتی مرۆڤایەتیدا ڕیشکی داکوتاوە بە باراناوی سەربەستی گەشە بکات، ئەوا دەبێت بە درەختێکی تووبای درەخشان و، لق و پەلەکانی بە هەموو لایەکدا بڵاو دەکاتەوە و، خۆرهەڵات دەکات بە هەڵاتگەی خۆری ڕووناکی بەخش بۆ خۆرئاوا، بە مەرجێ مۆرانەی "تەمبەڵی" کرمۆڵی نەکات و، ژەهری "ئامانجە کەسییەکان"یش تێکی نەدات و نەیشێوێنێت.

**ڕاستیی چوارەم:**

شەریعەتی خاوێن لەبەر ئەوەی لە لایەن گوفتاری ئەزەلییەوە هاتووە، ئەوا بەرەو ئەبەدیش دەڕوات. چونکە درەختی "مەیلی بەرەو کامڵ چوون" بە ڕێژەی خۆراك وەرگرتنی لە پوختەی توانای "بەدوای یەکدا هاتنی هزرەکان" گەشە دەکات، کە دەستکەوت و بەرهەمی مەیلی پێشکەوتنە لە مرۆڤدا، کە ئەویش لقی "بوون"ە.

بەڵگەی درەخشان لەسەر ئەمە بریتییە لەوەی کە شەریعەت بە وێنەی گەشەکردنی زیندەوەر گەشە دەکات و فراوانی بەدەست دەهێنێت(١).

جا ئەو سەربەستی و دادگەری و یەکسانییەی کە باشترین سەدەکان و سەردەمی چوار جێنشینەکان لە سایەیدا دەژیان، بە تایبەت لەو کات و ڕۆژگارەدا، بەڵگەیە

---

(١) ئاشکرایە مەبەستی دانەر "فیقهی شەریعەت" و "بوارەکانی جێبەجێ کردنیەتی". دەنا "شەریعەت" بۆ خۆی کامڵە، بە بەڵگەی ئایەتی: ﴿اَلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ﴾ (المائدة:٣). (وەرگێڕ)

لەسەر ئەوەی کە شەریعەتی پاکی ئیسلام سەرجەم پەیوەندییەکانی یەکسانی و دادگەری و ئازادیی ڕاستەقینەی لە خۆیدا کۆکردووەتەوە. ئاسەوارەکانی ئیمامی عومەر و ئیمامی عەلی و صەلاحەددینی ئەییووبیی کوردی - خوایان لێ ڕازی بێت - باشترین بەڵگەیە لەسەر ئەم دەعوایە.

ئا لێرەوە من بڕیارێکی بێ گومان دەدەم کە:

دواکەوتن و نزمبوونەوە و بەدحاڵیی ئێستامان، ئەنجامی ئەم چوار هۆکارەی خوارەوەیە:

١- چاودێری نەکردنی فەرمانەکانی شەریعەتی خاوێن.

٢- هەڵسوکەوتی هەڕەمەکیی هەندێ کەس لە مەراییکەران.

٣- دەمارگیریی نەفرەت لێکراوی نابەجێ، ئیتر چ لە لایەن زانایەکی نەزان و چ لە لایەن نەزانێکی زاناوە بێت.

٤- لاسایی کردنەوەی تووتی ئاسا بۆ خراپکارییەکانی شارستانێتیی ئەورووپا، بەهۆی بەدبەختی، یان بەهۆی خراپ هەڵبژاردنی خۆمان. هەر ئەمەش بوو بەهۆی وازهێنانمان لە چاکەکارییەکانی شارستانێتی، کە بە چەندین گیروگرفت و دەردیسەری بەدەست دێن.

جا ئەگەر کارمەندان بە ڕێکوپێکی ئەرکەکانی سەرشانیان جێبەجێ بکەن و، خەڵکانی تریش بەپێی بارودۆخی دەوروبەر و خواستی زەمان و ڕۆژگاری ئێستا تێبکۆشن، ئەوا هیچ کەسێك کاتی زیادی لێ نامێنێتەوە کە لە هەرزەییدا بەسەری بەرێت..

خۆ ئەگەر هەرکامیان خۆی بە کاری هەرزەییەوە سەرقاڵ بکات، ئەوا دەبێت بە میکرۆبێکی ترسناك لە جەستەی کۆمەڵگادا.

ڕاستیی پێنجەم:

جاران بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری دەوڵەت بیر و بۆچوونی چەند کەسێکی کەم سەروزیاد بوون، چونکە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و پێویستییەکانی ژیان و داخوازییەکانی شارستانێتیی ئەو کاتە زۆر و بەربڵاو نەبوون.

بەڵام لە کاتی ئێستادا پەیوەندی‌یە کۆمەڵایەتی‌یەکان و پێویستی‌یەکانی ژیان و ئارایشتەکانی شارستانێتی بە ڕادەیەك زیاد بوون و پەرەیان سەندووە کە دەوڵەت مەگەر بە ئەنجومەنێکی نوێنەرانی ئەوتۆ کە وەکو دڵی نەتەوە وابێت، بە ترپەی دڵی ئەو لێ بدات و، بە شوورای شەرعی کە لە جێی بیر و ژیریی نەتەوەدایە و، بە ئازادیی بیر و ڕاکانیش کە لە جێی شمشێر و هێزی دەوڵەتدایە، بەڕێوە ببرێ و پەروەردە بکرێت.

نموونەش لەسەر ئەم ڕاستی‌یە حکوومەتی خۆسەپێنی پێشوو و، حکوومەتی مەشروتیەتی ئێستایە.

وا لەسەر بناغەی ئەو ئەرکەی کە ڕاستیی سێ‌هەم خستوویەتیە ئەستۆم و، بە بروانامەی دەرچوون لە قوتابخانەی سەربەستی، سێ شت یادی نەتەوە دەخەمەوە:

*یەکەم:*

هەروەك مەحاڵە بە یەکجار جەستەی زیندەوەر هەڵبوەشێتەوە و ببێتەوە بە گەردیلەکان، هەر بەو جۆرەش مەحاڵە بە کتوپڕی و بە یەکجاری ئەو جەستەیە لە گەردیلەکان پێکبێت.

لەبەر ئەوە، لابردنی کارمەندەکانی پێشوو لە جەستەی دەوڵەت و دانانی کارمەندانی نوێ لە جێیاندا کارێکی دژوارە، گەر نەڵێم مەحاڵە..

ئاشکراشە جەستەی دەوڵەت دواتر ئەو کارمەندانە لادەبات کە چەپەڵی‌یەکی ئەوتۆیان لە خۆدا شاردووەتەوە چاکسازی هەڵنەگرێت، بەڵام دەرگای تۆبە و پەشیمانی بۆ ئەوانەیان لەسەر پشتە کە دەگونجێت چاکسازی‌یان تێدا بکرێت، بە مەرجێك خۆر لە خۆرئاواوە هەڵنەیەت.

ئەوانە دەبێت سوود لە ئەزموونیان وەربگیرێت، چونکە پڕکردنەوەی شوێنەکانیان بە کارمەندانی نوێ چل ساڵی تر دەخایەنێت.

دەنا زمان درێژ کردن بە خراپی بۆ هەموویان و سووکایەتی پێ کردنیان کارێك دەکات یەکێتیی ئەم نەتەوە مەزنە دووچاری پەتایەکی ترسناك و کوشندەی هزر و بیرە بێ کەڵك و ڕەوشتە خراپەکان بکات.

دووهەم:

من لەناو چیاکانی کوردستاندا گەورە بووم و، لە ئەندێشەی خۆمدا مەڵبەندی خەلافەتم بە جوان دەزانی. بەڵام کە پێش حەوت هەشت مانگ هاتم بۆ ئەو مەڵبەندە، ئەستەمبوولم بە وێنەی پیاوێکی وەحشی و دارستانیی وا هاتە پێش چاو کە پۆشاکی مرۆڤێکی شارستانیی پۆشیبێت، بە هۆی جیاوازی و لە یەك سڵەمینەوەی دڵەکان و بێزاریی خەڵکەکانی لە یەکتری.

وا ئێستا شارستانێتی بە هۆی یەکێتیی نەتەوە (و خۆشەویستیی نەتەوەیی) خۆیمان لە پۆشاکێکی نیوە شارستانی و نیوە وەحشیگەریدا پیشان دەدات.

جاران پێم وابوو تێکچوونی بارودۆخی کوردستان هی ئەوەیە کە ئەندامێکی جەستەی گرفتاری نەخۆشی بووە. بەڵام کە هاتم بۆ ئەستەمبووڵ و ترپەی دڵ و دەمارەکانیم تاقی کردەوە و نەشتەرگەریم تێدا ئەنجام دا، تێگەیشتم کە نەخۆشی‌یەکە لە "دڵ"ەوە پەرەی سەندووە و پاشان بە هەموو لایەکی تردا بڵاو بووەتەوە. بۆیە هەوڵی چارەسەر کردنی ئەو نەخۆشی‌یەم دا، کەچی بە نازناوی "شێتی" رێزم لێ نرا!

هەروەها ئەوەشم بینی کە ئەو ئیسلامەی بریتی‌یە لە شارستانێتیی راستەقینە، لە رووی ماددی‌یەوە لە شارستانێتیی سەردەم دواکەوتووە. وەك بڵێی ئیسلام لە بەدرەوشتیی ئێمە بێزار بووە و گەڕاوەتەوە، تاکو سکاڵای ئێمە لە لای باشترینی سەدەکان بکات.

گرنگترین هۆکاری دواکەوتنمان لە بواری شارستانێتیدا، دوای هۆکاری ئیستیبداد، بریتی‌یە لە جیاوازیی بیروڕا و مەشرەبەکانی شوێنکەوتووانی سێ لقی گەورە کە بە ڕابەری گشتیی هەمووان دادەنرێن، کە بریتین لە پەیڕەوانی قوتابخانە تازەکان و قوتابخانە ئایینی‌یەکان و تەکیە و خانەقاکان، ئەوانەی کە واتای قسەی ئەو شاعیرەیان تێدا هاتووەتە دی کە دەڵێت:

عباراتنا شتى وحسنك واحد    وكل إلى ذاك الجمـال يشـير

ئەم جیاوازیی بیروڕایە بناغەی ڕەوشتە ئیسلامی‌یەکانی جووڵاندووە و، یەکێتیی نەتەوەی لەت لەت کردووە و، لە کاروانی شارستانێتی دوای خستووین. چونکە کەسی وا هەیە یەکێکی تر بە کافر و گومڕا لە قەڵەم دەدات، کەچی ئەوی تر کەسی

یەکەم بە نەزانێك دادەنێت کە متمانەی پێ نەکرێت. بەم جۆرە، زیادەڕەوی و پشتگوێ خستن لە بڕیار و مامەڵە و ڕەفتاریاندا زاڵ بووە..

چارەسەری ئەم دەردەش سوڵح و ئاشتییەکی ئەوتۆیە کە لە یەکگرتنی بیر و بۆچوونەکان و پەیوەست کردنی پەیوەندییەکانەوە تا دەگاتە خاڵی میانەڕەوی، سەرچاوەی گرتبێت. ئیتر هەمووان دەست لە ناو دەستی یەکتر دەنێن و پێکەوە یەکدەگرن تاکو شیرازەی سیستەمی پێشکەوتن نەپچڕێنن و تێکی نەدەن.

سێهەم:

کاتێك گوێم لە قسەی ئامۆژگاران (هەندێ لە ئامۆژگاران) ڕاگرت، وەعز و ئامۆژگارییان کاری تێ نەکردم. کە سەرنجم لە هۆکاری ئەمە دا، بینیم جگە لە دڵڕەقیی خۆم، سێ هۆکار هەیە:

١ – ئەوانە جیاوازیی نێوان کاتی ئێستا و ڕابوردوو لە بیری خۆیان دەبەنەوە و، گەلێ زیادەڕەوی لە وێنەکێشانی باسەکانیاندا دەکەن و، دەیانەوێ بیرازێننەوە، بێ ئەوەی هێندە بەڵگەی پێویستی لەسەر بهێننەوە کە بۆ بەجێهێشتنی کاریگەری و قەناعەت بەخشین بە توێژەر و عەودالی ڕاستی پێویستە پێشکەشی بکەن. چونکە سەردەمی ئێستا زیاتر پێویستی بە هێنانەوەی بەڵگە هەیە.

٢ – ئەوانە کاتێك خەڵکی بۆ کارێکی باش هان دەدەن یاخود لە کارێکی خراپ دەیانترسێنن، دەچن نرخ و بەهای شتانی لەوە گرنگتر پشتگوێ دەخەن. بەم کارەشیان پارێزگاریی ئەو هاوسەنگییە وردە لە دەست دەدەن کە لە شەریعەتدا ڕەچاو کراوە.

٣ – یەکاویەك بوونی گوفتار لەگەڵ خواستی حاڵ و مەقامدا بەرزترینی جۆرەکانی "ڕەوانبێژی"یە. کەواتە دەبێت گوفتاری ئەمڕۆ لەگەڵ پێداویستییەکانی سەردەمدا تەبا بێت.

کەچی ئەوان گوفتارێك ئاراستەی ئەو خەڵکە ناکەن کە لەگەڵ دەستنیشان کردنی نەخۆشیی سەردەمدا بگونجێت، وەك بڵێی خەڵکی ئەم سەردەمە بۆ ڕۆژگار و سەردەمەکانی پێشوو دەبەنەوە، ئنجا بە زمانی ئەو ڕۆژگارەی پێشوو لەگەڵیان دەدوێن!

به پوختی:

دەسا با ئامۆژگار و ڕابەرە بەڕێزەکان "زانای لێکۆڵەر" بن، تاکو بتوانن وتەکانیان بچەسپێنن و قەناعەت بە کەسی بەرامبەر ببەخشن..

هەروەك دەبێت "دانای وردەکار" بن، تاکو هاوسەنگیی شەریعەت لێك نەترازێنن..

هەروەها دەبێ "ڕەوانگۆی قەناعەت بەخش" بن، تاکو گوفتارەکانیان لەگەڵ پێداویستی‌یەکانی سەردەمدا یەك بگرێتەوە..

هەروەك دەبێ هەموو شتێك بە "تەرازووەکانی شەریعەت" هەڵبسەنگێنن.

دەبا بژی شەریعەتی خاوێن.. بژی دادگەریی خوایی.. بژی یەکێتیی نەتەوە.

لەناوچێ جیاوازی و دووبەرەکی.. بژی خۆشەویستیی نەتەوە.

با هەر بمرێت ئامانجە کەسی‌یەکان و بیری تۆڵە سەندنەوە. با بژین ئەو سەربازە دلێرانەی کە ئازایەتیی بەرجەستەن.. بژی ئەو سوپایانەی کە گەورەیی دەوڵەت دەنوێنن.

هەر بەردەوام بێت کۆمەڵەی ئازادیخوازانی دیندار کە ژیریی ڕووناك و کارسازی دانان.

هەر بژی ئەو خەلیفەیەی پێغەمبەر ﷺ کە هەمیشە لە بیری تیمارکردنی زامەکاندایە.

* * *

بەری درەختی چیاکانی کوردستان هەرسکردنی قورسە، بە وردی لێی ڕامێنن تاکو هەرسی بکەن، دەنا پێتان حەڵاڵ ناکەم.

ئەگەر ئێوە، هەروەك هەردوو ڕۆژنامەوانەکە چۆن گوتارەکەمیان دەسکاری کرد، ئێوەش ئاوا بیخوێننەوە مەگەر خوا یارمەتیدەر بێت.. من بە ئیرتیجالی وتوومە، بەڵام لە هەموو وشەیەکیدا مەبەستێکم هەیە، بە وردی سەرنجی بدەن، تاکو ناوەرۆکی ئەم بەیتە لە ئێوەدا نەیەتەدی کە دەڵێ:

وکَم مِنْ عائِبٍ قولاً صحيحاً وآفتُه مِنَ الفهــمِ الســقيمِ

والسلام.

وتاری دووهەم:

## وەڵامێك بۆ هزری جوانی ئەمیر صەباحەدین، ئەو هزرەی کە تێگەیشتنی خراپی لێ وەردەگیرا[1]

ژیان لە یەکێتیدایە..

لەبەر ئەوەی هزری کەسێکی دەشتەکیی وەك من لە سروشتی ڕەسەنەوە نزیکترە و بە هەمان شێوە داوەرییەکەشی سروشتییە، ئەوا لەو هزرەی کە لە جۆری دەستکرد بێت، ڕێکوپێکترە .

ئەویش بەم جۆرەیە:

"خۆشەویستیی نەتەوەیی" نێوان تاکەکان بە وێنەی هێزی کێشکەری جوزئی لە نێوان گەردیلەکاندا، ئەنجامێك پێکدەهێنێت و چەند بناغەیەکی سەرەکی بەرهەم دەهێنێت لە ڕووی یەکبوونمانەوە. هەروەك لەو ڕووەشەوە کە یەکگرتن و پەیوەندیی خۆشەویستییە نەتەوەییەکان پتەو دەکات ئەوا کاریێ دەکات کە ئاوی پاکی شارستانێتی لەو ڕێڕەوەدا خوڕەی بێت و، ڕەگەزە جیاوازەکانیش دەهێنێتە یەك ئاست.

لەبەر ئەوە، با "ئاهەنگی پێشکەوتن" بە ئاوازێکی خۆش لە گوێی هەستیاری بیانییەکاندا بزرنگێتەوە.

هەروەها دەبێت حکومەت بە شێوەیەکی گونجاو لەگەڵ داب و نەریتی نەتەوەیی و زمانی نەتەوەیی و هێز و توانای بیر و بۆچوونەکاندا کار بکات، کە هۆکاری مانەوەی هەر نەتەوەیەکن، تاکو بە وێنەی هەڵمی مەکینەی پێشکەوتنی شارستانێتی "هەستی ئێرەیی" لە نێوانیاندا پەیدا ببێت، کە ئەویش پێشبڕکێ بەرهەم دەهێنێت..

---

(١) نەمانتوانی لە ڕۆژنامە بلاوکراوەکانی ئەو ڕۆژگارەدا دەقی ئەو وەڵامەی کە ئاراستەی صەباحەدین بەگ کراوە و، نوسخەی دوو سێ گوتاری پاش ئەویش بدۆزینەوە. ئەحمەد ڕامیز خاوەنی کتێبخانەی ئیجتیهاد بە سەربەخۆ و لە ژێر ناوی "گوتاری یەکەم"دا بلاوی کردبووەوە. جگە لەمە سەرچاوەیەکی ترمان نەبوو تاکو لەگەڵیدا بەراوردی بکەین. بەڵام لەگەڵ ئەو دەستنووسەدا بەرامبەرمان کرد کە مامۆستا خۆی هەڵەگیریی تێدا کردووە. (بادللی)

دەنا بیری "نامەرکەزی" کە ئەم پەیوەندیی و ڕێڕەوانـە لـە نـاو دەبـات و نایانـهێڵێت.. یاخود ئامۆزاکەی کە بریتی‌یە لە "یانە سیاسی‌یەکان"ی تایبەت بە ڕەگەزەکان، کـە هـەر لەخۆیاندا ڕقیان تێدایە بەرامبەر "مەڵبەند" لـە ڕووی ئیستیبدادەوە و بـەهۆی جیـاوازیی زۆری نێـوان ڕەگـەز و ڕێڕەوەکـان، لــە ناکـاودا دەگۆڕێـت بـۆ هـێزی "دەرچـوو لـە مەڵبەند".

ئنجا لەبەر ئەوەش ئەم بیرە لـە مەنجەڵی "فراوانکردنی ڕوخسەت پێدان" لەگەڵ "دواکـەوتوویی"دا جێـی نابێتـەوە تـاکو پێکـەوە بکولێـن، ئـەوا دەگۆڕێـت بـۆ خودموختاری‌یەك کە بە پەلە پەردەی عوسمانییەت و مەشرووتییەت دەدڕێنێت و، پاشان دەگـۆڕێت بۆ "سەربەخۆیی" دواتریش بۆ گروپە دەسەڵاتدارەکان (ملوك الطوائف). ئنجا بەهۆی هەستی ئێرەیی و بـە یارمـەتیی بـیری "زاڵبـوون" - کـە زادەی وەحشـەت و نایەکسانی‌یە - مشتومڕی ململانێ بەرهەم دەهێنێت.

ئەمـەش دەبێتـە گونـاهێکی هێنـدە گـەورە کــە لــە تـەرازووی بەرژەوەندیی‌یــە گشتی‌یەکاندا لەگەڵ چاکە زۆر گەورەکانی سەربەستیدا هـاوکێش یـاخود قورسـتر دەردەچێت.

لـە ئاستی زانستی‌یەوە هـەرگیز پۆشـاکی دەوڵـەتێکی شارستانیی وەکو ئەڵمان بـۆ باڵای توانا و لێهاتنەکانمان "کورت" یاخود "درێـژ" دەردەچێـت، چونکـە ئاستی ئێمـە و ئەوان یەك نی‌یە.

دەستوورێکی کۆنی پزیشکی‌یە کە: هەموو نەخۆشی‌یەك بە دژە سروشتەکەی خۆی چارەسەر دەبێت..

هـەر لەسـەر ئـەم بنەمایـە لـە کـاتێکدا کە پێویستە بـە ژەهـری ئیسـتیبداد نەخۆشـی "ئامـادەبوون بـۆ دووبـەرەکی" یـاخود "مـەیلی دووبـەرەکی"، کـە بـۆ مـیزاجی یـەکێتیی میللەت پێش هاتووە، لەناوببرێت یاخود بەری پێ بگیرێت، کەچی بیری "نامەرکـەزی" یاخود برازاکەی کە بریتی‌یە لە دەرگا بۆ کردنەوە و یارمـەتیدانی ئەو یانـە سیاسـی‌یانەی کە ئاوێتەی یەکتر نەبوون..

هەموو ئەمانە پێچەوانەی بنەمای دانایی و دەستووری پزیشکی‌یە.

جا ئەگەر زیرەکییەکی بەرجەستە کە سەرەتای بەدەستهێنانی سەرکەوتن و چاکەی هەرە گەورەی سەربەستی و یەکگرتنی نەتەوەییە، بە گوناهێکی گەورەی وەك "دووبەرەکی" کۆتایی پێ بهێنرێت، لە ڕاستیدا ئەو کارە زیندووکردنەوەی ئاژاوەکەیە و بریتییە لە ژیاندنەوەی ئەو دەمارگیرییە جاهیلییەی کە سیازدە سەدە پێش ئێستا مردووە. هەروەك گۆڕینی ئاسیای جێی ئاسوودەییان، بە دۆزەخ، بە کارێکی شیاوی غیرەت و بەرزیی ئەوان نازانم.

ئەو لێکدانەوەیە جوانە و، لە ڕووی بیر و هزرەوە دەتوانین لێی تێبگەین. بەڵام بەم توانایەمانەوە ناتوانین بە کردار جێبەجێی بکەین، چونکە ئەو جێبەجێکردنە کاتی زۆری دەوێت.

بۆ ئێمەش کە زۆرینەین و یەکگرتووین، ئەوا هەروەك "یەکتاپەرستی" خراوەتە ئەستۆمان، بە هەمان جۆر ئەرکی ئەو خۆشەویستی نەتەوەییەشمان پێ سپێردراوە کە بنەمای "یەکبوون" پێکدەهێنێت. خۆ ئەگەر پێویست بە ڕەگەزیش هەبێت ئەوا ئیسلامییەت بۆ ئێمە سەروزیادە.

وتاری سێ‌هەم:

## وتارێکە ئاراستەی کوردەکانی ئەستەمبوڵ کراوە

"گیان"م بە میوانیی بۆ لای "جەستە"ی حەماڵێك نارد و، بە زمانی ئەو ڕووی گوفتارم کردە حەماڵەکان و ڕوونکردنەوەم ئاراستە کردن. دەبێت کەموکووڕی‌یەکان بدرێنە پاڵ ئەم سیفەتی حەماڵی‌یە خوازراوەم!

ئەی حەماڵەکان!

ئەم هزرە لە دڵی ئێوەدا دەچێنم. چونکە دڵی ئێوە خاڵی‌یە و تێکنەچووە.

أتاني هواها قبل أن أعرف الهوى  فصادف قلباً خالياً فتمكّنا

گوێیەکم ناوێت کە گیانی ئەم بەیتە لە ئێوەدا بەرجەستە بکات. بەڵکو بە دڵ گوێم بۆ بگرن .

سێ گەنجینەی بەنرخمان هەیە کە بە ناوی شەریعەت و نامووس و غیرەتەوە داوامان لێدەکەن بیانپارێزین:

یەکەم: ئیسلامییەتە، کە خوێنی ملیۆنەها شەهیدی لەپێناودا ڕژاوە.

دووهەم: مرۆڤایەتی‌یە، کە مرۆڤی کردووە بە سەرداری جیهان.

سێ‌هەم: نەتەوەکەمانە کە پەیوەستمان دەکات بە بلیمەتانی پێشینانی زیندوومان.

جگە لەمانەش ئێمە سێ دوژمنمان هەیە کە لەناومان دەبەن:

یەکەم: هەژاری! بوونی چل هەزار حەماڵی کورد لە ئەستەمبووڵدا بەڵگەیە لەسەر ئەمە.

دووهەم: نەزانی! بەڵگەش ئەوەیە کە چل کەس لەو چل هەزارە ناتوانێت ڕۆژنامەکان بخوێنێتەوە، کە پەروەردەکاری بیر و هزرەکانن لەم سەردەمی پێشکەوتنەدا.

سێ‌هەم: دووبەرەکی! ئێستا ئێمە خاوەنی هێزێکی مەزنین کە لە چوار سەد هەزار جەنگاوەری ئازا پێکهاتووە، کەچی ململانێ و ناکۆکیی ناوخۆ ئەم هێزە تێکدەشکێنێت.

ئێمە لەم کاتەدا پێویستمان بە سێ شمشێری ئەلماس هەیە. تاکو پاریزگاری لە سێ گەنجینەکەمان بکات و، هەرسێ دوژمنەکەشمان لەناوبەرێت:

یەکەم: یەکێتیی نەتەوەیی.

دووهەم: هەوڵ و تێکۆشانی مرۆیی.

سێ‌هەم: خۆشەویستیی نەتەوە.

بەم یەکێتی‌یە ئەو هێزە نەتەوەییە مەزنە دەدەینە دەستی حکومەت، تاکو لە ڕووبەڕووبوونەوەی دەرەکیدا بەکار بهێنرێت. بەمە شایانی دادگەری دەبین و، لە بەرامبەریشدا داوای دادپەروەری و مافە ڕەواکانمان دەکەین لە حکومەت.

ئەو نەتەوەیەی کە بۆ ماوەی شەش سەد ساڵی ڕەبەق ئاڵای "تەوحید"ی لە بەرامبەر هەموو جیهانەوە بەرز ڕاگرتبوو، ئەمڕۆ بەهۆی گوێڕایەڵیی بۆ ئیستبداد و پشت هەڵکردنی لە نەریتی نەتەوەیی، پیر بووە..

ئێمە هێز و بوێری و غیرەتی خۆمان دەکەینە دیاری و پێشکەشی تورکە پێشینە بە شان و شکۆکانی دەکەین، لە بەرامبەر ئەمەشەوە سوود لە ژیری و زانیاریی ئەوان وەردەگرین و، ڕەسەنایەتیی خۆشمان دەردەخەین.

بە پوختی:

تورکەکان ژیریی ئێمەن. ئێمەش هێزی ئەوانین. هەردووک پێکەوە مرۆڤێکی باش پێکدەهێنین. کاری سەربەخۆ و سەرەڕۆ ناکەین. ئێمە بەم ویستەمان وانەی پەند بە لایەنەکانی تر دەڵێینەوە. ڕۆڵەی باش دەبێ وابێت. ئەگەر لە سەردەمی ئیستبدادا یەك باتمان گوێڕایەڵیمان کردبێت، ئەوا ئێستا پێویستە دە باتمان هەوڵ بۆ یەکێتی و گوێڕایەڵی بدەین. چونکە ئەم جارە تەنها قازانج وەردەگرین. لەبەر ئەوەی ئەم حکومەتی مەشروتییەتە حکومەتی شەرعیی ڕاستەقینەیە.

بە کورتی:

لە ڕێکەوتندا هێز هەیە.. لە یەکێتیدا ژیان هەیە.. لە برایەتیدا بەختەوەری هەیە.. لە گوێڕایەڵیی دەوڵەتیشدا سەلامەتی هەیە. پێویستە بە گەرمی دەست بە گوریسی توندوتۆڵی یەکێتی و پەتی خۆشەویستی‌یەوە بگرین.

سەعید

وتاری چوارەم:

## دەبێت هەرکەسەو کاری خۆی بزانێت و بە خراپی کەلکی لـێ وەرنەگرێت

ڕۆژنامەکان دوو ئەرکی گرنگیان لە ئەستۆ گرتووە. چونکە دوو پلە دەردەخەن:
یەکەم: پیشاندەری چاکە و خراپە.
دووەم: وتاربێژی گشتی، یاخود پەروەردەکاری بیر و هزرەکان.
ناونیشانی یەکەم داخوازی ئەوەیە: زمانی بڵاوکراوەکان، کە بە چەشنی شمشـێرێکی تیژن بۆ دەسەڵاتی میللەت و بڵاوبوونەوەی حەق، کاریگەریی خۆیان بپارێزن.
ناونیشانی دووهـەمیش داخـوازی ئەوەیـە کـە: کاتێ ئـەرکی پـەروەردە و فێرکردنی هزرەکان ئەنجام دەدەن بە شێوەیەکی ڕووکەش نەبێت. کەچی دەبینین بـە پێچەوانەوەیە! چونکە لە نـاوەندی ئـەم هـەموو زۆری و تێکـەڵ و پێکەڵی‌یەدا کاریگەریی‌یەکەی بەش بەش بووە و، هێزی خۆی لە دەست داوە و، بیر و هزرەکانی ڕووکەش کردووە و، کاتی ئەوانەش دەکوژێت کە لە هەوڵ و کۆششدان.
خاوەنی ڕۆژنامە بۆ دۆزینەوەی زەمینە دەچێـت کەسایەتی‌یەکان تێکـەڵی کارەکـەی دەکات، کە ئەوەش کانگایەکی چەپەڵە بۆ بیری تۆڵەسەندنەوە. یان بۆ پەیداکردنی چەند پولێك چـەندین گاڵتـەجاڕی و سـووکایەتی و شتی بێزراوی ئـەوتۆ بـڵاو دەکەنـەوە کـە ڕەوشـت و ئاکـاری ئیسـلامی دەلـەرزێنێت و تـۆوی ڕەوشـتە خراپـەکان لـــە زەینـــە خاوێنـەکاندا دەچێنێـت. یـاخود گرنگـترین و ناسـکترین و پەنـهانترین خـاڵی دەوڵـەت دەخەنە پێش چاوی عەوام، بەمەش کاری نابـەجێ و خۆهـەڵقورتاندن لـە کـاری سـەروو خۆیاندا دروست دەکەن. هەر ئەمەشە کە ئێمەی دووچاری ئـەم بـارەی ئێستا کـردووە. بەم کارەشیان دەرگا بۆ چەندەها خراپەکاری دەخەنە سەرپشت.
ڕێکخستنی کاری ئەم ڕۆژنامانە، یان پیادە کردنی دەستووری دابەشکردنی کـار لـە نێوانیاندا، کارێکی پێویستە.

لە ئاوێنەی ڕۆژنامە جیددییەکاندا وێنەی ناشیرینی ئەو پیرێژنە تەمەن هەشتا ساڵە دەبینرێت کە بۆ ئەوەی گوایا منداڵێکی دوو مانگ زوو گەورە بێت، دەچێ دەمی منداڵەکە پڕ دەکات لە نان و دەیکوژێت.

لە ئاوێنەی ژەنگاویی ڕۆژنامە گاڵتەچییەکانیشدا وێنەی سێ‌هەم هاوڕێ دەبینین کە لە کاتی شەڕە شیعردا بۆ ئەوەی سەرەوای شیعرەکەی تێکنەچێت کە پیتی (ث) بوو وتبووی: "امرأتي طالق ثلاثاً"! واتە هەرسێ تەڵاقی ژنەکەم کەوتبێت!

برادەرەکانیشی وتبوویان: "ئەو هەژارە گوناهی چییە؟"..

وتبووی: "بەرتەسکیی سەرەوای شیعرەکەیە"!

جا لەم ئاوێنە ڕازاوە ژەنگاوییەدا وێنەی ئەمە دەبینین.

ئەی ڕۆژنامەنووسەکان!

ئێوە بە جەربەزە و کاری بەهەڵەبردنی خوێنەر توخمەکان لێك هەڵدەوەشێنن. بەم کارەش ئامانجەکەمان کە "یەکێتی"یە و، ڕابەری ژیانمان کە پێشەکییەکانی "یەکێتی"یە، نەزۆك دەکەن .

**ئەنجامی ئەم قسانە:**

جاران (حەیدەر ئاغایەتی) هەبوو، ئێوە ئێستا کردووتانە بە (حەیدۆ). کەچی ئەوەی کە ئێمە پێویستمانە (حەیدەر)ە.

زمانی بڵاوکراوەکان لە شمشێرێکی ئەڵماس دەچێت، دەسا دەمەزەردی بکەن و میانەڕەویی پێ ببەخشن، تاکو ژەنگی زیادەڕەوی و کورتبڕی نەگرێت.

وتاری پێنجەم:

# بۆ نیازی بەگ[١]

ئەی ڕۆستەمی زاڵی سەردەم!

لە جیهانی ئەندێشەدا، کە نموونەیەکی بچووککراوەی جیهانی میساڵە، سەردانی (وێنە)ی تۆ دەکەین. چونکە ئێستا وەك هەر جوانییەکی چەشنی وشە، (وێنەی) تۆش لە نێو (واتا)دا دەردەکەوێت و لەسەر بیلبیلەی چاوی ژێریدا دەنەخشێت.

هاتم بۆ سەلانیك بۆ بەرامبەر کردنی وێنەی حەقیقەت بە شێوە مەجازییەکەت. بەڵام ڕێ نەدرا بە کۆکردنەوەی دوو وێنە پایە بڵند و مەزنەکەت، نەوەك حەسوودی و ڕوانینی خراپ و بەختی بەد کاری تێبکات. وەکو سوپاسێکی کردەیی بۆ توندوتۆڵ کردنی ئەو تەلاری بەختەوەرییەی کە تۆ دائمەزراند، نیازم وایە بڕۆم بۆ کوردستان.

(١) (نیازی بەگ): کەسایەتییەکی ئەلبانی نەژادە. گەلێ چالاکی و کاری بەنرخی ئەنجام داوە. مامۆستا بەدیعوززەمان ئەو کارە جوان و بەکەڵکانەی ئەوی بەرز نرخاندووە و، بە مەبەستی چاوپێکەوتنی ڕۆشتووە بۆ شاری "سەلانیك" (کە ئەو دەمە لە ژێر دەسەڵاتی عوسمانیدا بووە). بەڵام خوا نەیکردووە بە نسیب، چونکە هەتا دەگاتە ئەوێ "نیازی بەگ" کۆچی دوایی دەکات. بەدیعوززەمان ویستوویەتی لە هاوشێوەی کار و خەباتی نیازی بەگ گەلێ چالاکی لە کوردستان و لەناو کورداندا ئەنجام بدات، بەڵام لەبەر ئەوەی هەلومەرجی ئەو ڕۆژگارە بۆ هێنانەدیی ئەو ئامانجانە دژوار بووە، ئەوا خوای گەورە بۆی نەڕەخساند، ئەوەبوو نەیارەکانی دووریان خستەوە بۆ خۆرئاوای تورکیا. بەڵام مامۆستا لەوێش بێدەنگ دانەنیشت، بەڵکو لەپێناوی ڕزگارکردنی ئیمانی میللەتی ئەنادۆڵدا گەلێ کاری بەنرخی ئەنجام دا. خوا لێی ڕازی بێت. (پەراوێزی سەیدا ئیبراهیم خەلیل ئامەدییە، بە زاری کرمانجیی ژووروو نووسیویەتی، ئێمە گۆڕیمان بە زاری کرمانجیی خواروو)

وتاری شەشەم:

# وتارێکە دەربارەی "مەشرووتییەت"
# ئاراستەی شێخان و زانایان و سەرکردە و تاکی خەڵکی کوردستان کراوە

ئەی شێخان و زانایانی کوردی وەچەی پێغەمبەران!

لەبەر ئەوەی من لە ناوەندم، ئەوا ئاگادارتان دەکەمەوە کە:

لەم زەمانەی دواییدا هەوری ڕەشی هێزی ئیستبداد ڕووی بەرز و جوان و ڕاستەقینەی خۆری ئیسلامی شاردووەتەوە. بە ڕادەیەك کە ئیسلام لە دیدی بێگانەکاندا وەکو بەربەستێك دەبینرێت لە بەردەم پێشکەوتن و دادپەروەری و سەربەستیدا، کە هەرگیزاو هەرگیز وا نییە!

چونکە سەربەستی و یەکسانی و دادگەریی یەکەم دەستەی موسڵمانان (بە تایبەتی لەو کاتەدا) بەڵگەیەکی درەخشانە لەسەر ئەوەی کە شەریعەتی خاوێن سەرجەم پەیوەست و پێداویستییەکانی سەربەستیی ڕاستەقینە و دادپەروەری و یەکسانیی لە مافەکاندا، لەخۆدا کۆکردووەتەوە. (یەکسانی لە پەرستشەکاندا پشتی ئەمە دەگرێت).

چونکە مادەم شەریعەت گوفتارێکی ئەزەلییە ئەوا هەتا ئەبەدیش بەردەوام دەبێت.

جا هەروەك پێغەمبەران - درووديان لەسەر بێت - بنچینە و یاساکانیان لە ڕێی وەحیەوە دامەزراند و، موجتەهیدەکانیش لە ڕێی ئیجتیهادەکانیانەوە ئەحکامەکانیان هەڵگۆزی، ئێوەش ئەو ئەحکامە دادپەروەرانە بەسەر پێداویستییەکانی ڕۆژگاردا جێبەجێ بکەن و پەیوەندیی نێوانیان ڕێك بخەن!

ئەی سەرکردە ئازاکانی کورد!

ئێوە تا ئێستا شوێنی پادشا کەوتبوون و چاوتان لەو دەکرد و، لە بەرامبەر میللەتەوە، بەهۆی دەشتەکێتی و بێ ئاگاییان، زەبروزەنگتان بەکاردەهێنا، کە لەخۆیدا کارێکە

مەحکوومە بە نزمبوونەوە و تیاچوون. ئێستاش پادشا دیسانەوە ئیمامتانە، شوێنی بکەون. چونکە ئەو ئێستا بە زانست و دادپەروەری‌یەك میللەت بەرێوە دەبات کە تەمەنێکی ئەبەدی دەنوێنێت. ئێوەش وەکو ئەو رەفتار بکەن، تاکو رزگارتان ببێت. لە بری هێز و زەبر و زۆر، ژیری و دادپەروەری بەکاربێنن! لەبریی ترس و لەرز برەو بە خۆشەویستی بدەن. تاکو سەرکردایەتیتان بەردەوام بێت.

ئەنجام:

گەورەمان عەبای بەشان و شکۆی ئاغایەتیی پێشکەشی نەتەوە کرد. ئێوەش عەبای کۆن و شڕی ئاغایەتیتان بگۆڕنەوە بە پۆشاکی دادپەروەری.

ئەی یەك بە یەکی ئەو کوردانەی کە دەڵێی شێری ناو بێشەن!

ئێوە هەتا ئەمرۆ لە دوو رووەوە دیل بوون:

یەکەمیان: ئەرکی ستەمکارانەی حکومەتی خۆسەپێن.

دووهەمیان: بەهۆی دەست بەسەرداگرتن و سنوور بەزاندنی هەندێ ستەمکاری ترەوە.

بەڵام ئێستا دوای ئەم کودەتا مەزنە، ئێوە ئازادن و هەریەکەتان لە شوێنی خۆیدا وەکو پادشایەك وایە، بە مەرجێك گوێڕایەڵی خواستی دادگەرانەی حکومەتی مەشرووتییەتی مەشروع بن و دەستدرێژی نەکەنە سەر مافی کەسانی تر. هەوڵی پاراستنی ئەم پادشاییە کەسی‌یەی خۆتان بدەن و، لە رێی هەوڵ و تەقالای کەسی‌یەوە لە هەموو لایەنێکەوە چیتان لە دەست دێت بۆ خزمەتکردنی ئەم یەکێتیی میللەت و مەشرووتییەتە، دریغیی لێ مەکەن! چونکە ژیانی ئێمە، بەڵکو هی هەموو نەتەوەی ئیسلام و عوسمانی لەسەر ئەم یەکێتیی میللەتە بەندە.

ئەی کوردان بە تێکڕا!

چاوتان بکەنەوە.. وا سپێدەی بەیانە! بە ئاگابێنەوە!

با بیروبۆچوونە خراپەکان سوود لە جیاجیایی و دواکەوتنتان وەرنەگرێت، تاکو ئەم "یەکێتیی میللەت"ە بە شان و شکۆیە نەکەنە ئامانجی نەخۆشی‌یەکی کوشندە. دەنا ئەو کاتە هەموو میللەت و ئیسلام سکاڵاتان لێدەکەن.

ڕۆژگار زللەکانی خۆی دەسرەوێنێتە ئەو ململانێ و دووبەرەکییەی نێوانتان و دەیوەرێنێت. جا ئەگەر لە خەمی پاراستنی ناموستاندان، پێش ئەوەی زللە بخۆن ئەو ململانێ و دووبەرەکی‌یە فڕێ بدەن!

بەدڵنیاییەوە ئەوەش بزانن کە لە بەرامبەر ئەو شارستانێتی‌یەی هێرش بۆ هەموو لایەك دەبات، ناتوانن پارێزگاری لەو دواکەوتنە(وەحشەت)تان بکەن. دڵتان لە وشەی (وەحشەت) گەرد نەگرێت. چونکە یەکەم کەس بە خۆمی دەڵێم. گوناهەکەش هی حکومەتە. لەم حاڵەدا مەبەستم ئەوەیە کە پارێزگاری لە ناموس و کەرامەتی کوردانە بکەم.

دەسا شوێن پێی ئەلبانی‌یە قارەمان و نەبەردەکان هەڵبگرن و خزمەتی دادپەروەری و مەشرووتییەت بکەن. چونکە ئەم کارە لە حاڵی حازردا لە هەموو کەس زیاتر خزمەت بە بەختەوەریی ئێمە دەکات. چونکە لە هەموو کەس زیاتر ئێمە زیانمان لە ئیستیبدادەوە بینی.

گوایە ئەوان لە ئێمە زویر بوون و، ئێمە بەرەو لای ڕابوردوو دەدەنەبەر.

مژدەتان دەدەمێ کە بەم نزیکانە لە سەرتاسەری کوردستاندا قوتابخانە لەناوچووەکان زیندوو دەکرێنەوە و، لەو شوێنانەشدا کە هەر نی‌یە، قوتابخانە دادەمەزرێنرێت.

وتاری حەوتەم:

## چەند ڕێنماییەك[1]

کەسێکی تووڕە و هەڵچووی وەك من، کە "ڕاستی" ناکاتە فیدای هیچ شتێك، ئەگەر لەسەر ئەم توندوتیژی و زیادەڕەوی‌یە ڕەخنەی لێ بگرن، کە بەم وتانەیەوە دیارە و دژی بێ ویژدانی‌یەکی ڕوون و ئاشکرا کردوونی، ئەوا ناویژدانی‌یەکی تر دەخەنە سەر ناویژدانی.

گیانی "یانەکان" لە یەکگرتنی دڵاندایەو، تەندروستیی ژیانی حکومەتیش لە تێکەڵکردنی یانەکاندایە.

ڕاستی‌یەکی گرنگم پێشکەشی ئەو بیروڕا گشتی‌یە کرد کە پەرێشانە و بە تازەکی لە ناو چینەکانی نیازە جیاجیاکاندا چاوی هەڵهێناوە و بەئاگا هاتووە، کەچی بەرگی لێکدانەوەیەکی نرخ نەناسی هێندە ناشیرینیان کردەبەر کە غیرەت و مەردایەتی فەرمانی بێ چەند وچۆنم بۆ دەردەکەن هەر حەوت ئەندامەکەی جەستەی دەربخەم. بۆیە ناچارم پەردەی نەزاکەت بدڕێنم و، هەریەك لەو ئەندامانە لە شێوەی "ڕاستی"یەکدا بخەمە ڕوو.

ڕاستیی یەکەم:

ئەگەر مرۆڤێك بڕواتە "پلە"یەك و لە پەنجەرەیەکەوە تەماشای جیهان بکات.. گەر ئەو کەسە بالآی خۆی لەو پلەیە بچووکتر بێت، ئەوا دووچاری خۆدرێژکردن و خۆبەرزکردنەوە دەبێت، بەڵام ئەگەر بالآی لەو پلەیە بەرزتر بێت، ئەوا تووشی خۆنوشتاندنەوە دەبێت.

جا ئەگەر کەسێك بەها و لێهاتنی لەو پلەی دەسەڵاتە کەمتر بێت کە تیایدایە، ئەوا زیادەڕەوی دەکات و خۆی بە گەورە دەنوێنێت.

بەڵام گەر لە کەسانی پایە بڵند بێت، ئەوا بۆ خۆپاراستن لە زیادەڕەوی و دەرخستنی پایەبەرزیی، خۆی بە کەسێکی خاکی و بێ فیز و دەمار دەنوێنێت.

---

(١) ئەم وتارە ناونیشانی بۆ دانەنرابوو، ئێمە ئەم سەرباسەمان بۆ دانا. (وەرگێڕ)

**ڕاستیی دووهەم:**

لەبەر ئەوەی هیوا و ئاواتەکانی مرۆڤەکان بێ سنوورن و، لەم "دنیا" تەسك و سنووردارەدا جێیان نابێتەوە، ئەوا لە هەموو شتێکدا چەندین ئامانج و مەبەستی جۆراوجۆر جێ بە یەکتری لێژ دەکەن و، لەمەشەوە ئێرەیی و کێبەرکێ پەیدا دەبێت. کە ئەمەش ڕێ خۆش دەکات بۆ ئەوەی ململانێی ژیان ببێت بە مەیدانی پێشبڕکێ.

بەڵام "ئەودنیا" لەبەر ئەوەی تابلێیت فراوانە، ئەوا سەرجەم ئاواتە بێ سنوورەکان دەگرێتە خۆی و جێی هەموویانی تێدا دەبێتەوە..

هەر لەبەرئەمەیە کە لە جێبەجێ کردنی کاروباری سەر بە دوارۆژدا، کە یەکێکیان بەرژەوەندی‌یە گشتی‌یەکانە و بە "مافەکانی خوا" گوزارشتیان لێ دەکرێت، کێبەرکێ و پالپالێن نی‌یە.

هەر بە هەمان پێوەر، لەو کاروبارانەشدا کە وەکو ئاوی زوڵاڵی "ویلایەت" وان و، کەماڵی ڕاستەقینەی مرۆڤن و، هێندەی هێشووە ئەستێرەی "کۆ" بڵندن، ئێرەیی نی‌یە.

بەڵام لە شتانی بەها نزم و گوێرەیی و، لەوانەشدا کە وەکو سەراب و گڵ وان و، لەو "جوانی" و "هێز"ەشدا کە خێرا دەڕوات و لەناو دەچێت، لە ڕادەبەدەر ئێرەیی هەیە.

**ڕاستیی سێ‌هەم:**

ئەگەر ئەو یەکسانی‌یەی کە لە "پەرستش" و "مزگەوت"دا هەیە بکرێتە بناغەی کاروبارەکان و، وزەی جوامێریی نەتەوەیی کە سەر بە کاروباری دوارۆژە، تەقالا و لێبڕانی "کەسی" بکرێتە پشتگیر و یارمەتیدەری، ئەوا خۆشەویستی‌یە جوزئی‌یەکان کێشێکی گشتیی ئەوتۆ بە دەست دەهێنن کە دەتوانن بارستەیەکی مەزنی وەك کورد بە وێنەی گۆیەك بخولێننەوە.

بەڵام ئەگەر دەست لە کاروبارە تایبەتە گوێرەیی‌یەکان گیر بکرێت و، ئەوەش ببێت بە هۆی تێکدانی یەکسانی‌یە بنەڕەتی‌یەکە، ئەوا بە وێنەی خانەی میکرۆبەکان دەبێتە هۆکار و سەرچاوەی بڵاوبوونەوەی خۆویستی و ئامانجە کەسی‌یەکان. دیسانیش چارەسەری ئەوە هەر تەنها "یەکسانی"یە. چونکە هەموو کەسێك (من)ی خۆی هەیە.

ئەم بەیتە شایەتە لەسەر ئەم ڕاستی‌یە:

نە بە وەچە و نە بە ساڵە
نە بە پلـە و نە بـە ماڵە
گـەورەم! "مـەزنـی"
هـەر بـە "کـەمـاڵ"ە

ڕاستیی چوارەم:

نەخۆشێك لە سێ دۆخی جیاوازدا دەبێت لە بەرامبەر پزیشکەکەیەوە:

یەکەمیان: نەخۆش چاوی دەنووقێنێت و هیچ شتێك ناڵێت. پزیشکەکەش هیچ گرنگی‌یەکی پێ نادات، جارێك ژەهری دەداتێ و جارێکیش دەرمان. بە وێنەی حاڵی میللەت لە سەردەمی ئیستیبداددا.

دووهەمیان: نەخۆش لە دەستنیشان کردنی نەخۆشی‌یەکەیدا یارمەتیی پزیشك دەدات و، ئەو دەرمان و چارەسەرەش کە دەیدرێتێ بە ڕێکوپێکی بەکاری دەهێنێت و، داوای شتێ دەکات کە بۆ ژیانی پێویست بێت..

جا لەبەر ئەوەی نەخۆشەکە چاوی کراوەیە، ئەوا پزیشکەکەش ناچارە بە وردی و وریایی چاودێریی بکات و کاری خۆی ئەنجام بدات. بە وێنەی ئەو ڕێبازەی کە من پێم خۆشە لە "یانەکان"دا هەبێت.

سێ‌هەمیان: نەخۆش تەنها وەك "ڕەچەتە نووس"ێك دەڕوانێتە پزیشکەکەی. ئیتر بەو نەخۆشی‌یەوە دەچێت بە چێژی لاسایی کردنەوەی پزیشك، بۆ خۆی دەرمان وەردەگرێت و دروستی دەکات و بە ویستی خۆیشی بەکاری دەهێنێت. بەڵام "نەشارەزایی" وای لێ دەکات کە کارەکەی نهێنیی (إثْمُه أكبرُ من نفعِه)ی تێدا بێتە دی، چونکە بە تامی شیرینی "دەسەڵات" مەست دەبێت. بە وێنەی ڕێبازی ئێستا یاخود داهاتووی "یانەکان".

بە پوختی:

میللەت نەخۆشە و حکومەتیش پزیشکە. جا هەروەك لە خراپترین کاتدا خۆمان دایە دەستی. لە بەسوودترین کاتیشدا کاری سەربەخۆ و تاوانبارکردن لە قازانجی کەسێکدا نی‌یە کە بەرژەوەندیی گشتیی کردبێتە ئامانج.

با هێز لە یاسادا بێت، دەنا ئیستیبداد دابەش دەبێت.

ڕاستیی پێنجەم:

ئاغایەتیی ترسناك و دڕندانە ئەوەیە بە شەرەف و بەها و پلەوپایەی ئیعتیباری بنازێت کە سەرچاوەی ئیستیبدادە و، میللەت بەکار بهێنرێت و، خاترگرتن و خۆسەپاندن و لایەنگیری پێکەوە گرێ بدرێت.

جا باوکی ئاغاکان کە سوڵتان حەمید بوو لە ئامێزی دایکی ئاغاکاندا کە کۆشکی "یڵدز" بوو، وازی لە ئاغایەتی هێنا. ئیتر ئەم مێش و مەگەزانەی تر بۆکوێ ڕۆشتن!

بەڵام ئاغایەتیی ئازادی و شارستانێتی، پشت بە خود و کەماڵی خۆیی و بەکارهێنانی تواناکان و خزمەتکردنی میللەت دەبەستێت، کە دەستووری: (سید القوم خادمهم) جێبەجێ دەکات.

کەسێك کە زۆر بە توندی لافی غیرەت و پەرۆشی لێ دەدات، یاخود هەوڵ دەدات بۆ بەهێزکردنی، خۆی بەگومانە لەو غیرەت و پەرۆشییە!

ڕاستیی شەشەم:

هەندێ لە "یانەکان" لەبەر ئەوەی ئەنجامی یەکگرتنی میللەتن، سروشتی و توندوتۆڵن.

"یانەکان"ی ئێمەش لەبەر ئەوەی بۆ چارەسەرکردنی جیاوازیی نێوان شێرە کوردەکان دروستکراون و پێشەکین بۆ "یەکێتی"، ئەوا پێویستی بەوپەڕی قایمەکاری و نیازپاکی و کارامەیی و میانەڕەوی و فیداکاری هەیە (تەنانەت گیانیشی لەو پێناوەدا ببەخشێت.. تا دەگاتە خۆویستییەکانیش)..

چونکە بە "زیادەڕەوی"یەکی کەم، هەست و دەماری کەسانێکی زۆر دەورووژێت، بە تایبەتی هی گەورەکان!

لەم جۆرە بناغانەدا هەڵەیەکی بچووك، وەکو ژمارە کەرتەکان وایە، لە لقەکاندا خراپەیەکی گەورە پێکدەهێنێت.

بازنەکەش هێندە فراوانە کە جگە لە "هزری گشتی" هیچ چەترێکی تر نییە بۆ ئازادیخوازان. من بە هەموو شێوەیەك دژی "سەرۆکایەتیی تاکە کەسی"م. سەرۆکمان تەنها حکومەتە.

ڕاستیی حەوتەم:

"یانەکان" تیشکدەرەوەی بیری گشتی و ئاوێنە و تیشکۆی بوونی نەتەوەیین.

جا ئێمە، کە گوایا ژیری و زانیاریمان ئاوێتەی هێز و ئازایەتیمانە، گەر "بوون" و "نرخ"ی هزری گشتیی خۆمان بەوەی نەیارەکەمان بەراورد بکەین، ئەوا ئاستی خۆمان دەهێنینە خوارەوە.

ئەو شتەی کە بۆ ئێمە پێویستە ئەوەیە کە لەگەڵ تورکەکاندا یەك بگرین، ئەوانەی کە گوایە هێزی بە شان و شکۆی ڕابوردوویان، کە بەهۆی ستەملێکراوی‌یەوە تیاچووە، لە ژیری و زانیارییاندا تێهەڵکێش بووە.

دەبا ئەوان بمانپارێزن، چونکە حەقدەست و کرێی زۆرمان پێداون.

کاکە! ئەگەر لەم ڕاستی‌یە جوانانە تێگەیشتوویت، ئەوا بڕوانە کە چۆن بە لێکدانەوەیەکی چەپەڵ بەربەستیان لە بەردەم حەز و ڕەغبەتی گشتیدا دانا. ئەویش بەم جۆرە:

ئەوەتا تەقالای من بۆ یەکگرتنی کوردان، گوایا ئەنجامەکەی بۆ سەرۆکایەتیی کەسانی تر بێت و.. ڕق و حەسوودیم بەرامبەر بە چەند زاتێك هەبێت کە بە هیچ شێوەیەك ئێرەیی لە نێوانماندا نی‌یە و.. هەوڵ بۆ ئەو ناوبانگە بدەم کە لێی بێزارم و.. ئەو سەرۆکایەتی‌یەم بوێت کە بە ناشیرینی دەزانم..

ئیتر ئەوانە، بەم جۆرە وشە دوور لە ژیری و خۆپەرستانەیە، بەهای خۆیان پێش چاو خست.

من هەتا ئێستا لە بیری ئەوەدام کە "دووبەرەکی" بگۆڕم بە "یەکێتی". لە ترسی خۆهەڵکێشانیش زیاد لە پێویست بە گژی خۆویستیدا ڕۆشتوومەتەوە و، بە ئومێدی (إن للباطل صولةً ثم تضمحل) "ڕاستی"م لە بێدەنگیدا شاردەوە و، گەردنی چینەری تۆوە خراپەکانیش، کە ئێستا نابینرێن و لە کێڵگەی داهاتوودا بەری زەرەر و زیان دەگرن، بە زللەی ڕۆژگارم سپارد. (مَنْ لم يُؤدِّبْهُ الأبَوَان أدَّبَهُ الزمان).

ئەگەر هۆکارەکانی: تاکڕەوی و، دووبەرەکی و، خۆپەرستی و، مەیلی ئاغایەتی و، میللەت کردنە خزمەتکار و، خەڵەتێنران و، خەڵەتاندن، بە خواستێکی ئەو کوردایەتی‌یە

دەستکردە پێش چاو بخرێت، ئەوا ئێوە بە شایەت بن کە من دەست لەو جۆرە کوردایەتی‌یە دەکێشمەوە و، شانازی بەو کوردایەتی‌یە سروشتی‌یەوە دەکەم کە ناونیشانی ئازایەتی و ڕاستگۆیی و ئایینداری‌یە.

وەك ئەوەی کە لەسەردەمی ئیستیبداددا لەسەر ئەم کوردایەتی‌یە سروشتی‌یە خرامە شێتخانەوە و، بە پزیشکی شێتانم وت:

(ئەگەر ماستاوچێتی و مەرایی و لالانەوەی پشیلە ئاسا و کلکەلەقێی سەگانە و بەختکردنی بەرژەوەندیی گشتی لە پێناوی بەرژەوەندیی تایبەتیدا بە خواستی "ژیری" دابنرێت، ئەوا ئێوە شایەت بن کە من دەست لەم جۆرە ژیری‌یە هەڵدەگرم و، شانازی بە "شێتی"یەوە دەکەم).

دەسا ئەی کوردەکان!

من نەخۆشخانەی شێتانم قبووڵ کرد، بەڵام بۆ ئەوەی "کوردایەتی" لەکەدار نەکەم ویستی پادشا و مووچە و چاکەی شاهانەم قبووڵ نەکرد[1]!

سەرکەوتن هاوڕێی نیازی خاوێنە.

من کان لله کان الله لە.

والسلام.

ماتم الکلام.

---

(١) جێی پەند و سەرسامی‌یە کە لە سالی (١٣٢٤)دا و لە سێ‌هەم ڕۆژی ئازادیدا لە ئەستەمبووڵ، پاشان لە مەیدانی ئازادیی سەلانیك، بە هەموو هێز و توانای خۆم داوای شەریعەتم کرد، ئەمە لە کاتێکدا کە ئازادی و مەشروتییەتم کردبووە خزمەتکاری شەریعەت. دواتر لە ٣١ی مارتدا سوپای بزووتنەوە بەوپەڕی توندوتیژی ڕۆشت بە گژی شەریعەتخوازاندا. جا لە کاتێکدا کە ئەم وتە بڵاوکراوانەی سەعید لە (دادگای عورفی)دا بڕیاری بێ تاوانی‌یان بۆ دەرکرا، کەچی ئێستا کە ماوەی سی ساڵە * وازم لە سیاسەت هێناوە، بە بیانووی ئەوەی کە ئەم وتارانەم، با بە شێوەیەکی زۆر کەمیش بێت، پەیوەندیی بە سیاسەتەوە هەیە، ئەوا ماوەی بیست و حەوت ساڵە بێ ئایینەکان بە ناوی بێ ئایینی‌یەوە ئەشکەنجە و سزام دەدەن. بەمەش سەلماندیان کە زۆر لە دادگا تۆقێنەرەکانی مەسیحیەتی سەدەکانی ناوەڕاست ستەمکارترن، کە بە ناوی ئایینەوە ستەمیان لە میللەت دەکرد. (دانەر)

* مامۆستای دانەر ئەم پەراوێزەی لە سالی (١٩٥١)دا زیاد کردووە. (بادللی)

## بەشی دووهەم

# نووسینە وتارەکان[1]

# (مقالات)

### ڕوونکردنەوەیەك

ئەم بەشە، بریتی‌یە لە نووسینە وتارەکانی بەدیعوززەمان مامۆستا سەعیدی کوردی (نوورسی) کە لە هەردوو ساڵی (١٩٠٨و ١٩٠٩ز) دا، پاشتر هەندێکی تری لە ساڵی (١٩٢٠ز)دا لە ڕۆژنامە سیاسی و ئایینی‌یەکاندا بڵاو کردووەتەوە.

عەبدولقادر بادللی

---

(١) لێرەدا سوپاس و دەستخۆشی پێشکەشی برای ئازیز و هاوڕێی دڵسۆزم جەنابی مامۆستا سدیق ساڵح دەکەم لە بنکەی ڕۆشنبیریی (ژین) لە سلێمانی کە ژمارەکانی ڕۆژنامەی (تەعاون و تەرەقیی کورد)ی خستە بەردەستم و، سوودی زۆرم بۆ ئەم بەرگە لێ بینی. خوا پاداشتی بداتەوە. هەروەها سوپاس و دوعای خێر ئاراستەی بەڕێز ئیسماعیل یازجی بەڕێوەبەری پێشووی دەزگای پەخشی "سۆزلەر" دەکەم لە ئەستەمبوڵ کە فۆتۆکۆپیی چەند ژمارەیەکی ڕۆژنامەی (وولقان)ی پێ بەخشیم لەوانەی دەستی کەوتبوون. (وەرگێڕ)

وتاری یەکەم:

# ڕوونکردنەوەی ڕاستی سەبارەت بە تیپە سەربازییەکانی حەمیدییە[(١)]

ڕۆژنامەی: (شوورای ئوممەت)
ژمارە (٤٦) لاپەڕە (٧)
١٩٠٨/١١/١٩

**با چاوپۆشی لەو کەموکوورییە بکرێت کە لە ڕوونکردنەوەکانی کەسێکدا هەیە زمانی تورکی بە باشی نازانێت و، جارێ هونەری نووسین فێر نەبووە و، تازەکی بەئاگا هاتووە. هەروەها ڕووی گوفتاری ئەم وتارە لە "چینی تایبەتمەندان"ە، خۆ سەبارەت بەوان تەنها یەك ئاماژە سەروزیادە.**

ئەو سەربازە نەتەوەییانەی کورد کە پێیان دەوترێت "حەمیدیە" پێویستیان بە ڕێکوپێکی هەیە و هەرەمەکێتی قبووڵ ناکات..

چونکە "ڕێکوپێکی" هەم زیان ناهێڵێت و هەم سوودە گەورەکانیشی بۆ دەستەبەر دەکات.

بەڵام "هەرەمەکێتی"ی برای مردن و نەمان - کە دوورخستنەوەی زیانە بە زیانێکی تر - پێچەوانەی یاسای ئوسوولە.

هەروەها بناغەی "یەکێتی" و پەیوەندیدەرە گەورەکەی، کە کانگای پەرۆشی و پێشچاوخەری ئازایەتی و دامەزرێنەری ژیانی کوردییە، بریتییە لە "تیپە سەربازییەکانی حەمیدیە".

---

(١) ئەم وتارە کاك دکتۆر دیدار کامەران ناوەرۆکەکەی کرد بە کوردی و، منیش سەرلەنوێ بەم جۆرە دامڕشتەوە، ئنجا ئەحمەدی کوڕم لەگەڵ دەقی تورکییەکەدا بەرامبەری کرد. (وەرگێڕ)

گەر حاڵی ئێستای ئەو تیپە سەربازییانە بەراورد بکرێت بە حاڵی پێش سەربازییان، یان بەوانەی کە سوارەی حەمیدییە نین، یاخود لەگەڵ ئەو گوندنشینانەی کە تا ڕادەیەك شارستانین، لەو ڕووەوە کە ئەمان زیاتر توانای بە شارستانی بوونیان پیشانداوە، ئەوا ناونیشانی گەورەی "سەربازی" بوونی نەتەوەیی پیشان دەدات و، یەکەم پلەی پلیکانەی پێشکەوتن و بەهەشتی شارستانێتی‌یە بۆ "کورد" کە نەتەوەیەکی دەروون بەرزە و، حەزی بە ئاکارە بڵندەکانە و، مەشرووتییەت تازەکی بەئاگای هێناوەتەوە.

ناونیشانی "سەربازی" بناغەی ئەو کانزایانەی ژیانی نەتەوەیی دادەمەزرێنێت کە بە دووربینی هزری گشتی لە داهاتوودا دەیاندۆزێتەوە و، "ڕاستگۆیی" و "وەفاداری"ش توندوتۆڵ دەکات کە هەر لە کۆنەوە پەیوەندی‌یەکی نەپچڕاوی کورد بووە لەگەڵ حکومەتی عوسمانیدا.

ئەم ناونیشانە "سەربازی"یە نەتەوەیەکی تر بە ئاسانی دەستی ناکەوێت.

جا ئێستا لە کوێن ئەو شێرە کوردانە؟!

بە داخستنی ئەو پەنجەرە بچووکەی کە "مەکتەبی عەشایەر"ی پێ دەڵێن و، دەرگای بەهەشتی شارستانییەتە و، لە ڕووی سەربازییەوە بە ڕووی بێستانی زانست و زانیاریدا کراوەتەوە، بۆ دامرکاندنەوەی چالاکیی ئەو منداڵە کوردە بێچارانەی کە بە ڕووناکیی حەقیقەت ڕووناك دەبنەوە و، ئەو تابلۆ ڕەنگینانە سەیر دەکەن و، هەست بە چێژی ڕاستیی هەمیشەیی ئەو میوانە دەکەن..

ئەم کارە (واتە داخستنی ئەو پەنجەرەیە) بناغەیەکی گەورەی ڕاستگۆیی و وەفاداریی ئەوانی هەژاندووە، لەبەر ئەوەی کەوتوونەتە تاریکیی نائومێدی‌یەوە.

جا لەمەوە پەند وەربگرن.. ئەگەر بە داخستنی پەنجەرە کە ئەم شتانە ڕووبدات، دەبێت بە پێوەدانی دەرگاکە چی ڕووبدات؟!

هەروەها گەر ئەو خراپییانەی کە دەرەنجامێکی بێگومانی بێ حکومەتی و عەشایەرێتی و ناکۆکی و دەشتەکێتی‌یە، بکرێتە هۆکاری دابڕینی کوردەکان لە "سەربازی" کە هۆکاری بەرەوپێش چوونە سەبارەت بە کوردەکان، ئەوا ئەم کارە وەکو ئەوە وایە کە "زانست"ی زانایەکی گەورە بە سووك و زیانبەخش سەیر بکرێت تەنها لەبەر ئەوەی کە ئەو زانایە هەڵەیەکی کردبێت!

"حەمیدیە" تاکو ئێستا بەرگریی لە سنووری گرنگی حکومەتی لاوازی پێشوو کردووە و، کوتەکی هەڕەشە بووە لەسەر دوژمنانی وڵات و، بێ هیچ گومانێ بەربەستێکی ئاسنینیان لە دژی چەندین زیانی زۆر دروست کردبوو.

جا ئەو حکومەتە کۆنەی کە ئێستا ددانەکانی کەوتوون، تاوانێکی گەورەی کردووە کاتێ کە ئەو "ئیستیبداد"ە لەناوچووەی هێشتووەتەوە کە دوژمنی بێ ئەمانی بیر و بۆچوونی گشتییە، کە ئەویش حوکمڕانیی نەتەوە دەستەبەر دەکات..

هەروەها لەوەدا هەڵەی کردووە کە بە نانەوەی دووبەرەکی بیر و بۆچوونی گشتیی سڕیوەتەوە و، زانست و زانیاریی لەناوبردووە کە بیر و بۆچوونی گشتی ڕووناک دەکاتەوە و دەمەزەردی دەکات و، بە پشتگیریی لە "نەزانی" ئەو ڕووناکییەی کوژاندووەتەوە.

کەفارەتی ئەم تاوانە ئەوەیە کە:

حکومەتی دادگەری نوێ تا چەند ساڵێك مۆڵەتمان بدات و چاومان لێ بپۆشێت، هەتا سەرکەوتن بەدەست دەهێنین لە دامەزراندنی ئەو "یەکێتی"یەدا کە ژیانی نەتەوەیی دەستەبەر دەکات و مافەکان دەپارێزێت و بیروبۆچوونە گشتییەکان بەرهەم دەهێنێت، کە ئەویش بناغەی ئەو "زانیاری"یانە بنیات دەنێت کە بۆ خۆی دووربین و شمشێری بە بڕشت و مەشخەڵێکی ڕابەرە.

دواتر ئەگەر ئێمە حاڵی خۆمان چاك نەکرد، با بە ئەندازەی هەموو دنیا ڕەخنەمان لێ بگرن، لە ڕاستیدا تاوانەکە هەر هی حکومەتە ستەمکارەکەیە..

خۆ ئەگەر هی ئێمەش بێت، ئەوا لەبەر ئەوەی هێشتا خۆر لە خۆرئاواوە هەڵنەهاتووە، دەرگای تۆبە کراوەتەوە.

هەروەها ئەگەر ئەو گوناهبارانەی کە شارستانین و هیچ پاساوێکیشیان نییە، کەچی ڕەوشت و ژیانی حکومەتیان لە بناغەوە لەق کردووە، هەروەها خراپکارانی تریش، لێبوردنیان بۆ دەربکرێت، ئەوا کارێکی سروشتییە کە ئێمە لەبەر عوزری "نەزانی" شایستەتر بین بۆ لێبوردن و لە هەموویشیان زیاتر پێویستمان پێی بێت.

کارێکی هەڵەیە کە ئەگەر بە پێوەرێکی خەڵەتێنەر، کوردەکان بە وێنەی ڕەگەزێکی تر تەماشا بکرێن و، وەکو ئەوان فەرمانەکانیان لەسەر جێبەجێ بکرێت و هەر بەو جۆرەی ئەوانیش پەروەردە بکرێن. چونکە منداڵێك هەرچەندەش زیرەك بێت، بێ ئەوەی ئەلف و بێ بخوێنێت وانەی زانستە بەرزەکانی پێ ناوترێتەوە.

**بە پوختی:**

هەڵبژاردنی سووکەڵەترینی یەکێك لە دوو شتی خراپ، دادگەرییەکی ڕێژەییە.

با بە وێنەی "عُجالة الراکب"[1] لەمەشدا پەلە بکرێت هەتا ئامادەکاری بۆ دادگەریی ڕاستەقینە دێتەکایەوە.

والسلام.

**بەدیعوززەمانی کوردی**

(١) بەشێکە لە پەندێکی عەرەبی. (عُجالة الراکب) بە توێشوویەکی خێرای وەکو نان و خورما دەوترێ کە بێ ماندووبون بۆ ئەو کەسە ئامادە بکرێت لەسەر ڕێی سەفەرە و ئەسپی زین کردووە. ئەم پەندە لە کاتێکدا دەوترێ کە هانی مرۆڤ بدرێت بە پێداویستیی بچووك ڕازی بێت گەر لەوە باشتر لە بەردەستدا نەبوو. بڕوانە: (مجمع الأمثال للميداني، ١/٢١٠، مكتبة الحياة، بيروت، ١٩٦١). (وەرگێڕ)

وتاری دووهەم:

# کوردەکان پێویستیان بە چی‌یە؟

ڕۆژنامەی (شەرق و کوردستان)
ژمارە (١)
١٩٠٨/١٢/٣

خەڵکی کوردستان کە توخمێکی گرنگی قەوارەی کۆمەڵگای عوسمانی پێکدەهێنن، هەر چەندە بارودۆخیان لە لای حکومەت ئاشکرایە، بەڵام داواکارم دەرفەتم بدەن هەندێ داواکاری‌یان بخەمە ڕوو کە تایبەتە بە خزمەتی پیرۆزی "زانست"ەوە:

لەم دنیای شارستانێتی‌یەمان و لەم چەرخی پێشکەوتن و پێشبڕکێ‌یەدا و بۆ مەبەستی بەرزبوونەوەی پلەی زانیاری، کوردەکان - وەك برایانی تر - پێویستیان بە کردنەوەی قوتابخانە هەیە لە ناوچەکانیاندا.

هەرچەندە کۆششی حکومەت جێی سوپاسە لە ڕووی کردنەوەی چەند قوتابخانەیەك لە مەڵبەندی قەزا و گوندەکاندا، بەڵام جگە لە منداڵە تورك زمانەکان کەسی تر سوودیان لێ وەرناگرێت، ئەو قوتابیانەش کە کورد زمانن هەر ئەوەندە لە قوتابخانە تێدەگەن کە سەرچاوەی زانستە، یان دەزگایەکی زانستی‌یە و، هیچی تر سوودی لێ وەرناگرن.

خۆ نەشارەزایی مامۆستایانی ئەو قوتابخانانە لە زمانی خەڵکی ناوچەکە، کۆڵێکی تری قورسی خستووەتە سەر ئەستۆی قوتابیان و، بووەتە هۆی بێ بەش بوونیان لە زانست لە ئەنجامدا.

ئەم بارە نامۆیە کارێکی وای کردووە کە خۆرئاواییەکان بەو دواکەوتنەی کوردان خەنی و شاد بن، لە لایەکی تریشەوە گەر خەڵکی ئەو ناوچانە هەر بەو جۆرە لە کەنارگیری و ژیانی دەشتەکێتی و سەرەتاییدا بمێننەوە، ئەوا چەندین دوودڵی و گومانیان لە بارەوە دروست دەبێت.

ئەمڕۆ بە چاوی خۆمان دەبینین ئەو نەتەوانەی کە لە هەموو ڕوویەکەوە پلەیان لە خوار پلەی کوردەوە بووە، وا ئێستا سوود لە باری دواکەوتووی کورد وەردەگرن و پێشیان دەکەون، ئەم دۆخەیش کارێکی کردووە کە غیرەتمەندانی کورد بکەونە بیرکردنەوە.

ئەم سێ خاڵەی باس کران وەك مستەکۆڵێکی جەرگبڕ وان ئاراستەی کورد کراون و، دڵی کەسانی خاوەن بەسیرەتیان ئاگر تێ بەرداوە..

چارەسەرکردنیشیان بە کردنەوەی چەندین قوتابخانەی نموونەیی دەبێت لە هەموو ناوچەیەکی تیرە و هۆزەکاندا، تاکو ببێت بە هۆیەك بۆ خوێندن و هانیان بدات بۆ بەدەستهێنانی زانست. هەروەها لە شوێنە جیاجیاکانی ناو کورددا وەك: عەشیرەتەکانی "ئارتووش"و مەڵبەندەکەیان کە"بیت الشباب"ە. یەکێکی تریش لە: مەڵبەندی "مۆتکان، بەڵکان، ساسۆن"دا. یەکێکی تر لە ناوەندی: "سیپکان، حەیدەران" وەك ئەوەی کە لە "وان"دا هەیە و، هەر بە ناوی "مەدرەسە"وە زانستە ئایینی و سروشتییەکانی پێکەوە تێدا بخوێنرێت و، بەلای کەمەوە پەنجا قوتابیی تێدا بێت و گوزەرانیشیان لە لایەن حکوومەتەوە مسۆگەر بکرێت.

بەم پێیە سێ مەڵبەندی زانستی پێویستە دابمەزرێن.

زیندووکردنەوەی هەندێ لەم قوتابخانانە دەبێتە هۆی زیندووکردنەوەی ژیانی ماددی و مەعنەوی لە کوردستاندا و، ژیانی ئاییندەشی دەستەبەر دەکات و، دەبێ بە بەردی بناغەی بینای زانستی. هەر لەم سەرەتای دامەزراندنەشەوە یەکێتی دروست دەبێت.

ئیتر ئەو هێزە مەزنەی ئەوان کە لە ناکۆکیی ناوخۆدا تیادەچێت، ئەو کاتە دەدرێتە دەست حکوومەت، تاکو لە بەرامبەر دەرەوە بەکاربهێنرێت.

ئەمە هەروەك مافی ڕەوا و دادگەرانەی خۆیانە، بە هەمان جۆر گەوهەری ناو سروشتی ئەوانیش دەردەخات لەوەدا کە شایانی پێشکەوتن و شارستانێتین.

"مەلا سەعیدی مەشهوور"

وتاری سێهەم:

# ئەی گەلی کوردان!

## ئامۆژگارییەکانی بەدیعوززەمان مەلا سەعیدی کوردی[1]

ڕۆژنامەی (تەعاون و تەرەقیی کورد)
ژمارە (١)
٢٢/١١/١٩٠٨ز

ئەی گەلی کوردان!

ئیتیفاقێ دە قووەت، ئیتیحادێ دە حەیات، د برایەتی دە سەعادەت، حکومەتێ دە سەلامەت هەیە.

کابیکا ئیتیحادێ و شریتا موحەببەتێ قەوی بگرین، دا وە ژ بەلایێ خەلاس کە.

قەنج گوهێ خووە بدەنێ، دا ئەزی تشتەکی ژ وەرا بێژم:

هوون بزانن کو سێ جەوهەرا مە هەنە، حیفزا خووە ژ مە دخوازن:

یەك: ئیسلامییەت، کو هەزار هەزار خوینا شەهیدان بەهایێ وێ دانە.

ئێ دوودووا: ئینسانییەت، کو لازمە ئەم خووە نەزەرا خەلقێ دە ب خدمەتا عەقلی، جوامێری و ئینسانییەتی ئو خووە نیشانی دنیەیێ بدین.

ئێ سسیان: میللییەتا مەیە، کو مەزەبیەتێ دا مە.

ئی بەرێ کو ب قەنجی ئو خووە ساغین، ئەم ب کارێ خووە، ب حیفزا میللییەتا خووە، ڕووحێ وان قەبرا وان دە شاد بکین.

پشتی وێ، سێ دوژمنێ مە هەنە، مە خەراب دیکین:

---

(١) بە پێی ئەو زانیاریانەی کە تا ئێستا لە بەردەستدان، ئەم وتارە تاقانە بەرهەمی بڵاوکراوەی مامۆستا سەعیدی نوورسییە بە زمانی کوردی (کرمانجیی ژووروو). ئێمە خستوومانەتە سەر شێوە زاری کرمانجیی خواروو، دوابەدوای دەقی وتارەکە دامان ناوە. (وەرگێڕ)

یەك: فەقیرتی‌یە. چیل هەزار حەمالێ ئیستەنبولێ، دەلیلێ وێیە.

ئێ دوودوویان: جەهالەت و بێ خواندەنی. کو هەزار ژ مەدا یەك قازەتە نیکارن بخوینن، دەلیلا وێیە.

ئێ سسیان: دوژمنی و ئیختیلافە. کو ئەڤ عەداوەت قووەتا مە وندا دکە، مە ژی موستەحەقێ تەربیەتێ دیکە و، حکوومەت ژی ژ بێ ئینسافیا خووە زولم ل مە دیکیر.

کو وە ئەو سەح کر، بزانین چارا مە ئەوە کو ئەم سێ شووڕێ ئەلماس ب دەستێ خووە بگرین، تاکو ئەم هەر سێ جەوهەرا خووە ژ دەستێ خووە نەکین، هەر سێ دوژمنێ خووە سەر خووە ڕاکین:

ئەو شووڕێ عەدل و مەعاریف و خواندنە.

ئێ دوودوویان: ئیتیفاق و موحەببەتا میللی‌یە.

ئێ سسیان: ئینسانی ب نەفسا خووە شوغلا خووە بیکە و، مینا سەفیلان ژ قودرەتا خەلقێ هێڤی نەکە و پشتا خووە نەدەنێ.

وەسیەتا پاشی:

خواندن.. خواندن.. خواندن!

دەستێ هەڤ گرتین.. دەستێ هەڤ گرتین.. دەستێ هەڤ گرتین.

مەلا سەعید

* * *

## گۆڕینی وتارەکە بۆ زاری کرمانجیی خواروو

ئەی گەلی کوردان!

لە یەکگرتندا هێز و.. لە یەکێتیدا ژیان و.. لەه برایەتیدا بەختەوەری و.. لە حکوومەتدا سەلامەتی هەیە.

بە توندی دەست بە گوریسی یەکێتی و پەتی خۆشەویستی‌یەوە بگرن، تاکو لە بەڵا ڕزگارتان بێت.

باش گوێم لێ بگرن هەتا شتێکتان پێ بڵێم:

بزانن! ئێمە سێ گەوهەرمان هەیە کە دەخوازن بیانپارێزین:

یەکەمیان ئیسلامەتییە، کە هەزار هەزار خوێنی شەهیدانمان لە بەهایدا داوە.

دووهەمیان: ئینسانییەتە، کە پێویستە لە پێش چاوی خەلکیدا، بە خزمەتی عەقلی، جوامێری و مرۆڤ پەروەریی خۆمان پیشانی دنیا بدەین.

سێهەمیان: نەتەوایەتیمانە، کە تایبەتمەندیی بە ئێمە داوە.

پێشینانمان کە بۆ خۆیان کاردروست و ڕێکوپێك بوون، دەبێ ئێمە بە کارەکانمان و پاراستنی نەتەوایەتیی خۆمان، گیانی ئەوان لە گۆڕەکانیاندا شاد بکەین.

دوای ئەوە.. سێ دوژمنمان هەیە کە ئێمە لەناو دەبەن:

یەکەم: هەژارییە. چل هەزار حەماڵ لە ئەستەمبوولدا بەلگەیە لەسەری.

دووهەم: نەزانی و نەخوێندەوارییە. کە لە هەزار کەسدا یەکێکمان ناتوانێت ڕۆژنامە بخوێنێتەوە، بەلگەی ئەوەیە.

سێهەم: دوژمنایەتی و دووبەرەکییە. کە ئەم دوژمنایەتییەش هێزی ئێمە لەناو دەبات و، ئێمەش شایستەی تەمێ و پەروەردە دەکات. حکوومەتیش لە بێ ویژدانیی خۆیدا ستەمی لێ دەکردین.

دوای ئەوەی کە ئێوە لەمە تێگەشتن، بزانن چارەی ئێمە لەوەدایە کە سێ شمشێری ئەلماس بە دەستەوە بگرین، تاکو پاریزگاری لە هەر سێ گەوهەرەکانمان بکەین و، هەر سێ دوژمنەکەشمان لە خۆمان دوور بخەینەوە. ئەو سێ شمشێرەش:

یەکەم: دادپەروەری و زانست و خوێندنە.

دووهەمیان: یەکگرتن و خۆشەویستیی نەتەوەییە.

سێهەمیان: مرۆڤ بۆ خۆی کاری خۆی بکات و، بە وێنەی کەسانی نزم بە هیوای توانا و یارمەتیی خەلکی نەبێت و، پشتیان پێ نەبەستێ.

دوا وەسیەتم:

خوێندن.. خوێندن.. خوێندن!

دەستی یەك گرتن.. دەستی یەك گرتن.. دەستی یەك گرتن!

**مەلا سەعید**

وتاری چوارەم:

# کوردەکان پێویستیان بە چییە؟[(١)]

ڕۆژنامەی (تەعاون و تەرەقیی کورد)
ژمارە (٢)
٢٩/١١/١٩٠٨ز

ماوەی پازدە ساڵە لە نێوان ئەو پێداویستییانەدا کە بیرم لێ کردوونەتەوە، دوانیانم کردووە بە ئامانجی سەرەکیم. جگە لەو دوانەش هیچ هۆکارێکی تر شك نابەم کە داهاتووی کوردستان دەستەبەر بکات.

یەکەمیان: یەکێتیی نەتەوەیی.

دووهەمیان: گشتاندنی ئەوەی کە هاوکات لەگەڵ زانستە ئایینییەکاندا زانستە شارستانییە تازەکانیش لە قوتابخانەکاندا بخوێنرێن، کە بناغەی ئەمەش سوارەی عەشیرەتەکانن.

بە پشت بەستن بەم نهێنییە، دەتوانم بێ پەروا بڵێم:

پێویستە ئەو کەسانەی کە لە ناو عەشیرەتەکاندا نەبوونەتە سەرباز، بکرێن بە سەربازی میللی، تاکو ئەو سەربازێتییەی کە وەك تیشکی کارەبا وایە، پەیوەندییەکی کیمیایی ئاسا لە نێوان ئەم عەشیرەتە جیاوازە هاوسێیانەدا پێکبهێنێت.

بە تێکەڵکردنی هزرەکان و ئاواتەکان، جەوهەری ئەوان و بەهای ڕاستەقینەیان دەردەکەوێت و، ڕووناکیی زانستەکان و گەرموگوڕیی هێزی کوردەکانیش لە دایك دەبن.

---

(١) ناونیشانی ئەم وتارە بۆ دووهەم جارە کە دانەر بەکاری دەهێنێت. ئەحمەدی کوڕم ناوەڕۆکەکەی کرد بە کوردی و، منیش سەرلەنوێ بەم جۆرە دامڕشتەوە. (وەرگێڕ)

چونکە دەشتەکێتی و، دەمارگیری و، بێ حکومەتی، هەروەها ئەو هەژاری و دووبەرەکییەش کە ئەنجامی ستەمکاریی حکومەتن، لەگەڵ ئامانجە کەسییەکاندا بە یەکدا دێن.

ئەوان بە وێنەی زایەڵەی مەرگ هەمیشە سکاڵایان لە دەست ناوەند دەنگی داوەتەوە، چونکە لە بری سۆز و میهرەبانی هەمیشە لە لایەن حکومەتەوە زللەیان ئاراستە کراوە..

هەروەك زایەڵەی دوژمن پێ شاد بوونیان لە لایەن ناحەزانەوە دەنگی داوەتەوە، نەعرەتەی غیرەتمەندانیش لە پشتی سەریانەوە ورە و هێزی مەعنەویی ئەوانی بە چەپۆکی نائومێدی شکست پێ هێناوە و، ئەهلی بەسیرەتیشی دووچاری داخ و پەژارە کردووە.

هەروەها لە کاتێکدا کە خاوەنی چوار سەد هەزار قارەمان و جەنگاوەرن کە لە خۆیدا هێزێکی مەزن پێکدەهێنێت، کەچی ئەو هێزە هەروەك بە دووبەرەکیی ناوخۆیی لەناوچووە، ئەو ئاشووبەش کە بەهۆی دووبەرەکیی نێوانیانەوە پەیدا بووە، لە بری خۆشەویستیی باوکانە، خوڵك و بانگهێشتی ڕق و قینی ستەمکارانە دەکات.

هەروەها سڵەمینەوەی کوردەکان لە زانست و زانیارییە تازەکان، کە "گیان"ی ژیانی شارستانێتین، لەبەر ئەمانەیە:

١ – لەلایەن بیانییەکانەوە هاتوون.

٢– یەك نەکەوتن و پێچەوانە بوونی هەندێ لە بابەتە زانستییەکان لەگەڵ ئەو چیرۆك و تەشبیهاتانەی کە هەندێ کەسی عەوام بە شێوەیەکی ڕووکەش، وەکو باوەڕ و حەقیقەت وەریانگرتووە.

٣ – زانستە تازەکان لە پێش چاوی کوردەکاندا وا دەردەکەون کە دژی دەستوور و بناغەی قوتابخانە ئایینییەکان بن، کە لای ئەوان سەرچاوەی هەموو کەماڵ و بەرزییەکە.

٤ – هەندێ لە ئەهلی زانستە تازەکان بە ڕوانینێکی ڕووکەش و تەقلیدی هەندێ ڕواڵەتی ئایین فێر بوون و، بە بیروباوەڕێکی منالانە و بەو سەلیقە فەلەسەفییەی کە لە

زانستەکانەوە وەریانگرتووە دەیانەوێ بەراورد و داوەری بکەن. بەمەش دەکەونە ناو شیوی گومان و دوودڵی‌یەوە.

کوردەکان زۆر لە زانستە تازەکان دەترسن.

تەنها چارەسەری ئەم کێشەیەش بریتی‌یە لە:

کردنەوەی دەرگای بلندی سەربازی و سوارەی عەشیرەتەکان بە ڕووی قوتابخانە و زانستە تازەکاندا. هەروەها زیندووکردنەوەی قوتابخانە ئایینی‌یە پووکاوەکانیش کە کانزای بەختەوەری‌یانە و، وتنەوەی وانەی زانستە پێویستە شارستانی‌یەکان، شان بەشانی زانستە ئایینی‌یەکان، لە لایەن زانایانی کوردەوە.

**پوختەی ئەم قسانە:**

هەموو میللەتێك، بە تایبەت کوردەکان دەستاوێزی مەحکەم و ماکی ڕاستەقینەیان "یەکگرتن"ە.

جا ئەگەر ئەم یەکگرتنە کۆشکێك بێت، ئەوا "سوارەی عەشیرەتەکان" هەروەها "سەربازی" لە ژێر هەر ناونیشانێکدا بێت، بناغەیەکی درێژ و سەقفێکی توندوتۆڵی ئەو کۆشکە پێکدەهێنێت.

هەروەها ئەو شتەی کە ڕووناکی بەو کۆشکی یەکگرتن و یەکبوونە دەبەخشێت، یاخود سووری خوێنی ژیانی نەتەوەکان، کە بە وێنەی سەرچاوەی گازی هەوایە. بریتی‌یە لە زانستەکان..

سوارەی عەشیرەتەکانیش دەبن بە قوتابخانەیەکی مەزنی زانستە تازەکان و کارگەیەکی پیشەسازیی یەکجار گەورە. دەبێ حکومەتی مامۆستاشیان، بەپێی ئامادەیی و لێهاتنی سوارەکان، وانەیەکی ڕێکوپێکی‌یان پێ بڵێتەوە..

فنعم المطلوب.

والسلام.

**سەعیدی کوردی**

وتاری پێنجەم:

# یادگاری ئایین[1]

## وتاری بەدیعوززەمان سەعیدی کوردی بۆ نوێنەرانی میللەت

ڕۆژنامەی (تەعاون و تەرەقیی کورد)
ژمارە (٣) ١٩٠٨/١٢/٦ز
ژمارە (٤) ١٩٠٨/١٢/١٣ز

یا أيُّها المبعوثون! إِنَّكُمْ ﴿مَبْعُوثُونَ * لِيَوْمٍ عَظِيمٍ﴾ (المطففين: ٤-٥)!

ئەی نوێنەرانی خەڵك!

ئەو سوود و بەرژەوەندییانەی میللەت کە بە "مافەکانی خوا" گوزارشتیان لێ دەکرێت، لە بێستانی شارستانێتیدا بە "شەریعەت" ئاودێری بکەن کە ئەو کانیاوی ژیانەیە خوا ناردوویەتی، تاکو شارستانێتییەتەکەمان هەتاهەتایە بەم ژیانە درێژە بە لاوییەکەی بدات و، "دادگەریی خوایی"ش مافی پێ بدرێت و وەك خۆی دەربکەوێت. چونکە دادگەریی خوایی لەسەر عەرشی شەریعەتدا دەردەکەوێت..

ئەو ئەحکامانەش بکەن بە بەرنامەی کارتان کە لەوێوە هاتوونەتە خوارەوە، بۆ ئەوەی پێویست بەوە نەبێت کە بە بێ ڕوخسەت دەستکاری لە مافەکانی خوادا بکرێت. دەست تێوەردانیان بە بێ مۆڵەتی خاوەن ماف کارێکی دروست نابێت.

مرۆڤەکان بەڵێ ئازاد بوون، بەڵام هەر بەندەی خوان.

مستیلەی دواهەمین ئایین لە چنگی ستەمکارانەی دێوی دڕندەدا کە پێی دەڵێن "ئیستیبداد" دەنگی کپ کرابوو. بەڵام ئێستا لە پەنجەی سولەیمانی "مەشروتییەت"دا شیاو دەبینرێت، کە پێی دەگوترێت بیر و بۆچوونی گشتی و لەسەر تەختی شارستانێتی

---

(١) ئەم وتارە کاك دکتۆر دیدار کامەران ناوەرۆکەکەی کرد بە کوردی و، منیش سەرلەنوێ بەم جۆرە دامڕشتەوە، ئنجا ئەحمەدی کوڕم لەگەڵ دەقی تورکییەکەدا بەرامبەری کرد. (وەرگێڕ)

دانیشتووە و، بە پشت بەستنی بە شەریعەتی خاوێنەوە، خاوەنی هەموو تایبەتمەندییەکی گوێڕایەڵکردنە.

بەڵێ، ئەمە بە شیاو ببینن و، بە کرداریش پیرۆزبایی لێ بکەن و گوێڕایەڵی بن. مەهێڵن چنگی پیسی ئیستیبداد بەو شمشێرە خواییە سپی‌یە بگات کە هەر لە دەستی دادپەروەرانەی مەشرووتییەتدا جوانە و، بوار مەدەن بەوەی کە ئیستیبداد بیکاتە هۆیەك بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی خۆی و ئەو شتە پیرۆزە لەکەدار بکات.

ئەو گەنجینە نەبڕاوە و ناکۆتایەی چوار مەزهەبەکە، بە هەڵێنجان و نووسینی بێ گومانی ملیۆنان بلیمەت، بە وێنەی درەختی تووبا پەلوپۆی بڵاوبووەتەوە و، چ لە ڕووی سیاسەت و چ لە ڕووی بەرژەوەندی‌یەوە دەستگرتن بە هەر بابەتێکی هەر کامێکیان بە کارێکی دروست بینراوە و، نهێنیی: ﴿ولا رطب ولا يابس إلا في كتاب مبين﴾ی تەفسیر کردووە.. ئەو گەنجینەیە لێوانلێوە لەو گەوهەرانە..

کەواتە بۆ ڕێکخستن و بە دەستوور کردنی ئەو ئەحکامە دادپەروەرانە و ئەو ڕاستی‌یە بەرزانەی شەریعەتی خاوێن، سەردانی بیر و بۆچوونی گشتیی هەڵگرانی شەریعەت بکەن، تاکو ڕاستی‌یەکانی مەشرووتییەت و بڕیارەکانی یاسای بنەڕەتی بە شێوەیەکی تۆکمەتر و ڕوونتر لە شەریعەتی خاوێنەوە هەڵبگۆزن و ڕێکی بخەن، وەك ئەوەی کە بە هیممەتێکی کەم "مجلة الأحكام"یان[1] ڕێکخست. چونکە "یەکێتیی گشتی" کە پەتی توندوتۆڵی دەست پێوەگرتنە بۆ ژیانمان، بەم شێوەیە بەهێز دەبێت و دێتەدی.

جا لەبەر ئەوەی "خۆر"ی ئیسلامییەت هەتا ئێستا بە هەوری تاریکی ئیستبداد داپۆشرابوو، بە ڕەوشتی خراپ و لاوازیش لە ئایینداریدا - کە ئەنجامی ئێستان - ئەو خۆرە گیرا بوو، "مانگ"ی شارستانێتیش کە ڕووناکی دەرەوەی خۆرە، بە پەردەی

(١) (مجلة الأحكام) کتێبێکە یاسای مەدەنیی دەوڵەتی عوسمانیی تێدا تۆمار کراوە، کۆمەڵێك زانای فیقهی ئیسلامی بە سەرۆکایەتیی زانای گەورە و وەزیری دادی ئەو ڕۆژگارە "ئەحمەد جەودەت" بابەتەکانی فیقهی مەزهەبی حەنەفی‌یان بە شێوەی قانوون داڕشتووەتەوە. دواتر "مامۆستا عەلی حەیدەر" کە سەرۆکی یەکەمی داداگای تەمیز و ئەمینی فەتوا و وانەبێژی ئەو کتێبە بووە لە کۆلێجی مافەکان لە ئەستەمبووڵ، شەرحێکی گرنگی بۆ نووسیوە. لە لایەن پارێزەر "فەهمی حسەینی"یەوە بەشی "موعامەلات و جینایات"ی کراوە بە عەرەبی. (وەرگێر)

نەزانی و دواکەوتن کز کرابوو.. ئەوا لای هەندێ کەس گومانێکی پووچی وا دروست بووبوو کە گوایا ئایینی ئیسلام لەبارە بۆ ئیستیبداد و تەمبەڵی و بێکاری.

لە کاتێکدا کە (الحكمة ضالة المؤمن، أخذها أينما وجدها)[1] بناغەی شەریعەتێك بێت، ئایا بە چ بەڵگەیەك و بە چ شێوەیەك ئەو شەریعەتە ڕێگر دەبێت لە پێشکەوتن؟

دەسا ئێوە مەشرووتییەت بە ناونیشانی "مەشرووعییەت" پەسەند بکەن و، وەریبگرن و، لە زەینتاندا دایبنێن. تاکو ئەو گومانە پووچە بەدرۆ بخەنەوە و، لە چاولێکردنی هەندێ لە ئایینە ویژدانییەکانی دیکەدا، بە داماڵینی شەریعەت لە سیاسەت، ئەو گومانە پووچە پشت ڕاست مەکەنەوە..

چونکە ئایینەکەمان هەروەك مەعنەوی و ویژدانی و قیامەتی و نەقلی‌یە، بە هەمان جۆریش ماددی و سیاسی و عەقلی‌یە و، یاسای ژیان ڕێکدەخات و دابینی دەکات.

هەندێ لێکۆڵەری ئەوروپایی وتویانە کە:

(ئایینی ئیسلام لە هەندێ شوێندا تاکە هۆکارە بۆ ئەوەی مرۆڤەکان بڕۆنە ناو ژیانی شارستانی).

ئەو ئایینی ئیسلامەی کە تێکەڵی گۆشت و خوێنی موسڵمانان بووە، کاریگەریی لەسەر هەست و بیر و بۆچوونەکان هەیە و پادشایەکیشە لە ویژدانەکاندا فەرمانەکانی جێبەجێ‌یە.

جا لە کاتی ئێستادا بۆ دانانی بناغەی پێشکەوتن، پێویستە پشت بە بنچینەیەکی هێندە توندوتۆڵ ببەسترێت کە لە نێوان هزر و زەینەکاندا بە وێنەی گوزەری تەزووی کارەبا لەگەڵ ویژدانی ئەواندا گفتوگۆ بکات و لەناویاندا بڵاو بکرێتەوە.

هەروەها وەك ئەوەی کە فێرکردنی منداڵان بە ناچارکردن و زۆرەملێ‌یە، پەروەردە و فێرکردنی ئەو نەتەوانەش کە وەکو منداڵ وان، دەبێ بە زۆر بێت.

بەڵام زەبر و زۆر لەم زەمانی ئازادی‌یەدا تەنها بریتی‌یە لە شەوق و خۆشەویستی..

---

(١) واتە:

"دانست" گەوهەری ونبووی دینداره لە هەر شوێنێك دیی خۆی خاوەنداره

(وەرگێر)

ئەو شتەش کە شەوقی ڕاستەقینەی لێدەبێتەوە زایەڵەی ئایینە کە لە ویژدانەکانەوە دەردەچێت..

ئەو تایبەتمەندی‌یەش کە لەم کاتەدا بیورووژێنێت تەنها بە فەرمانی جێبەجێ کراوی شەریعەتی ئەحمەدی دەبێت، کە خاوەنی کێشکردنێکی موگناتیس ئاسای ڕۆحانی‌یە.

ئەوانەش کە لە کوردستان و عەرەبستان و ئەلبانیادان، لەم دەعوایەدا دوودڵ نین.

موگناتیزەکردنی زەینەکانی ئێستا بە هێزێکی کێشکەری ڕۆحانی تەنها بە ناوی شەریعەت دەبێت.

دەبا شیکاریی نەخۆشی‌یەکەمان بکەین و، ئنجا بە دوای دەرماندا بگەڕێین.

نەخۆشی‌یەکەمان:

نەخۆشیی بەدڕەوشتی‌یە، کە لە تەمبەڵی و نەزانی و ڕەفتاری پێچەوانەی شەریعەتەوە پەیدا بووە.

هەژاری و پێویستی و خراپکاری و فێڵ و ناوەکانی تر، کە ئەنجامی ئەوانەیە، دزیی ئاشکرایە.

جیهانی شارستانێتی نەهێشتنی ئەم خراپکاریانەی لە ئێمە دەوێت.

خۆ تیمارکردنی ئەو نەخۆشی‌یەش بە لاواز کردنی ئایین، وەکو ئەوە وایە کە بە مەبەستی تیمارکردنی زامێك لە پەنجەدا "چاو" دەربهێنرێت! چونکە نەخۆشیی دڵی ئەم نەتەوەیە لاوازیی ئایینە.

پوختەی پوختە:

بە دەستەوە گرتنی شمشێری ئەڵماسی شەریعەتی مەشرووتییەت شتێکی پێویستە، بۆ ئەوەی ئەو سێ درەختی زەقوومە لە بنەوە ببڕێت و، ئەم سێ گەنجینەی گەوهەرە یاخود ئەم سێ درەختی توبایەش بپارێزێت:

یەکەم درەختی زەقووم:

گومانی بەدی ئەورووپایە بەرامبەرمان و، هەستی نەفرەت و نامیهرەبانی و شادبوونیانە بە دواکەوتن و زیانمان کە ئەنجامی حاڵی ئێستامانن. چونکە ئەوان هەر خۆیان گومانی ئەوەیان بردبوو کە ئیسلام ڕێگرە لە پێشکەوتن و لەبارە بۆ ئیستیبداد.

**دووهەم درەختی زەقووم:**

بریتی‌یە لە بێ ئایینی، کە کانگای بەدڕەوشتی‌یە و، گەورەترین خراپەی شارستانێتی‌یە.

زەویی شۆرەکاتی ئەم درەختی زەقوومە ئەوەیە کە:

ئەگەر ئایینی ئیسلام، کە هەموو پلەیەکی کەماڵی لەخۆ گرتووە، تەنها لە ویژداندا قەتیس بکرێت، ئەوا ئایین لە شوێنێکدا دەمێنێتەوە و هەڵگرانی شەریعەتیش لە شوێنێکی دیکەدا..

ئیتر بە حوکمی تەبەعییەت هەتا بێت دوادەکەون، بەمەش ئەو درەختی زەقوومە زەمینەیەکی لەباری بۆ دەڕەخسێت.

هەر کەسێك بە چاوێکی تەبەعی و ڕووکەش تەماشای ئایین بکات، هەندێ لەو حیکایەتە ئیسلامی و تەشبیهات و ئیسرائیلیاتانەی کە بە دەمارگیری و بە بێ لێ وردبوونەوە تێکەڵی ئایین بووە و، خەڵکانێکی عەوام وەك باوەڕ و ڕاستیی ئیسلام وەریان گرتووە، ئەوا ئەو کەسانەش بە وێنەی ئەو عەوامانە پێیان وا دەبێت کە ئەو شتانە بریتی بن لە باوەڕ و ڕاستیی ئیسلام..

ئیتر لەو کاتەدا کە داوەریی زانستەکان دەکەن، دووچاری "لاوازیی باوەڕ" دەبن، کە بۆ خۆی نەخۆشی‌یەکی وەکو نەخۆشیی دڵ وایە.

**سێهەم درەختی زەقووم:**

ئەوەیە کە بە دووررویی دەچێت جیاوازی و ناکۆکی دەخاتە نێوان ڕەگەزە موسڵمانەکان و، دڵی تاکەکان دووچاری پەرتەوازەیی دەکات و، بیر و بۆچوونی گشتی تێکدەدات و دەیخاتە دووریانەوە و، حکومەتیش تووشی لەناوچوون دەکات.

چونکە عەوامترین و ترسنۆکترین کەس، بە وێنەی تایبەتمەندترین و ئازاترین کەس، خاوەنی هەستی ئایینی‌یە و، هەر شتێکی بە ناوی ئایینەوە بە گوێدا بدرێت گیانی خۆی لەپێناودا بەخت دەکات.

لە هەزاردا یەك کەس، بە شێوەیەکی ڕاستەقینە، هەستەکانی بە خۆشەویستیی وڵات و خۆشەویستیی نەتەوە و بەختەوەریی دنیا دەبزوێت.

تەنانـەت ئەوانــەش کــە هەســتی خۆشەویســتیی وڵات و نەتـەوەیان تێدایــە، بــە ڕەچاوکردنی ئایین و سەربەرزیی ئیسلام و یاساکانی ئایین، ئەو هەستەیان تێـدا دروسـت دەبێت.

کەواتە ئەگەر ئـایین نـەبێت، ئـەوا حکومـەت - کـە کەسێتی‌یەکی مەعنەوی‌یـە - لـە پێش چاوی خەڵکی عەوامدا وەکو کەسێکی هەڵگەڕاوە لە ئایین یان مرۆڤێکـی دووڕوو دەبێت و، ئنجا "یەکێتی" کە ژیانمانە و "گوێڕایەڵی"ش کە گیانی حکومەتە، لـە تـانوپۆی جاڵجاڵۆکە لاوازتر دەبێت.

گریمان سەربازێك هەبێت کە لە هەستی ڕاستەقینەی ویژدان (واتـە ئـایین لـە نـاخیدا) بێ بەش بێت، ئایا دەبێت چ فیداکاری‌یەك بنوێنێت؟

ئەگـەر شــەریعەت بەرجەسـتە ببوایـە، ئـەوا بــە وێنـەی لەعنـەتکردنی لــە شــەیتان ئیستیبدادیشی بە لەعنەت دەکرد.

دەسا شەریعەت بەلاوە مەنێن، تاکو ئیسـتبیداد بـە دەسـتی پیسـی خـۆی ئـەو وجـوودە خاوێنە لەکەدار نەکات.

**یەکەمین درەختی تووبا،** کە لە زەویی مەشرووتییەتدا نەشونما دەکات:

"یـەکێتیی گشـتی"یـە. چونکـە چ خـەڵکانی عـەوام و چ تایبەتمــەندانیش وەکـو یـەك هەستی ئایینی‌یان تێدایە.

جا ئەگەر ئایین نەبێت ئەوا عەوامی داماو دەڕۆنەوە بۆ لای ڕابوردوو، لای سەردەمی بەختەوەری، سکاڵاتان لەدەست دەکەن.

**دووهەم درەختی تووبا:**

شارستانێتی‌یەکەمانە، کــە لاوی‌یــەکی هەمیشــەیی دەنوێنێــت. چونکــە شــەریعەت هـاودەم لەگـەڵ ئـەوەدا کـە فـەرمان بـە لایەنـە باشــەکانی شارسـتانێتی دەدات، نـەهیش دەکات لە هەرزەیی و زیادەڕۆیی و ئەو نایەکسانی‌یە ترسناکەی گوزەران، کـە وا ئێستا لە پیربووندان و، شارستانێتی بەرەو لەناوچوون دەبەن.

**سێهەم درەختی تووبا:**

ئەو ئایینە تۆکمە و تەواوەمانە کە بەختی داهاتوومان بۆ دەستەبەر دەکات.

چونکە لە مەشرووتییەتدا "شەریعەت" لە جێگەی سووری خوێنە بۆ یەکەمین بناغەی شارستانێتیمان و، بە کرانەوە و پێشکەوتنی بیر و بۆچوونەکانیش، لەو حیکایەت و ئیسرائیلیات و تەشبیهانە پاك دەکرێتەوە کە شتانێکی چەپەڵن.. ئیتر بەم شێوەیە شەریعەت دەچێتە جێی سووری خوێن لە جەستەی گۆی زەویدا..

یاخود لەبەر ئەوەی خۆری ئیسلامییەت لە ئاسمانی سیاسەتدا لە هەورە ڕەشەکان ڕزگاری بووە، ئەوا مانگی شارستانێتی ڕووناك دەکاتەوە و، گوڵەکانی کێڵگەی ئاسیاش دەخاتە نەشونما و ئارایشتدان..

چونکە، لەبەر ئەوەی کە ئایین بناغەیە، ئەوا هەڵگرانی شەریعەت دەبنە بلیمەت و پیاوانی سیاسی و، ئایینی ئیسلام لەو حیکایەتانەی کە پێیان دەوترێ ئیسرائیلیات پاك و جیا دەکەنەوە.

"والفضل ما شهدت به الأعداء".

بەناوبانگترین فەیلەسووفی دنیای نوێ وتویەتی:

"ئایینی ئیسلام کە هات بە وێنەی بڵێسەی ئاگر هەموو ئایینەکانی تری هەڵلووشی کە وەکو پەلی وشکی درەختیان لێ هاتبوو. دوازدە سەدەیە بووەتە ڕێبەری ژیانی دوو سەد ملیۆن کەس و، بەوەش کە ئەم ڕاستی‌یە بەرزانەی ئیسلام لەگەڵ جیهاندا تەبا و گونجاون و، تایبەتمەندی و ڕاستی‌یەکانی خۆی پاراستووە، ئەوا ئێستا بە وێنەی ئاوێنەیەکی بریسکەدار محەممەدی عەرەبی ﷺ لەبەر چاوماندا بەرجەستە دەکات"[(١)].

**بە پوختی:**

پیشاندانی هەژاری بۆ ئەوروپا لە بواری "ئەحکام"دا و سوالکردنی "ئەخلاق" لێیان، لە کاتێکدا کە خۆمان خاوەنی گەنجینەی گەوهەرەکانین، خیانەتێکی گەورەیە لە ئایینی ئیسلام و کوشتنی ژیانی نەتەوەیە.

ئایین بۆ دنیا بەخت ناکرێت. ئایینی ئیسلامیش، کە لەسەر بەڵگە عەقلی‌یەکان بنیات نراوە، بە پێوەری ئایینێکی دیکە بەراورد ناکرێت.

---

(١) هەتا ئەم شوێنەی وتارەکە لە ژمارە (٣)ی (ڕۆژنامەی تەعاون و تەرەقیی کورد)دا بلاوکراوەتەوە، لێرەش بەولاوە لە ژمارە (٤)ی هەمان ڕۆژنامەدا. (وەرگێڕ)

بەڵێ، ئێمە پێویستمان بە "وەرگرتن" هەیە لە ئەوروپا..

پێویستمان بـە وەرگرتنـی ئـەو لایەنانەیـە کـە لـە بـەڕێوەبردنی مـاڵ و سـامان و، ڕێکخستنی هێزی جەنگی و دەریایی و، هونەری پیشەسازیدا بەکەڵکمان دێن. ئەمەش بە فەرمانی ئایینەکەمان..

ئەورووپاش تەنها "دادگـەری"ی لـە ئێمـە دەوێـت و، چاوەڕوانی شارستانێتیمان لـێ دەکات، تاکو هاوسەنگی‌یەکە تێکنەچێت.

ئێمە شەریعەتەکەمان لەسـەر ئەم دوو بناغەیـە بنیـات نراوە و، بە تـەواوەتی چـاودێرە بەسەریانەوە.

"لاوازیی ئـایین" هەریـەك لـە: برایـەتی و، ئـازادی و، شارسـتانێتی، وەکـو میـوە و گوڵێك لـێ دەکات کە لەناو لیتە و چڵکاودا ژەهراوی بوو بێت.

ئایا "شەیخەین" و "عومەرەین" و "هاروون و مەئموون" و "ئەمەوی‌یەکانی ئەندەلوس" بە لاوازیی ئایین پێشکەوتن؟!

لە سەردەمی پێشوودا، لەو کاتەدا کە ئەو وەحشیگەری‌یە لـە جیـهاندا زاڵ بـوو کـە باوکی ئیستیبدادە، "یەکسانی" و "ئازادی" و "دادگەری"یەکانی سـەرەتای ئیسـلام لـەو سـەردەمە نـاوبراوەدا، بەڵگـەی ئاشـکران لەسـەر ئـەوەی کـە شـەریعەتی خـاوێن بـەو یەکسانی‌یەی کە لە ئازادیی حـەق و دادگـەری و بەندایـەتیدا هەیـەتی، دەیسـەلمێنێت کـە سـەرجەم پێداویسـتی و پەیوەسـتەکانی یەکسـانیی مافـە گشـتی‌یەکانی لـەخۆدا کۆکردووەتەوە.

لەسەر ئەم بناغەیە، ئەم بڕیارە بێگومانە دەدەم کە:

هەتا ئێستا هـەرچی کـەموکورتی و نزمبوونـەوە و ڕەوشتی خراپمان هەیـە، لـە چـوار هۆکارەوە سەری هەڵداوە:

**یەکەمیان:**

لەبەر چاودێری نەکردنی بڕیارەکانی شەریعەتی خـاوێن و، لەبـەر پیشـاندانی هـەندێ لە ڕاستی‌یە شەرعی‌یەکان بە ناونیشانێکی دیکـە و، تـەراندن و لاوازکردنـی گوێڕایـەڵیی ویژدانیی عەوام. ئنجا بڵاوکردنەوەی هـەندێ ڕێسـای (گوایـا سـەرووی شـەریعەت) لـە

سەردەمی دواکەوتنماندا، بە بێ ڕووخسەت وەرگرتن لە شەریعەت، گەورەترین هۆکاری دواکەوتنمانە.

**دووهەمیان:**

ئەوەیە کە هەندێ لە کەسانی مەراییکار چۆنیان بوێت بەو جۆرە لێکدانەوەی خراپ دەکەن و، ئایینی ئیسلام (کە حاشا وا نی‌یە) وەها پیشان دەدەن گوایا لەبارە بۆ ئیستیبداد و ڕێگرە لە بەردەم شارستانێتیدا.

**سێ‌هەمیان:**

خیانەتکردنی دۆستە نەزانە ڕواڵەتپەرستەکانی "ئایین"ە. بەوەی کە بە جۆرە دەمارگیری‌یەکی نابەجێ هەندێ "تەشبیهات" وەکو "حەقیقەت" وەردەگرن و هەر بەو جۆرەش دەیگەیەنن.

**چوارەمیان:**

کەسانێك هەن منالْ ئاسا دەستبەرداری لایەنە باشەکانی شارستانێتی دەبن، کە بەدەستهێنانی کارێکی دژوارە و، بە شوێنکەوتنی ئەو شتانەی لەگەڵ هەوا و هەوەسیان یەکدەگرێتەوە دەچن وەکو تووتی لاسایی لایەنە بێ کەڵك و گوناهباری‌یەکانی شارستانێتی دەکەنەوە.

ئەی نوێنەرانی میللەت!

ئەگەر ئێوە بە ناوی شەریعەتەوە بڕۆنە مەیدان، ئەوا دەبنە زمانێکی بچووکی هەموو نەتەوە و، بە بانگی شەریعەتی خاوێن هەموو زەینەکان کەمەندکێش دەکەن و، فەرمانەکانتان بە گیان و ویژدان وەردەگیرێن.

ئێوە ئەهلی تەشریح (شیکار) نین، بەڵکو دەبنە ئەهلی تەرجیح و جێبەجێکاری ئەو فەرمانانەی کە پێداویستیی ڕۆژگارن.

پشتگوێ خستن و لادانێکی کەم لەم بناغانەدا، بە وێنەی ژمارە کەرتەکان وایە دوایی لە لقەکاندا دەرەنجامەکەی پێکهێنانی چەندین خراپەی هێندە گەورە دەبێت کە ئەگەرچی لە ئێستادا نەبینرێت بەڵام لە کێڵگەی داهاتوودا وەکو قارچکە مارانە زیان دەگەیەنێت.

هەڵبژاردنی سووکەڵەترینی یەکێك لە دوو شتی خراپ، دادگەرییەکی ڕێژەییە، با بە وێنەی (عُجالة الراكب)[١] لەمەشدا پەلە بکرێت، هەتا ئامادەباشی بۆ دادگەریی ڕاستەقینە دێتەکایەوە.

ئەی نوێنەرانی میللەت!

بە باشی هاوسەنگی بەکاربهێنن، تاکو ئەم بەیتەی کە دەڵێت:

(حفظت شيئاً وغابت عنك أشياء)[٢]

نەبێتە مایەی خەندەی سووکایەتی پێتان.

بە پوختی:

"دادگەری" بە هەر ناونیشانێك بێت هەر دادگەرییە، بەڵام جیاوازیی ناونیشان کاریگەرییەکی گەورەی هەیە. تەنانەت لە زانستی "مەنتیق"دا هەندێ شت لە کاتێکدا کە بە ناونیشانێك "زەرووری"یە، کەچی بە ناونیشانێکی دیکە "نەزەری"یە.

بۆ نموونە: "نوێژ" کاتێ بە ناونیشانی بەندایەتی و بە ئاراستەی قیبلە دەکرێت، کارێکی ڕاستە و نزیکییە لە خوای گەورە، بەڵام گەر بە ناونیشانی "گاڵتە پێکردن" بێت، یاخود بە ئاراستەی قیبلە نەبێت، نادروست و حەرامە. خۆ نوێژ لێرەشدا بە ڕواڵەت هەر ئەو نوێژەیە!

لەسەر ئەم بناغەیە:

"مەشرووتییەت" و "یاسای بنەڕەتی" کە پێیان دەوترێت دادگەری و شوورا، چ بەو ناونیشانەوە و چ بەم ناونیشانە شکۆدار و کاریگەرە بێت، بریتیی لە:

. . . . .[٣]

ئەگەر بوترێت:

---

(١) بۆ واتاکەی بڕوانە پەراوێزی لاپەرە (٦٣٩). (وەرگێر)

(٢) پەندێکی عەرەبییە. واتە: یەك دانە شت فێر بوویت و لەبەرت کرد، بەڵام زۆر شتی تریش هەیە کە لە کیست چوون و نایانزانیت! (وەرگێر)

(٣) لە شوێنی ئەم خاڵانەدا نووسەر هەمان دەقی ئەو بەشەی وتارێکی تری هێناوە کە لە لاپەڕە (٥٣٩-٥٤١)دا بە ناوی (بۆی شەریعەتی خاوێن) ڕابورد. بە پێویستمان نەزانی جارێکی تر لێرەشدا دووپاتی بکەینەوە، تاکو خوێنەری بەڕێز بێزار نەکات. (وەرگێر)

ئایا چۆن دەستوورەکانی شارستانێتی و ڕاستییەکانی زانستە تازەکان لـە شـەریعەتی خاوێن هەڵدەگۆزرێت و پیادە دەکرێت؟

لە وەڵامدا دەڵێم:

بڕۆنە خزمەت بیروڕای گشتیی زانایانی ئایینی و، بە زەینی ڕەخنەگرانی بسپێرن.

بە فەخر نـەبێت، لـەو ڕووەوە کـە منیـش بەشێکم لـەو گشتە، ئـەوا ڕایدەگەیـەنم کـە فەرموون پرسیارم ئاراستە بکەن، تاکو پیشانی بدەم کە لـە شـەریعەتی خـاوێندا شـتانێکی کامڵتر لـە لایەنە بەسـوود و ڕاستەقینەکانی شارستانێتی هەیـە و، دەیسـەلمێنم کـە هیـچ یەکێك لـە دەقە چەسپاوەکانی ئیسـلام پێچەوانـەی ڕاسـتییە زانسـتییە گومـان لـێ نەکراوەکان نییـە. خـۆ ئەگـەر دژ بوونێـك هـەبێت تەنـها لـە هـەندێ "نەزەرییـە" و "فـەرەزیات"ی زانستەکاندا هەیە، کە لاوانمان وەکو تووتیی چاولێکـەر بـە "یـەقین" وەریـان گرتـووە و، لـەو ڕووەوە هـەندێ لـە ڕواڵـەتی دەقـەکان، بـە لای ئەوانـەوە، پێچەوانەی مەبەست دەرچوون.

ئەی نوێنەران!

"مجلة الأحكام" نموونەیەکی باشە بۆ ئەمە. موسڵمانان چاوەڕێی شـتانی زۆر گـەورەن لە ئێوە، دەڵێی پێغەمبەر ﷺ لە چەرخی بەختەوەرییـەوە دەسـتی هـەڵبڕیوە و بانگتـان لـێ دەکات.

هەروەها با "هێز" لە یاسادا بێت، دەنا ئیسـتبداد دابـەش دەبێـت. هێزی "یاسـا"ش لـە بەهێزیی یاسادانەرەکەیەوە سەرچاوە دەگرێت. (خۆ هەر تەنها خـوای گـەورەش خـاوەن هێزی ڕاستەقینەی توندوتۆڵە).

ئەو هێزەی کە لەو یاسا خواییەدا هەیە و، لەو ڕوەوە کە بیروباوەڕی ڕاستەقینەیە، لـە ماوەیەکی کەمدا هەموو ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای نوقمی دادگەریی خۆی کرد.

لە شەریعەتدا گوێڕایەڵی کردن بۆ گەورە و کاربەدەستەکان جیـاوازە لـە ئیسـتیبداد، چونکە پایەبەرزترین کـەس لـە شـەریعەتدا ئەوەیـە کـە لـە دیلێتیـی "دەروون"ی ڕزگـاری بووە و، بەهۆی سەربەستیی شەرعییەوە بووەتە مرۆڤێکی کامڵ. هـەر لەبـەر ئەمەشـە کـە ڕێزی لـێ دەگیرێت و گوێڕایەڵییەکی ئاوێتەی خۆشەویستیی لە ڕوودا دەنوێنرێت.

ئەمە جیاوازە لەو ئیستیبدادەی کە لەسەر ترس و زۆرەملێ بنیات نراوە و، لەم سەردەمەی ئێستاماندا بەهۆی بێداربوونەوەی بیری خەڵکییەوە توانای لەدەست داوە.

ئامانجی ئەو جیاوازییەش کە لە ڕێبازەکانی هێنانەوەی بەڵگەکاندا هەیە، یەکگرتنە لە دەرەنجامەکاندا. بۆ پاراستنی هاوسەنگییەکەش پێویستە هەم هێزی ڕاکێشەر و هەم هێزی پاڵنەر هەبێت. یەکگرتنی ڕووت و پەتی تەنها و تەنها چاولێکەری بەرهەم دەهێنێت.

* * *

کەسێك لە چیاکانی کوردستاندا گەورە بووبێت، کە مەیدانی سەربەستیی ڕەهایە و.. نەچووبێتە ژێر هیچ کۆت و بەندێك لەوانەی کە ناوی داب نەریت و نەزاکەتیان لێ دەنرێت و.. هەرگیز سەربەستییەکەی خۆی بۆ هیچ شتێك و بۆ هیچ چێژێك بەخت نەکردبێت و.. تەنانەت لە سەردەمی ئیستبداددا "شێتی"ی هەڵبژاردبێت کە لەو دەمەدا ناونیشانی سەربەستی و لەبارترین زەمینەی ئازادی بووە و.. زایەڵەیەکی مەعنەویی ئەوتۆ کە لە جیهانی غەیبەوە هاتبێت لە ویژدانیدا بە وێنەی دەنگدانەوەی ئیسلامییەتەکەی، ناو دڵی ئەوی ورووژاندبێت و شەپۆلی غیرەتەکەشی جووڵاندبێت..

چاوپۆشین لە زیادەڕەوی و کورتبڕیی ئەم کەسە تووڕەیە، کە تووڕەییەکەی ڕەنگدانەوەی ئەم هەست و نەستە توندوتیژەی بێت، لەبەر پیریی ئەو کەسە، یاخود لەبەر نیازپاکیی ئەو، خواستی جوامێری و مرۆڤدۆستییە.

بس کنم، چون زیرکانرا این بس است     بانگ ده کردم اگر در ده کس است[1]

هەر بژی دادگەریی خوایی.. هەر بمێنێت شەریعەتی ئەحمەدی.. پایەدار بێت مەشرووتییەتی شەرعی!

* * *

لەبەر ئەوەی من کوردم، ئەوا لێرەدا یەك دوو وتەم سەبارەت بە کوردەکانەوە هەیە:

کوردەکان کە لە ڕێی نووسینی جەوهەری شمشێرەکانیانەوە زانست فێربوون، سڵەمینەوەیان لە زانستە تازەکان لەبەر چوار هۆکارە:

---

(١) بۆ زانیاری لەبارەی ئەم بەیتە شیعرەوە، بڕوانە: لاپەڕە (٤٤٣)ی ئەم کتێبە. (وەرگێڕ)

**یەکەمیان:**

یەك نەکەوتن و پێچەوانە بوونی هەندێ لە بابەتە زانستی‌یەکان لەگەڵ ئەو چیرۆك و تەشبیهات و ئیسرائیلیاتانەی کە هەندێ کەسی عەوام بە چاولێکەری، یاخود بە هەڵە، بە ناوی باوەڕ و حەقیقەت و ئیسلامەوە وەریانگرتووە.

**دووهەمیان:**

هەندێ لە ئەهلی زانستە نوێیەکان بە ڕوانینێکی ڕووکەش و تەقلیدی هەندێ ڕواڵەتی ئایین فێر بوون و، بە بیروباوەڕێکی منالانە و بەو سەلیقە فەلەسەفی‌یەی کە لە زانستەکانەوە وەریانگرتووە، دەیانەوێ بەراورد و داوەری بکەن. بەمەش دەکەونە ناو گومان و دوودڵی‌یەوە.

**سێ‌هەمیان:**

بە ڕواڵەت زانستە تازەکان لە پێش چاوی کوردەکاندا وا دەردەکەون کە دژی قوتابخانە ئایینی‌یەکان بن، کە لای ئەوان سەرچاوەی هەموو کەماڵ و بەرزی‌یەکە.

**چوارەمیان:**

لە ڕواڵەتدا وا دەردەکەوێت کە ئەو زانستانە لە وڵاتە بیانی‌یەکانەوە سەرچاوەیان گرتبێت.

چارەسەری ئەمەش بریتی‌یە لەوەی کە:

لە قوتابخانە سەربازی‌یەکانی سوارەکانی حەمیدییەدا هەستی ئازایەتی و بوێریی کوردان ڕەچاو بکرێت و، شانبەشانی زانستە ئایینی‌یەکان (هەر بە ناونیشانی قوتابخانە ئایینی‌یەکانی جارانەوە) زانستە نوێیە پێویستەکانیش لە لایەن زانایانی کوردەوە و بە گوێرەی توانا و لێهاتنی کوردانە، بوترێنەوە.. هەروەها بریتی‌یە لە زیندووکردنەوەی قوتابخانە ئایینی‌یە پووکاوەکانی کوردستان و، سپاردنی دامەزراندنی قوتابیی دەرچوو بە "پەروەردە" و "ئەوقاف" کە ئەمە لای کوردان جێی بایەخ و گرنگی‌یە.

بۆ ماوەی پازدە ساڵ ئەم بیرۆکەیە کاری تایبەتیم بووە. وا ئێستا دەیخەمە پێش چاوی ڕای گشتی، تاکو ببێتە کارێکی گشتی، چونکە کاتی هاتووە.

**مەلا سەعیدی کوردی**

وتاری شەشەم:

# گفتوگۆ (١)

## دەرەنجامی وتاری پێشوو

ڕۆژنامەی (تەعاون و تەرەقیی کورد)
ژمارە (٦)
١٩٠٨/١٢/٢٧ز

من بیرو بۆچوون و داوایەکی چوارگۆشەم هەیە.
یەکەمیان:

ئێمە پێویستمان بە وەرگرتنی لایەنە باشەکانی شارستانێتیی ئەوروپا هەیە..
بەلآم خۆ لایەنە خراپەکانی شارستانێتیی ئەویش هاودەم لەگەڵ لایەنە باشەکانیدا پێش دەکەون و، بە شێوەیەکی نـامۆ و خەڵەتێنەر تێکەڵی یەکتری بوون. لەناوبەرترینی ئەو لایەنە خراپانەش، کە بارێکی گرانن بەسەر شارستانێتییەوە و بەرەو داڕمانی دەبەن، بریتین لە: هەرزەیی و، خواستی ناپێویست و، زیادەڕۆیی بەکارهێنان و، نایەکسانیی سەرسوورهێنەر لە نێوان ژیان و گوزەرانی خەڵکیدا.
جا لەسەر ئەم بناغەیە و بۆ ئەوەی شتە خراپەکانی ئەوان هاوکات لەگەڵ لایەنە باشەکاندا نەیەنە ناو شارستانێتیی ئێمەوە، پێویست دەکات یاسایەکی دەسەلآتدار و هەڵسەنگێنەرمان هەبێت کە بەسەر هەوا و ئارەزوودا سەربکەوێت. چونکە ئێمە خووی منالآنەمان هەیە.

---

(١) ناونیشانی وتارەکە بە زمانی تورکی بریتییە لە (موصاحەبە) کە بە چەند واتایەکی وەك: دیدار، چاوپێکەوتن، وتووێژ، دێت. جا لەبەر ئەوەی لە تورکیدا بە ئاخاوتن دەڵێن: صوحبەت، ئەوا ناونیشانی (گفتوگۆ)مان بۆ کوردییەکەی پەسەند کرد. ئەم وتارە دکتۆر دیدار لە وەرگێڕانی ناوەرۆکەکەیدا ڕەنجی کێشاوە و، ئێمەش لە داڕشتنەوەیدا کارمان کرد و، ئەحمەدی کوڕیشم ئەرکی بەراوردی لەگەڵ دەقە تورکییەکەدا گرتە ئەستۆ. (وەرگێڕ)

**دووهەمیان:**

هەروەك ئەوەی کە ئەگەر کەسێك لەسەرکردە دەمارگیرەکانی کورد بە مەبەستی مەرایی کردن بۆ ئەوروپا جلوبەرگی ئەوان لەبەر بکات، ئەوا کوردەکان لەبریی گوێڕایەڵی بۆ کردنی سووکایەتیی پێدەکەن.. خۆ ئەگەر بزانن کوردیشە، ئەوا لەبەر ئەوەی جلوبەرگی نەتەوەیی گۆڕیوە، دەڵێن: "سووکایەتی بە نەتەوەکەی خۆی کردووە"..

بە هەمان جۆر، لەم سەردەمی مەشرووتییەتەشدا کە دەسەڵاتدار کەسی خۆسەپێن نییە، بەڵکو یاسایە کە مافی هەموو شتێك لەبەرچاو دەگرێ، ئەوا پێویستە ئەم یاسایەش پۆشاکێکی نەتەوەیی هەبێ، دەنا دەمارگیریی مەعنەوی لە دژی ئەو یاسایانە رادەوەستێت.

**سێهەمیان:**

ڕەگەزە ناموسڵمانەکان لە بەردەوامیی "دادگەری" و "یەکسانی" و "ئازادی" بە تەواوی دڵنیا نابن ئەگەر ئەم یەکسانی و دادگەرییە بە پشتگیرێکی توندوتۆڵەوە پەیوەست نەکرێن. ئەوەش هەر تەنها ئایین و شەریعەتە کە خالّی نەگۆڕ و دەسەڵاتداری ناو ویژدانە.

جا ئەگەر ئەم دادگەرییەی کە خواستی ئایینە پێش چاو بخرێت، ئەوا بە تەواوی ئەوانیش دڵنیا دەبن. نەك بە وێنەی گومانی بایەخنەدەرەکان کە ناتوانن هیچ گومانێکی خۆیان بشارنەوە. چونکە یەکگرتن لە "هودا"وە سەرچاوە دەگرێت، نەك لە "هەوا" و ئارەزووەکانەوە.

خۆ ئەگەر لەویشەوە پەیدا ببێت، ئەوا بە شێوەیەکی کاتی دەبێ. لەبەر ئەوەی هەوا و ئارەزووەکان بە وێنەی بەچکە دووپشك وان؛ دەبنە سەرچاوەی ئامانجە تایبەتەکان و خۆپەرستیی مرۆڤەکان.

**چوارەم:**

زانایەکی تووڕە کە ڕەفتارە خراپەکانی لە تووڕەییەکەیەوە سەرچاوە بگرێت، گەر ئەوە بکرێتە هۆکارێکی گشتی بۆ لێکدانەوەی هەموو ڕەوشێکی تری، ئەوا مەگەر بەو

چاوە سەیر بکرێت کە بۆ خۆی زانایەکی باشە و، کردەوە خراپەکانی ئەنجامی توورەیین، دەنا زانستەکەشی پێ لەکەدار دەبێت.

بەپێی ئەمە و بۆ ئەوەی خراپکاریەکانی ئیستیبداد و سەردەمی پێشوو، ئایین و شەریعەت لەکەدار نەکەن، پێویستە مەشرووتییەت لە پۆشاکی شەریعەتدا پیشان بدرێت و، یاساکانیشی جێبەجێ بکات و، چاو لە سەردەمی خەلیفە ڕاشیدەکان و عومەری کوڕی عەبدولعەزیز بکەین.

**ئەگەر بوترێ:**

خۆ ئێمە بە وێنەی ئەوان دڵپاکی و ڕەوشت جوانیمان تێدا نییە هەتا بتوانین چاویان لێ بکەین..

**دەڵێم:**

کامڵ بوونی بنەماکان و گشتگیریی شارستانێتی لە لای ئێمە، کە دەرەنجامی مەیلی پێشکەوتن و بێداربوونەوەی هزری گشتییە، جێی ئەو دڵپاکی و ڕەوشت بەرزییە دەگرێتەوە. دادگەریی دەوڵەتانی بیانی ئەمە دەسەلمێنێت.

جیاوازیی شارستانێتی ئیسلام لەگەڵ شارستانێتیی سەردەمدا، تەنها لەوەدایە کە ڕێ لەو ڕەفتارە خراپانە دەگرێت "نەهی"یان لێ کراوە و مرۆڤ دەکەنە دیلی دەروونی بەدخواز. جگە لەوەش، پۆشاکی ئافرەتانە شایانی بالآی جوانی توانا و لێهاتنی نەتەوەییمان نییە، چونکە ئەگەر پیاوێك پۆشینی جلوبەرگی ئافرەتێکی پێ جوان بێت، ئەوا لە بەرچاوی خەڵکیدا ڕسوا دەبێت. هەروەها بە پێچەوانەشەوە.

**پوختەی ئەمانە:**

لەسەر سنووری ئازادی و شارستانێتیماندا، بە شمشێری شەریعەت ڕێ لە هاتنە ژوورەوەی لایەنە بەد و خراپەکانی شارستانێتی دەگرین، تاکو شارستانێتییەکەمان هەتاهەتایە لەم ئاوی ژیانەی شەریعەت بنۆشێت.

ئەگەر شارستانێتیی ئیسلام جەستەیەکی زیندوو بێت، ئەوا "شەریعەت" خوێنی ناو دەمارەکانی و، ئایینیش گەرمیی سروشتیی ئەو جەستەیە دەبێت. ئنجا لەبەر ئەوەی شەریعەتی خاوێن لە گوفتاری ئەزەلییەوە هاتووە، دەبێ هەتا ئەبەدیش بەردەوام بێت.

سەرهەڵدانی هەموو ئەو پێغەمبەرانەی کە زانیاریمان لەبارەیانەوە هەیە – درووديان لەسەر بێت – لە قەڵەمڕەوی عوسمانیدا، نیشانە و ئاماژەیەکە لە لایەن قەدەری خوای گەورەوە بۆ ئەوەی کە مەکینەی کامڵ بوونی مرۆڤەکانی ئەو قەڵەمڕەوە تەنها بە هەڵمی ئاییناری دەکەوێتە گەڕ، گوڵەکانی "ئاسیا" و "ڕۆم ئەیلی"ش هەر بە ڕووناکیی ئایین گەشە دەکەن.

لەسەر ئەم بناغەیە: ئەرکی بەرزڕاگرتنی وشەی (الله) لە ئەستۆی هەموو ئیمانداریکدایە. گەورەترین هۆکاری ئەنجامدانی ئەو ئەرکەش لەم ڕۆژگارەدا بریتییە لە پێشکەوتنی ماددی. پێویستە هەموو کەسێك لە شوێنی خۆیدا لە دژی دوژمنانی پێشکەوتن تێبکۆشێت. گەورەترینی ئەو دوژمنانەش دوژمنانی ناوخۆ و نادیارن، ئەوانەش سێ دوژمنی گەورەن، یەکەمیان هەژاری، دووهەمیان نەزانی، سێهەمیان ناکۆکی و جیاوازی. لە لایەن ئایینەکەشمانەوە ئەرکی جیهادمان لە ئەستۆدایە لە دژی ئەو سێ دوژمنە.

بۆ ئەمەش دەبێ سێ شمشێری ئەڵماس بگرینە دەستمان: یەکەمیان خۆشەویستیی نەتەوەیی، دووهەم یەکێتی، سێهەم بەدەستهێنانی زانست.

جیهادی دوژمنانی دەرەوەش بە شمشێری ئەڵماس ئاسای بەڵگە گومان بڕەکانی ڕاستییەکانی ئیسلام دەسپێرین. جیهاد لەم سەردەمەدا بە دەربڕینی خۆشەویستی و خۆخۆشەویست کردن دەبێت لای بەرامبەر، نەك بە ترساندنی.

بە پێچەوانەی دەقی پیرۆزی ﴿ولا تَجَسَّسُوا﴾ هیچ کەسێ لە ترسی نهێنگرەکان نەیدەوێرا مافی دەسەڵاتی خۆی ڕایی بکات و، ڕۆژنامەکانیش بە پێچەوانەی نیوەی تری ئایەتەکە: ﴿وَلا يَغْتَبْ بَعْضُكُمْ بَعْضاً﴾ و بە وێنەی نهێنگرە کۆنەکان پشێوی و دوودڵییان خستووەتە ناو بیری هەموو کەسێکەوە. بەڵام بە داخەوە ئەوانەی کە ئامادەن بۆ زیادەڕەوی، شایانی ئەوەشن کورتبڕی بکەن.

ئەی زانایان! وا بەم جۆرە لەگەڵ ئێوەش دەدوێم:

زانایان لە هەموو کاتێکدا چاولێکەری میرە خۆسەپێنەکان بوون و، هەرکەسێك هزری یەکێك لەوانی قبووڵ نەکردبێت، جۆرە ئیستیبدادێکیان بەرامبەر نواندووە.

ئێستا "مەشرووتییەت" لە ئارادایە. "دەسەڵاتدار" کەسی خۆسەپێن نییە، بەڵکو "ڕای گشتی" گیانی شوورایە. دەسا ئێوەش لە زانستدا شوێن جۆرە مەشرووتییەتێك بکەون، چونکە ئیستیبداد بەرهەمەکانی پێشکەوتن لەناودەبات و مرۆڤەکان بەرەو ڕابوردوو دەباتەوە و، پشت لە داهاتوو هەڵدەکات. دڵۆپەکانی ئاو گەر جیاجیا بن وشك دەبنەوە، بەڵام ئەگەر کۆببنەوە، حەوزێك ئاوی ژیان پێکدەهێنن.

زیاد لەوەش دەڵێم:

هاوکاریی هێز لەو شتانەدا کە سەرتاپا مەعنەوییەکی پەتین، هیچ کاریگەرییەکی نییە و، یەك دانە و هەزار دانە وەکو یەکن، بەڵام لەبەر ئەوەی بنەمای شتە مەعنەوییەکان لە شتە مادییەکانەوە سەرچاوە دەگرێت، ئەوا بە وێنەی هەڵگرتنی بەردێکی گەورە وایە؛ پێویستی بە هاوکاری و ڕاگۆڕینەوە هەیە. لەم چەشنە بابەتانەدا دەستووری: (للکل حکم لیس لکل) پیادە دەکرێت. ئەورووپا لەسەر بناغەی ئەم نهێنییە و نهێنیی دابەشکردنی کارەکان، پێشکەوتن و زانستی خۆی بنیات ناوە.

هەروەها ئەگەر ڕای گشتی لە شووراوە سەرچاوە بگرێت، ئەوا بیدعەتەکانی هەندێ لە باوەڕە نارەواکان و پیرە گومراکان، کە سەرجەمی موسڵمانانیان خەمبار کردووە و، بە وێنەی خاشاك و دڕك و داڵ وان.. هەروەها ئەو دەمارگیرییەی کە گەلێ خراپەی لەخۆ گرتووە و ئەو دەربڕینە ناڕێك و پڕ لە هەڵانەش کە لە نەزانییەکی ئاڵۆزەوە سەرچاوەیان گرتووە، هەموویان لەناودەچن و، و ڕاستییە پاك و بریسکاوەکانی ئیسلام بە ڕوونی دەردەکەون.

والسلام علی من اتبع الهدی.

ئەوەی کە لە وتاری پێشوودا نووسراوە: "إختیارلغنه باغیشلامق" (واتە بەخشین بە ئیختیار)، هەڵەیە، ڕاستەکەی بەم جۆرەیە: "إختیارسزلغینه باغیشلامقدر" (واتە بەخشین لەبەر نەبوونی ئیختیار).

**مەلا سەعیدی کوردی**

وتاری حەوتەم:

# زانستی (1)

ڕۆژنامەی (تەعاون و تەرەقیی کورد)
ژمارە (٦)
١٩٠٨/١٢/٢٧ز

**ڕوونکردنەوەیەك:**

ژاپۆنییەکان کە ئێستا دامەزرێنەری شارستانێتیی خۆرهەلاتن و وانەیەکی پەندمان پێ دەلێنەوە، بە نیازی ئەوەی ژیان بکەن بەبەر شارستانێتییە ماددییەکەیاندا سۆراخی ئایین دەکەن..

هەر لەو ڕووەوە چەند پرسیارێکیان ئاراستە کردم. منیش لە لایەنی خۆمەوە وەلامێکم دانەوە(2).

جا بۆ ئەوەی کە هێزی ئەو وەلامە تاقی بکەمەوە، کە ئایا دەتوانێت بەناو شیوی مەزنی نێوان کاتی ڕابوردوو و کاتەکانی داهاتوودا تێپەڕ ببێت، یان بە وێنەی نەریت و هزرە دوور لە ڕاستی و پیربووەکانی ڕابوردوو لاواز و بێ هێزە و، هەر بە کەلکی ڕابوردوو دێت؟

بەم نیازە، وا ئێستا ئەم وەلامە بە دیاری پێشکەشی بیروڕای گشتی دەکەم، تاکو مەیلی گشتینەی خەلکیی بۆ لا ڕابکێشم. وەك خزمەتێکیش ورە و چالاکی بە هەول و تەقالای کەسانی تازە پێگەشتووی وەك خۆم ببەخشم.

---

(١) لە ژمارە (٦)ی ڕۆژنامەی تەعاون وتەرەقیی کورددا دوو وتاری مامۆستا نوورسی بلاوکراوەتەوە، کە ئەمە دووهەمیانە. ئەم وتارە دکتۆر دیدار ناوەرۆکەکەی وەرگێڕاوە و، ئێمەش بە داڕشتنەوەیدا ڕۆشتینەوە و، ئەحمەدیش ئەرکی بەراوردی لەگەل دەقە تورکییەکەدا گرتە ئەستۆ. (وەرگێڕ)

(٢) بۆ زانیاری لەسەر ئەو پرسیارانەی کە ژاپۆنییەکان ئاراستەی دانەریان کردووە، بڕوانە پەراوێزی لاپەڕە (٣٩)ی ئەم بەرگە. (وەرگێڕ)

گەر ئەم زادەی بیر و سروشتەم و ئەم بەروبوومەی دڵم، لە ڕووی شێوازەوە ئێستا لەگەڵ بازنەی فراوانی ئازادیدا نەگونجێت و، شایانی خواستەکانی بیروڕای شکۆداری گشتی نەبێت، خۆ چوار ڕووی ناوازەیان تێدایە کە ئومێد دەکەم ببنە هۆی ئەوەی کە بە گشتی بەهایەکی بەرزیان هەبێت:

ڕووی ناوازەی یەکەم: میوەی چیایە. چونکە ئەو وتانەی کە ئێستا لە چیاکانی کوردستانەوە دەردەچن، شێوەیان لە وتەی سەدەکانی سەرەتا دەچێت. لەو لایەنەوە دەڵێی ئێمە لە شوێنی خۆماندا نەجووڵاوین. چونکە تا ئێستا ئەوەمان بە خۆمان ڕەوا نەبینیوە کە ئازادی‌یە ڕەهاکانمان بۆ شارستانێتی‌یەکی زەلیلانە و ناڕەوا و هەرزە بەخت بکەین.

ڕووی ناوازەی دووهەم: سروشتی بوونیەتی. واتە لەگەڵ سروشتمدا یەکدەگرێتەوە. چونکە هزری کەسێکی دەشتەکیی وەك من کە لە "سروشتی ڕەسەن"ەوە سەرچاوە دەگرێت، لە داوەریدا پتر دڵنیایی دەبەخشێت و، شتێکی سروشتی و نوێ‌یە..

بەڵام هزری دەستکرد، چەندەش ڕێکوپێك و تەواو بێت، هێشتا هەر جێی سروشتی‌یەکە ناگرێتەوە. هەروەها بە وێنەی گوفتاری سروشتی وایە؛ هەست و نەستی قسەبێژ دەردەبڕێت و، لە دەمی خوێندنەوەیدا لە بەرامبەر ڕوانینی ئەندێشەوە کانزای کوردێکی وەك من بەرجەستە دەکات و، وێنەیەکی ڕاست و دروستی لایەنە مەعنەوی‌یەکانی ئەو لە زەیندا دەکێشێت.

سێ‌هەمیان: شێوازە نامۆکەمە، کە سەرنجی وردبوونەوە و ڕامانی ئەو زەینە ڕووکەشانە بە لای خۆیدا ڕادەکێشێت کە لەسەر خوێندنەوەی زۆر و، خێرا و، خووپێوەگرتوو ڕاهاتوون. ئەوەتا ئاکار و هەست و نەستە نامۆکانم لەگەڵ پۆشاکەکانمدا گونجاون. جا کاتێ کە "واتاکان"ی منیان بە جوان هەڵسەنگاند، داوای "شێوازێکی نووسین"یشیان لێ کردم کە لە پۆشاکەکانم بچێت، منیش دڵی ئەوانم نەڕەنجاند، بەڵام شێوە درووماني توركی بە باشی نازانم.

چوارەمیان: بریتی‌یە لەوەی کە ئەم وەڵامە خۆی لە خۆیدا: لاوە، پیرە، دەشتەکی‌یە، شارستانی‌یە، ئازادێکی ڕەهایە، ئازادێکی پابەندە. تەمەنیشی دوومانگ لە تەمەنی ئازادی زیاترە. دەڵێی ماوەی تەنها شەش مانگ، پەنجا ساڵ بگرە گەلێ کاتی زۆری

لەخۆدا پێچاوەتەوە. چونکە لەو کاتەوە کە ڕۆژنامەی "تەرجومانی ئەفکار" لە دایك بووە هەتا ئێستا گەر بە ڕۆژنامەیەکی تر بەراوردی بکەین، پێمان وا دەبێت کە چەندین سەردەم لەم نێوانەدا تێپەڕیوە و، ڕۆژنامەیەکە لە ئاوێتەکردنی ئازادیی ڕەهای دەشتەکێتی و ئازادیی سنووورداری شارستانێتییەوە پەیدا بووە و، دەڵێی کەڵەشێری عەرشە لە ڕێی ئیلهامەوە بە بانگی ناسینی کردگار دەخوێنێت و، ئەم کودەتا مەزنەش، بە وێنەی کەڵەشێرێکی دەمی بەیان، بە دەنگی خۆی زەینە نوستووەکانی لەخەو بێدار کردەوە.

ئومێد دەکەم کە سەرەتا و کۆتایی ئەم وەڵامە، واتە شکۆمەندیی بابەت و ئامانجەکەی و، گرنگیی هۆکارەکانی، سەرجەم کەموکوورییەکانی بپۆشێت.

"جیازی"ی کیژۆڵەی بیرم شێوازی نامۆیە و، پێشەکیی مارەییەکەشی لێ وردبوونەوەیەتی. هەروەها کارێکی سروشتییە کە یەکەم ئەزموون، یەکەم نووسین، یەکەم دانان، کەموکورتیی تێدا بێت و دەرگاکەشی داخراو بێت.

هەروەها من لە چەند ڕستەیەکی دوور و درێژدا وتوومە، تاکو شێوەی "حەقیقەت" پارچە پارچە نەبێت و، بازنەیەك بە دەورانەوری حەقیقەتدا بگێڕم کە سنووورداری بکات. خۆ ئەگەر من لە توانامدا نەبوو بیگرم و بە دەستی ئێوەی بسپێرم، دە فەرموون ئێوە بە وردەکاریی خۆتان بەدەستی بهێنن.

لە سەردەمی پێشیندا شاعیرەکان لە بەرهەمە جوانەکانی ناو دیوانەکانیاندا و، گەلێ کەسیش لە زانایان لە پێشەکیی دانراوەکانیاندا بە شان و باڵی دەسەڵاتدارێکدا هەڵیاندەدا لەوانەی کە لەسەر ڕێبازی خەلیفە ڕاشیدەکان نەبوون و، بەم کارەشیان دەستیان بەسەر لایەنە جوانەکانی خەڵکدا دەگرت و پێشکەشی ئەو دەسەڵاتدارەیان دەکرد و، بە شێوەیەك مەدحیان دەکردن وەك بڵێی ئەو چاکەکارییانەی کە هی میللەتن لەو کاربەدەستانەوە پەیدا بووبن! بەم کارەشیان هێز و توانایان بە ئیستیبداد دەبەخشی.

لایەنە بەدەکانی ئیستیبدادیشیان وا دەبینی کە لابردنیان لە توانادا نییە. بۆیە لە پەردەی ئەو وشانەدا کە واتاکانیان کاریگەریی بەجێ دەهێشت بە ناوی سکاڵا و ڕەخنە گرتن لە ڕۆژگار و چەرخی گەردوون، سکاڵاکانیان لە دەست ئیستیبداد دەردەبڕی.

"دادگەریی پەتی" لە ژێر سایەی مەشرووتییەتی شەرعیدا، مەگەر تەنها ئەفلاتوون لە شارە باشە نموونەییەکەیدا گریمانی ئەوەی بۆ دانابێت کە نموونەی جوانیی ڕاستەقینەی ئەو شارستانێتییە بەرجەستەیەی بێت.

بەڵام من وەکو کەسێکی ئەم سەردەمە گەر یەکێك بوومایە لەوان، ئەوا بە پێچەوانەی ئەو نەریتەی ئەوانم دەکرد کە لابردنی ئیستیبدادیان بە مەحاڵ دەبینی و، بنیاتنانی بناغەی ئەو شارە نموونەییەشیان بە مەحاڵێکی ئاسایی دەزانی.

بە کورتی پرسیاری یەکەم لەگەڵ وەڵامەکەیدا بە وێنەی "بابەتێکی قسە لەسەرکردن" پێش چاو دەخەم. درێژپێدانەکانی دواتری دەرەنجامی ئەم بابەتە بە وێنەی ئەو مەسەلانەیە کە پێوەرەکانی خۆیان لەگەڵدایە. ئەویش بەم جۆرە کە لە پرسیارەکەیاندا وتیان:

"بەڵگەی ڕوون لەسەر بوونی بەدیهێنەر چییە؟".

وەڵام:

"بەڵگەی ڕووناك و ژیانی گەرموگوڕ و چاوی بینەری جیهان حەزرەتی محەممەدە ﷺ و، ئەو زمانی دڵی هیدایەتەیە کە محەممەد ﷺ زمانی ئەوە":

[الذي نظره النَّقّادُ أدقُّ مِن أنْ يُدَلَّسَ عليه، ومسلَكُه الحقُّ أغْنى مِن أنْ يُدلِّسَ على الناس].

واتە: ئەندێشە ناتوانێت ڕوانینی ڕووناکی بەخشی ئەو داپۆشێت. چونکە ئەو کەسەی کە ڕێبازی حەقی گرتبێتەبەر، پێویستی بە فێڵ و چەواشەکاری نییە[1].

ئەم گوفتارەش ئاماژەیە بۆ بەرپەرچدانەوەی دوو دەستەی گومڕا.

وا ئێستاش دەست بە وەڵامی پرسیارەکە دەکەم.

(ماویەتی)

سەعیدی کوردی

(١) لە لاپەرە (٢٣٦)دا، دانەر ئەم برگەیەی جوانتر ڕوون کردووەتەوە. (وەرگێڕ)

وتاری هەشتەم:

# میوەی چیاکان ئەگەر تاڵیش بن هەر دەرمانن[1]

## پرۆگرامێکە بۆ پێرستی ئامانج و بیروبۆچوونەکانی بەدیعوززەمانی کوردی

ڕۆژنامەی (وولقان)
ژمارە:
(٨٣) بەرواری ١٩٠٩/٣/٢٤
(٨٤) بەرواری ١٩٠٩/٣/٢٥

ئەی ئەو کەسەی کە دەڕوانێتە ئەم وتە تێکەڵ و پێکەڵانەم!
بە سەرنجێکی زۆر وردەوە بیخوێنەرەوە..
خۆ ئەگەر بەهۆی خوێندنەوەی پەلەوە تێگەیشتنی هەڵەت لە لا دروست بوو، ئەوا گەردنت ئازاد ناکەم. تۆش مەیخوێنەرەوە!

ڕوونکردنەوەی مەبەستەکەم ئاراستەی کەسانی زیرەك کراوە، دیارە ئەوانیش ئاماژەیەکیان سەروزیادە بۆ تێگەشتن. هەر بۆیە چاوپۆشینیان لە کەموکورتییەکانم - کە هی دەشتەکێتی و زمان نەزانیمە - خواستێکی جوامێریی خوێنەری ئازیزە، چونکە قوتابخانەی ئەدەبیی من چیا گەردنکەشەکانی کوردستانە.

من لەو ڕووەوە کە پەیوەندیم بە هەریەك لە ئیسلامییەت و زانستە ئیسلامییەکان و زانایان و قوتابیێتی و عوسمانێتی و خەلافەت و یەکێتیی محەممەدی و کوردایەتییەوە هەیە، چونکە لە تێکەڵبوونی چەشنی بازنە یەکتربڕەکانی ئەم سیفەتانەوە کۆمەڵەکان کۆدەبنەوە..

(١) ئەم وتارە دکتۆر محەممەد خالید ناوەرۆکەکەی وەرگێڕاوە و، ئێمەش دامانڕشتووەتەوە، دوای ئەوە ئەحمەدیش ئەرکی بەراوردی لەگەڵ دەقە تورکییەکەدا گرتە ئەستۆ. (وەرگێڕ)

هەروەها لەبەر ئەوەش کە مەیلی "پێشکەوتن" لە هەر دەستەیەکی کۆمەڵایەتیدا – بە وێنەی جەستەی بە نەشونما – بێدارکەرەوە و بزوێنەرە بۆ گۆڕینی ئەو توانا و لێهاتنانەی کە ئاوێتەی گەوهەری ژیانیانە بۆ دۆخی کردار..

ئەوا بۆ بێدارکردنەوەی ئەو گەوهەری ژیانە و، خستنەگەڕی ئەو مەیلی پێشکەوتنە، من بیروبۆچوونی خۆمم هەیە سەبارەت بە هەر یەك لەو دەستە و تاقمە کۆمەڵایەتییانە.

## ماددەی یەکەم

بۆ بێدارکردنەوە و دەستەبەرکردنی گەوهەری ژیانی جیهانی ئیسلامی و کاراکردنی مەیلی "پێشکەوتن" تیایدا پێویستە "مەشرووتییەت" بگیرێتەبەر کە بریتی‌یە لە دادگەری و ڕاوێژکاری. بۆ ئەم مەبەستەش با چوار مەزهەبەکە، کە ڕوونکەرەوەی یاسا ئیسلامی‌یە ئەزەلی و ئەبەدی‌یەکانن، بکرێنە بنەما و سەرچاوە.

دەنا قەناعەت نەکردن بەو مەسەلە شەرعییانەی کە وەك دەریای عومان وان و لە لایەن ملیۆنان کەسی بلیمەتەوە بۆ بەدەستهێنانی پاداشتی دوارۆژ هەڵێنجراون و، لە بریی ئەوە سوالکردن لە ئەوروپا لە ڕووی "ئەخلاقی" و "ئەحکام"ەوە و، پیشاندانی هەژاری، تاوانێکی گەورەیە بەرامبەر بە ئایینی ئیسلام.

چونکە لەبەر ئەوەی لە مەشرووتییەتدا یاسا فەرمانڕەوایە، ئەوا دەبێت بەرگی میللیی ئیسلامی بە بەری ئەم یاسایە بپۆشرێت، تاکو "دەمارگیریی مەعنەوی" پەرپەرچی سەرکردایەتیی ئەو نەداتەوە.

لە "مەشرووتییەت"دا، کە شەریعەتی خاوێن تیایدا خاوەن بڕیارە، سێ درەختی زەقووم لە بنج و بێخدا دەردێن و، لە جێگایاندا سێ درەختی تووبا نەشونما دەکەن و پەلوپۆ دەهاوێژن.

درەختە زەقوومەکان بریتین لە: بێ ئایینی..

دووبەرەکی و دووڕوویی..

گوناهـ و لایەنە خراپەکانی شارستانێتی و، گومانی بەدی بیانی‌یەکانیش پێمان کە شاد و خۆشحاڵن بەو گومانەیان.

درەختە تووباکانیش:

یەکگرتنی گشتی، بەهۆی هێزێکی بکێشی ڕۆحانی..

پێشکەوتن، لە ڕێی کرانەوەی شەریعەت و پاکژکردنەوەی ئایین لە زیادەڕەوی..

پشت بەستن بە خاڵە بەهێزەکانی ئایین.

"مەشرووتییەت" ڕێیەکە بەرەو کرانەوەی بەختی داهاتوومان و، نەتەوە کەمینە ناموسڵمانەکانیش لە بەردەوامیی مەشرووتییەت دڵنیا دەکرێنەوە.

بە هەموو هێزێکمەوە دەڵێم: هیچ لایەنێکی جوانی شارستانێتی نییە کە ئایینی ئیسلام، چ بە ڕاشکاوی چ بە ناوەڕۆك چ بە ڕێپێدان، لە خۆی نەگرتبێت، یاخود باشتری لە لا دەست نەکەوێت.

بەڵام بەداخەوە هەندێ کەسی منداڵ سیفەتی شوێنکەوتەی هەوا و هەوەس، لایەنە خراپە لەخشتەبەرەکانی شارستانێتی بە چاکە تێگەیشتوون و، دەچن وەکو تووتی لە پێشدا لاسایی ئەوە دەکەنەوە.

هەروەها "مەشرووتییەت" فەرمانبەردارێکی گوێڕایەڵی شەریعەتە، لێی دانابڕێت.

سەرنجتان بۆ لای ئەوە ڕادەکێشم کە:

ئەو ئیستیبدادە ستەمکارەی کە هیچ پەیوەندییەکی بە شەریعەتەوە نەبوو، تەنها بۆ ئەوەی میللەت لەخشتە ببات پەیوەندییەکی وەهمیی وێنا دەکرد لە نێوان خۆی و شەریعەتدا. کەچی هەر بەو پەیوەندییە وەهمییەش بوو کە پارێزگاریی لە خۆی دەکرد لە بەرامبەر هێرشە ناوخۆیی و دەرەکییەکانەوە..

بەڵام ئێستا لەپێناوی مانەوەی مەشرووتییەتدا، کە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی بە بنچینەکانی شەریعەتەوە هەیە، پشت بەستن بەو هێزە بەرز و شکۆدارە (واتە شەریعەت) کارێکی یەکجار پێویستە.

## ماددەی دووهەم

بۆ چارەسەرکردنی ئەو زیادەڕەوی و کورتبڕییەی کە لە "بەگومڕادانان" و "نەزانکردن"ی نێوان هێزەکانی سوپای زانستە ئیسلامییەکاندا ڕوو دەدات، کە ئەهلی قوتابخانە ئایینییەکان و خانەقاکان و قوتابخانە تازەکانن و، لەرزەی بە بناغەی ڕەوشتە

ئیسلامی‌یەکان خستووە و ئاهەنگی پێشکەوتنی تێکداوە، پێویست دەکات جیاوازیی نێوان بیروبۆچوون و مەشرەبەکان لابرێت و، هزرەکان یەکبخرێن و مەشرەبەکانیش لێك نزیك بخرێنەوە.

هەروەك ئەوەی کە ئامێرەکانی کارگەیەکی مەزنی ڕێکوپێك هەموویان خزمەتی یەك ئامانج دەکەن و، ژوورەکانی کۆشکێکیش دەرگاکانی بە ڕووی یەکتردا دەکرێنەوە، پێویستە هەریەك لە قوتابخانە ئایینی‌یەکان و خانەقاکان و قوتابخانە تازەکانیش، پشتی پەیوەندیی نێوان خۆیان بگرن و، هەریەکەیان ژوورێکی دەرگاکراوەی کۆشکی مەزنی ئیسلام بنوێنن و، هۆڵەکەشی حکوومەت بێت. تاکو هەریەکەیان کەموکورتیی ئەوی تر پڕ بکاتەوە و، یاسای "دابەشکردنی هەوڵ و کۆشش" جێبەجێ بکەن.

پشتگیری و تۆکمە کردنی پەیوەندیی نێوانیان بەم شێوەیە دەبێت کە:

لە خوێندنگە بەرزەکاندا ڕاستی‌یەکانی ئیسلام بە بەڵگەی گومان بڕەوە بوترێنەوە و.. لە قوتابخانە ئایینی‌یەکانیشدا، لە بریی زەلکاوی ئەو "حیکمەت"ە کۆنەی کە پێشتر دەخوێندرا، زانستە شارستانی‌یە پێویستەکان بخوێنرێن و.. زانای یەکجار بەتواناش بۆ تەکیە و خانەقاکان دابین بکرێت.

## ماددەی سێ‌هەم

بریتی‌یە لە دامەزراندنی "مەشرووتییەتی زانستی" لە دەوڵەتی زانستیدا! تاکو هەڵچوون و هەڵکشانی "هزرە گشتی‌یەکان" سەرجەمی ئامانجە کەسی‌یەکان و، خۆویستی‌یەکان و، گومان و دوودڵی‌یەکان، قووت بدات. چونکە هەر زانایەك کاتێك کە دەیەوێت بیری خۆی بەسەر هەمواندا بسەپێنێت، ئەوا ڕێ بۆ لاسایی و چاولێکەری دەکاتەوە و، ڕێگاش دەگرێت لە لێکۆڵینەوە و گەڕان بە دوای حەقیقەتدا. بەم کارەش جۆرە "ئیستیبدادێکی زانستی" دێتە کایەوە.

**بە پوختی:**

ئیستیبداد چ لە "بەڕێوەبردن" و چ لە "زانست"دا بێت، بەرهەمی هەوڵ و تێکۆشان لەناو دەبات و، دەست بەسەر داهاتووشدا دەگرێت. دەبێ لە بەڕێوەبردندا هێز لە

"یاسا"دا بێت و، لە زانستیشدا دەبێ هێز لە "حەق"دا بێت. دەنا ئیستیبداد خۆی دەسەپێنێت.

### ماددەی چوارەم

پێویستە لەناو قوتابخانە ئایینییەکان و لە سنعەتە جۆراوجۆرەکانی قوتابیێتیدا یاسای "دابەشکردنی هەوڵ و کۆشش" پەیڕەو بکرێت و، ئەو چەشنە هزرە گشتییەش بکرێتە مامۆستای مەعنەوی کە لە ئالوگۆڕی بیروبۆچوون و مونازەرەی ناو کۆبوونەوەکانەوە پەیدا دەبێت، تاکو لە دەمی قوتابی بوونیدا گەوهەری ناو سروشتی ئەو بێدار ببێتەوە و، ئارەزووی بەرەوپێشچوونی چالاك ببێت و، حەزی نوێخوازیشی دەربکەوێت.

به پوختی:

هەروەك لە دەولەتدا بیروبۆچوونە گشتییەکان فەرمانڕەوایە، دەبێ موفتیی ئەو دەوڵەتەش "هزری گشتی"ی زانایان بێت و، مامۆستاکەشی "بیری گشتی"ی قوتابیان بێت، بۆ ئەوەی مەشرووتییەت بە یەکسانی و گونجاوی جێبەجێ ببێت.

لە شەریعەتدا کۆدەنگی(إجماع)ی نەتەوە بەڵگەیەکی گومان بڕە. خۆ ئەمەش ڕادەی گرنگی و نرخی "بیری گشتی" دەردەخات.

### ماددەی پێنجەم

ئامۆژگاران و وتاربێژەکان، کە ڕابەری گشتین، پێویستە "زانای لێکۆڵەر" بن، تاکو بتوانن لە ڕێی بەکارهێنانی بەڵگەوە قەناعەت بە گوێ بیستان ببەخشن. چونکە لە بەرامبەر کەسێکەوە کە بە دوای "حەقیقەت"دا عەودالْ بێت هەرگیز وێنە بۆ کێشان و ڕازاندنەوەی بابەتی قسەلەسەر کراو سوودێکی نابێت..

هەروەها دەبێت "دانای وردەکار" بن، تاکو لە دەمی تەرغیب یان تەرهیبی شتێکدا بەهای شتی لەوە گرنگتر دانەبەزێنن و، هاوسەنگیی شەریعەت نەترازێنن..

هەروەها پێویستە "ڕەوانگۆی دانا" بن، تاکو ئەو قسانەی کە دەیکەن یەکاویەك دەربچێت لەگەڵ خواستی حاڵ و مەقامدا و بۆ پێداویستییەکانی ڕۆژگار دەست بدات و بۆ دەستنیشان کردنی دەردەکانیش بگونجێت.

## ماددەی شەشەم

چالاك کردنی "مەیلی پێشکەوتن"ە لە دەوڵەتی عوسمانیدا. ئەویش بەم جۆرە:

مادەم مایەی ژیـان و ئـایینی ئـەم دەوڵەتـە ئـایینی ئیسـلامە، ئـەوا بـەرزڕاگرتنی شـان و شـکۆی ئیسـلام ئـەرکی سەرشـانی هـەموو تـاکێکی ئـەم دەوڵەتەیـە و، بەرزکردنـەوەی وشەی (اللّه)یش لە ئەستۆی هەموو موسڵمانێکدایە.

جا مـادەم لـەم سـەردەمەدا گـەورەترین هۆکـاری ئـەو بەرزکردنەوەیـە "پێشـکەوتنی مـاددی"یـە و، مـادەم گـەورەترین دوژمنـی پێشـکەوتنیش "نـەزانی" و "هـەژاری" و "دووبەرەکی"یە، ئەوا لە بەرامبەر هەموو ئەو دوژمنانەدا و، بـە نـاوی ئایینـەوە و، لـە ڕێـی شمشێری زانست و هەوڵی مرۆڤانە و یەکێتی‌یـەوە، ئێمـە یـەکدەگرین. بـەڵام لـە بەرامبـەر دوژمنـی دەرەوەدا، لەبـەر ئـەوەی ئـەو دوژمنانـە شارسـتانین، ئـەوا پێویسـتە بـە هـزر و بـیر بەسەریاندا سەربکەوین، ئەرکی ئەو جیهادەش بە بەڵگەکانی شـەریعەت دەسپێرین.

## ماددەی حەوتەم

خەونێکە لەبارەی خەلافەتەوە.

لە جیهانی مەعنادا پادشام بینی. وتم:

تـۆ زەکـاتی تەمـەنی خـۆت لـە ڕێبازەکـەی عومـەری دووهـەمدا بەسـەر ببـە، تـاکو گشـتینەی خـەڵکی ڕووی خۆیـانت ئاراسـتە بکـەن، کـە هـەر ئـەوەش واتـا و نـاوەرۆکی بەیعەتە و لە پێداویستیی سەرۆکایەتیی مەشرووتییەتە.

پادشا وتی:

باشە ئەگەر من بە ڕێی ئەودا ڕۆشتم، ئایا ئێوەش دەتوانن بە وێنەی خەڵکانی ئەو کاتـە بن؟ پاشان ئەی ئەو هێزە ئیسلامی و، پاکی و، ڕەوشت جوانی‌یەی ئەوان؟..

من وتم:

ئەم بێداربوونەوەیە لە هزر و بـیری گشـتیدا و، کـامڵ بوونـی بنـەما و هۆکـارەکـان و، گشتگیریی شارستانێتی لە لای ئێمە، جێـی ئـەو خاڵانـە دەگرێتـەوە. ئنجـا نـەك تەنـها ئـەو خاڵانـە بـە دەسـت دەهێنێـت، بـەڵکو پێشـکەوتنیش بەرهـەم دەهێنێـت کـە دەرەنجامـە خوازراوەکەیە. دادگەریی دەوڵەتانی بیانی ئەمە دەسەلمێنێت.

ئەو وتی:

من چۆن بکەم؟

وتم:

لەبەر ئەوەی ئیستیبداد خوێنی لەو ئەستەمبوولەدا نەهێشتووە کە دڵی وڵاتە، تۆ نیازخاوێنی بنوێنە..

هەروەك بە بێ ڕشتنی خوێن "مەشرووتییەت"ت قبووڵ کرد و شەفەقەتت پیشان دا، بە هەمان شێوە یڵدزی نەفرەت لێکراویش بکە بە خۆشەویستی دڵان و، لە بریی زەبانیەکانی پێشوو پڕی بکە لە زانایانی لێکۆڵەر کە مەلائیکەتی میهرەبانین، با یڵدزیش وەکو زانکۆی لێ بێت..

زانستە ئیسلامی‌یەکان ببووژێنەرەوە و، "خەلافەت" و "مەشیخەتی ئیسلامی"یش بۆ پێگەی بڵندی خۆیان بەرز بکەرەوە..

نەخۆشیی دڵی میللەت کە لاوازیی ئایینە و نەخۆشیی سەریشی کە نەزانی‌یە، بە سەروەت و سامانەکەت چارەسەر بکە، تاکو یەڵدز هێندەی هێشووە ئەستێرەی "کۆ" بەرز ببێتەوە و، خانەدانی عوسمانیش لە بورجی خەلافەتدا ببێتە ڕووناکی پرژێنی دادپەروەری..

لە پێداویستی‌یە ناچاری‌یەکاندا دەست پێوە بگرە، تاکو ئەو میللەتە داماوەی کە لەسەر هەڵەخەرجی ڕاهێنراوە و هیچ دەسەڵاتێکیشی بەسەردا نی‌یە، چاوت لێ بکات، مادەم ئیمامیانیت.

لەناکاو بە ئاگا هاتم. بینیم:

ئەم جیهانی بێداری‌یە خەونە و، حەقیقەت و بێداربوونەوەی ڕاستەقینەش ئەو خەونە بوو کە بینیم!

## ماددەی هەشتەم

بناغەی یەکێتیی "یانە"ی توخمەکانی تر، کە لە حوکمی بناغەی دەستە جیاجیاکانی داهاتوودان، هەروەها بناغەی خاڵی پشتیوانی ئێمەش کە "یەکێتیی محەممەدی"یە، با بەرامبەر بە ناموسڵمانەکان نەفرەت و ڕەفتاری نابەجێ نەنوێنن، چونکە لەبەر ئەوەی

ڕێبازی ئێمە تەنها و تەنها ڕێبازێکی ئەخلاقی و ئایینی‌یە، ئەوا جگە لە سوودێکی یەکجار مەزن هیچ جۆرە زیانێکیان لە ئێمەوە پێناگات[١].

دەبا ئەوانیش ئێمە بە خۆیان بەراورد نەکەن، چونکە لە مێژە "میللییەت"یان بەسەر ویژدانی ئایینی‌یاندا سەرکەوتووە.

زیاد لەوەش، ئێمە ئەوان بە شارستانی دەزانین، خۆ سەرکەوتنیش بەسەر شارستانی‌یەکاندا تەنها بە خۆشەویستی و قەناعەت پێ بەخشین دەبێت. تەنانەت لە دڕندەترین کاتدا ئەم هەموو ئایین و نەتەوە جیاوازانە بە فەرمانی: ﴿لا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ﴾ (البقرة: ٢٥٦) لەناو شارستانێتیی ئیسلامدا بە پارێزراوی مانەوە.

جا هەرکات بێزاری لەم "کۆمەڵە"یەی ئێمە دەربڕن، ئەوا کارەکەیان بە: ناشایستەیی لە ئاستی "مەشرووتییەت"دا و بە ناپاکی بەرامبەر بە نیشتمان دادەنرێت و، بە داواکاریی ناڕەوا دەبینرێت.

پاشان پێویستە بیانی‌یەکان بە بەرزی و جوانی ئەم کۆمەڵەیە بنرخێنن، چونکە لەبەر ئەوەی لە سەردەمەکانی پێشوودا بیانی‌یەکان کێوی و ناشارستانی بوون، ئەوا یەکێتیی محەممەدی ناچار بوو لە بەرامبەر وەحشیگەریی ئەوانەوە دەمارگیری و ڕکەبەرایەتی بنوێنێت..

ئێستا ئەو پاساوە نەماوە، چونکە ئەوان بوونەتە شارستانی. خۆ لە ئایینیشدا سەرکەوتن بەسەر شارستانی‌یەکاندا بەوە دەبێت کە قەناعەتیان پێ ببەخشرێت و، بە کردار ئایینیان هێندە بەرز و جوان پیشان بدرێت کە شایانی خۆشویستن بێت. نەك بە وێنەی ئەو دوژمنایەتی‌یە ناچاری‌یەی کە لە بەرامبەر کێوی‌یە ناحاڵی‌یەکانەوە دەنوێنرا.

بەڵام زۆر بە داخەوە هەندێ کەسی لاسار و بایەخنەدەر، کە ناوی ئیسلام و غیرەتیان هەڵگرتووە، بیانووی گەڵحۆیانە دەهێننەوە و دەڵێن: "سوودی مانگ تەنها لەوەدایە کە سەرخۆشان لە ڕووناکی‌یەکەیدا مەی بخۆنەوە و، سودی خۆریش تەنها لەوەدایە کە لە شوێنە پیسەکاندا ماددە ڕزیووە بەسەرچووەکان بۆگەن پێ بکات". ئنجا لە ڕوانگەی

(١) لە (وولقان)دا ئەم ڕستەیەش هەیە: "ئێمە بۆ ڕاگیرکردنی هاوسەنگیی دەوڵەت، جگە لە ئیسلام هیچ میللییەتێکی ترمان نی‌یە". (بادللی)

ئەم بۆچوونەیانەوە و، بۆ ڕێگرتن لە مەی خواردنەوە و بڵاوبوونەوەی بۆنە چەپەڵەكان، دەڕۆن بە گژی مانگ و خۆردا!

بە هەمان جۆر، ئەوانەش دەچن "شەریعەتی خاوێن" كە لە هەموو شتێ مەزنتر و پیرۆزترە و "یەكێتیی محەممەدی"ش كە خزمەتكارێكی قیامەتیانە و ڕاستەقینەیەتی، بە "كۆمەڵە" دنیاییەكانی خۆیان بەراورد دەكەن كە وەكو ئامرازێك بۆ ئامانجە بەد و دەسكەوتە نزمەكان بەكاری دەهێنن. بەم بەراوردەشیان گریمان بۆ شتی مەحاڵ دادەنێن و، بەسەر خۆری حەقیقەتدا كەشوفش دەكەن.

نەخێر، ئەم دووانە زۆر لە یەكەوە دوورن.. لە كوێ هێشووە ئەستێرەی "كۆ" دەبێتە گسك؟ یان لە كوێ بە وێنەی هێشووی ترێ دەخورێت؟

خۆ لە كاتێكدا كە سەرجەم شێرانی جیهان پەیوەستی زنجیرەی شەریعەتن، ئەوا هەوڵدانی ڕێوی بۆ قرتاندنی ئەو زنجیرە، جگە لە كارێكی شێتانە شتێكی تر نییە[1]!

مەشرەبی "كۆمەڵە"كەمان بریتییە لە: خۆشەویستیی هەرشتێك لە واتای "خۆشەویستی"دا بێت لە نێوان موسڵمانناندا و، دوژمنایەتی كردنی هەر شتێك كە واتای "دوژمنایەتی" بیگرێتەوە..

ڕێبازەكەی: ڕەوشت گرتنە بە ئاكاری پێغەمبەر ﷺ و، زیندووكردنەوەی سوننەتی پیرۆزی ئەوە..

ڕابەرەكەی: شەریعەتی خاوێنە و..

شمشێرەكەی: بەڵگە گومان بڕەكانە و..

ئامانجیشی: بەرز ڕاگرتنی وشەی (الله)یە!

## ماددەی نۆهەم

بۆ سوود وەرگرتن لەو هێزە مەزنەی كوردەكان كە لە دووبەرەكیدا لەناوچووە، پێویستە "یەكێتیی نەتەوایەتی" و "هزری گشتی"یان دەربخرێت و، بە "زانستەكان"یش

(١) ئاماژەیە بۆ ئەم بەیتەی مەولانای جامی:

جمله شیران جهان بستهء این سلسله اند روبه از حیله چسان بگسلد این سلسله‌را

(وەرگێڕ)

ئەو هزرانە بەرەو پێش بـبرێت. تـاکو خواسـتی "پێشکەوتن" لای ئـەوان کـارا بکرێـت و ڕووناکی و ماکی ژیانیان تێدا ببووژێتەوە.

سڵەمینەوەی ئەوان لە زانستە تازەکان لەبەر چوار هۆکارە. خـۆ ئەگـەر پێویسـت بـە ڕوونکردنەوەی زیاتر بکات، ڕوونی دەکەمەوە..

بە تایبەت هەڵسوکەوتی بایەخنەدەرانەی هەندێ لاوی ئەم سەردەمە لە ئایینەکـەیاندا، پتر میللەت بەرەو دواکەوتن دەبات. ئەم جۆرە بایەخنەدەرانە خزمەت بـە مەشـرووتییەت ناکەن، بەڵکو بە پێچەوانەوە گورزێکی تونـد لـە مەشرووتییەت و میللـەت دەوەشێنن و ڕێگاش لە پێشکەوتن دەگرن .

تەنها چارەسەر بۆ هێنانە ناوەوەی زانستە تازەکان بۆ کوردستان بریتی‌یـە لـەوەی کـە شانبەشانی "سوارەکانی حەمیدییە" لە قوتابخانەکاندا و هـەر بـە نـاوی "مەدرەسـە"وە کـە خەڵك پێی ڕاهاتوون، زانستە پێویستەکانی شارستانێتیی سەردەم، هاودەم لەگەڵ زانستە ئاینییەکاندا، بخوێندرێن.

ئـەوەش بـە کردنـەوەی سێ مەڵبـەندی زانسـتی دەبێـت لـە سێ ناوچـەی جیاجیـای عەشیرەتە ناوبراوەکـاندا، هاوکـات لەگـەڵ دەسـتەبەرکردنی دامـەزراندنی قوتابیـانی دەرچووی ئەو قوتابخانانە و ئەو زانا کوردانەش کە لەو قوتابخانانەدا پێدەگەن. تـاکو ئـەو قوتابخانە وێران بووانە بە گوێرەی توانا و لێهاتنی کوردانە زیندوو بکرێنەوە.

قەدەر تورکی‌یەکی کەمی پێ بەخشیوم، بەڵام خەت و نووسینی هیچ پێ نەبەخشیوم. دەسا بە وردبینیی خۆتان یارمەتیم بدەن.

والسلام علی من اتبع الهدی.

سەد هەزار جار هەر بژی شەریعەتی خاوێن.

وتاری نۆهەم:

# ڕووناکیی حەقیقەت (١)

ڕۆژنامەی (وولقان)
ژمارە (٩٧)
٧/٤/١٩٠٩ز

**زمانم بە باشی ناتوانێت هزر و بیرم دەرببڕێت. دەسا ئێوە بەپێی داوەریی خۆتان ئەم وتە پەشێوانەم ڕێکبخەن.**

**پرسیار:**

ئایا ئەم یەکێتییەی ئێوە، کە تیشکێك و نموونەیەکە لە "یەکێتیی محەممەدی"یە ئەسڵییەکە، دەتوانێت چی پێشکەش بکات؟

**وەڵام:**

لە ڕێی ڕێنمایی مەعنەوییەوە بێدارمان دەکاتەوە و..

ئەو زنجیرە یەك لە دوای یەکە نوورانییە دەلەرێنێتەوە کە بە هەر چوار لادا بڵاوبووەتەوە و..

خۆشەویستی و برایەتیی نێوان ئیمانداران لە دۆخی نادیارەوە دەکاتە کردار و..

بناغە جیاجیاکانی دەستە و پێڕە جیاوازەکان یەکدەخات..

هەروەها هەموو کەسێك ئاراستە دەکات بۆ هۆکارەکانی بەرەوپێشچوون کە: خۆشەویستیی ئایینە، بە وێنەی خۆشەویستیی نیشتمان..

هەروەها بۆ ئامانجەکان کە: بەرزڕاگرتنی وشەی (الله)یە، بە هەمان شێوەی هەوڵدان بۆ سوودەکانی ژیانی دنیا..

---

(١) ئەم وتارە ئەحمەدی کوڕم واتاکەی تەرجەمە کردووە و، دوایی خۆم دامڕشتووتەوە. ئنجا پێکەوە لەگەڵ دەقە تورکییەکەدا بەرامبەرمان کردووە. (وەرگێڕ)

هەروەها بۆ غیرەتی ئیسلامی، کتومت وەك غیرەتی نەتەوەیی..

چونکە هۆکارەکانی بەرەوپێشچوونمان چ لە ڕێگا و چ لە ئامانج و لە هەستی غیرەتی نەتەوەییدا، هەریەکەیان "دووانە"یەکی لێکدانەبڕاوە. هەر لەبەر ئەوەیە کە یەکجار توندوتۆڵە. بەڵام بە داخەوە نەمانزانی لە چ ڕێگایەکەوە سوودی لێ ببینین.

ئەگەر تەنها یەك پلەی ئەم "دووانە"یە چارەسەر بکەین، وەکو نیوە هێزێك دەبێت. هەروەها ناوەرۆکی ئەو پەندەتان تێدا دێتەدی کە دەڵێت:

"بە وازهێنان لە شێوە ڕۆشتنی خۆی، فێری شێوە ڕەوتی کەسی تر نەبوو"!

هیچ شتێکی تر ناتوانێت جێگەی ئەو هەستە ئایینییانە بگرێتەوە کە تێکەڵی خوێن و گۆشتمان بوون. مەگەر "وجوود" لە پڕێکدا و بە یەکجارەکی لە سروشتی خۆی هەڵبگەڕێتەوە وسەرەوژێر بێتەوە.

پرسیار:

ئەم "یەکێتیی محەممەدی"یەش وەکو هەموو کۆمەڵەکانی تر، هەستی لایەنگیری و بەربەرەکانێ و کێبەرکێ بێدار دەکاتەوە، بە تایبەتی پەرەسەندنی لەناو سەربازەکاندا ئەنجامەکەی باش دەرناچێت؟!

وەڵام:

"یەکێتیی محەممەدی" هاوشێوەی کۆمەڵەکانی تر نییە. بەڵکو بە وێنەی باوك و ڕابەر وایە بۆ هەموو ئەوانی تر. ئەم خۆرێکە ڕووناکی بەو هەسارانە دەبەخشێت و، لە سەرووی هەموو خولگەکانەوەیە و دەورانەوری هەموویانی داوە. چونکە لە ناوەرۆکدا ئەو کەسەی نەچووبێتە ژێر ئاڵای "حەمد"ی محەممەدییەوە - دروودی خوای لەسەر بێت - ئیماندار نییە، بە تایبەتی سەربازە یەکتاپەرستەکان.

ئامانجی ئەم یەکێتییە لەوەدایە کە خۆشەویستی و برایەتی و بەرزڕاگرتنی وشەی "الله" بە تەواوی پێش چاو بخات. لە ڕاستیدا ڕیزی پێشەوەی "یەکێتیی محەممەدی" لە سەربازە یەکتاپەرستەکان پێکدێت.

ئێمە لە ڕێی ئەم "یەکێتیی محەممەدی"یەوە دەمانەوێت هەموو میللەت بە وێنەی سەربازەکان یەك جەستە و یەکگرتوو بن، ئەو خۆشەویستی و برایەتییەش کە لە

توانایاندایە بە کردار بەرجەستە بکەن و، ڕای گشتی بە شێوەیەکی پوخت و خاوێن پێکبهێنن، کە پارێزگار و بەرگریکارە لە مافەکان و چارەسەری کێشەکانە. چونکە دڵۆپەکانی ئاو ئەگەر جیا جیا و پەرتەوازە بن، وشك دەبن و لە دەست دەچن، بەڵام بە یەکگرتنیان دەبنە حەوزێکی ئاوی ژیان.

**ئەی نەتەوەی محەممەد ﷺ!**

زایەڵەی ئەم یەکێتیی محەممەدی‌یە فەرمانێکی "هێرش"ە کە لە مەیدانی زۆرانبازیی ژیاندا بۆ هەموو یەکێکی باوەڕداران دەرچووە و، لە ڕێی پێشکەوتندا بە ئاراستەی داهاتوویەکی گەش وەکو سەرباز ئێوە دەخاتە پێش خۆی.

**پرسیار:**

پێکهاتە ناموسڵمانەکانیش، حەزی دەستگرتنیان بە یەکێتیی عیسایی و موسایی‌یەوە تێدایە. جا ئایا ئەم دەمارگیری و لێکترازانە زیان بە مەشرووتییەت ناگەیەنێت؟!

**وەڵام:**

زیانی نی‌یە. با ئەوانیش بیکەن، هەرچەند لەمێژە کردوویانە.

جا ئەگەر ئێستا "یەکێتی"یەك بە ناوی پێغەمبەرێکی پایە بەرزەوە دروست ببێت، ئەوا یان بۆ پیشاندانی خۆشەویستی و ڕێزلێنان و پشتڕاستکردنەوەی ئەو پێغەمبەرەیە، درودی لەسەر بێت، ئەوا هیچ پێویستی‌یەك بۆ ڕکەبەرایەتی نامێنێت. یاخود بە مەبەستی جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی ئەو ئایینانەیە، ئەوا بەپێی فەرمانی: ﴿لا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ﴾ و بە پشت بەستن بە ئازادیی مەزهەبی، نابێتە جێی قسە و باس.

خۆ ئەگەر لە بەرامبەر کاروباری سیاسی و ماددی‌یەوە وەکو هۆکارێك بەکاری بهێنن، ئەوا سەرکەوتوو نابن. چونکە ئایینی ئەوان تەنها و تەنها ویژدانی‌یە و لە جیهانی تایبەتیی کەسەکاندایە و، پەیوەندییان بە کاروباری سیاسی و ماددی‌یەوە تا بڵێی کەمە، هەرچەندەش لەمێژە ئەو پەیوەندی‌یە نەماوە. جگە لەوەی کە پێویستیشیان پێی نی‌یە. چونکە "میللییەت" و "بەرژەوەندی" سەروزیادە بۆ بزواندنی پێشکەوتنی ئەوان.

بەڵام ئێمە بۆ بەدەستهێنانی بەختەوەریی دنیا و دواڕۆژمان زۆر پێویستمان بەم یەکێتی‌یە هەیە. چونکە میللییەتی ئێمە جگە لە ئیسلام هیچ شتێکی تر نی‌یە. خۆ ئەگەر

باس لە "نەتەوایەتی" بکرێت، ئەوا وەکو تـەوائیفی ملـوك (دەستە و پێڕە جیاجیاکـان)ی لـێ دێت..

ئێمە جگە لـە ئـایین هیـچ فـەرماندەر و هـاندەرێك نی‌یـە بـۆ ویژدانمـان، هـەروەها سەرچاوەی تواناکانمان و خالّی پشت پێ بەستنمان ئەم یەکێتی‌یە ئایینی‌یەیە.

پرسیار:

لـە سـەردەمێکی هەسـتیاری ئـاوادا، خرۆشـاندنی هەسـتی ئـایینی، لـە دوایـدا ڕاستکردنەوە و دامرکاندنەوەی کارێکی دژوار دەبێت؟!

وەلاّم:

ئەو ڕاستی و دادگەری‌یـەی کـە لـە ئـاییندا فەرمانڕەوایـە، هەستەکان ڕێکدەخـات و سنووریان بۆ دادەنێت. لەبەر ئەوە، ناکرێت بە پێوەر بۆ هەستەکانی تر.

هەروەها گەرمیی ئەم خرۆشاندنە بە وێنەی تێکەلّبوونی ماددە کیمیاییەکان وایـە؛ بـۆ بەدەستهێنانی "ڕوونـاکیی زانستەکان" پێویستمان پێـی دەبێـت، چونکـە لـەو ڕووەوە شەوق و گوڕوتین بەرهەم دەهێنێت.

هەستە بەرزەکانیش، کە بۆ پێشکەوتن و شارستانێتی پێویستن، بە ناوی ئیسـلامەوە و لە ڕێـی پێشـکەوتندا دەشتەکی تریـن مرۆڤ بـە وێنـەی ڕۆشنبیرترین کـەس بـە شـەوق و حەزی ناخی ویژدانەوە دەخاتە پێش خۆی.

ئەگەر ئەم زایەلّـە ئایینی‌یـە، بـە دەرچوونـی لـە نـاوەندی خەلافەتـەوە لـە چواردەوردا ڕەنـگ نەداتـەوە، ئـەوا ئیسـتیبداد لـە هـەر پێکهاتەیـەکدا مـەیلی جیابوونـەوە لــە نـاوەند دەوروژێنێت و، بە سوودوەرگرتن لەم مەیلە، هەندێك کەس بـە نـاوی خـۆ بـە "مـەهدی" زان و "موجەدید"ی‌یەتەوە ئەم زایەلّەیە بە شوێنەکانی تردا بلاّو دەکاتـەوە و، ئـەم دەوڵەتـە ئیسـلامی‌یەش دووچـاری لێکـترازان دەکـات و، ئـەم نـاوە پـیرۆزەش لـە ئاسـتی خـۆی دادەبەزێنێت و سنوورداری دەکات.

هەروەها چەندە پێویستیی زۆرمان بە "ڕێکوپێکی کارگێری" هەیـە، سـەد پلـە بـەڵکو زیـاتریش پێویسـتمان بـە "پاکژکـاریی ڕەوشتەکان"ە. ئیکسـیری ئەمـەش تەنـها لــە ڕێـی ئایینەوە دەبێت.

چونکە سەرهەڵدانی زۆرینەی پێغەمبەران – درووودیان لەسەر بێت – لە قەڵەمڕەوی عوسمانیدا ئاماژەیەکە لە لایەن قەزا و قەدەرێکی خواییەوە بۆ ئەوەی کە: تەواوکاری و پاکژکردنی ڕەوشتەکانی خەڵکی ئەم قەڵەمڕەوە تەنها لە ڕێی هەستی ئایینییەوە دەبێت.

هەروەها ئەو ئیستیبدادەی کە جگە لە پەیوەستێکی وەهمی هیچ پەیوەندییەکی بە ئایینەوە نییە، کەچی لەو سەردەمەدا و بەو پەیوەندییە وەهمییە تا ئەو ڕادەیە لە دژی هێرشە ناوخۆیی و دەرەکییەکان پارێزگاریی لە خۆی کرد. بێ گومان ئێستا پشت بەستنی ئەم مەشرووتییەتە شەرعییەی کە بەندەی گوێڕایەڵی تایبەت بە شەریعەتە و پەیوەندیی ڕاستەقینەی لەگەڵدا هەیە، بەم هێزە مەزنە شەرعییە و سوود لێ وەرگرتنی، کارێکی گەلێ پێویستە.

پرسیار:

ئەگەر یەکێتیی محەممەدی دەست لە سیاسەت وەربدات، ئەو گوێڕایەڵییە تێکدەچێت کە گیانی حکومەتە؟!

وەڵام:

یەکەم: ئامانجی ئەم کۆمەڵەیە سیاسەت نییە.. چونکە زۆربەی نوێنەران یان لە زانایانن، یاخود کەسانی خاوەن تەقوان. لایەنی سیاسەت بەوان سپێردراوە.

دووهەم: لەبەر ئەوەی حکومەت حکومەتێکی ئیسلامییە، پێویستە کە شوێنکەوتەی ئەو یاسانامەیەی یەکێتیی محەممەدی بێت کە بریتییە لە فەرمان و نەهییەکانی شەرع. خۆ ئەگەر جێبەجێی نەکەن بێدار دەکرێنەوە. بەڵام نەك لە ڕێی بەکارهێنانی هێز و ناچارکردنەوە.

لەوەش ئاگادارتان دەکەمەوە کە ئەو کۆمەڵەیەی پێی دەڵێن "یەکێتیی محەممەدی" کۆمەڵەیەك نییە تەنها لە چەند کەسێك پێکهاتبێت کە بە جیاوازیی نێوان ئەندامەکانی، یان خراپ بەکارهێنانی کۆمەڵەکە، لەکەدار ببێت.

چونکە هەروەك ئەگەر پارچە شووشەیەك بشکێت کە لە حوکمی خۆرێکی بچووکدایە و تیشکی ئەو خۆرە دەداتەوە.. یاخود ئەگەر بە چاونووقاندن ڕۆژ بکرێت بە شەو.. ئەوا ڕووناکیی خۆر هەر لە سەرجەم ئاوێنەکانیەوە دەردەچێت و ڕووناکیی خۆر

دەبەخشێت.. هەروەك ئەمە وایە، ئەم کۆمەڵە ڕەسمییەی ئێرەش بە هەمان جـۆرە. چونکـە ئەگەر دووچاری لێکترازان ببێت، یاخود بە تێپەڕبوونی کات دووچاری گـۆڕان ببێت، هێشتا هەر درەوشـانەوەکانی خـۆری ڕاستەقینەی یـەکێتیی محەمـەدی لەکارناکـەوێت.. چونکە لە ڕاستیدا یەکێتیی محەممەدی هەموو باوەڕدارێکی لە ئامێزی خۆی گرتووە.

بەڵام چەند زاتێکی کەم بە نیازی پاکژکردنەوە و خێراکردنی جووڵەی چەرخەکانی کارگەی مەزنی ئیسلامەتی، کە لە ڕووبەرێکی زیاتر لە نیوەی گۆی زەویدا دامـەزراوە، خـەڵکی بـۆ ئـەو یەکێتییـە بانگهێشـت دەکـەن و، بـۆ بەهێزکردنیشـی بـە شـێوەی خزمەتگوزار کاری بـۆ دەکـەن. ڕیـزی یەکـەم و پێشـەوەی ئەوانـەش زانایـان و شێخانی تەریقەت و قوتابییان و وتاربێژەکانن.

پرسیار:

بۆچی تا ئێستا کار بۆ ئەم بیرۆکەیە نەکراوە؟

وەڵام:

لەبەر ئەوەی ئیستیبداد شەوقی هەموو کەسێکی تێکشکاند و لەکاری خست. بـەڵام ئێستا مادەم لە مەشرووتییەتدا بیر و ڕای گشـتی خـاوەن دەسـەڵاتە، پارچـەکانی ئـەو بیرە گشتییانەش تایبەتە بە هەر تاکێکەوە، هەموو تاکە کەسێك پێویستە بـبزوێت. بـۆ ئـەوەی جموجووڵی ڕای گشتی نەشێوێت.

لەسەر ئـەم بناغەیـە، ئـەو ئامانجانـەی کـە بـۆ خۆشـگوزەرانیی نیشـتمان و سـەلامەتیی حکومەت پێویستن، پێشتر وەکو فەرزێکی کیفایە سەیرکراوە، ئەمەش ڕێ بۆ ئەوە خۆش دەکات کە هەموو کەسێك لە جێی خۆیەوە بڵێ:

"من چ پێویستییەکم پێیەتی، با کەسێکی تر بیری لـێ بکاتەوە"!

ئـەم وەڵامـە هەژارانە و، ڕاسپاردنی ئـەو ئەرکـە بـە کەسـانی تـر، زەمینـەی لـەبار دەرەخسێنێت بۆ ئەوەی کە مرۆڤ بە دەستەوسانییەوە پشت بە غەیری خۆی ببەستێت.

بەڵام لەبـەر ئـەوەی خۆشەویستیی ئایین و بـەرزڕاگرتنی وشـەی (الله) فـەرزی عەینـە لـەسەر هەموو کەسێك، هەروەها لەبەر ئەوەی هەموو کەس خۆی بە بەرپرس دەزانێـت و بە نەعرەتەیەکی مەردانە قۆڵی لـێ هـەڵدەماڵێت و دەڵێـت: (ئێمـەش وەك ئـەوان پیـاوین)

ئیتر بە پچڕاندنی زنجیری یێکاری و تەمبەڵی و، بە دڕاندنی پەردەی ڕسوایی و نزمی دەڕواتە مەیدانی پێشبڕکێی پێشکەوتنەوە.

تا ئێستا ئیستیبداد سوودی لە جیاوازیی بیروبۆچوونمان وەرگرتووە. ئەورووپاش سوودی لە دوورەبەکێتیی ناو موسڵمانان وەرگرت و لە ژێر ئیستیبدادە مەعنەوییەکەیاندا ئازاری ئێمەیان دەدا.

دەبا ئێستا لە پێشدا ئێمە یەك بگرین، تاکو بتوانین دەستی یەکگرتنمان بۆ ناموسڵمانەکانی لای خۆمان درێژ بکەین.. هەروەها بۆ ئەوەش کە مەشرووتییەتی مەعنەوی هەڵبگەڕێتەوە بەسەر ئیستیبدادە مەعنەوییەکەی ئەورووپادا.

بیرهێنانەوەیەکی گرنگ:

یەکێتیی محەممەدی ئامانج و مەبەستمانە.. کاریش بۆ ئەو خاڵە دەکەین کە ئەو یەکێتییە محەممەدییە فەرمییەی ئێستا - کە دڵۆپێکیەتی - پێشەکییەك بێت بۆ ئەو یەکێتیی محەممەدییە.

هەموو کەسێك دەتوانێت پەیوەست بێت بە سنعەت و ئامانج و مەبەستی خۆیەوە. سەرەڕای ئەوەش، ئێمە بۆ پیرۆز ڕاگرتن و لێ تێگەشتن ناونیشانی پیرۆزی "یەکێتیی محەممەدی" بەکاردەهێنین، کە ئامانج و مەبەستمانە.

* * *

پێناسە و نەخشەی "یەکێتیی محەممەدی"ی ئەسڵی، بەم شێوەی خوارەوەیە:

بناغەکەی: لە ڕێی زنجیرەیەکی نوورانییەوە، کە درێژبووەتەوە بۆ هەموو هەرێمەکانی جیهان، توندوتۆڵ کراوە..

ناوەندەکەی: هەردوو حەرەمی پیرۆزە..

ڕووی یەکبوونی: "یەکتاناسین"ی خوای گەورەیە..

سوێند و پەیمانی: ئیمانە..

پەیڕەو و پرۆگرامی: سوننەتەکانی پێغەمبەرە ﷺ..

یاسانامەکەی: فەرمان و نەهییەکانی شەرعە..

یانە و ئەنجومەنەکەی: سەرجەم قوتابخانەکان و مزگەوتەکان و خانەقاکانە..

بڵاوکاری هەمیشەیی و بەردەوامی هێزی ئەم کۆمەڵەیە: هەموو کتێبە ئیسلامی‌یەکانە..

بڵاوکاری کاتیی بیروبۆچوونەکانیشی کە بەرزڕاگرتنی وشەی (اللّٰه)ی کردووە بە ئامانجی: رۆژنامە گشتی‌یەکانە..

ئەندامەکانی: سەرجەمی موسڵمانانن..

ریزی پێشەوەی ئەو ئەندامانە: لە موجاهیدان و شەهیدان پێکهاتووە، کە لە ساتە وەختی ﴿قالوا بلی﴾وە تیایدا ئەندامن..

تۆماری ناوەکانیان: "لەوحی مەحفووز"ە..

یەکێتی‌یەکی محەممەدیی لەم جۆرە، سەرۆك و سەرکردەکەی هەر تەنها: فەخری عالەمە، کە لە هەمان کاتدا سەرۆکی هەموو تاکە کەسێك و، سەرۆکی هەموو کۆمەڵەیەکی ئایینی و سەرجەمی جیهانیشە.

جا کاتێك کە دەڵێم:

"من ئەندامێکم لە یەکێتیی محەممەدی"دا..

مەبەستم ئەم یەکێتی‌یەیە. هەروەك مەبەستم ئەو کەسانەشە کە هێنانەدیی ئەم یەکێتی‌یەیان کردووە بە ئامانجی خۆیان.

کاری ئێمە خۆشویستن و بڵاوکردنەوەی خۆشەویستی‌یە و، بە پێچەوانەی ئەوانەوە رەفتار دەکەین کە سەرقاڵی دوژمنایەتی کردنن.

هەروەها ئێستا ئێمە یەکێتی‌یەکی رەسمی دروست دەکەین، بە مەبەستی کۆکردنەوە و یەکخستنی کۆمەڵە جیا جیا ئیسلامی‌یەکان! نەك خوانەخواستە بۆ جیاکردنەوەی گروپێکی تر!

من کەسێك نیم کە دووبەرەکی بنێمەوە.

پاشتر وەڵامی رەخنە و گومانە بەدەکانیش دەدەمەوە و بڵاوی دەکەمەوە.

**بەدیعوززەمان سەعیدی کوردی**

وتاری دەهەم:

## بریسکانەوەی حەقیقەت و لابردنی گومانەکان(١)

رۆژنامەی (وولقان)
ژمارەکانی: (١٠١-١٠٤)
بەرواری: ١١-١٩٠٩/٤/١٤ز

گومان:

تۆ ئەم ڕاستی‌یانە زۆر جار دووبارە دەکەیتەوە، هەموو جارێکیش بە هەمان دەربڕین؟

وەڵام:

پێش هەموو شتێك، لەبەر ئەوە دووبارەیان دەکەمەوە چونکە "حەقیقەت"ن. حەقیقەتیش وەکو ڕووناکی وایە و بێزاری نابەخشێت..

هەروەها من سێ چوار وتارم نووسیوە، ڕەخنە گرەکان خۆیان لێ بوارد، جا من دەمەوێ بیکەم بە چاویاندا، چونکە دووبارە کردنەوە بۆ منالان پێویستە..

هەروەها من بەمە پیشانی دەدەم کە ڕێبازێکی تایبەت بەخۆمم گرتووەتەبەر، خۆ ئەوانەش کە ڕێگایەکیان گرتبێتەبەر ناچاری دووبارە کردنەوە دەبن..

هەروەها کە بناغەی شتێك دادەڕێژرێت بۆ چەند جارێك پێویست بە چاو پێداخشاندنەوە دەکات.

تەنها بێ ڕێبازەکانن کە دەکەونە سەر هەموو ڕێڕەوێك!

ڕێڕەوی ئێمە تەنها یەك دانەیە. بەڵام من لە زمانی تورکیدا زۆر دەوڵەمەند نیم و، هەندێ وشەی تەمێکەریش دووبارە دەکەمەوە.

---

(١) ئەم وتارە دکتۆر دیدار کامەران کردی بە کوردی، منیش بەم دارشتنەکەیدا ڕۆشتمەوە، ئنجا ئەحمەدی کوڕم لەگەڵ دەقی تورکی‌یەکەدا بەرامبەری کرد. (وەرگێڕ)

گومان:

ئێوە ناوی (یەکێتیی محەممەدی)تان لە کۆمەڵەکەتان ناوە، لەمەوە هەندێك شتی نەگونجاو دێنە زەینەکانەوە..

چی دەبێت ئەگەر ئەو ناونیشانە بگۆڕن بە شتێکی دیکە؟

وەڵام:

یەکێتیی محەممەدی ﷺ دوو دانەیە:

یەکێکیان:

ئەوپەڕی ئامانجەکانە و، هەموو موسڵمانان بەهۆی ئیمانەکەیانەوە تیایدا بەشدارن.

ئەوی تریان:

ئەو "کۆمەڵە"یە کە پێشەکیی دەرکەوتن و هاتنەدیی ڕووی یەکەمە..

بە ئەندام بوون لەم ڕووەدا بە چاودێریی تەواوەتی و بێ چەند وچۆن دەبێت بۆ فەرمانە بڵندەکانی شەریعەتی ئەحمەدی.

جا ئەوانەی کە لە بەرامبەر ئەم لێبڕان و گەڕانەوەیە بۆ شەریعەت کەللەڕەقی دەنوێنن، ئەوانەن کە دەکەونە گومانەوە.

مەبەستیش لەم کۆمەڵەیە ئەوەیە کە "یەکێتیی محەممەدی" بێتەدی و، ئەو ڕاستییە کپ و خامۆشە بهەژێنرێت..

لەبەر ئەوە، ئەم کۆمەڵەیە پێویستی بە ناوێکی سەرنج ڕاکێشە، تاکو هەموو ئەوانەی کە بە نووری ئیمان یەکیان گرتووە، بەرەو لای خۆی ڕابکێشێت..

لە کۆمەڵەکانی دیکەدا ناولێنراوەکە بە دوای ناوەکەیدا دەگەڕێت، بەڵام لێرەدا ناوەکە بە دووی ناولێنراویدا دەگەڕێت!

هەروەها وەك ئەوەی کە دەتوانرێت وشەی "قورئان" بۆ هەریەکێك لە ئایەتەکانی و، وشەی "جیهان" بۆ هەر جۆرێك لە جۆرەکانی ناوی و، وشەی "ئاو"یش بۆ هەریەکێك لە دڵۆپەکانی بوترێت، بە هەمان جۆر دەشتوانرێت ناونیشانی "یەکێتیی محەممەدی" بۆ هەموو کۆمەڵەیەکی ئیسلامی دابنرێت. چونکە هەروەك سەرجەمی موسوڵمانان محەممەدین، بە هەمان شێوە یەك بە یەکیشیان محەممەدین. ئێمەش محەممەدیین.. ئەحمەدیین..

**گومان:**

دروستبوونی ئەم جۆرە دەستە و کۆمەڵانـە، کاریگـەریی حکومـەت و گوێڕایـەڵی بـۆ کردنی تێکـدەدات، کـە لـە خۆیـدا لاوازە، چونکـە هێشـتا بـە تـەواوەتی شارسـتانێتی ڕاستەقینە لـە نێوانمـاندا نەهاتووەتـەدی، خـۆ لـە نـەزانی و دواکەوتنیشـەوە دوژمنایـەتی و دەمارگیری پەیدا دەبێت؟

**وەڵام:**

مەرجی پەیوەندی کردنـی کەسێك بـەم کۆمەڵەیـەوە ئەوەیـە کـە گوێڕایـەڵی فەرمانـە شەرعییەکان بێت و دوورەپەرێز بێت لەو شتانەی کە نەهی کراوە لێیان. هەروەها دەبێ بە عەزمێکی تەواو هەوڵی پارێزگاری کردنی مەشرووتییەتی مەشروع و ڕەوا بدات..

خۆ ئەو مەرجانەش کانگایەکی باشن بۆ گوێڕایەڵی کردنی حکومـەت و، ڕێڕەوێکـی جوانیش پێکدەهێنـن بـۆ بەجێـهێنانی ئەرکـەکانی. چونکـە ئەوانـە سـنووری فەرمانـە شەرعییەکان نابەزێنن و، بە وێنەی ئەندامانی هەندێ دەسـتە و کۆمـەڵی دیکـە بـە کـاری خۆبەخۆ و وێرانکارانە و بەربادی و خۆسەپاندن ڕەفتـار ناکـەن.. هـەروەها حکومـەتیش بەدەر نابێت لەم کۆمەڵەیە.

**گومان:**

ئەوانەی کە بە ڕەزامەندیی خۆیان دەبن بە ئەندام لەم کۆمەڵەیەدا، ئەرکی سەرشانیان چی دەبێت؟

**وەڵام:**

دوو ئەرکیان هەیە.

یەکەمیان: ئەوەیە کـە بڕواتـە جیـهادی گـەورەوە لەگـەڵ "نـەفس"ی خۆیـدا، واتـە بـە تەواوەتی لێبـبڕێت بـۆ شـوێنکەوتنی شـەریعەتی خـاوێن و، زیندووکردنـەوەی شـەریعەتی ئەحمەدی.

دووهەمیان: سەرجەم موسڵمانانی دیکە بۆ خۆشەویسـتی و برایـەتی بـانگ بکـات و، بە هەژاندنی ئەو برایەتییـە ئایینییـە کـپ و خامۆشـەی کـە هەیـە، برایەتییەکـە پـەرە پێ بدات و بیخاتە ڕوو.

ئنجا بوونە ئەندامیش لەم کۆمەڵەیەدا تەنها بە خۆتۆمارکردن نییە لە تۆمارە تایبەتییەکەیدا..

بەڵکو بە خۆشویستن و رووتێکردن و پەیوەندیی ناخی دڵ دەبێت. چونکە ئەم کۆمەڵەیە خۆی لە خۆیدا ڕۆحانی و مەعنەوییە، نەك شتێکی رووکەش و جەستەیی.

**گومان:**

ئەم کۆمەڵەیە کە جاریّ لە سەرەتادایە، پێویستە ببێتە نموونە و تیشکدانەوەیەکی باش بۆ ڕاستیی "یەکێتیی محەممەدی"ﷺ، بەڵام ئەو کەسانەی کە ئەم حاڵە پەرێشانەی ئێوە دەبینن ناتوانن ڕۆشنایی ئەو ڕاستییە بەرزە ببینن؟

**وەڵام:**

بەڵیّ، ئەو کۆمەڵەیەی کە ئێستا لە بەرامبەر خۆری حەقیقەتی یەکگرتنەوە، دەڵێی ئەڵماسێکە و تازە لەو کانگاکەیەوە دەرهاتووە، هێشتا پاڵفتە نەکراوە، هەتا ببێتە ئاوێنەیەك وێنەی ئەوی تێدا ببینرێت.

بە پشتیوانیی خوای گەورە هەتا ساڵێکی تر، بە تەقالای زانایان لە هەموو شوێنە جیاجیاکانی جیهاندا دەدرەوشێتەوە. گریمان ئەم پارچەیەش بشکێت، ئەوا هەزاران پارچەی گەورە و بریسکاوە و تیشکدەرەوەی تری لیّ دروست دەبێت.

تاکەکانی ئەم کۆمەڵەیە هەرچەندەش جیا جیا بن، هەر وەکو کۆمەڵێك وان. چونکە ڕێسا و پەیڕەوەکانی ئەم کۆمەڵەیە لەسەر شەریعەت دامەزراون و، پەیوەندییەکانیشی ڕۆحانییە. ئیتر هەموو دنیا سەبارەت بەمان بە وێنەی یەك ئەنجومەنە و، وەکو کۆمەڵەکانی تر نییە کە بە کۆبوونەوەی رووکەش و بیروڕا گۆڕینەوەی رواڵەتی و بە ناوی پەیڕەو و ڕێساوە بیدعەت بیهێنێتە گۆڕیّ..

بەڵام دەگونجێت هەندیّ ڕێسا و پەیڕەوی تایبەتیی بۆ خزمەتەکانی خزمەتگوزارانی هەبێت.

هەروەها ئەگەر بتوانن لە شوێنە جیاجیاکاندا بە ڕوانینێکی عەقلی سەیری ئەو پەیوەندییە ڕۆحانییانە بکەن کە لە نێوان ئەم کۆمەڵانەدا هەیە، ئەوا وێنەی ئەو ڕاستییە بڵندە وەکو ئاوێنەیەکی تیشکدەرەوە دەگەڕێتەوە بۆ لای خۆتان.

وەك نموونەیەك، من ڕێگا بەرزەکانی زنجیرە شێخەکانتان لەو زنجیرە نوورانیانەدا پیشان دەدەم کە بنەمای پەیوەندی‌یەکان دادەڕێژن.

**گومان:**

لەم سەردەمەدا کە پێویستە بۆ پێشکەوتن و خۆشیی دنیا هەوڵ و تەقالا بدرێت، گەر بابەتێکی ئایینیی لەم جۆرە، کە دەمارگیری و پەرتەوازەیی لێ دەکەوێتەوە، بکرێتە بنەما بۆ مەشرووتییەت، ئایا ئەمە نابێتە هۆی دروستبوونی هەندێ مەترسی؟

**وەڵام:**

هۆکاری دواکەوتنمان ڕەچاونەکردنی ئایینەکەمانە. هەروەها ئێمە لە ڕێکخستنی بەڕێوەبردندا زیاتر پێویستمان بە پاڵفتەکردنی ڕەوشتەکان هەیە. خۆ پاڵفتەکاری ڕەوشتیش تەنها هەر ئایینە.

لەبەر دنیا، ئایین پشتگوێ ناخرێت. ئێمە لەبەر ئایین و حەرەمەین نیشتمانمان خۆش دەوێت و، دنیاش لەبەر ئایین بنیات دەنێین.

"لا خير في دنيا بلا دين".

جا مادەم مەشرووتییەت فەرمانڕەوای کۆمەڵگایە، ئەوا پێویستە "بوونی میللیەت" پیشان بدرێت.

میللییەتی ئێمەش تەنها ئیسلامە. چونکە پەیوەندی و میللیەتی ڕەگەزە موسڵمانەکان، جگە لە ئیسلامییەت ئەوەیە کە هەموویان نەوەی حەزرەتی نووحن (دروودی لەسەر بێت)..

ئەوەبوو بە کەمێك پشتگوێ خستنی ئەمە، بناغەی چینی دەسەڵاتداران (طوائف الملوك) دامەزرا..

بە زیندووکردنەوەی ئەو دەمارگیریی نەزانی و نەتەوەییەی کە سیازدە سەدە پێش ئێستا بە گورزی ئیسلام مردبوو، ئەو فیتنەیە بێدار کرایەوە..

**گومان:**

ئەم کۆمەڵەیە دووبەرەکی دروست دەکات و، گومان بەرهەم دێنێت و، ئەنجامەکەشی نائومێدی‌یە؟

وەلاّم:

ئەمــە دووبــەرەکی و جیــاوازی نی‌یــە، بــەڵکو یەکخســتنی ســەرجەم کۆمەڵــە جیاوازەکانە. نائومێدیش دروست ناکات، بەڵکو ئومێدی ژیان و یەکگرتنمان پێ دەبەخشێت، ئەویش بەم جۆرە:

ئەو ڕاستی‌یە، کە بە وێنەی ڕەگەکانی کانزای زێڕ لە نیوەی گۆی زەویدا شاردراوەتەوە، ئەگەر تەنها گۆشەیەکی دەربکەوێت، ئەوا دەبێتە مژدەی ئەوەی کە سەرجەمی ڕاستی‌یەکە بە تەواوەتی ئاشکرا دەبێت.

هەروەها ئەم بەشە (یەکێتیی محەممەدی) کە لە دۆخی هێزەوە گۆڕاوە بۆ دۆخی کردار، چەشنی ئەو لێدانەی پزیشکەکان وایە کە هەندێ جار بە مەبەستی چارەسەر لە نەخۆشەکانیان دەدەن، ئەمیش بەو جۆرە موسڵمانان بێدار دەکاتەوە و، بە شەوقی ناو ویژدانی ئیسلامەتی، ئەوان لە ڕێڕەوی پێشکەوتندا ڕاستەوڕاست بەرەو کەعبەی کەمالاّت دەبات..

چونکە لەم سەردەمەدا هۆکاری هەرە گەورە بۆ بەرزڕاگرتنی وشەی (الله) بریتی‌یە لە پێشکەوتنی ماددی و مەعنەوی. ئەوەبوو بیانی‌یەکان بە پێشکەوتن لە ئێمەیان بردەوە و، ئێمەش بە سەرپێچی کردنمان لە شەریعەت و بە ڕەوشتی بەدی خۆمان یارمەتیمان دان.

ئێستا پێویستە ئێمە ئەو زنجیرە یەك لە دوای یەکە نوورانی‌یە بخەینە لەرزە کە مەڵبەندە ئیسلامییەکانی پێکەوە بەستووە. ئێمە بە کپ و خامۆش بوونی ئەو زنجیرانە تووشی بێ ئاگایی بووین و، نەمانتوانی لێیان تێبگەین و، سوودمان لێ وەرنەگرتن..

هەروەها پێویستە چەشنی درەختی تووبا، گەشە و نەشونما بدەین بەو خۆشەویستی‌یەی کە لە کرۆکی تۆوی برایەتیدا هەیە و، بە یارمەتیی جۆشاندنی غیرەتی ئیسلامی، ئەو "هێز" و "زانست"ە بەدەست بهێنین کە لە یەکگرتن و تێکەڵیی ڕەگەزەکانەوە سەرچاوە دەگرێت.

هەروەها دەبێت فەرماندە و بەڕێوەبەر "ویژدانی" بن، دەنا هەمیشە لە ژێر دەسەلاّتی ئیستبداددا دەبین. "فەرماندەی ویژدانی"ش بەندە لەسەر ڕۆشنبوونەوەی بیرەکان..

ڕۆشنبوونەوەی "بیری گشتی"ش یان بە زانیاریی گشتی، یان بە شارستانێتییەکی تەواوەتی، یاخود بە هەستی ئیسلامییەت دەبێت. کەچی ئێستا لە هەزاردا یەك کەس بەهۆی شارستانی بوونیەوە یاخود بە زانیارییەکان بووەتە کەسێکی ڕۆشنبیر. دیارە ئەمەش ئاهەنگی پێشکەوتن پەك دەخات.

بۆ بەردەوامبوونی ئاهەنگی پێشکەوتن دەبێت ئایینی ئیسلام، کە نووری ڕۆشنایییەکانە، بکەینە ڕابەر و بەرچاوڕۆشنیی خۆمان، تاکو هەموو کەسێك وەکو ڕۆشنبیران بێت. ئەگەر بیریشی ڕۆشن نەبێت ئەوا دڵی ڕۆشنە. جا ئەگەر هەست و نەست جوان بن، هزرەکانیش جوان و ڕاست و ڕەوان دەبن.

**گومان:**

ناموسڵمانەکانی ناومان وڕك دەگرن، یاخود دەسڵەمێنەوە؟

**وەڵام:**

وڕك گرتن کارێکی منداڵانەیە. سڵەمینەوەش نەزانییە. چونکە ئاسوودەیی ناموسڵمانەکان پەیوەستە بە سەلامەتی وڵاتەوە.

جا لەبەر ئەوەی بەردەوامی و، گیان و، خاڵی پشت پێ بەستن و، ڕابەری مەشرووتییەت بریتییە لە ئایینی ئیسلام، کە شەریعەت و نەتەوەمانە، ئەوا پێویستە لەبری ئەوەی ئەوان لێی بسڵەمێنەوە بە پیرۆز و بەرز ڕایبگرین.

**گومان:**

ئەگەری ئەوە هەیە بیانییەکان لەمە بێزار بن؟

**وەڵام:**

ئەوانەی ئەگەری ئەوە دادەنێن کە ئەم ئەگەرە ڕووبدات، ئەوانە خۆیان دووچاری نەزانی و دواکەوتن دەکەن، چونکە ئەو چەندین کۆنفرانسەی کە بیانییەکان لە مەڵبەندی دەمارگیریی خۆیاندا سەبارەت بە بەرزیی ئایینی ئیسلام و پیرۆز ڕاگرتنی سازیان داوە، ئەو ئەگەرە دەسڕێتەوە.

فەیلەسوفی بەناوبانگ میستەر کارلایل، لە ئەمەریکاوە بە دەنگێکی بڵند باسی بەرزی و پیرۆزیی ئاینی ئیسلامی بە هەموو ئەورووپا ڕاگەیاندووە..

هەروەها دوژمنانی ئێمە "نەزانی" و "هەژاری" و "ناكۆكی"یە. بێ گومان ئەورووپاش بە یارمەتیی ئەم دوژمنانە بوو كە ئێمەیان دەخستە ژێر ئیستیبدادی مەعنەوی خۆیان.

ئێمەش بەم یەكگرتنەمان هێرش دەكەینە سەر ئەو سێ دوژمنە بێ ویژدانە، لە پێش هەموویانەوە "ناكۆكی".

بەڵام سەبارەت بە بیانییەكانیش ئێمە وەكو دوژمن تەماشایان ناكەین، بەڵكو لەبەر ئەوەی ئێمە ناچار دەكەن و هانمان دەدەن بۆ پێشكەوتن و بەشارستانی بوون، كە هەر ئەمانەش لەم سەردەمەدا هۆكارن بۆ بەرزكردنەوەی وشەی پیرۆزی (الله) و بەدەستهێنانی ئاسوودەییمان، ئەوا بە چاوی دۆست و خزمەتكار تەماشایان دەكەین.

هەروەها بیانییەكان لەبەر ئەوەی هاوكات لەگەڵ شارستانی بوونەكەیاندا بەهێزیشن، ئەوا هیچ پێویستییەك بە دەمارگیری و دوژمنایەتی نەماوە. چونكە لە روانگەی ئایینەوە سەركەوتن بەسەر بیانییەكاندا بە قەناعەت پێ كردنە، نەك بە ناچار كردن..

هەروەها بەوە دەبێت كە بە كردار و ڕەوشتمان پیشانیان بدەین "ئیسلام" بەرز و خۆشەویستە و، داوای پێشكەوتنمان لێ دەكات لە شتە ماددییەكاندا.

ناچاركردن و دوژمنایەتی تەنها لە بەرامبەر دڕندەیی كێوییەكانەوە بەكاردەهێنرێت، كە لە قسە تێناگەن، یاخود نایانەوێت تێبگەن.

گومان:

یەكێك لە پایەكانی مەشرووتییەت بریتییە لە "ئازادیی تەواوەتی". بەڵام یەكێتیی محەممەدی ﷺ كە سوننەتی نەبەویی كردووەتە ئامانجی خۆی، ئازادی سنووردار دەكات. هەروەها لەگەڵ زۆرێك لە پێداویستییەكانی شارستانێتیدا پێچەوانەیە؟

وەڵام:

بەو سنووردار كردنە "ئازادی" دێتەدی و كامڵ دەبێت. شمشێری شەریعەت رێ لە خراپە و تاوانەكانی شارستانێتی دەگرێت بێنە ناو سنووری ئازادی و شارستانێتیمانەوە.

چونكە تەنها ئیماندارە كە بە ڕاستی "ئازاد"ە و، كەسی بێ ئایینیش هەمیشە لە ژێر چەپۆكی ئیستیبدادایە.

کەسێك کە بە تەواوەتی بەندە و خزمەتگوزاری بەدیهێنەری جیهانییان بێت، نابێت بە زەلیلی‌یەوە سەر نەوی بکات بۆ ئیستیبدادی کەسێکی جگە لە بەدیهێنەری.

هەروەها سنووردار کردنی ئازادی لە ڕوانگەی مرۆڤایەتی‌یەوە کارێکی پێویستە. چونکە ئازادیی ڕەها دواکەوتنی ڕەهایە، بەڵکو ئاژەڵێتی‌یە. سنووردار کردنی ئازادی لە ڕێی بەستنەوەی ویژدانەوە بە ئەحکامی شەریعەت، لە ڕاستیدا کامڵ بوونە و پێچەوانەی نی‌یە.

بەڵام ئێوە بە سرووشتی منداڵانە و بە یارمەتیی هەوا و ئارەزووتان هەندێ لە خراپە و تاوانەکانی شارستانێتی کە ئێوە پێیان دەڵێن: "پێویستی‌یەکانی شارستانێتی" بە چاکە لە قەڵەم دەدەن..

لە کاتێکدا کە هیچ چاکەیەکی ڕاستەقینەی شارستانێتی نی‌یە کە لە شەریعەتدا نەبێت، چ بە ڕاشکاوی، چ بە لەخۆگرتن، چ بە ڕوخسەت پێدان، یاخود بە شێوەیەکی باشتر و جوانتر لە شەریعەتدا نەبێت.

هەندێ کەسی بایەخنەدەر لەبەر ئەوەی نایانەوێت بە ئازادی بژین، دەیانەوێت برۆنە ژێر ئیستیبداد و کۆت و زنجیری ڕسوایانەی دەروونی بەدخوازەوە.

به پوختی:

ئەو ئازادی‌یەی کە لە دەرەوەی بازنەی شەریعەتدایە، یان ئیستیبدادە لە قاڵبێکی دیکەدا، یان دیلی‌یە بۆ دەروونی بەدخواز، یاخود کێوی بوونێکی ئاژەڵ ئاسایە.

با ئەو بایەخنەدەرانە باش بزانن کە ناتوانن بە "بێ ئایینی" و بە "هەرزەیی" خۆیان لای هیچ بیانی‌یەکی بە ویژدان خۆشەویست بکەن و، ناشتوانن خۆیان وەك ئەوان پیشان بدەن، چونکە ئادەمیزادی بێ ڕێباز و هەرزە لای کەس خۆشەویست نی‌یە.. هەروەها پۆشاکی ئافرەتان لە کوڕان نایەت!

گومان:

ئەم کۆمەڵەیە هاودەم لەگەڵ کۆمەڵە ئایینی‌یەکانی تردا هۆکارێکن بۆ جیاوازی نانەوە و، کارەکەیان ئێرەیی و ڕق لە یەك بوونی لێ دەبێتەوە؟

**وەڵام:**

*یەکەم:*

لەبەر ئەوەی لە کاروبارەکانی سەربەدوارۆژدا ئیرەیی و کێبەرکێ و پاڵپاڵێن نییە، ئەوا ئەگەر هەرکام لەم کۆمەڵانە کارێکی چەشنی کێبەرکێ و ئیرەیی ئەنجام بدات، ئەوا وەکو ئەوە وایە کە ڕیا و دووڕوویی لە خواپەرستیدا کردبێت.

*دووهەم:*

لەگەڵ سەرجەمی ئەو کۆمەڵانەدا کە بە هۆی "خۆشەویستیی ئایین"ەوە دروست بوون، ئێمە بە دوو مەرج یەکدەگرین:

مەرجی یەکەم:

ئەوەیە کە پارێزگاری لە مەشرووتییەتی شەرعی بکرێت.

مەرجی دووهەم:

هەڵسوکەوتێکی بەدەر لە خۆشەویستی نەکات و، هەوڵ نەدات بەهای خۆی بەوە بەرز بکاتەوە کە پەڵەیەك بخاتە سەر کۆمەڵە ئیسلامییەکانی تر.

گریمان لە یەکێکیشیاندا هەڵەیەك هەبێت، ئەوا دەبێ ئەو هەڵەیە بە بیری گشتیی کۆمەڵەی زانایان بسپێردرێت کە موفتیی نەتەوەیە..

هەروەها دەبێ ئەو کەسە هێزی کۆمەڵەکەی نەقۆزێتەوە و لەو ڕێیەوە نەبێتە دەسەڵاتدارێکی زۆردار، چونکە هەر کەسێ بە چێژی بەڕێوەبردنی سیاسی سەرمەست بوو، نایەوێت وازی لێ بهێنێت!

*سێهەم:*

هەر کۆمەڵەیەکی ئایینی کە ئامانجی بەرزکردنەوەی ناوی پیرۆزی (الله) بێت، نابێتە هۆکاری گەیشتن بە هیچ ئامانجێکی تر. خۆ گەر خۆیشی ئەمەی بوێت، ئەوا تیایدا سەرکەوتوو نابێت.

خاتری حەق و ڕاستی هێندە بەرزە کە لە پێناوی هیچ شتێکدا بەخت ناکرێت و، شەریعەتیش ناکرێتە هۆکار بۆ گەیشتن بە هیچ مەبەستێك.

ئایا چۆن هێشووە ئەستێرەی (کۆ) دەکرێتە گسك؟ یاخود بە وێنەی هێشـووە ترێـەك دەخورێت؟

ئەوەی کە "فوو" لە خۆری ئیسلام دەکات، شێتیی خۆی ڕادەگەیەنێت.

ئەی کۆمەڵە ئایینییەکان!

مەبەستمان ئەوەیە کە کۆمەڵە جیاجیاکان لە "ئامانج"دا یەك بگرن..

لەبەر ئـەوەی یـەکگرتن لـە "ڕێبـاز"ەکـاندا لـە توانـادا نییـە، چونکـە دەرگـا لەسـەر چاولێکەری دەکاتەوە و، وتەی: "بە من چی، با خەڵکی تر بیری لـێ بکەنەوە"ش دەخاتە سەر زارەکان..

جیاوازی نێوان چوار مەزهەبەکە ئاماژەیە بۆ ئەم نهێنییە.

ئێمە لە هەر ڕێگایەکەوە بێت خزمەتی ئیسلامان دەوێت!

**گومان:**

ئەوانەی کە لـەم کۆمەڵـە فەرمییـەدا - کـە نموونـە و سـەرەتای یـەکێتیی ڕاستەقینەی محەممەدییـە ﷺ - بـە شـێوەیەکی ڕووکـەش دەبنـە ئـەندام، وەك ئـەندام بوونـی مەعنـەوی، زۆربەیان خەڵکی عەوامن و بەشێکیشیان نەناسراون، ئایا ئەمە ئاماژەیەك نییە بۆ ئـەوەی کە لەسەر بناغەیەکی توندوتۆڵ دانەمەزراوە؟

**وەڵام:**

هەموو موسڵمانێك لەناو بازنـەی یـەکێتیی محەممـەدیی گەورەدایـە. جـا ئـەم "یـەکێتیی محەمـەدی"یـەی ئێسـتا، کـە نموونـە و سـەرەتای ئـەوی تـرە، لێکچوونێکی تێدایـە لەگـەڵ ئەوەی سەرەتای ئیسلامدا، لەوەدا کە ڕێ بە هاتنە ناوەوەی ئامانجە کەسییەکان نادات.

هەروەها مـادەم ئامـانجی یەکێتییەکـە بەرزکردنەوەی وشـەی پیرۆزی (اللّٰه)یـە، ئـەوا هەموو جموجووڵ و کردەوەیەکی "پەرستش"ە..

خۆ لە پەرستش و مزگەوتدا پادشا و دەروێش و گەدا هەموویان یـەکن و، یەکسـانیی ڕاستەقینە دەستووری ئەوێیە و، هیچ ئیمتیازێکیش نییە جگە لە تەقوای خوای گـەورە. چونکە بەڕێزترین کەس پارێزگارترینیانە و، پارێزگارترینیش خاکی ترینیانە.

کەواتە ئەوەی کە بە ڕوو کەش دەبێتە ئەندام، کتومت وەك ئەوەی کە بە ناوەرۆك و لە دڵەوە دەبێت، شەرەفێك بەو کۆمەڵەیە نابەخشێت، بەڵکو خۆی شەرەفمەند دەبێت.

دڵۆپێك ئاو ناتوانێت دەریایەکی گەورە زیاد بکات.

جا هەروەك دەریایەکی گەورە لە سوراحییەکدا جێی نابێتەوە، بە هەمان جۆر "یەکێتیی محەممەدی"ش لە ئەستەمبوولدا جێی نابێتەوە..

دیاردەی بە ئەندام بوونی هەندێ کەسی نەناسراویش ناتوانێت ئەو حەقیقەتە گەورەیە لەکەدار بکات. چونکە کەسێك گەر خۆیشی لەکەدار بێت، خۆ ئیمانەکەی هەر پیرۆزە. ئامرازی پەیوەندییەکەش لێرەدا ئیمانە.

کەواتە لەکە خستنە سەر ئەم ناونیشانە پیرۆزە، بەم بەهانەیە، نەزانیی بەها و مەزنیی ئیسلام دەگەیەنێت و، ڕاگەیاندنی ئەوەیە کە خۆی نەزانترین کەسە. چونکە هەروەك ئەو کەسەی کە لەکەی پێوە بێت بە گوناهی گەورە لە ئیمان دەرناچێت، دەرگای تۆبەش بە هەمان جۆر هەتا خۆر لە خۆرئاوەوە هەڵدێت کراوەیە بۆ ئەو کەسانەی پێیان دەوترێت نەناسراو.

ئنجا گەر پڕی سوراحییەك ئاوی پیس بکرێتە ناو دەریایەك، دەریاکە پیس ناکات، بگرە خۆیشی پاك دەبێتەوە.

ئێمە بەوپەڕی هێزمانەوە و، بە بەراورد لەگەڵ هەموو کۆمەڵەکانی تردا، توانج تێگرتن و لەکە خستنە سەر ئەم کۆمەڵەیەمان، کە سەرەتای یەکێتیی محەممەدییە ﷺ ڕەتدەکەینەوە.

بەو توانجگرانەش دەڵێین:

با خۆیان نەکەنە شایانی زللەی بێئامانی ڕۆژگار.

گومان:

لە کۆمەڵەکانی تردا کاروبارەکان نهێنی و شاردراوەن، کەچی سەبارەت بە یەکێتیی محەممەدی، دەرخستنی نهێنییەکان و ئیش کردنی ئاشکرا بە پێویست زانراوە؟

وەڵام:

ئایینی ئیسلام خۆی لەخۆیدا ئاشکرایە..

هەروەها گەر هێزی فراوانبوونیشی بەر تەسك بکرێتەوە، ئەوا لەرزە بە هەموو دنیا دەخات..

هەروەها لەبەر ئەوەی فێڵکردن و کاری نهێنی پتر گومانەکان دەوروژێنێت، ئەوا ئەو ڕاستییە ئاشکرایانەی کە پاکن لە هەموو فێڵ و گومانێك، پێویستیان بە پەردەی نهێنی نییە..

هەروەها فێڵ لەم سەردەمەدا بریتییە لە سەرڕاستی و وازهێنان لە فێڵ!!

هەروەها ئەم کۆمەڵەیە بە کۆمەڵەکانی دیکە بەراورد ناکرێت. چونکە ئەوان تازەکی دەست دەکەن بە دروست بوون، بەڵام ئەم کۆمەڵەیە هەر زووتر بنیات نراوە و، لە هەندێ شوێندا بەدیار بووە.

ئێستاش کاتی ئەوە هاتووە کە ئەو ڕاستییە مەزنەی لە نیوەی گۆی زەویدا پەنهان و نادیار بووە، لە ژێر چینەکانی گومان و دوو دڵییەکاندا بێتە دەرەوە.

هەر لەبەر ئەوەیە کە ئەو ڕاستییە کەوتووەتە جووڵە و، لە هەندێ سووچەوە هەندێ ڕووی دەبریسکێتەوە.

جا کاتێ کە لە سەرەتای ئیسلامدا تەنها چل کەس بوون، ئەو ڕاستییە نەشاردرایەوە، دوای ئەوەی کە بوون بە سێ سەد ملیۆن چۆن دەشاردرێتەوە؟

گومان:

هەندێ کەسی ڕاڕا بە شەریعەتخوازان دەڵێن: کۆنەخواز؟

وەڵام:

بەڵێ، ئێمەش ناچار دەکەن کە پێیان بڵێین: بێ ئایین و ئاژاوەچی..

هەروەها بەوانە دەڵێین: ئێوە نەتانتوانی بە قسەی ڕازاوەی خەڵەتێنەر و فێڵ و تەڵەکە مەشرووتییەت بپارێزن، بەڵکو بە هەڵواسراوی بەجێتان هێشت.

ئێمە دەمانەوێ بە هێزی "شەریعەت" بنەمای مەشرووتییەت بەهێز بکەین و بیپارێزین.

جا ئەو ئاژاوەچییانە ئەگەر هێندەی گەردیلەیەك ویژدانیان ببووایە، بە هەموو کەسێکیان نەدەگوت کۆنەخواز کە لەسەر ڕێڕەوی ئەوان نەبێت، چونکە هەر لە ڕێڕەوەکەیانەوە هەتا دەگاتە کۆنەخوازی گەلێ پلە و مەنزڵ هەیە.

هەروەك ئەو قسەیە چەندە پڕوپووچە كە دەڵێت:

"ئەو كەسەی لە لەندەن نەبێت ئەوا دەبێ لە چین بێت، ئەوەش زمان لووس و خەڵەتێنەر نەبێت، دەبێ كەسێكی گێل بێت"..

ئەوانەش بە هەمان جۆر قسەی پڕوپووچ دەكەن.

چونكە بۆ نموونە ئەو كەسەی لە لەندەن یاخود لە چیندا نی‌یە، لە ئەستەمبووڵ یان حەرەمەیندایە. ئەوەش زمان لووس نەبێت، گێل نی‌یە، بەڵكو كەسێكی دانایە. ئەوەی بێ ئایین و ئاژاوەچی نەبێت، كۆنەخواز نی‌یە، بەڵكو شوێنكەوتەی شەریعەتی خاوێنە.

گومان:

تۆ لە سەلانیك لەگەڵ كۆمەڵەی ئیتیحاد و تەرەقی ڕێكەوتبوویت، ئەی بۆچی دوایی لێیان دوور كەوتیتەوە؟

وەڵام:

من دوور نەكەوتوومەوە، بەڵكو هەندێكی ئەوان دوور كەوتوونەتەوە. من هەتا ئێستاش لەگەڵ هەندێ مرۆڤی چەشنی نیازی بەگ و ئەنوەر بەگدا هەر هاوبیرم.

بەڵام هەندێ كەسی ئێمە لەوان جیابوونەوە و كەوتنە ڕێی گۆماوەكەوە. من گومانم لە غیرەتی ئەواندا نی‌یە، بەڵام ئەوان لە بەرامبەرەكەیاندا هەستیان بە هەندێ ئامانجی كەسی كرد و، ئەوانیش شوێنی ئامانجی سروشتی كەوتن.

وا ئێستا "شەریعەت" ئەوانە بۆ چوونە ژێر ناونیشانی "یەكێتیی محەممەدی" و خزمەتكردن بە ڕۆشنكردنەوەی زەینی خەڵكی، بانگهێشت دەكات.

پێم وایە گەلێ كەسی بە غیرەت لەبەر ئەوەی كودەتاكەی ئێمەیان بە شتێكی خوێناوی دەزانی، ئەوا خۆیان بە هەندێ چەكی مەعنەویی ئامانجە دەروونی‌یەكان، لە چەشنی ڕق و دوژمنایەتی و سەرسەختی، تەیار و پڕچەك كردبوو. بەڵام ئێستا دەركەوت كە كودەتایەكی خوێناوی نی‌یە.

هەندێ لە خاوەن ئامانجەكانیش كە بە مەبەستەكانی ئەوانیان زانی، ئەوا ئەو چەكە مەعنەوییانەی كە هۆكاری بەدەستهێنانی مەشرووتییەت بوون، بەوەی كە ئێستا گۆڕاون بۆ ڕەوشتی بەد و بیری تۆڵە سەندنەوە، بوونەتە چەكێكی تۆقێنەر لە دژی مەشرووتییەت.

من هەمیشە لەگەڵ پیاوانی ئاییندار و بەغیرەتدام و، هەتا ئێستاش لەسەر ئەو ڕێبازەی خۆمم کە لە سەلانیك لە گۆڕەپانی ئازادی لە وتارێکدا ئاشکرام کرد. کە بریتییە لەوەی دەمەوێت مەشرووتییەتی ڕەوا، کە هۆیەکە بۆ بەرزکردنەوەی شان و شکۆی ئیسلام و بەرزڕاگرتنی وشەی پیرۆزی "الله"، لە بازنەی شەریعەتدا درێژە پێبدەم.

**گومان:**

ئەم هەموو پەیوەندییەت لەگەڵ وولقاندا چییە؟ یەکێتیی محەممەدی چ سوودێك لەمە دەبینێت؟

**وەڵام:**

ئایین بریتییە لە ئامۆژگاری کردن. کاریگەریی ئامۆژگاریش کارێکی پێویستە. ئەو کاریگەرییەش پەیوەستە بە جۆش و خرۆشی غیرەتی ئیسلامی و هەستەوەریی ویژدانەکانەوە. ئێمەش بەناونیشانی "یەکێتیی محەممەدی" - کە خۆی شتێکی سەرنج ڕاکێشە - پەنجەرەیەك بە ڕووی ویژدانی هەموو کەسێکدا دەکەینەوە و، دەمانەوێت لە ڕێی ڕۆژنامە ئایینییەکانی چەشنی وولقانەوە، ئامۆژگارییە ئایینییەکان بەسەر ئەو ویژدانە هەستیار و جۆش سەندووانەدا ببارێنین.

ئەوانەش کە دژی ئەم کارانەن پێیان دەڵێین:

وەکو ئەو شێتانەی کە لەبەر ئەوەی هەندێ زیانی زۆر بچووکیان لە تیشکی خۆر و مانگەوە پێ دەگات لە دژی هەڵهاتنی خۆر و مانگ ڕادەوەستن، ئێوەش بە هەمان جۆر دەبنە ڕێگر لە دەرکەوتنی شەریعەتی خاوێن و وێنەدەرەوەکەی کە "یەکێتیی محەممەدی"یە، لەبەر ئەوەی کە لەگەڵ هەندێ ئامانجی هەندەکیی ئێوەدا یەکنا گرێتەوە.

بەڵام نابێت لەبەر زیانێکی کەم بەرژەوەندیی خەڵکی پشتگوێ بخرێت[1].

---

(١) لێرە بە دواوە هەتا تەواوبوونی وتارەکە، دانەر خۆی خستوویەتە کۆتایی وتاری (بەرپەرچدانەوەی گومانەکان) کە لە پاشکۆی (وتاری شام)دایە. بڕوانە لاپەڕە (٥٥٦ و ٥٥٧)ی ئەم کتێبە. (وەرگێڕ)

**وتاری یازدەهەم:**

# کورد و عوسمانییەت[١]

ڕۆژنامەی (ئیقدام)
ژمارە (٨٢٧٣)
١٩٢٠/٣/٧ز

بۆ ڕۆژنامەی بایەخداری (ئیقدام)!

ڕۆژنامەکانی ڕۆژی پێشتر، نووسینێکیان بڵاوکردووەتەوە کە گوایا لە پاریس هاوپەیمانێتی و ڕێکەوتنێك لە نێوان "شەریف پاشا" و "بۆغۆس نۆبار پاشا"ی سەرۆکی دەستەی ڕێپێدراوی ئەرمەنی دەربارەی کوردستان و ئەرمەنستان کراوە و، لەو ڕۆژنامانەدا داوا لە ڕای گشتیی کوردان کراوە ڕوونکردنەوە لەو بارەیەوە بدەن.

ئەو کوردانەی کە ماوەی چوار سەدە و نیوە بە وێنەی خزمەتگوزاری چاونەترس و فیداکار و لایەنگری یەکێتیی ئیسلام ژیاون و، لە زنجیرەی ئایینداریدا ڕاستگۆییان بە

---

(١) ئەم وتارە ئەحمەدی کوڕم واتاکەی تەرجەمە کردووە و، دوایی خۆم دامڕشتووتەوە. ئنجا پێکەوە لەگەڵ دەقە تورکی‌یەکەدا بەرامبەرمان کردووە.

ئەم وتارە ئیمزای سێ کەسایەتیی کوردی ئەو سەردەمەی لەسەرە، کە یەکێکیان مامۆستا نوورسی‌یە. ناوەرۆکی وتارەکە و هی وتارەکەی دوای ئەمەش بریتی‌یە لەوەی کە ئەرمەنەکان کەسێکی کوردیان بە ناوی شەریف پاشاوە (کە لە پاریس و دوور لە پەژارە و موعاناتی کورد ژیاوە و ڤێللایەکی گەورەی لەوێ هەبووە) بەکارهێناوە بۆ گەیشتن بە هەندێ لە ئامانجەکانیان. کەسایەتی‌یە کوردەکانی ئەو سەردەمەش کە دوای ئەوەی بۆیان دەرکەوت ئینگلیزەکان ڕاست ناکەن لە گەڵ کورددا و نایانەوێ کوردستان سەربەخۆیی بەدەست بهێنێت، بە هیچ جۆرێ ملیان بۆ ئەوە نەدا کە بە ناوی سەربەخۆییەوە لە ژێر چاودێریی هیچ دەوڵەت و لایەنێکدا بن، نەخوازەڵا ئەرمەن کە هێشتا خوێنی قەسابخانەی هەردوو لا لە یەکتر وشك نەبووبووەوە. کەسایەتی‌یە کوردەکان و سەرۆك خێڵەکان و زانایان و پەرلەمانتارانی کوردی ئەو کاتە پێیان وابوو کە ئەگەر سەربەخۆ نەبین و لە ژێر سایەی لایەنێکی دیکەدا بین، با ئەو لایەنە دەوڵەتی عوسمانی بێت کە مێژوو و خاڵی هاوبەش پێکەوەمان دەبەستێ، نەك ئەرمەن و ئینگلیز، کە ڕاست ناکەن لەگەڵ کورددا و مەرامی تایبەت بەخۆیان هەیە. (وەرگێڕ)

ئامانجی ژیان زانیوە و، هێشتا خوێنی نزیکەی پێنج سەد هەزار شەهیدیان وشک نەبووەتەوە و، هەتیوەکانیان لە شیشەکاندا بەندکراون و، چاوی پیرەکانیشیان بە فرمێسکی یادەوەرییە تاڵەکان تارمایی تێدا نەماوە..

هاوپەیمانی کردن بە شێوەی گرێبەست لەم کاتەدا لەگەڵ دوژمنانی مێژوویی و ژیانیاندا، زیانگەیاندنە بە ئیسلام و پێچەوانەی توندوتۆڵیی ئەوانە لە ئاییندا و، بە خۆ جیاکردنەوەش ناگەن بە ئاواتەکانیان.

لەسەر ئەم بناغەیە:

کوردان هەرگیز نە خودی ئەو کەسانە و نە ئاواتەکانیشیان ناناسن کە بەم شێوە دژە هەستە مامەڵە لەگەڵ ویژدانی میللییاندا دەکەن.

لەبەر ئەوەی بەڕێزتان یەکێتیی ئایینی و میللییەتان پاراستووە، ئەوا داخوازی ئەوەین لە ڕۆژنامەکەتاندا ڕێنمایی چۆنێتی ڕوونکردنەوەکە بفەرموون.

لە ساداتی بەرزنجی:
**پارێزەر أحمد عارف**

لە ساداتی بەڕێزی ناوچەی خیزان:
**عەقیدی یەدەك محمد صدیق**

لە زانایانی کورد:
**سەعیدی کوردی**

وتاری دوازدەهەم:

# كوردەكان و ئیسلامەتی

گۆڤاری (سبیل الرشاد)
ژمارە: (٤٦١) بەرواری: ١٧/٣/١٩٢٠ز

**بەدیعوززەمان سەعیدی كوردی، كە ئەندامە لە (دارالحكمة الإسلامیة)دا و، نوێنەری كوردەكانە لە دامەزراوی و ئایینداری و وەجاخزادەیی و ئازایەتیی موسڵمانانەدا، لە هەموو كەسێك زیاتر مافی قسەكردنی هەیە لەسەر ئەم بابەتە. ئەوەتا دەڵێ:**

بەهێزترین و ڕەوانترین بەرپەرچدانەوە بۆ ئەو گرێ بەستەی كە "بۆغۆس نۆبار" و "شەریف پاشا" ئیمزایان لەسەر كردووە، لە ڕێی تەلەگرافەوە درایەوە كە سەركردەی هۆزە كوردەكان لە هەرێمەكانی خۆرهەڵاتەوە ناردوویانە.

كوردەكان واز لە كۆمەڵگای ئیسلام ناهێنن، خۆ ئەوانەش كە قسەیەكی تری جگە لەمە بڵێن، چەند كەسێكی كەمن لەوانەی بە دوای ئامانجە تایبەتەكانی خۆیاندا وێڵن و، هیچ دەسەڵات و مافێكیان نی‌یە كە بە نوێنەرایەتیی گەلی كوردەوە لێدوان بدەن.

كوردەكان لەم دواییەدا پێنج سەد هەزار كەسیان لەپێناوی سەربەرزیی ئیسلامدا بەخت كرد، تاكو جارێكی دی بیسەلمێنن كە لایەنگری خەلافەتن.

با بێینە سەر باسی ئەو یادداشتنامە ئابڕووبەرە:

ئەرمەنەكان خۆیان باش دەزانن كە لە هەرێمەكانی خۆرهەڵاتدا كەمایەتی‌یەكی یەكجار كەم پێكدەهێنن..

لەبەر ئەوە، باشترین و ئاسانترین كار بەلایانەوە ئەوەبووە كە "شەریف پاشا" بكەنە داردەستێك بۆ پشتگیری كردن لە بیروبۆچوونەكانیان، بەو گومانەی كە گوایا نوێنەری كوردەكانە و، ئیتر لەو ڕێیەوە كێشەی كورد و كێشەی ئەرمەنیش چارەسەر دەبێت و، ئاواتی جیابوونەوەیان دێتەدی.

جا بۆ هێنانەدیی ئەم ئامانجە هاوبەشە، یادداشتنامەیەکیان بە شێوەیەکی هاوبەش ئیمزا کردووە، تاکو پێشکەشی "کۆنگرەی ئاشتی" بکرێت.

نیازی ئەرمەنەکان جگە لە هەڵخەڵەتاندنی کورد، شتێکی دیکە نییە. چونکە تەنانەت لە داهاتووشدا ناتوانن نکوولی لەوە بکەن کە کورد لە رووی ژمارەی دانیشتووانەوە زۆرینە پێکدەهێنن. بەڵام بەو حاڵەشەوە دەبنە پاشکۆی ئەرمەن، چونکە لە رووی خوێندەواری و زانستەوە پلەیان لە ئەرمەنەکان نزمترە!

لەبەر ئەوە، ناکرێ هیچ کوردێکی ژیر پشتی ئەو کارە بگرێت.

بە هەرحاڵ.. کوردەکان بە کردار - نەك گوفتار - سەلماندیان کە دژی ئەو یادداشتنامەیەن.

کێشەی کورد (واتە بەو شێوەیەی کێشەی ئەرمەن) قسەیەکی بێ واتایە. چونکە کوردەکان پێش هەموو شتێك موسڵمانن. ئنجا وێرای پشتگیریی توندوتۆڵیان بۆ ئیسلام کە هەندێ جار دەگاتە رادەی دەمارگیری، بە جۆرێکی راستەقینەش موسڵمانن. لەبەر ئەوە، تەنها بۆ چرکە ساتێکیش خۆیان سەرقاڵ ناکەن بەوەی کە ئایا لە هەمان رەگەزی ئەرمەن بن یان نا؟

ئیسلام دژی بیرۆکەی دەمارگیرییە، چونکە پێچەوانەی بیرۆکەی "برایەتیی نێوان موسڵمانان"ە.

قسەیەك لە ئارادایە لەبارەی بەخشینی سەربەخۆیی بە کوردەکان..

بەڵام کورد مردنی پێ باشترە لە سەربەخۆییەك کە لە ژێر چاودێریی دەوڵەتێکی بیانیدا بێت. خۆ ئەگەر پێویستی بێ چاودێری هەبێت دەوڵەتی عوسمانی ئەو ئەرکە رادەپەڕێنێت، نەك "نۆغۆس نۆبار" و "شەریف پاشا".

بە پوختی:

کورد پێویستی بە دەمراستی و خۆهەڵقورتاندنی کەسی تر نییە لەم کێشەیەدا.

گەر بێینە سەر روونکراوە زانراوەکانی سەیید عەبدولقادر ئەفەندی، ئەوا ئێستا لەو بارەیەوە هیچ شتێك ناڵێم، سەرەڕای ئەوەش لە تواناما نییە کە بزانم ئایا ئەو زانیارییانە تەحریف کراون یان نا؟

بەرهەمی شەشەم:

# سنووحات

بەدیعوززەمان

## سەعیدی نوورسی

داینـاوە

## فاروق ڕەسووڵ یەحیا

کردوویە بە کوردی

بسم الله الرحمن الرحيم

حامد

**ڕوونکردنەوەیەك:**

کـاتێك بـیرم لـە هـەندێ ئایـەتی قورئـانی پـیرۆز دەکردەوە، چەند سەرنجێکی ناسکم بە دڵدا هات و، لە شێوەی تێبینی و یادداشتدا تۆمارم کردن.

تۆیـش - ئـەی خوێنـەری ئـازیزم! - لـە شـێوازە چڕوپڕە کورتەکـەم بێزار مەبە، چونکە مـن لـە وشـەدا دەوڵەمـەند نیـم و، حـەز لـە ئیسـراف ناکـەم و، وشـە ڕازاوەکانیشم پێ باش نی‌یە..

کەواتـە لـە هـەموو شتێکدا باشـەکەی وەربگـرە و، هـەر لەسـەر ئـەم بنەمایـە برۆ. ئیـتر هـەر شتێکت بـە دڵ نەبوو، ڕەخنەی لـێ مەگرە و، وازی لـێ بهێنە بۆ خۆم.

**سەعید**

---

مەبەستی دانەر لە بەکارهێنانی وشەی (سنووحات) ئەو واتایانەیە کە بە کتوپڕی لـە ئاسـۆی دڵـدا هەڵدێن. (وەرگێڕ)

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿إِلاَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ﴾ (العصر: ٣)

تەنـها حیکمـەتی "ڕەهـایی" لـەم ئایەتـەدا ڕوون دەکەینـەوە. چونکـە قورئـانی پـیرۆز (الصالحات)ی بە ڕەهایی هێشتووەتەوە، بێ ئەوەی پابەندی بکات بە مەرجێکەوە و.. بـە نادیاری دەری بڕیوە، بێ ئەوەی دەستنیشانی بکات..

"خێر" و "جوانی" و زۆربەی ڕەوشتە بەرزەکان چەند شتێکی گوێڕەیین؛ کاتێ کە لە جۆرێکەوە دەچن بۆ جـۆرێکی تر، دەگـۆڕێن.. هەروەها لە چەشنێکەوە بـۆ چەشـنێکی تر و لە شـوێنێکەوە بۆ شـوێنێکی تر و لـە ڕوویەکـەوە بۆ ڕوویەکی تر، جیاوازییان دەبێت و.. هەتا لە "تاك"ەوە بۆ "کۆمەڵ" و لە "کەس"یشەوە بەرەو "نەتەوە" بەرز بینەوە، ناوەرۆکیان دەگۆڕێت.

بۆ نموونە:

"ئازایەتی" و "سەخاوەت" گەر لە پیاودا هەبن، ئەو پیاوە بەرەو غیرەت و یارمەتیدانی کەسانی تر هـان دەدەن. بـەڵام ئەگـەر لـە ئافرەتدا بـبن، فـێری گوێڕایـەڵی نـەکردن و بێ ئەدەبی و بەجێنەهێنانی مافی مێردی دەکەن.

نموونەیەکی تر: ئەو دەروونبەرزی(عزة النفس)یەی کـە "لاواز" بەرامبـەر "بـەهێزان" هەستی پێ دەکـات، گـەر لــە مرۆڤـی بـەهێزدا بێـت بـە "تەکـەببور" دادەنـرێ.. ئـەو "تەوازوعە"ش کە مرۆڤی بەهێز بەرامبەر لاواز هەستی پێ دەکات گـەر لـە بابـای لاوازدا بێت بە "زەلیلی" دادەنرێ.

نموونەیەکی تر: جیددییـەت و لێبڕانی کاربەدەسـت و حوکمڕان لـە پلـە و پایەکـەی (ڕێ و شوێنی کارەکەی)دا بە "ویقار" و، نەرمونیانیشـی لـەوێدا بـە "زەلیلـی" لـە قەڵـەم دەدرێ.. بـەڵام گـەر ئـەم جیددییەتـە لـە ماڵـەوەیدا دەربـبڕێ، ئەوا دەبێـت بـە بەڵگـەی "تەکەببور" و، گەر نەرمونیانیش بێت بەڵگەی "تەوازوع"ە.

نموونەیەکی تر: ئەگەر ڕێکخستنی پێشەکیی هەر کارێك بە خوای گەورە بسپێررێ، بە "تەمبەڵی" دادەنرێت، بەڵام بۆ هاتنەدیی ئەنجام بە "تـەوەککول" دەژمێررێ.. هـەروەك ڕازی بوونی مرۆڤ بە ئەنجامی کردوکۆششەکانی و ئـەو بەشـەی دەیدرێتێ و دەیکـەوێ "قەناعەت"ە و ئارەزووی زیاد کردنی کۆششـی تێدا بەهێز دەکـات. بـەڵام ڕازی بـوون تەنها بەوەی کە لە دەستدایە بەڵگەی "کورتهێنانی هیممەت"ە.

نموونەیـەکی تـر: ئەگـەر مـرۆڤ لـەو کەسانە خـۆش بێـت کـە خراپـەیان بەرامبـەر کردووە، یانماڵی خۆی ببەخشێت و بەختی بکات، کردەوەیەکی چاکی ئـەنجام داوە.. بەڵام ئەگەر ئەمە بە ناوی کۆمەڵ و کەسانی تـرەوە بکـات، ئـەوا بـە خیانـەت دادەنـرێ.. هەروەها بۆی نییە شانازی بە شتێکەوە بکات کە تایبەتە بە خۆیـەوە، بـەڵام دەتوانێـت بـە ناوی نەتەوەوە شانازی بکات، بێ ئەوەی مافی نەتەوەکەی بخوات و پێشێلی بکات.

بـەم جۆرە، لـە هـەموو یـەکێکی ئەوانـەی باسمـان کـرد نموونەیـەکت بینـی. دەسـا بـۆ خۆیشت نموونەی تر بدۆزەرەوە.

جا مادەم قورئانی پیرۆز گوفتارێکی ئەزەلییە و ئاراستەی هەموو چینەکان لـە هـەموو چەرخ و بارودۆخێکدا کراوە..

هـەروەها مـادەم جوانیـی نیسـبی و خـێری گوێرەیـی گەلـێ زۆرن، ئـەوا هێنـانی "الصالحات" بە ڕەهایی لە قورئاندا پوختەیەکی ڕەوانە بـۆ درێژەپێدانێکـی زۆر. بێدەنـگ بوونیشـی لـە جۆرەکـانی "الصـالحات"(کـردەوە باشـەکان) لـە ڕاسـتیدا گـوفتـارێکی فراوان و ئیعجازێکی ڕەوانە!

* * *

﴿وإِنَّ الْفُجَّارَ لَفِي جَحِيمٍ﴾ (الانفطار: ٤)

"ئاکام" بەڵگەی سزایە، "حەدس"[(١)] بەڵگەیە لەسەری. نابینی ئەو گوناهـەی کـە لـەم دنیایەدا ڕوو دەدات، بەڵگەیەکی حیدسییە لەسەر ئەوەی کە ئەنجامەکەی بـەرەو سـزای دەبات! چونکە هەر مرۆڤێـك لـە ڕێـی حیـدس و ئـەزموونی تایبـەتیی خۆیـەوە دەبینـێ کـە

(١) حەدس، حیدس: خێرایی زەینی مرۆڤ لە تێگەیشتندا. (وەرگێڕ)

گوناهـ هەمیشە ئاکامی خراپ و زیانبەخشی لـێ دەبێتەوە، هەرچەندەش پەیوەندییـەکی سروشتی لە نێوان ئەم دوانەدا نییە..

جا ئەم هەموو تاقیکردنەوە زۆر و زەبەندەیە، کە لە ڕووبەرێکی یەکجار فراواندا ڕوو دەدات، هەرگیز ئەنجامی ڕێکەوت نییە.

خۆ ئەگەر ئەم تاقیکردنـەوە کەسییانە بـە هـەند وەربگیرێن، خـاڵێکی هاوبـەشمان بـۆ دەردەکەوێ لە نێوانیاندا، ئەویش سروشتی گوناهـە کـە داخـوازی سـزایە. کەواتـە سـزا خواستێکی خۆیی گوناهکردنە.

جا مادەم ئەو خواستە پێویستەی گوناهـ لەم دنیایـەدا زۆربـەی جـار تەنـها لـە ئاکـامی گوناهکردنەوە پەیدا دەبێت، ئەوا هەر گوناهێك لەم دنیایەدا سزای لـێ نەکەوتبێتەوە بێ گومان لەو دنیادا سزای لـێ دەکەوێتەوە.

ئایا کەس هەیە لـە ژیـانی خۆیـدا تاقیکردنەوەیەکی وای بەسـەردا نـەهاتبێ کـە تیـایدا بڵێ: فڵانە کەس سزای کردەوە خراپەکەی خۆیەتی هاتووەتەوە ڕێی؟!

* * *

﴿وَجَعَلْنَاكُم شُعوباً وقبائلَ لِتعارَفُوا﴾ (الحجرات: ١٣)

[أيْ: لِتعارَفُوا، فَتَعاوَنُوا، فَتَحابُّوا.. لا لِتَناكَرُوا، فَتُعانِدُوا، فَتَتَعادَوْا].

واتە: (بۆ ئەوەی یەکتر بناسن، ئنجا هاوکاری لە نێوانتاندا دروست ببێت و یەکترتان خۆش بوێت.. نەك بۆ ئەوەی یەکتر نەناسن و، پاشـان سەرسـەختی بنوێنـن و دوژمنایـەتیی یەکتری بکەن)!

چونکە هەروەك کۆمەڵە هۆکارێکی پەیوەستکەر هەیە کە پەیوەندیی سەرباز بـە لـق و تیـپ و لیـوا و هێزەکـەی لـەناو سـوپادا گـرێ دەدات و، لـە هـەموو یـەکێکی ئـەو پەیوەندییانەدا ئەرکێکی دەکەوێتە ئەستۆ..

مرۆڤیش لە کۆمەڵگادا وایە؛ چـەندین پـەیوەندیی ڕیزبەستووی یـەك لـە دوای یـەك و ئەرکی هـاوپەیوەندیی لە ئەسـتۆدایە، ئەگـەر ئەم ئەرك و پەیوەندییانـە تێکـەڵ بـە یـەکتر بن و، دەستنیشان نەکرێن هەرگیز هاوکاری و یەکتر ناسینیش نایەتە کایەوە.

گەشە کردنی "هەستی نەتەوایەتی"ش لە لای هەر کەسێك، یان بە جۆرێکی ئیجابی دەبێت یان سەلبی..

ئیجابی‌یەکەیان ئەوەیە کە بەهۆی سۆز و بەزەیی و شەفەقەتەوە بەرامبەر هاوڕەگەز گەشە دەکات و، مرۆڤ بۆ هاوکاری و یەکتر ناسین بەرێ دەخات.

بەڵام سەلبی‌یەکەیان ئەوەیە کە بەهۆی سووربوون لەسەر دەمارگیری گەشە دەکات. ئەمەش دەبێتە هۆی لە یەکتر دابڕان و سەرسەختی نواندن لەگەڵ یەکتریدا.

ئایینی ئیسلامیش ئەمەی دواییان ڕەت دەکاتەوە.

* * *

﴿وما مِنْ دابَّةٍ فِي الأرضِ إلاّ عَلَى اللهِ رِزْقُها﴾ (هود: ٦)

"ڕۆزی" گەلێ گرنگە و، بە لای قەدەری خوای گەورەوە کتومت وەکو گرنگیی "ژیان" وایە. چونکە "توانست"ی خوایی ڕۆزی بەدی دەهێنێت و، "قەدەر" پۆشاکێکی دیاری کراوی پێ دەپۆشێت و، "چاودێری"ی خوای گەورەش سەرپەرشتیی دەکات.

کەواتە توانستی خوای گەورە بە کارامەییەکی مەزن جیهانی چڕوپڕ دەگۆڕێت بە جیهانێکی ناسك و نیان. ئنجا بۆ ئەوەی گەردیلەکانی بوونەوەران بەشێك لە ژیان بەدەست بهێنن، ئەوا بە ئاسایی‌ترین هۆکار و ساکارترین بیانوو ژیانیان پێ دەبەخشێت. هەر بە هەمان گرنگیش ئەو توانستە خواییە ڕۆزیی بۆ ئامادە دەکات بە شێوەیەکی هاوڕێژە لەگەڵ کرانەوە و بەرەو پێش چوونی ئەو ژیانەدا.

کەواتە "ژیان" ئاکامێکی دەستنیشان کراوە، واتە شتێکی دیار و سنووردارە، بەڵام ڕۆزی دەستنیشان کراو نی‌یە. واتە: کتوپڕ پەیدا نابێت، بەڵکو دەم بە دەم و سات بە سات و یەك لە دوای یەك بە دەست دێت و شتێکی بڵاوە و، مرۆڤ هان دەدات بە تێرامانەوە بیری لێ بکاتەوە.

لە گۆشە ڕوانینێکی تایبەتەوە دەتوانرێ بوترێت: مردن لە برساندا نی‌یە (واتە کەس لە برساندا نامرێ). چونکە پێش ئەوەی خۆراکی پاشەکەوت کراوی ناو جەستە لە شێوەی چەوری و غەیری ئەویشدا تەواو ببێت، مرۆڤ دەمرێت.

واتە: ئەو شتەی کە دەبێت بەهۆی مردنی مرۆڤ نەخۆشیی ئەنجامی وازهێنانە لە عادەتی ئاسایی، نەك نەبوونی ڕۆژی.

* * *

﴿وإنَّ الدّارَ الآخِرَةَ لَهِيَ الْحَيَوان﴾ (العنكبوت:٦٤)(١)

گۆی زەویمان وەکو گیانداریك وایە، ئەوەتا ئاسەواری ژیانی پێوە دیارە..

گریمان گۆی زەوی هێندەی بارستایی هێلکەیەك بچووك بیتەوە، ئایا گیانداریك دەرناچێت؟

یان گریمان میکرۆبێکی بچووك هێندە گەورە ببێت هەتا بە ئەندازەی گۆی زەویی لێ بێت، ئایا کتومت لە زەوی ناچێت؟

جا مادەم گۆی زەوی زیندووە، ئەوا گیانیشی هەیە!

بەڵێ، جیهان – کە مرۆڤێکی گەورە کراوە – بەهۆی ئەو بوونەوەرە ڕێکخراوانەی کە لە خۆی گرتوون، هێندە لە ئاسەواری ژیان دەردەخات وەك ئەوەی کە "جەستە" لە بەش و ئەندامەکانی خۆیدا دەریان دەخات، وەك: پشتگیری و، بەدەم یەکەوە چوون و، هاوکاریی یەکتر لە نێوان بەش و ئەندامەکاندا. تەنانەت ئەم ئاسەوارانەی ژیان کە "جەستە"پێش چاویان دەخات، کەم و کۆتاترە لەوەی کە"جیهان" دەریان دەخات!

خۆ ئەگەر بارستایی "جیهان" هێندەی بارستایی"مرۆڤ" بچووك بیتەوە و ئەستێرەکانیشی بە وێنەی گەردیلەکانیان لێ بێت، ئایا گیانەوەرێکی خاوەن هەستی لێ دەرناچێت؟

ئەم ئایەتە پیرۆزە ئاماژە بۆ نهێنییەکی مەزن دەکات:

سەرەتای "زۆری" بریتییە لە "یەکی". هەروەك کۆتاییەکەشی هەر "یەکی"یە. ئەمەش دەستوورێکی سروشتییە. ئەوەتا توانستی خوای گەورە هەر لەو هێزەی کە لەناو بوونەوەراندا دایناوە – کە ئەویش ڕێژنەی درەوشانەوە و ئاسەواری داهێنانی خۆیەتی –

(١) ژیانی ڕاستەقینە هەر تەنها ژیانی ئەودنیایە.. هەر ئەو جیهانەی ئەوێیە کە خودی ژیانە بە ڕاستی.. چونکە هیچ گەردیلەیەکی ئەوێ هەرگیز مردن بە خۆیەوە نابینێت. کەواتە دنیاکەی ئێمەش گیاندارێکە. (دانەر)

هێزێکی گشتیی کێش کردنی بەدی هێناوە کە سەربەخۆ و دەستنیشان کراوە و پەیوەستە بەو هێزەی لە بوونەوەراندایە و، چاکەیەکی ئەو توانستەیە کە هێزێکی کێش کردنی تایبەتی بە هەموو یەکێك لە گەردیلەکانی بوونەوەر بەخشیوە و، لەم ڕێیەوە پەیوەندیی ناو گەردوونی هێناوەتە کایەوە..

جا هەروەك گەردیلەکان ئاکامی هێزەکانی کێش کردنیان تێدایە کە لەو هێزەی تیایدا دانراوە پەیدا بووە و، ڕووناکیی ئەو هێزە و گۆڕانێکی جوان و ناسکی توانەوەی ئەوە.. بە هەمان جۆر، ئاکام و بریسکانەوەی دڵۆپەکانی ژیان کە بەسەر هەموو بوونەوەراندا بڵاو بووەتەوە، بریتی‌یە لە ژیانێکی گشتیی ئەوتۆ کە هەموو بوونەوەران دەگرێتەوە. بەڵێ، ئەم کارە وا دەخوازێ. ئەوەتا لە هەر شوێنێکدا ژیان هەبێت، ڕۆحیش لەوێ هەیە. ڕۆحیش وەکو ژیان وایە؛ کۆتاییەکەی سەرەتای درەوشانەوەی ڕێژنەی ڕۆحێکە.

سەرەتای ئەم ڕۆحەش درەوشانەوەیەکی ئەو ژیانە هەمیشەییەیە کە لای سۆفی‌یەکان ناوی "ژیانی ساری"ی لێ نراوە.

بەم جۆرە، دەرکەوت کە هۆی ئەو ئاڵۆزی و لێ تێکچوونەی کە ئەهلی ئیستیغراق تێی کەوتوون و مایەی سەر هەڵدانی شەتەحاتیانە، تێکەڵی و ئاڵۆز بوونی ئەم سێبەرەیە لەگەڵ ئەسڵەکەدا لە لای ئەوان.

* * *

﴿ولا تَقُولُوا لِمَنْ يُقْتَلُ في سَبيلِ اللهِ أمْواتٌ بَلْ أحياءٌ ولكِنْ لا تَشْعُرون﴾ (البقرة: ١٥٤)

[أي: ولكنّهم يشعُرُون أنّهم أحياءٌ ما ماتُوا].

(واتە: بەڵام شەهیدان خۆیان هەست دەکەن کە زیندوون و نەمردوون).

شەهید خۆی بە زیندوو دادەنێت(١). ئەوەتا لەبەر ئەوەی ژانی سەرەمەرگ ناچێژێت، پێی وایە کە ئەو ژیانەی بەختی کردووە هەر ماوەتەوە و بەردەوامە، تەنانەت لە چاو هی پێشووی گەلێ جوانتر و خاوێنتری دەبینێت.

---

(١) ڕووداوێکی سەرسووڕهێنەر ئەم واتایەی بە تەواوی بۆ سەلماندم. (دانەر)

ژیانی شەهید و، کەسێکی مردوو بە وێنەی ئەم نموونەیە وایە:

دوو کەس لە خەونیاندا تام و لەزەتێکی خۆش لە گەشت و گەڕانی ناو باخێکی ناوازە و ڕەنگین دەچێژن..

یەکێکیان لە خەونەکەیدا دەیزانی کە ئەوەی دەیبینێت خەونە و ڕووداوی ڕاستەقینە نییە. لەبەر ئەوە، تام و لەزەتی تەواوەتیی لەو خەونەی نەدەچەشت. بەڵام ئەوی تریان نەیدەزانی کە ئەوەی دەیبینێت خەونە، بەڵکو لەو باوەڕەدا بوو ڕاستییە، بۆیە هەستی بە لەزەت و بەختەوەریی ڕاستەقینە و بێگەرد دەکرد.

جا لەبەر ئەوەی جیهانی خەون سێبەرێکی جیهانی میسالە و، ئەویش سێبەرێکی جیهانی بەرزەخە، ئەوا دەستوورەکانی ئەم جیهانانە لەیەك دەچن.

* * *

﴿مَنْ قَتَلَ نفْساً بغَيْرِ نفسٍ أوْ فَسادٍ في الأرضِ فَكَأنَّما قَتَلَ النّاسَ جَميعاً وَمَنْ أحْياها فَكَأنَّما أحْيا النّاسَ جَميعاً﴾ (المائدة: ٣٢)

ئەم ئایەتە پیرۆزە ڕاستییەکی ڕوون و بێگەردە و، هەرگیز لەگەڵ ژیریدا ناتەبا نییە و، سەرتاپا حەقیقەتێکی دوور لە زیادەڕەوییە. بەڵام ڕوانینی ڕواڵەتی داوای تێڕامان دەکات:

**ڕستەی یەکەم:**

ئەم ڕستەیە مەزنترین دەستوور بۆ ئەو دادگەرییە پەتی و بێ خەوشە دادەنێت کە بڕیار دەدات: نابێ خوێنی کەسێکی بێ تاوان بڕژێت و گیانی لێ بسێنرێت، تەنانەت گەر ئەو کارە ببێت بەهۆی ژیانی هەموو گرۆی مرۆڤیش. چونکە هەروەك لە ڕوانینی توانستی خواییدا هەردووکیان یەکسانن، لە بەردەم دادگەریشدا وەهان.. هەروەك ڕێژەی شتانی جوزئی سەبارەت بە شتانی کوللی یەکێکە، حەقیش بە هەمان ڕێژەیە لە تەرازووی دادگەریدا. کەواتە لە بواری "حەق"دا گەورە و بچووك لەگۆڕێدا نییە.

بەڵام دادگەریی نیسبی و گوێرەیی دەچێت "جوزء" دەکات بە قوربانی "کول"، بە مەرجێ ئەو جوزئە هەڵبژاردەیە چ بە ڕاشکاوی و چ بە شێوەیەکی ناوەکی ڕەزامەندی و

ئیختیاری خۆی لەو بەخت کردنەدا هەبێت. چونکە کاتێ "من"ی تاکە کەسەکان دەگۆڕێت بە "ئێمە"ی کۆمەڵ و، تێکەڵ بە یەکتر دەبن و گیانی کۆمەڵ بەرهەم دەهێنن، تاك لەو کاتەدا ئامادەیە گیانی "خۆی" لە پێناوی "هەموان"دا بەخت بکات.

هەروەك "ڕووناکی" وەکو ئاگر دەردەکەوێت و دەبینرێت، زۆریی "ڕەوانبێژی"یش هەندێ جار بە "زیادەڕەوی" پێش چاو دەکەوێ.

سەرنجی ڕەوانبێژی لێرەدا لە سێ خاڵ پێکدێت:

*یەکەمیان:*

بۆ دەرخستنی بێ سنووریی توانا و ئامادەیی نـاو سروشتی مرۆڤـە سەبارەت بـە سەرپێچی و هەڵەشەیی.

چونکە هەروەك توانا و لێهاتنی مرۆڤ بۆ کاری خێر بێ سنوورە، بۆ شەڕ و خراپەش توانایەکی بێ کۆتایی هەیە. بە ڕادەیـەکی ئـەوتۆ کـە ئەگـەر کەسێك هەڵپە و خۆویستی بەسەریدا زاڵ ببێت، مرۆڤێکی وای لـێ دەردەچێت کە دەیەوێ هەموو ئـەو شتانە لـەناو بەرێت ڕێی هێنانەدیی هەڵپەکەی لـێ بگرن. تەنانـەت ئامادەیە بـۆ ڕووخـاندنی جیـهان و قڕکردنی ڕەگەزی مرۆڤ، گەر لە توانایدا بێت!

*دووهەمیان:*

بۆ سـەرزەنشت و بەربەسـت کردنی "دەروون"ە. ئـەویش بـە دەرخسـتنی هـێزی ئـەو توانا و لێهاتنە سروشتی‌یەی کە لە دەرەوەی دەروونـدا هەیە، لــە ڕێی پێش چـاو خستنی شتێ کە بگونجێ ڕوو بدات لە شێوەی شتێکدا کە ڕووی دابێت. بەو واتایەی کە تـۆوی ئـەو دەمارەی بـە غـەدر و سـەرپێچی لــێ دەدات، وا دەردەخـات کـە لـە دۆخـی هـێزەوە ڕۆشتبێتە دۆخی کار و هاتبێتە دی.

کەواتە ڕستەکە شـتانی "مومکین" دەگۆڕێـت بـە شتانی "واقیعی"ی وا کـە ڕوویـان دابێت، تاکو توانا و لێهاتنەکانی تا ئەو ڕادەیە بەربگرن کە شـێوەی درەختـی زەقوومیـان لـەخۆ گرتبێـت. ئەمـەش بـە مەبەسـتی ئـەوەی بێز لێکردنـەوە و تـەمێ بـوون بـەهۆی ئــەو سەرزەنشتەوە دابەزێتە ناخی دەروونەوە، کە هەر ئەمەش لێرەدا مەبەستە.

دیارە ڕێنمایی "ڕەوانبێژی" هەر بەم جۆرە دەبێت.

*سێ هەمیان:*

هەندێ جار کێشەی ڕەها(موتڵەق) لە شێوەی کێشەیەکی گشتی(کوللی)دا دەردەکەوێت.. هەندێ جاری تریش کێشەیەکی "کاتی"ی بڵاو لە شێوەی کێشەیەکی "بەردەوام"دا دەردەکەوێت..

لە کاتێکدا کە لە ڕووی مەنتیقی‌یەوە بۆ ڕاستی و دروستیی کێشەیەك هێندە سەروزیادە کە یەك "دانە" لە کاتێکی دیاری کراودا بڕیارێك بەدەست بهێنێت. بەڵام ئەگەر لە یەك دانە زیادی کرد و بوو بە چەند دانەیەکی خاوەن بایەخ و گرنگی، ئەوا کێشەکە لە ڕووی "عورف"ەوە بە کێشەیەکی ڕاست و دروست دادەنرێت.

هەموو چییەتی(ماهییەت)ێك چەند "دانە"یەکی نائاسایی، یان یەك "دانە"ی تێدایە کە لەوپەڕی تەواوی و کەماڵی ئەو "جۆرە"دایە. هەروەها هەموو "دانە"یەکیش زەمەنێکی نائاسایی هەیە بۆ چەند بارودۆخ و هەل و مەرجێکی سەرسووڕهێنەر، بە ڕادەیەك کە هەموو "دانە" و "زەمان"ەکانی تر لە چاو ئەو "دانە" و "زەمان"ە نائاساییەدا وەکو چەند گەردیلەیەکی بێ نرخ و بەها، یاخود بە وێنەی چەند وردە ماسی‌یەکی لێ دێت لەچاو نەهەنگێکی گەورەدا.

جا لەسەر بناغەی ئەم نهێنی‌یە، ڕستەی یەکەم هەرچەند بە ڕواڵەت "کێشەیەکی گشتی"یە، کەچی هەمیشەیی نی‌یە. بەڵام لە ڕووی "زەمان"ەوە ترسێنەرترین بکوژ دەخاتە پێش چاوی مرۆڤ.

بەڵێ، ڕۆژگارێك دەبێت کە تەنها یەك وشە سوپایەکی تەواو گیرۆدەی جەنگ دەکات و، تەنها یەك فیشەکیش دەبێت بەهۆی لەناوچوونی سی ملیۆن کەس[1].

هەروەها چەند باردۆخێکی ئەوتۆ دێنە کایەوە کە تەنها یەك جووڵەی بچووك - لەو بارودۆخەدا - مرۆڤ بۆ پلەی هەرەبەرزی (أعلى عليين) بەرز دەکاتەوە.. بە هەمان جۆر کارێکی سادە و ئاساییش خاوەنەکەی بەرەو نزمترین نزمی (أسفل سافلين) بەردەداتەوە!

---

(١) ئەو فیشەکەی کە بە "وەلی عەهد"ی نەمساوە نرا، بوو بەهۆی هەڵگیرسانی جەنگی یەکەمی جیهانی، کە سی ملیۆن کەسی تێدا کوژرا! (دانەر)

جا ئەم حاڵەتانەی کە لە خۆیاندا لە ڕووی زەمانەوە چەند کێشەیەکی "ڕەها"، یان "پەرش و بڵاو"ن، لەبەر سەرنجێکی گەورەی ڕەوانبێژی، ڕەچاو دەکرێن.

ئیتر "دانە"و "زەمان"ە سەرسووڕهێنەرەکان بە ڕەهایی و نادیاری دادەنرێن. ئەوەتا مادەم: "وەلی" لەناو خەڵکدا و.. "سەعاتی گیرابوونی دوعا" لە هەینیدا و.. "شەوی قەدر" لە مانگی ڕەمەزاندا و.. "ئیسمی ئەعزەمی خوای گەورە" لە نێوان ناوە جوانەکانیدا و.. "ئەجەل" لە تەمەندا نادیارن، ئەوا دانە دانەکانی تری ئەوانە نرخ و بەهایان دەمێنێت. کەچی ئەگەر ئەو "دانە" و "زەمان"ە ناوبراوانە دەستنیشان بکرانایە، نرخ و بەهای سەرجەم دانە و زەمانەکانی تر لەدەست دەچوو..

نابینی بیست ساڵی تەمەنێکی نەزانراو لە هەزار ساڵی تەمەنێك باشترە کە کۆتاییەکەی دیار و زانراو بێت؟

چونکە لە یەکەمیاندا وەهمی مرۆڤ بۆ بەردەوامبوونی ژیانی بەرەو ئەبەد ڕادەکێشێت و بە گریمانێکی دادەنێ کە دەگونجێ ڕوو بدات و، ئیتر دەروونی مرۆڤ قەناعەت بە تەمەنە نادیارەکە دەکات، بەڵام مرۆڤ لە دوای بەسەرچوونی نیوەی تەمەنە دیاریکراوەکە وەکو ئەو کەسەی لێ دێت کە هەنگاو بە هەنگاو لە ئیعدام نزیك ببێتەوە.

بێدارکردنەوەیەك:

چەندین ئایەت و فەرموودەی پیرۆز هەن کە لە شێوەیەکی "ڕەها"دان، بەڵام بە "گشتی" دانراون.. ئایەت و فەرموودەی وەهایش هەیە کە "کاتی" و پەرش و بڵاون، کەچی بە "بەردەوام" حسابیان بۆ کراوە.. هەندێکیشیان "سنووردار"ن، بەڵام بە "گشتی" دانراون..

بۆ نموونە: بەم واتایەی خوارەوە وتراوە:

(ئەم شتە کوفرە)..

واتە ئەم سیفەتە لە ئیمانەوە پەیدا نەبووە، واتە سیفەتێکی (کافر)ە و، ئەو کەسەش لەبەر ئەو هۆیە بە (کافر) لە قەڵەم دراوە. بەڵام پێی ناوترێت (کافر) چونکە چەندین سیفەتی تری بێ تاوانی هەیە کە لە ئیمانەوە سەریان هەڵداوە. کەواتە هەر ئەو کەسە چەند سیفەتێکی تری تێدایە کە لە ئیمانەوە هەڵقوڵاون، مەگەر بە دڵنیاییەوە بزانرێت کە

ئەو سیفەتەی لە کوفرەوە سەری هەڵداوە، چونکە لەوانەیە لە چەند هۆکارێکی ترەوە سەریان هەڵدابێت. ئەوەتا گومان هەیە لەوەدا کە ئەو سیفەتە بەڵگە بێت لەسەر کافربوونی، کەچی بوونی "ئیمان"ەکەی یەقین و بێ گومانە، خۆ "گومان"یش ناتوانێت "یەقین" لا ببات و بیسڕێتەوە.

کەواتە ئەو کەسانەی بە خێرایی بڕیار لەسەر کافربوونی خەڵکی دەردەکەن، با بە وردی بیر بکەنەوە.

ڕستەی دووهەم:

﴿وَمَنْ أحْياها فَكَأنَّما أحْيا النّاسَ جَميعاً﴾.

"زیندووکردنەوە" لە ڕووی واتای ڕواڵەتیی مەجازیەوە، دەستووری زیاد بوون و گەشە کردنی بێ سنووری کردەوە چاکەکان دەردەخات. بەڵام بە واتای ئەسڵیی خۆی، هێمایە بۆ قەڵاچۆ کردن و بنبڕکردنی شیرك و هاوبەشایەتی لە بواری دروستکردن و بەدیهێناندا. چونکە تەشبیهی ناو ئەم ڕستەیە و، ئەوەش کە لەم ئایەتەدایە: ﴿ما خَلْقُكُم ولا بَعْثُكُمْ إلاّ كَنَفْسٍ واحِدَةٍ﴾ (لقمان: ٢٨) مرۆڤ لە واتای "توانای خوای گەورە" تێدەگەیەنێت. چونکە هەر دوو تەشبیهەکە بەپێی دەستووری "عكس النقيض"ی زانستی "مەنتیق" داخوازی ئەوەن کە:

[مَنْ لايَقتَدِرْ على إحياءِ الناسِ جميعاً لا يَقتَدِرْ على إحياءِ نفسٍ واحدة].

واتە: (هەرکەسێك نەتوانێت سەرجەمی مرۆڤەکان لە دوای مردنیان زیندوو بکاتەوە، ناشتوانێت تەنها یەك کەسیان زیندوو بکاتەوە).

واتە ئەم ئایەتە پیرۆزە بە "ئاماژە" بەڵگەیە لەسەر ئەم واتایەی خوارەوە:

مادەم "توانست"ی مرۆڤ و هەموو بوونەوەرانی جۆری مومکینات بە ئاشکرا لە بەدیهێنانی ئاسمانەکان و زەویدا دەستەوسانن، ئەوا ناتوانن هیچ شتێك، تەنانەت یەك بەردیش، دروست بکەن.

واتە کەسێك نەتوانێت بە وێنەی جوڵاندن و هەڵسووڕاندنی دەنکەکانی تەسبێح، گۆی زەوی و سەرجەمی ئەستێرە و خۆرەکان بیزوێنێت، هەرگیز مافی ئەوەی نی‌یە کە لەم گەردوونەدا لافی دروستکردن و بەدیهێنان بۆ خۆی لێ بدات.

خۆ ئەو شتانەش کە مرۆڤ ئەنجامیان دەدات و هەڵسوکەوتیان تێدا دەکات، تەنها دەرخستن و ئاشکرا کردنی بەڕێوەچوونی یاساکانی خوای گەورەیە لە سروشتدا و، خۆگونجاندنیەتی لەگەڵ ئەو یاسایانەدا و، بەکارهێنانیانە لە بەرژەوەندی‌یەکانی خۆیدا.

جا روونی و درەخشانیی تا ئەم رادەیەی بەڵگەکە تەنها لە توانا و کێشی ئیعجازی قورئاندایە. ئەم ئایەتە پیرۆزەی تر ئەوە دەسەلمێنێت:

﴿ما خَلْقُكُم ولا بَعْثُكُمْ إلاّ كَنَفْسٍ واحِدَةٍ﴾ (لقمان: ٢٨)

چونکە توانستی خوای گەورە شتێکی خۆیی(ذاتي)یە و لاوازیی ئاوێتە نابێت و..

پەیوەندیشی بە "مەلەکووتییەتی" شتەکانەوە هەیە، کەواتە هیچ کام لە بەربەستەکان نایەنە ڕێی و ..

ڕێژەی ئەم دەستەڵاتەش، ڕێژەیەکی یاساییە. واتە "هەند"ی هەر شتێك لە چاویا وەك "هەموو"ی وایە و، "هەندەکی" و "هەمەکی"یەکانیش لە چاو ئەو دەستەڵاتەدا لە یەك ڕیزدان.

❖ خاڵی یەکەم:

بوونی سیفەتی توانستی ئەزەلی شتێکی پێویستە بۆ زاتی پاك و خاوێنی خوای گەورە.

واتە ئەم سیفەتە بە هیچ جۆرێك لە زاتی پیرۆزی خوای گەورە دوور ناکەوێتەوە و جیا نابێتەوە. کاتێ کە ئەمەمان زانی، دەشزانین کە ئەو شتەی پێچەوانە و دژی توانستە (واتە: نەتوانین و بێ دەستەڵاتی) هەرگیز نابێتە سیفەت بۆ ئەو خوایەی کە سیفەتی توانست و دەستەڵاتی بۆ خۆی بڕیار داوە. چونکە ئەگەر وا نەبێت، ئەوا دەبێ دوو شتی دژ بە یەك کۆ ببنەوە، دیارە ئەمەش شتێکی مەحاڵە.

لە کاتێکدا کە نەگونجێ "بێ دەستەڵاتی" ببێتە سیفەت بۆ خوا، ناشتوانێت ئاوێتەی دژەکەی ببێت کە "توانا و دەستەڵاتە". خۆ کە ئەمەشی نەتوانی، ئەوا دەردەکەوێت کە ئەو دەستەڵاتە خۆیی(القدرة الذاتية)یەی خوای گەورە پلەپلە(مراتب) نی‌یە. چونکە پلەپلەبوون لە هەر شتێکدا بەوە دەبێت کە دژەکەی، بە ڕێژەیەکی کەم یان زۆر، تێکەڵی بووبێت، وەك: پلەکانی "گەرما" کە بە تێکەڵ بوونی ڕێژەیەکی "سەرما" دەردەکەون و، پلەکانی "جوانی"ش کە بە تێکەڵ بوونی ڕێژەیەکی تایبەتیی "ناشیرینی" دەناسرێن... هتد.

بەڵام لە بوونەوەرە بەدیهاتووەکاندا کە لـە بەشـی گونجاوەکـان(الممکنـات)ن، لەبەر ئەوەی پێویستیی زاتەکان بۆ سیفەتەکان پێویستییەکی ڕاستەقینە نییە، ئەوا دەبینـین ئـەو شتانەی کە دژی یەکترین، تێکەڵ بە یەکتر دەبـن و، لەمەشەوە پلـەکان دروسـت دەبـن و ئاڵوگۆڕ و جیاوازییەکانیش دێنە کایەوە.

جا لەبەر ئەوەی لە دەستەڵاتی ئەزەلیی خوادا پلـە و بەرزی و نزمـی نییـە، ئـەوا هـەر شتێك ئەو دەستەڵاتە بەدیی بـهێنێت، چ زۆر گـەورە بێـت و چ زۆر بچـووك، وەکـو یـەك دەبن و بەلایەوە یەکسان دەبێت.. "ئەستێرەکان" و "گەردیلەکان" لەچاو ئـەو توانستەدا وەك یەك وان.

❖ خاڵی دووهەم:

توانستی خوای گەورە پەیوەندیی بە دیوی "مەلەکووت"ی شتانەوە هەیە..

بەڵێ، هەموو شتێکی ئەم بوونەوەرە وەك ئاوێنە وایە، دوو ڕووی هەیە:

یەکەمیان: ڕووی دەرەوە(المُلك) ئەم ڕووە وەك ڕووی بۆیەکراوی ئاوێنە وایە.

دووهەمیان: ڕووی ناوەوە(الْمَلَکُـوت) ئـەم ڕووەیـان وەك دیـوی پیشـاندەری سـافی ئاوێنە وایە.

ڕووی یەکـەمیان، کـە ڕووی "مولـك"ە، جێگـای چـەندین شـتی پێچەوانـە و دژی یـەکترین کـە لـەم ڕووەدا کـۆبوونەتەوە. وەك: جـوانی و ناشـیرینی، چاکـە و خراپـە، گەورە و بچووك، ئاسان و گران و شتانی هاوشێوەیان.

جا لەبەر ئەوەی ئەم لایەنەی بوونەوەر بەم جۆرەیە، ئەوا خواوەندی بەدیهێنەری دانا، کاروبارەکـانی خـۆی لـەم ڕووەدا بـە چـەند هۆکـارێکی ڕووکـەش داپۆشـیوە و، ئـەو هۆکارانەی کردووە بە چەند پەردەیەك کە لە پشتیانەوە کـاری خـۆی ئـەنجام دەدات. بـۆ ئەوەی دەستی توانستی خوا ڕاستەوخۆ لـەو شتە بچووکانـەدا دەرنەکـەوێت کـە بـە لای ئەوانەی کەم فامن و تەنها شتی ئاشکرا دەبینن، بە ناشیرین و کەم نرخ دێنە بەرچاویان و، پێیـان وایـە شـیاوی ئـەو دەسـتەڵاتە نـین. چونکـە "عـیززەت" و "گـەورەیی" خواوەنـد خواستیان لەسـەر شـاردنەوەی دەستی توانسـتی ڕاسـتەوخۆی خوایـە لـە پشـت ئـەو پەردانەوە..

دەبێ ئەوەش بزانین کە لەبەر ئەوەی "یەکبوونی تەنیایی خوا" ڕێگا بە شەریك و هاوبەش نادات، ئەوا کاریگەریی ڕاستەقینەی لەو شتانەشدا بەو هۆکارانە نەداوە، بەڵکو کاریگەریی ڕاستەقینە هەر لە لایەنی خوای گەورەی دانا خۆیەوەیە.

بەڵام دیوی "مەلەکووت" ڕوویەکی پاك و بێگەرد و ڕوون(شفاف)ە و، هیچ ڕەنگ و زرق و برقێکی بەرجەستە بوونەکانی تێکەڵ نابێت. لایەنێکی ئەوتۆیە کە بە بێ بوونی هیچ هۆکارێك تەنها ڕووی لە خوای خۆیەتی..

چونکە بە دوای یەکدا هاتن و ڕیز بەستنی "هۆکار" و "بەهۆکراو" لەم لایەنەدا نییە و، هیچ تەگەرەیەك ڕێگا لە شتێکی تر ناگرێت و کۆسپ و ڕێگرەکانی تێکەڵ نابێت، بەڵکو "گەردیلە" لەوێدا برای "خۆر"ە.

دەستەڵات و توانستی خوای گەورە پەتییە، واتە لە چەند شتێك پێك نەهاتووە.. هەروەها ڕەها و بێ سنوور و خۆییە.. پەیوەندیشی بە شتانەوە بە بێ هیچ نێوەند و هۆکارێکە.. ساف و بێ لێڵییە و، هیچ پەردەیەك بەسەر ڕوویدا دانەدراوە.. دواکەوتن لە کارەکانیدا نییە..

لەبەر هەموو ئەمانە، لە بەردەم دەستەڵاتی خوادا، گەورە بەسەر بچووکدا خۆی نانوێنێت و، کۆمەڵ بەسەر دانە و تاکدا پێش ناخرێت و، شتی گشتی بەسەر بەشێکی خۆیدا خۆی بە گەورەتر دەرناخات.

❖ **خاڵی سێهەم:**

توانستی خوا بە ڕێژەیەکی یاساییە.

﴿**لیسَ کَمِثْلِهِ شَیْءٌ**﴾ (الشوری: ١١).

﴿**وللهِ الْمَثَلُ الأعْلَی**﴾ (النحل: ١٠).

ئەم مەسەلە ئاڵۆز و تەماوییە بە چەند نموونەیەك لە زەینەکانەوە نزیك دەخەینەوە، چونکە "نموونە هێنانەوە" وێنە و شێوەکان لە تێگەیشتنی زەینی مرۆڤ نزیك دەخەنەوە:

بۆ نموونە:

ڕووناکیی تیشکی خۆر هەروەك لە خۆیدا دەردەکەوێت، لەسەر ڕووی دەریا و تەنانەت لەسەر هەموو دڵۆپێکی دەریاشدا دەردەکەوێت.

گریمان ڕووی گۆی زەوی لە وردە شووشە پێکهاتبێت و، هیچ پەردەیەکیش لە نێوان زەوی و خۆردا نەبێت، ئەوا درەوشاندنەوەی ڕووناکی و تیشکی خۆر بەسەر هەموو زەویدا و لە هەموو یەکێکی ئەو وردە شووشانەدا یەکسان دەبێت، بێ ئەوەی جێگا بە یەکتری لێژ بکەن یان لە بەشی یەکتر کەم بکەنەوە!

ئەگەر وا دابنێین "خۆر" بە هەست و ویستی خۆی کار بکات و هەرچی ڕووناکی و تیشکی خۆی هەیە بە ویستی خۆی بیدات بە زەوی، ئەوا ئەو کاتە بەخشینی ڕووناکیی خۆی بە تێکڕای زەوی، بە لایەوە گرانتر نابێت لەوەی کە تەنها بە یەك دانە گەردیلەی ببەخشێت، بەڵکو وەکو یەك ئاسان دەبن.

**نموونەیەکی تر:**

گریمان چەند کەسێك لە شێوەی بازنەیەکی فراواندا دانیشتبن و هەریەکەیان ئاوێنەیەکی بەدەستەوە بێت و، لە ناوەڕاستی بازنەکەشدا یەکێك مۆمێکی داگیرساوی بە دەستەوە گرتبێت، ئەوا ڕووناکیی ناوەندی بازنەکە وەك یەك و بە یەك ڕێژە لەناو ئاوێنەکاندا دەردەکەوێت، بە بێ لەناوچوون و کەمبوونەوە و، بێ ئەوەش جێگا بە یەکتری لێژ بکەن.

**نموونەیەکی تر:**

ئەگەر تەرازوویەکی زۆر گەورە و یەکجار هەستیارمان لە لا بێت و، لە تاکانیدا دوو خۆر، یان دوو ئەستێرە، یان دوو چیا، یان دوو هێلکە، یان دوو گەردیلەی تێدا دابنرێت، ئەوا ئەو هەوڵەی بۆ بەرزکردنەوەی یەکێکیان دەدرێت، هەمان هەوڵە بۆ نزمکردنەوەی ئەوی تریان.

**نموونەیەکی تر:**

گەورەترین کەشتی - کە ڕێکوپێك بێت - دەتوانرێت وەك بچووکترین بووکە شووشە(ئامێری یاری)ی منالان بخرێتە گەڕ و هەڵبسووڕێنرێت.

**نموونەیەکی تر:**

"میکرۆب" وەك "کەرکەدەن" هەڵگری هەمان ماهییەت و تایبەتمەندیی "زیندەوەری"یە و، بچووکترین "ماسی" وەك "نەهەنگ"ێکی گەورە دارای هەمان ماهییەت و ئەدگارە. چونکە ماهییەتی پەتی و ڕووتکراو لە شێوە و ڕوخسار و

دەستبەردار لە بەرجەستە بوون، هەموو گەردیلەکانی لەش - هەر لە بچووکترینی شتی بچووکەوە تا دەگاتە گەورەترینی شتی گەورە - دەگرێتەوە و ڕووی تێدەکات، بێ کەم کردن و بە بێ دابەشبوون.

چونکە ئەدگارەکانی دەستنیشانکاری و[1] سیفەتە ڕواڵەتی‌یەکانی لەش، لەگەڵ ماهییەت و تایبەتمەندیی ڕووت و پەتیدا تێکهەڵکێش نابن و ئاڵۆزی ناکەن.

**نموونەیەکی تر:**

هەروەك سەرکردەی سوپا دەتوانێت فەرمان بدات و بڵێت: "بڕۆ.. پێشکەوە" و، بەم فەرمانە تەنیا یەك سەرباز ببزوێنێت و بیخاتە کار و مەشق پێ کردن.. دەشتوانێت بە هەمان فەرمان، سوپایەکی گەورە بخاتە گەڕ و لە جێگای خۆی ببزوێنێت!

حەقیقەتی نهێنیی گوێڕایەڵی لەوەدایە کە:

هەروەك بە بینین و تاقیکردنەوە زانراوە، هەموو شتێك لەم بوونەوەرەدا خاڵێکی "کەماڵ"ی هەیە و حەزی پێ دەکات. زیادبوونی ئەم حەزەش "پێویستی" بەرهەم دەهێنێت و.. زیادبوونی پێویستیش شەوق و تاسە دروست دەکات و.. زیادبوونی شەوق و تاسەش کێش بوون پێکدەهێنێت.. جا هەر یەك لە کێش بوون و، شەوق و، پێویستی و، حەزکردن، لەبەر ئەوەی چییەتیی شتانن، ئەوا تۆوی بەجێهێنانی فەرمانە تەکوینی‌یەکانی خواوەندن[2].

کەماڵی ڕەهای چییەتییەکانی بوونەوەران "وجوودی موتلەق"ە (کە خوای گەورەیە). بەڵام کەماڵی هەرکام لە بوونەوەران، "بوون"ە تایبەتی‌یەکەی خۆیەتی..

لەبەر ئەوەش بوونی تایبەتیی پێ بەخشراوە، تاکو هەر لێهاتوویی و توانایەکی سروشتیی هەیە، بیهێنێتە دەرەوە و، بە کردار دەری ببڕێت[3].

---

(١) واتە: ئەو تایبەتکاری‌یانەی کە هەر لەشێك لەوی تر جیا دەکەنەوە و دەستنیشانی دەکەن. (وەرگێڕ)

(٢) فەرمانەکانی خوا بە گشتی دوو جۆرن: جۆرێکیان پێیان دەوترێت: فەرمانە شەرعی‌یەکان(الأوامر الشرعية) کە لە سیفەتی "الكلام"ی خواوە دەردەچن. جۆری دووهەمیان: ئەو فەرمانانەیە کە بۆ دروستکردنی بوونەوەران لە لایەن سیفەتی "الارادة"ی خواوە دەردەچن و پێیان دەوترێت: (الأوامر التكوينية) کە بۆ دەربڕینی چۆنێتیی ئەم جۆرە فەرمانە ڕستەی: "کُن، فیکون" بەکار دەهێنرێت. واتە کە خوای گەورە ویستی شتێك بەدی بهێنێت پێی دەفەرموێ: "ببە" ئەویش "یەکسەر دەبێ". (وەرگێڕ)

(٣) بوون(الوجود) دوو جۆرە. یەکەمیان: ئەو بوونەی کە لە تواناداییە(الوجود بالقوة). دووهەمیان: ئەو بوونەی کە لە واقیعدا هەیە(الوجود بالفعل). بۆ نموونە: سیفەتی ئاخاوتن واتە قسەکردن سیفەتێکە لە مرۆڤدا

جا گوێڕایەڵیی سەرجەمی بوونەوەران بۆ فەرمانی: "ببە - کُــن" وەکو گوێڕایەڵیی یەك دانە گەردیلە وایە، کە بە وێنەی تەنیا سەربازەکەی نموونەکەی سەرەوەیە!

ئنجا کاتێ کە بوونــەوەران گوێڕایــەڵیی ئــەو فەرمانــە دەکــەن لــە لایــەن ویستی پەروەردگارەوە بۆیان دەرچووە، هەموو ئەو حەز و پێویستی و ئارەزووانە، کە هەرکام لەوانە یەکێکن لە درەوشانەوەکانی هەمان ویستی خوایی، یەك دەگرن. ئەمەش لە ڕادەیەکی وادایە کە ئاوی ڕوون و ڕەوان هەرکات فەرمانی پێ دەدرێت ببەستێ، وەها گوێڕایەڵیی تێدا دەردەکەوێت، کە دەتوانێت ئاسن پەراش بکات!

جا ئەگەر ئەم شەش نموونەیە ئەوەی بۆ ڕوون کردبینەوە کە هێز و توانا و کرداری بوونەوەران چۆنە و تا چ ڕادەیەکە، لە کاتێکدا کە بێ هێز و لاواز و کەم دەستن و، کاریگەریی ڕاستەقینەشیان لە هیچ شتێکدا نییە.. ئەوا دەبێ لە بەردەم ئەو دەستەڵاتەی خواوەندا، کە شوێنەواری گەورەییەکەی بە ئاشکرا دیارە، هەموو شتێك (بە گەورە و بچووکەوە) یەکسان بن.. ئەو توانستەی کە ئەزەلییە و هەروەها بێ کۆتاییشە و، بوونەوەرانی لە نەبوونەوە هێناوەتە بوون و، هەزاران عەقڵی لەمەدا سەرسام کردووە.

کەواتە دەستەڵاتی خوا هیچ شتێکی بەلاوە گران نییە.

دەبێ ئەوەشمان لە یاد نەچێت کە دەستەڵات و توانستی ڕەها و گەورەی خوا، هەرگیز بە تەرازووە لاوازەکانی ئێمە لێك نادرێتەوە و بەراورد ناکرێت و، هیچ پەیوەندییەکیان لە نێواندا نییە. تەنها بۆ ئەو مەبەستە باس دەکرێت کە لە تێگەیشتن و زەینی مرۆڤەوە نزیك بخرێنەوە و، زەینی مرۆڤ بە شتێکی دووری نەزانێت.

بەم جۆرە:

مادەم توانستی خوای گەورە خۆیی و، نەبڕاوەیە و، پێویستە بۆ زاتی پیرۆزی خوای گەورە..

مادەم هەر شتێك کە لە لایەنی "مەلەکووت"ەوە ڕوو بکاتە ئەو دەستەڵات و توانستە، بە بێ هیچ پەردە و ڕووکەشێك ڕووی تێدەکات..

---

هەیە، بەڵام لە کاتێکدا کە بێدەنگە، ئەوا بوونی ئەم سیفەتە بوونێکی توانایی(وجود بالقوة)یە، کە لەو کاتەشدا مرۆڤ دەدوێت و دەست بە قسەکردن دەکات ئەوا ئەم سیفەتە بوونی واقیعی(وجود بالفعل) وەردەگرێت. (وەرگێڕ)

مادەم هەردوو لایەنی هەر شتێك لەچاو ئەو توانستەدا هاوسەنگی یەكترین..

مادەم ئەو ڕێسا سروشتی‌یەی كە خوای گەورە لە گەردووندا دایناوە، گوێڕایەڵی سەرجەم فەرمان و یاساكانی خواوەندە..

مادەم لایەنی "مەلەكووت" لایەنێكی ساف و بێگەردە و، شتی تایبەتكاری لەوێدا نی‌یە و، هیچ كۆسپێكیش ڕێگای لێ ناگرێت..

لەبەر هەموو ئەمانە، گەورە و بچووك لە بەردەم ئەو توانستەدا وەك یەك وان و، هیچ شتێك - با هەر شتێك بێت - ناتوانێت سەرپێچی لە فەرمانەكانی ئەو بكات. چونكە زیندووكردنەوەی هەموو گیانداران لەودنیادا وەك زیندووكردنەوەی تاقە مێشێك لە بەهاردا بەلایەوە ئاسانە. هەر لەبەر ئەوەشە كە هیچ گومان و دوودڵی و زیادەڕەوی‌یەك لەم ئایەتە پیرۆزەدا نی‌یە كە دەفەرموێ:

﴿مَا خَلْقُكُمْ وَلا بَعْثُكُم إِلاّ كَنَفْسٍ وَاحِدَةٍ﴾ (لقمان: ٢٨).

بەم ڕوونبوونەوەیە، ئەوەمان بۆ سەلما كە:

ئەو كەسەی ئەم كارانە ئەنجام دەدات، لەوپەڕی توانست و دەستەڵاتدایە و، هیچ شتێك ناتوانێت ڕێی هیچ كارێكی لێ بگرێت!

* * *

﴿ولا يَتَّخِذَ بعضُنا بعضاً أرباباً مِن دونِ اللهِ﴾ (آل عمران: ٦٤)

لە نێوان هەزاران سەرنجی ئەم ئایەتە پیرۆزەدا، تەنها یەك سەرنج دەهێنین:

بێ ئەوەی باسمان لە مەشرەبی سۆفێتی بێت، ئایینی ئیسلام هۆكار ڕەت دەكاتەوە و بەڵگە وەردەگرێت.. نەفیی هۆكار دەكات و پێشەوا دەچەسپێنێت. بەڵام ئایینەكانی تر هۆكار قبووڵ دەكەن..

جا لەسەر بناغەی ئەم نهێنی‌یە وردەیە كە زۆربەی ئەو نەصرانی‌یانەی كە لە ڕووی پلەوپایە و سەروەتەوە مەقامیان بەرزە، دیندارن. كەچی لە ئیسلامدا پتر خەڵكانی عەوام پابەندی ئایین دەبن، تاكو خاوەن سەروەت و پلەوپایەكان. چونكە مرۆڤی نەصرانیی

خاوەن پلە و پایە هەتا چەندە لە ئایینەکەیدا دەمارگیر بێت بەو ئەندازەیەش پارێزگاری لە پلەوپایەکەی و خۆپەرستیی خۆی دەکات و، ئەو دەمارگیرییەی بۆ ئایینەکەی لە شان و باڵی خۆ بەگەورە زانین و لەخۆبایی بوونی کەم ناکاتەوە، بەڵکو پەرەی پێ دەسێنێت..

کەچی موسڵمان هەتا چەندە دەست بە ئایینەکەیەوە بگرێت، بە هەمان پلە دەبێ دەستبەرداری لەخۆ باییبوون و تەنانەت شان و شکۆی پلە و پایەش ببێت و، لە پێناوی ئاییندا بەختیان بکات.

لەم ڕوانگەیەوە، دوور نییە کە نەصرانییەت لە ڕێی هێرشی کەسانی عەوامی ستەم لێکراو بۆ سەر ئەو ستەمکارانەی کە خۆیان بە تایبەتمەندانی نەصرانی دادەنێن لەت و پەت ببێت، چونکە ئایینی نەصرانی یارمەتیی خۆسەپاندنیان بەسەر خەڵکیدا دەدات!

بەڵام نابێ ئایینی ئیسلام لەرزەی پێ بکەوێت، چونکە زیاتر موڵکی عەوامی خەڵکییە، تاکو کەسانی تایبەتمەندی دنیایی.

* * *

﴿يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ الْمَيِّتَ مِنَ الْحَيِّ﴾ (الروم: ١٩)

ئەم ئایەتە پیرۆزە چەندین دەستووری "گشتی" و، هەندێ یاسای لەمەڕ "زۆرینە"ش لەخۆ دەگرێت، کە "تاك" و "کۆمەڵ" و "جۆر" و "ڕێباز" دەگرنەوە.

وا لێرەدا تەنها یەك دوو نموونە لەسەر پیادەبوونی دەستوورەکانی لەمەڕ "زۆرینە" دەهێنین:

ئەو "ئەمەوییەت"ەی کە پابەند نەبوو بە ئایینەوە، لە کۆتاییدا ئەهلی سوننەت و جەماعەتی لێ کەوتەوە و.. "عەلەوییەت"ی توندڕەو لە ئەنجامدا ڕافزییەتی بەرهەم هێنا و.. ئەو "نەسرانییەت"ەی کە لە بەرامبەر ستەمکارانەوە خۆی دەستەوسان ڕاگرتبوو، خۆڕاگریی بەرهەم هێنا و.. ئەو "ئاینی ئیسلام"ەش کە یەکێك لە بناغەکانی جیهاد لە دژی ستەمکاران و دەروون بەرزی بوو، وا بەداخەوە خۆی لە دەستەوسانیدا دەبینێتەوە..

ئنجا دەسپێكی هەر شتێك ئەگەر "عەزیمەت"ێك بێت تا ڕادەی دەمارگیری، ئەنجامەكەی "ئاسانكاری" دەبێت.. ئەگەر لایەنگری "ڕوخسەت"یش بێت، ئەوا كۆتاییەكەی توندوتۆلی دەبێت، بە وێنەی هەندێ لە حەنبەلی و حەنەفییەكان..

تەنانەت لە هەموویان نامۆتر ئەوەیە كە هەندێ كەس لە "دەمارگیران" بە پێچەوانەی ڕێبازی خۆیان، چاوپۆشی و لێبوردەیی بەرامبەر كافران دەنوێنن، كەچی "جۆن تورك"ە[1] بێ پەرواكانیش لایەنگری دوژمنایەتیی توندوتیژ بوون بەرامبەر كافران. وەك بڵێی جێ گۆڕكێیان لەو پێگەیەدا كردبێت كە هەیان بوو!

دوو زانا.. یەكێكیان "تەواو"ی كوڕی "ناتەواو"ە و، ئەوی تریان "ناتەواو"ی كوڕی "تەواو"ە.. (یەكەمیان) گوایا پاشماوەی حەز و شەوقی باوك بە میرات بۆ كوڕەكەی ماوەتەوە، بەڵام ئەوی تریان (باوكی دووهەم) لەبەر ئەوەی حەز و ئارەزووی خۆی بەجێ هێناوە، ئەوا لە كوڕەكەیدا هەستی تینوێتی بەرامبەر زانست دروست نابێت!

سەردەستووری ئەم نموونانە بریتییە لەوەی كە:

مرۆڤ مەیلی خۆنوێكردنەوەی تێدایە.. جا ئەگەر دوایینەكان بزانن پێشینانیان كەسانێكی "تەواو" بوون، ئەوا هەوڵی زیادكردن نادەن. ئیتر مرۆڤ بە شێوەیەكی تر بە دوای تێركردنی ئەو مەیلەی خۆیدا دەگەڕێت. تەنانەت هەندێ جار لەو پێناوەدا كاری پێچەوانە ئەنجام دەدات!

* * *

﴿وَلا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى﴾ (الأنعام: ١٦٤)

ئەم ئایەتە پیرۆزە دادگەرترین دەستوور لە سیاسەتی "كەسی" و "كۆمەڵایەتی" و "نەتەوەیی"دا دەنوێنێت. بەڵام ئایەتی پیرۆزی: ﴿إِنَّهُ كَانَ ظَلُوماً جَهُولاً﴾ (الأحزاب: ٧٢) ئامادەیی مرۆڤ دەردەخات بۆ ئەو ستەمە سامناكەی كە لە سروشتیدا جێگیر بووە.

نهێنیی ئەوەش لەمەدایە كە:

---

(١) بۆ زانیاری لەبارەی "جۆن تورك" بڕوانە پەراوێزی لاپەڕە (٣١٦)ی ئەم كتێبە. (وەرگێڕ)

مـرۆڤ - بـە پێچەوانـەی گیانـەوەرانی تـر - هـێز و مەیلـەکانی نـاو سروشـتی سنوورێکیان بۆ دانەنراوە، بۆیە ئارەزووی ستەمکاری و خۆشویستنی زات بە زۆری و بە جۆرێکی سامناك لە مرۆڤدا پەرە دەسێنێت.

بەڵێ، خۆشەویستیی مرۆڤ بۆ زاتی خۆی و بەدواگـەڕانی تـەنیا بەرژەوەندییـەکانی خۆی لە هەرشتێکدا، هەندێکن لە شێوە چەپەڵەکانی "منێتی و خۆپەرستی". خۆ ئەگـەر سەرسەختی و لەخۆباییبوون تێکەڵ بەو ئارەزووە ببێت، ئەوا کارەساتی هێندە چەپەڵ و سامناکی لێ دەکەوێتەوە کە مرۆڤ هێشتا ناوێکی بۆ نەدۆزیوەتـەوە. جا هـەروەك ئەمـە بەڵگەیە لەسەر بوونی دۆزەخ، بە هەمان جۆر ئاگری دۆزەخیش نەبێ هیـچ سزایەکی تـر نییە شایانی بێت.

دەبا لـەم دەستوورە بدوێین:

(لە بازنەی تاکەکەس)دا:

ئـەوەتا هەرکەسـێك بگریـت چـەندین سیفەتی زۆری تێدایـە، جـا ئەگـەر تـەنیا سـیفەتێکیان شایسـتەی دوژمنایـەتی کـردن بێـت، دەبـێ دوژمنایەتییەکـە تەنـها لـە چوارچێوەی ئـەو سیفەتەدا بێـت، بـەپێی ئـەو یاسا خواییـەی کـە لـە ئایەتـە پیرۆزەکـەدا هاتووە. تەنانەت دەبێ مرۆڤ بەزەیی بەو کەسـەدا بێتـەوە کـە چـەندین سیفەتی تـری بێ تاوانی هەیە و، نابێ دەستدرێژی بکاتە سەری.

کەچی ستەمکاری نەزان، بەهۆی ئەو ستەمەی لە سروشـتیدا جێگیر بـووە، دەچێـت لەبەر تـەنیا سـیفەتێکی خراپکـاری ئـەو کەسـە، دەسـتدرێژی دەکاتـە سـەری. بگـرە دوژمنایەتییەکەی پەرە دەسێنێت بۆ سیفەتە بێ تاوانەکانیشی و ئنجا دوژمنایەتیی خودی ئەو کەسـە دەکـات. لەوانەشـە بـە دوژمنایـەتیی ئـەو کەسـەوە نەوەستێت و، ستەمەکەی بەرامبەر هەموو خزمەکانی و سەرجەم ئەوانەش بگرێتەوە کە لە ڕێبازەکەی ئەودان.

ئاشکرایە ئـەو سیفەتە خراپکارە مـەرج نییـە لـە خراپیی نـاخ و دڵـی ئـەو کەسـەوە سەرچاوەی گرتبێت، بـەڵکو لەوانەیـە ئەنجامی هۆکـارێکی دەرەکی بێـت، چونکـە ڕێ دەکەوێت چەندین هۆکاری زۆر تەنیا یەك ئەنجام بەرهەم دەهێنن..

کەواتە ئەو سیفەتە بە تاوانکـار دانـانرێت، تەنانـەت گـەر ئـەو سیفەتە کـافریش بێـت مرۆڤەکە بە تاوانبار لە قەڵەم نادرێت.

(لە بازنەی کۆمەڵ)یشدا:

دەبینین کەسێکی هەڵپـەکار بیر و بۆچوونێك دەخاتـە ڕوو کـە ئارەزوویـەکی لـەخۆ گرتبێت، دەچێ بە هاندەری تۆڵەسەندنەوە، یان هاندەری ڕەخنەیەکی گەزندە، دەڵێـت: "لەمـەولا ئیسـلام پەرتـەوازە و تـەفروتوونا دەبێـت". یـان دەڵێـت: "خەلافـەت لـەناو دەچێـت". ئیـتر ئاواتـەخوازی ئەوەیـە کـە - پەنا بـە خـوا - سوو کایەتی بـە موسـڵمانان بکرێـت و برایـەتیی ئیسـلامیش بخنکێنرێت، تەنـها لەبـەر ئـەوەی کـە ڕاستیی قسـەکەی دەرکەوێت و خۆپەرستی و لەخۆبایی بوونی ناو دەروونی خۆی تێر بکـات! تەنانـەت بـە هەڵبەستنی چەند تەئویلێك و لاف لێدانی کارامەییەك کە هەر بە خەیاڵدا نایـەت، هـەوڵ دەدات لە شێوەی دادگەریدا ستەمی نەیاری سەرسەخت ڕوون بکاتەوە!

(لە بازنەی شارستانێتیی ئێستا)شدا:

دەبینین ئەم شارستانێتی‌یە شوومە دەسـتوورێکی غـەددار و ستەمکارانەی ئـەوتۆی بـە مـرۆڤ بەخشیوە کـە هــەموو چاکەکاری‌یـەکانی شارسـتانێتی دەسـڕێتەوە و، نـهێنیی نیگەرانیی مەلائیکەتە بەڕێزەکان دەردەخات کاتێك پرسیاریان لە خوای گـەورە کـرد و وتیان:

﴿أَتَجْعَلُ فِيهَا مَنْ يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ الدِّمَاءَ﴾ (البقرة: ٣٠)..

چونکـە ئەگـەر تـەنیا کەسێکی خیانەتکار لـە گوندێکـدا هـەبێت، ئـەو دەسـتوورە ستەمکارە فەرمان بە کاولکردنی ئەو گوندە دەدات بە هەموو بێ تاوانەکانی ناویەوە و.. گەر کەسێکی ملنەدەر لەناو کۆمەڵێکدا پەیدا ببێت، فەرمان بە لـەناوبردنی ئـەو کۆمەڵـە دەدات بـە سـەرجەم تـاك و خـێزان و منداڵەکانیشـەوە و.. کەسێکیش کـە سـەری بـۆ یاساکەی نـەوی نـەکردبێ، گــەر پـەنا بـۆ مزگـەوتی ئـەیاصۆفیا بـات، ئـەوا بڕیـاری ڕووخاندنی ئەو بینا پیرۆزە دەدات کە لە ملیارەها ئاڵتوون بەنرختـرە.

بەم جۆرە، ئەم شارستانێتی‌یە بـە وەحشیگەری‌یەکی سامناك حوکـم و فەرمانـەکانی ڕایی دەکات.

جا ئەگەر مرۆڤ - بەپێی دادگەریی ئایەتەکەی سەرەتا - تـاوانی تەنانـەت براکەشی لەسەر نەکرێت بە ماڵ، ئیتر چـۆن هـەزاران کەسی بێ تـاوان لـە شـارۆچکەیەك یـان لـە کۆمەڵێکدا بە تاوانبار دادەنرێت، بـە بیـانووی بوونـی یـەك کەسی خراپکـار لـەوێدا، لـە کاتێکدا کە هیچ شار و هیچ کۆمەڵێك نیی‌یە مرۆڤی خراپکاری تێدا نەبێت؟

* * *

﴿واعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللهِ جَميعاً ولا تَفَرَّقُوا﴾ (آل عمران: ١٠٣)

﴿الم ۞ ذلكَ الكِتابُ لا رَيْبَ فيه هُدىً لِلْمُتَّقِين﴾ (البقرة: ١-٢)

### فەرمانڕەوایی ڕەهای قورئانی پیرۆز

گرنگترین هۆکاری ئەو گوێ پـێ نەدانـەی کـە نەتـەوەی ئیسـلام بەرامبـەر ئەحکامـە فیقهی‌یەکان دەری دەبڕن، بەلامەوە ئەمەی خوارەوەیە:

پایـەکانی ئـایین و ئەحکامــە زەرووری‌یــەکانی لــە ســەرچاوەی قورئــانی پــیرۆز و سـوننەتی خـاوێنی پێغەمبـەرەوە ﷺ کـە ڕوونکـەرەوەی قورئانـە، هـەڵقوڵاون. ئـەم پایـە و ئەحکامانـە لـە سەدا نـەوەدی ئـایین دەبـن، بــەڵام مەســەلە خیلافی‌یــەکان، کــە شــایانی ئیجتیهادن، لە سەدا دە زیاتر نابن.

کەواتــە ڕێــژە و مــاوەی نێــوان ئەحکامــە زەرووری‌یـــەکان و مەســـەلە خیلافی‌یـــە ئیجتیهادی‌یەکان زۆر فراوانە.

ئەگــەر بڵێــین: مەســەلە ئیجتیهادی‌یــەکان وەکــو زێــڕ وان، ئــەوا ئەحکامــە زەرووری‌یەکان و پایەکانی ئایین وەك چەند ستوونێکی ئەڵماس وان. جـا ئایـا دەگونجێ نـەوەد دانـە ستوونی ئـەڵماس شـوێنکەوتەی دە دانـەی زێڕ بن؟ یـان ئایـا دروستە بایــەخ بەوانەی کە زێڕن زیاتر بدرێت تاکو بەوانەی کە ئەڵماسن؟

ئـەو شـتەی کۆمــەڵی زۆرینــەی خــەڵك بــەرەو شــوێنکەوتنی ئـایین و گوێڕایــەڵیی فەرمانـەکانی هـان دەدات، قودسـییەتی سـەرچاوەکەی ئــەو فەرمانانەیــە. هــەر ئــەم قودسییەتەیە کـە لـە هێزی بەڵگـەکان زیـاتر هـانی خـەڵکی دەدەن بـۆ فەرمانبـەرداری و ملکەچی.

لەبەر ئەوە، دەبێت کتێبە فیقهییەکان وەکو چەند هۆکارێکی ڕوونی چەشنی شووشە بن بۆ دەرخستن و پیشاندانی "قودسییەت"ی قورئانی پیرۆز، نەك ببن بە "پەردە" لە بەردەمیدا، یان لە جێگەیدا دابنرێن!

هەروەك لە زانستی مەنتیقدا دەستنیشان کراوە:

زەینی مرۆڤ لە "مەلزووم"ەوە بۆ "لازم" دەڕوات، نەك بۆ "لازمی لازم"[1]. خۆ ئەگەر لە مەلزوومەوە بۆ لازمی لازم بڕوات ئەوا بە مەبەستێکی سەرەکی و ڕاستەوخۆ ناڕوات، بەڵکو بە چەشنێکی ناسروشتی دەڕوات.

کتێبە فیقهییەکان وەك "مەلزووم" وان و، قورئانی پیرۆزیش دەلالەت و سەرچاوەی ئەو ئەحکامە فیقهییانەیە کە لەو کتێبانەدان، کەواتە "لازم"ە.

ئنجا سیفەتی زاتی و هەمیشەیی قورئانی پیرۆزیش بریتییە لەو قودسییەتەی کە هەیەتی و، ویژدانی مرۆڤ هان دەدات و دەیبووژێنێتەوە. "ئەمەش لازمی لازم"ە.

جا لەبەر ئەوەی زۆربەی خەڵك تەنها بۆ ئەو کتێبە فیقهییانە دەڕوانن، ئەوا مەگەر بە خەیاڵ، دەنا زەینیان بۆ لای قورئانی پیرۆز ناڕوات و، بەهۆی ئەم ڕوانینەیان بۆ کتێبە فیقهییەکان، مەگەر بە دەگمەن، دەنا تەسەووری قودسییەتی قورئان (لازمی لازم) ناکەن. ئیتر ئالێرەوە ویژدانیان لەسەر وازهێنان و پشتگوێ خستن ڕادێت و، لەمەشەوە وشکی (الجمود) پەیدا دەبێت!

ئەگەر لەگەڵ باسکردن و ڕوونکردنەوەکانی "زەرووریاتی ئایینی"دا قورئانی پیرۆز ڕاستەوخۆ ڕوون بکرایەتەوە، ئەوا یەکسەر و بە شێوەیەکی سروشتی زەینی مرۆڤ بۆ قودسییەتەکەی دەڕۆیشت و، شەوقی مرۆڤی بۆ گوێڕایەڵی دەهەژاند و، ویژدانیشی بۆ شوێن پێ هەڵگرتن و شوێنکەوتنی ڕادەپەڕاند. ئەو کاتەش بەهرەی هەست ناسکی لە لای ئەوانەی کە گفتوگۆیان ئاراستە دەکرێت، دەبووژایەوە و پەرەی دەسەند، لە بریی ئەوەی کە لە بەردەم هاندەر و بێدارکەرەوەکانی ئیماندا کەڕ و کاس بمێنێت.

---

(١) ئەمانە چەند زاراوەیەکی زانستی "مەنتیق"ن. کە کتێبێك دەبینیت یەکسەر بە ئەندێشەتدا دێت کە دانەرێکی هەیە، لێرەدا کتێبەکە "مەلزووم"ە و، دانەرەکەشی "لازم"ە. بەڵام بەرگ و دەنگ و ڕەنگی دانەرەکە "لازمی لازم"ن. (وەرگێڕ)

کەواتە دەبێ "کتێبە فیقهی‌یەکان" سەبارەت بە پیشاندان و دەرخستنی قورئانی پیرۆزەوە "ڕوون" بن و، بەم چەشنەی ئێستا نەبن کە بەپێی ڕۆژگار و ڕەوتی زەمانە و لە ئەنجامی کاری هەندێك لە موقەللیدان، بوون بە "پەردە" لە بەردەم قورئانی پیرۆزدا!

جا ئەگەر ئەو کتێبانە بەو جۆرە ڕوون بن، ئەوا دەبن بە "تەفسیر" لە خزمەت قورئانی پیرۆزدا، نەك چەند کتێبێکی سەربەخۆ و جیا.

ئاراستە کردنی ڕوانینی ڕاستەوخۆی زۆرینەی خەڵك لە کاروبار و پێویستی‌یە ئایینی‌یەکاندا ڕووەو قورئانی پیرۆز، کە نموونەی فەرموودە و گوفتاری خواوەندە و، بەهۆی ئیعجازە ڕوون و درەخشانەکەیەوە بەسەر دڵاندا زاڵە و، نیشانەی قودسییەتی بە دەورەوەیە و، هەمیشە لە ڕێی ئیمانەوە ناخی مرۆڤ ڕادەچڵەکێنێت..

ئەم ئاراستە کردنە تەنها لە سێ ڕێگاوە دەبێت:

یەکەم:

یان بە لابردنی ئەو پەردەیەی کە بەسەر ڕووی قورئانی پیرۆزدا دادراوەتەوە، بەوەی کە ڕەخنە و گومان و بڕوا نەهێشتن ئاراستەی دانەرانی ئەو کتێبە فیقهی‌یانە بکرێن، ئەوانەی کە لە ڕاستیدا شایانی هەموو ڕێز و باوەڕ و پشت پێ بەستنێکن.. دیارە ئەم کارە، ستەمێکی ئاشکرا و هەڵەیەکی سامناکی گەورەیە و، پێشێل کردنی مافی ئەو پێشەوا بەڕێزانەیە..

دووهەم:

یان وردە وردە وا لەو کتێبە فیقهی‌یانە بکرێن کە هەست بە پێت و بەرەکەتی قورئانی پیرۆز بکرێت لێیانەوە. واتە ببن بە "تەفسیری قورئان". ئەمەش بە شوێنکەوتنی چەند ڕێگایەکی مەنهەجی و پەروەردەییانەی تایبەت دەبێت. تاکو ئەو کتێبانە وەکو کتێبی پێشەوا موجتەهیدەکانی پێشین، واتە بە وێنەی "الموطأ" و "الفقه الأکبر"یان لێ بێت. ئیتر ئەو کاتە کتێبەکەی "ئیبن حەجەر" - بۆ نموونە - بۆ ئەوە ناخوێندرێتەوە کە بزانرێت خودی "ئیبن حەجەر" چیی وتووە، بەڵکو بۆ ئەوە دەخوێندرێتەوە تاکو بزانرێت قورئانی پیرۆز فەرمانی بەچی‌یە و داوای چی دەکات!

دیارە ئەم ڕێگایە پێویستی بە کاتێکی دوور و درێژخایەن دەبێت.

سێ‌هەم:

یاخود بە وێنەی ئەهلی تەریقەت، هەردەم ڕوانینی جەماوەری خەڵك بەرەو ئاستێکی بەرزتر لەو کتێبانەی کە بوون بە پەردە لەبەردەم قورئاندا، ڕابکێشرێن و ئاراستە بکرێن.

واتە: بەوەی کە هەمیشە ڕوانینی خەڵکی بۆ لای "قورئانی پیرۆز" ڕابکێشرێت و، هەمیشە ئەوە دەربخرێت کە قورئانی پیرۆز لە سەرووی هەموویانەوەیە.

ئیتر ئەو کاتە ئەحکامی شەرعی و زەروورییاتی ئایینی ڕاستەوخۆ لە سەرچاوە بنەڕەتی‌یەکەیانەوە - کە قورئانی پیرۆزە - وەردەگیرێن.

بەڵام ئەو بابەتە ئیجتیهادی‌یانەی کە لە ڕێی هۆکارێکەوە لە قورئان وەردەگیرێن، دەتوانرێت لە جێگا و سەرچاوەی خۆیاندا سەیر بکرێن.

شتێکی ئاشکرایە ئەو جازیبییەت و تەڕی و پاراوی‌یەی کە مرۆڤ لە وتەی شێخێکی ڕاستەقینەی تەریقەتدا هەستی پێ دەکات، جیایە لەوەی کە لە وەعزی زانایەکی فیقهیدا هەستی پێ دەکات..

ئەم جیاوازی‌یە لەو نهێنی‌یەوە سەرچاوەی گرتووە.

ئنجا یەکێك لەو شتە بریار لەسەردراوانەی ژیان ئەوەیە کە:

هەرکات خەڵکی ڕێز و نرخ و بایەخ بۆ شتێك دادەنێن، زۆربەی جار هۆی ئەم بایەخ پێدانەیان "کەماڵی ئەو شتە" نی‌یە، بەڵکو هی "پێویستی بوونیانە پێی"!

بۆ نموونە:

کە سەعاتساز کرێی کارەکەی لە زانایەکی مەزن زیاتر وەردەگرێت، نموونەیەکە پشتی ئەمە دەگرێت!

جا ئەگەر هەرچی پێداویستیی ئایینیی موسڵمانان هەیە ڕاستەوخۆ ئاراستەی قورئانی پیرۆز بکرایە، ئەوا ئەم کتێبە پیرۆزە (واتە قورئان) لە ئەنجامی "پێویستی پێ بوونەوە" و، بەوپەڕی "ئارەزوومەندی"یەوە، بە ڕادەیەك لە لایەنی خەڵکی‌یەوە ڕووی تێدەکرا، کە چەندین هێندەی ئەو ئارەزوومەندی‌یەی ئێستایان دەبوو کە بە پەرتەوازەیی و بڵاوی ئاراستەی هەزاران لەو کتێبانە کراوە..

بەڵکو ئەو کاتە قورئانی پیرۆز، بە جۆرێکی ڕوون و ئاشکرا، دەستەڵاتداری و زاڵبوون و فەرمانڕەواییەکەی بەسەر دەروونەکاندا دەردەکەوت و، هەموو داواکاری و

فەرمانە مەزنەکانیشی بە تەواوی ئەنجام دەدران و، تەنها بە کتێبێکی پیرۆز تەماشا نەدەکرا کە تەنها پیرۆزی‌یەکەی لە خوێندنەوەیدا بزانرێت و ڕەچاو بکرێت!

سەرەڕای ئەمە، تێکەڵ کردنی "زەرووریاتی ئایینی" لەگەڵ مەسەلە جوزئی و فەرعی‌یە خیلافی‌یەکاندا و، دەرخستنیان لە شێوەیەکدا کە شوێنکەوتەی ئەم مەسەلانە بن، مەترسی‌یەکی گەلێ گەورەی تێدایە. چونکە ئەو مرۆڤەی کە پێی وایە خەڵکی هەڵەن و هەر تەنها خۆی ڕاستە، لافی ئەوە لێ دەدات کە "ڕێڕەو(مەزهەب)ەکەی من حەقە، گریمانی هەڵەی هەیە و.. ڕێڕەوی بەرامبەریش هەڵەیە، گریمانی ئەوەی هەیە حەقی تێدا بێت"!

ئنجا لەبەر ئەوەی زۆربەی زۆری خەڵك توانای جیاکردنەوەی تەواویان نی‌یە لە نێوان زەرووریاتی ئایینی و، کاروبارە نەزەری‌یە ئاوێتەبووەکانیاندا، ئەوا دەبینی بە وەهم و سەهو، ئەو هەڵەیەی کە لە بابەتە ئیجتیهادی‌یەکاندا دەیبینن، بەسەر تێکڕا و سەرجەمی ئەحکامەکاندا دەیگشتێنن!

ئا لێرەوە گەورەیی مەترسی‌یەکە دەردەکەوێت.

من پێم وایە ئەو کەسەی کە خەڵك بە هەڵە دەزانێت و خۆیشی بە ڕاست، دووچاری نەخۆشیی بیر تەنگی و زەین تەسکی بووە، کە نەخۆشی‌یەکە لە خۆویستی‌یەوە پەیدا دەبێت. گومانیش لەوەدا نی‌یە کە ئەو کەسە لە بەردەم خواوەندی پەروەردگاری جیهانیاندا بەرپرسە لەو خۆگێل کردنەی کە بەرامبەر بە (شموولییەتی گوفتاری قورئان بۆ هەموو مرۆڤایەتی) دەینوێنێت.

پاشان ئەم بیری خەڵك بە هەڵە زانینە، سەرچاوەیەکی بەپیتە بۆ گومانی خراپ بردن بە خەڵکی و، لایەنگیری و، تاقمگیری.. لە کاتێکدا کە ئیسلام داوای گومانی باش بردن و، خۆشەویستی و، یەکێتیمان لێ دەکات!

* * *

ماوەیەکی کەم دوای نووسینی ئەم مەسەلەیە، لە خەودا بە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ شەرەفمەند بووم. لە خەونەکەمدا لەناو قوتابخانەیەکی ئایینی و لە کۆڕی مەزنی

حەزرەتدا دانیشتبووم و، چاوەڕوان بووم حەزرەت دەرسێکم لە قورئانی پیرۆز پێ بلێت..

کاتێ کە موصحەفەکەیان هێنا، پێغەمبەر ﷺ بۆ ڕێزگرتن لە "قورئانی پیرۆز" هەڵسایە سەرپێ!

لەو کاتەدا ئەوەم بە دڵدا هات کە ئەمە ڕێنماییە بۆ نەتەوەی ئیسلام تاکو ڕێزی شایان لە قورئانی پیرۆز بگرن.

پاشان ئەو خەونەم بۆ یەکێك لە پیاوچاکان گێڕایەوە.. ئەویش بەم جۆرەی خوارەوە لێکی دایەوە:

(ئەمە هێمایەکی ڕوون و مژدەیەکی گەورەیە بۆ ئەوەی کە قورئانی پیرۆز لە هەموو جیهاندا ئەو پلە و پایە بەرزەی پێ دەدرێت کە شایانیەتی).

* * *

﴿وأمْرُهُم شورى بينَهُم﴾ (الشورى: ٣٨)

﴿وشاوِرْهم في الأمْر﴾ (آل عمران: ١٥٩)

مێژوو پیشانمان دەدات کە[١]:

هەرکات موسڵمانان دەستیان بە ئایینەکەیانەوە گرتبێت، بە ئەندازەی ئەو دەست پێوەگرتنە بەرزبوونەتەوە و پێش کەوتوون، هەرکاتیش لاوازی ڕووی لە ئایینەکەیان کردبێت، دواکەوتوون. بە پێچەوانەی خاوەن ئایینەکانی تر، چونکە ئەوان هەرکات دەست بە ئایینەکەیانەوە بگرن وەکو دڕندەی خوێنمژیان لێ دێت و، هەرکاتیش ئایینەکەیان لاواز ببێت، لە باری شارستانێتییەوە پێش دەکەون.

---

(١) لە کاتی ڕاگەیاندنی دەستووردا* هێنانەدیی ئەم فیکرەیەم لە ئەندامانی "تورکیای لاو" داوا کرد. بەڵام بە دەنگمەوە نەهاتن. دوازدە ساڵ دوای ئەوە داوام لێ کردنەوە، ئەمجارە پێی ڕازی بوون، بەڵام ئەنجومەنی نوێنەران هەڵوەشێنرابووەوە. وا ئێستا جارێکی تر دەیخەمە پێش چاوی خاڵی چەقەهێز(نقطة تمركز)ی جیهانی ئیسلامی. (دانەر)

* واتە: ڕاگەیاندنی ڕژێمی پەرلەمانی لە دەوڵەتی عوسمانیدا (مەشرووتییەتی دووەم) کە لە ١٩٠٨/٧/٢٣دا بووە. (وەرگێڕ)

پەیدا بوونی بەشی زۆری پێغەمبەران - درووديان لەسەر بێت - لە خۆرهەڵاتدا، هێمایەکە لە لایەن قەدەری خوای گەورەوە بۆ ئەوەی کە تەنها ئایینە بەسەر هەستی خۆرهەڵاتی یەکاندا زاڵ و خاوەن دەستەڵاتە.

ئەو دیاردەی ڕابوون و ڕاپەڕینەی کە ئێستا لە هەموو لایەکی جیهانی ئیسلامدا دەیبینین، بۆمان دەچەسپێنێت کە تەنها هەست و شعووری ئایینی یە دەتوانێت جیهانی ئیسلامی بێدار بکاتەوە و، لە زەلیلی و سەرشۆڕی ڕزگاری بکات.

هەروەها چەسپاوە کە تەنها ئەو هەست و شعوورەیە ئەم دەوڵەتە موسڵمانە (عوسمانی یە)ی پاراستووە، سەرەڕای ئەو هەموو شۆڕش و شەڕە خوێناوی یانەی کە لەم لاو ئەو لایدا هەڵگیرسان. ئێمە بەم تایبەتکاری یە لە خۆرئاوا جیا دەبینەوە و لەگەڵ ئەواندا بەراورد ناکرێین.

"پادشایی" و "خەلافەت" یەکیان گرتووە و، هەرچەند ڕووکاری هەریەکەیان لەوی تر جیاوازە، کەچی لە یەکتر جیا ناکرێنەوە.

لەسەر ئەم بناغەیە.. پادشاکەمان هەروەك "پادشا"یە، لە هەمان کاتدا "خەلیفە"شە و، نوێنەری ڕەمزی جیهانی ئیسلامە.

لەو ڕوانگەیەوە کە پادشا و سوڵتانە سەرپەرشتیی (سی ملیۆن) کەس دەکات. بەڵام لە ڕوانگەی ئەوەی کە خەلیفەیە، دەبێ پاڵپشتی (سێ سەد ملیۆن) موسڵمان بێت، کە بە پەیوەستێکی نوورانی پەیوەندی یان پێ یەوە هەیە. هەروەها دەبێ خەلیفە مایەی یارمەتیدانی سەرجەمی موسڵمانان بێت.

"وەزارەت" نوێنەری "پادشایی"یە.. بەڵام "مەشیەخەتی ئیسلامی" نوێنەری "خەلافەت"ە.

جا لە کاتێکدا کە دەبینین وەزارەت لە بنەڕەتدا پشت بە سێ ئەنجومەنی ڕاوێژکاری دەبەستێت و، هەندێ جاریش ئەم سێ ئەنجومەنە پێداویستی یە زۆرەکانی وەزارەت ئەنجام نادەن، کەچی لە هەمان کاتدا "مەشیەخەت" تەسلیمی ئیجتیهادی یەك کەس کراوە! بە تایبەت لەم کات و سەردەمەدا کە پەیوەندی یەکانی نێوان هەموو شت و کاروبارێك، تەنانەت لە وردترین شتانیشدا، تابڵێی ئاڵۆز بووە. سەرەڕای ئەو فەوزا سامناکەی لە ڕا

ئیجتیهادییەکاندا هەیە و، ئەو بیر پەرتەوازەیی و ڕەوشت نزمییە ترسناکەش کە لە ئەنجامی بڵاوبوونەوەی مەدەنییەتی درۆینەوە، تیاماندا بڵاوبوونەتەوە.

ئاشکرایە بەرەنگار بوونەوەی کارتێکردنە دەرەکییەکان لە لایەن تاکە کەسێکەوە بەرهەڵستێکی لاواز دەبێت، ئەوەتا بۆ خۆگونجاندن لەگەڵ ئەو کارتێکردنە دەرەکییانەدا قوربانی بە زۆر لە ئەحکامی ئایین دراوە و لەو پێناوەدا بەخت کراوە!

خۆ ئەو کاتەی کە کاروبارەکان ساکار و ئاسایی بوون و بەم چەشنەی ئێستا ئاڵۆز نەبووبوون و، خەڵکی لە خۆ تەسلیم کردن و تەقلیدیان بۆ زانایان بەردەوام بوون، مەشیەخەت تەسلیمی ئەنجومەنێکی ڕاوێژکاری کرابوو، کە لە کەسانی بەرز پێکهاتبوو، هەرچەندەش ئەنجومەنەکە بە تەواوی ڕێکوپێك نەبوو.. کەچی ئێستا، کە هەرچی کاروبارە ئاڵۆز بووە و جڵەوی تەقلیدی زانایان و شوێنکەوتنیان شل بووە، چۆن تەنها یەك کەس دەتوانێت ئەم هەموو ئەرکانەی ئەستۆی ئەنجام بدات؟

ڕۆژگار دەری خست ئەم مەشیەخەتە، کە نوێنەری خەلافەتە، تەنها تایبەت نییە بە خەڵکی ئەستەمبووڵ و دەوڵەتی عوسمانییەوە، بەڵکو دەزگایەکی مەزنە و هی هەموو موسڵمانانە بە گشتی.

بەڵام بەم بارەی ئێستای، تەنانەت ڕێنمایی خەڵکی ئەستەمبوولی پێ هەڵناسوورێت، چ جای ڕێنمایی کردنی جیهانی ئیسلامی!

لەبەر ئەوە، پێویستە ئەم مەشیەخەتە بگەیەنرێتە پلەیەکی ئەوتۆ کە بتوانێت ببێت بە جێی بڕوای جیهانی ئیسلامی و، وەکو ئاوێنەیەك وا بێت بۆ دەرخستن و پیشاندانی گیروگرفت و کێشەکانی موسڵمانان بە گشتی و، ببێت بە سەرچاوەیەکی بەپیتی بیرکردنەوە و ئیجتیهاد.

تەنها ئەو کاتە دەتوانێت بە تەواوی پێویستی و ئەرکی سەرشانی خۆی بەرامبەر بە جیهانی ئیسلامی ئەنجام بدات.

ئێمە ئێستا وەك ڕابوردوو ناژیین کە کاربەدەست یەك کەس بوو، زۆربەی جار ئەم کاربەدەستەش یەك موفتیی هەبوو. ئەگەر ڕا و هەڵوێستی کاربەدەست ڕاست بوایە موفتی دەیوت ڕاستە و، گەر هەڵەیش بوایە، بۆی ڕاست دەکردەوە.. ئێستا کات کاتی "کۆمەڵ"ە، نەك "تاك".

"کاربەدەست"یش کەسێکی مەعنەوی‌یە، لە "گیانی کۆمەڵ"ەوە سەرهەڵدەدات و، ئەنجومەنەکانی ڕاوێژکاری ئەو کەسێتی‌یەیان هەیە.

لەبەر ئەوە، دەبێت ئەو کەسەی فەتوا بۆ ئەو کاربەدەستە دەردەکات، لەگەڵیدا گونجاو بێت، واتە وەکو ئەو خاوەنی "کەسێتی‌یەکی مەعنەوی" بێت و، لە ئەنجومەنێکی ڕاوێژکاری‌یەوە ئەو فەتوایە دەرچوو بێت، تاکو بتوانێت دەنگی خۆی بە گوێی کەسانی تردا بدات و، ئەو کاربەدەستەش لە کاروباری ئایینیدا بخاتە سەر ڕێی ڕاست..

دەنا دەنگی تاکە کەس لەبەردەم ئەو کەسە مەعنەوی‌یەی کە لە کۆمەڵەوە پەیدا بووە، وەك ویزەی مێشی لێ دێت، با ئەو تاکە کەسە بۆ خۆی مرۆڤێکی بەرزی مەزنیش بێت!

ئەم شوێنە گرنگە – واتە مەشیەخەت – هەتا بەم جۆرەی ئێستای بمێنێتەوە، هێزی موسڵمانان بەرەو ئەنجامێکی ترسناك دەبات، بە جۆرێك کە دەتوانین بڵێین:

ئەو لاوازی‌یەی کە ئێستا لە ئاییندا دەیبینین و، ئەو پشتگوێ خستنەی لە دروشمەکانی ئیسلامدا هەن و، ئەو بەرەڵایی‌یەی لە ئیجتیهادەکاندا تەشەنەی کردووە، ئەنجامی لاوازیی مەشیەخەت و کوژانەوەی ڕووناکی‌یەکەیەتی. چونکە ئەو کەسەی لە دەرەوەی مەشیەخەتدایە دەتوانێت خاوەنی ڕای خۆی بێت و، گوێ لە ڕای ئەو مەشیەخەتە نەگرێت کە پاڵی بە یەك کەسەوە داوە. بەڵام وتەی "شیخ الاسلام"ێك کە پاڵی بە ئەنجومەنێکی ڕاوێژکاری‌یەوە دابێت، وا لە گەورەترین کەڵە زانای بلیمەت دەکات، واز لە ڕاکەی خۆی بهێنێت، هیچ نەبێ ئیجتیهاد تەنها بۆ خۆی بکات.

هەرکەس ئامادەیی و توانای ئیجتیهاد لە خۆیدا شك دەبات، با بیکات. بەڵام ئەگەر ئیجتیهادەکەی جۆرە ئیجماعێکی جەماوەری زانایانی لەگەڵدا نەبێت، کاری پێ ناکرێت..

ئەو "شیخ الإسلام"ەی کە پشتی بە ئەنجومەنی ڕاوێژکار بەستووە، ئەم نهێنی‌یەی دەستگیر دەبێت.

هەروەك دەبینین، لە کتێبی شەرعدا دەوترێت:

"فەتوا لە خولگەی ئیجماع و ڕای جمهووردا دەخولێتەوە".

ئێستاش ئەمە پێویستە، تاکو ئەم کارە کۆتایی بەو هەموو فەوزایانە بهێنێت کە لە ڕاکاندا پەیدا بوون.

"وەزارەت" و "مەشیەخەت" دوو باڵی ئەم دەوڵەتە موسڵمانەن. ئەگەر هاوتا و هاوسەنگ و یەکسانی یەکتر نەبن، دەوڵەت ناتوانێت لە جێبەجێ کردنی ئەرکەکانی سەرشانیدا بەردەوام بێت. خۆ ئەگەر مەشیەخەت لەم بارەی ئێستایدا بمێنێتەوە، ئەوا لە بەردەم لافاوی مەدەنییەتی بەد و بێ کەڵکدا، زۆر موقەدەساتی ئایینی لەبەر خۆی دادەماڵێت.

(پێویستی مامۆستای هەموو کارێکە).. ئەمە دەستوورە.

خۆ ئەوەتا پێویستی‌یەکی زۆر بۆ ئەم ئەنجومەنە ڕاوێژکارە شەرعی‌یە لە گۆڕێدایە. جا ئەگەر ئێستا لە مەڵبەندی خەلافەتدا دانەمەزرێت، "پێویستی" لە جێگایەکی تردا دایدەمەزرێنێت!

هەرچەند وا گونجاوترە کە هەندێ پێشەکی بۆ دامەزراندنی ئەم ئەنجومەنە پێش دامەزراندنی خودی ئەنجومەنەکە بکەوێت، وەك دەزگای کۆمەڵە ئیسلامی‌یەکان و، ئەوقاف خستنە سەر مەشیەخەت و، چەندین شتی تری وەك ئەمانە. بەڵام دەستکردنی ڕاستەوخۆ بە دامەزراندنی ئەم ئەنجومەنە و، پاشان ئامادەکردنی پێشەکی‌یەکانی، ئەویش هەر مەبەستەکە دەهێنێتەدی.

فەرمانگە هەڵبژێرکاری‌یەکانی "ئەعیان" و "نوێنەران" هەرچەندە "کەم"ن و، فەرمانبەری‌یەکانیشیان تێکەڵ و پێکەڵن، بەڵام هەر دەتوانن وەك هۆکارێك کاریگەری‌یان لەمەدا ببێت و ڕۆڵێك ببینن، هەرچەندە بارودۆخ داخوازی ئەوەیە کە ئەنجومەنێکی ڕاوێژکاریی ئیسلامیی پاك و بێگەرد دامەزرێنرێت، تاکو بتوانێت ئەو ئەرکە گرنگەی ئەستۆی ئەنجام بدات.

بەکارهێنانی هەر شتێك لە غەیری جێگای خۆیدا، ئەنجامی لەکارخستن دەبێت و، ئەوەی لێی چاوەڕوان دەکرێت نایەتەدی!

بۆ نموونه: "دار الحكمة الاسلامية"(1) كه بۆ ئامانجێكی مەزن دامەزرێنراوە، ئەگەر لەم بارەی ئێستای دەربچێت و، هاودەم لەگەڵ سەرۆك فەرمانگەكانی تری مەشیەخەت لە ڕاوێژكاریدا بەشدار بكرێت و، بە ئەندامێكی ئەو فەرمانگانە دابنرێت و، نزیكەی بیست زانای بەرز و بەڕێز و جێی بڕوای لە هەموو لایەكی جیهانی ئیسلامییەوە بۆ بهێنرێت، ئەو كاتە دەتوانرێت بناغەیەك بۆ ئەم مەسەلە گەورە و گرنگە پەیدا ببێت.

دەبێ لەمەدا ترسمان نەبێت و دوودڵ نەبین و، سەرشۆڕی قبووڵ نەكەین و، لە ئایینەكەماندا "بەرتیل" بە ترس و دوودڵی نەدەین و، لە مەدەنییەتی درۆینە دوورەپەرێز بین. چونكە بە جۆرێكی وا بوو بەهۆی لاوازیی ئایینەكەمان كە لایەنی ترسی لە ئێمەدا هان داوە و لاوازیی تێدا زیاد كردووین و، كاریگەرە دەرەكییەكانی لە ئێمەدا بەهێز كردووە. چونكە بەرژەوەندییەك كە بێ گومانە و لە ڕاستیدا دێتە دی، لە پێناوی زیانێك كە بە وەهمدا دێت، هەرگیز بەخت ناكرێت.

ومن الله التوفيق.

* * *

## گفتوگۆیەك لە خەونێكدا

**(واتاكان و تەنانەت وشەكانیش هەر هەمان ئەوانەن كە لە خەونەكەدا هاتوون و لە یادم ماون)**

مانگی ئەیلوولی ساڵی ١٩١٩ز و، لە ئەنجامی نائومێدییەكی لە ڕادەبەدەر كە ڕووداوەكانی ڕۆژگار دووچاریان كردبووم، لەناو پەرێشانی و پەشێوییەكی سەختدا دەتلامەوە..

---

(١) "دار الحكمة الاسلامية" دەزگایەكی زانستیی سەر بە مەشیەخەتی ئیسلامی دەوڵەتی عوسمانی بووە. مامۆستا نوورسی یەكێك بووە لە ئەندامەكانی و، لەبەر شارەزایی لە زانستەكانی فەرمووودەدا بۆ ئەندامیی ئەم دەزگا زانستییە هەڵبژێرراوە، وەك مێژوونووسی تورك ئیسماعیل حەققی لە شێخولئیسلام مستەفا صەبرییەوە دەیگێڕێتەوە. (وەرگێڕ)

ئەو دەمـە، لـەو تاریکی‌یـە ڕەش و چڕەدا بـە دوای ڕووناکی‌یـەکدا وێـڵ بـووم کـە لـە بێداریدا نەمدۆزی‌یەوە.. ئەو بێداری‌یەی کە لە ڕاستیدا خەونێکە مـرۆڤ لـە نوستنێکدا دەیبینێت. بەڵکو لە خەونێکی ڕاستدا دەستم کەوت کە بێداریی ڕاستەقینەیە!

لێرەدا ئەو خاڵانە تۆمار دەکەم کـە بریتین لـەو گوفتارانـەی کاتێ دواندیـانم بـە سـەر زمانمدا هاتن، بێ ئەوەی بڕۆمە ناو درێژە پێدانیانەوە. ئەویش بریتی‌یە لەمەی خوارەوە:

شەوێکی هەینی لە ڕێی خەونەوە ڕۆشتمە ناو جیهانی میسالەوە.

لەوێ یەکێك هات و پێی وتم:

ئەنجومەنێکی خاوەن ڕێز و بەسام و شکۆ بانگت دەکەن، کـە بـۆ باسـی چارەنووسـی جیهانی ئیسلامی و حاڵی ئێستای گیراوە.

منیش ڕۆیشتم و، ئەنجومەنێکی وا نوورانیم بینـی کـە پێشینانی پیاوچاك و نوێنـەرانی چەرخـەکان، هەرچەرخـەو نوێنـەرێك، لـەوێ ئامـادە بـوون.. لـە ژیـانمدا هاوشـێوەیانم نەدیبوو.. بۆیە سام دایگرتم و.. لە ئەدەب و شەرمدا لای دەرگاکەوە ڕاوەستام..

یەکێکیان ڕووی گوفتاری تێکردم و، وتی:

ئەی مرۆی چەرخی کارەسـات و ئاشـووب و تیاچوونەکان! ڕای خـۆت سـەبارەت بەم باسە دەربڕە. چونکە تۆ خاوەنی ڕای خۆتی تیایدا.

هەر بە ڕاوەستانەوە، وتم:

پرسیار بکەن با وەڵامتان بدەمەوە.

یەکێکیان وتی:

ڕات سـەبارەت بـە چارەنووسی ئـەو شکستە چی‌یـە کـە بەسـەر دەوڵـەتی عوسمـانیدا هـات؟ .. چ ئاکـامێکت چـاوەڕان دەکـرد بـۆ ئـەم دەوڵـەتـە گـەر سـەرکەوتنی بەدەسـت بهێنایە؟

وتم:

گرفت و موسیبەتەکان سەرتاسەر خـراپ نـین، چونکە هـەندێ جـار بەختـەوەری لـە بـەڵا و گرفتەکانـەوە سـەر هـەڵدەدات، هـەروەك هـەندێ جـاری تریـش بەختـەوەری ئاکامەکەی بەڵا و دەردیسەری دەبێت.

ئەم دەوڵەتەی[1] کە پێشتر بۆ پارێزگاریی جیهانی ئیسلامی - کە وەك یەك جەستە وایە - ئەرکی جیهادی وەك فەرزێکی کیفایەت لە بریی سەرجەمی موسڵمانان خستبووە ئەستۆی خۆی و، لە پێناوی بەرزکردنەوەی وشەی "الله" و پاراستنی سەربەخۆیی جیهانی ئیسلامیدا خۆی لە هەڵوێستی قوربانی و خۆبەختکاریدا دانا و، ئاڵای خەلافەتی هەڵکرد..

ئەم دەوڵەت و نەتەوە موسڵمانە، بە پشتیوانیی خوای گەورە، بە سەربەستی و بەختەوەرییەکی ئەوتۆ پاداشت دەدرێتەوە کە سەرانسەری جیهانی ئیسلامی بگرێتەوە و قەرەبووی گرفت و زیانەکانی پێشوویان بۆ بکاتەوە..

چونکە ئەم گرفتەی کە دووچاری بووین، زیندووبوونەوەی برایەتیی ئیسلامی و گەشەکردنیشی لە نێوان موسڵماناندا پێش خست، ئەو برایەتییەی کە گیان و کاکڵەی ژیانمانە! تەنانەت کاتێ کە ئێمە بە دەم ئازارەوە دەتلاینەوە جیهانی ئیسلامی بۆمان دەگریا.

خۆ ئەگەر ئەوروپا پتر ئازاری بدایناییە ئەوا جیهانی ئیسلامی دەنگی هاوار و ناڵەی لێ بەرز دەبووەوە.

ئەگەر ئێمە بمرین، ئەوا بیست هاووڵاتیی "قەڵەمڕەوی عوسمانی" دەمرێت، بەڵام سێ سەد موسڵمان زیندوو دەبێتەوە.

ئێمە لە چەرخی کارە دەراساکاندا دەژیین، دوو سێ ساڵ دوای مردنمان دەبینرێین کە زیندوو دەبینەوە..

ڕاستە بەم شکستەمان بەختەوەرییەکی فانیی ئێستامان لە دەست دا، بەڵام دواتر بەختەوەرییەکی هەمیشەیی چاوەڕوانمان دەکات.

دیارە ئەو کەسەی کە حاڵێکی جوزئیی بگۆڕ و دیاری کراوی ئێستای دەگۆڕێتەوە بە داهاتوویەکی گەش و فراوانی ئایندە، بێ گومان ئەو کەسە قازانجی کردووە، نەك زیان.

لەم کاتەدا دەنگێك لە ئەنجومەنەکە بەرز بووەوە، وتی:

ئەوەی دەیڵێیت ڕوونی بکەرەوە.

---

(١) مەبەست دەوڵەتی عوسمانییە. (وەرگێڕ)

وتم:

جەنگی نێوان نەتەوە و دەوڵەتەکان جێی خۆی بۆ جەنگی نێوان چین و توێژەکانی مرۆڤ چۆڵ کردووە. ئادەمیزاد هەروەك مل بە دیلی نادات، بە ژیانی کرێ‌گرتەییش ڕازی نابێت..

ئەگەر سەرکەوتنمان بەدەست بهێنایە، ئەوا بەرەو ڕەفتاری دوژمنانمان لەمەڕ داگیرکاری و خۆسەپاندن کێش دەبووین و خووی ئەوانمان دەگرت، لەوانەشە زیادەڕەویمان تێدا بکردایە. لە کاتێکدا کە ئەو تەوژمە داگیرکاری‌یە خۆسەپێنە تەوژمێکی ستەمکارانەیە و، دژی سروشتی جیهانی ئیسلامی و، پێچەوانەی بەرژەوەندیی زۆرینەی ڕەهای ئیماندارانە. سەرەڕای ئەوەی کە تەمەنیشی کورتە و ڕووبەڕووی لەت لەت بوون و نەمان دەبێتەوە..

جا ئەگەر ئێمە دەستمان لەو تەوژمە گیر بکردایە، ئەوا جیهانی ئیسلامیمان بەرەو شتێکی پێچەوانەی سروشتی خۆی دەدایە بەر.

ئەم شارستانێتی‌یە چەپەڵەی کە جگە لە خراپە شتی ترمان لێ نەدیوە و، لە دیدی شەریعەتەوە ناپەسەند و نەویستراوە و، خراپەکانی بەسەر چاکەکانیدا زاڵ بووە، بەرژەوەندیی ئادەمیزاد بڕیاری هەڵوەشانەوەی و، بێداربوونەوەی گرۆی مرۆڤیش فەرمانی قڕبوونی بۆ دەردەکات.

ئەگەر ئێمە سەربکەوتینایە، ئەوا لە ناوەڕۆکدا پارێزگاریی ئەم شارستانێتی‌یە هەرزە و یاخی و ناپاك و دڕندەیەمان لە ئاسیادا دەگرتە ئەستۆ!

یەکێکی ناو ئەنجومەنەکە وتی:

بۆچی شەریعەت ئەم شارستانێتی‌یە[1] پەسەند ناکات و دەست بە ڕوویەوە دەنێت؟

---

(١) مەبەست ئەو چاکەکاری‌یانەی شارستانێتی‌یە کە پێشکەشی ئادەمیزادی کرد، نەك خراپکاری و گوناهەکانی کە گەوج و نەفامان بە دوایدا هەناسە بڕکێیانە و پێیان وایە ئەو خراپکاری‌یانە چاکە بن، هەتا دووچاری تیاچوونیان کردین! مرۆڤایەتی لە ئەنجامی زاڵبوونی تای خراپەکانی ئەم شارستانێتی‌یە بەسەر چاکەکانی و گوناهەکانی بەسەر لایەنە جوانەکانیدا دوو زللەی سامناکی لێ درا کە دوو جەنگی جیهانیی ئەوتۆ بوون ئەو شارستانێتی‌یە گوناهبارەیان تیابرد و خوێنێکیان ڕشاندەوە کە سەرانسەری گۆی زەویی چەپەڵ کرد. لە خوای گەورە داواکارین کە بەهێزی ئیسلام لە ئایندەدا چاکەکاری‌یەکانی شارستانێتی بەسەر

وتم:

چونکە لەسەر پێنج بناغەی سەلبی دامەزراوە:

خاڵی پشت پێبەستنی بریتی‌یە لە: "هێز". دیارە "هێز"یش ماف خواردن و سنوورشکاندن و دەستدرێژیی لێ دەبێتەوە.

مەبەست و ئامانجیشی بریتی‌یە لە: "بەرژەوەندی". خۆ ئەمەش پاڵپاڵێن و دوژمنایەتیی لێ دەبێتەوە.

دەستووری ژیانیش بەلایەوە بریتی‌یە لە "مشتومڕ و ململانێ". خۆ ئەمەش هەردەم قڕە و بڕە و پاشقول لەیەکتر گرتنی لێ پەیدا دەبێت.

ئەو پەیوەندی‌یە بنەڕەتی‌یەش کە بۆ هاوئاهەنگیی نێوان کۆمەڵانی خەڵکی دادەنێت بریتی‌یە لە "دەمارگیری و نەتەوایەتی‌یەکی سەلبی" کە لەسەر حسابی نەتەوەکانی تر گەشە دەکات و پەرە دەسێنێت. خۆ ئەمەش وەك لە بەرچاودایە هەمیشە ئاژاوە و جەنگ و ناکۆکیی لێ دەبێتەوە.

ئەو خزمەتەش کە پێشکەشی گرۆی ئادەمیزادی دەکات خزمەتێکی لەخشتەبەری سەرنج ڕاکێشە.. کە بریتی‌یە لە هاندانی حەز و ئارەزووی سوود و بەرژەوەندی و، ورووژاندنی دەروونی بەدخواز و، هێنانەدیی خواستەکانی و ئاسانکردنی بەدستهێنانی داواکاری‌یەکانی..

خۆ ئەو حەز و ئارەزووانەش مرۆڤ لە پلەی مەلائیکەییەوە بەردەدەنە خوارەوە بۆ پلەی ئاژەڵێتیی سەگ ئاسا، بەمەش دەبێتە هۆی شێواندنی سەروسیمای مرۆڤانەی ئادەمیزاد و بە چەشنێکی مەعنەوی مەسخی دەکات!

ئەوەتا گەر دیوی دەرەوەی زۆربەی ئەو مرۆڤە شارستانی‌یانە ئاوەژوو بکەیت و ناوەرۆکیان بخەیتە ڕوو، ئەوا ئەندێشەی مرۆڤ شێوەی گورگ و ورچ و مار و مەیموون و بەراز، لە ڕوخسار و سیمایاندا بەدی دەکات!

---

خراپەکانیدا زاڵ ببن، تاکو گۆی زەوی لە چڵك و چەپەڵی‌یەکانی پاك بکاتەوە و ئاسایشی گشتی بۆ سەرانسەری گرۆی مرۆڤ دەستەبەر بکات. (دانەر)

هەر لەم پێناوەشدا شارستانێتیی ئێستا لە سەدا هەشتای گرۆی ئادەمیزادی خستە باوەشی بەدبەختی و، لە سەدا دەیانی لەو بەدبەختییە هێنایە دەر و خستنیە ناو بەختەوەرییەکی ساختە و رووکەش و، دەکەی تریش لەو نێوانەدا مانەوە..

لە کاتێکدا بەختەوەری ئەوەیە کە هەمووان، یاخود زۆرینەی خەڵکی بگرێتەوە. کەچی بەختەوەریی ئەم شارستانێتییە بۆ کەمترینی بەشە کەمەکانی خەڵکییە.

لەبەر ئەمەیە قورئانی پیرۆز بە شارستانێتییەك ڕازی نابێت کە بەختەوەریی هەمووان، لانی کەم زۆرینەی زۆریان دەستەبەر نەکات.

پاشان بەهۆی خۆسەپاندنی هەوا و ئارەزووە لە بەند پچڕاوەکان، شتانی ناپێویست وەکو شتانی پێویست و ناچارییان لێ هاتووە بۆ مرۆڤ.. چونکە لە کاتێکدا کە مرۆڤ، لە قۆناغی ژیانی دەشتەکێتیدا پێویستی تەنها بە چوار شتی سەرەکی دەبوو، ئێستا لەم شارستانێتییەدا پێویستیی بە سەد شت هەیە.

بەم جۆرە، شارستانێتیی ئێستا مرۆڤی دووچاری هەژارییەکی لەڕادەبەدەر کردووە.

ئنجا لەبەر ئەوەی کە هەوڵ و کۆششی حەڵاڵ ناتوانێت ئەرك و نەفەقەی ئەو پێداویستییە هەمیشە زیادبووانە بگرێتە ئەستۆ، ئەوا مرۆڤ دەستی دایە کاری ساختە و فڕوفێڵ و خواردنی حەرام! بەم جۆرە بناغەکانی خووڕەوشت لێك هەڵوەشان.

لە کاتێکدا ئەم شارستانێتییە سەروەت و دەوڵەمەندی و زرق و برق بە کۆمەڵ و ڕەگەزی مرۆڤ دەدات، کەچی تاکە کەس دەستکورت و هەژار و بەدڕەوشت دەکات.

ڕشانەوەی ئەم شارستانێتییە دڕندەییەکی ئەوتۆی لە گەرووی خۆی هێنایەوە کە لە دڕندەیی سەدەکانی پێشین گەلێ زیاتر بوو.

بێزهاتنەوەی جیهانی ئیسلامی لە وەرگرتنی ئەم شارستانێتییە و هەڵپە بۆ نەکردنی و دوودڵ بوونی لە وەرگرتنیدا، شایانی سەرنجدان و تێڕامانە.

چونکە ئەو "ڕێنماییە خوایی"یە کە شەریعەتە، تایبەتکاریی "سەربەخۆیی" و پێویست نەبوون بە شتی تر بە مرۆڤ دەبەخشێت و، هەرگیز ناگونجێ ئەم "شەریعەت"ە

تێهەڵکێش و ئاوێتەی "دەهاء"ی فەلسەفەی[1] ڕۆمانی ببێت، یان هەڵی بلووشێت، یاخود شوێنی بکەوێت.

زیرەکیی "ڕۆمان" و "یۆنان"ی دێرین (واتە شارستانێتی‌یەکەیان) کە وەکو منالی دوانە لە یەك سەرچاوە و بناغەوە سەریان هەڵدابوو، وێڕای تێپەڕبوونی چەرخەکان و، گۆڕانی بارودۆخ و، تەقالا و کۆششی گەرموگوڕ بۆ تێکەڵ کردن و تواندنەوەیان لە یەکتریدا و، ئاوێتەکردنی هەردوکیان بە نەسرانییەت، کەچی بە چەشنی تێکەڵ نەبوونی ڕۆن و ئاو، هیچ کامیان ئاوێتەی ئەوی تر نەبوو، تەنانەت ئێستا گیانی هەر یەکەیان لە چەند شێوەیەکی جۆراوجۆر و جیاجیادا دەژی.

جا ئەگەر دوو برای دوانە و هاوڕێی یەکتر لە گەشەکردن و بەرەوپێشچووندا، لەگەڵ هەموو هەوڵ و هۆکارێکی ئاوێتەکردن، بە درێژایی ئەم ماوەیە و تا ئێستاش هەر پێکەوە نەگونجابن و تێکەڵی یەکتری نەبووبن، ئیتر چۆن نووری هیدایەتی قورئان – کە گیانی شەریعەتە – تێکەڵ بە تاریکی‌یەکانی شارستانێتی دەبێت کە بناغەکەی "دەهاء"ی ڕۆمایە؟ دیارە هەرگیز نە تێکەڵی یەکتری دەبن و نە پێکەوە هەرسیش دەکرێن.

وتیان:

ئەی ئەو شارستانێتی‌یە کامەیە کە لە شەریعەتدایە؟

وتم:

ئەو شارستانێتی‌یەی کە شەریعەتی خاوێن لە خۆی گرتووە و فەرمانیشی بە ئێمە داوە شوێنی بکەوین ئەوەیە کە بە ڕەوینەوەی ئەم شارستانێتی‌یەی ئێستا دەردەکەوێت و، لە بریی بناغە بێ کەڵك و کرمۆڵ و سەلبی‌یەکانی ئەو، چەندین بناغەی ئیجابی و بنیاتنەر دادەنێت:

بەڵێ، خاڵی پشت پێ‌بەستنی، لە بریی "هێز"، بریتی‌یە لە "حەق".. خۆ ئاشکرایە کە "حەق" هەمیشە دادگەری و هاوسەنگی دادەمەزرێنێت..

ئامانجیشی، لە بریی "بەرژەوەندی"، بریتی‌یە لە "فەزیلەت".. دیارە بەرهەمی "فەزیلەت"یش خۆشەویستی و تەبایی و لێك نزیکبوونەوەیە..

---

(١) مەبەست بە وشەی "دەهاء": گشت ئەو چەمك(مفاهیم)ە ماددی‌یانەیە کە شارستانێتیی خۆرئاوا، یان بیری ماددی لە فەلسەفەی خۆرئاوادا لە ئامێزی گرتوون. ئەم وشەیەشمان وەك خۆی هێشتەوە، چونکە لەگەڵ وشەی "هودا" و "هیدایەت" جیناسێکی جوان پێکدەهێنن. (وەرگێڕ)

لایەنی یەکێتی و پەیوەندی دەرەکانی نێوان کۆمەڵانی مرۆڤ بە لایەوە بریتین لە پەیوەندیی "ئایین" و "هاونیشتمانی" و "پەیوەندی‌یەکانی کار و پیشە" لە بریی "ڕەگەزپەرستی".. خۆ ئەم چەشنە پەیوەندی‌یانە هەمیشە برایەتیی بێگەردی ڕاستەقینە و ئاشتی و ئاسایش و تەبایی و بەرگری لە وڵات لە دەمی دەستدرێژیی دوژمندا بەرهەم دەهێنێت..

دەستووریشی لە ژیاندا، لە بریی مشتومڕ و ململانێ، بریتی‌یە لە "هاوکاری" و "هاوئاهەنگی" و "یارمەتیدانی یەکتری".. دیارە "هاوکاری"یش یەکبوون و پشتگیری لە نێوان مرۆڤدا بەرهەم دەهێنێت..

ئنجا "هودا" لە بریی "هەوا" و ئارەزووەکان دادەنێت بۆ ئەوەی فەرمانڕەوای ئەو خزمەتگوزاری‌یانە بێت کە پێشکەش بە کۆمەڵ دەکرێن.. خۆ "هودا"یش ئاستی مرۆڤ بەرەو ئاکارە تەواوەکان بەرز دەکاتەوە.

ئنجا لەو کاتەدا کە سنوورێك بۆ هەوا و ئارەزووەکانی "دەروون" دادەنێت، دڵنیاییش بە "گیان" دەبەخشێت و بۆ بەرزی‌یەکان پەرۆش و تامەزرۆی دەکات.

واتە ئێمە بە شکست هێنانمان لە جەنگدا شوێن تەوژمی دووهەم کەوتین کە تەوژمی ستەم لێکراوان و جەماوەری خەڵکە. خۆ ئەگەر ستەم لێکراوانی غەیری موسڵمان لە سەدا هەشتا پێك بهێنن، هی موسڵمانان لە سەدا نەوەد لەوانەشە لە سەدا نەوەد و پێنج پێکدەهێنن.

دوورەپەرێزیی جیهانی ئیسلامی لەم تەوژمی دووهەمە یان نەیاری کردنی بۆی کارێکی بێ پاڵپشتە و، سەرجەمی هەوڵ و تەقالاکانیشی بە زایە داوە. دەیتوانی لە بریی توانەوە لە ژێر دەستەڵاتی زاڵبووی لایەنی سەرکەوتوودا ژیرانە هەڵسوکەوتی بکردایە و ئەو تەوژمەی لەگەڵ تەرز و شێوەیەکی ئیسلامدا بگونجاندایە و بەو جۆرە بیخستایەتەکار. چونکە دوژمنی دوژمن هاوڕێیە هەتا دوژمنی بێت، هەروەك هاوڕێی دوژمن دوژمنە هەتا هاوڕێی بێت.

ئامانجەکان و سوودەکانی ئەم دوو تەوژمە دژی یەکترین، تەنانەت گەر یەکێکیان بڵێ: (بمرە) ئەوی تریان دەڵێت: (زیندوو بەرەوە). واتە سوودی یەکێکیان داخوازی

زیان و شپرزەیی و نزمی و لاوازیی ئێمەیە.. هەروەك سوودی ئەوی تریان بێ گومان هێز و یەکگرتنی ئێمە دەخوازێت.

جاران دوژمنایەتیی خۆرهەڵات ڕابوون و بێداریی ئیسلامیی دەخنکاند. وا ئێستا نەما، دەشبێ نەمێنێت. بەڵام دوژمنایەتیی خۆرئاوا دەبێ بمێنێت، چونکە هۆکارێکی گرنگە بۆ گەشە کردن و یەکێتیی برایەتیی ئیسلامی.

لەم کاتەدا نیشانەکانی پشتگیریی قسەکانم لە ئەنجومەنەکەوە بەرز بووە و.. وتیان:

بەڵێ، ئومێدەوار بن. چونکە مەزنترین دەنگێك کە لە ئاڵوگۆڕەکانی داهاتوودا دەزرنگێتەوە دەنگی زوڵاڵی ئیسلامە.

یەکێکی تریان پرسیی:

بەڵا و گرفتەکان سزای تاوان و پێشەکیی پاداشتن. ئایا ئێوە چ تاوانێکتان کرد کە قەدەری خوایی بڕیاری ئەم گرفتەی بۆ دەرکردن، چونکە هۆی داباریني موسیبەت و گرفتە گشتییەکان هەڵە و تاوانی زۆرینەی خەڵکییە؟ هەروەها پاداشتە پێشەکی و خێراکەشتان چییە؟

وتم:

پێش هەموو شتێك پشتگوێ خستنی سێ پایەی ئیسلام بوو لە لایەن ئێمەوە: نوێژ، ڕۆژوو، زەکات. چونکە بەدیهێنەرمان داوای لێ کردین کە لە ماوەی بیست و چوار سەعاتدا، تەنها یەك سەعات بۆ بەجێهێنانی پێنج فەرزەی نوێژ تەرخان بکەین. کەچی ئێمە سستیمان لەم ئەرکەدا نواند. بۆیە خوای گەورەش، لە تۆڵەی ئەمەدا بە مەشق و تەدریبێکی سەخت و بەردەوامی بیست و چوار سەعاتی و بۆ ماوەی پێنجساڵی یەك لە دوای یەك سزای داین. واتە ناچاری بەجێهێنانی جۆرە نوێژێکی تایبەتیی کردین..

هەروەها ئەو بەدیهێنەرە مەزنە بەزەیی بە ئێمەدا هاتەوە و داوای لێ کردین کە تەنها یەك مانگ لە سەرانسەری ساڵدا بەڕۆژوو بین. کەچی ئێمە دەروونی خۆمان بەلاوە ئازیز بوو، ئەو فەرمانەی خوای گەورەمان جێبەجێ نەکرد. خوای گەورەش، لە سزای ئەم سەرپێچییەدا و بۆ کەفارەتی ئەو گوناهە، بە درێژایی پێنج ساڵ ناچاری ڕۆژوویەکی تایبەتیی کردین!

هەروەها داوای لـێ کردین کە دە یەك، یان چل یەکی ئەو ماڵ و سامانەی خۆی، کە بە ئەمانەت لای ئێمە دایناوە، بـە نـاوی زەکاتـەوە دەربکـەین. کـەچی ئێمـە چرووکیمـان نواند و، ستەممان لـە خۆمان کرد. لـە سـزای ئەمەشـدا ناچـاری کردیـن کـە بـەپێی یاسـای "الجزاء من جنس العمل" زەکاتی کەڵەکەبووی ئەو ماوەیە بە یەك جار دەربکەین.

پاداشتی خێرا و زووبەزووی ئەم گرفتەش بریتی بوو لـەوەی کە پێنج یەکی ئەم نەتـەوە گوناهبـارە - واتـە چـوار ملیـۆن کـەس- بـۆ پایـەی ویلایـەت بـەرز کرانـەوە و، پلـەی موجاهیدی و شەهیدی‌یان پێ بەخشـرا. کەواتـە ئـەو موسیبەتە گشـتی‌یەی کـە ئـەنجامی هەڵەیەکی گشتی بوو گوناهەکانی ڕابوردووی سڕی‌یەوە.

یەکێکیان وتی:

ئەگەر فەرماندە بە هەڵە فەرمانی دابێت ئەوا نەتەوەی دووچاری تیاچوون کردووە؟

وتم:

مرۆڤی تووش بوو بە گرفتێك ئومێدەواری پاداشتە. جـا یـان چاکەکاری‌یـەکانی ئـەو فەرماندەیەی دەدرێتێ کـە بـە هەڵـە فـەرمانی بـۆ دەر کـردووە، کـە ئـەوەش شتێکی ئـەوتۆ نی‌یە.. یان گەنجینەی غەیب خۆی ئەو پاداشتەی دەداتەوە. خۆ پاداشتی ئـەو مرۆڤـەش لـە گەنجینەی غەیبەوە لەم چەشنە کاروبارانەدا جگە لە پلەی موجاهیدی و شەهیدی هیچـی تر نی‌یە.

بینیم ئامادەبووانی ئەنجومەنە میسالی‌یەکە ئەم وەڵامەیان پەسەند کردم.

دوای ئەمە، لە تین و تاوی هەڵچوونی خۆم لە خەونەکەم بێدار بوومەوە.

سەیرم کرد پەنجەکانی دەستم هەڵپێکاوە و ئارەقم لـێ دەچۆڕێ!

ئەو شەوەم بەم جۆرە لـێ گوزەرا.

* * *

بەیانی‌یەکـەی بـە دڵێکـی پڕ لـە هیـوا و ئاواتـەوە ڕۆشتم بـۆ ئەنجومـەنێکی تـر، بـەڵام دنیایی.. لێیان پرسیم:

بۆچی لەو کاتەوە هاتوویت بۆ ئێرە خۆت لە قەرەی سیاسەت نادەیت؟

وتم:

أعوذ بالله من الشيطان والسياسة.

بەڵێ، سیاسەتی ئێستای ئەستەمبووڵ وەکو نەخۆشیی "ئەنفلەوەنزا" وایە؛ مرۆڤ دووچاری وڕێنە دەکات!

چونکە ئێمە جووڵەمان لە لایەنی خۆمانەوە نییە، بەڵکو هۆکاری دەرەکی دەمانجووڵێنێت..

ئەوەتا ئەورووپا فوو بە کەڕەنای خۆیدا دەکات و ئێمەش لێرە سەما دەکەین. ئەو لە ڕێی خەواندنی موگناتیسییەوە تەلقینمان دەدات و ئێمەش پێمان وایە لە ناخی خۆمانەوە هەڵقوڵاوە و، دەچین بە وێرانکارییەکی کەڕ و کوێرانە لە دووی تەلقینەکەی ئەو ڕادەکەین!!

جا مادەم سەرچاوەکە لە ئەورووپایە، ئەوا تەوژمی داهاتوو یان سەلبی دەبێت یان ئیجابی..

ئەوانەی شوێن سەلبییەکە دەکەون وەکو (حەرف) وان کە بەوە پێناسە دەکرێ: "واتای غەیری خۆی دەگەیەنێت و لە خۆیدا واتایەکی سەربەخۆی نییە". واتە هەموو کارەکانی ڕاستەوخۆ لە بەرژەوەندیی دەرەوە دەبێت. چونکە کاری بەڕێوەبردنی ئەو تەوژمە سەلبییە خاوەنی بڕیاری خۆی نییە، کەواتە نیاز پاکی دادی نادات. نەخوازەڵا کە تەوژمەکە سەلبی بێت، ئەوا لە دوو ڕووەوە دەبێت بە ئامرازێکی بێ هەست و نەست و دوور لە ژێری بە دەستی دەرەوە بۆ لاواز کردنی ناوخۆ.

تەوژمەکەی تر، کە ئیجابییەکەیانە، پۆشاکی پشتگیریی ناوخۆ دەپۆشێت و، وەکو (ئیسم) وایە کە بەوە پێناسە دەکرێت: "خۆی لە خۆیدا واتای سەربەخۆی هەیە". بۆیە کارەکانی هی خۆیەتی، بەڵام ئاکامەکانی ئەو کارانە بۆ دەرەوە دەبێت. لەگەڵ ئەوەشدا گلەیی لێ ناکرێت، چونکە ئەو دەرهاویشتە پێویستەی لە هەر ڕێچکەیەك دەبێتەوە بە "ڕێچکە" دانانرێت. نەخوازەڵا گەر لە دوو ڕووەوە بڕواتە ڕیزی لاواز و ئیجابییەکەی تەوژمی دەرەکی، ئەو کاتە دەگونجێ دەرەوە بکات بە ئامرازێکی بێ هەست و نەست بە دەستی خۆیەوە.

وتیان:

ئایا نابینی ئیلحاد پەرە دەسێنێت؟ کەواتە ڕۆشتنە مەیدان بە ناوی ئایینەوە گەلێ پێویستە.

وتم:

بەڵێ پێویستە. بەڵام بە مەرجێکی تیژی بێ چەند و چۆن، کە بریتی‌یە لەوەی بزوێنەر و هاندەری ئەو کارە تەنها خۆشەویستیی ئیسلام و غیرەتی ئایینی بێت. چونکە مەترسی لەوەدایە کە هاندەر و ئاراستەکەر تەنها سیاسەت و لایەنگیری بێت. یەکەمیان لەوانەیە چاوپۆشیی لێ بکرێت، تەنانەت گەر هەڵەش بکات. بەڵام دووهەم بەرپرسە لە کارەکانی، تەنانەت ئەگەر ڕاستیشی پێکابێت.

وتیان:

جا چۆن لەوە تێبگەین؟

وتم:

ئەگەر کەسێك فەزڵی هاوڕێ سیاسی‌یە لە ڕێ لادەرەکەی خۆی بدات بەسەر ئایینداریکدا کە لەگەڵ ڕای سیاسیی ئەودا نەبێت و، گومانی خراپی بە ئاینندارەکە برد، ئەوا دیارە کە هاندەرەکە "سیاسی"یە.

پاشان پێش چاوخستنی ئایین - کە موڵکی پیرۆزی هەموو خەڵکی‌یە - بەهۆی لایەنگیری و حیزبایەتی‌یەوە لە شێوەیەکی وادا کە تایبەت بێت بەوانەی لەسەر ڕێبازی ئەون، نەك کەسی تر، زۆرینەی خەڵکی لە دژی ئایین دەورووژێنێت. ئەوەش دەبێت بەهۆی داشکانی شان و شکۆی ئایین و سووکایەتی پێکردنی.. دیارە هاندەری کارەکە لێرەدا "لایەنگیری"یە.

نموونەیەك بۆ ڕوونکردنەوەی ئەمە:

دوو کەس زۆران دەگرن.. هەر هێندەی یەکێکیان هەستی کرد خەریکە دەبەزێت، دەبێ ئەو قورئانەی کە بە دەستیەوەیە بیدات بە کەسە بەهێزەکە تاکو پارێزگاریی لێ بکات، نەوەکو لەگەڵ خۆیدا قورئانەکەش بکەوێتە ناو قوڕاوەکەوە. بەم کارەش خۆشەویستی و ڕێزی خۆی بۆ قورئان دەردەبڕێت. ئەو خۆشەویستی‌یەی بۆ قورئان تەنها لەبەر ئەوەیە کە قورئانە، نەك لەبەر هیچ شتێکی تر.

بەڵام ئەگەر لەو زۆرانەدا قورئانەکەی کرد بە قەڵغانێك بۆ خۆی بەرامبەر کەسە بەهێزەکە، ئەوا لەبریی ئەوەی غیرەتی بەهێزەکە ببزوێنێت بۆ پارێزگاری کردن لەو قورئانە، پتر تووڕەیی دەورووژێنێت!

جا ئەو کەسەی کە قورئان لە خزمەتگوزارێکی بەهێز بێ بەش دەکات و دەیخاتە دەستی کەسێکی لاواز، بە چەشنێ کە هەر هێندەی لاوازەکە شکستی هێنا و کەوت، قورئانەکەش لەگەڵیدا بکەوێت، کارەکەی ئەوە دەگەیەنێت کە لەبەر خۆی قورئانی خۆش دەوێت، نەك لەبەر قورئان!

بەڵێ، خزمەتکردنی ئایین و خەڵك بردن بۆ لای، تەنها بەوە دەبێت کە هان بدرێن بۆ پابەند بوون پێوەی و، ئەرکە ئایینییەکانیش یادی هەڵگرانی بخرێنەوە..

دەنا کاری پێچەوانەی ئەمە و، گوفتار ئاراستە کردنیان بەوەی کە: "ئێوە مولحیدن"، بۆ دەستدرێژی هانیان دەدات.

لە ناوخۆدا "ئایین" بۆ کاروباری سەلبی و خراپکاری ناقۆزرێتەوە!

ئێوە بە چاوی خۆتان دەستدرێژیتان بۆ سەر شەریعەت بینی، بە گومانی ئەوەی کە ئەو خەلیفەیەی سی ساڵ حوکمڕانیی کرد لە چەند ڕێ و ڕەسمێکی سیاسیی سەلبیدا بەکارهێنراوە.

ئایا کێ سوود لە ڕای سیاسییە سەلبییەکانی ئێستا وەردەگرێت؟ دەیناناسن؟ من پێم وایە ئەو سوودە دوژمنی هەرە سەرسەختی ئیسلام وەری دەگرێت، ئەوەی کە خەنجەری خۆی بەناو دڵی ئیسلامدا چەقاند.

وتیان:

جاران نەیاری ئیتیحاد و تەرەقی بوویت، کەچی ئێستا لێیان بێدەنگیت؟

وتم:

لەبەر زۆریی هێرشی دوژمنان لەسەریان.

ئامانجی ئەو هێرشەی کە دوژمنان دەیکاتە سەریان ئەو دامەزراوی و تین و غیرەتەیە کە لەواندا هەیە و، ئەوەشە کە نابن بە هۆکار و ئامرازێك بۆ پیادەکردنی ئامانجی دوژمنان لە ژەهراوی کردنی هزر و بیری موسڵماناندا. ئەمەش لە چاکەکارییەکانی ئەوانە.

من لام وایە بە وێنەی دوو تای تەرازوو ڕێگاکەش دوانە؛ سووکیی تایەکیان قورسیی تاکەی تر بەرهەم دەهێنێت.

بۆیە من لە تەنیشتی "ئەنترانیك"وە[١] زللەی خۆم لە "ئەنوەر"[٢] نادەم و، لە پاڵ "فینزیلیۆس"یشدا[٣]دا لە "سەعید حەلیم"ی[٤] ناسرەوێنم. پێم وایە ئەو کەسەی زللەیان ئاراستە دەکات نزم و بێ نرخە.

وتیان:

حیزبایەتی یەکێکە لە خواستە پێویستەکانی "مەشرووتییەت".

وتم:

لای ئێمە هێڵی هزر و بیرەکان لە بریی ئەوەی بۆ مەبەستی بە یەك گەیشتن لە یەکتر نزیك ببنەوە، کەچی هەتا بێت لار دەبنەوە و لە یەکتر دوور دەکەونەوە. هەر لەبەر ئەوەشە کە هیچ خاڵێکی بە یەك گەیشتنیان تێدا بەدی ناکەین، نە لەم نیشتمانەدا و نە لە سەرانسەری گۆی زەویدا. ئەو هزر و بیرانە بە وێنەی "بوون" و "نەبوون"یان لێ هاتووە؛ هەرگیز یەکناگرن، چونکە بوونی یەکێکیان داخوازی نەبوونی ئەوی تریانە!

"سەرسەختی" هەندێ جار خەڵکانی ڕۆچوو لە "دەمارگیری"دا دووچاری گومڕایی و ناحەقی دەکات، بە ڕادەیەك کە ئەگەر شەیتان یارمەتیی یەکێکیان بدات،

---

(١) سەرۆکی ڕێکخراوی "تاشناق"ی ئەرمەنییە کە سەردەمانێکی زۆر دەوڵەتی عوسمانیی بە شۆڕشەکانی سەرقاڵ کردبوو. (وەرگێڕ)

(٢) ئەنوەر پاشا: (١٨٨١-١٩٢٢ز) لە حکوومەتی ئیتیحاد و تەرەقیدا ساڵی (١٩١٣ز) وەزیری جەنگ بووە. دوای جەنگی یەکەمی جیهانی بۆ ئەڵمانیا هەڵهات و، پاشان ڕۆشت بۆ تورکستان و لەوێ سوپایەکی بۆ بەرەنگاریی ڕووسەکان پێکهێنا و لەوێ لە جەنگێکدا شەهید بوو. (وەرگێڕ)

(٣) فینزیلیۆس (١٨٦٤-١٩٣٦): سیاسەتمەدارێکی ناوداری یۆنانییە و یەکێکە لە پیاوە بەناوبانگەکانی دەوڵەت. لە پێشدا پارێزەر بووە، پاشان ڕۆڵێکی گرنگی بینیوە لە سەرکردایەتی کردنی شۆڕشی کرێت (١٨٩٦-١٨٩٧)دا لە دژی دەوڵەتی عوسمانی. ساڵی ١٩١٠ وەزارەتی یۆنانیی پێکهێناوە. گەلێ ئاشووبی چەکدارانەی لە دژی حکوومەتی پاشایەتی ڕێکخستووە، بەڵام هەر هەموویان سەرکوت کراون. ساڵی (١٩٢٥ز) ڕایکردووە بۆ فەرەنسا و لەوێ دوای ساڵێك کۆچی دوایی کردووە. (وەرگێڕ)

(٤) سەعید حەلیم پاشا: (١٨٦٣-١٩٢١ز) سەرۆك وەزیرانی حکوومەتی ئیتیحاد و تەرەقی بوو لەو دەمەدا کە "ئەنوەر پاشا" وەزیری جەنگ بوو. لەگەڵ شەست و حەوت کەسیتری هاوڕێیدا بەوە تاوانبار کران کە دەوڵەتی عوسمانیان لە جەنگی جیهانیدا ڕاپێچی جەنگ کردووە و، لە ئەنجامی ئەوەدا بۆ دوورگەی "مالتە" نەفی کرا. دوو ساڵ لەوێ ماوەیەوە. ئنجا پەنای بردە بەر ئیتالیا، چونکە ڕۆشتنی بۆ ناو تورکیا و میسر لێ قەدەغە کرابوو لەبەر ئەوەی ئەو دەمە لە لایەن بەریتانیاوە داگیر کرابوون. لە بەرواری: ١٩٢١/١/٦ لە نزیکی ڕۆما بە دەستی کەسێکی ئەرمەنی کوژرا. (وەرگێڕ)

دەڵێ: ئەوە مەلائیکەتە و، ڕەحمەتی بۆ دەنێرێت. کەچی گەر مەلائیکەتێك لە ڕیزی ڕای نەیاری خۆیدا ببینێت، دەڵێت: ئەوە شەیتانە پۆشاکی خۆی گۆڕیوە، ئیتر دەست دەداتە دوژمنایەتی کردنی..

ئەو کەسە گەر گومانی باشی بە شتێك بوو "نیشانەی لاواز" لەسەر ئەو شتە وەك "بەڵگە" دەبینێت، کەچی گەر گومانی خراپی بە هەر شتێك هەبوو ئەوا "بەڵگە" لەسەر ئەو شتە بە "نیشانەیەکی لاواز" دەبینێت! بە وێنەی ئەو کەسەی کە لە یەکێکی ئەو دوو سەرەی دووربینەوە بڕوانێت کە یەکێکیان شت نزیك دەخاتەوە و ئەوی تریان دووری دەخاتەوە..

دیارە ئەوەش ستەمێکی ئابڕووبەرە و، حیکمەتی ئەو ئایەتە ڕوون دەکاتەوە کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الإِنْسَانَ لَظَلُومٌ كَفَّارٌ﴾ (إبراهيم: ٣٤). چونکە هێز و مەیل و ئارەزووەکانی مرۆڤ لە سروشتیدا دەست نیشان نەکراون، بە پێچەوانەی گیانەوەران..

ئەوەتا مەیل و ئارەزووی مرۆڤ بۆ ستەم کردن، بە تایبەت ئەگەر شێوە چەپەڵەکانی خۆپەرستی وەك: لەخۆڕازی بوون و، گەڕان بە دوای بەرژەوەندیی خۆیی و، خۆبەگەورە زانین و، سەرسەختی و، لەخۆبایی بوون ڕۆشتبنە ڕیزی ئەو مەیلی ستەم کردنەوە، ئەوا تاوانی چەپەڵی وا بەرهەم دەهێنن کە مرۆڤایەتی ناوی بۆ نەدۆزیوەتەوە و، جگە لە ئاگری دۆزەخ هیچ سزایەکی تر نییە شایانی بێت، هەروەك بەڵگەشە لەسەر پێویستیی بوونی دۆزەخ!

بۆ نموونە:

ئەگەر لە سیفەتێکی تاوانباری کەسێك بێزار بێت، ئەوا ستەمەکەی بەرامبەر بەو کەسە هەموو سیفەتە بێ تاوانەکانیشی دەگرێتەوە، تەنانەت خۆشەویستانی و ئەوانەش لە ڕێبازەکەیدان بەو ستەمەوە دەگلێنێت! ئیتر دەبێت بە کەسێکی یاخی لە بەردەم ئەم ئایەتە پیرۆزەدا کە دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى﴾ (الأنعام: ١٦٤).

نموونەیەکی تر:

یەکێك لەو هەڵپەکارانە بە هاندەری تۆڵەسەندنەوە، وتی:

ئیسلام شکست دەهێنێت و دڵیشی پارچە پارچە دەبێت.

جا بۆ ئەوەی ڕاستیی ئەو قسە شوومەی دەربکەوێت کە لە گیانێکی نەخۆش و هزرێکی درۆینەوە سەرچاوەی گرتووە، ئاواتەخوازی ئەوەیە سووکایەتی بە موسڵمانان بکرێت و، چەپڵە بۆ دوژمنکارییەکانی کافران لێدەدات و، لەزەت لە وەشاندنی مستەکۆڵی دوژمن لە موسڵمانان دەچێژێت!

جا هەر ئەو چەپڵەلێدان و بەخێرهاتن و لەزەت چەشتنەیە کە ئیسلامی خستووەتە باری زامدارییەوە. چونکە ئەو دوژمنەی کە خەنجەری بە دڵی ئیسلامدا چەقاندووە، بەوە لێمان ڕازی نابێت کە لێی بێدەنگ بین، بەڵکو دەڵێ: بەخێرهاتنم بکە.. لەزەت لە کارەکانم بچێژە.. منت خۆش بوێت..

ئیتر بزانن کە ئەوە چ تاوانێکی مەزن و، چ ستەمێکی چەپەڵی ئەوتۆیە کە مەگەر تەرازووی حەشری مەزن سزای بۆ دەستنیشان بکات.

وترا:

ئێمە دەمانزانی شکست دەهێنین.. بە زانینەوە بەرەو موسیبەتەکە ڕاپێچیان کردین.

وتم:

چۆن پێشتر ئەنجامی جەنگ لای ئێوەی ناڕۆشنبیر ڕوون بووە، لە کاتێکدا لای کەسێکی مەزنی وەك "هیندەنبێرگ"[(١)] ڕوون نەبووە؟ ئەمە جێی سەرسووڕمانە! دەترسم ئەوەی بە هزر و بیری دەزانن – پەنا بە خوا – حەز و ئارەزوو بێت. چونکە هەندێ جار مەیلی ستەمکارانەی تۆڵەسەندن پۆشاکی هزر و بیر دەپۆشێت. ئایا ئێوە بەخۆتان دەزانن کە کەوتوونەتە ناو چ قوڕاوێکی پیسەوە و دەموچاوی خۆتانی پێ چەپەڵ دەکەن وەك ئەوەی میسك و عەنبەر بێت؟!

* * *

ئەم ڕوونکردنەوەیەم بۆ ئەو گفتوگۆیەی کە لە ئەنجومەنە میسالییەکەی شەوی ڕووناك و کۆرە دنیاییەکەی ڕۆژی تاریکدا ڕووی دا، نە زادەی بیری منە و نە لافاوێکیشە لە "ژیری"یەوە لێشاوی هێنابێت، بەڵکو لە سەرچاوەی دڵەوە تەقیوەتەوە.

(١) هیندەنبێرگ: ناوی خۆی (پۆوڵ ڤان)ە و، لە بنەچەدا خەڵکی پرووسیایە. لە نێوان ساڵەکانی (١٨٤٧–١٩٣٤ز)دا ژیاوە. لە جەنگی یەکەمی جیهانیدا مارشاڵ و سەرۆك ئەرکانی سوپای ئەڵمانیا بووە و، هێڵی هیندەنبێرگی پاراستووە. هەر لەو جەنگەدا و ساڵی (١٩١٤ز) بەسەر سوپای ڕووسدا سەرکەوتنی بەدەست هێناوە. لە نێوان ساڵەکانی (١٩٢٥–١٩٣٤ز)شدا سەرۆك کۆمار بووە. (وەرگێڕ)

تۆی خوێنەریش گەر پێت خۆشە وەری بگرە. دەنا وەری مەگرە و ڕەتی بکەرەوە. بەڵام بە مەرجێ لێی تێبگەیت!

* * *

## پاشکۆی خەونەکە

لە خەونەکەدا هیچ شتێکی لە بارەی "حەج"ەوە باس نەکرد.

لە ڕاستیدا پشتگوێ خستنی حەج و بایەخ نەدان بەو حیکمەتانەی کە لە حەجدان نەك تەنها مایەی دابارینی موسیبەتە، بەڵکو قەهر و تووڕەیی خوای بەهێز وخاوەن زەبریش دەبارێنێت. سزاکەشی کەفارەتی گوناهەکان نییە، بەڵکو زۆربوونیەتی.

بەڵێ، پشتگوێ خستنی سیاسەتی بەرزی ئیسلام لە حەجدا کە یەکگرتنی بیر و هزرەکانی لە ڕێی یەکتر ناسینەوە و هاوبەشکردنی هەوڵ و تەقالاکانیشی لە ڕێی هاوکاریی یەکترەوە لەخۆ گرتووە، بوو بەهۆی ئامادەکردنی دۆخ و ناوەندێکی لەبار بۆ دوژمنان کە ملیۆنەها موسڵمان لە دژی ئیسلام بەکاربهێنن.

ئەوەتا ئەو هیندییە لای سەری باوکیەوە دەگری کە کوشتوویەتی؛ پێی وابووە دوژمنەکەیەتی..

ئەوە تەتار و قەفقاسن لای پێی تەرمێکەوە ڕاوەستاون کە لە کوشتنیدا یارمەتیی یەکتریان داوە.. دوای هەل لەدەستدان زانیویانە کە باوکیانە..

ئەوە عەرەبەکانیشن بە هەڵە برا قارەمانەکەی خۆیان کوشتووە، لە سەرسامیدا نازانن چۆن بۆی بگرین و بیلاوێننەوە..

ئەوە ئەفریقیایە بێ ئەوەی پێی بزانێت براکەی خۆی کوشتووە و، ئێستا هاوار و شینی بۆ دەکات.

ئەوەش جیهانی ئیسلامییە بێ ئەوەی بەخۆی بزانێت یارمەتیی کوشتنی ڕۆڵەکەی خۆی داوە و، ئێستا بە وێنەی دایکێکی شێت و نەفام لە کوڵمی خۆی دەدات و قژی دەڕنێتەوە.

ملیۆنەها موسڵمانی جیهان لە ژێر ئاڵای دوژمنـدا - کە سەرتـاپا شەڕ و خراپەی پەتی و بێ گومانە - بەرەو چەندین گەشتوگوزاری درێژخایەن دراونەتە بەر، لە بریی ئەوەی چاك بکەن بەلادا و بۆ حەج خۆیـان بپێچنەوە، کە سەرانسەر خێر و چاکەی ڕوون و بێ گومانە.. دەسا پەند وەربگرن!

[كما ان الضرورات تبيح المحظورات، كذلك تسهّل المشكلات].

واتە: هەروەك پێوستی‌یە ناچاری‌یەکان شتانی حەرام بۆ مرۆڤ حەلاڵ دەکەن، بە هەمان جۆر گیروگرفتەکانیشی بۆ ئاسان دەکەن.

مریشك کە بۆ ترسنۆکی بە نموونە دەهێنرێتەوە، بۆ پارێزگاری لە جووجەڵەکانی هێرش بۆ سەر گامێش دەبات.. ئازایەتیی لەڕادەبەدەر ئەمەیە..

ترسی بزن لە گورگ نموونەی پێ دەهێننەوە. کەچی ئەو ترسەی لە کاتی ناچاریدا هەڵدەگەڕێتەوە بۆ داکۆکی و بەرگری کردن، تەنانەت بەگژی گورگدا دەچێت.. دلێریی نائاسایی ئەمەیە..

بەڵێ، مەیلێك کە سروشتی بێت ناتوانرێ ڕێی لێ بگیرێت. ئەوەتا لەوێچێك ئاو گەر لەناو تۆپێکی ئاسندا دابنرێت، هێندەی ڕووبەڕووی سەرمای زستان دەکرێتەوە، ئەو ئاوەی کە دەیبەستێت ئاسنەکە لەت و پەت دەکات، لەبەر ئەو مەیلە سروشتی‌یەی کە تیایدایە بۆ کرانەوە و بڵاوبوونەوە.

جا ئازایەتیی مریشکی دڵسۆز بۆ جووجەڵەکانی و.. دلێریی ناچاریی بزنی دەروون بەرز، نموونەی وروژاندنی سروشتین.

ئەم وروژاندنە سروشتی‌یە ئەگەر ستەمی کافر یەخەی پێ بگرێت و شەڕی پێ بفرۆشێت، بە وێنەی ئاوی ناو تۆپە ئاسنەکە هەموو شتێك لە بەردەمی خۆیدا وردوخاش دەکات. (ڕووسە لادێ نشینەکان نموونەی لەبەرچاون لەسەر ئەمە).

وێڕای ئەمەش، ئەو مەردایەتی‌یە نائاساییەی کە ماهییەتی ئیمان لەخۆی گرتووە و ئەو ئازایەتی‌یەش کە لە عیززەتی ئیسلامیدا هەیە و تەحەددای سەرجەمی جیهان دەکات، لە ڕێی بڵاوبوونەوە و پەرەسەندنی برایەتیی ئیسلامی‌یەوە هەموو کاتێك دەتوانێت موعجیزات پێش چاو بخات.

ڕۆژێك دێت کە خۆری حەقیقەت هەڵبێت.. ئایا جیهان تا ئەبەد هەر لە تاریکیدا دەمێنێتەوە؟

## پاشكۆی پاشكۆ

## بۆ دەرمانی نائومێدی[1]

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله الذي قال: ﴿ولا يَغْتَبْ بعضُكُم بعضاً﴾ (الحجرات: ١٢).

والصلاة على محمد ﷺ الذي قال: (من قال هلكَ النـــاس هلــكَ النـــاس فـــهو أهْلَكُهُم)[2].

دادگاکـانی پشـکنینی شارسـتانێتیی ئـەم چەرخـە، لـە ڕێـی بـەکارهێنانی چـەند هۆکـارێکی ترسـناك و بـە مەبەسـتی موتوربـە کردنـی هـەندێ لـە زەینـەکان، ڕۆڵــە ناشەرعی‌یەکانی خۆی خستووەتەوە و، لـە ڕێی ئەوانـەوە ڕقی شـارراوەی خـۆی لـە ئیسـلام، بۆ تۆڵـە لـێ سـەندنەوەی، ڕایـی دەکـات. بـەو کارەشـی هـەوڵ دەدات کـە دەرگایەك بخاتە سەرپشت لە بـەردەم ئەوەی موسـڵمانان لـە ئاییـنەکـەیان لا بـدات، هیـچ نەبێ وایان لـێ بکات پشتگوێی بخەن، یـاخود بـەرەو نەصرانیـەت بیانبـات، یـان لـە ڕێـی بڵاوکردنەوەی دوودڵی و گومان لـە ژیری‌یـەکاندا وازیـان لـە ئیسـلام پـێ بـهێنێت. بـەم کارەشی پەرە بە فێڵێکی بەد و بێ کەڵکی وەك ئەمەی خوارەوە دەدات:

ئەی موسڵمان! سەرنج بدە لە هەر شوێنێك موسڵمان هەبێت: هەژارە.. بێ ئاگایە.. تا ڕادەیەکیش نەزانە. کەچی نـەصرانی بڕواتـە هـەر جێگایـەك: شارستانی‌یە.. بێدارە.. خاوەن سامانە.. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە هتد.

منیش دەڵێم:

---

(١) مەبەست لـە (دەرمـانی نـائومێدی) پـەیامی (وتـاری شـام)ە. پاشکۆکەشـی باسـی (دەستنیشـان کردنـی نەخۆشی)یە. ئەم باسەش پاشکۆی ئەوە. (وەرگێڕ)

(٢) في صحيح مسلم ٤ / ٢٢٣٧ "إذا قال الرجل: هلكَ الناس فهو أهْلَكُهُم". (وەرگێڕ)

ئەی موسڵمان! نەکەیت دەستت لە ئایینی ئیسلام شل بکەیت، کە پاریزەری بوون و قەوارەی ئێمەیە بەرامبەر بەو ویرانکاری‌یەی کە ئەم ئاکامە ترسناکەی پێشکەوتنی ئەوروپا بەرهەمی دەهێنێت. بەڵکو بە گەرمی پابەندی بە و، بە هەموو هێزێکت دەستی پێوە بگرە. دەنا چارەنووست تیاچوون دەبێت.

بەڵێ، ئێمە بەرەو خوارەوە شۆڕ دەبینەوە و، ئەوانیش بەرەو سەرەوە بەرز دەبنەوە. ئەمەش دوو هۆکاری هەیە؛ یەکێکیان ماددی و ئەوی تریان مەعنەوی‌یە.

**هۆکاری یەکەم:**

بارودۆخی سروشتیی ئەوروپایە، کە لە خۆیدا کەنیسەی نەصرانیەتە بە گشتی و سەرچاوەی ژیانیەتی. ئەوەتا کیشوەرێکی تەنگەبەر و جوانە و، خاوەنی ئاسنە و، کەناری دەریاکانی بەرزی و نزمی‌یان تێدایە و، بە وێنەی پێچاوپێچی ڕێخۆڵەکانی ناو جەستە ڕووبار و دەریاکانی ئەویش بە یەکدا ئاڵاون و، کەش و هەوایەکی ساردیشی هەیە.

بەڵێ، هەرچەند ڕووبەری ئەوروپا یەك لە پەنجای گۆی زەوی‌یە، کەچی لەبەر خۆشی و جوانیی کەش و هەوا سروشتی‌یەکەی چوار یەکی گرۆی ئادەمیزادی بۆ لای خۆی کێش کردووە.

لە دانستدا ئەوەش سەلماوە کە: کۆبوونەوەی خەڵکانێکی زۆر لە شوێنێکدا پێداویستی‌یەکان دەهێنێتە کایەوە و، بەرهەمەکانی زەوی بەشی دابینکردنی ئەو پێداویستی‌یانە ناکات کە لە ڕێی چەند هۆکارێکی زۆری وەك چاولێکەری وشتی تریشەوە هەمیشە لە زیادبووندان. ئا لێرەوەیە کە "پێویستی" دەبێت بە دایك و بەرهەمهێنی پیشەسازی و داهێنانەکان و، حەزی شارەزابوونیش دەبێت بە مامۆستای زانست و، تەنگ و تاریکیی ڕۆحیش دەبێتە بەرهەمهێنی هەرزەیی.

بەڵێ، ڕووکردنە پیشەسازی و حەزکردنیش لە زانین لە "زۆری"یەوە پەیدا دەبێت. جا بەهۆی تەنگەبەریی شوێن لە ئەوروپا و زۆریی دەریا و ڕووبارەکانی کە چەند هۆکارێکی سروشتیی گواستنەوەن لەوێ، ئەوا "یەکتر ناسین" دەبێت بەهۆی ئەوەی

بازرگانی و هاوکاری و بەشداری کردن لە کاروبارەکاندا بەرهەم بهێنێت، وەك ئەوەی کە "بەریەك کەوتن"(التماس) کارێك دەکات کە بە دوای یەکدا هاتنی بیروبۆچوونەکان و بەربەرەکانێ و پێشبڕکێ بێتە کایەوە.

ئنجا زۆریی ئاسن لەوێ - کە سەرچاوەی هەموو پیشەسازی‌یەکانی ئەوروپایە - چەکی بەهێزی وای بە شارستانێتیی ئەوان داوە کە تەنانەت دەستی بەسەر پاشماوەی شارستانێتی‌یەکانی هەموو دنیادا گرت و هێرشی بۆ بردن، بە ڕادەیەك کە تای تەرازووی خۆی قورس کردووە و هاوسەنگیی گۆی زەویشی شێواندووە.

پاشان کەش و هەوای ساردی مامناوەندی کە سروشتی وایە هەموو شتێك بە لەسەرخۆیی وەردەگرێت و هەر بە لەسەرخۆییش وازی لێ دەهێنێت، جێگیربوون و توندوتۆڵیی بە هەوڵ و کۆششی ئەوان بەخشیوە. ئەمەش شارستانێتیی ئەوانی بە بەردەوامی هێشتووەتەوە.

ئنجا پێکهاتنی دەوڵەتەکانیان کە پاڵی بە زانستەوە داوە و.. پێکدادانی هێزە هاوشانەکانیان و.. وەڕسی و بێزاری‌یەکانی ئەنجامی زۆرداری‌یە ناپاك و غەدداره‌کانیان و.. گوشارەکانی دەمارگیریی ستەمکار و نەفرەت لێکراویان - بە وێنەی دەمارگیریی دادگاکانی پشکنین - کە پێچەوانەی مەبەستی لێ کەوتەوە و.. پێشبڕکێی نێوان تۆخمەکانی..

هەموو ئەمانە، توانا و لێهاتنی ئەوروپاییەکانی گەشە پێ دا و، قابیلییەتی ئەوانی بووژاندەوە. ئیتر تایبەتکاری‌یەکان و بیری نەتەوەیی لە لایان پەیدا بوو.

**هۆکاری دووهەم:**

بریتی‌یە لە "خاڵی پشت پێ بەستن"(نقطة الاستناد).

بەڵێ، هەر نەصرانی‌یەك لە هەر کاتێکدا سەر بەرز بکاتەوە و دەست بۆ هەر ئامانجێك ببات لە زنجیرە ئامانجە یەك لەناو یەك و تێهەڵکێشەکان، هەست دەکات خاڵێکی بەهێزی پشت پێ بەستنی ئەوتۆی هەیە کە وره و هێزی مەعنەویی بەرز دەکاتەوە و ژیانی تێدا دەبووژێنێتەوە، بە ڕادەیەك هێندە هێز لەخۆیدا شك دەبات کە خۆی بهاوێتە ناو هەموو کارێکی گەورە و دژوارەوە.

جا ئەو خاڵی پشت پێ بەستنەی ئەو بریتییە لە "شارستانێتیی ئەوروپا" کە سەربازگەیەکی پڕچەك کراوە و، "کەنیسە" مەزنەکەشیەتی کە هەمیشە ئامادە و لەسەر پێیە ژیان لە دەماری هاوئایینەکانیدا ببووژێنێتەوە لەوانەی کە لە هەموو لایەکەوە دەستی یارمەتیی بۆ درێژ دەکەن و، هەردەم ئامادەیە شادەماری ژیانی موسڵمانان بقرتێنێت. چونکە بە دەمارگیریی دادگاکانی پشکنینی شارستانێتیی فێڵباز و ئیلحادی هەڵقوڵاوی ناو بیری مادیگەری هەڵشێلراوە و پێکهاتووە. ئەوەتا ئەوروپا بە سەرکەوتنی شارستانێتییەکەی بەسەر هی شوێنانی تردا خۆی هەڵدەکێشێت و لووت بەرزی دەنوێنێت.

ئایا نابینرێ ئینگلیز - کە ڕوخساری خۆی بە دەمامکی ئازادی پۆشیوە - دەست بۆ هەموو لایەك درێژ دەکات و لە دووی نەصرانییەك دەگەڕێت، کە هەر هێندەی دۆزییەوە ژیانی بە بەردا دەکاتەوە؟! بۆ بەراورد فەرموو ئەوە حەبەشە و سوودانە.. ئەوە تەیار و ئەرتووشە.. ئەوە لوبنان و حۆرانە.. ئەوە ماسوور و ئەلبانیایە.. ئەوە کورد و ئەرمەنە.. ئەوەش تورك و ڕۆمە... هتد.

**پوختەی ئەم قسانە:**

ئەو شتەی ژیانیان بە بەردا دەبووژێنێتەوە "هیوا"یە. ئەو شتەش کە ئێمە دەکوژێ "نائومێدی"یە.

یەکێك لەوانە بەو وتەیە ناوبانگی دەرکرد کە وتبووی:

"گەر خاڵێکی پشت پێ بەستنم دەستگیر ببێت، دەتوانم گۆی زەوی لە شوێنی خۆی بجووڵێنم".

ئەم وتە گریمان کراوە خاڵێکی گرنگی تێدایە کە بریتییە لەوەی ئەم مرۆڤە بچووکە هەرکات خاڵێکی پشت پێ بەستن بەدەست بهێنێت دەتوانێت گەورەترین شتی مەزنی وەك گۆی زەوی بەڕێوە ببات.

**دەسا ئەی ئەهلی ئیسلام!**

خاڵی پشت پێ بەستنمان بەرامبەر بەو کارەسات و مەترسییانەی کە قورسایی گەورەی هێندەی گۆی زەویی خستووەتە سەر شانی جیهانی ئیسلامی، تەنها ئەو

"ئیسلام"ەیە کە فەرمان بە "یەکێتی"یەك دەدات لـە "خۆشەویستی"یـەوە هـەڵقوڵابێت و، داوای "ئاوێتـەبوونێکی هـزر و بیرەکـان" دەکـات کـە لـە "زانین"ەوە پـەیدا بووبێـت و، "هاوکاری"یەکیشی دەوێت کە "برایەتی" بەرهەمی بهێنێت.

بڕوانە، هەر لە بازنەی فراوانی جیهانی ئیسلامی‌یەوە تا دەگاتە زانست خوازێکی ناو قوتابخانەیەکی شەرعی (وەك بچووکترین بازنە)..

دەبینیت هەریەکەیان چەندین چەقە خاڵیان هەیە کـە ئاواتـەکانی لەمەڕ ژیانیـان تێـدا چڕ بووەتەوە و، ئەو چەقـە خاڵانـەی لەمـەڕ ژیـانیش زنجیرەیـەکی پەیوەستی یـەکترن و بـە وێنەی یەك بە یەکی خەڵکانی ناو کۆمەڵگا و پەیوەندی‌یـەکانیان پاڵیـان بـەو خاڵـە هـەرە مەزنەوە داوە.

بەو واتایەی کە هەرکات موسڵمانان بێدار بکرێنـەوە و گیـانی گەشـە کردنیـان تێـدا ببووژێنرێتەوە ئەوا دەگونجێ ڕاپەڕن و هەنگاو بەرەو پێشکەوتن بنێن.

دەنا گەر کەسێك بەراورد لە نێوان چاکەکاری‌یەکانی ئەورووپا و خراپکاری‌یـەکانی ئێمـە و.. لـە نێـوان بـەروبوومی بـە دوای یـەکداهاتنی بـیر و هزرەکـانی لای ئـەوان و بەروبوومی کۆششی یەك دانە کەسی لای خۆماندا بکات[1]، ئەوا هەروەك بەم بەراوردە ناحـەق و ستەمکارەی دەریدەخـات کـە هـەڵگیراوە و دۆزراوەی ئەورووپایـە، چونکـە شەیدای بووە و نەفرین لە نەتەوەکەی خۆی دەکات..

بە هەمان جۆر لە ڕێی پیاهەڵخوێندنی هەڵقوڵاوی فێڵ و بـیری شۆڕشـگێڕی و مـەیلی حیزبایـەتی، کـە لـە سـەرپێچی و بوختـان و دەستدرێژی کـردن بـۆ شـەرەف پـڕ کـراوە، فیرعەونایـەتیی خـۆی و مـەدحی خۆکـردن و ئافـەرین بـۆ لـەخۆبایی بوونـی خـۆی لـە نـاوەرۆکدا دەردەخـات و، بـێ ئـەوەی بـە خـۆی بزانێـت دوژمنایـەتیی بـۆ ئیســلام دەردەبڕێت..

---

(١) گێڕانەوەی چاکەکاری‌یەکانی شارستانێتی بۆ نەصرانێتی‌یەك کە هیچ فەزڵێکی ئەوی تێدا نی‌یـە و، پێش چاو خستنی ئیسلامیش بە هۆکاری نزم بوونەوە و دواکەوتن کە هـەر خـۆی دوژمنـی ئەوەیە، بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی کـە چارەنووسـەکان لـە پێچەوانـەی سـوورگەی خۆیـاندا دەسـووڕێنەوە و بارودۆخـەکانیش هەڵگەڕاونەتەوە. (دانەر)

لە كاتێكدا كە لە ڕووی شەرع و ژیری و داناییەوە، دەبوو هەستی سۆز و شـەفەقەتی بەرامبەر نەتەوەكەی تێدا بوایە، بەڵام لەبەر فیرعەونایەتی و خۆپەرستی و لەخۆبایی بوونی، دەچێ لە بریی هەست و سۆزی شـەفەقەت بەرامبەر نەتەوە، سووكایەتی پێكردنی و.. لە جیاتی حەزی نزیك بوونەوە لێی، نەفرەت و دوورەپەرێزی و.. لە بریی خۆشویستنی، ویستی گاڵتە پێكردنی و.. لە جیاتی ڕێز لێنانی، ناوزەد كردنی بە نەزانی و.. لە بریی بەزەیی پێدا هاتنەوەی، حەزی خۆ بەگەورە زانین بەرامبەری و.. لە بریی گیانی خۆبەخت كردن و فیداكاری لە پێناویدا، گیانی تاك پەرستی دادەنێت..

بە هەموو ئەمانە، دەیسەلمێنێت كە هیچ پەرۆشی و حەماسێكی بۆ نەتەوەكەی تێدا نیيە و، لە ڕاستیدا پەیوەندیی پێیەوە پچڕاوە ، بە ڕادەیەك كە بە وێنەی گەوجێكی گەلحۆ ڕەفتار دەكات. وەك ئەو كەسەی كە لە پاریس پۆشاكی ئافرەتە سەماكەرێكی بێ ئابرووی پێ جوان بوویێت و ئنجا بیبات بە بەری مامۆستایەكی بەڕێزی مزگەوتی بپۆشێت..

چونكە "پەرۆشی بۆ نەتەوە" دەرەنجامێكی حەتمیی خۆشەویستی و ڕێز و میهرەبانیيە بەرامبەری و، بە بێ ئەمانە هیچ پەرۆشیيەك لە ئارادا نابێت. دەنا هەرچیيەك بێت تەنها پەرۆشیيەكی درۆینە و خەڵەتێنەرە.

دوورەپەرێزی و نەفرین كردنیش لە نەتەوە پێچەوانەی غیرەت و پەرۆشیيە بەرامبەری.

ئەوەتا هەموو یەكێكی قەشەكانی ئەوروپا كە هێرش دەكەنە سەر دەمارگیرەكانی لای ئێمە، خۆیان زۆر توندڕەوتر و دەمارگیرترن بۆ ڕێبازەكەی خۆیان. خۆ ئەگەر زانایەكی ئایینی بە شێوەیەكی زیاد لە پێویست ستایشی "شێخی گەیلانی" بكات وەك ئەو ستایشەی كە ئەوان بۆ "شكسپیر" دەیكەن، ئەوا بەكافر لەقەڵەم دەدرێت!

دەسا بزانە كە خۆشەویستی و پەرۆشیی نەتەوەیی لەوانەوە چەندە دوورە!

یەكێك لە بوارە گرنگەكانی ژیان كە بزوێنەری كۆمەڵ و هاندەری كاراییەكانە: "بیری ئەدەبی"یە، كە بە داخەوە تەنها ئەوە لەناو ئێمەدا دەستی بە گەشە و نەشونما

کردووه، بە تایبەت ئەدەبی پیاهەڵخوێندن و ئارەزووی سووکایەتی کردن بە کەسانی تر. کە غروور و زیادەڕەویی لە وەسفدا لەخۆ گرتووە و، لە شێوازێکدایە هەرگیز شایانی ئەدەب نییە، چونکە لەو ئەدەبە ڕاستەقینەیە بەدەرە کە ئەم ئایەتە پیرۆزە ئێمەی لەسەر پەروەردە دەکات: ﴿ولا يغتَبْ بعضُكم بعضاً﴾ (الحجرات: ١٢)..

ئەوەتا هەرکەسە و هێرش دەکاتە سەر ئەوی تر.

خۆ هاوکات لەگەڵ بەرپەرچدانەوەی دەستدرێژییە ناوەکییەکان بەرامبەر بە ئیسلام و نەتەوە لە ڕووی ئەو قەشانە، کەچی سەبارەت بە پیاهەڵخوێندنی بێ ئایینی و سووکایەتی پێ کردنی کەسانی تر کە ئەوانە دەیکەن، بێ دەنگ دانیشتووین و، لەبەر خۆمانەوە دەڵێین: لەوانەیە شایانی ئەو سووکایەتییە بن!

من پێم وایە هۆکاری زەلیلیی ئەم نەتەوەیە، زیاتر لە نەزانی، زیرەکیی نەزۆك و قرتاوی بێ بەهرەی نووری دڵە. مەترسیدارترین نەخۆشی بە لامەوە لایەنگیریی توندڕەوانەیە، چونکە لەبەر ئەوەی هەموو شتێك لە شێوەکەی خۆی دەباتە دەر ئەوا پێچەوانەی مەبەستی پێ دێتە دی.

برای بەڕێز!

نۆبەرەی چەند هۆکارێکی بەهێز و لاو خەریکە لای ئێمە دەردەکەوێت، لە بریی ئەو هۆکارە پیر و پەك کەوتانەی کە پێشکەوتنی نەصرانییەتی بەرهەم هێنا. ئەمەشم لە کتێبێکی تردا بە درێژی باس کردووە(١).

* * *

چیرۆکێك:

دە ساڵ پێش ئێستا (واتە: ساڵی ١٩١٠ز) ڕۆشتم بۆ "تەفلیس" و سەرکەوتمە سەر گردی "شێخی صەنعان".

لەو کاتەدا کە بە تێڕامانەوە سەرنجی دەوروبەری خۆم دەدا، ڕووسێك لێم هاتە پێش و، وتی:

---

(١) مەبەست کتێبی "وتاری شام" (الخطبة الشامية) یە. (وەرگێڕ)

سەرنجی چی دەدەیت؟

وتم: نەخشەی قوتابخانەکەم دەکێشم!

وتی: بۆچی تۆ خەڵکی کوێیت؟

وتم: بەتلیس.

وتی: ئاخر خۆ ئێرە تەفلیسە!

وتم: بەتلیس و تەفلیس برای یەکترین.

وتی: مەبەستت چییە؟

وتم: خەریکە سێ ڕووناکیی یەك لە دوای یەك لە ئاسیا و سەرجەمی جیهانی ئیسلامیدا دەردەکەون.. لای ئێوەش سێ تاریکیی یەك لەسەر یەك پەیدا دەبن. دوای ئەوە، پەردەی ئەم ئیستیبدادە دێتەوە یەك و پارچە پارچە دەبێت. ئەو کاتە منیش دێم و قوتابخانەکەم لێرە بنیات دەنێم.

وتی: ئاواتێکی چەندە دوورە! من لە هیوا درێژیت سەرسام ماوم!

وتم: منیش لە ژیریی تۆ سەرم سووڕماوە! ئایا پێت وایە ئەم وەرزی زستانە هەر دەمێنێتەوە؟ دڵنیابە کە هەموو زستانێك بەهارێکی لە دوایە و، هەموو شەوێکیش ڕۆژی لێ دەبێتەوە.

وتی: ئاخر موسڵمانان لەت و پەت بوون.

وتم: ڕۆشتوون بۆ بەدەستهێنانی زانست.. ئەوەتا "هیندی"ی کوڕی بە جەوهەر و لێهاتووی ئیسلام لە قوتابخانەی ئامادەیی ئینگلیزدا دەخوێنێت..

ئەوەش "میسری"ی کوڕە زیرەك و وریای ئیسلامە لە قوتابخانەی ئیداریی سیاسیی ئینگلیزدا درێژە بە خوێندنەکانی دەدات..

ئەوانەش قەفقاسی و تورکستانین، کە کوڕی ئازا و بەجەرگی ئیسلامن، لە قوتابخانەی سەربازیی ڕووسدا مەشق دەکەن هتد.

جا ئەو ڕۆڵە بەوەفا و جوامێرانە، دوای وەرگرتنی بڕوانامەکانیان، هەریەکەیان جڵەوی یەکێك لە کیشوەرەکان دەگرنە دەست و، ئاڵای باوکی دادگەریان - کە ئیسلامی مەزنە - بەرز دەکەنەوە، تاکو بەسەر ئاسۆکانی سەرجەم ئاکارە بڵند و ڕەفتارە

مەزنەکاندا بشەکێتەوە و، وێڕای هەموو گیروگرفتێکیش نهێنیی ئەو دانستە ئەزەلـی‌یەی خواوەند ئاشکرا بکەن کە لە چارەنووسی ئادەمیزاددا دەستنیشانی کردووە.

ئەمە نیوەی چیرۆکەکەمە..

نموونەیەك:

وا بەمەی خوارەوە نموونە لەسەر ئەو حاڵەتە ڕۆحی‌یەش دەهێنمەوە کـە هـانی هـەندێ کەس دەدات بڵێت:

(هەر تەنها خۆمم مەبەستە.. چیم لە خەڵکی داوە؟):

دوو کـەس ڕووبـەڕووی یـەك دەکەونـە گفتوگـۆ و شـانازی کـردن.. یـەکێکیان مەردێکی بەغیرەت و ئازایە، بـەڵام عەشـیرەتە ڕەسـەنەکەی مارانگـازی دەسـتی چـەرخی گەردوونە[1].. ئەوی تریان ترسنۆکە، بەڵام سەر بە عەشیرەتێکی ترە کـە بـەختی ڕۆژگـار بە دەمیەوە پێکەنیوە..

یەکەمیان هەر کە سەری بەرز دەکاتەوە و زەلیلیی عەشیرەتەکەی دەبینێـت، دەروون بەرزی‌یەکەی بەرگەی بینینی ئەو زەلیلی‌یە نـاگرێت و، لـە تـاوا سـەری نـەوی دەکـات. لەو کاتەدا کە بۆ دەروونی خۆی دەڕوانێت، دەبینێ تـا ڕادەیـەك عیززەت و سـەربەرزیی لـەخۆ گرتـووە. ئیـتر غرووره‌کەی، کـە بـە شمشـێری خۆویسـتیی زامـدار بـووە، هـاوار دەکـات و، دەڵێـت: مـن چیـم لـە عەشـیرەتەکەم داوە؟ ئـەوەتا خـۆم و کردەوەکـانم بـەو جۆرەن کە شانازی‌یان پێوە دەکەم. ئیتر لەو عەشیرەتە دەکشێتە دواوە، یان پـەیوەندی بـە عەشیرەتێکی تـرەوە دەکـات و، بـەم کـارەش دەری دەخـات کـە ڕەسـەنایەتیی خـۆی لەدەست داوە!

بەڵام ئەوی تریان، هەرکاتێ سەری بەرز بکاتەوە، شـانازی‌یەکانی عەشـیرەتەکەی بـە درەخشانی دەبینێت، ئیتر غرووری تێدا دەبووژێتەوە. بـەڵام هـەر هێنـدەی سـەیری خـودی خـۆی دەکـات، دەبینێـت لـە دەروونـەوە گـەلـێ لاوازە. ئـا لـەو کاتـەدا گیـانی خۆبەختکـردن و فیداکـاری لـە هەستی نەتـەوەیی ئـەودا بێـدار دەبێتـەوە و، دەڵـێ: بـە قوربانت بم عەشیرەتەکەم!

---

(١) بەو واتایەی کە: (الدنیا سجن المؤمن وجنة الکافر) مەجاز نی‌یە! (دانەر)

جا ئەگەر لەو هێمایە تێگەیشتوویت کە لە کاکڵەی ئەم نموونەیەدا هەیە، ئەوا بزانە کە ئەم جیهانە مەیدانی تاقیکردنە و تێکۆشان و پێشبڕکێیە..

گەر هەست و نەستەکانی هەریەك لە: موسڵمان و نەصرانی.. کورد و ڕۆمی، لەکاتی مونازەرەی لەمەڕ پەرۆشی و خەمیاندا بۆ نەتەوەکەیان بەرجەستە ببێت و بەرچاو بکەوێت، نهێنیی نموونەکەی تێدا دەبینیت. هەرگیز ئەو جیاوازییەی نێوانیان بەو جۆرە نییە کە خەڵکی گومان دەبەن.. نەخێر. لەوانەیە ئەو لێکدانەوەیەی ئەوان ئەنجامی ڕوانینی ڕواڵەتی و ڕووکەش و هەڵەی هەستیان بێت.

دەسا ئەی برای موسڵمان!

نەکەی بخەڵەتێی.. هەرگیز سەرت نەوی نەکەیت! چونکە پارچە ئەڵماسێکی نایاب هەرچەندەش ژەنگی لێ نیشتبێت لە پارچە شووشەیەك باشترە کە هەمیشە بریسکێتەوە. دڵنیابە کە لاوازیی ڕواڵەتیی ئیسلام هی خزمەتکردنی ئەم شارستانێتییەی ئێستایە لە پێناوی ئایینێکی تردا!

کەواتە ئێستا کاتی ئەوە هاتووە کە ئەم شارستانێتییە شێوە و ڕوخساری خۆی بگۆڕێت. دیارە ئەو کاتەش کێشەکە پێچەوانە دەبێتەوە.

وەك لە پێشەکییەکەدا وترا: لە هەر شوێنێکدا موسڵمان هەبێت، لەچاو نەصرانیدا دەشتەکییە و بێز لە وەرگرتنی شارستانێتی دەکاتەوە و بایەخی پێ نادات.

بەڵام گەر ئەم دیاردە و ڕوخسارە ئاڵوگۆڕی بەسەردا بێت، ئەم بارودۆخەش هەڵدەگەڕێتەوە!

خۆ هەر شتێکیش لە هاتندا بێت، دڵنیابە کە بە نزیك دادەنرێت: (كُلُّ آتٍ قريبٌ) و ﴿إنَّ معَ الْعُسْرِ يُسْراً﴾.

**سەعیدی نوورسی**

بەرهەمی حەوتەم:

# شەش هەنگاوەكان

بەدیعوززەمان

**سەعیدی نوورسی**

دایناوە

**فارووق ڕەسووڵ یەحیا**

كردوویە بە كوردی

## پێشەکیی وەرگێڕ

دوای هەڵهاتنی مامۆستا سەعیدی نوورسی لە دیلیی ڕووسەکان و گەیشتنەوەی بۆ ئەستەمبووڵ لە بەرواری ١٩١٨/٦/١٧زدا و، پاشان دامەزرانی بە ئەندام لە "دار الحكمـة الإسـلامية"دا لە ١٩١٨/٨/١٣دا، هەتا ڕۆشتنی بۆ ئەنقەرە لە بەرواری ١٩٢٢/١١/١٩زدا، هەر لە ئەستەمبووڵدا ماوەتەوە.

ئاشکرایە ئەم چەند ساڵەی ژیانی بەر قۆناغی کۆتایی جەنگی جیهانیی یەکەم و شکستی دەوڵەتی عوسمانی و هاوپەیمانەکانی لەو جەنگەدا دەکەوێت، کە ماوەیەکی ئەوتۆ بووە ئاڵوگۆڕی خێرا و تەپاوتلی زۆری لە دەوڵەتی عوسمانی و جیهانی ئیسلامیدا بەخۆیەوە بینیوە.

ئەوەبوو دوای شکستی دەوڵەتی عوسمانی و ناچار کردنی بەوەی کە هودنەی "موندرۆس" لە (١٩١٨/١٠/٣٠ز)دا ئیمزا بکات، دوای ئەوە و لە بەرواری (١٩١٩/١١/١٣ز)دا، بەپێی هودنەی ناوبراو، پەنجا و پێنج کەشتیی جەنگیی دەوڵەتانی هاوپەیمان خۆیان کرد بەناو ئەستەمبووڵدا، کە بیست و دوو دانەیان هی ئینگلتەرا و دوازدەیان هی فەرەنسا و حەڤدەیان هی ئیتالیا و چوار دانەشیان هی یۆنان بوون.

هاوکات لەگەڵ ئەم ڕووداوانەدا، چەند ژەنراڵێکی سوپا توانییان خۆیان بگەیەننە ئەنقەرە و ناوەڕاستی ئەنادۆڵ - کە داگیر نەکرابوو - تاکو سەرباز و کەرتەکانی سوپا و خۆبەخشەرانی گەل بۆ جیهاد لە پێناوی وەدەرنانی داگیرکەراندا کۆ بکەنەوە و، دوایی بە "سەرکردەکانی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی" ناسران و، کەوتنە چەندین جەنگەوە لەگەڵ داگیرکەراندا، کە ناوی "جەنگەکانی ڕزگاری"یان لێ نراوە.

موسڵمانان گەلێ داستانی قارەمانییان لەو جیهادانەدا تۆمار کرد، کە چەندین بەرگ کتێبیان لە لایەن کەسانی پسپۆڕەوە لەسەر نووسراوە و، بە چەند لاپەڕەیەکی پڕشنگدار و پڕ شانازی دادەنرێن لە تۆماری مێژووی موسڵمانانی هاوچەرخدا.

لەم بارودۆخەدا کە لە لایەکەوە جەنگی سەربەخۆیی دەست بەکارە و، لە لایەکی تریشەوە خەلیفە و پایتەختی خەلافەت لە ژێر لوولە تۆپەکانی داگیرکەراندان، مامۆستا نوورسی لەناو ئەستەمبوولدا دەژیا.

هاوپەیمانەکان، بە تایبەت ئینگلیز - وەك داب و نەریتی خۆیان - دەستیان دایە جەنگی دەروونی و بلاوکردنەوەی چەند پروپاگەندەیەکی تایبەتی لە ڕێی سیخوڕەکانیانەوە لەناو ئەستەمبوولدا، بە مەبەستی نەهێشتنی ورە و ڕووخاندنی گیانی بەرگری لەو گەلە موسڵمانەدا.

کاتێ مامۆستا نوورسی کاریگەریی ئەم بیرە ژەهراوییانەی لە ناوەندی گەلدا بینی، تەنانەت کە دوژمنان - بە تایبەت ئینگلیز - توانییان مەیلی هەندێ لە زانایان بە لای خۆیاندا ڕابکێشن، نامیلکەی "شەش هەنگاوەکان"(خطوات ستة)ی دانا، کە فرۆفێڵی داگیرکەرانی تێدا خستە ڕوو بۆ گەل و، سەرجەم شوبهە و وەسوەسە و پروپاگەندەکانی ئینگلیزیشی پێ پووچەڵ کردەوە، هەروەك لەم ڕێیەوە تەمومژی نائومێدیی لەسەر موسڵمانان ڕەواندەوە.

ئەمە پوختەیەك بوو لەبارەی ناوەرۆك و بارودۆخی دانانی پەیامی "شەش هەنگاوەکان"ەوە، کە لاپەڕەیەکی پرشنگداری جیهادی مامۆستا نوورسی دەنوێنێت لەو قۆناغەدا. بە پێویستم زانی خوێنەری بەڕێز لە پێش خوێندنەوەی پەیامەکەدا پێی ئاشنا ببێت، تاکو بە شارەزاییەوە بڕواتە ناو خوێندنەوەی خودی ئەو پەیامە.

ئەو دوو پێشەکییەی تر کە دوای ئەم چەند دێڕە خستوومانەتە بەردەستی خوێنەری بەڕێز، تیشکی زیاتر دەخەنە سەر هۆکاری دانانی ئەم پەیامە.

شایانی باسە ئێمە لە وەرگێڕانی پەیامەکەدا ئەو دەقە عەرەبییەمان کرد بە بناغەی کارەکەمان کە مامۆستا "ئیحسان قاسم صالحی" بلاوی کردووەتەوە و، لەو پێشەکییەدا زانیاریی لەبارەوە داوە کە بۆ ئەم پەیامەی نووسیوە. ئنجا دوای ئەوە هاتین لەگەڵ چاپە کۆنەکان و کتێبی (آثار بديعيـــة)دا بەراوردمان کرد و، لە ئەنجامدا ئەم دەقەی بەردەستی ئێوەی بەڕێزی لێ دەرچوو.

**فارووق ڕەسووڵ یەحیا**

## پێشەکیی قوتابیانی دانەر[1]

لە دەمی داگیرکردنی ئەستەمبووڵ لە نێوان ساڵانی ١٩٢٠-١٩٢٣دا لە لایەن ئینگلیزەوە، مامۆستا بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی ئەم بەرهەمەی کە ناوی "شەش هەنگاوەکان"ە، لە دژی داگیرکەران نووسیوە و، ئنجا بە نهێنی و دەستاودەست بڵاوکراوەتەوە.

هەروەها ئەم بەرهەمە بە زمانی عەرەبی لەگەڵ کتێبی "سنووحات"دا لە ساڵی ١٣٣٦ی ڕۆمی (واتە ١٣٣٨ی کۆچی و ١٩٢٠ی زایینی) لە چاپخانەی "ئەوقافی ئیسلامیە" لە ئەستەمبووڵ چاپکراوە و بڵاوکراوەتەوە.

نووسینی ئەم کتێبە بچووکە لەو ڕۆژگارە ترسناکەدا کە هێزەکانی دوژمنان لە هەر چوارلاوە "ئەنادۆڵ"یان داگیر کردبوو، ئاوێنەیەکی درەخشانە لە نێوان هەزاران چاکەی تابلێی گەورە و لە ناوەندی خزمەتە یەکجار بەرزەکانی مامۆستادا، کە بێ سڵەمینەوە و بە وێنەی قارەمانێك لە ڕێی زمانی چاپخانەکانەوە لە ڕووی داگیرکەراندا سەربەرزیی ئیسلام و غیرەتی ئیمانیی وەبیری خەڵکی هێناوەتەوە. کە ئەمەش لەو ڕۆژەدا وەك تف کردنێك وا بووە بە ڕووی ئەو داگیرکەرانەدا..

مامۆستا بەدیعوززەمان، پێش ئەوەی ئەم بەرهەمەی (شەش هەنگاوەکان) بنووسێت، وەك ئەفسەری تیپێکی سەربازیی خۆبەخش لەگەڵ قوتابییەکانیدا بەشداریی جەنگی جیهانی یەکەمی کردووە و، لە زنجیرە شەڕێکی قورسدا ڕووبەڕووی هێرشی ئەرمەنی و

(١) ئەم پێشەکییەی قوتابیانی دانەر لەگەڵ دەقی تورکیی پەیامەکەدا بڵاوکراوەتەوە. برای بەڕێزمان (دکتۆر دیدار کامەران) ئەرکی وەرگێڕانی لە تورکییەوە بۆ کوردی گرتە ئەستۆ. ئێمە تەنها پێداچوونەوەمان بە دارشتنەکەیدا کرد، جگە لەو دەقەی کە هی (پاشبەندەکان)ە و، لەوێ هێناومانە.

ڕووسەکان بووەتـەوە و، بەشێکی زۆر لـە قوتابیـانی شـەهید بـوون، خۆیشی دوای دوو ساڵ "دیلی" لە ڕووسیا، هەڵهات و گەڕایەوە.

ئنجا لەسەر داواکاریی سەرۆکایەتیی ئەرکانی سوپا بووە بە ئەندام لـە دەزگـای (دار الحكمة الإسلامية) لە ئەستەمبووڵ. ئیتر لەم ماوەیەدا سەرجەم پەیامـە عەرەبییـەکانی کـە دواتر لە "مەسنەویی نووری"دا کۆکرانەوە و، هەندێك لە تورکییەکانیشی وەك "چەند بریسکانەوەیەك" و "خالێك لە ناسینی خوای گەورە" چاپ کـرد. دوای ئەمانـە، پەیامی "شەش هەنگاوەکان"ی بە نهێنی لە دژی داگیرکەران لە چاپ دا و بڵاوی کردەوە.

دوای ئەو بەرهەمانە، مامۆستای دانەر "پەیامەکانی نـوور"ی نووسـی، کـە وانەیـەکی قورئانی حەکیمن بە گوێرەی تێگەیشتنی خەڵکی ئـەم سـەردەمە و، بـە بەڵگـەی عـەقڵی و مـەنتیقی "ڕاستییەکانی قورئـان" بـۆ خـەڵکی ئەنادۆڵ و، جیـهانی ئیسـلامی و، هـەموو مرۆڤایەتی دەسەلمێنن.

مامۆستا لە ساڵەکانی کۆتایی ژیانیدا هەندێ جار باسی ئەوەی دەکرد کە لە قۆنـاغی ژیـانی "سـەعیدی کـۆن"دا بـە تـەنیا خـۆی ڕووبـەڕووی چـوار ئەفسـەری ئـازا و تـووڕە بووەتەوە. ئەمەشی بە تایبەتی بۆ هەندێ لە فەرمانبەرانی دەوڵەت و نوێنەرانی میللەت لـە میوانـەکانی دەگێڕایـەوە، لـەو کاتانـەدا کـە چۆنێتیـی ئـەو خزمەتـە ئیجابییـەی بـۆ ڕوون دەکردنەوە کە پەیامەکانی نوور گرتوویانەتە ئەستۆ..

باسـکردنی ئـەو ئازایـەتی و بوێـری و غیرەتـەی ئـەو کاتەشـی بـە بەڵگـە دەهێنایـەوە و، بەراوردێکی پێ ساز دەکرد لە نێوان هەڵسـوکەوتی ئـەو کاتـەی و، لـە نێـوان خزمـەت و بڵاوکردنەوەی "پەیامەکانی نوور" لە کاتی ئێستایدا و، ئـەو جموجوڵـە ئیجابییـەش کـە لەگەڵ قوتابیانی نووردا ئەنجامیان داوە.

بۆ نموونە لە باسی: "دواهەمین وانە سەبارەت بە کـاری ئیجابیی بنیاتنـەر"دا، کـە دوا بەشی کتێبی "پاشبەندی ئەمیرداغ"ە، بە قوتابیانی دەڵێت:

(ئـەرکی سـەرشـانی ئێمـە کـاری ئیجـابیی بنیاتنـەرە، نـەك تـەقالای کـاری سـەلبیی ڕووخێنەر. هەروەها خزمەتکردنی ئیمانـە لـە بازنـەی ڕەزامـەندیی خـوای گـەورەدا، بێ ئەوەی خۆمان لە کارێکدا بسەپێنین کـە خـوای گـەورە خـۆی ئەنجامی دەدات. ئێمـە لـە

بەرامبەر هەر چەشنە تەنگانـە و گرفتێـك بێتـە ڕێمـان ئـەرکی خۆڕاگری و شـوکرانەمان خراوەتە ئەستۆ، ئەویش بە ئەنجامدانی ئەو خزمەتە ئیمانی‌یە بنیاتنەرەی کە پارێزگـاری لـە ئاسایش و ئارامی دەکات.

وا خۆم بە نموونە دەهێنمەوە:

هەر لـە مێژە هیـچ کـاتێك سـەرم بـۆ خۆسـەپاندنی هیـچ کەسێك نـەوی نـەکردووە. ئەمەش چەندین ڕووداوی زۆری ژیانم دەیسەلمێنن.

بۆ نموونە: هەڵنەسانم لەبەر سەرکردەی گشتیی ڕووس، هەروەها وەك ئەوەی کە هیچ بایەخێکم بە پرسیاری پاشا(جەنراڵ)کانی دیوانی دادگای سەربازی نەدا کـە هەڕەشـەی سێدارە و کوشتنیان لـێ دەکردم..

ئەم ڕەفتارەم بەرامبـەر هـەر چـوار سـەرکردەکە، ڕوونـی دەکاتـەوە کـە خۆسـەپاندنی هیچ کەسێکم پێ قبووڵ نەکراوە..

کـەچی وا مـاوەی سـێ سـاڵە بە ڕازی بوونـەوە ڕووبـەڕووی هـەموو ئـەو مـامەڵە نابەجێ و ناڕەوایانە بوومەتەوە کە لەم ماوەیەدا لەگەڵم کراوە، تـاکو هـەوڵ و تـەقالامان بۆ کاری ئیجابی بێت و، خۆمـان دوور بخەینـەوە لـە کـاری سـەلبی، بـۆ ئـەوەی خـۆم لـە ئیشێکدا هەڵنەقورتێنم کە هی خوای گەورە خۆیەتی. تەنانەت هـەموو مامەڵـە نابـەجێ و ناشیرینەکانی ئـەم ماوەیـەم بـە ڕازی بـوون و ئـارامگرتنێکی جوانـەوە پێشـوازیی لــێ کردووە، لەمـەشدا "جەرجیس پێغـەمبـەر، دروودی خـوای لەسـەر بێـت" و هـاوەڵە بەڕێزەکانم - خوایان لـی ڕازی بێت - داناوە بـە سەرمەشق و پێشـەنگی خـۆم. ئەوەبوو هاوەڵان لە جەنگی بەدر و ئوحوددا گەلـێ سەختی‌یان چەشت)[1].

هـەروەها لـە یـەکێك لـە نامـەکانی "پاشـبەندی ئـەمیرداغ"دا دەربـارەی "شـەش هەنگاوەکان" دەڵێت:

(دوێنێ بە فەرمانبەرێکی گرنگی دەوڵەتم وت، کە بە میوانی هاتبوو بۆ لام:

سێ ڕاستیی زۆر گرنگی سەرگوزەشتەی ژیانی سەعیدی کۆن هاتوونەتـەدی. دیـارە ئەمەش کەرامەتێکی "پەیامەکانی نوور"ە. کە ئەمانەن:

(١) پاشبەندەکان: ٦٠٤-٦٠٥

لە ڕووداوەکەی (٣١ی مارت) و لەو کاتەدا کە "مەحموود شەوکەت پاشا"ی سەرکردەی "سوپای بزووتنەوە" زۆر لە من توورە بوو.. هەروەها ئەو ڕۆژەش کە لە "دادگای عورفیی سەربازی"دا دادگاییان کردم و، پازدە پیاویش لە بەرامبەرمەوە لە سێدارە درابوون، "خورشید پاشا"ی سەرۆکی دادگای عورفی لێی پرسیم:

"تۆش داوای شەریعەتت کردووە؟ ئەمە ئەنجامی ئەو کەسانەیە کە شەریعەتیان دەوێت"!!

پێم وتن:

"ئەگەر هەزار گیانم هەبێت، ئامادەم لە پێناوی یەك دانە ڕاستیی شەریعەتدا هەموویان بەخت بکەم"!!

هەروەها لەو کاتەشدا کە - بە درۆ و بوختانی سیخوڕەکان - چەندین هۆکار هەبوو کە منی پێ تاوانبار بکەن، کەچی بە شێوەیەکی ناوازە بڕیاری بێ تاوانیی منیان دا..

هەروەها کە لە کۆتایی جەنگی یەکەمی جیهانیدا لە ئەستەمبووڵ کتێبی "شەش هەنگاوەکان"م دژی ئینگلیز نووسی..

هەروەها کە ئەو قسە سووکایەتی ئامێزانەشم لە دژی سەرۆکی قەشەکانیان کەوتە بەردەستی فەرماندەی گەورەی ئینگلیزەکان و، گریمانی لە سەدا سەد هەبوو لەناوم بەرێت، کەچی وازی لە ڕەفتاری لەو جۆرە هێنا و ڕقەکەی خۆی خواردەوە..

هەروەها لە ئەنقەرەش لە کاتێکدا کە لە دیوانی سەرۆکایەتی لەگەڵ چەند ئەندامێکی پەرلەماندا بووم، "مستەفا کەمال" بە توورەییەکی زۆرەوە خۆی کرد بە دیوانی سەرۆکایەتیدا و، لەناو هەموویاندا بەسەر مندا قیڕاندی و، وتی:

"ئێمە تۆمان بۆ ئێرە بانگهێشت کرد تاکو چەند بیر و بۆچوونێکی بەرز و دروستمان بدەیتێ، کەچی چەند شتێکت لەبارەی نوێژەوە نووسیوە و، بەمەش دووبەرەکیت خستە نێوانمانەوە".

منیش بەرامبەر بەو توورەبوونەی، وتم:

"ئەوەی نوێژ نەکات ناپاکە، کەسی ناپاکیش وەرنەگیراوە".
بەمەش بتێکی ترسناکم شکاند.

هەر لەو دەمەدا هاورێکانی ئەوێم مەترسییان لێ نیشت کە دەگوێجێ لەناوم بەرێت، بەڵام هەستکردنی "مستەفا کەمال" بە ڕاستی و هێزێکی گەورە و، کشانە دواوەی و، نواندنی مامەڵەیەکی تایبەت بەرامبەرم و، خواردنەوەی ڕقی خۆی لەو دانیشتنەدا..

جگە لەمەش، کە ڕۆژی دواتر لە ژووری تایبەتیی سەرۆکایەتیدا نزیکەی سەعاتێك باسی ئەو "یەکەم فرۆفیڵ"ەم بۆ کرد کە لە کتێبی "شەش هێرشەکان"دا ڕوون کراوەتەوە، هەر لە ڕستەی: (وا دابنێ مزگەوتی ئەیاسۆفیا پڕە لە کەسانی خاوێن و بەڕێزی ئەهلی فەزڵ... هتد) تا دەگاتە "فرۆفیڵی دووهەم"..

بەو کارەشم هەموو هەست و نەست و بنەماکانی ئەوم تێکشکاند. کەچی سەرباری ئەمەش، خراپەی لەگەڵ نەنواندم، تەنانەت هەوڵیشی دا دڵم ڕابگرێت..

دیارە ئەم سێ حاڵەتە سەیرەی ئەم سێ سەرکردە زۆردار و بەزەبر و زەنگە و، ترسانیان تا ڕادەیەك لە "سەعیدی کۆن"، بە دڵنیاییەوە کەرامەتێکی درەخشانی "پەیامەکانی نوور" و، هێزی کەسایەتیی مەعنەویی قوتابیی‌یە قارەمانەکانی ئەو پەیامانە بوون کە لە داهاتوودا دەرکەوتن).

* * *

یەکێکی تر لە گەورەترین و پڕ بایەخترین و کاریگەرترین چالاکی و خزمەتی نەتەوەیی و نیشتمانیی مامۆستا لە ئەستەمبوولدا بریتیی‌یە لە پەیامی "شەش هەنگاوەکان"، کە بەم بەرهەمە تفێك دەکاتە دەموچاوی داگیرکەرانی ستەمکار و، شەرەفی ئیسلامی و سەربەرزی ئایینی دەپارێزێت.

ئەوەش کە وەڵامی شەش پرسیارەکەی کەنیسەی ئەنگلیکانی ئینگلیزی - کە ئاراستەی "مەشیەخەتی ئیسلامی"ی کردبوو لە کاتی داگیرکردنی ئەستەمبوولدا - بە چەند وەڵامێکی سارد و ڕەق بە ناوی "شەش تف" دایەوە، پلەی بەرزی چاونەترسیی ئەو مامۆستایە و کەماڵات و ئازایەتیی‌یەکەی، بە کردار دەسەلمێنێت و پیشانی دەدات.

* * *

لەو کاتەدا کە ئینگلیزەکان لە ئەستەمبووڵ دەیانویست (شەیخولئیسلام) و چەند زانایەکی ئایینی دیکە لە دژی مامۆستا هان بدەن، مامۆستا بەدیعوززەمان بە چالاکی‌یەکانی ناو ئەستەمبوولی و، بە کتێبی "شەش هەنگاوەکان" سیاسەتی داگیرکاریی ئینگلیزەکان و فێڵ و تەڵەکەبازی و دوژمنایەتی‌یە مێژووییەکەی ئەوانی بەرامبەر جیهانی ئیسلامی، بە هەموو لایەکدا بڵاو کردەوە و، بوو بە پاڵپشتی جەنگی سەربەخۆیی نەتەوەیی لە ئەنادۆڵ و، لەم بوارەدا بە یەکێك لە چالاکترین کەسەکان دانرا.

وا ئێمەش بە وێنەی مێژوویەکی هەمیشە زیندوو ئەم بەرهەمە (شەش هەنگاوەکان) دەخەینەوە بەر دیدی خوێنەرانی، کە لە ڕووی قەبارەوە بچووکە، بەڵام لە ڕووی کات و شوێنی سەرهەڵدان و بڵاوبوونەوەیەوە زۆر گرنگە..

هەروەك لەو خاڵەشیدا زۆر گەورەیە کە سەربەرزیی مامۆستا بەدیعوززەمان پیشان دەدات لە ڕووی پارێزگاری کردنی نەتەوە و نیشتمانی ئیسلام و، هەوڵدانی بۆ سەربەخۆیی و سەربەرزیی داهاتووی موسڵمانان.

ئەو قوتابیانەی

کە لە خزمەتیدا بوون

## پوختە باسێك لەسەر مێژووی دانانی ئەم پەیامە

(پێشەکیی وەرگێڕانە عەرەبی‌یەکە)

به پێنووسی مامۆستا

**ئیحسان قاسم صالحی**

کاتێك کە لـە چـەندین شـەڕی دژواردا جـەنگ بـە گـەرمی بـەردەوام بـوو، هـەروەها خوێنـی هـەزاران موسـڵمان لـە پێنـاوی بـەرگری لـە ئەستەمبووڵی مەڵبەندی خەلافـەتدا دەڕژا، هاوپەیمانـەکان بـە تایبـەت ئینگلـیز دەسـتیان دایـە جـەنگێکی دەروونـی و بڵاوکردنەوەی چەند بیروبۆچوونێکی سەرلێشێوێن سەبارەت بە بیر و باوەڕی نەتەوە. ئیتر هاوکـار و سیخورەکانیان بـە هـەموو شـوێنێکی ئەستەمبووڵدا بڵاوبوونـەوە و ئـەو گومانە ڕقاویانـەیان لـە نـاوەندە گشتی و تایبەتی‌یەکاندا و بـەپێی جەنگێکی دەروونیـی ئامانجدار بڵاودەکردەوە کە مەبەستی شکاندنی ورەی موسڵمانان بوو.

کاتێك مامۆستا نوورسی جێدەستی بیرە ژەهراوی‌یەکانی ئەم جەنگـە فێڵبـازەی بینـی کە لە ڕادەیەکدا بوو توانیبووی هەندێ لە زانایـان بـۆ ڕیـزی ئینگلیزەکـان ڕابکێشـێت، ئەم پەیامەی دانا کە فرتوفێڵی داگیرکەرانی تێدا ئاشکرا دەکات و، گومـان و وەسوەسـە شەیتانی‌یەکانیان پووچەڵ دەکاتەوە و هەستی نائومێدی لە موسڵمانان دوور دەخاتەوە.

پەیامەکە بـە نـهێنی و بـە بێ نـاوی چاپخانـە و سـاڵی لـە چاپدانی چـاپ کـرا. ئنجـا خۆشەویستان و قوتابییانی مامۆستا، بەوپەڕی نهێنی و لـە ڕووبـەرێکی فراوانـدا، بڵاویـان کردەوە.

با ئێستا زۆر بە خێرایی بڕوانینـە بـارودۆخی نووسـین و بڵاوبوونـەوەی ئـەم پەیامـە و، مەودای کاریگەریی لەو بارودۆخەدا:

لە بەرواری ١٣/١١/١٩١٩زدا و بە پێی "پەیمانی مۆنـدرۆس" پەنجا و پێنج کەشتیی (جەنگیی) دەوڵەتانی هاوپەیمان خۆیـان کـرد بەناو ئەستەمبووڵدا و، لـە دەریـای بسفۆر بەرامبەر کۆشکی "دۆڵمە باخچە" لوولـەی تۆپەکانیان ئاراستەی کۆشـکی خەلیفـە "سولتان وەحیدەدین" کرد کە وەکو دیلێکی لـێ هاتبوو..

بەم جۆرە، سەربازانی چوار دەوڵەتی داگیرکەر ڕۆشتنە ناو ئەستەمبووڵەوە.

لەم کاتەدا کەمایەتی‌یە ناموسڵمانەکان بە چەپڵەڕێزانەوە پێشوازییان لە داگیرکـەران دەکرد. ئەوە بوو "جولەکە" و "ئەرمـەن" بـەناو شـەقامەکاندا دەگـەڕان و بـە شـەپقەکانی سـەریان ئامـاژەی بـەخێرهاتنیان لـێ دەکـردن و گـوڵیـان بەسـەردا دەبـاراندن.

"ڕۆمەکان"یش ئاڵای بچووك بچووکی یۆنانیان هەڵدەبڕی و هاواریان دەکرد:

زیتۆ.. زیتۆ.

واتە: بژی..بژی!

لـە نـاوەندی خۆشـحاڵیی جوولەکە و ئەرمەن و ڕۆمـەکان و، هـاوار و چەپڵـەیاندا، ژەنەڕاڵ "فەرانس دۆپەر"ی سەرکردەی فەڕەنسی بـەناو شـەقامی "بەگ ئۆغلـوو"دا بە سواری ئەسپێکی سپی بەرەو سـەفارەتی فەرەنسـا دەڕۆشـت و، وەك لاسـایی کردنـەوەی فاتیحە مەزنەکانی مێژوو دەستەکانی بۆ ئەو پێشوازیکارانە بەرز دەکردەوە!

بـەڵام موسـڵمانەکان بـە دڵـی بیمـار و چـاوی پڕ لـە فرمێسـکەوە بۆ ئەو دیمەنانـەیان دەڕوانی و، ئازارەکانیان لە توێی دڵیاندا دەپێچایەوە.

ئنجـا وەنـەبێ ئەستەمبووڵ تاقانـە شـار بووبێـت کـە دەوڵـەتانی هاوپـەیمان داگیریـان کردبێـت، بـەڵکو چـەندین شـاری زۆری تـر لــە لایـەن ئەرمـەن و ئیتالیـا و ئینگلـیز و ڕووسەوە داگیر کرابوون، چونکە بە پێـی پەیمانی نـاوبراو سـوپای عوسمـانی لـە خزمـەتی سـەربازی تەسریح کـرا بـوو ، تەنـها ئەنادۆڵ (ناوەڕاسـتی تورکیـا) مـابوو کـە داگـیر نەکرابێت.

بـەم جـۆرە.. شـەقامەکانی ئـەو شـارانە پـڕ بووبـوون لــە سـەربازی سەرخۆشـی داگیرکـەران، کـە بـە ئـارەزووی خۆیـان ڕەفتـاری نەشیاویان دەنوانـد و هـەراوهوریایان دەنایـەوە. گەڕەکـە موسـڵمان نشـینەکانیش خـەمێکی کـش و مـات بـاڵی بەسـەردا کێشابوون.

لەم کەشە تاریکەدا مامۆستا نوورسی هەستی بە خەم و خەفەتێکی قووڵ دەکرد. هاوڕێیانی تێدەکۆشان دڵی بدەنەوە و سەختی ئازارەکانی لەسەر شان کەم بکەنەوە. بەڵام ئەو بە خەفەتێکەوە - کە دڵی دەگووشی - وەڵامی دەدانەوە:

"من دەتوانم ئازارە کەسی‌یەکانی خۆم بخۆمەوە و دان بە خۆدا بگرم. بەڵام ئازاری نەتەوەی ئیسلام هێندە منی هاڕیوە کە وا هەست دەکەم ئەو چەپۆکانەی لە جیهانی ئیسلامی وەشێنران لە پێشدا بە وێنەی خەنجەرێك بە دڵی مندا کراون، لەبەر ئەوەیە کە وا بە دڵشکاوی دەمبینن. بەڵام نوورێك دەبینم بەڕێوەیە کە - پشت بە خوا - دێت و ئەم ئازارانەمان لە بیر دەباتەوە".

کاتێ سەرکردەی سوپای ئینگلیز هاتە ناو ئەستەمبوولەوە، نامیلکەی "شەش هەنگاوەکان"ی درایە دەست کە هێرشیان تێدا دەکاتە سەر و، پەردە لە ڕووی درۆ و دەلەسەکانیان هەڵدەداتەوە و وورەی موسڵمانان بەرز دەکاتەوە. هەروەك چالاکی‌یە سەرومڕەکانی "بەدیعوززەزمان"یان پێش چاو خست لە ڕووی ئابڕووبردنی سیاسەتی ئینگلیز و هاندانی خەڵکی لە دژیان.

ئەو سەرکردەیە بڕیاری گرتن و لە سێدارەدانی مامۆستا نوورسیی دا. بەڵام کاتێ ئاگادار کرایەوە لەوەی کە ئەم بڕیارە پڕ ڕق و قینی گەلیان لە دژ دەورووژێنێت، ئەوا لە بڕیاری لەسێدارەدانی پاشگەز بووەوە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا هەر بۆ مەبەستی گرتنی بە دوایدا دەگەڕان.

(بەڵام خوای گەورە پاراستی و نەیخستە بەردەستی ئەوان).

کاتێ سەرکردەکانی "بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی" لە ئەنقەرە کاریگەریی ئەم پەیامەیان لە ناوەندە گشتی و تایبەتەکاندا بیست و، جیهاد و کۆششی "بەدیعوززەزمان"یان لە دژی داگیرکەرانی ئەستەمبووڵ بەرگوێ کەوتەوە، بە مەبەستی ڕێزنان لە پاڵەوانێتی و جیهاد و خزمەتگوزاری‌یە مەزنەکانی لە پێناوی وڵات و گەلدا، دوو جار بانگهێشتیان کرد بۆ ئەنقەرە، بەڵام مامۆستا لەو دەمەدا بەدەم داواکاری‌یەکەیانەوە نەڕۆشت و، وتی:

"من دەمەوێ لە ترسناکترین شوێندا جیهاد بکەم، نەك لە پشتی سەنگەرەکانەوە. پێم وایە شوێنەکەی ئێرەم لە چاو ئەنادۆڵ گەلێ ترسناکترە"!

مامۆستا نوورسی ئەم پەیامەی بە تورکی نوسیوە و، وەك پێشتر وتمان ئاماژەی بە ناوی چاپخانە و ساڵی چاپی نەداوە.

ئنجا هەر بۆ خۆی وەریگێڕاوە بۆ عەرەبی و، ساڵی ١٣٣٦ی کۆچی (١٣٣٨ی ڕۆمی) لە چاپخانەی "ئەوقافی ئیسلامیە"ی ئەستەمبووڵ لە کتێبێکدا چاپی کردووە کە هەردوو پەیامی (وتاری شام) و (سنووحات)یشی لەخۆ گرتووە.

پاشان قوتابیانی نوور لە ساڵی (١٩٥٨ز)دا لە چاپخانەی "نوور"ی ئەنقەرە سەرلەنوێ لە چاپیان داوەتەوە.

هەردوو چاپەکە پڕن لە هەڵەی ڕێنووس و چاپ.

منیش کە لە لایەنی خۆمەوە هەردوو دەقە تورکی و عەرەبییەکەم بەرامبەری یەکتر کردەوە، بینیم دەقە تورکییەکە لەچاو عەرەبییەکەدا ڕوونترە و، هەندێ شتی کەمیشی لەو زیاترە. ئیتر هاتم لە هەردووکیان ئەم دەقەم ئامادە کرد، کە واتای تەواوی دەقە تورکییەکەی لەخۆ گرتووە و، دارشتنەوەشی وەختە لەگەڵ دەقە عەرەبییەکەدا یەکاویەك بێت.

لە خوای گەورە داواکارین کە نیازی جوان و، تێگەیشتنی ڕاست و، ڕاستیمان لە گوفتار و کرداردا پێ ببەخشێت.

وصل اللهم علی سیدنا محمد وعلی آله وصحبه وسلم أجمعین.

**ئیحسان قاسم صاڵحی**

# شەش هەنگاوەکان

أعوذ بالله من الشيطان الرجيم

﴿وَلا تَتَّبِعُوا خُطُواتِ الشَّيْطانِ﴾ (البقرة:١٦٨)

بزانە:

هەموو زەمان و ڕۆژگارێك شەیتانێکی ئینسی تێدایە کە وەکیلـی خـودی شـەیتانە و، شێوەی مرۆڤێکی "تاك" یان گیانی "کۆمەڵ"ێکی پۆشیوە.

"عەزازیل"ی[١] ئەم زەمان و ڕۆژگارەی ئێمەش، بریتییە لەو گیانە غەددارەی کـە لـە ڕێـی سیاسـەتە فێڵبـاز و لەخشتەبەرەکەیەوە، فەسـاد و خراپکـاریی لـە هــەموو گۆشـە و لایەکی گێتیـدا بڵاوکـــردووەتەوە و، بـە "شـــەش هــەنگاو"یـش جیهـــانی ئیســـلامی تێکـدەدات و پشێوی و خراپکاریی تێدا بڵاو دەکاتەوە..

چونکە لە ناوەندی تاك و کۆمەڵەکاندا بە دوای سـەرچاوە پیسـەکاندا دەگـەڕێت و، بۆ ئامانجەکانی خۆی بەکاریان دەهێنێت..

هــەروەها لــەناو سروشتەکانیشــدا چــاو بــۆ کـــانزا زیانبەخشــەکان دەگــێڕێت و دەریاندەهێنێت، ئنجا لە ڕێی وەسوەسـەی کردارەوە (واتـە بـەهۆی پروپاگەندەکانیـەوە) لە بەرژەوەندییەکانی خۆیدا دەیانخاتەکار..

---

(١) عەزازیل: ناوی شەیتانە. (وەرگێڕ)

هەروەها بە شێوازێکی زۆر زیرەکانەش ئەو ڕەگ و دەمارە لاوازانەی دەروونەکانیش دەدۆزێتەوە کە توانای بەرگری‌یان نی‌یە، پاشان دەچێ بۆ مەبەستی فەساد و خراپکاری‌یەکانی خۆی دەیانبزوێنێت!

ئەوەتا لە لای هەندێك هەڵپەی "تۆڵەسەندنەوە" بەکاردەهێنێت و..

لە لای هەندێکی دیکە هەڵپەی "پلە و مەنسەب" دەبزوێنێت و..

لای هەندێکی تریش هەستی "تەماع" دەوروژێنێت و..

لە هەندێ کەسیشدا "گەوجی و گەلحۆیی" و..

لە هەندێکی دیکەشدا "ئیلحاد" دەدۆزێتەوە ... هتد..

لەمانەش سەیرتر ئەوەیە کە لە هەندێ کەسی تردا "دەمارگیری" دەقۆزێتەوە!

ئیتر هەموو یەکێکی ئەم شتانە وەك هۆکارێك بۆ پیادە کردنی سیاسەتەکانی خۆی بەکاردەهێنێت!

## هەنگاوی یەکەم

ئەو شەیتانە لەعنەتی‌یە، چ خۆی و چ لە ڕێی هۆکارەکانیەوە، واتە یان بە قسەی ڕاشکاوی خۆی یان بەوەی کەسانی تر بخاتە گوفتار و قسەی ئەم دووپات بکەنەوە، دەڵێت:

(ئێوە خۆتان دان بەوەدا دەنێن کە شایانی ئەم گرفتەن. خۆ دیارە قەدەری خواوەندیش دادگەرە و، هەرگیز ستەم ناکات..

کەواتە بەو ڕەفتار و مامەڵەیەی من لەگەڵتان دەیکەم ڕازی بن، چونکە من هۆکارێکم بۆ هاتنەدیی ئەو شایستەییەی خۆتان)!

ئێمەش بەرپەرچی ئەم وەسوەسە و شوبهەیەی دەدەینەوە و دەڵێین:

"قەدەر"ی خوای گەورە کاتێ کە گیرۆدەی موسیبەتێکمان دەکات، لەبەر ملنەدان و سەرپێچیمانە لە فەرمانەکانی خواوەند.

جا ڕازی بوون بە تەقدیر و نەخشەی قەدەری خواوەند – لە ڕاستیدا – تۆبەکردنە لەو گوناهانەی کە هۆی سەرهەڵدانی ئەو گرفت و موسیبەتەن.

بەلآم تۆی هۆکاری لەعنەتی، لەبەر ئەوەی کە موسلمانین و لەسەر "ئیسلامەتی"یەکەمانە ئێمەت گیرۆدەی ستەمی خۆت کردووە و دەکەیت، نەك لەسەر گوناهـ و سەرپێچی‌یەکانمان لە بەرامبەر خواوەندەوە..

کەواتە ڕازی بوون بەو کارانەی کە تۆ ئەنجامیان دەدەیت و گوێڕایەڵی کردنی سەربەستانەمان بۆ فەرمانەکانت، لە ڕاستیدا پەشیمان بوونەوەیە – پەنا بە خوا – لە ئایینی ئیسلام و پشت هەڵکردن و هەڵگەڕانەوەیە لێی!

بەڵێ، دەگونجێ تەنها یەك شت دوو ڕووی تێدا بێت..

واتە لە ڕووی "قەدەر"ەوە موسیبەتێکی دادگەرانە بێت. چونکە ئەنجامی هۆکارێکی پەنهانی وەك خراپە و گوناهەکانمانە و، قەدەری خواوەندیش لەبەر ئەوە مرۆڤیان پێوە گیرۆدە دەکات تاکو دوورەپەرێزی لەو خراپکاری و گوناهانە بکات..

جا ڕازی بوون بەم موسیبەتە – لەم ڕووەوە – پەشیمانیی مرۆڤی لەخۆ گرتووە بەرامبەر بەو گوناهانە.

هەر هەمان شت کە لە ڕووی "لایەنی مرۆڤ"ەوە دێت و ئاراستەی خەڵکی دەکرێت، ستەمی تێدایە..

چونکە هۆی ئەو ستەمە – لای ستەمکارەکە – ئەوە نی‌یە کە ئێمە گوناهبار بین، بەڵکو ئەوەیە کە موسڵمانین!

کەواتە ڕازی بوون بەم ستەمە، لەم ڕووەوە، گەورەترینی تاوانەکانە.

## هەنگاوی دووهەم

ئەو شەیتانە، چ بۆخۆی و چ لە ڕێی هۆکارەکانیەوە، ئەم وەسوەسەیە بڵاودەکاتەوە و دەڵێت:

(ئێوە لەگەڵ کافری وەك مندا ڕێککەوتوون[1].. ئیتر بۆچی لە دۆستایەتی و لایەنگیریی من دوورەپەرێزی دەنوێنن)؟

---

(١) مەبەست ئەڵمانی‌یەکانە کە لە جەنگی جیهانیی یەکەمدا هاوپەیمانی دەوڵەتی عوسمانی بوون. (وەرگێڕ)

لە بەرپەرچی ئەم وەسوەسەیەدا دەڵێین:

ئێمە "دەستی یارمەتی"مان پێ قبوڵـە. بەڵام هەرگیز "دەستی دوژمنایەتی" ماچ ناکەین و، ئەم دەستە لەوی تر ناچێت و، بە یەك چاو سەیریان ناکەین..

چونکە هەموو سیفەتەکانی مرۆڤی "کافر" وەك خۆی کافر نین، یان لە کوفرەکەیەوە سەرچاوەیان نەگرتووە..

بۆیە هیچ ڕێگرێك نی‌یە بۆ تەوقە کردن لەگەڵ دەستی کافرێکدا کە بۆ "یارمەتی"ی ئیسلام درێژی کردبێت، لە پێناوی دوورخستنەوەی دوژمنی دەستدرێژکەر و دێرینەی ئیسلامدا. تەنانەت قبووڵ کردنی ئەم دەستی یارمەتی‌یە بە خزمەتی ئیسلام دادەنرێت..

بەڵام تۆی کافری لەعنەتی، ئەو دەستی دوژمنایەتی‌یە درێژ دەکەیت کە لە دژایەتی کردنی موسڵمانان ڕاناوەستێت و، دەتەوێت بە دڵسۆزی ئەو دەستە ماچ بکەین.

بەڵام ئێمە باش دەزانین کە دەستدان لێی - چ جای ماچکردنی - تاوان و دوژمنایەتی‌یە بەرامبەر بە ئایینی ئیسلام!

## هەنگاوی سێ‌هەم

ئەو شەیتانە، چ خودی خۆی و چ لە ڕێی هۆکارەکانیەوە، ئەم وەسوەسەیە بڵاودەکاتەوە و، دەڵێت:

(ئەوانەی کە تا ئێستا کارگێری و فەرمانڕەوایەتیی ئێوەیان لە ئەستۆدا بووە، هەموو مافەکانتانیان ژێر پێ خستووە و، ئێوەیان لەناو داوە و، ستەمیان لێ کردوون. کەواتە ئێوە شایانی بەڕێوەبردنی کاروباری خۆتان نین..

لەبەر ئەوە، من بە "وەصی" و دەمڕاستی خۆتان دابنێن و، بە حوکم و فەرمانم ڕازی بن، تا کاروبارتان بەڕێوە ببەم)!

لە بەرپەرچی ئەم شوبهە و وەسوەسەیەشدا دەڵێین:

ئەی شەیتانی خەنناس!

هەر تەنها تۆ هۆکاری سەرەکیی ئەو تاوان وخراپکاری‌یانەیت کە سەرکردە و کاربەدەستانمان دووچاری بوون..

چونکە هەر تۆ ئەم دنیا فراوانەت لێ هێنانەوە یەك و، لە هەموو هەل و دەرفەتێکدا ڕێی ژیانت لێ بڕین و، منالە ناشەرعی‌یەکانی خۆت لەناو ئەواندا بڵاوکردەوە و، ناچارت کردن کە لەبەر دنیا دەست لە ئایینەکەیان بشۆن، چونکە شارستانێتی‌یەکت لێ مارە بڕیون کە مارەییەکەی تەنها لە ئایینەکەیان وەردەگریت و، کە دەبیتە کاربەدەست ئایینەکەیان بە بەرتیل لێ دەسێنیت!

لەگەڵ ئەوەشدا، گەر ئێمە لە بریی ئەوان تۆ بکەین بە کاربەدەست و فەرمانڕەوای خۆمان، ئەوا وەك ئەو کەسەمان لێ دێت کە پۆشاکەکانی ئاوی پیسی بەرکەوتبێت و لە نوێژ چووبێت، کەچی بە میزی بەراز شوێنەکەی بشوات!

تۆ تەنها ژیانێکی ئاژەڵانەی نزم و کاتی بۆ ئێمە دەهێڵیتەوە و، ژیانی ئینسانی و ئیسلامیمان تێدا دەمرێنیت.

بەڵام ئێمە – بە کوێرایی چاوی تۆ – هەر بە ژیانی ئیسلامەتی و شەرەفی مرۆڤایەتی دەژیین!

## هەنگاوی چوارەم

ئەو شەیتانە، چ خودی خۆی و چ لە ڕێی هۆکارەکانیەوە، ئەم وەسوەسەیە بڵاودەکاتەوە و، دەڵێت:

(کاربەدەستەکانتان کە لە ئەنادۆڵدا دژایەتیم دەکەن[1]، نیازیان خاوێن نی‌یە و، ئامانجی ئەوان جیاوازە لە ئامانجە ئیسلامی‌یەکانی ئێوە).

لە بەرپەرچی ئەم وەسوەسەیەشدا دەڵێین:

ئەوان "هۆکار"ن بۆ هاتنەدیی ئامانجەکان. خۆ کاریگەریی "نیازەکان"یش لە هۆکارەکاندا ئاسەوارێکی کەمی هەیە و، ئەو نیازانەی ئەوان – هەرچی‌یەك بێت – حەقیقەتی ئامانجەکانی ئێمە ناگۆڕێت. چونکە هاتنەدیی ئەو ئامانجانە بەندە بە بوونی هۆکارەکانیانەوە، نەك بەو نیازەی کە لە دڵی هۆکارەکاندایە!

---

(١) مەبەست سەرکردەکانی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازە کە گەلانی تورکیایان کۆکردەوە و ڕێکیان خستن بۆ وەدەرنانی داگیرکەرانی وڵات. (وەرگێڕ)

بۆ نموونە:

گەر من بە مەبەستی دەرهێنانی "ئاو" یان دۆزینەوەی "گەنجینەیەك" زەوییەك هەڵبكەنم و، لەم كاتەدا كەسێكیش بە نیازی "خۆحەشاردان" لەو چاڵەدا یان بە نیازی "شاردنەوەی شتێك" هات و یارمەتیی هەڵكەندنی چاڵەكەی دام، ئەوا ئەم نیازەی ئەو هەرگیز ڕێ لە دۆزینەوەی ئاوەكە یان گەنجینەكە ناگرێت، چونكە دەرهێنانی ئەو ئاوە بەندە بە كرداری "هەڵكەندن"ەوە، نەك بە نیاز و دڵ و دەروونی ئەو كەسەوە كە هەڵی دەكەنێت!

بەڵێ، ئامانجی ئەوانەی كە دوژمنایەتیت دەكەن:

ئاراستە كردنی موسڵمانانە بۆ كەعبە، نەك بۆ خۆرئاوا..

هەروەها پارێزگاریی پلەوپایەی بەرزی قورئانی پیرۆزە كە ئەو كتێبە مەزنەیە فەرمان بە بەرزكردنەوەی وشەی "الله" دەدات لە ڕێی پارێزگاری كردنی عیززەتی ئیسلامەوە.

كەواتە ئەوان دوژمنایەتیی ئەوروپایان لە جێی خۆشویستنیدا داناوە، كە بناغەی هەموو قەیران و كێشە و بەدڕەوشتیيەكمانە..

لەبەر ئەوە، نیازی ئەوان هەرچی و هەرچۆنێك بێت، هەر ڕاستیی ئەم ئامانجە ناوبراوانە ناگۆڕێت!

## هەنگاوی پێنجەم

ئەو شەیتانە، چ بۆ خۆی و چ لە ڕێی هۆكارەكانیەوە، دەڵێت:

(ئیمام – واتە خەلیفە – پشتگیریی سیاسەتمان دەكات و، مەیلی بەلای خۆشویستنی ئێمەدا هەیە. خۆ دیارە ئێوەش دەبێ ملكەچ و گوێڕایەڵی فەرمانی ئەو بن)!

لە بەرپەرچی ئەم وەسوەسەیەشدا دەڵێین:

مەیلی هەر مرۆڤێك و فەرمانە تایبەتیيەكەی و بیر و بۆچوونی زاتیی خۆی، تەواو جیاوازە لەو مەیلەی كە لە كەسێتیی مەعنەویی فەرمانی ئەو ئەمیندارەی نەتەوەی ئیسلامەوە سەرچاوەی گرتووە كە ئەمانەتی پێشەوایەتی و خەلافەتی لە ئەستۆدایە..

چونکە ئەم ویست و ئیرادەیە لە "عەقڵ"ێکەوە سەرچاوە دەگرێت و.. پاڵ بە "هێز"ێکەوە دەدات و.. ڕوویشی لە "بەرژەوەندی"ی جیهانی ئیسلامی‌یە..

ئەو عەقڵ و ژیری‌یەش بریتی‌یە لە "شووڕای نەتەوەی ئیسلام" نەك شوبهە و وەسوەسەی تۆ!

هێزەکەشی "سوپا"ی چەکدار و "نەتەوە" ئازادەکەیەتی، نەك چەك و قەمە و نێزەی تۆ!

بەرژەوەندیش لە بازنە ئیسلامی‌یەکەوە ڕوو دەکاتە چەق و مەڵبەند و، سوودی گەورە و مەزنی موسڵمانان پێش دەخرێ بەسەر بەرژەوەندی‌یە کەسی‌یەکاندا..

دەنا گەر ئەمە پێچەوانە ببێتەوە و لە کاتی تەعاروزدا بەرژەوەندی‌یە نزیکەکە بەسەر بەرژەوەندی‌یە هەرە مەزنەکەدا پێش بخرێت، وەك تەرجیحدانی تەختی پادشایی بەسەر ئەستەمبووڵدا و، ئەویش بەسەر ئەنادۆڵدا و، ئەویش بەسەر دەوڵەتدا و، ئنجا "جیهانی ئیسلامی"ش لە پێناوی دەوڵەتدا بەخت بکرێت، ئەوا هەرگیز گوێڕایەڵیی ئەم تەرجیحدانە ناکرێت..

دیارە کاری وایش هەر لە ئارادا نی‌یە.

خۆ ئەگەر سوڵتان "وەحیدەدین" – کە پادشایەکی دیندارە – لە ڕێ بترازێت و ببێت بە فاجرترین کەس و خراپترین مرۆڤ، هێشتا هەر بە ویست و ئیرادەی خۆی کاری وا ئەنجام نادات. تەنها لەبەر یەك "هۆ" کە بریتی‌یە لەوەی ناوی "خەلیفە"ی هەڵگرتووە!

جا ئەگەر کاری وا ئەنجام بدات ئەوا دیارە بە زۆرەملی و تۆپزی پێی کراوە.

دیارە گوێڕایەڵی کردنی خەلیفە لەو جۆرە کاتانەدا بەوە دەبێت کە گوێڕایەڵیی بۆ نەکرێت!

## هەنگاوی شەشەم

ئەو شەیتانە لە وەسوەسەکانیدا دەڵێت:

(بەرگری‌یەکانتان بێهوودەیە و بە دەستی خۆتان دەچن خۆتان دووچاری کێشە و گرفت دەکەن. چونکە ئێوە لە کوێ بە تەنها خۆتان کارێکتان پێ ئەنجام دەدرێت کە لەگەڵ هاوپەیمانەکانیشتاندا نەتانتوانی ئەنجامی بدەن)؟

لە بەرپەرچی ئەم وەسوەسەیەدا دەڵێین:

ئەو هێزە گەورەیەت کە دوژمنایەتیی ئێمەی پێ دەکەیت، تەنها لەسەر دوو قاچی لەرزۆکی "فێڵ" و "خراپکاری" خۆی ڕاگرتووە..

بۆیە ئێمەش لەبەر سێ "هۆ" دووچاری نائومێدی نابین:

*یەکەم:*

فێڵ و خراپکارییەکانت کاتێك کاریگەرییان دەبێت کە لە پشت پەردەی پەنهانی و بێ ئاگایی خەڵکیدا خۆیان بشارنەوە. بەڵام گەر ئاشکرا بن، ئەوا ڕوو بەڕووی نابووتی دەبنەوە و هێزەکەشیان لەدەست دەدەن.

خۆ ئەوەتا بە ڕادەیەکی وا پەردەیان لەسەر لادراوە و دڕاوە کە درۆ و دەلەسە و وڕێنە و خراپکارییەکانت بوون بە مایەی پێکەنین و گاڵتەجاڕیی خەڵکی و، کارێکی نەزۆکی بێ ئەنجام!

*دووەم:*

هێزە بێ پێز و لاواز و کرمۆڵەکەشت، کە دژایەتیی ئێمەی پێ دەکەیت، هەرگیز بێ دوژمن نییە. بەڵکو چەندین دوژمنی ئەوتۆی لە بەرامبەرەوەیە کە بە هیچ جۆرێك ڕازی نابن لەگەڵ تۆدا یەکبگرن و ڕێك بکەون. کە ئەمەش کارێك دەکات بەسەر هێزەکەتدا زاڵ ببێت و لەسەدا نەوەدی بێ سوود و ئاکام بهێڵێتەوە و لەکاری بخات..

ئنجا پاشماوەی ئەو هێزەت ناتوانێت – بە وێنەی ڕابوردوو – ئەو ستەم و ئیستیبدادانە بە بەردەوامی لەسەر جیهانی ئیسلام بهێڵێتەوە و، بوار بە کەس نەدات دەم بکاتەوە و، بە کۆت و پێوەندی دیلی بیانبەستێتەوە و، وزە و جووڵەیان لێ ببڕێت. ئەو جیهانی ئیسلامەی کە هەموو بەشەکانی چ لەم دەردە و چ لە دەرمانەکانیشیدا بەشدار و هاوبەشی یەکترین..

ئەم گریمانە گەلێ دوورە..

خۆ ئەگەر لەو باوەڕەدا بیت کە ئەم گریمانە ڕوو بدات، ئەوا لەگەڵ ئەوەشدا کە شەیتانێکی فێڵباز و چەپەڵیت، دەری دەخەیت کە لە وڵاخ نزمتر و لە کەریش گەوج و نەفامتریت.

سێهەم:

ئەگەر هیچ چارەیەکمان نەبێت جگە لەوەی کە بە دەستی تۆ بمرین، ئەوا مردنی عیززەت و سەربەرزی بۆ ئێمە ژیانە و، ژیانی زەلیلی و ڕسواییش بۆ ئێمە مردنە.

چونکە "مردن" بە دوو جۆر و شێوەیە:

یەکەمیان:

تەسلیم بوون و خۆزەلیل کردن لە بەرپێی تۆدا..

دیارە لەو حاڵەدا بە دەستی خۆمان گیان و ویژدانی خۆمان دەکوژین و لەناوی دەبەین، ئنجا دوژمن دێت جەستەشمان دەکوژێت و لەناوی دەبات. وەك بڵێی کوشتنەکەی دەستی دوژمن تۆڵەیەکی خوایی بێت لەسەر ئەوەی کە بە دەستی خۆمان گیان و ویژدانی خۆمان کوشتووە!

جۆری دووهەم:

ئەوەیە کە مرۆڤ ویژدانی خۆی بپارێزێت و بەرەنگاری دوژمنەکەی ببێتەوە و تف لە ڕووی بکات و زللەش لە سەروگوێلاکی بسرەوێنێت..

ئەو کاتەش گیان و ویژدانی دەژین و جەستەشی شەهید دەبێت و، "سەربەرزی و فەزیلەت"یش لە "زەلیلی و ڕسوایی" جیا دەبێتەوە و، عەقیدە و عیززەتی ئیسلامیش لە سووکایەتی و گاڵتە جاڕی دەرباز دەبن!

پوختەی ئەم قسانە:

خۆشویستنی ئیسلام داخوازی دوژمنایەتی کردنی ئێوەیە! چونکە چۆن ڕێ دەکەوێت حەزرەتی جیبریل - دروودی لەسەر بێت - لەگەڵ عەزازیلدا سوڵح و ئاشتی بکات!

گێژ و گەلحۆترین عەقڵ و ژیری هی کەسێکە پێی وابێت دەتوانرێ دۆستایەتی بخرێتە نێوان "تەماع و بەرژەوەندییەکانی ئینگلیز" و "عیززەت و بەرژەوەندییەکانی ئیسلام"ەوە!

گەوجترین دڵیش هی ئەو کەسەیە کە وا بزانێت ژیان لە ژێر ڕکێف و سایەی ئینگلیزدا دەچێتە سەر!

چونکە ئەوان ژیانی ئێمە بە مەرجێکی مەحاڵەوە دەبەستنەوە و، پێمان دەڵێن:

لە ژێر سایەماندا بژین، بەڵام بە مەرجێك خیانەت لە یەك دانە کەسیشتانەوە نەبینرێت..

دەنا خانە و لانەتان بەسەردا دەڕووخێنین و، تاوانبار و بێ تاوانتان پێکەوە لەناو دەبەین!

خۆ ئەگەر مرۆڤێکی ڕاستگۆ لە پێناوی حەق و ڕاستیدا ڕوو بەڕووی ستەمەکەیان ببێتەوە و پاشان پەنا بۆ مزگەوتی ئەیا صۆفیا ببات، هیچ سڵ لەوە ناکەنەوە کە ئەو بینا گەردنکەشە بەهادارەی بەسەردا بڕووخێنن..

هەروەها ئەگەر لە گوندێکدا یەك کەس هەبێت بەرەنگاری‌یان بکات، شەرم نایانگرێت و بەلایانەوە ئاساییە کە سەرجەمی گوندەکە - بە پیر و لاوەکانیانەوە - لەناوبەرن!

چونکە پێیان وایە کە خۆیان سەلاحییەتی لەناودانی هەر کۆمەڵێکیان هەیە گەر یەکێکیان تێدا بێت زیان لەوان بدات!

دەك ڕسوایی و سەرشۆڕی بۆ ئەو شارستانێتی‌یەی کە ئەم سەلاحییەتەی پێ سپاردوون!

ئایا ئیتر دەگونجێ دڵێك هەبێت دۆستایەتی لەگەڵ دڵی ئەو کەسەدا بکات کە چێژ و لەزەتی لەوەدا بێت خەنجەری ستەم بە دڵی ئەمدا بچەقێنێت؟

یان ئایا دەگونجێت هیچ شار و گوندێك هەبێت ئاژاوەچی‌یەکی تێدا نەبێت؟

کەواتە چۆن دەگونجێ درێژە بە ژیانی کەسێکی نەخۆش بدرێت کە بە کۆت و زنجیر پابەند کرابێت و، دارەکەی دەستیشی لێ سەندرابێت و، دوو سەگی کەڵبە و نینۆك تیژیشی تێبەردرابن؟!

"ئینگلیز" کتومت وەکو "شەیتان"ی نەفرەت لێ کراو وایە، دەچێ هەستە چەپەڵەکانی مرۆڤ دەورووژێنێت و برەو بە ڕەوشتە نزمەکان دەدات، لە هەمان کاتدا گەرموگوڕی و تینی هەست و نەستە بەرز و بڵندەکانیش دەکوژێنێتەوە.

ئەو ڕق و قینە شاراوە و ڕانەوەستاوەی کە ئێستا ئەم دوژمنە دەری دەخات هەرگیز ئەنجامی ئەم جەنگەی ئێستا نی‌یە، چونکە شکستمان لەم جەنگەدا سەروزیادی ڕاوەستانی ئەو ڕقە بوو گەر هی ئەم جەنگە بوایە، وەك لای دوژمنەکانی ترمان ڕاوەستا!

دەسا ئەی موسڵمانان!

ئایا دوای ئەم هەموو حاڵەتانەی کە بینیتان، هێشتا هەر پێیان دەخەڵەتێن؟

ئایا دوای ئەوەی کە لە نزیکەوە ناشیرینی و چەپەڵیی کافرانتان دی - کە لەوەو پێش لە دوورەوە بە جوان دەبینرا - هێشتا هەر ئەو شتانەتان بەلاوە جوانە کە شەرع و عەقڵ و بەرژەوەندیی ئیسلام بە ناشیرین و پیسیان داناون.

دەسا لەتاو وەسوەسە و فڕوفێڵی شەیتانەکان پەنا بە خوا بگرن و، بە پەشیمانی و لالانەوە هانای بۆ بەرن و، دەست لە داوێنی سۆز و بەزەیی خواوەندی میهرەبان بەرمەدەن.

* * *

(كما إنَّ الضروراتِ تُبيحُ المحظورات، كذلك تُسَهِّلُ المُشكلات)(١)

مریشك، کە ناوی بە "ترسنۆك" دەرچووە، بۆ پارێزگاری کردن لە بێچووەکانی پەلاماری گامێش دەدات!

ئەمەش نموونەی چاونەترسی‌یەکی سەرسووڕهێنەرە..

هەروەها ترسی بزنیش لە گورگ، لە کاتی ناچاریدا دەگۆڕێت بە بەرگری کردن، بینراوە کە قۆچی لە گورگ داوە و ورگی ڕاداوە!

ئەمەش نموونەی ئازایەتی‌یەکی دەراسایە..

هەروەها شەوق و ئازایەتیی سروشتی بەری لێ ناگیرێت..

(١) ئەم دوا بەشەی پەیامەکە نە لە دەقە عەرەبی‌یەکەی دانەر و نە لە وەرگێرانە عەرەبی‌یەکەشدا نەبوو، برای بەڕێزم دکتۆر دیدار کامەران لە دەقە تورکی‌یەکەوە کردی بە کوردی، خوا پاداشتی بداتەوە. (وەرگێڕ)

ئەوەتا ئەگەر مشتێك ئاو بخرێتە ناو تۆپێکی ئاسن و ئنجا ڕووبەڕووی سەرمای سەختی زستان ببێتەوە، ئەوا مەیلی سروشتیی فراوانبوونی ئەو ئاوە (بەستووە) ئاسنەکە هەپروون هەپروون دەکات.

بەڵێ.. بە وێنەی چاونەترسیی مریشکی بەشەفەقەت و، ئازایەتی و غیرەتی بزنی ناچار و، خرۆشانی سروشتیی ئاو بۆ فراوانبوون لەناو تۆپە ئاسنینەکەدا.. ئێمەش - بە وێنەی ئەوە - کاتێ دووچاری ستەمی دوژمنکارانەی کافرانی داگیرکەر ببینەوە، هەموو شتێك پارچە پارچە دەکەین..

ڕووسەکان شایەتحاڵی ئەمەن!

لەگەڵ ئەمەشدا، ئەو شەهامەتە دەراسایەی کە لە گەوهەر و ماهییەتی ئیماندا هەیە و، ئەو ئازایەتی‌یەش کە سروشتی سەربەرزیی ئیسلام لەخۆی گرتووە - کە لای هەموو جیهان پەسەندە - هەموو کاتێ چاوەڕوان دەکرێت، بە وریابوونەوەی برایەتیی ئیسلامی، موعجیزەکانی خۆی پیشان بدات.

سەعیدی نوورسی

* * *

بەرهەمی هەشتەم:

# گزنگەکان

بەدیعوززەمان

## سەعیدی نوورسی

داینەوە

## فارووق ڕەسووڵ یەحیا

کردوویە بە کوردی

بسم الله الرحمن الرحيم

**ڕوونکردنەوەیەك:**

کەسێکی نەناسراو، کە پەیوەندییەکی توندوتۆڵی لە جۆری "تەلیپاتی"[1] لەگەڵ ڕۆحمدا هەیە، لەبارەی چەند بابەتێکی جۆراوجۆری دوور لە یەکتر و، بە جۆرێکی کتوپڕی چەشنی (هەڵگیرسانی) کبریت، چەندین پرسیارم ئاراستە دەکات کە تیایاندا تەڕ و وشك تێکەڵ بە یەك دەبن..

لێ هەڵبژاردنیان بە پێی ئارەزووی خوێنەر خۆیەتی.

(دانەر)

---

(١) (تەلیپاتی Telepathy): بریتییە لە گۆڕینەوەی بیر و بۆچوون لە نێوان مێشکی چەند کەسێکدا و حالیبوون لە یەکتری، بە بێ بەکارهێنانی زمانی قسە و گوفتار. بڕوانە فەرهەنگی: **Oxford**. (وەرگێڕ)

# گزنگەکان

(طلوعات)[١]

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله الذي قال:

﴿وَلاَ تَنَازَعُواْ فَتَفْشَلُواْ وَتَذْهَبَ رِيحُكُمْ وَاصْبِرُواْ﴾[٢].

**پرسیار:**

سەبارەت بە جیاوازیی سەرسوورهێنەری نێوان زانایانی جیهانی ئیسلامی، چی دەڵێیت؟ ڕات چی‌یە؟

**وەڵام:**

یەکەم[٣]: جیهانی ئیسلامی بە وێنەی کۆڕێکی شلوشێواوی نوێنەران و، ئەنجومەنێکی شووراى ناڕێکوپێك دێتە پێش چاوم.

---

(١) وشەی (طلوعات) کۆی (طلوع)ە لە تورکیدا کە بە مەبەستی (طوالع)ی عەرەبی بەکاری دەهێنن و، لە کوردیدا بە واتای (گزنگەکان) دێت. بەڵام وەکو زاراوەیەك بە واتای درەوشانەوەی یەکەمجاری ناوە جوانەکانی خوای گەورە دێت بەسەر دڵ و دەروونی بەندەکەیدا، کە لەو ڕێیەوە جوانی بە ڕەوشتەکانی ئەو بەندەیە دەبەخشن و ناخ و هەناوی ڕووناکی بەدەست دەهێنن. بڕوانە: (التعريفات)ی جورجانی. (وەرگێڕ)

(٢) (الأنفال:٤٦). واتە: لەناو خۆتاندا ناکۆك مەبن، با ئەو توانا و دەسەڵاتەی هەتانە لە دەستتان نەچێت و، ئارامگر بن. (وەرگێڕ)

(٣) ڕۆژگارێك ئەمەم وت. (دانەر)

ئێمە دەبیستین کە شەریعەت دەڵێت:

"ڕای جومهوور (زۆرینە) ئەمەیە.. فەتوا لەسەر ئەم بناغەیە دەدرێت".

جا دەبێ لەم کۆڕەدا "ڕا"ی زۆرینەی ئەنجومەن وەربگیرێت.

خۆ ئەو "گوتە" و بۆچوونانەش کە پێچەوانەی ڕای زۆرینەن، ئەگەر بە تەواوی لە "حەقیقەت" و ناوەرۆك بەتاڵ و بێ بەش نەبن، ئەوا بە ڕای توانا و لێهاتنەکان (إستعدادات) دەسپێررێن تاکو هەر لێهاتنەو ئەوەی لێ هەڵبژێرێت کە لەگەڵ پەروەردەی خۆیدا بگونجێت.

بەڵام لێرەدا دوو خاڵی گرنگ هەیە:

یەکەمیان:

ئەو "گوتە"یەی کە بە مەیلی ئەم توانا و لێهاتنە هەڵبژێرراوە و، تا ڕادەیەك "حەقیقەت"ی لەخۆ گرتووە و، لە ناوەندی "کەمینە"دا ماوەتەوە، لە کاتێکدا کە بۆ خۆی پابەندی سنوورێکە و تایبەتە بەو لێهاتنەوە، کەچی لەبەر گوێ پێ نەدانی خاوەنەکەی شێوەی "ڕەها"ی وەرگرتووە.

ئنجا شوێنکەوتووانی ئەو خاوەن توانا و لێهاتنەش هاتوون گشتاندوویانە و، بە پێویستیان زانیوە کە پابەندی پەیڕەوی لێکردنی بن!

پاشان کەسانی چاولێکەری دەمارگیر بە نیازی پاراستنی ئەو "گوتە"یە هەوڵ و تەقالای خۆیان خستووەتە کار بۆ بەرپەرچدانەوە و ڕووخاندنی ڕا پێچەوانەکان!

ئەوەبوو لەم خاڵەدا بە ڕادەیەك ئاژاوەنانەوە و ڕووبەڕوو بوونەوە و زامدارکردنی بەرامبەر و بەرپەرچدانەوەی یەکتری مەیدانی گرتەوە کە ئەو تەپوتۆزەی لە ژێر پێیان هەڵدەستێت و، ئەو هەڵمەی لە دەمیان دەردەچێت و، ئەو هەورەبروسکانەش کە لە زاریانەوە دەبریسکێتەوە، هەورێکی بە چەخماخە و هەندێ جاریش بەڕەحمەتیان لە ڕووی خۆری ئیسلامدا کردووە بە پەردە.

بەڵام ئەو "لێهاتن"ە لە پلەی هەوری ڕەحمەتدا نەمایەوە کە لە ڕووناکیی خۆر بەهرەمەند ببێت، چونکە هەروەك باران نابەخشێت ڕێ لە هاتنی ڕووناکیش دەگرێت!

خاڵی دووهەم:

ئەو "گوتە"یەی کە لە سنووری "کەمینە"دا ماوەتەوە، ئەگەر ئەو حەقیقەت و کاکڵەیەی تیایدایە بەسەر هەوا و هەوەس و، ئەو ئاوێنە بۆماوەیە و ئەو میزاجەدا کە لە توانا و لێهاتنی کەسی هەڵبژێر کاردا هەیە، زاڵ نەبێت، ئەوا ئەو "گوتە"یە دەکەوێتە مەترسییەکی گەلێ مەزنەوە. چونکە لە کاتێکدا کە دەبوو ئەو لێهاتنە ڕەنگی خۆی بداتە ئەو، هەروەها بە لای پێویستییەکانی خۆیدا وەرییچەرخێنێت، کەچی ئەو دەچێت موتوربەی ئەم دەکات و دەیخاتە ژێر فەرمانی خۆی.

ئیتر لەم خاڵەدا "هودا" دەگۆڕێت بە "هەوا" و، "مەزهەب"یش لە "میزاج" دەخواتەوە و لێی دەنۆشێت..

بەڵێ، "هەنگ" ئاو دەخواتەوە بەڵام هەنگوین دەبەخشێت، کەچی "مار" کە ئاو دەخواتەوە ژەهر دەڕێژێت!

بەڵام ئومێدێکی یەکجار بەهێزم بەوە هەیە کە زانایانی جیهانی ئیسلامی لەم کۆڕە بەرزەی بوونەوەراندا و لەم شارە حاڵ لێهاتووە سەرگەردانەی گۆی زەویدا و لە نێوان قەومی ئادەم و میللەتی مرۆڤدا، ببنە ئەنجومەنێکی پیرۆزی نوێنەرانی ئەوتۆ کە زانایانی پێشین و دوایین لەسەرووی چەرخ و سەردەمەکانەوە تیایدا بڕواننە یەکتر و لە نێوان خۆیاندا "ئەنجومەنێکی ڕاوێژکاری" پێکبهێنن.

* * *

پرسیار:

ئایا لەمەولا "نەسرانییەت" نابێتە ڕێگر لە بەردەم بەرەو پێشچوونی ئیسلامدا؟

وەڵام:

ئایینی نەسرانی لە ئەنجامدا خۆی لە بەردەم "کوژانەوە" یان "خاوێنبوونەوە"دا دەبینێتەوە و، چەك فڕێ دەدات!

ئەوەتا چەند جارێك لەتوپەت بوو تا گەیشتە ئەوەی بوو بە "پرۆتستانت". ئنجا "پرۆتستانت"یش پارچە پارچە بوو هەتا لە "تەوحید" نزیك بووەوە و، ئێستا بۆ کەرتبوونێکی تر خۆی ئامادە دەکات..

جا یان ئەوەیە بە تەواوی خامۆش دەبێت، یان ڕاستەوڕاست خۆی لە بەردەم ڕاستییەکانی ئیسلامدا دەبینێتەوە کە بناغەکانی ئایینی ڕاستەقینەی نەسرانیی تێدا کۆبوونەتەوە.

مرۆڤ ناتوانێت بە بێ ئایین بێت!

ئەمەش نهێنییەکی مەزنە؛ پێغەمبەری ئازیز ﷺ بە هەواڵدانی نازڵبوونی حەزرەتی عیسا و، حوکم کردنی بە شەریعەتی ئیسلام و، بەوەش کە کەسێك دەبێت لە نەتەوەی پێغەمبەر ﷺ، ئاماژەی بۆ کردووە.

دووهەم: هۆکاری ئیختیلافی زیانبەخش ئەوەیە کە لە بریی ئەو دەستوورەی دەڵێت: "ئەمە حەقە" دەستووری "هەر تەنها ئەمە حەقە" و، لە جێی بڕیاری "ئەمە جوانترە" بڕیاری "هەر تەنها ئەمە جوانە" جێگیر کراوە..

هەروەها لە شوێنی بناغەی میهرەبانانەی: (الحب في الله)دا (البغض في الله) دانراوە..

لە بریی خۆشویستنی کار و ڕێبازەکەی خۆی، نەفرین لە کار و ڕێبازەکانی تر بەسەر هەڵسوکەوتەکانیدا فەرمانڕەوایە..

لە جیاتی خۆشەویستیی حەقیقەت، لایەنگیریی "من" (أنا) خۆی هەڵقورتاندووە..

هۆکار و بەڵگەکان لە شوێنی ئامانج و مەبەستەکاندا دانراون. لە کاتێکدا کە دەتوانرێت بە یەك بەڵگەی بێ کەڵك یەك دەرەنجامی حەق لە زەینێدا جێگیر بکرێت و، بە یەك هۆکاری ناهەقیش ئامانجێکی حەق لە هزردا دابمەزرێنرێت. کەواتە مادەم ئامانج و مەبەستەکە "حەق"ە، ئەوا نابێت بێ کەڵکیی هۆکار و بەڵگە و ڕێنوێنەکان بەم جۆرە ببێتە هۆکاری لێکترازانی دڵەکان.

سێهەم: هۆکاری ئیختیلاف "جەربەزەیی"ە[1]، کە حوکمڕانێکی ستەمکارە. ئەم "جەربەزەیی"یەی کە پاڵی بە بیری ڕەخنەگرتن و بەدبینییەوە داوەتەوە، هەمیشە ستەمکارە.

(١) وشەی "جەربەزەیی" لێرەدا کۆمەڵە واتایەکی لێك نزیك لەخۆ دەگرێت، وەك: فرتوفێڵ لە قسەدا بۆ هەڵخەڵەتاندنی بەرامبەر.. شاردنەوەی ڕاستییەکان بە وشەی هەق و ناهەق.. چاوقایمی لە قسەدا بۆ زاڵبوون بەسەر قسەی تردا.. هاروهاجی.. جرپنی.. لاساری. (وەرگێڕ)

پرسیار:

ئەو پرسیارکارە نەناسراوە، دووبارە دەڵێت: "جەربەزەیی" چییە؟

وەڵام[١]:

بینینــی تەنــها و تەنــهای قســوور و ناتەواوییــەکان لــە نێــوان کاروبــارە گــەورە جۆراوجۆرەکاندا، جەربەزەییەکی ئەوتۆیە کە فریو دەخوات و فریویش دەدات..

سروشتی "جەربەزەیی" وایە کە لـە یـەك دانـە تۆوی "خراپە" هێنـدەی گوڵەگەنمێك دێنێتە بەرهەم و بەسەر "چاکە"دا زاڵی دەکات[٢].

بۆ نموونە:

ئـەو بەڵغەمـەی کـە یـەك بـە یـەکی کەسـانی هۆزێـك ڕۆژانـە فڕێـی دەدەن، ئەگـەر بـە جەربەزەیی و بە شێوەیەکی وەهمی باز بەسەر "شوێنەکان"دا بدرێت و، بەو شـێوەیە وێنـا بکرێت کە هەموویان بەرهەمی یەك دانە کەسـی ئـەو هـۆزە بـن! ئنجـا ئـەو کەسـە بکرێتـە پێوەر بۆ کەسانی تری هۆز و بەو شێوەیە تەماشا بکرێن!

یاخود ئەو بۆنە ناخۆشـەی کـە لـە مـاوەی سـاڵێکدا لـە کەسێکەوە دێـت، ئەگـەر بـە جەربەزەیی بـاز بەسـەر "کاتـەکان"دا بدرێـت و، وا تەسـەوور بکرێـت کـە هـەموویان لـە ماوەی یەك خولەکدا لەو کەسەوە هاتووە!

ئەو کاتە دەبێ کەسی یەکەم چەندە چەپەڵ و، دووهەمیش چەندە بۆگەن بێت!

تەنـانەت ئـەگـەر ئەندێشـە چـاوی خـۆی بنووقێنێـت و، وەهمیـش لــووتی خـۆی بگرێـت و، لــە ئەشـکەوتەکانی خۆیـان هــەڵبێن، ئــەوا "ژیــری" مـافی ئــەوەی نـابێت سەرزەنشتیان بکات!

بــەڵام جۆرێکــی ســەیر و ســەمەرەی ئـەو جەربەزەییــە لەوەدایــە کـە شـتە پــەرت و بڵاوەکانی ناو "کــات" و "شـوێن"ەکـان پێکـەوە کۆدەکاتـەوە و دەیانکـات بـە یـەك دانـە شت. ئیتر لەو پەردە ڕەشەوە تەماشای هەموو شتێك دەکات!

بە ڕاستی سەرجەم جۆرەکانی "جەربەزەیی" مەکینەی شتانی نامۆ و سەمەرەیە!

---

(١) ڕۆژگارێك بوو کە بەم شێوەیە وەڵامی هۆز و تیرەکانم دایەوە. (دانەر)

(٢) بیوورن کە لە نموونەکانی داهاتوودا چەند کاروبار و شتێکی ناشیرین پێش چاو دەخرێن. (دانەر)

ئایا نابینرێت کە لە پێش چاوی عاشقێکی جەربەزەدا سەرجەمی بوونەوەران خۆشەویستی یەکترین و، بە لێوی خەندانەوە دەبزوێن و هەڵدەپەڕن؟ یاخود سەرانسەری بوونەوەران لە ڕوانگە نائومێد و جەربەزەکەی دایکێکی ماتەمین و جەرگ سووتاودا چۆن بە خەم و خەفەتەوە لە گریاندایە؟

هەر کەسەو بەروبوومی گونجاو لەگەڵ حاڵی خۆیدا بەرچنی دەکات!

لەم مەقامەدا نموونەیەکت بۆ دەهێنمەوە:

گریمان لەناو ئێوەدا ڕێبوارێکی ماندوو تەنها بۆ ماوەی یەك سەعاتی گەشتوگوزار بڕواتە ناو باخچەیەکی لەوپەڕی ڕازاوە و پڕ لە گوڵزاردا..

(دیارە باخچەی بێ ناتەواوی لە تایبەتمەندییەکانی بەهەشتە و، تێکەڵبوونی ناتەواوییەك لە هەر کەماڵێکدا یەکێکە لە خواستەکانی ئەم جیهانی بوون و تێکچوونەی دنیا)..

ئنجا لەبەر ئەوەی هەندێ شتی پیس و مردارەوەبوو لە چەند گۆشەیەکی جیاجیای ئەم باخچەیەدا هەبوو، ئەوا ئەو کەسە ڕێبوارە، بەهۆی لاریی میزاجی خۆی، تەنها بە دوای شتانی بۆگەندا دەگەڕا و سەیری مردارەوەبووەکانی دەکرد، گوایا هەر تەنها ئەوانە لەو باخچەیەدا هەن. ئنجا بە حوکمی خولیای خۆی، ئەندێشەی پتر فراوان دەبێت و، سەرجەمی باخچەکە لە شێوەی کوشتارگەیەکی ئاژەڵان و زبڵخانەیەکی مەزندا دەبینێت.

ئیتر لە ئەنجامدا گەدەی تێکدەچێت و دەڕشێتەوە و، بەوپەڕی نەفرەتەوە لەوێ هەڵدێت!

زۆر سەیرە! ئایا "حیکمەت" و "بەرژەوەندی" دەتوانن ڕووی ڕازیبوون پیشانی ئەندێشەیەك بدەن کە چێژی ژیان ئاوا لە گەرووی مرۆڤدا بکات بە خەفەت و پەژارە؟

ئەو کەسەی کە "جوان" دەبینێت، جوان بیر دەکاتەوە..

ئەو کەسەش کە جوان بیر دەکاتەوە، چێژ لە ژیانی دەبات!

* * *

پرسیار:

هەرکەسەو سکاڵا لە دەست ڕۆژگار دەکات. ئایا ئەوە نابێتە ڕەخنەگرتن لە سنعەتی ناوازەی کردگاری شکۆمەند؟

وەڵام:

نەخێر.. هەرگیزاو هەرگیز.. بەڵکو واتای ئەو سکاڵا دەربڕینە بەم جۆرەیە:

گوایا سکاڵاکەر دەڵێت:

ماهییەتی جیهان، کە بە دەستووری دانستی ئەزەلی ڕێك خراوە، بۆ ئەنجامدانی ئەو شتەی کە من دەمویست و ئارەزووم دەکرد و ئەو حاڵەتەی حەزم لێی بوو، ئامادە نی‌یە و..

ئەو یاسایەی گەردوون کە بە پەرکاری چاودێریی ئەزەلی نەخشاوە، بواری پێ نادات و..

سروشتی ڕۆژگار، کە لە چاپخانەی ویستی ئەزەلیدا چاپ کراوە، لەگەڵیدا یەك ناکەوێت و..

دانستی خواوەندیش، کە بەرژەوەندی‌یە گشتی‌یەکانی لەسەر بنیات نراوە، پێی ڕازی نی‌یە، هەتا ئەم جیهانی "مومکینات"ە ئەو بەروبوومانە لە دەستی توانستی پەروەردگاری بکاتەوە کە بە ئەندازیاریی مێشکی خۆمان و حەزی هەوا و ئارەزووەکانمان داوای دەکەین. تەنانەت گەر بیانبەخشێت، ئەوا ناتوانن وەری بگرن. ئەگەر بەروبوومەکان بۆ خۆیشیان دابکەونە خوارەوە، ئەوا هەر مومکینات ناتوانن هەڵیان بگرنەوە.

بەڵێ، هەرگیز ناگونجێت لەبەر ئارەزووی کەسێك بازنەیەکی گەورە لە جوولەی گرنگی خۆی ڕابووەستێنرێت!

بە پوختی:

"جەربەزەیی" دادوەرێکە، نابێت تەنها گوێ بیستی لایەنی "خراپەکان" بێت، بەڵکو دەبێ گوێ لە ڕکەبەرەکەشی بگرێت کە "چاکەکان"ە، ئنجا بەراوردیان بکات. بە

وێنەی بڕیاردانی دادگەرانەی ڕۆژی حەشر بکات و، بە خۆشەویستییەوە "هەق" بە لایەنە زاڵ و تا قورسەکەیان بدات.

**پرسیار:**

جەربەزەیی چۆن کاریگەریی لەسەر هزرەکانی ئێستا بەجێ هێشتووە؟

**وەڵام:**

بڕوانە! هەر ئەو "خراپە"یە وای کردووە دەوڵەتێکی بیانی کە هێندەی چیای "ئارارات" ستەم و سووکایەتیی بە ئێمە کردووە، بە چەند بەهانەیەکی تەڵەکەبازانە و قسەی پڕوپووچ و ورێنەی چەشنی: (نازانم لە چ مێژوویەك لە "قرم"دا هاوکاریی ئێمەی کردووە) لە شێوەیەکدا پیشانی دەدەن کە بتوانێت دۆستی ئێمە بێت.

هەروەها کۆمەڵێ ئەو تێکۆشەرانەی کە بە ئەندازەی چیای "سیپان" (سوبحان) لە پێناوی شەرەف و سەربەرزی ئیسلامدا خەباتیان کردووە، بە چەند بڕوبیانوویەکی سەیر و سەمەرە بەرەو نزمترین پلە دەهێنرێنە خوارەوە و، بە وێنەی دوژمنانی میللەت پێش چاو دەخرێن!

هەروەها بە پێی دەستووری: "خُذ من کلّ شيء أحسنه" کە دەرەنجامی برەوپێدانی پەروەردەی ئەورووپاییە، دەبوو بە خواستی "بەرژەوەندی" لە هەر شتێکدا باشترین ڕوو وەربگیرێت، کەچی خراپترینی ئەو ڕووانە لەبەرچاو دەگرن و، بەردەوام میللەت بەرەو نائومێدی دەبەن و، گیانە بە کۆمەڵەکەی دەکوژن.

هەروەها لەگەڵ ڕامبوونی "لاوازیی باوەڕ" بۆ "جەربەزەیی خراپ" بەوەی کە لە بابەتە ئایینییەکاندا لاوازترین لایەن پیشان دەدات، ئەوا زەمینەسازی بۆ بێ ئایینی دەکات.

هەروەها دەرەنجامێکی تری ئەوە، بریتییە لەوەی کە ئەو ڕەخنەگرتنەی خواستی سروشتی مرۆڤە و، لە نێوان پێشیناندا چ بەهۆی ئێرەیی و چ لەبەر حەقویستی بووبێت ڕوویداوە، جەربەزەیی سۆفستائییانە هاتووە ڕەخنەی هەریەکەیان بەرامبەر ئەوی تر دەردەخات و، سەبارەت بە گەورە مەردانی نەتەوە بێ ڕێزی و نائەمینیی بە گوێی

خەڵکیدا دەدات و، لەم ڕێیەشەوە لەرزە بە قودسییەتی ئیسلامەتی دەخات لە زەینەکاندا..

لە ئەنجامدا چەندین زیانی گەورە لەم جۆرە جەربەزەییەوە سەرهەڵدەدات.

پاشان هەرچی بیر لە ئەستەمبوولّ دەکەمەوە، دەبینم زمانی هێندەی دوو بست درێژ بووە، بەڵام ئەندامەکانی تری لە نەشونماکردن بێ بەشە و، وێنەکەی وەك هی "منالێکی بەتەمەن" بە زەینمدا دێت!

* * *

پرسیار:

سەبارەت بەو فەتوایەی کە لە دژی "ئەنادۆڵ"[1] دەرچووە، چی دەڵێیت[2]؟

وەڵام:

ئەوە "فەتوا"یەکی پەتی نییە هەتا عوزری بۆ بهێنرێتەوە، بەڵکو فەتوایەکە "قەزا"(بڕیار)ی لەخۆ گرتووە..

چونکە جیاوازیی فەتوا لە قەزا لەوەدایە کە بابەتی فەتوا گشتییە و، دەستنیشان نەکراوە و، مولزیمیش نییە. بەڵام قەزا هەم دەستنیشان کراوە و هەم مولزیمیشە..

جا ئەم فەتوایەی کە پرسیاری لەبارەوە دەکەیت، هەروەك "دەستنیشان کراو"ە، ئەوەتا هەرکەسێك سەرنجی بدات لە مەبەستەکەی تێدەگات.. "مولیزیم"یشە، چونکە هاندانی عەوامی موسڵمانان لە دژی ئەوان (ئەنادۆڵ) دواهەمین هۆکاری دەرکردنیەتی.

---

(١) ئەو دەمە دوو حکوومەت لە تورکیا هەبوو: یەکەمیان هی ئەستەمبوولّ، کە لە ژێر دەسەڵاتی داگیرکەرانی ئینگلیزدا بوو. حکوومەتی ئەنادۆڵیش کە ئەنقەرەیان کردبووە پایتەخت و لە دژی داگیرکەران دەجەنگان. ئەو فەتوایەش بە گوشاری ئینگلیز لە دژی ئەمەیان دەرکرابوو. (وەرگێڕ)

(٢) جێگای سەرنجە کە مەلبەندی خەلافەت وێڕای بوونی زانایان و دارولحیکمە و کۆنترۆڵە ڕەوشتییەکانیش، کەچی تاوانە گەورەکانی چەشنی: (فەحش و مەی و قومار) نەك لانەبراوە، بەڵکو نەتوانراوە ڕاگیریشی بکەن. بەڵام بە تەنها یەك فەرمانی حکوومەتەکەی ئەنادۆڵ هەرچی گوناهی گەورەی وەك مەی و قومار هەیە قەدەغە کراوە. واتە ئەگەر دەستوورەکانی حیکمەت لەگەڵ یاساکانی حکومەتدا و قانوونەکانی حەق لەگەڵ هێزدا تێکەڵ نەکرێن، ئەوا ئەو یاسایانە لای زۆرینەی خەڵکی بەرهەمێکیان نابێت. (دانەر)

جا مادەم ئەم "فەتوا"یە "قەزا"ی لەخۆ گرتووە، ئەوا لە "قەزاء"دا گوێ ڕاگرتن لە هەردوو ڕکەبەرەکە دەبێتە کارێکی پێویست..

لەبەر ئەوە، دەبوو قسەی ئەنادۆلیش بە هەند وەربگیرایە. دوای ئەوە لە لایەن دەستەیەکی سیاسەتمەدار و زانایانەوە و، لە خاڵی بەرژەوەندیی ئیسلامدا داوەری لەو دەعوایەی کە لە دژیانە و لە دەرەنجامی مایەی دەعواکەشدا بکرایە، ئنجا دەتوانرا فەتواکە بدرێت.

خۆی لە خۆیدا هەندێ لە ڕاستییەکان هەڵگەڕاونەتەوە و، دژەکان ناوەکانی خۆیان لەگەڵ یەکتردا گۆڕیوەتەوە، ئەوەتا "ستەم" بە دادگەری و، "جیهاد" بە هەڵگەڕانەوە و، "دیلی" بە ئازادی ناودەبرێن!

* * *

پرسیار:

بۆچی تۆ تا ئەم ڕادەیە نەفرەت لە (ا.ك.ز) [ ئینگلیز ] دەکەیت، تەنانەت بە سولحیش لەگەڵیاندا ڕازی نابیت؟

وەڵام:

هۆکاری ئەوە یەك دانە نییە، بەڵکو هەزارە. توندوتیژترینی ئەو دەست وەشاندنە بە لای منەوە ئەوەیە کە لە ڕووی مەعنەوییەوە دەیسرەوێننە ڕەوشت و ئاکارەکانمان. ئەوەتا ڕەوشتە خراپەکان، کە وەکە ناوك و تۆوێك وابوون لە ناخماندا، ئێستا ئەوان وردە وردە چەکەرەی پێ دەکەن و پێش چاویان دەخەن.

برینەکانی ژیان سارێژ دەبنەوە، بەڵام زامەکانی عیززەتی ئیسلامی و نامووسی میللەت یەکجار قووڵن!

ئەوانە، لە مزگەوتی "ئەدیرنە"دا بە زمانی زانایەکی موسڵمان خەڵکیان ناچاری دوعا کردووە بۆ شەیتانێکی وەك "ڤینزیلیۆس"[1]..

---

(١) بۆ زانیاری لەبارەی "ڤینزیلیۆس"ەوە بڕوانە لاپەڕە (٧٥٤)ی ئەم کتێبە. (وەرگێڕ)

ئینگلیز کە دەستە و پیری شەیتانن، لە ئەستەمبوڵ و بە زمانی موسڵمانان، سەربازەکانی یۆنان بە ڕزگارکەر و پاکژکار ناوزەد دەکەن و، کۆمەڵی خەباتکارانیش کە لە دژی ئەوان ڕاوەستاون، بە تاوانبار و ستەمکار ناو دەبەن!

جێی سەرسوڕمانە! ئایا دایکێك بگاتە ئەو ڕادەیەی کە بە دەستی خۆی جگەرگۆشەکەی بکوژێت و، بێ ئەوەی هیچ پەژارەیەك دەرببڕێت پارچە پارچەی بکات، ئایا دەگونجێت هەموو هەستێکی بڵند و ڕەوشتێکی بەرز لەو دایکەدا نەکوژابێتەوە؟!

* * *

پرسیار:

بۆچی سیاسەتی (ا.ك.ز) سەرکەوتوو دەبێت؟

وەڵام:

چونکە تایبەتمەندیی سیاسەتی ئەو بریتی‌یە لە: ئاژاوەگێڕی و، دەرفەت وەرگرتن لە جیاوازی‌یەکان و، ئەنجامدانی هەموو سووکایەتی و نزمی‌یەك لە پێناوی بەرژەوەندیی خۆیدا و، درۆکردن و، وێرانکاری و، ئەنجامدانی کاری سەلبی لە دەرەوە.

مرۆڤێك بە تەنها خۆی دەتوانێت لە ماوەی یەك ڕۆژدا بینایەکی مەزن تێکبدات و، پشێوی لەناو یەك تیپی سەربازیشدا بنێتەوە.

هەر ئەم سیاسەتە نزمەیە کە بە ڕواڵەت نەفرەت لە (ق.ط.ط.نی)[1] دەکات، کەچی بە پەنامەکی خۆی لە کاروباریدا هەڵدەقورتێنێت، چونکە هۆکاری سیاسەتی ئەو: بەدی و خراپکاری‌یە. لە هەر شوێنێکدا پارێزگاری لە ڕەوشتە خراپەکان بکرێت، ئەو پشتی دەگرێت و هانی دەدات. حاڵی ئێستای ئەستەمبوڵ شایەتی ئەمەیە.

* * *

(١) مامۆستا عەبدولقادر بادللی لە چاپە لاتینی‌یە نوێکەی (آثار بديعيه)دا سەبارەت بەم پیتانە نووسیویەتی: (مەبەستی لە قسطنطينيه)یە. (وەرگێڕ)

پرسیار:

لە ئەنادۆڵیشدا ستەم گەلێ پەرەی سەندووە.. موسڵمانانی زۆر لە سێدارە دەدرێن.. ئەوانە بۆچی وا دەکەن؟

وەڵام:

بەڵێ، بە داخەوە چەند شتێکی تەواو دڵتەزێن ڕوو دەدەن. بەڵام هۆکاری بنەڕەتیی ئەوە: مەدەنییەتی نەفرەت لێکراوی بێ "میم"ە کە ئەم جۆرە چەکە وەحشیگەرییانەی بەم جەنگە بەخشیوە.

بەرەنگاربوونەوەی ئەو چەکانە هەر دەبێ بە چەکی هاوشێوەی خۆیان بێت. تفەنگی "شەش تیر" ناتوانێت لە بەرامبەر "میترالیۆز"ەوە[1] بەرگری بکات. هەر هەمان چەك و هەمان دەستوورە کە ئەم شارستانێتییە بە دەستی ئەو جەنگەی سپاردووە.

من بە چاوی خۆم دوو فەرمانی "گران دۆق نیکۆلا فیچ"م[2] دی:

فەرمانی یەکەمی ئەوە بوو کە:

(ئەگەر لە گوندێکدا یەك تفەنگ لە ڕووی سەربازەکانماندا بتەقێنرێت، ئێمە ئەو گوندە بە خاوخێزانەوە لەناو دەبەین).

فەرمانی دووهەم:

(ئەگەر لەناو کۆمەڵێکدا یەك کەس خیانەت بە بەرەی ئێمە بکات، بە خۆی و ماڵ و منالیەوە لەناوی دەبەین).

جا بەم دەستوورە یەکجار ستەمکارانەیە کە (ا.ك.ز) هێرش دەکاتە سەر ئەنادۆڵ.

* * *

پرسیار:

بۆ ڕێککردنەوەی جیاوازییەکانی نێوان جیهانی ئیسلامی چارەسەر چییە؟

وەڵام:

لە پێشدا پێویستە ئەو ئامانجانە بە هەند وەربگیرێن کە هەموان لەسەری یەکدەگن.

---

(١) جۆرە تفەنگێکی ڕەشاشە، کورد پێی دەڵێت: مەترەلۆز، شەست تیر. (وەرگێڕ)

(٢) خاڵی قەیسەری ڕووس و سەرکردەی بەرەی قەفقاس بوو لە یەکەم جەنگی جیهانیدا. (وەرگێڕ)

چونکە:

خوامان یەکێکە..

پێغەمبەرمان - دروودی خوای لەسەر بێت - یەکێکە..

قورئانمان یەکێکە..

هەمووشمان لەسەر پێداویستییە ئایینییەکان قسەمان یەکە.

ئیتر لق و پەلی ئەو بابەتانەی کە بەشێك نین لە پێداویستییەکانی ئایین، یان جیاوازی لە شێوەی وەرگرتنیان، یاخود لەیەك نەچوونی ڕێی تێگەیشتن لێیان، هیچ کام لەمانە ناتوانێت لەرزە بەم یەکێتییە بخات، یان بەسەریدا زاڵ ببێت.

خۆ ئەگەر دەستووری "الحب في الله" پیادە بکرێت و، "عەشقی حەقیقەت" دادوەری جموجووڵمان بێت - کات و سەردەمیش بۆ ئەمە یارمەتییەکی باشمان دەدات - ئەوا دەتوانرێت ئەو جیاوازییانە بە ئاراستەیەکی ڕاست و دروستدا ببرێن.

بەداخەوە لەبەر ئەوەی ئامانجی ئەندێشە لەبیر براوەتەوە یان لەبیر چووەتەوە، ئەوا زەینەکان بە دەور و خولی (من)ەکاندا دێن و دەڕۆن. بەڵام ئامانجی ئەندێشە "مەبەستی بلند"ی بەوپەڕی ڕوونی هێناوەتە مەیدانەوە.

* * *

## جۆرێکی توندوتیژی ستەم

ئەو تایبەتمەندییەی کە مرۆڤانی "خەواص" لە دنیادا هەیانە، هۆیەکە بۆ تەوازووع و خۆنەویستی.. کەچی بووە بەهۆی خۆ بەگەورە گرتن و خۆسەپاندن بەسەر کەسانی تردا!

هەروەها دەستەوسانی "هەژاران" و هەژاریی "عەوام"ەکانیش داخوازی بەزەیی پێدا هاتنەوە و خەم بۆ خواردنە.. کەچی بوون بەهۆی ئەوەی کە بەرەو دیلی و ژێردەستەیی بیانداتەبەر!

ئەگەر چاکە و شەرەفمەندییەك لە هەر ئیشێکدا هەبێت، پێشکەش بە چینی تایبەتمەند دەکرێت. بەڵام گەر خراپە بێت، بەسەر عەوامی خەڵکیدا دابەش دەکرێت!

بۆ نموونە:

ئەگەر تیپێکی سوپا سەرکەوتن بەدەست بهێنێت، شان و شەرەف بۆ سەرکردە دادەنرێت و بەسەر تیپەکەدا دابەش ناکرێت.. کەچی لە کاتی شکست هێناندا ئەو خراپەیە بەسەر تیپەکەدا دابەش دەکرێت!

نموونەیەکی تر:

ئەگەر هۆزێك کارێکی شەرەفمەندانە ئەنجام بدات، بە سەرۆکەکەی دەوترێت:

(ئافەرین حەسەن ئاغا)!

بەڵام لە کاتی تیاچووندا دەوترێت:

(تف.. چ هۆزێکی پیسن)!

ئەو وتە بەناوبانگەی کە دەڵێت:

وإذا تكـــون كريهـــةٌ أُدعَى لها     وإذا يُحاسُ الْحَيْسُ يُدعَى جُنْدُبُ[1]

ئەم ستەمە سەیرە روون دەکاتەوە.

هەروەها رێگایەکی تری هاتوچۆی ئەم دەماری ستەمە، لەم سیستەمە کۆمەڵایەتییەدا، بریتییە لەوەی کە:

ئەگەر کەسێك لە توێژە بڵندەکان بکوژرێت، چەندین ساڵ ماتەمینیی بۆ دەگیرێت.

بەڵام ئەگەر بە تاوانی ئەو کەسە سەد کەس بەڵکو هەزاران کەس بکوژرێت، لە یەك دوو رۆژدا لە بیر دەبرێتەوە!

ئەم دیاردەیە دژی دادگەریی قورئانە.

چونکە ئەگەر پادشایەك هەژارێك بکوژێت، قورئان فەرمان بە کوشتنەوەی دەدات و، هەردووکیان بە یەك چاو سەیر دەکات.

---

(١) واتە:

لە تەنگانەدا هانام بۆ دەبرێ     بەڵام بۆ خواردن "جوندوب" بانگ دەکرێ

پەندێکە لەم بەیتە شیعرەدا بە عەرەبی داڕێژراوە. (دانەر)

تێبینی: لەم شوێنەی پەراوێزدا دانەر واتاکەی بە پەخشانی تورکی نووسیوە. ئێمە بەم جۆرە هەوڵمان دا لە شێوەی هۆنیندا بە کوردی دایبڕێژینەوە. "جوندوب"یش ناوی کەسێکە. (وەرگێڕ)

## سزایەکی شایان

دەستووری دادگەرانەی شەریعەت: (القاتلُ لا يرثُ)[1] لەگەڵ یاساکانی قەدەردا، کە شەریعەتی سروشتە، یەکدەگرێتەوە..

ئەوەتا گەر کەسێك بۆ گەیشتن بە ئامانجێك ڕێیەکی نامەشرووع بگرێتەبەر، سزاکەی بە هێنانەدیی دژی ئەو ئامانجە دەبینێت. وەکو "ویلسون"[2] و "کیلمانسۆ"[3] و "ڤینزیلیۆس".

نموونەیەك لەسەر ئەمە: لە دەسپێکی کودەتاکەمانەوە تا ئێستا کەسانێك کە پاداشتی دوارۆژیان کردە هۆکارێك بۆ بەدەستهێنانی شان و شەرەفێکی بێ دینانە، ئەنجامی کارەکەیان ڕسواییەکی ترسناکی لێ کەوتەوە و، ئەو شان و شەرەفە کاتییە، کەوتنە خوارەوەیەکی ئازاربەخشی بە دوادا هات و، زمانی حاڵیان ئایەتی: ﴿يا لَيْتَنِي مِتُّ قَبْلَ هذا وَكُنتُ نَسْياً مَنْسِيّاً﴾[4] دەخوێنێتەوە!

سروشتی مرۆڤ وەکو کێڵگەیەك وایە کە ڕەوشتە باشەکان و، حەز و ئارەزووە خراپەکانی پێکەوە و بە وێنەی "تۆو" بە دەستی قەدەر تێدا دەچێنرێن. ئەم تۆوانەش بۆ نەشونماکردنیان پێویستیان بە ئاوێك هەیە..

---

(١) رواه أبوداود والترمذي وابن ماجه والدارمـي وأحمـد في مسنده. واتە: مرۆڤی بکوژ میرات لە کوژراوەکەی نابات. (وەرگێڕ)

(٢) ویلسون توماس ودرو (١٨٥٦-١٩٢٤): لە بواری یاسادا خوێندوویەتی و، ماوەیەك پارێزەر و پاشان لە نێوان ساڵەکانی (١٩٠٢-١٩١٠)دا بەڕێوەبەری زانکۆی برنستون بووە. ئنجا لە لایەن پارتی دیموکراتییەوە پاڵێوراوە و لە نێوان ساڵەکانی (١٩١٣-١٩٢١)دا بۆ سەرۆك کۆمارێتیی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هەڵبژێرراوە. بە ئاشکرا دژایەتیی خۆی بەرامبەر هەموو جۆرەکانی ئیستیعمار دەربڕیوە. گەلێ کتێبی لە بواری ڕێسا و ڕژێمە سیاسییەکاندا نووسیوە، گرنگترینیان بریتییە لە کتێبی "مێژووی گەلی ئەمریکا" لە پێنج بەرگدا. (وەرگێڕ)

(٣) جۆرج کیلمانسۆ (١٨٤١- ١٩٢٩ز) سیاسەتمەدارێکی ناسراوی فەرەنسییە و لە کۆماری خوازەکانە. لە سەرەتادا هەواڵنێر و ڕۆژنامەوان بووە، دواتر لە بواری سیاسەتدا کاری کردووە و، بووەتە ئەندامی پەرلەمان، دوو جاریش پۆستی سەرۆك وەزیرانی وەرگرتووە. لە دوا ساڵەکانی تەمەنیدا لە بواری سیاسەت دوورکەوتووەتەوە. گرنگترین بەرهەمەکانی کتێبێکە بە ناوی: (لە ئاوابوونی خۆری ئەندێشەمدا). (وەرگێڕ)

(٤) (مريم: ٢٣) واتە: خۆزگا پێش ئەمە بمردمایە و لەبیر بچوومایەتەوە. (وەرگێڕ)

جا ئەگەر ئاوەکە لە لایەنی (هەوا)وە سەرچاوە بگرێت، ئەوا تۆوەکانی حەز و ئارەزووە خراپەکان نەشونما دەکەن، بە وێنەی ئەو کاریگەری‌یەی کە ئەم شارستانێتی‌یە چەپەڵە بە جڤاتی کۆمەڵایەتیی مرۆڤی بەخشیوە..

بەڵام لەبەر ئەوەی بە سروشت "خێر" بەسەر "شەڕ"دا زاڵە، ئەوا تۆوێك کە گەشەی کردووە و گوڵی گرتووە و دواتر بەروبوومی بەخشیوە، بەسەر نەك سەد دانە بەڵکو بەسەر هەزار دانە تۆوی وشك بوودا سەردەکەوێت.

چارەی ئەم دیاردەیەش ئەوەیە کە هاوکات لەگەڵ داخستنی ئەو دەرگای فیتنەیەدا، پێویست دەکات ئاودێری کردنی ئەو کێڵگەیە لە سەرچاوەی (هودا)وە بێت.

* * *

پرسیار:

هەندێ کەسانی بیانی چەند گومانێك لەبارەی هەندێ مەسەلەی شەریعەتەوە دەهێنن، وەك "فرە ژنی" و "کۆیلایەتی". وەك بڵێن ئەمانە لەگەڵ شارستانێتیدا ناگونجێن. ئیتر لەم ڕێ‌یەوە دوودڵی و گومان لەبارەی شەریعەتەوە بڵاو دەکەنەوە.

وەڵام:

ئەحکامی ئیسلام دوو بەشن:

یەکەم:

ئەوەیە کە شەریعەتی لەسەر بنیات دەنرێت، کە خێر و جوانیی بێگەرد و ڕاستەقینەیە.

ئەوی تر: شەریعەتی ڕاستێنەر(تەعدیل کار)ە.

واتە کاتێ کە شەریعەت دێت ئەو شتە لە شێوە ناشیرینە ستەمکارانەکەیەوە دەگۆڕێت بە شێوەیەکی ئەوتۆ کە لەگەڵ کات و دەوروبەردا گونجاو بێت و، بەپێی سروشتی مرۆڤ شایانی جێبەجێ کردن بێت و، ئەو شێوازە بێت کە زیان و شەڕی کەمتری تێدایە، تاکو کاتێ دێتە پێشەوە هێنانەدیی جوانیی ڕاستەقینە بە تەواوی لە توانا دەبێت. چونکە لابردنی کتوپڕی شتێ کە لە سروشتی مرۆڤدا ڕەگی داکوتابێت، داخوازی سەرەوبخوون کردنی سروشتی مرۆڤە!

جا لەسەر بناغەی ئەم دەستوورە:

شەریعەت "کۆیلایەتی"ی دروست نەکردووە! بەڵکو تەنها شەریعەت بوو کە ڕێی بۆ ئەوە ئاسان کرد کۆیلایەتی لە دڕندانەترین شێوەیەوە بگۆڕێت، هەتا وردە وردە بە ئاسانی دەتوانرێ بۆ "سەربەستی" و ئازادیی تەواو بگوێزرێنەوە[1]. واتە شەریعەت هات ئەو شێوە ناڕەوا و ناشیرینەی تەعدیل کرد و دیاردەکەشی کەم کردەوە.

پاشان "فرەژنی" تا ڕادەی چوار[2]، هەرچەند کارێکە لەگەڵ سروشت و عەقڵ و داناییدا گونجاوە، لەگەڵ ئەوەشدا شەریعەت نەهاتووە لە یەك دانەوە بیگەیەنێتە چوار، بەڵکو لە هەشت و نۆوە کەمی کردووەتەوە بۆ چوار! بە تایبەت کە چەندین مەرجی ئەوتۆی بۆ فرەژنی داناوە کە ئەگەر ڕەچاو بکرێن زیانێکی ئەوتۆی تێدا نابێت. خۆ ئەگەر لە هەندێ خاڵیدا "شەڕ"ێك ڕوو بدات ئەوا شەڕێکی "سووکتر" و "کەمتر"ە. خۆ "شەڕی کەمتر" دادگەرییەکی نیسبییە، چونکە زۆر دوور و مەحاڵە کە خێری پەتی و بێگەرد لە هەموو حاڵەتێکی ئەم جیهانەدا دەست بکەوێت!!

* * *

پرسیار:

بۆچی (دار الحكمة الإسلامية) نەیتوانی خزمەت بکات؟

وەڵام:

گەورەترین خزمەتی ئەوێ خزمەت نەکردنیەتی! مەزنترین جموجوولیشی نەجووڵانەوەیەتی!

چونکە ئەو هێزەی کە لێرەدا زاڵە سەرکوتی هەر جموجوولێك دەکات لە بەرژەوەندیی خۆی نەبێت.

ڕاپەڕیوە جووڵاوەکانم بینی کە لەناو مزگەوتە پیرۆزەکاندا ناچارکران دوعا بۆ کافران بکەن و، فەتوا بۆ کوشتنی خەباتگێڕانیش دەربکەن!

---

(١) هەروەك لە مێژوودا بەو جۆرە کۆتایی بە کۆیلایەتی هێنا. (وەرگێڕ)

(٢) زۆربەی جار "پیاو" هەتا تەمەنی سەد سالیش توانای وەچەخستنەوەی دەبێت، بەڵام "ژن" لەبەر ئەوەی نیوەی کاتی لە سووڕی مانگانەدایە، ئەوا لە تەمەنی پەنجا ساڵیدا لە سکوزا دەکەوێت. (دانەر)

لەبەر ئەوە، نەیانتوانی لەم زریانەدا (دار الحكمة) بکەنە ئامرازێك بۆ ئەم فیتنەیە.

هێزی بیانی کە گەورەترین ڕێگر بوو لەوە، بە هەموو هێز و توانایەکی خۆی پارێزگاری لە ڕەوشتە خراپەکان دەکرد و هانی بڵاوبوونەوەیانی دەدا.

هۆکاری دووهەم:

ئەندامانی (دار الحكمة) توانای توانەوەیان لەیەکتردا و تێکەڵ بوونیان بە یەکتری تێدا نییە، بەڵکو هەریەکەیان تایبەتمەندیی کەسیی خۆی هەیە و، گیانی "کۆمەڵ" لەواندا لەدایك نەبووە و، "من"ەکانیان زۆر بە هێزە و کوناودەر نەکراوە تاکو ببێتە "ئێمە"! بەڵێ، "من" نەبووە "ئێمە".

ئەوان بە دەستووری "هاوبەشێتی" دەستیان دایە کار و، دەستووری "هاوکاری" لە نێوانیاندا پشتگوێ خرا.

"هاوبەشێتی" لە کاروبارە ماددیەکاندا بەرهەمەکە دەکاتە شتێکی زۆر گەورە، بەڵام لە کاروبارە مەعنەوییەکاندا دەیانکات بە شتێکی ئاسایی، تەنانەت ناشیرین و بێ کەڵکیش.

کەچی دەستووری "هاوکاری" لە شتانی ماددیدا بە تەواوی پێچەوانەی ئەمەیە؛ سەبارەت بە "کۆمەڵ" دەبێتە هۆی بەرهەمێکی زۆر بچووك، بەڵام سەبارەت بە تاکە کەس دەبێتە هۆی بەرهەمێکی زۆر گەورە، خۆ لە شتانی مەعنەویدا بە ڕادەیەکی نائاسایی بەرهەمەکە بەرز دەکاتەوە.. هەروەها ڕەخنەگرتنەکانیشی یەکجار یەکلاکەرەوەن؛ هزری نەیار لەتوپەت دەکەن و دەیکوژێننەوە.

هەندێ کەس لە سۆراغکردنی (حەقتر)دا (حەق) ون دەکەن.

بە ڕای من زۆر جار (حەق) لە (حەقتر) حەقترە، چونکە لە "حەق"دا یەکگرتن هەیە و لە "حەقتر"دا جیاوازیی ڕاکان!

لە ماوەی گەڕاندا بە دوای "حەقتر" جۆرە چاوپۆشییەك ڕوو دەدات لە "ناحەق"!

* * *

پرسیار:

ئەوە چۆنە ئەگەر کەسێك بڵێ: "ئەم حەدیسە قبووڵ ناکەم"؟

وەڵام:

هەندێ جار "نەبوونی قبووڵ کردن" لەگەڵ "قبووڵ کردنی نەبوون"دا تێکەڵ دەبێت و، ئەمەش سەری لە چەندین هەڵەی زۆرەوە دەردەچێت..

لە کاتێکدا کە نەبوونی بەڵگە دەبێتە بەڵگە بۆ "نەبوونی قبووڵ" کەچی "قبووڵ کردنی نەبوون" پێویستی بە بەڵگەیە لەسەر "نەبوون"! یەکێکیان گومان و ئەوی تریشیان ئینکارە.

بۆ نموونە: سەبارەت بە حەدیسێك هەروەك "قبووڵ کردن"ی ئەو حەیسە هەیە، "نەبوونی قبووڵ کردن"یشی هەیە، هەروەها " قبووڵ کردنی نەبوون"یشی هەیە..

یەکەمیان: هێزێکی کێشکەری بەڵگە دەخوازێت.

دووهەمیان: کێشەیەکی ئەوتۆ نی یە کە تەسدیق بخوازێت، بەڵکو بریتی یە لە "نەزانی"!

سێ‌هەمیان: لەبەر ئەوەی ڕەتدانەوە و ئینکارە، ئەوا پێویستی بە "بەڵگە" دەبێت. ئەو خۆی "نەفی"یە. نەفیش بە ئاسانی ناچەسپێت، بەڵکو کە واتاکەی پووچەڵ کرا، ئیتر خۆی نەفیی خۆی دەکات.

* * *

پرسیار:

چۆن دەڕوانیتە "ڕەخنەگرتن" بە تایبەت لە شتی ئایینیدا؟

وەڵام:

هاندەری ڕەخنەگرتن یان تۆڵەسەندنەوەی نەفرەتە، یان بۆ دڵنیاکردنی سۆز و شەفەقەتە؛ شتێکە بە وێنەی بینینی عەیبی "دۆست" یان "دوژمن" وایە!

هەرشتێك گریمانی "ڕاست" و "هەڵە"ی هەبێت، مەیل و تەرجیحی قبوولکردنی لە "شەفەقەت"ەوەیە، مەیل و تەرجیحی ڕەتدانەوەشی - وەسوەسەی لێ بەدەر بێت - لە "نەفرەت"ەوەیە.

ئەمەش لە خۆیدا پێوەرێکە بۆ "ڕەخنەکان".

وعينُ الرضا عن كل عيبٍ كليلةٌ  كما انّ عين السخط تبدي المساويا[1]

هاندەری "ڕەخنە گرتن" دەبێ عیشقی حەق و ئارەزووی پاك ڕاگرتنی حەقیقەت بێت، بە وێنەی ڕەخنەی نێوان پیاوچاکانی پێشین.

* * *

**پرسیار:**

دەبێ چۆن چۆنی وەڵامی پڕوپاگەندەی تا ئەم ڕادەیەی کافرانی ستەمکار بدرێتەوە؟

**وەڵام:**

"پڕوپاگەندە" مناڵێکی ناشەرعیی "جەربەزەیی" ستەمکارە، کە پێشتر نابەجێیی ئەوم خستە ڕوو. نابێ لە بەرپەرچدانەوەیدا هەمان چەکی "درۆ" بەکاربهێنرێت. بەڵکو دەبێ چەکی ئەو بەرەنگارییە "حەق" و "ڕاستی" بێت. یەك دەنکە دانەوێڵەی "ڕاستگۆیی" خەرمانێك "درۆ" دەسووتێنێت.

(إنَّما الحيلةُ في تَركِ الحِيَل)[2]..

﴿قُلِ اللهُ ثُمَّ ذَرْهُمْ فِي خَوضِهِمْ يَلْعَبُونَ﴾[3].

پێویستە کە مرۆڤ بە چاوی "قەدەر" بڕوانێتە "ڕابوردوو" و "موسیبەتەکان". بەڵام لە خاڵی "تەکلیف"ەوە بڕوانێتە "داهاتوو" و "گوناهەکان".

زۆر پێویستە کە مرۆڤ لەو شتانەدا چارەیان هەیە پەنا بۆ "دەستەوسانی" نەبات و، لەو شتانەشدا کە چارەیان نی‌یە دەست لە داوێنی "خەم و پەژارە" گیر نەکات.

* * *

(١) ئەم شیعرە هی ئیمامی شافیعی‌یە، بڕوانە: "ديوان الإمام الشافعي" ص٩١ جمع وتعليق محمد عفيف الزعبي. نشر دار النور، بيروت سنة ١٣٩١هـ - ١٩٧١م. واتە: چاوی ڕازی بوون لە ئاستی هەموو نەنگی‌یەکدا نابینایە، بەڵام چاوی ڕازی نەبوون هەر خراپە دەردەخات. (وەرگێڕ)

(٢) واتە: فێڵ تەنها ئەوەیە کە مرۆڤ واز لە فێڵ کردن بهێنێت. (وەرگێڕ)

(٣) (الانعام: ٩١) واتە: بڵێ: "خوا".. ئنجا لێیان گەڕێ با سەرقاڵی گەمە و گاڵتەی خۆیان بن. (وەرگێڕ)

## حەقیقەتێکی حەدسی[١]

**پرسیار:**

حەزرەتی عیزرائیل (مەلائیکەتی گیان کێشان) تەنها یەك کەسە، کەچی لە یەك کات و لە چەند جێگایەکی جیاجیادا گیانی چەندین کەس دەکێشێت کە ئەجەلیان هاتووە..

حەزرەتی جیبریل لەو کاتەدا کە لە "سدرة المنتهی" لەسەر شێوەی ڕاستەقینەی خۆیەتی، لەسەر شێوەی "دیحیە" یاخود لە شێوەی کەسێکی دیکە لە کۆڕی پێغەمبەردا ﷺ پرسیار لەبارەی ئیمان و ئیسلام دەکات، یان ڕاپاندەگەیەنێت.. ئنجا مەگەر تەنها خوا بزانێت کە لە چەند شوێنی تریشدا ئامادەیە..

پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ دەفەرموێ:

(مَنْ رآني في الْمَنامِ فقد رآني حقاً)[٢].

لەسەر بناغەی ئەم نهێنییە و لە یەك کاتدا لە لایەن هەزاران کەس لە عەوامی ئوممەتەکەی لە خەوندا و، لای تایبەتمەندانشیان لە حاڵی بێداری و لە ڕێی کەشفەوە دەبینرێت. هەروەك گوێی لە سڵاواتی سەرجەمی نەتەوەکەیەتی و، لە قیامەتیشدا هەموویان دەبینێت و شەفاعەتیان بۆ دەکات..

هەروەها ئەوەش کە "وەلی"یەك لە تەنها یەك کاتدا لە چەندین شوێنی جیاجیادا دەبینرێت..

ئایا کلیلی ئەم نهێنییانە چییە؟

**وەڵام:**

وێنەی هەر شتێکی نووڕانی خاوەنی تایبەتمەندیی هەمان شتی نوورانییە و، پێی ناوترێ غەیری ئەوە.

---

(١) (حەدس): خێرایی تێگەیشتنی مرۆڤە لە بنەماکانەوە بەرەو خواستەکان. لە کتێبی (التعریفات)ی جورجانی وەرگیراوە. (وەرگێڕ)

(٢) فەرموودەی: (مَنْ رآني في الْمَنامِ فقد رآني) بوخاری (٦٥٩٣) و موسلیم (٢٢٦٥) ڕیوایەتیان کردووە. لە صەحیحی (ئیبن حیبان)یشدا (٦٠٥١) بەم دەقە هاتووە: (مَنْ رآني في الْمَنامِ فقد رأى الحقَّ). (وەرگێڕ)

ئاوێنەی تەنە ڕوونەکان، کە لەم جیهانەدا پەنجەرەیەکن بەسەر جیهانی وێنەکان و جیهانی میسالدا کراونەتەوە، شێوەی بێ تایبەتمەندیی تەنە چڕەکان وەردەگرن، کەچی لەگەڵ پیشاندانی وێنەی تەنە نوورانییەکاندا وێنەی تایبەتمەندییە خۆییەکانیشی وەردەگرن..

بۆ نموونە:

ئەگەر "مرۆڤێك" لە ناوەڕاستی هەزاران ئاوێنەدا ڕابووەستێت، هەموو یەکێکی ئەو ئاوێنانە هەمان کەس پیشان دەدەن، بەڵام هەموو یەکێکی ئەوانە بێ گیان، بێ هەست، بێ بیرکردنەوەن..

کەچی ئەگەر وێنەی "خۆر" لە هەزاران ئاوێنەدا ببینرێت، هەرکام لەو وێنانە هەرچەندەش خاوەنی ماهیەتی مەزن و پلەی کەمالی "خۆر" نەبێت، لەگەڵ ئەوەشدا گەرمیی خۆر کە وەك "هەست"ی خۆر و، ڕووناکییەکەی کە وەکو "ژیان"ی و، ڕووناکی بەخشینەکەی کە وەکو "ژیری"ی ئەو وان و، سیانە هەستەوەری ئەون، لەخۆدا کۆ دەکاتەوە ودەریاندەخات.

وێنەی شتی نوورانی زیندوویەکی پەیوەندیدارە بەو شتە نوورانییەوە. بەڵام وێنەی شتانی چڕ لە ئاوێنەکانیاندا مردوویەکی بزۆکە!

"گیان" (روح) نوورێکی تابلێی ڕووناکی بەخشە..

هەرکام لە وێنە بێ سنوورەکانی "گیان"ێکی تەماشاکەر لە پەنجەرەکانی ئەو جیهانی میسالەوە کە سنوور قبووڵ ناکات، "گیان"ێکی بەرجەستەیە و، خاوەنی تایبەتکارییەکانی ئەو گیانەیە و، هەرگیز غەیری ئەو نییە.

* * *

بەرهەمی نۆهەم:

# ئامازەکان

بەدیعوززەمان

## سەعیدی نوورسی

داینراوە

## فاروق رەسووڵ یەحیا

کردوویە بە کوردی

بسم الله الرحمن الرحيم

**ڕوونكردنەوەیەك:**

شەش ساڵ پێش ئێستا و لە سەرەتای ئەم بوومەلەرزەیەدا (یەكەم جەنگی جیهانی) كاتێ كە تەفسیری (إشارات الإعجاز)م نووسی، لە دەمی ڕوونكردنەوەی ﴿وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنْفِقُونَ﴾دا هەمان ئەو تێگەیشتنەی خۆمم تۆمار كرد كە لەم نامیلكەیەدا هەیە. جا لەبەر ئەوەی ڕۆژگار پشتی ئەم تێگەیشتنەی منی گرت، ئەوا بڵاوی دەكەمەوە.

ئەم نامیلكەیەش بۆ خۆی چەند شتێكی تێكەڵی وەك هی چێشتی مجێوەرە كە پاشكۆی پرژوبڵاویان هەیە.

(دانەر)

# ئاماژەکان

(إشارات)

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنْفِقُونَ﴾ (البقرة: ٣)

لە دوو توێی ئەم ڕستە بڵندەدا کورتەیەکی ئیعجاز بەخش دانراوە. چونکە قورئانی پیرۆز بە هەڵبژاردنی: ﴿وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنْفِقُونَ﴾ لە بریی ڕستە کورتەکانی وەك "يتصدقون" یاخود "يزكون" مەرجەکانی قبووڵ بوونی صەدەقە و سەرنجە جوانەکانی صەدەقەی، وەك چاکە و خێرێك، بە تێگەیشتنەکان بەخشیوە!

"صەدەقە" بە پێنج مەرج دەبێتە صەدەقەی تەواوەتی:

**یەکەمیان:** خێرەوەمەند لە بەخشینی صەدەقەدا ئیسراف نەکات، تاکو خۆیشی نەگاتە ئەوەی کە موحتاجی وەرگرتنی صەدەقە بێت! ئەم مەرجە "من"ی "تبعيضية"ی ﴿مِمَّا﴾ دەبێتە نیشانە لەسەری.

**دووهەمیان:** دەبێ لە ماڵ و سامانی خۆی ببەخشێت، نەك بچێت لە "ئەحمەد"ی وەربگرێت و بیدات بە "مەحموود"! پێوەری ئەم مەرجە بریتی‌یە لەو تایبەتکردنەی کە لە پێشخستنی ﴿مما رَزَقْنَاهُمْ﴾دا هەیە.

**سێ‌هەمیان:** بەخشەرەکە منەت نەکات. ئەم مەرجەش هێمای ﴿رزقنا﴾ دەبێتە خولگەی، کە بە هۆیەوە دەزانرێت خاوەنی ڕاستەقینەی سامانە بەخشراوەکە خوای گەورەیە، ئەو کەسەش کە دەیبەخشێت لە هۆکار زیاتر نی‌یە.

**چوارەمیان:** دەبێ لە ناخی دەروون و ڕەزامەندیی دڵەوە بیبەخشێت و ترسی هەژاریی نەبێت. ئەو "نوون"ی مەزنایەتییەی کە لە ﴿رزقنا﴾دایە و وەك هێمایەك بۆ واتــای ﴿إنَّ اللهَ هو الرزاقُ ذو القوةِ المتين﴾ بەکارهاتووە، ئەم مەرجەی لەخۆ گرتووە.

**پێنجـەمیان:** وەرگری ئـەو صەدەقەیـە نـابێت لـە کـاری هـەرزەییدا، بـەڵکو دەبێ لـە نەفەقەی پێویستی خۆیدا خەرجی بکات. ئـەم مەرجـەش نیشـانەی مـاددەی ﴿يُنفِقُـــونَ﴾ ئاماژەی بۆ دەکات.

**مەرجی شەشـــەم:** کەماڵـە[1]. واتـە خێر و سـەدەقە تەنـها لـە سـاماندا نـەبێت، بـەڵکو هەروەك خێرکردن بە ماڵ و سامان دەبێت، لـە کـار و زانسـت و هزریشـدا دەبێـت. ئـەم مەرجە بە "گشتی بوونی" وشەی: ﴿ما﴾ و "ڕەهایی" وشەی: ﴿يُنفِقُـــونَ﴾ ئامـاژەی بـۆ کـراوە، چونکـە بـەکارهێنانی وشـە بـە "ڕەهـایی" لـە مــەقامی ئاراسـتەکردنی گوفتـاردا "گشتی بوون"ی دەگەیەنێت.

گرنگیی "زەکـات" کـە پایەیـەکی گرنگـی ئـاینی ئیسـلامە، بـۆ ژیـانی کۆمەڵایـەتیی مرۆڤ ئەمەیە:

لە فەرموودەی پیرۆزدا هاتووە کە: "الزكاة قنطرة الاسلام"[2]. واتە: زەکات پردێکـە موسـڵمان بـە سـەریدا دەپەڕێتەوە بـۆ فریـاگوزاریی بـرای موسـڵمانی. چونکـە زەکـات هۆکـاری ئـەنجامدانی ئـەو هەرەوەزی‌یەیـە کـە فـەرمان بـە موسـڵمان دراوە لەگــەڵ موسـڵماناندا پیـادەی بکـات، تەنانـەت ڕاستەشـەقامە لـە ڕێسـای کۆمەڵایـەتیی جـۆری مرۆڤدا و، پەیوەندیدەری هاتوچۆی ماددەی ژیانـە لـە نێوانیـاندا، بگـرە چارەسـەری ئـەو ژەهرانەیە کە نێوانبڕی پێشکەوتنەکانی مرۆڤن.

بەڵـێ، حیکمەتێکی مەزن و، بەرژەوەندی‌یەکی بڵند و، میهرەبانی‌یـەکی فـراوان لـەو بانگەوازەی قورئاندا هەیە کە بۆ بەخشینی زەکات و صەدەقـە و قـەرزدانی بێ بەرامبـەر،

(١) لە پێنج مەرجەکە زیادکراوە، چونکە تایبەت نی‌یە تەنها بە "سامان"ەوە. (وەرگێڕ)

(٢) أورده الهيثمي في المجمع (٦٢/٣) وقال: رواه الطبراني في الكبير والأوسط ورجاله موثقون إلاّ بقية مدلس وهو ثقة، وأورده المنذري في الترغيب والترهيب (٥١٧/١) وقال: رواه الطبراني... وفيه ابن هيعة، والبيـهقي وفيه بقية بن الوليد. والحديث ضعفه محقق الجامع الصغير برقم ٣١٩١ في ضعيف الجامع الصغير (وەرگێڕ، لە پەراوێزی "إشارات الإعجاز"ەوە).

هاوکات لەگەڵ حەرامکردنی بێ چەندوچۆنی سەرجەم هۆکارەکانی "سوو"دا، ڕایگەیاندووە.

ئەگەر بە وردی و بە ڕوانینی مێژوویی سەیری لاپەڕەی جیهان بکەیت و، لە خراپکارییەکانی گرۆی مرۆڤ ورد ببیتەوە، دەبینیت بەردی بناغەی هەموو پشێوی و خراپکارییەك و، سەرچاوەی گشت ڕەوشتە نزمەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی، تەنها دوو وشەن. هەر بە تێکەڵ بوونی ئەم دوو وشەیە بوو گۆی زەوی وەك بۆمبێك تەقییەوە و، بە یەکانگیریشیان بوو کە مرۆڤە شارستانییەکان جرِوجانەوەریان لێ پەیدا بوو:

یەکەمیان: "ئەگەر خۆم تێر بم، چیم لە خەڵکی داوە، با لە برساندا بمرن"!

دووهەمیان: " تۆ ماندوو ببە با من بحەوێمەوە.. تۆ ڕەنج و تەقالا بدە با من بیخۆم"!

هەر تەنها وشەی بێ بەزەیی و خۆپەرست و غەدداری یەکەم بوو کە لەرزەی بە جیهانی مرۆڤ خست و، قیامەتی نزیك خستەوە.

تەنها چارەسەر و قرتێنەری دەماری وشەی یەکەم بریتییە لە "زەکات" هەروەها سەدەقە و قەرزی بێ بەرامبەر کە تەواوکەری ئەون.

وشەی ستەمکاری بەهەڵپە و سەرسەختی دووهەمیش بوو کە پێشکەوتنەکانی گرۆی مرۆڤی هێندە شێواند کە نزیکە بۆ ناو ئاگری ئاژاوە و بێ سەرەوبەرەیی بەر دەبێتەوە.

بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەم کێشە مەزنە تەنها یەك چارەسەر هەیە، ئەویش بریتییە لە "حەرامکردنی سوو" لەگەڵ لابردنی هەر شتێك لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا هۆکاری دروستبوونی "سوو" بێت. هەروەها داخستنی دەرگای ڕیبا و هەموو ئەو بانکانەیە کە دەبنە هۆی کۆبوونەوەی سامان لە دەستی سەرسەختەکاندا..

بەڵێ، لەو دەرگایانەدا سەرجەمی سامانەکان لە لای چەند کەسێکی کەمدا کۆدەبنەوە.

خۆ ئەگەر بەم دوو دەستوورە دابەش نەکرێت، ئەوا سامانەکان زەوت دەکرێن.

بەڵێ، ڕێکوپێکیی ژیانی کۆمەڵایەتی بەو مەرجە دێتەدی کە چینەکانی مرۆڤ لێکدانەبڕێن و، توێژی "تایبەتمەندان" لە توێژی "گشتینە"ی خەڵك و دەوڵەمەندانیش لە هەژاران هێندە دوور نەکەونەوە کە دەزووی پەیوەندیی نێوانیان بپچڕێت..

کەچی بە ژیاندنەوەی "سوو" هەروەها پشتگوێ خستنی " زەکات" ماوەی نێوان چینەکان لێکترازا و، ڕشتەی پەیوەندی لە نێوانیاندا نەما..

دەبینیت لە چینە نزمەکانەوە بۆ چینە بەرزەکان لە جیاتی ڕێز و گوێڕایەڵی و خۆشەویستی، تەنها زایەڵەی ئاژاوە و دەنگی ئیرەیی و بۆڵەی ڕق و ناڵەی کینە و هاواری تۆڵەسەندنەوە بەرز دەبێتەوە..

هەروەها لە بریی سۆز و چاکە و نەرمونیانی، تەنها ئاگری ستەم و خۆسەپاندن و بروسکەی سووکایەتی پێکردن لە توێژە هەرە بەرزەکانەوە بەسەر توێژە نزمەکاندا دەبارێت..

لەبەر ئەم حاڵەتە ڕۆحی‌یەیە کە دەبینیت ئەو ڕەوشتەی تایبەتمەندان، کە هۆکاری خۆنەویستی و بەزەیی هاتنەوەیە، بووە بە هۆی خۆ بە گەورە گرتن و لەخۆ بایی بوون.. دەستەوسانیی هەژاران و دەستکورتیی عەوامیش، کە هۆکاری بەزەیی پێداهاتنەوە یاخود چاکەکاری‌یە لەگەڵیاندا، بووەتە هۆکارێك بۆ دیلی و نزمییان.

ئەگەر شایەتت لەسەر ئەمە دەوێت، سەیری خراپکاری و ڕسوایی حاڵەتی جیهانی شارستانی بکە. "زەمان"یش شایەتی زۆرت پیشان دەدات!

بە کورتی:

هیچ چارەیەك نی‌یە بۆ ئاشتەوایی و نزیکبوونەوەی نێوان توێژەکان، جگە لەوەی "زەکات" کە یەکێکە لە پایەکانی ئیسلام و دەستوورێکی فراوانە بۆ هەڵسووڕاندنی ژیانی کۆمەڵایەتی، بکرێتە دەستوورێکی باڵا لە ژیانی کۆمەڵگادا.

هەروەها "ڕیبا" و سەرجەم هۆکارەکانیشی لا ببرێت، کە لە ئایینی ئیسلامدا بە گوناهێکی "گەورە" دانراوە.

دادگەریی قورئان لەسەر دەرگای جیهان ڕاوەستاوە و بە "ڕیبا" دەڵێت: (قەدەغەیە.. مافی هاتنە ژوورەوەت نی‌یە)!

"زەمان" چەندە پیر ببێت، "قورئان" پتر لاو دەبێتەوە و هێماکانیشی زیاتر ڕوون دەبنەوە. بۆ نموونە:

﴿إِنْ يَكُنْ مِنكُمْ عِشْرُونَ..﴾ (الأنفال: ٦٥)..

﴿تَجْرِي فِي الْبَحْرِ..﴾ (البقرة: ١٦٤)، (الحج: ٦٥)، (لقمان: ٣١)..
﴿قُتِلَ أَصْحَابُ الأُخْدُود..﴾ (البروج: ٤)..
هەروەها نموونەی دیکە و دیکە.. هتد.

* * *

## چێشتی مجێور

س: مَن أنتَ؟ أأنتَ أنتَ بعدَ موتِكَ؟ وهل لِخَرابِ البدَنِ تأثيرٌ في وحدةِ الروحِ؟
ج: أنا تولّدْتُ الآنَ متلَخِّصاً من ثمانين "سعيداً" تمخَّضُوا في أربعين سنةً بقياماتٍ مُسلسَلةٍ واستنساخات متسَلسِلة. فهذا "السعيد" حيٌّ، ناطقٌ. ميِّتون.. لو بالانجماد تماسَكَ ماءُ الزمانِ وتمثَّلَ أولئك السعيدون وتراأوا لما تعارفُوا! تدحرجتُ عليهم في الأطوارِ، فتفرقَ مني ما زان، وأخذتُ منهم ما شان. فكما أنَّ أنا الآن هو أنا في هاتيكَ المراحل، كذلك أنا أنا فيما يأتي بموتي من المنازل، إلا أنّه في كل سنةٍ بمهاجرة اثنتين لساكني تلك البلادِ يجدِّدُ "أنا" لباسَهُ، فيلبسُ "السعيدُ" الجديدَ ويخلعُ العتيقَ.

## واتاکەی[1]

**پرسیار:**
تۆ کێیت؟ ئایا تۆ هەر خۆتی لە دوای مردنت؟ ئایا هەڵوەشانەوەی جەستە کار دەکاتە سەر کەسایەتیی "گیان"؟
**وەڵام:**
من ئێستا پوختەی هەشتا "سەعید"م کە بە ماوەی چل ساڵ بە چەندین قیامەتی یەك لە دوای یەك و زنجیرەیەکی لەبەرگرتنەوەدا[2] تێپەڕیون و بەرهەم هاتوون. پێرستی ئەو

(١) دانەر بۆ خۆی دەقی ئەم برگەیەی بە عەرەبی نووسیوە، ئنجا تەرجەمە تورکی‌یەکەشی بە دوادا هێناوە. لە یەك دوو شوێنی تەرجەمەکەیدا هەندێ شیکردنەوەی بە دەقەکە داوە. ئێمەش لە وەرگێڕانی برگەکەدا بۆ کوردی سوودمان لە تورکی‌یەکەش وەرگرت. (وەرگێڕ)
(٢) لەبەرگرەوە قەڵەمی توانستە. (دانەر)

حەفتا و نۆ "سەعید"ە مردووە، یەك زیندووی هەستیارە. خۆ ئەگەر ئاوی "زەمان" بەستێت و ڕابووەستێت و ئەو سەعیدانەش بەرجەستە بن و بۆ یەك بڕوانن، ئەوا لەبەر جیاوازییە زۆرەكان یەكتر ناناسنەوە.

من بەسەر ئەو قۆناغانەدا تل بوومەوە، ئیتر جوانی و چێژ و چاكەكانیان پەرتەوازە بوون و، خراپە و ناشیرینی و ئازارەكانیانم بۆ مایەوە. جا هەروەك "من" ئێستا هەر ئەو "من"ەم لەو قۆناغانەدا، بە هەمان جۆر "من" هەر ئەم "من"ەم لەو مەنزڵانەشدا كە بە مردنم دێنە پێش.

ئەوەندە هەیە كە لە هەموو ساڵێكدا دوو جار گەردیلەكانی ئەو مەنزڵە كۆچێكی گشتی دەكەن و، "من" پۆشاكەكەی خۆی نوێ دەكاتەوە و، "سەعید"ی نوێ دەپۆشێت و كۆنەكەی لەبەر دادەماڵێت.

* * *

**"وێنەدانەوە"[1] خودی خاوەن وێنەكە، یان تایبەتمەندیی خودی ئەو، یان تایبەتمەندیی خود و ماهییەتی ئەو دەردەخات**

"توانست" گەلێ ئاوێنەی هەیە كە هەر یەكەیان لەوانی تر ڕوونتر و تەنكترە. هەر لە شووشەوە بگرە هەتا ئاو، لە ئاوەوە تا هەوا، لە هەواوە تا ئەثیر، لە ئەثیرەوە تا جیهانی میسال و هەتا زەمان و تەنانەت هەتا ئەندێشە.. هتد، چەند ئاوێنەیەكی جۆراوجۆرن..

ئەگەر وێنەی شتی چڕ لە ئاودا خودی شتەكە نەبێت، لە شتی نوورانیدا غەیری ئەو نی‌یە. بەڵام لە هەوادا هەر خودی ئەوە. لە ئاوێنەی هەوادا یەك دانە وشە دەبێتە ملیۆنەها.

لەم چاپخانەیەی "توانست"دا، قەڵەمی سنعەتی خوایی بە شێوەیەكی سەرسووڕهێنەر لەبەر نهێنیی وەچەكەوتنەوە دەگرێتەوە و كۆپیی دەكات.

﴿فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ﴾ (المؤمنون: ١٤).

* * *

(١) سەرنجی كۆتایی "گزنگەكان" بدە. (دانەر)

**ئەو دوو دژ بە یەکەی کە وەکو دوو هاوشێوە تەماشا کراون**

"وحدة الوجود"ی صۆفی‌یانی ئەهلی زەوق لەسەر حسابی خوای گەورە ئینکاریی سەرجەم بوونەوەران دەکات.

بەڵام فەلسەفەی بیرمەندان و ئەو "وحدة الوجود"ەی کە لەسەر زاری کەسانێکە باوەڕیان لاوازە، لەسەر حسابی بوونەوەران - پەنا بە خوا - ئینکاریی خوای گەورە دەکات..

یەکێکیان "وحده الشهود" و، ئەوی تریشیان "وحدة الوجود"ی لەخۆ گرتووە. (أين الثرى من الثريا)؟!

تێڕوانینی "فیکری" گەر لە کێشەی شتی "زەوقی"دا (ئەوەی بە چێژ پەیی پێ دەبرێ) خۆی هەڵبقورتێنێت، تێکی دەدات. شتێ کە "زەوقی" و "کەشفی" بێت بە تەرازووی تێڕوانینی "فیکری" هەڵناسەنگێنرێت. ئەگەر بەو پێیە بخرێتە ڕوو، قەبە و ناشیرین دەردەچێت.

بۆ نموونە: یەك دەنکە دانەوێڵەی ژێر خاك، لە هەوادا گوڵە گەنمێکی هەیە. ئەگەر "تێڕوانینی فیکری" لە جیهانی خاکدا بە وردی سەرنجی ناوکەکە بدات، چەند بناغەیەکی یەکجار باریك دەبینێت، کە ناتوانێت گوڵە گەنمەکەی ناو هەوا بۆ ئەو بناغە باریکانە بگێڕێتەوە و ڕوونیان بکاتەوە و، ناتوانێت ئەوەی دەیبینێت لەناو ئەو تۆوەدا جێی بکاتەوە. "چێژ" دەڕوانێتە ئێرە و "تێڕوانینی فیکری"ش دەڕوانێتە ئەوێ و، ڕوانینەکان دەگۆڕێت.

"ڕاستی‌یەکان" چەندە داماون! ئەوەتا کاتێ دەکەونە ناو دەستە بێ نرخەکان، نرخ و بەهای خۆیان لە دەست دەدەن!

وتوویانە:

(سبحانَ من اختفى لشدة ظهوره).

منیش دەڵێم:

(نَعَم! وسبحانَ من اختفى لعدم ضده)!

(ولولا الجنة والزمهرير لَمَا عذّبت جهنمُ ولا احرقت).

ئەگەر بەهەشت نەبوایە، دۆزەخ نەدەبووە سزادەر و، گەر زەمهەریریش نەبوایە، دۆزەخ هیچ شتێکی نەدەسووتاند.

* * *

## سەرنجێك بۆ دەروون پەرستان

پاروویەك بە یەك فلس بێت و پارووێەکی تر کە بە دە فلس بێت[1]، هەردووکیان پێش ئەوەی بڕۆنە ناو دەمی مرۆڤ و دوای تێپەڕبوونیشیان لە گەروویەوە، یەکسانن! جیاوازیی نێوانیان تەنها لەزەتبردنی دەمی مرۆڤە بۆ ماوەی چەند چرکەیەك. لەبەر ئەوە، ڕازی کردنی هەستی چەشتن - کە ئەرکی پشکنین و پاسەوانیی پێ سپێرراوە - لە ڕاستیدا هەرزەترینی جۆرەکانی ئیسرافە.

لە سەردەمەکانی پێشیندا زۆربەی موسڵمانان برسی و دەستکورت نەبوون، بۆیە دروست بوو موسڵمان ژیانی ڕەفاهییەت (خۆشگوزەرانی) بۆ خۆی هەڵبژێرێت. بەڵام لەم سەردەمەی ئێستادا زۆربەیان دەستکورت و برسین، بۆیە ڕوخسەتی شەرعی بۆ هەڵبژاردنی تام و لەزەتەکان بە دەستەوە نەماوە.

* * *

## سەرنجێك بۆ لەزەت پەرستان

ئەگەر مرۆڤ بیر لە ڕابوردووی ژیانی خۆی بکاتەوە، ئەوا چ بە دڵ و چ بە زمانی دەڵێت: "ئاخ و داخ".. یاخود دەڵێت: "ئۆخەی"!

"ئاخ" دەرخەری ئازارێکی شاراوەیە و.. "ئۆخەی" هەواڵدەری چێژ و نیعمەتێکی پەنهانی ناو گیانی مرۆڤە.

ئەو شتەی کە "ئاخ" بەسەر زاری مرۆڤدا دەهێنێت یادی لە دەستچوونی چێژەکانی ڕابوردوویەتی، چونکە هەروەك نەمانی ئازار چێژ و لەزەتە، نەمانی لەزەتیش ئازارە.

---

(١) لە کاتێکدا کە هەردوو پاروەکە لە ڕووی خۆراك بەخشینەوە بە جەستە هەر یەکێکن، کەچی حەز و ئارەزوو باج دەخاتە سەر نرخی یەکێکیان! (دانەر)

هەریەك لە دیوانی شاعیرەکان داد و هاوارێکە لە دەست ئازارێکی فیکری کە هی وێناکردنی نەمانی چێژەکانە!

بەڵام "ئۆخەی" یاخود ئەو شتەی کە زمانی مرۆڤ بە وتنی "الحمد لله" دەخاتە گۆ، نیشانەی چێژێکی ڕۆحی‌یە کە لە یادی نەمانی ئازارەکانی ژیانی ڕابوردووی سەرچاوەی گرتووە.

کەواتە دەبێ مرۆڤ پتر بە "ئازاری کاتی" دڵخۆش بێت هەتا "چێژ و لەزەتی کاتی".. تەنانەت بەخێرهاتنیشی لێ بکات!

* * *

## هاوسەرگیری پێویستە

بێ هاوسەری کاری بێکارانە

(ڕێژەی) کچ دوو لە سێی ئافرەتان و یەك لە سێی پیاوانە.. (ڕێژەی) کوڕیش دوو لە سێی پیاوان و یەك لە سێی منالانە. هاوسەرگیری کۆتایی بەم کێشەیە دەهێنێت و یەکلای دەکاتەوە!

* * *

**پرسیار:**

تۆ لە کام "کۆمەڵە"یت؟ بۆچی بە توندی ڕەخنە لە نەیاران دەگریت؟

**وەڵام:**

من لە کۆمەڵەی "شەهیدان"م!

ئینکاری و سووکایەتی بە یەك دانە کەسی "وەلی" کارێکی بەد و شوومە.

جا مادەم وایە، ئەوا ئینکاریی دوو ملیۆن شەهید کە "ئەولیای خوای گەورە"ن و، بە هەدەر حسابکردنی خوێنیان، لە هەموو بەدێك بەد و شوومترە..

چونکە نەیاران دەڵێن: (ئەوان بە ناحەق ڕۆشتنە جەنگەوە، حەق لای دوژمنان بوو، ئەو کارە جیهاد نەبوو)!

ئەم بڕیارەشیان ئینکاریی شەهیدیی دوو ملیۆن شەهیدە!

پێم وایە کە دەبێ زۆرترینی دوعاکانمان ئەمە بێت:

(اللهم لا تجعل بأسنا بيننا)[1].

ڕاستییەك هەیە کە دەشتەکیترین کەس، تەنانەت مرۆڤە دڕندەکانیش سەری گوێڕایەڵی و ڕێزی بۆ دادەنەوێنن، کە بریتییە لەوەی:

ئەگەر دوژمنێکی دەرەکی ڕووبەڕووی دوو هۆزی سەر بە یەك عەشرەت ببێتەوە کە لەناوخۆیاندا ناکۆك بن، ئەوا ئەو دوو هۆزە، بە هاندەری سروشتی، دوژمنایەتیی ناوخۆیان دەخەنە لاوە!

شایانی سەرسووڕمانە کە دەبینیت ئەوانەی بە شارستانی و ڕووناکبیر دادەنرێن، لە پلەیەکی گەلێ نزمتردان لەچاو ئەو دڕندانە و، لە دەمی سەرهەڵدانی دوژمنی دەرەکیدا دەچن ناکۆکیی ناوخۆیی پەرە پێ دەدەن!

جا ئەگەر زانست و شارستانێتی ئاوا بێت، ئەوا بەختەوەریی مرۆڤ لە دەشتەکێتی و نەزانیدایە!

* * *

## زانای ڕابەر دەبێ وەکو "مەڕ" وابێت نەك وەکو "مەل"!

ئەوەتا "مەڕ" شیر دەرخواردی بەرخەکانی دەدات، بەڵام "مەل" ڕشانەوەی خۆی بە دەم جووجەڵەکانیەوە دەکات!

* * *

وێنەکێشان و ڕوونکردنەوەی کاروبارە ناڕەواکان دەبێت بەهۆی گومڕاکردنی زەینە ساف و خاوێنەکان!

خۆ لە دوای زامدارکردنی ئەو زەینانە، چارەسەر و هێنانەوەیان بۆ شوێنی خۆیان یان سەردەگرێت یان ناگرێت!

---

(١) دوعایەکە لە فەرموودەیەکی صەحیح وەرگیراوە کە ئیبن ماجە لە (كتاب الفتن)دا ڕیوایەتی کردووە.واتە: (خوایە گیان! هێز و وزەمان لە دژی یەکتر مەخەرە کار). (وەرگێڕ)

ئەستەمبوولی داماو لەبەر ئەوەی مێشکی بە چەند پرەنسیپێکی زیانبەخش و فێڵبازانـە پڕکراوە، ئەوا توانای خۆموتوربەکردنی لە دەست داوە و زەینیشی ئاڵوودە بووە.

* * *

"لەبیرچوونەوە" خۆی لە خۆیدا نیعمەتە، چونکە تەنـها ئـازاری ڕۆژانـە دەرخـواردی مرۆڤ دەدات و، ئازارە کەڵەکەبووەکانی لە بیر دەباتەوە!

* * *

هەموو گیروگرفتێك، بە وێنەی پلەکانی گەرما، پلەیەکی نیعمەتی تێدایە..

لەبەر ئەوە، دەبێ مرۆڤ بیر لە موسیبەتی گەورەتر بکاتەوە و، ئەو نیعمەتە ببینێت کـە لەو موسیبەتە هەرە بچووکەدا هەیە تاکو شوکری خوا بکات..

دەنـا ئەگـەر فـوو بکرێتە ئـەو گیروگرفتـە و بـە گـەورە تەماشـا بکرێـت، ئـەوا ئـەویش گـەورە دەبێـت، خـۆ ئەگـەر مـرۆڤ بەهۆیـەوە تووشـی نیگـەرانی ببێـت، ئـەوا گیروگرفتەکەی دووچەندانە دەبێت و لەناو دڵدا دەبێتە حەقیقەتێکی بەرجەستە!

* * *

## ڕووناکیی تاریك!

ئەو هۆکارە هەرە گرنگـەی کـە لـەناو هـزر و بیرەکـانی ئێـستادا "نـەزانیی سـاکار" و ئاسایی دەگۆڕێت بە "نەزانیی ئاڵۆز" ئەوەیە کـە نـاوێکی "ڕوون" لـە شـتێکی "نـەزانراو" دەنرێت و ئیتر گومان وا دەبرێت کە بەو ناولێنانە شتە "نەزانراو"ەکە ڕوون کراوەتـەوە و بووە بە "زانراو"[1]! لە کاتێکدا کـە پێناسـەی هـەر شـتێك یـان بـە (حـەد) دەبێـت یـان بـە (ڕەسم)[2].

---

(١) بۆ زیادە ڕوونبوونەوەی مەبەستی دانەر بڕوانە پەراوێزی ل (٥٩٤)ی کتێبی (پاشبەندەکان). (وەرگێڕ)

(٢) (حەد) و (ڕەسم) لە زانستی مەنتیقدا بـە واتـای (پێناسـەر) دێن، بـەو جۆرەی کە لـە کتێبـەکانی زانستی ناوبراودا هەموو بەش و لقەکانیان بە دووروودرێژی ڕوون کراوەتەوە. (وەرگێڕ)

دەنا ئەگەر ناولێنەر کەسێکی نەزان بێت و، ئەو ڕووەش کە لە خاوەن ناوەکەیە تاریك بێت، ئەوا ناکرێت ناوێکی بێ گیانی لێ بنرێت[1]. بە وێنەی مانیاتیزم و، تەلیپاپی و، هێزی موگناتیسی!

* * *

## زیندووکردنەوەی ئەم نەتەوەیە بە ژیاندنەوەی "ئایین" دەبێت

## هەروەك ژیانی ئایینیش ڕووناکیی ژیانە

ئەندازەی پێشکەوتنی نەتەوەکەمان بە ڕێژەی دەستگرتنیەتی بە شەریعەتەوە. مەودای دواکەوتن و نزمبوونەوەشی بە ڕادەی پشتگوێ خستنی شەریعەتە. ئەمەش ڕاستییەکی مێژووییە.

* * *

(١) واتە: ئەو شتە "نەزانراو"ە بەم کارە پێناسە نابێت و نابێتە شتێکی "زانراو". (وەرگێڕ)

بەرهەمی دەهەم:

# هێماکان

بەدیعوززەمان

## سەعیدی نوورسی

داینا‌وە

## فارووق ڕەسووڵ یەحیا

کردوویە بە کوردی

بسم الله الرحمن الرحيم

**ڕوونکردنەوەیەك:**

هەر کەسەو بە مرۆڤەکانەوە سەرقاڵە. من لـە مرۆڤـەکان بێزار بووم. زیاتر گفتوگۆم لە گـەڵ کەسـانی میسـالیدا پێ خۆشە، چونکە بەویژدانن.

دیاردەیەکی سەیرە کە وا ماوەی یەك دوو ساڵە لە کاتی بێداریدا تاریکی‌یەك زەینم دەگرێتەوە، تەنانەت هەندێ جـار تووشـی لەبیرچوونـەوەی تـەواوەتی دەبم، کـەچی کاتـێ دەڕۆمە جیـهانی خەونـەوە ڕۆشـناییەك دێـت و بـە باشـی دەبینم. دوو شەو لە جیهانی "مەعنا"دا دوو پرسیارم ئاراستە کرا. کاتێ کە لە شەوی یەکەمدا خۆم بۆ وەڵام ئامادە کـرد بێدار بوومەوە. لە شـەوی دووهـەمدا وەڵامـم دایـەوە، بـەڵام پێش ئەوەی تەواوی بکەم بەخەبەر هاتم.

(دانەر)

# هێماکان

(رموز)

بسم الله الرحمن الرحيم

**پرسیاری یەکەم:**

بە کورتی "ئیعجازی قورئان" ڕوون بکەرەوە.

**وەڵام:**

ئیعجازی قورئـان لـە حـەوت سـەرچاوەی هەمەکی‌یـەوە دەردەکـەوێت و لـە حـەوت ماك(عنصر) پێکدێت.

**□ سەرچاوەی یەکەم:**

نەخش و نیگارێکی سـەرسووڕهێنەرە کـە لـە: ڕەوانیی وشـە و، پاراویی هـۆنین و، ڕەوانبێژیی مـەعنـا و، ناوازەیی واتاکان و، تەواویی نـاوەرۆك و، نـامۆیی شـێوازەکانەوە، سەر هەڵدەدات.

**□ ماکی دووهەم:**

زانسـتە غەیبی‌یەکانـە، کـە لـە "ڕاستی‌یە پەنهانـەکانی گـەردوون" و، "نهێنی‌یـە غەیبی‌یـەکانی لـە مـەڕ حەقیقەتـە خواییـەکان" و، "کاروبـارە پەنهانـەکانی ڕابـوردوو" و، "بارودۆخە شارراوەکانی داهاتوو" پێکدێت.

❑ **سەرچاوەی سێ‌هەم:**

بریتی‌یە لەوەی کە قورئانی پیرۆز:

لە ڕووی "وشە"وە: گەلێ گریمانی فراوان و ڕووی زۆر و زەبەندەی لەخۆ گرتووە، بە جۆرێك کە هەموو یەکێ لەو ڕووانە بەلای دەستوورەکانی زمانی عەرەبی‌یەوە ڕاستە و، لە پێش چاوی ڕەوانبێژیدا جوانە و، لە هەمان کاتدا شایستەی حیکمەتی تەشریعیشە.

سەبارەت بە "**واتا**"کەشی، ئەوا: سەرجەمی مەشرەبەکانی ئەولیا و، چێژەکانی خواناسان و، ڕێڕەوەکانی سالیکان و، ڕێبازەکانی زانایانی شەرع و، ڕێگاکانی زانایانی کەلامی لەخۆ گرتووە.

لە ڕووی "**ئەحکام**"ەکانیەوە: حەقیقەتەکانی سەرجەم حاڵەتەکان و، دەستوورەکانی بەختەوەریی هەردوو دنیا و، هۆکارەکانی پەروەردە و، پەیوەندیدەرەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیی لەخۆدا کۆکردووەتەوە.

لە ڕووی "**زانست**"ەکەیەوە: سەرجەم زانستە گەردوونی‌یەکان و زانستە خواییەکانی، گرتووەتەوە.

سەبارەت بە "**ئامانجەکان**"یشی، ئەوا بە: هاوسەنگی و، بەردەوامی و، یەکاویەك بوونیان لەگەڵ دەستوورەکانی سروشتدا، جامیعییەتێکی نائاسایی دەرخستووە.

❑ **ماکی چوارەم:**

بریتی‌یە لەوەی کە: قورئان بە ئەندازەی پلەی تێگەیشتن و ئاستی ئەدەبیی هەموو چەرخێك و، بە گوێرەی توانا و لێهاتنی گشت سەردەمێك، نوورانیێتیی خۆی پەخشاندووە. ئەوەتا دەرگاکەی بۆ سەرجەم چینەکانی هەموو چەرخێك لەسەر پشتە و، لاوی و نوێ بوونیشی هێندە گشتگیرە کە هەموویان ڕازی دەکات.

❑ **سەرچاوەی پێنجەم:**

لە ڕووی ئەو شتانەش کە دەیانگێڕێتەوە، ئەوا: هەواڵەکانی پێشینان و بەرەکانی ئایندە و، ڕاستی‌یەکانی جیهانی غەیب و جیهانی بینراو و، نهێنی‌یە خواییەکان و،

پەیوەندیدەرە گەردوونی‌یەكان بە جۆرێك دەگێڕێتەوە كە نە واقیع و نە ژیری و نە مەنتیق – ئەگەر پەسەندیشی نەكەن – هەرگیز ناتوانن بەدرۆی بخەنەوە و پووچەڵی بكەنەوە!

هەر قورئانە كە هەواڵی ڕاستی كتێبە ئاسمانی‌یەكانی پێشووی پێ بێت. ئەوەتا لەو شتانەدا كە قورئان لەگەڵیاندا یەكدەگرێتەوە، پشتیان دەگرێت و، لەوانەشدا كە یەك ناگرنەوە، هەڵەكانیان بۆ ڕاست دەكاتەوە!

□ ماكی شەشەم:

قورئانی پیرۆز لەخۆگر و دامەزرێنەری "ئایینی ئیسلام"ە، كە نە لە "ڕابوردوو"دا و نە لە "داهاتوو"دا ئایینێكی وەك ئیسلام ناتوانرێت بدۆزرێتەوە.

□ سەرچاوەی حەوتەم:

چێژێكی ئیعجازە كە لە تێكەڵكردنی ئەم شەش نوورەوە سەرهەڵدەدات و جوانی‌یەكی ڕاستەقینە پێكدەهێنێت. ئەوەش تەنها بە "حەدس" دەزانرێت، چونكە زمانمان لە ئاستیدا هێندە كۆڵەوارە ناتوانێت دەری ببڕێت و، بیریش هێندە كورتە كە ناتوانێت دەستی بە داوێنی بگات.

ئەگەر دەڵێیت:

لەم وێناكردنەوە مرۆڤ وا تێدەگات كە: جۆراوجۆریی ڕێبازەكان و جیاوازیی ڕێگاكان كارێكی پێویست و خوازراو بێت؟

وەڵام:

بەڵێ، هەروەك خوازراوە، پێویستیشە. بەڵام ئەگەر مرۆڤ بەو زەین تەسكی‌یەی كە لە خۆویستی‌یەوە سەرهەڵدەدات بیەوێت بەرپەرچی نەیاران بداتەوە و "البغض في الله" بە خراپی بەكاربهێنێت، ئەوا ئەو كاتە "ئیختیلاف" زیانبەخش دەبێت. دەنا ئەگەر دەستووری "الحب في الله" بكرێتە بناغە و، بزانرێت كە بە "یاسای هاوكاری" دەتوانرێت تەواوكاری(التكامل) بەدەست بێت و، بە فراوانی و ڕوانینی پزیشكییانەی شەریعەت بیربكرێتەوە، ئەوا "ئیختیلاف" دەبێتە هۆی ئاوێتەبوون لەگەڵ یەكتردا.

**بە پوختی:**

هەرکەس سەبارەت بە ڕێبازی خۆی بڵێت: "ڕێبازێکی حەقە".. نەڵێت: "هەر تەنها ئەمە حەقە"!

یاخود بڵێت: "جوانترە".. نەك بڵێت: "هەر تەنها ئەمە جوانە"!

دەسا ئەی مرۆڤە پرسیارکەرەکەی جیهانی میسال!

تۆ داوای پوختە وەڵامێکت لێ کردم، وا منیش بە کورتی وەڵامم دایتەوە..

خۆ ئەگەر داوای درێژە پێدانی باسی ئیعجاز دەکەیت، ئەوا پێویست بە چەند بەرگێکی کتێب دەبێت!

بەڵام بۆ ئەو مەبەستە تەفسیرەکەمت پێش چاو دەخەم کە ناوی (إشارات الإعجاز)ە، لەو کتێبەدا تەنها ماکی یەکەم و، لەویشدا بە شێوەیەکی جوزئی "پاراویی هۆنین"ی قورئانم ڕوون کردووەتەوە، چونکە سەرانسەری ئەو تەفسیرە توانیویەتی یەك بەشی "پاراویی هۆنین"ی قورئان ڕاڤە بکات.

* * *

**پرسیاری دووهەم، کە نیوەی وەڵامەکەی سپی و نیوەکەی تریشی ڕەشە**

**وتی:**

ئایا کاتێ کە "گومان" و "ڕەخنە" ڕووبەڕووی ئەم بەڵگەیەتان دەبێتەوە، ئیمانتان لەرزەی پێ ناکەوێت؟

ئایا لێکۆڵینەوە بەم چەشنە بەڵگەهێنانەوەیەی کە جەنگی وەهمەکانە، زیان بە کەس ناگەیەنێت؟

**وەڵام:**

ئەگەر ئەو ئەنجامەی کە پەیوەستی بەڵگەیە، بەو بەڵگەیە دامەزرێت و بسەلمێت و، بۆ هاتنەدیی ڕاستی‌یەکان بوویێتە پێوەر و، وەهمی مرۆڤ نەبوونی بەڵگە بە نەبوونی بەڵگە بۆهێنراوەکە دابنێت، ئەوا زیانی دەبێت. لە کاتێکدا کە ناکرێت "ئیمان" لەسەر شانی بەڵگەیەکی تەواو باریك بنیات بنرێت..

بەڵکو ئیمان لەسەر "حەدس"ێکی ئەوتۆ دادەمەزرێت کە لە چەندین سەرچاوەی هێز و کانگای نوورانیی ئەوتۆوە هێز بە دەست دەهێنێت کە کوژاندنەوەیان وەکو کوژاندنەوەی سەرجەمی بوونەوەران وایە.

**سەرچاوەی یەکەم:**

یەکگرتنی ملیۆنەها کەسی ئەهلی حەقیقەتە کە نهێنیی هەرە مەزنی "کۆدەنگی" و واتای هەرە فراوانی "تەواتور"ی لەخۆ گرتووە.

بە حەدسێکی قەناعەت بەخش - کە لە خاڵی نهێنیی کۆدەنگی و تەواتورەوە دەرکەوتووە - ئەو ئەنجامە لە زەینەکاندا جێگیر بووە. چونکە هەریەك لەو لێکۆڵەرانە بەڵگەی خۆی هەیە، خۆ ئەگەر ناوەڕۆکی ئەو بەڵگەیەش دەستنیشان نەکرێت، ئەوا هەر بە جۆرێکی بێ گومان بوونی بەڵگەکە زانراوە.

ئایا لە هەموو دنیادا چ ڕەخنە و گومانێك هەیە بتوانێت ئەم پەتە مەحکەم و قایمە بقرتێنێت کە لە ڕشتەی ملیارەها بەڵگە پێکهاتووە؟

چونکە من دەڵێم:

هەریەك لە ئەهلی حەقیقەت کە لە ژمارە نایەن بە بەڵگەیەك یاخود چەندین بەڵگە ئەم ئەنجامەی لەمەڕ یەکتایی بەدیهێنەریان بینیوە. وەك بڵێی سەرجەم بەڵگەکانی ئەوان یەك دانە بەڵگەی ئەوتۆ بێت لەرزەی پێ نەکەوێت. چونکە ئەگەر ئەو بەڵگانەش نەزانرێن، بوونیان دەزانرێت.

ئەمەش بۆ خۆی سەرچاوەیەکی بەپیت و زەنگینە بۆ "حەدس".

**سەرچاوەی دووهەم:**

شایەتیدانی سەرجەمی بوونەوەرانە.

**سەرچاوەی سێهەم:**

فیترەتی ناو ویژدانە.

گەلێ سەرچاوەی تری وەك ئەمانەش هەیە.

جا ئەگەر هەموو سەرچاوەکانی ئەم حەدسە نەکوژێنەوە، ئەویش ناکوژێتەوە.

ئەگەر بۆ گومان خستنە بەڵگەیەك سەد بەڵگە بهێنرێتەوە، ئەوا ناتوانێت زیان لە "بەڵگە بۆ هاتووەکە" بدات. چونکە ئەو گومەزە بلندە تەنها لەسەر یەك دانە ستوون ڕاگیر نەبووە.

لەبەر ئەوەی "زەین"ی مرۆڤ شتێکی جوزئییە، ئەوا گەر بە چاوی کرپار هەوڵی سەلماندنی بدرێت مەترسیدار دەبێت. بەڵکو ئەرکی ئەو بەڵگانە ئەرکێکی نەرێیە، تەنها مەبەستەکە ڕوون دەکاتەوە و پوختی دەکات، هەروەك هێز و پێز بە هەندێکیشی دەدات.

**وردبوونەوە دوو بەشە:**

**یەکێکیان:**

چەندە بڕوات و بگوزەرێت ﴿نُورٌ على نور﴾ە و، پتر ڕووناکی دەبەخشێت.

**ئەوی تریان:**

هەتا بڕوات تاریکیی گومانەکانی لێ دەکەوێتەوە.

بۆ نموونە: سەرچاوەی ئاوێکی شیرین و سازگار هەیە. لەو سەرچاوەیە هەزاران جۆگە و لەو جۆگانەش چەندین لق بووەتەوە و، ئەم لقانەش بەرەو چەندین جێگا ڕۆشتوون و تێکەڵی چەند بەشێکی تر بوونەتەوە.

ئنجا کەسێك سەرچاوەکەی بینی و تامی ئاوەکەی چەشت و بە دڵنیاییەوە هەستی بە سازگاری و شیرینیی ئاوەکە کرد و، ئەوەشی زانی کە جۆگە و لقەکانی پەیوەستن بە سەرچاوەکەوە. دوای ئەوە، هەرکام لەو جۆگە و لقانە ببینێت بە نزمترین بەڵگە لەسەر سازگاری و شیرینیی ئەو لقە بڕوا دەکات، مەگەر دژە بەڵگەی بێ گومان سەبارەت بەو قەناعەتەی ڕوون ببێتەوە، ئەو کاتەش دەڵێت: "ماددەی تری تێکەڵ بووە"!

ئەم جۆرە تێڕوانین و وردبوونەوەیە هێز و پێز بە ئیمان دەبەخشێت و یارمەتیی ڕوونبوونەوەی زیاتری دەدات.

**تێڕوانینی دووهەم:**

لە بریی ئەوەی لەسەرچاوەکەوە بەرەو خوار بڕوات دەچێت لەلای خوارووی ئاوەکەوە گوزەر دەکات. ئیتر سەیری هەر لقێکی ئاوەکە بکات و هەر ئاماژەیەك

ببینێـت لەسـە تـالیی ئـەو ئـاوە دەكەوێتـە گومانـەوە و، بـۆ شــیرینیی ئاوەكـە خوازیـاری بەڵگەی بێ گومانە! ئەمەش دژوارە! چونكە لە هەموو شوێنێكدا بەڵگە بەدەست نایەت. دەیەوێت ئەنجامێكی تابڵێی گەورە لەسەر شانی ئـەم لقـە یـەكجار بچووكـە هـەڵبگرێت. ئیتر وردە وردە نائارامیی گومانەكە پەرە دەسێنێت و زیاد دەبێت.

"ژیری" لە پەنجەرەی تێڕوانینەوە بۆ شتەكان دەڕوانێـت و هـەڵیان دەسـەنگێنێت. لـە كـاتێكدا كـە ئـەو "دڵ"ەی شـوێنی "ئیمـان"ە بـە هەستەوەرێكی پەنـهانی شەشـەم كـە بــە ناوێكی وەك "حـەدس" و "ئیلـهام" گوزارشتی لــێ دەكرێـت، دەڕوانێتـە حەقیقەتـەكان. "سرووش"ی پێغەمبەرانیش هەر بەو هەستەوەرەیە.

تێڕوانینی "ژیـری" لـە دەستوورەكانی خۆیـدا گەلــێ هـەژار و سـنووردارە و، لــە بەرامبەر گەلـێ ڕاستییەوە كورت دەهێنێت و دەستەوسـان دەبێـت، ئنجـا لەبـەر ئـەوەش كە پەی بەو حەقیقەتە نابات دەڵێ: ئەمە حەقیقەت نییە و، ڕەتی دەكاتەوە.

* * *

**لـە لایەن كەسێكەوە پرسیار كرا:**

لە كاتێكدا كە دەوترێت: (الحق یعلو ولا یعلی علیه) كەچی كافر بەسەر موسـڵماندا سەردەكەوێت؟

**وەڵام:**

هەروەك "گوێڕایەڵی" و "سەرپێچی" بەرامبەر بە فەرمانە شەرعییەكان دەكرێـت كـە لە سیفەتی "كـەلام"ەوە هـاتوون، بـە هـەمان جـۆر "گوێڕایـەڵی" و "سـەرپێچی" بەرامبـەر فەرمانە تەكوینییەكانیش ڕوو دەدات كە لە سیفەتی "ئیرادە"وە هاتوون.

زۆربەی جار یەكەمیان پاداشت و تۆڵەی خۆیان لەودنیادا وەردەگرن. بەڵام زۆربەی جار دووهەمیان هەر لەم دنیایەدا بە پاداشت و تۆڵەی خۆیان دەگەن!

بۆ نموونە:

پاداشتی ئارامگرتن: سەركەوتنە.

تۆڵەی تەمبەڵی و دانیشتن: زەلیلی و نزمییە.

پاداشتی کۆشش و بەردەوامی: سەروەت و سەرکەوتنە.

لەم حاڵەدا گوێڕایەڵیی کافر بۆ فەرمانە تەکوینییەکان زاڵ دەبێت بەسەر پشتگوێ خستنی فەرمانە تەکوینییەکان لە لایەن موسڵمانەوە.

هەروەك مەرج نییە هەموو سیفەتەکانی موسڵمانێك وەك خۆی موسڵمان بن، بە هەمان جۆر مەرج نییە کە هەموو یەکێك لە سیفەتەکانی کەسێکی کافر وەك خۆی کافر بێت.

یاخود زاڵبوونی بەسەر موسڵماندا سەبارەت بەو ئیستیدراجەو، موسڵمانەکە پاك دەکاتەوە.

* * *

**شپرزەیی ئەم جیهانە چییە؟**

**وەڵام:**

مشت و مڕی نێوان "کۆشش" و "سەرمایە"یە.

**ئایا چارەسەرێك نییە بۆ ئاشتکردنەوەی ئەو دوانە؟**

**وەڵام:**

بەڵێ، واجب کردنی زەکات و حەرامکردی ڕیبا و قەرزدانی بێ بەرامبەر مەرجەکانی پێکهاتنی ئەو دوانەیە.

ئەگەر ئەم بەردی ڕیبایە دەربهێنرێت ئەوا کۆشکی ئەم شارستانێتییە ستەمکارە هەڵدەوەشێتەوە.

**ئەم دوو ڕووداوەی ناو گاورەکان چۆن دەبینیت؟**

**وەڵام:**

ئێستا یەکێکی ئەوان "پیس" و یەکێکیان "پیستر"ە. پاك و خاوێنی تەواوەتی هەر تەنها دەستوورەکانی ئیسلامە.

ئەگەر وایە، کەواتە لەعنەت لە هەردووکیان!

بەڵێ ڕاستە..

بەڵام بۆ پاکژکردنەوەی ئەو "پیسترۆ"ەی کەوتووەتە ناو ئێمەوە گەر بەو "پیس"ەی کە بۆ کەنارگیرکردنی ئەو تێدەکۆشێت بوترێ: "پیس" و بکرێتە نەیارێك، ئەوا بەرژەوەندیی تێدا نابێت.

بۆ نموونە: بەرازێك دەیەوێت تۆ بکوژێت، ورچێکیش دەیەوێت ئەو بەرازە بکوژێت، لەم کاتەدا وەشاندی تیرێك لە سنگی ورچەکە و زاڵکردنی بەرازەکە بەسەر خۆدا جگە لە شێتی بە ژیری دانانرێت. لە ڕاستیدا شێتییەکی دەسەڵاتدار بە دنیادا بڵاوبووەتەوە.

چی دەبینیت لە پارچە پارچە بوونی کوفردا؟

**وەڵام:**

یەکێتیی ئیسلام.

یەکێتیی ئیسلام چییە؟

**وەڵام:**

یەکێتیی ئیسلام ئەنجومەنێکی نوورانییە کە لە خۆرهەڵاتەوە بۆ خۆرئاوا، لە باکوورەوە بۆ باشوور فراوانە و، ئێستا پێکهاتووە لە سێ سەد ملیۆن کەس زیاتر و، پەیوەستێکی مەحکەم بەیەکەوە گرێی داون، بەڵام لەم کاتەدا بەهۆی بێ ئاگاییەوە و بە شێوەیەکی نارەوا ئەو پەیوەستە لێك ترازاوە.

بە گرێبەستی پەیمانی ئەزەلی و سوێندی ئیمان پەیوەندیمان بەو کۆمەڵەیەوە کردووە.

ئێمە یەکتاپەرستین و فەرمانی یەکێتیمان پێ دراوە.

لقەکانی ئەم کۆمەڵەیە سەرجەم مزگەوتەکان و قوتابخانەکان و تەکیە و خانەقاکانە.

سەرۆکی ئەم کۆمەڵەیە پێغەمبەری سەروەرە، درוودی خوای لەسەر بێت.

یاسای بنەڕەتیی قورئانی پیرۆزە.

هاوکات لەگەڵ بزواندنی پەیوەندیی نوورانیی نێوان تاکەکانی ئەم کۆمەڵەیە بە شێوەیەکی هەست پێ کراو، زەمان ڕووناکیی خۆی بەسەر هەموو ئەو لقانەدا پەخشاندووە.

بەڵێ، "حجر الاسود"ی یەکێتیی ئیسلام، کە کەعبەی بەختەوەریی ئێمەیە: "مەککەی پیرۆز"ە و، مرواریی سپیی ئەو یەکێتییەش "ڕەوزەی خاوێن"ە. مەککەی موکەڕڕەمەشی: دوورگەی عەرەبە و، مەدینەی مەدەنییەتی مونەووەرەی: دەوڵەتی عوسمانییە.

ڕۆژگارێك بە مەبەستی ئاماژەدان بە ڕەفتارەکان و پەیوەندییەکان و لایەنە جوانەکانی ڕەوشتەکانی ئیسلام، لە ڕێگەی بەکارهێنانی هێما، من بەم جۆرەی خوارەوە وتم:

ئەگەر دەتەوێت ئارایشت و نەخش و نیگاری ئەم کەعبەیە ببینیت، ئەوا بڕوانە:

ڕێز و حورمەتی جوامێرانە، کە لە حەیا و غیرەتەوە پەیدا دەبێت..

خەندەی پاك و بێ گوناهانە، کە زادەی حورمەت و میهرەبانییە..

شیرینیی ڕۆحانییانە، کە لە پاراوی و جوانیی گوفتارەوە سەرهەڵدەدات..

نەشئەی ئاسمانییانە، کە لە عیشقی جوانی و شەوقی بەهارییەوە هاتووە..

چێژی مەلەکوتی، کە لە پەژارەی دەمی خۆرئاوابوون و شادیی کاتی سەحەرەوە دێتەدی..

ئارایشتی موقەددەس، کە لە جوانیی پەتی و قەشەنگیی ئاشکراوە دەردەکەوێت..

هەموو ئەمانە، تێکەڵ بە یەکتری بوون و، ئەو ڕەنگە نوورانییەی کە لەوانەوە لە تاقی بلندی کەعبەی بەختەوەرییەوە دەردەکەوێت، کە قابە قەوسەینی خۆرهەڵات و خۆرئاوایە، لە نێوان حەوت ڕەنگەکەی پەلکە زێڕینەدا تەنها ڕەنگی شینی ئاسمانی و سەوز دەبینیت.

بەڵام ئەم "یەکێتی"یە بە "نەزانی" دروست نابێت.

یەکێتی بریتییە لە ئاوێتەبوونی هزر و بیرەکان، کە ئەویش بە تیشکی "زانین" بەدەست دێت.

* * *

## وەڵامی قەشەیەکی فێڵباز کە لە سەرەوە بۆ خوارەوە دەڕوانێت

کەسێك تۆی هاویشتووەتە ناو قوڕ و لیتە و، لەو کاتەدا کە پێی لەسەر گەرووی تۆ داناوە، لە ڕووی سووکایەتی پێ کردنەوە لێت دەپرسێت: "مەزهەبی تۆ چی‌یە"؟

وەڵامی دەمکوتکەری ئەو کەسە، هاودەم لەگەڵ بێدەنگیدا تفێکە بکرێتە ڕووی.

"تف بکەرە ڕووی ئەو لەعینە بێ شەرم و حەیایە"!

نەك لە وەڵامی ئەودا، بەڵکو بە ناوی حەقیقەتەوە ئەمە وەڵامیەتی:

پ: ئایینی محەممەد ﷺ چی‌یە؟

و: قورئانە.

پ: چیی بە هزر و ژیان بەخشیوە؟

و: تەوحید و ڕاستڕەوی.

پ: دەرمانی پاڵپاڵێن چی‌یە؟

و: حەرامکردنی ڕیبا و واجبکردنی زەکات.

پ: سەبارەت بەم بوومەلەرزەیە چی دەڵێیت؟

و: ﴿لَيْسَ للإنسانِ إلاّ ما سعَى﴾..

﴿ والَّذينَ يكنِزُون الذَّهَبَ والفِضّةَ.. الخ ﴾.

* * *

## لاواندنەوەی ئاژەڵێکی موجاهید(١)

﴿وَما يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إلاّ ماهو﴾

هەروەها لەو سەربازانەدا غازی‌یەکی شەهید هەیە کە لە جۆری ئاژەڵە و، بریتی‌یە لەو مەیموونە بەختەوەرە.

(١) ئەو دەمە قەیرانێکی سیاسی دەکەوێتە نێوان دەوڵەتی یۆنان و دەوڵەتی عوسمانی و نزیك دەبێتەوە لە ڕوودانی جەنگ. لە ئەنجامدا بەوە کۆتایی پێ دێت کە مەیموونێك هێرش دەباتە سەر پادشای یۆنان و دەیکوژێت! ئیتر خوای گەورە جەنگی لە کۆڵ موسڵمانان کردەوە و، ڕووداوەکەش وەکو مژدەیەك بوو بۆیان. مامۆستا نوورسی بەو بۆنەیەوە بڕگەی (لاواندنەوەی ئاژەڵێکی موجاهید)ی نووسی، کە تیایدا ڕەگەزدۆزی‌یەکی جوانی لە نێوان "مەیموون" و "مەمنوون"دا بەکارهێناوە! (وەرگێڕ)

ئـەی بەختـەوەر مـەیموون! تـۆ ئیمـاندارانت مـــەمنوون و کـــافرانت مـــەحزوون و یۆنانییەکانت شێت و زەبوون کردا

زللەیەکت وەشاند کە چەرخی سیاسەتی ئەوانت تێکشکاند. "لوید جۆرج"ت هــار کرد و "فەنزیلیۆس"یشت لەناوبرد. زۆر بە قورسی لەسەر تەرازووی سیاسەت دانیشـتی بە ڕادەیەك کە ئۆردووی کوفر و لەشکری ستەمت لە یەك هەڵمەتدا تـەفروتوونا کـرد و، دەمـامکی سـەر دەموچاویـانت هێنایـە خـوارێ و لـە دنیـادا بوونـە مایـەی گاڵتـەجاڕی و پێکەنینی خەڵکی. بە ڕێـی ئـەو ئاژەڵانـەدا ڕۆشتی کـە مژدەی بەهەشتیان پێ دراوە. لـە بەهەشتدا بەختەوەریت، چونکە غازی و شەهیدیت.

* * *

## خاڵێکی گرنگ

موسڵمانێتی دایە بـێ ئاگـایی و ئیـتر موسـڵمانان ژێـر دەسـت بـوون.. ئـایینی دیـانیش زانست و پیشەسازیی کرد بەماڵی خۆی و بەو دوو چەکە زاڵ بوو.

ئێستا لە خۆرهەڵاتدا چەکێکی سەرسووڕهێنەر بـەکاردەهێنرێت، پێویسـت دەکـات بەشە حەق و ڕەواکەی ئەو چەکە بەدەست بهێنرێت. دەنا گەر ئـەوەش پشتگوێ بخرێـت دیانەکان دەیخەنە دەستی خۆیان و لە دژی ئیسلام بەکاری دەهێنن، ئەو کاتـەش بەرامبـەر بەوە توانای خۆڕاگری نامێنێت.

هـەر هزرێـك کـە ڕووی لـە جـەماوەری عـەوام بێـت، گـەر قودسـییەتی تێـدا نـەبێت، دەکوژێتەوە و نامێنێت. دوو ئایینی مەزنی ڕکەبەر هەیە کـە قودسییەت بـەو دەسـتوورانە دەبەخشن.

کاتێ ئەم هزرە چاوی خۆی واڵا کردووە، ئایینی دیانی بە دوژمنی خۆی و چەکیشی لـە دەسـتی ئـەو دوژمنـەدا بینیـوە. مـادەم ئـەو هـزرە بـەو جۆرەیـە، ئـەوا بـۆ بەدەسـتهێنانی قودسییەت ناچارە بڕواتە ناو ئیسلامەوە.

* * *

پوختەیەك لە بەسەرهاتی ژیانی

# بەدیعوززەمان سەعیدی کوردی


## حەمزە موکسی

دایناوە

## فارووق ڕەسووڵ یەحیا

کردوویە بە کوردی

# پێشەکیی وەرگێڕ

ئەم پوختەیەی ژیانی مامۆستا نوورسی یەکەم نووسینە کە بۆ مێژووی ژیانی نووسراوە و، هی ئەو کاتەیە کە دوای گەڕانەوەی لە دیلی لە ساڵی (١٩١٨ز)دا، ئەندام بووە لە دارولحیکمەی ئیسلامی لە ئەستەمبووڵ.

ئەم نامیلکەیە زۆر بە کورتی وێستگە گرنگەکانی ژیانی نوورسی باس دەکات لە سەرەتاوە هەتا ئەو ساڵانە.

(حەمزە موکسی) کێیە؟

نووسەری ئەم نامیلکەیەش (حەمزە ئەفەندی موکسی) یەکێکە لە قوتابییە دێرینەکانی مامۆستا بەدیعوززەمان لە پێش جەنگی جیهانیی یەکەمدا و، پاش گەڕانەوەی مامۆستاکەشی لە دیلی، لە ئەستەمبووڵ یەکیان گرتووەتەوە. ئیتر لەو ماوەیەدا کە لە ئەستەمبووڵ بووە هەروەك ئەم نامیلکەیەی لە ژیانی مامۆستاکەیدا نووسیوە و بڵاوی کردووەتەوە، هاودەم لەگەڵ یەك دوو قوتابیی تری مامۆستادا سەرپەرشتیی چاپی تەفسیرە عەرەبییەکەی مامۆستا نوورسییان کردووە کە ناوی (ئاماژەکانی ئیعجاز)ە.

بە پێی ئەو زانیارییانەی کە لە بەردەستدان، حەمزە ئەفەندی ساڵی (١٨٩٢ز) لە شارۆچکەی (موکس)ی سەر بە پارێزگای (وان) لە باکووری کوردستان لە دایك بووە.

لەگەڵ عەبدولمەجیدی برای نوورسیدا لە (دیاربەکر) لە ماڵی "جەودەت بەگ"ی والیی شار پێکەوە تەفسیری "إشارات الاعجاز" (ئاماژەکانی ئیعجاز)یان نووسیوەتەوە.

(قوتابخانەی ئامۆژگاران)ی تەواو کردووە. دوای ئەوەش لە زانکۆی ئەستەمبووڵ لە کۆلێجی (زمانەکان) لە بەشی زمانی "فارسی" دەرچووە.

ماوەیەك لە سوپادا بە ناونیشانی "پێش نوێژ" و، ماوەیەکیش وەکو "مامۆستا" لە قوتابخانەیەکی ناوچەی "ئوسکودار"ی ئەستەمبووڵ وانەی وتووەتەوە.

دوای شکستی دەوڵەتی عوسمانی لە جەنگی جیهانیدا، گەڕاوەتەوە بۆ کوردستان و، ماوەیەك لە (ماردین) ماوەتەوە.

ساڵی (١٩٢٧ز) ناوی حەمزە لە چەند ڕووداوێکدا هاتبوو، لەبەر ئەوە لە لایەن دەوڵەتەوە ماوەیەك خرایە بەندیخانە. دواتر لە ساڵی (١٩٢٩ز)دا کۆچی کرد بۆ خۆرئاوای کوردستان و لە شاری (حەسەکە) ژیا، هەتا لە ساڵی (١٩٦٠ز)دا لەوێ کۆچی دوایی کرد.

یەکێك لە کارە گرنگەکانی ماوەی ژیانی لەوێ، چاپکردنی (مەم و زینی خانی) بووە لە شاری حەڵەب.

خوای گەورە لێی خۆش بێت.

مامۆستا نوورسی، کە بە کەسێکی وەفادار ناسراوە بۆ قوتابی و دۆستانی، "حەمزە"ی هەر لە یاد بووە و دوعای خێری بۆ کردووە. ئەوەتا لەو بارەیەوە بەم جۆرە باسی دەکات:

(هەمیشە هاوکات لەگەڵ دوعام بۆ قوتابییە شەهیدەکانم، کە یەکێك لەوانە "عوبەید"ە، دوعا بۆ "مەلا حەمزە"ش دەکەم کە "ئاماژەکانی ئیعجاز" و "وتەی دەهەم، پەیامی حەشر"ی بە چاپ گەیاند، کە بیستوومە ئێستا لە عێراق دەژی و سۆراخی ڕووناکی دەکات).

تێبینی:

بەشێکی ئەم زانیارییانەم لە خودی مامۆستا عەبدولقادر بادللی و، بەشێکی دیکەشی لە کتێبی (الشهود الاواخر) وەرگرتووە.

فارووق ڕەسووڵ یەحیا

### پوختەیەك لە بەسەرهاتی ژیانی

## بەدیعوززەمان سەعیدی کوردی

بە قەڵەمی:

**حەمزە ئەفەندی**

کە ماوەیەکی درێژخایەن لە هاوڕێیەتی و

وانەکانی ئەودا ئامادە بووە

بەدیعوززەمان لە بەرواری (١٢٩٣)[1] لە گوندی "نوورس"ی سەر بە ناوچەی ئیسپاریت، قەزای هیزان، لە پارێزگای بەتلیس لە دایك بووە.

باوکی زاتێکە بە ناوی "میرزا"[2].

نۆ ساڵی تەمەنی منالّیی لەناو لانەی باوکیدا بەسەر بردووە.

---

(١) بە پێی مێژووی ڕۆمی کە لە ساڵەکانی کۆتایی دەوڵەتی عوسمانیدا کاری پێ دەکرا. ئەم بەروارەش دەکاتە (١٢٩٤)ی کۆچی (١٨٧٦-١٨٧٧) زایینی. (وەرگێڕ)

(٢) لە ساڵەکانی بیستی سەدەی بیستەمدا کۆچی دوایی کردووە و، لە گۆڕستانی گوندی "نوورس" بە خاك سپێرراوە. هەر سێ توێژەری بەڕێز (نەجمەدین شاهێنەر) و (عەبدولقادر بادللی) و خوالێخشبوو (مەلا محەممەد زاهیدی مەلازگوردی) لە ڕەچەڵەکی مامۆستا کۆڵیونەتەوە و گەیشتوونەتە ئەم دەرەنجامە: سۆفی میرزا کوڕی عەلی کوڕی خزر کوڕی خالید کوڕی میرزا ڕەشانە لە هۆزی ئیسپاریت. دایکیشی: نووریەی کچی مەلا تاهیر لە گوندی "بەڵکان" کە سێ سەعات لە گوندی "نوورس"ەوە دوورە و سەر بە هۆزی (خاکیف)ە. هەردوو هۆزەکەش لە کوردانی هەکارین. (وەرگێڕ)

دوای ئەوە، بۆ ماوەی سێ ساڵ لای "مەلا عەبدوڵڵا"ی برا گەورەی[1] دەستی بە خوێندن کردووە و، بە وێنەی نەریتی کوردستان سەرەتاکانی (نەحو) و (صەرف)ی[2] هەتا کتێبی (حل المعاقد) بە پلەیەکی مامناوەندی خوێندووە. واتە بە پێی نەریتی ئەستەمبووڵ هەتا کتێبی (ئیزهار)ی خوێندووە، ئنجا لە براکەی جیا بووەتەوە.

لە کوردستان کاتێ کە قوتابیانی زانستە ئایینی‌یەکان دەخرێنە بەر خوێندن، قوتابی دەتوانێت بڕوات بۆ لای هەر مامۆستایەك و ئەو کتێبەی کە خۆی دەیەوێت لە لای ئەو مامۆستایە بیخوێنێت. واتە قوتابی شوێنکەوتەی ئارەزووی مامۆستاکەی نابێت لە دیاریکردنی کتێبی خوێندندا، بەڵکو مامۆستا شوێنکەوتەی ڕای قوتابی‌یەکەیەتی. بەدیعوززەمانیش بە پێڕەوی کردنی لەم نەریتە ڕۆیشت بۆ شاری (سیرت – سیعرد)[3].

دوو مانگ لە سیرت لە قوتابخانەکەی (مەلا فەتحوڵڵا)دا سەرقاڵی خوێندن بوو.

دوای ئەوە، ڕۆشت بۆ (موکس)[4] بۆ قوتابخانەی "ئەمیر حەسەنی وەلی" کە (مەلا عەبدولکەریم ئەفەندی) وانەی تێدا دەوتەوە.

ماوەی دوو مانگ لە ڕێژنەی زانستی ئەو زاتە بەهرەمەند بوو. ئنجا ڕۆشت بۆ (وەستان)[5].

دوای تەنها یەك مانگ خوێندن لە وەستان، بە نیازی گەشتێکی هەوا گۆڕین بەرەو (بایەزید)[6] کەوتەڕێ.

سەرەتای ڕاستەقینەی خوێندنی لەم بەرواره بە دواوە دەست پێدەکات.

---

(١) سالی (١٩١٤ز) دنیای بەجێ هێشتووە و لە گۆڕستانی گوندی نوورس بە خاك سپێرراوە. (وەرگێڕ)

(٢) دوو زانستن لە ڕێزمانی عەرەبیدا. (وەرگێڕ)

(٣) ناوی مەڵبەندی پارێزگایەکە لە باکووری کوردستان. (وەرگێڕ)

(٤) (موکس، مەکس) مەڵبەندی قەزایەکی سەربە پارێزگای (وان)ە لە باکووری کوردستان. ئێستا پێی دەڵێن: "باهچە سەرای"! (وەرگێڕ)

(٥) وەستان: مەڵبەندی قەزایەکە لە پارێزگای (وان) لە باکووری کوردستان، ئێستا بە گوێرەی ناوی نوێ پێی دەوترێ "گەواش". (وەرگێڕ)

(٦) بەپێی دابەشبوونی ئیداریی ئێستا ناوی (دۆگۆبایەزید)ە و، قەزایەکی سەر بە پارێزگای ئاگری (ئەرارات)ە. (وەرگێڕ)

لە (بایەزید) ماوەی سێ مانگ لە لای (مامۆستا شێخ محەممەدی جەلالی) دەخوێنێت. بەڵام ئـەم خوێندنـەی لەوپەڕی نـاوازەییدا دێتـە پێـش چـاو، چونکـە لـە مـاوەی ئـەو سـێ مانگەدا خوێندنی هەموو ئەو کتێبانەی کە بە پێی ڕێ و ڕەسمی کوردستان دەخوێندرێن تا دەگاتە کتێبی (مەلا جامی)[1] تەواو کرد! واتە لە هـەر کتێبێـك یـەك یـان دوو وانـە، هـەر زۆر ڕۆشتبێت دە وانەی خوێندووە و، وازی لە پاشماوەی کتێبەکە هێناوە!

"شێخ محەممەد جەلالی"ی مامۆستای، ئەم ڕەفتـارەی قوتابی‌یەکـەی بـە دڵ نـەبوو، بۆیـە ڕەخنەی لەو کارەی گرت.

بەدیعوززەمان لە وەڵامیدا وتی:

(مامۆستام! من توانای خوێندنی ئەم هەموو کتێب و زانسـتانەم نی‌یـە، تەنـها دەمـەوێ بزانم ئەم کتێبانە باسی چی دەکەن، تاکو ئەوەیان بەدەست بـهێنم کـە لەگـەڵ سروشتمدا بگونجێت).

مەبەستی بنـەڕەتیی لـەو کـارە تەنـها ئـەوە بـوو کـە شتێکی نـامۆ پێـش چـاو بخـات و، تازەگەرییـەك لـە داب و نـەریتی قوتابخانـەکاندا بهێنێتـە نـاو، تـاکو بـەو ڕادەیـە کـات لــە خوێندنی پەراوێز و ڕاڤەکاندا بە زایە نەدرێت[2]!

ئیتر بە پێی ئەم ڕەوشەی خۆی، لە ماوەی سێ مانگدا هەموو ئەو کتێبانەی تەواو کرد کە بە پێی ئوسووڵی خوێندن بە ماوەی بیست ساڵ دەخوێندرێن.

دوای ئەوە، مامۆستاکەی لێی پرسی:

(چۆن و کام لەم زانستانەت بە دڵ بوو)؟

وەڵامی دایەوە:

(ناتوانم ئەم زانستانە لە یەکتر دابڕم.. یان دەبێ هەموویان بزانم، یان هیچیان)[3]!

---

(١) مەبەست کتێبی (الفوائد الضیائیة)ی مەولانا عەبدوڕڕەحمانی جامی‌یە لـە زانستی نـەحوودا، کـە شـەرحی (الکافیة)ی ئیبن حاجبی پێ کردووە. (وەرگێڕ)

(٢) ئەوەش یەکێکە لە کارە ناوازەکانی مامۆستا نوورسی کە لەو سەردەمەدا بە کردەوە دەنگی ناڕەزایی لە نەریتی خوێندنی حوجرەکان بەرز کردووەتەوە و، هەوڵی داوە نموونەیەکی تازەگەری پێش چاو بخات، تـاکو تەمەنی قوتابی لە شتی دوورپاتبوودا بە فیڕۆ نەڕوات. (وەرگێڕ)

(٣) مامۆستا نوورسی لە کتێبی (موحاکەمات)دا پێی وایە زانستەکان تەواوکەری یەکترن. (وەرگێڕ)

ئەو دەمە، هەر کتێبێکی دەکەوتە دەست، لێی تێدەگەیشت و کاتی خۆی بە خوێندنەوەی وردی ئەو کتێبە دەبردەسەر..

بە ڕادەیەك لە زانستدا نوقم بووبوو کە نەبینراوە هیچ پەیوەندییەکی بە ژیانی ئاساییەوە بووبێت.

هەر پرسیارێکی زانستیی ئاراستە بکرایە، بە بێ ڕاوەستان و یەکسەر وەڵامەکەی دەدایەوە.

بەڵام بۆ خۆی کەوتبووە گومانەوە لەوەی کە ئایا ئەم جۆرە تێگەیشتنەی لەگەڵ تێگەیشتنی زانایانی تردا یەکدەگرێتەوە یان نا؟

بۆ لابردنی ئەم گومانەی، ڕۆشتە سەردانی ڕوخسارە نایابەکانی زانایانی کورد و، بە نیازی بەهرەوەر بوون لە پیت و فەڕی ئەوان، بڕیاری دا لای هەر یەکەیان یەك دوو وانە بخوێنێت.

بەم مەبەستە مۆڵەتی لە مامۆستاکەی وەرگرت و بەرەو "بەتلیس" کەوتەڕێ. بەڵام بە جادەی ئاساییدا نەڕۆشت، بەڵکو گەشتی لەسەرخۆی ناو هەوراز و نشێوی چیاکانی هەڵبژارد. تا دوای سێ مانگ گەیشتە بەتلیس[1].

لەوێ لە شێوەی دەروێشێکی گەشتیاری خەرقە پۆشدا ڕۆشت بۆ تەکیەی (شێخ محەمەد ئەمین ئەفەندی) و، دوو ڕۆژ لە وانەکانی ئەودا ئامادە بوو.

هەرچەند شێخ محەمەد ئەمین ئەفەندی داوای لە بەدیعوززەمان کرد کە پۆشاکی زانستی لەبەر بکات، بەڵام لەبەر ئەوەی بەدیعوززەمان ئەو دەمە هێشتا بە تەمەن باڵغ نەبووبوو، خۆی بە شایانی لەبەرکردنی پۆشاکی مامۆستایەکی بەڕێز نەدەبینی. چونکە لە کوردستان پۆشاکی زانستی تایبەتە بە مامۆستایان و، قوتابی مێزەر لەسەر ناکات. لەبەر ئەوە وەڵامی دایەوە کە:

من منالێکم، چۆن دەبمە مامۆستا؟!

بەم جۆرە دەستی بە ڕووی داواکارییەکەی شێخ محەمەد ئەمینەوە نا.

---

(١) مەڵبەندی پارێزگاکەی دانەرە لە باکووری کوردستان. (وەرگێڕ)

دوای ئەوە، ڕۆشت بۆ (شێروان)[(١)] بۆ لای برا گەورەکەی کە هەشت نۆ مانگ بوو لێکدابڕابوون.

مەلا عەبدوڵڵای برای، بە بەدیعوززەمانی وت:

سەعید! من (شرح الشمسية)م[(٢)] دەخوێند، تەواوم کرد. ئەی تۆ چیت خوێندووە؟

بەدیعوززەمان: هەشتا کتێبم خوێندووە!

مەلا عەبدوڵڵا: ئەوە چی دەڵێیت؟

بەدیعوززەمان: هەموو ئەو کتێبانەم خوێندووە کە دەخوێندرێن و، گەلێ کتێبی تریش کە لە لیستی ئێوەدا نییە!

مەلا عەبدوڵڵا: ئەگەر وایە تاقیت دەکەمەوە!

بەدیعوززەمان: ئامادەم.. چ پرسیارێك دەکەیت بیکە.

مەلا عەبدوڵڵا بەدیعوززەمانی تاقی کردەوە و، لە پلەی زانستیی ئەو تێگەیشت. ئیتر سەعید ئەفەندیی بە مامۆستای خۆی قبووڵ کرد، لە کاتێکدا کە هەشت نۆ مانگ پێشتر لای ئەو قوتابی بوو!

دوای ئەوەی کە دوو مانگ لە شێروان لای براکەی مایەوە، ڕۆشت بۆ (سیرت) و، لەوێ بە نیازی بەهرەمەند بوون لە پیت و بەرەکەتی مامۆستا مەلا فەتحوڵڵا چوار جار ئامادەی وانەکانی بوو. جار بە جاریش لەگەڵ مامۆستا مەلا فەتحوڵڵادا دەکەوتە وتوویژەوە و، مامۆستای ناوبراو نوقمی سەرسامی بووبوو.

مەلا فەتحوڵڵا چەند جارێك مەدح و ستایشی زانست و فەزڵی ئەم قوتابییە لاوەی کرد.

زانایانی سیرت لە شوێنێکدا کۆبوونەوە و، مەلا سەعیدیان تاقی کردەوە. لە ئەنجامدا گەلێ ڕێز و ستایشیان بۆ وەڵامەکانی دەربڕی.

---

(١) شێروان: مەڵبەندی قەزایەکە لە پارێزگای سیرت لە باکووری کوردستان. (وەرگێڕ)

(٢) (الشمسية) کتێبێکە لە زانستی مەنتیقدا کە (الکاتبي القزويني ٦٠٠-٦٧٥ك) بە عەرەبی دایناوە. هەریەك لە (تەفتازانی ٧٩٣ك) و (تەحتانی ٧٦٦ك) شەرحێکی باشیان بۆ نووسیوە. ئەمەی دووهەمیان بە ناوی (تحرير القواعد المنطقية في شرح الشمسية) ناسراوە و لە حوجرەکاندا خوێندراوە. (وەرگێڕ)

هەندێ لەو مامۆستایانەی کە لە پلەی دووهەمدا بوون، بە هاندەری حەسوودی ئەوەیان پێ هەرس نەکرا و، ناکۆکی لە نێوانیاندا پەیدا بوو.

لەو ڕووەوە کە بەدیعوززەمان لە پێش چاوی خەڵکەکەدا وەکو کەسێکی "وەلی" دەبینرا و[1]، بە کەسێکی بەڕێز و خاوەنی پلە دانرابوو، هەروەها هەرچەند هەندێکیشیان پشتیان دەگرت و دەیتوانی شکست بە ڕکەبەرەکانی بهێنێت، بەڵام لەبەر ئەوەی دڵی ئازاری پێ گەیشتبوو، "سیرت"ی بەجێ هێشت و ڕۆشت بۆ بەتلیس.

ئەو کاتە تەمەنی چواردە پازدەساڵان بوو.

لەبەر زانست و فەزڵ و ئازایەتی یەکەی، ناوبانگی لەو دەوروبەرەدا بڵاو بووەوە، تەنانەت نازناوی (مەلا سەعیدی مەشهوور)ی لێ نرا.

لە بەتلیس لەگەڵ شێخ ئەمین ئەفەندی و زانایانی تردا کەوتە مونازەرە و، هەموویانی ناچاری تەسلیم بوون کرد.

جا بۆ ئەوەی پارێزگاری لەو پلەوپایەی خۆی بکات کە لە لایەن زانایانەوە بە دەستی هێنابوو، ناچار بوو لە هەر زانستەو یەك دوو "مەتن"[2] لەبەر بکات، بە تایبەت بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەو گومان و دوودڵییانەی کە ئاراستەی ئایینی ئیسلام دەکران هەتا ڕادەی چل مەتن کتێبی وەکو "المطالع" و "المواقف"[3] لە زانستە بەرزەکان و لە زانستە هۆکارەکان لە ماوەی دوو ساڵدا لەبەر کرد.

شاری (بەتلیس) زانای زۆری تێدا دەبینرا، بەڵام لەبەر ئەوەی شاری وان زانایەکی ناوداری تێدا نەبوو، ئەوا ڕۆشت بۆ (وان) و لەوێ نیشتەجێ بوو. ماوەی پازدە ساڵی لەوێ بە وانە وتنەوە و گەشتی ڕێنمایی بەناو هۆز و تیرەکاندا بەسەر برد.

---

(١) واتە پێیان وابووە لای خوای گەورە پلەیەکی هەیە. (وەرگێڕ)

(٢) زۆربەی کتێبەکانی جاران لە (مەتن) و (شەرح) پێکدەهاتن. مەتن بە چڕوپڕی بابەتەکەی تێدا دەنووسرا. بەڵام شەرحەکە ڕاڤە و ئاسانکاریی تێگەیشتنی دەکرد. زۆر جار خوێنەری ئەو کتێبانە دەقی مەتنەکانی لەبەر دەکرد و، زانیاریشی لەبارەی شەرحەکانەوە دەبوو. (وەرگێڕ)

(٣) (مطالع الأنوار) کتێبێکە لە زانستی مەنتیقدا دانراوی (القاضي الأرموي). (المواقف)یش کتێبێکە لە زانستی کەلامدا (عضد الدين الإيجي ٧٥٦ك) دایناوە. گەلێ شەرحی لەسەر کراوە، بەناوبانگترینیان شەرحەکەی "سەیید شەریفی جورجانی"یە. (وەرگێڕ)

ماوەی مانەوەی لە وان تێکەڵیی والی و دەستەڵاتدارانی دەکرد.

لەبەر ئەوەی پێی وابوو کە "زانستی کەلام"[١] بە شێوازە کۆنەکەی ناتوانێت بە تەواوی بەرپەرچی گومان و دوودڵی‌یەکانی ئەم سەردەمە بداتەوە، و، لەبەر ئەوەش کە فێربونی زانستە نوێیەکانی زۆر بە پێویست دەزانی، ئەوا لە ماوەیەکی کەمدا زانستەکانی:

(مێژوو، جوگرافیا، بیرکاری، زانستە سروشتی‌یەکان، مەوالید[٢]، فەلسەفە)ی بە دەست هێنا.

وا گومان نەبەیت کە لای مامۆستایەك ئەم زانستانەی خوێندبێت..

نەخێر، بەڵکو هەر تەنها لە سایەی موتاڵای شایستەی خۆیەوە فێریان بووە..

تەنانەت ڕۆژێکیان لەگەڵ مامۆستایەکی وانەی جوگرافیادا دەکەوێتە گفتوگۆ. کاتێ کە دەبینێت ئەم کارە پێویستی بە شارەزاییەکی تەواو هەیە لە زانستی ناوبراودا، ئەو گفتوگۆیە بۆ شەوێکی تر هەڵدەپەسێرێت و، لە ماوەی بیست و چوار سەعاتدا کتێبێکی جوگرافیا، کە زۆر دوورودرێژ نەبوو، لەبەر دەکات. ئیتر شەوی دوای ئەوە لە ماڵی تایەر پاشادا ئەو مامۆستا بەرێزەی جوگرافیا دەبەزێنێت.

واتە لە ماوەی بیست و چوار سەعاتدا، هێندەی مامۆستایەکی دەوڵەتی، زانستی جوگرافیای بەدەست هێناوە!

لە ئەنجامی مونازەرەیەکی تری لەو شێوەیەدا، بە ماوەی پێنج ڕۆژ، کیمیای نائەندامی فێر بووە و، ڕۆشتووەتە مونازەرەوە لەگەڵ مامۆستای وانەی کیمیادا.

لەبەر ئەم ناوەزەیانەی کە پێش چاوی خستن، نازناوی "بەدیعوززەمان"ی بۆ دانرا.

بەدیعوززەمان سەعیدی کوردی بۆ خۆی شێوازێکی وانە وتنەوەی هێنایە کایەوە کە لە وتنەوەی وانەکانیدا لەسەری دەڕۆشت. بەو جۆرەی کە زانستە ئایینی‌یەکانی

---

(١) زانستی کەلام، لە هەمان کاتدا زانستی تەوحید و ئوسوولی دینیشی پێ دەوترێ. ئەو زانستەیە کە بناغەکانی ئایین بە بەڵگەی عەقلی و نەقلی دەسەلمێنێت و، بەرپەرچی نەیارانی دەداتەوە. ئەم زانستە لە سەرەتای دروستبوونیەوە هەتا ئێستا گەلێ کتێبی بەناوبانگی تێدا دانراوە، کە هەر یەکەیان لە سەردەمی خۆیدا سەرچاوەیەکی گرنگ بووە. (وەرگێڕ)

(٢) پێدەچێ مەبەستی "بایۆلۆجی" بێت. (وەرگێڕ)

ئاوێتەی زانستە تازەکان دەکرد و، پشتی ڕاستی‌یە ئایینی‌یەکانی بە زانستە موسبەتەکان دەگرت و بنیاتی دەنا.

ئیتر بەم شێوەیە هەوڵ و کۆششی خۆی لە پێناوی ڕووناککردنەوەی زەینی قوتابی‌یەکانیدا دەخستە کار.

هەموو تەقالایەکی بۆ زانیاری و زانست، بە تایبەت لە پێناوی بڵاوکردنەوەی زانست لە کوردستاندا، بەسەر بردووە..

تەنانەت بە مەبەستی کردنەوەی سێ چوار قوتابخانە لە شێوەی زانکۆدا لە پارێزگاکانی وان و بەتلیس و دیاربەکر ڕۆشتە ئەستەمبوڵ. بەڵام بە داخەوە هەر هێندەی گەیشتە ئەوێ خرایە بەندیخانە و، دەرەنجامێکی تریش ڕەوانەکردنی بوو بۆ نەخۆشخانە[١].

کە گەڕایەوە بۆ (وان) قوتابخانەیەکی میللیی کردەوە و، تیایدا لەسەر وتنەوەی وانەکانی بەردەوام بوو[٢].

لەگەڵ ئەوەشدا هەردەم لە هەوڵ و تەقالادا بوو بۆ هێنانەدیی ئەو بیرە دێرینەیەی[٣].

وەك بڵێی ئەم جارەیان لە سەرەتاوە دەرگای بەخت ڕووی ڕەزامەندیی لێ کردبێتەوە..

ئەوەبوو فەرمانی پادشایی بۆ کردنەوەی قوتابخانەیەك لە وان بە ناوی (قوتابخانەی زەهراء) و لە شێوەی "جامع الأزهر"دا دەرچوو. دانانی بناغەکەی شتێکی ئەوتۆی نەمابوو کە جەنگی جیهانی سەری هەڵدا.

---

(١) با خوێنەری بەڕێز کتێبی (بروانامەی هەردوو قوتابخانەی موسیبەت) بخوێنێتەوە کە لە لاپەڕە (٣٩١-٤٦٦)ی ئەم بەرگەدا بڵاومان کردووەتەوە، تاکو ئاگاداری درێژەی ئەو ڕووداوانە بێت کە لە دەقەکەی سەرەوەدا بە پوختی باسیان لێ کراوە. (وەرگێڕ)

(٢) مەبەست قوتابخانەی (خورخوڕ)ە کە زانستە ئایینی و نوێ و گەردوونی‌یەکانی تێدا دەوتەوە و، هەتا جەنگی یەکەمی جیهانی و وێرانکردنی شاری (وان) لەو جەنگەدا، خزمەتە زانستی‌یەکانی لەو قوتابخانەیەدا پێشکەش کردووە. ئێستا تەنها داروپەردووی ماوە. (وەرگێڕ)

(٣) واتە دامەزراندنی زانکۆیەکی وەك زانکۆی ئەزهەر لە کوردستاندا بە ناوی "زانکۆی زەهراء"، کە ئەرکی بڵاوکردنەوەی زانست لە کوردستان و وڵاتانی ناوچەکەدا بگرێتە ئەستۆ. (وەرگێڕ)

هاودەم لەگەڵ گوزەرانی خۆیدا، بژێوی قوتابیانیشی لە گیرفانی خۆی و لە ڕێی خوادا دابین دەکرد. قوتابی‌یەکانیشی کە پێدەگەیشتن فیداکاری ڕاستەقینە دەردەچوون.

لە هەموو ئەو گفتوگۆ و مونازەرە زانستییانەیدا هیچ کات دۆخی ئاراستەکردنی پرسیاری هەڵنەبژاردووە، بەڵکو هەمیشە لە شوێنی وەڵامدەرەوەدا بووە[1]!

ئەم ڕەوشەی کە پابەندی بووە پلەی توانستی ئەو دەردەخات کە تا چ مەودایەکی بڕیوە.

بەڵام دەمەوێت لێرەدا خاڵێك بخەمە پێش چاو، ئەویش بریتی‌یە لەوەی کە پلەی بڵند و ڕەوشتی بەرزی بەدیعوززەمان لەو کارەدا ئاشکرایە، ئەوەتا لەبەر ئەوەی بەرامبەرەکەی ڕووزەرد نەبێت، خۆی لە پرسیار کردن بەدوور دەگرت!

لە لاپەڕەکانی مێژوودا مەگەر بە دەگمەن ڕێمان لە کەسێك بکەوێت کە لە ڕووی خۆیدا بەرامبەرەکەی لە ڕووزەردی بپارێزێت!

تەنانەت لە ئەستەمبووڵ ڕایگەیاند کە:

ئامادەیە وەڵامی هەر پرسیارێك بداتەوە لە لایەن هەر کەسێکەوە ئاراستە بکرێت، تاکو خۆی هیچ جۆرە پرسیارێك لە لایەنی بەرامبەری نەکات.

پێم وایە ئەم جۆرە ڕەفتارەی ئەو، بەڵگەیەکی بێ گومانە کە پشتی بۆچوونەکەم دەگرێت.

لە بەتلیس و لە دوای مونازەرەکانی لەگەڵ (شێخ محەممەد ئەمین ئەفەندی)دا، ناکۆکی و جیاوازیی لەناو خەڵکدا دروست بوو، بۆیە حکومەت کەوتە نێوانیان و بەدیعوززەمانی لەوێ دوورخستەوە.

---

(١) مامۆستا بەدیعوززەمان لە دەمی لاویدا و لە خەونێکیدا بە خزمەتی پێغەمبەری سەروەر ﷺ شاد بووە و، داوای زانستی قورئانی لێ کردووە. حەزرەتیش لەو خەونەدا دەفەرموێ: (سیوهب لك علم القرآن ما لم تسأل شيئاً من الأمة). واتە: زانستی قورئانت دەدرێتی، بە مەرجێ (سوئال)ی هیچ شتێك لە نەتەوەکەم نەکەیت. مامۆستاش بە درێژایی تەمەنی مەرجەکەی بردەسەر، چونکە (سوئال)ی لە نەتەوەی ئیسلام نەکرد، نە بە واتای "پرسیار" و نە بە واتای "سوال". تەنانەت لە موحتاجترینی کاتەکانی تەمەنیدا زەکات و صەدەقەشی لێ وەرنەگرتن! (وەرگێڕ)

دوای ماوەیەك، لە شوێنی دوورخستنەوەکەی هەڵهات و، ڕۆشت لە شارۆچکەی "تیللۆ"ی سەر بە "سیرت" لە شوێنێك بە ناوی "گومەزی خاصیە"[(١)] خۆی گۆشەگیر کرد و، لەوێ فەرهەنگی (القاموس المحیط)ی هەتا (باب السین) لەبەر کرد.

ڕۆژێکیان لێم پرسی:

بە چ نیازێك (القاموس المحیط)ت لەبەر کرد؟

لە وەڵامدا وتی:

هەر "وشە"یەك چەند (واتا) هەڵبگرێت، فەرهەنگی (القاموس المحیط) ئەو واتایانە دەنووسێت..

بەڵام من دەمویست بە پێچەوانەی ئەو فەرهەنگێك دابنێم کە هەر "واتا"یەك چەند (وشە) گوزارشتی لێ دەکەن بیاننووسم! دوایی هەواڵم پێ گەیشت کە لە لایەنی کۆمەڵەیەکەوە لە میسر بەرهەمێکی لەم جۆرە دانراوە، ئیتر تێگەیشتم کە ڕەنجەکەم جێی نەگرتووە.

من لە لایەنی خۆمەوە بیرم دەکردەوە و خەفەتم بەوە دەخوارد کە:

چ بەهرەگەلێکی هەیە، بەڵام لەبەر نەبوونی ڕابەرێك هەموویان لەدەست دەچن!

ئایا ئەم چەشنە زیرەکی و خولیایە شایانی ئەوەیە لەو پێناوەدا تیابچێت[(٢)]؟!

ئنجا ئەو شوێنەی بەجێ هێشت و ڕۆشت بۆ (جەزیرە).

هەرچەند لە سەرەتاوە کەوتە مونازەرە لەگەڵ مامۆستایانی جەزیرەدا، بەڵام دواتر بە مامۆستای خۆیان قبووڵیان کرد و دەستیان کرد بە وانە خوێندن لە لای.

هەر یەك دوو مانگ لە شوێنێکدا تەمەنی بەسەر دەبرد. ئەوەبوو بەدیعوززەمان لە جەزیرەوە بەرەو (ماردین) کەوتە ڕێ.

---

(١) مزگەوتێکی بچووکی چوارگۆشەیە، گومەزێکی لەسەر دروستکراوە لەسەر بەرزاییەکی بەرامبەر شارۆچکەی "تیللۆ"ی باکووری کوردستان. گوایا دایکی یەکێك لە پادشایانی دێرین بۆ خۆی بنیاتی ناوە، تاکو تیایدا لێبڕێت بۆ خواپەرستی. ئێستاش وەکو شوێنێکی گەشتیاری و ئایینیی ناوچەکە، خەڵکی ڕووی تێدەکەن. (وەرگێڕ)

(٢) واتە ئەو بەهرەیە لەوەدا بخرێتەکار کە قامووس لەبەر بکات! (وەرگێڕ)

لەبەر ئەوەی لەوێ خەریکی سیاسەت بوو، هەروەها پشتی ئیستیبدادی نەدەگرت، دەست و پێی لە کەلەپچە و زنجیر کرا و، بەرەو (بەتلیس) دوورخرایەوە.

لەو سەفەرەدا ڕووداوێکی سەیر و نامۆ هەیە، کە بە پشتیوانیی خوای گەورە کاتێکی تر بە دوور و درێژی دەینووسم[1].

لەو ڕووەوە کە هەتا ئەو کاتەش سەرجەم زانیاری‌یەکانی بەدیعوززەمان لە ڕێی سنووحاتێکەوە بوون کە ڕوویان لە دڵی دەکرد، ئەوا بە پێویستی نەدەزانی کە بە شێوەیەکی فراوان موتاڵا و کۆششەکانی پەرە پێ بدات..

بەڵام لەو کاتەوە سنووحاتەکانی پێشووی وردە وردە بەرەو نەمان ڕۆشتن، بە بێ ئەوەی بزانرێت کە ئایا لەبەر ئەوە بووە کە گەیشتووەتە تەمەنی بالغ بوون، یا هی سەرقاڵ بوونی بووە بە کاوباری سیاسەتەوە.

بەرهەمەکانی:

**بە زمانی تورکی:**

١- بەرهەمێکی بەنرخە بە ناوی "محاكمات بديع الزمان"[2] کە وەك پێشەکی‌یەك بۆ تەفسیرەکەی[3] نووسیویەتی.

**بە زمانی عەرەبی:**

٢ - "رجتة العلماء"

٣ - "رجتة العوام". ئەم دوو بەرهەمە شایانی ستایشن.

٤ - "تەعلیقات" کە بەرهەمێکی بێ وێنەیە لە مەنتیقدا. لە ڕێی هێنان و شیکردنەوەی نموونەوە، تیۆرە مەنتیقی‌یەکان لە تێگەیشتنەوە نزیك دەخاتەوە.

---

(١) ئاماژە بۆ ئەو ڕووداوە دەکات کە لەو سەفەری دوورخستنەوەیەدا و لە ڕێگای چۆڵەوانیدا کاتی نوێژ بە جەندرمەکان دەڵێت کەلەپچەکەی دەستی بکەنەوە تاکو نوێژەکەی بکات، بەڵام ئەوان داواکەی جێبەجێ ناکەن. مامۆستاش دەڵێت: بسم الله و فشار دەخاتە سەر کەلەپچەکە، ئیتر بەو ناوی خواهێنانە کەلەپچکەی دەستی دەکرێتەوە و نوێژەکەی دەکات. کاتێ پۆلیسەکان ویستوویانە ئەو ڕووداوە بە کەرامەتێکی مامۆستا ناوبنێن، ئەو فەرموویەتی نەخێر، ئەوە کەرامەتی نوێژە! (وەرگێڕ)

(٢) کتێبی (موحاکەمات) یەکەم بەرهەمە لەم بەرگەی بەردەستی خوێنەری ئازیزدا. (وەرگێڕ)

(٣) واتە تەفسیری (ئاماژەکانی ئیعجاز). (وەرگێڕ)

٥ - "رموزات" بەرهەمێکی جوانە لەو ڕووەوە کە زەینی مرۆڤ لە مەنتیقدا دەخاتە کار.

٦ - تەفسیرێکی پیرۆزە بە ناوی "إشارات الإعجاز في مظـــان الإيجاز" کە تا ئێستا تەفسیرێك لە بەردەستدا نییە بەو ڕێبازە دانرابێت. تەنانەت دەتوانم بڵێم کە: جگە لە بەرهەمی قەریحەی خۆی هیچماڵێکی ئەوقافی تێکەڵ نەکردووە[1].

ئەم تەفسیرە بەوەی کە لەگەڵ زانستە موسبەتەکاندا یەکدەگرێتەوە و ڕێنماییان لێ وەردەگرێت، ئیعجازی دارشتنی قورئان و، حەق و ڕاستی بوونی چەمکەکانی دەسەلمێنێت.

مامۆستای بەڕێزمان هێشتا ئەم تەفسیرەی دانەنابوو کە لە ئەڵقەی وانە وتنەوەیدا دادەنیشتم.. قورئانی بە دەستەوە دەگرت و سەیری هیچ کتێبێکی تەفسیری نەدەکرد و بە زمانی کوردی ڕوونکردنەوەی لەسەر دەدا. برادەرێکی بەڕێزمان بە ناوی "مەلا حەبیب"[2] بە زمانی کوردی تێبینییەکانی تۆمار دەکرد..

ئەوەش زۆری نەخایاند، چونکە جەنگی جیهانی دەستی پێ کرد[3].

بەدیعوززەمان سەعید ئەفەندی لە دەمی جەنگ و بەرەی شەڕدا بەو تێبینیانەدا نەڕۆشتەوە، بەڵکو بۆ خۆی ئەم کتێبەی دانا کە ئێستا ئێمە بە چاپکردنیەوە سەرقاڵین لە چاپخانەی ئەوقاف[4].

---

(١) واتە لە هیچ تەفسیرێکی ترەوە نەقڵی نەکردووە و، هیچ سەرچاوەیەکی بەکارنەهێناوە، هەمووی ئەنجامی تێڕامانی خۆیەتی لە قورئانی پیرۆز. (وەرگێڕ)

(٢) مەلا حەبیب یەکێکە لە قوتابییە دڵسۆز و زیرەك و نزیکەکانی مامۆستا نوورسی لە پێش جەنگی یەکەمی جیهانیدا. بەهۆی خەتە جوانەکەیەوە نووسەرەوەی بەرهەمەکانی ئەو دەمەی مامۆستا نوورسی بووە، وەك ئەو بەرهەمە کوردییەی کە لە دەقەکەدا باسی هاتووە، هەروەها تەفسیری عەرەبیی (إشارت الإعجاز) و کتێبی (تەعلیقات) لە زانستی مەنتیقدا. لە جیهادی جەنگی یەکەمی جیهانیدا لەگەڵ مامۆستا نوورسیدا بووە، تا ئەو کاتەی شەهید بووە. خوا لێی خۆش بێت. (وەرگێڕ)

(٣) وەك لە پێشەکیی ئەم بەرگەدا باسمان کرد، لێرەشدا دووپاتی دەکەمەوە کە هەواڵی ئەو دەستنووسە کوردییەم لە "سەیدا عەبدولقادر بادللی"ی قوتابیی مامۆستا بەدیعوززەمان پرسی، وتی: لە ڕووداوەکانی جەنگی یەکەمی جیهانیدا تیاچووە و، ڕووسەکان فەوتاندوویانە. (وەرگێڕ)

(٤) مەبەست چاپی یەکەمی تەفسیری (ئاماژەکانی ئیعجاز)ە. (وەرگێڕ)

لەم دواییەدا کە جەنگ کەوتبووە بەتلیسەوە، ڕۆژێکیان سێ فیشەکی بە شێوەیەکی سەیر بەرکەوت:

یەکێکیان ڕاستەوڕاست بەرەو دڵی ڕۆشت، بەڵام بەر قوتووی جگەرە و تووتن و دارجگەرەکەی کەوت و لەوێ ڕاوەستا[١]..

گوللەی دووهەم لای چەپی بەر دەسکی خەنجەرەکەی کەوت و لەوێ گیرسایەوە..

فیشەکی سێهەم لای شانی کەمێ زامدار کرد.

دوایی لە کاتی داگیرکردنی شاری بەتلیسدا، بەو زامەوە کە لە شانیدا هەبوو پێیەکی شکا[٢]. ئنجا دوای دوو ڕۆژ مانەوە لە گەمارۆدا، لە لایەن ڕووسەکانەوە دیل کرا.

دوای دوو ساڵ و سێ مانگ دیلی، بە شێوەیەکی سەرسووڕهێنەر، لەوێ هەڵهات[٣].

ئەمڕۆ سوپاس بۆ خوا وەك ئەندامێکی (دار الحکمة الإسلامیة) سەرگەرمی ئەنجامدانی ئەرکی ئاینی و زانستیی خۆیەتی.

من لێرەدا بەسەرهاتەکانی ژیانی مامۆستاکەمم، چ ئەوانەی لە زانایانم بیستووە و چ ئەوانەش کە بە چاوی خۆم بینیومن، بە کورتی خستووەتە پێش چاوی خوێنەرانی بەڕێز.

لەگەڵ ئەوەشدا، بە مەبەستی ئەوەی کە ئەوپەڕی خۆپارێزی لە زیادەڕەوی بکەم و تۆمەتی لایەنگیریم نەدرێتە پاڵ، گەلێ زانیاریم پشتگوێ خستووە.

با لەمەدا خوێنەران دڵنیا بن!

---

(١) ئەو کاتە و هەتا سەرهەڵدانی قۆناغی "سەعیدی نوێ"ش مامۆستا سەعیدی نوورسی جگەرەی کێشاوە، کە ئەو دەمە لەناو کوردەواریدا زۆر باو بووە. بەڵام لەگەڵ وازهێنانی لە "سیاسەت" وازی لە جگەرەکێشان و خوێندنەوەی ڕۆژنامەش هێنا. بڕوانە: کتێبی (مەکتووبات) ل: ١٠٢، کە دووهەم بەرگی (سەرجەمی پەیامەکانی نوور)ە بە زمانی کوردی. (وەرگێڕ)

(٢) چونکە لەسەر بەردێك کەوتبووە خوارەوە. (وەرگێڕ)

(٣) مامۆستا نوورسی بە شێوەیەکی وردی سەرنج ڕاکێش باسی ڕۆژگارانی دیلی و دواتریش گەشتی هەڵهاتنی لەو دیلی‌یە لە (پەیامی پیران)دا دەگێڕێتەوە. شایانی باسە لە بەرواری: ١٩١٦/٣/٢ز دیل کراوە. بەرواری گەیشتنەوەی بۆ ئەستەمبوولیش دەکاتە ڕۆژی: ١٧/ ١٩١٨/٦ز. (وەرگێڕ)

بەڵام لە نیازمدایە کە لە نامیلکەیەکی تردا بەسەرهاتەکانی ژیانی بە جۆرێکی دوور و درێژ بنووسم کە گەلێ ڕووداوی سەرسووڕهێنەر لەخۆ بگرێت(١).

لە قوتابییانی ناوبراو:

حەمزە

دەرچووی

قوتابخانەی ئامۆژگاران

* * *

(١) لەم بارەیەوە پرسیارم لە مامۆستا (بادللی) کرد کە: ئایا حەمزە موکسی ئەو کتێبەی تری داناوە یان نا؟ وتی: لە بریی ئەو "عەبدوڕڕەحمان نوورسی"ی برازای بەدیعوززەمان ئەو ئەرکەی گرتە ئەستۆ و ژیاننامەیەکی فراوانتری بۆ مامی نووسی. (وەرگێڕ)

# پێرستی بابەتەکان


بابەت ... لاپەڕە

تێبینی ... ٤

پێشەکیی وەرگێڕ ... ٥

ئەم کۆمەڵە پەیامە ... ١٩

مو حاکەمات

ناساندن. بە پێنووسی: د. عەبدولمەلیك سەعدی ... ٢٥

وتەیەك بۆ خوێنەری بەڕێز ... ٢٩

سەرەتای کتێبەکە ... ٣٣

پێشەکی ... ٣٩

وتاری یەکەم: (توخمی حەقیقەت) ... ٤١

چەند پێشەکی و مەسەلەیەك:

پێشەکیی یەکەم: ئامانجەکانی قورئان و باسی بوونەوەران تیایدا ... ٤٣

پێشەکیی دووهەم: بەدوای یەکداهاتنی هزرەکان و ڕۆڵی لە پێشکەوتندا ... ٤٨

پێشەکیی سێهەم: ڕۆشتنی ئیسرائیلیات و فەلسەفەی یۆنانی بۆ ناو هزری ئیسلامی ... ٥١

پێشەکیی چوارەم: ئەو ناوبانگەی دەبێتە سەرچاوەی خورافات ... ٥٨

پێشەکیی پێنجەم: گۆڕانی مەجاز و تەشبیهەکان بە حەقیقەت، بە تێپەڕبوونی کات ... ٦١

پێشەکیی شەشەم: مەرج نییە هەرچی لە کتێبی تەفسیردایە تەفسیر بێت ... ٦٥

پێشەکیی حەوتەم: زیانەکانی زیادەڕەوی و بە مفتە هەڵڕشتنی گوفتار ... ٧١

پێشەکیی هەشتەم: بەراوردێك لە نێوان نەوەکانی ڕابوردوو، ئێستا، داهاتوودا ... ٧٦

پێشەکیی نۆهەم: داهاتوو بۆ ئیسلامە ... ٨٣

پێشەکیی دەهەم: هەندێ گرفتی تێگەیشتن لە هەندێ ئایەتی قورئان ... ٩٠

پێشەکیی یازدەهەم: چەند مەسەلەیەك لە دووتوێی یەك مەسەلەدا ... ٩٥

پێشەکیی دوازدەهەم: کاکڵە و توێکڵی شتەکان ........ ٩٨
چەند مەسەلەیەك:
مەسەلەی یەکەم: خڕیی زەوی ........ ١٠٧
مەسەلەی دووهەم: گا و نەهەنگ ........ ١١٤
مەسەلەی سێهەم: چیای قاف ........ ١١٩
مەسەلەی چوارەم: بەربەستی زولقەرنەین و تێکچوونی و، یەئجوج و مەئجوج ........ ١٢٤
مەسەلەی پێنجەم: شوێنی دۆزەخ ........ ١٣٠
مەسەلەی شەشەم: ئەرکی تەفسیرکار و، ڕێبازی قورئان ........ ١٣٣
مەسەلەی حەوتەم: چەند سەرنجێکی ڕەوانبێژی ........ ١٣٦
مەسەلەی هەشتەم: هۆکاری تێوەگلانی ڕواڵەتبینان ........ ١٣٨
وتاری دووهەم: (توخمی ڕەوانبێژی) ........ ١٥١
چەند مەسەلەیەك:
مەسەلەی یەکەم: گۆڕانی هۆنینی واتا بۆ هۆنینی وشە ........ ١٥٣
مەسەلەی دووهەم: بەرجەستەبوونی واتاکان و گیان بەبەرداکردنی بێ گیانەکان ........ ١٥٧
مەسەلەی سێهەم: شێوازی گوفتار ........ ١٥٩
مەسەلەی چوارەم: بەدەم یەکەوەچوونی بەستێنەکانی گوفتار و هاوئاهەنگیی
چۆنێتییەکانی ........ ١٦٢
مەسەلەی پێنجەم: ئامانجەکانی گوفتار و پێداویستییەکانی ........ ١٦٤
مەسەلەی شەشەم: ئەو واتایانەی کە گوفتار بەرهەمیان دەهێنێت ........ ١٦٨
مەسەلەی حەوتەم: فەلسەفەی ڕەوانکاری ........ ١٧٤
مەسەلەی هەشتەم: موتوربەکردنی "واتا" بە ئامانجی "گوفتار" ........ ١٧٦
مەسەلەی نۆهەم: بڵندترینی پلەکانی گوفتار ........ ١٧٧
مەسەلەی دەهەم: ڕەوانیی گوفتار ........ ١٨١
مەسەلەی یازدەهەم: ساغی و تەندروستیی ڕەوانکاری ........ ١٨٢
مەسەلەی دوازدەهەم: سفت و سۆڵیی گوفتار ........ ١٨٣
وتاری سێهەم: (توخمی باوەڕ) ........ ١٨٩
چەند مەبەستێك:
سەرەتا: ........ ١٩١
پێشەکیی مەبەستی یەکەم: ........ ١٩٣
مەبەستی یەکەم: چەند بەڵگەیەك لەسەر کردگاری شکۆمەند ........ ١٩٥

بەڵگەی گەردیلەکان لەسەر خوای گەورە ........ ١٩٥
بۆچی هەموو کەسێك بە ژیریی خۆی خوا نابینێت؟ ........ ١٩٦
ڕێبازەکانی بەرزبوونەوە بەرەو ناسینی خوای گەورە ........ ١٩٧
"بەڵگەی چاودێری" لە قورئاندا ........ ١٩٨
"بەڵگەی داهێنان" لە قورئاندا ........ ٢٠١
سروشت چیيە؟ ........ ٢٠٥
سەرهەڵدانی "بوون" لە "نەبوون"ی پەتی ........ ٢٠٩
گومانی پەیوەندی لە نێوان "وحدة الوجود" و ماددیيەکاندا ........ ٢١٣
پوختە ڕوونکردنەوەیەك بۆ بەڵگەکانی تەوحید ........ ٢١٤
پێشەکیی مەبەستی دووەم: ........ ٢١٨
مەبەستی دووەم: بەڵگەکانی پێغەمبەرێتی بە شێوەیەکی ڕەها و، پێغەمبەرێتیی محەممەد ﷺ ٢١٩
سەرەتا ........ ٢١٩
جیاوازیی مرۆڤ لە زیندەوەرانی تر ........ ٢٢٠
بەڵگەکانی پێغەمبەرێتیی حەزرەتی محەممەد ﷺ ........ ٢٣٠
پێشەکی ........ ٢٣٠
یەکەم ڕێبازی پێغەمبەرێتی: زاتی پیرۆزی ئەو ........ ٢٣١
ڕێبازی دووەم: لاپەڕەی ڕابوردوو ........ ٢٣٤
ڕێبازی سێهەم: لاپەڕەی حاڵی حازر ........ ٢٣٦
ڕێبازی چوارەم: لاپەڕەی داهاتوو ........ ٢٤١
کۆتایی: وەڵامی چەند گومانێك ........ ٢٤٧
ڕێبازی پێنجەم: موعجیزەکان ........ ٢٥٣
مەبەستی سێهەم: حەشری جیسمانی ........ ٢٥٧
ئامانجی یەکەم: ........ ٢٥٨
ئامانجی دووەم: ........ ٢٦٢

## مونازەرات

تێبینی ........ ٢٦٤
ڕوونکردنەوەیەك لەم وەرگێڕانە کوردیيەی "مونازەرات"دا ........ ٢٦٥
پێشەکیی وەرگێڕی چاپە عەرەبیيەکە ........ ٢٦٩

دوو نامەی دانەر سەبارەت بە پەیامی "مونازەرات" .................... ٢٧٥
نامەی یەکەم: ڕوانینێك بە پەیامی "مونازەرات"دا .................... ٢٧٥
نامەی دووهەم: ڕەخنەی وەلییەکی مەزن .................... ٢٧٩
پۆزشێکی درێژ داوێن (پێشەکیی دانەر) .................... ٢٨٥
دەقی پەیامی "مونازەرات"
دەقی ئەو بەشەی کە دانەر لە سەرەتای چاپە تازەکاندا لایبردووە .................... ٢٩١
دەقی پاشماوەی پەیامەکە .................... ٣١١

## بڕوانامەی هەردوو قوتابخانەی موسیبەت

ڕوونکردنەوەیەك لەم وەرگێڕانە کوردییەدا .................... ٣٩٥
پۆزشێك .................... ٤٠١
سەرەتایەك (ڕوونکردنەوەی کوردی زادە ئەحمەد ڕامیز) .................... ٤٠٤
دەقی پەیامەکە .................... ٤٠٩
پێشەکی: .................... ٤٠٩
وەڵامەکان بۆ دادگای سەربازی .................... ٤١٢
یازدە تاوان و نیو! .................... ٤١٣
یازدە پرسیار و نیو لە لە دادوەرەکانی دادگای سەربازی .................... ٤٣٩
جەختکردنی دانەر لەو بابەتانەی کە لە ڕۆژنامەکاندا بڵاوی کردبوونەوە .................... ٤٤٢
باسی بارودۆخی ئەو زیندانەی تیایدا بەند کراوە .................... ٤٤٣
ماڵئاوایی لە ئەستەمبوڵ .................... ٤٤٥
خەباتی سەعیدی کوردی لە دەوری ئیستیبدادا .................... ٤٤٩
گفتوگۆ لەگەڵ شەفیق پاشادا .................... ٤٥٩
کۆتایی .................... ٤٦٣

## وتاری شام

وتەیەك بۆ ئەم وەرگێڕانە کوردییە .................... ٤٧٠
پێشەکیی وەرگێڕانە عەرەبییەکە .................... ٤٧١
پێشەکیی دانەر .................... ٤٧٥
ڕێبازی پەیامی نوور لە گەیاندنی بانگەوازیدا .................... ٤٧٧
دەقی وتاری شام .................... ٤٨٧

سەرەتای پەیامەکە .......... ٤٨٧
نەخۆشییەکانی نەتەوەی ئیسلام .......... ٤٨٨
وشەی یەکەم: (هیوا) .......... ٤٨٨
ئیسلام ئامادەیە بۆ پێشکەوتنی مەعنەوی .......... ٤٨٩
بڕیاری مێژوو .......... ٤٨٩
بێداربوونەوەی مرۆڤ .......... ٤٩١
کاکڵە و گەوهەری مرۆڤ .......... ٤٩٢
قورئان مرۆڤ هان دەدات بۆ بەکارهێنانی ژیری .......... ٤٩٢
ئەو ڕێگرانەی کە ڕێیان لە بڵاوبوونەوەی ئیسلام دەگرت .......... ٤٩٤
شایەتیی کەسایەتییەکانی ناو دوژمنان .......... ٤٩٦
نموونەی تۆماس کارلایل .......... ٤٩٦
نموونەی بسمارك .......... ٤٩٧
ئیسلام ئامادەیە بۆ پێشکەوتنی ماددی .......... ٤٩٨
پێنج هێزی توندوتۆڵ بۆ ئەو پێشکەوتنە: .......... ٤٩٩
هێزی یەکەم: ڕاستیی ئیسلام .......... ٤٩٩
هێزی دووهەم: پێویستیی لەڕادەبەدەر .......... ٤٩٩
هێزی سێهەم: سەربەستیی شەرعی .......... ٤٩٩
هێزی چوارەم: جوامێریی ئیمان .......... ٥٠٠
هێزی پێنجەم: سەربەرزیی ئیسلامی .......... ٥٠٠
نیو بەڵگە .......... ٥٠٢
بەڵگەی زانستەکان .......... ٥٠٣
مرۆڤ بەرێزترینی بەدیهاتووانە .......... ٥٠٤
محەممەد پێغەمبەر ﷺ پلەبەرزترینی مرۆڤەکانە .......... ٥٠٤
وشەی دووهەم: (نائومێدی دەردێکی کوشندەیە) .......... ٥٠٧
وشەی سێهەم: (ڕاستگۆیی بناغەی ئیسلامە) .......... ٥٠٨
وشەی چوارەم: (خۆشەویستی) .......... ٥١٣
وشەی پێنجەم: (دووچەندانە بوونەوەی خراپە و چاکە) .......... ٥١٥
وشەی شەشەم: (ڕاوێژ) .......... ٥٢٠
پاشکۆی یەکەمی وتاری شام: (دەستنیشان کردنی نەخۆشی) .......... ٥٢٣

پاشکۆی پاشکۆی یەکەم:
حەقیقەت ........ ٥٣٧
بڕی شەریعەتی خاوێن ........ ٥٣٩
بڕی شەریعەتی ئەحمەدی ........ ٥٤٢
زایەڵەی حەقیقەت ........ ٥٤٥
بەرپەرچدانەوەی گومانەکان ........ ٥٤٧
دوا پارچەی پاشکۆی پاشکۆ:
بۆ سەربازە قارەمانەکان ........ ٥٥٨
وتارێك بۆ سەربازەکان ........ ٥٦٠
**بەشی دووهەمی پاشکۆی دووهەمی وتاری شام ........ ٥٦٣**
هێمایەکی سوورەتی "ئیخلاص" ........ ٥٦٣
دووبەڵگەی گەورەی تەوحید ........ ٥٦٤
ئامانجی ئامانجەکان ........ ٥٦٥
جگە لە خوا هیچ شتێك کاریگەریی لە گەردووندا نی‌یە ........ ٥٦٦
ڕوانینی ئیسلام و نەسرانییەت بۆ پیاوچاکان و ئازیزان ........ ٥٦٧
چێژ لە "کارایی"دایە ........ ٥٦٨
هەڵپەکردن هۆی بێ بەشی‌یە ........ ٥٦٩
مەترسیی ڕەخنە لە یەك گرتن ........ ٥٧٠
ئەو بینایەیەی کە نە کەس دەخەڵەتێنێ و نە بۆ خۆیشی دەخەڵەتێ ........ ٥٧١
ڤێزەونیی "غەیبەت" ........ ٥٧١
نهێنیی هاوکاری ........ ٥٧٢
مرۆڤی ڕێزلێنگیراو ........ ٥٧٣
چەند هەستێکی تر ........ ٥٧٣
وێنەکانی هزر و بیر ........ ٥٧٣
فریوی دەروون ........ ٥٧٤
شەهید وەلی‌یە ........ ٥٧٤
ڕەوشتەکانمان بەندن بە ئایینەکەمانەوە ........ ٥٧٤
پیادەکردنی دادگەری ........ ٥٧٥
مافی ئیماندار بەسەر ئیماندارەوە ........ ٥٧٥
دەقی یەکەمجاری (وتاری شام) کە دانەر بە زمانی عەرەبی لە مزگەوتی ئەمەویی دیمەشق پێشکەشی کردووە ........ ٥٧٧

## وتارەکان

پێشەکی‌یەك بۆ ئەم کۆمەڵە وتارە ..... ٥٩٥
بەشی یەکەم: (بێژە وتارەکان) ..... ٦٠١
مێوەی کێوی هەرچەندە تاڵە، لەگەڵ ئەوەشدا دەرمانە ..... ٦٠٢
وتارێك بۆ سەربەستی ..... ٦٠٣
وەڵامێك بۆ هزری جوانی ئەمیر صەباحەدین ..... ٦١٨
وتارێك ئاراستەی کوردەکانی ئەستەمبووڵ کراوە ..... ٦٢١
دەبێت هەرکەسەو کاری خۆی بزانێت ..... ٦٢٣
بۆ نیازی بەگ ..... ٦٢٥
وتارێك دەربارەی "مەشرووتییەت" ئاراستەی کەسایەتی‌یەکانی کوردستان کراوە ..... ٦٢٦
چەند ڕێنماییەك ..... ٦٢٩
بەشی دووهەم: (نووسینە وتارەکان) ..... ٦٣٥
ڕوونکردنەوەی ڕاستی سەبارەت بە تیپە سەربازی‌یەکانی حەمیدییە ..... ٦٣٦
کوردەکان پێویستیان بە چی‌یە؟ ..... ٦٤٠
ئەی گەلی کوردان! ..... ٦٤٢
کوردەکان پێویستیان بە چی‌یە؟ ..... ٦٤٥
یادگاری ئایین ..... ٦٤٨
گفتوگۆ ..... ٦٦١
زانستی ..... ٦٦٦
مێوەی چیاکان ئەگەر تاڵیش بن هەر دەرمانن ..... ٦٧٠
ڕووناکیی حەقیقەت ..... ٦٨٠
بریسکانەوەی حەقیقەت و لابردنی گومانەکان ..... ٦٨٨
کورد و عوسمانییەت ..... ٧٠٣
کوردەکان و ئیسلامەتی ..... ٧٠٥

## سنووحات

ڕوونکردنەوەیەك ..... ٧٠٨
حیکمەتی "ڕەهایی" لە وشەکانی قورئانی پیرۆزدا ..... ٧٠٩
ئاکام بەڵگەی سزایە ..... ٧١٠

لایەنی ئیجابی و سەلبی لە هەستی نەتەوایەتیدا ........ ٧١١
گرنگیی "ڕۆزی" وەکو گرنگیی "ژیان" وایە ........ ٧١٢
ژیانی ڕاستەقینە ئەودنیایە ........ ٧١٣
شەهیدان هەست دەکەن کە زیندوون ........ ٧١٤
کوشتنی بێ تاوان لە دیدی قورئاندا ........ ٧١٥
توانستی خوای گەورە لە زیندووکردنەوەدا ........ ٧١٩
جگە لە خوا کەس مەکەنە پەروەردگار ........ ٧٢٦
چەند دەستوور و یاسایەکی گشتی ........ ٧٢٧
دادگەرترین دەستوور لە سیاسەتی کەسی و کۆمەڵایەتی و نەتەوەییدا ........ ٧٢٨
فەرمانڕەوایی ڕەهای قورئانی پیرۆز ........ ٧٣١
بانگەوازێك بۆ دامەزراندنی ئەنجومەنێکی شوورای ئیجتیهاد ........ ٧٣٦
گفتوگۆیەك لە خەونێکدا ........ ٧٤١
پاشکۆی خەونەکە ........ ٧٥٧
پاشکۆی پاشکۆ بۆ "دەرمانی نائومێدی" ........ ٧٥٩

## شەش هەنگاوەکان

پێشەکیی وەرگێڕ ........ ٧٧١
پێشەکیی قوتابیانی دانەر ........ ٧٧٣
پوختەیەك لەبارەی مێژووی دانانی ئەم پەیامە ........ ٧٧٩
**دەقی پەیامی (شەش هەنگاوەکان)** ........ ٧٨٣

## گزنگەکان

ڕوونکردنەوەیەك ........ ٧٩٦
جیاوازیی نێوان زانایانی جیهانی ئیسلامی ........ ٧٩٧
نەسرانییەت و بەرەوپێشچوونی موسڵمانان ........ ٧٩٩
جەربەزەیی چییە؟ ........ ٨٠١
واتای سکاڵاکردن لە دەست ڕۆژگار ........ ٨٠٣
کاریگەریی جەربەزەیی لەسەر هزرەکان ........ ٨٠٤
سەبارەت بە فەتوایەك کە دژی ڕاپەڕینی ئەنادۆڵ دەرکراوە ........ ٨٠٥
بۆچی نەفرەت لە ئینگلیز دەکەیت؟ ........ ٨٠٦

بۆچی سیاسەتی ئینگلیز سەرکەوتوو دەبێت؟ ........ ٨٠٧
لە ئەنادۆڵیش ستەم زۆرە ........ ٨٠٨
چارەسەری جیاوازییەکان لە جیهانی ئیسلامیدا ........ ٨٠٨
جۆرێکی توندوتیژی ستەم ........ ٨٠٩
سزایەکی شایان ........ ٨١١
وەڵامێك بۆ مەسەلەی فرەژنی و کۆیلایەتی ........ ٨١٢
بۆچی "دار الحكمة" نەیتوانی خزمەت بکات؟ ........ ٨١٣
ئەوە چۆنە گەر کەسێك بڵێ: "ئەم حەدیسە قبوڵ ناکەم"؟ ........ ٨١٥
ڕەخنەگرتن بە تایبەتی لە شتانی ئاینیدا ........ ٨١٥
وەڵامی پڕوپاگەندەی کافران ........ ٨١٦
حەقیقەتێکی حەدسی ........ ٨١٧

### ئاماژەکان

ڕوونکردنەوەیەك ........ ٨٢٠
مەرجەکانی صەدەقە ........ ٨٢١
گرنگیی زەکات بۆ ژیانی کۆمەڵایەتی ........ ٨٢٢
بناغەی هەموو پشێوییەك دوو وشەیە ........ ٨٢٣
زیانی پشتگوێ خستنی "زەکات" و کارکردن بە "سوو" ........ ٨٢٣
چێشتی مجێور ........ ٨٢٥
جۆرەکانی "وێنەدانەوە" ........ ٨٢٦
دوو شتی دژ بە یەك بەڵام وەکو هاوشێوە تەماشا کراون ........ ٨٢٧
سەرنجێك بۆ دەروون پەرستان ........ ٨٢٨
سەرنجێك بۆ لەزەت پەرستان ........ ٨٢٨
هاوسەرگیری پێویستە ........ ٨٢٩
لە کام کۆمەڵەیت؟ ........ ٨٢٩
زانای ڕابەر دەبێ چۆن بێت؟! ........ ٨٣٠
چەند دەستورێك ........ ٨٣٠
ڕووناکیی تاریك! ........ ٨٣١
زیندووکردنەوەی نەتەوە ........ ٨٣٢

## هێماکان

ڕوونکردنەوەیەك ........ ٨٣٤
پوختەی ئیعجازی قورئان ........ ٨٣٥
جۆراوجۆریی ڕێبازەکان و جیاوازیی ڕێگاکان ........ ٨٣٧
پرسیارێك نیوەی وەڵامەکەی سپی و نیوەکەی تریشی ڕەشە! ........ ٨٣٨
بۆچی کافر بەسەر موسڵماندا سەردەکەوێت؟ ........ ٨٤١
شپرزەیی ئەم جیهانە چییە؟ ........ ٨٤٢
ئەم دوو ڕووداوەی ناو گاوران چۆن دەبینیت؟ ........ ٨٤٢
یەکێتیی ئیسلام چییە؟ ........ ٨٤٣
وەڵامی قەشەیەکی فێڵباز ........ ٨٤٥
لاواندنەوەی ئاژەڵێکی موجاهید ........ ٨٤٥
خاڵێکی گرنگ ........ ٨٤٦

## پوختەیەك لە بەسەرهاتی ژیانی بەدیعوززەمان سەعیدی کوردی

لە نووسینی: (حەمزە موکسی)

پێشەکیی وەرگێڕ ........ ٨٤٩
دەقی ژیاننامەکە ........ ٨٥١

* * *

# سەرجەمی پەیامەکانی نوور

## بە زمانی کوردی

**بەرهەمەکانی گەورە زانای جیهانیی گەلەکەمان (مامۆستا بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی)**
**تا ئێستا بە زیاتر لە پەنجا زمانی نەتەوەکانی ڕووی زەوی بڵاودەبنەوە.**
**یەکێك لەوانە زمانی کوردی‌یە.**

بە پشتیوانیی خوای گەورە هەر لە سەرەتای ساڵەکانی هەشتای سەدەی بیستەمەوە هەتا ئێستا بەم جۆرە بڵاوکراونەتەوە:

یەکەم: لە شێوەی کتێبی بچووك و مامناوەندی و نامیلکەدا (٣٠) دانەمان بڵاوکردووەتەوە، کە زۆربەیان چەند جارێك لە چاپ دراونەتەوە.

دووهەم: لە شێوەی بەرگی گەورەدا ئەم بەرگانەمان خستووەتە بەردەستی خوێنەران:

١ – وتەکان

٢ – مەکتووبات

٣ – بریسکەکان

٤ – تیشکەکان

٥ – پاشبەندەکان

٦ – داوەری‌یەکان

بە پشتیوانیی خوای گەورە بەرگەکانی تریش بڵاودەکرێنەوە

# محاكمات

(آثار سعيد القديم)

المجموعة السادسة من كليات رسائل النور

التي ألفها: بديع الزمان سعيد النورسي

ترجَمها من العربية إلى الكردية: فاروق رسول يحيى

❁❁❁

# MUHAKEMAT

**(The Old Said's Works)**

From the Risale-i Nur Collection

By:

Bediuzzaman Said Nursi

Translated from Arabic into Kurdish by:

Farooq Rasool Yahya

❁❁❁

# MUHAKEMAT

**(Eski Saidın Eserlerı)**

Risale-i Nur Külliyatından

Müellifi:

Bediüzzaman Said Nursi

Kürtçeye Mütercimi:

Faruk Resul Yahya

❁❁❁

# داوريها

ششمين كتاب از كليات رسائل نور

تأليف دانشمند بزرگ: بديع الزمان سعيد نورسى

مترجم به زبان كردى: فاروق رسول يحيى